# قامووسی رستە

بەرگی یەکەم

خ • د • ذ • ر • ز • س • ش

نوسینی:

## مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

٢

١٤٣١ك ٢٠١٠ز

دار المعرفة
بەیرووت

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ




۞ ناوی کتێب: «قامووسی رسته»

۞ دانراوی: مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

۞ تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

۞ لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (      ) ساڵی (٢١٠)ی دراوەتێ.

۞ تایپ و دیزاینی: (روبار حسین)

۞ ساڵی چاپ: ١٤٣١ ك - ٢٠١٠ ز

# قامووسی

# رستە

بەرگی دووەم

## خ • د • ذ • ر • ز • س • ش

نوسینی:


## مەلا مەحموودی گەلاڵەیی


٢


دار المعرفة
بەیرووت

١٤٣١ك
٢٠١٠ز



(خ)ێ پیتی حەوتەمی پیتەکانی هیجایە ٥ شوێنی لێدەرهاتنی لای سەروی قورگە بەلای بنکی زمانەوە.

الخاتون: ئافرەتی شەریفو رەسەن ٥ شوێنی موراقەبەو خودا پەرستی صۆفیەکان.

خَبَأَهُ خَبْأً: پەنهانی کرد ٥ پاراستی.

أخْبَأَهُ: بەمانا (خَبَأَهُ) دێ.

خَبَّأَهُ: بەمانا (خَبَأَهُ) دێ.

خَابَأَهُ: کەوتە مونازەعەو بەبەریەك دا هەلّکوتنو بەلّگە هێنانەوە بەمەبەستی بۆردانی یەکتری.

إخْتَبَأَ: خۆی حەشاردا (اختَبَأَ الشَّيءَ) شتەکەی پەنهان کرد ٥ پەزمەندەی کردو هەلّی گرت ٥ ئیمامی عوسمان دەفەرموێ: (اختَبَأتُ عن الله خصالاً).

إختَبَأَ لَه خبيئاً: شتێکی لێ هەلّەوگێرو موعامەکرد ئەمجار پرسیاری لێ کرد.

تَخَبَّأَ خِبَاءً: مەلجەئوپەناگای بۆخۆی دروست کرد.

الخابِيَة: کوندەی ئاو، دێمکە، جەوەندە (ك: الخوابي).

الخَبْءُ: پەزمەندە، پەزمەندەکراوو شێراوە ٥ هەندێك پێیان وایە (الخَبْء) لەزەوی دا مەبەست روەکە پێش ئەوەی سەر دەربێنێ ٥ لەئاسمانیش دا مەبەست بەو وشەیە بارانە.

الخِبَاءُ: رەشماڵ (خانووی لەکولّكو مودروستکراو)، خێوەت کە کۆلّەکەی ژێر دەدرێ ٥ توێکلّو پەردەی دەنکە جۆو گەنم کەلەناو گوڵەکەی دابێ ٥ هەروا ئەو پەردەو توێکلّەی کەبەسەر خونچەی گوڵەوەیە پێش ئەوەی بپشکوێ.

اَلْخُبْأَةُ: هەلّگیراوو پەزمەندەکراو.

الخُبَأَةُ: ئافرەتێکە گۆشەگیر ٥ دەگوترێ: (إمرأة خُبَأَةٌ) ئافرەتێکە لەمالّەوە خزاوەو خۆی دەشێرێتەوەو دەرناکەوێ، (إمْرَأة خُبَأةٌ طُلَقَةٌ) ئافرەتێکە ناومناوە دەردەکەوێو ناوە ناوەش خۆ گوم دەکا، دەگوترێ: (خُبَأة خير من يفعة سوء) کچێکی مالّەوە زۆرباشترە لەکورێکی خراپی بێ خێر.

اَلْخبِيءُ: بەمانا (اَلْخُبْأَةُ) دێ بەشتێکیش دەگوترێ: کرابێتە موعەمماو بەپرسیار ئاراستەی یەکێکی تر بکرێ.

**اَلْخَبِيئَةُ**: بەمانا (اَلْخُبَاةُ) دێ (ك:خبايا) لەحەدیثی پێغەمبەردا هاتووە دەفەرموێ: (أُطْلُبوا الرزق في خبايا الأرض) مەبەست بە (خبايا الأرض) تۆوی دانەویلەیە ٥ یان کانە کانی ژێر زەوییە.

**اَلْمَخْبَأُ**: پەناگایەکە ئادەمیزاد لەترسی هێرشی ئاسمانی پەنای بۆدەبا.

**اَلْمُخْبَأَةُ**: ئافرەتێکە کەژاوەنشینو شوی نەکردبێ.

**اَلْمُخَبَّأَةُ**: بەمانا (اَلْمُخْبَأَةُ) دێ.

**خَبَّ الفرسُ**: ئەسپەکە لەراکردن دا جارێك دەستو پاشوی راستو چەلێك هی چەپی بەیەکەوە هەڵدەهێنێ.

**خَبَّ فلان في الأمر**: فلانکەس لەکارەکەی دا پەلەی کرد.

**خَبَّ النبات**: رووەکەکە بەرزبۆوەو درێژ بوو.

**خَبَّ البحرُ خَبّاً وخِباباً**: دەریا تێکیەوە هاویشتو شەپۆلەکانی توند بوون.

**خَبَّ خِبّاً**: فێڵو فەجەری کردو لەکارەکەی دا غەشی کرد ٥ دەگوترێ: (هو خِبٌّ) لەحەدیثدا هاتووە (لايدخل الجنة خِبٌّ ولاخائن) لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (ليس أمير القوم بالخِبِّ الخَدِع).

**أَخَبَّ الدابةَ**: وڵاخەکەی والێکرد لەرۆین دا خێرابێ.

**خَبَّبَهُ**: فێڵی لێ کردو توشی فەسادی کرد ٥ خوی خراپ کرد ٥ لەحەدیثدا هاتووە دەفەرموێ: (من خَبَّبَ امرأةً أو مملوكاً على مسلم فليس منا).

**إخْتَبَّ**: پەلەی کرد ٥ دەگوترێ: (اختَبَّت الدابة) وڵاغەکە خێرا رۆیی.

**اَلْخَابُّ**: دەشتێکە لەنێوان دوو تەپۆڵکە دا کەقاچکی تێدا هەبن ٥ رێگای لمبەڵان ٥ (ك: أخباب).

**اَلْخَبُّ**: پەرۆیەکی درێژکۆڵەیە وەکوو فەقیانە وایە لەپۆشاکەکە دەردەهێندرێ قۆڵو مەچەکی پێ دەبەسترێ ٥ توێکڵی درەخت ٥ شوێنی نادیارو پەناو قوژبن ٥ (ك: خبوب وأخباب) دەگوترێ: (لوب أخباب) پۆشاکێکی دڕاوو شڕە.

**اَلْخَبَّةُ**: پارچە پەرۆیەکی درێژکۆڵەیە وەکوو فەقیانە مەچەکی خۆتی پێ دەبەستی (ك: خَبَبٌ) دەگوترێ: (لوب خَبَبٌ) کراسێکی دڕاوو شڕو ونجڕ ونجڕە.

**اَلْخِبَّةُ**: بەمانا (الخَبَّةُ) دێ ٥ (ك: خَبَبٌ).

**اَلْخُبَّةُ**: ناو شیوو دۆڵ ٥ زەوییەکی مام ناوەندی نەزۆر بەپیت نەزۆر خراپو بێ خێر ٥ شوێنێکە ئاوی تێدا کۆبێتەوەو بەدەوری دا گیاو کز بڕوێ ٥ (ك: خُبَبٌ).

**اَلْخَبِیبُ**: ناوی شیوو چاڵایی یەکەی ٥ چاڵی درێژوتەسك.

**الخَبِیبَةُ**: بەمانا (الخِبَّةُ) دێ ٥ قوڵایی شیوو دۆڵ ٥ بەشێك لەگۆشت ٥ هەرپارچە گۆشتێك کۆببێتەوەو درێژبێ ٥ (ك: خبائب) دەگوترێ: (ثوب خبائب) کراسێکی شڕو وڕە.

**خَبَتَ** المکان خبتاً: زەویەکە تەخت بوو پەستێورایەوە.

**خَبَتَ ذِکرُهُ**: ناوی گوم بوو.

**أخْبَتَ**: شوێنی چاڵێ ویست ٥ هەوڵی دا بچێتە جێگای نزمایی و بەرفراون ٥ دایبەزاند ٥ خۆی بەکەم زانی و تەواضوعی نواند ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَخْبَتُوا إِلَى رَبِّهِمْ﴾.

**أخْبَتَ الیه**: دڵنیا بوو ٥ (أخْبَتَ ذِکرُهُ) بەمانا (خبت) دێ.

**اَلْخَبْتُ** من الأرض: ئەوەیە زەوییەکە نزمو بەرفراوان بێ ٥ زەوی نزمی لەبەلان ٥ دۆڵو شیوی قوڵو درێژ کەگیاو گژی تێدابێ ٥ (ك: خبوت، أخبات).

**اَلْخَبْتَةُ**: تەوازوعو خۆم بەکەم زانین.

**خَبُثَ** الشَّیئ خُبْثاً وخَبَاثَةً: شتەکە فاسیدو بێ کەڵكو خراپ بوو.

**خَبُثَ** فلان: فلان رەوشتی ناشیرینی لێ پەیدا بوو، هەڵسو کەوتی ناشیرینی کردن ٥ (هو خبیث) (ك: خُبَثاء وخُبُثٌ وخَبَثَةٌ وأخباثٌ) (وهي خَبیثَةٌ) (ك: خبائث)، قورئان دەفەرموێ: ﴿الَّتِي كَانَت تَّعْمَلُ الْخَبَائِثَ﴾.

**خَبُثَ** نفسه: دەروونی تێکچو شێوا.

**أخْبَثَ الشَّیئَ**: بەمانا (خَبُثَ) دێ.

**أخْبَثَ فلان**: فلانکەس کاری ناشیرینی ئەنجام دا ٥ هاوەڵو منداڵو کەسوکاری خراپ بوون ٥ منداڵی رەوشت ناشیرینی لێ کەوتنەوە.

**أخْبَثَ فلاناً**: فلانکەسی فێری رەوشتی ناشیرین کرد.

**أخْبَثَ فلان القولَ**: فلانکەس قسەی ناشیرینی گوتن ٥ شتی ناشیرینی پاڵ داو بەخراپی لەقەڵەم دا.

**تَخَابَثَ**: بەڕواڵەت و ظاهیری خۆی بەخراپ نیشان دا

**اِسْتَخْبَثَهُ**: بەپیسو خراپی دانا.

**الأَخْبَثَان**: میزو گو ٥ پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ: (لا یصلی أحدکم وهو یدافع الأخبثین) هیچ کامێ لەئێوە بانوێژنەکا لەکاتێکی وەهادا ئەو دووشتە پیسە تینیان بۆهێنابێ ٥ هەروا (الأخبثان) ناوە بۆ شەو بەخەبەری‌و نارەحەتی.

**خَبَاثِ**: شێوە جنێوێکە ئاڕاستەی ئافرەت دەکرێ دەگوترێ: (یاخَبَاثِ) ئەی داوێن پیس!.

**الْخَبِيثُ**: کەسێك ڕەوشتی ناشیرینی زۆربن، (صیغة موبالەغەیە).

**خُبَثُ**: بەشێوەی جنێو ئاڕاستەی پیاو دەکرێ، دەگوترێ: (یا خُبَثُ).

**اَلْخَبَثُ**: ئەوچڵك‌و ژەنگەیە کەبەهۆی ئاگرو گەرمکردنی زۆرو کوتانەوە لەئاسن دەبێتەوە ٥ لەحەدیثدا هاتووە دەفەرموێ: (ان الحُمىَّ تنفي الذنوب کما ینفي الکیر الخَبَثَ) لەرزو تا تاوان هەڵدەوەرێنێ وەکوو چۆن کورەی ئاسنگەر چڵك‌و ژەنگ لەئاسن دەکاتەوە ٥ هەروا وشەی (اَلْخَبَثُ) بەمانا پیسی دێ ٥ لەحەدیثدا هاتووە: (اذا بلغ الماء قلتین لم یحمل خَبَثاً)، (ك: أخبَاث) لەزانستی کیمیاگەری دا (خَبَثَ) بریتیە لەو چڵك‌و کەفو ژەنگ‌و خشت‌و خاڵەی کەلەکاتی ئاسن توانەوەدا سەردەکەوێ‌و دەتوانرێ جیابکرێتەوە ٥ (خَبَثُ البرکان) ئەو ئاگرو دوکەڵ‌و حیمەمەیە بورکان فڕێی دەدا.

**الخِبْثَةُ**: حەرام‌و یاساغ، دەگوترێ: (سَبْيٌ لا خِبْثَةَ فیه) ئەو ڕفێندراوە لەهۆزو خێڵێکە ناگونجێ بکرێتە کۆیلە ٥ زیناو داوێن پیسی ٥ دەگوترێ: (هو ابن خِبْثة) ئەو وەلەدی زیناو داوێن پیسی یە.

**اَلْمَخْبَثَةُ**: مەفسەدەو گەندەڵی ٥ پیس‌و پۆخەڵێ ٥ دەگوترێ: (طعام مَخْبَثَةٌ) خواردنێکی پیس‌و پۆخەڵ کەنەفس قێزی لێ بکاتەوە.

**مَخْبَثَان**: دەگوترێ:(یا مَخْبَثان!) بەئافرەتی خراپ‌و پیاوی خراپ.

**خَبْخَبَ الشَّيْئَ خَبْخَبَةً خَبْخَاباً**: کشاو شێواو تێکچوو.

**خَبْخَبَ فلان**: فلانکەس سکی شل بوو سکی چوو.

**خَبْخَبَ مِن الظهیرة**: وازی لەڕۆیشتنی نیوەڕۆژان هێناو لەسێبەردا مایەوە.

**تَخَبْخَبَ**: بەمانا (خَبْخَبَ) دێ ٥ (تَخَبْخَبَ بَدَنُهُ) جەستەی دوای قەڵەوی لاواز بوو (تَخَبْخَبَ الحرُّ) گەرما دوای تەوژمی بێ هێزبوو.

خَبَرَت الناقةُ خبوراً: حوشترەکە شیری زۆربوو.

خَبَرَ الشَّيْءَ خُبْراً وخُبْرَةً ومَخْبَرَةً: شتەکەی بەتاقی کردەوە لەبۆتەی دا ٥ هەواڵەکەی لەسەر حەقیقەتی خۆی زانی ٥ دەگوترێ:(لأخْبَرَنَّ خُبْرَك): بێگومان هەرچی زانیاری تۆهەیە من دەیزانم‌و پێت دەڵێم.

خَبَّرَ الطعامَ: خواردنەکەی چەور کرد.

خَبَّرَ الأرضَ: زەوییەکەی کێڵا.

خَبِرَت الأرضُ: زەوییەکە گڵێ زۆر بوو ٥ دەگوترێ:(خَبِرَ المكان) ئەوشوێنە گڵی زۆر بوو.

خَبِرَ الشَّيْءَ: شتەکەی زانی، هەواڵ‌و کرۆکی شتەکەی زانی.

خَبُرَت الناقةُ خبوراً: حوشترەکە شیری زۆربوو.

خَبُرَ الرجلُ: پیاوەکە بوو بەپسپۆڕ.

خَبُرَ الأمرَ خُبْراً وخُبْرَةً: لەئیشەکەی کۆڵییەوەو سەروناوی کرد.

أَخْبَرَهُ بكذا: هەواڵی دایە.

اخْبَرَ الناقةَ: حوشترەکەی بەشیر زۆری دەست کەوت.

خابَرَهُ: کشتوکاڵی بەشێوەی موخابەرەکرد ٥ هەواڵەکانیان ئاڵ‌و گۆڕکردو رووداوەکانیان بۆیەکتر باس کرد.

خَبَّرَهُ بكذا: هەواڵی بەو ڕوداوە پێدا.

اخْتَبَرَ الشَّيْءَ: شتەکەی بەتاقی کردەوە.

تَخَبَّرَ القومُ خُبْرَةً (شاةً): خەڵکەکە مەڕێکیان کڕی‌و سەریان بڕی‌و گۆشتەکەیان دابەش کرد.

تَخَبَّرَ الخَبَرَ: دەربارەی هەواڵەکە پرسیاری لێ کرد.

تَخَبَّرَ الشَّيْءَ: شتەکەی وەکوو حەقیقەتی خۆی ناسی ٥ لەحەدیثدا دەربارەی حودەیبیەدا هاتووە دەفەرموێ: (أنه بعث عيناً من خزاعة يَتَخَبَّرَلَه خَبَرَ قريش).

اِسْتَخْبَرَهُ: پرسیاری لێ کرد دەربارەی هەواڵەکەو داوای لێ کرد بۆی باس بکا ٥ دەشگوترێ (اسْتَخْبَرَ الخَبَرَ).

الأخباري: مێژوو نووس ٥ ئەوکەسەی ڕوداوەکانی ڕابردوو دەگێڕێتەوەو دەنووسێتەوە.

الخابور: ڕوەکێکە گوڵێکی زەردی جوانی هەیە، بۆنی خۆشە.

اَلْخَبَارُ: گڵی زۆر کەبە ڕەگ‌و بنکی درەختەوە دەبێ.

اَلْخَبَار من الأرض: ئەو زەوییەی نەرمەڵان بێ‌و قاچی وڵاخی تێ بچەقێ ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە (من تجنب الخبار أمن العثار).

اَلْخَبَرُ: ئەوەی دەگێڕدرێتەوە یان دەنووسرێتەوە ٥ هەواڵێکە خۆی لەخۆی دا وێدەچێ راست بێ وێدەچێ درۆبێ ٥ (ك: أخبار وأخابیر).

اَلْخِبْرُ: کشتو کاڵ کردن بەشێوەی موخابەرە ٥ حوشتری بەشیر.

الخَبْرُ: دڵۆپە ئاوو تکەی ئاو لەشاخو کەژدا ٥ کشتو کاڵ ٥ درەختی سیدرو دار سیواكو ئەو گیاوگژەی کەبەدەوریدا رواوە.

اَلْخَبْراءُ: دەشتێك کە درەختی سیدرو ئەراکی لێ بڕوێ.

اَلْخُبْرَةُ: ئەوشتەی پێشکەشی میوان دەکرێ لەپسکیتو چاو ئاوو شتی وەها ٥ بەشە خۆراك کە ئادەمیزاد وەری دەگری ٥ ئەوەی ئادەمیزاد دەیکڕێ بۆماڵو منداڵی ٥ خواردەمەنیەکە رێبوار لەگەڵ خۆی هەڵی دەگرێ (واتە تێشوو) ٥ تێکوشراوی زۆرو چەور ٥ پێخۆر ٥ مەڕێك کۆمەڵێك بیکڕنو سەری بڕنو گۆشتەکەی بەگوێرەی ئەوپارەی داویانە لەناو خۆیان دا بەشی بکەن.

الخُبُورُ: ئەو هەواڵەی لاتەو ئاگات لێیە، دەگوترێ:(اَخبَرَ خُبُورَةً) ئەو هەواڵەی لای بووو پێی راگەیاند ٥ لەپەنددا هاتووە (اخبرتە خُبُوری وشتوری وقفوری).

الخبیر: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا، واتە ئاگاداری هەموو شتێك لەوەی بوومو لەوەی دەبێ ٥ لێزانو ئەهلی کار ٥ ئاگاداری شت بەهۆی زانایی تایبەتی خۆیەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَاسْأَلْ بِهِ خَبِيرًا﴾

اَلْمُخَبِّرُ: هەواڵدەر، جوتیار، گیاوگژ، کوڵكو موو، کەفی دەمی حوشتر.

اَلْخَبِيَةُ: مەڕێك کۆمەڵێك بیکڕنو سەری بڕنو گۆشتەکەی لەنێو خۆیان دا دابەش بکەن هەرکەسە بەگوێرەی پارەی خۆی ٥ خوری چاكو پەسەند.

المخابرة: ئەوەیە خاوەن زەوی زەوییەکەی دەدا بەسەپانێك زەوییەکە بکاتە کشتو کاڵو بەشێکی دیاریکراو وەکوو سێیەكو چواریەك بۆخاوەن زەویو ئەوی تری بۆ سەپانەکە بێ.

اَلْمِخْبَارُ: ئامێرێکی تاقیکردنەوەیە، بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی بەکاری دەهێنن.

اَلْمَخْبَرُ: پێچەوانەی دیمەنە، دەگوترێ:(طابَقَ مَخبَرُهُ مَنظَرُهُ).

اَلْمُخْبِرُ: هەواڵ نێری رۆژنامەو ئاژانسەکانی دەنگو باس ٥

ئاسایش‌و چاودێر بۆ سەلامەتی ولآتو گەل.

**اَلْمَخْبَرَانِيّ**: کەسێکە بەباشەو چاکە ناوی بلآوبێتەوە.

**المَخْبَرَةُ**: بەمانا (اَلْمَخْبَرُ) دێ.

**اَلْمِخْبَرَةُ**: ئامێرێکە بۆ بەتاقی کردنەوەی شوحنەی کارەبا بەکاردەهێندرێ.

**اَلْمُخْتَبَرُ**: تاقیگە، ئەوشوێنەی ئەزمونەزانستیەکانی تێدا ئەنجام دەدرێ.

**خَبَزَ اَلْخُبْزَ خَبْزاً**: نانی کرد.

**خَبَزَ القومَ**: نانی دەرخواردی خەڵکەکەدا.

**خَبَزَ البعيرُ الأرضَ**: حوشترەکە خێراخێرا قاچی بەزەوی دەکێشا، پێ کوڵی کرد.

**خَبَزَ فُلَانٌ الشيئ**: فلآن بەدەست لەوشتەی دا لێدانێکی توند.

**خَبَزَ فلان الدابَّةَ**: فلآنکەس ولآخەکەی بەتوندی لێ خوڕی.

**خَبِزَ خَبَزاً**: گوشتی شل بوو تەندروستی تێك چوو.

**اِخْتَبَزَ الخُبْزَ**: نانی کرد.

**اِنْخَبَزَ المكانُ**: شوێنەکە نرم بوو.

**تَخَبُّزٌ**: بەقاچی لێی دا بەر پێلەقەی دا.

**الخابِزُ**: نانەوا، نان فرۆش.

**الخَبازى**: رودکێکە لەپێری (الخُبازية) جۆرێکی گەلآکەی دەکوڵێندرێو دەخورێ.

**الخِبازَة**: پیشەی نانەوایی.

**الخَبّازُ**: نانکەر، نانەوا.

**الخُبّازُ**: روەکی خوبازی

**الخُبازِيُّ**: (کەلەبواری رەسمەو رەنگ دا هات) ئەوە مەبەست رەنگی روەکی خوبازێیە.

**الخبازيات**: زاراوەیەکی زانستی ڕووەك ناسییە.

**الخُبْزُ**: نانو کولێرەو لەواشەو خەپلە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنِّي أَرَانِي أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزًا﴾.

**الخَبِيزُ**: بەمانا (اَلْخُبْزُ) دێ.

**اَلْمَخْبِزُ**: شوێنی نانکردن، نانەوەخانە (فرن) ٥ (ك: مَخَابِز).

**خَبَسَ الشيئَ خبساً**: شتەکەی گرت، هەڵیگرت، بووبەدەسکەوتی.

**خَبَسَ فلاناً حَقَّهُ أو مالَه**: ستەمی لەفلآن کردو بەناڕەوا ماڵەکەی برد ٥ (هو خابس و خباس وخبوس).

**اِخْتَبَسَ الشيئ**: بەمانا (خَبَسَهُ) دێ.

**اِخْتَبَسَ فلاناً حَقَّهُ**: مافی فلآنی داگیرکردو ماڵەکەی برد.

**تَخَبَّسَ الشيئ**: بەمانا (اِخْتَبَسَهُ) دێ.

**الخُباساءُ**: دەسکەوتو ماڵی تالآنی.

**الخُباسة**: بەمانا (الخباساء) دێ.

**خَبَشَهُ خَبْشاً**: کۆی کردەوە ٥ لەملاوئەولا

هێنای و گردی كردموه بەدەستی هێنا ٥ (هو خابش وخبّاش).

**تَخَبَّشَهُ:** بەمانا (خَبَشَهُ) دێ.

**الْخُبَاشَةُ:** ئەوخۆراك و شتانەیە كۆدەكرێتەوە ٥ كۆمەڵێكی پێكهاتە لەچەند هۆزو نەتەوەیەكی جیاجیا.

**خَبَصَهُ خَبْصاً:** تێكەڵاوی كرد، تێكی هەڵدا (هو مخبوص وخبیص).

**خَبَّصَ الخَبیصَ:** حەڵوای دروست كرد.

**اخْتَبَصَ:** كردی بەحەڵوا، حەڵوای خوارد.

**اخْتَبَصَ الضَّیْفُ:** میوانەكە داوای حەڵوای كرد.

**تَخَبَّصَ:** كردی بەحەڵوا.

**اَلْخَبِیصُ:** حەڵوای دروستكراو لەدۆشاوی خورماو رۆن.

**الخَبِیصَةُ:** پارچە حەڵوایەك.

**المِخْبَصَةُ:** ئەوقاپەی حەڵواكەی تێدا تێك هەڵدەدرێ، (ك: مخابص).

**خَبَطَ خَبْطاً:** چۆنی بۆلوا راكشاو نوست، گوێی بەوەندەدا ئاخۆ شوێنەكە گونجاوە یان نا.

**خَبَطَ علی الباب:** لەدەرگای دا ٥ (خَبَطَ الشیئَ) بەتوندی پێلەقەی بەشتەكەدا دا.

**خَبَطَ فلاناً:** بەتوندی لەفلانی دا.

**خَبَطَ اللیلَ:** بەنەشارەزایی بەشەو رۆیشت، ملی رێگای گرتەبەر ٥ دەگوترێ:(فلان یخبط في عمیاء، وفلان یخبط خَبَطَ عشواء): واتە هەرچی دەیكا بەنەزانی پری دەداتێ.

**خَبَطَ فلاناً:** بەبێ ئەوەی بیناسێ، خزمایەتی و كەسایەتیان بەسەریەكەوە هەبێ داوای پیاوەتی لەفلان كرد.

**خَبَطَ فیهم بخیر:** سودی پێگەیاند.

**خَبَطَ الشیطان فلاناً:** شەیتان دەستی لەفلان وەشاند ٥ توشی شێتی و فێ وپەركەمی كرد.

**خَبَطَ البعیرَ:** بەداخ حوشترەكەی نیشانەكرد.

**خَبَطَ القَومَ بسیفه:** بەشمشێر كەوتە وێزەی ئەوخەڵكە.

**خَبَطَ الشجرةَ:** لەدرەختەكەی دا بۆئەوەی گەڵاكەی هەڵوەرێ.

**خُبِطَ فلان:** فلان توشی نەخۆشی بوو، هەڵامەتی گرت.

**اختَبَطَت البلاد:** فیتنەوناشوب كەوتە ناو وڵاتەوە.

**اِخْتَبَطَ الشجرةَ:** بەمانا (خَبَطَها) دێ ٥ لەحەدیثەكەی عومەردا هاتووە دەفەرموێ: (لقد رأیتنی بهذا الجبل احتطِبُ مرة وأختبطُ أخری).

**اختَبَطَ فلاناً:** بەبێ ناسیاوی و هەبوونی

پەیوەندییــــەك داوای چــــاكەو دالْدەدانی لەفلاّن كرد.

**تَخَبَّطَت البلاد**: فیتنەو ئاشووب كەوتە ولاّتەوە، ولاّت شێوا.

**تَخَبَّطَ الشيءَ**: شتەكەی زێرپێدا.

**تَخَبَّطَ الشيطانُ فلاناً**: شەیتان دەستی لەفلاّن وەشاند شێتی كرد

**اَلْخَابِطُ**: سەر سوڕانو گێژی ٥ هەروا بەمانا حوشتریش دێ دەگوتری: (ماله خابط ولا ناطح) نەحوشتری هەیە نەڕەشە ولاّخ.

**الخَبَاطُ**: تەپو تۆز.

**الخِبَاطُ**: داخو نیشانە لەسەردەمو چاو ٥ داخ لەسەر ڕان.

**الخُبَاطُ**: فێو پەركەم ٥ هەلاّمەت.

**الخَبَّاطُ**: بێچوی ماسی كەنعەد (جۆرە ماسییەكە).

**الخَبَطُ**: ئەوگەلاّو گۆلەی لەدرەخت دەكەوێتە خوارەوە.

**الخِبْطُ**: ئاوێكی كەم كەلەبنكی حەوزدا دەمێنێتەوە.

**الخَبْطَةُ**: چاوگە یەكجار دەگمێنێ ٥ هەلاّمەت ٥ جۆر جۆرەی ئاو كەلە زلكاوو چالاّیی دا مابێتەوە یان لەبنكی بەرمیلو شتی وادا ٥ شتی كەم ٥ بارانی بەرفراوانو فەترمورد.

**الخِبْطَةُ**: چاوگی شێوازە ٥ (مصدر الهيئة) ٥ ئاوی كەم كەلەچالاّیی یان بنكی بەرمیلو شتی وادا بمێنێتەوە ٥ شتی كەم ٥ شتی كەم لەهەرشتێك بێ ٥ كۆمەلْ، تاقم ٥ دەگوترێ:(جاءوا خِبطة خِبْطةً) تاقم تاقم هاتن.

**اَلْخُبطَةُ**: باقی ماندەی ئاو لەچالاّیی یان بنكی بەرمیلو شتی وادا.

**الخُبُوطُ**: پێ بەزەوی دادان ٥ دەگوترێ: (فرس خبوط) ئەسپێكی پێكولْ كەرە ٥ (حاكم خبوط) دادوەرێكی ستەمكارە.

**اَلْخَبِيطُ**: شیر پێش ئەوەی بكرێ بەماست، كە هەوێنی تێ بكرێ بۆ ئەوەی ببێتە ماست ٥ حەوزێك ئەسپ پێكولّی لەسەر لێوارەكەی كردبێو تێكی ڕوخاندبێ ٥ حەوزی بچوك ٥ ئاوی كەم لە چالاّییو بنكی حەوزدا بمێنێتەوە.

**المِخْبَطُ**: ئەو شتەی گەلاّی پێ دەوەرێنن (ك: مَخَابِطَ).

**اَلْمَخْبَطَةُ**: بەمانا (اَلْمِخبَط) دێ.

**خَبَعَ الصَّبِيّ خُبُوعاً**: مندالّەكە هەناسەی لێ بڕا ٥ هیند گریا هەنسكی هەلْدان.

**خَبَعَ بالمكان خَبْعاً**: لەو شوێنە مایەوە.

**خَبَعَ في المكان**: چووە ناو ئەو شوێنە.

**خَبَعَ الشَّيءَ**: شتەكەی شاردەوە.

**اَلْخُبَعَةُ**: پارچەیەك لۆكە ٥ دەگوترێ:

(امـرأة خبعـه طلعـة) ئافرەتێـكە سەرتاسكەدەكا خـۆ نیشان خەڵـكی دەداو خۆدەشێرێتەوە.

**خَبَقَ** فلانـاً خَبْقـاً: فلانـی لەپێش چاوی خۆی پچوك كردەوە؟

**تَخَبَّقَ**: بەرز بووە.

**اَلْخَبْقَةُ**: زەوی پانو بۆڕ.

**الخَبيقُ**: درێژ (جا ج بۆ ئادەمیزاد یان گیانلەبەری تر بەكاربێ) باز هاوێژو هەنگاو پانو درێژو خۆشڕەو.

**الخِبِّقَـى**: رۆیـشتنی خێـرا ٥ ئـاژەڵی خۆشـــڕەو ٥ هــــەنگاو درێـــژو پان ٥ دەگوترێ: (هو يمشي الخِبِّقى).

**اَلْخِبِقَّاءُ**: ئافرەتی بەدڕەوشت.

**اَلْخِبِقَّةُ**: ئاژەڵی خۆشڕەو ٥ گیانلەبەری باز هاوێـژ ٥ گیانلەبـەری كـورت ج نێر ج مێ.

**خَبَـلَ**: كەمتەرخـەمیكرد ٥ دەگـوترێ: (خَبَلَ عـن فعـل أبيـه) لـە ئیشەكەی بـاوكی دا كــەمو كــورتی هێنـــا، نەیتوانی وەكوو ئەو بكا.

**خَبَـلَ** الانـسانَ أو الحيـوانَ: ئەندامێـكی ئادەمیزادەكە، یان هی حەیوانەكەی لەكار خست.

**خَبَـــلَ** فلانـــاً: فلانكەســـی شـــێتو شـــــەیداكرد ٥ عـــــــەقڵی برد ٥ دەگوترێ: (خَبَلَهُ الحزن والحب والدهر والشيطان).

**خَبَلَ** فلانـاً عـن كـذا: فلانكەسـی لـەوكارە مەنع كرد.

**خَبِلَ** خَبَلاً وخبـالاً: شـێتی كـرد ٥ عـەقڵو هۆشی برد ٥ ئەندامێكی جەستەی لەكار خست، بڕیەوە.

**خَبِلَتْ يَدُهُ**: دەستی توشی شـەلەل بـوو (هو خَبِلٌ وَأخبَلُ) (وهي خَبْلاء) (ك: خَبِلٌ).

**أخـبَلَهُ**: حوشترێـكی دایـە بـۆ ئـەوەی سودی لێ وەربگرێ.

**خَبَّلَهُ**: بەمانا (خَبَلَهُ) دێ.

**اختَبَلَ**: بەمانا (خَبِلَ) دێ.

**اختَبَلَ الدابَّةُ**: وڵاخەكە لەشوێنی خۆی نەیتوانی بوەستێ.

**اختَبَلَ فلاناً**: فلانكەسی شێت كرد.

**أُختُبِلَ**: شێت بوو.

**تَخَبَّلَ**: بەمانا (خَبِلَ) دێ.

**اسْتَخْبَلَهُ ناقةً**: حوشترێكی بەئەمانەت لێ وەرگرت.

**الخابلان**: شەوو رۆژ.

**الخَبـالُ**: كـەمو كـوڕی ٥ تێـدا چـونو فەوتان ٥ ژەهـری كوشـندە ٥ كێمو زوخاوی دۆزەخییان ٥ لـە حـەدیثی پێغەمبـەردا (د.خ) هـاتووە: (مـن شرب الخَمْرَ سقاه الله من طينة الخبال) هـەروا بـەمانا (كـوڵو مانـدو بونو خێزانداری دێ.

**الخَبْـلُ**: بـڕین ٥ فیتنـەو ئاشـوب لـە

حەدیثدا هاتووە دەفەرموێ: (بین یدی الساعة خبل) ٥ هەروا بەمانا قـــەزرکردنو خواستـــن دێ ٥ دەگوترێ: (وقع في خَبْلِه) سەرگەردان بوو ماتو حەیران کەوت ٥ لەزاراوەی زانستی عروزدا لابردنی (س و ت) لە (مُسْتَفْعِلن)دا هەروا لابردنی (ف)و (و) لە (مفعولات)دا.

**الخُبْلُ**: نەمانو تێکچونی عەقڵ ٥ سەر لێ شێوانو سەرگەردانی.

**اَلْخَبَلُ**: ئادەمیزاد ٥ جندۆکە ٥ برین ٥ مەشکەو کوندە ٥ کوندەی پڕ ئاو ٥ باڵندەیەك شەو بخوێنێ ، وەکوو کوندەبوو.

**اَلْخُبْلَةُ**: نەمانو تێکچونی ئەندامێك یان نەمانی عەقڵو هۆش.

**الخُبولُ**: بەمانا (اَلْخَبْلَةُ) دێ.

**خَبَنَ**: وێـــکی هێنایەوەو دروی ٥ دەگوترێ: (خَبَنَ الثوبَ خَبْناً وخُباناً) لوێکی قوماشەکەی نوشتاندەوەو دروی.

**خَبَنَ الشَّئَ**: شتەکەی شاردەوە ٥ بەری دایەوە.

**خَبَنَ الطعامَ**: خۆراکەکەی هەڵگرت بۆ کاتی قاتو قڕی.

**اَخْبَنَ**: لەژێر دەرپێکەیدا شتی شاردەوە.

**الخَبْنُ**: لە عیلمی عەروزدا بریتییە لە لابردنی پیتی دووەم کە بزوێنی نەبێ لە تەفعیلەدا.

**اَلْخُبْنَةُ**: لە کراسو دەرپێ بەو بەشەیان دەگوترێ بەسەر یەکدا هێندرابێتەوەو دوورابێ ٥ هەروا ئەو شتەی ئادەمیزاد لەکۆشی دا یان لە بنهەنگڵی دا هەڵی گرێ ٥ تورەکە یان قاپێکە شتی تێ دەکرێو هەڵدەگیرێ، لەکۆڵ دەدرێ.

**الْخُبُنُ**: بۆ پیاو بەکەسێك دەگوترێ تێکسمراوو کوڵەبنە بێ.

**خَبَتِ النار خَبْواً وخُبُواً**: ئاگرەکە دامرکاو بڵێسەی نەما ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿مَّأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا﴾.

**خَبَتَ الحربُ**: شەڕ کوژایەوە ٥ دەگوترێ: (خبا لَهَبُهُ) کڵپەی رقو قاری دامرکایەوە.

**اَخْبَى**: رەشماڵی دروست کرد.

**اَخْبَى خِبَاءً**: رەشماڵی دروستکردو هەڵی دا.

**اَخْبَى الكِسَاءَ**: قوماشەکەی کرد بە خێمەو رەشماڵ.

**اَخْبَى النارَ**: ئاگرەکەی کوژاندەوە.

**خَبَّى خباءً وكساءً**: رەشماڵی دروست کرد.

**استَخْبَىَ خِباءً**: رەشماڵی هەڵداو چووە ناوی.
**خَتَأَه خَتْـأ**: مـەنعی كـرد ٥ گێڕایـەوەو نەیهێشت.
**اخـــتَتَأ**: چەوســـایەوە ٥ زەلیـــل بوو ٥ لەترسی شتێك ڕەنگی گۆڕا.
**اِخْـتَتَأ لفـلان**: خـۆی لـەفلان شـاردەوە لەترسـا یـان لـە شـەرما نەیویـست فلان كەس ببینێ.
**اخْتَتَأ الشَيْءَ**: شتەكەی ڕفاند.
**اَلْمُخْـتَتِئَةُ**: دورو درێـژ ٥ دەگـوترێ: (مفَـازة مُخْـتَتِئَةٌ) سـارایەكی دورو درێژە ، دەنگێـكی تێدا نابیـسترێو ڕێبازێـكی دەرەتـانو فوتـار بـوونی تێدا بەدی ناكرێ.
**خَتَّ خَتّاً**: خوێری بوو ، بەدرەوشت بوو.
**خَـتَّ فلانـاً خَتّـاً**: بـەرمب لـەفلانی دا ، لێكدان لێكدان بەرمب لێی دا.
**خَتَّ خَتَتاً**: جەستەی تێكچوو.
**أخَتَّ**: گەردنكەچ بوو ، كەناوی باوكیان هێنا شەرمی بەخۆی داهات.
**أخَتَّ القولُ فلانـاً**: قـسەكەی فلانكەسـی خەجاڵـەت كـرد نەزیـەتی داو بـێ دەنگی كرد.
**أخَـتَّ حـظَ فـلان**: بەشـی فلانكەسـی پـوچ كرد.
**خَتَرَتْ نَفْسُهُ خَتْراً وختوراً**: نـەفسی خـۆی هیچو پوچ كرد.

**خَتَـرَ فلانـاً**: سـتەمی لـەفلان كـەس كـرد ستەمێـــكی زۆر ٥ لەحـــەدیـــثدا هـاتووە دەفـەرموێ: (مـا خـتر قـوم بالعهـــــد الا سُـــــلِطَ علـــــیهم العَدُوّ) ٥ دەگـوترێ: (هو خاتر وختير وختـور وختّـار وخِـتيرٌ) لەقورئانـدا هاتووە: ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ﴾.
**خَتِرَ خَتَـراً**: جەسـتەی خـاوو خلیـچك بـوو بێهێـزو لاواز بـوو، جـا یـان بـەهۆی نەخۆشی یان مـەی خواردنـەوە یان دەرمان.
**خَثَّرَهُ الـشرابُ وغـيره**: شـەرابەكە بـاری تەندورستی شێواندو لەپـەلو پۆی خست.
**تَخَتَّـــرَ**: جەســـتەی تێكـــچو خـــاو بۆوە ٥ تەمبەڵو لاواز بوو ٥ زیهنی شـــێوا شـــتی تێـــكەڵو پێـــكەڵ كـرد ٥ بەشـێوەی تەمبـەڵو بێهێـز كەوتە ڕۆیشتن.
**خَتَعَ خَتعاً وختوعاً**: هەڵات.
**خَتَـعَ في الأرض**: ڕۆیـشتو لـەولات دوور كەوتەوە.
**خَتَـعَ علـى القـوم**: هێرشـی كـردە سەر خەڵـــكەكە ٥ بەمەبەســـتەوە بەتاریكی شەو كەوتەڕێ.
**اَلخَتَـعَ في الأرض**: بـەمانا (خَتَـعَ) دێ.

**اَلْخَتِعُ**: ئەو شارەزاو چاوساغەیە کە هەرگیز لەرێگاو رۆیشتندا دانامێنیٚو رێگای لیٚ هەڵە نابیٚ.

**الْخُتَعُ**: بەمانا (اَلْخَتِعُ) دیٚ.

**اَلْخُتَعَةُ**: بەمانا (اَلْخَتِعُ) دیٚ.

**اَلْخَتِيعُ**: بەلاو کارەسات.

**اَلْخَتِعَــةُ**: پێستۆکێکە تیر هاویژ لەپەنجەی دەکا لەکاتی تیر هاویشتندا.

**الْخَوْتَــعُ**: بەمانا (الخَتِـعُ) دیٚ ٥ بێچوی کەروێشك ٥ جۆرێکە لە مێشی گەورە مێشە سەگی پیٚ دەگوتریٚ.

**الْخَوْتَعَةُ**: پیاوی کورتە بالا.

**خَتْعَرَ**: پوچایەوە ٥ توایەوە.

**اَلْخَيْتَعُورُ**: هەرشتێك گۆڕانی بەسەردا بیٚو زوو بپوکێتەوەو لەسەر شێوازێك بەردەوام نەبیٚ ٥ تراویلکەیەك زوو زوو بپوکێتەوە ٥ جیهان بەو مانایە کە زوو زوو چەرخو دەورەکانی دەگۆڕێن ٥ شتێکی تەنك وەکوو تەونی جاڵجاڵۆکە وایە لەکاتی گەرمادا رایەڵەکانی دەبینریٚن پێی دەڵێن لیکی خۆر: (لعاب الشمس) ٥ هەروا بەدەعبایەکی بچوکی رەش دەگوتریٚ لەسەر روی ئاو دەبینریٚو هەمیشە وەکوو کێچ هەڵبەزو دابەز دەکاو دانامەکنیٚ ٥ هەروا ناوە بۆ گورگ، لەبەرەوە کە زۆر بێوەفایە ٥ ناوێکیشە بۆ غولی بیابان ٥ دەشگوتریٚ: (امرأة خيتعور) ئافرەتێکە خۆشەویستی بەردەوام نییە ٥ ستەمکار ٥ بەلاو کارەسات.

**خَتَلَهُ خَتلاً وخَتَلاناً**: فێڵی لیٚ کردو بەبیٚ ئاگایی لەخشتەی برد ٥ دەگوتریٚ: (ختلــه في الحــرب) لەشەڕا فێڵی لێکردو لەشوێنێکەوە هێرشی بۆ کرد چاوەڕوان نەدەکرا لەوێوە پەلامار بدا ٥ (هو خاتِلٌ وختول وختّال).

**خَاتَلَــهُ**: بەمانا (خَتَلَــهُ) دیٚ ٥ فێڵی لێکردو چاووراوی کرد.

**اخْتَتَلَ**: گوێی هەڵخست گوێی کلۆرکرد بۆ ئەوەی قسەی خەڵکی تر ببیستیٚ.

**تَخَاتَلوا**: فێڵیان لەیەکتر کرد.

**اَلْخَتِــلُ**: ئەو شوێنەی پیلانی تێدا دادەڕێژریٚ ٥ کونە کەروێشك.

**الخَوْتَــلُ مــن الرجــال**: ئەو کەسەیە عاقڵمەندو زەریف بیٚ.

**خَتَمَ النحلُ خَتماً وختاماً**: هەنگەکە شانە هەنگوێنەکانی پڕکرد لە هەنگوین.

**خَتَمَ على الطعام والشراب**: سەری قاپو مەنجەڵو زەرفو تورەکەی

خۆراكەكەی بەستو داپۆشێ بۆ ئەوەی پیس نەبێ‌و شتی تێ نەچێ ٥ یان بەقورو مێوو ئەو جۆره شتانه زارکی قاپوو دیزەو زەرفی خواردنەکەی سواغ داو گرتی ٥ بۆ ئەوەی هیچی تێنەچێ‌و هیچی لێ دەرنەیە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿یُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ﴾.

خَتَمَ علی فمه: قسەی لێ قەدەغەکرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ﴾.

خَتَمَ علی قلبه: وای لێ کرد لەشت تێنەگا.

خَتَمَ الشَّيْءَ وعليه: شتەکەی چاپ کرد ٥ مۆری کرد ئیمزای کرد ٥ دەگوترێ: (ختم الكتابَ ونحوه) کیتابەکەی ئیمزا کرد، مۆری کرد ٥ کیتابەکەی تەواو کردو هەمووی خوێندەوە.

خَتَمَ بابه علی فلان: روی لەفلانکەس وەرگێراو پشتی تێکرد.

خَتَمَ الزَّرْعَ وعليه: دوای کێلان‌و تۆو کردن یەکەمجار گشتوکاڵەکەی ئاودا.

خَتَّمَهُ: شتەکەی مۆر کرد، لۆکی کرد، ئیمزای کرد.

خَتَّمَ صاحِبَهُ: ئەنگوستیلەی لەقامکی هاوەڵەکەی کرد.

اخْتَتَمَ الشَّيْءَ: شتەکەی تەواو کرد.

تَخَتَّمَ: ئەنگوستیلەی لەقامك کرد ٥ دەگوترێ: (تَخَتَّمَ به).

تَخَتَّمَ بعمامته: مێزەرەکەی خۆی کرد بە پەردەو لەمپەر.

تَخَتَّمَ بأمره: کارەکەی ئەوی شاردەوە.

تَخَتَّمَ عن الشَّيْءَ: خۆی لە شتەکە غافڵکردو لێی بێدەنگ بوو.

الخاتَامُ: ئەو شتەی مۆری پێ دەکەی ٥ ئەڵقەیەکە دەکرێتە پەنجەوە ٥ (ك: خواتيم)٥.

الخاتَمُ: بەمانا (الخاتام) دێ ٥ کچێتی‌و دەست لێنەدراوی، دەگوترێ: (زفت اليه بخَاتِمِها) ٥ گرێیەکە لە پشتی مل ٥ دەگوترێ: (احتجم فلان في خاتم القفا) ٥ تاڵەمووی سپی لەقاچی ئەسپدا دیار دەکەوێ ٥ هەروا وشەی (خاتم) بەکۆتایی‌و دواییی شت دەگوترێ، قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَـكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ﴾.

الخاتِمَةُ من کل شيئ: سەرەنجام‌و کۆتایی شتەکە.

الخاتيام: بەمانا (الخاتامُ) دێ.

الخِتامُ: قور یا مێو کەدەمی کوڵەسە هەنگی پێ دەگیرێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿خِتَامُهُ مِسْكٌ﴾ ٥ کچێتی ٥ دەستەگوڵ‌و

سەرەتای شت ٥ دەگوترێ: (زفت الیه بختامها) ٥ هەروا بەمانا سەرەتاو کۆتایی شت دێ.

**اَلْخَـــتْمُ**: شـــوێنی مـــۆر ٥ شـــوێنکەی مۆر ٥ دەمەکوڵەسی هەنگ ٥ زارکی کوڵەسی میشە هەنگوین.

**اَلْخَـــتَمُ**: بـەمانا (الخاتـــام) دێ ٥ بـــەمانا ســـــەرمۆردێ ٥ لـــۆککراو ســــەر قەباتکراو.

**اَلْخِیْتامُ**: بـەمانا (الخاتـام) دێ ٥ بـەمانا نۆبەرەو تازە پەیدابوو دێ ٥ بەمانا کچێتی دێ ٥ دەگوترێ: (زفّت الیه بخَیْتامها).

**اَلْمُخَتَّمُ مِن الخیل**: ئەو ئەسپەیە نێوان سمیو زەنگی مووەکانی سپیبن.

**اَلْمَخْتُومُ**: پێوەر وەکوو قسناغو ربەو تەنەکەو تەغارو عەربە.

**خَـــتَنَ** خُتونـــاً وختونـــةً: هاوســـەرگیری ئەنجامدا ٥ ژنی هێنا.

**خَـــتَنَ** الـصَّبِیَ خَتْنـاً وخِتانـاً: منداڵەکـەی خەتەنەکرد.

**خاتَنَ فُلاناً**: ژنی بۆ فلان هێنا.

**اِخْتَتَنَ الصَّبِیُّ**: منداڵەکە خەتەنەکرا.

**الخِتــانُ**: ئـەو شـوێنەی لـەهینی نێـرو وانێـــــکی مێینـــــە دەبـــــڕدرێ ٥ دەگوترێ: (بـرِئ ختانُـهُ) شوێنی خەتەنە کردنەکەی منداڵەکە چاك بۆتــەوە ٥ هــەروا بــە ئاهــەنگی خەتەنە سورانیش دەگوترێ:

**الخِتانَةُ**: پیشەی خەتەنە سوران.

**اَلْخَتَنُ**: باوكو برای خێزان ٥ مێردی کچ مێـردی خوشـك واتـە: زاوا ٥ بۆیـە لەحـەدیـثدا هـاتووە: (علـي خَـتَنُ رســــــول الله): عـــــەلی زاوای پێغەمبەرە ٥ (ك: أختان)ە.

**خَتاخَتـْواً**: ترساو دڵشکاو بـوو بەهۆی نەخۆشیو خەمو خەفەتەوە.

**خَتا** اللیلُ: تاریکایی شەوەکە زۆر پـەرەی سەند.

**خَتـا** العقـابُ وغـیره: هەڵۆکـە یـان هـەر باڵندەیەکی تر کەوت.

**خَتَا** فلاناً عن الأمـر: فلانکەسـی لەکارەکە مەنع کرد.

**خَتَا** الثوبَ: پرژی قوماشەکەی بادا، لولی دا.

**أخْـــتی**: کاڵاکـــانی یـــەك لەدوایـــەك فرۆشت.

**إخْتَتی**: بەمانا (ختا) هاتووە.

**اَلْخَتْـيُ**: زەبرەلێـدانی زۆرو یـەك لـەدو یەك.

**خَثَّـهُ**: کـۆی کـردەوە ٥ پینـەی کـردو چاکی کردەوە.

**اَلْخُثُّ**: کەفو خشتوخاکی لافاو پاش نیـــــشتنەوەی لافاوەکـــــەو وشـکبوونەوەی ٥ (ك: أخثـــاث)ە.

اَلْخثْــةُ: گورزەیــەك لەشــوڕكی شــكاوە ئــاگری پــێ گوێزراوەتــەوە (دەســتە چیلە).

اَلْخثْــةُ: بەمانا (اَلْخثْلَةُ) دێ.

خَثَرَ اللبنُ ونحوه: (خثراً وخثوراً وخثَرَاناً): شیرەكە مەیی‌و توندبوو.

خَثَرَ نفسُهُ: دەرونی شكاو رەنجا ٥ باری دەروونی تێك شكا.

خَثُرَ فلان: فلانكەس هەستی بەبێ تاقەتیكردو تەندورستی تێكچوو ٥ دەگوترێ: (خاثر النفس خاثر العظام).

خَثُرَ اللَّبنُ ونحوه والنّفسُ خثارةً وخثورةً: شیرەكە مەیی ، بزركاو توند بوو ٥ دەگوترێ: (هو خثير النفس)، (ك: خثراء) (وخثرى).

أخثَرَ فلان: بەمانا (خَثَرَ) دێ.

أخثَرَ الزُّبَدَ: رۆنە كەرەكەی واز لێهێنا نەیتواندەوە ٥ لەپەندی پێشینانداهاتووە (ما يدري أيخثرُ أم يذيب) نازانێ چ بكا رونەكەرەكە بەنەتواوەیی بهێڵێتەوە یان بیتوێنێتەوە.

خثَّرَ اللَّبَنَ: شیرەكەی مەیاند ٥ بزركاندی.

التَّخَثُّرُ التاجي: خەستبوونەوەی خوێن لەناو دەمارەكانی جەستەی دا بەهۆی نەخۆشی.

اَلْخثار من كل شيئ: بەرماوەو پاشمرۆكی هەموو شتێكە.

الخثارَةُ: بەمانا (الخثار) دێ.

اَلْخثارِمُ: لێو ئەستور ٥ رەشبین.

الخِثْرِمَةُ: نەرمانی لا لوت كە ئەستور ببێ ٥ كەوانەیی ناوەراستی لێوی سەرو ٥ (ك: خَثارِم).

خَثعَمَهُ: بەخوێن رەنگیكرد ٥ خوێنی تێهەڵسوو ٥

خَثْعَمَ القَومُ: پەیمانیان بەیەكدا كەپشتی یەكتر بگرن دەست لێك بەرنەدەن ٥ دابو نەرێتی هەندێ كۆمەڵگای عەرەب وەهابوو كۆ دەبوونەوە ئاژەڵیان سەردەبڕین‌و گۆشتیان دەبرژاندو دەخوارد ٥ خوێنی كوشتییەكانیان لەگەڵ زەعفەران‌و بۆنی خۆش دەكردە مەنجەڵێكەوە ئەمجار دەستیان دەخستە ناو خوێنەكەوەو پەیمانیان بەیەكتر دەدا كە پشتگیریی یەكتر بكەن.

تَخَثْعَمَ: بەخوێن خۆی رەنگ كرد.

خَثِمَ خَثَماً: پان بووە ٥ لوتی پان بووە.

خَثَّمَهُ: پانی كردەوە.

خَثَى البَقَرُ أو الفيل خَثياً: مانگاكەیان فیلەكە ناوسكی خۆی دانا ٥ توراندی ٥ هەرچی ریخی لەسكی دا هەبوو هەمووی دەردا.

أخثى: تەپاڵەی داگیرساند ئاگری بەتەپاڵە کردەوە.

اَلْخَثْوُ: خوار ناوك كە داكەویْ وشك ببیْ.

اَلْخَثْواءُ: ئافرەتێك لای خواروی گەدەی داكەویْو شل ببیْ.

اَلْخَثَی: ریخو پیسایی رەشە ولاخو فیل ٥ (ك: اخثارء)

اَلْخِثی: بەمانا (اَلْخَثَی) دیْ ٥ (ك: أخثاء وخثيّ).

خَجَاَ خُجُواً: دڵشكاو تێك شكاو بوو.

خَجَا الليلُ: شەوەكە رۆیی‌و كۆتایی هات.

خَجَا فلاناً: خجئا: لە فلانكەسی دا تیْی سرەواند.

خَجِيَ خَجَاً: قسەی ناشیرین‌و جنێوی دان ٥ شەرمیكرد.

أخجَأَه: زۆری داوا لێكرد تاوای لێكرد بێتاقەت ببیْ.

تَخَاجَأت المرأةُ: ئافرەتەكە سمتی خۆی دەرپەڕاند.

تَخاجَأ فلان: بەهێواشی‌و مەیلەو خۆ بادان ریشت.

اَلْخَجَأَةُ: ئادەمیزادی قەڵەوی قونگران ٥ ئەحمەق‌و خراپ راڕاو بیْ بەڵێن.

خَجَّ خُجوجاً: وێك هاتەوە نوشتایەوە ٥ دەگوتریْ: (خَجَّ ساعدُهُ).

خَجَّ برجله: لە رۆیشتنا تەپو تۆزی بەرپاكرد.

خَجَّ الشَّیْءَ: پاڵی بەشتەكەوە نا، دەگوتریْ: (خَجّت الريحُ السفينة) بایەكە پاڵی بەكەشتییەكەوە نا ٥ لەپڕەوی خۆی لای دا رەشەباكە بەتەوژمی خۆی كەشتییەكەی لادا.

خَجَّ الشَّیْءَ: شتەكەی شەق كرد ٥ دەگوتریْ:

خَجَّ العود: دارەكەی قڵیشاند.

اختَجَّ في سيره: بەخێرایی‌و پێچاو پێچ رۆیشت.

اَلْخَجِيجُ: (خجيج الريح) دەنگی رەشەبا.

خَجْخَجَ: خۆی شاردەوە ٥ دەگوتریْ: (خَجْخَجَ الرجل) پیاوەكە ئەوەی لەدڵیدابوو دەری نەخست.

خَجْخَجَ الريحُ: رەشەباكە بەشێوەی پێچاو پێچ‌و گێژەڵۆكەیی رۆیی.

اَلْخَجْخَاجَةُ: ئەحمەق‌و گێل.

خَجِلَ خَجَلاً وخَجْلَةً: شەرمی كردو بەخۆی دا شكایەوە.

خَجِلَ الحَيْوانُ: گیانلەبەرەكە واقی وڕماو حەوق‌و بوو نەیزانی بەچ لایەك دا بڕوا.

خَجِلَ فلان بأمره: فلان بەكارەكەیەوە زۆر ماندوو بوو بۆی ئەنجام نادریْ نازانیْ چی بكا.

**خَجِلَ** فلان: دڵنارەحەت‌و جاڕز بوو ٥ تەڕ دەماخ بوو ، كەیف خۆش بوو.

**خَجِلَ** النباتُ: گیاو گژەكە چڕو پڕو تێك چڕژا ٥ دەگوترێ:

**خَجِلَ** الوادی: دۆڵەكە بەگیاوو گژی زۆر ڕازایەوە.

**خَجِلَ** بالحِمل: بارەكەی قورس‌و گران بوو.

**خَجِلَ** علی فرسه: لەسەر ئەسپەكە نەیتوانی دامەزراو بێ چونكە بچكۆلەبوو زینەكەی بۆ پڕنەكرا.

**خَجِلَ** الثوبُ ونحوه: كراسەكەی لەبەر پان‌و پۆڕی چاك چاك لە جەستەی دا دەگەڕا ٥ هەروا دەگوترێ: (ثوب خَجِلٌ وجُلٌّ خَجِلٌ) هەروا دەگوترێ: (خَجَ الثوبُ) واتە: كراسەكە كۆن بوو ڕزی.

**أخْجَلَ النَّبَاتُ**: بەمانا (خَجِل) دێ.

**أخْجَلَ الثوبَ ونحوه**: كراسەكەی درێژكرد یان پانی كرد تا بەتەواوی لەبەریا بكەوێ.

**خَجَّلَهُ**: وای لێكرد تەریق بێتەوە.

**اَلْخَوْجَلَی**: ڕۆیشتنی ئافرەتە بەلارو لەنجە.

**خَدَبَ** خَدْباً: درۆیكرد.

**خَدَبَ** فلاناً: پێست‌و گۆشتی فلانكەسی هەڵدڕی ٥ دەگوترێ: (خَدَبَهُ بالسیف) ٥ (خَدَبَتْهُ الحَیَّةُ) مارەكە تێكی شكاند.

**خَدِبَ الشَّیْءُ خَدَباً**: شتەكە درێژو پان بوو ٥ دەگوترێ: (خَدِبَتِ الضربَةَ أو الطعنة وخدبت الدرعُ).

**خَدِبَ** اللسانُ: زمان درێژ بوو.

**خَدِبَ** السیفُ: شمشێرەكە بڕی.

**خَدِبَ** فلان: فلانكەس خوارو خێچ بوو هەر بەهەواو هەوەسی خۆی دەڕوا بەگوێی كەس ناكا (هو أخدب وهی خدباء)

**تَخَدَّبَ**: بەمانا (خَدِب) دێ ٥ دەگوترێ: (تَخَدَّبَ اللسانُ وتَخَدَّبَ السیف).

**تَخَدَّبَ** فلان: فلان بەڕۆیشتنی مام ناوەندی ڕۆیی.

**الخِدَبُّ**: گەورەو دڵڕەق ٥ كەتەو زەبەللاح لە هەموو شتێك ٥ دەگوترێ: (رَجُلٌ خِدَبٌّ) و(سنام خِدَبٌّ وجمل خِدَبٌّ) بەهێزو پتەوو كەتەو زەبەللاح.

**الْخَیْدَبَةُ**: ڕێگای ئاشكرا (ك: خیادِبَ) ٥ ڕێبازو داب‌و نەریت‌و پەیڕەوو پرۆگرام ٥ دەگوترێ: (اقبل علی خَیْدَبَتِهِ) بەهەمان داب‌و نەریتی خۆی هاتە پێشەوە.

**خَدَجَ** خِداجاً: كەم بوو كەمی كرد.

**خَدَجَ** الحامِلُ: ئافرەتە دووگیانەكە سكەكەی لەبار چوو پێش ئەوەی

کاملْ ببێ ٥ (هي خادِج) (ك: خوادج)، (وهي خدوج)، (ك: خدائج)٥، بەمنداڵە فڕێ دراوەکە دەگوترێ: (مخدوج) و(خدوج) و(خديج).

خَدَج الزند: چەرخەکە ئاگری لێ دەرنەچوو.

أخدجتِ الْحَامِلُ: بەمانا (خدجت) دێ.

أخدجت الشتوةُ: زستانەکە بارانی کەم بوو.

أَخْدَجَ الشَّيْءَ: شتەکەی کەم کردەوە ٥ دەگوترێ: (اخدَجَ التحية): بەتەواوی وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوە.

أخدَجَ أمْرَهُ: کارەکەی بەباشی بنبەست نەکرد.

خَدَّجَتِ الحاملُ: بەمانا (خَدَجَتْ) دێ.

الخَديجُ: لقی رووەکێك یان ئەندامی جەستەی گیانلەبەرێك کە ناکامڵ بێ.

المِخْدَاجُ: ئافرەتێکە منداڵی بۆ رانەوەستێ ٥ پێش ئەوەی سکەکەی کامڵ بێ لەبەری بچێ ٥ (ك: مخاديج)٥.

خَدَّ الأرضَ: زەوییەکەی هەڵکەند.

خَدَّ السيلُ الأرض وفي الأرض: لافاوەکە زەوی دادڕی ٥ (وخَدَّ فلان أخدوداً) فلانکەس چاڵێکی درێژی هەڵکەند.

خَدَّ جسمَهُ بنابه: بەکەڵبەی پێستی هەڵدڕی.

خَدَّ البعيرَ: لا شەویلەی حوشترەکەی داخ کرد.

خَدَّ الفرسُ الأرضَ بحوافره: ئەسپەکە بەسمەکانی شوێنی لە زەوییەکە کرد.

خادَّهُ: بەربەرەکانی کرد لە ئیشەکەی دا.

خَدَّدَ لَحْمَ الفرس: گۆشتی ئەسپەکەی لەڕولاواز کرد ٥ دەگوترێ:

خَدَّده الفقرُ وسوءُ الحال: هەژاریو باری نالەبار لەڕو لاوازی کرد.

خَدَّدَ السَّيْرُ لحمَ الفرس: رۆیشتن گۆشتی ئەسپەکەی لاواز کرد.

تَخادّا: بەرامبەر یەك وەستان.

تَخَدَّدَ لَحْمُهُ: بەمانا (خَدَّدَ) دێ.

تَخَدَّدَ القومُ: خەڵکەکە بوون بەچەند تاقمو پێڕێك.

الأخدود: کەندڕی درێژو قووڵ.

ضربة أخدود: لێدانێك شوێنەکەی لەجەستەو پێستی کرد ٥ دەگوترێ: (في ظهره أخاديد السياط) ٥ بەپشتیەوە شوێنەکەی شۆڕكو قەمچی دیارە.

الخَدُّ: کوڵم لا رومەت ٥ هەروا ناوە بۆ لایەنێکی شت.

**خدُّ الهودج**: لاتای کەژاوە ٥ هەروا ناوە بۆ کۆمەڵێك خەڵك دەگوترێ: (مضی خَدٌّ من الناس) تەمەنی چینێك لەئادەمیزاد تێپەڕی ٥ هەروا بەمانا رێگاش دێ.

**الخُدَّةُ**: کوڵم ٥ کەندری درێژ ٥ چاڵ ٥ (ك: خدد).

**المِخَدُّ**: کەڵبە.

**المِخَدَّةُ**: سەرین، بالیف کە لەکاتی نوستندا لاڕومەتی دەخرێتە سەر ٥ ئاسنێکە زەوی پێ هەڵدەدرێ وەکوو پێمەڕە ٥ (ك: مخادٌّ).

**خَدَرَ خَدْراً**: خۆی شاردەوە ٥ خۆی تاقەت کردو، خۆی حەشاردا، دەگوترێ: (خَدَرت المرأة ٥ وخدر الأسدُ) ئافرەتەکە چووە ناو کەژاوەوە ٥ شێرەکە چۆوە ناو لانەکەیەوە.

**خَدَر بالمكان**: لەو شوێنە مایەوە ٥ سەری لێشیوا ٥ لە گەلە رەوەکە دواکەوت.

**خَدَر الشَّيءَ**: شتەکەی شاردەوە.

**خَدَرَ الهودجَ**: پەردەی بەسەر کەژاوەکەدا دا.

**خَدَرَ المرأةَ**: ئافرەتەکەی خستە ناو کەژاوەوەو پارێزگاری کردو پێداویستییەکانی بۆ دابین کرد.

**خَدِرَ خَدَراً**: لەش داهێزان‌و بێ هێزی سواری سەروملی بوو ٥ دەگوترێ: (خدِرَ من الشَّراب أو الدواء) بەهۆی مەیەوە یان بەهۆی دەرمانەوە گێژو لەش داهێزاو بوو ٥ دەگوترێ: (خدِرَ جسمه، وخدِرَت عظامُهُ، وخدِرَتْ يدُهُ أو رجله، وخدرت عينه).

**خَدِر اليوم**: ئەمرۆ گەرماکەی توند بوو بای نەسیم‌و شەماڵی تێدا هەڵنەبوو.

**خَدِرَ الليلُ والمكانُ**: شەوەکە تاریك بوو شوێنەکە تاریك بوو ٥ (هو خَدِرٌ وأخدر، وهی خَدْراء)، (ك: خُدرٌ).

**اخدَرَ**: لەناو کەژاوەدا مایەوە ٥ دەگوترێ: (اخدرت المرأةُ) (أخدر الأسدُ).

**أخدَرَ**: کەوتە ناو شەوەوە ٥ هەروا باران دایپۆشی.

**أخدَرَ بالمكان**: لەو شوێنە مایەوە ٥ دەگوترێ: (أخدر في أهله)

**أخدَرَ الشَّيْءَ**: شتەکەی شاردەوە ٥ دەگوترێ:

**أخدر المرأةَ**: لەناو کەژاوەکەدا ئافرەتەکەی هێشتەوە.

**خَدَّرَهُ**: دایپۆشی ٥ دەگوترێ: (خدَّر المرأة) ئافرەتەکەی لەناو کەژاوەکەدا هێشتەوە.

خَدَّرَ الهَوْدَجَ: کەژاوەکەی داپۆشی.

خـــدَّرَت الظَبيـــةَ ولـــدها: ئاســکەکە بێچوەکەی شاردەوە.

خــــدَّرَهُ: دای هێـــــزان تێــــکی شـــکاند ٥ دەگـــوترێ: (خَـــدَّرَهُ الـــــشَّرابُ) ٥ مـــەیو عـــەرەق دایوەشـــاند ٥ (خَـــدَّرَهُ المـــرضُ) نەخۆشی گێژو وێژی کرد.

خَدَّرَتـهُ المَقاعِـدُ: دانیـشتن قاچی گۆجو ئیفلیج کرد.

إخْتَدَرَ: خۆی شاردەوە.

اخْتَدَرَت المرأةُ: ئافرەتەکە کەژاوە نشین بوو.

تَخَدَّرَ: خۆی حەشاردا.

تَخَدَّرَت المرأة: ئافرەتەکە خـۆی خـستە کـــەژاوەوە ٥ بـــاری تەندروســـتی تێکچوو لەشی داهێزا.

الأُخْـدورُ: کەژاوە ٥ (ك: أخادير)٥.

التخـدير الكوكـاييني: لـەکار خـستنی هەستەکان بەهۆی کۆکایینەوە.

الخُـدارِيُّ: رەشو تاریـك ٥ دەگـوترێ: (لیـــل خـــداريُّ) شەوێـــکی تاریکـــە ٥ (وســـحاب خـــداريٌّ) هەورێـکی رەشە.

الخِـدرُ: هەرشتێـك تـۆ بگرێتـە خـۆی لەخیوەتو خانوو ٥ پەردەیەکە بۆ ئـــافرەت لـــە گۆشـــەیەکی هۆڵـــدا دادەدرێتـەوە ٥ لانـەی شـێر ٥ (ك: خدور وأخدار).

الخَـــــدَرُ: شـــــوێنی تاریـــــكو چەواشە ٥ هەور ٥ باران ٥ لەزاراوە ی فەلسەفەدا لـە دەستدانی هەست بەگشتی یان شوێنێکی تایبەتی.

الخُدرُ: شەوی تاریك.

الخَـدَرَةُ: دەنکـە خورمـای نەگـەییو کـە بکەوێتە خوار ٥ هەروا ناوە بۆ ئـەو دەنکـە خورمایـەی ناوەکـەی رەش بووبێو بۆگەنی کردبێ.

الخَدرَةُ: باران ؛ دڵۆپە باران.

اَلْمُخَدِّرُ: دەرمانێـکە بـەکار هێنـانی بـۆ ئـادەمیزادو حـەیوانات بـەئاگایی لێ زەوت دەکـــا، وای لێـــدەکا وەعیـــی نەمێنێ.

خَـــدَشَ الجِلْـدَ ونحـوه خَدْشـــاً: پێـستی جەستەی رنی دایماڵی.

خـادش فـلان فلانـاً مُخادَشَـةً وخداشـاً: هەریەکـە لـەو دوو کەسـە پێـستی ئەوی تریانی دارنی.

خَدَّشَهُ: پێستی رنی پێستەکەی داماڵی

الْخَـــدشُ: شـوێنکەی رنـینو دامـاڵینی پێست.

الخُدُوشُ: کێچ ٥ مێش ٥ ریوی.

اَلْمُخادِشُ: پشیلە.

اَلْمُخـــدِشُ: پـــشیلە ٥ باریکـــایی

مل ٥ باریکایی زەندی ولاخ ٥ (ابنا مُخدّش) ئەملاو ئەولای شان.

**خَدَعَ** خَدْعاً: حاڵو وەزعی گۆڕا ٥ هەر ڕۆژە لە حاڵێکدایە.

**خدع** فلان: فلانکەس ڕەوشتی تری پەیڕەوکرد بەئەخلاقو ڕەوشتی تر پەروەردە بوو.

**خادع الرأي**: هەرساتەو رایەکی هەیەو هەرگیز لەسەر ڕاو بۆچوونێکی تایبەتی پایەدار نابێ.

**خَدَعَ الضَّبُّ**: سوسەمار چووە ناو کونی خۆیەوە.

**خَدَعَ الظَّبْيُ**: ئاسکەکە چووە ناو کولانەکەی خۆی.

**خدَع الثَّعْلَبُ**: ڕێوییەکە فێڵو پێچی کردن.

**خَدَعت الشمسُ**: خۆر ئاوا بوو.

**خَدَعت العينُ**: چاوەکە بەقوڵداچوو، یان خەوی لێ نەکەوت.

**خَدَعَ الشَّيْءُ**: شتەکە خراپ بوو کەڵکی نەما.

**خَدَعَ الطعامُ وخَدَع الريق**: بۆگەنی کرد.

**خَدَعت السوقُ**: بازاڕ کەوتو کڕینو فرۆشتن کەمە.

**خَدَعَ الرجلُ**: پیاوەکە ماڵو سامانی کەم بوو.

**خَدَعَ الزمان**: وەرزەکە بارانی کەم بوو.

**خَدَعَ فلاناً خَدْعاً وخُدْعة**: ئەوەی بۆ فلانی دەرخست پێچەوانەی ئەوە بوو کە لەناو دڵی دابوو ویستی بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێ زەبرێکی لێدا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِن يُرِيدُواْ أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ اللّهُ﴾.

**خَدَعَ الشَّيْءَ خَدْعاً**: شتەکەی شاردەوەو ونی کرد.

**خَدَعَ الدابة**: ولاغەکەی بەستەوەو هیچ لەوەڕو ئالفی نەدایە.

**خَدَعَ الثَّوْبَ**: قوماشەکەی نوشتاندەوە.

**أَخْدَعَهُ**: شاردییەوەو پەنهانی کرد.

**أَخْدَعَ فلاناً**: فلانکەسی هەڵنا بۆ فێڵکردنو چاوراو.

**خادعه مُخَادَعَةً**: بەمانا (خَدَعه) دێ.

**خَدَّعَهُ**: بەمانا (خَدَعَهُ) دێ.

**خَدَّعَهُ**: بەمانا (خَدَعَهُ) دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ﴾.

**اِنْخَدَعَ**: فێڵی لێکرا هەڵخەڵەتێندرا ٥ وای دەرخست هەڵخەڵەتێندراوە وەهاش نەبوو.

**اِخْدَعَ الشَّيْءُ**: شتەکە خۆی حەشارداو لەبەرچاو گوم بوو.

**انخدع السوقُ**: بازاڕ کەوت ٥ کڕینو فرۆشتنی تێدا نەما.

**تَخادَعا**: هەریەکە لەو دوانە فێڵیان لەیەکتر کرد.

**تخادع فلان**: فلان وای نیشاندا فێڵی لێکراوە.

**تَخدَّعَ**: فێڵکردنی بەسەر خۆیدا هێنا.

**الأخدَعُ**: رەگی لامل ٥ بەهەردوو رەگی لامل دەگوترێ: (الأخدعان).

**الخادع من الطريق**: ئەو رێگەیەیە هەندێ دیارەو هەندێکی کوێر بۆتەوە ٥ دەگوترێ: (دینار خادع) دینارەکە کەمە ٥ کێشی تەواو نییە.

**خوادع (سنون خوادع)**: ددانی بێ خێرو کلۆر.

**الخادعة**: دەرگای بچوك کە دەبێتە بەشێك لە دەرگای گەورە ٥ ژوری بچکۆلە لەناو خانوودا، (ك: خوادع)٥.

**الْخَدِعُ**: زۆر فێڵبازو پاشقولگر.

**الخُدْعَةُ**: فێڵو پیلان:

**اَلْخَدْعَةُ**: یەکجار فێڵکردن ٥ دەگوترێ: (الحرب خَدْعة) شەڕ فێڵێکی بەسە ٥ بەیەك فێڵ بەلایەکا دەگەڕێ.

**الخُدَعة**: زۆر فێڵباز ٥ دەگوترێ: (الحرب خُدَعة) واتە شەڕ زۆر فێڵو پیلانی گەرەکەو ئەوانەی شەڕدەکەن دەبێ زۆر فێڵو تەڵەکە بزانن.

**الخدوع**: ئەو ئاژەڵە شیردەرەیە جار جار شیر دەداو جار جاریش دەیگرێتەوە ٥ رێگایەك هەندێکی کوێر بوبێتەوەو هەندێکی دیار بێ.

**الخَیْدَعُ**: زۆر فێڵباز، دەگوترێ: (رجل خیدع) و(ذِئب خیدع) و(طریق خیدع) ٥ هەروا ناوە بۆ تراویلکە (سەراب).

**اَلْمُخَدَّعُ**: ئەو کەسەی زۆری فێڵ لێکرابن‌و چەقاوە سوو بوبێ.

**اَلْمِخْدَعُ**: ژوور لەناو خانوودا ٥ گەنجینە (ك: مخادع).

**خَدَفَ** خدفاً: رۆیشت بەخێرایی بەهەنگاوی کورت ٥ کەوتە نازو نیعمەتەوە ٥ دەگوترێ: (خَدَفَ في الخِصب).

**خَدَفَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بڕییەوە.

**خَدَفَ الثوبَ**: قوماشەکەی بڕی‌و پارچە پارچەی کرد.

**اختَدَفَهُ**: بەمانا (خدفه) دێ ٥ هەروا بەمانا رفاندن دێ.

**اَلْخَدَفُ**: سەرنشینانی ناوکەشتی ٥ کلکی کەشتی کە بەهۆی ئەو کلکەوە رێڕەوی کەشتییەکە دیاریی دەکرێ.

**الخِدْفَةُ**: پارچەی شت ٥ کۆمەڵێك لە ئادەمیزاد دەگوترێ: (کنا في خِدْفة من الناس) و (مرّت خدفة من الليل)

سەعاتێك لەشەو رۆیی.

**خَدِلَ** خَدَلاً وخدالةً وخدولةً: پڕ بوو ، تەواو بوو ، بالغ بوو ٥ دەگوترێ: (خَدِلَ الغلامُ وخَدِلَتِ المرأةُ وهكذا).

**اَلْخَدْلُ**: تێرو پڕو تەواوو بێکەمو کوڕی ٥ (غلام خدل) گەنجێکی تەواوو رێکو پێکە ٥ (وإمرأة خدلة) ئافرەتێکی تەواو جەستە رێكو پێکە ٥ بۆڵەترێی وردو بیزۆك کە بەهۆی خزمەت نەکردنو دەردو بێ ئاوی باش هێشوەکەی هەڵنەپێچابێ.

**اَلْخَدْلَجُ**: ئادەمیزادی دەستو پەلو قلو قاچ ئەستورو گۆشتن ٥ (چوار پەل قەوی).

**خَدَمَهُ** خدمةً: پێداویستی ئەوی دابین کرد (فهو وهي خادم) (ك: خَدَمٌ وخدّام) (وهي خادمة).

**أخْدَمَهُ**: خزمەتکاری بۆ دانا.

**خَدَّمَهُ**: بەمانا (أخْدَمَهُ) دێ.

**خَدَّم البعير**: پێوەندی لەقاچی حوشترەکە کرد.

**تَخَدَّمَ خادماً**: خزمەتکاری راگرت.

**اخْتَدَمَ**: خزمەتی خۆی کرد.

**اخْتَدَم فلاناً**: داوای لەفلانکەس کرد خزمەتی بکا.

**استخدَمَهُ**: کردی بەخزمەتکار ٥ داوای لێکرد خزمەتی بکا ٥ خزمەتکارێکی پێشکەش کرد.

**اَلْخَدَّامُ**: ئەو کەسەی زۆر خزمەت بکا.

**اَلْخَدْمَةُ**: ساتێك لەشەو یان لە ڕۆژ.

**اَلْخَدَمَةُ**: ئەڵقەیەکی پتەوی ئاسنە دەکرێتە قاچی حوشترەوە ٥ شورای قایەمو پتەو ٥ کوڕو کۆمەڵ ٥ دەگوترێ: (فَضَّ الله خَدَمَتَهُمْ): خودا کوڕو کۆمەڵیان لێك هەڵوەشێنێ ٥ سیرمەیەکی قایەمو پتەوە دەکرێتە زەندی حوشترەوە واتە: باریکایی پشت سمی ٥ کەلەبچە ٥ خرخاڵ.

**اَلخَدُومُ**: زۆر خزمەتچی.

**اَلْمُخْدَّمُ**: ئەو کەسەی زۆری خزمەتکار هەبێو دەولەمەند بێ ٥ شوێنی تێکردنی حەلقەو خرخاڵ لەقاچی ئافرەت یان هی حوشتر.

**اَلْمُخْدَمُ**: کەسێك نیشی ئەوە بێ خزمەتکار پێشکەش بەکەسانی تر بکا.

**اَلْمُخَدَّمَةُ**: شوێنی ئەلقە یان پێوەند لە قاچدا ٥ واتە: باریکایی قاچ پشت قاپە رەقە بۆ ئادەمیو پشت زەنگ بۆ وڵاخ.

**اَلْمُستخدم**: ئەو کەسەی لەفەرمانگەیەکی دەوڵەت کاربکا بەموچەیەك.

خادَنَــهُ: پــشتگیری قــسەکەی کــرد، تەصــدیقی کــرد ٥ (هــو مخــادِن وخَدين).

الخِــــدْنُ: دۆســــتو بــــرادەر ٥ هاوەڵ ٥ دۆستی دڵداریو نهێنـی ج پیاو بـێ ج ئـافرەت بـێ ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَآتُـوهُنَّ أُجُـورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْـرَ مُـسَافِحَاتٍ وَلاَ مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ﴾.

اَلْخُدْنَةُ: ئـەو کەسـەی دۆسـتو هاوڕێی زۆر دەگرێ.

الخِديو: نـاز نـاوی فـەرمانڕەوای میـصر بــووە لــەژێر دەســەڵاتی تورکــە عوسمانییەکانداو ئەو سـەردەمانەی رابردو تا سەردەمی کۆماریی.

خَذَا خَذْءاً: گەردن کەچ بوو ژێر بار بوو.

خَذِئَ لـە خَـذءاً وخَـذوءاً وخَـذاءةً: بـەمانا (خذأ) دێ.

أخْذَأَهُ: زەلیلو گەردنکەچی کرد.

استخْذَأَ لە: بەمانا (خذِئ) دێ.

خَذَّ الجرح خَذّاً: برینەکەی کێمو زوخاوی لەبەر ڕۆیی.

أخَذَّ الجرحُ: بەمانا (خَذّ) دێ.

خَـذَرَفَ الحیـوان: گیانلەبەرەکـە پەلـەی کرد ٥ قاچی کەوانەیی کرد.

تَخَذْرَفَ الثوبُ: قوماشەکە دڕا.

اَلْخَذْرَفَةُ: پارچەیەك لەقوماش.

الخذروف: دەسکی دەستاڕ پارچە دارێکە دەخرێتـە کـونی دەسـتاڕی سـەرەوە دەســتی پــێ دەگــیرێ پێــی دەخولێندرێتەوە.

خَذَّعَ اللحـم خَـذْعاً: گۆشـتەکەی پارچـە پارچەی کردو ئەنجن ئەنجنی کرد.

خَذَّعَــــهُ: بــــەمانا (خَذَعَــــهُ) دێ ٥ دەگوترێ: ٥ (خذّعته السیوف) شمـشێر هـەموو جەسـتەی ئـەنجن ئـەنجنکردووە چـونکە ئەومنـدەی شەڕو هەراکردووە.

خَذَّعَ الشَّيْئَ: ئـەملاو ئـەولای شتەکەی بڕی ٥ دەگوترێ:

خَذَّع الشجرة: لقو پۆپی درەختەکـەی بڕین.

تَخَذَّعَ اللحمَ ونحوه: گۆشتەکە یا شتێکی تری لەو جۆرە ئـەنجن ئـەنجن کـرد بەبێ ئەوەی پارچە پارچەی بکا.

خِذَعْ: پـەرتو بڵاو ٥ دەگـوترێ: (ذهبـوا خِذَع مِذَع).

الْخِذْعَةُ: پارچە گۆشتێك یـان شتێـکی تری لەو جۆرە.

الْمُخَذَّعُ: برژاو.

الْمِخْذَعة: کێرد (ك: مخاذع)٥.

خَذَفَت الدَّابَّةُ خَـذفاً وخَـذَفاناً: وڵاخەکە پەلــەی کــرد لــە رۆیــشتنەکەیدا بــەردو چــەوی لــەژێر قاچــی دەرپەڕین.

**خَذِف** باالحصا: به پەلەپیتکە بەردۆچکەی هاویشتن.

**خَذَف الشَّيءَ**: شتەکەی بڕییەوە (هو وهی خذوف).

**المِخـــــــذَفَةُ**: قۆچـــــەقانی ٥ دار لاستیـــــك ٥ ئامێرێـــــکە منـــداڵ بەردوچکەی پێ دەگرێتە باڵندە.

**خَذَقَ خَذْقاً**: جیقنەی فڕێدا.

**خَـذَقَ الدابَّـةَ**: لەولاخەکەیـەوە زەنـی بـۆ ئەوەی باش بڕوا ٥ ولاخەکە بـەهۆی تێوە ژەنینەوە باش ڕۆیی.

**خَــــذَلَ خَـــــذْلاً وخِـــــذلاناً**: جیـــا بـــــــووە ٥ گۆشــــــــــەگیر بـــوو ٥ لاکـــــەوت ٥ هـــــەڵبڕاو تـــەرمبوو ٥ دەگـــوترێ: (خَـــذَلَت الظبیـــة)، دەگـوترێ: (فـلان خـذول الرِّجـــــل) فلانکـــــەس قاچـــــی عەرزناگرێ.

**خَـذَل فلانـاً وعنــه**: دەسـتی لەفلانکـەس بـــەرداو جـــیدی پـــشتی نـــاگرێو یارمەتی نادا ٥ ریسوای کرد.

**خَذَلَه الله**: خودا ریـسوای کـرد لەلۆمـەو چاو بەرەوژێری نەیپاراست.

**أخذَلت الظبية ونحوها**: ئاسکەکە بەسەر بێچووەکەیەوە مایەوە.

**خَذَّلَـهُ**: هـەڵینا بـۆ ئـەوەی نەچـێ بـۆ شەڕو فەشەل بێنێ.

**خَـذَّل عنـــه أصـــحابَه**: هاوەڵـەکانی وا لێکردن ریسوای بکەن.

**تَخاذلت الظبيةُ**: بەمانا (أخذلت) دێ.

**تَخـــاذل القـــوم**: هەنـــدێ لەخەڵـــکەکە هەندێکی تریانی ریسواکرد.

**تَخاذلت رجلاه**: قاچەکانی بێهێـز بـوونو ڕۆیینی بۆ ناکرێ.

**اَلْخُذَلَـةُ**: کەسێـــك زۆر خەڵـــك ریـــسوا بکا.

**اَلْخَـــذُولُ**: دوگیانێـــکە کـــەزانی هاتـــێ لەشوێنی خۆی نەمێنێ لەتاوان ئـەم دیوو ئەو دیوبکا.

**خَذَمَ الحیوان ونحوه**: پەلـەی کـرد خێـرا ڕۆیشت.

**خَـــذَم الـــصقرُ**: هەڵۆکـــە بەدەنـــدوك لەکوشتییەکەی دا.

**خَذَم الـشَّيءَ خَـذماً**: شتـەکەی بـەخێرایی پارچە پارچەی کرد.

**خَـذِم**: خێـرا ڕۆیـیشت، دەگوترێ: (خَذِم الفرسُ).

**خَــــذِم فــــلان**: فلانکـــەس دڵپـــاكو بەخشندەبوو خێرخوایە.

**خَذِم السیفُ**: شمشێرەکە بڕندە بوو.

**خَذِم فلان خَذْماً**: فلانکەس دابڕا، هـەواڵی نەما، دیارنەما.

**أخذَمَ**: دانی بەزەلیلیو ژێر باری خۆی دانا ٥ داسەکنا.

**اخذَمَ الشراب**: مەیـیەکـە سەرخۆشـکەر بوو سەرخۆشیکرد.

أخْذَمَ النعل: پشتێنی نەعلەکەی چاك کردەوە.
خَذَمَهُ: پارچە پارچەیکرد ٥ بڕی.
خَذَم أذنَهُ: گوێچکەی بڕی.
تَخَذَّمَ: بۆ موطاوەعەی(خذ مه) هاتووە.
تَخَذَّم فلان: فلانکەس دابڕاو هەواڵی نەما.
تَخَذَّمَ الشجرةَ: درەختەکەی بڕییەوە.
الخُذامَةُ: پارچەیەك لەشت.
الخَذْماءُ: (شاة خذماء) مەڕێك قەراخی گوێچکەی بڕابێ.
المِخْذَمُ: شمشێری بڕندە (ك: مخاذم)٥.
خذا خُذُواً: شل‌و شەوێڵ بوو.
خذا لَحْمُهُ: گۆشتی جەستەی تونـدو پڕ بوو.
خذِي خذَىً: بەمانا (خذا) دێ.
خَذِي الرجلُ: پیاوەکە زەعیفو بێ وەج بوو.
أخذاه: ژێرباری کرد ٥ زەلیل‌و داماوی کرد.
الخَذَا: شۆڕ بوونەوەی گوێچکەیە بەسەر لاڕومەتـدا ٥ کرمێـکە لەگـەڵ پیسایی ئاژەڵدا دێتەدەر.
الخُذاوِيَّةُ من الآذان: گوێچکە سوك.
خَرِئَ خرءاً وخراءةً وخِراءاً: پیسایی کرد.
الخُرْءُ: ڕیخ‌و قشپل، پیسایی ئادەمیزاد (ك: خُرُءَ)
المَخْـرَأةُ: شـوێنی پیـساییکردن، ئاودەست (ك: مخارئ)
المَخْرُوءَة: بەمانا (المَخْرَأةُ) دێ.
خَـرَبَ خَرْباً: بـوو بـەدزو جـەردە ٥ (هـو خارب) (ك: خُرّاب)٥.
خَرَبَ الشَّيْءَ: شتەکەی کونکرد دڕاندی.
خَـرَبَ دینه: ئایینی خۆی شێواند شك‌و گومانی تێدا پەیداکرد.
خَرَبَ الشَّيْءَ: شتەکەی سەقەت کـرد بێ سودی کرد لەکاری خست.
خَرَب فلاناً: لەکلۆتی دا.
خَرَبَ الشَّيْءَ خرباً وخرابةً: شتەکەی دزی.
خَرِبَ خرباً وخراباً: شـتەکە لـەکار کـەوت‌و سودی نەما.
خَرِبَ المكان: شوێنەکە چۆڵ بـوو کەسـی تێدانەما.
خَـرِب الحيـوانُ: ئاژەڵەکـە گوێـچکەی هەڵدڕا ٥ (هو أخرب وهي خرباء)
أخْرَبَهُ: وێرانی کرد.
أخربـه فلانـاً: فلانکەسـی بـەدز هاتـە بەرچاو.
خَرَّبَهُ: بەمانا (أخْـرَبَهُ) دێ.
خَـرَّبَ المـزادة ونحوهـا: دەسـکی بـۆ تێشودانەکە دروست کرد.
اسـتخرَبَ: بـەمانا (خَـرِبَ) دێ ٥ دەگـوترێ: (إسـتخرب فـلان): فلانکـەس بـەهۆی کارەساتێـکەوە تێك شکاو نەهامەتی بەسەردا هات.

**استَخــــرَبَ الى فـــلان:** ئـــارەزۆی لای فلانكەسی كرد.

**الأخْرَبُ:** گوێ هەڵدڕاو.

**الخُرابَـــــةُ:** كـــونی پـــانو پـــۆڕی كەوانـــەیی ٥ حەبلێـــك لـــە پـــرژی دارخومـا ٥ تاتـە بەردێـك كونێـكی لەناوەراسـتی دا هـەبێ‌و حەبلێـكی تێخرابێ.

**خُرابة الأبرة:** كونی دەرزی.

**خُرابة الوَرِك:** سەری ئێسقانی ران لـەناو قەپۆڵكی حەوزی دا.

**الخَرْبُ:** تورەكەیەكە شوان تێشووی خـۆی تێـدا هەڵـدەگرێ ٥ (زاراوەیـەكی زانایانی عوروزە).

**الخُرْبُ:** بـەمانا (الخَـرْب) دێ ٥ شوێنێـك درەختی (غەضای) لێ بڕوێ.

**الخَــرَبُ:** كەوانەیەكـە لەسـەروی ورگـی ئەسـپەوەیە ٥ تـوكی خـوار ئـەژنۆی ئەسـپ ٥ نێرینـەی حوبـارا ٥ (ك: خِـراب وأخـراب) دەگـوترێ: (فـلان خَرَبٌ) فلانكەس ترسنۆكە.

**الخَـربُ:** قـەراخی كێـو؛ دەرەوەی سـنوری كێو.

**الخَرْباءُ من المعز:** ئەو بزنەیە گوێچكەی هەڵدڕابێ.

**اَلْخِرِبّانُ:** تـرسنۆك.

**الخَرَبَـــــــةُ:** بێـــــژینك ٥ عــــەیب‌و لەككــــە ٥ شــــەرمگا ٥ هەڵــــە ٥ حەیاچون ٥ قسەی ناشیرین.

**اَلْخُرْبَةُ:** كونی گەورەو كەوانەیی.

**خُرْبَـــةُ المـــزادة:** قلفـــەی تێـــشودانی شـوان ٥ سەرەئێـسقانی ران ٥ ئـەو قرۆیلكــــەی دەچــــێتە نــــاو حــــــــەوزەوە ٥ عـــــــــەیب‌و رەخنــە ٥ گومــان ٥ تورەكەیەكــە شــوان تێــشوی خــۆی تێــدا هەڵدەگرێ ٥ (ك: خـُرَبُ، أخـراب، وَخَرُب).

**الخِرْبَةُ:** شوێنی وێرانە؛ كاولەكۆن.

**اَلْخَرَبَـــــةُ:** بــــەلاَو كارەســــات ٥ تاوان ٥ عەیب.

**اَلْخَرِبَةُ:** شوێنی وێرانـە، كاولـەكۆن (ك: خَـرِب) دەگـوترێ: (وقعـوا في وادی خَرِبــات) واتــە: كەوتنــە شــیوی فەوتێنەرو ترسناكەوە.

**اَلْخَرُوبُ:** خرنوك ٥ رومكێكە بـەخۆی‌و بەبەرەكەشـــــــی دەگــــــوترێ: خرنوك ٥ بەرێكی درێژكۆڵەی هەیە لەشێوەی گورچیلەدایە ٥ بەرەكـەی تفتــە، لەگــەڵ زەردینــەی هێلكــەدا دەكرێتە دەرمانی چاو ئێشە بـۆ زۆر دەرمــانی تــریش بەكاردەهێنــدرێ ، بەرەكەی دەخورێ، ئالفێكی باشیشە بۆ ئاژەڵ.

الخَرُوبة: (لەزاراوەی ئاڵتونچیەکاندا) دەنکە دانەوێڵەیەکە زێڕی پێ دەکێشرێ.

الخِرْبِزُ: کاڵەك لە پەندی پێشینانندا هاتووە دەڵێ: (دوو خەربوز بەدەستێك هەڵناگیرێ) ٥ لە حەدیثی ئەنەس دا هاتووە دەڵێ: دیتم پێغەمبەر (يجمع بين الرطب والخِربِز) خورماو کاڵەکی پێکەوە دەخوارد.

خَربَشَ الشَّيْئَ: شتەکەی تێکدا لەکەڵکی خست ٥ یان شتەکەی قایمو قۆڵو رێكو پێك نەکرد ٥ دەگوترێ: (خَربَشَ الكتاب): کتێبەکەی تێكو پێك دا، یان کتێبەکەی جوان رێك نەخست.

الخِرْبَاشُ: تێکەڵیو پێکەڵیو هەراو هۆریا ٥ (ك: خرابيش)٥.

خَربَصَ الأشياءَ: شتەکانی لێك هەڵاوارد.

خَربَصَ الدابَةُ الزرعَ: وڵاخەکە زۆری لەکشتوکاڵەکە خوارد هیچی نەهێشتەوە.

خَربَقَ في مشيه خربقةً وخِرْباقاً: پەلەی کرد لە رۆیشتندا.

خَربَقَ النبتُ: گژو گیاکە تێك هاڵا.

خَربَقَ الشَّيْئَ: شتەکەی بڕییەوە، شتەکەی دڕاند.

خَربَقَ العملَ: کارەکەی تێکدا.

اخْرَنْبَقَ: بەزموییەوە نووساو جوڵەی بۆ نەکرا ، تەمبەڵ بوو کاروکاسبی نەکرد ٥ سەرکوت کرا وەکوو سەرکوتکردنی گومانکار ٥ سەری خست بەبێ دەنگی.

الخِرْباق: ئافرەتی درێژی کەتەو زەبەللاح ٥ ئافرەتی خۆشرۆ.

الخِرِيقُ: حەوزێکە ئاوی تێدا کۆ دەکرێتەوە ٥ تەنکی گەورە.

خرتَ الطريقُ به الى كذا: رێگاکە بەرەو ئەوێی برد.

خَرَأ الشَّيْئَ: شتەکەی شەق کرد دایدڕی ٥ کونی کرد.

خَرَتَ الأرضَ: رێگاو کونو قوژبنی زەوی شارەزا بوو.

الخرتُ: کون؛ کونی بچکۆلە، دەگوترێ: (وقعوا في مضايق مثل أخرات الإبر) ٥ کەوتنە کێشەو تەنگژەی وەها لێ رزگار بوونیان نەبێ.

أخرات المفاوز: رێچکەو تولەڕێی چۆڵەوانیو کێوو کەژ.

الخُرتُ: کونو کەلەبەر ٥ سمگو گورگی گورجو گۆڵ.

الخُرتَةُ: کون ٥ ئەڵقەو قوڵفە، (سەرە قەپاسەو گوریس).

الخِرِيت: چاوساغی شارەزا بەرێگای بیابان ٥ لێزان لەکاروباردا ٥ لەسیرەی پێغەمبەردا هاتووە لەباسی کۆچدا دەڵێ: (فاستأجر رجلاً من بني الدّيل هادياً خريتاً، (ك: خراريت).

اَلْمَخْرَتُ: رێگای راستو ئاشکرا (ك: مخارت).

خَرِثَت المرأة خرثاً: ئافرەتەکە هەردوو کەلەکەی قەڵەو فش بوونو گۆشتی شۆڕبووەوەو شل بوو ٥ (هي خرثاء)، (ك: خُرْث).

الخِرثاءُ: مێرولەیەکی مەیلەو سوورە.

الخُرْثِيُّ: شتومەکی ناوماڵ ٥ یان خراپترینو بێ کەڵک ترین شتی ناوماڵ ٥ قسەی پڕو پوچ.

خَرَجَ: لە شوێنی خۆی چووە دەر یان لەو بارو دۆخەی تێیدا بوو ڕزگاری بوو ٥ چووە ناو حاڵەتێکی ترەوە.

خَرَجَت السماءُ: ئاسمان هەوری نەماو بوو بەساو.

خرجت خوارج فلان: پیاوەتیو نەجیبزادەیی فلان دەرکەوت.

خَرَجَ من الأمر أو الشدة: لەوکارە یان لەو ناخۆشییە رزگاری بوو.

خَرَجَ على السلطان: لەپاشا قاچاخ بوو.

خَرَجَ في العلم: لەزانیاری دا پێشکەوتو ناوی کرد.

خَرِجَ السحابُ: هەورەکە بەرفراوان بوو بڵاو بووەوە.

خَرِجَ خرجاً: بوو بە دورەنگ ٥ رەنگاو رەنگ ٥ دەگوترێ: (خَرَجَت الأرضُ): زەوی رەنگاو رەنگ بوو هەندێ شوێنی گیای لێ رواو هەندێکی روتەن.

خَرِجَ العام: ساڵەکە هەندێکی هەرزانیو هەندێکی گرانی بوو.

خَرِجَ النعام: نوعامە بەڵەك بوو هەندێکی رەشو هەندێکی سپی.

خَرِجَ الشاة: مەڕەکە کەلەکەو قاچەکانی سپیو باقی جەستەی رەش، (هو أخرج وهي خرجاء).

أخْرَجَ فلان: فلانکەس خەراجو سەپانانەی خۆی دا ٥ نوعامەیەکی بەڵەکی گرت.

اخرجت الراعیة: مەڕەکە هەندێ لەپاوانەکەی خواردو هەندێکی جێ هێشت.

أخْرَجَ الناسُ: خەڵکەکە ساڵێکیان بەسەردا تێپەڕی نیوەی هەرزانیو نیوەی گرانی بوو.

أخرج الحديثَ: فرمایشتەکەی پێغەمبەری بەڕشتەی ڕاستو دروستەوە ریوایەت کرد.

أخرج الشَّيْءَ: شتەکەی دەرکرد.

**أخرج الرواية أو المسرحية**: لەسەر شاشە یان لەسەر شانۆ بەشێوەی فەنی مەسرەحییەکەی رانواند (هو مُخرِج)

**خارَجَ عَبْدَهُ**: لەگەڵ عەبدەکەی دا رێکەوت هەموو مانگێك شتێکی بۆ بگێڕێتەوە.

**خَرَّجَهُ في العلم والصّناعة**: فێری زانیاری‌و پیشە سازی کردو کارامای کردو زانیاری پێدا ٥ قوتابییەکەی پێگەیاند.

**خَرَّجَ خَيْلَهُ**: ئەسپو ولاخەکەی رامکرد.

**خَرَّجَ الأرضَ**: زەوییەکەی خەرساندو خەراج‌و عوشری بۆ دیاری کرد.

**خَرَّجَ الشَّيْئَ**: شتەکەی بەدوو رەنگ رەنگ کرد.

**خَرَّجَ الغلامُ لوحَهُ**: قوتابییەکە لەوحەکەی هەندێکی رەنگ کردو هەندێکی رەنگ نەکرد.

**خَرَّجَ فلان عملَه**: فلانکەس کارەکانی جۆراو جۆرکردن.

**اخْتَرَجَ**: شتەکە دوو رەنگ بوو.

**اخترجَ الشَّيْئَ**: شتەکەی دەرخست، دەری هێنا ٥ لە حەدیثی پێغەمبەردا (د.خ) (فاخترجَ تمرات من قِربة) ٥ هەروا بەمانای (إستنباط) و لێوەرگرتن‌و لێتێگەیشتن دێ.

**اخترج فلاناً**: داوای لەفلان کرد بێتە دەر بۆلای.

**تخارج القومُ**: هەریەکێ لەو خەڵکە بە ئەندازەی هاوەڵەکەی بژێوی دابین کردو هاوبەشی لەکۆمەکییەکەدا کرد.

**اخْتَرَجَ الشركاءُ**: هەریەکێ لەهاوبەشەکان بەشەکەی خۆی بۆ هاوەڵەکەی بە فرۆشتن دیاریکرد ٥ لەحەدیثی ئیبنو عەباسدا هاتووە (لا بأس أن يتخارجَ القومُ في الشركة تكون بينهم).

**تخرّج في فن كذا**: لەو فەننەدا دەرچوو، فێری بوو.

**إخْرَجَّ النعامُ**: نوعامەکە بەڵەك بوو.

**إخْراجَّ النعامُ**: نوعامەکە بەڵەك بوو.

**استخرجَهُ**: داوای لێکرد بێتە دەر بۆلای.

**استخرجَ الشَّيْئَ من المعدن**: شتەکەی لەکانزاکە دەرهێناو لەقوڕو تەپو تۆز پاکی کردەوە.

**أُستُخرِجَتِ الأرضُ**: زەوییەکە چاکرا بۆ کشتوکاڵ‌و رواندن.

**اَلتَّخريجُ**: یارییەکی منداڵی عەرەبە، کە تێیدا هاواردەکەن ٥ (خَراجِ خراجِ) یەکێکیان شتێك دەخاتە مشتی خۆیەوەو بەوانی تر دەڵێ: وەرن

هەڵی هێنن چیم لەدەست دایە دەری بێنن.

الخارجُ من کل شيئ: دیوی دەرەوەی شتەکەو بینراوەکەیە.

الخارجِيّ: ئەوشتەی بەسەر هاو وێنەکانی دا باڵادەست بێ ٥ کەسێك ببێتە گەورەو بنەماو وەجاخزادە نەبێ ٥ کەسێك لەپاشاو فەرمانڕەوا یاخی ببێ، یان بەگوێی نەکا ٥ هەروا ناوە بۆ تاکی خەواریجەکان.

وزارة الخارجیة: دامو دەزگایەکە کارو باری دەرەوەی وڵات جێبەجێ دەکا.

الخراجُ: ئەو بەرو بوومەیە لەزەوی کشتوکاڵی دەردەهێندرێ ٥ تام خۆش؛ دەگوترێ: (هذه التفاحَةُ طيّب ريحها طيبٌ خراجها) لەم رستەدا (خراج) بەمانا تام خۆشییە ٥ هەروەها:

الخَرَاجُ: باجو گومرگو سەرانەو مەرانەو ئەم شتانەش دەگرێتەوە.

البلاد الخراجیة: ئەو وڵاتەیە سوپای ئیسلام بەئاشتی دەستی بەسەردا گرتووە بەصوڵحو ڕێککەوتن ئەرزەکە دراوەتەوە بە خاوەنەکانیان لەبەرامبەر ئەندازەیەکی دیاریکراو کە بیدەن بەحکومەتی ئیسلامی ٥ (ك: أخراج، أخرجة)٥.

الخُراجُ: بەمانا (الخَراج) دێ ٥ هەروا بەمانا ئەو کێمو زوخاوو شتە دێ کە لەبرین دەردێ.

الخَرْجُ: ئەوشتەی لەزەوی‌و شتی تر وەبەرهەم دێ‌و دەبێتە واریدات.

خَرْج السحاب: ئەو بارانەیە بەهێواشی لەهەور دێتە خوارەوە ٥ هەروا وشەی.

الْخَـرْج: پێچەوانەی (الدخل) دێ ٥ گومرگو باجی ساڵانە.

الخُرْجُ: خوێدانو تورەکەو جەوالە بچکۆلەیەکە لە موو یان لەچەرم دروست دەکرێ دوتایە بەئەم دیوو ئەودیوی پشتی وڵاخدا شۆڕدەکرێتەوەو شتی تێ دەکرێ تێرەو هۆرپیشی پێ دەگوترێ، (ك: خِرَجَة واخرِجَة).

الخُرْجَةُ: کەسێك زۆر لەماڵ دەربچێتە دەرەوە.

الخَرُوجُ: ملدرێژ ٥ دەگوترێ: (فرس خروج).

الخُرُوجُ: لەزانستی (سەرەوادا) بریتییە لە حەرفی (مەد) بەشوێن (هاء الوصل)دا بێ لەسەرەوای ڕەهادا.

یوم الخُرُوج: ڕۆژی قیامەت ٥ ڕۆژی جەژن.

الخَوارجُ: پێڕێکن لەپێڕە ئیسلامییەکان

لەسەردەمی ئیمامی عەلی دا لەئیمام هەڵگەڕانەوەو لەژێر بەیعەتو وەلاء بۆ ئیمامی عەلی چونەدەرو دژی وەستان.

اَلْمَخْـرَجُ: شوێنی لێ هاتنە دەرەوەی شت، (ك: مَخَارِجُ)ە، لەلای زانایانی (علوم قرآن)و تەجویدو صەرفییەکان شوێنی هاتنە دەرەوەی دەنگی پیتێکە لە پیتەکانو جیاکردنەوەی لەوانی تر بەهۆی دەنگەکەوە.

خَرْخَرَ الماءُ: ئاوەکە خورە خوری دێ.

خَرْخَرَ النائم: خەوتۆکە پرخەپرخی دێ ٥ پرخەی هات.

تَخَرْخَرَ بطنُهُ: سکی چوو، سکی قوڕە قوڕی لێ هات.

تخرخر الرجل: پیاوەکە لەبەر بێ هێزی لاژە لاژیەتی.

تخرخرت المرأةُ: ئافرەتەکە دوای قەڵەوی زەعیفو لاواز بوو.

اَلْخِرْخِرُ: حوشتری شیر زۆر ٥ پیاوی ژیان نەرمو نۆڵ.

الخُرْخُور: بەمانا (الخِرخَر) دێ، (ك: خراخير)ە.

خَرِدَ خَرداً: بێ دەنگییەکەی درێژەی کێشا.

خَرِدت اللؤلؤةُ: مرواریەکە بەکون تێنەکراوی مایەوە.

خَرِدت الفتاةُ: ئافرەتەکە بەکچی مایەوەو بوو بەقەیرەو شوی نەکرد.

خَرِد فلان: فلانکەس زۆر بەشەرمو حەیا بوو.

خَرِد صوته: دەنگی نزمو لەسەرە خۆ بوو نیشانەی شەرمی پێوە بوو ٥ بێدەنگییەکەی درێژەی کێشا ٥ (هو خارد) (هی خريد وخريدة).

أخرد الفَتى: لاوەکە لەشەرمان بێدەنگ بوو.

اخرد الرجل الى اللهو: پیاوەکە بەلای لەهوو لەعەبدا چوو حەزی لەوە بوو.

تَخَرَّدَت الجارية: بەمانا (خَرِدَتْ) دێ.

الخُرْدَةُ: هەرماڵێك وردو پارچە پارچەبێ.

الخَرُودُ: ئافرەتی بەزەوقو زیندو گەشەدار ٥ کچی دەست لێ نەدراو.

الخريد: بەمانا (اَلْخَرُود) دێ، دەگوترێ: (له صوت خريد) دەنگێکی نزمو نەرمی هەیە لە شەرما دەنگی هەڵنابڕێ.

الخريدةُ: بەمانا (الخريد) دێ، هەروەها دەنکە لوئلوئی کون نەکراو.

اَلْخُرْدِيقُ: شورباوی بەگۆشتەوە.

خَرْدَلَتِ النخلةُ: دراخورماکە زۆری

لەبەرەکەی بەنەکاملی هەڵوەرانـدو ئـەوی مایـەوە دەنکـەکانی گـەورە بوون.

خَـرْدَلَ اللحـمَ: گۆشـتەکەی پارچـە پارچەکردو لێکی جیاکردەوە.

خردلَ الطعامَ: خوراکە باشەکەی خوارد ئەوی دی وەلانا.

خَردَلَ فلاناً: فلانکەسی بەعـەردی داداو رەمی کرد.

الخَـرْدَلُ: گیایەکـە لـە حـەقڵو دەورو بەری رێگاکاندا دەڕوێ تۆومکەی بۆ دەرمـان بـەکاردێ ٥ بەنموونـەی بچوکی دەهێندرێتـەوە، دەگـوترێ: (ما عندي من كذا خردلة).

الخُردُولَـةُ: هەرئەندامێـکی جەسـتە کە گۆشتن بێ.

خَرْذَلَ: بەمانا (خَرْدَلَ) دێ.

خَـرَّ المـاءُ والـريحُ: ئاوەکـە خـورەی هات ٥ رەشەباکە وژەی هات.

خَـرَّ البنـاءُ خَـرّاً وخـرُوراً: بیناکـە روخـاو هاڕەی کرد.

خَرَّ الشيَ: شتەکە کەوتە خوارێ.

خَرَّ ساجداً: کەوتە سوژدە ٥ چووە سـوژدە بردن.

خَـرَّ فـلانٌ: فلانکـەس کەوتـە نـازو نیعمەتەوە ٥ مرد ٥ تێپەڕی.

خَرَّ فـلان علـى فـلان: فلانکەس هێرشی کردە سەر فلان.

خَـرَّ القـومُ: خەڵـکەکە لەشوێنێـکەوە کواستیانەوە بـۆ شوێنێـکی تـر، (فهـم الخُرّارُ والخرارة).

خَرَّ الماءُ الأرض خرّاً: لافاوەکە زەوییەکەی هەڵدڕیو پێیداڕۆیی.

أخَرَّهُ: خستیە خوارێ.

انْخَرَّ: کەوتە خوار.

انْخَـرَّ الرجـلُ: پیاوەکـە شـلو شـێواو شلەپەتە بوو.

الخَـرّارَةُ: سەرچـاوەی کـانی ٥ دارێـکی بـــچکۆلەیە منـــداڵ پەتێـــك لەسەرێکیانی دەخا، سەرەکەی تـری پەتەکـە دەگـرێو هەڵیـدەخولێنێ دەنگێـــکی لێـــدێ . باڵندەیەکـــە لەسوڕەد گەورەترە، (ك: خَرّارَة).

الخُـرُّ: بنکـی گوێـچکە، گـەروی بەرداشـی ئـاش ئـەو شـوێنەی لـە دۆێڵەکـەوە گەنمەکـەی تێـدەڕژێ ٥ زەوییـەك لافاو هەڵیـدڕیبێ.

الْخَرِيـرُ: دەنگێـکە پەیـدا دەبێ لەتیـژ ڕۆیـشتنی ئـاو یـان لـەباڵی باڵنـدەی کـەخێرا دەفـرێ ٥ شـوێنی نزمـایی نێوان دوو گردۆڵکە.

الخِرِّيَانُ: ترسنۆك.

خَرَزَ الجلد ونحوه: پێستەکەی دروەوە.

خَرِزَ خَرَزاً: کاری خۆی قایمو پتەو کرد.

خَرَزَةُ: پەراوێزی جنی، بەمیروو شـرازە جنی کرد.

الخِـرازة: پیـشەی میـرو هۆنینـەوە.

**اَلْخَرّازُ**: میرو دروستکەر ، زینــدرو ئەوکەسەی چەرم دەدروێ.

**الْخَرَزَةُ**: میروی ملوانکەو تەزبیح.

**اَلْخُرْزَةُ**: هەموو کونێکو پەتێک کە لەچەرم بێ.

**اَلْمِخْرازُ**: ئەو شتەی پێستی پێ دەدورێتەوە (درێوشە).

**المِخْرَزُ**: بەمانا (اَلْمِخْراز) دێ.

**خَرَسَ النُّفَساءَ خَرْساً**: خۆراکی خورسەی بۆ ئافرەتە زەیستانەکە دروستکرد خۆراکی خورسە خواردەمەنییەکە بۆ ئافرەتی زەیستان لێ دەنرێ ، خۆراکی خورسەی دەرخوارد دا.

**خَرِسَ خَرَساً**: زمانی گیراو قسەی بۆ نەکرا.

**خَرِسَتِ الكتيبةُ**: هێزە سەربازەکە زۆر بەویقارو لەسەرەخۆبون دەنگی تەقەو رەقەو بگرەو بردەیان نەبوو.

**خَرِسَ اللبنُ**: شیرەکە خەست بوو کەرۆیان کردە ناوشتی ترەوە خوڕەی نەهات.

**خَرِسَ السحابُ**: هەورەکە گرمەو بروسکەی نەبوو.

**خَرِسَ الماءُ**: ئاوەکە لەرۆیشتنی دا خوڕەی نەهات.

**خَرِسَ الجبلُ**: کێوەکە دەنگی نەدایەوە.

**خَرِسَتِ الأرضُ**: زەوییەکە بەکەڵکی کشتوکاڵ نەهات، (هو أخرس وهي خرساء) (ك: خَرْسٌ وخرسان).

**خَرَّسَ فلان**: بەکوپە ئاوی خواردەوە ، شەونەنوست بێدار بوو.

**أخرستِ الأرضُ**: زەوییەکە بەکەڵکی کشتوکاڵ نەهات.

**أخرَسَ اللهُ فلاناً**: خودا فلانکەسی توشی کەڕیی کرد.

**خَرَّسَ على النفساء**: حەڵوای بۆ ئافرەتە زەیستانەکە کرد حەڵوای دەرخواردا.

**تخرستِ المرأةُ**: ئافرەتەکە حەڵوای بۆ خۆی دروست کرد ، لە پەندی پێشیناندا هاتووە دەڵێ: (تَخَرّسي يانفسُ لامخرسة لك)، واتە: بۆ خۆت بەدەستی خۆت کاری خۆت ئەنجام بدەو پشت بەکەس مەبەستە.

**استخرسَتِ الأرضُ**: زەوییەکە بەکەڵکی کشتوکاڵ نەهات.

**الخِراسُ**: خواردەمەنییەکە بۆ ئافرەتی زەیستان دروست دەکرێ ، یان بەبۆنەی منداڵبوونەوە دروست دەکرێو خەڵکی بۆ بانگ دەکرێ.

**الخَرّاسُ**: کوپەو کۆڵینە دروست کەر وەستای کۆڵینەو کوپە ، فرۆشیاری کوپەو کۆڵینە ، عەرەق دروستکەر.

**الخُرْسُ**: کوپەی گەورە ، کۆڵینە، دەگوترێ: (سَمِنَ حتى صار كالخُرْسِ)

قەڵەو بوو تاوەکوو کوپەی لێهات.

**الخُرْسُ**: بەمانا (اَلْخِراس) دێ.

**الخِرْسُ**: بەمانا (الخَرَس) دێ ٥ زەوییەك بەکەڵکی کشتوکاڵ بێ.

**اَلْخَرْسَاءُ**: ماری گەورە ٥ بەلاو کارەسات.

**الخُرْسَةُ**: ئەو خواردەمەنییە بۆ ئافرەتی زەیستان دروست دەکرێ، حەڵواو شیرینی بۆ ئافرەتێك تازە منداڵی بووبێ.

**الخَرُوسُ مِنَ النِّساءِ**: ئەو ئافرەتەیە لەدوای ئەوەی منداڵی دەبێ حەڵوای بۆ دروست دەکرێ بۆ ئەوەی تا چەند رۆژێك ئەو خواردنە شیرین تامەبخوا ٥ ئافرەتێك یەکەمجار بێ منداڵی ببێ ٥ ئافرەتێك شیری کەم بێ.

**تَخَرْسَنَ**: هاتە خوراسان، لە خوراساندا مایەوە ٥ داب و نەریتی دنیشتوانی ئەهلی خوراسانی وەرگرت.

**الخَرْسانَة**: چیمەنتوو بەردو چەوو لمبو ئاو تێکەڵ دەکرێ بەزۆری بۆ بناغەی بینا بەکاردەهێندرێ، وادەبێ شیشی تێکەڵ دەکرێ.

**خَرَشَ مِنَ الشَّيْئِ خَرْشاً**: لەشتەکەی وەرگرت ٥ دەگوترێ: (فلان يَخْرِشُ من فلان الشَّيْئَ): فلانکەس لەفلان شت وەردەگرێ.

**خَرَشَ لأهله**: کاروکاسبی بۆ ماڵو منداڵی خۆی کرد.

**خَرَشَ الْجَسَدَ**: پێستی لەشی رنیو روشاندی بەنینۆك.

**خَرَش البعيرَ**: حوشترەکەی بەگۆچان بۆلای خۆی کێشکرد.

**خَرَشَ الغُصْنَ**: لقەدارەکەی بە قەلانگ داهێناو لەخۆی نزیك کردەوە.

**خَرَشَ الدابَّةَ**: ولاخەکەی داخ کرد.

**خَرَشَ الذُّبَابُ فلاناً**: مێشەکە، زەردەواڵەکە فلانکەسی گەست.

**خارَشَهُ مُخارَشَةً**: جەستەی یەکتریان روشاند.

**خَرَّشَ الزرعُ**: سەرێکی دەنکە مێوەکە لەگوڵەکەی دەرکەوت.

**خَرَّشَ الجَسَدَ**: بەمانا (خَرَشَهُ) دێ.

**اخْتَرَشَ لأهله**: کاسبی بۆ ماڵو منداڵی کرد.

**اخْتَرَشَ الجَسَدَ**: بەمانا (خَرَشَهُ) دێ.

**اِخْتَرَشَ الشَّيْئَ**: شتەکەی وەرگرتو بەدەستی هێنا.

**تَخارشت الكلاب والسنانير**: سەگەکان پشیلەکان یەکتریان شرو وڕ کرد.

**الخِراشُ**: داخێکە لاکێشەییە پێستی ئاژەڵی پێ داخ دەکرێ ٥ (ك:أخرشة).

**اَلْخُرَاشَةُ**: ئەو وردەو پرژو پاڵەی لەکاتی برینەوەو شکاندنی شتدا

دەکەوێتە خوار ٥ دەگوترێ: (لی عنده خُرَاشَةٌ) مافێکی کەمم لایەتی.

**الخَرَشُ**: شتی پڕو پوچی ناومالّ؛ کەلو پەلی بێ نرخو لەکارکەوتووی ناومالّ ٥ پیاوێک لەترسان یا لەبرسان خەوی کەم بێ ٥ یان ئەرکی سەرشانی بێ ئەونەنوێ حەرصی شتێک بێ.

**الخُرَشُ**: شتی خراپو بێ نرخی نامالّ، (ك: خُرُوش).

**الخِرْشَاءُ**: توێکلی سەرەوەی هێلکە توێکلە تەنکەکە ٥ توێژی مار ٥ سەرتوێژی ماستو شیر ٥ مێوو کەرەشانی هەنگوێن یان ئەو هەنگانەی لەناو هەنگوینەکەدا مردون.

**خِرشاءِ الصدرِ**: ئەو بەلغەمو لینجاییە کە لەسینگ دێتەدەر ٥ تەپو تۆز ٥ دەگوترێ: (طلعت الشمس في خِرشاء) خۆر لەناو تەمو غارو تەپو تۆزو تەم مژدا هەلّهات ٥ هەروەها وشەی (خِرشاءَ) ناوە بۆ هەرشتێک کلۆربێو هاوسانو کونو شیتالّی تێدابن، (ك: خراشيّ).

**الْخَرَشَةُ**: مێش (ك: خَرَش).

**اَلْمِخْرَاشُ**: دارێکە پێستی پێ نیشانە دەکرێ ٥ گۆچان (دارێکە لایەکی کەوانەیی دادێنرێ (ك: مخاريش)٥.

**المِخْـرَشُ**: بەمانا (اَلْمِخْـرَاشِ) دێ ٥ لەحەدیشدا هاتووە: (ضرب رأسة بِخِرْشٍ) ٥ (ك: مخاريش).

**المِخْـرَشَةُ**: بەمانا (المِخْـراش) دێ، (ك: مخارش).

**خَرْشَبَ عَمَلَهُ**: ئیشەکەی باش ئەنجام نەدا.

**الخُرْشُبُ**: درێژو قەلّەو.

**خَرْشَفَ القوم**: خەلّکەکە کەوتنە جمو جوڵو هەراو هۆریا.

**الخِرْشَافُ**: زەوی رەقەلانو پتەو کە نەتواندرێ رۆیشتنی لەسەر بکرێ.

**الخَرْشَفَةُ**: بەمانا (الخرشاف) دێ.

**اَلْخُرْشُوفُ**: روەکێکی وەرزانەیە گولّەکەی ئونبوبییە بەرەکەی بەگەلا داپۆشراوە دەکولّێندرێ دەخورێ.

**خَرْشَمَ الرجلُ**: دەمو چاوی دزێوبوو.

**اخرَنْشَمَ**: خۆی بەمزلزانیو لەدلّی خۆی دا خۆی پێ پەسەند بوو ٥ رەنگی گۆڕاو گۆشتی پێوەنەما.

**الخِرْشِمُ**: (جبل خِرشم) کێوێکی وشکو رەقو تەق.

**الخِرْشِمَةُ**: ئەوەیە کەزەوی پتەو بێ وەکوو بەردە زڕوێ، رەقەلانو سەخت بێ وشکو بێ ئاوبێ.

**الخُرْشُومُ**: دوندی کێو، لوتکەی

کەژ ٥ بەرزایی کێو کە بەسەر دۆڵو شیوو دەشتایی دا بڕوانێ ٥ کێوی گەورەو بەرز ٥ پارچەیەك لە زەوی کەسەختو پتەو بێ.

**خَرَصَ** خرصاً: درۆی کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿قُتِلَ الْخَرَّاصُونَ﴾.

**خَرَصَ** الشَّيْءَ: لەخۆیەوە شتەکەی مەزندە کرد، دەگوترێ: (خَرَصَ النَّخلَ والكرمَ): باخە خورماکە یان ڕەزەکەی خەرساند ٥ لەلایەن خۆیەوە بەرو بوومی باخە خورماکە یان ڕەزەکەی مەزندەکرد.

**خُرَّاص**: زۆر مەزندەکارو لێزان لەخەرساندنی باخە خورماو باخە مێودا.

**خَرَصَ** النَّهرَ: بەری چەمەکەی گرت.

**خَرَصَ** الشَّيْءَ خِراصةً: شتەکەی چاك کردەوە.

**خَرِصَ** خَرَصاً: برسیایەتیو سەرمای توش بوو (هو خَرِصٌ)

**اختَرَصَ**: درۆی کرد ٥ دەگوترێ: (اختَرَصَ القولَ) قسەکەی هەڵبەست ٥ بەویستی خۆی مەزندەی کرد هیچ یاساو ڕێسایەکی بەرچاو نەگرت.

**تَخَرَّصَ**: بەناڕەواو بەتاڵ درۆی هەڵبەست.

**تَخَرَّصَ القولَ**: بەمانا (اخترصه) دێ.

**الخِراصُ**: رمب ، سەرە رمب.

**الخُرصُ**: بەمانا (الخِراص) دێ ٥ ئەڵقەی زێڕ یان هی زیو ٥ گوارەی یەك گۆ ٥ کوپەو کۆڵینە ٥ زەنبیلەی دوو قوڵفە ٥ حوشتری بەهێز ٥ (ك: أخراص وخِرصان).

**الخُرصُ**: بەمانا (اَلْخِراص) دێ ٥ هۆرو جەوالو خەرار ٥ لقی درەخت ٥ ئەڵقەی زێڕو زیو ٥ بۆیە لە حەدیثدا هاتووە ڕۆژێك پێغەمبەر (د.خ) ئامۆژگاری ئافرەتانی کردو هەڵینان بۆ بەخشینو خێرو صەدەقە، (فجعلت المرأة تلقي الخرصَ والخاتمَ) ٥ گوارەی یەك گۆ ٥ دارێکە هەنگوینی پێ لەکۆڵەس دەردەهێندرێ.

**اَلْخُرْصَةُ**: خواردەمەنییەکە بۆ ئافرەتی زەییستان ئامادە دەکرێ.

**اَلْخَرِيصُ**: بەمانا (الخِراص) دێ ٥ ئەستێرە ئاوێکە لەروبارەوە ئاوی تێ دێو پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ناو روبارەکە ٥ ئاوی سارد، دەگوترێ: (ماء خريص)، کەناری روبارو کەناری دەریا ٥ دورگەی ناودەریا.

**اَلْمِخْـرَصُ**: بـەمانا (الخِـراصُ) دێ، خەنجـەر ٥ دارێـکە هـەنگوێنی پـێ لەکوولـەس دەر دەهێنـدرێ، (ك: مخارص)٥.

**خَرطَـت الدابّـةُ خِراطـا**: ولاخەکـە سەرکەش بـوو رێشمەکەی لەدەست خاوەنەکەی ساندو رۆیی.

**خَرَطتِ المرأةُ**: ئافرەتەکە سەرکەش بـوو قسەی ناشیرین و جوێنی ناڕاستەی بەرامبەرەکەی کردن.

**خَرط** في حديثه: لەقسەکانی دا درۆی کرد.

**خَـرَط** في الأمـر: لـە ئیشەکەدا پێکیشی لـەراو بۆچـونی خـۆی کـرد ٥ قـسەی کەسی قبوڵ نەبوو ، هەر قسەی خۆی بەلاوە پەسەند بوو.

**خَرَط** الشَّجَرَ: گەڵای درەختەکەی رنی.

**خَرَط** العنقـودَ: هێشوی میوەکـەی خـستە ناو چنگی خۆیەوە.

**خَـرَط** الـدَّواءُ فلانـاً: دەرمانەکـە سـکی فلانکەسی چواند.

**خَـرَط** الابـلَ في المرعـى: حوشـترەکەی بـــەرەڵای نـــاو لەوەڕگاکـــە کــرد ٥ دەگــوترێ: (خَـرَط البــازي): بازەکەی ناڕاستەی نێچیرەکە کرد.

**خَرَط** تابعـه علـى النـاس: رێـگای بەهـەوا خواهـانی خـۆی دا زیـان بەخەڵـك بگەیەنن.

**خَـرَط** العـودَ: دارەکـەی سـپی کـرد توێکڵەکەی لێکردەوەو رێکی خست.

**خَـرَط** الأشـياءَ: شـتەکانی هـەموو لەخەریتەیەکدا کۆکردەوە.

**خَرَط** الحديدَ: ئاسنەکەی وەکوو تەزە درێژ کردەوە.

**خَرِطَت اللبونُ خَرَطا**: حوشـترەکە شیری بەناخۆشـی هاتـەدەر یـان شـیرەکەی هاتـە دەرو ئاوێـکی زەردی لەگەڵـدا بوو.

**خَـرَط** فـلانٌ: فلانکـەس خواردنەکـەی لەقورگ گیرا.

**اخْـرَطت اللبونُ**: بەمانا (خرطت) دێ.

**خَرِط** الخريطةَ: نەخشەکەی کێشا.

**خَرَّط** الدواءُ فلانا: بەمانا (خَرَطَهُ) دێ.

**اخْتَرَطَ** في البكاء: کەوتە گریـان و ژێـر نەبووەوە.

**اخـْتَرَطَ** العنقـودَ: هێـشوە میوەکـەی خستە دەمیەوەو لاسکەکەی بەروتی لەدەم هێنایـە دەرو بۆڵـەکانی لـەناو دەمی دا مانەوە.

**إختَـرَط** الـسيفَ: شمـشێرەکەی لـەکالان دەرکێشا.

**إنْخرَطت الدابّةُ**: بەمانای (خَرَطَتْ) دێ.

**انْخَرَط** الصقرُ: بازەکە کەوتە خوار.

**انْخَرَط** جسمُهُ: جەستەی لاواز بوو.

**انْخَرَط** الفرسُ وغيره في العدو: ئەسپەکە

یا وڵاخەکە لە غاردان تیژڕۆ بوو.

**اَفْرَط في الأمر**: لە ئیشەکەدا هەر بەقسەی خۆی کردو گوێی نەدایە راوو بۆچوونی کەسانی تر.

**انْخَرَطَ علیه بالقبیح**: بەقسەو ئوسلوبی ناشیرین روی تێکرد.

**تَخَرَّطَ في الأمر**: لەکارەکەدا هەر رای خۆی پێ پەسەند بوو گوێی نەدایە راوو بۆچوونی کەسانی تر.

**استَخْرَطَ في البكاء**: دەستی دایە گریانو ژێر نەبوووەوە.

**الاِخْرِيطُ**: روەکێکە لەخۆشترین گیا ترشۆکەکانە، حوشتر حەزی لێ دەکا.

**الخُراطَةُ**: ئەو وردەو پرژو پاڵەیە لەئاکامی برینەوەو تاشینی شت دەکەوێتە خوار ٥ ئاوێکی کەم لەگواندا.

**خراطة الامعاء**: ئەو شتەیە لەکاتی سکچونی بەردەوامدا لە ریخۆڵە دێتە دەر.

**الخَرَّاط**: کارتیخ؛ ئەو ئاسنە گرگرناوییە یە دارو ئاسن دەرنێ.

**الخِرْطُ**: شیری مەیی‌و کە ئاوێکی زەردی بکەوێتە سەر.

**الخريطة**: تورەکێکە لە پێست دروست دەکرێ دەمەکەی دەبەسترێ ٥ لەزاراوەی زانایانی سەردەمدا بریتییە لەو شتەی روبەری زەوی یان هەندێکی لەسەر نەخش دەکرێ، (ك: خرائط).

**اَلْمِخْرَاطُ**: لەئاژەڵی شیردەردا بەوانە دەگوترێ شیرەکەی خەست بێ یان ئاوێکی زەردی تێکەڵاوبێ بەهۆی نەخۆشییەوە ٥ هەروا ناوە بۆ ئامێری رنین وەکوو کارتێخو برمەند ٥ (ك: مخاريط).

**اَلْمِخْرَطُ**: ئامێری رنین‌و هەڵکراندن وەکوو برمەندو کارتێخ (ك: مخاريط).

**المِخرَطَة**: بەمانا (المِخْرَطُ) دێ.

**المَخرُوطُ**: شتێك وەکوو مزراح وابێ سەرەوەی پان بێ‌و وردە وردە باریك بێتەوە تا دەگاتە خاڵی سفر یان روبەرێکی بچوك تر.

**الخَرْطُوشَ**: ناواخنی چەکی ئاگرین واتە: باروت.

**خَرْطَمَهُ**: لەلوتی دا ٥ لوتی خوارکرد.

**اِخرَنْطَمَ**: لوتبەرزیی نواند ٥ خۆی بەزلزانی، لوتی خۆی وەرگێڕاو رقو کینەی خۆی خواردەوە.

**الخُراطِمُ**: لەئافرەتدا بەوانە دەگوترێ: بەساڵاچووبێ.

**الخُرْطُومُ**: لوت، کەپو ٥ سەری لوت ٥ دەگوترێ: (خرطوم الفیل)

(خرطوم الخنزير)، دەگوترێ: (وسَمَهُ على الخرطوم) زەلیلو ڕیسوای کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿سَنَسِمُهُ عَلَى الْخُرْطُومِ﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ شەرابێك کەزوو سەرخۆش بکا ٥ (ك: خراطیم).

خراطیم القوم: گەورەو پیاو ماقوڵانی خەڵك.

اَلْخُرْطُمانيُّ: لوت زل، کەسێك کەپوی زۆر گەورەبێ.

الخراطین: کرمی درێژ لەناو قوڕو لیتەی روبارەکاندا.

خَرَعَ الشَّيْءَ خَرْعاً: شتەکەی شەقکرد.

خَرِعَ الشَّيْءُ خَرَعاً وخُراعةً: شتەکە نەرم بوو داچۆڕا بێ هێز بوو.

خَرِعَ فلان: فلانکەس دەهشەت گرتی ٥ لە حەدیثی ئەبو سەعیدی خودری دا هاتووە: (لوسمع أحدكم ضغطة القبر لَخَرِعَ) ٥ (هو خرِع وخريعٌ وهي خرعة وخريعة).

خَرُعَ خَراعةً وخروعةً: بەمانا (خَرِعَ) دێ.

خُرِعَ خُراعاً: ساغو سەلیم بوو کەوتو مرد ٥ شێت بوو.

خَرَّعَ الثوبَ: کراسەکەی بەتۆو زەعفەران رەنگ کرد.

اخْتَرَعَهُ: بەمانا (خَرَعَهُ) دێ ٥ شتێکی تازە قەڵای داهێنا؛ دروستی کرد ٥ بەسەر پێو گۆزو گوممەتو بێ لێوورد بوونەوە وتارەکەیدا ٥ قەصیدەی دانا.

اخترع فلاناً: فلانکەسی هەڵخەڵەتاند ماڵەکەی برد.

اخْتَرعَ الدابَّةَ: وڵاغەکەی هەوسارکرد ٥ دای بەیەکێکی تر سودی لێ وەربگرێ، دوایی لێی وەرگرتەوە.

انْخَرَعَ: دولەت بوو، قڵیشا ٥ نەرم بوو داچۆڕا، شۆڕ بووەوە.

انْخَرَعَ الرجلُ: پیاوەکە زەلیلو لاواز بوو، دەگوترێ: (انْخَرَعَ له) ملکەچی بوو.

انْخَرَعَ العضوُ: ئەندامێکی جەستەی لەجێ چوو لەشوێنی خۆی خزا.

تَخَرَّعَ: بەمانا (انْخَرَعَ) دێ.

الخُراعُ: دابڕانێك لە پشتی حوشتردا پەیدا دەبێ.

الخَراعَةُ: بێ حەیایی و روتو قوتیو سفوریو بەدڕەوشتی.

الخِرْبِعُ: دەنکە تۆوی گیازەعفەران.

الخَرَوعُ: نیشانەو داخێکە لەگوێی مەڕ دەکرێ ، سەری گوێچکەی دەکرێ بەسێ تلیش، تلیشی ناوەڕاست بۆ دیوی ناوەوە خوار دەکرێتەوە.

الخِرْوَعُ: ئافرەتی بێ شەرمو حەیا تکاو ٥ ئافرەتی نەرمو نۆڵو شلك.

الخِرْوَعَةُ: دەگوترێ: (امرأة خِروعة)

ئافرەتێكی جوانو نەرمو بارخۆشو ڕەت نەكەرەوەیە.

**اَلْخَرِيعُ**: بەمانا (الخِرِّيع) دێ، ئافرەتی بێحەیا ٥ هەرشتێك خێرا بشكێ ، لیچی حوشتر كە شۆڕ بوبێتەوە.

**الخَرِيعَةُ**: بەمانا (الخَرُوعُ) دێ.

**الخَرْعَبُ**: تولە داری درێژو نەرمو تازە ڕواوو شوورك ٥ تووڵە نەمام ٥ ئافرەتی جوانی ڕەوشت بەرزی نەرمو نیانو شلك ٥ (ك: خَراعِبُ).

**الخُرعُوبُ**: بەمانا (الخَرْعَبُ) دێ ٥ قاشە خەیارو ترۆزی ٥ پارچە بەز (ك: خراعیب).

**خَرَفَ فِي بستانه**: لەوەرزی پایزدا لەناو باخەكەی مایەوە بۆ ئەوەی میوەكەی بچنێ.

**خَرَفَ الثَّمَرَ خَرْفاً وخِرافاً**: لەوەرزی پایزدا میوەكەی چنی، ڕنی، دەگوترێ: (خرف النخلَ).

**خَرَفَ الماشيةَ**: گیاو گژێكی بۆ ئاژەڵەكان ڕواند تا لەپایزدا بیخۆن.

**خَرِف خَرَفاً**: عەقڵی تێكچوو ، شێت بوو لەبەر پیریو كەنەفتی، (هو خرِف وهي خَرِفَةٌ).

**خُرِفَ الرجلُ خَرَفاً**: بەمانا (خَرِفَ) دێ.

**خُرِفَ**: بارانی پایزی لێباری، دەگوترێ: (خُرِف القومُ)، (خُرِفت الأرضُ).

**أخْـرَفَ**: چووە ناو وەرزی پایزەوە، (أخرفت الدابةُ) ولاخەكە یان حەیوانەكە لە پایزدا بێچوی بوو ٥ (هي مُخْرِفٌ).

**أخْرَفَ النخلُ**: كاتی ئەوە هات خورماكە بەرەكەی لێبكرێتەوە.

**أخرفت الذُّرَةُ**: زوراتەكە زۆر درێژ بوو.

**أخْرَفَ القومُ بمكان كذا**: خەڵكەكە وەرزی پایز لەو شوێنە مانەوە.

**أخْرَفَ الكِبَرُ الرجلَ**: پیریو تەمەندرێژی پیاوەكەی تێك داوە.

**أخْرَفَ فلاناً نخلةً**: دارخورمایەكی بۆ فلانكەس دیاری كرد تا لە وەرزی پایزدا میوەكەی بچنێ.

**خارَفَهُ مُخارَفَةً وخِرافاً**: سەراپای وەرزی پایز مامەڵەی لەگەڵداكرد ٥ لەپایزدا بەكرێی گرت.

**خَرَّفَهُ**: بەعەقڵ تێكچوو خەرفاوی لەقەڵەم دا.

**اخترف الثمر**: بەمانا (خَرَفَهُ) دێ.

**الخارِفُ**: چاو دێری باخە خورما (ك: خُرافٌ).

**الخِراف**: كاتی ڕنینو چنینی میوە لەوەرزی پایزدا.

**الخُرافَةُ**: ئەو بەرو بومەی لەپایزدا دەچندرێو دەڕندرێ ٥ قسەی

خـۆش‌و درۆ؛ کـه بـۆ پێـکه‌نین دەگـوترێ: (الخُرْفَـةُ): میـوەو بـەرو بوومی چنراو لەوەرزی پایزدا.

اَلْخَرُوفُ: شەکە بەران.

خروفة: کاوڕ ٥ (ك: خِراف وأخـْرِفَةٌ) ٥ لەپەنـدی پێـشیناندا هـاتووە دەڵـێ: (فلان کالخروف أینما اتَّکأ اتَّکأ علی صـوف): فـلان وەکـوو کـاوڕ وایـە چونێـك ئەمـدیو ئـەو دیـو بکـا ڕاخەری خورییە.

الخروفةُ: دارخورما پیاو هەڵیدەبـژێرێ‌و هـەڵی دەگـرێ بـۆ ئـەوەی هـەرکاتێ ویـستی خورماکـانی لێبکاتـەوە بـۆ خواردنی خۆی‌و ماڵ‌و منداڵی ٥ (ك: خَرائِف).

الخریـف: وەرزی پـایز ٥ بـارانی وەرزی پـایز ٥ (بـارانی پەڵـە) ٥ سـەرەتای بـارانی وەرزی زسـتان ٥ خورمـاو روتابی چنراوی وەرزی پایز.

لبن خریف: شیری تازە دۆشراو.

الخریفة: بەمانا (الخَرُوفَةُ) دێ.

اَلْخْرَف: شوێنی مانەوە لەکاتی وەرزی پـایزدا ٥ بـاخ‌و کۆمەڵـە درەختـی میوە.

اَلْمخْرَفُ: زەمبیلەی بچوك کە میوەی هەڵبژاردەی بەتامی لەوەرزی پایزدا تێدا دەچنرێ ٥ (ك: مَخارِف).

اَلْمَخـْـرَفَةُ: بـاخ‌و کۆمەڵـە درەختـە خورما ٥ ڕێگای ئاشکراو رون ٥ (ك: مخارف).

خَرْفَجَهُ: پان‌و فراوانی کرد ٥ دەگوترێ: (عـیش مُخَـرْفَجٌ) ژیانێـکی خـۆش‌و هـەرزانی بـەرفراوان‌و بـێ تـەنگ‌و چەڵەمە.

سـرابیل مُخرفَجَـةُ: (سـراویل مخرفجـة) دەرپێی پان‌و پۆڕ.

خَرفج فلاناً: خۆراکی باشی بۆ فلانکەس دابین کرد.

خـرفج الـشَّیْئَ: شـتەکەی زۆر وەرگـرت زۆری لێ هەڵگرت.

الخُـرافِجُ: ژیـانی خـۆش‌و نـەرم‌و نـۆڵ ٥ قەڵـەوو گۆشـتن، دەگـوترێ: (نبـت خـرافج): روەکێـکی ناسـك‌و تەڕو تازەیە.

الخِرْفاجُ: ژیانی خۆش‌و نەرم‌و نۆڵ.

الخُرْفُجُ: بەمانا (الخِرفاجُ) دێ، (خـروف خُرْفُجُ) بەرخێکی قەڵەوە.

اَلْخرفیجُ: بەمانا (الخِرْفاجُ) دێ.

الخُرْفُـقُ: پـەمو کـە بـەرِوەکی خۆیـەوە بیرو کەڵکی نەمابێ.

الخَرْفَـقُ: خـەردەلی فارسـی ٥ لـەوڵاتی میـصر بەحەشیـشەی سـوڵتان بـەناو بانگە.

خَرَقَ فی البیت خروقـاً: لەماڵەوە مایـەوەو دەرنەچوو.

**خَرَقَ الشَّيءَ خَرْقاً**: شتەكەی هەڵشاند دڕاندی.
**خَرَقَ الأرضَ**: زەوی دابڕی تا گەیشتە ئەو پەڕی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ الأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولاً﴾.
**خَرَقَ الكذبَ**: درۆی هەڵبەست ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَخَرَقُواْ لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ سُبْحَانَهُ﴾.
**خَرِقَ خَرَقاً**: ئەحمەق بوو ٥ لەكارەكەی دا نەرم نیان نەبوو ٥ دەهشەت گرتیو سەرسام بوو (هو خَرِقٌ).
**خَرِقَ الظَّبيَ وخرق الطائر**: ئاسكەكە یان باڵندەكە راوكەرەكەی بینی سەری لێ شێوا لە شوێنی خۆی جوڵەی نەكرد ٥ ترساو هیچ پەلەقاژەی راكردن یان فڕینی نەكرد.
**خَرِقَ بالشَّيء**: شتەكەی نەزانیو نەیتوانی ئەنجامی بدا.
**خَرِقَ في البيت**: بەمانا (خَرَق) دێ ٥ (هو أخرق وهي خرقاء).
**خَرُقَ خُرْقاً**: ئەحمەق بوو.
**خَرُقَ بالشَّيءَ**: شتەكەی نەزانیو بۆی ئەنجام نەدرا.
**أخْرَقَهُ الفَزَعُ**: ترس سەری لێ شێواند.
**خَرَّقَ الثَّوبَ وغَيرَهُ**: دراویی قوماشەكەی زیادكرد.
**خَرَّقَ الكذبَ**: درۆی زۆری هەڵبەست.
**اخْتَرَقَ الثوبَ ونحوه**: قوماشەكەی دڕاند.
**اخْتَرَقَ القومَ**: بەناو ئاپۆڕای خەڵكەكەدا رۆیی.
**اختَرَقَ دار فلان**: ماڵی فلانكەسی كرد بەرێگای خۆی بۆ پێداویستییەكانی.
**اختَرَقَ الأرضَ**: قەد بڕ بەناو ئەرزەكەدا رۆیی گوێی بەرێگانەدا.
**اختَرَقَ الخيلُ مابين القرى والشجر**: ڕەوە ئەسپەكە بەناو گوندو درەختەكاندا بڵاو بوونەوە.
**انْخَرَقَ الشَّيْءُ**: شتەكە قڵشا دادڕا.
**اِنْخَرَقَتِ الريحَ في الأرض**: رەشەباكە پێچاو پێچ هاتو هەڵی كرد ٥ رەشەباكەی توند بوو چووە هەموو كونو قوژبنێكەوە.
**تَخَرَّقَ**: بۆ موطاوعەی (خرَّقه) هاتووە.
**تَخَرَّقَ في الكَرمِ**: لەبەخشیندا زۆر زێدە رەوی كرد.
**تَخَرَّقَ في الكذِبِ**: دروی هەڵبەست.
**الخارق**: (سيف خارق) شمشێرێكی برندەیە ٥ رووداوێكە ٥ شتێكە پێچەوانەی یاسای سروشتە ئەگەر بەشێوەی تەحەددا بوو دەبێتە موعجیزە.
**الخُرَيْقُ**: جۆرە جۆلەكەیەكە.
**الخِرِّيقُ**: جوانمەردی سەخی سروشتو بەمانا هاتووی لێقەوماوانەوە.

**الخَرْق**: كونی دیوارو شتی تر ٥ دەشتو سارا ، سارای بەرفراوانو دورو درێژ کەرەشەبا پێیدا بڕوا ٥ (ك: خُرُوقٌ).

**الْخُرق**: نەزانیو نەفامی ٥ نەحمەقی.

**الخرِق**: بەمانا (الخريق) دێ.

**الخُرِقُ**: تەپو تۆز.

**الخَرْقاءُ**: زەوی پانو پۆڕ کەرەشەبا تەی بکا ٥ رەشەبای تێژڕۆ، کەهەردەم بەلایەکا دەڕوا ٥ ئافرەتی گێلۆکەی شت نەزان کە دەست رەنگین نەبێ.

**أذن خَرْقاءُ**: گوێچکەیەك نەمدیو ئەو دیو کونبێ.

**شاة خرقاءُ**: مەڕێکە گوێچکەی کونبێ کونەکە کەوانەیی بێ ٥ یان لەناوەراستی گوێچکەی دا کونەکە هاتبێ تا قەراخی گوێچکەکە.

**الخِرْقَةُ**: پارچە پەڕۆی شڕو وڕ.

**الخُرُوقُ**: رەشەبای سارد.

**الخَرِيق**: چاڵو نزمایی زەوی کە گیای لێراوبێو کەوتبێتە نێوان دوو پارچە زەوی بێ گیاو گژ ٥ رەشەبای سارد ٥ بای شەماڵو هەوای ساردو فێنك کە کەمکەم هەڵبکاو بووەستێتەوە ٥ دەراوی دۆڵو شیو ٥ ڕێڕەوی ئاو، کەزۆر قوڵ نەبێ، بێ دارو درەختیش نەبێ ٥ یان منداڵدانی ئافرەت کە بەهۆی منداڵ هاتنە دەرەوە هەڵدرابێو گوشتەوەزونی نەهێنابێتەوە، (ك: خرائق وخُرُقٌ).

**اَلْمُخْتَرَقُ**: رێڕەوی هەوا شوێنی هەڵبوونیو رێڕەوی رۆیشتنی.

**المِخْرَاقُ**: پیاوی شۆخو شەنگو قەدو باڵا جوانو بەژن ڕێکو پێك ٥ کارو ئیشی ئەنجامدراو ٥ کارو ئیش ئەنجامدەر (ئیش لەدەست هاتوو).

**مِخراق حرب**: شەرەنگێزو تێ هەڵاتوو لەشەڕاندا ٥ پیاوی سەخیو رێزدار ٥ شمشێر ٥ میزەرو پارچە پەڕۆیەك لول دەدرێو بۆ ترساندن پێی لەمنداڵ دەدرێ ٥ کەڵەکێوی.

**اَلْمَخْـرَقُ**: دەشتی پانو بەرین کە رەشەبای تێدا هەڵبکا.

**اَلْمَخْرُوقُ**: بێکەسو هەژارێك شتێکی دەست ناکەوێ بێ ناتاجی بکا ٥ دەگوترێ: (هو مخروق الكف بالنوال) بەهۆی سەخاوەتەوە هیچی بەدەستەوە نەما.

**خَرْقَلَ**: تیرەکەی لەکەوانەوە هاویشت.

**خَرْقَلَ في رميه السهمَ**: زۆر تفەنگچییانە تیرەکەی هاویشت.

**خَـرَمَ الشَّيْءَ خَرْماً**: شتەکەی کون کرد ٥ لەتی کرد ٥ قەڵاشتی، بڕیەوە.

**خَرَمَ فلاناً**: نێوانی دوو کونەلوتی هەڵدڕی ٥ قەراخی لوتی دادڕی.

ماخَرَمَ من الحديث حرفاً: پیتێکی لەقسەکە کەم نەکردەوە.

خَرَمَ الوباءُ القومَ: تاعونەکە خەڵکەکەی لەبێخ دەرهێناو لەناوی بردن.

خَـرَمَ الرامـي القرطـاسَ: هاوێژەرەکـە کاغەزەکـەی هـەنگاوت بـەڵام کـونی نەکرد ٥ دەگوترێ: (ماخَرَمَ الدليل عن الطريـق)، چـاو سـاغو شـارەزا کـە لەرێگاکە لای نەدا.

خَرِمَ خَرَماً: نیوان دوو کونە لوتی شەق بوو ٥ گوێچکەی قەڵشاو هەڵدڕا، (هـو أخرم وهي خرماء).

خَـرُمَ خرامـةً: تونـدو پتـەو بـوو ٥ بـێ شەرمو بێ حەیا بوو.

خَـرَّمَ الـشَّيَ: شـتەکەی شـەق کرد ٥ بڕییەوە ٥ لەحەدیشدا هاتووە: (نهى النبىّ أن يـضحى بالمخَرَّمَةِ الأذن) پێغەمبـەر (د.خ) نـەی لـەوەکرد کـە ئاژەڵی گوێ بڕاو بکرێتە قوربانی.

اخترمته المنيةُ: مردن تێکیەوە پێچا.

إختَرَمَهُ الوباء: تاعون لەناوی برد.

انْخَرَمَ: شەق بوو ، دابڕا گۆشە گیر بوو.

انْخَرَمَ العامُ: ساڵەکە تێپەڕیو ڕۆیی.

انْخَرَمَ القومُ: خەڵکەکە فەوتانو تێدا چون.

انْخَرَم الكتـابُ: کتێبەکە کـەمی هـەبوو هەندێکی لێفەوتا.

تَخَـرَّمَ: شـەقار شـەقار بـوو، درزی بـرد قەڵشا.

تَخَـرَّمَ فـلانٌ: فلانکـەس چـووە سـەر ڕێبازی خورەمییەکان.

تَخَـرَّمَ زَنْـدُ فـلان أو زِيـده: فلانکـەس رقەکەی نیشتەوە.

يَتَخَـرَّم زنـده: دەیـەوێ لـەڕێی زۆرو سـتەمەوە خـۆی فـەرزبکا خـۆی بسەپێنێ.

تَخَـرَّمَ الوبـاءُ القـومَ: تاعونەکـە خەڵکەکەی لەناو برد.

الأخْرَمُ: گردۆڵکەی ناو بانوو دەشتایی ٥ زلکاوو گەڕاو.

أخـرَمُ الـرأي: کەسێـك راو بۆچـونی زەعیف بێ.

الأخرمان: دوو ئێسقان لەم لاو لەولای مەلاشوی سەرو

أخرما الكتفين: شەپیلکی هەردوشان ٥ هەروا لای خواروی شان.

الخرامَـة: ئامێرێـکە کاغـەزی پـێ کـون دەکرێ.

الخُـرُّمْ: بـەناز پـەروەردە ٥ روەکێـکە وەکـوو لۆبیـا رەنگـی وەنەوشـەیی هەیە.

الخُرَّمية: شوێنکەوتانی بابەکی خوڕەمی، ڕێبازێـکە ڕێڕەوانـی بڕوایـان بەتەناسـوخو گواسـتنەوەی گیـان

لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی تر هەیە، هەوڵی لابردنی لەمپەرەکانی نێوان نێرو مێ دەدەن‌و ئیباحی رەهایان گەرەکە ٥ (الخَرَمُ) لوتکەی کەژ.

**الخَرْمَاءُ**: گردۆڵکەیەکە لەناو دەشتایی یەك دا ٥ قەڵاو شوورایەك نەتواندرێ لەم لاو ئەولای بچێتە ناوی ٥ بزن پانەوپان گوێچکەی ببڕدرێ ٥ درۆزن، (الخُرمانُ) بەمانا درۆزن دێ.

**الخَرَمَةُ**: شوێنی کونە لوت.

**الخَوْرَمَةُ**: پێشی لوت ٥ نێوان دوو کونە لوتی ٥ بەردێك کونکون بێ، (ك: خَوْرَمٌ).

**المخرِمُ**: رێگای ناو کێوو کەژ، یان رێگای ناولیەلان، (ك: مَخارم) لەباسی کۆچی پێغەمبەردا هاتووە کەلەگەڵ ئەبوبەکردا بەلای ماڵی ئەسلەمی ئەشجەعی دا رۆیشتن وشترێکی پێدان چاوساغی لەگەڵ ناردن پێی گوت (أسلك بهما حیث تعلم من مخارم الطرق).

**مَخْرَم الجبل**: لوتکەی کێو.

**مخارم اللیل**: سەرەتای شەو.

**خَرْمَدَ**: لەماڵی خۆی دا مایەوە، سەری لەکۆشی خۆی ژەنی‌و بێدەنگ بوو.

**أخرَمَّسَ**: بێدەنگ بوو، زەلیل‌و گەردن کەچ بوو.

**الخِرْمِسُ**: شەوی تاریك.

**خَرْمَشَ العملَ أو الكتابَ**: کارەکەی تێك دا، کتێبەکەی شێواند.

**إخْـرَنْمَصَ**: بەمانا (إخرَمَّسَ) دێ، دەشگوترێ (إخْرَنْمَصَ).

**خَرْمَلَ وَبَرُ البعیر**: تووکی حوشترەکە لەقەڵەویان بەری دا.

**تَخَرْمَلَ الثوبُ**: قوماشەکە ونجڕ ونجڕ بوو.

**الخِرْمِلُ**: خەڵکی زۆر ٥ ئافرەتی دەنگ‌و دۆرە ناخۆش ٥ پیرێژنی پەککەوتە ٥ ئافرەتی بەدکارو ئەحمەق ٥ حوشتری پیر (ك: خرامِلَ).

**خَرَنَفَهُ بالسیف**: بەشمشێر لێی دا.

**الخرانِفُ**: درێژ داوەڵ

**الخِرنِفُ**: حوشتری بەشیرو قەڵەو ٥ لۆکە، (ك: خرانف)

**الخِرْنِفَةُ**: بەروبومی درەختی (غەضاء) ٥ (ك: خرانِف)

**خَرْنَفَتِ الأرضُ**: لەو دەڤەرە کەروێشك پەیدا بوو، کەروێشك زۆر بوو لەو زەوی‌و زارەدا.

**خَرْنَقَتِ الناقةُ**: پیوو بەز لەسەنامی حوشترەکە لۆلۆ وەستا.

**الخِرْنِقُ**: بێچووە کەروێشك، کەروێشکی گەنج.

اَلْخَوَرَنَقُ: باڵە خانەیەك بوو لەعێراق موڵكی نوعمان بوو.

خَزِبَ الجلدُ خَزَباً: پێستەكە بەبێ ئەوەی ئازاری هەبێ هاوسا، قەڵەو بوو تاواندەزانی هاوساوە.

خَزِبَت الناقةُ والشاةُ: گوانی حوشترەكە یان هی مەڕەكە هاوسا ٥ گونی گوانەكانی تەسك بونەوە ٥ گوانی وشك بوون‌و شیری كەم بوو (هو أخزب وهي خزباء).

تَخَزَّبَ الجلدُ: بەمانا (خَزِبَ) دێ.

الخَزَبُ: سواڵەت

الخِزْباءُ: مێشێكە بەزۆری لەناو باغ دا دەژی.

الخُزْبَةُ: كانی زێڕ.

اَلْخَــوزَبُ: هاوسانی گوانی ئاژەڵ (حوشترو مەڕ)

اَلْخَيزَبــان: بەمانا (الخَيــزَب) دێ ٥ بێچوە نوعامەی نێر.

اَلْمِخْزابُ: حوشترێك كەعادەتی وابێ پێستی ئەستور ببێ یان هێندە قەڵەو ببێ وابزانێ هاوساوە.

تَخَزَّبــزَ علينــا: تەكەببوری بەسەرا كردین‌و لوتبەرزی نواند.

اَلْخازبــاز: مێشێكە بەزۆری لەباغ دا دەژی ٥ لاسایی كردنەوەی دەنگە دەنــگو وێـــزە وێزەكەیەتی ٥ دەردێكە توشی قوڕگی حوشتر دەبێ ٥ پشیلە.

الخِزْباز: بەمانا (اَلْخازباز) دێ.

خَزِجَ خَزَجاً: زل بوو، جەستەی زەبەلاح بوو (هو خَزِجٌ)

المِخزاجُ: حوشتری زۆر قەڵەو.

الخُزاخِــزُ: پیاوی بەهێزو چوارپەل قەوی‌و شان‌و مل پان.

خَزَرَ خَزْراً: خۆی بەشارەزا دەرخست ٥ پیاو بەقولینچكی چاوی بەتیلەی چاوی بڕوانێ.

خَزِرت العينُ خَزَراً: چاوی بچوك بون‌و تەنگ بوونەوە ٥ خێل بوو.

خَزِرَ فلان: فلانكەس چاوێكی هەڵێناو لێكی نایەوە ٥ وای ڕوانی دەتگوت بەتیلەی چاوی شت دەبینێ.

خَزَّرَ الشيخ عينيه: پیرەمێردەكە پێڵوی چاوی بچوك بوونەوە هەتاوایان لێهات دەتگوت دوورواون ٥ دەگوترێ: (خَزَّرَ الشابُ عينيه) گەنجەكە پێڵوی چاوی خۆی بچوك كردنەوە بەمەبەستی فەن‌و لێزانی.

خَزَّرَ الشيئ: شتەكەی تەنگەبەر كردەوە.

تَخازَرَ: چاوی خۆی بچوك كردنەوە بۆئەوەی چاوی تیژ ببن‌و باش شت

ببینیٚ ٥ بەتیلەی چاوی روانی.

اَلْخَزَرُ: شۆرباى چەور.

الخَزَرَةُ: دەردێکە توشی باریکایی پشت دەبیٚ.

الخُزَرَةُ: بەمانا (الخَزَرة) دێ.

الخُـزَرَةُ: هەڵگەڕانەوەی بیلبیلەی چاو بـۆلای پێڵـوی چـاو ٥ ئـەم جـۆرە خێلییـە ناشـیرین تـرین شـێوەی خێلییە.

اَلْخَزِیـرُ: گۆشتێـکە دەکرێتـە کوتکوتی بـچوك ئـەمجار بـەئاوو خـوێی زۆر دەکوڵێنـدرێ، کەتـەواو کـوڵا ئـاردی بەسـەردا دەکـرێو دەکوڵێنـدرێ، ئەمجار دەکرێتە پێخۆر ٥ شۆرباى ئاوو رۆنو ئارد واتە: پەڵوی چەور ئەگەر شیرینی تێکەڵ بکرێ دەبێتە حەڵوا.

الخَزِیرَةُ: بەمانا (الخَزِیرُ): دێ.

اَلْخَوزَرِی: رۆیشتنی لارولەنجە ئامێز.

الخَیْزُرانُ: هەرچڵەدارو شورکێك نـەرم بیٚ ٥ دارێکە قەد لوسو بـیٚ گـرێو گـۆڵ ٥ بەنموونـەی راستـیو نـەرمو شـلی دەهێنـدرێتـەوە ٥ قەفـەزاز: دانیشتوانی ناوکەشتی کەدەکەوێتـە بەشی دواوەی.

خَـزْرَبَ الکَـلامُ: قسەکان تێـکەڵاوو بـیٚ سەروبەر بوون.

خَزَجَت الشاةُ: مەڕەکە شەل بوو.

اَلْخَزْرَجُ: بای باشور (ریح الجنـوب) بـای سـارد ٥ (شـێر)؛ بەشێـکی یاریـدەدەرانی پێغەمبـەر بـوون کـە هۆزێکی سەرەکی ناومەدینە بوون.

الخِزْرَافَـةُ: پیـاوی زەعیـفـو بـیٚ وره ٥ کەسێـك نەتوانیٚ یان نـەزانیٚ بەرێـکو پێـکی لـەکۆڕو مەجلیـسدا دابنیـشیٚ ٥ کەسێـك زۆر قـسەی سوکانەو نەفامانە بکا.

خَـزَّهُ بـسهم خَـزّاً: تیرێـکی پێوەنـاو هـەنگاوتی ٥ دەگـوترێ: (خَـزَّهُ ببصره): بەچاو هەنگاوتیٚ.

خَزَّ الحائِطَ: لای سەروی دیوارەکەی بەتەلی دڕك گـرت بـۆ ئـەوەی کـەس سـەردیوارەکە نەکـەویٚ ٥ دەگـوترێ: (خَزَّ الحائط بالشوك).

خَزَّ التمرُ خَزّاً: خورماکە هێشتا کەمێك مـزری تێـدا مـاوەو بەتـەواوی شـیرین نەبووە.

اخْتَزَّهُ بسهم: بـەمانا (خَـزَّهُ بـه) دیٚ ٥ دەگوترێ: (إخـتَزَّهُ ببـصره)، بەچاو هەنگاوتی.

اخـتَزَّ فلانـاً: هاتـە لای فلانکـەس کـە لـەنێو کۆمـەڵدا بـوو شتێـکی لـیٚ وەرگرت.

اَلْخَزُّ: قوماشێکە لەخوریو ئاوریشم پێك

دەهێنـدرێ ٥ یـان هـەموو رایـەڵو تێوەدانەکەی لەئاوریشم دەبێ.

**اَلْخُـزَزُ**: کەروێشکە نێرینـە ٥ بێـچووە کەروێشك ٥ (ك: خِزاز وأخزة).

**الْخَـزَّازُ**: ئاوریـشم فـرۆش ٥ ئاوریـشم ڕێس.

**الْخَزِیـزُ**: هـەموو ڕوەکێـك چـقڵاوی بـێ بەرەکەی زۆر وشك بێ.

**اَلْمَخَزَّةُ**: زەوییەك کەروێشکی زۆر بێ.

**خَزَع** عن أصـحابه خَزْعـاً: لەڕێـگا لەگـەڵ هاوەڵەکانی بوو لێیان دواکەوت.

**خَـزَع** مـن فـلان: فرسـەتی لێ هێنـاو لەفلانکەسەوە شتی دەسکەوت.

**خَزَع** الشَّیْءَ: شتەکەی بڕیـەوە ٥ پارچـە پارچەی کرد.

**خَزَع** اللَّحْـمَ: گۆشـتەکەی پارچە پارچـە کرد.

**خَزَع** فلاناً: نەیهێشت فلانکەس بەئاسایی بڕوا، لەمپەری خستە بەردەم.

**اِخْتَزَعَـه** عـن القـوم: شـتەکەی لەخەڵکەکە بڕی.

**اخـتَزَعَ** فلانـاً عِـرق سـوءٍ: ڕەوشـتە ناشـیرینەکانی بـەفلان تـەرك کـرد وازی پێ لێ هێنا.

**اخْتَزَع** منه شیئاً: شتەکەی لەفلانکەس وەرگرت.

**انْخَـزَعَ** الـشَّیْءُ: شـتەکە کۆتـایی هـاتو نەما ٥ بڕایەوە.

**انْخَزَعَ** الْحَبْـلُ: لەناوەڕاسـتدا حەبلەکـە پچڕا.

**انْخَزَعَ** متن الرجل: پشتی پیاوەکە لەبەر پیری یان لاوازی چۆمایەوە.

**انْخَزَعَ** العود: دارەکە شـکاو بـوو بـەدوو لەت.

**تَخَـزَعَ** عـن أصـحابه: لـەهاوەڵانی دواکەوت.

**تَخَزَّع** اللحمَ: گۆشتەکەی کوتکوت کرد.

**تَخَزَّعَ** منه شیئاً: شتەکەی لێ وەرگرت.

**تَخَـزَّعَ** القـومُ الـشَّیْءَ: خەڵـکەکە شتەکەیان لەناو خۆیاندا بەشکرد.

**الْخُزَاعُ**: مردن.

**الْخُزاعة**: پارچەی شتێـك کە لێـی جیـا بوبێتەوە.

**الْخِزْعَةُ**: پارچەی گۆشت.

**الْخَزُوعُ**: بەکەسێـك دەگوترێ کە لەماڵو سـامانی خەڵـك بەشێـك بـۆ خـۆی دابڕێ.

**الِمخْزَاعُ**: بەمانا (الْخَزُوعُ) دێ.

**الْمُخَـزِّعُ**: کەسێـك کێـشەو نیزاعـی زۆربێ ٥ بەسروشت گێچەڵاوی بێ.

**الْخَزَعْبَـلُ**: قـسەی خـۆش‌و نەسـتەق کـە ببێتە هۆی پێکەنین.

**الْخُزَعْبِلُ**: شتی بەتاڵو بۆچ:

**الْخُوزَعْبِلَـةُ**: گاڵتـەو گـەپ ٥ قـسەیەك ببێتە هۆی پێکەنین.

**خَزَعلت الضَّبُعُ**: کەمتیارەکە وا ڕۆیشت

شەلی پێوە دیاربوو.

**خَزْعَلَ** الماشي: ڕۆیشتوەکە قاچی خۆی ڕاتەکاند لەبەر زۆر ماندوو بوون.

**الخُزْعَالَةُ**: گاڵتەو گەپ.

**الخَزْعَلُ**: کەمتیار.

**خَزَفَ** في مشيه خَزْفاً: لە ڕۆیشتندا دەستی بەرز کردنەوە.

**خَزَفَ** الثوبَ: قوماشەکەی دادڕی دڕاندی.

**الخَــزّاف**: گــۆزەو کیتەڵــە فــرۆش، دروستکاری گۆزەو کیتەڵە.

**الخَـزَف**: هەر قـاپو قاچاخێـك لـە قوڕ دروسـت بکـرێو سـور بکرێتــەوە، بخرێتە ناو کڵەوەو ببێتە سواڵەت.

**خَـزَقَ** الـسهمُ خَزْقـاً وخُزُوقـاً: تیرەکـە لـە کەوانەکەوە دەرچوو.

**خَــزَقَ** الرجــلُ أو الطــائِرُ: پیاوەکـە یـان باڵندەکە ئـەوەی لـە سکیدا بـوو داینـا، ناوسکی خۆی دانا.

**خَزَقَ** السهمُ القرطاسَ: درێوشەکە، تیرەکـە لــە کاغەزەکــەوە چــووە ئــەو دیــو ئەمدیوو ئـەودیوی کـرد، (هـو خـازق) (ك: خوازق).

**خَــزَقَ** فلانــاً بالنبــل: بەسـەرە تیرەکـە فلانکەسی هەنگاوت.

**خَـزَقَ** فلانـاً بـالرمح: فلانکەسـی بـە ڕمـب کەمێ بریندار کرد (برینەکەی سوکە).

**خَزَقَ** فلاناً بعينه: چاوی لە فلانکەس بڕیو هەنگاوتی، چاوەزاری لێکرد.

**انْخَــزَقَ الــشَّيْءُ**: شـتەکە بـە زەویـدا ڕۆچـوو، دەگـوترێ: (انْخَـزَقَ الـشَّيْءُ الحادُّ في الشَّيْءَ).

**الخَـازق**: سـوژن، درێوشـە، سـەرەتیر کـە شت کون بکا ٥ لە پەندی پێشیناندا هاتووە: (لأَنْفَذُ من خازق) ٥ ئەمە بۆ کەسێــك بــەکار دەهێنــدرێ کــە ئیشەکانی باش بڕوا هـەرگیز کێشە نەیەتە ڕێگای.

**الخَـازوق**: عەمودێـك کەسـەرەکەی تیـژ بێ ٥ لە ڕۆژگاری کۆندا ئـەو جۆرە عــەمودەیان چــەقاندوەو زەلامیــان لەسـەر دانـاوە بۆئـەوەی عەمودەکە لە کۆمیەوە بڕواو لـە تـەپلی سـەری دەرچێ.

**الخُزُقُ** (أرض خُزُقٌ): زەوییەك کە ئـاوی تێدا نەوەستێ هەڵۆڵ بێ.

**الخُزوقُ**: حوشترێـکە بە قـەراخی سمـی زەوی کــون دەکــا ٥ یــان کــە دەڕوا سمی لاوو نیـو دادەنـێو شوێنکە لـە زەوی دەکا.

**المِخْزَقُ**: دارێـکە سـەرەکەی بزمارێـکی تیژی پێوەیە (نەقیزە).

**المِخْزَقَةُ**: حەربە.

**خَزَلَ** الشَّيْءَ خزلاً: شتەکەی بڕی، بڕی دا، لێی کردەوە دەگـوترێ: (ضَرَبَهُ فَخَـزَ لَـهُ نصفين).

**خَزَلَ** فلاناً عن حاجتـه: فلانکەسـی عـەوق

کردو نەیهێشت جووڵە بکا.

**خَزَلَ الشَّيْءَ**: ڕەخنەی لە شتەکە گرت، عەیبداری کرد.

**خَـزِلَ الرجـلُ خَـزَلاً**: ناوقـەدی پـشتی هەنگاوت، گازەرەی پشتی شکاند، (هـو أخزل).

**خَزِلَت المرأةُ في مشيتها**: ئافرەتەکە لە ڕۆیشتندا لارو لەنجەی کـرد بـە عاسـتەم سـەری پەنجـەی دەخـستە سـەر زەوی، (هـي خـزلاءُ) ٥ (ك: خَزْلٌ).

**اخْتَزَلَ**: لەنگی، شەل بوو.

**اخْتَزَلَ برأيه**: تاکڕەوانە جولایەوە هەر ڕای خـۆی بـەلاوە پەسـەند بـوو، شتەکەی دابڕی، بڕیدا.

**إنْخَزَلَ**: دابڕا، گۆشەگیربوو.

**إنْخَزَلَـت المـرأةُ في مـشيتها**: بـەمانا (خَزِلَت) دێ.

**إنْخَـزَلَ فـلان عـن الأمـر**: فلانکـەس لە کارەکە هەڵگەڕایەوەو زەعیف بوو.

**إنْخَزَلَ عن جواب ماقلت له**: گرنگی بە وەلامی قسەکەی من نەدا.

**تَخَزَّلَ السحابُ**: هەورەکە وا دەرکەوت وەکوو ئەوەی بگەڕێتەوە دواوە.

**تَخَزَّلَت الْمَـرْأةُ مَـشْيَتَهَا**: ئافرەتەکە لە ڕۆیـشتندا لارو لەنجـەی نوانـد بـە عاسـتەم سـەری پەنجـەی دەخـستە سەر زەوی.

**الأخـزَلُ**: شـەل، حوشترێـك دوگـی نەمابێ.

**الخَزْلُ**: زاراوەیەکی زانستی عوروزە.

**الخُزَلَةُ**: کەسرێکە شکاوییەکە لە پشتدا، زاراوەیەکی عوروزیشە.

**الْخُزَلَـةُ**: ئـەوەی دەتـەوێ لێـت مـەنع دەکا، کۆسپو تەگەرە دەخاتە پێش کارەکەتەوەو ناهێڵێ بە مراد بگەی.

**الْخَـوْزَلَى**: ڕۆیـشتنێکە لارو لەنجـەی تێدایە دەگوترێ: (هو أو هـي تمـشي خَوْزلى).

**الْخَيْزَلُ**: بەمانا (الخوزلى) دێ.

**خَزَلَـبَ الحَبْـلَ أو اللحـمَ**: بـە خێرایـی حەبلەکـەی پـساند هـەڵی بـڕی، گۆشتەکەی پارچە پارچە کرد.

**خَزَمَهُ خَزْماً**: شتەکەی ڕیـز کـرد، کونی کرد، بنکی کتێبەکەی کون کرد.

**خَزَمَ شِراكَ النَّعْل**: شیراکی نەعلەکەی کون کردو توند بەستی.

**خَزَمَ البَعيرَ**: لوتی حوشترەکەی کون کرد، کـونی لـە لالـوتی کـردو لوتەوانـەی تێکرد.

**خَزَمَ أنفَ فـلان**: فلانکەسـی زەلیـل کـردو ژێرباری کرد.

**خَـزَمَ الجـراد في العـود**: کوللـەکانی بـە شیـشەکەوە کـرد بـۆ برژانـدن.

**خازمَهُ الطريق مخازمةً وخِزاماً**: هەریەکە لەو دوو کەسە پێچەوانەی یەکتر هەڵس و کەوتیان کرد، هەریەکەو ڕێبازێکی گرتە بەر بۆئەوەی لە ئاکامدا لەیەك شوێندا یەکتر بگرنەوە.

**خَزَّمَهُ**: بەمانا (خَزَمَهُ) دێ ٥

**تَخَازَمَ الجيشان**: هەردوو سوپاکە ڕوبەڕوی یەکتر بوونەوە.

**تَخزَّم الشوك في رجله**: چقڵ بەقاچیدا چوو.

**الأخْزَم**: نێرە مار.

**الخِزامُ**: لێك چوون، دەگوترێ: (لقيته خِزاماً) توشی بووم ڕوبەڕو.

**الْخزام**: ڕوەکێکی بۆنخۆشە لە پێری (الشفويات) عەتری لێ دروست دەکرێ.

**الخُزامَى**: ڕەگەزی ڕوەکێکە لە پێری (الفصيلة الشفوية) جۆرەکانی بۆندارو عەتر ئامێزن، وەکوو سمڵ و مێخەك ٥ بەزۆری لە وڵاتی هۆڵندا زەرع دەکرێ.

**الخِزامة**: پەتێکی کەوانەییە، دەکرێتە ئەو کونە سماوەی لە لوتی حوشتردایە واتە: لوتی حوشتر دەسمرێ و ئەو پەتەی تێدەکەن وەکوو لوتەوانە بۆئەوەی زیاتر هەوسارو جڵەوی نەرم بێ، دەگوترێ: (جعل في أنف فلان الخِزامة) لوتەوانەی لە لوتی فلانکەس کردوە واتە: ژێر باری کردوەو بە ئارەزوی خۆی کاری پێ دەکا.

**خِزامة النعل**: ئەو تیلمە چەرمەیە دەکرێتە نێوان دوو شیراکی نەعلەکەوە.

**الْخَزَّامُ**: فرۆشیاری درەختی خەزمە درەختێکە لە توێکڵەکەی حەبل و گوش دروست دەکرێ.

**الْخَزْمُ**: لە زاراوەی شیعریدا زیادەیەکە لە سەرەتای شیعرەکەوەیە لە تەفعیلەی عوروزیدا حیسابی بۆ ناکرێ، وا دەبێ یەك پیت دەبێ وا دەبێ تا چوار دەڕوا.

**الْخَزَمُ**: درەختێکە لە توێکڵەکەی حەبلی گوش دروست دەکرێ، لە ڕۆژگاری کۆندا صندوق و پەغدانی کەل و پەلی تایبەتی ئافرەت لەو جۆرە دارە دروست کراوە.

**الْخَزومَةُ**: لە زاراوەی هۆزی هوزەیلدا بە مانگا دەگوترێ، یان مانگای پیرو کورتە بنە، (ك: خَزَائم، خُزُم، خَزُومٌ).

**الْمُخَزَّمُ**: باڵندەو نوعامە (چونکە ئەوانە لوتیان کونی تێدایە).

**خَزَنَ** اللَحْمُ والطعامُ خَزْناً وخزوناً: گۆشتەکە یان خۆراکە بۆگەنی کرد.

**خَزَنَ** الشَيْءَ خَزْناً: شتەکەی خستە ناو گەنجینەوە.

**خَزَنَ** عنه العطاء: بەخششی لێ گرتەوە هیچی نەدایە.

**خَزَنَ** لسانَه: زمانی خۆی پاراست.

**خَزَنَ** السِرَّ: نهێنییەکەی شاردەوە بڵاوی نەکردەوە، (هو خازِن)، (ك: خوازِن).

**مَخْزُون**: لە گەنجینەدا هەڵگیراو.

**أخزَنَ**: دوای هەژاریی دەوڵەمەند بوو.

**اختَزَنَ الشَيْءَ**: شتەکەی خەزن کرد، هەڵیگرت.

**اختَزَنَ الطريقَ**: ڕێگاکەی کورت کردەوە.

**اختَزَنَ السِرَّ**: نهێنییەکەی شاردەوە.

**استَخْزَنَهُ الشَيْءَ**: داوای لێکرد شتەکە خەزن بکا، هەڵی بگرێ.

**الخِزانةُ**: گەنجینە، شوێنی شت تێدا هەڵگرتن، (ك: خَزَائِن)ە پیشەی گەنجینە داریی.

**خِزانة الانسان**: دڵی ئادەمیزاد.

**خِزانة الاحتراق**: لە زاراوەی ئەندازیاری میکانیکی دا ئەو بەتاڵاییە کە سوتانی تێدا دروست دەبێ.

**الْخَزَّان**: زمان، خورما کە ناوەکەی بەهۆی نەخۆشییەوە ڕەش ببێ، شوێنی کۆبونەوەی ئاو (دەریاچە، ئەستێر، تەنکی، حەوز).

**الْمَخْزَنُ**: شوێنی شت تێدا هەڵگرتن.

**خزا** فلاناً: فلانکەسی ژێر بارکردو خۆی بەسەردا سەپاند.

**خَزَا** الدابة: وڵاخەکەی ژێربار کرد.

**خَزَا** النفسَ: نەفسی خۆی گرتەوەو نەیهێشت بەهەوەسی خۆی پەل بهاوێ.

**خَزَا** الشَيْءَ: شتەکەی کردە مڵکی خۆی.

**خَزَا** الفصيلَ: زمانی بێچوە ئاژەڵەکەی دەرهێناو فەلاشتییەوە.

**خَزِيَ** خِزيةً: ڕیسوا بوو کەوتە تەنگژەو ناخۆشییەوە.

**خَزِيَ** فلان خَزَىً وخَزايةً: فلانکەس شەرمی کرد، بەخۆیدا شکایەوە، تەریق بۆوە.

**أخزاهُ**: سوکایەتی پێکرد، ڕیسوای کرد، خەڵەت بوو، قورئان دەفەرموێ: ﴿فَاتَّقُواْ اللّهَ وَلاَ تُخْزُونِ فِي ضَيْفِي﴾.

**خازَىَ** فلان فلاناً: فلانکەس بەسەر فلاندا سەرکەوتوو بوو.

**الخِزْيَةُ**: بەڵاو کارەسات، ڕەوشتێك کە شەرم ئاوەر بێ ٥ هەڵس و کەوتێك ببێتە هۆی ڕیسوا بوون.

**المَخـــزَاةُ**: زەلیلـی و ژێـر دەسـتـی و سوکایەتی، (ك: مَخَازِي).

**المُخْزِيَةُ**: دەگوترێ: (قصيدة مُخـزِية) چامەیەکە لەوپەڕی جوانی و ڕەوانی دایە ٥

**خَسَأَ البَصَرُ خَسْئاً وخُسُوءاً**: چاو مانـدوو بـوو نـەیتوانی درێـژە بـە ڕوانینەکـەی بـدا ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِأً وَهُوَ حَسِيرٌ﴾.

**خَسَأَ الكلبُ وغيره**: سەگەکە چەفەی لێکرا دوور خرایـــەوە هەیـــدی کـــرا، تەکێنـدرایەوە.

**خاسَأَ القَوْمُ**: خەڵکەکە بەردیان بۆیەکتر هاویـشت، کەوتنـــە بـــەردە فڕکـــێی یەکتری.

**إنْخَسَأَ البَصَرُ**: بەمانا (خَسَأَ) دێ.

**تَخَاسَأَ القومُ**: خەڵکەکە شەڕە بـەردیان کرد بە بەردە فڕکێ کەوتنە وێـزەی یەکتری.

**الخاسِـئُ مِـن الكـلاب**: سەگێـك کـە نەهێڵـدرێ لـە ئـادەمیزاد نزیـك بێتەوە ٥ زەلیل و ژێر دەستە.

**الخَسِيئُ**: خوری خراپ و بێ کەڵك.

**خَـسَرَ التـاجِرُ في معاملتـه**: بازرگانەکـە لـە مامەڵەکەیـدا زیـانی پـێ گـەیی و زەرەر مەند بوو.

**خَـسَرَ التجـارة**: لـە بازرگانیکردنەکەیـدا زەرەرمەنـد بوو ماڵ و سامانەکەی کەم بووە.

**خَسَرَ فلان**: فلانکـەس فـەوتا، لـەناو چـوو ٥ گومڕا بوو، سەری لێ شێوا.

**خَسَرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی فەوتاندو لـە کـیس خۆی دا.

**أخْـسَرَ فـلانٌ**: فلانکـەس کەوتـە نـاو زیان و زەرەر مەندییەوە.

**أخْسَرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی کەم کردەوە.

**أخْسَرَهُ في تجارته**: لە مامەڵەو بازرگانی کردنەکەیدا توشی زیانی کرد.

**خَسَّرَ الشَّيْئَ**: شـتەکەی کـەم کـردەوە ٥ خەسارەت مەندی وە پاڵدا.

**خَسَّرَ فلانـاً**: فلانکەسی لە خێـرو بێـر دوور خستەوە ٥ فەوتاندی.

**خَسَّرَهُ سوءُ عملـه**: کـردارە خراپەکانی فەوتاندیان.

**الخَنَاسِيرُ**: گومڕایی، فەوتاندن، غـەدر ٥ لۆمەو تانەو تەشەر.

**الخَنْسَرىَ**: بەمانا (الخناسير) دێ ٥

**الخَيْـسَرىَ**: گومڕایی ٥ فـەوتان و تێـدا چوون ٥ لۆمە ٥ غـەدر ٥ پیاوێـك نەچـێ بـۆ دەعـوەت و نـانخواردن لـە ترسـی ئـەوەی ئـەویش دەعـوەتی ئەوان بکاتەوە.

خَسَّ الرجلُ خسّاً: پیاوەکە کاری پڕو پوچی ئەنجام دا.

خَسَّ النصیبُ: بەشەکە کەم بوو.

خَسَّ نصیبه: بەشەکەی کەم کردەوە.

خَسَّ الرجلُ خَسّاً: پیاوەکە بێ ڕێز بوو کەس بە هیچی نەزانی، دەگوترێ: (خَسَّ فعله وقوله ورأیه).

خَسَّ الشَّیْءُ خَساسةً: شتەکە کێشی کەم بوو، هاوکێشی بەرامبەری نەهاتەوە، رەزیلو بێ نرخ بوو، (هو خسیس) (ك: أخِسّاء وخِسَاسٌ) (هي خسیسة) (ك: خسائس).

أخَسَّ فلانٌ: فلانکەس کردەوەیەکی ناشیرینی ئەنجام دا.

أخَسَّ فلاناً: فلانکەسی بە هیچو پوچ هاتە پێش چاو.

أخَسَّ نصیبَهُ: بەشەکەی کەم کردەوە.

الخُسَاسُ: بێ نرخو هیچو پوچ.

خَسَّسَ نصیبَهُ: بەشەکەی کەم کردەوە.

اسْتَخَسَّهُ: بە هیچو پوچی لە قەڵەم دا.

الخِسَاسُ: دەگوترێ: (هذه الأمور خِسَاسٌ بینهم) ئەو کارو پیشانە، ئەو راوو بۆچونە لە ناویاندا باوە ٥

الْخَسَاسَةُ: ئەو حاڵەتو بارو دۆخەی پیاوی پڕو پوچ تێیدایە.

الخُسَاسَةُ: ماڵو سامانی کەم، ماڵو سامانی بێ بایەخ ٥ پاڵی ئەسپ.

الْخَسُّ: کاهو، روەکێکی گەڵا پانە بە کاڵی دەخورێ ٥ زۆر جۆری هەیە.

الْخُنَّسُ: ئەو ئەستێرانەن کە هەرگیز ئاوا نابن وەکوو ئەستێرەی جەدیو فیرقەدانو ئەو ئەستێرانەی ناویان (بنات النَّعْش)ە بە دەوری قوتب دا سوڕ دەخۆن.

الْخَسِیسُ: شتی کەم، شتی بێ نرخ.

الْخَسِیسَةُ: نزمی قەدرو ڕێز دەگوترێ: (رفع من خَسِیسَتِهِ) لە نابودی خۆی کەم کردەوە.

خَسِیسَةُ الناقةِ: ددانی حوشتر پاش ئەوەی شیلەکانی لە ساڵی شەشەمیدا دەکەون.

الْمُسْتَخِسُّ: روخسار ناشیرین.

خَسَفَتِ الأرْضُ خَسْفاً وخسوفاً: زەوییەکە رۆچوو ئەوەی لەسەری بوون قوتی دان، دەگوترێ: (خَسَفَ الله بهم الأرض) خودا بەناخی زەویدا بردنیە خوارێ.

خَسَفَت عینُ الماءِ: سەرچاوەی ئاوە (کانیاوەکە) رۆچووە خوار.

خَسَفَتْ عینُ فلان: چاوی فلانکەس دەرهات.

خَسَفَ القمرُ: مانگ گیرا، روناکی نەما یان روناکییەکەی کەم بووە.

**خَسَفَ الشَّيْءَ**: شتەکە دڕا، (خَسَفَ الشَّيْءَ) شتەکەی دڕاند.
**خَسَفَ الشَّيْءُ خَسْفاً**: شتەکە کەم بۆوە.
**خَسَفَ بَدَنُهُ**: جەستەی لاواز بوو.
**خَسَفَ فلان**: فلانکەس برسی بووە، نەخۆشی چاك بووە ٥ (هو خاسف) (ك: خُسُفٌ) ٥ (هي خاسفة) (ك: خواسِف).
**خَسَفَ فلاناً**: فلانکەسی زۆر بارکردو ناچاری کرد ئەوکارە بکا.
**خَسَفَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بڕیەوە.
**خَسَفَ البِئرَ**: بیرەکەی لە بەرد هەڵکەند شاخەکەی بڕی ئاوی زۆری لێ هەڵقولاو وشکی نەکرد.
**خَسَفَ للشعراء عين الشعر**: ڕێگەی بواری شیعر بۆ شاعیرەکان ئاسان بوو، شارەزایی فونونو مەبەستەکانی شیعر بوون.
**أخْسَفَتِ العينُ**: چاوەکە کوێر بوو، دەگوترێ: (حَفَرَ فأخْسَفَ): بیرەکەی وای لێهات ئاوی تێدا نەبێ.
**انْخَسَفَتِ الأرض**: بەمانا (خَسَفَتْ) دێ.
**انْخَسَفَتِ العين**: چاوەکە کوێر بوو.
**الأخاسيفُ**: زەوی نەرمەلان.
**الخاسِفُ**: منداڵی قالب سوکی بە جەمو جوڵ.
**الخَسْفُ**: زەلیلیو زۆر دەستەیی، برسیەتی، ستەم، کەمبونی ماڵو سامانو نەمانی خێرو بەرەکەت، ئەو شوێنەی ئاوی بیری لێوە دەردەهێندرێ.
**خَسَقَ السهمُ خَسْقاً وخُسُوقاً**: تیرەکە نیشانەکەی پێکاو تێیدا مایەوە، یان ئەمدیوو ئەودیوی کرد.
**خَسَقَت الناقةُ الأرضَ**: حوشترەکە بە قەراخی سمی شوێنی لە زەوییەکە کرد (هي خَسُوقٌ).
**الْخَسَّاقُ**: درۆزن.
**الْخَسْقَةُ**: ژێوان بوونەوە لە مامەڵەو وادەو بەڵێندا.
**الخَيْسَقُ**: بیری قوڵ، گۆڕی قوڵ.
**خَسَلَهُ خَسْلاً**: دووری خستەوە، نەفی کرد.
**الْخُسالَةُ**: هەموو شتێکی خراپ.
**الْخَسِيلُ**: شتی پڕوپوچ لەهەر جۆرێك بێ (ك: خسائل).
**الخَسِيلُ من القوم**: کەسانی پڕوپوچ لەناو کۆمەڵگەدا.
**الْخَسِيلَةُ**: بەمانا (الْخَسِيلُ) دێ.
**أخْسَاهُ**: بە بەردە وردە یاری لەگەڵ کرد (هەڵماتێنی لەگەڵ کرد).
**تَخَاسَى اللاعبان**: دوو یاری چییەکە یاریان کرد، بە بەردە وردە یارییان کرد (واغ واغێنیان کرد).
**تَخَاسَى القومُ**: خەڵکەکە بە بەردوچکە

يەكتريان بەرد باران كرد بەردوچكەيان بەيەكتردا دان.

**تخاست الدابّةُ بالحصى**: ولاغەكە بەهۆى رۆيشتن بەسەر زيخو بەردە وردەدا قاچى هاوسا.

**الْخَسَا**: تاك، دەگوترێ: (خساً أوزكاً) تاك يان جوت.

**الْخَسِيُّ**: پۆشاك، رەشماڵو خێمە كە لە خورى چنرابێ.

**خَشَبَهُ خَشْباً**: تێكەڵاوى كرد دەگوترێ: (خَشَبَ الشَّئَ بالشئ) ئەو شتەى تێكەڵاوى ئەو شتە كرد ٥

**خَشَبَ السيف**: شمشێرەكەى مشتو ماڵ كردو تيژى كردەوە، (هو مخشوب وخشيب).

**خَشَبَ النَّبلَ والقَوسَ**: بە ناشيەتى تيرو كەوانى دروست كرد چ كارامايىو دەست رەنگينيەكى تێدا نەبوو.

**خَشَبَ الشعرَ أو الكلامَ او العملَ**: چۆنى بۆ رێكەوت ئاوا شيعرەكەى نووسى يان پەخشانەكەى دانا يان كارەكەى كرد هيچ وردەكارييەكى تێدا نەبوو.

**خَشِبَ خَشَباً**: زبرو ئەستورو رەق بوو، دەگوترێ: (خَشِبَ العَيْشُ): ژيانەكە زبرو پڕ تەنگژەو ناخۆشى بوو.

**إخْتَشَبَ السيفُ**: شمشێرەكە تيژ بوو.

**إخْتَشَبَ الشعرَ**: شيعرى دانا بەبێ وردەكارى، كاڵو كرچ بوو.

**تَخَشَّبَت الابلُ**: حوشترەكە ئاڵفى وشكى خوارد.

**اخْشَوْشَبَ**: وشكو رەق بوو لە دينداريو پۆشاكو خواردنو خۆراكيدا، لە هەموو هەڵسو كەوتێكيدا.

**اخْشَوْشَبَ في عيشه**: لە ژيانيدا زبر بوو، بە ئەنقەست ئەو جۆرە ژيانە زبرە پەيرەو دەكا بۆئەوەى بەرامبەر روداوەكانى رۆژگار پشوو درێژ بێ.

**الخَشَابُ**: (أرض خشابٌ): زەوييەكە وشكو هەڵۆڵەو ئاو راناگرێ.

**الْخَشْبَاءُ**: (أرض خشباء) بەمانا (خَشاب) دێ، لە پەندا هاتووە (لسان من رطب ويد من خشب) زمانى شيرينو دەستى بێ خێرو قوچاو.

**الْخَشَبُ**: دار، بەتايبەتى (بنكو قەدو لقو پەلەكانى).

**الخَشّابُ**: دار فرۆش.

ئەو كەسەى بە بەرد شەڕ دەكا.

**الْخَشِيبُ**: لە هەموو شتێكدا رەق

زبرو وشك، له پياوو حوشتردا: درێژ داوەڵی لەرو ئێسقان دەرکەوتوو، بەهۆی ئیش کردنو ماندوبوونەوە.

**أَلْخَشِيبَةُ**: کۆکە کوك کەر، لێدراوو جەستە کوتراو.

**أَلْمُخَشَّبُ**: خانوی بە دار دروستکراو دەگوترێ: (بيت مُخَشَّبٌ).

**خَشْخَشَ السلاحُ وغيره**: چەکەکە خرو وری هات کە چەخماخەکانیان راکێشان خرە خرپان هات.

**خَشْخَشَ الثوبُ الجديد**: پۆشاکە تازەکە خشەی دێ.

**خَشْخَشَ فِي الشَّيْءِ**: چووە ناو شتەکەوەو تێیدا هون بوو.

**خَشْخَشَ السلاح وغيره**: چەکەکەی جوڵاندو خرەی هات.

**خَشْخَشَ الشَّيْءَ فِي الشَّيْءِ**: شتەکەی خستە ناو شتەکەوە.

**تَخَشْخَشَ**: چووە ناویەوەو هون بوو.

**تَخَشْخَشَ فِي الشَّيْءِ**: چووە ناو شتەکەوەو هون بوو، دەگوترێ: (تَخَشْخَشَ في الشجر).

**الخَشْخاش**: کۆمەڵێك بە چەكو زرێوە ٥ کۆمەڵێکی زۆری ئادەمیزاد ٥ هەر شتێکی وشك کە لێکیان بخشێنی دەنگی لێوە بێ ٥ هەروا وشەی (الخشخاش) ناوە بۆ رووەکێك حەشیشەو ئەفیونی لێ بەرهەم دێ ٥ تاکەکەی (خشخاشة).

**خَشَرَ فلانٌ**: فلانکەس چڵێس بوو ٥ لەسەر سفرەو خوانەکە شتی بێ کەڵکی هێشتەوە.

**خَشَرَ الشَّيْءَ**: سۆو خشتو خاڵەکەی لە شتەکە دوور خستەوە ٥ پاکی کرد.

**خَشِرَ خَشَراً**: چڵێس بوو ٥ لەترسا هەڵاتو ڤاچاندی.

**الخُشارَةُ**: ئادەمیزادی خوێڕیو هەتیو مچە ٥ کەفو زبڵو زاڵی سەر دەریا ٥ جۆی بێ ناوك کەهەر سۆیەکەی مابێ ٥ شتی خراپو بێ کەڵك لەهەر جۆرێك بێ.

**الخُشَارَةُ**: بەمانا (أَلْخُشَارُ) دێ.

**خاشر المِنْجَل**: دەمی داس، لا تیژەکەی.

**خَشْرَمَت الضَّبُعُ**: کەمتیارەکە لەکاتی شت خواردندا دەنگی لێوە هات.

**أَلْخَشْرَمُ**: کۆمەڵی هەنگو زەردەواڵەو شامە تریکە ٥ تاکەکەیان (خَشْرَمَةٌ) ٥ هەروا ناوە بۆ مەلیکی هەنگەکان (شاژن) ٥ کۆڵەسو هێلانەکەیان ٥ ئێسقانە نەرمەی لوت ٥ بەردە قسڵ ٥ یان ئەو بەردەی دەگرێ بە گەچ ٥ کێوی پچوك (گرد) ٥ (ك: خشارم).

**خَشَّ** السحابُ خَشاً: هەورەکە بارانێکی کەمی پێوە بوو باراندی.

**خَشَّ** الرجُلُ: پیاوەکە ڕۆیشتو کارەکەی جێبەجێ کرد.

**خَشَّ** في الشَّيْءِ: چووە ناو شتەکەوە.

**خَشَّ** في الدار: چووە ناو خانوەکەوە.

**خَشَّ** البَعيرَ: لوتەوانەی کردە لوتی حوشترەکەو مەهاری کرد؛ (دارێکە بە ئەندازەی دوو پەنجە درێژە دەکرێتە لوتی حوشترو بە هەوسارەوە قایم دەکرێ، بەوە حوشترەکە جڵەوی خۆش دەبێ).

**خَشَّ** فلاناً: فلانکەسی بریندار کرد، زەبرێکی کوشندەی لێدا.

**أخَشَّ** البعيرَ: بەمانا (خَشَّهُ) دێ.

**إِخْتَشَّ** من الأرض: جرو جانەوەری زەوی خوارد، کرمو کوللەی خوارد، گوێچکە نانو میوە رزیوی خوارد.

**انْخَشَّ** في الشَّيْءِ: چووە ناو شتەکەوە، دەگوترێ: (أنْخَشَّ في القوم) چووە ناو خەڵکەکەوە، (وانخشَّ في الشَّجرِ) چووە ناو درەختەکەوە.

**الخَشاشُ**: جرو جانەوەری ناو زەوی ٥ باڵندەو زیندەوەری پەلەوەر ٥ تاکەکەی (خَشاشة) ٥ بوردەی تەنك (عەبای سوکەڵە) ٥ ئادەمیزادی روح سوکی زیرەك ٥ هەر شتێك ناسكو جوانو دڵگیربێ.

**الخِشاشُ**: دارێکە بە ئەندازەی دوو پەنجە درێژە دەکرێتە لوتی حوشترەوەو بە رێشمەکەیەوە دەبەسترێتەوە بۆئەوەی جڵەوی خۆش بێ ٥ ماری کێو ٥ ئەژدیها ٥ جرو جانەوەری ناو زەوی ٥ باڵندەو پەلەوەر ٥ پیاوی رۆح سوکی زیرەكو کار لەدەست هاتوو ٥ جەواڵ ٥ (ك: أخِشة) ٥

**الخُشاشُ**: باڵندەو پەلەوەر ٥ جرو جانەوەری ناو زەوی ٥ پیاوی ئازاو ورە بەرز ٥ شتی خراپ.

**الخِشاشَةُ**: لوتەوانەی حوشتر، مەهاری حوشتر.

**الخَشُّ**: پیادە، پیرۆ ٥ رەشماری گەورە ٥ شتی زبر ٥ بارانی کەم.

**الخُشُّ**: گردۆڵکە، تەپۆڵکە ٥ (ك: أخشاش).

**الخَشاءُ**: کۆلەس، هەنگەلان هیلانەی هەنگو ژەنگە سورەو زەردەواڵە ٥ زەوییەك گڵو چەو بێ، (ك: خشاوات وخشاشيٌّ).

**الخُشاءُ**: ئەو ئێسقانە باریکەی پشتی گوێچکە کە مووی لێ ناروێ.

**المُشَيْشُ**: ئاسكی بچوك ٥ گردۆلكه.

**المِخَشُّ**: پیاوی ئازا، ئیش لەدەست هاتوو ٥ دەگوترێ: (هو مَخِشُّ اللیل) چاو نەترسەو دەچێتە ناو تاریکایی شەوەوە ٥ کەسێك زۆر تێکەڵاوی خەڵك ببێ و ئاخاوتنیان لەگەڵ بکا ٥ ئەسپی چاو نەترس.

**خَشَعَ** خشوعاً: گەردن کەچ بوو، زەلیل و داماو بوو ٥ ترسا ٥ دەنگی نزم کردەوە ٥ چاوی بە دەورو بەردا گێڕاو ئەمجار چاوی لێك نا.

**خَشَعَ** ببصره: چاوی داخست، چاوی لێك نا.

**خَشَعَ** لربه: گەردن کەچی خودا بوو سەری دانەواند ٥ (هو خاشع) (ك: خُشَّعٌ).

**خَشَعَ** صوتُهُ: دەنگی نزم بووە بە عاستەم سرتەی هات ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَخَشَعَتِ الْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا﴾.

**خَشَعَ** بَصَرُهُ: چاوی شکایەوەو نەیتوانی سەیری بکا.

**خَشَعَ** الشَّيْءُ: شتەکە ئارامی گرت.

**خَشَعَ** الوَرَقُ: گەڵاکە سیس بوو.

**خَشَعَتِ** الأرضُ: زەوییەکە وشکەڵ بوو لەبەر بێ بارانی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنَّكَ تَرَى الْأَرْضَ خَاشِعَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ﴾.

**خَشَعَ** الكوكبُ: ئەستێرەکە نزیك بە ئاوابوون بۆوە.

**خَشَعَتِ** الشمسُ: خۆر گیرا، خۆر روناکییەکەی نەما.

**خَشَعَ** السنامُ: دوگەکە بچوك بووە کەمێکی پیو پێوەما.

**إِخْتَشَعَ**: گەردن کەچ بوو، چاوی بە زەویدا گێڕا، دەنگی نزم بۆوە ٥ دەنگی نزم کردەوە.

**تَخَشَّعَ**: خۆی زەلیل کرد ٥ پاڕایەوەو لاڵایەوە ٥ بە زۆر خشوع و گەردن کەچی بەسەر خۆیدا هێنا ٥ چاوی بە زەویدا گێڕاو چاوی نوقاند ٥ دەنگی نزم کردەوە.

**الْخاشِعُ**: ئەو کەسەی بچێتە روکوع ٥ ئەو شوێنەی خاکەکەی لمبەلانە رەشەبا لێی هەڵدەگرێ و شوێنەوارەکەی کوێر دەکاتەوە ٥ شوێنێك کە نادۆزرێتەوە ٥ شوێنی تەپ و تۆزاوی کە کەسی تێدا نەبێ.

**الْخِشْعَةُ**: بێچوێك سکی دایکی هەڵبدرێ و بهێندرێتەدەر بە زیندویی و دایکەکەی بمرێ ٥ (ك: خِشَعٌ).

**الخُشعَةُ**: پارچـه زەوی پتـەو و گردۆڵکەی وەها بە زەوییەکەوە پان بوبێتەوە.

**خَشَفَ خُشْفاً وخُشوفاً وخَشَفاناً**: دەنگی هات، خشەی هات و لە زەویدا هون بوو، بەشەو گەڕا و بەناو زەویدا هاتوو چوو.

**خَشَفَ في الشّيِ**: چووە ناو شتەکەوە.

**خَشَفَ في السير**: بە خێرایی رۆیی.

**خَشَفَ البردُ**: سەرماکە توند بوو پەرەی سەند.

**خَشَفَ الماءُ**: ئاوەکە بەستی، بوو بە سەهۆڵ.

**خَشَفَ الثلْجُ**: لەکاتی بەناو رۆیشتنی بەفردا دەنگی لێوە هات خشەی هات و وژەی هات.

**خَشَفَ الدليل بالقوم**: چاو ساغەکە بە باشی خەڵکەکەی گەیانـدە شوێنی مەبەست و شارەزای کردن.

**خَشَفَتِ المرأة بالولد خَشْفاً**: ئافرەتەکە منداڵەکەی لەبارچوو، منداڵەکەی فڕێ دا.

**خَشَفَ رأسه بالحجر**: سەری بە بەرد بریندار کرد.

**خَشِفَ البعيرُ**: حوشترەکە هەموو جەستەی گرێ بوو، لەبەر گرویی جەستەی پێستی وشکەڵ هەڵگەڕا.

**خَشِفَ الشّيئُ**: شتەکە وشك بوو (هـو أخْشَفُ) (ك: خُشُفاً)ە.

**أخْشَفَتِ الظبيةُ**: ئاسکەکە بێچوەکەی لە تەکدا بوو.

**خاشَفَ السهمُ**: تیرەکە لەکاتی هەنگاوتنی نیشانەکەدا دەنگی لێ هات.

**خاشَفَ الى كذا**: پەلەی کرد بۆلای ئەو شتە.

**خاشَفَ في ذمته**: خێرا وادەو بەڵێنەکەی هەڵوەشاندەوە.

**خَشَّفَ الدليل بالقوم**: چاو ساغەکە بە باشی شارەزایی خەڵکەکەی کردو رێگای نیشاندان.

**الخُشَّاف**: شەربەتی ترێو مێوژ یان هی هەنجیر یان هی هەر میوەیەکی تر دوای ئەوەی دەپاڵێودرێ (بەکورتی خۆشاو).

**الْخَشْفُ**: جمووجوڵ، دەنگ (ك: أخشاف وخشف).

**الْخُشُفُ**: بێچوی ئاسك لە سەرەتای لە دایکبوونیدا چ نێرو چ مێ و (ك: خُشُوفٌ وخِشَفَةٌ).

**الْخَشَفُ**: بەفری زبر.

**الْخَشْفَةُ**: جمووجوڵ، دەنگـەدەنگی کەمتیار، خشەی رۆیشتنی مار ورشەی مار.

**اَلْخَشُوف**: کەسێك بچێتە ناو کارو پیشەوەو چاو نەترس بێ ◦ کەسێك ئازابێ بۆ شەو ڕەوی ◦ شمشێری بڕندە ◦ (ك: خُشُفّ).

**اَلْخشِيفُ**: سەهۆڵ ◦ شتی فش‌و نەرم وەکوو ئیسفنج ◦ بەفری زبر کە بەهۆی ساردی کەش‌و هەوا زبر بووبێ کە بەناویدا دەڕۆی خشە خشی لێ دێ.

**اَلْمِخْشَفُ**: چاو ساغی شارەزاو کارا، بەڵگەی بەهێز ◦ شێر ◦ ئازا بۆ شەو ڕەوی ◦ کەسێك بچێتە ناوکارو پیشەوە بە چاو نەترسی ◦ (ك: مَخاشِف).

**اَلْخُشْكار**: نانی گەنمی پاك نەکراو (وشەیەکی فارسییە).

**اَلْخُشْكنان**: نانێکە لە ئاردی گەنمی پاك کراوی بێ سۆ دروست دەکرێ شەکرو بادام‌و گوێزو فستەقی تێ دەکرێ ئەمجار دەبرژێ، سور دەکرێتەوە.

**خَشَلَهُ خَشْلاً**: ڕەزیلی کرد.

**خَشّلَ الشرابَ**: شەرابەکەی پاڵفتە کردو پالاوتی.

**خَشِلَ الثّوبُ خَشَلاً**: قوماشەکە ڕزی.

**خَشِلَ الرجلُ**: پیاوەکە لە شەڕدا لاواز بوو فاشیل بوو دەگوترێ: (رجل خَشِلٌ فَشِلٌ).

**خَشّلَهُ**: ڕەزیلی کرد ◦ خشڵ داری کرد بە بازنەو خلخال.

**تَخَشّلَ**: تەوازوعی نواند گەردن کەچ بوو.

**اَلْخَشَلُ**: ڕەزیلی خراپ ◦ هێلکە کە زەردێنەکەی دەربهێندرێ ◦ ئەمسەرو ئەوسەری بازنەو خرخاڵ ◦ یان ئەوەی شکاوە لە ئەمسەرو ئەوسەری بازنەو خرخاڵ ◦ بەری درەختی (الدوم) جۆری خراپی، وشکی، تەڕی وردی یان دەنکەکەی.

**اَلْخَشِيلُ**: پوش‌و پەڵاشی وشك.

**اَلْمِخْشَلَةُ**: پالاوگە ◦ (ك: مَخاشِل).

**خَشَمَهُ خَشْماً**: لوتی شکاند.

**خَشِمَ الانسانُ خَشَماً**: ئادەمیزادەکە دەردێك لە لوتیدا پەیدا بوو بۆنی بۆ ناکرێ ◦ بۆنی لوتی ناخۆش بوو، بۆنی ناخۆش دەکا ◦ لوت کە بەهۆی نەخۆشییەوە بۆگەن بکا.

**خَشِمَ اللّحمُ وغيره**: گۆشتەکە یان هەرشتێکی تر بۆنی گۆڕا.

**خَشّمَ فلانٌ**: فلانکەس کەپووی گەورە بوو، خەیشومی داکەوت‌و کونی لوتی گیرا، هەناسەی لە لوتەوە بۆ نادرێ ◦ (هو أخشم) و (هى خشماء) (ك: خُشُمٌ).

**خُشِمَ**: توشی دەردی لوت بوو

بـــۆنكردنی نـــەما، یـــان بۆنەكـــە دەگۆڕێ.

أخْشَمَ: بۆنی گۆڕا.

خَشَّمَ اللَّحْمَ ونحوه: بەمانا (خَشِمَ) دێ ٥

خَشَّمَ الشرابُ فلاناً: بـۆنی شـەرابەكە لـە ڕێـگەی لوتیـەوە دای لـە دەمـاغیو خێرا سەرخۆشی كرد.

تَخَشَّمَ فلان: فلانكەس بەهۆی هەڵچونی شـــەرابەكە لـــە قورگیـــدا دای لـــە دەماغیو سەرخۆشی كرد.

تَخَشَّمَ اللحمُ: گۆشـتەكە بۆگـەنی كـرد بەهۆی تێكچونیەوە.

اَلْخُـشامُ: دەردێـكە توشـی لـوت دەبـێ هەسـتی بـۆنكردنی نامێنـێ ٥ لـوتی گەورە، كێوی گەورە، پیاوی لـوت زل ٥ شێر لەم ڕوەوە كە لوتی زلە.

اَلْخَـشَمُ: دەردێـكە توشـی لـوت دەبـێ هەستی بـۆنكردنی نامێنـێ ٥ لـوت ٥ چڵم كە لە لوتەوە دێتە دەر.

اَلْخَیْشُومُ: لای سەروی لوت.

خَشُنَ خشونةً وخَشَناً وخشانة: زبـرو گـڕن گڕناوی بـوو (هو خَشِنٌ) (ك: خُشُنٌ) و (هـو خَـشِنٌ) (ك: خُـشْنٌ وخِـشانٌ وهـو أخْـشَن وهـی خـشناء) (ك: خُشْنٌ).

خاشَنَهُ: پڕی دایە ٥ قسەی زبـرو ڕەقـی لەگەڵدا كرد.

خَشَّنَهُ: زبری كرد.

خَشَّنَ صَدْرَهُ: دڵـی تێـكدا، دڵـی ڕەنجانـد شتێـكی وای خستە دڵەوە هەڵوێستی گۆڕی.

تَخاشَـنوا: لـە قـسەو كـردەوەدا زبـرو ڕەقییـان نوانـد، قسەی ناشـیرینیان بەیەكتر گوت.

تَخَـشَّنَ: زبرییەكـەی زۆر بـوو ٥ زۆر زبـرو گـڕن گڕنـاوی بـوو ٥ پۆشـاكی زبری لەبەركرد ٥ شتی زبری خوارد ٥ یان باری بە وتنـی قـسەی زبـرەوە گرت ٥ یان ژیا بە ژیانێـكی زبر.

اسْتَخْشَنَهُ: بە زبری هاتە بەر چاو.

اخْشَوْشَنَ: بەمانا (تَخَشَّنَ) دێ.

اَلْخَـشِنُ: قـورسو گرانـە بـە ئاسـانی بەدەست نایێ.

اَلْخَشْناءُ: پڕچەك ٥ دەگوترێ: (كتيبـة خـــشناء) كەتیبەكـــە پـــڕ چـــەكو تەقەمەنییـــە ٥ پـــەیكوڵ بـــەرە ڕوەكێـــكی زبـــرو گـــڕن گڕناوییـــە ٥ (ك: خُشْنٌ).

خَـشَتِ النَّخْـلَةُ: دار خورماكە بەرەكـەی خورما وشكەڵە بوو.

اَلْخَشَا: كشتو كاڵ كـە بـە سـەرما ڕەش ببێ.

اَلْخَشَاءُ: زەوییـەكی پتـەو چـەقەن كـە گیای لێ نەڕوێ.

**الْخَشْوُ**: خورما وشكەڵ.

**الْخَشِيُّ**: گیاوو گژی رزیوو بۆگەن بوو.

**خشاه خَشْياً**: ئەو زیاتر دەترسا تا ئەم.

**خَشِيَ خَشْيَةً**: ترسا.

**خَشِيَ فلاناً ومنه خشْيَةً**: لە فلانكەس ترسا ٥ لە روی رێزو هەیبەتەوە لێی ترسا وەكوو قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾.

**خاشاهُ**: وازی لێ هێنا ٥ لە لێ ترساندا كێ بركێی لەگەڵدا كرد.

**خشّاهُ**: ترساندی.

**تَخَشَّى فلان**: فلانكەس ترسا ٥ (أَخْشَى فلاناً) فلانكەسی ترساند.

**الأَخْشَى**: دەگوترێ: (هذا المكان أخشَى من غيره) ئەم شوێنە لە شوێنێكی تر ترسناك ترە.

**خَصِبَ خِصْباً**: شوێنەكە گیاوو گژو لەوەڕی زۆر بوو ٥ (هو خَصِبٌ وخصيب هو أو هي مخصاب).

**أَخْصَبَ المكانُ**: بەمانا (خَصِبَ) دێ ٥ دەگوترێ: (أَخْصَبَ القومُ): ولاتی ئەو خەڵكە لەوەڕگای باشی هەیە، خواردن خواردنەوەیان زۆرو زەبەندیە.

**أَخْصَبَ جناب فلان**: فلانكەس خێرو بێری زۆرە.

**أَخْصَبَ فلان**: فلانكەس هەرزانی روی تێكردو كەوتە خێرو خۆشی ژیانەوە.

**أخصَبَ الله الموضعَ**: پەروەردگار لەو شوێنەدا گژوگیاو لەوەڕی زۆری رواند.

**الأَخْصَابُ**: تێكەڵبوونی خانەی نێرینەو خانەی مێینە.

**الخِصَابُ**: دارخورمایەك زۆری بەر گرتبێ.

**الْخَصْبُ**: بەمانا (الخِصاب) دێ ٥ پرژی دار خورما ٥ تۆوی تەلقیح كردن.

**الخِصبُ**: گەشەو دماو خێرو بێر ٥ ژیانی نەرمو نۆڵ ٥ (ك: أخصاب).

**الْخَصِيبُ**: خێرو بێر، دەگوترێ: (رجل خصيبٌ) پیاوێكی خێرەو مەندە، پیاوەتیو پارمەتیدانی بۆ ئاتاجان زۆرە.

**الْمُخْصِبُ**: زبڵی كیمیاویو هەرشتێكی تر كە بكرێتە ناو زەوییەوە بۆئەوەی بەهێز ببێو كشتو كاڵەكەی باش پێبگا.

**الْمُخَصِّبُ**: مادەیەكی سروشتییە یان دروست دەكرێو تێكەڵ بەخاك دەكرێ بۆئەوەی هێز بداتە خاكەكە بۆ گەشە پێدانی كشتوكاڵ.

**خَصَرَهُ**: لـه کەلەکـەی دا ٥ زەبـری لـە کەلەکەی دا.

**خَصِرَ خَصَراً**: سەرمای بوو یان سەرماکەی زیادی کرد ٥ سەرما دەستو قاچی ئەزیەت دا.

**خُصِرَ**: کەلەکەی توشی ئازار بوو.

**أخْصَرَهُ**: ساردی کردەوە.

**خاصَرَهُ**: دەستی لەسەر کەلەکەی دانا ٥ هەریەك لەو دوو کەسە رێبازێکیان گرتە بەر بۆئەوەی لە شوێنی تایبەتیدا بەیەك بگەنەوە.

**خَصَّرَ الثوبَ أو النعلَ**: ئەملاو ئەولای قوماشەکە یان نەعلەکەی باریك کردەوە.

**اخْتَصَرَ فلان**: فلانکەس دەستی خستە سەر کەلەکەی ٥ عەصای بەدەستەوە گرتو خۆی بەسەردا دا.

**اخْتَصَرَ المِخْصَرَةَ**: عەصای وەرگرتو توند گرتی بەدەستەوە ٥ شتەکەی بڕییەوە بەڵام دولەتی نەکرد.

**اخْتَصَرَ الطريقَ**: نزیکترین رێگای گرتە بەر.

**اخْتَصَرَ الکتابَ**: چەند باسو شتی زیادەی لەکتێبەکە لابردن.

**اخْتَصَرَ الشَّيْءَ**: زێدەی شتەکەی لابرد.

**تخاصَرَ**: هەریەکە لەو دوانە دەستی خستە کەلەکەی.

**تخاصَرَ الشخصان**: ئەو دوو کەسە بە رێگادا رۆیشتنو دەستی هەریەکەیان لە ئاستی کەلەکەی ئەوی تریان بوو.

**تَخَصَّرَ**: دەستی خستە سەر کەلەکەی.

**تَخَصَّرَ بالازار**: دەرپێکەی خستە سەر کەلەکەی.

**تَخَصَّرَ بالمِخْصَرَةِ**: عەصاکەی بەدەستەوە گرت.

**الأخْصَرُ**: کورت تر ٥ دەگوترێ: (هذا أخصر من ذاك).

**الخاصِرة**: کەلەکە (نێوان ئێسقانی سەری رانو پەراسوی لای خوارو).

**الخِصار**: دەرپێ یان هەر شتێك لە ناوکەوە بۆ خوارەوە جەستە داپۆشێ، پشتێن.

**الخَصْرُ** من الانسان والحیوان: ناوقەد، ئاستی سێبەندەو ناوك ٥ باریکایی پشت کلۆت.

**خَصْرُ القدم**: بەری پێ (نێوان سینگی پێو پاژنە پێ).

**خَصْرُ السهم**: ناوەراستی تیر.

**الخصیر**: کورتکردنەوە ٥ لابردنی شتی زیادە.

**المِخْصَرَة**: عەصاو گۆچان هەر شتێك

خۆی بەسەردا بدرێ ٥ دارێکە لە شێوەی شمشێردا وتار خوێن بە دەستییەوە دەگرێ ئاماژەی پێ دەکا لەکاتی وتارەکەیدا ٥ لە کۆنداو تا ئێستاش پاشاو خەلیفەکانو وتار خوێنەکان ئەو جۆرە دارە بە دەستەوە دەگرنو ئاماژەی پێ دەکەن ٥ (ك: مخاصر).

**مخاصِر الطريق**: نزیکترین رێگا.

**اَلْمُخَصَّرَةُ**: بەری پێ ئەو بەشەی دەکەوێتە سەر زەوی سنگی پێو پاژنە پێ.

**اَلْمَخْصُور**: قەد باریك، قاچو قول پچوك ٥ دەگوترێ: (رجل مخصور البطن، مخصور القدم).

**خَصَّ**: تایبەت پێچەوانەی گشتو رەها.

**خَصَّ فلاناً**: شتی زۆری دا بە فلانکەس ٥ ئەوی تایبەت کرد بەو شتەوە، شتەکەی دا بە ئەو.

**خَصَّ** خصاصاً وخصاصة: هەژار کەوت.

**أَخَصَّهُ به**: بەمانا (خَصَّهُ) دێ.

**اختصَّ الشَّيْئُ**: بەمانا (خَصَّ) دێ.

**اختصَّ فلان**: فلانکەس هەژار بوو.

**اختصَّ به**: تایبەت بوو بەو شتەوە، تاکە کەسە لەو بوارەدا.

**اختَصَّ الشَّيْئَ**: شتەکەی هەڵبژاردو پەسەندی کرد.

**اختَصَّ فلاناً بكذا**: فلانکەسی تایبەت کرد بەو شتەوە.

**اختَصَّ الشَّيْئَ لنفسه**: شتەکەی تایبەت کرد بەخۆیەوەو بۆ خۆی دانا.

**تَخَصَّصَ**: قاڵ بوو لەو شتەداو تایبەت بوو پێیەوە ٥ هەروا بۆ موطاوعەی (خَصَّصَ) هاتووە دەگوترێ: (خَصَّصَهُ فتخصَّصَ) ٥

**تَخَصَّصَ به وله**: تایبەت بوو بەو شتەوەو پێی تایبەت بوو.

**تَخَصَّصَ في علم كذا**: لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەو نووسینەکانی تایبەت کرد بەو بوارەوە.

**اسْتَخَصَّهُ**: بە تایبەتی لەقەڵەم دا، هەڵی بژاردو پەسەندی کرد.

**الاختِصَاصُ في القضاء**: بریتییە لەو دەسەڵاتەی دادگا هەیەتی بە گوێرەی شوێنو جۆری رووداوەکە.

**الخاصة**: تایبەت پێچەوانەی وشەی (عامّة)یە ٥ هەروا ئەو شتەی تایبەتی دەکەی بە خودی خۆتەوە.

**خاصة الشَّيْئِ**: تایبەت مەندی شت، ئەوەیە تایبەت بێ بەو شتەوەو بۆ شتی تر نەبێ ٥ (ك: خواص).

**خواص العقاقير**: کاریگەریی دەرمانو تایبەت مەندییەکانی لەسەر جەستە.

**الخَصاصَةُ**: فەقیریو پێداویستیو حاڵو وەزعی خراپ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ ٥ بۆشاییو خەلەلو درزو کون لە دەرگاو شتی وا ٥ لە حەدیثدا هاتووە (أن أعرابياً أتى باب النبي فألقم عينه خصاصة الباب) ٥ (ك: خصاص وخصائص).

**الخُصَاصَةُ**: تولە مێو ئەگەر تێر ئاو نەبێو هێشو ترییەکانی دەنك وردو بڵاوو لاوازبن ٥ ئەو تولە مێوەی دوای برین بە دار مێوەوە دەمێنێتەوە.

**الخُصُّ**: کەپر یان کوخ کە بە کەرەستەی قەفەزاژ دروست کرابێ ٥ خانوێك هەڵاشەکەی دارو شتی وا بێ ٥ دوکانی مەی فرۆش با بەکەرەستەی تریش دروست کرابێ ٥ (ك: أخصاص، خِصاص، خصوص).

**الخِصِّيصُ**: تایبەت مەندتر لە تایبەت.

**الخِصِّيَةُ**: بەمانا (الخاصة) دێ.

**الخُصُوصُ**: پێچەوانەی (العموم) ٥ مانای (بە تایبەتی) دەگەیەنێ.

**الخُصُوصَةُ**: حاڵەتی تایبەت.

**الخُصُوصِيَّةُ**: (خُصُوصِيَّةُ الشَّيْءِ) تایبەت مەندییەکەی.

**الخَصِّيصَةُ**: ئەو صیفەتو چۆنیەتییەیە کە شتەکە جیا دەکاتەوەو سنوی دیاری دەکا.

**خَصَفَت الناقَةُ خَصْفاً وخِصافاً**: حوشترەکە بێچووەکەی دوای نۆ مانگ بوو، لە مانگی نۆیەمی سکەکەی دا زا، یان دوای تەواو بوونی ساڵ بەچەند مانگێك.

**خَصَفَ النَّعْلَ**: نەعلەکەی بە درێوشە دوورییەوە.

**خَصَفَ** العريانُ الورقَ على بدنه: پیاوە روتەکە گەڵا داری بە جەستەی خۆیەوە نوساند.

**خَصَفَ** على نفسه ثوباً: قوماشێکی لەخۆ هاڵاندو ئەمسەرو ئەوسەری بە چیلکەیەك یان بەهۆی درونەوە لیك بەستن.

**خَصَفَ الشَّيْءَ** الى الشَّيْءِ: شتەکەی خستە پاڵ شتەکەی ترەوە.

**خَصَفَ** الكتيبة: پەلە سەر بازەکەی قەرەباڵغ کردن.

**خَصِفَ خَصَفاً**: رەنگی لە رەنگی خۆڵ دەچێ.

**خَصِفَت الشاةُ والفرسُ**: لا کەلەکەی مەرەکە یان ئەسپەکە سپی بوو (هو أخْصَفُ وهي خَصْفَاء) ٥ (ك: خُصْفٌ).

أخصَفَ العريان الورق على بدنه: بەمانا (خَصَفَهُ) دێ.

خصَفَ: ڕەوشتی ناشیرین بوو، تەنگە تاو بوو ٥ جنێوی زۆری پێدا.

خصَفَ الشیبُ فلاناً: مووی ڕەش‌و مووی سپی فلانکەس بەرامبەر بوون.

خصَفَ العریان الورقَ علی بدنه: بەمانا (خصَفَهُ) دێ.

اختصَفَتِ الناقة: حوشترەکە بە نۆ مانگی سکەکەی دانا.

اختصَفَ العریانُ بالورق علی بدنه: بەمانا (خَصَفَهُ) دێ.

تَخصَّفَ العریانُ الورق علی بدنه: بەمانا (خَصَفَهُ) دێ.

خِصَافٌ: ناوی ئەسپێکی بەناو بانگە.

الخصَّاف: پینەچی ٥ درۆزن ٥ لەم ڕووەوە قسەی درۆ دەخاتە سەر قسەی درۆ، قسەیەکی درۆی بە درۆیەکی تر پینەدەکا.

الخَصْفَةُ: پارچەیەك کە دەکرێ بە پینە.

الخُصْفَةُ: درزو کونی نەعل ٥ (ك: خُصَفٌ).

الخَصَفَةُ: بەر چنەیەك، زەرفێکە لە لقی دار خورما دروست دەکرێ‌و خورمای تێدا هەڵدەگیرێ ٥ قوماشی ئەستوورو زبر ٥ (ك: خَصَفٌ، خِصافٌ).

الخَصِیفُ: گڵ‌و خۆڵ ٥ ڕەنگێك وەکوو ڕەنگی خاك ٥ هەر شتێك دوو ڕەنگ‌و زیاتری هەبێ وەکوو تێکەڵاو بوونی ڕەنگی ڕەش‌و سپی دەگوترێ: (حبل خصیف ورماد خصیف) گوریسی بەڵەك ٥ گڵی سوورو سپی، ڕەش‌و سوور ٥ هەروا ناوە بۆ شیری مەییو ٥ نەعلی پینە کراو.

الخَصِیفَةُ: هەرشتێك بەڵەك بێ دوو ڕەنگ بێ، هەموو تووپیەکی نەعل ٥ شیری مەییو (فرۆ).

المِخْصَفُ: درێوشە، سوژن ٥ هەر شتێك نەعلی پێ کون بکرێ.

خَصَلَ السَّهمُ خصلاً وخِصالاً وخَصلة: تیرەکە لە تەنیشت نیشانەکەی دا.

خَصَلَ الهدف أو الغَرَضَ أو القِرطاسَ: نیشانەکەی هەنگاوت.

خَصَلَ الشَّئَ: شتەکەی بڕییەوە، پارچە پارچەی کرد.

خَصَلَ غَیرَهُ: لە تێکۆشان‌و بەرەنگاری کردندا بەسەر بەرامبەرەکەیدا زاڵ بوو.

أخصَلَ: نیشانەکەی هەنگاوت ٥ دەگوترێ: (رمی فأخصَلَ) دوو جار لەسەر یەك کاغەزەکەی هەنگاوت.

**خاصَلَهُ خِصالاً ومُخاصَلَةً**: بەرەنگاری بووە، روبەڕوی وەستا.

**خَصَّلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی پارچە پارچە کرد.

**خَصَّلَ الشَّجَرَ**: لق و پۆپی درەختەکەی بڕیو ئەملاو ئەولای هەڵپاچی ٥ پرژو پاڵی لێ کردنەوە.

**خَصَّلَ البعيرَ**: توکی حوشترەکەی لێکردەوە.

**تخاصَلَ القومُ**: خەڵکەکە کەوتنە پێشبڕکێو کێ بڕکێ لە تفەنگ چییەتیو تێکۆشاندا.

**الخَصْلُ**: ئەوەی گرەوی لەسەر دەکرێ.

**الْخَصْلَةُ**: رەوشتێکە لە ئادەمیزاددا وادەبێ رەوشتی بەرزە وا دەبێ رەوشتی ناشیرینە ٥ هێشوی میوە ٥ چڵە دارێکە دڕکی پێوەبێ ٥ سەرێکی شوڕکی تەڕو نەرم ٥ (ك: خِصَال).

**الْخُصْلَةُ**: موی کۆمەڵو پڕ بەسەر ئاژەڵەوە ٥ هێشووی میوە ٥ چیلکە دارێکی چقڵاوی، هەموو شوڕکە دارێکی نەرم ٥ سەرو پرچی شۆڕەوەبووی درەخت، لق و پۆپی شۆڕەوە بوو ٥ پارچە گۆشت ٥ (ك: خُصَلْ).

**الْخَصَلَةُ**: سەرێکی لقە داری تەڕ ٥ شوڕکە داری (عرفوط) ٥ چیلکە داری چقڵاوی ٥ (ك: خَصَلْ).

**الخصيلُ**: تاوان و گوناه.

**الخصيلَةُ**: هەر پارچە گۆشتێك پچوك یا گەورە ٥ پرچی بادراوو هۆنراوە ٥ کوڵکو موی بادراو ٥ (ك: خصيل وخصائِلْ).

**خَصَمَهُ خَصْماً**: لە کێشەو نیزاعدا بەسەریدا زاڵ بوو.

**خَصِمَ خَصَماً**: کێشەو نیزاعەکەی توندکرد ٥ کێشەی لەگەڵدا کرد ٥ (هو خصيم).

**أخْصَمَ فلاناً**: بەڵگەو نیشانەی فێری فلانکەس کرد بۆئەوەی لە کێشەکەیدا باڵا دەست بێ.

**خاصَمَهُ مُخاصَمَةً**: کێشەی لەگەڵدا کرد (هو مُخَاصِم وخصيم).

**اخْتَصَمَ القومُ**: خەڵکەکە کێشەو نیزاعیان لەگەڵ یەکتر کرد ٥ هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان کێشەیان بەرپا کرد.

**تَخاصَمُوا**: بەمانا (إِخْتَصَمُوا) دێ.

**الأُخْصُومُ**: قوڵفەی جەواڵو تێرەو هۆڕ ٥ یان تایەکی بار ٥ (ك: أخَاصِيمَ).

**الْخَصْمُ**: دژ ٥ بەرامبەر ٥ کێشەکار ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَهَلْ أَتَاكَ نَبَأُ الْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا الْمِحْرَابَ﴾.

**الخُصْمُ**: لایەن و دەفەر ٥ قەراخی شت ٥

ئەمـــسەرو ئەوســـەری شـــت ٥ قولینـچکی هـۆڕو شـریفـو تـەغار ٥ درزو بـەتالایی ٥ دەراوی شـیوو دۆڵ ٥ کونو کەلەبـەر ٥ لەپەنـدا هاتووە دەڵێ: (لایـسدّ منـه خُـصْمٌ الا انفـتح علینـا منـه خُـصْمٌ) کونیـکمان پینـه ناکریَ کونیـکی ترمـان تـێ دەبـێ ٥ (ك: خُصُومٌ وأخصام).

أخـصام العـين: ئەوبەشـەی بـرژانگ دایدەپۆشێ ٥

**الْخَصِمُ**: لیزانو کارامـا لە کیشەو نیزاعـدا ورياو زانا بۆ بردنەوەی کیشەکەی ٥ ئاشـوب گیـرو کیـشه دروسـتکار بەناحەق ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ﴾.

**الْخصِنُ**: پاچه کۆڵه ٥ پاچی بچوك ٥ (ك: خُصُنٌ وأخصُنٌ).

**خَصَاهُ خَصْياً وخِصَاءً**: خەساندی ٥ گونی دەرهێنان ٥ کێری بڕی.

**خُصِيَ**: گونی ئازاری لێ پەیدا بوو ٥ هەژار بوو.

**اختصاه**: بەمانا (خَصَاهُ) دێ.

**الخُــصِيُ**: هێلکـه گـون (هێلکـەی کۆئەندامی زاوزێ) ٥ پێستی گون.

**الْخَصِي**: گون هێشاو، ئـەو کەسـەی گـونی ئازاری هەبێ.

**الْخُـصيَةُ**: هێلکـەی گـون ٥ (هێلکـەی کۆئەندامی زاوزێ).

**خُصَى** الثعلـب وخُـصى الكلـب: رەگـەزی ئـەو رووەکـە بەتەمەنانـەن کـە لـە پێـڕی (الـسَّحلبیه)ن‌و سـەحلەب کـە مادەیـەکی سـڕکەرە لـەو بەرهـەم دەهێندرێ.

**الْمَخْصَى**: شوێنی براوی گون.

**خَضَبَ** خَضْباً وخُضُوباً: رەنگاو رەنـگ بـوو، خەناوی بوو.

**خَـضَبَ** الـشجرُ: درەختەکـە سـەوز بـوو، گەڵای دەرکرد.

**خَـضَبَت الأرض**: زەوی گــژوگیای رواو سەوز بوو.

**خَضَبَت الماشيةُ**: ئاژەڵەکە گـەڵای تـازە پشکوتوی درەختەکەی خوارد.

**خَـضَبَ** الـشَّيْءَ خَـضْباً وخِـضاباً: رەنگـی شتەکەی خەناوی کرد.

**خَضِبَ** الشَّجَرُ ونحوه خَضْباً وخُضُوباً: بەمانا (خَضَبَ) دێ.

**أخْضَبَتِ الأرض**: بەمانا (خَضَبَتْ) دێ.

**خَضَّبَهُ**: بەمانا (خَضَبَهُ) دێ.

**اخْتَضَبَ**: بە خەنە رەنگی کرد.

**تَخَضَّبَ**: بـە خەنـەو شـتی لـەو جۆرە رەنگی کرد.

**تَخَضَّبَ بالدماء**: بەخوێن ڕەنگی کرد.

**تَخَضَّبَتِ الأرض**: بەمانا (خَضَبَتْ) دێ.

**اخْـضَرْضَبَ**: بـەمانا (خَـضَبَ) دێ.

الخاضِبَ مِن البهائم: ئەو ئاژەڵەیە گەڵای تازە پشکوتوی درەخت بخوا ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (ألخاضِبةُ) ٥ (ك: خَواضِبّ).

الخضاب: خەنەو هەرشتێ لەو جۆرە بێ بۆ رەنگ کردن.

ألخَضبُ: گەڵای درەخت کە تازە دەپشکوێ ٥ رووەکی تازە شین بوو کە بە باران زۆر سەوز دەبێ ٥ (ك: خُضُوبٌ).

الخُضَبَةُ: ئافرەتێك زۆر خەنە بەکاربێنێ‌و لەخۆی بدا.

الخضيب: دەستی خەناوی ٥ ئەستێرەیەکە.

ألمِخضَبُ: ئینجانە، سوێنە، تەشت، کە جلی تێدا دەشۆرێ.

ألمِخضَبَةُ: بەمانا (ألمِخضَبُ) دێ ٥ (ك: مَخاضِبّ)ە ٥ پەرۆی خەناوی ٥ پەرۆێی کە ئافرەت لەکاتی عادەی مانگانەیدا بەخۆی هەڵدەگرێ.

خَضخَضَ ألشَّيئَ: شتەکەی جوڵاندو رای تەکاند.

خَضخَضَ الأرض: زەوییەکەی کێڵاو هەڵەو گێری کرد بۆئەوەی نەرم بێ‌و کە ئاودرا بە باشی رووەکی لێ بروێ.

تَخضخَضَ: بۆ موطاوەعەی (خَضخَضَة) دێ.

الخُضاخِضُ: شوێنێك ئاوو درەختی زۆر بێ، ئاودارو چڕبێ ٥ قەڵەوی ورگن ٥ (ك: خَضاخِض).

ألخَضخاض: جۆرە قەترانێکی رەش‌و روونە حوشتری گروێی پێ چەور دەکرێ.

ألخُضخُضُ: بایەکە لە نێوان شەماڵ‌و رەشەبا دایە.

الخُضخِضُ: بەمانا (الخُضخُض) دێ.

خَضَدَ خَضداً: شتێکی تەڕی خوارد وەکوو گێزەرو خەیار.

خَضَدَ ألشَّيئَ: شتەکەی شکاند بەڵام لێکی جیا نەکردنەوە ٥ بڕیەوە ٥ خواری کرد.

خَضَدَ الشَّجَرَ: چڵ‌و چاڵی لە درەختەکە دەرهێناو پاکی کردەوە.

خَضَدَ الشوكَ: چڵەکەی لە درەختەکە داماڵی لێی کردنەوە.

خَضَدَ شوكة فلان: تونلو تیژی فلانکەسی شکاندو هێواشی کردەوە.

خَضِدَ خَضداً: نەرم بوو.

خَضِدَ الثمرُ: میوەکە لاوازبوو سیس هەڵگەڕا.

خَضِدَ النَّبتُ: رووەکە لاواز بوو سیس بوو.

اخضَدَ المُهرُ: جوانوەکە ئاسنی

لغاوەکەی دەجوو لەبەر تەڕ دەماخیو سرکی خۆی.

**خَضَّدَهُ**: بەمانا (خَضَدَهُ) دێ.

**اِخْتَضَدَ الشَّيْءَ**: شتەکە دولا هاتەوە، چەمایەوە.

**اِخْتَضَدَ البَعِيرَ**: لوتەوانەی لە لوتی حوشترەکە کرد بۆئەوەی سەر نەرم بێ لغاوی خۆش بێ.

**اِنْخَضَدَ**: شکا، چەمایەوە.

**اِنْخَضَدَ الثَّمَرُ**: میوەکە شکا، درزی تێ بوو.

**تَخَضَّدَ**: بەمانا (اِنْخَضَدَ) دێ.

**اَلْخَضَادُ**: درەختێکە نەرمو شلكو بێ چقڵو دڕکە ٥ ئازارێکە توشی ئەندامەکانی جەستە دەبێ بەلام ناگاتە ئازاری شکان.

**اَلْخَضَدُ**: ئەو لقو پۆپە بڕاوو شکاوانەن کە بە درەختەکەوە دەشکێنەوە ٥ یان دەبڕێنەوە ٥ درەختێکی نەرمو شلكو بێ چقڵو دڕکە ٥ ئازارێکە تووشی ئەندامی جەستە دەبێو ناگاتە ئازاری شکان.

**اَلْمِخْضَدُ**: ئامێری گەلا بڕی، تەورداس، یان هەرشتێکی تر کە لقو پۆپی درەختی پێ ببڕدرێتەوە ٥ (ك: مخاضِدُ).

**اَلْمَخْضُودُ**: کەسێك نەتوانێ هەڵسێو ڕاپەڕێ ٥ یان کەسێك لە کێشەو دانوساندا بەڵگەی پێ نەبێو دۆش دامێنێ.

**خَضَرَ الرجلُ النَخْلَ خَضْراً**: پیاوەکە دار خورماکەی بڕیەوە.

**خَضِرَ خَضَراً وخُضْرَةً**: سەوز بوو.

**خَضِرَ الزرعُ**: کشتو کاڵەکە راساو پێگەییو سەوز بوو ٥ (هو خَضِرٌ وأخْضَرُ وهي خَضْراءُ).

**أخْضَرَهُ**: سەوزی کرد.

**اخْضَرَ الرَّيُّ الزرعَ**: ئاودێر کردنەکە کشتو کاڵەکەی وا لێکرد لەخۆ بکەوێو گەشە بکا.

**خاضَرَهُ**: بەروبومەکەی بە سەوزی فرۆشت (شین دروی کرد).

**خَضَّرَهُ**: وای لێکرد سەوز بێ.

**خَضَّرَ الأرضَ**: گەنم یان زوڕاتی بەناو زەوییەکەدا چاند.

**اِخْتَضَرَهُ**: بە سەوزیو نەکامڵی بڕیەوە ٥ دەگوترێ: (اختَضَرَ الشجرَ واختَضَرَ الكلأ) بۆیە ئەگەر گەنجێك بمرێ دەڵێن: (أُختُضِرَ).

**إخْتَضَرَ**: بڕیەوە، لە بێخ هەڵی کەند ٥ بە سەوزیو کاڵی خواردی، دەگوترێ: (إختَضَرَ الفاكهةَ) میوەکەی خوارد پێش ئەوەی پێ بگا.

**إخْتَضَرَ الحِمْلَ**: بارەکەی هەڵگرتو توانی.

**إخْضَرَّ الشَّيْئَ**: بەمانا (خَضِرَ) دێ.

**إخْضَرَّ الكلأُ**: لەوەڕەکە دورایەوە.

**إخْضَرَّ الليلُ**: شەوەکە تاریك بوو دونیا ڕەش داگەڕا.

**اخْضَارَّ**: وردە وردە سەوز هەڵگەڕا.

**إخْضَوْضَرَ**: بەمانا (إخْضَرَّ) دێ.

**الأخاضِرُ**: زێڕ، گۆشت، بادە ٥ دەگوترێ:

**مـاء أخْـضَرُ**: هـەرکاتێ ئاوەکـە لەبـەر زۆر رونی سەوز بنوێنێ.

**شـاب أخْـضَرُ**: گەنجێـك کـە مـووی لا ڕوومـەتی سـەریان دەرهێنابـێ ٥ سەرەتای هاتنی ریشی دیاربدا.

**أخْضَرَ الجناحين**: شەو ٥ دەگوترێ: (جَنَّ علینا اخضر الجناحين).

**فـلان أخْـضَرُ**: فلانکەس خێـرو بێـری زۆرە.

**أخْـضَرُ القفـا**: بـە کەسێـك دەگـوترێ دایکی قولە ڕەش بێ.

**أخْضَرَ البطن**: نازناوی جۆلایە.

**أخْضَرَ النواجذ**: نازناوی فەلاو وەرزێرە ٥ دەگـوترێ: (هـم خُـضْرُ المناکـب) واتـە: لـە هـەرزانیو خێـرو خۆشـی دان.

**الأُخَيْضِر**: مێشی ڕەنگ سـەوز قـەبارەی وەکوو مێشی ڕەش وایـە ٥ دەردێـکە تووشی چاو دەبێ.

**اَلْخَـضَار**: سـەرەتای سـەوزەوات ٥ ماستاوێـك ئـاوی زۆری تێـکرابێ ڕەنگی سەوز بووبێ.

**خُضَارَة**: بـەبێ وشـەی (أل) واتـە دەریـا لەو رووەوە کە سەوز دەنوێنێ.

**اَلْخُضَارَةُ**: گیاو گژی سەوز.

**اَلْخُضَارِی**: باڵندەیەکی ڕەنگ سەوزە بە عـەرەبی نـاوێی تریـشی هەیـە کـە (القارِیَـــة)یـە ٥ هـەروا نـاوە بـۆ باڵندەیەکی تر کە ناوی (الأخْيَل).

**اَلْخَـضْرُ**: ئـەو لـقو پۆپەیـە بـە تـەڕی ببڕدرێ.

**اَلْخِضْرُ**: بـەفیڕۆ چـون، دەگـوترێ: (ذهـب دمُـهُ خِـضْراً): خوێنەکـەی بـەفیڕۆ چوو.

**اَلْخَضَرُ**: لقو پۆپی دار خورما بـە سـەوزو تەڕی.

**الخَـضِرُ**: زەرعـاتی تـەڕو تـازەی سـەوز ٥ شوێنێـك سـەوزایی زۆربـێ ٥ درەختی خورما.

**الخَضْراءُ**: سەوزە بەهەموو جۆرێـکیەوە ٥ بنەچـەو ئەصـڵو فەسـڵ ٥ هـەرزانیو ژیـانی خـۆش ٥ ئـافرەتی ڕەش پێست (قولە ڕەش) ٥ ئاسمانی شـین ٥ دەسـتە سـەربازی زۆر ٥ دۆڵـچە کـە زۆر ئـاوی پـێ هەڵێجیندرێ قەوزە بکا ٥ دەگـوترێ: (المحبـة بیننـا خَـضْراءُ) دۆستایەتیەکەمان درێژ خایەنە.

خَضْراء الدمن: بە ئافرەتێك دەگوترێ روخساری جوان بێ‌و رەوشتی ناشیرین بێ ٥ پێغەمبەر فەرمویەتی (ایاکم وخَضْراء الدمن) عەرزیان کرد کێیە؟ فەرمووی: ئافرەتی روخسار جوانی شۆخ‌و شەنگ بەلاّم لە خێزانێکی بەد رەوشتدا پەروەردە بووبێ‌و خوی ئەوانی گرتبێ.

الْخُضْرَةُ: رەنگی سەوز (ك: خُضَرٌ وخُضَرٌ) ٥ نەرمو نیان‌و بەناز پەروەردە ٥ ئادەمیزادی گەنم رەنگ ٥ ئەسپی رەنگ خاکی بۆر (شێ).

الْخُضَّارُ: رەگەزی باڵندە لە پێری (الخضارية) ٥ ئەو باڵندانەی پەنجەیان پێکەوە نووساون.

الْخُضَّاري: زەرعات (کشت‌و کاڵ) لە کاتی سەوزیدا.

الْخَضُورُ: بەمانا (الأخْضَر) دێ.

الْخَضِيُّ: بەمانا (الأخضر) دێ ٥ روەکی سەوز ٥ دەریا.

الْخَضِيرَةُ: دار خورمایەکە خورماکەی هێشتا سەوزە کەمی تامی شیرینی تێدەکەوێ ٥ (ك: خضائر) ٥ ئافرەتێك کە سکی بۆڕانەگیرێ، هەر منداڵی لەسکی کەوت پێش کامڵ بوونی سکی لەبەر بچێ.

الْخُضَيْرِي: باڵندەیەکە لە پێری (الشرشوريات) دەندوکی مەخروطییە، واتە: سەر دەندوکی تیژو بنەکەی ئەستور.

المِخْضَارُ: بەمانا (الخضيرة) دێ ٥ (ك: مخاضير).

المِخْضَرُ: چنگ‌و نینۆك، بۆ باڵندەو درندە ٥ (ك: مخاضر).

الْمَخْضَرَةُ: شوێنێك سەوزایی زۆر بێ ٥ (أرض محضرة) زەوی سەوز.

الْيَخْضُورُ: مادەی سەوزی گیاو گژ.

اللايخضور: ئەو روەکەی رەنگی سەوز نەبێ.

خَضَرَبَ الماءُ ونحوه: ئاوەکە شڵەقا.

الْخُضَارِبُ: ئاوێك شەپۆلەکانی تێکەوە بهاون.

الْمُخَضْرَبُ: زمان پاراوی قسە زان‌و کاراما لە وتاردانەدا.

الْخِضْرِيجُ: شوێنێك کاڵەکی زۆر بێ ٥ (ك: خضارِج).

خَضْرَعَ البخيلُ: پیاوە رژدو چروکەکە بە زۆر خۆی سەخی کرد رەوشتی دەستبلاّوی بەسەر خۆیدا هێنا.

خَضْرَفَ: پیری لێی دیاری داو پێستی چرچ‌و لۆچی تێکەوت‌و داچۆڕا.

خَضْرَمَ الأذنَ: قەراخی گوێچکەی بری یان نیوەی بری‌و لێی کردەوە، یان بە گوێچکەیەوە هێشتییەوەو لەرە لەریەتی.

تَخَضْرَمَ الزُّبدُ: رۆنەکە لەبەر ساردی

دانار دانار بوو پرژا.

**اَلْخُضَارِمُ**: ناوی زۆر ٥ پیاو ماقوڵی سەخی سروشتو بەخشندە.

**اَلْخَضَارِمَةُ**: خێڵێکن لە ولاتی شام دەژین لە ولاتی بێگانەوە هاتوونە ئەو دەڤەرە ٥ تاکەکەی (خَضْرَمِیّ)ە.

**الخِضْرِمُ**: هەر شتێك پانو پۆرو گەورە بێ ٥ (ك: خضارم)ە.

**اَلْخُضَرِمُ**: ناوێك لەنێوان شیرینیو سوێریدا بێ ٥ سوسە مار یان بێچووەکەی ٥ (ك: خَضَارِمَ).

**اَلْمُخَضْرَمُ**: کەسێك خەتەنە نەکرابێ ٥ کەسێك لەسەردەمی نەزانیو سەردەمی ئیسلامی دا ژیابێ ٥ بەزۆری بۆ ئەو شاعیرانە بەکاردێ کە لەسەردەمی نەزانیو ئیسلامیدا شیعری گوتبێ ٥ وەکوو (حسان)ی کوڕی ثابیت ٥ هەروا بە کەسێك دەگوترێ بۆ خۆی ڤولە رەش بێو باوکی سپی پێست بێ ٥ کەسێك باوکی نەزانرێ کێیە ٥ گۆشت کە نەزاندرێ گۆشتی ئاژەڵی نێرە یان هی مێیە ٥ خواردنێك نە شیرین نە تاڵ.

**اَلْمُخَضْرِمُ**: کەسێك سەردەمی نەزانیو ئیسلامی دیبێ ٥ هەروا کەسێك دوو سەردەمی دیبن وەکوو سەردەمی شۆڕشی ئەیلولو شۆڕشی گولان ٥ یان سەردەمی بەعسو سەردەمی فیدراڵی لە عێراق.

**خاضَهُ**: کالا بە کالا مامەڵەی لەگەڵدا کرد.

**خَضْخَضَ المرأةَ**: ئافرەتەکەی بە میروی سپی بچوك رازاندەوە.

**الخَضَاضُ**: ئادەمیزادی ئەحمەق ٥ خشڵی کەمو بچوك ٥ بۆ کەسێك: خشڵی پێوە نەبێ ٥ ڤلێتەی ملی ئاسكو پشیلە ٥ پێوەندی دیلو شێت.

**الخَضَاضَةُ**: ئادەمیزادی ئەحمەق ٥

**الخُضَخَضُ**: میروی سپی بچوك ٥ خواردنی جۆراو جۆر، ڤسەی پڕوپوچ.

**اَلْخَضِيضُ**: شوێنی ڤوڕاوی ٥ شوێنێك ئاوو درەختی زۆر بێ.

**خَضَعَ خُضُوعاً خَضْعاً وخضعاناً**: گەردن کەچ بوو، مەیلی کردو نەرم بوو بەڤسەی کرد.

**خَضَعَ لە**: ڤسەی نەرمی لەگەڵدا کرد ٥ بە ناسکیو نازەوە ڤسەی لەگەڵ کردو ئاماژەی خۆ بەدەستەوەدانی تێدا بوو.

**خَضَعَ فِي سَيْرِهِ**: لە رۆیشتنەکەی کۆشش کردو ملی درێژ کردو بە

وریایییەوە هەنگاوی هەڵدەهێنان.

خَضَعَهُ الكِبَرُ: پیری پشتی چەماندۆتەوە.

خَضِعَ خَضَعاً: مەیلی کرد، ژێر بار بوو، پشتی کۆمایەوە ٥ رازی بوو بە ژێر دەستەیی ٥ (هو أخضع وهي خضعاء).

أخْضَعَ فلان: فلانکەس قسەی نەرمی لەگەڵ ئافرەتەکە کرد.

أخْضَعَ الشَّيْءَ: بەمانا (خَضَعَهُ) دێ.

خاضَعَهُ: قسەی نەرمو نیانی لەگەڵ کرد.

خَضَّعَ اللحمَ: گۆشتەکەی پارچە پارچە کرد.

اخْتَضَعَ: بەمانا (خَضَعَ) دێ.

اخْتَضَعَ الصَّقْرُ نحوه: سەری شۆڕکردەوە بۆئەوەی نێچیر بگرێ.

تَخَضَّعَ: بەزۆر گەردن کەچی بەسەر خۆیدا هێنا.

الْخَضْعَةُ: دەنگی لێدانی قامچیو کێپاڵ ٥ دەگوترێ: (سمعت للسياط خَضْعَةً، وللسيوف بَضْعَةً) دەنگی وێ کەوتن ٥ دەنگی بڕین.

الْخُضَعَةُ: کەسێك کە ژێر باری هەموو کەس ببێ ٥ کەسێك خەڵکانی تر ژێر بار بکاو بیانچەمێنێ ٥ درەختی خورما کە بەدەنك روابێ نەك بە

ئەمام ٥ (ك: خُضَعٌ).

الخضوع: بەمانا (الخاضع) دێ ٥ کەسێك زۆر ژێر بار ببێو زەلیلی قبوڵ بکا ٥ (ك: خُضَّعٌ).

الْخَضِيعَةُ: دەنگێکە لە گەدەی ئاژەڵ دەبیسرێ، قۆڕەی سك، خورەی لافاوو شتی وەها.

الْخَيْضَعَةُ: ژاوە ژاوو غەڵبە غەڵب لە شەڕو شتی وادا ٥ شەڕو هەرا ٥ تەپو تۆز.

خَضَفَ الطعامَ خَضْفاً: خۆراکەی خوارد.

الْخَضَفُ: کاڵەك.

خَضِلَ خَضَلاً: شەی هێنایەوەو تەڕ بوو، نازو نیعمەتی دەست کەوت.

الْخُضْلُ: دوڕی صافو بێگەرد وەکوو دڵۆپە ئاوی رون.

أخْضَلَ: بەمانا (خَضِلَ) دێ.

أخْضَلَ الشَّيْءَ: شتەکەی تەڕکرد، تەاوی کرد لە حەدیثی (الأنصار)دا هاتووە دەڵێ: (فبكوا حتى أخْضَلوا لحاهم).

خَضَّلَهُ: بەمانا (أخْضَلَهُ) دێ ٥ لە حەدیثی سولەیمدا هاتووە: (خَضِّلي قنازِعَكِ): قژەکانت بە ئاوو رۆن نەرم بکە شەداریان بکە.

إخْضَلَّ: بەمانا (خَضِلَ) دێ ٥ لە

حەدیثی عومەردا هاتووە (فبكى حتى إخضَلّت لحيته) ئەوەندە گریا تا ریشی تەڕ بوو.

**إخضَلَّ الليلُ**: شەوەكە زۆر تاریك بوو، هەوای فێنكی شەو هەڵیكرد.

**إخضَالَّ**: بەمانا (خَضِلَ) دێ.

**إخضَالَّت الشجر**: درەختەكە لقو پۆپی زۆر بوون.

**إخضَالٌ**: بەمانا (إخضَالٌ) دێ.

**اخضَوْضَلَ**: بەمانا (خَضِلَ) دێ.

**الخَضْلُ**: لوئلوئی باش ٥ دوڕی صافو رون وەكو قەترەی ئاوی صاف.

**الخُضُلَّةُ**: هەرزانیو ئاو داری ٥ نازو نیعمەتو خۆشگوزەرانی ٥ ژنو هاوسەر ٥ شۆقە زێڕینە.

**خُضْلات**: شتی پڕو پوچ.

**الخضيلَةُ**: باغچەی فێنكو شێدار ٥ (ك: خضائل).

**خَضَمَهُ خَضْماً**: بڕیەوە، پڕ بەدەمی خواردنەكەی خوارد یان بە خرێیەكانی دواوەی ناودەمی خواردنەكەی كەرت كرد.

**خَضَمَ له من ماله**: لە ماڵو سامانی خۆی بەشی دا.

**خَضِمَهُ خَضْماً**: بەمانا (خَضَمَهُ) دێ.

**أخضَمَ الماءُ**: ئاوەكە شیرین نەبوو تاڵیش نەبوو.

**أخضَمَ له من العطاءِ**: بەشی زۆری پێدا.

**أخضَمَ فلاناً**: رزقو رۆزی زۆری دا بە فلان.

**اختَضَمَهُ**: بەمانا (خَضِمَهُ) دێ.

**الخُضَامُ**: شتی بڕدراوە لە گیاو گزو دارو دەوەن.

**الخُضَامَةُ**: شتی درواوەو بڕدراو لە گیاو دارو درەخت.

**الخُضَمَةُ**: لوش دەر، كەسێك خێرا شت بخوا، ئاژەڵێك خێرا ئاڵف بماشێتەوە.

**الخِضَمُّ**: دەریای پانو پۆڕ ٥ كۆمەڵی زۆر ٥ شمشێری بڕندە ٥ ئەسپو ماینی كەتەو ناوقەد ئەستور.

**الخُضُمَّةُ**: زۆرینەی هەموو شتێك ٥ باسكو قۆڵ ئەستور ٥ ناوەندو میانە (فلان في خُضُمَّةِ قومه) فلان لە ناوەندەی كۆمەڵی خزمەكانیدایە.

**الخَضِيمةُ**: چڵە گیای سەوزو تەڕ ٥ زەوییەك گیاو گزی نەرمی لێ بڕوێ ٥ چێشتی گەنمە كوتاو، چەمسوتەكە.

**خَضَنَ الجَمَلَ ونحوه خَضْناً**: باری لە حوشترەكە نا ولاغەكەی باركرد ٥ ژێر باری كرد.

**خَضَنَ الشَّيَ**: شتەكەی صەرف كرد.

**خاضَنَ القوم مخاضنةً وخِضاناً**: خەڵكەكە

جنێوو قسەی ناشیرینیان بەیەکتر گوتن.

**خاضَنَ المرأةَ**: مێ بازی لەگەڵ ئافرەتەکەدا کرد.

**اَلْمخضَنُ**: کەسێك ولاخ دەعاملێنێ و ژێرباری دەکا.

**خطِئَ** خطا وخطْئاً: تاوانی کرد ، یان بە ئەنقەست گوناهی ئەنجامدا.

**خطِئَ** السهمُ الهَدَفَ: تیرەکە نیشانەکەی نەهەنگاوت.

**أخطأ**: بەمانا (خَطِئَ) دێ ، هەڵەی کرد، لە رێبازی راست لایدا ، بە ئەنقەست یان بە سەهو تاوانی لێ رودرا.

**أخطأ الهَدَفَ**: نیشانەکەی نەپێکا.

**خطأه تخطئةً**: بە هەڵەکارو تاوانباری لە قەڵەم دا ، یان بە قسە پێی گوت هەڵەت کرد.

**تخاطأ له**: بە رواڵەت خۆی بە هەڵەکار دانا.

**تخاطأ الشَّیْئَ**: شتەکەی نەپێکا.

**تخطأه**: بەمانا (أخطأه) دێ.

**استخطأت الأنثی**: مێیەکە ئاوس نەبوو، کەڵی نەگرت.

**الخطء**: تاوان، یان تاوانی بە ئەنقەست.

**اَلْخطاء**: کردەوەیەك بە هەڵە نەکرابێ ، پێچەوانەی (ألصواب)ە.

**الخطا**: بەمانا (اَلْخطاء) دێ ، پێغەمبەر فەرمویەتی (رفع عن أمتی الخطا والنسیان).

**اَلْخطاءُ**: کەسێك زۆر هەڵەو تاوان بکا.

**اَلْخطیئةُ**: تاوانو هەڵە.

**خَطَبَ** الناسَ وفیهم وعلیهم خطابةً وخُطبةً: وتاری بۆ خەڵکەکە دا.

**خطَبَ فلانةً خَطباً وخِطبَةً**: خوازبێنی ئافرەتەکەی کرد، داوای لە فلان ئافرەت کرد هاوسەرگیری لەگەڵدا ئەنجام بدا.

**خطَبَها الی أهلها**: داوای لە کەس و کاری ئافرەتەکە کرد رازی بن بەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتەکەدا ئەنجام بدا ، دەشگوترێ:

**خطَبَ ودَّهُ**: هەوڵی دا خۆشەویستی ئەو بەدەست بێنێ.

**خطِبَ** خَطَباً وخُطبَةً: رەنگی مەیلەو خۆڵاوی بوو.

**خطُبَ** خَطابةً: بوو بە وتاربێژ.

**أخْطَبَ**: بەمانا (خَطِبَ) دێ.

**اخطَبَ فلاناً**: وەڵامی خوازبێنی فلانی دایەوە.

**اخطَبَ الشَّیْئَ فلاناً**: شتەکەی لە فلان کەس نزیك کردەوەو وای لێکرد دەستی بیگاتێ ، دەگوترێ: (أخطَبَهُ الصیدُ).

**خاطَبَهُ مُخاطَبةً وخِطاباً**: قسەی لەگەڵدا

کرد ٥ قسەی ئاراستە کرد لە بارەی شتێکەوە لەگەڵی دوا.

**خَطَبَـهُ**: بـەمانا (اخـتَطَبَهُ) دێ ٥ لـە حـەدیشـدا هـاتووە (انـه لَحَـرِیٌّ ان خَطَبَ ان یُخَطَّبَ).

**اخْتَطَبَ المرأةَ**: خـوازبێنی ئافرەتەکـەی کرد.

**اخْتَطَبَ فلاناً**: داوای لە فلان کەس کرد ژن بهێنێ (ژن مارە بکا).

**تخاطَبَا**: بەیەکەوە قسەیان کرد.

**الخِطابُ**: قسەی رێک‌و پێـک ٥ بەڵـگەو شـارەزایی لـە ئاخاوتنـدا ٥ قورئـان دەفەرموێ: ﴿فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِي فِي الْخِطَابِ﴾: نامـەو تـەوجیهاتە (فـصل الخطـاب) قـسەی یـەکالا کەرەوە، بڕیاردانی دادوەر لە ئاکامی سوێند یـان شـایەت ٥ تێگەیـشتن‌و لێـزانین لـە قـەزاوەت‌و دادوەریـدا ٥ جیاکەرەوەی نێوان حـەق‌و بـەتاڵ ٥ دەقێك ئەوەندە کورت نەکرابێتەوە مانا نەگەیـەنێ، یـان ئەوەنـدە درێـژ بێ بێ تام‌و چێژبێ.

**الخطابـة**: لـە زاراوەی مەنتیقیەکانـدا قیـاس‌و بەراوردێـکە پێـك هاتبێ لەشتی ظەنی یان شتی مەقبول.

**الخَطْبُ**: ئیش‌وکار ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ﴾ ٥ بەڵاو کارەسات‌و کێشە کە پێویستی بە زۆر لەسەر گوتن هەبێ.

**الخِطْبُ**: دەسـگیران، ئـافرەتی خـوازبێنی کـراو ٥ یـان پیاوێـك کـە خـوازبێنی دەکا ٥ (ك: أخْطابٌ).

**خِطْـبٌ**: وشـەیەکە عەرەبـەکان لـەپێش هـاتنی ئیـسلام بـۆ ژن مـارەکردن بــەکاریان هێنــاوە ٥ پیاوەکــە وتویەتی: (خِطْبٌ) لە وەڵامدا پێیـان گوتـووە (نِکْـحٌ) واتـە: لـە شـوێنی نیکاح‌و تەزویج بەکاریان هێناوە.

**الْخطْباءُ**: دەستێك خەنەی تێـگیرابێ‌و رەنگەکەی نەمابێ.

**الْخُطْبَـةُ**: بـۆ رەنـگ بـوترێ: مەبەست رەنگێکە کە خاکی یان زەردێك بێ سـەوز یـان سـوری تێـکەڵ بـێ ٥ پەخشانێك بە شێوەیەکی تایبـەتی یەکێـکی زمـانرەوان بـۆ کۆمـەڵی خەڵکی بخوێنێتـەوە بـە مەبەستی ئەوەی گوێگرەکان کار بە نـاوەڕۆکی بکـەن ٥ دیباچـەی کتێـب ٥ (ك: خُطَبٌ).

**الْخِطْبَـةُ**: خــوازبێنی ئــافرەت بــۆ هاوسەرگیری ٥ دەسگیران.

**الخَطابُ**: کەسێك زۆر خوتبە بداو وتار وەخوێنێ.

الخَطابية: پێرێکن له شیعەی رافزی شوێن رێبازو بیرو بۆچوونی ئەبولخەتابی ئەلئەسەدی کەوتوون.

الخطيبُ: ئەوکەسەی لێزان و کارامەیە له خوتبه خوێندنەوەدا له مزگەوت یان له شوێنی تر ٥ وته بێژی رەسمی گەل و هۆز ٥ خوازبێنی کەری ئافرەت (زاوا).

الخطيبة: دەسگیران ٥ ئافرەتی خوازبێنی کراو.

خَطَرَ في مشيه خَطْراً وخَطَراناً: خۆی باداو لارو لەنجەی کرد.

خَطَرَ بذنبه: کلکی هەڵسوراند جارێک بەرزی دەکردەوەو دەمێک شۆڕی دەکردەوە ٥ یان بەملاو ئەولادا هەڵی دەسوڕاند.

خَطَرَ بباله وفيه وعليه خَطْراً وخطوراً: شتەکەی کەوتە دڵەوە، بە خەیاڵیدا هات.

خَطَرَ الشيطان بين الانسان وقلبه: شەیتان ختوکەو وەسوەسەی گەیاندە ناو دڵی ئادەمیزادەکە.

خَطُرَ خَطَراً وخُطوراً: گەورەبوو رێزی زیادی کرد.

أخْطَرَ: خۆی کردە رەفیق هاوشانی فلان و بۆی چووە مەیدان و شەڕی لەگەڵدا کرد.

أخْطَرَ فلان لي وأخْطَرْتُ له: من و فلان گرەومان کرد.

أخْطَرَ فلاناً: ئەوەندەی باربەهادا بە فلان تا رازیی کرد.

أخْطَرَ المرض فلاناً: نەخۆشیەکە فلان کەسی خستۆتە حاڵەتی مان و نەمانەوە ٥ دەشگوترێ: (بادية مُخْطِرَة) سەحرایەکی ترسناکە.

أخْطَرَ الشَّيْءَ: شتەکەی کردە گرەو لەسەر کراو.

خاطَرَ به: خۆی خستە گۆڵەمەزێکەوە نزیکی لێواری مەرگ بۆوە.

خاطَرَ فلاناً: لەگەڵ فلان کەسدا گرەوی کرد ٥ (خَاطَرَ عليه) گرەوی لەسەر کرد.

خطَّرَ: بەشی وەرگرت.

خطَّرَ الشَّعْرَ: مووەکەی تێکەڵ بە میزو قشپلی ئاژەڵەکان کرد.

تخاطَرَ: گرەویان کرد ٥ دەگوترێ: (تخاطر علی كذا) لەسەر ئەوشتە گرەویان کرد ٥

تخاطر الفحولُ بأذنابها: ئەسپەکان گوێیان جوت کردن بە مەبەستی ئامادە بوون بۆ هەڵمەت و بازدان.

الخاطِرُ: ئەوشتەی بە دڵدا هات، ئەو فکرەو بیرو بۆچونەی دێتە ناودڵ و مێشکەوە ٥ دڵ و دەروون ٥ (ك: خواطر)ە.

**اَلْخَاطِرَةُ**: بەمانا (اَلْخَاطِرُ) دێ ٥ (ك: خواطر).

**اَلْخَطْرُ**: هەوری گەواڵ گەواڵ، هەوری بارانـاوی ٥ حوشتری زۆر ٥ کـەمێڵ ئەو ریخو قشپڵو گەمرەی بە قلو قاچی حوشترەوە تەبار دەبەستێ ٥ هەروا ناوە بۆ ئامێرێکی پێوانە وەکوو تەغارو عەربە دانیشتوانی شام بەکاری دەهێنین.

**اَلْخِطْرُ**: رووەکێکە دەستو پەنجەی پێ خەناوی دەکرێ ٥ ماستاوێك ئاوی زۆر بێ ٥ لقەدار ٥ حوشتری زۆر ٥ ئەو کەمێڵو گەمرەیەی لەسەر دەستو پەلی حوشتر تەبار دەبەستێ، ئەو ریخو پیساییە کە بە جەستەیەوە رەق دەبێ.

**اَلْخَطَرُ**: نزیك بوونەوە لە لێواری مردن ٥ گرەو ٥ باربەهاو بارتەقاو بەش‌وبار.

**اَلْخَطِرُ**: ئادەمیزادی بە فیزو ترزل.

**اَلْخَطْرَةُ**: ئەوەیە بە دڵو مێشکدا رادەبوورێ ٥ کاتو سات ٥ دەگوترێ: (ما ألقاه الاخطرَةً بعد خَطْرةٍ) بەین بەین نەبێ نای بینم ٥

**اَلْخَطَّارُ**: ئەوشتەی شتی تری پێ هەڵدەکێشی ٥ گازو پلایس ٥ قۆچەقاینی ٥ زەمبەلەك ٥ شێر ٥ عەتارو بۆن فرۆش ٥ رمب ٥ زەبری رمب.

**اَلْخَطَّارَةُ**: گەووڕی حوشتر ٥ ئاغەڵی حوشتر.

**اَلْخِطِّيرُ**: هاوشان لە شەرەفو وەجاخزادەیی دا ٥ لغاوو رێشمە ٥ حەبلو پەت ٥ هێڵەکانی خۆر لە جەنگەی گەرمادا ٥ تاریکایی شەو.

**خَطَّ** الوجهُ خَطّاً: دەمو چاوی چرچو لۆچی تێدا پەیدا بوون ٥ لاجانگی مووی لێ دەرهات (ریشی هات).

**خَطَّ** علی الشَّيْءِ: نیشانەو ئارمی لەسەر شت وێنە کرد.

**خَطَّ** الخِطَّةَ: پلانەکەی دیاری کردو نیشانەی لەسەر دانا بۆئەوەی بزانرێ کە ئەوە هەڵبژاردەی خۆیەتی.

**خَطَّ** الشَّيْءَ: شتەکەی هەڵکۆڵیو شەقی کرد.

**خَطَّ** الکتابَ: کتێبەکەی نووسیەوە ٥ دەگوترێ.

**خَطَّهُ بِقَلَمِهِ**: بە قەڵەمی خۆی نووسیەوە.

**خَطَّطَهُ**: بەمانا (خَطَّهُ) دێ، دەگوترێ: (خَطَّطَ الأرض والبلاد): زەوییەکە یان وڵاتیان سنوردار کرد سنوورەکانی دیاری کردن.

**خَطَّطَ المكانَ**: شوێنەکەی دابەشکردو ئامادەی کرد بۆ دروستکردنی تەلارو باڵە خانە لەسەری.

**خَطَّطَ الحواجِبَ**: بەقەڵەم بڕۆی خۆی کێشاو ڕێکی خست.

**اخـتَطَّ الوَجْهُ**: دەمو چاوی چرچی تێکەوت.

**اخـتَطَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی هەڵکۆڵی‌و شەقی کرد.

**التخطيط**: پلان دانان‌و نەخشە کێشان ٥ لە زاراوەی فەنن‌و رەسم چییەتیا بریتییە لە چەسپاندنی فکرەو بۆچونێک بە رەسم وێنە کردن ٥ یان نووسین کە ئاماژە بکات ئەو وێنەیە چ دەگەیەنێ.

**الخَـطُّ**: دێڕ ٥ نووسین ٥ هەرشوێنێک ئادەمیزاد سنووری بکێشێ‌و سنوورەکانی بە هەڵکەندنی کانگەو ڕوشاندنی زەوییەکە ئەنجام بدرێ ٥ ڕێگای ڕاستی درێژو لاکێشەیی ٥ لە زاراوەی حوکەما ئیغریقیەکاندا بە خەتێک دەگوترێ تەنها لە باری درێژییەوە قبوولی کەرتکردن بکاو کۆتاییەکەی خاڵێک بێ ٥ لە زاراوەی ماتماتیکدا هێڵێکە دوو شتی جیا یا زیاتر پێکەوە دەبەستێ.

**خط الاستواء**: لە زاراوەی جوگرافیدا ئەو کەوانەیە سفرمیە زەوی دەکاتە دوو بەش ٥ لە ناوەڕاستی مەسافەکەدا درێژ دەبێتەوە بۆ ناو جەمسەرەکان.

**خَـطُّ الرجعة**: ئەو ڕێگایەیە سوپا دەبەستێتەوە بە مەرکەزەوە.

**الْخَطّ الامامي**: هێڵی پێشەوەی گۆڕەپانی شەڕ.

**فن الخط**: دەست ڕەنگینی لە خۆش نووسیدا.

**علمُ الْخَطِّ**: زانیاری ڕەمڵ هاوێژی.

**الْخُطُـوطُ البريّة**: ئەو ڕێگاو بانانەی ترومبیل‌و شتی وایان پێدا دەڕوا.

**الْخُطُـوطُ الجوية**: ڕێبازی تەیارە لە هەوادا.

**الْخُطُوطُ المائية**: ڕێگای کەشتی‌و گەمی لەناو ئاودا.

**الْخُـطُّ**: ڕێگای درێژەوەبوو ٥ شوێنی گەڕەك لەناو شاردا.

**الْخِـطّ**: ئەو شوێنەی ئادەمیزاد بۆخۆی بڕەدا لە زەوی بۆ جێگای خانوو کردن یان بەکارهێنانی بۆ باغ‌و شتی تر.

**الْخطاطُ**: خۆشنووس.

**الْخُطَّـة**: نەخشەو پلان، ئیش‌و کار، بڕیارێک لێکۆڵینەوەی تێداکرابێ‌و هەڵبژێردرابێ بۆ تەنفیز.

子曰。學而時習之。不亦說乎。有朋自遠方來。不亦樂乎。人不知而不慍。不亦君子乎。南海

الخط الصيني

በስመ፡እግዚአብሔር፡ሥሉስ፡በኢተሌልዮ፤ዋሕድ፡በኢተፋልዮ፤ክዱን፡መለኮት፡እምተሐልዮ፤ወኅሩመ፡ሥልጣን፡

الخط الحبشي

الخط المسماري

الخط الهيروغليفي

落下傘は高所カラ人員乃至物質を緩速度で比較的安全に地上に降下させるための救命具の一種。取って語學は好きなのでフランス語を見たが割合に好く出來タ、カラ。たゞ。そろ〳〵。

الخط الياباني

خطوط شرقيّة

نماذج من الخط العربي

# جمعت الطبيعة عبقريتها فكانت الجمال

الثلث

وكان أحسنه وأشرفه ما حلّ في الهيكل الآدمي وجاور العقل الشريف والنفس اللطيفة والحياة الشاعرة

النسخي

# فالجمال البشريّ سيّد الجمال كلّه

الفارسي

لا المثال البارع استطاع أن يخلعه على الدمى الحسان ولا النيرات الزهر في ليالي الصحراء ما له من لمحة وبهاء

الريحاني

ولا لبديع الزهر وغريبه في شباب الربيع ما له من بشاشة وطيب

الرقعي

وليس الجمال بلمحة العيون ولا ببريق الثغور ولا بهيف القدود ولا بأسالة الخدود

الديواني

ولا بلؤلؤ الثنايا وعقيق الشفاه ولكنه شعاع علوي يسطع من المبدع البديع على بعض الهياكل البشرية

الديواني الجلي

يكسوها روعة ويجعلها سحرا وفتنة للناس

الكوفي

بيروت في ١٥ تموز ١٩٥٤

فؤاد نوفل طعمة

**اَلْخِطَّةُ**: بەمانا (اَلْخِطُّ) دێ.

**اَلْخَطِّيُّ**: شمشێرێك له ولاتی (اَلْخَطْ) كه شوێنێكه له بەحرەین دروستكرابێ، یان لەوێ دەفرۆشرێ‌و رەواجی هەیە.

**اَلْخَطُوطُ**: ئەوكەسەی بە رۆیشتن بە ناوی زەویدا هێڵ دروست دەكا ○ مادەیەكە برۆی پێ رێك دەخرێ.

**اَلْخَطِيطَةُ**: لەبەلان ○ زەوییەك هەندێكی بارانی لێ درابێ‌و هەندێكی بارانی لێ نەباری بێ.

**المِخْطاط**: هەرشتێك هێڵی پێ رێك بخرێ.

**اَلْمِخَطُّ**: هەرشتێك شتی پێ بدورێتەوە ○ وەكوو سوژن‌و دەرزی ○ شیشی گۆرەوی چنین‌و شتی لەوجۆرە.

**المخطوط**: هەر شتێك بەدەست نووسرابێ ○ كتێبی دەستنووس.

**اَلْمَخْطُوطَةُ**: ئەو نوسخەیەی بەدەست نووسراوە.

**خَطَفَ** خَطفاً وخَطَفَاناً: بەخێرایی رۆیی‌و تیژ تێپەری ○ فڕاندی، هەڵی گرت‌و بردی ○ دەگوترێ: (خَطَفَ البرقُ البَصَرَ) بروسكە روناكی چاوی برد ○ (خَطَفَ السمع) قسەكەی دزی ○

**خَطِفَ** خَطْفاً: بەمانا (خَطَفَ) دێ.

**خَطُفَ**: كزو لاواز بوو.

**خَطِفَ الشَّيءَ**: شتەكەی رفاند، فڕاندی.

**أخْطَفَ**: كەمێ نەخۆش كەوت‌و زوو چاكبۆوە.

**أخْطَفَ السهمُ**: تیرەكە نەیهەنگاوت، هەڵەی كرد.

**أخْطَفَ الحُمَّى المَريضَ وعنه**: نەخۆشییەكە لەجەستەی نەخۆشەكە لاچوو ئەما چاكبۆوە.

**أخْطَفَ المرضُ فلاناً**: نەخۆشییەكەی لەسەر سووك بوو بۆی نەكەوت.

**أخْطَفَ الشَّيءَ**: شتەكەی هەڵە كرد بۆی نەچوو.

**أخْطَفَ لي من حديثه شيئاً**: كەمی لە قسەكەی بۆ دەرخستم‌و بێدەنگ بوو.

**أخْطَفَهُ**: بەمانا (خَطَفَهُ) دێ.

**تَخَطَّفَهُ**: بەمانا (خَطَفَهُ) دێ.

**الأخْطَفُ**: قەدباریك، كەسێك ورگ‌و ریخۆڵەی پچووك بن.

**الخاطِفِ**: تیرێك نیشانەكە نەهەنگێوێ.

**خاطِف ظله**: باڵندەیەكە سێبەری خۆی لێ دەبێتە نێچیرو پەلاماری دەدا.

**الخاطوف**: ئامێری شت فڕاندن.

**الخَطَّافُ**: كەسێك زۆر رفێنەر بێ، دەگوترێ: (لِصٌّ خطاف).

**الخُطاف**: بەمانا (الْخَاطُوف) دێ ٥ هەر ئاسنێـك سـەرەكەی چـۆمابێتەوە وەكـوو قـولاپ، دەنـدوكی باڵنـدە، باڵنـدەی سـینونو كـە جـۆرە باڵندەیەكـە دەنـدوك پـان باڵـەكانی باریك‌و درێژ ٥ كلكی فشەڵۆك ٥ (ك: خطاطیف).

**الْخطْفَـةُ**: پارچەی بـڕاو لـە ئـاژەڵ بـە زینـدویی ٥ لـە حـەدیثـدا هـاتووە: پێغەمبـەر (د.خ) (نهی عن الْخَطْفَـةِ) نەهی كردووە لەوەی پارچەیەك لـە جەسـتەی مەڕێـك بزنێـك بـبڕێ پـێش سـەر بـڕین ٥ قومـە شیرێـك منـداڵ لـە مـەمكی دایكی دەیگرێ‌و بەرەڵای دەكا.

**الْخطَفَی**: ڕۆیشتنی خێراو بەپەلە.

**الْخطِیفَةُ**: بەمانا (المخطوفَةُ) دێ ٥ پەڵو، كاسـتەر ٥ شـیرو ئـاردی بەسـەردا دەكرێ‌و دەكوڵێنـدرێ‌و بـە كەوچك دەخورێ.

**المِخْطَفُ**: بەمانا (الْخَاطِفُ) دێ ٥ هەروا بەمانا (الخاطوف) دێ.

**خَطِـلَ خَطَـلاً**: جەسـتەی داهێـزاو بـاری تەنـدروسـتی خـراپ بـوو ٥ پەلـەی كـردو لـە ڕێبـازی ڕاسـت لایـدا ٥ نەحمەق بوو ٥ هەڵەی كردو قسەی ناشیرینی كردن ٥ دەگوترێ: (خَطِـلَ كلامُهُ).

**خَطِـلَ فِي مـشيه**: لـە ڕۆیـشتنەكەیدا لارو لەنجەی كرد ٥ (هو خَطِـلٌ وأخـطَلٌ، هی خطلاء).

**أخْطَلَ في كلامه**: بەمانا (خَطِلَ) دێ ٥

**تَخَطَّلَ**: خۆی باداو لارو لەنجەی كرد.

**الْخطـالُ**: جـوێن فـرۆش‌و قـسە تـڕن ٥ گوما ناوی.

**الْخطَـــلُ**: قـسەی پڕوپـوچ‌و خـراپ‌و ناشـوباوی ٥ قـسەی بـێ سـەروبەرو وێ نەچوو.

**الْخَطِلُ**: نەحمەق‌و ناكەس بەچە ٥ ڕمب وەشێنی گورج‌و گۆڵ.

**خَطَمَهُ خَطْماً**: لە لوتەوانەكەی سرەواند ٥ لوتەوانەی لە لوتی كرد.

**خَطَمَ أَنفَ فلان**: داخی عـەیب‌و عـاری بـە لوتیەوە نا، سەری لوتی ڕەش كرد.

**خَطَـمَ فلانـاً بـالكلام**: بەقـسەی كاریگـەر دەمی فلانكەسی بەسـت‌و نەیهێـشت دەم بكاتەوە.

**خَطَمَ الجِلْدَ ونحوَه**: دەوروبەری پێـستەكەی دوریـیەوە.

**خَطَـمَ القَـوْسَ بـالْوَتَرِ**: قەوسـەكەی بـە ژێیەكە هەڵواسی، هەڵیواسی.

**خَطَّمَهُ**: بەمانا (خَطَمَهُ) دێ.

**الأخطم**: لوت درێـژ، ڕەش پێـست ٥ (ك: خُطْمٌ).

**الْخَاطِمُ**: دەگوترێ: فلان خَاطِمُ بني فلان: فلانکەس ریش سپی خێلەکەیەتی ‌ە تەگبیر کەرو را دروستی بنەماڵەکەیانە.

**الخِطامُ**: هەوسار، رێشمە ‌ە ئەو دارەی دەکرێتە لوتی حوشترەوە بۆئەوەی جڵەوی خۆش بێ ‌ە دەگوترێ: (وَضَعَ الخِطامَ على أنف فلان) فلانکەسی ژێر بار کردو کۆنترۆلی کرد.

**منع خِطامَهُ**: کابرا رازی نەبوو بە چەوسانەوەو ژێر بارکردن ‌ە ژنی قەوس ‌ە (ك: خُطُمٌ وأخْطِمَةٌ).

**الْخِطام**: دەگوترێ: (مسك خَطامٌ) میسکێکە پڕ بە لووت، بۆنی ئەوەندە زۆرە لووت پڕدەکا.

**الْخَطْمُ**: لووت، پێشی لووت ‌ە دەندوك ‌ە (ك: خطوم وأخطام).

**الْخِطْمِيُّ**: روەکێکە لە پێری (الخبازية)یە سوودی زۆرە بۆ ئادەمیزاد گەڵاکەی وشك دەکرێو دەکوترێو دەکرێ بە شامپۆی سەر شتن باش پاکی دەکاتەوە.

**الْمُخَطَّمُ**: ئەو شوێنەی لووتی حوشتر کە دارەکەی تێدەکرێ ‌ە ئەسپێك لبۆزی تادەگاتە شەویلەی خوارووی نزیك قورگی سپی بێ.

**الْمَخْطِمُ**: بەمانا (الْخَطْمُ) دێ.

**خَطا** خطواً: رۆیی.

**أخْطاه**: وای لێکرد بڕوا ‌ە هەلی نا بۆئەوەی هەنگاو هەڵێنێ.

**خَطّاهُ**: بەمانا (أخطاه) دێ.

**خَطّى عنه الشَّيْءَ**: شتەکەی لێ دوور خستەوە، پالی پێوە نا.

**إخْتَطى**: بەمانا (خَطا) دێ.

**إخْتَطى الشَّيْءَ**: شتەکە بواردی لێی تێپەڕی.

**تَخَطّاهُ واليه**: بەمانا (إختطاه) دێ.

**الخَطْوَةُ الْخُطْوَةَ**: هەنگاو، شەقاو مەسافەی نێوان دووقاچی لەکاتی رۆیشتندا ‌ە دەگوترێ: (اتَّبعَ خُطاهُ) شوێن پێی ئەوی هەڵگرت ‌ە رێگەی ئەوی گرتەبەر قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ﴾.

**أخْطَّ الرجلُ**: پیاوەکە سکی شل بوو، گەدەی داچۆڕا شۆڕەوە بوو.

**خظا** لَحْمُهُ خُظواً: قەڵەو بوو، گۆشتی گرت.

**أخْظى الرجلُ**: پیاوەکە قەڵەو بوو.

**أخْظى الحَيْوانَ**: ئاژەڵەکەی قەڵەو کرد.

**خَظّاهُ**: کەتەی کردو گەورەی کرد تا زەبەلاح بوو.

**الْخَاظِي**: ئەستورو پتەوو رەق ‌ە دەگوترێ: (قدح خاظٍ) پیالەیەکی ئەستورو پتەوە.

**الخَظَاةُ**: تێرو پڕ لەهەموو رویەکەوە.

**الخَظَوانُ**: (رجل خَظَوَان) پیاوێکی گۆشتن‌و قەڵەوە.

**الخَظيُ**: تێکسمراوو گۆشتن، نەرمو شل ٥ دەگوترێ: (امرأة خظية بظية).

**خَفَتَ** خَفتاً وخفوتاً وخفاتاً: دامرکا، هێدی بوو، بێهێز بوو.

**خَفَتَ** المريضُ: نەخۆشەکە لە قسە کەوت، زمانی شکا ٥ لە ناکاو مرد، کت‌و پڕ مرد ٥ دەنگی نزم بۆوە.

**خَفَتَ** بصوته: دەنگی خۆی نزم کردەوە، بەسرتە قسەی کرد.

**خافَتَ** بصوته: دەنگی خۆی نزم کردەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا﴾.

**تَخافتا**: ئەو دوو کەسە بەیەکەوە سرکەیان کرد.

**تَخافَتَ** فلان: فلانکەس خوستی لەخۆی بڕی جوڵەی نەکرد.

**الخافِتُ**: هەوری بێ باران ٥ کشت‌و کاڵی تەمەن کورت.

**الخَفُوتُ** من النساء: ئافرەتی رەقەڵەو کزو لاواز.

**خَفِجَ** خَفَجاً: نەخۆشێ قاچ لەرزینی توش بوبێ، دەگوترێ: (خَفِجَت رجلُه): قاچی فەیزەن بوو خوار بوو، قاچی لەکاتی هەڵسان‌و رۆیشتندا توشی لەرزین بون (هو أخفج وهي خَفجاء) (ك: خُفُجٌ).

**تَخَفَّجَ**: خوار بوو.

**الخَفيجُ**: دەردێکە توشی حوشتر دەبێ ٥ رومکێکی بەهارییە لە پێری (المركبة)یە ڕەنگاو ڕەنگە گەڵاکەی پانە.

**الخَفيجُ**: لاوازو باریك یان قاچ باریك ٥ ئاوێك نەگاتە ئاستی شیرینی‌و گوارایی.

**خَفْخَفَ**: قیژاندی، هاواری کرد (خَفْخَفَ الشَّئَ) شتەکەی جوڵاند دەنگی لێوە هات.

**الخَفْخافُ**: گن، کەسێکە کە قسە دەکا دەنگی لە لوتیەوە دێتە دەر ٥ دەگوترێ: (هو خفخاف الصوت) دەنگی گنە.

**خَفَدَ** خَفْداً وخَفَدَاناً: خۆی سوك کردو لە رۆیشتندا پەلەی کرد.

**أَخْفَدَت** الناقةُ: حوشترەکە وای لێ دەرکەوت ئاوس بێ وەلێ وانەبوو ئاوس نەبوو.

**أخْفَدَت الحاملُ**: ئافرەتەکە سکەکەی لەبار چوو پێش ئەوەی کامڵ بێ ٥ (هي مُخْفِد وخفود).

**خَفَرَهُ** وبه وعليه خَفْراً وخِفَارَةً: پەنای داو پارێزگاری لێکرد.

خَفَرَ بالعهد: پابەندی بەڵێنەکەی خۆی بوو.

خَفَرَ العَهْدَ: پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە.

خَفِرَت خَفَراً: شەرمو حەیای زۆر بوو.

أخْفَرَهُ: پاسەوانی بۆ گرت ٥ حەرەسی لەگەڵ نارد ٥ پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە.

أخْفَرَ العهدَ: پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە.

خَفَّرَ: بەمانا (خَفَرَهُ) دێ ٥ شورای بۆکرد.

تَخَفَّرَ: بەمانا (خَفِرَ) دێ ٥ خۆی خستە پەنایەوە، داوای پارێزگاری لێکرد.

إستَخْفَرَهُ: داوای لێکرد ببێتە پاسەوانو خەفەری.

اَلْخَفَارةُ: وادەو بەڵێن ٥ دڵنیایی ٥ پاسەوانی.

اَلْخُفَارَةُ: بەمانا (اَلْخَفَارة) دێ ٥ کرێی پاسەوانی.

اَلْخِفَارَةُ: بەمانا (اَلْخَفَارَةُ) دێ ٥ پیشەی پاسەوانی.

الخَفِيرُ: حەرەسو پاسەوان.

اَلْمَخْفِرُ: شوێنی حەرەسیو خەفەر ٥ (ك: مَخَافِر).

خَفَسَ خَفساً: قسەی ناشیرینی کرد.

خَفَسَ الشرابَ: زۆری ئاو کردە ناو شەرابەکەوە.

خَفَسَ البناءَ: خانوەکەی روخاند.

خَفَسَ فلاناً: فلانکەسی لە عەرزدا ٥ گاڵتەی پێکرد.

أخْفَسَ: بەمانا (خَفَسَ) دێ ٥

أخْفَسَ الشرابُ: شەرابەکە خێرا سەرخۆشی کرد.

إنْخَفَسَ: بۆ مطاوعەی (خَفَسَهُ) دێ ٥ راکشا، لەسەر پشت راکشا.

خَفَشَهُ وبه خَفْشاً: هاویشتی.

خَفَشَ الانسانَ وغَيْرَهُ: مرۆڤەکەی لە عەرز دا، خستی.

خَفِشَ خَفَشاً: چاوی کزبوو ٥ دەگوترێ: (خَفِشَتْ عينهُ) (هو أخْفَشَ وهي خَفْشَاءُ) (ك: خُفْشٌ) ٥

خَفَّشَ: زەعیف بوو ٥ (خَفَّشَ بالأرض) بە زەوییەکەوە نووسا.

خَفَّشَ البناءَ: خانوەکەی روخاند.

خَفَّشَ الانسانَ وغيرَهُ: ئادەمیزادەکەی خست، شێرەکەی بەزاند.

اَلْخَفَشُ: چاو کزی کەلەکاتی روناکی زۆردا شت نابینێ.

اَلْخُفَّاشُ: شەمشەمە کوێرە: باڵندەیەکی مەمکدارە دەتوانێ بفرێ وەڵێ تەنها بەشەو دەفرێ.

خَفَضَ العيشُ: ژیانی ئاسان بوو، باری گوزەرانی سوك بوو.

خَفَضَ بالمكان: لەو شوێنەدا جێگیر بوو مایەوە.

**خَفَضَ الشَّيْءَ**: شتەکەی نرم کردەوە، دوای بەرزبوونەوەی خستیە خوار، دایگرت ◦ لێی کەمکردەوە.

**خَفَضَ الطائر جناحَهُ**: باڵندەکە باڵی لێکنان بۆئەوەی لە فڕین بکەوێ.

**خَفَضَتْ المرأةُ صَوْتَها**: ئافرەتەکە دەنگی خۆی نەرم کردو بە سرتەوە کەوتە ئاخاوتن.

**خَفَضَ فلان جناحَهُ للناس**: فلانکەس خۆی تەرخان کرد بۆ خزمەتی خەڵک و سوك کردنی کێشەکانیان.

**خَفَضَ الصَبِيَّةَ خِفاضاً**: کچەکەی خەتەنە کرد.

**خَفُضَ العَيْشُ خَفْضاً**: ژیانی فراوان بوو پێداویستی ژیانی بۆ دەستەبەر بوو، کەوتە خۆشی‌و ژیانی نەرم‌و نۆڵەوە.

**خَفَّضَ الشَّيْءَ**: شتەکەی کەم کردەوە ◦ ئاسانی کرد ◦ گیرو گرفتەکانی لابردن ◦ دەگوترێ: (خَفِّضْ عليك أمرَك) کارەکەی خۆت لەسەر خۆت ئاسان بکە ◦

**اخْتَفَضَ الشَّيْءَ**: شتەکە دوای ئەوەی بەرز بۆوە دابەزی.

**اخْتُفِضَتْ الصَبِيَّةُ**: کچەکە خەتەنە کرا.

**انْخَفَضَ الشَّيْءُ**: بەمانا (اخْتَفَضَ) دێ.

**الخافِضُ (خافض الجناح)**: بە ئەدەب‌و بێدەنگە.

**الخافِضَةُ**: (أرض خافضة السُقْيا): زەوییەکە بەئاسانی ئاو دەدرێ.

**ليلة خافضة**: شەوێکە بۆ شەو ڕەوی خۆشە ◦ دەشتاییەکی پڕ بەرەکەت ◦ ئەو کەسەی خەتەنەی منداڵ دەکات.

**الْخَفْضُ**: ژیانی خۆش‌و بەناز پەروەردەیی ◦ دەشتایی پڕ خێرو بێر ◦ بەلای نەحوییەکانەوە بەمانا (الْجَرّ) بزوێنی ژێر لەدواپیتی وشە دا.

**خَفَعَ فلان خَفْعاً وخفوعاً**: بەهۆی نەخۆشی یان برسییەتی لاواز بوو، یان بێ هۆش بوو لەخۆ بووە ◦ دەگوترێ:

**خَفَعَ على فراشه**: لەسەر جێگای پاڵکەوتنی لەهۆش خۆی چوو.

**خَفَعَ مفاصِلُهُ**: جومگەکانی جەستەی شل‌و بێ هێز بوون.

**خَفِعَ خَفْعاً**: لە برسا یان بەهۆی نەخۆشی سکی بە پشتییەوە نووسا ◦ (هو أخْفَعُ وهي خَفْعَاء) (ك: خُفِعَ).

**أخْفَعَهُ المرضُ أو الجوع**: نەخۆشی یان برسیایەتی برستی لێ بڕی.

انْخَفَعَتِ النخلـةُ: دار خورماكـه لـه ريشەوه هەڵكەندرا.

انْخَفَـعَ فـلان: فلاّنكـەس لاواز بـوو تەندروستى تێك چوو.

انْخَفَعَ على فراشه: بەهۆى نەخۆشى يان برسييەتى لە جێگادا كەوتو تواناى هەڵسانى نييە.

اَلْخُفَاعُ: نەخۆشييەكە تووشى سييەكان دەبێ لەتلەت دەبن.

خَفَّ الشَّيْءُ: شتەكە كێشى كەم بوو.

خَفَّ الميزانُ: تەرازووەكە سەرى كرد.

خَـفَّ المطـرُ: بارانەكـە كـەم بـوو هـەڵى بروكاند.

خَفَّ القومُ خفوفاً: خەڵك كەم بوو.

خَفَّ فـلان على القلـوب: فلاّنكەس روح سـوكە لـه دڵـدا شـيرينە ٥ خۆشەويستە.

خَفَّ عقلهُ: بێ عەقڵو نەحمەقە.

خَفَّـتْ حالُـهُ: بـارى ژيـانى سـوك بـوو نارەحەتى نەما.

خَفَّ عن المكـان: لەو شوێنە بـارى كـردو بەپەلـه رۆيـى ٥ دەگـوترێ: (فـلان خِفٌّ): فلاّنكەس ئازاو بەجەرگە ٥

أَخَفَّ الرجل: پياوەكە لە سەفەردا كۆڵو بارى سوك بوو ٥ يان لە ماڵەوە بـار گران نييە لەهەموو شوێنێك جێى دەبێتەوە ٥ حـاڵو گـوزەرانى خـۆش

بوو ٥ وردە ئاژەڵى هەن رەشە وڵاخو

حوشترى نييە.

أَخَـفَّ فلانـاً: حـيلەو لەسـەرە خـۆيى

فلاّنـى نەهێـشتو واى لێـكرد تـوڕە

بێ.

تَخَافَّ: كۆڵى خۆى گران نەكرد ٥ كەمى

لە شتەكەى هەڵگرت.

خَفَّـفَ الـشَّيْءَ: شـتەكەى سـوك كـرد

دەگوترێ:

خَفَّفَ الثوبَ: قوماشەكەى شاشو تەنك

چنى.

خَفَّـفَ مـا بِـه: خـەمو خەفـەتى لـە كۆ

دامـاڵى، قورسـايى ژيـانى لەسـەر سو

كرد، ئازارى لەسەر سوك كرد.

تَخَفَّـفَ الـشَّيْءُ: شـتەكە سـوك بـو

قورسايى نەما.

تَخَفَّفَ مـن الـشَّيْءِ: لە شـتەكەى كـ

كردەوە بۆئەوەى كێشى سوك بێ.

تَخَفَّفَ خُفّاً: خوففى لەپێ كرد.

اسْتَخَفَّهُ: داواى سوكىو بێ كێشى كرد

بـە سـوكى زانـى ٥ جـاڕزى كـرد

سوكايەتى پێكرد.

اَلتَّخْـفِيفُ: لـە زاراوەى سـەرفييەكا

بريتييـە لـە حـەمزەكردنى پيتـ

هەمزە لە وشەدا جا بنووسرێ يان

٥ يان بگۆڕدرێ بە پيتێكى تر.

**الخُفَاف**: زیرەك‌و وریا.

**الخُفَّاف**: فرۆشیاری خوف، یان خوف دروستکەر.

**الخُفُّ**: سمی حوشتر، ئەو شوێنەی لە دەست‌و قاچی حوشتر کە نزیك زەوییەو توکی لێ ناڕوێ ٥ بەری پێی ئادەمیزاد ٥ گۆرەوییەك کە بتوانی ماوەیەك لەسەری برۆی ٥ کالە ٥ لە پەندا هاتووە: (رجع بخفي حنين) بە کەسێك دەگوترێ: هەولّی بۆ کارێك دابێ‌و بۆی نەکرابێ‌و ناهومێد بووبێ.

**الخِفُّ**: هەر شتێك هەڵگرتنی خۆش بێ ٥ کۆمەڵی کەم.

**الخَفیفُ**: دەگوترێ: (هو خفیف الروح) ئەو کابرایە روح سوك‌و قسە خۆشە ٥ زیرەك‌و رەزا سوکە ٥ دەست کورت‌و کەم دەرامەتە ٥ هەژارو بێ بەختە ٥ جۆرێکە لە بەحری عروزی شیعر.

**خَفَقَتِ النعلُ خَفْقاً**: نەعلەکە دەنگی لێ هات لەکاتی لەپێ کردن‌و پێ رۆیشتنیدا.

**خَفَقَ الشيءُ خفقاً وخفوقاً وخفقاناً**: شتەکە کەوتە پەلە پەل‌و جەم‌و جوڵ ٥ دەگوترێ: (خَفَقَ القلبُ) دڵی کەوتە پەلە پەل‌و لێدانی خێرا ٥ (خَفَقَ الطائرُ) باڵندەکە لە شەقەی باڵیداو فڕی.

**خَفَقَ**: مەیلی کرد، بەلای ئاوا بووندا رۆیی، خەریکە ئاوابێ ٥ دەگوترێ: (خَفَقَ النجمُ) (خَفَقَت الشمس).

**خَفَقَ فلان**: فلانکەس نووست.

**خَفَقَ الليلُ**: شەوەکە زوربەی رۆیی.

**خَفَقَ الحيوانُ**: ئاژەڵەکە لاواز بوو.

**خَفَقَ المكانُ**: شوێنەکە خاڵی بوو.

**خَفَقَ السهمُ**: تیرەکە بە تیژی رۆیی.

**خَفَقَ فلان في البلاد**: فلانکەس بەناو وڵاتدا رۆیی.

**خَفَقَ فلاناً بالسوط**: بەهێواشی بە شوڕك لە فلانکەسی دا.

**أخْفَقَ**: کەوتە جەم‌و جوڵ‌و پەلە پەل.

**أخْفَقَ الطائر**: باڵندەکە لە شەقەی باڵی داو فڕی.

**أخْفَقَ النجومُ**: ئەستێرەکە نزیك ئاوابوون بۆوە.

**أخْفَقَ القومُ**: خەڵکەکە خواردەمەنی نەما.

**أخْفَقَ فلان**: فلانکەس ماڵ‌و دارایی کەم بوو ٥ هەولّی کارێکی داو بۆی جێبەجێ نەکرا.

**أخْفَقَ فلاناً**: فلانکەسی لە عەرزداو خستی.

**أخْفَقَ نعلیە**: نەعلەکانی بەیەك کێشان.

اخْتَفَقَ الشَّيْءُ: شتەکە کەوتە پەلە پەل‌و جم‌و جوڵ.

الخافِقُ: ئاڵا ○ ئاسو، ئاسۆی خۆرهەڵات‌و ئاسۆی خۆر ئاوا ○ (ك: خوافِق).

خوافق السماء: ئەو دەڤەرو لایەنەی بای لێوە دێ.

الْخَفَّاقُ: پیاوی پێ پان ○ شتێك زۆر جم‌و جوڵ بکا.

الخفاقةُ: ئافرەتی ورگ پچکۆلە ○ قەد باریك.

الخَفَقَان: زێدە لێدانی دڵ بەهۆی ماندو بوونی زۆر یان نەخۆشی.

الْمَخْفَقُ: دەشتی کاکی بەکاکی کە تراویلکەی تێدا بدرەوشێتەوە.

الْمِخْفَقُ: شمشێری پان.

الْمِخْفَقَةُ: قەمچی‌و شورکی لێدان.

خَفَا البرقُ خَفْواً وخُفُوّاً: بروسکەی دا.

خفا الشَّيْءُ: شتەکە دەرکەوت.

خَفِيَ له: خِفوةً: خۆی حەشاردا.

خَفِيَ البرق خَفْياً: بروسکەکە بەکەمی بروسکەی دا.

خَفَيَ الشَّيْءَ: شتەکەی ئاشکرا کردو دەری هێنا.

خَفِيَ الشَّيْءُ خَفَاءً وخِفيةً: خۆی شاردەوە، خۆی حەشاردا.

خَفِيَ البطنُ: گەدەی پچوك بووە.

أخفى الشَّيْءَ: شتەکەی شاردەوەو پەنهانی کرد.

اخْتَفَى الشَّيْءُ: شتەکە خۆی شاردەوە، لەپێش چاو گوم بوو.

اخْتَفَى الْمَيِّتَ: گۆڕی مردوەکەی هەڵدایەوەو کفنەکەی دزی.

اخْتَفَى البِئرَ: بیرەکەی هەڵکەند.

تَخَفّى: خۆی شاردەوەو هون بوو.

اسْتَخْفَى: بەمانا (تَخَفّى) دێ.

الْخافِي: جندۆکە.

الخافِية: بەمانا (الخافي) دێ ○ دەگوترێ: (أرض خافية) زەوییەکە جندۆکەی لێیە ○ یەکێ لەو چوار پەڕەی باڵی باڵندەیە کە باڵەکانی وێك نان دیار نامێنن ○ (ك: خَوَاف).

الْخَفَاءُ: نزمایی لە زەویدا ○ دەگوترێ: (بَرِحَ الخفاءُ) ئیشەکە دەرکەوت.

الخِفَاءُ: پۆشاك‌و پەردە ○ عەبای ئافرەت (ك: أخفِية).

أخفِية النَّوْرِ: توێکڵی چرۆو خونچە.

أخفِية الكرى: چاو.

الخَفِية: بیری هەڵنەچنراو ○ روەکێك گەڵاکانی تێکەوە پێچرابن وەکوو کاهوو کەلەرم.

خلخخ النارُ: دیزەکە قڵپە قڵپی کوڵانی هات.

**خَقَّ** القارُ: دیزمکە دەنگی کولانی هات.

**خَقَّ** في الأرض: لە زەوییەکە بیرێکی قولی هەڵکەند.

**الأخقوقُ**: کەندری درێژو قول (ك: أخاقيق).

**الخَقُّ**: کەندری هەڵکەندراوی درێژو قول ◦ شیوو دۆڵ.

**خَقَّنَ** القومُ الخاقانَ على أنفسهم: خەڵکەکە خاقانیان کردە مەلیکی خۆیان، پیاوێکیان کردە خاقانی خۆیان.

**الخاقان**: نازناوی پاشا تورکەکان بووە (ك: خواقين).

**خلأت** الناقة خَلْئاً وخلاء وخلوءاً: خوشترەکە یخی خوارد، کە دەنگیان دا بۆئەوەی بڕوا ئەو وەستاو یخی خوارد.

**خلأ** الانسانُ خلوءاً: ئادەمیزادە کە لەشوێنی خۆی نەجولا.

**خالأ** القومُ مُخالأةً وخِلاءاً: خەڵکە وازیان لە شتێك هێناو دەستیان دایە شتێکی تر.

**خالأ القَومَ**: خەڵکەکەی دوور خستەوەو کەنار گیری کردن.

**خَلَبَ** الشيءُ خَلْباً: بەچنگو نینۆك شتەکەی گرت.

**خَلَبَ** النَّباتَ: روەکەکەی هەڵبری ◦ دوریيەوە.

**خَلَبَ** الجِلدَ: پێستەکەی روشاند، یان بەنینۆك هەڵیدری.

**خَلَبَتِ** الحَيَّةُ فلاناً: مار فلانکەسی گەست، پێوەی دا.

**خَلَبَ** فلاناً خَلْباً وخلاباً وخَلَبَةً: فێڵی لێ کردو دڵی کرمی کرد ◦ (هو خالِبٌ) (ك: خُلَباءُ وخَلَبَةٌ وخَلَبوت) (وهي خالبة)

**خَلِبَ** خَلَباً: ئەحمەق بوو، لەکارەکەی دا سەرکەوتوو نەبوو ◦ (هو أخلب وهي خلباء) ◦ (ك: خُلْبٌ).

**أخْلَبَ** الماء: ئاوەکە قوڕاوی پەیدا کرد.

**خالب** فلاناً: بەمانا (خَلَبَهُ) دێ.

**خَلَّبَ** الشَّيْءَ: پەراوێزی بۆ شتەکە کرد بە وێنەی نینۆك ◦ قوڕاوی کرد.

**اخْتَلَبَ** فلاناً: بەمانا (خَلَبَهُ) دێ.

**استَخْلَبَ** الشَّيْءَ والنَّباتَ: بەمانا (خَلَبَهُمَا) دێ.

**الْخِلابَةُ**: فێڵ کردن هەڵخەڵەتاندن بەقسەی خۆش.

**الْخُلْبُ**: ناوکی خورما ◦ توێکڵی ئەو درەختەی دەکرێ بە گوش ◦ حەبلی باریك‌و پتەو کە لەتوێکڵی درەخت یان لۆکە یان هەر شتێکی تر دروستکرابێ ◦ قوڕ ◦ گلامێوی پان.

**اَلخِلْبُ**: بەمانا (اَلخُلْبُ) دێ ٥ نینۆك ٥ پەردەیەكە لە نێوان جەرگو دڵدایە ٥ پیاوی مێبازە.

**هو خِلْبُ النساء**: بەقسەی نەرمو نیان قسە لەگەڵ ئافرەت دەكاو مێبازییان لەگەڵ دەكاو هەڵیان دەخەڵەتێنیو دەكەونە داویەوە.

**اَلخُلَّبُ**: هەور كە بروسكەی دەداو هومێدی ئەوەی لێ دەكرێ بارانی لێ ببارێ، دوایی دەڕەوێتەوەو نامێنێ.

**المِخْلَبُ**: چنگو نینۆكی هەموو دڕندەو باڵندەیەكی گۆشتخۆر ٥ (ك: مخالب ومخاليب).

**اَلخَلَبُوبُ**: فێڵبازو ساختەچی.

**خَلْبَسَهُ**: عەقڵی تێك داو شێتو هاری كرد.

**الخُلاَبِسُ**: قسەی مێبازانەو درۆو دەلەسە.

**اَلخَلاَبِسُ**: شتی پڕو پوچو بێ بناغە ٥ شتی هەرچیو پەرچیو بێ بەرنامە ٥ خەڵكی خوێڕیو هەتیوەچە.

**خَلْبَصَ**: هەڵاتو ڤاچاندی.

**اَلخَلَبُوصُ**: باڵندەیەكی بچكۆلەیە لە چۆلەكە بچوكترەو ڕەنگی وەك ڕەنگی ئەو وایە ٥ دزو جەردە.

**خَلَجَ الشَّيْءَ خَلْجاً وخُلُوجاً وخَلَجاناً**: جمو جوڵی كردو كەوتە پەلە پەل.

**خَلَجَتْ عينى**: چاوم كەوتە پرتەپرت.

**خَلَجَ لِي مشيتِهِ**: لە ڕۆیشتنندا لارو لەنجەی كرد،(هو خالج وهي خلوج).

**خَلَجَ الشَّيْءَ خَلْجاً**: ڕایتەكاندو دەری كێشا.

**خَلَجَ الرضيعَ**: منداڵە شیرەخۆرەكەی لەشیر بڕیەوە.

**خَلَجَهُ أمْرٌ**: كارێك مەشغوڵی كرد ٥ خستیە جمو جوڵ.

**خَلَجَ عينيه وبعينيه**: چاو بڕكێی كرد ٥ چاوی بروكاندن.

**خَلَجَ رمحَهُ**: ڕمبەكەی لە تەنیشت خۆیەوە ڕاكێشا.

**خَلِجَ خَلَجاً**: ئازاری ماسولكەو گۆشتی هەبوو، ئێسقانی جەستەی ئازاریان هەبوو بەهۆی ئیشكردنی زۆر یان زۆر ڕۆیشتن.

**خَلِجَ الخِباءُ**: لایەكی كەژاوەكە، خێمەكە خراپ بوو ٥ (هو أخلج هي خلجاء)

**أخْلَجَ الشَّيْءُ**: شتەكە كێش بوو بۆی كشا.

**أخْلَجَ الشَّيْءَ**: بەمانا (خَلَجَهُ) دێ.

**خَالَجَ الأمرُ فلاناً**: شتەكە فلانی خستە بیركردنەوە ٥ لەبارەی فلانكەسەوە بیرو بۆچونێكی هەیە.

**خَالَجَ فلاناً الشَّيْءَ**: ئەو شتەی خستە بیرو بۆچونی فلانەوە.

**تَخَلَّعَ الشَّيْءَ**: بەمانا (خَلَجَ) دێ، (تخلج من الشيء): لەو شتە بووەوە.

**تَخَلَّجَ الشَّيْءَ**: بەمانا (خَلَجَهُ) دێ.

**اخْتَلَجَ الشَّيْءَ**: بەمانا (خَلَجَ) دێ، دەگوترێ: (اختَلَجَ فِي صدري كذا)، ئەوەم بەدڵداهات.

**اخْتَلَجَ لَحْمُهُ**: گۆشتی لاواز بوو.

**اخْتَلَجَ الشَّيْءَ**: بەمانا (خَلَجَهُ) دێ، دەگوترێ: (اختَلَجَ خليجاً): جاڵێکی هەڵکەند ٥ (اختلج رمحَهُ) بەمانا (خَلَجَهُ)دێ.

**تَخَالَجَهُ**: کێشی کردو دیقە دیقەی دا ٥ دەگوترێ: (تخالجته الهموم): خەم و خەفەت هێنایان و بردیان.

**الخليج**: قۆڵێکی دەریا کەبکشێ بۆ ناو وشکانی ٥ جوگەلەیەك لە دەریا هەڵبگیرێ بەمەبەستی سود لێ وەرگرتن بۆ ناو دێری یان بۆ هەرشتێکی تری بەسود ٥ گوریس و حەبل، (ك: خُلُجٌ وخلجان).

**اَلْمَخْلَجُ**: ڕێچکەیەك کە لەرێگای گشتییەوە هەڵبگیرێ.

**خَلْخَلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی وا لێ کرد ڕێك و جوت نەبێ.

**خَلْخَلَ المرأةَ**: خرخاڵی لە قاچی ئافرەتەکە کرد.

**خَلْخَلَ العظمَ**: گۆشتی سەر ئێسقانەکەی لابرد.

**تَخَلْخَلَ**: بۆ مطاوعەی (خَلْخَلَهُ) دێ.

**اَلْخَلْخَالُ**: خشڵێکە وەکوو بازنە ئافرەت دەیکاتە قاچی ٥ (ك: خلاخيل)، دەگوترێ: (ثوب خلخال) پۆشاکێکی تەنکە.

**اَلْخَلْخَلُ**: بەمانا (الخلخال) دێ.

**خَلَدَ خُلْداً وخلوداً**: مایەوە، ئەفەوتا ٥ تەمەنی درێژ بوو نیشانەی پیری لێ دەرنەکەوت ٥ لەو شوێنەدا مایەوە.

**أَخْلَدَ فلان**: تەمەنی درێژ بوو وەلێ نیشانەی پیری لێ دەرنەکەوت ٥ لەو شوێنە جێگیر بوو درێژەی بەمانەوەی خوی دا.

**أَخْلَدَ بفلان**: وەگری فلانکەس بوو هەر لەگەڵی بوو.

**اخْلَدَ اليه**: دڵی پێوە نووساو جێگیر بوو.

**خَلَّدَهُ**: بەمانا (أخلده) دێ ٥ دەگوترێ:(خَلَّدَه في السجن) لە بەندیخانەدا هێشتییەوە.

**خَلَّدَ الفتاةَ أو الفَتَى**: بە بازنەو گوارەو خشڵی تر کچەکەی ڕازاندەوە، یان کوڕەکەی بەشتی تر ڕازاندەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿يَطوفُ عَلَيهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ﴾.

**اَلْخُلْدُ**: بالّندەی قوببەرە ٥ مشکە کوێرە ٥ بازنەو خلخالّ ٥ گوارە ٥ (دار الخُلْد): بەهەشت.

**اَلْخَلَدُ**: دڵو دەرونو خەیاڵ، دەگوترێ: (لم يَدُرْ في خَلَدي كذا).

**اَلْخَلَدَة**: گوارە ٥ (ك: خِلَدَة).

**الخَلودُ**: (دار الخلود) بەهەشت.

**الخَوالِدُ**: کێوو کەژ ٥ درکە شاخو بەردی زل ٥ سێ کوچکەی ئاگردان.

**اَلْمُخلدُ من الرجال**: پیاوێکە تەمەنی درێژ بێو نیشانەی پیری پێوە دیار نەبێ ٥ ددانی نەکەوتبن بەهۆی پیری.

**خَلَسَ خَلْساً**: شتەکەی بەپڕ تاوو غافڵگیری لێ فڕاند، لێی ستاند، دەگوترێ: (هو رجل خلاس) ٥ پیاوێکی بەهەڵمەتو چاونەترسە، ئازایە.

**خَلِسَ خَلَساً**: گەنم رەنگ بوو (هو أخلس وهي خلساءُ).

**اَخْلَسَ شَعْرُهُ**: قژی ماشو برنج بوو ٥ بۆزبوو موی سپی کەوتە ناو مووە رەشەکانییەوە، (هو مُخلِسٌ وخليس).

**أخْلَسَت الأرض والنباتُ**: گیاو گژی تازەیان تێکەڵ بۆشو بەلاشی ساڵی رابردوو بوو.

**أخْلَست الارضُ**: زەوییەکە کەمێ گیاو گژی رواند.

**خَلَسَ الشَّيْءُ مُخالسةً وخلاساً**: شتەکەی لێ دزی غافڵگیری کردو لێی فڕاند.

**خَالَسَ فلاناً**: فرسەتی لەفلانکەس هێناو دزی لێکرد.

**اخْتَلَسَ الشَّيْءُ**: بەمانا (خلسە) دێ.

**تَخالَسَ القَوْمُ الشَّيْءَ**: خەڵکەکە شتەکەیان لەیەکتر دزی ٥ هەما يتخالسان أنفسَها: هەریەکێ لەو دوانە دەیەوێ فرسەت لەوی تریان بێنێ.

**تَخلَّسَ الشَّيْءُ**: بەمانا (خَلَسَهُ) دێ.

**اَلْخالِسُ**: (موت خالِسٌ) مردنی ناگەهان ٥ کوتو پڕ ٥ کابرا بەخۆی نازانێ ناگەهان مردن یەخەی دەگرێ.

**الخِلاسِيُّ**: منداڵێك دایكو باوکی یەکێکیان سپی پێست بێو ئەوی تریان رەش پێست بێ ٥ (دجاج خلاَسِيٌّ) مریشکێکە لەکەڵە بابێکی هیندیو مریشکێکی فارسی پەیدا بووبێ.

**اَلْخَلَسُ**: گژو گیایەکە تەڕو وشکی تێکەڵاو بێ.

**اَلْخُلْسَةُ**: ئەو شتەی دەدزرێ؛ ئیختیلاس دەکرێ ٥ هەلو فرسەت.

اَلْخَلِيسُ: (طعنة خليس) زەبرێكی گورچكبڕە بەلێزانی لێی داوە ٥ (هو خَلِيس:) ئەو پیاوێكی ئازاو چاونەترسە ٥ (ك: خُلُسٌ).

اَلْخَلِيسَةُ: نێچیرێك لەدەست درندە رزگار بكرێ‌و پێش ئەوەی سەرببڕدرێ مندار ببێتەوە ٥ هەرشتێك داگیر بكرێ.

خَلَصَ خلوصاً خلاصاً: صاف بوو خشتوخاڵ‌و پوش‌و پەلاشی لێ جیاكرایەوە، دەگوترێ: (خَلَصَ من ورطته): لە چورتم‌و گێژاوەكەی رزگاری بوو.

خَلَصَ من القوم: لەخەڵكەكە پەناگیر بوو لێیان دوور كەوتەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا اسْتَيْأَسُوا مِنْهُ خَلَصُوا نَجِيًّا﴾.

خَلَصَ بنفسه والى الشَّيْءُ: پێی گەیی.

خَلِصَ العَظْمُ خَلَصاً: ئێسقانەكە پارچە پارچە بوو لەناو گوشتەكەدا.

أخْلَصَ العظمُ: ئێسقانەكە مۆخی زۆر بوو.

اخْلَصَ الشَّيْءَ: شتەكەی پاك كردو بژاردی‌و پوش‌و پەلاشی لێ دوور خستەوە، رزیوو كرمۆڵی لێ لابرد، دەگوترێ: (أخْلَصَ النصيحةَ والحُبَّ): ئامۆژگاری‌و خۆشەویستی فلان، بۆ ئەو پاڵفتەو راستالانەیە، بێ ریاو بەرژەوەندییە.

أخْلَصَ لله دينه: بەخاڵصی‌و راستی ئایینداری بۆ خودا كرد.

أخْلَصَ فلاناً: فلانكەسی هەڵبژارد بۆ ئەوەی كاری تایبەتی‌و گرنگی پێ بسپێرێ.

أخْلَصَ السَّمْنَ: رۆنەكەی قاڵ كرد پاڵفتەكەی گرد.

خَالَصَهُ: دڵسۆزانە هەڵس‌و كەوتی لەگەڵدا كرد.

خالَصَهُ الوُدُّ: بەراستی خۆشی ویست.

خالص لله دينَهُ: بۆ خودا صولحاو بەراستی فەرمانبەرداری بوو.

خالَصَ الدائن المدينَ: خاوەن قەرز قەرزدارەكەی بەری كرد لە قەرزەكەی خۆش بوو.

خَلَّصَ الشَّيْءَ: شتەكەی پاك كردو رزیوو كرمۆڵ‌و پوچ‌و پوش‌و پەلاشی لێ جیاكردەوە، دەگوترێ: (خَلَّصَهُ الله): خودا لەتەنگانەو چورتمەكە رزگاری كرد.

تَخالَصَ القومُ: خەڵكەكە پێكەوە ئاشتبوونەوەو دەستیان خستە ناو دەستی یەك.

تَخَلَّصَ: بو موطاوەعەی (خَلَّصَهُ) دێ.

اِسْتَخْلَصَهُ: بەمانا (أَخْلَصَهُ) دێ ٥ هەڵی بژاردو متمانەی پێ كردو كاری تایبەتیو گرنگی پێ سپارد.

الإخلاص: وشەی (لا الـه الا الله محمد رسول الله)یە ٥ ناوی سورەتێكە لەقورئان بەسورەتی (قل هو الله...) مەشهورە.

الخالِصُ: حەلاڵو رەوا: دەگوترێ: (هو خالص لك) ئەوە تایبەتیو دیاری كراوە بۆ تۆ ، رەوایە بۆ تۆو هی خۆتە ٥ هەروا بە رەنگی رۆنو ورشە داریش دەگوترێ:

الخالِصَةُ: دەگوترێ: (هذا الشيءُ خالصة لك) ئەو شتە تایبەتە بەتۆو بۆ تۆدانراوە.

اَلْخَلاَصُ: پوختەی رووداوو ئەوەی لەكێشەو نیزاعەكە پەیدا دەبێ ٥ كرێی كرێكار ٥ حەقی ئیش كردن.

الخِلاصُ: دۆشاوی خورما ٥ جۆرێكە لە دۆشاوی خورما ٥ رۆنی قاڵكراو ٥ زێرو زیوی لەبۆتەدراو.

الخُلاَصَةُ: پاڵفتە كراوی شت.

خلاصة الكلام: كورتەو پوختەی قسە بەلابردنی وشەی بێ ماناو زیادە ٥ هەرشتێك لە شتێك بەرهەم بهێنرێو تایبەتمەندییەكانی ئەو شتەی تێدابن.

اَلْخِلْصُ: دۆستی گیانی بەگیانی، دەگوترێ: (هو خلصي).

اَلْخُلْصَانُ: دۆستی تایبەتیو دڵسۆز.

اَلْخَلَصَةُ ذو الْخَلَصَةُ: خانوێك بووە هی خێڵی خوئەعەم پێیان گوتووە كەعبەی یەمەنییەكان؛ بتێكی تێدابووە ناوی (اَلْخَلَصَة) بووە.

الخُلُوصُ: جۆرە دۆشاوێكە لەخورما بەرهەم دەهێنرێ ٥ خڵتەو پڵتە كە دەكەوێتە بنكی رونو شیرو شتی وەهاوە.

اَلْخَلِيصُ من الألوان: رەنگی تۆخو پاڵفتەكراو.

اَلْمَخالَصَةُ: چەكێكە خاوەن قەرز دانی پێدادەنێ بەوەی كە قەرزدارەكەی قەرزەكەی لەسەر نەماوە.

خَلَطَ الشَّيْءَ بالشَّيْءِ خَلْطاً: شتەكەی تێكەڵ بەشتەكەی تركرد جا وادەبێ دوایی لێك جیادەكرێتەوە واش دەبێ لێك جیاناكرێنەوە.

خالَطَهُ مُخالَطَةً وخِلاطاً: تێكەڵاوی كردو تێكی هەڵدا.

خالَطَهُ الداءُ: دەرمانەكە تێكەڵ بەخوێنی بوو ٥ یان كاریگەری لەسەر داناو سەرخۆشی كرد.

**خُولِطَ في عَقلِهِ**: عـهقلی تێـك چوو شێوا.

**اختَلَطَ عَقْلُهُ**: عەقلی شێوا.

**إختَلَطَ الشَّيْئُ بالشَّيْئِ**: بـهمانا (خَالَطَهُ) دێ.

**اختلطوا في الحديث**: خەڵکەکە قسەیان تێك گێراو کەوتنە دەمە دەمێ.

**تَخَالَطَ الشَّيْئَانِ**: بەمانا (اختَلَطا) دێ.

**تَخَالَطَ القومُ في الحرب**: خەڵکەکە لەشەڕەکەدا تێك ڕژان.

**اَلخِلطُ**: ئەوەیە تێکەڵاو شت بێ ٥ شتێك لەگەڵ شتی تردا تێکەڵ بکرێ ٥ ئەحمەق و گێل ٥ کەسێك خۆلەلای خەڵك خۆشەویست بکا ٥ ماستاو چی و خۆلەبەرکەربێ ٥ کەسێك نەسەبی تێکەڵاوبێ.

**أخلاط الانسان**: لە پزیشکی کۆندا بریتییە لە زەرداوو بەڵغەم و خوێن و ڕەشاو.

**اَلخَلِطُ**: کەسێکە خۆلەلای خەڵك خۆشەویست بکا.

**اَلخُلطَةُ**: هاوبەشی و شەراکەتی.

**اَلخَلِيطُ**: ئەوەیە لەدو جۆرو زیاتر تێکەڵاو کرابێ ٥ هاوبەش، هاوڕێ، جیران.

**اَلمِخلَاط**: ئەو کەسەیە شت تێکەڵاوو چەواشە بکاو بەسەر خەڵکی تردا تێی بپەڕێنێ و نەهێڵێ بیسەرو بینەر بەخۆیان بزانن.

**اَلمِخلَط**: بەمانا (اَلمِخلَاط) دێ.

**خَلَعَ الزرعُ خلاعةً**: کشتوکاڵەکە گەڵای کردو دانەوێڵەی هەڵێنچا ٥ گەڵاکەی هەڵوەری.

**خَلَعَ الشَّيْئُ خَلعاً**: شتەکەی داکەند ٥ دەری هێنا.

**خَلَعَ عليه ثوبَهُ**: کراسەکەی پێدا.

**خَلَعَ الوالي العاملَ**: پاشا کاربەدەستەکەی عەزڵ کرد.

**خَلَعَ الشعبُ الملكَ**: جەماوەر پاشایان لەسەر کورسی هێنایە خوارێ.

**خَلَعَ فلان إبنَهُ**: فلانکەس تەبەڕای لە کوڕی خۆی کردو وتی: کوڕی من نیە، بۆ ئەوەی لە تاوانەکانی بەرپرسیار نەبێ.

**خَلَعَ دابّتَهُ**: ولاغەکەی بەرەڵلاکرد.

**خَلَعَ الرِّبقةَ من عنقه**: وادەو پەیمانی خۆی هەڵوەشاندەوە.

**خَلَعَ يدَه من طاعته**: لەژێر فەرمانی ئەو چووە دەرێ.

**خَلَعَ عِذارَهُ**: شەرم و حەیای نەماو بەهەوەسی خۆی هەڵس و کەوت دەکا.

**خَلَعَ إمرأتَهُ**: ژنەکەی تەڵاق دا لەبارتەقای ئەوەدا ژنەکەی وازی لەمارەییەکەی

هێنا؛ یا هەندێکی پارە دایە.

**خَلِعَ**: دەماری پاژنەپێی خواربوو.

**خَلُعَ**: حەیای تکاو پەردەی ناموسی فڕێدا.

**خالَعَتْ زوجُها**: ژنەکەی داوای لێکرد تەڵاقی بدا بەپارە واتە: ژنەکە پارەبدا بۆ ئەوەی پیاوەکە تەڵاقی بدا.

**خالَعَ فلانٌ فلاناً**: فلانکەس قوماری لەگەڵ فلانکەس کرد.

**خَلَعَهُ**: بەمانا (خَلَعَهُ) دێ.

**تَخالَعَ الزوجان**: ژنو مێردەکە ڕێك کەوتن کە دەست بەرداری یەکتربن‌و پیاوەکە بڕێ پارەبدا بەژنەکە.

**تخالَعَ القومُ**: خەڵکەکە وادەو پەیمانی خۆیان هەڵوەشاندەوە.

**تَخَلَّعَ**: لێکو پێك بووە ٥ دەگوترێ:

**تَخَلَّعَ في مشيه**: لە ڕۆیشتندا شانی هەڵتەکاندن دەستی ڕاوەشاندن.

**تَخَلَّعَ القوم**: خەڵکەکە چوونە ناوەوە بەدزەدزە ڕۆیشتن.

**تَخَلَّعَ في الشراب**: وەگری مەی خواردنەوە بوو وازی لێ نەهێنا.

**اخْتَلَعَ الشَّيْءُ**: بەمانا (خَلَعَهُ) دێ.

**اخْتَلَعَ مالَ فلان**: ماڵی فلانکەسی دەس بەسەراگرت.

**اخْتَلَعَت الزوجةُ**: ئافرەتەکە بەپارەی خۆی تەڵاق درا ٥ پارەی داو تەڵاقیان دا.

**اِنْخَلَعَ**: بۆ موطاوعەی (خَلَعَهُ) هاتووە.

**اَنْخَلَعَ من الشَّيْءِ**: لەشتەکە دەرچوو.

**الخالِعُ**: ئافرەتێکە بە پارەی خۆی تەڵاقی لەمێردەکەی وەرگرتبێ ٥ (ك: خوالِع) ٥ هەروا بە کەسێك دەگوترێ شادەماری پاژنەی پێی خواربووبێ.

**جبن خالع**: پەنیرێکی توندو جیڕە ٥ (شجر خالع) درەختێکی گەندەڵەو کەوتووە.

**الخُلاَعُ**: شێوە شێتییەکە ٥ جۆرێکە لە شێتی ٥ ترسێکە ئادەمیزاد توشی ڕاڕایی‌و وەسوەسە دەکا.

**اَلْخَلْعُ**: دەرچوونی جومژگەیە لەشوێنی خۆی، بەبێ ئەوەی بەچاوی ئاسایی ببیندرێ ٥ گۆشت ئێسقانەکەی لێ دەربهێندرێ‌و بکوڵێندری‌و پاشان بکرێتە ناو پێستەوەو بۆ سەفەر هەڵبگیرێ.

**اَلْخُلْعُ**: ئەوەیە مێرد ژنەکەی تەڵاق بدا لەبارتەقای ئەوەدا بڕێ ماڵ لەژنەکە وەربگرێ.

**اَلْخُلْعَةُ**: ماڵی باش‌و بەنرخ ٥ بەمانا (اَلْخُلْعُ) دێ ٥ زەعیفی‌و لاوازی.

**الخِلْعَةُ**: ئەوەی دایدەکەنی لە پۆشاك‌و شتی وا، دەگوترێ:(خَلَعَ علیه خِلْعَةً):

پۆشاکی پێدا یان لەبەری کرد ٥ ماڵو سامانی باش.

**اَلْخَلِيعُ مِنَ الثيابِ ونحوِها**: پۆشاکی کۆنو رزیو ٥ داکەندراو ٥ کەسێک خزمو کەسو کاری خۆیان لێ بەری کردبێ بۆ ئەوەی بەرپرسیاری تاوانەکانی نەبن ٥ کەسێک لەقورمارکردندا دۆڕابێ.

**اَلْخَوْلَعُ**: جۆرە شێتییەکە ٥ قومارچی بەشانسو بەخت ٥ لاوی زێنە خرۆ ٥ تاوانکار ٥ گورگ ٥ ئادەمیزادی ئەحمەقو گێل ٥ گۆشتێک لەناو سرکەدا بکوڵێندرێو لە سەفەردا هەڵبگیرێ ٥ نەخۆشییەکە توشی جومزکە دەبێ.

**اَلْمُخَلَّعُ**: زەعیفو لاواز ٥ شێت ٥ گۆشت ئێسقانی لێ دەرهاتبێ.

**اَلْمَخْلُوعُ**: ترساو ، ترسنۆک.

**خَلَفَ الشَيْءُ خُلُوفاً**: شتەکە گۆڕاو بۆگەنی کرد، کەڵکی نەما ٥ دەگوترێ: (خَلَفَ الطعامُ) خۆراکەکە بۆگەنی کرد ٥ (خَلَفَ فَمُ الصائم) دەمی رۆژووە وانەکە بۆنی لێ دێ ٥ لە حەدیثدا هاتووە دەفەرموێ: (لخلوفُ فم الصائم أطيب عند الله من ريح المسك).

**خَلَفَ فلان**: فلانکەس ئەحمەق بوو.

**خَلَفَ عن الشَيْءِ**: ڕوی لەشتەکە وەرگێڕا.

**خَلَفَتْ نَفْسُهُ عن الطعام**: لەبەر نەخۆشی خواردنی پێش چاوکەوت.

**خَلَفَ عن خلق أبيه**: شوێن ڕێبازی باوکی نەکەوت.

**خَلَفَ فلاناً خَلْفاً**: دوای فلانکەس کەوت. لەدواوەی شتی وەرگرت ٥ بوو بەجێگیری فلان.

**خَلَفَهُ بخير أو شر**: باسی چاکەی یان خراپەی فلانی کرد.

**خَلَفَ لە بالسيف**: لە دواوە بۆی هاتو بەشمشێر لێی دا.

**خَلَفَ الثوبَ**: ناوەڕاستی کراسەکەی بڕیو ئەم لاو ئەولاکەی پێکەوە بەست.

**خَلَفَ فلاناً خَلَفاً**: لەدواوە هاتو بوو بەجێگیری فلان.

**خَلَفَ على فلانة**: دوای مێردە کۆنەکەی ئەم مارەی کرد.

**خَلِفَ خَلَفاً**: لاخواربوو ٥ هەردوو چاوی خێل بوون، (هو أخلَفُ وهي خَلْفاءُ).

**خَلِفَت الناقةُ**: حوشترمکە ئاوس بوو (هي خَلِفَةٌ) ٥ (ك: خَلِفات).

**أخْلَفَ الزرعُ والشَجَرُ**: ڕوەکو درەختەکە دوای هەڵوەرینی گەڵاکانیان گەڵای تریان دەرکرد.

أخْلَفَ الطائر: بالندەکە پەڕی لێ روان دوای ئەوەی پەڕو باڵی تری لێ روا بوون.

أخْلَفَ فلان لنفسه: فلانکەس لەباتی شتێك کە لەکیسی چووە شتێکی تری هەڵبژاردووە.

أخْلَفَ الله لك وعليك خيراً: خودا خێرو بێرت بداتێ.

اخْلَفَت الشجرُ: درەختەکەی بەری نەگرت.

اخْلَفَ الغيثُ: خەریك بوو باران ببارێ ٥ هەموو بەتەمای بارینی باران بوون کە چی هەورەکان رەوێنەوەو نەباری.

أخْلَفَ الشَّيْئُ: شتەکە گوڕاو کەڵکی پێوە نەما.

أخْلَفَ يَدَهُ الى الشَّيْئِ: دەستی برد بۆشتەکە بۆ ئەوەی لەدواوە بیگرێ.

خالَفَ عنه مخالفةً وخلافاً: دواکەوت.

خالَفَ الى الشَّيْئِ: لەدواوە بۆشتەکە هات.

خالَفَ عن الأمر: لە فەرمانەکە دەرچوو.

خالَفَ الشَّيْئَ: دژی شتەکە وەستا.

خَلَّفَ فلاناً: فلانکەسی دوا خست ٥ خستیە دوا خۆیەوە ٥ کردی بە جێنشینی خۆی.

تَخالَفا: دژی یەکتر وەستانو بەرامبەری یەکتریان کرد.

تَخَلَّفَ: بۆ موطاوعەی (خَلَّفَهُ) دێ.

تَخَلَّفَ القَوْمَ: بەلایاندا تێپەڕیو خستنیە دووا خۆیەوە.

اخْتَلَفَ الشيئان: ئەو دوو شتە پێکەوە نەگونجاوو هاوتای یەکتر نەبوون.

اختلف فلان: فلانکەس توشی نەخۆشی هەیضە بوو.

اخْتَلَفَ الى المكان: جار جار سەردانی ئەو شوێنەی کرد.

اخْتَلَفَ الشَّيْئَ: شتەکەی خستە دوا خۆیەوە، لەدواوە گرتی.

اخْتَلَفَ فلاناً: فلانکەس بوو بەجێگری فلانو لەشوێنی ئەو دانیشت.

اِسْتَخْلَفَهُ: کردی بەجێ نشینی خۆی.

التَّخالِيفُ: رەنگی جۆراو جۆر، هەمەڕەنگ.

التَخَلُّفُ: دواکەوتوویی ٥ سستی گەشەکردنو پێگەیشتن چ لەروی عەقڵەوە چ لەروی زیرەکیو بوارەکانی ترەوە بێ.

الخالِفُ: کەسێك نیشتیهای خواردنی نەمێنێ ٥ کەسێك زۆر کێشەو نیزاع دروست بکا.

الْخالِفَةُ: کۆڵەکەی دواوەی خانووە ٥ نافرەتی دانیشتو

لەماڵەوە ٥ کەسێك لە غەزا دوا بکەوێ ٥ کەسێك زۆر کێشەو نیزاع بنێتەوە ٥ پیاو خراپ؛ کەسێك هیچ خێرو بێرێکی لێ چاوەڕوان نەکرێ.

**الخِلاف**: درەختی صەفصاف ٥ دوایین ، پاش ئەو ٥ دەگوترێ: (جاءَ خِلافَهُ) دوا ئەو هات.

**الخِلافة**: فەرمانڕەوایی، رابەرایەتی.

**اَلْخَلْفُ**: ئامێرێکە داری پێ کون دەکرێ ٥ تیژایی پاچ یان سەری پاچ ٥ موس‌و تەراش ٥ چەرخ‌و رۆژگار دوا چەرخ‌و رۆژگار ٥ قسەی پڕو پوچ ٥ دەگوترێ: (سکت دهراً ونطق کفراً) ٥ تەویلەو ئاغەڵی ولاخ لە دواوەی خانوو.

**اَلْخُلْفُ**: بەمانا (الإخلاف) دێ ٥ لە زاراوەی مەنطیق دا بەشتێك دەگوترێ کە محاڵ بێ‌و عەقڵ وەری نەگرێ.

**اَلْخِلْفُ**: دژو ناتەبا ٥ کورترین پەراسوو لاواز ترینیان ٥ سەری گۆی مەمك‌و گوان ٥ گۆی گوانی حوشتر.

**اَلْخَلَفُ**: بارتەقاو قیمەت ٥ منداڵی صالح.

**الخِلْفَةُ**: ناتەبایی دژایەتی ٥ دەگوترێ:(القومُ خِلْفَةً) خەڵکەکە ناتەباو ناڕێکن ٥ (وأبناؤه خِلْفَةً) منداڵەکانی نیوەیان کوڕو نیوەیان کچن ٥ ئەوەی لەدوا سوارەوە هەڵدەواسرێ ٥ چەروزەی درەخت کە لەجێی پەلی شکاوەو هەڵدەداتەوە ٥ پینەی چل ٥ بەرماوەی شت ٥ پاشماوەی شت ٥ مەعیدە ترشان ٥ نەخۆشی هەیضە.

**اَلْخُلْفَةُ**: بەمانا (الخِلاف) دێ ٥ عەیب‌و بێ کەڵکی ٥ دواتامی خواردەمەنی.

**اَلْخَلْفِیَّةُ**: پاشینە ٥ ئەوەی لەدوا پەردەوە ئەنجام دەدرێ لە بواری رەسم گرتن‌و شانۆدا.

**اَلْخَلِیفُ**: رێگا ٥ یان رێگای نێوان دوو کێو ٥ خوار ناوکی حوشتر ٥ کراس ناوەڕاستی بڕزێ‌و بدڕێ‌و پینەبکرێ ٥ هەروا بەمانا (المُتخلِّفُ) دێ ، بەمانا (المستخلف)یش دێ.

**الخَلیفَةُ**: ئەو کەسەی دەکرێتە جێنشین‌و فەرمانڕەوا ٥ سوڵتانی گەورەو فەرمانڕەوای گشتی موسوڵمانان.

**المُخالَفَةُ**: سەرپێچی‌و تاوان کە بەپیاساو شەریعەت شیاوی سزادان بێ بەمەرجێ سزاکە لە حەفتەیەك زیاتر نەبێ.

**اَلْمِخْـلاَفُ**: كەسێـك (إخـلاف)ی زۆری بـێ ٥ لـە دواوە بـۆ شـت بـچێو بیگـرێ ٥ ناوچـەو هەرێمێـکی بچوك.

**اَلْمَخْلَفَةُ**: زەوییەکە درەختـی خیلافـی تێدا بێ.

**خَلَـقَ** الثـوبُ والجِلـدُ وغیرهمـا خلوقـا: قوماشەکە پشتەکەی رزی.

**خَلَـقَ** الثـوبَ والجِلـدَ ونحوهمـا خَلْقـاً: ئەندازەی گرت بۆ ئەوەی بەگوێرەی پێویـست بـی بـبڕێو بیدروێ، دەگـوترێ: (فلان يخلق ثـم يفـري) فلانکـەس ئەنـدازە دەگـرێ ئەمجار ئیشەکە دەکا

**خلـق** الله العـالَم: خـودا بونـەوەری بـەدی هێنـاوەو هێناویەتـە وجـود لەسـەر ئەو شێوە جوانو رەنگینە.

**خلـق** فـلانٌ القـولَ: فلانکـەس قـسەکەی هەڵبەست.

**خَلَقَ** الـشَّيئَ: شـتەکەی لوسـکردو نـەرمی کردەوە.

**خَلِـقَ** الثـوبُ والجِلْـدُ خلاقـةً: کراسـەکە، پێستەکە رزی.

**خَلِقَ** الشَّيئُ: لوس بوو نەرم بوو.

**أخـْلَقَ** الثـوبُ والجِلْـدُ وغيرهمـا: رزیـن، کراسەکە رزی، پیستەکە رزی.

**اخـْلَقَ** فـلان: فلانکـەس پوشـاکەکانی رزین.

**أخْلَقَ** شبابُ فلان: گەنجیەتی فلانکەس بەسەر چوو.

**أخْلَقَ** الشيْئُ: شتەکەی رزاند.

**أخْلَقَ** فلانـاً: پۆشـاکی کۆنو رزیـوی دا بەفلانکەس.

**أخْلَقَ** السائلُ مـاءَ وجهـه: سواڵـکەرەکە حـەیاو ناموسـی خـۆی لەرێـگەی سواڵ کردندا بەفیرۆدا.

**خَالَقَـهُ** مخالقـةً وخلاقـاً: هاورێیـەتی لەگەڵدا بەست لەروی رەوشتەوە.

**خَلَّقَـهُ**: لوسـی کـردو رێـکی خـست ٥ دروستکردنەکەی تەواو کرد.

**اخْتَلَقَ** الشَّيئَ: دروسـتکردنی شـتەکەی ئەنجامدا.

**اخْتَلَقَ** القولَ: قسەکەی هەڵبەست.

**تخَلَّقَ** بِخُلُقٍ: باری بەو رەوشتەوە گرتو لێی بوو بەسروشت.

**تَخَلَّقَ** القولَ: قسەکەی هەڵبەست.

**اِخـْلَوْلَقَ** الثـوبُ والجِلـدُ: کراسـەکە، پێستەکە رزی.

**اخـْلَوْلَقَ** الـشَّيْئُ: شـتەکە لـووس بـوو نـەرم بـوو راسـتەو پاسـتە بـوو ٥ شـتەکە نزیـك بـوو ٥ دەگـوترێ: (اخلولقت السماءُ أن تمطر) ٥ ئاسمان خەریك بوو باران ببارێنێ.

**اِخـْلَوْلَقَ** بعـد تفـرقٍ: دواى لێـك

جیابوونەوەو لێك دابڕان خەریكن كۆببنەوە.

**الأخـلاق:** (علـم الاخـلاق) بـاسو خواسەكانی بریتین لە چەند یاساو رێسایەك كە بەچاك یان خراپ جوان یان ناشیرین ناو زەد دەكرێن.

**الأخلاقـي:** هەرشتێـك لەگەڵ یاساو ریسای ئەخلاقی جوانو پەسەندی كۆمەڵ یەك بگرێتەوە.

**الأخـلَقُ:** دەگـوترێ: (شَـيْءٌ أخلَـق) شتێكی پتەوە هیچ شتێك كاری تێ ناكا.

**أخلَقُ بكذا:** شیاوی ئەوەیە.

**الخـالِقُ:** ناوێـكە لـەناوە جوانـەكانی پەروەردگار ٥ بەدیهێنەری بونەوەر لەسەر شێوەیەك كە نمونەی نەبێ ٥ دەشـگوترێ: (رجـل خـالِق): پیاوێكی دەست رەنگینو كارامایە.

**الخَـلاَقُ:** بـەشو بـار لـەخێرو بێـر، دەگـوترێ: (فـلانٌ لاخَـلاَقَ لـه): فلانكەس ئارەزۆی لەخێر نیە.

**الخِـلاَقُ:** جۆرێـكە لەشـتی بۆنخـۆشو ئـامێری پـاكو خـاوێنی، وەكـوو زەعفەران.

**الخَلْقَاءُ:** پارچە زەوییەك كە كژو گیای تێدا نەڕوێ.

**خلقاءُ الشَّيْءِ:** شتی راستەو پاستەكراوو لوس كراو، دەگوترێ: (خَلْقاء الجَبْهةِ) و(خَلْقاءُ الظهر).

**الخَلْقُ:** خەڵـك ٥ دروسـتكراو ٥ هـەموو شتێـك رێـكخرابێو لـوسو پـوس كرابێ.

**الخَلَقُ:** پێستو پوشاكی رزیو.

**ثوب أخلاق:** پۆشاكی رزیو.

**الخُلُقُ:** رەوەشت؛ حاڵەتێـكی دەروونییـە كردەوەكـان بەچـاكو خراپیانـەوە لـەوەوە سەرچـاوە دەگـرن ٥ (ك: أخلاق).

**خِلقَـةٌ:** دەگـوترێ: (سَـحَابَة خَلِقَـة) هەورەكـە ئیقلـیم گـیرەو بـەری ئاسمانی گرتـووە چاوەڕوانی بارانی لێ دەكرێ.

**الخِلْقَةُ:** فیطـرەتو پێـكهاتە، دەگوترێ: (عَيْـبٌ خِلْقـيٌ) ئـەوە عەیبێـكی ئەصـڵیو بنەرەتییـە، لـە پێـكهاتەكەیدایەو تـازە پەیـدا بـوو نیە.

**الخُلـوقُ:** بـەمانا (الخِـلاَقُ) دێ، واتـە: جۆرە بۆنێـكی خۆشە.

**الخَلِيقَةُ:** هەموو دروستكراوێك ٥ ئەو سروشـتەی ئـادەمیزادی لەسـەر دروست كراوە ٥ خودی ئادەمیزاد ٥ (ك: خليق وخَلاَئِق).

**المَخْلَقَةُ:** شیاو، دەگوترێ: (هو مَخلَقَةٌ للخير) ئەو شیاوی خێركردنو خێر لێ وەشانەوەیە.

**المَخْلُوقَةَ**: دەگوترێ: (قصيدة مخلوقة) چامە شیعری یەکە پاڵ شاعیرەکەی خۆی نەدراوە.

**خَلَّ خَلاً وَخلولاً**: خەلەلی تێکەوت، دەگوترێ: (خَلَّ العَسْكَرُ) سەربازەکان رێك و پێك نەبون.

**خَلَّ لَحْمُهُ**: گۆشتی کەم بوو، زەعیف بوو.

**خَلَّ فلانٌ**: فلانکەس هەژار کەوت و ئاتاج بوو.

**خَلَّ في دعائِهِ**: لە دوعاکەی دا تایبەتی کرد.

**خَلَّ الإبلَ خَلاً**: حوشترەکەی بردە نێو لەوەڕی شیرین تام بۆ ئەوەی بلەوەڕێ.

**خَلَّ الشيْءَ**: شتەکەی کون کردو لێوەی دەرچوودەر.

**خَلَّ أسنانَهُ**: ددانی هاژنینەوە ئەو پاشماوەی خواردنەی کەوتۆتە نێوانیانەوە دەری هێنان.

**خَلَّ الكساءَ**: ئەمسەرو ئەوسەری چارەکەی بەدارەکە خستەوە سەریەك.

**خَلَّ فلاناً بالرُمْحِ**: بەرمب لە فلانکەسی دا، بەرمب برینداری کرد.

**خَلَّ الفصيلَ**: لوتەوانە یان دەمبێنی لە لوت و دەمی بێچوەکە کرد بۆ ئەوەی شیری دایکی نەخوا.

**الخَلُّ**: لەوەڕی شیرین تامیدا بەناژەڵەکەی.

**أخَلَّ الأرضُ**: زەوییەکە لەوەڕی شیرینی تێدا زۆر بوو.

**أخَلَّتِ النخلَةُ**: خورماکە ناڵ و بۆڵی تێکەوت، خورمای مزری دەرخست ٥ بەرەکەی خراپ بوو؛ خورماکانی وەکوو پێویست هەڵنەپێچا.

**أخَلَّ بالمكان**: شوێنەکەی جێ هێشت و ئاگای لێ نەبوو.

**أخَلَّ بالشيْءِ**: کەمتەرخەمی لەشتەکەدا کردو لێی بێ خەم بوو.

**أخَلَّ بفلان**: پابەندی ئەو وادەو بەڵێنە نەبوو کە بە فلانی دابوو، یارمەتی نەدا.

**أخَلَّ فلانٌ**: فلانکەس هەژار بوو.

**أخَلَّ الإبلَ**: حوشترەکەی بردە ناو لەوەڕی شیرین تام و لەوێ لەوەڕاندی ٥ لە پەندی پێشینانda هاتووە (جاءوا مُخِلِّينَ فلاقُوا حَمضاً) ئەم پەندە بۆ کەسێك دەگوترێ: هەڕەشە بکا وەلێ توشی گوناەشی خۆی بێ.

**أخَلَّ فلاناً الى كذا**: فلانکەسی موحتاجی فلان شت کرد.

**خالَّهُ مُخالَّةً وخِلالاً**: دۆستایەتی لەگەڵدا کرد ٥ دەشگوترێ (خَالَلَهُ) واتە: (لامە) گوشراوەکە بکەینەوە.

**خَلَّلَ الشرابُ**: شەرابەکە فاسیدبوو

ترشاو بووه بەسرکە.

**خَلَّلَ الخمر:** شەرابەکەی کردەوە بەسرکە.

**خَلَّلَ البُسْرَ وغيره:** خورما مزرەکەی لەبەر خۆر هەڵخست ئەمجار بەسرکە پرژاندیو خستیە ناو جەرەو کوپەوە.

**خَلَّلَ فلان:** فلانکەس سرکەی دروست کرد.

**خَلَّلَ بين الشيئين:** بۆشایی لەنێوان دوشتەکەدا دروست کرد.

**خَلَّلَ اللحيةَ والأصابعَ:** پەنجەکانی بەتەری وەکوو شانە بەناو ریشی دا هێناو برد بۆ ئەوەی بنکی مووەکانی ریشی تەڕببێ ٥ یان پەنجەکانی تێك نا.

**خَلَّلَ أسنانَهُ:** ددانی هاژنینەوە بۆ ئەوەی چی خواردنو پەلو پۆش لەناو ددانەکانی دا هەیە دەریان بێنێ.

**خَلَّلَ الزَّرْعَ:** بەناوکشتوکاڵەکەدا گەڕاو هەرچی نەڕوابوو سەرلەنوێ لە شوێنەکەی شەتڵی تری لێ دا.

**اخْتَلَّ العصيرُ:** تریێ گوشراوەکە بوو بەسرکە.

**اخْتَلَّ فلانٌ:** فلانکەس سرکەی دروست کرد ٥ هەژار بوو، زۆری تینوو بوو.

**اخْتَلَّ الإبلُ:** حوشترەکە لەوەڕی شیرین تامی خوارد، یان لەناو لەوەڕی شیرین تام دا بەستیەوە.

**اخْتَلَّ العقلُ:** عەقڵی تێك چوو سەنتەری تێك چوو.

**اخْتَلَّ جسمُ فلان:** جەستەی فلان لاواز بوو.

**اخْتَلَّ الأمرُ:** کارەکە پوچو بێ کەڵك بوو.

**اخْتَلَّت النخلةُ:** دارخورماکە خورمای مزری دەرخست (ئاڵو بۆڵی تێکەوت).

**اخْتَلَّ فلاناً بسهمٍ:** تیرێکی بەفلانکەسەوە ناو ئەمدیو ئەو دیوی کرد.

**تخلَّلَ الشيْءُ:** شتەکە کونی کرد ئەمدیواو دیوی کرد.

**تخلَّلَ الثوبُ:** کراسەکە رزی، تەسك بوو.

**تخلَّلَ فلان بعد الأكل:** فلانکەس دوای نان خواردن ددانەکانی هاژنینەوە ٥ بۆ ئەوەی پاشماوەی خواردن لە بنکی ددانەکانی دەربهاوێ.

**تخلَّلَ المطر:** بارانەکە گشتگیر نەبوو لەچەند شوێنێکی تایبەتی باری.

**تَخَلَّلَ في وضوئه:** بە پەنجە تەڕەکانی ویستی بنکی مووەکانی ریشی تەڕبکا ٥ یان پەنجەکانی تێك کردن بۆ ئەوەی ناوان پەنجەکانی تەڕبن.

**تَخَلَّلَ الشَّيْئَ**: شتەکەی کون کرد.

**تَخَلَّلَ فلاناً**: زەبر دوا زەبر لەفلانەکەسی دا.

**تَخَلَّلَ الديارَ**: بەناو خانوەکاندا گەڕاو کوچەو کۆڵانەکانی پشکنین.

**تَخَلَّلَ القومَ**: چووە ناو نەتەوەکەوەو لەناویاندا مایەوە.

**تَخَلَّلَ الرُطَبَ**: بەدوا دەنکە خورمای شیرین دا گەڕا لەناو لقەکانی دا.

**تَخَلَّلَ البعيرُ الكلأ بلسانه**: حوشترەکە بەزبانی خواردنەکەی لولدا ٥ دەگوترێ: (فلان يَتَخَلَّلُ الكلام بلسانه) فلانکەس قسەی قەوی دەکاو وشەکانی دەگوشێ.

**اَلْخَلاَلُ**: خورمای مزر لەسەرمتای ئاڵو بۆڵ تێکەوتنندا.

**اَلْخِلالُ**: بۆشایی نێوان دوشت ٥ هەروا ناوە بۆ دارێك کە دەخرێتە لوتی بێچوە ئاژەڵ بۆ ئەوەی شیری دایکی بۆ نەخورێ ٥ داروچکەی ددان هاژنینەوە ٥ پاشماوەی خۆراك لەبنکی ددانەکان ٥ قەفەزاز یان داری بارێك کە لەسەر دارە رای سەقفی خانوو دادەنرێ بۆ ئەوەی گڵو خۆڵ دانەدا.

**اَلْخُلاَلُ**: خورمای تازە گەییوو شیرین کە بۆیان بگەرێی لە نێوان لقە دارخورما کۆکراوەکاندا، (پاشەڕۆك چنین) ٥ هەروا ناوە بۆ دیاردەیەك کە بەسەر شتی تام مزرو ترشدا دێو شیرین دەبێ.

**اَلْخَلاَلَةُ**: دۆستایەتی راستەقینە کە هیچ بۆشایی‌و گەندەڵی تێدا نەبێ.

**الخُلاَلَةُ**: بەمانا (اَلْخَلاَلَةُ) دێ ٥ بنکی لقەدارخورما ٥ پاشماوەی خۆراك لە نێوان ددانەکاندا ٥ ئەو پارچەو وردە خواردنانەی دوای نان خواردن لە نێوان ددانەکان دەر دەهێندرێن ٥ دەگوترێ: (فلان يأكُلُ خُلاَلَتَهُ) بەکەسێك دەگوترێ رژدو بەخیل بێ.

**اَلْخَلَلُ**: بۆشایی نێوان دوشت، کوچەو کۆڵان، دەگوترێ: (جاسَ خِلالَ الديار) ٥ بەناو کۆڵانەکانی خانوەکاندا گەڕا ٥ فەسادو گەندەڵی دەگوترێ: (في رأيه خَلَلٌ)

**اَلْخَلاَّلُ**: سرکە فرۆش ٥ ئەو کەسەی سرکە دروست دەکا.

**اَلْخَلُّ**: گوشراوی ترێ یا شتی تر کە ترش‌و مزربێ.

**الخَلُّ والخمرُ**: خێرو شەڕ دەگوترێ: (ما عند فلان خلٌّ ولا خمر)

**اَلْخَلُّ**: رێگایەك دەربچێ بەناو لمبی کۆمەڵ بوودا ٥ دراوی لە

پۆشاكدا ◦ كونو قەڵێری جلو بەرگ ◦ پۆشاكی رزیوو خمتخمت ◦ ڕەگێكە لەملدا پەیوەستە بەسەر ◦ باڵندەی روتەڵەو كەم پەرو پۆڵ ◦ حەیوانی كزو لاواز.

**أم الخلّ**: عمرەق.

**الخِلُّ**: دۆستی راستەقینە ◦ (ك: أخلال)◦.

**اَلْخَلَّةُ**: كونو كەلەبەری كەپرو ساباتو كۆخ ◦ كونی پچكۆلە ◦ پێویستیو هەژاریی ◦ كاتێ دوعا بۆ مردو دەكرێ دەگوترێ: (اللهم أسُدُّ خُلَّتَهُ) ◦ دەگوترێ: (فلان ذوخُلَّةٍ) ◦ فلانكەس ئاتاجەو پێویستی هەیە بۆ دابینكردنی ژیانی ◦ ڕێگا ◦ رەوەشت ◦ شەرابی ترش ◦ ترشاو تام گۆڕاوو بۆن كردو ◦ هەروا بەمانا زەعیفو لاواز دی دەگوترێ: (إمْرَأةٌ خُلَّةٌ) ئافرەتێكی زەعیفەو رەقەڵەیە.

**اَلْخِلَّةُ**: پاشماوەی خۆراك كە لەبنكی ددانا دەمێنێتەوە.

كالانی شمشێر كە بە ئاڵتون نەخشێندرابێ ◦ هەموو چەرمێك كە نەخشێندرابێ.

**اَلْخُلَّةُ**: هەموو گیاوو گژێكی شیرین تام ◦ دۆستایەتیو خۆشەویستی كە چوبێتە ناخی دەروونەوە ◦ دۆستی راستەقینە ◦ خێزانو هاوسەر.

**اَلْخُلُولُ**: (أُمُّ الْخُلُولُ): گیاندارێكی دەریاییە سوێردەكرێو دەخورێ.

**الخليل**: دۆستی راستەقینە ◦ ئامۆژگاریی كەر ◦ جەستە لاواز ◦ هەژارو بێ نەوا.

**اَلْمُخَلَّلُ**: خەیارو زەیتونو ئەو جۆرە شتانە خوێیان پێ دەكرێو هەندێ سركەیان بەسەردا دەكرێو دەخورێن.

**خَالَهُ**: هاورییەتی لەگەڵدا بەست.

**خَالَم المرأةَ**: مێبازی لەگەڵ ئافرەتەكەدا كرد.

**خَلَّمَهُ**: هەڵی بژارد.

**اخْتَلَمَهُ**: بەمانا (خَلَّمَهُ) دێ.

**اَلْخَالِمُ**: شتێكی راستو رێكی وەها كە گرێو گۆڵی تێدا نەبێ.

**اَلْخِلْمُ**: لانەی ئاسك ◦ پیوو بەزی دەوروبەری ورگی مەڕ ◦ دۆستی راستەقینە ◦ پیاوی ژنانی.

**اَلْخِلْمَةُ**: دەگوترێ:(إبِلٌ خِلْمَةٌ) حوشترێكە بە ئارەزۆی خۆی دەلەوەڕێ.

**خلا**: خاڵی بوو، هیچی تێدا نەما، كەسی تێدانەما.

**خلا فلانٌ من العیب**: فلانكەس عەیبی تێدا نیە ◦ پیربوو زوربەی تەمەنی

رۆیی ٥ (خلا فلان): فلان مرد ٥ بێ تاوان دەرچوو ٥ بەتەنیا لەگەڵی دا کۆبوەوە.

**خلا علی طعام**: بەتایبەتی ئەو خواردنەی خواردو هیچی تری لەگەڵ تێکەڵ نەکرد.

**خلا علیه وبه**: گاڵتەی پێکرد، هەڵی خەڵەتاند.

**أخْلَی المکانُ والإناءُ**: بەمانا (خلا) دێ.

**أخْلَی الرجُلُ**: پیاوەکە کەوتە شوێنێکی چۆڵەوانییەوەو کەس تەنگی پێ هەڵناچنێ.

**أخْلَت المرأةُ**: ئافرەتەکە بێ مێرد بوو.

**أخْلَی لە الشَّیْئُ**: شتەکە بۆ ئەو کۆنترۆڵ بوو.

**أخلی بفلان**: بە تایبەتی بەتەنها لەگەڵ فلانکەسدا کۆبوەوە.

**أخْلَی بنفسه**: خۆی گۆشەگیرکرد.

**أخْلَی علی بعض الطعام**: یەکجۆر خواردنی خوارد.

**أخلی المکانَ والإناءَ**: شوێنەکە یان زەرفەکەی خالّی کرد ٥ ئەوەی تێیدا بوو وەدەری نا ٥ دەگوترێ: (لا أخلی الله مکانَكَ) خودا شوێنەکەت چۆڵ نەکاو تەمەن درێژت بکا.

**خالَی القومُ**: خەڵکەکە خانوەکانیان چۆڵ کردو رویان کردە چۆڵو بیابان ٥ کەوتنە ناو ماڵو سامانی زۆرو گیاوو گژی زۆرو زەبەندە.

**خالَی فلاناً**: وازی لە فلان هێنا ٥ سەرپێچی فلانی کرد ٥ زۆرانبازی لەگەڵا کردو بەسەریدا زاڵ بوو ٥ خودا حافیزی لێکرد.

**خالَی العَدُوُّ**: ئەوەی لەنێوان ئەوو خۆیدا بوو وازی لێ هێنا.

**خلَّی الأمر**: وازی لە کارەکە هێنا.

**خلَّی سَبیلَهُ**: وازی لێ هێناو بەرەڵای کرد.

**خلَّی بَیْنَهُمَا**: لێیان گەڕاو ویستی بۆخۆیان پێکەوە بژین.

**خلَّی فلان**: فلانکەس مرد.

**تَخالَی القومُ**: خەڵکەکە یەك هەڵوێستیان هەبوو وەلێ دوایی کێشەیان تێکەوت.

**تَخلَّی عن الأمر ومنه**: وازی لێ هێنا.

**تَخلَّی فلانٌ**: فلانکەس خۆی تەرخانکرد بۆ ئەو کارە ٥ چوو بۆ سەرئاودەست.

**تَخلَّی خَلِیَّةً**: خەلییەیەکی بۆ خۆی دانا.

**اسْتَخْلَی المکان والإناءَ**: بەمانا (خَلاَ) دێ.

**اسْتَخْلَی فلان**: فلانکەس چووە خەلوەتخانە بۆ خودا پەرستی ٥ داوای کرد لەگەڵی دا

بچێته شوێنی پەناوەو کۆببنەوە.

اِسْتَخلی بە: بۆی تاق بووە، بۆ ئەوە خۆی تەرخان کرد.

استخلی فلاناً: پێی گوت لەگەڵمدا کۆببەرەوە.

اِسْتَخْلی فلاناً مَجلِسَهُ: داوای لێ کرد مەجلیسەکەی بۆ چۆڵ بکا.

اِخلَـوْلی: بەردەوام بوو لە سەر خواردنەوەی شیر.

اَلتخـلاّءُ الـشحماتي: نەخۆشییەکی منداڵانەیە.

الخالی من الرجال: پیاوێکە عازەب بێ ژنی نەبێ.

اَلْخَلاَ: دەگوترێ: (انه لَخُلُو الخَلاَ): قسە شیرینە.

الْخَلاَءُ: چۆڵی بەرفراوان، دەشتی کاکی بەکاکی ٥ شوێنی دەست نوێژگرتن ٥ هەروا دەگوترێ: (انا منه خلاءٌ) ٥ من لێی بێ بەریم و چیم بەسەریەوە نیە.

الخِلالَةُ: ئامێرێکە بنکی کاغەز پێکەوە دەبەستێ بە تەل یان بەدەزو.

الخِلْـوُ: ئادەمیزادی بێ خەم و خەیاڵ ٥ پیاوێك بێ ژن بێ.

اَلْخَلْوَةُ: شوێنی کۆبونەوە لەگەڵ یەکێکی تردا ٥ یان خەڵوەتخانەی خودا پەرستی و بیرکردنەوە.

اَلْخَلْوَةُ الصحیحة: لە زاراوەی شەرع و یاسادا ئەوەیە پیاوو ژن لە ژورێکدا بن و دەرگایان لەسەر خۆ داخستبێ و کەسیان لەگەڵ نەبێ.

اَلْخَلِـيّ: هەنگەڵان ٥ کۆڵەسی هەنگ ٥ شانەی هەنگوین ٥ ئەو شوێنەی هەنگ هەنگوینی تێدا دروست دەکا.

اَلْخِلْيُ من الرجال: پیاوی بێ خەم و خەیاڵ ٥ بێ ژن، بێ هاوسەر.

اَلْخَلِیَّةُ: هەنگەڵان، کۆڵەس ٥ شانە هەنگوین ٥ حوشترێك تاقی کرابێتەوە بۆ دوشین ٥ حوشترێك بێچوی خۆی نەمابێ بێچوی تری بەریخەن بۆ ئەوەی شیربدا ٥ ئاژەڵی بەرەڵلا کراو بۆ ئەوەی لە کوێی حەزلێیە بلەوەرێ ٥ کەشتییەك کەشتییەوانی تێدا نەبێ و بڕوا ٥ کەشتی گەورە ٥ کەشتییەك کەشتی بچوکی بەدواوەبێ ٥ ئافرەتێك نە مێردی هەبێ و نەمنداڵ ٥ وشەیەکە کینایەیە بۆ تەڵاق، ئەگەر پیاوێك بەژنەکەی بڵێ (اَنتِ خلیةٌ) بە وشەی (خلیه) مەبەستی تەڵاق بێ، تەڵاقەکەی دەکەوێ.

الخَلِیَّةُ: لە زانستی (الأحیاء)دا بریتییە لە (خانە) جا خانەی رووەکی بێ یان خانەی حەیوان بێ ٥ خانە زۆر

پـــچوکەو بەچـــاوی ئاســـایی نابینریٚ ٥ پێکهاتەی خانە (سیتو بـــلازم)و پەردەیـــەکی بلازمـــی بەدەوردا ٥ خانەی روەك دیوارێکی نەرمی هەیە زوربەی لە سلیلۆزە.

اَلْمُخَالِي: کەسێك وادەو بەڵێنی نەبیٚ.

المِخْلاَةُ: حوشترێکە بێچوەکەی لیٚ دور خرابێتەوە.

خَلَى خَلْياً: بڕیەوە، پارچە پارچەی کرد.

خَلَـــى الفَـــرَسَ: لغـاوی کـردە دەمـی ئەسپەکە.

خَلَى اللجام عـن الفـرس: لغاوی لـەدەمی ئەسپەکە دەرهێنا.

خَلَى القِدرَ: داری خستە ژێر مەنجەڵەکە.

خَلَى الماشِيةَ: گیاوگژی تـەڕی بۆ درون‌و خستیە بەردەمی ئاژەڵەکان.

أخـلَت الأرض: زەوییەکـە گیـاوو گـژی تەڕی زۆر بوو.

أخلَى القِدْرَ: ئاگری بە قشبل‌و تەپاڵە لەژێر مەنجەڵەکەدا کردەوە.

أخلى الدابةَ: گیاو گـژی تـەڕو تـازەی دا بە ئاژەڵەکە.

أخلَـى اللهُ الماشـيةَ: خـودا گیـاوو گـژی تازەی بۆ ئاژەڵەکان رواند بۆ ئـەوەی بیخۆن.

أخلـى الفَـرَسَ: لغـاوی خـستە دەمـی ئەسپەکە.

اخْتَلَى السيفُ: شمشێرەکە بڕی.

اخـــتَلى الخَلَـــى: گیـــاوو گژەکـــەی دروێنەکرد.

اخْتَلَى رأسَهُ: سەری بڕی.

اَلْخَلَـى: حەشیش‌و گیـاو گـژ ٥ گیـای تەڕ.

خَمِـجَ خَمَجـاً: لەبـەر زەعیفـی‌و لاوازی توانای نـەماو نـەیتوانی جم‌و جوڵ بکا.

خَمِجَ اللحمُ: گۆشتەکە بۆگەنی کرد.

خَمِجَ التَمرُ: خورماکە خراپ بوو.

خَمِجَ دينهُ وخُلُقُهُ: ئایین‌و رەوشـتی خـراپ بوو.

اَلْمُخَمَّـــــجُ: پیـــــاوی رەوشـــــت ناشیرین ٥ دەگوتریٚ: (رجل مُخَمَّجُ الأخلاق)

خَمِـدَت النـــار خَمْـداً وخُمـوداً: بڵێـسەی ئاگرەکە دامرکایەوە بەڵام پشکۆکەی نەکوژاونـــەوە ٥ مـــردو گیـــانی تێدانەما.

خَمِدَ فلان: بێـدەنـگ‌و ئـارام بـوو ٥ (خَمِدَ المـــريضُ): نەخۆشـــەکە بێهـــۆش بوو ٥ مرد.

خَمِـدَت الحُمـىُ: لـەرزو تاکـەی هێـواش بووە ٥ هەڵچونەکەی دامرکایەوە.

أخْـمَدَ الرجـلُ: جوڵـەی لـەخۆی بـڕی‌و بێـدەنـگ بـوو، خـۆی بـەو کـارەوە راهێنا.

**الخامِـدُ**: راوەستاو بێ جمو جوڵو بێدەنگ.

دەگوترێ:(قوم خامِدون) گەلو نەتەوەیەکی بێ جمو جوڵن هەموویان مردونو بوون بەخۆڵەمێش ٥ قورئان دەفەرموێ ٥ ﴿إن كَانَتْ إلاَّ صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَامِدُونَ﴾.

**اَلْخُمُـودُ**: چاڵو قوڵکەیەکە ئاگری تێدەکەن بۆ ئەوەی دابمرکێ.

**خَمَـرَ** منه خَمراً: شەرمی کرد ٥ (خَمَرَ الشَّيْئَ) شتەکەی داپۆشی ٥ شاردیەوە ٥ (خَمَرَ العجين) خەمیرەی کردە ناو هەویردکەوە بۆ ئەودی باش هەڵبێ.

**خَمِـرَ** خَمَراً: تووشی سەر هێشە بوو لەناکامی شەرابخوادنەوە ٥ بەهۆی عەرەق خواردنەوە نەخۆش کەوت ٥ دەردو ئازار چووە ناو جەستەیەوە.

**خَمِرَ** المكانُ: شوێنەکە شەرابی تێدا زۆر بوو.

**خَمِرَ** الشَّيْئُ: شتەکە لەو حاڵەی لەسەری بوو گۆڕاو چووە سەرحاڵێکی تر.

**خَمِـرَ** عنه: خۆی هون کردو لەبەرچاو نەما.

**خَمِـرَ** عنه الخَبـرَ: هەواڵەکەی نەزانی.

خەبەرەکەی لێ شێوا.

**خَمِرَ** علي فلان: رقی لە فلانکەس هەڵسا.

**خُمِرَ** خَمْراً: بەعەرەق خواردنەوە توشی سەرئێشە بوو.

**أخْمَرَ**: لەناو دارو درەختو جەنگەڵدا گوم بوو ٥ شەراب لەلای ئەو زۆر بوو.

**أخْـمَرَت المـرأةُ**: ئافرەتەکە میکیاجی کردو خۆی بۆنخۆشکرد.

**أخمـرت الجاريـة**: کچەکە کاتی ئەوەی هاتووە خۆی بالاّ پۆشبکا.

**أخْـمَرَتِ الارضُ**: زەوییەکە دارو درەختی زۆر بوو.

**أخْمَرَ** علي فلان: کینەو رقی لەفلاّن هەڵگرت.

**أخْمَرَ الْخَمْرَ**: شەرابی دروست کرد.

**أخْـمَرَ الـشَّيْئَ**: شتەکەی داپۆشی ٥ شاردیەوە ٥ پاشگوی خست.

**أَخْمَـرَ العَجِينَ**: خەمیرەی کردە ناو هەویرەکەوە.

**خامَرَ** به: شاردیەوە ٥ (خـامَرَ الـشَّيْئَ): تێکەڵاوی شتەکەی کرد ٥ (خـامَرَ المكانَ): لە شوێنەکە مایەوە تێیدا جێگیربوو.

**خَمَّـرَ**: شەرابی دروستکرد ٥ (خَمَّـرَ الشَّيْئَ): شتەکەی داپۆشی.

خَمَّرَت المرأةُ رأسَها بالخمار: ئافرەتەکە بە سەرپۆش سەری خۆی داپۆشی ٥ (خَمَّرَ المكانَ): لەو شوێنە مایەوەو تێیدا نیشتەجێ بوو.

خَمَّرَ العجينَ: خەمیرەی کردە ناو هەویرەکەوە ٥ هەویرەکەی شێلاو ماوەیەك لێی گەڕا بۆ ئەوەی هەڵێ.

إخْتَمَرت المرأةُ: ئافرەتەکە سەرپۆش‌و چارەکەی پۆشی.

اخْتَمَرَ الخمرُ: عەرەقەکە پێگەیی‌و وەختی کولاندنی هات.

اخْتَمَرَ العجينُ: هەویرەکە هەلات بوو بە خەمیرە.

تَخَمَّرَت المرأةُ الخِمارَ: ئافرەتەکە سەرپۆش‌و چارەکەی بەخۆی دادا.

تَخَمَّرَت المرأةُ بالخُمْرةِ: ئافرەتەکە میکیاجی دەم‌و چاوی بە خومرەکە کرد.

اسْتَخْمَرَ الرجلَ: پیاوەکەی کرد بە کۆیلە.

الخُمَارُ من الناس: کۆمەڵ‌و دەستەو دایەرەیان.

اَلْخُمَار من الخمر: ئەو شەرابەیە بخۆرەوەکەی توشی سەرهێشە بکا ٥ ئەو مادە سەرخۆشکەرەیە کە تێکەڵی خوێنی ئادەمیزاد دەبێ.

الخِمارُ: پەردەو سەرپۆش‌و چارەکەو مێزەر.

الخَمْرُ: هەر شتێك سەرخۆشکەربێ لە گوشراوی تری‌و خورماو شتی تر ٥ تری ٥ هەر شەرابێك سەر خۆشکەر بێ ٥ (ك: خُمور).

اَلْخِمْرُ: حیقدو کینە.

اَلْخَمَرُ مِنَ الناس: پێرو کۆمەڵی خەڵك ٥ هەرشتێك شت داپۆشێ لە دارو دەوەن‌و گزو گیاو کێو ٥ درەختی پرگەڵاو لق‌و پۆپ ٥ غافڵگیری‌و نهێنی دەگوترێ:(جاء نا علی خَمَر).

الخَمْرَةُ: بەمانا (اَلْخَمَرُ) دێ ٥ کۆمەڵ‌و قەرەباڵغی ئادەمیزادان.

اَلْخَمْرَةُ: بۆنی خۆش.

الخُمْرَةُ: ئەو مادە بێهۆشکەرانەی تێکەڵاوی خوێندەبێ ٥ کۆمەڵێك داوو دەرمان ئافرەت میکیاجی پێ دەکاو خۆی پێ ئارایش دەدا ٥ خومرە کە دەکرێتە ناو هەویرەوە بۆ ئەوەی هەویرەکە هەڵبێ ٥ بیرەی لێڵ‌و تەڵخ ٥ بیرەی بۆنخۆش ٥ حەصیرو بەرماڵ کە لەلقی دارخورما بتەنرێ‌و بەبەن‌و گوش رایەڵبەند بکرێ.

اَلْخِمْرَةُ: بۆنی خۆش ٥ دەگوترێ: (امرأة طيبة الخِمْرَةِ) ٥ ئافرەتێکی بۆنخۆشە ٥ لەبەرکردنی خیمار.

اَلْخَمْرِيّ من الألوان: ئەوەی رەنگی شەرابی بێ.

**الخَمَّارُ**: مەیفرۆش.

**اَلْخَمَّارَةُ**: دوکانی مەیفرۆشی.

**الخِمِّيـرُ**: ئەو کەسەی زۆر شەراب بخواتەوە ◦ (مودمین).

**اَلْخَمِيرُ**: جۆرە هەویرێکی تایبەتییە.

**اَلْخَمِيرَةُ**: رومکێکە تاکخانەیەو لەجۆری (فیطریات)ە ◦ شکڵی هێلکەیی یان خرە بەشەتڵ دەبێ بۆ هەڵهێنانی هەویر بەکاردێ، هەروا بۆ ئامادەکردنی مادەسرکەرەکانو فیتامینات بەکاردێ.

**خَمِيرَةُ اللبن**: هەوێنی ماست دەکرێتە ناو شیرەوە بۆ ئەوەی بمەیێ.

**اَلْمُخْتَمِرَةُ**: مەڕی سپی یان ئەسپی سپی.

**اَلْمُخَمَّرَةُ من الشياه**: مەڕی سەر سپی باقی جەستەشی هەر رەنگێك بێ.

**اَلْمُسْتَخْمِرُ مِن الرجال**: پیاوێك زۆر مەی بخواتەوە.

**خَمَسَ المالَ خَمْساً**: پێنج یەکی ماڵەکەی هەڵگرت.

**خَمَسَ فلاناً**: پێنج یەکی ماڵی فلانەکەسی هەڵگرت.

**خَمَسَ القومَ**: بوو بە پێنجەمی خەڵکەکە ◦ پێنجەم کەسیان بوو.

**خَمَسَ الحَبْلَ**: بەپێنج تاڵی حەبلەکەی بادا.

**أخْمَسُوا**: بوون بە پێنج.

**أخْمَسَ فلانٌ**: فلانەکەس حوشترەکانی پێنج پێنج هاتن بۆ ئاو خواردنەوە.

**خَمَّسَ الشَّيْءَ**: شتەکەی کرد بەپێنج روکن بەپێنج لایەن بەپێنج گۆشە ◦ دەگوترێ: (خَمَّسَ الشِّعْرَ) شیعرەکەی کرد بەپێنج خشتەکی.

**خَمَّسَ الأرْضَ**: زەوییەکەی دوای رۆژی پێنجەم ئاودا، واتە: لەمئاودانی پێشووەوە.

**الأخْمَاسُ**: کۆی (خِمْس) ◦ دەگوترێ: (هما في بردة أخماس) کاتێك ئەو دووە تەبابن‌و لێك نزیك بن.

**خُمَاسَ**: (جاءوا خُماسَ) خەڵکەکە پێنج پێنج هاتن.

**الخَمَاسِنُ**: بایەکی گەرمو وشكو تەپو تۆزاوییە ◦ لە مانگەکانی بەهاردا بەزۆریو لەمانگی تردا بەکەمی هەڵدەبێ.

**الخُمَاسِيُّ**: منداڵێك یان پۆشاکێك درێژیەکەی پێنج گەزبێ.

**اَلْخَمْسُ**: ژمارەی پێنجە بۆ مێینە دەگوترێ:(خَمْسُ نِسوة).

**اَلْخِمْسُ**: بەشێك لە پێنج ◦ جۆرە قوماشێکی یەمەنییە ◦ ئاوە بۆ سارایەکی بەرفراوانی وەها ئاوی دووربێ حوشتربە پێنج رۆژ بگاتە سەرئاوەکەی.

**اَلْخُمْسُ**: بەشێك لەپێنج بەش ٥ پێنج یەك.

**اَلْخَمْسَةُ**: ژمارەی پێنجە بۆ نێرینە، دەگوترێ:(هم خَمْسَةُ رجال).

**الخَمِيس**: بەشێك لەپێنج بەش ٥ ناوی ڕۆژی پێنج شەممە ٥ سوپای زۆر کەپێك هاتبێ لەپێنج بەش (پێشە تاو پاشەتا لای ڕاستو لای چەپ، ناوەڕاست) ٥ پۆشاك یان ڕمبو هەر شتێکی تر کە درێژییەکەی پێنج بست بێ.

**اَلْمَخْمَسُ**: پێنج پێنج دەگوترێ:(جاءوا مَخْمَسَ).

**اَلْمُخَمَّسُ**: لە زاراوەی هەندەسەدا بەشتێك دەگوترێ پێنج گۆشە بێ.

**اَلْمَخْمُوسُ**: ڕمبێکە پێنج زیراع درێژبێ.

**خَمَشَ وَجهَهُ خَمْشاً وخُمُوشاً**: پێستی دەمو چاوی بریندارکرد.

**خَمَشَ فلاناً**: پێستی جەستەی فلانکەسی بریندارکرد.

**خَمَّشَهُ**: بەمانا (خَمَشَهُ) دێ.

**تَخَمَّشَ**: بۆ موطاوەعەی (خَمَّشَهُ) دێ.

**تَخَمَّشَ القومُ**: خەڵکەکە جمو جوڵیان زۆر بوو.

**الخامِشَةُ**: ناوەڕۆی بچوك ٥ (ك: خَوامِش).

**الخُمَاشَةُ**: برینێکە خوێنی دیاریکراوی لەشەرعدا بۆ دانەنرابێ.

**اَلْخَمْشُ**: ناوە بۆ برینی پێست (ك: خُمُوشٌ).

**خَمَصَ البطنُ خَمصاً وخُموصاً**: گەدەکە خاڵی بوو، سکی بچوك بۆوە ٥ سکی قبوت، سکی چووە ناوەوە ٥ (هو خَمِيص، ك: خِماص) و(هي خَمِيصة، ك: خِماص وخَمائص).

**خَمِصَ بَطنُهُ**: بەمانا (خَمَصَ) دێ ٥ (هو خَمصان وهي خَمْصَانة)

**خَمِصَ القدمُ**: چاڵایی بەری پێی زۆر بەرز بۆنەوە لەزەوی ناکەوێ ٥ (هو أخمص وهي خَمصاء).

**خَمُصَ البَطْنُ خُمْصاً وخَماصةً**: گەدەی خاڵی بوو، سکی بچوك بووە.

**تَخَامَصَ عنه**: لێی دوور کەوتەوە.

**تَخَامَصَ له عن حقه**: وازی لەمافی خۆی هێنا بۆنەوەی مافەکە بدا بەنەو.

**تَخَامَصَ الليلُ**: تاریکایی شەو کە مێ ڕوویەوە لە دەمەوبەیاندا.

**إنْخَمَصَ الجرحُ**: برینەکە هاوساوییەکەی ڕوویەوە.

**الأَخْمَصُ**: چاڵایی بەری پێ؛ ئەوەی لە زەوی ناکەوێ.

**اَلْخُمْصَان**: بەمانا (الخَمْصَان) دێ.

**اَلْخَمِيصَةُ**: کراسێکی ڕەش یان سور

وێنەو نیشانەی تێدابن.
**اَلْمَخْمَصَةُ**: برسییەتی (رب مَخْمَصَةٍ شرّ من التخم).
**خَمَطَ** اللَّبَنُ والخَمْرُ والوعاءُ خَمْطاً وخُموطاً: بۆن خۆش بوو.
**خَمَطَ** اللَّبَنَ والخَمْرَ: شیرەکە یان شەرابەکەی کردە مەنجەڵەکەوە.
**خَمَطَ** اللحمَ: گۆشتەکەی برژاند ٥ باش نەیبرژاند.
**خَمَطَ** الحَمَلَ والجديَ: کاوڕەکە یان گیسکەکەی گروو گۆشتەکەی برژاند.
**خَمِطَ** اللبنُ والخمرُ: بەمانا (خَمَطَ) دێ ٥ دەگوترێ:
**خَمِطَت الأرضُ**: زەوی بۆنی خۆش بوو.
**خَمِطَ** الرجلُ: پیاوەکە فیزی کردو خۆی بەزل زانی ٥ رقی هەڵساو توڕە بوو.
**تَخَمَّطَ الرَّجُلُ**: پیاوەکە تەکەبوری کرد، فیزی نواند ٥ زۆری رق هەڵساو توڕە بوو ٥ رکەبەرەکانی خۆی ملکەچ کردنو بەسەریاندا زاڵ بوو.
**تَخَمَّطَ الفحلُ**: دەنگی خۆی خواردەوە، حیلکەی لە قورگی دا دوبارە کردەوە.
**تَخَمَّطَ البَحْرُ**: دەریا شەپۆلەکانی تێکیانەوە هاویشتو ئارامی نەما.
**اَلْخَمْطُ**: شتی بۆنخۆش ٥ جۆرێکە لە درەختی (الأراك) بەرەکەی دەخورێ ٥ بەری کەم لەهەر درەختێك بێ ٥ شەرو ماستی ترش ٥ شتی تاڵ ٥ هەرگیاوو گژێك تامی تاڵی گرتبێ.
**اَلْخَمطَةُ**: بۆنی زەوی ٥ بۆنی تولەمێوو بەرسیلە لەسەرەتای پەیدابوونو هەڵپێچانی دا ٥ بۆنی کونەدمو مەشکە ٥ بۆنی شەراب پێش ئەوەی بترشێ، لەسەرەتای ترشبونی دا.
**الخَمْطَةُ من السقاء**: بۆنی کونەدمو مەشکە.
**الخَمّاطُ**: برژاو، برژاندن.
**خَمَلَ** المنزلُ: خانوەکە شوێنەواری نەما ٥ مەکۆکە لابراو هیچی نەما.
**خَمَلَ** الرجلُ: پیاوەکە گوم بوو نەناسراو کەس باسی ناکا.
**خَمَلَ** ذِكرُهُ: ناوی ونەو کەس باسی ناکا.
**خَمَلَ** الصوتُ: دەنگەکە نزم بوو.
**خَمَلَ** الرجلُ صوتَهُ خَملاً: پیاوەکە دەنگی نزم کردەوە ٥ دەنگی بەرز نەکردەوە.
**خَمَلَ** البُسْرَ: خورما مزرو کاڵەکەی خستنە جەرەوە بۆ ئەوەی نەرم بن.
**خُمِلَ**: دەردە جومگەی توش بوو (الخمال): نەخۆشییەکە توشی جومگە دەبێ.

أَخْمَلَتِ الأرضُ: زەوییەکە گوڵەخەمائیلی زۆر بوو.

أَخْمَلَ الحائكُ الثوبَ: جۆلاکە گوڵی بۆ قوماشەکە دروست کرد.

أَخْمَلَ الله فلاناً: خودا ناوو شۆرەتی فلانی کوێر کردوە، کەس نایناسێو کەس باسی ناکا.

اِخْتَمَلَ: لەناو خەمائیلەکاندا لەوەڕا.

الخامِلُ: ئادەمیزادی هیچو پوچو بێ ناوونیشان.

اَلْخُمَالُ: نەخۆشییەکە توشی جومگە دەبێو توشی قاچی ئاژەڵ دەبێو قەیزەنی دەکا.

اَلْخَمَالَةُ: پەرو پۆڵی نوعامە.

اَلْخَمْلُ: بەمانا (اَلْخَمَالَةُ) دێ ٥ برژو پاڵی قوماشی قەدیفە یان خوری قەدیفە ٥ ئەو چەرمە پرژ پرژەی روی ناوەوەی مەعیدەی داپۆشیوە.

الخَمِلُ: دۆستی باش.

اَلْخَمْلَةُ: قەدیفە.

اَلْخِمْلَةُ: قەدیفە ٥ نهێنییەکانی پیاو.

اَلْخَمِيلُ: قەدیفە ٥ تشریبو تێکوشراو ٥ هەوری پرو تاریك ٥ پۆشاکی گوڵگوڵاوی ٥ یان پۆشاك لە قەدیفە ٥ قەدیفەی رەش.

اَلْخَمِيلَةُ: پەرو باڵی نوعامە ٥ قەدیفە ٥ درەختی پڕ لقو پۆپو گەڵا بەجۆرێك زەلام بچێتە ناویەوە دیارنەبێ ٥ هەرشوێنێك نەرمان بێو بەگیاو گوڵو گوڵزار برازێتەوەو بشوبهێتە پارچە قەدیفە.

خَمَّ اللحمُ خَمّاً وخُموماً: گۆشتەکەی بۆگەن بوو بەبرژاوی یان کوڵاوی ٥ بۆنی کردبێو بەتەواوی فاسیدنەبووبێ.

خَمَّ اللبنُ: شیرەکە گۆڕاو بزرکاو بۆنەکەی ناخۆش بوو.

خَمَّ فلانٌ: فلانکەس زۆر گریاو دادو فیغانی کرد.

خَمَّ البَيْتَ: ماڵەکەی ماڵی ٥ (خَمَّ البئرَ) بیرەکەی پاك کردەوە.

خَمَّ قَلْبَهُ: دڵی پاککردەوە لە حیقدو کینە ٥ (المخموم القلب): دڵپاکو بێ حیقدو کینە.

خَمَّ النَاقَةَ: حوشترەکەی دۆشی.

خَمَّ الشَيْئَ: شتەکەی بریەوە.

خَمَّ فلاناً بثناء حسن: بەباشی باسی فلانکەسی کرد.

خَمَّ فلان يَخُمُّ ثياب فلان: فلانکەس بەباش‌وچاك ناوی فلاّن دێنێ.

خُمَّ الدجاجُ: مریشکەکە کرایە کولانەوە.

خُمَّ الخُمُّ: کولانەکە پاك کرایەوە.

أخَمَّ للحمُ واللَّبَنُ: گۆشتەكەو شیرەكە بۆگەنی كرد.

إختمّ البیتَ والبِئرَ: ماڵەكەی ماڵی، بیرەكەی پاك كردەوە.

تخَمَّمَ ما علی الخِوان: ئەوەی لەسەر سفرەكە بوو خواردی.

الخُمَامَـةُ: ئەوەی بماڵدرێ لەبیرو لە خانوو ٥ گەسكی ماڵین ٥ ئەو خواردن‌و خوراكەی دەكەوێتە سەر سفرەو دەپرژێ.

اَلخَمُّ: باغێكە بێ درەخت‌و بێ میوە.

اَلخُـمُّ: كولانەی مریشك ٥ قەرتاڵەو سەبەتەیەكە لە قەفەزاژ، كاو وردەپوش دەكرێتە تەختەكەی بۆ ئەوەی مریشك هێلكەی تێدا بكا یان جوجكی تێدا هەڵبێنێ.

اَلخَمِیمُ: رەزاگران‌و نەكڵەوەت ٥ شیری تازە دۆشراو ٥ وەسپ دراو.

اَلمِخمَّةُ: گەسكە ئاڵەتی ماڵماڵین.

خَمَنَ الشَّئَ خَمْناً: بەگۆترەو مەزندە شتەكەی هەڵسەنگاند.

خَمَّنَ الشَّئَ: بەمانا (خَمَنَ) دێ.

اَلخَمَنُ: بۆگەن.

اَلْخُمَّانُ مِنَ النَاسِ: ئادەمیزادی پەرو پوچ‌و خوێڕیلە ٥ رەبی زەعیف.

اَلْخُمَّانَةُ: شمشێری زەعیف.

خَبِبَ فُلانٌ خَنَباً: توشی لوت گنی بوو ٥ مردو فەوتا ٥ شەل بوو.

أخْنَبَ: بەهیلاك چوو (أخْنَبَهُ) بەهیلاكی برد.

أخْنَبَ رِجلَهُ: قاچی سڕكرد ٥ بڕیەوە.

اِخْتَنَبُوا: تێداچون، لەناو چون.

تَخَنَّبَ: دیمەنی ناشیرینی سەرلوتی لابردو نەشتەرگەری بۆ كرد ٥ تەكەبووری كرد.

اَلْخَنَابُ من الرجال: پیاوی گەڵەگەتی كەتەو زەلام ٥ پیاوی نەحمەق‌و گێل‌و هەردەمە خەریكی شتێكە.

اَلْخَنَابَةُ: شوێنێكەی ناشیرین لەسەر جەستە ٥ شەڕو نەگبەتی.

اَلْخِنْبُ: شوێنی بەیەك گەیشتنی ئێسقانی ران‌و ئێسقانی لولاك (ئەژنۆو رەفیچك) ٥ بۆ شایی نێوان پەنجەكان ٥ بۆشایی نێوان دوو گۆشە.

اَلْخَنَّبُ: دەردێكە توشی لوت دێ‌و ئادەمیزاد كە قسەدەكا وشەكان گن دەبن.

اَلْخَنَبَاتُ: غەدرو درۆ ٥ دەگوترێ:(هو ذوخَنَبَاتٍ) ئەو كابرایە میزاجییەو هەرجارە رولەلایەك دەكا ٥ جارێك باش دەكاو جارێك خراپ.

اَلْخُنُبَاتُ: بەمانا (اَلْخَنَبَات) دێ.

اَلْخُنْبَةُ: فەسادو داوەشان‌و گەندەڵی.

**اَلْخِناب مِن الرجال**: پیاوی کەڵەگەتی زەلام و کەتە ◦ پیاوی لوتزل و کەپوگەورە.

**اَلْخِنَابَةُ**: نەرمایی لوتی زل، ئەملاو ئەولای لوت لەلای سەروی لوت ◦ لوتبەرزی و تەکەببورکردن.

**الخِنَّبُ**: بەمانا (اَلْخِنَبُ) دێ.

**اَلْمَخْنَبَةُ**: دەنگ لێدابڕان و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی.

**خَنْبَسَ**: تالانییەکەی دابەشکرد.

**اَلْخُنَابِسُ**: شتی کۆنی پتەوی جێگیر ◦ شێر ◦ پیاوی کەتەی ناشیرین و ڕەزاگران ◦ شەوی تاریکی هەنگوستە چاو.

**اَلْخُنَابِسَةُ**: مێینە لەسەرەتای ئەوەدا کە دەردەکەوێ سکی هەیە.

**اَلْخَنْبَسُ من الرجال**: بەمانا (اَلْخُنابِسُ) دێ.

**اَلْخَنْبَسَةُ**: (خَنْبَسَةُ الأسد) شێوە ڕۆیشتنی شێر ئازایەتی و هەڵمەتی.

**اَلْخَنْبُوسُ**: بەردە ئەستێ بەردێکە کە بەئاسن لێی دەی ئاگری لێ دەبێتەوە.

**خَنَثَ السقاءَ خَنْثاً**: دەمی کوندەو مەشکەکەی هەڵگێڕایەوە بەدیوی دەرەوەداو دەمی پێوەناو لێی خواردەوە.

**خَنَثَ فلاناً**: گاڵتەی پی کرد ◦ دەگوترێ: (خَنَث له بأنفه): لوتی لێ هەڵقرچاند، لوتی لێ بادا.

**خَنِثَ الرجل خَنَثاً**: پیاوەکە هەڵس و کەوتی ژنانەی کردن.

**خَنِثَ فلان**: شلە پەتەبوو ◦ لارو لەنجەی کرد خۆی بادا.

**خَنَّثَهُ**: وای لێکرد وەکوو (خونثی) هەڵس و کەوت بکا.

**خَنَّثَ كلامَهُ**: ئاخاوتنی وەکوو ژنی نازو نوزکەر کرد، ژنانە دوا.

**خَنَّثَ الشَّيْءَ**: شتەکەی چەماندەوەو دولای کردەوە.

**خَنَّثَ السقاءَ**: بەمانا (خَنَثَهُ) دێ.

**اخْتَنَثَ الرجلُ**: بەمانا (خَنَثَهُ) دێ.

**اخْتَنَثَ السقاءُ**: کوندەکە، مەشکەکە نوشتایەوە.

**انْخَنَثَ العنقُ**: ملەکە خوار بوو.

**تَخَنَّثَ الرجلُ**: بەمانا (خَنِثَ) دێ، دەگوترێ:(تَخَنَّثَ في كلامه) لەقسەکردندا ژنانە دوا.

**تَخَنَّثَ الشَّيْءُ**: شتەکە چەمایەوە.

**خَنَاثِ**: وتەیەکی جینو ئامێزە ئاڕاستەی ئافرەت دەکرێ.

**اَلْخُنَاثَةُ**: پیاوێک ئاکارو گوفتاری ژنانەبێ.

**اَلْخِنْثُ**: کۆمەڵی پەرتەوازە ◦ لویەکی

قوماشی پێچراوە ◦ چرچو لۆچی قوماشی پێچراوە، دەگوترێ: (طوی الثوبَ علی أخنائه وخِنثائه) ◦ دیوی ناوەوەی شەویلە ئاستی ددانی دواوە (ددانی خری) چ لای خوارو چ لای سەرو.

**خُنَثُ**: وشەیەکی جنێو ئامێزە ئاراستەی پیاو دەکرێ، دەگوترێ: (یا خُنَثُ) هۆی نێرەموک.

**اَلْخُنْثی**: نێرەموک ◦ کەسێك کۆئەندامی زاوزێی نە نێرینەی تەواوبێ نە مێینەی تەواو بێ ◦ رووەکێك خانەی مێینەو خانەی نێرینەی تێدابن (ك: خناثیَ).

**اَلْخُنُوثَةُ**: نێرەموکی ◦ (الخُنُوثَةُ الكاذبة): ئەوەیە ئادەمیزادەکە لەراستیدا رەگەزی نێرینەبێ یا رەگەزی مێینەبێ وەلێ هەندێ دیاردەی رەگەزەکەی تری پێوە دیار بێ.

**اَلْمِخْنَاثُ**: ئافرەتی چاو نەرمو لارو لەنجەکەر لەرۆیشتندا.

**اَلْخَنْجَرُ**: خەنجەر، کێرد، کێردی گەورە (ك: خناجر).

**اَلْخِنْجَرُ**: بەمانا (اَلْخَنْجَرُ) دێ.

**اَلْخَنْجَرَةُ**: حوشترێك شیری زۆربێ.

**اَلْخَنْجَرِيرُ مِنَ المِيَاه**: ئاوی قورس بەمەرجێ نەگاتە ئاستی سوێری.

**خَنْخَنَ فلان**: قسەی بەلوت کرد، لەقسەدا گنە.

**اَلْخُنْدُبُ من الرجال**: پیاوی بەدرەوشت.

**اَلْخَنْدَرِيسُ**: شەراب، شەرابی کۆن ◦ (تمر خندریس): خورمای کۆن ◦ (حِنطَةٌ خندریس) گەنمی کۆن.

**اَلْخُنْدُعُ**: جۆرێکە لە کوللە باز دەهاوێ.

**اَلْخُنْدُعُ**: کەسێك نەفس نزم بێ ◦ بەسروشت ناکەس بەچەبێ.

**خَنْدَق**: کانگەی هەڵکەند.

**اَلْخَنْدَق**: چاڵێکە بەدەوری شتێکدا هەڵدەکەندرێ ◦ شەقە جۆگایەکی درێژە لە گۆڕەپانی شەڕدا هەڵدەکەندرێ بۆ پارێزگاری لەسوپاو سەربازەکان.

**تَخَنْذَ**: بێ حەیابوو خۆی سفورکرد دەستی دایە بەدرەوشتی ◦ یان شەڕەنگێزو ئازاو جەربەزە بوو.

**الخِنْذِيذُ**: شاعیری چاك و شیعر رەوان ◦ وتاربێژی زمانڕەوان و قسەکاریگەر ◦ پیاو ماقوڵی هێدی و هێمن ◦ شارەزا لەبەسەرهاتو مێژووی رۆژگاری عەرەب، هۆزو شیعرو هونەرو کەلەپوریان ◦ پیاوی ئازای کە زەفەری پێ نابرێ و دوژمن نازانێ لەکوێوە بۆی بچێ ◦ پیاوی

**استدرك الشيءَ بالشيءِ:** بەشوێن ئەو شتەدا شتەکەی هێنا.

**استدرك عليه القولَ:** قسە هەڵەکەی بۆ راست کردەوە ٥ یان کەمو کورپیەکەی بۆ تەواو کرد کونو کەلەبەری بۆ پڕکردنەوە.

**دَراكِ:** (اسم فعل)ە بەمانا (أدرِك) دێ.

**الـدَّرَك:** (اسم فعل)ە لە(إدراك) وەرگیراوە ٥ تاوانو گوناە ٥ بنکی هەرشتێك قوڵی هەبێ وەکوو بیرو چاڵو شتی وا ٥ دەگوترێ: (بَلَغَ الغواص درك البحر) مەلەوانەکە گەیشتە قوڵایی دەریاکە ٥ چینێکە لە چینەکانی دۆزەخ ٥ پۆلیسو زێرەڤان.

**الدَّرَكةُ:** ئەڵقەی ژێ ٥ تیلمە چەرمێکە دەکرێ بەژێی کەوانەوە ٥ پارچە خستنە سەر دوخینو پیشتێنی کورتە.

**الدَّرَكةُ:** مەنزڵی پایینو ڤاتی ژێرەوەی شتی ڤاتقاتە.

**الدَّرَكات:** کۆمەڵە شتێکی ڤاتقات چین لەخوار چین بە پێچەوانەی (الدرجات) ڤات لەسەر ڤاتە.

**الْمَدَارِكُ:** پێنج هەستەکان.

**دَرَمَت الارنبُ والفـارةُ والقُنْفُذُ درماً ودَرَماناً:** کەروێشکەکە یان ژیشکەکە هەنگاوەکانی نزیك کردنەوەو کەوتە پەلە پەل لەرۆیشتندا.

**دَرِمت الارنب والفأرة والقُنفُذُ دَرَماً:** لاسایی کردنەوەی رۆیشتنی ئەم گیانلەبەرانە، دەگوترێ: (دَرِم الصبيّ والشيخ) منداڵەکە یان پیرەمێردەکە وەکوو کەروێشك یان وەکوو مشك یان وەکوو ژیشك رۆیشتن.

**دَرِم الكعب والعظم:** گۆشت ڤاپەرەڤەی یان ئێسقانی داپۆشیو لەگۆشتدا هون بون.

**دَرِمَ المكانُ:** شوێنەکە تەخت بوو بەرزیو نزمی تێدا نەما.

**دَرِمَ الأسنانُ:** ددانەکان کەوتن.

**دَرِمَ البعيرُ:** حوشترەکە ددانی کرموڵ بونو نزیکە بکەون.

**دَرِمت الشفتان:** دوو لێوی سور بون بەهۆی سیواك کردن بەدرەختی (دارم).

**أدْرَمَ:** ددانەکانی کەوتن چونکە لەژێریانەوە ددانی تری دێن ٥ دەگوترێ: (أدْرَمَ الصبيُّ وأدْرَمَ الفصيلُ).

**أدْرَمت الأرضُ:** زەوی درختی دەرمای رواند.

**دَرَّمَـهُ:** رێکی خست ٥ دەگوترێ: (دَرَّمَ

أظفاره) نینۆکەکانی ڕێك کردن دوای ئەوەی قرتاندنی ئەمجار ڕێکی کردن.

الأدْرَمُ: پیاوێکە ددانی نەمابن.

الدارِمُ: درەختێکە دەشوبهێتە درەختی غەضا، ئافرەتان کە سیواکی پێ دەکەنەوە لێوو پوکیان زۆر سور دەبن.

الدّراما: جۆرێکە لە شانۆ، چەندکەسێك لاسایی کەسانی دیکە دەکەن قسەو کردەوەو پۆشاکیان وەکوو ئەوان رادەنوێنن.

الدُّرّامُ: ناشیرین‌و ڕەوت ناشیرین ٥ ژیشك.

الدُّرماءُ: دەگوترێ: (امرأة درماءُ): ئافرەتێکە قاپەرەقەو ئێسقانی لەگۆشت دا شارابنەوەو دیارنەبن ٥ ڕوەکێکە گەلاکەی سوورە نەدرەختەو نەگیایە لەشێوەی جەرگ دایەو لەپێری (حُمْضَ)ە.

الدِّرِمَةُ: کەروێشك ٥ (درع دَرِمَة) زرییەکی لووسە.

الدِّرِمَةُ: مندالی قەلەوی گۆشتن.

درمَجَ في مشيه: بەگاگۆلکێ ڕۆیی.

دَرْمَجَت الناقة وَلَدَها: حوشترەکە سۆزی بۆ بێچوەکە نواند.

إدْرَمَّجَ عليهم: بەبێ پرس خۆی بەماڵەکەیاندا کرد.

إدْرَمَّجَ في الشَّيْئِ: چووە ناو شتەکەوەو خۆی تێدا حەشاردا.

الدُّرامِجُ من الرجال: پیاوی لارو لەنجە کەرو خۆبەزلزان لە ڕۆیشتندا.

دَرْمَكَ: بازی دا، پەلەی کرد یان خەریك بوو هەنگاو بهاوێ.

دَرْمَكَ الشَّيْئَ: شتەکەی ورد کردو هاڕی.

دَرْمَك الابلُ الحَوْضَ: حوشترەکە حەوزەکەی شکاند.

دَرْمَكَ البناءَ: باڵەخانەکەی لوس کردو راستەو پاستەی کرد.

الدَّرْمَكُ: کوتانی هەموو شتێك وردکردنی ٥ گڵی نەرم‌و بێ بەردو چەو ٥ ئاردی سپی.

دَرِن دَرَناً: چڵکن بوو، دەگوترێ: (دَرِن الثوبُ) و (دَرِنَت يده بكذا).

دَرِن الإنسانُ: ئادەمیزادەکە سییەکانی توشی نەخۆشی سیل بوو (هو دِرِن وأدْرَنُ وهي درناء).

أدْرَنَ الثوبُ: پۆشاکەکە چڵکن بوو.

أدرنت الماشية: ئاژەڵەکە پەل‌و پوشی کۆنی رزیوی ساڵی پێشوی خوارد، ئەمەش بەهۆی قات‌و قڕی‌و گرانی.

أدرنَ الحَطَبُ: دارەکان وشك بون.

أدرنَ الثَّوْبَ: کراسەکەی چڵکن کرد.

الإدْرَوْنُ: ئـاڵفو ئالیـك ە نیـشتمان ە ئەصڵو بنەما.

الدُرَانَـةُ: پـڵو پوشـی ڕزیـوی سـاڵی پێشوو.

الدَّرَنُ: نەخۆشییەکە توشی سییەکانی ئادەمیزاد دەبێ . سیل.

أم دَرَن: جیهان، (دونیا).

الدَّرَنَةُ: لە زانیاری پزیشکیدا تەڵخانیو گۆڕانکارییەکە لەسی سیل گرتودا دەردەکەوێ ە لەزانیاری روەکناسی دا برێتییە لە رەگی روەکێ یان قەدی روەکێ کەبهاوسێو مادە بژیویەکانی تێدا کۆببنەوە.

الدَّرِینُ: پڵو پوشی پاوانو لەوەڕگا کە هـــی ســـاڵی پێـــشووبێو رزی بن ە پۆشاکی رزیـو ە (أم درین) زەوی روتو بێ گژو گیاو درەخت.

لِلـــدْرانُ: کەسێـــك نەخۆشـــی ســیلی کوشندەی هەبێ.

دَرَهَ علـــیهم دَرْهـــاً: لێیـان دەرکـەوتو هێرشـی کردنـە سـەر بـەبێ ئـەوەی بەخۆیان بزانن.

دَرَهَ عـــنهم وعــم: قـسەی لێـوەکردنو بەرگری لێ کردن.

دَرَهَ فلاناً: خۆی لە فلان نەناسکرد.

دَرَّهَ علی کذا: لەسنور تێپەڕ بوو زیادی کرد.

تَدَرَّهَ: هەڕەشەی لێ کرد.

الـــدِّکَرَهُ: پەیامبـــەر راســـپاردەو رەوانـــەکراو ە لاپرەســـەنگ خـــۆ هەڵواسەر.

الدَّارِهَـةُ دارهـةُ الـدهر: هێرشـکردنی رۆژگار.

الدِّرِیَةُ، درِیَة القوم: سەرەك خێڵ، ریش سپی گەل.

المِدْرَهُ: پیـاو مـاقوڵو ریـش سـپی هـۆزو خێڵ ە سەرۆکی گەلو وتەبێژ بـەناو یانـەوە ە پـارێزەرو داکوکیکـەر (ك: مَدَارُهُ).

دَرْهَمَـــت الخُبَّـــازی: درەختـــی خوبـبـازا گەڵاکانی وەکوو دیرهەمیان لێ هات.

إدْرَهَمَّ: لەبەر پیری کەوتە سەر زەویو جیتر خۆی بۆ ڕانەگیرا.

إدْرَهَمَّ بَصَرُهُ: چاوی نابینابوو.

الـدِّرْهَمُ: بەشێـك لـە دوانـزە بەشـی ئوقیەیە ە پارچە زیوێـکی سکە لێ دراوە بـۆ مامەڵـەپێوەکردن ە (ك: دَرَاهِم).

المُدَرْهَمُ: پارە زۆر، (دیرهەم زۆر)

دَرَیَ الشَّیْءَ وبهِ دَرْیاً ودرایةً ودَرَیاناً: پێـی زانـی بـەجۆرە فێڵێـك فێـری ئـەو شتە بوو.

دَرَیَ الصَّیْدَ: بۆ گرتنـی نێچیرەکە خۆی خـستە پـەنا ولاخێـك بۆئـەوەی نێچیرەکە هەسـت بـە ڕاوکەرەکـە نـەکا تـادەیگرێ دەگـوترێ: (دری

فلانا) فێڵی لە فلانکەس کردو هەڵی خەڵەتاند، (دری الرأسَ) سەری بەشانە داهێنا.

أَدْرَاهُ بە: پێی زاناند، فێری کرد.

دَارَاهُ: نەرمی لەگەڵ نواندو بەهێدیو لەسەرخۆیی لە گەڵی جولایەوە، خۆی لەشەڕی پاراست.

إدّرَتِ المرأةُ: ئافرەتەکە بەشانە قژەکانی داهێنان.

إدّرَتِ الصَّيدَ: موداراتی نێچیرەکەی کرد.

إدّرَت فلاناً: لەگەڵ فلانکەسدا هەڵیکردو خۆی لەگەڵ گونجاند.

الدَرِيَّةُ: ئەو جەستە وەهمییەی کە لەسەری فێری شیر وەشاندن دەبێ ٥ یان لەسەری فێری مستە کۆڵە وەشاندن (ملاکمة) دەبێ ٥ ولاخێکە راوکەر خۆی لە پەنادا حەشار دەدا بۆ ئەوەی هەل لەنێچیرەکە وەرگرێو بتوانێ گوللەی تێ گرێ یان بیگرێ ٥ بەتایبەتی نەچیری وەحشی.

اللا أدرية: بیرۆکەیەکی فەلسەفییە پێی وایە عەقڵ ج نرخێکی نیەو ناتوانێ شت بزانێ، بەلای زانا عەرەبەکانەوە بە تاقمێکی سۆفسطائی دەگوترێ.

المِدْرَیّ: شانەی گەورە ج لە دار یان لە ئاسن یان لەهەر مەعدەنێکی تر دروستکرابێ قژی ئاڵۆزکاوی پێ شانە دەکرێ ٥ شاخە حەیوان ٥ دەگوترێ: (نَطَحَهُ الثورُ بالمِدْرَی) کەڵەگا کێوییەکە شاخی تێهەڵدا ٥ (ك: مَدَارِ ومداری).

الدِّرياق: تریاق ٥ شەراب.

الدّرياقَةُ: بەمانا (الدّرياق) دێ.

الدَّسْتُ: دەستەجل ٥ سەرۆکی ئەنجومەن ٥ پلەی وەزیری ٥ یاری؛ دەگوترێ: (فلان حسن الدست) فلانکەس شەترەنج زانێکی باشە ٥ بردنەوەی یاری شەترەنج ٥ لە زانیاری هەندەسەدا ٥ بریتییە لە ئوسطوانەیەك دیوی ناوەوەی مادەیەکی زۆر گەرمی تێدابێ بۆ تواندنەوەی ئاسن.

الدَّسْتَةُ: گورزە شت ٥ بریتییە لە گورزەیەکی دوانزە پارچەیی وەکوو دەستە قەڵەم دەستە گورەوی دەستە پیل.

الدَّسْتَجَة: گورزە شت، دەستە شت، وەکوو دەستە قەڵەم ٥ گۆزەو کوپەیەکی گەورە بەدەست دەگوێزرێتەوە.

الدستور: یاسایەکی سەرەکیو بنەڕەتییە بۆ بەڕێوەبردنی وڵات دادەڕێژرێ بۆ ئەوەی بکرێتە سەرچاوەی یاساکانو یاسا ناسان لەژێر رۆشنایی ئەو دەستورەدا قانونەکان دارێژن ٥ دەفتەرێکە ناوی سەربازو موچەو ناونیشانیانی تێدا تۆمار دەکرێ ٥ بەلام لەسەردەمی تازەدا بەکۆمەڵە یاسایەکی بنەرەتی دەگوترێ کەشێوەو شێوازی حکومەتو فەرمانڕەوایی دیاری دەکاو دەسەلاتەکان سنوردار دەکا.

دَسَرَ الدِّسَار في الشيْئِ: بزمارەکەی بەزەخت بەشتەکەدا داکوتا.

دَسَرَ الشَّيْءَ: شتەکەی قایم کرد بەبزمار ٥ بەتوندی پاڵی پێوەنا.

دَسَرَ السفينةَ: کەشتییەکەی بە بزمار چاك کردو بەزەخت بزماری پێدا کوتا.

دَسَرَ فلاناً بالرمح: بەرمب زەبری کوشندەی لە فلانکەس دا ٥ دەگوترێ:

دَسَرَت السَّفينةُ الماءَ: کەشتییەکە بەهێز ئاوەکەی دڕدا ٥ هەروا دەگوترێ: (دَسَرَهُ البحرُ) ٥ دەریا پاڵی پێوەناو خستیە ناو شتەوە.

الدِّسارُ: بزمار ٥ هەروا حەبلێکە لە تویێکلی دار دروست دەکرێ پێی دەگوترێ: گوش ٥ لەو حەو پارچەی کەشتی پێ لێك دەبەسرێ، (ك: دُسُرٌ) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَحَمَلْنَاهُ عَلَى ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ﴾.

الدُّواسِرُ: شتی گەورەو زەبەللاحو بەهێز.

الدَّوْسَرُ: بەمانا (الدُّواسِر) دێ ٥ دەگوترێ: (رجل دَوْسَرٌ وَجَمَل دَوْسر وَأسرٌ دَوْسَرٌ).

الدَّوسَرُ: شتی کونو عەنتیکە ٥ دانەوێڵەیەکە گەنم رەنگە دەنکەکانی وردن تێکەڵاوی گەنم دەبێ ٥ پێشی دەگوترێ: (الدُّحرج).

الدَّوسَرَةُ: تاکی (الدَّوسَر) دەگوترێ: (كتيبة دَوْسَرَةٌ).

الدَّوْسَرِی: بەمانا (الدُّواسِر) دێ ٥

الدَّوْسرانيُّ: بەمانا (الدُّواسر) دێ ٥

دَسَّهُ دَسّاً ودَسيساً: شتەکەی شاردەوە دەگوترێ: (دسَّ الشَّيْءَ في التراب)٥

دَسَّ المكرَ: فێڵەکەی شاردەوە.

دَسَّ نَفْسَهُ في الأخيار وليس منهم: خۆی بەباش لەقەڵەم دا بەلام وانەبوو.

دَسَّ البَعيرَ: حوشترەکەی بەقەتران رەنگ کرد بەلام تۆخ نەبوو.

دَسَّسَهُ: بەمانا (دَسَّهُ) دێ.

إندَسَّ فلان الى فلان: بۆ موطاوەعەی (دَسَّهُ) دێ.

اندسّ فلان إلى فلان: فلان دێته لای فلان بۆ دووزمانی.

الدَّسَّاسُ: مارێکی کورتی سورباوه سەرو کلکی وەکوو یەك وایە نازانرێ لای سەری کامەیە، دەچێته ژێر گڵەوەو نایەوێ هەتاو لێی بدا ٥ دەگوترێ: (العِرْقُ دسَّاس) واته: رەوشتی باوکان دەگوێزرێتەوە بۆ منداڵەکانیان بەنهێنی دزە دەکەن بۆیان ٥ فیتنەو دووزمان ٥

الدَّسَّاسة: کەرە مار رەقە مار حەزی لەومیە لەژێر گڵدا خۆی حەشاربدا.

الدُّسَّة: یارییەکی منداڵە عەرەبە.

الدَّسِيسُ: شتی بزراو لەناو ئاگردا ٥ کەسێك خۆ هەڵکێشێ و بەشانازییەوە باسی کردەوە باشەکانی خۆی بکا ٥ کەسێك بکرێ بەسیخورو بەشەو بنێردرێ بۆ ئەوەی هەواڵ بزانێ بیانهێنێ ٥ دەگوترێ: (فلان دسیس قومە) فلانکەس جاسوسی گەلەکەیەتی.

الدَّسِيسُ: بۆگەنێك کە دەرمان لای نەبا ٥ (ك: دُسُسٌ).

الدَّسِيسةُ: فیتنەیی دوو زمانی ٥ رق و کینەی شاراوە دژی کەسانی تر.

دَسَعَ البعيرُ بجرّته دسعاً ودسوعاً: حوشترەکە کاوێژی کرد، خۆراکی ناوگەدەی هێنایەوە ناو دەمی و سەرلەنوێ جویەوە ٥

دَسَعَ الرجلُ بقَيئِهِ: پیاوەکە ڕشایەوەو رشوەکەی فرێ دا.

دَسَعَ فلانٌ: فلان رشایەوە.

دَسَعَ العِرقُ في اللحم: رەگەکانی جەستەی لەگۆشت دا گوم بوون.

دَسَعَ الشّئَ دسْعاً ودسعة: پاڵی پەشتەکەوەنا.

دَسَعَ الإناءَ: قاپەکەی پڕکرد.

دَسَعَ فلاناً: فلان بەخشیشێکی بەنرخی دا بەفلان.

دَسَعَ فلان: بەخشیشی باشی پێ دا.

دَسَعَ الجُحْرَ: شتێکی هەڵگرت بەئەندازەی زارکی کونەکەو بەو شته زارەکەی هاخنی.

ادّسَعَ البعيُ: بەمانا (دَسَعَ) دێ ٥

الدَّسِيعُ مِنَ الانسان: ئەو ئێسقانە گرێی گەردنی تێدایە ٥ شوێنی جیابوونەوەی مل لەشان.

الدَّسِيعَةُ: پێلوی گەورە ٥ سفرەی پڕ خواردەمەنی ٥ بەخششی باش و چاك ٥ هێزو توانا ٥ سروشت و ئەخلاق ٥ بنکی ملی ئەسپ ٥ (ك: دسائع).

المِدْسَعُ: دەربەند، بۆری خواردن و

خواردنەوە لە قورگی ئادەمیزاد.

**الْمِدْسَعُ**: چاو ساغو شارەزا بۆ ڕێگا.

**دَسِقَ الحَوضُ دَسَقاً**: حەوزەکە پڕبوو تا لە چواردەورییەوە ئاوەکە سەرڕێژی کرد.

**الدَّسَقُ**: سپیایەتی.

**الدَّسْقانُ**: ڕەوانەکراوو پەیامبەر، شالیار.

**الدَّيْسَقُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ**: سپی بریسکەدار ٥ دەگوترێ: (غدير ديسق، وسراب ديسق وخبز ديسق). ئاوی کەم کە قوڵایی نەبێ ٥ هەموو خشڵێکی زیوی سپی ٥ سینی زیو. ڕوناکی ٥ دەشتو سارای بەرین ٥ گوڵ ٥ پیرەمێرد ٥ قاپێکە، جامێکە کاتی خۆی عەرەب بەکاریان هێناوە ٥ جوانو شۆخو شەنگ ٥ سپییەتی ٥ ڕێگای درێژ ٥ حەوزی پڕ لە ئاو.

**الدَّسْكَرَةُ**: زەوی دەشتو تەختایی ٥ باڵەخانەی گەورە: کەبەدەورو بەریدا چەند خانوێکی خێزانی ناعەرەبی لێبێ ٥ لەو خانووە گەورەو باڵەخانەدا شەرابو شوێنی ڕابواردنی لێ بێ کە بەرواڵەت ئەو جۆرە باڵەخانانە پاشاو فەرمانڕەوای تێدا نیشتەجێ دەبێ ٥ شارەدێو گوندی گەورە ٥ (ك: دساكرة).

**دسم الأَثَرُ دَسَماً**: شوێنەوارەکە پێخوست کراو گوم بوو.

**دَسَمَ الشَّيْءَ**: زارکی شتەکەی بە تۆپەوانە بەست ٥ دەگوترێ: (دَسَمَ القارورة ونحوها): بەتۆپەوانە دەمی گۆزەکەی هاختنی.

**دَسَمَ البابَ**: دەرگاکەی داخست.

**دَسَمَ الجُرْحَ**: پلیتەی خستە ناو برینەوە.

**دَسَمَ المطرُ الأرْضَ**: بارانەکە کەمێك زەوییەکەی تەڕکرد.

**دَسَمَ البعيرَ دَسْماً**: بە ڕەنگی ڕەشی قەترانی حوشترەکەی ڕەنگکرد.

**دَسَمَ الشَّيْءَ دَسَماً**: شتەکەی چەور کرد ٥ پیسیوپۆخەڵی داپۆشی ٥ تۆزو خۆڵ داپۆشی بەجۆرێك ڕەنگی ڕەش بێ، دەگوترێ: (فلان دِسمَ الثياب) فلانکەس پۆشاکی ڕەشە ٥ (وأدسم الثوبِ) عەیبو لەککە لەناپینو پیاوەتی دا هەیە.

**أدْسَمَ القارورَةَ**: دەمی گۆزەکەی هاختنی.

**دَسَمَ الطَّعامَ**: چەوری کردە ناو خواردەمەنییەکەوە.

**دَسَمَ اللُّقمةَ**: پارووەکەی لە ڕۆنەکە هەڵسو.

دَسَمَ المطرُ الأرضَ: زەوییەکەی کەمێ تەرکرد.
دَسَمَ ثیابَهُ: بەچەوری پۆشاکەکەی چڵکن کرد.
تَدَسَّمَ: چەوری خوارد.
تَدَسَّمَ الطعامُ: خۆراکەکە چەور بوو.
تَدَسَّمت الثیابُ: پۆشاکەکە چڵکن بوو.
الدِّسام: تۆپەوانە؛ زارکی گۆزەو کۆلینەی پێ دەماخندرێ.
الدَّسْمُ: لایەنێکی شت، دەگوترێ: (هو علی دسم الأمر) ئەو لەسەر لایەنێکی ئەو شتەیە.
الدَّسَمُ: رۆنو چەوری گۆشتو پیو ٥ گۆشتو پیو ٥ چڵكو پیسی.
الدُّسْمَةُ: ئەوشتەی کونی کوندەو شتی وای پێ دەگیرێ ٥ رەنگی بۆر بەلای رەشی دا بروانێ ٥ پیاوی خوێڕیو هەتیو مچە ٥ زلی بێ هونەر ٥ دەگوترێ: (ماهو إلا دسمة لاخیر فیه).
الدَّسیم: کەسێك زۆر یادی خودا بکا.
الدَّیْسَمُ: رەش ٥ تاریکی ٥ هاوڕێی دڵسۆز لەکارو پیشەدا ٥ ورچ ٥ بێچووە ورچ ٥ ڕێوی.
الدَّیْسَمة: گەردیلەو زەرە.
دَسَا دسْوَةً: کەم بوو، بچوك بووە (پێچەوانەی گەشەکردنو زۆربون).
دَسَا الرجلُ: پیاوەکە خۆی شاردەوە.
دَسَا فلان: فلانکەس گومڕاو فاسید بوو لەڕێی ڕاست لای دا.
دَسَّی نفسَهُ: نەفسی خۆی ئیهمال کردو خۆی شاردەوە خۆی دەرنەخستو بەهرەکانی خۆی نەنواندن نەوەکوو پێی بزانن‌و کاری شیاوی بخەنە ئەستۆ ٥ نەفسی خۆی گومڕا کردو سەری لەخۆی شێواند.
دَسَّی غیرَهُ: کەسانی دیکەی گومڕاکردن‌و سەری لێ شێواندن.
دسَّی عنه حدیثاً: حەدیثی لێ وەرگرتو ڕیوایەتی کرد.
تدسَّی: گومڕابوو، فاسید بوو.
الدَّشْتُ: سارا ٥ کۆمەڵە کاغەزێك ناڕێكو یێك بن ٥ پەڕەکاغەزی ئیهمال کراو.
دَشَّ فلان في کلامه دشّا: زۆری قسەکرد.
دَشَّ في الارض: بەناو زەوی دا گەڕا.
دشَّ الدَّشیشةَ: پەلوی دروستکرد (خواردنێکە لەئارد دروست دەکرێ).
دَشَّ الحَبَّ: دانەوێڵەکەی هاڕی.
الدُّش: دۆش، شتێکە زۆر کونی تێدان دەکرێ بە بۆری حەمامو شوێنی تەرەوە بۆئەوەی ئاوەکە لەکونەکانەوە بەبلاوی بێتەدەرێ.
بەعەرەبی دوناوی تری هەن: (اَلمِشَنُّ، الثجّاجُ).

**الدَّشيشة**: پەلو، چێشتی گەنمە كوتاو.

**دَعَبَ دَعْباً**: قسەی سوعبەتی كردن، قسەی خۆش‌و پێكەنین هاوەری كرد.

**دَعَبَ الشَّيْءَ**: شتەكەی پالنا، پالی پێوەنا، دەگوترێ: (ريح داعِبَةٌ): رەشەبایەكی بەهێزە هەموو شتێك رادەدا ٥ دەگوترێ: (رياح دواعِب).

**دَعَبَ**: ئەحمەقی كرد، (هو أدعب وهي دعباء).

**أدْعَبَ**: لەقسەكانی دا قسەی گاڵتەو سوعبەتی كردن.

**داعَبَهُ**: قسەی خۆش‌و سوعبەتیان بۆیەكتری كردن.

**تداعَبَ القومُ**: قسەی خۆش‌و سوعبەت ئامێزیان بۆیەكتری كردن. هەروا دەگوترێ: (إنه ليتداعب على الناس): ئەوبەقسەی خۆش‌و سوعبەت‌و خۆ بەزلزانی سواری ملی خەڵك بووەو خۆی بەسەردا سەپاندون.

**تدعَّبَ عليه**: نازو نوزی بەسەردا كرد.

**الدَّاعِبُ**: فیچقەكەر ٥ دەگوترێ: (ماء داعب): ئاوێكی فیچقەكەرە ٥ بەتەوژم دەردەچێ.

**الدَّاعِبَةُ**: راماڵەر، رادەر ٥ دەگوترێ: (ريح داعبَةٌ): رەشەبایەكی بەهێزە هیچ شتێك خۆی لەبەرناگرێ‌و رایدەدا.

**الدُّعابَةُ**: یاری‌و سوعبەتكردن ٥ ئەحمەقی كردن‌و گێلی نواندن.

**الدَّعَّابُ**: پیاوی سوعبەتچی‌و دەم بەپێكەنین ٥ دەگوترێ: (رجل دَعَّابٌ): پیاوێكی قسە خۆش‌و سوعبەتچی یە.

**الدَّعَّابَةُ**: بەمانا (الدَّعابُ) دێ.

**الدُّعْبُبُ**: یاری ٥ كەسێك زۆر سوعبەت‌و یاری بكا ٥ كوڕی گەنجی تازە پێگەیشتوی پێست تەڕو تازە ٥ گۆرانی بێژی چاك ٥ ترێ ڕێویلكە.

**الدُّعْبُوبُ**: پیاوی گورج‌و گۆڵ‌و بەنیشات ٥ ئەحمەق‌و گێل ٥ كورتە باڵاو ناشیرین‌و خوێڕی، ئادەمیزادی لاوازو هیچ‌و پوچ: كە بوبێتە گاڵتەچی خەڵك ٥ ئەسپی درێژ ٥ جۆرێكە لەمێروی ڕەش باو ٥ ڕێگای تەختكراو ئاشكراو ئاوەدان ٥ شەوی تاریك‌و نوتەك.

**دَعَثَ** التراب في الأرض دعثاً: گڵەكەی بەقاچ وردو هاڕكردو كردییە خۆڵەپەتە.

**دَعَثَ** به الأرْضَ: بەزەوی دا كێشا.

**دَعِثَ دَعَثاً**: گرژی‌و لەش داهێزاوی‌و سەرئێشەو نارەحەتی سەرەتای نەخۆشی بوو.

**دُعِـثَ**: بـەمانای (دَعِـثَ)دێ ٥ (هــو مَدْعُوث).

**أدْعَثَ في الشرِّ وغيره**: لـە شـەڕەکەوە گلاو تێیدا ڕۆچو.

**أدْعَثَ الشَّيْءَ**: شتەکەی هێشتەوە.

**إنْدَعَثَ**: بۆموطاوەعەی (دَعَثَ)دێ.

**تَـدَعَّثَتْ صـدورهم**: دوژمنایـەتیو ڕقو کینەی خۆی شاردەوە.

**الدَّعَثُ**: بەمانا (الدَّعْثُ)دێ.

**الـدِّعْثُ**: ڕقو کینـە ٥ داواکـاری ٥ تۆڵەسەندنەوە ٥ پاشماوەی ئاو، (ك: أدعاث ودِعاثٌ).

**دَعْثَـرَهُ**: بـەزەوی دا داو کوشـتی ٥ لەحەدیث دا هاتووە: (انه ليدرِكُ الفارسَ فيدعثره).

**دَعْثَرَهُ**: شکاندی.

**دَعْثَـرَ الحـوضَ وغيره**: حەوزەکـەی ڕوخاند.

**الدُّعْثُرُ**: ئەحمەقو گێل.

**الـدِّعْثَرُ مـن الجِمـال**: حوشـتری ئـازاو بەهێز.

**الدُّعْثُورُ**: چاڵو کەنـدەڵان ٥ حەوزێـك قەراخـەکانی جوانو ڕێـكو پێـك هەڵنەچنرابێ ٥ حەوز یان خانوی ڕوخاوو کەلاوە.

**الدُّعْثُورُ من النِعم**: نازو نیعمەتی زۆر، (ك: دعاثير).

**دعِجَتِ العَيْنُ دَعَجاً ودُعْجَةً**: ڕەشێنەی چـاوی زۆر ڕەشو سـپێنەکەی زۆر سپیو چاوگەورە ٥ (هو أدعج وهي دعجاء).

**الأدْعَـجُ**: دەگـوترێ: (لیـل أدعـج) شەوێـکی زۆر تاریـكو بەیانیەکـەی ڕوناك بێ ٥ (رجُلٌ أدعج): پیاوێـکی ڕەش پێـست ٥ دەگـوترێ: (رجـل أدعج اللون).

**الدَّعجاءُ**: دەگوترێ: (شفة دعجاء ولِثة دعجـاء): لێوێـکی ڕەشـباو، پـوکی ڕەشباو ٥ ناوێـکە لەناوەکانی شێت ٥ هـەروا وشـەی (الـدعجاء) بەیەکـەم شـەوی شـەوەکانی مـەحاقی مـانگ دەگـوترێ واتـە: شـەوی بیـستو هەشتی مانگ ٥ نالی دەڵێ:

لەدەوری تۆیە ئەی خورشیدی پڕتەو بەخشی شەوگەردان
کـەنالی وا لەحالـەتی مـەحاقی مـاهی نـەو دایـە

**المَدْعُوجُ**: شێتو کاڵفام.

**داعْ** داغ وداعِ داعِ: وشـــەیەکە بـــۆ بـانگکردنی مـەڕو بـزن یـان بـۆ دەرکردنو ڕاونانیان.

**دُغْ** دُغْ: فـــەرمانکردنی شـــوانە بـــە مەڕەکانی کە چیتر بارەبار نەکەن.

**دَغْ** دَغْ: وشـەیەکە بەمانـدوو شـەکەت دەگـوترێ مەبەسـت ئەوەیـە هەڵـسە تـۆزێ هـەوا هەڵمـژە ئـارامی بـدەرە گیانت.

**دَعْدَعَ دَعْدَعَةً ودعداعاً**: بازی داو کەوتە راکردن بەلام بەهێواشیو پێچاو پێچ.

**دَعْدَعَ بالغنم**: بانگی لەمەڕو بزنەکانی کرد، یان ڕاوی نانو دەری پەڕاندن ٥ دەنگی لێ کردن بەوشەی (دَاعْ دَاعْ).

**دَعْدَعَ الوعاءَ**: تەنەکەکە یان قسناغەکەی راوەشاند بۆئەوەی شتە پێوراوەکەی ناوی باش پاڵ لێك بدا، بیەستێوریو زۆرتر لەوشتە بگرێ.

**دَعْدَعَ الشَّيْءَ**: شتەکەی پڕکرد ٥ دەگوترێ: (دَعْدَعَ السيلُ الواديَ): لافاوەکە دۆڵەکەی پڕکرد.

**تَدَعْدَعَ**: وەکوو پیرەمێرد ڕۆیی، وەکوو پیری لەرزۆكوپشت کۆماوە بەرێگادا ڕۆیی.

**الدَّعْداعُ من الرجال**: پیاوی قەزەمو کوڵەبنە ٥ هەروا دەگوترێ: (سَعْيٌ دعداع): ڕۆیشتنێکە تەمبەڵیو قۆرتو پێچی تێدایە.

**الدَّعْدَعُ من الأرض**: زەوی روتەنو بێ درەختو گیا، (ك: دعادع).

**دَعَرَ دعارةً**: فاسقو بێ ڕەوشت بوو، (هو داعِرٌ ودَعَّار).

**دَعِرَ العودُ**: چڵەدارەکە دوکەڵی کردو ئاگری لێ نەبووەوە ٥ (فهو دَعِرٌ ودُعَرٌ).

**دَعِرَ الزَّنْدُ**: چەند جارێك دەنکە شقارتەکەی لێداو سەرەکەی سوتاو گڕی نەگرتو هەڵنەگیرسا.

**تَدَعَّرَ وَجْهُهُ**: دەمو چاوی پەڵە پەڵە بونو ڕەنگی پێستی گۆڕا.

**الداعرة**: ئافرەتی بەدڕەوشتو داوێن پیس ٥ دارخورما کە قبوڵی موتوربەکردن نەکا، (ك: مَدَاعِر).

**الدَّعَارة**: فیسقو فوجورو بەدڕەوشتی.

**الدِّعارَةُ**: دەگوترێ: (في خلقه دِعَارَة): لەڕەوشتی دا خراپیو پیسی هەیە.

**الدُّعْرُ**: مۆرانە، کرمێکە دار دەخوا، خەم خۆرکە.

**الدُّعَرُ**: (رجل دُعَرٌ): پیاوێکی خائینو دڵ پیسە ڕەخنەی روخێنەر لەهاوەڵەکانی دەگرێ ٥ پیاوێکە بێخێرو بێرە.

**الدُّعَرَةُ من الرجال**: بەمانا (الدُّعَرُ) دێ.

**المَدَاعِيرُ**: کۆمەڵی بەد ڕەوشتان.

**الدُّعْرورُ**: دەرون پیسی ناکەس بەچە کە هەمیشە ڕەخنەی بێ جێ لەهاوەڵانی دەگرێ.

**دَعْرَمَ**: هەنگاوی کورتو خێرا خێرای هاویشتن ٥ ڕەخنەی بێ جێ لەهاوەڵانی دەگرێ.

**الـدِّعْرِمُ مِـن الرِجّـال وغيرهـم:** پيـاوی كوڵەبنـــەی ناشـــيرين ٥ ناپيـــاوی خوێڕی دەمپيس.

**دَعَـسَهُ دَعْـساً:** بـەرمب لێـی داو ونجـڕ ونجڕی كرد.

**دَعَـسَ الـشَّیْئَ:** شـتەكەی ژێـر قاچـی داو پانی كردەوە.

**دَعَـسَ الوعـاءَ:** زەرفەكـە يـان قاپەكـەی پڕكرد.

**دَعَسَ القصابُ الـشاةَ:** قەسابەكە لـەكاتی گـــورينی كوشـــتييەكەدا دەســـتی بـەنێوان پێـستو گۆشـتی دا بـردو پێـــستەكەی لەگۆشـــتەكەی جيـــا كردەوە.

**أدْعَسَهُ الحرُّ:** گەرما كوشتی.

**داعَسَهُ:** رمبی لـێ دا.

**الدَّعْسُ من الطـرق:** ئـەو رێـگايەيە كـە زۆر ئاوەدان بێو ئادەميزادو ئـاژەڵی پێـدا بـڕۆنو بــەهۆی زۆر پێــدا رۆيشتنەوە خۆڵە پەتەی لـێ پەيدا بووبێ.

**الـدِّعْسُ:** لۆكـە ٥ كلـۆ لـب كـە يـەكتری گرتبێوخڕبێ.

**الدَّعِيس من الرجال:** پيـاوی ئـازاو چـاو نەترس لەشەڕو تەنگانەدا.

**الْمُـدَّعَسُ: (مُـدَّعَسُ القـوم):** شـوێنی نانكردنو چێشت لێنانی هۆزو خێڵ لەساراو لادێكان دا.

**المِــدْعاسُ مــــن الطـــرق:** بـــەمانا (الدعْـسُ)دێ.

**المِدْعاسُ من الرماح:** شمشێری ئەستور كە چەمانەوەی نەبێ.

**الْمَـدْعَسُ:** باڵندەيـەك خرابێتـە نێـو قەفـەزو تـۆڕەوە بۆئـەوەی باڵنـدەی تـری پـێ هەڵخەڵەتێو بكەونـە نـاو تۆڕەكەوە.

**المِدْعَسُ:** بەمانا (المِدْعاس) دێ.

**المُدْعَسُ من الرجال:** پيـاوی ئـازاو رمـب وەشـێن ٥ هـەروا بـۆ ئـافرەتيش دەگـوترێ: (امــرأة مِــدْعَسٌ)، (ك: مداعس).

**المَدْعوسُ من الطـرق:** بـەمانا (الـدَّعْسُ) دێ.

**دَعَــصَ برجلــه دعــصاً:** قاچـی لـەرزینو شەپلەی لێدا.

**دَعَصَ فلاناً:** فلانكەسی كوشت.

**دَعَصَ بالرمح:** بەرمب لـێی دا.

**أدْعَـصَ:** قاچـی بلۆقيـان كـرد بـەهۆی گەرمی لمبەلانەوە.

**أدْعَصَ فلاناً:** فلانكەسی كوشت.

**أدعــص حَـرُّ الرمـضاء فلانــاً:** گـەرمای لمبەلانەكە تينی بۆ فلانكەس هێنـاو لەناوی برد.

**أدعــص المــوتُ فلانــاً:** مـردن لـەناكاو

بەخەی فلانکەسی گرتو مۆڵەتی نەدا.

**داعَصَهُ**: لەناکاو پەلاماری دا.

**تَـدَعَّصَ اللحمُ**: گۆشتەکە ڕزیو هەڵوەری.

**إندَعَصَ الميتُ**: مردوەکە بۆگەنی کردو ڕزی.

**الدَّعْصُ**: کڵۆ لمێکی خڕە کە یەکتری گرتبێ، (ك: دِعْصة وأدعاص).

**الدَّعْصاءُ**: زەوییەکی دەشتە کە هەندێ شوێنی لمەلان بێ بەخۆر سور ببێتەوەو لمەلانەکەی لەشوێنەکانی تری گەرمتر بێ.

**الدِّعْصَةُ**: بەمانا (الدِّعْصُ) دێ، (ك: دِعَصٌ).

**المِدْعَصُ**: دەگوترێ: (رجل مِدعَصٌ بالرمح): پیاوێکی رمب وەشێنی ئازایە ٥ هەروا وشەی (مِدْعص) بەخودی رمبەکەشی دەگوترێ، (ك: مُداعِص).

**دَعَّهُ دعًّا**: بەتەوژم پاڵی پێوەنا، بەشێوەی رەقو ناشرین بەرەو روی بۆوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَذَلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ﴾.

**أدَعَّ**: خێزانی وردەی زۆر بوو.

**الدَّعاع**: خێزانی وردەی پیاو کە جگە لە خواردن هیچ ئیشێکی تریان پێ نەکرێ.

**دَعَقَت الدوابُ الطريقَ دَعْقاً**: ئاژەڵو وڵاخەکان هێندە بەو ڕێگایەدا رۆیشتن شوێن پێی خۆیان لە ڕێگاکەدا دەرکەوتو خۆڵە پەتەیان لێ پەیدا کرد.

**دَعَقَت الإبلُ الْحَوْضَ**: حوشترەکە چەپۆکی لەحەوزەکە دا کەلێ تێکرد ٥ یان حوشترەکان هاتنە سەر حەوزەکەو پاڵە پەستۆیان کرد.

**دَعَق** الفارسُ الفَرَسَ: سوارەکە ئاوزەنگی لەئەسپەکە دا بۆ ئەوەی خێرا بڕوا، غار بکا ٥ یان کەمێ لغاوی گرتەوە ئەمجار بۆی شل کرد بۆئەوەی بکەوێتە غاردان.

**دَعَق** عليهم الخَيْلَ: لەهەڵمەتو پەلامارەکەدا بەسواری ئەسپ هێرشی کردە سەریان.

**دَعَق** الماءَ: ئاوەکەی هەڵقوڵاند.

**دَعَق** الغارةَ: هێرشەکەی بەرفراوان کردو پێشی خست.

**أدْعَقَ**: هەڵاتو بازی هاویشت.

**أدْعَق الفَرَسَ**: ئاوزەنگی لەئەسپەکەدا بۆئەوەی خێرا بڕواو غاربدا.

**أدْعَق إبلَهُ**: حوشترەکەی بەرێ کرد بۆ لەوەڕگا.

**الدعْقَةُ**: کۆمەڵە حوشتر سوارێ ٥ پەلامارو هاوارو هەراو هۆریا ٥ ڕێژنەبارانی بەتەوژم.

**اَلْمَداعِقُ مَداعِقُ الوادي:** سەرانسەری شیوو دۆڵ.

**اَلْمَداعِيقُ خَيْل مداعيق:** کۆمەڵە ئەسپ سوار کەدەچنە ناو دوژمنەوەو دوژمن دەخەنە ژێر پێی ئەسپەکانیان.

**اَلْمَدْعَقُ، مَدْعَقُ الماء:** شوێنی هەڵقوڵانی ئاو.

**اَلْمَدْعُوقَةُ:** دەگوترێ: (أرض مدعوقة): زەوییەکە رێژنە بارانێکی گەورەی بەتەوژمی لێ درا.

**دَعَكَ الجلدَ دَعْكاً:** پێستەکەی شێلاو دەستی رێ خستو نەرمی کرد.

**دَعَكَ الثَوْبَ باللبس:** پۆشاکەکەی ئەوەندە لەبەرکرد تا دەقی شکاندو زبرییەکەی نەماو نەرم بوو ◦ هەروا دەگوترێ: (دَعَكَ الخَصْمَ): دوژمنەکەی مل کەچو زەلیل کرد.

**دَعَكَ فلاناً في التراب:** فلانکەسی لەگڵو خۆڵەکە وەردا، لە قوڕاوی وەردا.

**دَعَكَ بالقول:** بەقسەی ناخۆش ئێشی پێ گەیاند.

**دَعِكَ دَعَكاً:** گێلو ئەحمەق بوو، رەوشتی ناشیرینی نواند ◦ (هو داعك، وداعكة): بۆ نێرو مێ.

**داعَكَهُ:** ماتڵی کرد ◦ کێشەیەکی دژواری بۆنایەوە.

**تَداعَكَ القومُ في الحرب:** خەڵکەکە لەشەرو هەرادا شارەزا بون ◦ کێشەو نیزاع لەناویان دا پەرەی سەند.

**الدَّعِكُ:** نوزە درێژو ریخۆڵە بەکێشو فێرسیچمە.

**الدُّعَكُ:** قالۆنچە ◦ دەگوترێ: (رجل دُعَك): پیاوێکی زەعیفو هیچو پوچو گاڵتە چییە.

**الدُّعْكَةُ:** کۆمەڵە حوشتر سوار، گاڕانە حوشتر.

**المِدْعَكُ:** ماتڵ کەرو کێشە خەرەوە.

**اَلْمَدْعُوكُ من الأراضي:** ئەو زەوییەی زۆری حوشترو خەڵک لێ بوو بەهۆی قەرەباڵغییەوە زەوییەکە وێران بووبێو کەڵکی کشتو کاڵی پێوەنەمێنێ.

**دَعَلَهُ دَعْلاً:** بەنەخافڵ فێڵی لێ کرد.

**دَاعَلَهُ:** هەڵی خەڵەتاندو فێڵی لێ کرد.

**الدَّاعِلُ:** هەڵهاتوو فیرار.

**دَعْلَجَ:** رارا بوو لەهاتوو چون، زۆر هاتوو چوی کرد.

**دَعْلَجَ الجُرَزُ:** جرجەکە هاتوو چۆی کرد.

**دَعْلَجَ الصَبِيُّ:** منداڵەکە هاتووچۆی کرد ◦ دەگوترێ: (فلان يُدَعْلِجُ إلى دار فلان بالليل): فلان شەوانە زۆر هاموشۆی ماڵی فلان دەکا ◦ یاری منالانە (چاوشارکێ)ی کرد.

**دَعْلَجَ اللَّيلُ:** شەو تاریک بوو.

**دَعْلَجَ الشَّيْءَ:** شتەکەی زۆر خولاندەوە، زۆری لێ وەرگرت.

**دَعْلَجَ الماءَ في الحَوْضِ:** ئاوەکەی لە حەوزەکەدا کۆکردەوە.

**الدَّعْلَجُ:** ئەوکەسەی بەبێ ئیش‌وەمەبەست دێو دەچێ ٥ زۆرخۆر چ ئادەمیزاد بێ چ گیانلەبەری تر ٥ گەنجی قۆزی شۆخو شەنگو نەرمو نۆڵ ٥ روەکێك بەسەر یەکدا تێك چرژابێو تێك هالاَبێ ٥ گوێدرێژ ٥ گورگ ٥ حوشترێك لێی خورێ نەڕوا ٥ تاریکی ٥ جەوالی پڕ.

**الدَّعْلَجَةُ:** تاریکایی ٥ یاری منداڵان (چاوشارکێ)و تێکەوە هاویشتن.

**دَعَمَهُ دَعْماً:** پاڵپشتی کردو کۆڵەکەی بەردا بۆئەوەی نەهێڵێ بکەوێ ٥ دەگوترێ: (دَعَمَ فلاناً): پشتگیری فلاّنی کرد.

**دَعَّمَهُ:** بەهێزی کردو جێگیری کرد.

**ادَّعَمَ:** پشتی بەکۆڵەکەوە دا ٥ دەگوترێ: (ادَّعَمَ على العصا): خۆی بەسەر عەصاکەدا دا.

**تداعَمَتْ الأمور:** کارەکانی زۆر بونو شانو ملیان گرتو گەلەکۆمەکیان لێ کرد.

**الأدْعَمُ:** ئەوەیە بەسنگییەوە یان بە گەردنیەوە خاڵێکی سپی هەبێ ٥ دەگوترێ: (فرسٌ أدعم): ئەسپێکی مل بەڵەکە یان سینگ بەڵەکە.

**الدِّعامُ:** کۆڵەکە ٥ داری رایەڵکراو بۆ کەپرە مێو.

**الدِّعامَةُ:** کۆڵەکەی خانوو، ئەوەی قورسایی خانوەکەی لەسەرە ٥ دەشگوترێ: (هو دعامة الضيف) پارمەتیدەری میوان ٥ (دِعامة القوم): سەرەك خێڵو پشتو پەنای هۆز ٥ (هو من دعائم الأمور): هەموو کارەکان بەوەوە پەیوەستن ٥ (الدّعام والدعامتان): ئەو دوو دارەی کە چەرخە (بەکرە)کەی پێوەیە.

**الدَّعْمُ:** هێز ٥ ماڵی زۆر ٥ رۆن ٥ دەگوترێ: (لفلان دعم ولا دعم بفلان) فلاّنکەس نە هێزەی هەیە نە رۆن ٥ (فلانة ذات دعم): فلاّن هەر بەزو گۆشتە.

**الدُّعْمَةُ:** بەمانا (الدّعام) دێ.

**الدُّعْمِيُّ:** شتێك کە قورسایی زۆری قەبارەیەکی لەسەر بێ ٥ دارتاش.

**الأدْعَمُ من الطريق:** زوربەی رێگا یان ناوەراستی رێگا.

**المُدَّعَمُ:** پشتو پەنا ٥ دەگوترێ: (لا مُدَّعَمَ لفلان): فلاّنکەس هیچ پشتو پەنای نییە ٥ هەروا دەگوترێ:

(بيــت مــدعوم): خانوێــکه خەرێکــه بکەوێو کۆڵەکەی بەردراون بۆئەوەی نەڕوخێ.

**دَعَـنَ** دَعَانَـةً: رايبـوارد، سەيرو سەفای کرد.

أدْعَنَ الدّابّةَ: هێند سواری وڵاخەکە بوو تا بەهیلاکی برد.

الدَّعِنُ: بەدڕەوشت ◦ بەدخۆراك.

الدَّعَنُ: ئەوکەسەی سەرگەرمی گاڵتەو گەپو رابواردنە.

المُدْعَنُ: بەمانا (الدَّعِنُ) دێ.

**دَعَا** بالشَّيْءِ دعواً ودعوة ودعاءً: داوای ئامادە بوونی شتەکە (کەسەکە)ی کرد ◦ دەگوترێ: (دعا بالكتاب): داوای کرد کتێبەکەی بۆ بهێنن.

**دَعَـا** الشَّيْءُ إلى كذا: ئەوشتە پێویستی بەوە هەیە وەکوو بڵێی ئەو خۆراکە پێویستی بەناوی زۆرە ◦ هەروا دەگوترێ: (دَعَت ثيابُه) پۆشاکەکەی کۆن بوو رزی پێویست بوو جلی تر بکرێ لەبەری بکا.

**دَعَا** الطِّيبُ أنفَهُ: بۆنی کردو هەوڵی دا بەدەستی بێنێ.

**دَعَـا** فلانـاً: بـانگی فلانکەسـی کـرد ◦ دەگوترێ: (دَعا الميتَ): باوکە رۆ، برا رۆ، رۆڵە رۆی کرد.

**دَعَـا** اللّه: هیـوای خێـرو لێخۆشـبوونی لەخودا هەبوو.

**دَعَا** لفلان: هیـوای خێـرو خۆشـی بـۆ فلانکەس خواست.

**دَعَا** على فلان: داوای شەڕو بەڵای بۆ فلانکەس کرد.

**دَعَا** بزيدٍ وزيداً: منداڵەکەی بەناوی زەید ناوزەد کرد.

**دَعَـا** إلى الشَّيْءِ: بانگەوازی بۆئەو شتە کـردو هـەوڵی دا ئـەنجامی بـدا ◦ دەگوترێ: (دعـا إلى القتـال) و (دعـا إلى الصلاة) و (دعـاه إلى الإنـضمام للحـزب) هـەڵینا پەیوەنـدی بـە پارتـەوە بکـاو خـۆی بکـا بـە یـەکێ لەئەندامانی پارت.

**دَعَا** القومَ دعاءً: بـانگی خەڵکەکەی کرد کەلای ئەونان بخۆن.

داعى البناءَ: باڵەخانەکەی روخاند.

**دَعَـا** فلانـاً: دەمەدەمێو کێشەی لەگەڵ فلان دا کرد.

دَعَّى في الضرع: هەندێکی شیر لەگوانی ئاژەڵەکـە دا هێـشتەوە هـەمووی نەدۆشی، جۆڕ بڕی نەکرد.

ادّعى في الحرب: لەشەڕدا نـاوی خـۆیو بـاوكو بـاپیری راگەیانـد وتـی: مـن فلانی کوڕی فلانم!.

ادّعى الشَّيْءَ: ئاواتە خوازی فلان شت بوو بۆی ببێ.

إدّعى فلاناً: فلانكەس وای لەفلانكەس كرد پاڵ باوكی خۆی نەدرێ.

ادّعـى علـى فـلان كـذا: شتی پـاڵ فلانكەس داو كێشەی لەگەڵ نایـەوە ٥ لە حەدیـثدا هـاتووە (البینـة علـى من إدّعى واليمين على من انكر).

اندعى: وەڵامی بانگكردنەكەی دایـەوە ٥ دەگـوترێ: (لـو دُعِينـا لا نـدعينا): ئەگەر دەعوەت بكرێین دەچین.

تداعى القومُ: خەڵكەكە یەكتریان بانگ كرد تا هەموویان كۆبونەوە.

تـداعى القـومُ علـى فـلان: خەڵـكەكە گەلەكۆمـــەكیان لـــەفلان كـــردو یەكتریان گرت دژی ئەو.

تداعى القومُ بالرحيل: خەڵكەكە بانگی یەكتریان كرد بەوەی خۆ ئامادەكەن بۆ بەرێ كەوتن‌و گواستنەوە.

تـداعى النـاسُ بالألقـاب: خەڵـكەكە هەندێكیان بەنازناوو لەقەب بـانگی یەكتریان كرد.

تـداعى القـومُ بالأحـاجي: خەڵـكەكە هەندێـــكیان لەگـــەڵ هەندێـــكیان كەوتنـە بەڵـگە هێنانـەوەو قـسەو باس.

تـداعى الـشَّيْئُ: شـتەكە درزی بـردو خەریكـــە بڕۆخـــێ‌و وەرگـــەرێ ٥ دەگـوترێ: (تـداعى البنـاءُ بالـسقوط) باڵەخانەكـــە خەریكـــە بكـــەوێ ٥ (تـداعى الحـائط) دیوارەكـە شـەقی بردوە خەریكە بكەوێ.

تداعَتْ ابلُ بني فـلان: كاڕانـە حوشـتری فـلان هـۆز كـزو كۆڵـەوار بـون‌و خەریكە لەناو بچن.

تداعى الثوبُ: پۆشاكەكە كۆن بوو.

تداعى في الحَرْب: لەشەڕا نەڕاندی‌و وتی مـن فلانـی كـوڕی فـلانم ٥ مـن مەمەنـــدە فیـــتم، مـــن سـەلیم شیوەكەڵیم.

تَدَعَّتِ النائحة: ئافرەتـە شین گێڕەكە لـەكاتی لاواندنـەوەو پێـدا هەڵـدانی مردووەكە دەنگی خـۆی لەرانـدەوەو پێی لـێ هەڵبڕی.

اسـتدعاهُ: بـانگی كـرد، داوای لـێ كـرد ئامادەبێ، ئەركی خستە سەرشانی ٥ داوای كـرد بـۆی بـانگ بكـەن ٥ یـان كارێـكی كـرد شیاوی ئـەوەبێ داوای لە دژ تۆمار بكرێ.

الأدْعُوَّةُ: بەڵگەو دەلیل.

الأُدعِيَّـــةُ: بـــەمانا (الأُدْعُـــوَّةُ)دێ ٥ دەگـوترێ: (بينهم أدعية يتداعون به): بەڵگەیەكیان پێیە كە بۆ داواكەیان بیخەنـە كـار هـەروا لـەخۆوە ئـەو قسەیە ناكەن.

الإدّعَـــــاءُ: لـــــەزاراوەی یاســـــادا

ناراستەکردنی داوایە دژی بەرامبەر لەبەردەم دادوەرو قەضادا.

**الدّاعي**: هۆکار ٥ (داعي اللبن): ئەوەیە هەندێک شیر لەگوانی ئاژەڵەکەدا بهێڵیتەوە بەتەواوی جۆرە بڕی نەکەی بۆئەوەی شیری تری بێتەوە.

**الدّاعِيَةُ**: بانگخواز، ئەوکەسەی بانگەوازی دەکا بۆ ئاینێک خەڵکی هەڵدەنێ بۆئەوەی بێنە ژێر خێمەی ئەو ئاینەوەو پابەندبن پێیەوە (پیتی (ت) کە بە پیتی هێ نوسراوە بۆ موبالەغەیەو بۆ تەئنیث نییە) ٥ کەسێک بانگەشەی سەروەری بۆخۆی بکاو لەڕاستی دا گەندەڵو پڕو پوچ بێ ٥ سەبەبو هۆکار ٥ دەگوترێ: (هو داعية إلى كذا): ئەوە هۆکارە بۆ ئەو ٥ ئەو بڕە شیرەی لەگوانی ئاژەڵدا دەهێڵرێتەوە بۆئەوەی شیری تری بێتە پاڵ، (ك: دواع) ٥ هەروا دەگوترێ: (أصابته دواعي الدهر): بەڵاو کارەساتی ڕۆژگار لێی دا ٥ بەمانا خودی بانگەوازیش دێ وەکوو دەگوترێ: (دعاه بداعية الإسلام): واتە: (بدعوة الإسلام).

**الدُّعاءُ**: پاڕانەوەو لاڵانەوە لەخودای مەزن، (ك: أدعية).

**الدَّعاوَةُ**: بەمانا (الإدّعاء)ە.

**الدِّعايَةُ**: بانگەوازیو بانگەشە بۆ مەزهەبو پارتێک بەنوسینو وتاردانو ئەوجۆرە شتانە.

**الدَّعّاءَةُ**: کەسێک زۆر دوعابکاو پاڕانەوەو لاڵانەوەی لەخودا زۆر بێ.

**الدَّعْوَةُ**: بانگ کردن بۆنانخواردن ٥ بانگکردن بۆ وەرگرتنی بەخشیش ٥ بەمانا (الإدّعاء)یش دێ.

**الدَّعوى**: داوا ٥ ناوی ئەوشتەی داوای دەکەی وەکوو (دعوى تخلية البيت) و(دعوى الطلاق) و(دعوى النفقة والحضانة و....)، (ك: دعاوى، دعاو)٥ لەزاراوەی یاسادا بریتییە لە قسەیەك ئادەمیزاد بەهۆیەوە بتوانێ مافێکی خۆی لەسەر یەکێکی تر بچەسپێنێ.

**الدُّعْوِيُّ**: بانگ لێ کراو، دەگوترێ: (ما بالدار دُعويٌّ): لەخانوەکەدا کەسێک نییە بانگی لێبکەی.

**الدَّعِيُّ**: زۆڵ، کەسێک باوکی نەزانراوبێ ٥ بەکوڕی باوکی خۆی بانگی لێنەکرێ، (ك: أدعياء) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ﴾ ٥ بانگکراو بۆنان خواردن.

**اَلْمَدْعَاةُ**: دەعـوەتو بـانگ کـردن بـۆ نانخواردن، دەگـوترێ: (نحن في مدعاة فلان): ئێمە داوەتـی فلانکەسـین بـۆ نـانخواردن ٥ هـەروا دەگـوترێ: (لـە مَدَاع ومساعٍ): فلانکەس لـە شـەڕدا مەردایەتیو نەبەردی هەیە.

**اَلْمُدَّعي والمدَّعَى عليه**: لەزاراوەی یاسادا داواکارو داوا لەسەر تۆمارکراو.

**المدّعِي**: لەیاسادا دژ رکەبەر.

**دَغْدَغَ فلاناً**: لـە کەلەکەیـەوە ژەنـی یـا لەورگییـەوە ژەنـی قەنەقەنـەی دا دیقە دیقەی دا. دەگـوترێ: (دَغْدَغَ فلانـاً بكلمـةٍ): تانـەو تەشـەری لەفلانکـەس دا ٥ (دَغْـدَغَ عِرضَـهُ) تانـەی لـەناموسو شـەرەفی دا ٥ تانەی لەبنەچەو نەسەبی دا.

**الدَّغْدَغَـةُ**: ختوکـەدانو قەنەدانـە لەکەلەکـەو دەورو بـەری نـاوکو بەری قاچ کەبەهۆی ئەو ختۆکەدانە ئادەمیزاد توشی هەڵچونو ئینفیعال دەبێ.

**اَلْمُدَغْـدَغُ**: ئـادەمیزادی ختوکـەدراو ٥ هـەروا دەگـوترێ: (فـلان مُدَغْـدَغٌ): فلانکـــەس لەککـــەو پەڵـــەی بەنەسـەبو بنەچـەوە هەیـە، یـان رەوشتی لەکەدارە.

**دَغَـرَ في البيت دَغْـراً**: چـووە نـاو خانوەکەوە.

**دَغَـرَ عليـه**: بـەزۆر چووە نـاو خانوەکە، هەڵمـەتی بـۆ بـرد ٥ هێرشـی کردەسەر ٥ قورسایی خستە سەر تا گیـانی دەرچـوو ٥ خواردەمـەنی خراپـی دایـە ٥ شـیری دایـەو تێـری نەکرد.

**دغَرَ الشّيءَ**: شتەکەی تێکەڵاو کرد.

**دَغَرَتِ المرأةُ الصَّبيَّ**: ئافرەتەکە قامکی خـستە نـاو قـورگی منداڵەکـەوە بۆئەوەی ئاڵوی بێنێتەوە.

**تَـدَغَّرَ**: بـاری پێـوەگرتو بـوو بـە رەوشتی.

**الدّاغِرُ**: پیاوی هیچو پوچو نارەسـەنو زەلیـل، دەگـوترێ: (ذهـب صـاغراً داغـراً): رۆیـی بـە بەملکەچـیو زەلیلی ٥ هەروا بەمانا دەرون پیسو ئاشوبگێڕ دێ، (ك: دُغّار).

**الـدَّغْرَةُ**: هەڵـگرتنی شـتە بـەدزیو ئیختـیلاس ٥ لەحـەدیثـی عـەلی دا هـاتووە: (لا قطـع في الـدّغرة): کەسێـك بـە ئیختـیلاس پـارە هەڵبگرێ دەستی نابڕدرێ.

**الدّغرى**: دەگـوترێ: (دَغـرى لاصـفّى): واتە پەلاماریان بدەنو ئاشتەواییان لەگەڵ مەکەن.

**اَلْمَـدْغَرَةُ**: شـــەڕی درێژخایـــەنو

ماڵوێرانکەر کە وشەی نهێنی لەنێوان شەرکەرو هاوەڵەکەی دا ئەم وشەی (دَغْرَیْ) یە.

**الدُّغرورُ**: درێژ داوەڵی نەکڵەوەت.

**دَغْرَقَ الماءَ**: ئاوەکەی هەڵقوڵاند ٥ ئاوەکەی بە تەوژم بەسەردا رژاند ٥ دەگوترێ: (دَغْرَقَ علیه الماءَ): هەروا دەگوترێ: (دَغْرَقَ مَالَهُ): ماڵو سامانی خۆی بەخشان و تەخشان کردو دەستبلاوی تێدا ئەنجام دا ٥ ئاوەکەی لێڵ کرد.

**دَغْرَقَ الشَّيْءَ**: پەردەی بەسەر شتەکەدا دا دایپۆشی.

**الدَّغْرَقُ**: ئاوی لێڵ ٥ ئاوی زۆر ٥ دەگوترێ: (عیشٌ دغرق): ژیانێکی خۆش و فەرەحی یە ٥ (عام دغرق): ساڵێکی هەرزانیو خۆش.

**دَغَشَ دَغْشاً**: چووە ناو تاریکییەوە ٥ (دَغَشَ علیه): هێرشی کردەسەر.

**أدْغَشَ**: بەمانا (دَغَشَ) دێ.

**داغَشَ**: بەدەوری ئاوەکەدا هاتوچو لەتینوان ٥ داوای ئەوشتەی کردو سور بوو لەسەر بەدەست هێنانی.

**دَغَشَ الظُّلْمَةَ**: خۆی خستە ناو تاریکیو بێ لێوردبونەوە ملی لێ نا.

**دَغَشَ الماءَ**: ئاوەکەی بەپەلە خواردەوە ٥ کەمی خواردەوە.

**دَغَشَ فلاناً**: پاڵەپەستۆی فلانکەسی کرد لەسەر ئەوشتە.

**تداغَشَ القومُ**: خەڵکەکە لەشەڕدا یان لەهەراو ڤاوو ڤیزدا تێک چرژان و یەکتریان هێناو برد.

**الدَّغْشُ**: تاریکی.

**الدُّغشَةُ**: بەمانا (الدَّغْشُ)دێ.

**الدَّغشَةُ**: بەمانا (الدَّغْشُ) دێ.

**دَغِصَ دَغَصاً**: پڕبوو لە خواردەمەنی ٥ دەگوترێ: (دَغِصَ فلانٌ): فلان ڕقی هەڵسا خەریك بوو بتەقێ.

**دَغِصَتْ الدابَّةُ**: ولاخەکە زۆر قەڵەو بوو ٥ (هو دغصان وهي دغصى).

**أدْغَصَهُ**: پڕی کرد لەقین و قارو بەتەواوی ڕقی هەڵساند.

**أدْغَصَ الموتُ فلاناً**: مردن بەسروشتی یەخەی فلانی گرت.

**داغَصَهُ**: پەلەی لێکرد ٥ دەگوترێ: (داغصَ في الأمر): لەکارەکەدا پەلەی کرد ٥ هەروا دەگوترێ: (أخذتُهُ مداغصةً): بەهێزو تواناو بالادەستی گرتم.

**الدّاغِصَةُ**: کلاوە ئەژنۆ، ئەو ئێسقانە خڕەی سەرکەشکە ئەژنۆ کە دێو دەچێ ٥ بەزو پیوی ژێر پێست کە دەکەوێتە پشت ئەژنۆوە ٥ گۆشتی کۆبۆوە ٥ دەگوترێ: (سَمِنَ حتی کأنه

داغصة): هەروا بەئاوی رون‌و صاف دەگوترێ، (ك: دواغِصَ).

دَغَفَ الشَّيْءَ دَغْفاً: زۆری لەوشتە هەڵگرت.

دَهَفَ الحَرُّ فلاناً: گەرما فلانکەسی نارەحەت کرد.

دَغْفاءُ: (أبو دَغْفاء): کونیەی ئادەمیزادی گێل‌و ئەحمەق.

دَغْفَقَ المَطَرُ دَغْفَقَةً ودغْفاقاً: بارانەکە لەسەرەتادا زۆر بەتەوژم‌و رێژنە ئامێز بوو.

دَغْفَقَ الماءَ: ئاوەکەی هەڵرِشت بەتەوژم‌و رێژنەو ئەندازەی زۆر ٥ دەگوترێ: (دَغْفَقَ مالَهُ): ماڵ‌و سامانی خۆی تەخشان‌و پەخشان کرد بەرەهایی بەخشی.

الدَّغْفَقُ: ئاوی رژێندراو ٥ دەگوترێ: (عَيْشٌ دغفقٌ): ژیانێکی فەرەحی‌و هەرزانی یە ٥ (عام دَغْفَقٌ): ساڵێکی هەرزانی‌و خۆشە.

الدَّغْفَلُ: بەرفراوان‌و هەرزانی ٥ دەگوترێ: (عيش دَغْفَلٌ) و (عام دَغْفَلٌ) ژیانێکی خۆش‌و ساڵێکی هەرزانی ٥ هەرزانی‌و هاتی رۆژگار ٥ (عام دغفليٌ): ساڵێکی هەرزانییە.

دَغَلَ القانِصُ دَغْلاً: تفەنگچییەکە خۆی هاویشتە کۆختەو شوێنێکی نادیار بۆئەوەی نێچیرەکە هەڵبخەڵەتێ‌و پێوە ببێ.

دَغَلَ فيه: وەکوو کەسێکی کە لەخۆی بەگومان بێ ئاوا چووە ناو کۆختەو سەنگەرەکەوە.

دَغَلَ في الريبة: چووە ناو دەریای شك‌و گومانەوە.

أدْغَلَ المكانُ: شوێنەکە زۆر روەکی پوچ‌و درەختی بەرنەگری لێروا.

أدْغَلَ الأرضُ: زەوییەکە روەکی دەغەڵ‌و پوچی زۆر بوو.

أدْغَلَ فلان: فلان لەدەغەڵی دا گوم بوو.

أدْغَلَ بفلان: خیانەتی لە فلانکەس کردو تیرۆری کرد ٥ فیتنەیی بەدەم ئەوەوە کرد.

أدْغَلَ الأمْرَ: کارەکەی تێك دا، یان شتێکی خستە ناو کارەکەو گەندەڵی تێدا دروست بوو‌و پێچەوانەی سروشتی ئەوشتەبێ.

الداغِلُ: کەسێکە شەرو ناخۆشی بۆهاوەڵەکانی بوێ‌ە لەگەڵیان دا راست نەبێ، ئەوان وابزانن دڵسۆزە بۆیان‌و بەلام لەواقیع دا دوژمنیان بێ ٥ دەشگوترێ: (مكان داغِل): واتە شوێنێکی هون‌و نادیار.

الداغِلَةُ: خەڵکانێکە دەگەرِێن بەدوای

عــەیبو عــاری پیــاودا هــەوڵ دەدەن خیانەتەکانی بدۆزنــەوە ٥ رقو کینــەی شاراوە.

**الدَّغَلُ**: عەیبو عارێکە کارتێك بــدا ٥ درەختێــکی چڕو پــڕە کــە لقــەکانی تێــك چــڕژابن، زەلام خــۆی تێــدا حەشــاربدا بــۆ دزیو راوو روت ٥ شوێنێــك ترسی دزیو تــیرۆری لــی بکــرێ ٥ هــەڵاشو ســەقفی بــەرز ٥ شــیوو دۆڵ ٥ چــاڵو نزمــایی زەوی، (ك: أدغال ودِغال).

**اَلْمَدْغَلُ**: دۆڵی دارستاناویو چڕو پــڕ، (ك: مَداغِل).

**دَغَمَ الحَرُّ والْبَرْدُ دَغْماً**: گــەرما یــان ســەرما هەریەکەیان لــەکاتی خــۆی دا وڵاتــی گرتەوە.

**دَغَــمَ الحــرُّ والــبردُ القــوم دغمــاً ودغمانــاً**: گــەرما خەڵــکەکەی هــەموو گرتــەوە هەموویان هەستیان پێ کرد.

**دَغَمَ الغَيْثُ الأرضَ**: بارانەکــە زەوی بــەئاو داپۆشی.

**دَغَمَ أنْفَهُ**: لوتی شکاند، وردو هاری کرد.

**دَغَمَ الإناءَ**: قاپەکەی داپۆشی.

**دَغِمَ الحرُّ والبردُ**: بەمانا (دَغَمَ)دێ.

**دَغِــمَ الحــرّ والــبردُ القــومَ**: گەرماکــە یــان ســـەرماکە هــــەموو خەڵـــکەکەی گرتەوە.

**دَغِمَ الفَرَسُ وغيره دَغَماً ودُغمة**: ئەسپەکە لــوتو لمبــۆزی رەش بــوو ٥ ســەرو کەللەو دەمو لمبۆزی بــەلای رەشــی دا چوو بە پێچەوانەی باقی جەســتەی ٥ (هو أدغم وهي دغماء).

**أدْغَمَ فلانٌ**: فلانکەس دەست پێشخەری کـــرد، فـــلان لەترســـی ئـــەوەی خەڵکەکە پێشی بکەون بۆیــە بــەبێ جوین خواردنەکەی قوت دا.

**أدْغَمَ الطعــامَ**: خواردەمەنیەکــەی قــوت دا.

**أدْغَمَ الحرُّ والبردُ القومَ**: گەرماو سەرماکە هەموو خەڵکەکەی گرتەوە.

**أدْغَــمَ الــشَّيْءَ**: شــتەکەی رەش کــرد ٥ دەگــوترێ: (أدغمه الله): خــودا رووی رەش کردو زەلیلو ملکەچی کرد.

**أدغَمَ الشَّيْءُ فلانــاً**: شــتەکە فلانکەســی نارەحەت کرد.

**أدْغَمَ الشَّيْءَ في الشَّيْءِ**: شتەکەی خستە نــاو شــتەکەی تــرەوە ٥ دەگــوترێ: (أدغم اللجامَ في فم الدابّة): لغاوەکەی خستە دەمی وڵاغەکەوە.

**إدَّغَمَهُ**: بــەمانا (أدْغَمَــهُ)دێ ٥ هــەروەها دەگوترێ: (إدّغَمَ الحرف في الحرف): پیتەکەی خستە ناو پیتەکەی ترەوە ٥ (رَدَدَ)ەی کرد بە (ردَّ).

**إدغامُ الفَرَسُ**: ئەسپەکە سەرو کەللەی

رەش بوو باقی جەستەی رەنگێکی تری هەبوو.

**الأدْغم**: لوترەش، لمۆز رەش ٥ کەسێک گن بێو بەلوت قسە بکا، (ك: دُغـمٌ ودُغْمَان).

**الـدُّغامُ**: ئازارێـکە لـەقورگ دا پەیدا دەبێ.

**الـدُّغْمَانُ**: رەش ٥ یـان رەش‌و گـەورەو کەتە.

**دَغْمَـرَهُ**: تێـکەڵی کـرد، لێـی تێـک دا، دەگـوترێ: (دَغمَـرَ علیـه الخَبَـرَ): هەواڵەکانی لـێ‌شاردەوە ٥ (وفي خلقه دَغْمَرَةٌ): لەڕەوشتی دا بەدی‌و پیسی هەیـە ٥ (خلق دُغمَريٌ): رەوشتێـکی ناشیرین‌و ناپەسەندی هەیە.

**الـدُّغمورُ**: هـون‌و نادیـار ٥ دەگـوترێ: (رجـل مُـدَغْمَرُ الخلـق): پیاوێـکی رەوشـت ناشـیرینە ٥ رەوشـتەکانی ناشکراو رون نین.

**المُدَغْمَسُ مِـن الأمـور**: کـاری شاردراوە، دەگـوترێ: (حَـسَـب مُــدغمس) بنەچـەو نژادێـکی پـاکی نیـە، رەخنەو لەککەی پێوەیە.

**دَغَنَ الیومُ دَغناً ودغونا**: تاریك‌و لێڵ بوو.

**الدُّغْنَةُ**: لێڵی‌و تاریکی.

**دُغَیْنَةُ**: ناوە بۆ ئەحمەق‌و گێل.

**دَفِيَّ مـن البرد دَفَأً و دفاءً ودفاءةً**: گەرمی هاتـەوە یـان شتێـکی کردەبـەر کـە گەرمی بکاتەوە.

**دَفِيٌّ دَفْأً**: شانی کوڕبون‌و بەسەر سینگی دا دەڕوانێ ٥ (فهو أدْفَأوهي دَفْای).

**دَفُؤَ مـن الـبرد دفـاءةً**: بـەمانا (دَفِيَّ) دێ ٥ دەگوترێ: (دَفُؤَ یومُنا ودفُؤت لیلتنا).

**أدفـأت الإبـل علـى مائـة**: ژمـارەی حوشترەکان لەسەد تێپەڕی.

**أدفـأ فلانـاً**: شتێـکی لەبـەر فلان کـرد بۆئەوەی گەرمی بێتەوە.

**أدفَأ الثَّوْبُ**: کراسەکە سەرما بووەکەی گـەرم کـردەوە ٥ بەخـشش‌و پاداشـی باشی پێدا.

**أدْفَأ القومَ**: خەڵکەکەی گرد کردەوە.

**أدْفَأ الجَريحَ**: برینـدارەکەی کوشت.

**دافَــأ الجَــریح**: بریندارەکــەی گــەرم کردەوە.

**دَفّــأَهُ**: بـەمانا (أدفـأهُ)دێ ٥ بەخـششی زۆری پێدا.

**إدَّفَــأ**: شتێــکی لەبــەرکرد گــەرمی بکاتەوە ٥ دەگوترێ: (إدَّفَأ بـالثَّوبِ): بە پۆشاکەکە گەرمی هاتەوە.

**تَدَفّأ**: بەمانا (إدَّفَأ) دێ.

**الـدِّفاءُ**: ئەوشـتەی خـۆی پـێ گـەرم بکەیەوە.

**الـدِّفْءُ**: پێــچەوانەی ســەرمایە ٥ ئەوشــتەی خــۆتی پــێ گـــەرم

دەکەیتەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾.

**دِفْءُ** الحائط: گوێسەبانەو کۆڕنیشی دیوار ٥ دەگوترێ: (أَقْعُدْ دِفْءَ الحائط): لە سێبەری گوێسەبانەی ئەو دیوارە دابنیشە ٥ هەروا وشەی (دِفْء) بەمانا بەروبومی حوشترە، ئەوەی سودی لێ وەردەگیرێ ٥ هەروا بەمانا (بەخشش دێ).

**الدَّفِينة**: ژورێکی لەشوشە دروستکراوە روەکی تێدا بەخێو دەکرێ.

**الْمَدْفَأَةُ**: (أَرض مَدْفَأَةٌ): زەوییەکە گەرمایی هەیە.

**الْمِدْفَأَةِ**: زۆپا، ئامێری خۆگەرمکردنەوە، (ك: مَدَافِئ).

**الْمُدْفِئَةُ**: حوشترێک کولکو بەزو پیوی زۆر بێ، یان حوشترەکان زۆربن بەهەناسەیان ئاغەڵەکەیان گەرم بکەن.

**الدَّفْتَرُ**: دەفتەر، (ك: دفاتر).

**الدَّفتردار**: کارمەندی تایبەتی دارایی، ئەوکەسەی ئەرکی ڕێکخستنی داهاتو خەرجی حکومەتی لەئەستۆدایە، وشەکە لە بنەڕەتدا تورکییە.

**دَفْدَفَ**: پەلەی کرد.

**دَفْدَفَ الطائرُ**: باڵندەکە بەهێواشی فڕی.

**دَفْدَفَ الدُّفُوفَ**: بەخێرایی لەدەفەکەی دا.

**الدَّفَادِفُ، دَفَادِفُ الأَرض**: ئەو گردۆڵکەو بەرزاییانە بە کەلەدەورو بەری دایە، تاکەکەی (دَفْدَفَةٌ).

**دَفَرَهُ دَفْراً**: لە پشتیەوە پالی بە پشتەملیەوە نا، یان لەپێشەوە پالی بەسنگیەوە نا.

**دَفِرَ دَفَراً**: زەلیل کەوت.

**دَفِرَ** اللحمُ أو الطعامُ: گۆشتەکە یان خواردەمەنییەکە کرمی هەڵێنا.

**دَفِرَ الشَّئ**: شتەکە پیس بوو بۆگەنی کرد ٥ (هو أَدْفَرُ وهي دَفْراءُ).

**أَدفَرَ**: بۆنی بنباخەڵی بلاو بۆوە.

**دَفَارِ**: لەسەر شێوەی (فَعَالِ) بەمانا دونیایە یان چەتیوو کارەکەرە ٥ هەرکاتێ جنێوی ئاراستە دەکرێ پێی دەگوترێ: (یا دَفَارِ)، (یا مُنتِنة) ٥ بەزۆری لەکاتی بانگکردن بەکاردی.

**أُم دَفَار**: نازناوی دونیایە ٥ بەڵاو کارەساتە.

**الدَّفْرُ**: بەڵاو کارەسات ٥ (أم دَفر): دونیایە.

**دَفَعَ** إلى فلان دفعاً: گەیشتە فلانکەس ٥ دەگوترێ: (طریق یدفع إلى مکان

کـذا): ڕێـگەیەکە دەچێتە سـەرفلان شوێن‌و بەوێ کۆتایی دێ.

**دَفَـعَ** عَـنْ الموضـع: لەوشـوێنە ڕۆیـی، ئەوشوێنەی جێ هێشت.

**دَفَعَ** القَـوْمُ: خەڵـکەکە تێـکڕا بەکۆمـەڵ هاتن.

**دَفَـعَ** الـشَّيْءَ: شـتەکەی دوور خـستەوەو بەهێز لایـبرد ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِـبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الأَرْضُ﴾ ٥ هەروا دەگوترێ: (دفَعْتُهُ عني، ودفع عنـه الأذى) واتـە: لـەخۆم دوور خـستەوە، لێـی پـاك کردەوە.

**دَفَعَ** اليه الشَّيْءَ: ڕەتی کردەوە ٥ دەگوترێ: (دفع القـولَ): بەبەڵـگەو بەتونـدی قسەکەی ڕەتکردەوە.

**دَفَعَ** فلاناً إلى كذا: فلانکەسـی ناچار کـرد بەوە.

**دافَـعَ** عنـه مدافعـةً ودفاعـا: بـەرگری لـێ کردو هەوڵی دا لە کێشەکەدا بەسەر ڕقەبەرەکەی دا سەربکەوێ.

**دَفَعَ** عنه الأذى: ئەزیەت‌و پیسی لـێ دوور خستەوە.

**دَفَعَ** فلاناً في حاجته: فلانکەسـی خافلانـدو پێداویـستییەکەی بـۆ جێبـەجێ نـەکرد ٥ پاڵەپەسـتۆی لەگـەڵ دا کردو ویستی لەگۆڕەپانەکە لایبەرێ ٥ دەگـوترێ: (هـو سـید قومـە غـیر مـــدافَع): ئـــەو گـــەورەی هـــۆزو خێڵەکەیـــەتی‌و کـــەس ناتوانـــێ بەربەرەکانی بکا ٥ هەروا دەگوترێ: (دافـع الرجـلَ أمْـرَ کـذا): پیاوەکـە چووە ناو ئەو کارەو وەگری بوو.

**دُفَّعَـةُ**: بـەمانا (دُفَعَـةُ) دێ ٥ دەگـوترێ: (رجـل مُـدَّفَعٌ): پیاوێـکە لەنەسـەب‌و بنەچـەی خـۆی وەدەر نـراوەو دوور خراوەتەوە ٥ پیاوێـکی هیچ‌و پوچـە ٥ ئەگـەر میوانـداری کـراو زیافـەت ڕازایـەوە ئـەوبانگ نـاکرێ‌و کـەس بەهیـچی نازانـێ ٥ هیـچی دەسـت ناکەوێ ئەگەر هەوڵی بەدەستهێنانی شتی دا ٥ (هـو مُـدَّفع): ئـەو هێنـدە هـیچ‌و پوچـە هـەموو کـەس لـەخۆی دوور دەخاتـەوە کـەس نایـەوێ لـێی نزیك بکەوێتـەوە ٥ (ضـيف مُـدَّفَعٌ): میوانێـکە گەڕەکەکـە یـان گوندەکـە کەسـیان دایناکـاو هەریەکـەیان دەینێرێ بۆلای یەکێکی تر.

**اِنْدَفَعَ**: بۆ موطاوەعەی (دفعه) هاتووە.

**اِنْدَفَعَ في الأمر**: دەستی بەکارەکە کـردو پێیدا ڕۆیی.

**اِنْدَفَعَ في الحديث**: درێژەی بەقسەکانی دا.

**اِنْـدَفَعَ الفـرسُ**: ئەسـپەکە بـەگورجی ڕۆیی.

اِنْدَفَعَ السيلُ: لافاوەكە هەندێكی پاڵی بەهەندێكیەوە نا.

اِنْدَفَعَ القومُ: خەڵكەكە هەندێكی پاڵە پەستۆی هەندێكی دا.

اِنْدَفَعَ القومُ الشَّيْءَ: هەریەك لەوخەڵكە شـــــتەكەی لەهاوەڵەكـــــەی دوورخستەوە.

تَدَافَعَ السيلُ: بەمانا (اندفع) دێ.

استدفَعَ الله السوءَ: داوای كـرد لـەخودا كە خراپەی لێ دوور بخاتەوە.

الدَّفْعُ: لەزاراوەی قانون دا ئەوەیە داوا لەسـەر تۆمـاركراو ئیـدیعای شتێـك بكـا كـە ئـەو حوكمـەی بەسـەریا دەدرێ یـــــان دراوە لـــــەخۆی بڕەوێنێتەوە، (ك: دفوع).

الدُّفعَةُ مـن المطـر: ڕێژنـە باران ٥ ئـەو ڕێژنـــە ئـــاوەی لەكونــدەو دەبـــەو بـــەرمیل بەیـــەكجار هەڵــدەڕژێ ٥ هەروا دەگوترێ: (أعطاه الفا دُفعَـةً): بەیەكجار هەزاری پێ بەخشی.

الــدَّفَاعُ: ئەوەیـە بـەهێز بـێ بـۆ شـت ڕەتكردنەوە.

الدُّفاع: خەڵـكی زۆر ٥ لافـاوی گـەورەو بەهێز.

الدِّفَاعُ الشرعي: مافێـكە قـانون دەیـدا بـــەئادەمیزاد كـــە پەنابـــەری بـــۆ بـــەكارهێنانی ئەنـــدازەی پێویـــست لەهێز بۆ ڕەتكردنەوەی دەستدرێژی كردن بۆسەر خـودی خـۆی یـا مـاڵو سامانی یـان نـەفسو مـاڵی كەسـانی تـر ٥ (وزارة الـدفاع): وەزارەتێـكە ئەركی پارێزگـاری لـەوڵات دەگرێتـە ئەستۆی.

الدُّفوعُ: زۆر هاوێژەربێ، زۆر پاڵنـەربێ ٥ حوشترێـــك لـــەكاتی دۆشـینی دا لەقە بهاوێ.

اَلْمَدْفع: دەراوی ئاو، ڕێڕەوی ئاو.

اَلْمِدْفَعُ: تۆپ هاوێژ، ئامێرێكە بـۆ شـەڕ بـــەكاردێ گوللـــەی گـــەورەی پـــێ دەهاوێــژرێ، (ك: مَـدافع) ٥ (رجــل مِــدفَعٌ): پیاوێــكە پـاڵ پێوەنـانی، هاویشتنی بەهێزە).

دَفَّـت الجماعَـةُ أو الإبـلُ دفَّـاً ودفیفـاً: كۆمەڵەكـــە ڕۆیـــی بەهێواشـــیو لەسەرە خۆیی.

دَفَّ له الأمرُ: كارەكەی بۆ ڕەخسا.

دَفَّ الطائر دفّاً ودفیفاً: باڵندەكە باڵەكانی لێك دانو فڕی، لەشـەقەی بـاڵی دا، یـــان لەســـەر زەوی باڵــــەكانی جوڵاندنو بەقاچ ڕۆیی ٥ لەحەدیث دا هـاتووە ٥ (كُلْ ما دفّ ولا تأكل ما صَفَّ): ئـەو باڵندەیـەی لـەفڕینی دا بـــاڵی لێـــك دان بیخـــۆ، ئـــەوەی باڵەكانی صاف بكا مەیخۆ.

دَفَّتِ العقـابُ: هەڵۆكە لـەزەوی نزیـك بۆوە.

دَفَّ الشَّيْءَ: شتەكەی تەقانـدەوەو تـارو

ماری كردو لەبێخەوە دەری هێنا.

**أدفَّ الطائرُ:** بەمانا (دَفَّ)دێ.

**أدَفَّ عليه الأمور:** ئیشەكانی یەك لەدوا یەك هاتن.

**دافَّهُ مُدافَّةً ودفافاً:** كوشتی، هێرشی كردە سەرو لەناوی برد.

**دَفَّفَ:** پەلەی كرد.

**دفَّفَ فلاناً:** هێرشی كردە سەر فلانو كوشتی.

**دفَّف الدفوف:** دەفی دروست كرد.

**تداف القومُ:** خەڵكەكە پاڵەپەستۆی یەكتریان كرد.

**استدفَّ الطائرُ:** بەمانا (دَفَّ) دێ.

**استدفَّ له الأمرُ:** كارەكەی بۆ سەقامگیر بوو، ئیشی بۆ راست بوو، كارەكەی سەری گرت.

**استدفَّ الأمرُ:** كارەكە جێ بەجێ بوو.

**استدفَّ بالموس:** بەتەراش موەكانی تاشین.

**الدافَّةُ:** سوپا كە بەرەو دوژمن هێرش بەرێ ٥ كۆمەڵێك لەئادەمیزاد كەلەشارێكەوە بڕۆن بۆ شارێكی تر، (ك: دَوَاف).

**الدَّفُّ:** لاتەنیشتو روی شت، دەگوترێ: (بات يتقلب على دَفِّهِ): واتە: ئەمشەو تا بەیانی ئەمدیوو ئەو دیوی كردوە ٥ تەمبارە گلو تەمبارە لەب كەلەزەوی بەرز بووبنەوە.

**الدَّفَّافُ:** دەف دروستكەر، دەف فرۆش.

**الدَّفَّـةُ:** لاتەنیشتو روو لەهەرشتێك بێ ٥ دەگوترێ: (بات يتقلب على دفّيه): هەر لەم مەعنایەدا یە دەگوترێ: (دَفَّتا المصحف): دوو تەنیشتی موصحەف، دوو لای موصحەف.

**دَفَّتَا الطَّبل:** ئەو دوپێستەی دەوری تەپڵەكە كەلێیان دەدرێو دەنگی لێ دێ.

**الدَّفَّةُ من السفينة:** سوكانی كەشتییەكە، ئامێرێكە لەدواوەی كەشتییەكە بەلای راستو چەپ دا جوڵەی پێ دەكرێ.

**الدَّفُوفُ من الطير:** ئەو باڵندەیە كەویستی دابێتە نێچیر لەزەوی نزیك دەبێتەوە ٥ دەگوترێ: (عقابٌ دَفُوفٌ).

**دَفَقَ الماءَ ونحوهُ دفقاً:** ئاوەكەی رژاند، ئاوەكەی بەتەوژم رشت ٥ (هو مدفوق ودافق) ٥ هەروا دەگوترێ: (دَفَقَ اللهُ روحَهُ): خودا گیانی لێ وەرگرتەوە ٥ مراندی.

**دَفَّقَ الكوزَ:** چی ئاوی لە گۆزەكەدا بوو بەیەكجار ڕشتی.

**دَفِقَ** دَفَقاً: پشتی کوڕ بوو ٥ حوشتره کە ئەژنۆی سوڕاوە.

**دَفِـقَ** الفَـمُ: ددانـەکانی بـەرەو پـێش هاتوون.

**دَفِقَ** الهلالُ: مانگ وەکوو دەمە داسی لـێ هات ئاوا خوار بووە.

**دَفِـقَ** النهـرُ أو الـوادي: رووبارەکـە یـان شیوەکە پڕ بوو لەئاوو لێوان لێوان بوو لەقەراخەکانیەوە ئاوسەر ڕێژی کرد. (هـو أدفـق وهـي دَفْقـاءُ)، (ك: دُفقٌ).

**أدْفَقَ الكوز**: بەمانا (دَفَقَهُ) دێ.

**دَفَّـقَ المـاءَ ونحـوه**: بـەمانا (دَفَقَـهُ) دێ ٥ دەگوترێ: (دُفِّقَتْ كفـاه النّـدى): دوو دەستی بەخششیان ڕژانـد ٥ (إنْـدَفَقَ الماءُ ونحوُهُ): بۆ موطاوەعـەی (دَفَقَـهُ) دێ.

**تَدَفَّقَ الماءُ ونحوه**: بۆ موطاوەعەی (دَفَقَهُ) دێ.

**تَدَفَّقَ فلانٌ**: فلان پەلە پەلیەتی بۆشتی پڕو پوچ.

**تَدَفَّقَ حلم فـلان**: خـەوو خـەیالی فـلان ڕۆیی.

**استَدْفَقَ الكوزُ**: گۆزەئاوەکە قلپ بووە هیچی تێدانەما.

**الأدْفَـقُ**: (سـير أدْفَـقُ): ڕۆیـشتنێـکی خێرایە.

**الدُّفْقَةُ**: دەگوترێ: (جاءوا دُفْقَةً) بەیەك کۆمەڵ هاتن.

**الدُّفوقُ**: حوشتری خۆشڕۆ.

**الدُّفْلُ**: قەطرانو زفتی تۆخو خەست.

**الدِّفْلَى**: ڕوەکێـکی تـام تاڵە، گوڵەکەی وەکوو گوڵە سوورە وەهایە بەرەکەی وەکوو بەری درەختی خەڕوب وایە.

**دَفَنَـت الإبـلُ دفْنـاً**: حوشـترەکە بـەرەو پێشەوە ڕۆیی.

**دَفَنَـــت النّاقَـــةُ**: حوشـــترەکە بـــەبێ مەبەست ڕۆیی.

**دَفَنَ الشَّيْءَ**: شتەکەی شاردەوەو ژێـر گڵی دا.

**دَفَـــنَ الميـــتَ**: مردوەکـــەی شـــاردەوە ٥ ڕووبـــەڕوی ئـــادەمیزادی خـــەمۆك دەگوترێ: (دَفَنْتَ نفسك في حياتك): بەزیندویی خۆت مراندوە.

**دَفَنَ الحَديثَ**: قسەکەی شاردەوە.

**إدَّفَـــنَ العبـــدُ**: کۆیلەکـــە لەترســـی خاوەنەکەی هەڵات، یان لەبـەر زۆر کارپێـکردن خـۆی شاردۆتەوە لـەناو ماڵو هۆبەکان دا.

**إدَّفَنَ الشَّيْءَ**: بەمانا (دَفَنَهُ) دێ.

**إنْدَفَنَ**: بۆ موطاوەعەی (دَفَنَهُ) دێ.

**تـدافَنَ القَـوْمُ**: خەڵـکەکە قـسەکانیان لەیەکتر شاردەوە.

**تَدَفَّنَ**: بەمانا (إندفَنَ) دێ.

**دافِنُ الأمرِ**: ناوەوەی کار.

**الدَّفْنُ**: پیاوی خەمۆك‌و خەفۆك.

**الـدِّفْنُ**: شـاردراوە، ژێـر گـڵ دراو ٥ بەشیعری مانا چەواشە دەگوترێ ٥ (أبیاتـهُ دِفْـنٌ): شیعرەکانی مانایـان چەواشـــەو تــــەمو مـــزاوین ٥ هەرواوشەی (الدِّفن) بەمانا بیر یـان حەوز یان پلوسکی ئاودێ.

**الدَّفُون من النـاس والأبـل**: ئەوەیە کە بەبێ مەبەست دێو دەچێ ٥ کۆیلەی هـەڵاتو لەترسـی خاوەنەکـەی یـان لەترسـی کارپێـکردن ٥ حوشترێـك عـــادەتی وابـــێ لەســـەر دوێڵـــی ئاوخواردنـەوە خۆبخاتـە ناوەڕاستی حوشـــــترەکانەوە ٥ بنەچـــــەو رەگەزێـــکی نادیـــار، دەگـــوترێ: (حَسَبٌ مدفون).

**الدَّفِینُ**: شاردراوە، (ك: دُفَنَاءُ، ودُفُنٌ).

**دَفــینٌ**: گۆشتێـــك لـــەناو بـــرنج دا بـشاردرێتەوەو بکوڵێنـدرێ ٥ هـەروا دەگـوترێ: (فِي فـــلان داءٌ دفـــین): فلاَنکەس دەردێکی تێدایە نازانـدرێ هەتا شەڕو ئازارەکانی دەردەکەون.

**دفــین المـروءة**: کەسێـــکە مەردایـــەتی تێدانەبێ.

**امـرأة دفـین**: ئافرەتێـکی بەحـەیاو ڕو سوورە، (ك: دفنی).

**الدفینة**: هەرشتێـك ژێرخـاك بکـرێ ٥ گەنج‌و خەزێنەی پێشینان کەلـەناو خاك دایە، (ك: دفائن).

**المَـدْفِنُ**: گۆڕسـتان ٥ ئەوشـوێنەی شـتی تێدا دەشاردرێتەوە، (ك: مَدافِن).

**دَفَا الجَریحَ دَفْواً**: برینـدارەکەی کوشت.

**دَفِيَ دَفاً**: پشتی کوڕ بوو، (هو أدْفی وهـي دفواء).

**دَفِـــي الوَعِـــلُ**: کەڵـەکێوی یـان هـەر ئاژەڵێـکی تـری شـاخدار شاخەکانی رویـان بـەرەو دواوە بـوو ٥ هەڵۆکـە دەندوکی خواربووە.

**دَفِي الطائر**: باڵندەکە باڵی درێژ بوو.

**دَفِیـت الـشجرة**: درەختەکـە لقـەکانی گەورەبون‌و شۆڕابەیان کـرد ٥ (فهـي دفواءُ): لەحـەدیث دا هاتووە: (أنـهُ أبْـصَرَ شـجرةً دَفْـواءَ تـسمی ذات أنواط).

**أدفـی الظَّبْـيُ**: ئاسکەکە شـاخەکانی درێـــژبوون تالـــەدواوە بەســـەر کوێچکەکانی دا هاتنەوە.

**أدفی الجَریحَ**: برینـدارەکەی کوشت.

**دفَّيَ الجَریحَ**: برینـدارەکەی کوشت.

**تدافی البعیر**: حوشـترەکە بەشێوەیەکی ناڕێك رۆیشت.

**الدَّفواءُ**: حوشتری رەسەنی مل درێژ.

**دَقْدَقَ القومُ**: خەڵکەکە قەرەباڵغیان کردو کۆبوونەوە بۆ شەڕکردن.

**دَقْدَقَت الدَّوابُ**: خرمەی سمی وڵاخەکان بیسترا.

**دَقْدَقَ الشَّيْءَ**: زێدەڕۆیی کرد لە کوتانی شتەکەدا.

**دَقِرَ المكانُ دَقَراً**: شوێنەکە بوو بە باغستانو درەختو روەکی جوانی تێدا ڕوا.

**دَقِرَ النّباتُ**: روەکەکە زۆر بوو پێگەیی‌و گەشەی کرد.

**دَقِرَ فلان من الطعام**: فلانکەس ورگی پڕبوو لەخواردن.

**الدَّقْرُ والدَّقَرى**: باغی جوانو رازاوەو بەشۆقو پڕگوڵو گوڵزار.

**الدَّقارَةُ**: دابو نەریتی ناشیرین ٥ فیتنەیی‌و دوزمانی ٥ (رجل دِقْرارة): پیاوێکی زۆر دوو زمانو فیتنەیە ٥ کێشەو نیزاع ٥ قسەی ناشیرین، دەگوترێ: (جاء بالدقارير): هات کۆمەڵێك فیتنەیی‌و دوزمانی هەڵرشت ٥ بەڵاو کارەسات ٥ پیاوی کوڵەبنە.

**الدُّقْران**: دارێکە دەکرێتە کەپری مێو ٥ تاکەکەی (دُقْرَانَة).

**دَقَسَ الوترُ في الأرض دَقْساً ودقوساً**: سنگەکە بەزەوی دا داکوتراو ڕۆیشتە خوار ٥ هەروا دەگوترێ: (دَقَسَ فلان في البلاد): فلانکەس چووە قوڵایی وڵاتەکەوە.

**دَقَس خَلْفَ العَدُوِّ**: شوێن دوژمن کەوتو راوی نا.

**دَقَس الجَرادُ النّباتَ**: کوللە بێتانەکە چووە کشتوکاڵەکەوەو سەر لەبەری خوارد.

**دَقِعَ دَقَعاً**: زەلیلو ملکەچ بوو ٥ لەحەدیث دا هاتووە: (إنّكنّ اذا جُعْتُنّ دَقِعْتُنّ): ئێوە برسیتان بوو توشی زەلیلی‌و ملکەچی دەبن ٥ بەمژیانی کولەمەرگی ڕازی بوو ٥ زۆر بەنارەحەتی توانی لەگەڵ حاڵەتی هەژاری دا هەڵبکا ٥ نارەحەت بوو بەدوا بەدەستهێنانی بژێو دا.

**دَقِعَ الفصيلُ**: بێچووەکە زۆری شیرخواردو قەڵەو بوو ٥ (هو أدقع وهي دَقْعَاء).

**أدْقَعَ**: لەناو خۆڵەپەتەدا کەوت، هیچ کارو کاسبی نەکرد ٥ زەلیلو ژێردەستە بوو، زۆری هەڵپەکرد بەشوێن دابینکردنی بژێودا نارەحەتی چەشت.

**دَقِعَ لە واليە في الشتم**: زێدەڕەوی کرد لەجنێوپێدانو قسەی ناشیرین هیچ نەما پێی نەڵێ.

**دَقِعَ الرَّجُلَ**: پیاوەکەی زەلیلو ناچارکرد.

**الأدْقَعُ**: گڵو خۆڵ، دەگوترێ: (جوع أدْقَعُ): برسییەتی توندو تیژو بڕست بڕ.

**الدَّقِعُ**: کەسێك زێدەڕۆیی بکا لەکار کردنی نزمو سوکایەتی دا ئەوکارانەی لەڕوانگەی دیدی کۆمەڵگاوە کاری ڕێزدار نین وەکوو ناتری حەمامو ئیشی جادەو کۆڵان پاك کردنەوە.

**الدُّقَاعُ**: گڵ.

**الدَّقْعَاءُ**: گڵ ٥ زەوی بێ ڕوەكو درەخت (سوتەمەڕۆ).

**الدَّقْعَى**: دەگوترێ: (رأیت القوم دَقْعی): خەڵکەکەم بینی تەمبەڵو بێکار لەماڵەوە دانیشتون، لەسەر زەوی دانیشتون.

**الدَّوْقَعَةُ**: هەژاریی ٥ زەلیلیو ملکەچی، بەڵاو کارەسات، دەگوترێ: (رماه الله بالدّوقعة).

**الدَّیقوعُ**: برسیایەتی بڕست بڕو توندوتیژ.

**المُدْقِعُ**: (فقر مُدْقِعٌ): هەژاریی زۆر توندو ملکەچ کەر ٥ حوشترێك کە ڕوەكو گیاوگژ بخوا تاسەر ڕەگەو شینایی پێوە نەهێڵێ، (ك: مداقیع).

**دَقَّ الشَّيْءُ دِقَّةً**: شتەکە بچوك بوو، هیچو پوچ دەرچوو بەکەڵکی هیچ نەهات ٥ ماناکەی نادیارو نارۆشن بوو ئادەمیزادی زیرەك نەبێ لێی حاڵی نابێ.

**دَقَّ القلبُ**: دڵەکە لێی دا.

**دَقَّتِ الساعة**: سەعاتەکە لێی دا، جەرەسی لێ دا ٥ کاتەکانی دیاری کردن بەوردی.

**دَقَّ الشَّيْءَ دقًّا**: شتەکەی کوتاو وردو هاڕی کرد، یان بەچەکوشو پیك لێی داو شکاندی وردی کرد.

**دَقَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی دەرخست ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (دَقّوا بینهم عِطرَ مَنْشِم): هەموو عەیبو عاری یەکتریان دەرخست.

**دَقَّ البابَ والطَّبْلَ ونحوهما**: لەدەرگای دا ٥ تەپڵەکەی کوتا.

**أدَقَّ**: شوێن وردەکاری ئیشەکان کەوتو لێکۆڵینەوەی لەشتە بێنرخەکانیش دا کرد.

**أدقَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی والێ کرد وردبێ.

**دَاقَّهُ في الحساب**: بەوردی حیسابی لەگەڵ دا کرد.

**دَقَّقَ في الشَّيْءِ**: وردەکاری لەشتەکەدا کردو وردبینی تێدا بەکار هێنا.

**دَقَّقَ الشَّيْءَ**: شتەکەی ورد کرد.

**تَداقًّا**: رکەبەرییان کرد لەوردەکاری دا.

**استدق الشَّيْئُ**: شتەکە ورد بوو.

**استدق الشَّيْئَ**: شتەکەی بە بچوك زانی.

**الدُّقاقُ والدُّقاقَةُ**: وردەو پرپوڵەی شت.

**الدِّقُّ**: باریك، ورد، بچوك و کەم نەود، دەگوتری: (أخَذْتَ دِقَّه وجِلَّهُ): وردو گەورەی شتەکەم هەڵگرت ٥ (وحمى الدِّق): بەلەرزو تایەك دەگوتری ڕۆژانە دوبارە بێتەوە.

**الدُّقَّةُ والدُّقاقَةُ**: داوو دەرمانی هاڕدراو ٥ خوێی هاڕاوو وردکراو.

**الدُّقَّاق**: دەرمانکوت.

**الدُّقَّاقَةُ**: ئاشی برنج هاڕین، ئەوشتەی چەڵتوکی پێ کرەدەکرێ.

**الدَّقَقَةُ**: ئەوکەسانەی عەیبو عاری خەڵك دەردەخەن.

**الدَّقوق**: جۆرە کلێکە دەکوترێو لەچاو رادەدری ٥ دەرمانێکە دەکوترێو دەکرێتە چاو.

**الدَّقوقة**: کاگێرە، کە گیاو کرشەی گەنمو جۆو شتی تری پێ گێرە دەکرێ.

**الدَّقيق**: پێچەوانەی ئەستورە، واتە باریك . وردەئارد ٥ پیاوی بێ خێرو بێر، کاری بچوكو هیچو پوچ ٥ کاری چەواشەو تەماوی، (ك: أدِقَة، وأدِقّاء ودقاق ودقائق).

**الدقيقة**: چرکەسات کە بەشێکە لەشەست بەشی سەعات ٥ یەکەیەکە بۆ ئەندازە گرتنی هێڵەکانی (الطول) یان (العرض) کە پلەیەکە لەشەست پلە، (ك: دقائق).

**الدَّقيقي**: ئارد فرۆش.

**الدِّقِّيَّةُ**: مەنجەڵێکی بچکۆلە لەمس دروست کراوە.

**المِدَقّ والمُدُقّ**: ئەو ئامێرەیە کەشتی پێ دەکوتی، جا داری جل کوتان بێ یان دەسکەوانی دەرمان کوتان بێ یان شتی تر.

**المُسْتَدَقّ**: لەهەموو شتێك کەبێ ئەودو باریك بێ ٥ باریکایی مەچەك.

**دَقَلَ جِسْمُهُ دقلاً**: جەستەی لاواز بوو.

**دَقَلَ فلاناً**: فلانکەسی مەنع کردو نەیهێشت بەمراد بگا.

**أدقلت الشاة**: مەڕەکە لاواز بوو.

**أدقل النَّخْلُ**: دارخورماکە خورمای خراپی لێ وەبەرهات خراپترین خورمای گرت.

**أدقل فلان**: فلانکەس منداڵێکی جەستە بچوکی هەبوو.

**دَوْقَلَ فلان**: فلانکەس خوی گرت بەخواردەمەنیەکی تایبەتییەوە.

**دَوْقَلَ الشَّيْئَ**: شتەکەی وەرگرتو خواردی ٥ دەگوتری: (دَوْقَلَهُ): خواردەمەنییەکەی بۆ خۆی قۆرغ کرد.

**الدَّقَلُ**: خراپترین جۆری خورما ٥ دارێکی درێژە لەناو قەدی کەشتی دەبەسترێ، سەوڵەکانی بەسەردا ڕەتدەکرێ.

**الدَّقَلَةُ**: (شاة دقلة): مەڕێکی کزو لەڕە.

**الدَّقِيلَةُ**: مەڕە لەڕ، (ك: دِقال ودقائل).

**الدَّوقَلُ**: دارێکی درێژە بەناوەڕاستی بەلەمەوە قایم دەکرێ سەوڵەکانی بەسەردا ڕەتدەکرێ، (ك: دواقِلَ).

**دَقَمَهُ دَقْماً**: لەنکاو پالی پێوە نا ٥ بەرسنگی گرتو پاشەو پاش پالی پێوە نا ٥ ددانی شکاندن ٥ (هو أدقم).

**أدقَمَ فاهُ**: ددانی پێشەوەی شکاند.

**الدُّقْمُ**: غەمی زۆرو نارەحەت بەهۆی قەرزدارییەوە.

**الدُّقْمَةُ**: پێشەوەی دەمو ددان.

**دَقَنَ في لَحْيِهِ دَقْناً**: شەپلاغەیەکی بەهێزی لەلا چاوی دا ٥ مەنعی کردو نەیهێشت بەمراز بگا.

**الدَّيْقَانُ**: سێ کوچکەی ئاگردان.

**دقِيَ** الفصيلُ دَقًى: زۆری شیرخوارد، ورگی تێك چوو، سکی چوو ٥ (فهو دقيّ ودقوان وهي دقوى).

**الدِكتاتورية**: دەسەلاتگرتنە دەستی تاك یان تاقمێك بەبێ ڕەزامەندی ڕەشە خەڵکەکەی حوکمیان دەکەن واتە: بەکێك یان تاقمێك بەخۆ سەپاندنو کێزری حوکم بگرنە دەستو تاکڕەوانە فەرمانڕەوایی گەل بکەن هیچ ڕێو شوێنێکی دیموقراطیو عەدالەتکاری ڕەچاونەکەن.

**دَكْدَك الحفرة**: چاڵەکەی پڕکرد لەگڵ.

**تَدَكْدَكت الجبالُ**: کێوەکە روخا.

**الدَكداك والدِكداك**: زەوییەك هەندێ شوێنی پتەوو زرویو توتمان بێ ٥ لبەلانێك لەناوی دا پارچە گڵی ڕەقبوی تێدابێ.

**إدَّكَرَ**: بڕوانە وشەی (إذ كَرَ).

**دَكَسَ** الترابَ: گڵەکەی پڕکرد.

**دَكَسَ** الوِعَاءَ: قاپەکە یان گونیەکەی پڕکرد لەگڵو کەبسی کرد.

**دَكِسَ دَكَساً**: گڵەکە هەندێکی سواری هەندێکی بوو.

**تداكَسَ**: زۆر بوو.

**تداكس فلان**: فلانکەس توندو تیژو سەر ڕەقو بێ گوێ بوو ٥ ڕەوشتی ناشیرینی نواندن.

**الداكِسُ**: ئاسکی پاڵ کەوتوو.

**الدُّكاسُ**: هەنۆز، ونەوز ٥ (دُكاس الشحم والتمر): بەزی قاتقاتو گردەوبوو خورمای یەك لەسەریەكو تەبار بەستو.

**الدَّكيسةُ**: كۆمەڵە ئادەمیزاد.

**الـدُّوكَسُ**: زۆرو زەبەنـدە ◦ دەگـوترێ: (نِعم دوكَس) و (مال دوكَـس) نـازو نیعمەتی زۆر ماڵو سامانی زۆر.

**دَكِـعَ الحيـوانُ**: ئاژەڵەکـە پـزمیو توشی کۆکە بوو.

**الـدُّكاعُ**: کۆکەیەکـە توشـی حوشـترو ئەسپ دەبێ.

**دَكَّهُ دكّاً**: کوتای وردو هاڕی کرد ◦ پاڵی پێوەنا.

**دكّ البنـاءَ ونحـوه**: باڵەخانەکـەی روخانـد تاله بێخ دەری هێنا.

**دَكّ الأرضَ**: زەوییەکـەی تـەخت کـرد، تەپۆڵـــکەکانی تـــەخت کـــردنو چـاڵەکانی پڕکردنــەوە ◦ قورئـان دەفەرموێ: ﴿كَلَّا إِذَا دُكَّـتِ الْـأَرْضُ دَكًّـا دَكًّـا﴾ ◦ دەگـوترێ: (دَكَّـه المرضُ): نەخۆشی لاوازی کرد.

**دَكَّـت الدَّابَّـةَ**: ولاخەکـەی لێخـوڕیو زەختـی لـێ کـرد زۆر بـڕوا خێـرا بڕوا.

**دَكّ البئرَ**: بیرەکەی پڕکـردەوەو ژێرخـاکی کرد.

**دَكّ الـــترابَ**: گڵەکـــەی رێکخـــستو پەستاوتی.

**دَكّ الترابَ على الميت**: گڵی بەسەر گـۆڕی مردوەکـــەدا کـــردو کوتایـــەوەو پەستاوتی.

**دَكّ الفـرسُ**: ئەسـپەکە خڕبـووەو پـشتی گەورە بوو ◦ (فهو أدَكّ وهي دكّاء).

**تَـداكّ عليــه القــوم**: خەڵــکەکە گەلەکۆمەکێیان لەسـەر کـردو لـێی کۆبونـەوە ◦ دەشـگوترێ: (تَـداكّت عليهم الخيـلُ): ئەسـپ سوار هەڵیان کوتایە سەریانو دەورەیان گرتن.

**إنْدَكّ**: بۆ موطاوەعەی (دَكّ) دێ.

**إنْـدَكّ الرَّمْـلُ**: لمەکە بۆتـە کەمـسەكو یەکتری گرتووە.

**إنْـدَكّ الـسنام**: دوگەکـە بەسەرپـشتی حوشترەکەوە پان بۆتەوە.

**الـدَّكّاء**: زەوی تـەختکراو ◦ تەپۆڵـکەی گـڵ کەلـە گڵەنەرمـە پێـك هاتبـێ توتمانی تێدا نەبێ.

**الدَّكُّ**: روبەری تەخت لە لمەلانو زەوی ◦ دەگـوترێ: (هـذا مكـان دَكٌّ)، (ك: دكوك ودِكاك).

**الـدُّكُّ**: شـتی زەبـەلاحی بـەهێز، (ك: دِكَكَة).

**الدُّكّانُ**: بڕوانە وشەی (دَكَنَ).

**الدَّكّـة**: لمبـەلانی تـەخت ◦ سـەکۆی ئامـادەکراو بـۆ دانیـشتن ◦ کورسـی درێژو کەرەویتە کە بەزۆری لەدار دروست دەکرێ، (ك: دِكاك).

**المِدَكّ**: جادەکوت، زەوی کوت ◦ هەروا

ئەوكەسەی کە بەهێز قاچی بەزەوی دا دەدا ە دەگوترێ: (رجل مِدَكٌ وأمَةٌ مِدَكَةٌ): پیاوێکی ئازایە بۆکار عەرزی لەبەر دەلەرزێ ئافرەتێکی ئازایە بۆ ئیش.

**المِدَكّ والمِدَكَّةَ**: خەرماشە ە رۆڵە ە باگردێن، هەرشتێك زەوی پێ تەخت بکرێ.

**دَكَلَ الطينَ دَكْلاً**: بەدەست قورەکەی تۆپەڵ کرد بۆئەوەی دیوارەکەی پێ سواغ بدا.

**دَكَلَ الشيْءَ**: شتەکەی بەقاچ پان کردەوە.

**دَكَّلَ الدابَةَ**: وڵاخەکەی لەخۆڵەپەتەدا گەوزاند.

**تَدَكَّلَ علينا فلان**: فلانکەس نازی بەسەردا کردین‌و خۆی بەعەزیزو بەرز خستە بەرچاو.

**تدكَّلَ عنه**: گوێی پێ نەداو خۆی خافلاند.

**الدَكْلَةُ**: کۆمەڵە خەڵکێکن بەهۆی خانەدانی‌و جێگەو رێگەی خۆیانەوە گوێ بۆفەرمانی سوڵتان شل ناکەن‌و گەردنکەچی نابن ە قوری تەنك، بەشێك لەو قورە.

**دَكَمَهُ دكماً**: شتەکەی بەسەریەك دا کوتاو وردو هاری کرد ە هەندێکی بەسەر ئەوی تردا هەڵدایەوە.

**دَكَمَ أنف فلان**: لوتی فلانکەسی شکاند.

**دَكَمَ فلاناً**: تەنگی بە فلانکەس هەڵچنی.

**دَكَمَ فلاناً في صدره**: دەستی بە سنگی فلانکەسەوە ناو پاڵەپەستۆی دا.

**تَداكَمَ القومُ**: خەڵکەکە پاڵەپەستۆی یەکتریان کرد.

**دَكَنَ المتاعَ دكناً**: کاڵاکەی بەریەك‌و پێکی لەسەریەك ریز کرد.

**دَكِنَ دَكَناً ودُكْنَةً**: شتەکە مەیلەو رەش بوو.

**دَكِنَ الثوبُ**: کراسەکە چڵکن بوو ە رەنگی تۆزاوی بوو، (هو أدكن وهي دكناء) ە دەشگوترێ: (ثريدةٌ دكناءُ): تێکوشاوێکە زۆری داوو دەرمان تێکراوە، (ك: دُكْنٌ).

**أدْكَنَ**: بەمانا (دَكِنَ) دێ.

**دَكَّنَ المتاعَ**: بەمانا (دَكَنَهُ) دێ.

**دَكَّنَ الدُكان**: دوکانی دروستکرد.

**دَكَّنَ الشيْءَ**: شتەکەی والێ کردەمەیلەو رەش بنوێنێ.

**الدُكانُ**: شوێنی بازرگانیکردن، (ك: دكاكين).

**الدالِبُ**: پشکۆ ئاگرێك نەکوژابێتەوە.

**الدُلْبُ**: هەر درەختێك بروێندرێ بۆ جوانی‌و رازاندنەوە ە لەپێری (الدُلْبِيَّة) بە درەختێکی گوڵدارەو زۆری حەز لەئاوە.

**الدَولابُ**: دۆڵاب.

**اَلْمَدْلَبَةُ**: زەوییەك كە درەختی دولبی زۆر بێ.

**الدُلْتا**: روبەرێكە لەزەوی پێكهاتووە لە پاشماوەی لافاوو لیتەی روبار كە لەبناوانو دەراوەكان دا جێی دێڵێ.

**دَلَثَ دلثاً**: هەنگاوەكانی خێرا خێراو لێك نزیك هاویشتن.

**إدلَثَ الشَّيْئَ**: شتەكەی داپۆشی.

**إدلَثَ القطيفةَ**: بەقەدیفە جەستەو سەری خۆی داپۆشی.

**إنْدَلَثَ**: پەلەی كرد ٥ بە پەلە رۆیی‌و ئاوڕی لەهیچ نەدایەوە ٥ بەبێ لێكۆڵینەوەو وردبونەوە چووە پێشەوە.

**إنْدَلَثَ علينا يشتم**: بە تورە بوونەوە بۆلامان هاتو هێرشی هێنایە سەرمان.

**تَدَلَّثَ**: خۆی تێ فڕێ دا.

**الدِّلاَثُ**: حوشتری خۆشڕو یان هەرشتێك خێرا بڕوا.

**اَلْمَدَالِثُ**: شوێنی شەڕو پێكدادان لەسەر سنورو بەرەی جەنگ دا.

**مَدَالِثُ الوادي**: شوێنی هەڵسانی لافاو لەسەرانسەری شیوەكان دا.

**دَلَجَ الساقي دُلُوجاً**: ئاوگێڕەكە دۆڵچەكەی لەبیرەكە هەڵێنجاو هەڵی رشتە ناو حەوزەكەوە ٥ شیرە دۆشراوەكەی حوشترەكەی گواستەوە بۆناو مەنجەڵە گەورەكە، (ك: دُلُجّ).

**دَلِجَ** بحمله دَلْجاً ودُلُوجاً: ئاوگێڕەكە زۆر بەنارەحەتی ئاوەكەی لەبیرەكەوە گواستەوە بۆناو حەوزەكە.

**أدْلَجَ القومُ**: خەڵكەكە سەر لەئێوارە بەڕێ كەوتن.

**إدّلَجَ القومُ**: خەڵكەكە لەكۆتایی شەودا (لەبەرە بەیان دا) بەڕێ كەوتن ٥ هەموو شەوەكە بەڕێوە بوون.

**الدُلْجان**: كولله بێتان، كوللەی زۆر.

**الدُلْجَةُ**: رۆیشتنی سەر لەئێوارە ٥ شەوڕەو ٥ لە حەدیث دا هاتووە: (عليكم بالدُّلجة فان الأرضَ تطوى بالليل).

**الدَّوْلَجُ**: خانوێكە لەزەوی دا بێ پەنجەرەو دەرگا بێ ٥ ژوری بچكۆلە لەناو خانووی گەورەدا ٥ حەشارگەی ئاژەڵی كێوی لەبن درەختو پەنا پاساردا، (ك: دوا لج).

**اَلْمُدَلِجُ**: ژیشك، پێشی دەگوترێ (أبو مُدلِج).

**اَلْمَدْلَجَةُ**: بەمانا (اَلْمُدلج) دێ ٥ حەشارگەی ئاژەڵی كێوی لەبن درەختو پەنا پاساردا ٥ قاپی گەورە كە شیری تێدا دەگوێزرێتەوە وەكوو تەنەكەو دەبە.

**دَلَحَ** دَلْحاً ودَلَحاناً: بەکۆڵبارەوە ڕۆیشت کۆڵەکەی هێنا، کۆڵەکەی گران بوو کە نەیتوانی هەنگاو بەفراوانی بهاوێ.

**دَلَحت السّحابةُ**: هەورەکە بەهۆی بارگرانیو پڕلەبارانی یەوە بەهێواشی ڕۆیی ○ (هي دالِحٌ)، (ك: دُلَحٌ و دوالِحٌ).

**تَدالَحَ الرجلان الشَّيْئَ بينهما**: ئەو دوکەسە شتەکەیان بەدارێکەوە بەستو هەریەکەیان لایەکی دارەکەیان هەڵگرت ○ لەحەدیث دا هاتووە: (أن أبا سلمان وأبا الدّرداءَ اشتريا لحماً فتدالحاه بينهما على عود).

**دَلِخَ** دَلْخاً: قەڵەو بوو (فهو دلوخ ودَلِخٌ).

**دَلِخَ الإناءَ**: قاپەکە لێوان ڕێژ بوو.

**الدّالِخُ من الرجال**: پیاوی پڕخێرو بێرو بەسود بۆ کۆمەڵ.

**الدُّلاَخ من النساء**: ئافرەتی سمت قەڵەوو گەورە، (ك: دِلاخ).

**الدُّلخَةُ من النساء**: بەمانا (الدُّلاَخُ) دی.

**الدّلوخُ**: درەختی خورمای بەروبوم زۆر.

**دَلْدَلَ اعضاءَهُ**: لەڕۆیشتن دا ئەندامی لەشی جوڵاندن خۆی باداو لارو لەنجەی کرد.

**تَدَلْدَلَ الشَّيْئَ**: شتەکە شۆڕبووەوە شۆڕابەی کرد ○ لەڕۆیشتن دا خۆی ڕاوەشاندو شانی هەڵتەکاندن.

**الدُّلْدُلُ**: گیانلەبەرێکی چقڵاوی ددان تیژە، مێشو مەگەزو کوللەو کرمو مارمێلکە و ئەوجۆرە گیانلەبەرانە دەخوا.

**أدلَسَ القومُ**: خەڵکەکە چونە ناو پەرێزی سەرلەنوێ شین بووەوە.

**أدلَسَ الأرضُ**: زەوییەکە بەگیاوگژی سەرلەنوێ شین بۆوە سەوز هەڵگەڕا.

**دالَسَهُ مدالسة ودِلاساً**: فێڵی لێکردو ستەمی لێ کرد ○ دەگوترێ: (هو لايُدالس ولا يُوالِسُ) ئەو نەستەم دەکاو نە خیانەت دەکا.

**دَلَّسَ البائعُ**: فرۆشیارەکە عەیبی کاڵاکەی لەکڕیارەکە شاردەوە.

**دَلَّسَ المُحَدِّثُ**: ڕاوییە کە حەدیثی لەهاوچەرخی خۆی ڕیوایەت کردو هیچیشی لێ نەبیستبوو ○ وای نیشان دا حەدیثەکەی لێ بیستوە، یان ناوی مامۆستاکەی بە ناوێک هێنا کە پێی نەناسرابوو.

**دَلَّسَ الإبلُ**: حوشترەکە بەشوێن گیای سەر لەنوێ شین بووەی پاوانی خوراو دا گەڕا.

**إنْدَلَسَ**: گوم بوو.

**تَــدَلَّسَ الرجــلُ:** پیاوەکــە عەیبەکــەی شاردەوە پەردەپۆشی کرد.
**تَدَلَّسَ الشَّيْئُ:** شتەکە گوم بوو.
**تَدَلَّسَت الدابَّةُ:** وڵاخەکە شتێکی کەمی لە لەوەڕگاکە دەست کەوت.
**تَــدَلَّسَ فــلان الطعــامَ:** فــلان کەمکــەم لەخواردنەکەی هەڵگرتو خواردی.
**الــدَّلْسُ:** فــێڵو فەجــەر ٥ دەگــوترێ: (مــالي فيــه وَلْــسٌ ولادَلْــسٌ) مــن نــە خیانـەتم لەوشتەدا کـردوە نـەفێڵو فەجەر.
**الدَّلَسُ:** زەوییــەك گیــای لــێ بڕوێتــەوە دوای ئەوەی گیای پێشووی خورابوو ٥ گیــاو گــژ کەدەمــەو پــایز شــین دەبێتــەوە ٥ بــەرماوەو گیاوگــژی کەلەپاشەڕۆك مابێتەوە ٥ تاریکایی شەو، (ك: أدلاس).
**الدُّلْسَةُ:** تاریکی.
**دَلَصَت الدِّرعُ دلاصةً:** زرێکە نەرم بوو.
**دَلِصَ الشَّيَ:** شتەکەی مـشتو مـاڵ کـردو بریقەی دایەوە.
**دَلَصَت المرأةُ جبينها:** ئافرەتەکە زوڵفی لاداو روخساری جوان دەرکەوت.
**دَلَصَ دَلَصاً:** هەڵخلیسکا.
**دَلِــــصَ الــــشَّيْئُ:** شــتەکە بروســکەی داوپڕتەوی دەرکەوت ٥ (هــو أدْلَــص وهي دَلْصاء)، (ك: دُلْصٌ).
**دَلِصَتْ الناقة:** حوشترەکە لەبەر پیریو کۆنــە ســاڵی ددانــەکانی کــەوتن ٥ لەبــەر قەڵــەوی کوڵــکەکەی بــەرداو تــوکی پێوەنــەما ٥ (فهــي دَلِــصَة ودَلْصاءُ).
**أدْلَصَت الحاملُ الجنين:** ئافرەتە سکپڕەکە منداڵەکەی لەبارچوو.
**دَلَّـصَ الـشَّيْئَ:** شـتەکەی سـفتو لـوس کــرد ٥ دەگــوترێ: (دَلَّــصَ الــسيلُ الحجــرَ): لافاوەکــە بەردەکــەی لــوس کردو سوییەوە.
**دَلَّصَ الدِّرْعَ:** زرێکەی نەرم کرد.
**دَلَّصَت المرأة جبينها:** ئافرەتەکە زوڵفی لاداو روخساری دەرکەوت.
**إنْدَلَصَ الشَّيْئُ مِنْ يده:** شتەکە لەدەستی فلانکەس کەوتە خوار.
**إنْــدَلَصَ الــشَّيْئُ عَــنْ الــشَّيْئ:** شــتەکە لەشتەکەی تر جیا بۆوە.
**الــدِّلاَّصُ:** نــەرم، بروســکەدار، لــووس‌و صاف ورشـە بـەخش ٥ (دِرْعٌ دِلاَّص) زرێیەکی نەرمە.
**الدَّلِصُ:** شتی نەرمو شوعلەدارو لوس‌و صاف.
**الــدَّلِيصُ:** نــەرمو بریقــەدارو لــوس ٥ ئاوی ئاڵتون، (ك: دُلَصٌ).
**دَلَظَ في سَيْرِهِ دَلْظاً:** بەخێرایی رۆی.
**دَلِظَت الهَضبةُ بالماء:** گردۆڵکەکە ئاوی لــێ هەڵقوڵا.
**دَلَظَ فلانــاً:** دەسـتی بەسـنگیەوە نـاو پـاڵی

پێومنا ٥ لەفلانکەسی دا.

**دَالَطَهُ مدالَطَةً ودلاطاً**: پالی پێومنا.

**انْدَلَطَ الماءُ**: ئاوەکە هەڵقولا.

**الدَّلَظى**: کەسێك لەشەڕدا خۆنەگرێو هەڵبێ.

**الدَّلَظُ**: کەسێك بەهێز پاڵ بنێ.

**الدِّلیظُ**: کەسێکە زۆر پاڵ بەدەرگای فەرمانڕەواو بەرپرسەوە بنێ.

**دَلَعَ اللِسانُ دُلوعاً**: زمانەکە لەدەم هاتە دەرەوەو بەسەر چەناگەی دا شۆڕ بۆوە بەهۆی تینوایەتی یان ماندوبونەوە.

**دَلَعَ لِسانَهُ**: زمانی دەرهێنا.

**إدْلَعَ لِسانَهُ**: زمانی دەرکێشا ٥ دەشگوترێ: (أدلعه العطشُ) تینوایەتی زمانی پێدەرکێشا.

**إدْلَعَ اللِسانُ**: زمانی دەرکشا لەتینوان یان لە ماندویی یا.

**إنْدَلَعَ اللسانُ**: بەمانا (إدْلَعَ) دێ ٥ دەگوترێ: (إندلَعَ السیف من غمده): شمشێرەکە لەکالان هاتەدەر.

**إدْلَعَ بطنُ فلان**: فلانکەس سکی چوو کۆمی هاتەدەر ٥ سکی هاوساو شۆڕ بۆوە ٥ هەروا دەگوترێ: (إنْدَلَعَتْ نارُ الحرب): ئاگری شەڕ لەناکاو هەڵگیرساو شەڕ گەرم بوو.

**إنْدَلَ بطنُ المرأة**: سکی ئافرەتەکە گەورە بوو شۆڕ بۆوە.

**الأدْلَعُ**: ئەسپێ زمانی دەربکێشێ لەغاردان دا.

**الدَّالِعُ**: پیاوی گێل‌و ئەحمەق ٥ دەگوترێ: (أحمقُ دالِعٌ): ئەوپەڕی گێل‌و نەفامە.

**الدَّلیعُ**: ڕێگای بەرفراوان ٥ دەگوترێ: (طریق دلیع): ڕێگایەکەی تەخت‌و بێ هەورازو نشێوی یە، (ك: دلائِعَ) ٥ دەشگوترێ: (طریق دَوْلَعُ) ڕێگایەکی تەخت‌و بێ هەورازو نشێوی یە، (ك: دوالِعُ).

**دَلَفَ دَلْفاً ودلوفاً ودَلفاناً**: بەهێواشی ڕۆیی‌و هەنگاوی کورتی هەڵهێنان ٥ دەگوترێ: (دلف الشیخ ودلف الحامل بحمله).

**دَلَفَ الیه**: ڕوی تێکرد.

**أدْلَفَ له القولَ**: قسەکەی بۆجەخت کردەوە.

**أدْلَفَ الکِبَرُ فلاناً**: پیری وای لە فلانکەس کرد هەنگاوی کورت بهاوێ.

**إنْدَلَفَ الیه**: ڕۆیشت بۆلای.

**تَدَلَّفَ الیه**: بەمانا (إندلف) دێ.

**الدَّالِفُ**: پیرەمێردێك کە ڕۆژگاری درێژ لەپەل‌و پۆی خستبێ ٥ کۆڵ هەڵگرێك کەبەهۆی گرانیی

كۆڵەكەیـەوە هـەنگاوی كـورت بهـاوێ ٥ تیرێك كورت بكاو لەخوار نیشانەكەوە بـداو شـوێنەكە نـەبڕێ هەڵبەزێتـەوە، (ك: دُلُفٌ ودُلُفٌ).

الدُّلُفُ: پیاوی ئازاو چاونەترس.

الـدُّلُفُ: حوشترێـك كـە بەبارەكەیـەوە هەڵسێ‌و بڕوا.

الـدَّلُوفُ: هـەڵۆی گـورج ٥ حوشـتری قەڵـەو كەلەبـەر قەڵـەوی هـەنگاوی كـــورت بهـــاوێ ٥ دارخورمـــای بەبەروبومی زۆر، (ك: دُلُفٌ).

الدُّلْفِينُ: دۆلفین جۆرە ماسییەكە زۆر لەناو دەریادا مەلەوان سواری پشتی دەبێ.

دَلَــقَ دُلوقــاً: بـەگورجی رۆیـشتە دەر ٥ دەگـوترێ: (دَلَقَ السيفُ مـن غِمـده): شمـــشێرەكە نەچـــوەوە نێـــو كالانەكەی.

دَلَقَ الخيلُ: ئەسپەكان یـەك بـەدوای یـەك دا هاتنە دەر.

دَلَقَ الشَّيْءَ: شتەكەی دەرهێنا.

دَلَقَ الغارَةَ عليهم: هێرشی كردەسەریان.

دَلَقَ بابَهُ: بەتوندی دەرگاكەی كردەوە.

أدْلَقَهُ: بەمانا (دَلَقَ).

إنْدَلَقَ الـشَّيْءُ: شـتەكە لەشوێنی خـۆی بەتەوژم دەرچوو ٥ دەگوترێ: (طعنه فاندلَقَتْ أحشاء بطنه): زەبرێـكی لـێ دا ریخۆڵەی هەڵڕژانە دەر.

إنْدَلَقَ السيلُ: لافاوەكە بەتەوژم هەڵساو هێرشی هێنا.

إنْدَلَقَ البابُ: دەرگای ئوتوماتیـك یـان هەردەرگایـەك بۆخـۆی بكرێتـەوەو پێوە بدرێتەوە.

تَدَلَّقَ: راچمی، هەڵسا ٥ دەگـوترێ: (تدلَّقَ السيلُ وتدلَّقت الخيلُ).

استدلَقَ السيف من غمده: بەمانا (دَلَقَهُ) دێ.

الأدْلَقُ: كەسێـك بـەهۆی پیری ددانـی لـەدەما نـەمابێ‌ولیك لـەدەمی بێتـە دەر ٥ (هي دَلْقاءُ).

الـدَّالِقُ: پێـشكەوتوو ٥ یـان شمـشێرێك كەبەخۆشی لە كالان بێتە دەر.

الـدَّلَقُ: دەعبایەكـە لەشـێوەی پـشیلە، پـشتی درێـژە لـە پێـستەكەی فـەروە دروست دەكرێ واتە دەڵەك.

الدَّلِقُ من السيوف: بەمانا (الدَّالِقُ) دێ.

الدُّلُوقُ: بـەمانا (الأدلق) دێ ٥ هێـرش‌و هەڵكوتانە سەر.

دلَـــكت الـــشَّمْسُ دلوكـــاً: خـــۆر لەناوەڕاسـتی ئاسمـان لای دا بـەرەو خۆرئاوا ٥ قورئان دەفـەرموێ: ﴿أَقِمِ الصَّلَاةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ﴾.

دَلَـكَ السنبلُ دَلْكاً: دانەوێڵەكە یـان بـەرە درەختەكـە توێـكڵەكەی قەڵـشاو

دەمی کردەوەو دەنکەکەی دەرکەوت.

**دَلَكَ** الشَّئ: شتەکەی جولاند شێلای ٥ دەستی پێدا هێنا.

**دَلَكَ** الجَسَدَ: جەستەکەی شێلا ٥ سفتو لوسی کرد ٥ مشتو ماڵی کردو تیفتیفەی دا.

**دَلَكَ** الثَّوبَ: کراسەکەی بەدەست هەڵگلۆفت بۆئەوەی بیشوا.

**دَلَكَ** الوَجْهَ ونَحوه بالطيب: دەمو چاوی خۆی ئارایش دا.

**دَلَكَ** الدَّهرُ فلاناً: رۆژگار فلانکەسی لەبۆتە داو تەربیەی دا دا.

**دَلَكَ** عَقِبَيْهِ للأمر: لەسەر پێ بوو بۆ ئەنجامدانی کار.

**دُلِكَتِ** الأرضُ: زەوییەکە گژوگیاکەی خورا.

**دالَكَ** فلاناً: لەگەڵ فلان دا هەڵیکردو بەصەبرو پشوو درێژبوو.

**دالَكَ** غريمه: خاوەن قەرزەکەی ماتڵ کردو لەکاتی خۆی دا قەرزەکەی بۆ نەگێڕایەوە.

**دَلَّكَ** الشَّئ: زێدەڕۆیی کرد لەشێلانی شتەکەدا.

**دالَكَ** المريضَ: نەخۆشەکەی ورد ورد شێلا بۆ ئەوە لەشی نەرم بێ.

**دالَكَ** الجَسَدَ: دەستی بە جەستەدا هێناو زۆری دەست رێ خست بۆئەوەی پاك بێتەوە.

**تَدَلَّكَ** الرجلُ: پیاوەکە لەکاتی خۆشتن دا زۆری دەست رێ جەستەی خۆی خست.

**تَدَلَّكَ** بالطيب: داوو دەرمانی لەدەمو چاوی هەڵسو.

**الدُّلُك**: ئاوە بۆکاتی ئاوا بوونی خۆرو لادانانی لە نیوەراستی ئاسمان بۆلای خۆرئاوا ٥ نەرمایی ئەژنۆی حوشتر.

**الدلاَّك**: کەسێك جەستەی یەکێکی تر دەشێلێ بۆ لابردنی ئازارو نەخۆشی یان بۆ نیشات پەیدا کردن، هەروا موتاشین بۆ پاكو خاوێنی.

**الدَّلوك**: ئەوشتەی بۆ شێلان بەکاری دەهێنن وەکوو بۆدرەو مەڵهەمو شتی وا.

**الدليك**: خشتو خۆڵ کە ڕەشەباو بای بەهێز دەیبەن ٥ خواردەمەنییەکە لەرۆنو شیرو پەنیر دروست دەکرێ وەکوو تریت ٥ پیاوی دونیا دیدەو کاراماو لێزان لەئیش، (ك: دلك).

**المُدالِكُ** من الرجال: پیاوێکە خوی بەبێناموسییەوە گرتووەو وازی لێ ناهێنێ.

**المُدَلِّكُ**: بەمانا (الدَّلاَّك) دی.

**دلَّ** عليه واليه دِلالةً: شارەزایی کرد.

**دَلّتِ المرأة على زوجها**: ئافرەتەکە لەروی نازەوە سەرپێچی مێردەکەی کردو وای خۆپیشان دا نارازییە وەلێ لەواقیع دا وانییە ٥ دەگوترێ: (ما دَلّكِ عليَّ) چی وای لەتۆکرد نازو نوزم بەسەرابکەی.

**أدَلَّ عليه**: بتمانەی بەخۆشەویستی ئەو کردو ئەویش زۆری ئەو خۆش ویست.

**أدَلَّ عليه بصحبته**: تینی دایە خۆیو لەخۆی رابینی هاوەڵی بکا.

**أدَلَّ الرجل على أقرانه**: لەناکاو پیاوەکە هاوەڵەکانی گرتنو بەسەریان دا چوو ٥ دەگوترێ: (أدلّ البازی على صیده) بازەکە لەناکاو نێچیرەکەی خۆی راوکرد.

**أدَلَّ الذِئبُ**: گورگەکە کزکرا.

**أدَلَّ بالطريق**: رێگاکەی زانیو شارەزای بوو.

**دلَّلَهُ**: نەرمو نیانی لەتەربیەکەی دا نواند بەجۆرێك گوێڕایەڵی نەکردو لەروی هەڵگەڕایەوە.

**دَلّلَ على المسألة**: بەڵگەی لەسەر مەسەلەکە هێنایەوە.

**دَلّلَ على السلعة**: کاڵاکەی هەڕاج کرد ٥ بانگەشەی فرۆشتنی کرد.

**إنْدَلَّ الماءُ**: ئاوەکە هەڵڕژا.

**تدلّلت المرأةُ على زوجها**: بەمانا (دلت علیه) دێ، واتە: چاوی لەمێردەکەی کرایەوە.

**استدلَّ عليه**: داوای لێ کرد بەڵگەی لەسەر بێنێتەوە.

**استدلَّ بالشَّيْئِ على الشَّيْئِ**: ئەوشتەی کرد بە بەڵگە لەسەر شتەکە.

**الأدَلُّ**: ئەوکەسەی ئیشەکانی خۆی دەکاتە منەتو بار بەسەر خەڵکەوە.

**الدَّالَّةُ**: ئەوشتەی کە دەیکەیە بەڵگە لەسەر دۆستایەتیو خزمایەتی ٥ ئەو هەڵوێستو ئاکارەی دەیکەیە نیشانەی دڵسۆزی خزمو دۆست ٥ نازایەتی.

**الدَّلّ**: نازو نوز ٥ (الدَلّ من المرأة): قسە خۆشی ئافرەتو نازکردنو سوعبەتچییەتی.

**الدِلالة**: شارەزایی کردن ٥ ئەومانایەی رستەو وشە دەیگەیەنن لەکاتی گوتنی دا، (ك: دلائل دلالات).

**الدَّلالة**: بەمانا (الدِلالَة) دێ ٥ ناوە بۆ ئەو هەوڵدانو ماندو بوونەی کە دەڵاڵ دەیکا ٥ کرێی دەڵاڵی.

**الدَّلُّ**: ئەو حاڵاتو دیاردەیە کە ئادەمیزاد خۆی پێ دەرازێنێتەوە وەکوو لەسەرەخۆیی و شکۆمەندی

لەئاکارو رەفتاردا ٥ دەگوترێ: (إمرأة ذات دِلٍّ): ئافرەتێکە شێوە روخساری نەجیبیو وەجاغزادەیی پێوە دیارە.

**الدَّلاّلُ**: ئەوکەسەیە دەبێتە بریکاری کڕیارو فرۆشیار، کڕیارو فرۆشیار یەکدەخاو مامەڵەکە سازدەکا ٥ ئەوکەسەی بانگەشە بۆ کالاکەی دەکاو دەیەوێ بەپیاهەڵدانو وەسفکردن بیفرۆشێ.

**الدِّلِيلَى**: بەمانا (الدَّلِيلُ) دێ.

**الدَّلِيلُ**: چاو ساغو شارەزایی کەر، (ك: أدلة وأدلاّء) ٥ ئەوەی دەکرێتە نیشانە، (ك: أدلة).

**الدَّلِيلَةُ**: بەمانا (الدَّلِيل) دێ.

**دَلِمَ الشَّيْءُ دَلَماً**: شتەکە زۆر رەشو لووسو پوس بوو.

**دَلِمَ الرجلُ**: پیاوەکە رەشو درێژ بوو.

**دَلِمَتْ شِفَاهُهُ**: لچی شۆڕ بوونەوە ٥ (هو أدْلَمُ، هي دَلْماءُ).

**إدْلاَمَّ الشَّيْءُ**: بەمانا (دَلِمَ)دێ.

**دَلِمَ اللَّيلُ**: شەوەکە تاریکییەکەی تەواو چڕ بۆوە.

**الدَّلاَمُ**: رەشو رەشایی.

**الدُّلَّمُ**: فیل

**الدُّلَّمُ**: بێچوە مار، (ك: أدلام).

**الدَّلْماءُ**: شەوی کۆتایی مانگی عەرەبی (قەمەری).

**الدُّلْمَةُ**: رەنگی فیل.

**الدَّيْلَمُ**: تاقمێک خەڵکانی نا عەرەب بوون کە دانیشتوی دەورو بەری ولاتی ئازربایجان بوون ٥ بەڵاو کارەسات ٥ دوژمنو ناحەز.

**إدْلَمَّسَ الليلُ**: شەوەکە تاریکی زۆر چڕ بووە ٥ دەگوترێ: (هو مُدْلَمِّسٌ).

**الدُّلاَمِسَ**: زۆر رەشو تاریک ٥ بەڵاو کارەسات.

**الدِّلْمِسُ**: بەڵاو کارەسات.

**دَلْمَصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بریسکە دار کرد.

**تَدَلْمَصَ رأسُهُ**: سەری روتایەوە.

**الدُّلاَمِصُ**: شتی بروسکەدارو بریقاوی ٥ دەگوترێ: (ذَهَبٌ دُلاَمِصٌ).

**دَلَهَ دَلْهاً**: تەسەلای هات ٥ خوێنی بەفیڕۆ چوو.

**دَلِهَ دَلْهاً ودَلَهاً ودُلُوهاً**: دڵی لەسۆزو عیشق دا توایەوە.

**دَلِهَتْ فلانَةُ على ولدها**: فلان ئافرەت سوێی بۆوە بۆ منداڵەکەی ٥ (فالرَّجُلُ دَلِهٌ وهي دِلِهَةٌ).

**دَلِهَتِ النَّاقَةُ عَنْ إلفها وَوَلَدِها**: حوشترەکە بروی هاوڕێیەکەی یان بێچوەکەی نا.

**دَلَّهَهُ الحُبُّ والعِشْقُ**: خۆشەویستیو سۆز ماتو حەیرانی کرد.

تَدَلَّهَ: سەرسام بوو.

الدَّالِهُ والدالِهَةُ من الرجال: ورەنـزەو نەفس زەعیف.

المُدَلَّهُ من الرجال: پیاوێـك بـەهۆی عەشقەوە عەقڵی تێك چوبێ.

إدْلَهَمَّ الظلامُ: تاریکایی چڕ بووە.

إدْلَهَمَّ الليلُ: تـاریکی شەو چڕ بۆوە ٥ (فهو مُدْلَهِمٌّ).

إدْلَهَمَّ الرجُلُ: پیاوەکە پیرو کەنـەفت بوو.

الدُّلْهَامُ: شێر ٥ پیاوی ورە بەرزو ئـازاو چاو نەترس.

المُدْلَهِمَّةُ: (فـلاة مُدْلَهِمَّةٌ): دەشتێـکی کاکی بە کاکیو بێ گردوتەپۆڵکە.

دلا الدَّلْوَ وبها دَلْواً: دۆڵچەکەی داهێشتە خوار بۆ نـاو بیرەکە بۆئـەوەی پـڕی بکـا لـەئاو، یـان لـەناو بیرەکـەوە هەڵیکێشایەوە بە پڕی.

دلا فلانـاً: لەگـەڵ فلانکـەس دا هێـدیو هێمن بوو، لەگەڵی هەڵکرد.

دلا بفـلان إلى فـلان: فلانکەسـی کـردە تکاکار بۆلای فلان.

دلا النَاقَـةَ: لەسـەرە خـۆ حوشـترەکەی لـێ خوڕی.

دلا حاجَتَـــــهُ: داوای دابینکردنـــــی پێداویستییەکی خۆی کرد.

دَلِيَ دَلَىً: سەرسام بوو.

أدْلَـى: دۆڵـچەکەی شۆڕکردوە بۆنـاو بیرەکـە بۆئـەوەی پـڕی بکـا لـەئاو ٥ دەشکوترێ: (أدلى الشَّيْءَ في المهـواة): شتەکەی بەرەڵڵای سارا کرد.

أدْلَى فـلان بحجتـه: فلانکـەس بەڵـگەی خـۆی ئامـادەکردو هێنایـە رو بـۆ چەسپاندنی داواکەی، یان فلانکەس بەڵـگەی خـۆی چەسپاندو داواکـەی بردەوە.

أدْلَى فلان بِرَحِمِهِ: فـلان کـەس رەحـمو خزمایـــەتی کـــردە تکاکـــار بـــۆ بەجێهێنانی ئامانجەکەی.

أدْلَى فلان إلى الحاكم برشوة: فلانکەس بەرتیلی دا بەحاکم.

أدْلَى فلان إلى الميت بالبنوة: فلانکـەس بەکوڕیـــەتی دەگاتـــە مردوەکـــەو نەوەی ئەوە.

دالاه: نـەرمو نیـانی لەگـەڵ دا نوانـدو خۆی لەگەڵ گونجاند.

دلَّى الدَّلْوَ: بەمانا (دلاها) دێ.

دلَّـــى الـشَّيْءَ في المهـــواة: شـتەکەی بەرەڵڵای ساراکرد.

دلَّـــى فلانـــاً بغـــرور: فلانکەســـی هەڵخەڵەتانـــــدو خـــستیە داوی خۆیەوەو ویستی خۆی بەجێهێنا.

تَدَلَّى: شۆڕبۆوە، لەبەرزییەوە دابەزی ٥

قورئان دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى﴾ ◦ دەگوترێ: (تدلّى من الجبل).
تدلّى: نزیك بووە لەشتەكە.
تدلّى الثمر من الشجر: میوەكە بەدرەختەكەوە شۆڕابەی كرد.
تدلّى عليهم من أرض كذا: لەفلان شوێنەوە هاتەلایان ◦ دەگوترێ: (من أين تدلّيت علينا؟).
إدْلَوْلى: پەلەی كرد.
الدّالي: دابەزیو ◦ پەكێك لەهۆزی (الدُّلاة) ئەمانە هۆزێكی كورد نەژادن ◦ خورمایەك كە هێشتا شیرین نەبووبێ كاتێ شیرن دەبێ دەخورێ.
الدّالية: دۆڵچەو شتی لەو جۆرە ◦ دارێكە لەسەر شێوەی صەلیب دروست دەكرێ لەزاركی دۆڵچەكە قایم دەكرێو سەرێكی حەبلەكەی لێ دەبەسترێ، سەرەكەی تری حەبلەكە لەسەر لێواری بیرەكە بەشتێكەوە دەبەسترێ ◦ ناعور كە بەولاخ هەڵدەسوڕێندرێو لەنزماییەوە ئاوی پێ هەڵدەهێنجندرێ ◦ زەوییەك بە دۆڵچەو ناعور ئاو بدرێ، (ك: الدّوالي).
الدّوالي: ترێ رەشكە كە زۆر رەشنەبێ ◦ هێشوەكانی لەهێشوی هەموو ترێیەكی تر گەورە ترە، ترێكەشی زۆر ئاودار نییە، دەشكرێ بەمێوژ◦ هەروا ئاوە بۆ دەردێك توشی قاچو قول دەبێ رەگەكانی دەهاوسێن.
الدّلاة: دۆڵچەی بچوك ◦ دۆڵچەی گەورە ◦ گوانی زل ◦ بەشێك لەشت.
الدُّلُوُ: زەرفێكە ئاوی پێ لەبیر هەڵدەگوازرێ ◦ بورجێكە لە بورجەكانی ئاسمان.
دَمِثَ المكان وغيره دَمَثاً: ئاسان بوو نەرم بوو ◦ (هو دَمِث وهي دمثة).
دَمُثَ الرجلُ دماثةً ودموثةً: رەوشتی نەرمو نیانە.
دَمَّثَ الشَّيْءَ بيده: بەدەستی خۆی شتەكەی نەرم كرد.
دَمَّثَ المَضْجَعَ: شوێنی نوستنی رێك خستو چاكی كرد.
دَمَّثَ الحديث لفلان: سەرەتای قسەكەی بۆ كابرا گێڕایەوە یان سەرەتای قسەی بۆ فلان دەرخست بۆئەوەی مەبەستەكە بزانێو لەوبارەوە بكەوێتە قسە.
دَمَجَ الليلُ دُموجاً: شەو تاریك بوو.
دَمَجَ الحيوان: پێڕۆكە خێرا رۆیشتو هەنگاوەكانی خێرا خێرا هەڵێنان.
دَمَجَ الشَّيْءُ في الشَّيْء: شتەكە چووە

شتەکەوەو تێیدا جێگیر بوو ٥ دەگوترێ: (دمج في البيت) چووە ناو خانوەکەوەو تێیدا جێگیر بوو.

دَمَجَ الأمْرُ: کارەکە راست بوو، جێ بەجێ بوو.

دَمَجَ على القَومِ: چووە دیوەخان‌ومالی خەڵك بەبێ ئەوەی ئیزنی چونە ژورەوە بخوازێ.

دَمَجَت الماشِطَةُ الشَّعْرَ: قژ چاککەرەکە قژەکانی بەشانە کردن‌و هۆنینیەوەو رێکی خستن.

أدْمَجَ الشَّيْءَ: شتەکەی لەقوماشەکەوە پێچا.

أدْمَجَ الحَبْلَ: لەسەرە خۆ گرێ‌و قولفەی حەبلەکەی قایم کردن.

أدْمَجَت الماشِطَةُ الشعرَ: بەمانا (دَمَجَتْهُ) دێ.

أدْمَجَ فلان الفَرَسَ: فلانکەس ئەسپەکەی کزو لاواز کرد.

أدْمَجَ كلاَمَهُ: قسەکانی بەرێك‌و پێکی کردن ٥ یان قسەکانی تەم‌و مژاوی بوون.

دَامَجَهُ: لەگەڵی دا گونجاو موداراتی کرد.

دامَجَ فلاناً على الأمر: رازیبوونی خۆی نیشان دا بۆ فلانکەس لەسەر ئیشەکە.

دامَجَ فلاناً عليهم: فلانکەسی خستە گەڵ پێرەکە.

إدّمَجَ الشَّيْءُ في الشَّيْءِ: بەمانا (دَمَجَ)دێ.

إدّمَجَ الفَرَسُ: ئەسپەکە کزو لاواز بوو.

إنْدَمَجَ الشَّيْءُ في الشَّيْءِ: بەمانا (دَمَجَ)دێ.

تَدامَجُوا على فلان: گەلە کۆمەکیان لەفلان کرد، لەفلانکەس کۆبونەوە.

تَدَامَجَ على الشَّيْءِ: لەسەر کارەکە رێك کەوتن.

تَدَمَّجَ في ثيابه: خۆی لەپۆشاکەکەیەوە پێچا.

الدَّامِجُ: کۆکەرەوە ٥ دەشگوترێ: (ليل دامِجٌ) شەوێکی تاریك‌و نوتەکە.

الدُّماجُ: پتەو، دەگوترێ: (صُلْحٌ دُمَاجٌ) رێککەوتنێکی پتەوو قایم‌و قوڵە ٥ یان صولحێکی ژێر بەژێرە ٥ (أمر دماج): کارێکی راستە بیرو بۆچونێکی باشە.

الدَّمَجُ: پرچ‌و زوڵف.

الدُّمْجُ: هاوشان، دۆست‌و یار.

الدُّمْجَةُ: رێگاو پەیڕەوو پرۆگرام ٥ دەگوترێ: (هو على تلك الدُّمْجَة): ئەو لەسەر ئەو بیرو باوەڕو رێبازەیە.

الدُّمَيْجَةُ: کەسێك تەمبەڵ‌و خەواڵو

بـێ، لـەماڵ دابنیـشێو هـیچ نـەکا ◦ پیاوی بێ خێرو بێر.

المدْماجة من الرجال: پیـاوی بڕیـاردەرو کار دروستو قسە ڕۆیشتوو.

المُدْمَجُ: پیاڵە ◦ داشی قومـار ◦ پیـاوی ڕەوشت بەرزو خۆگرو پشوو درێـژو قـاڵبوو لەبۆتـەدراو وەکـوو حـەبلی تێـك باهەڵدراوو پتەو.

دَمْدَمَ علیه: رقی لـێ هەڵسا.

دَمْدَمَ القومَ وعلیهم: خەڵکەکەی تەفرو تونا کردو لەناوی بردن.

دَمْدَمَ الشَّیْئَ: شتەکەی ریشەکێش کرد.

دَمْـدَمَ علیـه القَبْـرَ: گۆڕەکـەی تـەخت کرد، یان سەقفی لەسەر کرد.

تَدَمْدَمَ الجُرْحُ: برینەکە چاك بۆوە.

الدُّمـادِمُ: شتێـکی سورە وەکـوو قـەتران دەچـێ، لـەدرەختی سـەلەمو سـەمور دەتکێ وەکوو چۆن بنێـشتە تـاڵ لـە دارەبەن دەتکێ.

اليَمْدِمُ: لەوەڕی وشکەوە بوو.

دَمَـــرَ فـــلانٌ دُمُـــوراً ودمـــاراً: فـــلان بەهیلاکچوو.

دَمَرَ علیهم دموراً: چووە لایان بەبێ ئیزن ◦ هێرشـی شــەڕەنگێزانەی کردنــە سەر.

دامَـرَ اللَّیْـلَ: بـە ڕابـواردنو کـەیفو شادی شەوی بەڕۆژ کردەوە.

دَمَّـرَ الـشَّیْئَ: شـتەکەی لـەناو بـرد ◦ روخاندی ◦ تێکی دا.

دَمَّـــرَ القـــومَ وعلـــیهم: خەڵـــکەکەی لەناوبردو فەوتاندنی.

دَمَسَ الظلامُ دَمْـساً ودموسـاً: تاریکییەکـە چڕ بۆوە.

دَمَسَ اللَّیـلُ: شـەوەکە تاریکییەکـەی زۆر توند بوو ◦ دەگوترێ: (لیل دامِسٌ): شەوێکی زۆر تاریكو تونەکە.

دَمَـــسَ المرضِـــعُ: شـــوێنەکە کـــوێر بـــۆوە ئاسەواری نەما.

دَمِـــــسَ بیـــــنهم: ئاشـــتەوایی خـــستە نێوانیانەوە.

دَمِسَ الشَّیْئَ دَمْـساً: شتەکەی داپۆشی.

دَمِسَ علیه الخَبَرَ: هەواڵەکەی شاردەوە.

دَمِسَ فلاناً في الأرض: فلانکەسی ژێرخاك کرد بەزیندویی یا مردویی.

دَمِسَتْ یَدُهُ دَمْساً: دەستی لە پیسییەوە چوو.

أدمَسَ اللیلُ: بەمانا (دَمَسَهُ) دێ.

دامَـسَهُ: ئـەوەی لـەدڵی دا بـوو لـێی شاردەوە.

دَمَّسَ الشَّیْئَ: شتەکەی لـەژێر خەڵـکی تردا شاردەوە.

دَمَّسَ فلاناً: بەمانا (دَمَسَهُ) دێ ◦ بەمانا چڵکن کردنیش دێ.

دَمَّـسَ الخمرَ: کوپـە شـەرابەکەی زارهـاخن کـرد.

**دَمَّسَ قِدْرَ الفول**: مەنجەڵە پڕ لە (الفول)ەكەی خستە ناو كڵی تەپاڵەی داگیرساوەوە، بۆئەوەی بكوڵێ.

**إندَمَسَ الرجلُ**: پیاوەكە چووە ناو تاریكییەوە، ناو تەمو مژەوە.

**تدمَّسَتِ المرأةُ**: ئافرەتەكە داوو دەرمانی لەخۆی هەڵسو.

**الأدْمُوسُ**: تاریكی ٥ دەگوترێ: (لیل أدموس) شەوێكی تاریكە.

**الدَّامُوسُ**: كۆختەو سەنگەری راوكەر، (ك: دوامیس).

**الدِّماسُ**: پەردە ٥ هەرشتێك شت داپۆشێ ٥ پەردەیەك كەدەدرێ بە كوننە ئاوو شتی وادا.

**الدِّمْسُ**: شەخسو كەس.

**الدِّمْسُ**: شتی گەورەو سامناك، دەگوترێ: (جاءوا بأمور دُمْسٍ): كاری گەورەیان خستە ڕوە شتی سەرنج راكێشیان ئەنجام دا.

**الدِّمْسُ**: تێكەڵەیەكە لەبەرزە ئاخورو وردە كاو ریخی ولاخ ٥ بەكوردی (تەپاڵە) بۆ سوتەمەنی بەكاردێ.

**الدَّمسُ**: هەرشتێك شت داپۆشێو بكرێتە پەردە.

**الدَّمِيسُ**: بەمانا (الدَّمسُ) دێ.

**الدَّيماسُ**: هێلانە ٥ زێرابی تاریك ٥ ئەشكەوتو كونی بێ مەنفەز ٥ گەرماو، (ك: دیامیس ودمامیس).

**الْمُدَمِّسُ**: بەندیخانە.

**الْمُدَمَّسُ**: هەرشتێك شیلەی هەنگوینی بەسەرەوە بێ ٥ (الفول اَلْمُدَمَّسُ): فول كوڵاو لەمەنجەڵی سەرقاپ نراوەدا.

**دَمِشَ فلان دَمَشاً**: فلانكەس خروی تێكەوتو هەڵچو بەهۆی گەرما یان خواردنەوەی دەرمانو شتی لەوجۆرە.

**أدْمَشَهُ**: تێكەڵی كرد.

**دَمَّشَهُ**: بەمانا (أدْمَشَهُ).

**دمْشَقَ في الشَّيْئِ**: پەلەی لەشتەكە دا كرد.

**دمْشَقَ العَمَلَ**: بەخێرایی كارەكەی ئەنجام دا ٥ دەگوترێ: (دَمْشَقَ الشِّوَاءَ): پەلەی كردلە برژاندنی گۆشتەكەو زۆری نەبرژاند.

**دمْشَقَ الشَّيْئ**: شتەكەی ڕازاندەوەو جوانی كرد.

**الدِّمَاشِقُ**: خۆشڕۆ ٥ بەپەلە.

**الدِّمَشْقُ**: بەمانا (الدِّماشِقُ) دێ ٥ ناوی پایتەختی جمهوری سوریایە.

**دَمَصَ دَمْصاً**: پەلەی كرد (دَمَصت الأنثى): سكپڕەكە بێچوەكەی بەناكاملی دانا.

**دَمِصَ رأسُهُ دَمَصاً**: هەندێ جێگە لەسەری

موى كەم بوو، (هو أدمص وهي دمصاء)، (ك: دُمْصٌ).

الدَّوْمَصُ: ئەصڵو بنەماى ئاسن، ئەو ماددەيەى ئاسنى لىێ دروست دەكرێ.

دمعت العَيْنُ دَمْعاً ودمعاناً: فرمێسكى ڕژان ◦ دەشگوترێ: (دَمَعَت الشجّةُ): برينەكە خوێنو زوخاوى لىێ هات.

دَمَعَ المطرُ: باران بارىو بوو بەلافاو بەسەر زەوى دا.

دَمَعَتْ الجَفْنَةُ: قسعەكە چەورى زۆر بوو سەر ڕێژى كرد.

دَمَعَ الثرى أو المكان: شوێنەكە گلەكەى وادەردەكەوێ دەڵێى شەونمى لىێدەتكێ.

أدْمَعَ الإناءَ: قاپەكە، گۆزەكە پڕبوو هەتا لىێى ڕژا، سەرڕێژى كرد.

الدِمّاعُ: هێڵێكى بچكۆلەيە ڕێڕەوى فرمێسكى حوشترە.

الدُّمّاعُ: شوێنى فرمێسك بەروخسارەوە ◦ ئاوى چاو بەهۆى نەخۆشى يان پيرى كەلەچاو دێتە خوار.

الدَّمْعُ: فرمێسك، (ك: أدمُعٌ ودموع).

الدَّمِعَةُ: گرينۆك ◦ دەگوترێ: (إمرأة دَمِعَة): ئافرەتێكە زۆر گريانى دێ ◦ (رَجل دمِعٌ): پياوێكە زۆر گريانى دێ، يان فرمێسكى زۆرە.

الدُّمّعَانُ: پيالەيەك كەپڕ بووبێو لەهەموو لايەكەوە سەرڕێژ بكا.

الدَّمْعَةُ: دڵۆپە فرمێسك، (ك: دمَعٌ).

دَمعَة الكرم: شەراب، گوشراوى ترێ.

الدَّمَاعُ: دەگوترێ: (يوم دماع): واتە: شەونمو وردەبارانى زۆرە.

الدُّماعُ: ئەو ئاوەيە كەبەهاران لەدارى مێو دێتە خوار ◦ ئەوجولانەوەى سەرى منداڵە كە لەكاتى لەدايكبون دا دەيكا.

الدَّمُوعُ: دەگوترێ: (عين دموع): چاوێكە زۆر فرمێسك دەڕێژێ ◦ خێرا فرمێسكى لىێ دێ ◦ (ثرىً دَمُوعٌ): گڵێكە ئاو دەدزێ ئاوى لىێ دێ يان خەريكە ئاوى لىێ پەيدا بێ.

الدَّمِيعُ من الرجال: پياوێك زوو گريانى بێ، زۆر فرمێسك بڕێژێ، (ك: دَمْعى ودمائع) ◦ هەروا دەگوترێ: (إمرأة دميع): ژنێكى گرينۆكو چاو بەفرمێسكە زۆر دەگرى، (ك: دَمْعى ودمائع).

اَلْمَدْمَعُ: ڕێڕەوى فرمێسك، شوێنگەى فرمێسك ◦ شوێنى كۆبوونەوەى فرمێسك لەناو پێڵوى چاوو قولينچكى چاودا.

دَمَغَ فلاناً دَمْغاً: سەرى فلانكەسى شكاند تا برينەكە گەيشتە دەماغ ◦ مێشكى

پرژاندو خستیه دەر، (فهو رهي دميغ)، (ك: دَمْغی).

دَمَغَتِ الشمسُ فلاناً: خۆر ئازاری مێشکی فلانکەسی دا ٥ کاری لە مێشکی فلان کرد.

دَمَغَ الحَقُ الباطلَ: حەق بەتاڵی قەلاچۆ کرد.

دَمَغَ المَعْدَنَ ونحوه: قاپو قاچاغەکانی کارگەکەی بە مۆرێکی تایبەتی نیشانە کردو نارمێکی تایبەتی لێ دا.

أَدْمَغَ الطعامَ: خواردەمەنییەکەی پێش ئەوەی بیجوێ قوتی دا.

أَدْمَغَ فلاناً إلى كذا: فلانکەسی ناچار کرد بۆ فلان شت.

دَمَّغَ الثريدةَ بالدَّسَم: تریتەکەی بەچەوری نەرم کرد.

الدَّمِغة من الشجاج: یەکێکە لەو دە برینە کوشندانەی کاریگەرییەکانیان دەگاتە دەماغو دەبێتە هۆی مردن ٥ دارێکە دەخرێتە نێوان دوو عەمودەوە کوندە ئاوی پێدا دەکرێ ٥ ئاسنێکە پاشەوەی کەژاوەو بارگەنەی پێ قایم دەکری.

الدَّموغ والدامِغَةُ: ئەوەی شت وردو هاڕ دەکا.

الدِّماغ: مێشك، ئەوەی لەناو کاسەی سەردایە لەمۆخو موخیخو نوخاعو رەگو زۆر شتی تر ٥ هەروا بەمانا سەر دێ.

الدَّمْغَةُ: باجو رەسمێکە حکومەت یان کۆمپانیایەك لەسەر نووسراو بڵاو کردنەوە وەری دەگرێ.

دِمْغَةُ المسكوكات: تەمغەو نیشانەیەکە فەرمانگەی تایبەتی بازرگانی لەپارەو مەعدەنی دەدا بۆئەوەی خەڵکی دڵنیا بن لەوەی وەزنو عەیباری ئەو مەعدەنە چەندەو چییە.

دَمَقَ دُمُرقاً: لەناکاو چووە ژوورەوەو ئیزنی نەخواست ٥ دەشگوترێ: (دَمَقَ القومُ في الخمر): خەڵکەکە ئالودەی خواردنەوەی شەراب بوو زۆریان خواردەوە.

دَمَقَ الشَّيءَ: شتەکەی ژێر بەژێر دزی.

دَمَقَ الشَّيءَ في غيره: شتەکەی خستە ناو شتێکی ترەوە ٥ تێکی ترنجاندن.

دَمَقَ فاه: ددانەکانی شکاندن.

دَمَّقَ العجينَ: ئاردی بەهەویرەکە کرد بۆئەوەی لەدەستییەوە نەهاڵێ.

إنْدَمَقَ رأسُ الفخذ: سەری ئێسقانی ڕانی لەقرۆڵکی خۆی دەرچووە، جولاوە.

الدَّمَقُ: سەرماو بەفرو كرێوە لەگەڵ ڕەشەبا دا كەزۆر كوشندە دەبێ.

دمَقَسَ الثوبَ: ڕایەڵی قوماشەكەی بەئاوریشم تەنی.

الدِّمَقاسُ والدِّمَقْسُ: ئاوریشم.

دَمَكَ في مشيه دموكاً: پەلەی كرد لە ڕۆیشتن دا.

دَمَكَ الشَّيْئُ: شتەكە لوس بوو.

دَمَكَت الشمس في الجوّ دَمْكاً: خۆربەرز بووەوە نزیك ناوەڕاستی ئاسمان بۆوە.

دَمَكَ الشَّيْئَ: شتەكەی هاڕی.

دَمَكَ الرشاءَ: حەبلی دۆڵچەكەی گشت باداو گرژی كرد.

الدَّموك، رحيً دموك: ئاشێكی خێرایە بۆ هاڕینی دانەوێڵەكە، (ك: دُمُك).

المِدْماك: چینی دیوار ٥ تەناقی وەستای دیوار كردن ٥ چەكوشێك بەردی پێ ڕاستەو پاستە دەكرێ بۆ دیوار.

المِدْمَك: تیرۆك، ئامێرێكە نانی پێ پان دەكرێتەوە.

دَمَلَ الدُّمَلَ دملاً ودملاناً: گوانەكەی دەرمان كرد.

دَمَلَ الأرضَ: زەوییەكەی بەسەمادو زبڵ تێكردن چاك كرد.

دَمَلَ القومَ: تێكەڵاوی خەڵكەكە بوو ئاشنای داب و نەریتیان بوو.

دَمِلَ جُرْحُهُ دملاً: برینەكەی ساڕێژ بوو.

أدْمَلَ الأرضَ: زەوییەكەی بەسەماد چاك كرد.

دامَلَهُ: خۆی لەگەڵ گونجاند بۆئەوەی لەوڕێگەوە بتوانێ صوڵحی نێوانیان بكا.

ادْمَلَ الجرحُ: بەمانا (دَمِلَ) دێ.

إنْدَمَلَ الجرحُ: برینەكە بەرەو چاكبوونەوە ڕۆیی ٥ دەگوترێ: (إندَمَلَ المريضُ): نەخۆشەكە نزیكە چاك ببێتەوە ٥ برینەكەی ساڕێژ ببێ.

تدامَلَ القومُ: خەڵكەكە ڕێك كەوتن و دژایەتی نێوانیان نەما.

تدمَّلَتِ الأرضُ: زەوییەكە بەزبڵ و سەماد چاك بوو.

الدَّمالُ: سەمادو زبڵ ٥ خورمای گەنیوو ترشاوو ڕەش و كۆن ٥ تێكچوونی بەروبوم و بەرسیلە پێش ئەوەی بگا ٥ شتی بێ كەڵك و فڕێ دراو.

الدُّمَلُ: كێم و زوخاو كەلە گوان و برین دێتە دەر.

الدُّمَّلُ: بەمانا (الدَّمَلُ) دێ ٥ ئیلتیهاب و ڕزینێكی سنورداره كەلەپێست دا دەردەكەوێ و كێم و زوخاوی لێ پەیدا دەبێ، (ك: دمامِلُ ودماميلُ).

دَمْلَجَ الشَّيْئَ دَمْلَجةً ودِملاجاً: شتەكەی ڕاستەو پاستە كردو ڕێكی خست.

دُمْلِجَ جِسْمُهُ: جەستەی ڕێك بوو خۆی دارِشت.

الدُّمْلَجُ الدُّملوجُ: بازی بەند، بازنەیەكە دەكرێتە قۆڵ ◦ بەردی لووس، (ك: دماج ودماليج).

دَمْلَقَ الشَّيْئَ: شتەكەی ڕاستەو پاستەكردو لووس‌و پوسی كرد.

الدُّملوق والدّمالِق: شتی زۆر سفت‌و لووس‌و خڕ، (ك: دَمَاليقُ).

دَمْلَكَ الشَّيْئَ: شتەكەی خڕو سفت‌و لوس كرد.

تَدَمْلَكَ الشَّيْئُ: شتەكە سفت‌و خڕ بوو.

دملكت ثدي الجارية: مەمكی كچەكە خڕبون.

الدّملوك: بەردی ڕەش‌و خڕ ◦ هەڵماتی بەردی ڕەش.

دَمَّ دَمَامةً: شێوەی ناشیرین بوو جەستەی بچكۆلە بوو ◦ خراپەی كرد ◦ (هو دميم وهي دميمة)، (ك: دِمام ودمائم).

دَمَّ على الشّيِئ: شتەكەی داپۆشی، هەمووی گرتەوە.

دَمَّ عليه القبرَ: گۆڕەكەی كوتایەوەو تەختی كرد.

دَمَّ الوَجْهَ: ڕوخساری ئارایش دا.

دَمَّ الثّوبَ: قوماشەكەی ڕەنگ كرد، لەخومی دا.

دَمَّ البيتَ: خانوەكەی گەچكار كرد.

دَمَّ السفينة: كەشتییەكەی قیركرد بۆئەوەی ئاو نەدزێ بۆناوی.

دَمَّ العَيْنَ الوجِعَةَ: چاوە هێشاوەكەی بەسوراو كردنی دیوی دەرەوەی دەرمان كرد، ئارایشی دا.

دَمَّ الصُّدْغَ بالدم والشعر المحرق: لاجانگی بەخوێن‌و قژی سوتاو ڕەنگ كرد.

دَمَّ الأرضَ: زەوییەكەی تەخت كرد.

دَمَّ الكماةَ: گڵی بەسەر قاچكەكەدا كرد.

دَمَّ اليَرْبوعُ فَمَ جُحْرِهِ: یەربوعەكە دەمی كونەكەی بەگڵ گرت ◦ یەربوع جانەوەرێكە وەكوو جرج دەستی لەقاچی كورت ترن.

دَمَّ جُحْرَهُ: كونەكەی خۆی گەسك دا.

دَمَّ فلاناً: ئازاری فلانی دا ◦ سەری شكاند ◦ (دمّ رأسَهُ): لەسەری دا.

دَمَّ القومَ: خەڵكەكەی هاڕی‌و لەناوی بردن.

دُمَّ الجَسَدُ: جەستەی قەڵەو بوو تاوای لێ هات ئێسقانی دیارنەمان‌و بەردەست ناكەون ◦ دەشكوترێ: (دُمّ وَجْهُهُ).

دَمَّ دَمامةً: ڕوخساری ناشیرین بوو جەستەی بچوك‌و بێ نمود، (ك:

دمــام) ◊ (وهــي دميمــة)، (ك: دِمــام ودمائم).

أدَمَّ فــــلانٌ: فلانكــــەس منداڵێــــكی ناشــــیرینی بــــوو ◊ كردەومیــــەكی ناشیرینی كرد.

الــدَّمّاءُ: كونی یـەربوع (كونـەجرج) ◊ گلّــــە وردمیــــەك كــــە یــــەربوع لەكونەكەی دەری دەداو دوایی دەمی كونەكەی پێ دەگری.

الــدِّمَامُ: سوراوێــكە ئـافرەت روخساری خۆی پێ ئـارایش دەدا ◊ هەرشتێـك ئارایشی پێ بكرێ.

الدَّمُّ: خوێن.

الدَّیمومُ والدَّیْمُومَةُ: سارای كاكی بەكاكی كەئاوی تێدا نەبێ.

الِمدَمَّةُ: ماڵماڵ، دارێــكە یـان ئاسنێـكە دونــــــدە دوندەیـــــە زەوی پــــێ رێكدەخرێ.

دَمَــنَ الأرضَ دَمْنــاً: زەوییەكـەی بـەزبڵی كیمیاوی رێك خست.

دمِنَ قَلْبُـهُ دَمْنـاً: دڵـی رقو كینـەی پەیـدا كرد دەشگوترێ: (دَمَـنَ فـلان علـی فــلان): فـلان رقو كینــەی لــەفلان هەڵگرت.

دَمِنَ علـی الـشَّيْ: بـەردەوام بـوو لەسـەر فلان شت.

أدْمَــنَ الـشرابَ ونحـوَه: بـەردەوام بـوو لەسـەر شـەرابو وازی لـێ نـەهێنا ◊ (أدمن الأمـر وعلیـه): بـەردەوام بـوو لەسەری.

دَمَّنَــتِ الماشــیة المكــانَ: ئاژەڵەكــە ئەوشوێنەی كردە سوتەمەڕۆ.

دَمَّنَ الماءَ: میزی كردە ناو ئاوەكەوە.

دَمَّــنَ القــومُ المَوْضِـعَ: خەڵكەكـە ئـەو شوێنەیان كردە سوتەمەڕۆو گەمرە.

دَمَّنَ بَابَهُ: بـەری دەرگـای خـۆی گـرتو لـێی دەرنەچوو.

تَدَمَّنَ المكانُ والماءُ: شوێنەكە یان ئاوەكە ریخو قشپڵی حوشترو مـەڕو بزنـی تێـكەوت.

الأدمانُ: رزینو رەشبوونی دارخورما.

الدِّمّانُ: زبڵ، لمب.

الدَّمّانُ: ئەوكەسەی زبڵ بـەزەوی دەكـا ◊ بۆنەوەی بەپیت بێ.

الدَّمُونُ: ناشیرین.

الدِّمْنُ: زەمبڵـی رەق هـەڵاتو بەجۆرێـك بوبێتــە گـەمرە ◊ دەگـوترێ: (فـلان دِمْــنُ مــال): مـاڵو سامانی خـۆش دەویو هەمیشە پێوەی خەریكە.

الدِّمْنَـةُ: شـوێنەواری ئـادەمیزادو جـێ ئاگردانی خێڵەكانو ئەوبەردو دركە شاخانەی بەئاگر كردنەوە رەشبوون ◊ كــــــەلاوەكۆن ◊ زبڵــــــدانو سەرانگوێلكی ماڵەكان ◊ ئەو قشپڵو

ریخەی تێکەڵاوی گڵی دەوروبەری حەوزی ئاوەکان بووەو بوەتە گەمرە ٥ باقی ماندەی ئاو لەبنکی حەوزدا ٥ کینەو رقی کۆن ٥ دژایەتی هەمیشەیی.

**دَمِيَ الجُرْحُ دمىً ودمياً**: خوێن لەبرینەکە دەرچوو وەلێ لەدەمی برینەکە رەت نەبوو.

**أدْمى فلاناً**: لەفلانکەسی دا تاخوێنی لەجەستەی هێنا.

**أدْمَاهُ**: خوێنی لەلوتی هێنا ٥ (أدْمَى الجُرْحَ) خوێنی لەبرینەکە هێنا.

**دَمَّى الجُرْحَ**: بەمانا (أدماه)دێ.

**دَمَّى له**: خوێنی لەسەرخۆی پێویست کرد بڕیاری دا کوشتنی سەر ببڕێ.

**دَمَّى الشَّيْ**: شتەکەی واجوان کرد کردی بە عەنتیکەو دومیە.

**دَمَّى الشَّاةَ**: سەرپەرشتی مەڕەکەی کردو خزمەتی کرد تا قەڵەو بوو.

**دَمَّى الفتاةَ**: کچۆڵەکەی رازاندەوەو ئارایشی دا ٥ هەروا وشەی (دمىً) بەمانا (دەرکەوت)دێ ٥ دەگوترێ: (خذ ما دَمّي لك) چیت بۆ دەرکەوت بۆخۆتی بەرە.

**استَدْمى الرجلُ**: پیاوەکە دڵۆپە خوێنی پێداهاتنە خوار.

**استَدْمى الأنفُ**: لوتی پڕژا.

**استَدْمى غريمه**: بەهێواشی و لەسەرە خۆیی قەرزەکەی لەقەرزدارەکە وەرگرتەوە.

**الدَّامي (دامي الشفتين)**: سورایی لێو، رەنگی خوێن لە لێودا ٥ هەروەها بە کەسێکیش دەگوترێ کەزۆر گیرە گیر بکا لە داواکردن دا.

**الدَّامِية**: برینێک خوێنی دەرکەوتبێ وەلێ رەوان نەبووبێ.

**الدَّمُ**: خوێن، شلەمەنییەکی رەنگ سوورە بە ناو رەگی گیانلەبەردا دەڕواو دێ، (ك: دماء).

**الدَّمَةُ**: دڵۆپە خوێن ٥ پەڵە خوێن.

**الدُّمْية**: پەیکەری لەعاج دروستکراوی وردیلانەو جوان٥ بتی بچکۆلەی رازاوە، (ك: دُمىً).

**المُدَمىّ**: زۆر سوورو ئاڵ ٥ دەگوترێ: (ثوب مُدمىً) (وخيل مَدَمّاة) ٥ رەوە ئەسپی سورباو ٥ هەروا ئاوە بۆنەو تیرانەی تیر ئەندازەکان بەیەکتریيەوە دەنێن.

**دَنِيَّ دَناءً**: سەری نەوی کردو خۆی چۆماندەوە، (هو أدْنأ وهي دَنْأى).

**دَنُؤَ دُنوءً أو دناءةً**: هیچ و پوچ بوو، خوێڕی و نەفس نزم بوو.

**أدْنأ**: کارێکی هیچ و پوچی گرتە دەست.

**تنَنَّأ**: بەمانا (دَنُوَ) دێ.

**تَنَنَّأ فلانٌ نفسه**: فلانکەس نەفسی خۆی فێری کاری نزمو خوێڕیەتی کرد.

**الدَّنِيءُ**: هیچو پوچو خوێڕی، (ك: دُناءٌ وأدنياء وأدناء).

**الدَّنيئة**: کارێك ئادەمیزاد بێ نرخ بکا.

**الدَّنِيَّةُ**: بەمانا (الدَّنيئة) دێ.

**دَنَحَ دُنوحاً**: سەری لەقاندو نزمی کرد، گەردنکەچ بوو.

**الـدِّنْحُ**: جـەژنی مەسـیحییەکانە کـە دەکەوێتـە ڕۆژی شەشـی مـانگی دوانـزە ٥ پێـشی دەڵـێن: (عیـد الغطاس).

**دَنَخَ دَنَخاناً**: لەڕۆیشتن داهەنگاوی قورسی هـەڵێنان لەبـەربارگرانیو قورسایی کۆڵەکەی.

**دَنَخَت الكرةُ**: تۆپەکە چاڵو چۆێڵو گرن گرن بوو.

**دَنْدَنَ الرَّجُلُ**: پیاوەکە بەسرتە قسەی کرد قسەکانی دەبیسران بەڵام کەس لێیان تێ نەدەگەیشت ٥ دەگوترێ: (دَنْـدَنَ فـلان): فلانکـەس بـەدەنگی نزم گۆرانی چڕاند.

**دَنْـدَنَ الـذُّباب**: مێـشەکە ویـزە ویـزی کرد.

**دَنْـدَنَ فـلان**: فلانکـەس بـەو شوێنەدا هاتو چۆی کرد.

**دَنَّـرَ الوَجْـهُ**: دەمو چاوی درەوشایەوە وەکوو پارچە ئاڵتون بریسکەی دا.

**دَنَّرَ الذَهَبَ**: سکەی دیناری لەئاڵتونەکەدا ٥ دەشـگوترێ: (دَنَّـرَ الـدنانير): دینارەکانی لێدان.

**دَنَّـرَ الثَّـوْبَ**: پـەراوێزی کراسـەکەی بەئاڵتون دادرو.

**دُنِّـرَ فـلان**: فلانکـەس دینارەکانی زۆر بوون.

**تَدَنَّرَ وَجْهُهُ**: بەمانا (دَنَّرَ)دێ.

**الدينار**: سکەیەکی ئـاڵتونی بووە، شان بەشـانی عوملـەی زیـو کـەپێی گوتراوە دیرهـەم عوملـەی سـەرەکی دەوڵەتی ئیسلامی بووە.

**دَنِسَ ثَوبُهُ دَنَساً**: کراسەکەی چڵکن بوو ٥ دەگـوترێ: (دَنِـسَ عِرضُـهُ وخُلُقـه): نـاموسو شـەرەفی لەکـەی تێدایـە ڕەوشتی ناشیرینە ٥ (هو دِنِسٌ)، (ك: أدناس).

**دَنَّـسَ ثَوبَـهُ**: کراسـەکەی چڵکن کـرد ٥ دەگـوترێ: (دَنَّـسَ عرضـه وخُلُقَـهُ): کارێـکی کـرد خـۆی ناشـیرین کـرد بەوکارە حەیای خۆی برد.

**تَدَنَّسَ الثوبُ**: قوماشەکە چڵکن بوو.

**الدَّنَسُ**: چڵك، (ك: أدناس).

**دَنُـعَ**: بـێ خێـرو بێـر بـوو، هـیچو پـوچ دەرچوو ٥ دەگـوترێ: (هـو مـن دَنَـع

الناس): لەچینە خوێری و هیچ و پوچەکانی ئادەمیزادە.

**الدَّنِعُ**: ئەو پرژو پاڵو کەوەڵەیە کە حوشتر بەرەوە لەحوشترەکەی دەکاتەوە.

**دَنِفَ** المريضُ دَنَفاً: نەخۆشەکە دەردەکەی لێگران بوو گەیشتە حاڵەتی گیانەڵاو ٥ (وهو وهي وهم دَنِفٌ).

**دَنَفَ** الشمسُ: خۆر بەرەو ئاوا بوون دەچێ و زەرد هەڵگەڕاوە.

**دَنِفَ** الأمْرُ: کارەکە نزیك بووەوە.

**أدْنَفَ** المريضُ: بەمانا (دَنِفَ) دێ ٥ دەشکوترێ: (أدْنَفَهُ الْمَرَضُ).

**الدَّنَفُ**: نەخۆشی کوشندە، گرانەتا ٥ نەخۆشێك توشی نەخۆشییەکی گران بووبی.

**دَنِقَ** دُنُوقاً: خەفەتی خواردو شوێن شتی بچوك و بێ نمود کەوت ٥ خۆی بەشتی کەمبایەخەوە هەڵەوگیر کرد.

**دَنَّقَ** وَجْهُهُ: روخساری کزی و لاوازی پێوە دەرکەوت بەهۆی نەخۆشی یان ماندووبوونەوە.

**دَنَّقَت** الشمسُ: خۆر نزیك ئاوا بوون بوو.

**دَنَّقَ** البخيلُ: کابرای چروك زێدە رۆیی کرد لەدەست قوچان و کەم مەسرەفی ٥ یان لە حیساب و مەسرەفی کۆڵیەوە.

**دَنَّقَ في معاملاته**: وردەکاری لەمامەڵەکانی دا کرد.

**الدانق**: شەشیەکی دیرهەمێك ٥ گیسکە لەڕو شتی وا، (ك: دوانق ودوانیق).

**الدوانیقی**: کەسێك زۆر وردەکاری لەحیساب و مامەلەدا بکا.

**دَنْقَسَ**: سەری خۆی دانەواندو ملکەچی نواند.

**دَنْقَعَ** الرجلُ: پیاوەکە هەژارکەوت.

**دَنَّ** الذبابُ ونحوه: مێشەکە ویزە ویزو گیزە گیزی کرد.

**دَنَّ** فلانٌ دنيناً: فلانکەس مینگە مینگی کردو کەس لێی حاڵی نەبوو.

**دَنَّ** الرجلُ دَنَناً: پیاوەکە پشتی کوڕ بوو ٥ (هو أدَنُّ وهي دنّاء).

**دَنَّ** البَيْتَ: هەڵاشی بۆ خانوەکە کرد.

**أدَنَّ** بالمكان: لەوشوێنە مایەوە.

**دَنَّنَ**: بەمانا (دَنَّ)دێ.

**الدَّنّانَةُ**: دروستکردنی کوپە یان پیشەی کوپە دروستکردن.

**الدَّنُّ**: کۆپەیەکی گەورەیە، شەرابی تێدەکرێ.

**دَنَا** منه واليه وله دُنُوّاً: نزیك بووە.

**أدنى** الشَّيْءَ: شتەکەی نزیك کردەوە.

أدنى الحامِلُ: سكپڕەكە نزيك بووە لەمنداڵ بوون.
أدنى الشَّيْئ: شتەكەی نزيك كردەوە.
أدنى السَتْرَ أو الثوب: پەردەكە يان كراسەكەی دادايەوە.
دَانَاهُ: دەگوترێ: (دانى بين الشيئين): ئەو دوو شتەی لێك نزيك خستنەوە.
دانى القيد في الدّابة: زنجيرەكەی لەقاچى وڵاخەكە توند كرد.
دَنَّى: بەمانا (أدنى).
تدانى القومُ: خەڵكەكە هەندێكيان لەهەندێكيان نزيك بوونەوە.
تَدَنَّى فلانٌ: فلانكەس كەمكەم هاتە پێشەوەو نزيك بووەوە.
استدناهُ: داوای لێكرد كەنزيك بێتەوە.
الأدنى: نزيكتر.
الدَّانِيَةُ: بۆ مێينەی (الدّانى)يە ٥ دەگوترێ: (فلان في دنيا دانية) واتە: فلان لە جيهانی لەزەتو خۆشیو رابواردن دايە.
الدُّنا: كۆی وشەی (الدنيا)يە ٥ هەروا ناوە بۆهەر شتێك نزيك بێ لەخێرو شەڕ.
الدنيا: بۆ مێينەی (الأدنى) بەكاردێ ٥ دەگوترێ: (هو ابن عمي دنيا): كوڕی مامی راستەقينەمەو نەژادمان يەكە ٥ ژيانی خۆشو پڕ لەزەت ٥ دەگوترێ: (هو يعيش في دنيا الأحلام، ودنيا السرور).
دِنيا: بەمانا (دُنْيا)دێ ٥ دەگوترێ: (هو ابن عمي دِنْيا ودِنْيا).
دَهْ دَهْ: دەنگێكە ئاڕاستەی حوشتر دەكرێ بۆ دەركردنو راونانی.
دَهِ دَهِ: دەگوترێ: (إلاّ دَهِ فلا دَهِ) واتە: ئەم كارە ئەگەر ئێستا نەبێ دوايی نابێ.
الدَّهْبُ: لەشكری شكاو.
دَهْبَلَ: پاروی گەورەی كرد بۆئەوەی لەخواردن دا پێش بكەوێ.
دَهْبَلَ اللُقمةَ العظيمة: پاروی گەورەی قوت دا.
دَهْثَهُ دَهْثاً: بەدەست پاڵی پێوە نا ٥ بەقاچ بەتوندی شێلای ٥ پلیشانديەوە.
الدَّهْثَمُ من الأمكنة: زەوی تەختایی نزمو نەرمەڵان.
الدَّهْثَمُ من الرجال: پياوی نەرمو نيان ٥ پياوی سەخیو بەخشندە.
الدَّهْثَمُ من الجِمَالِ: حوشتری بەهێزو توانا ٥ دەريا.
دَهْدَقَ في ضحكه: پێكەنينی ناشيرينی ئەنجام دا، يان زۆر پێكەنی.
دَهْدَقَتْ القطعة من اللحم: پارچە

گۆشتەكە لەناو مەنجەڵەكەدا بەهۆی كوڵانو قڵپە قڵپی ئاوەكەوە خولایەوەو هەڵبەزو دابەزی كرد.

**دَهْدَقَ الشَّيْءَ دَهْدَقةً ودِهْداقاً**: شتەكەی شكاند پارچە پارچەی كرد.

**دَهْدَقَ اللحمَ**: گۆشتەكەی كوتكوت كردو ئێسقانەكانی شكاند.

**الدِّهْــداقُ**: ناشــیرینترین پێــكەنین ٥ رۆیــشتنی خێــرا كــه بگاتــه گورگــه لوقێ.

**دَهْــدَمَ البنــاءَ**: خانوەكــەی روخانــدو بەسەریەكی دادا.

**تَدَهْدَمَ**: بۆ مطاوعەی (دَهْدَمَهُ) دێ.

**دَهْدَهَ الحَجَرَ**: بەردەكەی خولاندەوە.

**دَهْدَهَ الشَّيْءَ**: شتەكەی بەسەریەك داداو تێكو پێكی دا.

**تَدَهْدَهَ الحجرَ**: بۆ موطاوعەی (دَهْدَهَـهُ) دێ.

**الدَّهْداهُ**: بێچوە حوشـتر ٥ یـان جەڵەبـه حوشتری زۆر.

**الدَّهْدَهانُ**: رەوە حوشتری زۆر كه بگاتە سەتو زیاتر ٥ یان حوشـتری كەتـەو زەبەلاح.

**الدَّهْدَهَةُ**: بەمانا (الدَّهداهُ) دێ.

**دَهْدَيَ الحَجَرَ دهداةً ودهـداءً**: بەردەكـەی خولاندەوە.

**دَهْدَيَ الشَّيْءَ**: شتەكەی بەسەریەك دادا ٥ تێكی هەڵشێلا.

**تَدَهْدَى الحجرُ**: بۆ موطاوعەی (دَهْـدَاهُ) دێ.

**دهَـرَ القـومَ وبهـم أمـرٌ دهـراً**: خەڵـكەكە توشــی بــەڵاو نەهامــەتی هــات ٥ دەگــوتری: (دهــــرهم الجـــزعُ) نەخۆشیو بەڵا سواری شانیان بوو.

**داهَرَهُ مـداهرةً ودِهـاراً**: مامەڵەی هـەتا هەتایی لەگەڵ دا كـرد ٥ دەگـوترێ: (عامَلَهُ او استأجرَهُ مداهرة ودهاراً).

**دَهْــوَرَ الــشَّيْءَ**: شـتەكەی كـۆكردەوەو فرێی دایە چۆڵەوانی.

**دَهْوَرَ كلامَــهُ**: درێـژەی بەقـسەكانی داو یەك بەدوای یەك داهێنانی.

**دَهْوَرَ الحـائِطَ**: پـاڵی بەدیوارەكەوە نـاو رمباندیو روخا.

**تدهور الرملُ**: لمبەكه داڕوخـاو زۆربـەی زۆری هاتە خوارەوە.

**تــدهور الــشَّيْءُ**: شـتەكە لەسـەرەوە ڕا هاتە خوارو روخا.

**تــدهور الليــلُ**: شـەو راشـكاو زوربـەی زۆری رۆیی.

**الدّاهِرُ**: زەمانی زۆر درێـژ ٥ دەگـوترێ: (دَهْر داهِرٌ) ٥ دەگـوترێ: (لا آتية دهر الدّاهرين) هەتا هەتایێ نایەمە لای.

**الــدّاهِرَةُ**: بــۆ مێینــەی (الــدّاهر)دێ ٥ دەربارەی ئافرەتێـك دەگـوترێ: (انها

لداهِرة الطول) بەراستی ئەو ئافرەتە تا بلێی بالای بەرزە.

**الــدَّهارير**: ســەرەتای زەمــان ◦ بــەڵاو کارەساتی رۆژگار ◦ دەگوترێ: (دهــر دهارير)، (و دهور دهارير).

**الدَّهْرُ**: ماوەی ژیانی دونیا هــەمووی ◦ مــاوەو رۆژگــاری درێــژ ◦ زەمــان بەرەهایی کـەم بـێ یا زۆر ◦ هـەزار ساڵ ◦ سەد هەزار ساڵ ◦ بەڵا ◦ ورەو نیــازو مەبەســت ◦ دابو نــەریت ◦ دەگوترێ: (كان ذلك دَهْر النجم).

**الدُّهُرُ**: بەمانا (الدَّهْرُ) دێ، (ك: أدهار).

**الــدَّهْرِيّ**: کەسێــکە بــڕوای بــەهاتنی قیامـەت نـەبێ، پـێی وابـێ زەمـانو دونیا بەردەوام دەبن.

**الــدُّهْرِيّ**: پــیرو کۆنەســاڵ ◦ لێــزان لەنیشو کاردا.

**الدُّهْرُوِيّ من الرجال**: پیـاوی خـۆراگرو ورەبەرز.

**الدَّهِيرُ**: دەگوترێ: (دَهر دهير) رۆژگاری سەختو ناهەموار.

**دَهْرَجَ**: لەرۆیشتن دا پەلەی کرد.

**دَهِــسَ المكــان دَهَــساً**: ئەوشــوێنە نەرمەڵانەو زەوی باشی زۆرە.

**دَهِسَت المرأةُ**: ئافرەتەکە سمتو کەفەڵی گەورەبوون.

**دَهِسَ العَنْزُ والرَّمْـلُ**: رەنگـی مەڕەکە یـان لمەکە رەش هەڵگەڕا ◦ (هـو أدهــس وهي دهساء)، (ك: دُهْسٌ).

**دَهُسَ دَهَاسَةً ودهوسة**: رەوشتی نـەرمو نیان بوو.

**أَدْهَسَ**: بە شوێنی نـەرمو تـەختایی دا رۆیی ◦ تێیدا نیشتەجێ بوو.

**أَدْهَــسَ المكــانُ**: شــوێنەکە زۆری نەرمەڵان بوو.

**إدْهاسَّ النبت والأرضُ والعَنْـزُ**: رەنگیـان رەش هەڵگەڕا.

**الدَّهاسُ**: شـوێنی نەرمـەڵان بـێ بـەردو لـمبو چـەو ◦ هەرشتێـك نـەرم بـێ لەسەرە خۆو رەزان بێ ◦ دەگـوترێ: (رجــل دهــاس): پیاوێــکی رەوشــت جــوانو لەســەرە خــۆو روخۆشــە ◦ (إمــرأة دَهَــاسٌ): ئافرەتێــکی سمــت گەورەیە.

**الــدَّهْسُ**: شـوێنی نەرمـەڵان بـێ لـمبو بــەردو چــەو ◦ زەوییــەك کــەتازە گیاکەی سەری دەرهێنابێو هێشتا رەنگــی زەوییەکــەی ســـەوز هەڵنـەگێڕابێ ◦ گژوگیایـەك هێـشتا رەنگـی زەردو ناسـك بـێو سـەوز هەڵنەگەڕابێ، (ك: أدهاس).

**الدُّهْسَةُ**: رەنگی لمبەڵان کە کـەمێ رەش هەڵبگەڕێ.

**الــدَّهَّاس مــن الرجـال**: پیـاوی رەوشـت جوانو نەرمو نیان.

**الدَّهُوس**: شێر.

**دَهَشَهُ خَطْبٌ دَهْشاً**: بەڵاو کارەسات سەرسامی کرد، عەقڵی بردو شێتی کرد.
**دَهِشَ دَهَشاً**: سەرسام بوو عەقڵی نەما لە ترسا یان بەهۆی عیشق‌و خۆشەویستییەوە یان لەشەرما.
**دُهِشَ**: بەمانا (دَهِشَ)دێ ٥ (هو مَدْهُوشٌ).
**أدهَشَهُ الحياءُ وغيره**: بەمانا (دَهَشَهُ) دێ.
**دَهَّشَ**: بەمانا (دهِشَ)دێ.
**دَهْشَرَ الرجلُ**: پیاوەکە پەلەی کرد لە فێنەبەرایەتی‌و کێشە نانەوەدا.
**دَهْشَرَ الأمْرَ**: کارەکەی بەهەڵەشەیی ئەنجام دا.
**الدَّهْشَرَةُ مِن النوق**: حوشتری کەتەو زەبەللاح.
**دَهَفَ الشَّيءَ دَهْفاً**: شتەکەی زۆر هەڵگرت.
**أدهف الشَّيْءَ**: بەمانا (دَهَفَهُ)دێ.
**الدَّاهِفُ**: ماندوی زۆر رۆیشتن.
**الدَّاهِفَةُ**: بۆ مێینەی (الدّاهِفَ)دێ ٥ بێگانەو غەریب.
**دَهَقَ الكأسَ دَهْقاً ودهاقاً**: پیاڵەکەی پڕ کرد.
**دَهَقَ الماءَ**: بەتەوژم ئاوەکەی رژاندو رۆی کرد.
**دَهَقَ الشَّيءَ**: شتەکەی شکاندو پارچە پارچەی کرد ٥ بەتوندی گوشی‌و دایچۆڕاند.
**دَهَقَ فلاناً**: لەفلانی دا.
**أدْهَقَ الكأسَ والماءَ**: پیاڵەکەی پڕکرد.
**أدْهَقَ فلاناً**: پەلەی لەفلان کرد.
**دَهَّقَ الشَّيْءَ**: شتەکەی تەسك کرد ٥ گوشی، دایچۆڕاند ٥ شکاندی.
**إدَّهَقَت الحجارةُ**: بەردەکان چەمبەرەیان لێك وەرهێناو تێکەڵ کێش بوون.
**إدَّهَقَ الشَّيْءَ**: شتەکەی شکاند ٥ گوشی ٥ دایچۆڕاند.
**الدِّهَاقُ**: دەگوترێ: (كأسٌ دِهَاق) پیاڵەی بەرزو پڕ لەشەراب کە یەك لەدوای یەك دێنە بەردەستی بخۆرەوە ٥ ئاوی صاف‌و رون ٥ (ماء دِهاق): ئاوی زۆر.
**الدَّهَقُ**: فەلاقە، داری فەلاقە، ئەوداره دوفاقەی جوانەگاو نێرینەی پێ دەخەسێنن.
**الدَّهْقَةُ مِن المال**: بەشێك لەماڵ‌و سامان.
**دَهْقَنَ فلان**: فلان ماڵی زۆر بوو.
**دَهْقَنَ القوم فلاناً**: خەڵکەکە فلانکەسیان کرد بەریش سپی‌و گەورەی خۆیان.
**دَهْقَنَ الطعامَ**: خواردەمەنییەکەی نەرم کردەوە.
**تَدَهْقَنَ الرجلُ**: پیاوەکە بوو بەکوێخاو سەرۆك ٥ ماڵ‌و سامانی زۆر بوو ٥ عاقڵ‌و ژیر بوو.

**الـدُّهْقَانُ**: سەرۆکی گوندو ریش سپی هۆزو خێڵ ٥ سەرۆکی ناوچە ٥ ئازاو کاردروستو کاراما لەئیشو کاردا ٥ کەسێک خاوەنی زەویو زاربێ ٥ بازرگان، (ك: دهاقنة ودهاقين).

**دَهَكَ الشَّيْءَ دَهْكاً**: شتەکەی هاڕیو وردی کرد ٥ شکاندی.

**دَهَكَ الأرضَ**: زەوییەکەی پێخوست کرد.

**الدُّهُوك**: ئاسیاو، ئاش، (ك: دُهُكٌ).

**تَدَهْكَرَ فلانٌ**: فلانکەس لەرۆیشتنەکەی دا ئەملاو ئەولای کردو خۆی بادا ٥ خۆی راوەشاند، لەنجەولاری کرد.

**تَدَهْكَرَ عليه**: بازی داو پەلەی کرد.

**الدُّهكر**: کورتە بالاّ.

**تَـدَهْكَمَ**: خـۆی خستە نـاو کارێکی ئەستەمەوە.

**تَدَهْكَمَ على فـلان**: نـازو فیـزی بەسـەر فلان دا کرد.

**الدُّهْكَمُ**: پیری پەککەوتەو کۆنەساڵ.

**الدَّاهِلُ**: سەرسام.

**الدَّهْلُ**: شتی کەم ٥ کەمێك لە زەمەن ٥ دەگوترێ: (مضى من الليل دهل): کەمێك لەشەو رۆیی یان (بقي دهل من الليل) کەمێکی شەو ماوە.

**الـدَّهليز**: رێـڕەوو شـوێنی چوونە ژوورەوە لـەنێوان دەرگـاو خـانوداە تەوێلـەو گـەورە (أبنـاء الـدّهاليز) زۆڵوحەرامزادە.

**دَهَمَـهُ أمْـرٌ دَهْمـاً**: غافڵگیری کـرد، دایپۆشی.

**دَهَـمَ القـومُ فلانـاً**: خەڵکەکە بەکۆمەڵو سەرجەم هاتنە لای فلان.

**دَهِمَ دُهْمَةً**: رەش هەڵگەڕا.

**دَهِـمَ الإبـلُ**: حوشـترەکە سـپیایی تـوکی نەماو رەنگی بۆری هەڵگرت ٥ (هـو أدهمُ وهي دَهماءُ)، (ك: دُهُمٌ).

**دَهِمَ فلاناً أمرٌ**: بەمانا (دَهَمَهُ) دێ.

**أدْهَمَهُ**: خراپی کردو ملکەچی کرد.

**دَهَّمَت النارُ القِدْرَ**: ئاگر دیزەکەی رەش کرد.

**إدهَـمَّ الفَـرَسُ**: ئەسـپەکە رەش بـوو ٥ دەشگوترێ: (إدْهَمَّت القِدْرُ).

**إدْهَامَّ الشَّيْءُ**: شتەکە رەش هەڵگەڕا.

**إدْهَامَّ الزرعُ**: کشتو کاڵەکە لەتێر ئاوی دا رەش هەڵـگەڕا، لـە قورئـان دا دەفـەرموێ: ﴿مُـدْهَامَّتَانِ﴾ ٥ بـەهۆی زۆرسەوزی رەش دەنوێنن.

**الأَدْهم**: شوێنەواری کۆن ٥ زنجیر، (ك: أدَاهِمٌ).

**الدُّهام**: رەش.

**الدَّهْمُ**: ژمارەی زۆر ٥ دەگوترێ: (جـاء دهم من الناس) خەڵکێکی زۆر هاتن ٥ (جيش دهم) سوپای زۆر.

**الـدَّهْماءُ**: مێینـەی (الأدهـم)ە ٥ شـەوی

بیستو نۆی مانگی عەرەبی ٥ مەڕی سورباو ٥ (حديقة دهماءُ): باخێکە لە تێرئاوی‌و زۆر سەوزی دا ڕەش هەڵگەڕاوە ٥ بۆرە پیاوو ڕەشە خەڵك ٥ ڕوەکێکە گەڵاو پەل هەیە، گوڵێکی سووری هەیە بۆ دەباغکردن بەکاردێ بەزۆری لەشوێنی لیەلان دا دەڕوێ.

الدُّهْمَةُ: ڕەشایی ٥ حوشترێك توکی پێوە دیار نەبێ.

الدُّهَيْمُ: ئەحمەق‌و گێل ٥ (أم الدُّهَيم): بەڵاو چورتم.

الدُّهَيْماء: بەڵاو کارەسات ٥ فیتنەی گەورەو دونیا گیر.

الدَّهْمَثَةُ: (أرض دَهْمَثَة): زەوییەکی نەرمەڵان‌و دەشتە.

الدُّهْمُوثُ: پیاوی سەخی سروشت‌و مەرد.

دَهْمَجَ الرجلُ أو البعيرُ: پیاوەکە یان حوشترەکە هەنگاوی خێرا خێرای هاویشتن‌و پەلەی کرد.

دَهْمَجَ الهَرِمُ: پیرەکە هەنگاوی دەنان دەتگوت پێوەندی لەقاچ دایە ٥ ڕۆیشت بە شێوە ڕۆیشتنی جیاجیا.

دَهْمَجَ الخَبَرَ: لەخۆیەوە لەهەواڵەکەی زیاد کردو پێوەی نا.

الدَّهامِجُ: هەنگاو کورت، خۆشڕۆ ٥ کەتەو زەبەللاح لەهەر شتێك بێ ٥ حوشتری دو دووگ.

الدَّهْمَجُ: جەستە گەورە لەهەموو شتێك ٥ پان‌و پۆڕ.

دَهْمَسَ الأمْرَ: کارەکەی داپۆشی شاردییەوە.

دَهْمَسَ فلاناً: فلانی دڵخۆش کرد ٥ بازی پێ داو هەڵمەتی پێ برد.

دَهْمَقَ في الشَّيْءِ: پەلەی کرد.

دَهْمَقَ الشَّيْءَ: شتەکەی شکاند.

دَهْمَقَ الطحينَ: ئاردەکەی وردو هاڕ کرد.

دَهْمَقَ الطعامَ: خواردنەکەی چاك‌و خۆش کرد.

دَهْمَقَ الفَاتِلُ الوَتَرَ: ژێ بادەرەکە هەموو ژێیەکەی ڕێك‌و پێك بادا.

دَهْمَقَ الكاتبُ الكتابَ: نووسەرەکە کیتابەکەی بەوردی نووسی.

دَهْمَقَ القَدَّاحُ القِداحَ: قوداح چیەکە بەرووپشتی قەدەحەکەی ڕێك‌و پێك کرد ٥ شەقی کرد.

دَهْمَقَ الكلامَ: قسەی جوان‌و ڕێك‌و پێکی کرد.

الدُّهامِقُ: گڵی نەرم ٥ دەگوتری: (أرض دُهامِق) زەوییەکی نەرمەڵان‌و گڵە وردەیە.

دَهَنت الناقةُ دهانةً ودهاناً: حوشترەکە شیری کەم بوو.

**دَهَنَ فلان دَهْناً**: فلانکەس دوو ڕوویی ئەنجام دا.

**دَهَنَ فلاناً**: لەگەڵ فلانکەس دا دوڕوویی بەکارهێنا.

**دَهَنَ الرأسَ**: سەری چەورکرد، ڕونی لەسەردا.

**دَهَنَ المطرُ الأرضَ**: باران کەمێك زەوی تەڕکرد.

**دَهَنَ فلان الأرضَ**: فلانکەس زەوییەکەی والی کرد بۆ کشتوکاڵ بگونجێ ٥ زبڵو سەمادی کردە ناو زەوییەکە.

**دَهَنَ فلاناً بالعصا**: بەعەصا لە فلانکەسی دا.

**دَهُنَت الناقة**: بەمانا (دَهَنَتْ) دێ.

**أدْهَنَ**: پێچەوانەی ئەوەی لەدڵی دایە قسەی کرد ٥ فرتو فێڵی کردو گەندەڵی ئەنجام دا ٥ لەقسەدا نەرمو نیانی نواند.

**أدْهَنَ الجِلْدَ**: پێستی بەرۆنو مەڵهەم نەرم کرد.

**أدْهَنَ فلاناً**: موداراتی فلانی کردو خۆی لەگەڵ دا گونجاند.

**دَهَّنَ الشّعرَ والرأسَ وغيرهما**: بەمانا (دَهَنَهُ) دێ.

**داهَنَ مداهنةً ودهاناً**: پێچەوانەی ئەوەی لەدڵی دایە قسەی کرد.

**داهَنَ فلاناً**: فێڵی لەفلان کردو غەشی ئەنجام دا.

**إدَّهَنَ**: ڕوخساری خۆی بەرۆن چەورکرد.

**تَدَهَّنَ**: بەمانا (إدَّهَنَ)دێ.

**الداهِنَ**: دەگوترێ: (لحية داهِن): ڕیشێکی چەورکراوە.

**الدِّهان**: شوێنی خلیسك ٥ ڕێگای لووس ٥ پێستی سوور ٥ سوراو سپیاو کە ئافرەت خۆی پێ ئارایش دەدا ٥ خڵتەو پڵتەی زەیت.

**الدَّهّانُ**: ڕۆن فرۆش ٥ کەسێك پیشەی ڕۆن دروست کردن بێ.

**الدُّهْنُ**: ئەو ئەندازە بارانەیە کە ڕوبەری زەوی تەڕ دەکا.

**الدِّهن**: درەختێکە جرو‌جانەوەر لێی بخوا دەیانکوژێ.

**الدُّهن**: ڕۆن، چەوری، مادەیەکە لە حەیوانو نەبات دا هەیە چەورە، لەپلەی گەرمی ئاسایی دا ڕەقە، ئەگەر شلەمەنی بوو پێی دەگوترێ زەیت ٥ ئەو ئەندازە بارانەی ڕوی زەوی تەڕ دەکا، (ك: أدهان ودهان).

**الدَّهناءُ**: سارا، چۆڵەوانی ٥ گیایەکی سورباوە، گەڵاکانی پانە دەباغی پێ دەکرێ.

**الدُّهْنَةُ**: جۆرێك لەرۆن ٥ بۆنی خۆش ٥ دەگوترێ: (هو طيب الدّهنة).

**الـدّهين**: چـەورکراو، ڕۆن لـێ دراو ٥ دەگوترێ: (شَعْرٌ دهين ولحية دهـين): قژی ڕۆن لێ دراو ڕیشی چەورکراو ٥ زەعیفو بێ نرخ، ورەنزمو هیچ لەبارانەبووە، هیچی پێ ناکرێ.

**المُـدْهِنُ**: ئامێری چەورکردن ٥ دیزەی ڕۆن.

**المُدْهَنَةُ**: ئەوشتەی ڕۆنی تێ دەکرێ ٥ بـەرداو، قوڵـکەیەکە لەشـاخ هەڵدەکەنـدرێ یـان سروشـتی بـە ئاوی تێدایە.

**المُدَهَّنُ**: بەناز پەروەردە ٥ دەگوترێ: (قوم مُـدَهَّنون): کەسانێـکن بەنازو نیعمـەت پێگەیـشتونو هەمیـشە لەخۆشی دان.

**دهور**: بڕوانە وشەی (دَهَرَ).

**تَدَهْوَرَ**: بڕوانە وشەی (دَهَرَ).

**الدَّهْوَرِيّ**: بڕوانە وشەی (دَهَرَ).

**دهـاه دَهْـواً**: توشـی بـەڵای کـرد ٥ بەزیرەکولێزانی لە قەڵەم دا.

**دهته الدّاهية**: بەڵا هاتە خوار.

**دهاه دَهياً ودهايةً**: بـەڵای تـوش کـرد ٥ بەلێزانی زانی.

**دهِـيَ دِهـاءً ودهـاءَةً**: لـەکارو ڕوداو شـارەزابوو، ڕای دروسـتی بەرامبـەر ڕوداوەکان هەبوو.

**دَهُوَ الرجلُ**: پیاوەکە عـاقڵو زیـرەك بوو (هو دَهِيٌ)، (ك: أدهياء ودُهَوَاءُ).

**أدهـى الرجـل**: منداڵێـکی زیـرەكو لێهاتووی بوو.

**أدهى فلانـاً**: بـەزیرەكو عـاقڵ هاتـە بەرچاوی.

**داهَاهُ**: بەڵای توش کرد.

**دَهَّـاهُ**: بـە زیـرەكو عـاقڵ هاتـە بەرچاوی.

**تَدَهَّى**: بەمانا (دَهِيَ) دێ.

**الداهي**: شێر.

**الدّاهِيـةُ**: دەگـوترێ: (رجـل داهِيَـةٌ) پیاوێـکە لـەکارو بـار شـارەزایە ٥ بەڵاو کارەساتی گەورە، (ك: دَوَاهٍ).

**دواهي الدّهر**: بەڵاو کارەساتی گـەورەی ڕۆژگار کەتوشی ئادەمیزاد دەبێ.

**الـدّهاءُ**: عـەقڵو ئـاوەز ٥ بـیروڕای دروست.

**الدَّهْوُ**: عەقڵو ئاوەز.

**الـدَّهواءُ**: دەگـوترێ: (داهيـة دهـواءُ) تەنگانـەی گـەورەو کارەسـاتی جەرگبڕ.

**الدُّهْوِيـةُ**: دەگـوترێ: (داهيـة دُهْوِيَـةُ) بەمانا (الدهواء) دێ.

**الدَّهي**: شتی ناخۆش.

**الدَّهياءُ**: بەمانا (الدَّهواءُ) دێ.

**دأَ الرجلُ دَوْءاً وداءة**: پیاوەکە نـەخۆش کـەوت ٥ دەگـوترێ: (وقـد دِئْـتَ

يارجلُ) كابرا نەخۆش كەوتى.

أداء الرَّجُلُ داءً: پياومكە نەخۆش كەوت ٥ ناوسكى توشى نەخۆشى بوو.

أداءَ فلاناً: فلانكەسى توشى شكو گومان كرد.

أدْوَأ الرجل: بەمانا (داءَ) دێ.

الدّاءُ: نەخۆشى ديارو ناديار، نەخۆشى ديوى دمرەوەى جەستەو هەناو ٥ عەيب دياربێ يان شاراوه ٥ دمگوترێ: (فلان مَيِّتُ الداء): فلانكەس رقى لەوكەسانە نييە كە خراپەيان دمرحەق كردوە.

داء الأسد: لەرزو تا.

داء الظَّبي: تەندروستىو نيشات.

داء الملوك: نەخۆشييەكە توشى جومگەى قاچو پەنجە دمبێ.

داء الكرم: قەرزارىو هەژارى.

داء الضرائر: شەڕى هەميشەيى.

داء البطن: فيتنەيى كوێرانە.

داء الذِئب: برسيايەتى.

الدّيِّءُ: نەخۆش.

الدّوبارة: دمزوێكى دولا لەكەتانو شتى وا درومانى پێ دمكرێ.

الدّوبَلُ: بڕوانە (دَبَلَ).

داجَ دَوْجاً: خزمەتى كردو يارمەتى دا.

الدّاجَةُ: پێويستياتى بچوك بچوك ٥ شوێنێكەوتەو پاشەتاى سوپا.

الدُّواجُ: پاڵتۆى ئەستورو پتەو.

دَاحَت الشجرةُ دوحاً: درەختەكە گەورە بوو لقو پۆپى كرد.

دَاحَ بَطنُهُ: سكى زل بوو داچۆڕا بەرمو خوار ٥ دمشگوترێ: (داحَتِ سُرَّتُهُ): ناوكى داچۆڕا بەرمو خوار.

دَوَّحَ مالَهُ: ماڵەكەى تەخشانو پەخشان كرد.

إنداحَ بطنُهُ: بەمانا (داح) دێ.

الدّاحُ: پەراوێز بۆكردنو نەخشاندن بۆئەوەى منداڵ پێوەى خەريك بێو خۆى پێ بخافڵێنێ ٥ بازنەيەكى بادراوه ٥ جۆرێكە لەبۆنى خۆش ٥ شلەمەنييەكە زەردايى تێدايە.

الدَّحَة: قوماشى پەراوێز بۆكراوو نەخشێندراو ٥ جيهان.

الدَّوْحُ: خانوى گەورە لەرەشماڵ.

الدَّوْحَةُ: درەختى گەورمو لقو پۆپدارى زۆرو شۆڕ بووه، (ك: دَوْحٌ) ٥ دمگوترێ: (هو من دوحة الكرم): سێبەرى گەورمو پانو بەرفراوان.

الدَّوَّاحُ: بەرزو هەڵچو ٥ دمگوترێ: (عذق دوَّاح): لقە درەختێكى هەڵچوو بەرزە ٥ درەختێكى گەورمو بەرزە.

داخ الرجلُ أو البعيرُ دَوْخاً: پياومكە زەليلو گەردنكەچ بوو.

**داخ** النـاسَ: خەڵـكەكەی ژێربـارو زەلیـل كـرد ٥ دەگـوترێ: (داخَ الـبلادَ): ولاتەكـەی داگـیر كـردو دانیشتوانەكەی ملكەچ كرد.

**أداخَ الرَّجُـلَ أو الـبعيرَ**: پیاوەكـە یـان حوشترەكەی ژێربار كرد.

**دَوَّخَ الرجـلَ أو الـبعيرَ**: بـەمانا (أداخَـهُ) دێ.

**دَوَّخَ الوَجَعُ رأسه**: ئازار سەری گێژ كرد.

**دَوَّخَ الحَرُّ فلاناً**: گـەرما فلانـی زەعیـفو لاواز كرد.

**دَوَّخَ المكـانَ**: بـەو شـوێنەدا هاتوچـۆی كرد.

**دَوَّخَ البلادَ**: بەوڵاتەكەدا هاتوچۆی كرد تـاوای لـێ هـات هـەموو كـونو كەلەبەری شارەزا بوو.

**الـدَّائخُ**: دەگـوترێ: (لیـل دائـخ): شەوێكی تاریكە.

**داد** الطعـامُ ونحـوه دَوْداً: خۆراكەكـە كـرم لـێی دا، كرمی تێكەوت.

**دِيدَ** الطعامُ: خواردنەكە كرمی تێكەوت.

**أدادَ الطعامُ**: بەمانا (دَادَ) دێ.

**دوَّدَ الطعامُ**: بەمانا (دَادَ) دێ.

**دوَّدَ الـصَبِيـيُ**: مندالەكە یـاری بـەكرم كرد.

**الدُّواد**: كرمی بچوك ٥ پیاوی بەپەلە.

**الدُّودَةُ**: كرم گیانلەبەرێـكی درێـژە زۆر جۆری هەیە.

**الـدُّوداةُ**: جۆلانـە ٥ چـەرخو فەلـەك ٥ دەنگی جۆلانەو چەرخو فەلەك.

**دار** دوراً ودورانـاً: بـەدەوری شـتەكە دا سوڕایەوە ٥ دەگـوترێ: (دار حولَـهُ و بە وعليە).

**دار** فلان على أربع نسوة: فلانكـەس چوار ژنی هەیە چاودێرییان دەكاو مـاڵو منـداڵیان بـەڕێوە دەبـا ٥ كـابرا سواڕایەوە گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی لێیەوە دەستی بەرۆیشتن كرد.

**دار** الفلـكُ في مـداره: فەلـەك بـەڕێو ڕەسمی خۆی سوڕانەوەی بەردەوامی داو بێ راوەستان سوڕایەوە.

**دار** العِمَامـةَ حـول رأسـه: مێزەرەكـەی لەسەری پێچا.

**دِيرَ** به وعليـه: توشـی سـەرە خولـێ بـوو، گێژ بوو.

**أدار حول الشَّيْئ**: بەمانا (دارَ) دێ.

**أدار عَـن الأمـر**: داوای لـێ كـرد واز لەوكارە بهێنێ.

**أدار فلاناً على الأمر**: داوای لەفلان كرد كارەكە ئەنجام بدا.

**أدار الـشَّيْئَ**: شـتەكەی والـێ كـرد بخولێتەوە.

**أدار العمامـة حـول رأسـه**: مێزەرەكـەی لەسەر پێچا.

أدار التجارة: بازرگانیەکەی دەست پێ کرد بێ ئەوەی دوای بخات.
أدار الرأي والأمر: زانیاری تەواوی بەسەر راوبۆچوونوکارەکەدا پەیدا کرد.
أدير به: سەرەخولێ توش بوو.
داور مُداورة ودواراً: لەگەڵی دا سوڕاو گونجا.
داور الأمورَ وعليها: داوای ڕێو شوێنی چونە ناوشتەکەی کرد ویستی بزانێ چۆن ئەوکارە بکا ○ دەگوترێ: (داورتُ الرَّجُلَ على الأمر) لێکۆڵینەوەمو دانو سانم لەگەڵ ئەوپیاوە کرد دەربارەی کارەکە.
دَوَّرَهُ: شتەکەی والێ کرد خڕ بێ ○ بسوڕێتەوە هەڵخولێ.
تَدَيَّرَ المكانَ: ئەو شوێنەی کردە خانووی نیشتەجێ بوون.
استدار: بەدەوری شتەکەدا سوڕایەوە.
استدار القَمَرُ: مانگ خشت بوو رۆشنایی زیادکردو پتر سەرزەوی روناک کردەوە ○ گەڕایەوە بۆئەو شوێنەی سەرەتا سوڕانەوەی لێوە دەست پێکرد.
استدار به: دەورەی دا، کۆنترۆڵی کرد.
التَدْوِرَةُ: چەوی خڕ، کلۆلبی خڕ.
الدائرةُ: کەوانەیی، بازنەیی ○ لەزانیاری ریازی دا بریتییە لە وێنەیەکی یەکسانو سنوردار بەهێڵێکی خوارەوە بوو هەموو خاڵەکانی لەسەر بوعدە یەکسانەکانن بەرامبەر خاڵی ناوەوە ○ هەرشتێک دەورەی شتێکی تری دابێ ○ ئەڵقە.
دائرة رأس الإنسان: موی پێشەسەر، کاکۆڵ ○ دارێکە، سنگێکە لەناوەڕاستی خەرمان دا دادەکوترێو گا گێرە بەدەوری دا دەسوڕێتەوە ○ خوار لوت ○ بەڵاو کارەسات ○ تێشکان.
دائرة المعارف: جۆرە کتێبێکە زانیاری جیاجیاو لەبوارە جیاجیاکان دا لەخۆ دەگرێ، زۆربەی کات زانیاریەکان بەگوێرەی (أ ب ت ث ...) ریز بەند دەکرێن.
الدائرة الإنتخابية: بەشێک لەشار یان چەند گوندێک نوێنەرێک یا زیاتر هەڵدەبژێرن.
الدَارُ: خانوو بەدیوارو هەڵاشو حەوشەوە ○ شوێنی نیشتەجێ بوون ○ شارو وڵات ○ هۆزو خێڵ.
دار الإسلام: وڵاتی موسوڵمانان.
دار السلام: بەهەشت ○ بەغدا.
دار الحرب: وڵاتی دوژمن، (ك: أدؤر، دیار، دیارة، دور، ...).
الدَارِيُّ: ئەوکەسەی وەگری ماڵ بێو

لەماڵ نەچێتە دەرو هەوڵی وەدەست هێنانی بژێو نەدا ◦ دەگوترێ: (ما بالدار داريٌ): کەس لەماڵەوە نییە ◦ هەروا بە حوشترێک دەگوترێ کەلەگەڵ گاران دا دەرنەچێ‌و لەئاغەڵ دا بمێنێتەوە ◦ بەلەمەوان، کەڵەکەوان، کەشتییەوان کەلە دوا سەوڵی ئامێرەکەوە بێ ◦ عەطر فرۆش.

**الدَّارَةُ**: خانوو ◦ هەرشتێک دەورەی شتێکی تری دابێ ◦ دیمەنی مانگ لەشەوی چواردەو پانزەدا روناکی مانگ ◦ کڵۆ لمبی رەق بوو ◦ هەرشتێک بەشتێکی تر دەورە درابێ ◦ هەر دەشتاییی‌و پانتاییەک بکەوێتە ناو چەند کێوێکەوە، (ك: دور ودارات).

**دارات العرب**: چەند دەشتاییەکن لەوڵاتی عەرەب رەوەکی بۆنخۆشیان لێ دەروێ ◦ زیاد لەسەدو دە دەشتایی وا هەیە لەوڵاتی عەرەب دا یەکێ لەوانە (دارة جُلْجُلَ)ە.

**الدُّوارُ**: سەرە خولێ‌وگێژبوون‌و سەر سوڕان.

**الدُّورُ**: توێ‌و چینی شت کەدەکەونە سەریەک‌و شێوەی بازنەیی پێک دێنن وەکو توێی مێزەر ◦ دەگوترێ: (إِنْفَسَخَ دور عمامته) ◦ لەزاراوەی زانایانی مەنطیقدا بریتییە لە تەوەتوفکردنی هەر یەک لەدوشت لەسەریەکتر ◦ حەریق دەڵێ:

حاشیەی زولفت لەسەر ئایاتی ڕوت
زۆر موتالام کرد وەکوو دەوری تەسەلسول مایەوە

◦ کەڕەت‌و جارو نۆبە، سەرە، دەگوترێ: (جاء دوري) سەرەی من هات.

**الدورة الدموية**: هەڵسوڕانی خوێن بەناو رەگەکانی جەستەدا ◦ لەشەراییی دڵەوە بۆ ئەوریدەکان، لە (أوردة)وە بۆ شەراییین.

**الدورة الزراعية**: دابەشکردنی زەوی بۆ دووبەش یان زیاتر لەجاری یەکەم دا نیوەی تایبەت بکرێ بۆ لۆکەو نیوەکەی تری بۆدانەوێڵەی تر یان بەهەر دابەشکردنێکی تر.

**دورة المياه**: ئاودەست‌و حەمام‌و هەر شتێک پەیوەست بێ بەوانەوە.

**دورة المجلس النيابي**: خولی ئەنجومەنی نوێنەران.

**الدُّورِيّ**: جۆرە چۆلەکەیەکە لەبن گوێسەبانە هێلانە دەکەن.

**الدَّوَّار**: هەرکەسێک هەرشتێک زۆر بخولێتەوە، هەڵسوڕو داسوڕ بکا ◦ دەگوترێ: (الدهر دوار بالإنسان): زەمانە زۆر سوڕانەوەو هەڵسوڕو داسوڕ بەئادەمیزاد دەکا ◦ ناوێکیشە

بۆ کەعبە ٥ لەزانیاری الطبیعة دا بەو شتە دەگوترێ ئامادەباشی هەڵسوڕانی تێدابێ.

الدَّوَّارة: ئەو دائیرەو کەوانەییەی لەژێر لوت دایە ٥ ئامێرێکە نەققاش‌و نەجار بەکاری دێنن بۆ مەزندەکردنی ئەندازەی کەوانە ٥ بەکورتی‌و کوردی پەرگاڵ ٥ لەورگ دا ناوە بۆ ئەو بەشەی ریخۆڵەی لەخۆ گرتون ٥ لەسەر دا مەبەست لەخراپیەکەیەتی.

الدُّوارَةُ: هەرشتێك بجوڵێ‌و بخولێتەوە ٥ تەپکە لەبی خڕ بوو کە جڕو جانەوەرو ئاژەڵی کێوی بەدەوری دا دەخولێنەوە ٥ هەمبانەو کوندە کە کونجی هاڕدراوی تێدەکرێ‌و ئەمجار دەخرێنە سەر یەك‌و بەهێز زەختیان لێ دەکرێ‌و دەگوشرێن بۆ ئەوەی رۆنی کونجییەکە بێتە دەر ٥ هەروا بەمانا (الدَّوّارة) دێ کە بۆ ورگ‌و سەر بەکار بهێندرێ.

الدَّوّاريُّ: زۆر خلۆك، هەرشتێك زۆر بسوڕێتەوە ٥ دەگوترێ: (الدهر بالإنسان دوّاريٌّ) زەمانە بە زۆر شێوە هەڵسوڕو داسوڕکەرە بەئادەمیزاد.

الدَّيّارُ: تاکە کەسێك ٥ دەگوترێ: (ما بالدَّار دَيَّار) کەسێك لەو خانوەدا نییە.

الدَّيُّورُ: تاکە کەسێك ٥ دەگوترێ: (ما بالدّار ديور).

اَلْمَدَارُ: شوێنی سوڕانەوە ٥ (مدار الأمر) ئەوەی کارەکەی لەسەر بەڕێوە دەچێ ٥ هەروا وشەی (المدار) بەمانا ڕێڕەوی سوڕانەوەی ئەستێرە گەڕۆکەکان دێ کە بەدەوری خۆردا سوڕ دەخۆن ٥ یان ڕێڕەوی مانگ بەدەوری ئەو ئەستێرانەی مانگ بەدەوریان دا دەخولێتەوە.

مدار الأرض: ئەو فەلەکەی زەوی تێیدا دەسوڕێتەوە بەدەوری خۆردا.

اُلْمُدَارَةُ: دۆڵچەیەك لە پێست دروست دەکرێ‌و ئاوی پێ دەخورێتەوە ٥ دەرپێیەك دەرەلینگەکانی بنەخشێندرێن بە ئەتەمین‌و شتی وا.

اَلْمُدَوَّرُ: هەرشتێك لەسەر شێوەی خڕو کەوانەیی بێ.

المدير: بەڕێوەبەر، ئەوکەسەی کاروباری فەرمانگەیەك یان کۆمپانیایەك هەڵدەسوڕێنێ.

اَلْمُدِيرِيَّة: ناوچەیەك یان دەستەیەك کە بەڕێوەبەرێك سەروکاری بکا.

الدَّوْرَقُ: بڕوانە وشەی (دَرَقَ).

دَاسَ الشَّيْءَ برجله دَوْساً ودِياساً ودِياسَة:

شتەکەی بەقاچی پێشاندەوەو وردو هاڕی کرد.

**دَاسَ** الزرعَ: کشتو کاڵەکەی دروێنەکردو گێرەی کرد.

**دَاسَ** الحصيدَ: کشتو کاڵە درواوەکەی گێرەکرد بۆئەوەی دانەوێڵەکەی لێ دەربێنێو جیای بکاتەوە.

**دَاسَ** السيف: شمشێرەکەی مشتو ماڵ کرد.

**دَاسَ** الحديقةَ: باخەکەی راستەو پاستە کرد.

**دَاسَ** فلاناً: فلانکەسی زەلیلو ژێردەستە کرد ٥ فێڵی لێ کردو هەڵی خەڵەتاند.

**أداسَ** الحَبُّ: بەمانا (داسَهُ)دێ.

**دوَّسَ** الطريقَ: زۆر بەرێگاکەدا رۆیی.

**إنداسَ** الحَبُّ: دانەوێڵەکە گێرەکرا.

**الدّوائس**: دەگوترێ: (أتتهم الخيلُ دوائس) ئەسپەکان هاتن بۆیان یەك لەدوای یەك.

**الدُّوَاسَةُ**: کۆمەڵێك لەئادەمیزاد.

**الدَّوَّاسُ**: هەرکەسێك زۆر کاراماو لێهاتوو بێ لەکارو پیشەی خۆی دا ٥ ئازاو پاڵەوانێك کەس جەنەبەری نەیەو هەرکەسێك بەرەو ڕوی بێتەوە بی پروێنێ.

**الدَّواسة**: لوت ٥ ئەو ئامێرە یان ئەو پارچە کومبارەی لەبەردەرگا دادەنرێ بۆ پێڵاو پاککردنەوە.

**الدَّوِيسةُ**: بەمانا (الدَّوَّسة) دێ.

**الدِّيَسُ**: ئازاو نەبەردێکی وەها کەهەرکەسێك بەرەنگاری بێ بی پروێنێ، (ك: دِيَسَةُ) ٥ جۆرە قەفەزازێکە بادەدرێو حەصیری لێ دروست دەکری.

**الدِّيسَةُ**: بۆ مێینەی (الدِّيس) بەکاردەهێندرێ ٥ بێشەلانی پڕدارو چڕو زەمەنداوی.

**المَدَاسُ**: جۆرە پێلاوێکە، (ك: أمدسة).

**المَدَاسَةُ**: خەرمان، شوێنی گێرەکردنی گەنمو جۆی دورواوە.

**المِدْوَاسُ**: جەنجەڕ، گاگێرە، کەبەسەر کرشەکەدا دەسوڕێتەوە بۆ دەرهێنانی دانەوێڵەکە، (ك: مَداويس).

**المِدْوَسُ**: بەمانا (المِدْوَاس) دێ، واتە: جەنجەڕ، دارێکە خڕ وەکوو باگردێن پارچە ئاسنی وەکوو دەمە بیوری لێ قایم دەکرێ هەڵدەخولێندرێو بە سەرکرشەکەدا دەهێندرێو دەبرێ ٥ هەروا ناوە بۆ ئامێرێك شیرگەر شمشێری پێ مشتو ماڵ دەکا، (ك: مَداوس).

**المِدْوَسَةُ**: جەنجەڕ، واتە: بەهەمان

مانــای (أَلْمِــدْوَسُ)دیّ ٥ بــۆ وشــەی (الدَّوْسِرُ، الدّوسَرُ، الدَوسَرَةُ، الدّوسري، الدَّوْسَرانيّ)بڕوانە وشەی (دَسَرَ).

أَلْدَّوسَقُ: بڕوانە وشەی (دَسَقَ).

**داش** فــلان درشــاً: فلاّنکـەس شـەوکوێر بوو.

**دَوِش** الرجلُ دَوَشاً: پیاوەکە تاریکی‌و لێڵی بەسـەر چـاوی دا هـات ٥ چـاوی کـز بـوو ٥ چـاوی بـچوك بـوون ٥ چـاوی خێل بوون.

دَوِشَتْ عِيْنُـهُ: چاوی بـەهۆی نەخۆشـی چاوی کوێر بوون ٥ (هو أدوش وهـي دوشاءُ)، (ك: دوش)ە.

الدَّوْش: تاریکایی کەبەسـەر چاودا دێتە کزی چاو ٥ خێلی چاو.

الدَّوطة: ئەو دیارییەیە کە بـوك دەیـدا بە زاوا.

**دافَ** الــدَّوَاءَ أو الطِّيــبَ دَوفــاً: دەرمانەکـە یــان بۆنەکــەی تێــکەڵاو کــرد ٥ دەگــوترێ: (دافَــهُ في المــاء وبـــه) دەرمانەکــەی تێــکەڵاوی ئــاوکرد ٥ دەرمانەکـەی تـەڕ کـردە وردو هـاڕی کرد.

أدافَ الــدَّواءَ أو الطِّيــبَ: بـەمانا (دافَــهُ) دێ.

الدُّوفانُ: مۆتەکە.

**داق** فلانٌ دوقاً ودواقةً: فلاّنکەس نەحمەق بوو ٥ لەگێلی دا زێدەڕۆیی کرد.

**داق** الحيوانُ: ئاژەڵەکە کزو لاواز بوو.

**داق** الفَصِيلُ من اللــبن عَــنْ أمـه: بێچوەکە تێری خوارد لە شیری دایکی‌و دەمی لەگوانەکە بەردا.

**داق** الطعــامَ: تــامی خواردنەکــەی کــرد، لەخواردنەکەی چەشت.

**ديقت الغنمُ**: مەڕەکە یان بزنەکە سـەر ڕەقــی نوانــدو بــەگوێی شــوانەکەی کرد.

أَدَاقُــوا بــە: دەورەیــان داو لــەناوخۆیان گرت.

دَوَّقَهُ: گێل‌و نەفامی کرد.

إنداقَ بَطْنُهُ: سکی هاوسا.

تَدَوَّق: گێل بوو.

الدّائق: (متاع دائقٌ مائق): کالاّیەکی بێ نـرخ‌و بەهایە ٥ هەرزانە.

الــدَّوق: قلینـچکی چـاو ٥ یەکـەم پلـەی ڕێــزو پیــاو مــاقوڵی یــە لــەناو خۆرئاواییەکان دا.

الدَّوقانيــــة: گەمــــدەڵی‌و داوەشــــان ٥ نەحمەقی‌و گێلی.

الدُّوقَةُ: بەمانا (الدوقانية) دێ.

الدُّوقيةُ: کوێخای دێ‌و فەرمانڕەوایەکی بچوك.

الدَّوقعة: بڕوانە وشەی (دقع).

دَوقَــــلَ: بڕوانــــە وشــــەی (دَقَــــلَ).

**الدّوَقلُ:** بڕوانە (دقل).

**داكَ** القـومُ وغيـرهم دوكـاً ومـداكاً: خەڵـکەکە وروژان و تێـکیانەوە هاویشت ٥ نەخۆش کەوتن.

**داكَ** الطِّيـبَ والـشَّيْءَ دوکـاً: شـتە بۆندارەکـەی (بۆنەکـەی) وردو هاڕکرد، هاڕیو کردی بە تۆز.

**داكَ** فلانـاً: فلانکەسی لەناو هەڵکێشا ٥ خستیە ناو گلەوە، ژێـر گڵی کـرد ٥ فلانکەسـی دیـل کـردو کـردی بـە نەسیر.

**تَـدَاوَكَ القَـومُ:** خەڵـکەکە بەشـەڕو خراپـەکاریی بۆیـەکتری تـەنگیان بەیەکتر هەڵچنی.

**الدَّوَكُ:** جۆرێکە لەمەحاری دەریا.

**الدَّوكَـةُ:** دەگوترێ: (وقعـوا في دوكـة) خەڵـکەکە کەوتنـە شـەڕو کێشە وە لەگەڵ یەکتری.

**المـداكُ:** دەسـکەوان، سـندۆڵ، شتێـکە مـاددە بۆندارەکـەی تێـدا دەکوترێ یان لەسەری ورد دەکری.

**المِـدْوَكُ:** ئـەو دەسکە سـندۆڵەی شتە بۆندارەکـەی پـێ دەکـوترێ یـان دەسـکی دەسـکەوان کـە شـتە بۆندارەکـەی پـێ ورد دەکـرێ، (ك: مَدَاوِك).

**الدَّوكَس:** بڕوانە وشەی (دَكَسَ).

**دَالَ** الـدهرُ دولاً ودولـةً: ڕۆژگـار گـۆڕانی بەسـەردا هـاتو لەحاڵێـکەوە گواستییەوە بۆ حاڵێکی تر.

**دالـت الأيـام:** ڕۆژەکـان گۆڕانکارییـان بەسەردا هات.

**دَالَ** الثـوبُ: کراسـەکە (قوماشـەکە) ڕزی، کۆن بوو.

**دَالَ** بطنُـهُ: ورگـی دا چـۆڕاو شـۆڕ بـۆوە بۆسەر زەوی.

**أدالَ الشَّيْءَ:** شتەکەی والێ کرد خەڵك دەستاو دەستی پێ بکا.

**دَالَ** فلانـاً علـى فـلان ومنـه: یارمـەتی فلانکەسـی داو زاڵـی کـرد بەسـەر فلانکەس دا.

**داولَ كـذا بيـنهم:** شـتەکەی والـێکرد لەناو خۆیـان دا دەسـتاو دەسـتی پـێ بکەن ٥ جارێك بەدەست تاقمێکەوە بـێو دەمێـکی تـر بەدەسـت کۆمەڵێـکی تـرەوە ٥ دەگـوترێ: (داولَ الله الأيـام بـين النـاس): پـەروەردگار ڕۆژگـاری سـوڕاند هەردەمەو بەدەست یەکێکەوە بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ الأيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ﴾.

**دَوَّلَ دالاً:** پیتـی دالی نووسـی ٥ (تـدويل المدينـة) بریتییـە لـەوەی شارێـك لـەژێر کـۆنترۆڵی زیـاد لـە حکومەتێك دا بێ.

**اندالَ القـومُ:** خەڵـکەکە لەشوێنێـکەوە

گواستیانەوە بۆ شوێنێکی تر.

اندالَ الشّيْئُ: شتەکە هەڵواسرا.

اندالَ بطنُهُ: ورگی داچۆڕاو شۆڕ بۆوە.

انـــدالَ مـــاني بطنــــه: ورگـــی دڕاو ریخۆڵـەکانی هەڵڕژانـە سـەر زەوی ◊ (تداولت الأيدي الشّيْئَ): دەستـەکان ئەوشتـەیان ناڵو گۆڕکرد هـەر رۆژە شتەکە بەدەست یەکێـکەوە بـووە ◊ دەگـوتری: (تـداول القـومُ الأمـرَ): خەڵـــکەکە ناوەنـــاوە کارەکـــەیان لەئەستۆ گرت.

اسـتدالَ الأيـامَ: هـەوڵی دا رۆژگـاری دەسەڵاتداریەتی بۆ بگەڕێتەوە.

الـدّالُ: پیتێـکە لەپیتـەکانی هیجـا ◊ هـەروا بـەمانا ئـافرەتی قەڵـەو دێ ◊ (دال النهـر) بریتییـە لـە خلتـەو قوڕاوی ناو روبارەکان کـە روبارەکە دەکاتــە دوکــەرتو شـێوەی پیتــی (دال) پێــك دەهێنـــێ ◊ بــەزمانی یۆنانی پێی دەگوترێ: (دلتا).

الدّالّةُ: شۆرەتو ناوو ناوبانگ.

الـدّوالي: تـرێ تایـەفی ڕەش کەبـەلای ســوری دا بڕوانـــێ ◊ لەزانــــستی پزیـشکی دا ئەسـتوربونو هاوسـانی رەگە خوێنبەرەکانە، ناهێڵێ خوێن پێیاندا بگەڕێتەوە.

دَوَالَيــكَ: چـاوگەو زۆری زێـــدە ڕەوی دەگمەیەنێ لـە دەست بەسـەراگرتنو دانو سانو لێکۆڵینەوە دا.

الـدّوَلُ: سـەرەتیری دەسـتاو دەست پـێ کراو.

الدّوْلَــةُ: دەسـەڵاتو دەســت بەســەرا گرتنــی کاروبــار ◊ شــتی دەســتاو دەست پێکراو ◊ کۆمەڵێـك خەڵـکی زۆر بەشـــێوەیەگی هەمیـــشەیی لەهـــەرێمو وڵاتێـــك دابنیـــشنو شەخـــصیەتێکی مەعنــــەویو ســـەربەخۆی سیاســییان هـــەبێ ◊ ئەگــەر لـەبواری شـەڕدا بـەکارهات بریتییـە لـەوەی دولایـەنی شـەڕکەر هـەر دەمـەو یەکێـکیان سـەرکەوتن بەدەســت بێنـــێ ◊ هـــەروا بـــەمانا (چکڵدانە)دێ ◊ بەمانا (دەندوك)دێ ◊ بـــەمانا (لا ورگ) دێ ◊ بـــەمانا (ناوك) دێ.

الدُّولَةُ: زاڵبونو دەست بەسـەراگرتن ◊ شتی دەستاو دەست پێکراو لـەپارەو پولو ئامێری جۆراو جۆر.

الـدُّوِيلُ: گیـای وشـکەوە بـووی وەهـا ساڵێكو دوانی بەسەردا رۆیشتبێ ◊ هەر گژوگیایەك تێك شکابێو رەش هەڵگەڕابێو کەڵکی پێوەنەمابێ.

اَلْمُدَاوَلَةُ في القضاء: لێکۆڵینەوەو قسە لــێ کردنــی دادوەرەکانــە لەســەر

روداوو قەضیەیەك پێش دەرکردنی بڕیار.

الدُّولابُ: ناعور، ئامێرێکە بە ئیسترو بارگیر هەڵدەسوڕێندرێ ئاوی پێ هەڵدەگوێزرێ ٥ ئامێرێکە بۆ بەرزکردنەوەی شتی قورس بەکاردێ ٥ کەنتۆری جلو بەرگ، (ك: دوالیب).

الدُّولَجُ: بڕوانە وشەی (دَلَجَ).

الدُّولَعُ: بڕوانە وشەی (دَلَعَ).

دامَ الشَّيْءُ دوماً ودواماً: جێگیرو پایەدار بوو ٥ مایەوە ٥ دەستاو دەستی کرد ٥ جەو جۆڵی کرد ٥ کپ بوو ٥ دەگوترێ: (دام غَلَیَانُ القِدرِ) قڵپەو هەڵچونی مەنجەڵەکە کپ بوو.

دامَ الحیوانُ: ئاژەڵەکە، وڵاخەکە ماندوو بوو.

دامَ المطرُ: بارانەکە بەردەوام بوو.

دامَ الدَّلوُ: دۆڵچەکە پڕبوو.

دیم به: توشی سەر سوڕان بوو، گێژ بوو.

أدامت السماءُ: ئاسمان بارانی باراند.

أدامَ الشَّيْءَ: شتەکەی دامرکاندەوە بەئاو یان بەشتی تر ٥ خواستی وابوو بەردەوامی بکا ٥ کاڵو خۆی تێداکرد بەهێواشی دەستی بۆبرد.

أدامَ القِدْرَ: قڵپە قڵپو هەڵچونی مەنجەڵەکەی هێواش کردەوە.

أدامَ الدَّلْوَ: دۆڵچەکەی پڕکرد.

أُدیم به: بەمانا (دیم به)دێ.

داوَمَ علیه: بەردەوام بوو لەسەری‌ودەستی لێ هەڵنەگرت.

داوَمَ الشَّيْءَ: هیوای خواست بەردەوام بێ ٥ هێواشی تێدا بەکارهێنا.

دَوَّمت السماءُ: ئاسمان بارانی وردو لەسەر خۆو بەردەوامی باراند.

دوَّمَ الطائرُ: باڵندەکە بەحەوادا فڕی‌و باڵی لێکدان ٥ فڕی‌و باڵی راست کردن.

دوَّمَت الشمسُ: خۆر بەئاسمان دا خولی خۆی ئەنجام دا.

دوَّمَت عینه: بیلبیلەی چاوی سوڕاو سوڕی کرد.

دوَّمَ فلان أو البعیُ: فلانکەس یان حوشترەکە زمانی لەناو دەمی خۆی دا هێناو برد بۆئەوەی ناودەمی وشك نەبێ.

دوَّمَ الکلابُ: سەگەکە لەڕاکردن دا بینی گرت.

دوَّمَ الشَّيْءَ: شتەکەی خولاندەوە ٥ دەگوترێ: (دَوَّمَ العمامة) مێزەرەکەی بەدەوری سەری دا پێچ پێدا.

دوَّمَ الصَّبِيُّ الدوامةَ: منداڵەکە یاری بەمزراحەکە کرد.

دوَّمَ الخمرُ شارِبَها: شەرابەکە کابرای

گێژوێژکردو توشی سەرسوڕانی کرد.

دوَّمَ الزعفـران: زەعفـەرانی کـردە نـاو ئـاوەوە تێـکی هەڵـدا بۆئـەوەی بتوێتـەوە ◦ یـان تێـکی هەڵـداو توانـدیيەوە.

دوَّمَ المَرَقَةَ: شۆرباوەکەی زۆر چەور لێنا، رۆنـی زۆری تێـکرد بۆئـەوەی رۆنەکە بەسەریەوە بسوڕێتەوە.

دوَّمَ القِـدْرَ: قلّپـە قلّـپو هەڵـچونی مەنجەڵەکەی هێواش کردەوە.

استدام الشَّيْءَ: شتەکە بەردەوام بوو.

استدام فـلان: کـابرا لەکارەکە دا زێـدە رۆیی کرد ◦ چاوەڕوانی کرد.

استدام الطائرُ: بەمانا (دوَّمَ) دێ.

استدام الشَّيْءَ: هیـوای خواسـت شـتەکە بەردەوام بێ.

استدام الأمْرَ: هێواشی لەکارەکە پەیڕەو کرد.

اسـتدام عـاقبـة الأمـر: چـاوەڕوانی سەرەنجامی کارەکەی کرد.

استدام غريمـه: لەگـەڵ قەرزدارەکـەی دا هێدیو هێواشی نواند.

اسـتدام فـلان أللّه نعمـة فـلان: داوای لـەخودا کـرد نیعمـەتو پیـاوەتی فلانکەسی بۆبەردەوام بکا.

الدّوامُ: ئەوماوەیە کە پێویستە موچە خـۆر لەشـوێنی کارەکـەی بـەردەوام بێو ئەرکی سەرشانی ئەنجام بدا.

الدُّوامُ: سەر سوڕانو گێژ بوون.

الدَّوْمُ: بـەمانا (الدائم) دێ ◦ دەگـوترێ: (مازالت السماء دوماً دَوماً) ئاسمـان تا ئێستا بەردەوام بـاران دەبارێنـێ ◦ هـەروا نـاوە بـۆ درەختێـك لـەپێری دارخورمابـێ، قـەبارەی زلـەو لـە سـەعیدی میـصر زۆرە ◦ هـەروا لـەولاتی تـری عـەرەبیش زۆرە، قـەبارەی بەرەکـەی بەئەنـدازەی سێوێکە توێکڵێکی ئەستورو سوری هەیـە ◦ دەنکـی گـەورەی هەیـەو کاکڵەکـەی نـەرمو ئیـسفنجی یـە ◦ هـەروا نـاوە بـۆ درەختـی گـەورە لەهەر جۆرێك بێ.

الدُّوَاقَـةُ: مـزراح، (خلخلۆکـە) دارێـکە لایەکی پانو لایەکی باریك سەری لاباریکەکـەی ئاسنێـکی خـڕی بەئەندازەی دەنکە نۆکێکو گەورەتر پێدا دەکوترێ ◦ ئەمجار پەتێکی تێ دەهاڵێنـدرێو بـەزەوی دا دادەخوترێودەخولێتەوە.

الدِّيمَـةُ: بارانێـك مـاوەی بارینەکـەی درێژە بکێشێو لەسەرخۆ بباری.

الدَّيُّوم: بەردەوام.

المُدَامُ: بارانی بەردەوام ◦ شەراب.

المُدَامَةُ: شەراب.

المِدْوَامُ: ئاو یان چیلکەدارێکی تـەڕ یان

هەرشتێکی تر کە هەڵچوون و قڵپە قڵپی مەنجەڵی سەر ئاگر دامرکێنێتەوە، (ك: مداویم).
المَنْوَم: بەمانا (المِذْوامُ) دێ، (ك: مَدَاوِمَ).
دان دَوْناً ودوناً: پڕو پوچ و بێخێر بوو ٥ زەعیف و لاواز بوو.
دان لــــه: فەرمانبــەر داری بـــوو، گەردنکەچی بوو.
أُدِينَ: بەمانا (دان)دێ.
دَوَّنَ دیوانـــاً: دیــوانی شــیعری دانـــا، شیعری کۆکردەوەو نوسینیەوە.
دوّن الکتــب: کتێبـەکانی کۆکردنـەوەو رێکی خستن.
تَدَوَّنَ: بۆ مطاوعەی (دَوَّنـه) هاتووە ٥ باش دەوڵەمەند بوو.
الدُّونُ: خوێڕیو پڕو پوچ.
دُوْنَ: زەرفی زەمانە.
الـدِّیوانُ: دەفتـەرو تۆمارگـا کـە نـاوی سەربازو شتی وای تێدا بنووسرێ ٥ نووسـەرو شـوێنی ئیـشکردنیان ٥ کۆمەڵێـك یـا زۆربـەی شـیعری شاعیرێك ٥ هەموو کتێبێك.
دَوِي فـــلان دَوَیً: فلانکـەس تووشـی نەخۆشـی سیل بـوو ٥ بەنەخۆشـی هەناو مرد ٥ رقو کینەی پەیداکرد ٥ گێلو نەحمەق بوو ٥ کوێر بوو.
دویـت الأرضُ: زەوییەکـە دەردو ئافـاتی زۆر بوو.
أدْوَى فــلان: فلانکــەس هاونــشینی نەخۆشێکی کرد.
أدْوَى فلاناً: فلانکەسی نـەخۆش کـرد ٥ چارەسەری نەخۆشییەکەی کرد.
داوىَ المــریض ونحــوه مــداواةً ودواءً: چارەسەری نەخۆشەکەی کرد.
داوىَ الفــرسَ: ئـەرکی بـەخێوکردن و سەرپەرشـتی کردنـی ئەسـپەکەی لەئەستۆ گرت.
دَوَّى الرعد: هەورەکە گرماندی.
دَوَّى الفحـــلُ: ئەسـپەکە حیلکانـدی، حیلکەی ئەسپەکە بیسترا.
دَوَّى الطـائرُ: باڵندەکـە لەحـەوادا باڵی رێك کردن و فڕی.
دَوَّى الکلـب في الأرض: سـەگەکە بـەناو زەوییەکەدا سوڕایەوە.
دَوَّى الرجـل في الأرض: پیاوەکـە بـەناو زەوییەکەدا رۆیی.
دَوَّى بالـشَّیْ: بـەلای شتەکەدا رۆیـی ٥ ملـی لەسـارای کـاکی بـەکاکی نـاو رۆیی.
دَوَّى اللبنُ والمرقُ: شیرەکە یـان شۆرباکە توێی گرت ٥ توێی کەوتە سەر.
دَوَّى المـاءُ: ئاوەکـە بـەڵفی سـەرکەوت ٥ شتێکی لەسەر دەرکەوت وەکوو توێ وایە.

**دَوِّيَ الطعامُ**: خۆراكە كە زۆر بوو.

**دَوِّيَ فلاناً**: سەرتوێژی شیرو ماستی دا بەفلان.

**إدّوى**: سەرتوێژی شیرو ماست یان هی شۆربای خوارد.

**تداوى**: حەبو دەرمانی خوارد.

**الـداوي**: (لـبن داوٍ) شـیرو ماستێـكی سەرتوێژدارە.

**الدَّاوِيَةُ**: دەشتی كاكی بەكاكی.

**الدَّوِيَّةُ**: بەمانا (الدّاوِيَةُ) دێ.

**الدَّايَـةُ**: مامـان ٥ ئـافرەتی بێـگانەی شیردەر ٥ ئافرەتێك منـداڵی خەڵـك بەخێو بكا.

**الـدَّوى**: نەخۆشـی ٥ نەخۆشـی سـیل ٥ عـــەیبی دیارنـــەبووی كـــاڵا ٥ ئـادەمیزادی خـب بـوو، خوسـت لـێ بـڕاو ٥ دەگـوترێ: (تركــت فلانـــاً دوًى): فلانكەســـــم جێهێـــــشت خوستی لـێ بڕابـوو، جووڵەی لێـوە نەدەهات.

**الدَّواءُ**: دەرمان، هەرشتێـك چارەسـەری نەخۆشی پێ بكرێ.

**الـــدَّوَاةُ**: قوتـــوە مەرەكـــەبو ئـــوچو كەرەسەی پێ نووسین ٥ هەروا نـاوە بۆ توێـكڵی كاڵەكە مارانـەو توێـكڵی كاڵەكو توێـكڵی بۆڵەترێ.

**الدُّوايَةُ**: توییەكی تەنكە دەكەوێتە سەر شـیرو شـۆربا ٥ دەگـوترێ: (مرقــة دُوايَة): شۆرباوێـكی توێدارو چـەورو پیـوداره ٥ ئـەو بـەڵغو سـەوزاییەی دەكەوێتە سەر ددان.

**الــدَّوُّ**: سـارای كـاكی بـەكاكی ٥ زەوی تەخت.

**الدَّوِيُّ**: بەمانا (الدّاوِيَة).

**الـدَّوِيُّ**: گرمـەی هـەور ٥ ویـزە ویـزو گیزە گیزی هەنگو مێشو مێشولە ٥ دەنگـو صەدا.

**دَوِي الريح**: بای لەسەرە خۆ.

**دَوِيَ الأذن**: هاشـە هاشـی گوێچكە ٥ تاكـە كەس ٥ دەگوترێ: (مـا بالـدار دَوِيٌّ) كـەس لەخانومكـەدا نییـە ٥ هـەروا دەگـوترێ: (داء دَوِيَـــة) دەردێـــكی گرانە.

**الدَّوِيَّـــةُ**: (أرض دَوِيَّـــةٌ): زەوییـــەكی نـەگونجاوە بـۆ تێـدا ژیـان، دەردو ئافاتی زۆرە.

**الدَّيِيّ**: بڕوانە (دَوَأ).

**الدَّيُّوبُ**: بڕوانە (دَبَّ).

**دَاثَ دیثاً**: نەرمو ئاسان بوو.

**دَاثَ فـلان**: فلانكـەس غـیرەتو پیـاوەتی نـــەماو خەجاڵــەت بــوو، گــەوداو خوێڕییە.

**دَیِّثَ فـلان**: فلانكـەس گەوادو خـوێڕی بوو.

دَيَّثَ الطريقَ: ڕێگاكەی پێخوست كرد، تەختو بێ كۆسپی كرد.
دَيَّثَ الشَّيْءَ: شتەكەی نەرم كرد، چەماندی، ژێربـاری كـرد ٥ دەگوترێ: (دَيَّثَت المِطرقةُ الحديدَ) چەكوچەكە ئاسنەكەی نەرم كرد چەماندییەوە.
دَيَّثَ الحيوانَ والإنسانَ: ولاخەكە یان ئادەمیزادەكەی زەلیلو ژێربار كرد ٥ خەساندی ٥ ئەوەندەی زەلیلو ملكەچ كرد تاژێر باربوو، دەگوترێ: (دَيَّثه بالصغار)منداڵە وركەی دواخستو سوكایەتی پێ كرد.
تَدَيَّثَ: بۆ موطاوەعەی (دَيَّثَهُ)دێ.
دَيَّثَ فلان: فلانكەس خەڵكی بۆژنەكەی هێناو لەجیاتی ئەوە پارەی وەرگرت، واتە: گەوادیی بەخێزانی خۆی كرد.
الدَّيَّثانُ: مۆتەكە كەسواری ئادەمیزاد دەبێ.
الدَّيْثانيُّ: بەمانا (الدَّيثانُ) دێ.
الدَّيّوثُ مِن الرجال: پیاوێكە گەوادیی بەژنو خوشكی خۆی بكا ٥ غیرەتو پیاوەتی تێدانییەو بەهیچ شتێك خەجاڵەت نابێ.
الدّياجي: بڕوانە (دَجَا).
الدَّيْجوج: بڕوانە (دَجَّ).
الدَّيْجور: بڕوانە (دَجَرَ).
الدَّيْجوريّ: بڕوانە (دَجَرَ).
الدَّيْحان: بڕوانە (دَحَنَ).
الدَّيْحس: بڕوانە (دحس).
الدَّيْخَسُ: بڕوانە (دَخَسَ).
الدَّيْدَبُ: بڕوانە (دَدَبَ).
الديدبان: بڕوانە (دَدَبَ).
الديدان: بڕوانە (دَدَنْ).
الدَّيدن: بڕوانە (دَدَنْ).
تدير المكان: بڕوانە (دَوَرَ).
الدَّيْر: كەنیشتە، شوێنی خوداپەرستی ڕەبەنە مەسیحییەكان چ نێرو چ مێ ٥ (رأس الدير): پیاو ماقوڵو سەرەك خێڵ.
الدَّيْرانيُّ: خاوەنی كەنیشتە، ئەوكەسەی سەروكاری كەنیشتە دەكا لەڕوی پێداویستیو بیناسازییەوە.
الدَّيّار: بەمانا (الدّيرانيّ)دێ.
الدَّيّور: بڕوانە (دور).
الديرة: بڕوانە (دور).
المدير: بڕوانە (دور).
المديرية: بڕوانە (دور).
الدِّيس: بڕوانە (دوس).
الدِّيسةُ: بڕوانە (دوس).
الدَّيْسَقَ: بڕوانە (دَسَقَ).
الدَّيسم: بڕوانە (دسم).
الديسمة: بڕوانە (دَسَمَ).

ديسمبر: مانگی دوانزەی رۆمیو کانونی یەکەم لە حیسابی سورەیانی دا.

**داصَ** دیصاً ودَیَصاناً: لای دا، کلا بوو ٥ ریّی لیّ گوم بوو سەر کوێر بوو ٥ لەشەڕدا هەڵات ٥ چوستو چالاك بوو، بەدەوری شتەکەدا سوڕایەوە ٥ شوێن فەرمانڕەواکەوتو پابەندی فەرمانو بڕیاری بوو ٥ دوای گەشەکردنو بەرز بوونەوە تێشکاو پوچایەوە ٥ جوڵە جوڵی کرد.

**داصَ** عَنْ الطریق: لەرێگا لای دا.

داصَت السمکة في الماء: ماسییەکە رۆچووە خوار بەناو ئاوەکەدا.

انداص الشَّیْئُ: شتەکە لەدەست دەرچوو لەدەست ترازا.

إنداص بالشَرّ: لەناکاو بەشەڕو خراپەکاریی بەرەنگاری بۆوە ٥ دەشگوترێ: (انداص علیه بالشَرِ).

الدّائص: دز، (ك: داصة).

الدَیّاصُ: قەڵەو خڕپنێك لەبەر گۆشتنی بەدەست نەگیرێ ٥ یان لەبەر بەهێزو پتەویی ماسولکەکانی کەس پێی نەوێرێ.

الدَیّاصَةُ: ئافرەتی گۆشتن ٥ ئافرەتی کوڵەبنە.

الدَّیقوعُ: بڕوانە (دقع).

الدّیك: کەڵەشێر، (ك: دیوك، أدیاك، دیکة) ٥ هەروا ناوە بۆ بەهار لەم رومەوە کە بەجۆرەها رەوەكو گوڵ دەرازێتەوە ٥ ئەو ئێسقانەی لەدوا گوێچکەی ئەسپەوەیە.

المدیکة: (أرض مدیکة): زەوییەکی تەخت کراو راستەو پاستە کراوە.

الدَّیلعُ: بڕوانە (دَلَعَ).

الدّیماسُ: بڕوانە (دمس).

الدیمة: بڕوانە (دوم).

الدیموقراطیة: جۆرێکە لەفەرمانڕەوایی کەسەرورەی گەلی تێدا بەرچاو دەگیرێو دژی دیکتاتۆرییەتە ٥ ئەمە لە روی رامیارییەوە، لەروی کۆمەڵایەتیشەوە شێوازێکی ژیانە لەسەر بنەمای یەکسانیو ئازادی رادەربڕینو بیرکردنەوە.

**دانَ** دینا ودیانة: ملکەچو زەلیل بوو، فەرمانبەر دار بوو ٥ دەشگوترێ: (دان لە و دان منه): تۆڵەی لێساند ٥ (دان بکذا): ئەوەی کردە ئایینی خۆی.

**دان** فلان دیناً: فلانکەس قەرزی کرد ٥ قەرزەکانی زۆربوون ٥ خوی بەکاری خێر یان شەرمنگێزییەوە گرت.

**دان** فلاناً دینا: فلانی زەلیل کرد ملکەچی کرد ٥ دەگوترێ: (دان فلان نَفْسَهُ) خۆی هەڵنا بۆ کردنی کارێك کەپێی ناخۆش بوو ٥ نەفسی خۆی موحاسەبە کرد ٥ (دان الشَّیْئ) شتەکەی کردە ملکی ئەو.

أدانَ: پـارەی قـەرز كـردو بـوو بەقەرزدار، پارەی بە قەرزداو بوو بە خاوەن قەرز.

أدانَ فلاناً: قەرزی دایە ٥ قەرزی لێ كرد.

دَايَنَهُ مُداينة ودياناً: مامەڵەی بەقەرز لەگەڵ دا كرد ٥ پاداشی دایەوە ٥ دادگایی كرد.

دَيَّنَهُ: قەرزی دایە ٥ وازی لێ هێنا خۆی و بیرو باوەڕی چۆنەو چۆن نییە چی بەسەرەوە نەبوو ٥ بڕوای پێ كرد.

دَيَّنَ فلاناً الشيْئَ: شتەكەی كردە موڵكی فلان ٥ دەگوترێ: (دَيَّنَ فلاناً القومَ) فلانكەسی كردە كوێخاو كاربەدەستی خەڵكەكە.

إدَّان: قەرزی كرد، بوو بە قەرزدار ٥ قەرزی لەسەر كەڵەكە بوو.

إدَّان القومُ: خەڵكەكە مامەڵەیان بەقەرز كرد.

تداين الرجلان: دوو پیاوەكە مامەڵەیان لەگەڵ یەكتردابەقەرز كرد.

تَدَيَّنَ: قەرزی كردو بوو بەقەرزدار.

تَدَيَّنَ بكذا: بڕوای بەوەكردو پابەندی بوو.

الدِّيوان: بڕوانە (دون).

استدان: قەرزی كردو بوو بەقەرزدار ٥ داوای ئەوەی كرد قەرزی پێ بدەن ٥ دەگوترێ: (استدان فلاناً) قەرزی لەفلانكەس كرد.

الدِّيانَةُ: ئەوەی ئادەمیزاد بیرو باوەڕی پێیە.

الدَّيْنُ: قەرزی ماوە دیاریكراو ٥ بەهای كالاو شتومەك ٥ هەرشتێك حازرنەبێ ٥ مردن.

الدِّينُ: بەمانا (الدِّيانة) دێ ٥ هەروا ناوە بۆ هەموو ئەوشتانەی عیبادەتی خودایان پێ دەكرێ ٥ ئاینی ئیسلام بڕوا بەدڵ و دان پیانان بەزوبان بەجەستەو ئەندام كاركردن ٥ ژینامە ٥ مڵكایەتی ٥ فەرمانڕەوا ٥ حاڵ و وەزع ٥ خۆپارێزی ٥ حیساب و ئەژمار ٥ قەزاو ئەخشەدانان، (ك: أدْيُن، ديون، أديان).

الدِّينة: بەمانا (الدِّين)دێ ٥ بەمانا خودا پەرستی دێ.

الدَّيَّان: ناوێكە لەناوە جوانەكانی خودا ٥ قازی و دادوەر ٥ پاداش دەرەوە بەخێر یان بەشەڕ ٥ ژمێریار.

المِدْيانُ: كەسێكە زۆر قەرزو قۆڵە بكا، كەسێك زۆر شت بەقەرز بدا، دەشگوترێ: (امرأة مديان)، (ك: مداين).

المَدينُ: بەندەو كۆیلە.

دَيْ دَيْ: جۆرە گۆرانییەكە بۆ حوشتر دەگوترێ.

الدَّايَةُ: بڕوانە (دوی).

الـدِينامیكا: زانیارییەكە دەربارەی جەم و جوڵ بەمانا گشتییەكەی.

الدَّيُّوم: بڕوانە (دَوَمَ).



**الــدّالُ**: پیتــی نۆیــەمی پیتــەکانی هیجایــە ٥ لــەنێوان کــەناری زوبــانو کــەناری دوو دانــی پێــشەوەی لای سەرو دەردێ.

**ذا**: ئیــسمی ئیــشارەیە بــۆ تــاکی نێرینــە بــەکاردێ، دەتــوانرێ پیتــی (کــافی خیطابی) پێوە بلکێنــدرێ بــەگوێرەی خیطابە ئاڕاستە کراوەکە (کافەکە) دەگــۆڕێ، دەگــوترێ: (ذاكَ، ذاكِ، ذاكما، ذاکــم، ذاکــنّ) ٥ واش دەبــێ پیتی (ها)کە بۆ هوشیار کردنەوەیــە پێــشی دەکــەوێ، دەگــوترێ: (هــذا) (هذاك) وادەبێ پیتی (ل) کە دوریــی دەگەیەنێ، دەکەوێتە نێوان ئیــسمی (ذا)و (کافەکە)، دەگــوترێ: (ذلك) ٥ هەروا وشەی (ذا) بەمانا خاوەن دێ، (ذا المال) واتە: خاوەن ماڵ.

**ذات**: بــۆ مێینــەی (ذو)ی بــەمانا صــاحب بــەکاردێ، دەگــوترێ: (هــو ذو مــال وهـــي ذات مـــال) ٥ (ك: ذَوَات)ە ٥ وادەبێ بەمانای یــەکجار دەگەیــەنێ، دەگــوترێ: (لقیــت فلانــاً ذات مــرة) جارێــك توشی فلانکەس بووم ٥ (مــا کلمت فلاناً ذات شــفة): یــەك وشــە قــسەم لەگەڵ فلان نــەکرد ٥ هــەروا بەمانا حاڵووەزع دێ (وأصــلح ذات بینهم) حاڵو وەزعی نێوانیانی بــاش کــردو کێــشەیان نــەما ٥ بــەمانا لای شــت دێ، دەگــوترێ: (ذات الــیمین وذات الـــــشمال) لای ڕاســـتو لای چـــەپ ٥ بـــەمانا خـــودی شـــتو حەقیقــەتی شــت دێ، دەگـــوترێ: (ذات الـــشيء) خـــودی شـــتەکەو حەقیقــەتو تایبەتمەنــدی شــتەکە، دەگوترێ: (عیب ذاتــي): عەیبێــکی سروشتیو خۆڕسك.

**الــذّاتُ**: نــەفسو شــەخصو خــود ٥ لەبواری ئــەدەب دا (نقد ذاتي): واتــە ڕەخنەکــە پەیوەنــدی بــە بــیرو بۆچـــونی کەســـەکەو هەڵـــچونو داچوونە دەروونیەکانیــەوە هەیــە ٥ پێچەوانەی نەقــدی مــەوضوعییــە، دەگـــوترێ: (جـــاء فـــلان بذاتـــه): فلانکەس خودی خۆی هاتە (عرفــه من ذات نفــسه): لــەخودی خۆیــەوە ناسیوێتی شارەزابوو.

**ذات** الصدر: نهێنی نــاو دڵــی ئــادەمیزاد ٥ قورئــان دەفــەرموێ: ﴿وَاللّــهُ عَلِــيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾.

**ذات** الرئة: ئیلتیهابو هەوکردنی سی.

**ذات** الجنب: ئیلتیهابی پەردەی سی.

**ذَأَب** فلان: فلانکەس کردەوەی گورگانەی کرد، کەلەشوێنێکەوە ترسی هەبوو لەلایەکی ترەوە بۆی هات.

**ذَأَب** في السير: لە ڕۆیشتن داپەلەی کرد.

**ذَأَب** الريحُ الشَّيَ: بایەکە لە هەموو لایەکەوە بۆشتەکە هات.

**ذَأَب** الشَّيَ: شتەکەی کۆکردەوە، ڕێکی خست.

**ذَأَب** الدابَّةَ: وڵاخەکەی لێخوڕی.

**ذَأَب** فلاناً: فلانکەسی دەرکردو سوکایەتی پێکرد ◦ ترساندی.

**ذَأَب** الغُلامَ: کاکۆڵی بۆ منداڵەکە دروست کرد.

**ذَئِبَ**: لەگورگ ترسا ◦ گورگ کەوتە ناو مەڕو ماڵاتەکەیەوە.

**ذَئِبَ** ذاباً: وەکوو گورگی لێ هات لەچاو چنۆکیو زێنە خرۆیی دا ◦ لەگورگ ترسا ◦ لە شتێك ترسا.

**ذَؤُبَ** ذآبَةً: وەکوو گورگی لێ هات لەخراپەکاریو چاوچنۆکی دا.

**أذأبت** الأرضُ: وڵاتەکە گورگی زۆر بوو ◦ گورگی تێدا پەیدا بوو ◦ لەشتێك ترسا.

**أذأب** في السير: لەرۆیشتن دا پەلەی کرد.

**أذأبَ** الغُلامَ: کاکۆڵی بۆ منداڵەکە کرد.

**ذأَبَهُ**: کاکۆڵی بۆکرد ◦ ترساندی ◦ ڕایچڵەکاند.

**تَذاءبت** الريحُ: بایەکە هەڵبوونەکەی شێواوبوو هەردەمە لەلایەکەوە دەهات.

**تذاءبت** الريحُ الشَّيْئَ: بایەکە هەردەمە لەلایەکەوە لەشتەکەی داو بۆی هات.

**تَذَأبَ**: وەکوو گورگی لێ هات.

**تَذَأبَ** الريحُ الشَّيْئَ: بایەکە لەهەموو لایەکەوە بۆشتەکە هاتو لەهەموو کونو کەلەبەرێکەوە لەشتەکەی دا.

**تَذَأبَ** فلاناً: فلانکەسی ترساند.

**استَذْأبَ**: وەکوو گورگی لێ هات.

**الذُؤابة** من كل شيئ: لای سەروی هەموو شتێك، دەگوترێ: (فلان ذؤابة قومه): فلانکەس سەرۆکی هۆزەکەیەتی، پیاو ماقوڵو ریش سپی خەڵکەکەیە ◦ سەری شتو کۆتاییەکەی، دەگوترێ: (ذؤابة السوط) سەری شوڕكو قەمچی ◦ (ذؤابة العمامة): سەری لکی مێزەر، دەگوترێ: (فلان فُلِت ذؤابته): فلان لەڕاو بۆچوونی خۆی ژێوان کراوەتەوە.

**الـذِّئبُ**: گورگ ٥ سەگە كێوی٥ (ك: أذؤب، ذِئـاب، ذُؤبـان) ٥ لەپەنـدی پێشینانی عـەرەب دا هـاتووە دەڵێ: (الذِّئبُ خالياً أسـد): گـورگی برسـی شـێرەكۆ لـەهیچ ناكاتـەوە، هـەروا دەگوترێ: (فلان من ذُؤبان العرب): فلاّنكـەس لـە دزو جـەردەكانی عەرەبە.

**الْمَذْأَبَةُ**: (أرض مَذْأَبَة): ولاّتێـكی فـرە گورگە، گورگی زۆرە.

**ذَئِـرَ** ذأراً: رقـی هەڵساو تـۆرا، خـۆی ئامادەكرد بۆ هەڵمەت بردن.

**ذَئِرَ** بالأمر: خوی بەكارەكەوە گرت.

**ذَئِرَ** الشّيءَ: شتەكەی پێ ناخۆش بوو روی لێ وەرگێڕا٥ (فهو وهي ذائِر وذئِر).

**ذَئِـرَ** عليـه: جەسارەتی بەسـەر دا كـرد، بەسەریا زاڵ بوو، دەگوترێ: (ذَئِرَت المـرأةُ علـى بعلـها): ئافرەتەكـە لەمێردەكەی هەڵگەڕایەوەو ناچیزە بوو.

**أذْأَرَهُ** اليه: پەنای پێ برد.

**أذْأَرَهُ** علـى فـلان: رقـی فلاّنكەسـی هەڵساند.

**آذْأَرَهُ** بـه: بەوشتە هـەڵیناو ئیغـرای كرد.

**ذاءَرَتْ** **الناقـةُ**: حوشـترەكە لـە بێچوەكەی نەبان بوو.

**ذأرت المـرأةَ**: ژنەكـە لەمێردەكـەی ناچیزە بوو.

**ذَأفَ** ذأفاً وذأفاناً: مرد.

**ذَأفَ** الجـريحَ: برینـدارەكـەی مرانـد، كوشتی.

**الذُّؤَافُ**: ژەهری كوشندە، دەشگوترێ: (موت ذؤاف): مردنی كتوپڕ.

**ذَأَلَ** ذألاً وذألانـاً: بـەخێرایی‌و خۆبـادان رۆییشت ٥ بازی دا.

**ذَأَلَ** فلاناً: فلاّنكەسی دەركردو سوكایەتی پێ كرد.

**تَذاءَلَ**: خۆی بچوك كردەوە، یان ئـەو دوو كەسـە یـەكتریان بەبـچوك لەقەڵەم دا.

**ذُؤالـة**: عەلـەمی جینـسە بـۆ گـورگ (واتە ڕەگـەزی گـورگ) ٥ (ك: ذُؤْلان وذئلان).

**المِذْأَلُ**: خۆشڕەوی وەزن سوك.

**ذَأَمَهُ** **ذأْمـاً**: رەخنـەی لە گەلـێ گـرت بەسـووك‌و بـێ ڕێـزی دانـا ٥ دەری كردەترۆی كرد.

**آذْأَمَهُ**: ترساندی.

**الذَّأْمُ**: عەیب‌و عار.

**الذَّأمَـةُ**: دەگـوترێ: (مـا سمعـت لـه ذأمَةً): تاقە وشەیكم لـێ نەبیست.

**ذَبَّ** ذَبـاً: لەیـەك شوێن جێـگیر نـەبوو، رەنگی هەڵبزركا.

**ذَبَّ** جسمُهُ: جەستەی چرچو لاواز بوو.

**ذَبَّ** شَفَتُهُ ذَبّاً وذَبوباً: لێوی وشك بوو لەبەر تینوایەتی زۆر لێوی سیس بوون، دەگوترێ: (ذَبَّ لسانُهُ والغديرُ والنّباتُ ذَبّاً وذبوباً): وشك بوو.

**ذَبَّ** الذُّبابَ وغيرَهُ ذَبّاً: مێشەکەی دەرکرد.

**ذَبَّ** عنه: بەرگری لێ کرد ٥ داکۆکی لێ کرد.

**ذُبَّ** المكانُ: ئەو شوێنە مێشی زۆر بوون ٥ (ذُب الحيوانُ): ئاژەڵەکە مێش چۆتە کونە لوتیەوە.

**ذَبَّبَ**: بەمانا (ذَبَّ) دێ ٥ زێدە ڕەوی کرد لەشوێن گۆڕکێو هەڵبەزو دابەزدا.

**ذَبَّبَ في السير**: پەلەی کرد لە ڕۆیشتن دا، دەگوترێ: (ذَبَّبَ النهارُ): زۆر نزیکە تەواو ببێ کەمەکێکی ماوە.

**ذَبَّبَ الذُّبَابُ**: ناوە بۆ زۆر لەجۆرەکانی مێشو مەگەز، یەکێ لەوانە مێشی ماڵەکی، مێشە سەگ، مێشە ئەسپ، مێشی میوەجات ٥ (ك: أذِبَّةٌ وذِبّان)، دەگوترێ: (فلان ذبابٌ): فلانکەس وەکوو مێش وایە ئەزیەتی خەڵك دەدا.

**ذباب العين**: بیلبیلەی چاو ٥ (ذباب السيف): تیژایی شمشێر.

**الذُّبابَةُ**: ئاکی مێشە ٥ باقی ماندەی شت هەرشتێك بێ، دەگوترێ: (على فلان ذبابة من دين): فلانکەس بەشێکی کەمی لەقەرزەکە لەسەر ماوە، (و به ذبابة من جوع): کەمێك برسییەتی پێوە ماوە، (وصدرت الإبلُ وبها ذبابة من عطش): حوشترەکە لەسەر دوێڵاوەکە گەڕایەوە کەمێك تینوایەتی مابووە

**ذُبَابَةُ الإبل**: مێشولەیەکە لەرزو تاو سێبەرۆ دەگوێزێتەوە.

**الـذَّبُّ**: گاکێوی ٥ دەگوترێ: (بعير ذبٌّ): حوشترێکە لەهیچ شوێنێ هەڵناکا دەڵێی ماخۆلانیەتی.

**المَذَبَّةُ**: (أرض مذبَّةٌ): خاکێکە مێشو مەگەزی زۆرە ٥ (ك: مَذَاب).

**المِذَبَّةُ**: مێش کوژ، مێش دەرکەر.

**ذَبَحَهُ ذبحاً**: سەری بڕی، قورقوڕاگەی هەڵبڕی.

**ذَبَحَ** الشَّيءَ: شتەکەی دوولەت کرد، کونی کرد، دەگوترێ: (ذَبَحَ الدَّن): کونی لەکوپەکە کرد.

**ذبحته العبرة**: فرمێسك خنکاندی.

**ذبحَهُ الظما**: تینوایەتی تینی بۆهێنا، برستی لێ بڕی.

**ذبحت فلاناً لحيتُهُ**: فلانکەس خوێن لەژێر چەناگەیەوە ڕۆیی.

ذَبَّحَ: زۆری سەربڕین ئەنجام دا.
ذَبَّحَ الحیوانَ والطیرَ: حەیوانەکەی یان باڵندەکەی سەربڕی.
إذَّبَحَ: کوشتنی بڕیار دا، حەیوانی کوشتنی پەیدا کرد.
تَذَابحوا: خەڵکەکە کەوتنە وێزەی یەکترو یەکتریان سەربڕی.
الذّابِحُ: داخو نیشانەیەکە لەپانایی مل دەکرێ.
الذُّباحُ: ئیلتیهابێکە لەگەرودا دروست دەبێ دەیهاوسێنێ بەکوردی بینەخرەی پێ دەڵێن.
الذِّبْحُ: ئاژەڵی قوربانی، ئەو ئاژەڵەی ئامادە دەکرێ بۆ سەربڕین ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ﴾.
الذُّبْحَةُ الصدرية: ئازارێکی تاوتاوو دەمدەمییە لەسنگ دا پەیدا دەبێو توشبوو بەو نەخۆشییە هەست دەکا خەریکە هەناسەی دەرنەیەو بخنکێ.
الذِّبحة: بەمانا (الذّباح) دێ.
الذّبيحُ: سەربڕاو، هەر ئاژەڵێك بەکەڵکی قوربانی بێ ٥ (ك: ذِبحی وذَباحی)یە.
الذّبيحة: حەیوانی قوربانی بەسەر بڕاوی ٥ (ك: ذَبحی وذَباحی).
المَذْبَحُ: قەسابخانە یان شوێنی پێشکەشکردنی قوربانی لە پەرستگای ناموسوڵمانان دا ٥ قورقوڕاگە.
مَذْبَحُ الكنيسة: ئەوشوێنەی ڕێو ڕەسمی قوداسی مەسیحییەکانی تێدا ئەنجام دەدرێ.
مذبح السَّيْل: ئەو کەندرو دادڕانەی لافاوە کە لەزەوی دەیکا بەمەرجێ قوڵاییەکەی بەئەندازەی بستێك بێ ٥ (ك: مَذَابِحَ).
المِذْبَحُ: ئەوشتەی کاری سەربڕینی پێ ئەنجام دەدرێ.
ذَبْذَبَ الشَّيْءُ المعلق في الهواء: شتە هەڵواسراوەکە بەحەواوە هاتوچۆی کرد.
ذَبْذَبَ فلان: فڵانکەس لەنێوان دوو شت یان نێوان دوو پیاودا ئەمبەرو ئەوبەری کرد، هەردەمە دۆستی یەکێکیان بوو.
ذَبْذَبَ الشَّيْءَ: شتەکەی لەجمو جۆڵ خست.
ذَبْذَبَ فلاناً: بەسەرسامیو واقو وڕماوی فڵانکەسی جێ هێشت.
تَذَبْذَبَ: کەوتە جمو جۆڵو هاتو چۆ.
تَذَبْذَبَ فلان: بەمانا (ذَبْذَبَ)دێ.
الذَّبْذَبُ: زمان.
الذُّبْذُبُ: ئەو گوڵینكو هەیتو هوتەی بەکەژاوەوە دەکرێ بۆ جوانی، یان بەسەرو ملی حوشترەوە دەکرێ ٥

(ك: ذَبَاذِبُ) ٥ لەزانیاری ریاضەو ئەنـدازیاری دا بریتییە لەوەمەسافەیەی فەبارەیەك دەیبڕێ کە دەکەوێتە جەو جوڵ لەدورترین خاڵ لەسەر لایەکی میحوەری وێکچو تا دەگەڕێتەوە بۆ هەمان خاڵ جارێکی تر.

**ذَبَرَ** ذبارةً: سەیری کردو هەستی پێکرد پێی زانی.

**ذَبَرَ** الخَبَرَ: لەهەواڵەکە حاڵی بوو.

**ذَبَرَ** الكتابَ ذَبراً: کتێبەکەی نووسییەوە، یان بەهێواشی خوێندییەوە یان بە خێرایی خوێندییەوە.

**ذَبَرَ** القراءةَ: خوێندنەوەکەی سووك کرد.

**ذَبِرَ** عليه: رقی لێ هەڵسا ٥ (هو ذَبِرٌ وهي زَبِرَة).

ذَبَّرَ الكتابَ: کتێبەکەی نووسییەوە.

**ذَبَّرَ** الكوبَ: پەراوێزی بۆ کراسەکە کردو گۆزو گوڵێنکی بەداوێنەکەیەوە کرد.

الذَّبرُ: بێ دەم و پلی، دەگوترێ: (فلان لا ذَبْرَ لـه): فلانکەس نوتقی نییە، لەبەر لاوازیو بێهێزی زمانی گۆ ناکا، قسەی بۆناکرێ.

المِذْبَرُ: فەڵەم.

**ذَبَلَ** النباتُ ذبلاً وذبولاً: روەکەکە تەڕو تازەییەکەی نەما سیس بوو، دەگوترێ: (ذَبَلَ فوه): دەمی بەهۆی تینوێتی یان نەخۆشی وشك بوو، تفی لەدەم دا نەما.

**ذَبَلَ** الإنسان والحيوان: ئادەمیزادەکە یان ئاژەڵەکە کزو لاواز بوو.

**ذَبَّلَ** السِراجَ ذبلاً: پلیتەی چراکەی چاك کرد.

أذبَلَـهُ: وشکی کردەوە کزو لاوازی کرد.

أذبَلَ بالشَّيْءِ: شتەکەی چەماند.

تَـذَبَّلَ: ئەمدیوو ئەو دیوی کرد جینگلی دا.

تَذَبَّلَ في المَشيِ: لەرۆیشتن دا خۆی بادا لەنجەو لاری کرد.

تَذَبَّلَ فلان: فلانکەس هەموو پارچە جلەکانی بەری داکەندن جگە لەیەك پارچەیان نەبێ.

الذّابِلُ: باریك و تیژ، دەگوترێ: (رمح ذابِلٌ): رمبێکی باریکە.

الذُّبالَـةُ: پلیتەی چرا ٥ ئەو داوە دەزوەی دەسوتێو روناکی دەدا.

الذَّبْلُ: پێستی کیسەڵی وشکانی، یان هی کیسەڵی دەریا بازنەو شانەی لێدروست دەکرێ.

الذُّبْلَـةُ: قشپل ٥ بای پێچاو پێچ (گێژەلوکە).

الـذّبيل: کارەسات و شتی سەرسوڕهێنەر.

ذَحَجَتْـهُ الريح ذحجاً: بایەکە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بردی و هەڵسوڕو داسوڕی پێ کرد.

**ذَحَجَ** الشَّيْءَ: شتەكەی قەڵاشت، توێكڵی لێ كردەوە.

**ذَحَجَ** الأديمَ: چەرمەكەی تاشی، هەڵی گلۆفت، هەنوی.

**ذَحَجَتْ** المرأة بولیدها: ئافرەتەكە منداڵەكەی بوو فرێی دا.

**أذحجت** المرأة على ولدها: ئافرەتەكە بەبێوەژنكۆشی منداڵەكەی بەخێو كردو دوای مردنی مێردەكەی شوی نەكردەوە.

**ذَحَّ** فلاناً ذَحّاً: شەپلاغەی لەفلانكەس دا، مستەكۆڵەی پیا كێشا.

**ذَحَّ** الشَّيْءَ: شتەكەی كوتا، دوو لەتی كرد.

**ذَحْذَحَ**: هەنگاوەكانی خێراكردنو نزیكی خستنەوە.

**ذَحْذَحَ** الريحُ الترابَ: رەشەباكە گڵو خۆڵەكەی بەحەوادا برد.

**الذَّحْزاحُ**: كورتە باڵای ورگن.

**الذَّحْلُ**: رقو كینە ٥ تۆڵەستاندنەوە.

**الذِّحَلُ**: بەمانا (الذَّحْلُ) دێ ٥ (ك: أذحال).

**ذَخَرَ** الشَّيْءَ ذخراً وذ خراً: شتەكەی پەزمەندە كرد بۆ كاتی پێویست، دەگوترێ: (ذَخَرَ لنفسه حديثا حسناً) ناوو ناوبانگی باشی بۆخۆی هێشتەوە.

**إذَّخَرَ** الشَّيْءَ: بەمانا (ذَخَرَهُ) دێ٥

**الذّاخِرُ**: قەڵەو.

**الذُّخْرُ**: پەزمەندە كراو.

**الذُّخيرة**: بژێوی پەزمەندە كراو ٥ (ك: أذخار) ٥ هەروا ناوە بۆ كەرەستەی شەڕ لەڕەصاصو گوللە تۆپ.

**اَلْمَذاخِرُ**: ریخۆڵە ٥ گەدەی وڵاخو ئاژەڵ، دەگوترێ: (ملأت الدابّة مذاخِرَها).

**ذَرَأَ** شَعْرُهُ ذَرْءاً: ئەملاو ئەولای توكی سەری سپی بوو.

**ذَرَأَ** اللهُ الخلقَ: خودا مەخلووقاتی وەدی هێناوە، ئادەمیزادی دروست كردونو بەناو زەوی دا بڵاوی كردونەوە.

**ذَرَأَ** فلان الشَّيْءَ: فلانكەس شتەكەی زۆركردوە.

**ذرِئَ**: (ذَرَأَ) پیری (موی سپی) دەورەی سەری داگرتووە لاجانگی سپی بوون، دەگوترێ: (ذَرِئَ رأسه)٥ (هو أذرَا وهي ذرآءُ).

**أذرأه**: رقی هەڵساند.

**أذرأه الى كذا**: ناچاری كرد بۆ ئەو شتە.

**أذرا فلاناً بالشَّيْءِ**: فلانكەسی فێری ئەو شتەكرد، وای لەگەڵ كرد خوی بداتێو وەگری ببێ.

**الذُّرأة**: یەكەم شتێك كەنیشانەی پیرییە وەكوو موی سپی.

**الذُّرْأ**: لایەنێك، بەشێك،

سەرمداوێـك، دەگـوترێ: (بلغـني ذرءٌ من خـبر): بەشێـكی هەواڵەكەم پـێ گەیشت.

**ذرء، ذِرءَ**: وشـەیەكە ئاراسـتەی بـزن دەكرێ بۆ ئەوەی شیربدا.

**الـذّرآني**: سپی، دەگـوترێ: (ملـح ذرآني) خوێیەكی زۆر سپییە.

**الـذّرِيُ**: تـۆو كـراو، دەگـوترێ: (ذرع ذرئ).

**الذُّرِيَّةُ**: وەچەو نەوە ٥ (ك: ذرارِيّ).

**ذَرِبَ الـسیفَ ذَرِبـاً**: شمـشێرەكەی تیژ كرد.

**ذَرِبَ لِـسانُهُ**: زمـانی درێـژو جنێـو فرۆش بوو.

**ذَرِبَ فـلانٌ**: فلانكـەس زمـانی دوا لاڵی و گیری، ڕەوان بوو.

**ذَرِبَ أنْفُـهُ**: لوتی تكەی كـرد دڵۆپ دڵۆپ ئاو لەلووتی هاتە خوار.

**ذَرِبَ الجُرْحُ**: برینەكە پیس بوو پێوە چوو، كەورە بوو.

**ذَرِبَ مَعِدَتُـهُ**: گـەدەی تێـك چـوو، هەڵترشـا ٥ (هـو ذرِبٌ) ٥ (ك: ذُرُبُ) و(هي ذرِبة) (ك: ذرِبات).

**أذْرَبَ فـلان**: فلانكـەس زمـانی ڕەوان بـوو دوای ئـەوەی لـەوەپێش زمـانی دەگیرا ٥ ژیانی تاڵ و ناخۆش بوو.

**ذَرَّبَ الـسیف ونحـوه**: بـەمانا (ذرَبَـهُ) دێ ٥ لـــــەزەهری هەڵكێـــــشاو جەوهەرداری كـردو ئـەمجار مـشت و ماڵی كرد، دەگوترێ: (ذَرَّبْتُ فلانـاً): فلانكەسم تووڕەكرد، ڕقیم هەڵساند.

**ذَرّبَـت المـرأة طِفْلَهـا**: ئافرەتەكـە منداڵەكـەی ڕاداشـت بۆئـەوەی پیسایی بكا.

**الذُّراب**: ژەهر.

**الذَّرَبُ**: دەردێـكە توشی گـەدە دەبـێ خـواردن هـەزم ناكـا، خـۆراكی تێـدا دەترشێ و سودی لـێ وەرناگیرێ.

**الـذّرِبُ**: زمـان پـیس، جنێـو فـرۆش، دەمدرێژ.

**الـذّرْبُ**: زمـان پـیس، جنێـو فـرۆش، دەمدرێـــز ٥ ئاوسـاوییەكە لـــەملی ئـادەمیزاد یـان هـی ئـاژەڵ دا پەیـدا دەبێ ٥ نەخۆشییەكە توشی جـەرگ دەبێ درەنگ چاك دەبێتەوە.

**الذَرْبَـةُ**: بـەمانا (غـوددە)دێ ٥ (ك: ذِرَبٌ).

**المِذْرَبُ**: زوبان.

**ذَرَحَ الطعامَ ذرحاً**: ژنگە سورەی خستە ناو خۆراكەكەوە.

**ذَرَحَ الشّيْءَ في الريح**: شتەكەی بەربادا.

**ذَرّحَ لَبَنَهُ**: ئـاوی كـردە شـیرەكەیەوە بۆئەوەی زۆربێ.

**ذَرّحَ إداوَتَهُ**: قوڕی لەسوراحییەكەی هەڵسوو بۆئەوەی بۆنی خۆش ببێ.

**ذَرّحَ الشّيْءَ في الريح**: شتەكەی بەربادا.

**ذَرَّحَ الزعفرانَ وغيره في الماء:** شتێکی کەمی لەزەعفەران کردە ناو ئاوەکە.

**الذُّراحُ من اللبن:** ماستاو.

**الذُّراحُ:** ژەنگە سورە، حەشەرەیەکە لەمێش گەورەترە پەڵەپەڵەی رەش بەجەستەیەوەن، چەند جۆرێکی هەیە، ئەمانە دەکوژرێن و وشك دەکرێنەوەو ورد ورد دەکرێن بۆکاری پزیشکی بەکاردێن ٥ (ك: ذَراريح).

**الذَّريحةُ:** بانو، تەپۆڵکەی پان و پۆڕ.

**الذَّريحي:** شتی زۆر سور، دەگوترێ: (أحمر ذريحي): زۆر سوورە.

**ذَرَّتِ الشمسُ ذُروراً:** خۆر گزنگی دا.

**ذَرَّ النبتُ:** روەکەکە سەری دەرهێنا٥

**ذَرَّ لحمُهُ:** گۆشتەکەی لەڕ بوو، کەمی کرده

**ذَرَّ فلان ذُروراً:** فلانکەس پێشەسەری سپی بوو.

**ذَرَّ الشيءَ ذَرّاً:** شتەکەی پەرت و بڵاو کردەوە، دەگوترێ: (ذَرَّ الذَّرورَ): بەسەری پەنجەکانی خوێ یان دەرمانێکی تری بەشتەکەی تردەوە وەرد کرد (وەکو ئەوە بڵێی خوێی بەتەماتەکەوە کرد).

**ذَرَّ اللهُ عبادَه في الأرض:** خودا ئادەمیزادی بەناو زەوی دا بڵاوکردنەوە.

**ذَرَّ الحَبَّ:** دانەوێڵەکەی تۆو کرد (بەناو زەوی دا بڵاوی کردەوە).

**ذَرَّت الأرضُ النباتَ:** زەوی سەری روەکەکەی دەرخست.

**ذَرَّ عينَهُ بالذَّرور:** چاوی بەدەرمانی سپی رشتن.

**ذَرَّ الجُرْحَ:** دەرمانی سپی بەبرینەکە کرد.

**الذُّرارَةُ:** ئەو وردەو تەپ و تۆزەیە لەدەرمانی کوتراو پەیدا دەبێ.

**الذَّرُّ:** وەچەو نەوە ٥ مێروی بچوك ٥ ئەو گەردیلەو قەبارە بچوکانەی بەهۆی تیشکی خۆرەوە کەلەپەنجەرەو کون و کەلەبەرەوە دێتە ژورەوە دەردەکەون.

**الذَّرَّةُ:** بچوکترین قەبارە لەهەرشتێك بێ.

**الذَّرور:** ئەو دەرمانە سپییەی دەکرێتە چاوەوە یان بەبرین دەکرێ٥ یان ئەو خوێیەی بەخەیارو ترۆزی و شتی تردەوە دەکرێ٥ (ك: أذِرَّة).

**الذَّريرَةُ:** بەمانا (الذَّرور)دێ.

**الذُّرِيةُ:** ئەوەی ئادەمیزاد ٥ رەگەزو نەژاد ٥ ژن و منداڵی بچوك ٥ لەحەدیث دا هاتووە پێغەمبەر (د٥خ) ژنێکی کوژراوی دی فەرمووی: (ما هذه تقتل إلْحَقْ خالداً فقل له: لا تقتل ذرية ولا عسيفاً).

**المِذْرَّةُ**: ئالەتی تۆو چاندن.

**ذَرَعَ** فلان ذَرْعـاً: فلانكـەس باسكی خۆی راكێشا.

**ذَرَعَ** له عنده: تكای بۆكرد.

**ذَرَعَ** الـبعيرَ: لەقاچـی حوشـترەكەی دا ٥ دەستی حوشترەكەی داخ كرد.

**ذَرَعَ** فلانـــاً: لـــەدواوە باســـكی لـــەملی فلانكەس هالاندو خنكاندی.

**ذَرَعَ** الثَّوبَ: بە قۆڵو باسك قوماشـەكەی پێوا.

**ذَرَعَ** الطريـقَ: رێـگاكەی بـەخێرایی بـڕی، دەگـوترێ: (ذرعــت الناقــةُ الفــلاةَ): حوشـــترەكە بـــەخێرایی ســـاراكەی بڕی.

**ذَرَعَ** القَيْئُ فلاناً: رشانەوە تـەنگی بـەكابرا هەڵـــچنیو رشـــوەكە كەوتـــە نـــاو دەمیـــەوە٥ لەحـــەدیـــث دا هـــاتووە دەفـەرموێ: (مـن ذَرَعَـهُ القيـئ فـلا قضاء عليه).

**ذَرَعَـت الدّابَّـةُ الدّابَّـةَ**: وڵاخەكـە پێش وڵاخەكە كەوت.

**ذَرِعَ** ذَرَعـاً: شـەوو رۆژ رۆیـشت ٥ زمـانی شڕو درێژ بوو.

**ذَرِعَ** رِجلاه: قاچەكانی ماندوو بوون.

**ذَرِعَ** اليه: تكای لەلاكرد.

**ذَرُعَ** ذَراعةً: هەنگاوەكانی پانو پۆڕ بـون، شەقاوی گەورەی هاویشت.

**ذَرِعَ** المــوتُ: مــردن بــڵاو بــووە، پــەتاو تاعون بڵاو بۆوە.

**ذَرُعَتِ** المرأةُ: ئافرەتەكە لەكاركردن دا دەســـتی ســـوك بـــوون٥ (هـــي ذِراع وذَراع).

**أذْرَعَ**: بەباسـكو مەچـەكی شـتەكەی گرت، دەگوترێ: (أذْرَعَ الشَّيْئَ).

**أذْرَعَ** فـلان: فلانكـەس زۆری گـوتو درێژدادڕی كرد.

**أذْرَعَ** القَيْـئَ: رشـوەكەی لـەدەمی دەركرد.

**أذْرَعَ** ذِراعيه: هەردوو قۆڵی لەژێر جبەو باڵتۆكەیەوە هێنایە دەرێ.

**ذارَعـت الدّابـة وغيرُهـا الطَّريـقَ**: وڵاخەكە هەنگاوی درێـژی هاویـشتن بۆئەوەی بەزوویی رێگاكە ببڕێ.

**ذارَعَ** فلانـــاً الـــشَّيْئَ: شـــتەكەی بەفلانكەس فرۆشت بـەگوێرەی بـاڵ نەك بەهەژمارو گۆترە.

**ذَرَّعَ** المطـــرُ: بارانەكـــە بەئەنـــدازەی باڵێكی ئادەمیزاد بـەزەوی دا رۆچـو ٥ بەقـەدەر ذیراعێـــك بـــۆ قـــوڵایی زەوی چووە خوار.

**ذَرَّعَ** فلان: فلانكەس هەردوو دەسـتی بەرزكردنـەوەو قـسەی خـۆش یـان ناخۆشی بـۆ خەڵـك دەكـرد مـژدەی دەدا یان هەڕەشەی دەكرد.

**ذَرَّعَ** في مـشيه: لەرۆیـشتن دا پـەلی

راوەشـــاندن بۆئـــەوەی پاڵپـــشتی ڕۆیشتنەکەی بکەن، دەشکوترێ: (ذرّع بیدیه).

ذَرَّعَ فِي الـــسباحة: لەمەلـــەکردن دا باڵی کردنەوەو پەلی هاویشتن.

ذَرَّعَ الـــبعيرَ ولـــه: حوشـــترەکەی پێوەنـــد کـــرد بـــەمجۆرە حەبلێـــکی بـــەنێوان لوتەوانـــەو دەســـتی حوشترەکەدا قایم کـرد، یان زێدەی ڕێشمەکەی بەقاچی بەستەوە.

ذَرَّعَ فلاناً: لەدواوە قۆڵی لەملی فلان وەرهێنـــاو خنکانـــدی ◊ فلانکەســـی کوشت، دەشـکوترێ: (ذرَّع لـي شيئاً من خيره): بڕێـکی لەهەواڵی خۆی پێدام، هەروا دەگوترێ: (فـلان ذرَّعَ بيننا هذا): فلانـکەس بـوو بەهۆکاری ئەوەی نێوانمان.

إنْذَرَعَ: پێشکەوتو چووە پێش.

إنْذَرَعَ فِي السَّيْرِ: لەرۆیشتن سەرگەرم کەوتو کەوتە ڕۆیشتن.

تذارعُوا الطَّريقَ: پێشبڕکێیان کـرد لـــەبڕینی ڕێـــگاکەدا بـــەخێرایی ڕێگاکەیان بڕی.

تَذَرَّعَ البعيرُ: حوشـترەکە لەرۆیـشتن دا هـــەنگاوی پـــانی هاویـــشتن، دەگوترێ: (تَذَرَّعَ فِي السَّيْر).

تَذَرَّعَ فلان: فلانکەس زۆری چەنەداو قسەی زۆری کرد.

تَـــذَرَّعَ بِذَرِيعَـــةٍ: پـــەنای بـــردە بەربیانوهێنانەوە بۆ ئەوکارە.

اسـتَذْرَعَ بالـشَّيْءِ: شتەکەی کـردە مەتەڵو دێوجامە بۆ فلان ئیش.

الأذْرَعُ: زمـــان ڕەوانو قـــسەزان ◊ گـورجو خێـرا، دەگـوترێ: (قتلـوهم أذرع قتـل) بـەخێرایی‌و کتو پڕی کوشتیانن.

الـــذِّرَاعُ: دەســـتو باســـك چ هـــی ئادەمیزاد بێ یان هی حەیوان بێ، وەلـــێ لـەئادەمیزاددا بریتییـــە لـــە ئانیـــشکەوە تاســـەری پەنجـــەی ناوەڕاســـت، لـــە ئاژەڵـــدا بریتییـــە لەزەنـــدو سمیـــەوە بـــەرەو ژوور ◊ ئامێرێـــکە بـــۆ پێوانـــە، ئەنـــدازەی ذیراعی هاشمی سی‌و دوو پەنجەیە یـان شەسـتو چـوار سانتیمەترە ◊ هـــەروا نـــاوە بـــۆ ئەســـتێرەیەك کەلەشێوەی ذیراع دایە.

ذِراع القناة: لای پێشەوەی ڕمب.

الـذَّرْعُ: ئەنـدازە، دەگـوترێ: (ذَرْعُـهُ كذا) ئەنـدازەی ئەوەندەیە ◊ هێـزو توانـاو وزە، دەگـوترێ: (ضـاق بـه ذرعي) لەوزەم دا نـەماوە نـەمتوانی چیدی بێدەنگ بم.

الذَّرَع: کۆختە دیوجامـە ◊ ئەوشـتەی ڕاوچـــی خـــۆی لەپاشـــەوەی دا دەشارێتەوە.

**الذُّرِعَةُ:** هۆكارو سەبەبە بۆشت.

**الذُّرُوعُ:** هەرزیندەوەرێك لەسەر خۆ بڕواو هەنگاوی درێژ بهاوێ جیا حوشترێ یا ئەسپ بێ یان شتی تر.

**الذَّرِيعُ:** بەمانا (الذُّروع) دێ، دەگوترێ: (موت ذريع) مردنێكی بەربڵاوە كەس فریا مردو ناشتن ناكەوێ ٥ (أمر ذريع) كارێكی بەرفراوانو زۆرە ٥ (وأنا ذريع لـه عنده) من لای ئەو تكاكارم بۆی.

**الذَّرِيعة:** نیشانەیەكە دادەنرێ خەڵكی لەسەری فێری تفەنگچیەتی دەبن ٥ دێوجامەو كۆختەی راوچی ٥ سەبەبو هۆكاری شت.

**المِذْرَاعُ من الدابَّة:** قاچی ولاخ ٥ ئەسپی پێشبڕكێ ٥ لاپاڵی دۆڵو شیو ٥ گوندی بچوك بچوكی نزیك بەشارە (ك: مَذرِع ومَذاريع).

**المُذَرَّعُ مِن الناس:** كەسێكە دایكی عەرەب بێو باوكی نا عەرەبە یان كەسێك بنەماڵەی دایكی خانەدانتربێ لەبنەماڵەی باوكی.

**المِذْرَعُ من الدابة:** نێوانی دوو ئەژنۆیو ناوكی.

**ذَرَفَ الدَّمْعُ ذَرْفاً وذُرُوفاً وذريفاً:** فرمێسكی داباری.

**ذَرَفَت العَيْنُ:** چاوەكە فرمێسكی رژاند.

**ذَرِفَ الدَّمْعُ ذَرَفاً:** فرمێسكی بارین.

**ذَرَّفَتِ العَيْنُ دمعها تذريفاً وتذرافاً:** چاو فرمێسكی رژاندن.

**ذَرَّفَ على الخمسين من السنين:** لەپەنجا ساڵی تێپەڕاندو تەمەنی هەڵكشا.

**ذَرَّفَ فلاناً الشَّيْءَ:** فلانكەسی بەسەر شتەكەدا ئاگاداركرد.

**ذَرَّفَ الموتَ:** گەیاندییە شەرای مردنو مەرگی نیشان دا.

**تَذَارَفَ دَمْعُهُ:** فرمێسكی رەوان بوون، دەشگوترێ: (رأيت قدحاً لي يده يَتَذارَفُ) پەرداخێكم بینی بەدەستیەوە دڵۆپ دڵۆپ ئاوی لێ دەتكا.

**اسْتَذْرَفَ الضَّرْعُ:** گوانەكە وای لێ هاتبوو تەماعی دۆشینی لێ بكرێ.

**اسْتَذْرَفَ الشَّيْءَ:** شتەكەی گوشیو دایچەكاند.

**الذُّرَّافُ:** گورجو گۆڵ.

**الْمَذْرَفُ:** شوێنی فرمێسك ٥ (ك: مَذَارِف).

**ذَرَقَ الطائرُ:** باڵندەكە جیقنەی كرد، دەگوترێ: (كلام يذرق عليه) قسەی ناشیرینو پڕوپوچ.

**ذَرَقَ على الناس:** وتەی نابەجێو ناشیرینی ئاڕاستەی خەڵكەكە كرد.

**أذرق الطائرُ:** بەمانا (ذَرَق)دێ.

**أذرقــت الأرضُ**: زەوییەکــە گیــای حەنــدەقوقی لــێ ڕوا، (حەنــدەقوق گیایەکی خۆڕسکەو ساڵانە دەڕوێو دەکرێ بەئاڵف).

**ذَرَّقَ اللَّــبنَ**: ماســتەکەی تێــکەڵاوی ئاوکرد.

**الذُّرَاقُ**: جیقنەی باڵندە (پەلەوەر).

**الذُّرْقُ**: بەمانا (الذراق)دێ.

**الــذُّرَقُ**: حەنــدەقوق؛ گیایەکــە خۆڕســکەو ســاڵانەیەو دەکــرێ بەئاڵف.

**ذَرَا ذَرْواً**: بەحــەوادا فــڕی، بەحــەوادا بڵاوبۆوە.

**ذَرَا فلان**: فلان بەگورجی ڕۆیی.

**ذَرَا الشَّيْءَ**: شتەکە کەوتە خوار.

**ذَرَا فــوه**: ددانــی کــەوتن، کەڵبــەی هەڵوەرین تیژاییان نەما.

**ذَرَا حَــدُّ نابــه**: تیــژایی کەڵبــەی نــەمان، هێزی بڕینیان نەما.

**ذَرَا اليه**: بەرز بووە، چو بۆ لای.

**ذَرَت الريحُ الترابَ ذرواً وذرياً**: ڕەشــەباکە تــۆزو خۆڵەکــەی بــڵاو کــردەوە بەحەوادا.

**ذَرَا الحَــــبَّ**: دانەوێڵەکــەی بــەباکردو کاوکۆتی لێ جیاکردەوە.

**ذَرَا اللهُ الخلــقَ ذرواً**: خــودا مــەخلوقاتی دروست کردوە.

**أذْرَتِ الريحُ الترابَ**: ڕەشــەبا تــەپو تۆزەکەی بڵاو کردەوە.

**أذْرَت العــينُ دَمْعَهَــا**: چــاوەکە فرمێسکی باراند.

**أذْرا الــشَّيْءَ**: شــتەکەی هاویــشت، دەشکوترێ: (أذرت الدابَّــةُ راكِبَهــا): وڵاخەکــە ســوارەکەی لەسەرپــشتی خــۆی فــڕێ دا ، هــەروا دەگــوترێ: (أذرى رأسه بالسيف).

**ذَرَّت الـــــريحُ الـــــترابَ**: ڕەشـــــەباکەگڵوخۆڵەکەی بـــــڵاو کــــردەوە، دەگــــوترێ: (ذرى تــــرابَ المعــــدن): گڵــی کانەکــەی پــشکنی بۆدۆزینەوەی زێڕ.

**ذَرّى الحَــبَّ**: دانەوێڵەکــەی بــەرباداو شەنی کرد.

**ذَرّى فلانــاً**: پــەنای فلانکەســی داو پاراستی ، مەدحی کرد.

**تَذَرّى القطيعُ**: جەڵەبە حەیوانەکە کۆبونــەوەو هەندێــکیان خۆیــان خستە پەنا هەندێکیان، یان خۆیان لەبــەر ســەرماو ڕەشــەبا خۆیــان لەپــەنا درکــە شــاخو درەخــت دا پەناداو خۆیان شاردەوە.

**تَــذَرّى بفــلان**: خــۆی خــستە پــەنا فلانەوە بۆئەوەی داڵدەی بدا.

**الذَّرْوَةُ**: تۆپەڵاك،لای سەروی شت.

**تَــذَرّى بــني فــلان وفــيهم**: لەدیارترین پیاوی ئەو بنەماڵە ئافرەتی خواست.

استذرى: بەمانا (تَذَرّى) دێ.

الـذّرا: ئـەو شـتـەی خـۆتـی لەپـەنادا دەشـاریـیـەوە، خـۆت دەخەیـە پەنایـەوە، دەگـوترێ: (أنـا في ذرى فـلان): مـن لەسـێبەری فـلان كـەس دام ٥ فرمێسكی رژاو ٥ تەبیعـەتو سروشتی نەرمو نیان.

الذُّری: ناوە بۆ ئەو خشتو خۆڵەی با دەیبا ٥ فرمێسكی ڕژاو.

الـذُّرَارَةُ: نـاوە بـۆ ئـەو وردەو خاشاكەی لەدانەوێڵەی بەشەن كـراو دەكەوێتە خوار.

الـذَّرْوُ: بـەش‌و لایەنێـك، دەگـوترێ: (بلغني ذروٌ من القول): سەرەداوێـكی قسەكەم دەست كـەوتووە، كەمێـكی هەواڵەكـەم زانیـوە ٥ قـسەی بەتوانجو توێكلاوی.

الـذُّرَةُ: زورات،گەنمـە شـامی؛ دانەوێڵەیەكـە دەهـاڕدرێو دەكـرێ بەنان.

الـذِّرْوَةُ: تۆپـەڵاكو دونـدی شـت، دەگوترێ: (هو في ذُرْوَة النسب وعلى ذُروَة الشرف).

ذُرا الليل: ساتە سەرەتاییەكانی شەو.

المِـذْری: شـەن‌و سـێلك؛ دارێـكە سەرێـكی وەكـوو پەنجـەكانی دەست وایە كرشەی پێ ئەمدیوو ئەو دیو دەكرێ دانەوێڵەی پێ شەن دەكرێو كاوكۆتەكـەی پـێ لەدانەوێڵەكـە جیادەكرێتەوە.

المِـذْرَوان: دولایـەنی شـت ٥ ئەمبـەرو ئەوبەری شت ٥ دووشان، دەگـوترێ: (جـاء یـنفض مِذرویـه): هـات شـانی هەڵدەتەكانـدیان دەگـوترێ: (قَنَـعَ الـشیبُ مِذرَوَیْـه): پـیری لەسـەر دوولاجانگی هەڵنیشتووە.

المِذْراة: بەمانا (المِذْرى) دێ.

ذَعْذَعت الـريحُ الـشّجر: رەشـەباكە درەختەكـەی خـستە جـەو جـوڵو راوەشاندن.

ذَعْـذَع الـترابَ: گـڵو خۆڵەكـەی بەباكرد.

ذَعْـذَع فـلان المالَ: فلانكـەس ماڵو سامانەكەی پەخشانو تەخشان كرد، دەگوترێ: (ذعذعهم الدهر): رۆژگـار پەرتو بلاوی كردنەوە.

تَذَعْـذَع: داڕوخـاو هـاڕەی كـرد، دەگـوترێ: (تذعذع البنـاء والـشعر): دیوارەكە روخا، مووەكان هەڵوەرین٥

الـذّعاذِعُ: خورمـای بـلاوە بـوو، دەگـوترێ: (تفرقـوا ذَعَـاذِعَ) بـلاو بوونـەوە هەریەكـەیان كەوتـە شوێنێـك.

الذَّعْـذاعُ: نهێنـی بلاوكـەرەوە، دوزمانو فیتنە گێڕ.

ذَعَرَهُ ذَعْراً: ترساو سەرسام بوو.

أذعَرَهُ: بەمانا (ذَعِرَهُ) دێ.

تَذَعَّرَ: ترسا ە بۆ موطاوەعەی (ذَعَّرَهُ)دێ.

إنذعَرَ: ترساو راچڵەکی.

الذاعِرُ: ترساوو ترسنۆك ە لەحەدیث دا هاتووە دەفەرموێ: (لا یزال الشیطان ذاعراً من المؤمن)، دەگوترێ: (رجل ذاعِرٌ) پیاوێکی عەیبدارو نامەردە.

الذُعْرُ: ترس‌و لەرز.

الذُعَرَةُ: چۆلەکە کلك هەڵسەنگێنە، زۆر ترسنۆکە لەولاتی میصر پێی دەگوترێ (ئەبو فصادە) لەولاتی شام پێی دەڵێن: (أم سَكعكَعْ) لەعێراق پێی دەگوترێ: (زیطەو زطزاطە).

الذُعورُ: ترسنۆك‌و سوکە ئافرەتێك زۆر بترسێ لەقسەو قسەلۆك‌و قسەی ناشیرین.

ذَعَفَ ذِعفاناً: مرد لەناوچوو.

ذَعَفَ فلاناً ذَعْفاً: ژەهری کوشندەی دا بەفلان.

ذَعَفَ الطعامَ: ژەهری کردە ناو خۆراکەکەوە.

أذعَفَهُ: بەخێرایی کوشتی.

إنذعَفَ: شاگەشکە بوو دڵی بچڕا.

الذُعافُ: ژەهری کوشندەی هەلاهیل ە (موت ذعاف): مردنی خێرا، دەگوترێ: (حیّةٌ ذعف اللعاب): مارێکە ژەهرەکەی کوشندەو خێرا کوژە.

ذَعِنَ ذَعناً: ملکەچ بوو ژێربار بوو.

أذعَنَ: ملکەچ بوو راستگۆ بوو هاتە ژێربار، دەگوترێ: (أذعَنَ بالحق) دانی بە حەق دانا.

المِذْعَانُ: وشتری سەرنەرم، ئادەمیزادی گوێ بیست‌و گوێ راێر.

ذَفْذَفَ: لارو لەنجەی کرد، هەڵسوڕو داسوڕی کرد.

ذَفْذَفَ الجَريحَ وعليه: بریندارەکەی کوشت، پەلەی کرد لەگیان دەرچوونی.

ذَفِرَ النَّبتُ ذفراً: گژوگیاکە زۆر بوو.

ذَفْذَفَ الشيءُ: شتەکە بۆ نەخۆشەکەی زۆر کەسکون بوو وەکوو میسك بۆنی بلاوەی کرد، یان بۆگەنی زۆری لێ هات وەکوو بۆنی سیر بلاو بووە (هو ذَفِرٌ وهي ذَفِرَةٌ) ە (هو أذفر وهي ذفراء).

إستَذْفَرَ بالأمر: سور بوو لەسەر کارەکەو بەورە بەرزییەوە لەگژی راچوو.

الذَّفْرى من الحيوان والإنسان: ئەو ئێسقانەی پشت گوێچکەیە.

**ذَفَّ** الطائِرُ ذفّاً وذفيفاً وذفافةً: بالندەکە پەلەی کرد.

**ذَفَّ** الأمْرُ ذفيفاً: کارەکە گونجاو ئامادەبوو بەیدەست بوو.

**ذَفَّ** علـى الجـريح: پەلـەی کـرد لـەگیان دەرچـوونی بریندارەکـەو تـەواوی کرد.

**أذَفَّ** الجَريحَ: بەمانا (ذَفَّ علیه) دێ.

**ذافَّ** الجـريحَ وعليـه ولـه: بـەمانا (أذَفَّهُ)دێ.

**ذَفَّفَـتْ** بهـم الـدّوابُ: ئاژەڵـەکان (وڵاخەکان) پەلەیان کرد لەڕۆیشتن دا.

**ذَفَّـف** فـلانٌ: فلانکـەس کەرەسـەو ئـامێری کـاروان و قافڵەکـەی کـەم کردەوە وڵاخەکانی سوکبار کردن.

**ذَفَّف** فلاناً وعليه: بەمانا (أذَفَّهُ) دێ ٥ لەحـەدیثـی ئیبنـو مەسـعوددا هاتووە دەڵێ: (فَـذَفَّفْـت علـى أبـي جهـل) هـەروا دەگـوترێ: (ذَفَّفَـهُ بالسيف) بەشمـشێر خێـرا گیـانی دەرچواند.

**اسْتَذَفَّ** الأمرُ: کارەکە گونجاو رێـك کەوت.

**الذَّفافُ**: زەهری کوشندەو هەلاهیل ٥ شـتی کـەم، دەگـوترێ: (مـاءٌ ذفـاف) ئاوی کەم.

**الذُّفافُ**: زەهری کوشندە ٥ شتی کـەم ٥ خۆشڕۆو سوکەڵە ٥ (ك: ذُفُفٌ).

**الـذَّفُّ**: دەگـوترێ: (سمعـت ذَفَّ نعلـه) دەنگی تەپەی نەعلەکانیم گوێ لـێ بوو.

**الذَّفَفُ**: بەمانا (الذَّفُّ) دێ.

**الـذَّفيف**: کـەم ٥ خۆشـڕۆو سـوکەڵە، دەگـوترێ: (مـوت ذفيـف) مردنـی خێـراە (سـيف ذَفيـفٌ): شمـشێری برنـدەو تیـژ، دەگـوترێ: (صـلاة ذَفيفـةٌ) نوێـژی کـورت و سـوکەڵە، وەکـوو نوێـژی رێبـوار ٥ قالۆنـچە نێرینە.

**المُذَفَّفُ**: دەگوترێ: (سَهْمٌ مُذَفَّفٌ): تیری خێرا ڕۆو سوك.

**ذَقَنَـتِ** الدّابـة ذَقَنـاً: لغاوەکـەی شلکرد لەڕۆیشتن دا.

**ذَقَـنَ** فـلان علـى يـده أو علـى عـصاه: فلانکـەس چـەناگەی خـۆی لەسـەر دەستی دانـا یـان چـەناگەی خـستە سەر گۆچانەکەی.

**ذَقَـنَ** فلانـاً: مـستە کوڵـەی لەچـەناگەی فلانکەس دا.

**ذَقِنَ** ذقناً: چەناگەی درێژ بوو.

**ذَقِنَ** الدَّلْو: لێوی دۆڵچەکەی خوار کرد.

**ذَقَّـنَ** علـى يـده أو علـى عـصاه: بەمانا (ذَقَنَ)دێ.

**الذّاقِنَةُ**: ئەو بەرزاییەی گەردنـە کـە

دەکەوێتە نێوان چەناگەو قوڵکەی گەردن ٥ خوار ناوك ٥ پارچە دارێکە مۆسیقاژەن لەکاتی مۆسیقالێدان دا چەناگەی دەخاتە سەر ٥ (ك: ذواقن).

**الذَّقَنُ**: لای خواروی چەناگە، کۆتایی بەیەك گەیشتنی هەردوو لای ریش ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (مُثْقَلٌ استعان بذَقَنِهِ) کوڵی گرانەو بەتەمایە چەناگەی هەندێکی لەسەر سوك بکا ٥ بەکەسێك دەگوترێ: پشت بەکەسێك ببەستێ هیچی لەبارانەبێ، یان لەخۆی بێ دەسەڵات تر بێ.

**ذَكَرَ** الشَّيْءَ ذِكراً وذُكراً وذِكرى وتَذكاراً: لەبەری کرد ٥ خستیە یادەوەری خۆیەوە ٥ ئامادەی کرد ٥ بیری کەوتەوە ٥ دوای ئەوەی لەیادی چووبووەوە هاتەوە یادیو بەزوبان گوتیەوە.

**ذَكَرَ** فلانَةَ: خوازبێنی فلانە ئافرەتی کرد بۆئەوەی بیکاتە هاوسەری خۆی.

**ذَكَرَ** اللهَ: یادی خودای کردو ستایشی کرد.

**ذَكَرَ** النِّعْمَةَ: سوپاسگوزاری نیعمەتەکەی کرد.

**ذَكَرَ** النَّاسَ: پاشە ملە باسی خەڵکی کرد ٥ عەیبو لەکەکانیانی خستنەرو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿أَهَذَا الَّذِي يَذْكُرُ آلِهَتَكُمْ﴾.

**ذَكَرَ** الشَّيْءَ لَه: شتەکەی تێگەیاند، پێی گوت.

**ذَكَرَ** حَقَّهُ: مافی خۆی پاراست.

**ذَكِرَ** ذَكَراً: بیرەوەری باشەو چاکی لەبەرکرد ٥ (هو ذَكِرٌ وهي ذَكِرَةٌ).

**أَذْكَرَتِ المرأةُ وغيرها**: ئافرەتەکە کوڕی بوو (فهِيَ مُذْكِرٌ).

**أَذْكَرَت فلانة**: فلان ئافرەت لەرەوشت دا لاسایی پیاوانی کردەوە.

**أَذْكَرَ الحَقُّ عليه**: حەقو راستی باڵادەست کرد، حەقی راگەیاند.

**أَذْكَرَ فلاناً الشَّيْءَ**: وای لەفلان کرد شتەکەی بێتەوە یاد.

**ذاكَرَهُ في الأمر**: دەربارەی کارەکە وتو وێژی لەگەڵ دا کرد.

**ذَكَّرَ السيفَ والفأسَ**: پۆڵای خستە سەرنووکی شمشێرەکە یان نووکی پارچەکە٥

**ذَكَّرَ الكلمةَ**: وشەکەی بەشێوەی واگوت بۆ نێرینە بەکاربێ.

**ذَكَّرَ النَّاسَ**: ئامۆژگاریی خەڵکەکەی کرد.

**ذَكَّرَ فلاناً الشَّيْءَ وبه**: شتەکەی بیر فلانکەس هێنایەوە.

**اِذَّكَرَهُ، اذدكره، اِدَّكَرَهُ**: بەمانا (ذَكَرَهُ)دێ.

**تذاكروُا في الأمر**: دەربارەی کارەکە وتو وێژیان کردو کەوتنە قسەو دەمەدەمێ.

**تذاكروُا الشَّيْءَ**: شتەکەیان باس کرد، بیریان هاتەوە.

**تَذَكَّرَت فلانَةُ**: فلان ئافرەت لەهەڵس و کەوتا لاسایی پیاوی کردەوە.

**استذكَرَ فلاناً**: داوە دەزوویەکی لەپەنجەی فلانکەس بەست بۆ ئەوەی شتەکەی لەبیر نەچێ، کارەکەی لەیاد نەچێتەوە.

**استذكَرَ الكِتابَ**: کتێبەکەی خوێندەوە بۆئەوەی لەبەری بکا.

**الذّاكِرَةُ**: توانای نەفس لەسەر بەراورد کردنی ئەزمونی رابردوو سەرلەنوێ بەکارهێنانەوەیان.

**التَّذكِرَةُ**: هۆکاری یادخستنەوەو بیرهێنانەوەی پێویستیات پسولەیەکی تایبەتییە بۆناو شەمەندەفەرو تەیارەو سینەماو ئەوجۆرە شتانە بەکاردێ.

**الذِّكْرُ**: دەنگو صەدا ، نوێژو پاڕانەوە لەخودا، یادکردنەوەی خودا ، قورئانی پیرۆز (ذِكر الدين) چەکی قەرز.

**الذُّكْرَةُ**: پارچەیەك پۆڵا بخرێتە سەرنووکی شمشێر یان پاچ.

**الذَّكَرُ**: پێچەوانەی مێینە ، وانێکی نێرینە ، ئاسنی چاكو پتەوو وشكو رەق، دەگوترێ: (رجل ذكر) پیاوێکی ئازاو ملنەدەر ، بارانی قەترە گەورە ، قسەی رەق.

**الذّكورة**: پێچەوانەی مێینەیی.

**الذّكير**: دەگوترێ: (رجل ذكير) پیاوێکی زیرەكو وریاو بیرتیژو زاکیرە باشە ، ئاسنی پتەوو رەق.

**المِذْكارُ**: پیاوێك هەرکوڕی ببن یان ئافرەتێك هەر کوڕی ببن، دەگوترێ: (أرض مذكار) زەوییەکە هەر رووەکی نێری لێ دەروێ ، (فلاة مِذكار) سارایەکی کاکی بەکاکی ترسناکە پیاونەبێ ناوێرێ پێی دا بڕوا.

**المُذكِرُ**: دەگوترێ: (داهية مُذكِرٌ) بەڵایەکی سامناکە پیاوی بەجەرگ نەبێ خۆی بۆرناگیرێ ، (طريق مُذكِرٌ) رێگایەکی ترسناکە.

**المُذكرُ**: نێر؛ پێچەوانەی مێ، دەگوترێ: (يوم مُذكرٌ) رۆژێکی سامناكو قورسە ، (سيف مُذكَّرٌ) شمشێرێکی جەوهەردارە.

**المُذكَّرَة من النساء**: ئافرەتێك لەهەڵس و کەوتی دا لاسایی پیاو بکاتەوە.

**المُذَكِّرَةَ**: دەفتەری تێبینی،

دەفتەری یادەوەریی ٥ یادداشتو ڕونکردنەوەی هەندێ مەسەلە پێشکەش بەدادوەر دەکرێ.

اَلْمَذْكُور: دەگوترێ: (رجُلٌ مَذْكور) پیاوێکە ناوو ناوبانگی باشی هەیە٥

**ذَكَت** النارُ ذُكُواً وذكاءً: بڵێسەی ئاگرەکە پەرەی سەند.

**ذَكَت** الشَمْسُ: گەرمای خۆر بەهێز بوو تاوی ستاند.

**ذَكَت** الحَرْبُ: شەڕ هەڵگیرسا.

**ذَكَت** الريحُ: بۆنەکە بڵاو بووە کونو کەلەبەری گرتنەوە، دەگوترێ: (زکا المسكُ) بۆنی میسکەکە بڵاو بۆوە.

ذَكّى الشاةَ: مەڕەکەی سەربڕی.

**ذَكِيَ** فلان: فلانکەس زیرەك بوو ٥ (ك: أذكياء).

**ذَكُوَ** فلان: بەمانا (ذَكِيَ)دێ، دەگوترێ: (ذَكُوَ قلبه)دڵی هوشیار بۆوە.

أذْكَتِ السحابَةُ: هەورەکە جار دوا جار بارانی باراند.

أذكى النّارَ: ئاگرەکەی هەڵگیرساند، دەگوترێ: (أذكى الحربَ) شەڕی بەرپاکرد ٥ (أذكى عليهم العيون) چاوی بۆگێڕا.

ذكّى فلان: فلانکەس زیرەك بوو بەهۆی ئەزموونی زۆرو لەبۆتەدان ٥ کەوتە ساڵەوە قەڵەوبوو، جەستەی زل بوو.

ذَكّىَ الفرسُ: ئەسپەکە لەتەمەنی جوانویەتی تێپەڕی.

ذَكّىَ النارَ: بەمانا (ذكاها) دێ.

ذَكّىَ الشاةَ: مەڕەکەی سەربڕی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ﴾.

استذكت النارُ: بەمانا (ذَكَتْ)دێ.

الذّكا: بڵێسەی ئاگرە پشکۆ ئاگری گەشاوە.

الذّكِيَةُ: باوەشێن، ئامێری ئاگر گەشانەوە، یان چەرخی ئاگر کردنەوەو شقارتە.

الذّكِيَّةُ: نار ذَكِيَّةٌ: ئاگرێکە بڵێسەو گڕەکەی بەتەوژمە.

**ذَلِفَ** الأنفُ ذَلَفاً: لوتی باریكو بچوك بووە گەورەو پانو فش بوو (هو أذلف وهي ذلفاءُ) ٥ (ك: ذُلْفٌ).

**ذَلَقَ** اللسانُ ذلاقةً: زوبانی تیژ بوو، دەم قەرەبالغ بوو.

**ذَلَقَ** السكينَ ونحوه: کێردەکەی تیژ کرد.

**ذَلَقَ** الصومُ وغيرُهُ فلاناً: ڕۆژو گرتنو کەم خواردن فلانکەسی لاواز کرد.

**ذَلِقَ** السنان واللسانُ ذَلَقاً: ڕمبەکە یان زوبانی تیژو بەبڕشت بوو، (هو أذلق).

**ذَلِقَ** السراجُ: چراکە ڕوناکایی دا

دەوروبەری روناك كردەوە.

**ذَلِقَ** فلان: فلانكەس دلەڕاوكێی تووش بوو.

**ذَلِقَ** من العَطَشِ: لەتینوان خەریك بوو بخنكێ ٥ لەحەدیث دا هاتووە: (ذَلِقَ یوم أحد من العطش)، (هو ذَلِق وهي ذَلِقة).

**ذَلُقَ** اللسانُ ذلاقة: بەمانا (ذَلَقَ)دێ.

**أذلق في الرمي**: پەلەی كردلەرەمی كردن دا.

**أذلق السكين**: بەمانا (ذَلَقَهُ)دێ.

**أذلق الصومُ وغيرُهُ فلاناً**: بەمانا (ذَلَقَهُ)دێ٥ دەگوترێ: (أذلقني قولُهُ) قسەكەی ئەوەندەی ماندو كردم هەتا پێی لاواز بووم.

**أذلق السِراجَ**: چراكەی هەڵكرد روناكی كرد.

**أذلق الضُبُّ**: ئاوی كردە كونی سوسەمارەكەوە بۆئەوەی لەكونەكەی بێتە دەر.

**ذَلَّقَ السكين ونحوه**: بەمانا (ذَلَقَهُ) دێ.

**ذَلَّقَ الفَرَسَ**: ئەسپەكەی كرزو لاواز كرد.

**ذَلَّقَ اللَّبَنَ**: شیرەكەی تێكەڵ بەئاوكرد، ئاوی كردە شیرەكەوە.

**ذَلَّقَ الضُبُّ**: بەمانا (أذلقه) دێ.

**إِنْذَلَقَ**: شتەكە تیژ بوو.

**الذُّلَقُ**: تیژو بڕەر، دەگوترێ: (لسانٌ ذُلَقٌ) زوبانی تیژو رەوان ٥ هەرشتێك تیژو كاریگەر بێ.

**الذَّلَقُ**: زوبانی تیژو رەوان.

**الذَّلْقَةُ**: لەهەموو شتێك تیژاییەكەی.

**الذَّوْلَقُ**: لەهەموو شتێك دا قەراخو تیژاییەكەی.

**المِذْلاقَةُ**: حوشتری خۆشڕۆ.

**تَذَلْذَلَ**: هەڵبەزو دابەزی كردو شل بوو، شۆڕ بۆوە.

**الذُّلْذُلُ والذِّلْذِلَ**: كراسی درێژ ٥ جزداشە، (ك: ذَلاذِل)ە ٥ دەگوترێ: (شَمِّر ذلاذلك لهذا الأمر): داوێنت بۆ ئەوكارە بەلادابكە٥ (فرس خفيف الذَّلاذل): ئەسپێكی كلك بچوكە.

**ذَلَّ**: لاوازو ملكەچ بوو، سوكایەتی پێ كراو قبوڵی كرد.

**ذلت الدَّابَّةُ**: وڵاخەكە ژێربار بوو ملی دا.

**ذَلَّ له القوافي**: بەئاسانی سەرەوای بۆ دێ.

**ذَلَّلَ السحاب**: بارانێك لەسەر خۆ بباریو هەورە بروسكەی تێدا نەبێ.

**أذَلَّ فلانٌ**: فلانكەس هاوەڵەكانی زەلیلو بێ دەسەڵات بوون.

**أذَلَّ فلاناً**: فلانكەسی زەلیلو بێ

دەسەڵات کرد ، بەزەلیلو بێ دەسەڵات لەقەڵەمی دا.

ذَلَّلَهُ: گەردنکەچی کرد، ئاسانی کرد، رامی کرد، دەگوترێ: (ذُلِلَ الكرمُ): مێوەکە هێشوە ترێیەکانی بەیدەست بوون.

تَذَلَّلَ: بۆ موطاوەعەی (ذَلَّلَهُ)دێ.

اسْتَذَلَّهُ: بەمانا (أذَلَّهُ) دێ.

الذُّلّ: زەلیلیو بێ دەسەڵاتی ، سوکایەتی پێ کردن.

الذِّلُّ: بەمانا (الذُّلُّ) دێ ، رێگایەك زۆر پێخوست کرابێ.

الذَّلُولُ: رێگای ئاسانو بوار خۆش ، ولاخی ژێربارکراوو جڵەو نەرم ، حوشتری خۆش بارو سەرنەرم.

الذَّلیلُ: لاوازو بێ دەسەڵاتو ناچار، ماڵو خانووی نەوی، رێگای ئاوەدانو پێخوست کراو، درەختێك هەموو کەس دەستی بگاتێو بەئاسانی بەرەکەی لێ بکەنەوە.

ذَمَرَ الأسدُ ذمراً: شێرەکە نەڕاندی.

ذَمَرَ فلان: فلانکەس رقی هەڵساو هەڕەشەی کرد، دەگوترێ: (جاء عمرُ ذامراً): عومەر بەشێوەی هەڕەشەوە هاتو رقی هەڵسابوو چاوی لێسور ببونەوە.

ذَمَرَت النّارُ: ئاگرەکە هەڵگیرسا.

ذَمَرَ النارَ: ئاگرەکەی هەڵگیرساند.

ذَمَرَ فلاناً علی الأمر: فلانکەسی هەڵنا لەسەرکردنی کارەکە.

ذَمَّرَهُ: هەڵینا، تەشجیعی کرد ، لەحەدیثێك دا کە عەلی گێراویەتیەوە دەفەرموێ: (الأوان الشیطان قد ذَمَّرَ حزبَهُ).

ذَمَّرَ الأمر: شتەکەی مەزنەکرد.

تَذامَرُوا: خەڵکەکە هەندێکیان هەندێکیانیان هەڵنا بۆ شەڕ ، سەر زەنشتی یەکتریان کرد ، لەحەدیثی نوێژی ترس دا هاتووە دەفەرموێ: )فتذامر المشركون وقالوا: هلاّكنا حملنا عليهم وهم في الصلاة).

تَذَمَّرَ: سەرزەنشتی خۆی کرد لەسەر شتێکی لەدەستچوو ، رقی هەڵسا ، ناڕازی بوو هەڕەشەی لێ کرد.

الذِّمار: شتێك پێویست بێ پارێزگاری لێ بکرێ ، وەکوو ماڵو خێزان، دەگوترێ: (فلان حامی الذِّمَارِ).

الذَّمارةُ: ئازایەتی.

الذِّمْرُ: ئازاو مەردو نەبەرد ، ئادەمیزادی قسە خۆش ، بەلاو کارەسات ، (ك: أذمار).

الذَّمِرَةُ: دەنگو صەدا.

الذَّمِیرُ: بەمانا (الذِّمْرُ) دێ.

الْمُذَمَّرُ: شانو ملو دەوروبەریان،

دەگوترێ: (بلغ الأمرُ المُذمَّرَ): ئیشەکە قورس بوو گەیشتە بنبەست.

المُــذمِرُ: ئــەو کەســەیە تەماشــای شــەرمگای ئــاژەڵ دەکــا بــۆ ئــەوەی بزانێ ئاخۆ نێرە یان مێیە.

ذمَلَ البعيرُ ذَمولاً: حوشترەکە بەخێرایی رۆیی٥ (فهو ذامل وهي ذاملة).

ذَمَّلَهُ: وای لێ کرد خێرا بڕوا.

ذَمَّ الأنفُ: لوتەکە چڵمی لێ هاتە خوار.

ذَمَّ الوَجْهُ: ڕەشایی‌و تەڵخاییەکە دەکەوێتە سەر دەم‌و چاو بەهۆی گەرما یان خواردنی زۆر.

ذَمَّ فلانـاً ذَمّـاً ومَذَمَّـةً: ڕەخنـەی لـەفلان گرت‌و عەیبی تێدا بەدی کرد.

أذَمَّ: شتێکی کرد لۆمەی بکرێ.

أذَمَّ البِئْرُ: بیرەکە ئاوی کەم بوو.

أذَمَّت الدابَّةُ: وڵاخەکە مانـدوو بـوو نــەیتوانی بــڕوا راوەســتا یــان دواکەوت.

أذَمَّت المكـانُ: شـوێنەکە بێ خێـرو بەرەکەت بوو.

أذَمَّ بكـذا: بـەهیچ‌و پوچـی زانـی‌و گرنگی پێ نەدا.

أذَمَّ بفــلان: وازی لەفلانکـەس هێنــا بەسەر کۆنەکراوی.

أذَمَّ لفلان على فلان: وادەو پەیمانی لەفلان وەرگرت بۆ فلان.

أذَمَّ فلاناً: پەنای فلانکەسی دا.

أذَمَّ فلانـاً وغَيْـرَهُ: فـلان‌و خەڵـکی تـری بەسـەر کۆنـەکراو لەقەڵـەم دا، دەگوترێ: (بلوتُهُ فاذمَمْتُهُ).

ذَمَّمَهُ: زێدەڕەوی کردلە زەمکردنی دا.

تَذامّوا: هەریەکە لەخەڵکەکە زەمـی یەکتریان دەکرد.

تَذَمَّمَ: شەرمی کـردو خـۆی لەشتەکە بـوارد، بێـزی نــەهات خــۆی بکــا بەخاوەنی.

تَــذَمَّمَ لـصاحبه: عەهـدو پـەیمانی هاوەڵەکەی پاراست.

تَـذَمَّمَ بفـلان: هانـای بـۆ فـلان بـردو داوای لـێ کرد تکا کاری بێ.

اسـتَذَمَّ اليــه: کارێـکی کـرد هـەموو کەس لۆمەی بکا.

استَذَمَّ بفلان: بەمانا (تَذَمَّمَ)دێ.

الأذَمّ مــن الــدواب: وڵاخــی مانــدو شەکەت کە بوەستێ‌و نەتوانێ بڕوا.

الذِّمام: عەهدو پەیمان بەرپرسیاری لەحیاتی یەکێکی تر ٥ ماف‌و رێـز ٥ (ك: أذمة).

الذِّمامَة: بەمانا (الذِمام)دێ٥ شەرم‌و حەیاکردن لەسەر زەنشت‌و لۆمە٥

الذُّمامَةُ: بەمانا (الذَمّامُ)٥

الذَمُّ: دەگوترێ: (رَجُلٌ ذَمٌّ): پیاوێکی زەم کراوە.

الذَّمَّةُ: دەگوترێ: (بئر ذَمَّةٌ): بیرێکی کەمئاوە.

الذِّمَّةُ: پەیمان‌و بەڵێن‌و بەرعۆدە بوون ۞ ماف‌و ڕێز ۞ (أهل الذمة): ئەوانەی ناموسوڵمانن‌و پەیمان لەگەڵ موسوڵمانان دەبەستن‌و خۆیان دەخەنە ژێر زیممەی موسوڵمانان.

الذِّمِّيُّ: پەیمان پێدراو، ئەوەی ئەهلی کیتابەو پەیمانی دەدرێتێ‌لەلایەن موسوڵمانانەوە کەماڵ‌و ناموس‌و ئایینی پارێزراوە.

الذميم من الآبار: بیری کەم ئاو ۞ چڵم۞ پەڵەی ڕەش کەلەسەر دەم‌و چاو بەهۆی گەرما یان زۆر خورانـدن پەیدا دەبن ۞ شەونم کەشەوانە دەکەوێتە سەرگەڵای درەخت‌و تێکەڵ بەگڵ دەبێ، شەونمە کەوەکوو دڵۆپە قوری لێ دێ.

الذَّمِيمَةُ من الآبار: بەمانا (الذمة)دێ ۞ تۆپەوانەو سەرقەباخ کەناهێڵێ شت لەزەرفەکەی بێتە دەرێ.

المُذِمُّ: (رجل مُذِمٌّ)پیاوێکە جوڵە ناکا خێپ بووە، دەگوترێ: (أمر مُذِمٌّ) کارێکی عەیبدارە.

المَذَمَّةُ: ڕێزو ماف، دەگوترێ: (قضى مَذَمَّتَهُ) چاکەی لەگەڵ کرد بۆئەوەی گلەیی لێ نەکا.

المُذَمَّمُ: دەگوترێ: (مكان مُذَمَّمٌ) شوێنێکی خاوەن ڕێزو حورمەتە.

ذَمِهَ اليومُ ذَمَهاً:ڕۆژەکە گەرم بوو (ذَمِهَ الحَرُّ) گەرمییەکە زۆر بوو.

ذَمِهَ الرجلُ بالحرِّ: گەرما کاری لەدەماغی پیاوەکە کرد.

أذْمَهَتْهُ الشمسُ: خۆر ئازاری مێشکی دا.

ذَمِيَ المذبوحُ ذمياً وذماءً وذمياناً: جم‌و جوڵ لەئاژەڵەسەربڕاوەکەدا ماوە۞

ذَمِيَ المريضُ: نەخۆشەکە کەوتە گیانەڵاوەوە، گیانکێشانەکەی درێژەی کێشا.

ذَمِيَ الرجلُ وغيرُهُ: شتەکە بۆنێکی ناخۆشی لێ هاتەدەر.

ذَمِيَت الرائحة الكريهة فلاناً: بۆنی ناخۆش فلانکەسی ناڕەحەت کرد.

ذَمِيَ لفلان من كذا شيءٌ: شتێک بۆ فلانکەس لەوەپەیدا بوو.

الذماءُ: هەنگاوتی‌و کەمی جم‌و جوڵی تێداماوە.

استذمى الشيءَ: داوای شتەکەی کرد.

استذمّى ماعند فلان: شوێن ئەوشتە کەوت کەلای فلانەو گرتی.
الذّمى: بۆگەن، بۆنی ناخۆش.
الذّماءُ: باقی ماندەی دیاردەی گیان لەگیانداره سەربڕاوەکەدا ◦ هێزی دڵ.
الْمَذْماة: گیانلەبەری کراو بە نیشانە بپێکرێ‌و گیانی تێدا بمێنێ.
ذَنَبُ ذَنباً: کلکی هەنگاوت ◦ شوێنی کەوت ◦ شوێنەواری پێوە ماوە، دیاردەی ماوە، دەگوترێ: (السحاب یذنب بعضه بعضاً).
ذَنَبَ الأرضَ: لەزەوییەکە ناوەڕۆی دامەزراند.
أذْنَبَ: تاوانی ئەنجام دا ◦ گوناهی کرد.
ذَنَّبَ: کلکی درێژ کرد.
ذَنَّبَ الضَّبُّ: سوسەمارەکە لەخوار کونەکەوە کلکی دەرهێنا.
ذَنَّبَ البُسْرُ: بەرسیلە خورماکە لەلای قنچکیەوە شیرین بوو.
ذَنَّبَ الجرادُ: کوللەکە کلکی داچەقاند بۆئەوەی هێلکە بکا.
ذَنَّبَ الحارسُ الضَّبَّ: راوکەرەکە کلکی سوسەمارەکەی گرت.
ذَنَّبَ الدّابَّةَ: کلکی ولاخەکەی گرت.
ذَنَّبَ الشَّيْءَ: کلکی بۆشتەکە دروست کرد.
ذَنَّبَ عمامتَه: لفکەی مێزەرەکەی شۆڕ کردەوە.
ذَنَّبَ الكتابَ: تەواوکەری کتێبەکەی نووسیەوە.
تَذانَبَ السحابُ: هەورەکان تێك هاڵان‌و هەندێکیان دواهەندێکیان کەوتن.
تَذَنَّبَ الْمُعْتَمُّ: لفکە مێزەرەکەی شۆڕکردەوە.
ذَنَّبَ علیه: دەستدرێژی کردە سەر.
تذَنَّبَ الطریقَ ونحوَهُ: لە لاڕێوە هاتە سەر ڕێگاکە.
استذنَبَ الأمْرُ: کارەکە تەواو بوو، جێگیر بوو.
استذنَبَ الدّابَّةَ: لەکاتی ڕۆیشتنی ولاخەکە کابرا لەلای کلکیەوە دەڕۆیی.
استذنَبَ فلاناً وغیره: شوێن فلان کەوت‌و لێی دانەبڕا هەر بەدوایەوە بوو.
استذنَبَ فلاناً: فلانکەسی بەتاوانبار حیساب کرد، بەتاوانباری زانی ◦ تاوانی پاڵ دا.
الأذْنَبُ: کلك درێژ.
الذِّنّاب من كل شيْءٍ: پاشین‌و پاشەتای ◦ قولینچك‌و دواوەی

دەگوترێ: (نظر اليه بـذِناب عينـه): بـە قلينچکی چاوی سەیری کرد ٥ پەتێکە کلکی حوشتری پێ دەبەسترێ بۆئـەوەی سـواربووەکەی پـیس نـەکا ٥ ڕێـڕەوو پلوسـکی ئـاو لەبەرزاییـەوە بۆسـەر زەوی.

الـــذِّنابى: بـــەمانا (الـــذَّنب)دێ، دەگوترێ: (هم ذنابى فلان):ئەوانـە شوێنکەوتەی فلانـن، کلکەو پلکەی فلانن.

الذِّنابَةُ: شوێنکەوتوو ٥ پاشینو لای دواوەی هـەموو شتێـك ٥ لەشـیوو دۆڵ دا ئەو شوێنەی ڕێڕەوی ئاوەکە کۆتایی دێ.

الـذَّنَبُ: کلکی گیانلەبـەر ٥ پاشـەوەی هەموو شتێك، دەگوترێ: (نظر اليـه بِـــذَنَبِ عينـــه) بەقلینـچکی چـاوی سەیری کرد ٥ هەروا ناوە بۆسەری شوڕكو قامچی، دەگوترێ: (ضَـرَبَ فـلان بِذَنَبِـهِ) ٥ هـەروا دەگـوترێ: (رکـب ذَنَـبَ الـريح) پێـشکەوتو کـەس نەیگەیـشتێ ٥ (رکـب ذَنَـبَ الـبعير) بەبەشـی کـەم ڕازی بـوو ٥ (بينهما ذَنَبَ الضبّ): دوژمنایەتییان لەنێواندایـە ٥ (حديثه طويل الذّنب): قسەکەی درێژەو نابڕێتەوە ٥ (ولّتـه الخمـسون ذَنَبَهَـا): تەمـەنی لەپـەنجا تێپەڕی ٥ (هم أذناب الناس): ئەوانە خوێڕیوهەتیو مچەی خەڵکن.

ذَنَـــبُ الخيـــل: کلکـە ئەسـپ؛ جینـسی ڕوەکێـکە کە گوڵی نیـەو لەشوێنی زۆنگاودا دەڕوێ.

الـذُّنُوبُ: کلکـی چـاكو تـەواو، کلکـی درێژ، دەگوترێ: (يوم ذنـوب) ڕۆژی سـامناكو شـەڕاوییە ٥ دۆڵـچەی گەورە کەئاوی پێ هەڵدەهێنجرێ ٥ بـەشو بـارە قورئـان دەفـەرموێ: ﴿فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذَنُوبًا مِّثْلَ ذَنُـوبِ أَصْحَابِهِمْ﴾.

الذُّنَيْبـاء: گیایەکە وەکوو وێنجە وایە بۆخـۆراکی وڵاخو ئـاژەڵ بـەکاردێ، وادەبـێ لەگـەڵ مـەرەزەدا دەڕوێو بەرەکـەی لەگـەڵ چـەڵتوکەکەدا تێـکەڵ دەبێ.

الذُّنَيبِيَّــةُ: ڕەگـەزی گوڵـە لـە پێـڕی (الزنبقية).

المِـذْنَبُ: کلکی درێـژ ٥ ئـامێری شت هـەڵێنجان ٥ ڕێـڕەوی ئـاو ٥ (ك: مَذانِبُ).

المُـــذَنِّبُ: ئەسـتێرە کلـك دارەکـان، قەبارەیەك لەئاسمان کلکێکی غازیی هەیـە دەدرەوشـێتەوە، بـەدەوری خـۆردا هەڵدەسـوڕێ جـار جـار دەبینـدرێ.

**ذَنَّ** الشَّيُ ذنيناً: ليكاوى داچۆڕا، دەگوترێ: (ذنّت العين) چاو ئاوى ڕژاند، (ذنّت الأنف) لوت چڵمى لێ هاتە خوار.

**ذَنَّ** البَرَدُ: سەرماكە توند بوو.

**ذَنَّ** في مشيته: بەلاوازيى رۆيى، دەگوترێ: (مازال يَذِنُّ في حاجته): تائێستا بەدوو دڵيەوە دەست بۆكارەكەى دەبا.

**ذنَّ** ذنَناً: شلەمەنى لێچۆڕايەوە ٥ ئاوى لێ هات ٥ خوێنى لێ هات، دەگوترێ: (امرأة ذنّاء) ئافرەتێك كەخوێنى حەيزى ناوەستێتەوە ٥ (قرحة ذنّاء): برينێكە زوخاوى لێدێ‌و وشك ناكا.

**ذانَّ** فلاناً على حاجته: داواى لەفلان كرد پێداويستييەكەى بۆ جێ بەجێ بكا.

**ذَنَّ**: دۆخاوى لێ هاتەت خوار.

**الذُّنانُ**: چڵم لەلوت بێتەخوار.

**الذُّنانة**: پێداويستى٥ باقى ماندەى شت، دەگوترێ: (عليه من دينه ذُنَانَةٌ): لەقەرزەكەى كەمێكى لەسەر ماوە.

**الذَّنَنُ**: چڵك‌و پيسى.

**الذَّنينُ**: بەمانا (الذّنان)دێ.

**ذِهِ**: ئيسمى ئيشارەتە بۆتاكى مێينە.

**ذَهَبَ** ذهاباً وذهوباً: رۆيى ٥ تێپەڕى، ڕەت بوو ٥ مردو فەوتا، دەگوترێ: (ذَهَبَ الأثرُ): شوێنەوارى نەماو سڕايەوە.

**ذَهَبَ** بە: لەگەڵيا ڕۆيشت ٥ لاى برد، فەوتاندى ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿ذَهَبَ اللَّهُ بِنُورِهِمْ﴾ خودا روناكييەكەى بردن ٥ هەروا دەگوترێ: (ذهبت بە الخيلاءُ): لوتبەرزيى‌و خۆ بەزلزانى لەڕەوتى ئاسايى خۆى لايدا.

**ذَهَبَ** عنه: وازى لێ هێنا.

**ذَهَبَ** عليه كذا: لەبيرى چۆوە.

**ذَهَبَ** اليه: روى تێ كرد، پەيڕەوى كرد، دەگوترێ: (ذهب الى قول فلان): بەگوێرەى قسەى فلان هەڵس‌و كەوتى كرد.

**ذَهَبَ** في الدين مَذْهَباً: لەئايين دا راوو بۆچونێكى خۆى پەيڕەو كرد ٥ يان رايەكى نەشازو تازە قەڵاى هێنايە كايەوە.

**أَذْهَبَهُ**: لاى برد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ﴾ ٥ سوپاس بۆ خودايەكى وەها كەناڕەحەتى لەسەر لابردين ٥ بەئالتون زەركەفتى كرد.

**أَذْهِبَ** فلانٌ: فلانكەس ئارايش‌و جوان‌و جورى تەواو بوو ٥ ڕێك‌و پێك‌و روخسار شيرين هاتە بەرچاو.

ذَهَّبَهُ: بەئالتون روکەشی کرد.

الذَّهَبُ: ئالتون، عونسورێکی فیلزی رەنـگ زەردە، کێشی زەرپیەکـەی (١٩٧.٢)، ژمـارەی زەرپیەکـەی (٧٩)، ئەندازەی چڕی پەستاوتنی (١.٩٤) ٥ (ك: أذهاب وذهوب).

الذَّهَبَةُ: پارچە زێڕێك.

الذَّهَبِيَّة: کەشتییەکە مێکوتەکانی دادەکـوترێن‌و دەبەسـترێتەوە بۆئەوەی ماوەیەك تێیدا نیشتەجێ ببن.

الذَّهيب: هەرشتێك زەرکەفت کرابێ.

المَذْهَبُ: ڕێگەو ڕێبازی ئایینی یان رامیاریی یان فەلسەفی٥ کۆمەڵێك بیرو بۆچـونی زانـستیانەو فەلـسەفییانەن کـە پەیوەنـدی‌و پێکەوە گرێدانیان هەیەو وادێنە پێش چاو کەیەکەیەکی تۆکمەو داڕێژراون ٥ (ك: مذاهب).

المُذْهَب: بـەمانا (الـذَّهيبُ) دێ، دەگوترێ: (فرس مُذْهَبٌ): ئەسپێکە سـوراییی زیـاترە لـەزەرداییی ٥ (ك: مَذاهِب).

ذَهَلَـهُ وعنـه: لـێی بـێ ئاگـا بـوو، لەبیری چووەوە.

ذَهِلَ ذهولاً: عەقڵ‌و هۆشی لەدەست دا.

ذَهِلَـهُ الـشَّيْءَ وعنـه: بـەمانا (ذَهَلَهُ)دێ.

أذْهَلَهُ: وای لێ کرد لێی بێ ئاگابێ.

الذُّهْلُ من الليل: بەشێك لەشەو.

المَـذْهَلُ: ئـامێری خافلانـدن٥ هەرشتێك ببێتە هۆی بێ ئاگایی‌و هەڵـەو گێربـوون ٥ (ك: مَـذاهِلَ)، دەگوترێ: (لي مَشاغِلٍ ومَذاهِلٌ).

ذَهِنَ فِرْنَهُ ذَهْناً: لەزیرەکی‌و زیهن بـازی دا بەسەر هاوشانەکەی دا سەرکەوت.

ذَهِنَ ذَهَناً: تێگەیی، هەستی کرد.

ذَهِنَ الشَّيْءَ: لەشتەکە حـاڵی بوو، چووە عەقڵییـەوە تەصـەوری کـرد ٥ (هـو ذَهِنٌ وهي ذَهِنَةٌ).

ذُهِنَ فلانٌ: فلانکەس زیهنی ڕۆییندراوەو هەست بـەهیچ ناکـا، لـەهیچ حـاڵی نابێ.

ذَهُـنَ ذَهانـةً: ذیهنـی هەسـتی پـێ کـردو بۆشتەکە چوو، بیری کەوتەوە.

ذاهَنَهُ: پێشبڕکێی ذیهن بازییان کرد، ویستیان بزانن کامەیان ذیهنـی تیژ ترە.

استذهَنَهُ حب الدنيا: خۆشەویـستی دونیا ذیهن‌و هۆشی لـێ ستاندوە.

الذِّهْنُ: تێگەیشتن‌و عـەقڵ‌و ئـاوەز ٥ (ك: أذهـان) بـۆ ئاوەڵنـاویش بـەکار دەهێنـدرێ، دەگوترێ: (فلان ذِهْنٌ): فلانکـەس زیـرەك‌و وریایـە ٥ هێـزو

توانا، دەگوترێ: (ما برجلي ذِهنٌ): قاچم هێزی تێدا نەماوە ناتوانم بڕۆم، لەزاراوەی زانستی دا ذیهن بریتییە لەو هێزە مەعنەوییەی بەهۆیەوە هەست دەکرێ بەدیاردە نەفسییە جۆراو جۆرەکان ، هەروا بەکاردەهێندرێ بۆ بیرکردنەوەو پاساکانی، یان تەنها خۆ ئامادەکردن بۆ هەست کردن.

**ذو**: بەمانا هاوەڵو خاوەنە ، بۆ لەقەبو نازناوی پاشاکانی یەمەنیش بەکارهاتووە کە گوتراوە: (ذو یزن، ذو الكلاع).

**ذابَ** الشحمُ والثلجُ ذوباً وذَوَباناً: پیوەکە یان بەفرەکە توایەوە، ڕەقی نەماو ڕەوان بوو.

**ذابَ** الجسمُ: جەستە کزو لاواز بوو.

**ذابَ** فلانٌ: فلانکەس گێلو نەحمەق بوو دوای ئەوەی لەوەپێش عاقڵ بوو.

ذابَت الشمسُ: خۆر گەرمییەکەی زیادی کرد.

**ذابَ** لي عليه حق: مافی منی لەسەر چەسپاو چووە ئەستۆی.

أذابَ عليهمُ العَدُوُّ: دوژمن هێرشی کردنە سەر.

أذابَ المالَ: ماڵەکەی تاڵان کرد.

أذابَ الشَّيْءَ: وای لەشتەکە کرد بتوێتەوە، دەگوترێ: (أذابَهُ الهَمُّ والغَمُّ): غەمو ناڕەحەتی تواندییەوە.

أذابَ حاجَتَهُ: ئیشەکەی تەواو کرد، پێویستیاتی بەجی هێنا.

أذابَ أمْرَهُ: فەرمانەکەی ئەنجام دا ، لەپەندی پێشینان دا هاتووە (فلان ما يدري أيخثر أم يُذيب): فلان نازانێ شتەکە ڕەق دەکا یان دەیتوێنێتەوە؛ ئەمە بەکەسێك دەگوترێ کەلەبەرامبەر کارەسات و بەڵای گەورە دا نەزانێ چی بکا.

ذَوَّبَهُ: وای لێ کرد بتوێتەوە.

إسْتذابَ الشَّيْءَ: داوای توانەوەی ئەوشتەی کرد ، پاڵفتەی کرد ، هێشتییەوە.

ذَوَّبَ حاجَتَهُ: کارەکەی تەواو کرد.

الإذْوابُ: ڕۆنەکەرە کە بتوێندرێتەوە بۆئەوەی چێشتی پێ لێ بندرێ، ئەو دەمە پێی دەوترێت (سَمْن).

الإذْوَابَةُ: بەمانا (الإذوابُ) دێ.

الذّائِبُ: نەفس قورس ، ڕەزا گران.

الذَّوْبُ: تواوەی شت.

الذَّوْبَةُ: یەکجار توانەوە ، پاڵفتەی ماڵ کەخاوەنەکەی پوختەی دەکاو هەڵی دەگرێو پەزمەندەی دەکا.

المِذْوَبُ: تاوە، ئەوشتەی شتی تێدا دەتوێندرێتەوە.

**المِذْوَبَةُ**: بەمانا (المِذْوَبُ) دێ ٥ ئەسکوێو ئامێری شت هەڵێنجان ٥ (ك: مَذاوِبَ).

**ذاحَ** ذوحاً: بەخێرایی ڕۆیی.

**ذاحَ** الإبلَ: بەتوندی حوشترەکەی لێ خوڕی.

**ذاحَ** الشَّيءَ: شتەکەی پەرتو بڵاو کرد.

ذَوَّحَ الشَّيْءَ: بەمانا (ذاحَهُ)دێ.

المِذْوَاحُ: گوشەر، ئامێری گوشین.

ذادَهُ ذوداً وذِياداً: پاڵی پێوەناو وەدەری نا، دەگوترێ: (ذاد عن عرضه ووطنه وذاد عنه الهمَ)، هەروا دەگوترێ: (ذاد الدّوابَّ عن الموارد): وڵاخەکەی گێڕایەوەو نەیهێشت بچێتە سەر ئاوەکە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ امْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ﴾.

**ذادَ** الدّابّة: وڵاخەکەی لێ خوڕی.

أذادَهُ: یارمەتی دا لەسەر بەرگری کردن.

ذَوَّدَ الدّابَّةَ: زێدەڕۆیی کرد لەبەرگریکردنو نەهێشتنی وڵاخەکە دا.

الـذَّوْدُ: جەڵەبە حەیوان، مێگەلە حوشتر لە سێ سەرەوە بۆ دە سەر.

المَذادُ: شوێن لەوەڕو پاوان.

المِذْوَدُ: ئامێری بەرگریکردن٥ زوبان ٥ شاخی کەڵەگا، دەگوترێ: (رجل مِذْوَدُ): پیاوێکە بەرگری لەوڵاتو ناموس دەکا ٥ ئاخوڕی وڵاخ ٥ (ك: مذاود ومذاويد).

**ذاقَ** الطعامَ ذوقاً وذوقاناً: خواردنەکەی چەشت، لێی تام کرد، تامەکەی بەتاقی کردەوە، دەشگوترێ: (ما ذقت نوماً): چەشی خەوم نەکردووە، خەو نەچۆتە چاوم.

**ذاقَ** الشَّيءَ: شتەکەی بەتاقی کردەوە ٥ (هەر ذاق وذوّاق): هەستی کرد، دەگوترێ: (ذاقته يدي): بەدەست هەستم پێ کرد ٥ قورئانیش دەفەرموێ: ﴿فَذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ﴾.

أذاقَ فلاناً: فلانکەسی والێکرد چەشی خواردنەکە بکا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ﴾.

تذاوق الشَّيْءَ: بەمانا (ذاقَهُ) دێ.

تَـذَوَّقَ الطعامَ: جار دواجار تامی خواردنەکەی کرد.

إسْتَذاقَ له الأمر: کارەکەی بۆگونجا، ئیشەکەی بۆ مەیسەر بوو، دەگوترێ: (لا يستذيقُ لِي الشعرُ إلا فِي فلان): شیعرم بۆ نایە مەگەر لەفلان کات دا نەبێ.

الذّوّاقُ: تامکردنی شت.

**الذَّوْقُ**: هەستێکە تایبەتمەندی تامی خواردنەکانی پێ دەکرێ، بەهۆی هەستی تامکردن کە لەدەم دا هەیەو سەنتەرەکەی زوبانە ٥ لەزاراوەی ئەدەبو فەن دا بریتییە لە هەستێکی مەعنەوی بەهۆیەوە نەفسی دەکرێتەوە یان تەنگ دەبێ لەکاتی تێروانین بۆ دیاردەیەك لەدیاردەکانی سۆزو فیکر، دەگوترێ: (هو حَسَنُ الذوق للشعر): هەستی شیعری باشی هەیەو رەخنەگرێکی باشە.

**الْمَذَاقُ**: تامی شت، دەگوترێ: (طيب المذاق): تام خۆش.

**ذَوَلَ** ذالاً: پیتی ذالی نووسی.

**الذّال**: نۆیەم پیتی هیجایە ٥ پۆپنەی کەڵەشێر ٥ (ك: أذوال).

**الذّولَقُ**: بڕوانە (ذَلَق).

**ذوى** العودُ وغيره ذياً وذُوياً: چڵەدارەکە چرچ بوو، وشك بوو، دەگوترێ: (ذوي عود فلان): فلانکەس پیر بوو ٥ (هو ذاو، وهي ذاوية).

**أذْوَاهُ**: وای لێ کرد بتوێتەوە، چرچ ببێ، وشك بێ.

**الذّواةُ**: توێکڵی کاڵەکە مارانە، توێکڵی خەیارو کاڵەكو ئەو شتانە.

**ذَيَّأه**: پارچە پارچەی کرد ٥ (ذَيّا اللّحْمَ): گۆشتەکەی کوڵاند تا بەتەواوی پێگەیی‌و جیری نەما.

**تَذَيَّأ الجُرْحُ**: برینەکە قەڵشت قەڵشت بوو، داوەشا، دەگوترێ: (تَذَيّأتِ القِرْبَةُ): کوندەکە قەڵشت قەڵشت بوو.

**تَذَيّأ اللحمُ**: گۆشتەکە کوڵاو لێك هەڵوەشاو لەنێسقانەکە بووەوە یان بەهۆی رزینەوە وای لێ هات.

**تَذَيّأ وَجْهَهُ**: دەمو چاوی هاوسان.

**أذاخ بالمكان**: بەدەوری شوێنەکەدا سوڕایەوە.

**ذَيَّختِ النخلةُ**: درەختە خورماکە قبوڵی تۆو لێ وەشاندنەکەی نەکردو خورمای هەڵنەپێچا، بێ بەربوو.

**الذّيخُ**: نێرە کەمتیاری توکن ٥ (ك: أذياخ وذيوخ) ٥ گورگی ئازا ٥ ئەسپی سواریی ٥ لقی دارخورما ٥ لوتبەرزی‌و خۆ بەزلزانی.

**الْمَذْيَخَةُ**: جەڵەبە گورگ ٥ رەوە گورگ.

**ذاط** في مشيه ذيطاناً: لەرۆیشتن دا شانی هەڵتەکاندو گۆشتنیش بوو.

**ذاعَ** الخبرُ ذيعاً وَذُيُوعاً وذيعاناً: هەواڵەکە بڵاو بووەوە، دەشگوترێ: (ذاع في جلده الجرب): گرۆیی بەناو پێستی دا بڵاو بووەوە.

**أذاعَهُ** وبه: بڵاوی کردەوە، ڕایگەیاند

٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِ﴾ ٥ هەروا بەمانا (بردی‌و براندییەوە)ش دێ.

الإذاعَــة: گواستنەوەی قسە یان مۆسیقا بەهۆی ئامێری لاسلکییەوە.

المِـذْياعُ: قسە گێڕەوە، ئەوکەسەی قسەی تێ ناوەستن یان ناتوانێ نهێنی بپارێزێ ٥ ئامێری قسەو مۆسیقا بلاوکردنەوە ٥ (ك: مذاييع).

الْمُذيعُ: ئەوکەسەی لەسەر ڕادیۆ یان تەلەفزیۆن هەواڵ بلاو دەکاتەوە.

**ذال** ذيلاً: کلکی بۆ پەیدا بووە کلکی درێژ بوو ٥ کلکی ناوگەڵی نا.

**ذال** فلان: فلانکەس خۆی باداو لارو لەنجەی کرد، کلکی شۆڕ کردەوە.

**ذال** بِذَنَبِه: کلکی ڤیت کرد.

**ذال** بِثَوبِه: پۆشاکەکەی درێژ بوو لەزەوی خشاند.

**ذال** الی فلان: بۆ فلانکەس کڕایەوە پێی گەشایەوە.

**ذال** الشَّيءُ: شتەکە زۆرو بێ نرخ بوو، دەگوترێ: (ذالت الفرس وذالت المرأةُ): ئەسپەکە یان ئافرەتەکە کزو کۆلەوار بوو.

**ذال** حالُـهُ: باری ژیانی دابەزی‌و بەکولەمەرگی ژیا.

أذالَهُ: کلکی بۆ دروست کرد ٥ کلکی درێژ کرد، دەگوترێ: (أذالت المرأةُ قناعها): ئافرەتەکە بەچەکەی درێژکرد، دایدایەوە٥ شتەکەی بەبێ نرخ سەیر کردو گرنگی پێ نەدا٥ لەحەدیث دا هاتووە: (نهى النبي — ص- عن إزالة الخيل)، هەروا دەگوترێ: (أذالَ مالَـهُ): ماڵ‌و سامانەکەی تەخشان‌و پەخشان کردو پارێزگاری نەکرد.

ذيَّلَـهُ: کلکی بۆکرد، لکی بۆدانا ٥ پەراوێزی بۆ نووسی ٥ کلکی درێژکرد، دەگوترێ: (ذيَّلَ كتابَهُ او كلامَه): پەراوێزی بۆ کتێبەکە نووسی، کەم‌و کوڕییەکانی پڕکردەوە.

ذيَّلَ في كلامه: کرایەوەو قسەی گاڵتەو گەپی کردن ٥ قسەی بێشەرمانەی کردن.

تذايلت حالُهُ: باری ژیانی دابەزی‌و هەژار کەوت.

تذيَّلَتِ الدابَّةُ: وڵاخەکە کلکی ڕاوەشاند.

تذيَّلَ فلان: فلانکەس کلکی بادا، واتە: خۆی هەڵکێشاو فیزو نازی کرد.

تبذَّلَ الى فلان: بەفلانکەس شادمان بوو قسەی خۆشی بۆکردن.

التذييلُ: پاشكۆی كتێب ٥ لەزارەوەی عیلمی مەعان دا هێنانی ڕستەیەكە بەشوێن ڕستەیەكی تردا هەمان مانای پێشوو جەخت دەكاتەوە.

الـذَّيْلُ: كۆتـایی هـەموو شتێـك ٥ داوێنی كراسو دشداشە ٥ خێشكەو شیوو دۆڵێ كە ڕەشەبا لە لمبەلان دروستی دەكا ٥ بەكینایە دەگوترێ: (فـلان طویـل الـذیل): فلانكـەس دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتووە.

الـذَّيَالُ: كلك درێژ ٥ لارو لەنجەكەر لەرۆیشتن دا، دەگوترێ: (هـو ذَیَالُ بثوبـه): بـۆ فیـز داوێنـی لەعـەرز دەخشێنێ.

ذامَـهُ ذیماً وذامـاً: ڕەخنـەی لـێ گرتو بەخراپە باسی كرد.

الـذّامُ: عـەیبو ڕەخنـەو لەپەنـدی پێشینان داهاتووە (لاتَعْدَمُ الحسناءُ ذاماً).

الذَّيْمُ: بەمانا (الذّامُ)دێ.



ڕێ پیتی دەیەمی هیجایە، دەنگێکی گەورەی گڕ پەیدا دەکات.

**الراتین**: جۆرە سمغێکە پیشەوەرەکان بۆ پێکەوە نوساندن بەکاری دێنن.

**راتینَج**: جۆرە جەوی‌و سمغێکە زۆر درەخت دەری دەدا لەکاتی بڕینەوەو بریندار کردنی دا ٥ بەزۆری سمغ‌و زەیت تێکەڵاو بەیەك دەبن.

**رَاوَنْدُ**: هەموو جۆرە ڕوەکێکی تەمەن درێژە لەپێری (بەمطباطیە)، ڕوەکێکە سکی پێ دەچێ، هەرکەسێ بیخوا گەدەی پێ ڕەوان دەبێ.

**رَأَبَت الأرضُ رأباً**: دوای درونەوەی گیاوگژەکە هەڵیدایەوەو سەرلەنوێ ڕوایەوە.

**رَأَبَ الإِناءَ**: قاپ‌و قاپاخەکەی چاك کردەوە، پینەی کرد.

**رَأَبَ الصَّدْعَ**: دڕدۆمی نێوانیانی لابرد، دژایەتیەکەی چارەسەرکرد، دەگوترێ: (رَأَبَ بین القوم) کێشەی نێوان قەومەکەی حەل کردو ناخۆشی لەنێواندا نەهێشتن ٥

**الرِّئابَةُ**: پیشەی پینە دۆزی‌و مزگەری قاپ‌و قاپاخ.

**الرُّؤبَةُ**: پارچە دەخرێتە ناو قاپ‌و قاپاخەوە بۆنەوەی بکرێ بە پینەو کون‌و کەلەبەری پێ دەگیرێن ٥ (ك: رِئابُ).

**رَأْبَلَ**: لەسەر لا بەپارێز ڕۆیی وەکوو ئەوە پارێز بەرێتە شتێك.

**تَرَأْبَلَ**: دزەی کرد.

**تَرَأْبَلَ القَوْمُ**: خەڵکەکە بەبێ ئەمیرو سەرکردە بەپیادەیی شەڕیان کرد.

**الرِّئْبَالُ**: شێر ٥ گورگە چەقەڵ ٥ گورگی پیس ٥ دەگوترێ: (لِصٌّ رِئْبالٌ): دزی ئازاو لەسەر پێ بۆ هەڵمەت ٥ تاقانەی دایك ٥ ڕوەکی تێك هالاوی درێژ وەکو لاولاو ٥ (ك: رآبیل).

**رَأَدَ الضحی**: کێشتەنگاو دەرەنگ بوو، بەتەواوی خۆر سەرکەوت‌و بەرەو ناوەڕاستی ئاسمان کشا.

**رَؤُدَ الغُصنُ**: شوڵەدارەکە زۆر نەرم‌و شلك بوو ٥ لقە درەختەکە بەملاو بەولادا جم‌و جوڵی کرد.

**ارتادت الفتاة**: کچە گەنجەکە لەڕۆیشتن دا لارو لەنجەی کردو خۆی بادا.

**ترأد الضحی**: بەمانا (رَأَدَ) دێ.

**تَرَأَّدَ الشَّيئُ**: شتەکە لەرمو جوڵەی کرد بەراست‌و چەپ دا هاتوو چوو، دەگوترێ: (تَرَأَّدَ الغُصنُ).

**تَـرَأدَت الحَيَّـةُ**: مارەكـە لەڕۆيـشتن دا ماڕودو ڕۆيی.
**تَـرَأدَتِ الـريحُ**: بايەكـە گێژەڵوكـە ئاسا بـوو، لەچـەند لايەكيـەوە تێـك گێران.
**تَرَأدَ الرجلُ في قيامه**: پياوەكـە لـەكاتی هەڵـسان دا لـەرزينی تـوش هـات بەتەكان پشتی ڕاست كردەوە.
**الـرَّأدُ**: دەگـوترێ: (فتـاة رأدٌ): كـچۆڵەيەكی جـوانو خێـرا پێگەيشتوو زوو بوو بە گەورە كچ.
**رَأدُ** اللِّحَى: لاجانگ، سەرەتای ڕيش.
**الـرؤودُ**: دەگـوترێ: (غُـصْنٌ رُؤودٌ) لقـە درەختێكە زۆر نەرمو نيانو شلكە ◦ (فتـاة رُؤود): كـچۆڵەيەكی جوانخـاصو روخـسار شـيرينە ◦ ئەمـسەرەو سـەری لقـە درەخـت ◦ هەروا بەمانا لاشەويلە دێ.
**الرِّئـدُ**: هاوتەمـەن ◦ (ك: أرآد) ◦ نەمامـە درەخـت ◦ لقـەداری نـەرمو نيان.
**الرَّأدَةُ**: كچۆڵەی ناسكو جوان.
**الرُّؤدَةُ**: بەمانا (الرَّأدَةُ) دێ.
**رَأرَأ**: چـاوی هەڵـگێڕو داگێـڕ كـردنو بەوردی تێ ڕوانی.
**رَأرَأت المـرأةُ**: ئافرەتەكـە سـەيری ئاوێنەی كرد بۆئەوەی خۆی ببينێ.
**رَأرَأت بعينيهـا**: چاوی خـۆی بريقـەدار كردن، بە كلە سوبحانی ڕشتی.
**رَأرَأ الـسحابُ والـسرابُ**: هـەور يـان تراويلكە بريسكەی دا.
**رَأرَأ بالغَنَمِ**: بەگوتنی (ئەڕ ئەڕ) بـانگی مەڕەكانی كرد.
**رَأرَأ الحيـوانُ بِذَنَبِـه**: ئاژەڵەكـە لەقـە لەقی بەكلكی كرد ◦ كلكی ڕاوەشاند.
**رَأسَ** فلانٌ رآسـةً ورياسـةً ورئاسـةً: ڕيـزی پەيداكرد، ڕێزدار بوو.
**رَأسَ** القومَ: بوو بە سەرۆكی گەلەكەی.
**رَأسَ** فلاناً: سەری فلانكەسی هەنگاوت.
**رُئِسَ** رأساً: سەری ئازاری لـێ پەيـدا بـوو، سەری هێشا.
**رَئِسَ** رأساً: سەری زل بـوو (هو أرْأسُ وهي رأساءُ).
**راءَسَ**: لەشەڕ دواكەوت.
**رأسَّـهُ علـيهم**: كرديـيە سـەرۆكی فـلان خێل.
**إرْتَأس عليهم**: بوو بە سەرۆكيان.
**تَرَأسَ عليهم**: بوو بەسەرۆكيان.
**الـرَّائِسُ**: سەرانـسەری دۆڵو دۆپ ◦ هەربەرزاييـەك بڕوانێتـە نزمـايی ◦ فەرمانڕەواو كاربەدەست.
**الرِّئـاسُ**: (رئـاس الـسيف): دەسـكی شمشێر ◦ (رئـاس الأمـر): سـەرەتای ئيش.
**الرَّآسُ**: سەروپێ فرۆش، پاچە فرۆش.
**الـرَّأسُ**: لای سـەروی هەرشتێـك ◦ سـەرەك خـێڵ ◦ سـەری مـانگ ◦ سـەری سـاڵ ◦ يەكـەم ڕۆژی سـاڵ،

دەگوترێ: (عنده رأس من الغنم): یەك سەر حەیوانی هەیە یان (عنده خمسة أرؤس ورؤوس) پێنج سەری حەیوان هەیە.

**رأس المـال**: دەسمایەی بازرگانی ٥ ئەو پارەو پولەی دەخرێتە ناو پرۆژەیەکەوە.

**الرأسمالیـة**: یاسای ئابوری کەلەسەر بنەمای مڵکیەتی تایبەتیو تاك دادەمەزرێت.

**الرُؤاس**: سەر زل.

**الرُؤاسي**: بەمانا (الرُؤاسُ)دێ.

**الـرئیسُ**: سەرۆکی نەتەوە ٥ (ك: رُؤَسَاء) ٥ ئەندامی سەرەکی لەجەستەی ئادەمیزاددا کە بەنەمانی یەکێکیان ناتوانێ بژیا.

**المِرآسُ**: ئەو ئەسپەی لەپێشبڕکێ دا گاز لەسەری ئەسپ دەگرێ ٥ پێشەنگی قافڵەو ڕەوە.

**رَأَفَ** بە رأفةً: زۆری بەزەیی پێداهاتو سۆزی بۆ جولا.

**رَئِفَ** به رأفاً: بەمانا (رَأَفَ)دێ.

**رَؤُفَ** به رَأْفةً ورآفةً: بەمانا (رَأَفَ)دێ.

**تراءفـوا**: خەڵکەکە لەناو خۆیان دا بەزەییان بەیەکتردا دێتەوە.

**تـرأف بـە**: بەهێدیو هێمنی هەڵسو کەوتی لەگەڵ دا کرد.

**استرأفَهُ**: داوای سۆزو بەزەیی لێ کردو ویستی ڕەحمی پێ بکا.

**أرألَـت النعامَـةُ**: نوعامە (شوتورمورغە)کە بوو بەخاوەن بێچو.

**رَاءلَ**: پەلەی کرد.

**استرألَ الرَّألُ**: بێچوە شوتورمورغەکە گەورە بوو.

**استرألَ النباتُ**: ڕوەکەکە درێژ بوو.

**الـرّألُ**: بێچوی شوتورمورغ ٥ ئەو بێچوە نوعامەی ساڵێکی بەسەردا تێپەربووبێ ٥ (ك: أرؤل ورئال).

**الـرَّاءول**: زێدەی ددانی وڵاخ ٥ لیکی وڵاخ.

**الرُؤالُ**: لیکی وڵاخ.

**رَأمَ** الإنـاءَ رأمـاً: قاپەکەی چاكو ڕێك کردەوە.

**رَأمَ** الحَبْلَ: حەبلەکەی توند بادا.

**رَئِـمَ** الجُـرْحُ رَأمـاً ورئمانـاً: دایکەکە منداڵەکەی خۆش ویست سۆزو چاودێری بۆ بەچکەکەی زۆر بوو.

**رَئِـمَ** الـشَّئَ: شتەکەی خۆش ویستو وەگری بوو.

**ارْأَمَهَـا**: بەسەری دا چۆمایەوە، خۆی کوشمەڵە کرد.

**ارْأمَ الجُـرْحَ**: چارەسەری برینەکەی کردو دەرمانی کرد تا وێك هاتەوەو چاك بۆوە.

**أرْأمَ الحَبْلَ**: بەمانا (رَأَمَ)دێ.

**أرْأمَ فلاناً على الأمر**: فلانکەسی ناچار کرد بۆ کردنی ئەوکارە.

**رَاءَمَ الإناءَ مراءمةً**: بەمانا (رَأْمَهُ) دێ.

**تَرَأَمَتِ النَّاقَةُ**: حوشترەکە کورکاندی‌و سۆزی خۆی پیشان دا.

**تَـرَأَمَ فلانـاً**: بـەزەیی بەفلانکـەس دا هاتەوە.

**الرَّأْمُ**: منداڵێك کە کەسانی دی جگە لەدایکی خۆشیان بوێ.

**الرِّئْمُ**: ئاسکی سپی کە هیچ ڕەنگێـکی تـری پێـوە نـەبێ ٥ بێـچوە ئاسـك ٥ (ك: أرْآم، آرَام).

**الرُّؤْمَةَ**: غەرەو سیکۆتین کە بۆپێـکەوە نووسان بەکاردێ.

**رَآهُ يَرَاهُ رَأياً ورؤيةً**: بەچاوی سەر بینی ٥ بـڕوای وابـوو ٥ وای بـۆ چـوو ٥ تەگبیری کردو نەخشەی بۆکێشا.

**رَآى** فلانـاً: لەفلانکەسـی داو سـییەکانی هەنگاوتن.

**رَآى** الرَّايَةَ: ئاڵاکەی چەقاند.

**رَآى** لِي منامه رؤياً: خەونی بینی.

**رَآى** فلاناً عالماً: فلانکەسی بەزانا لەقەڵەم دا، فێری زانیاری کرد ٥ گومانی لێ کرد.

**رُئِـيَ** رَأيـاً: سـی توشـی نەخۆشـی بـوو، سییەکانی زامدار بوون.

**أرأى**: بـوو بـەخاوەن عـەقڵ‌و فـام ٥ سی‌و جگەری ئازاریان بوو ٥ سەیری ئاوێنـەی کـرد ٥ جنـدۆکـە هـەواڵی نهێنـی فێردەکـەن ٥ ئیـشەکەی بـۆ ڕوپامـایی‌و خـۆ هەڵکێـشان کـرد ٥ بیرو بۆچونی بۆ داهاتوو زۆر بـوو ٥ لـەکاتی سـەیرکردن دا چـاوی زۆر پرتە پرتی کرد.

**أرى الله بفـلان**: خـودا وایکـرد کـابرا بەدوژمنەکـــەی خـــۆش بـــێ دوژمنەکەی بەشکستی ببینێ.

**أرى فلاناً المـرآة**: ئاوێنـەی دایـە فلان سەیری خۆی بکا.

**أرى فلاناً الشَّيْئَ**: شتەکەی دایە فلان.

**أرى وجـه الـصواب**: وای کـرد ڕێـگای ڕاست بدۆزێتەوە.

**راءاه مُراءاةً ورءاءً ورياءً**: بۆی دەرکەوت کابرا ڕەوشتی بەرزو جوانی تێدان‌و بەپێچەوانەی زانینی ئەو بوو.

**راءَى فلانٌ فلاناً**: فلانکـەس بـەرەو ڕوی فلانکەس بووەوەو بینی.

**رآه**: بینی کە خاوەنی ڕەوشتی جوان‌و بـەرزە پێـچەوانەی ئـەوە ٥ ئاوێنـەی دایە سەیری خۆی بکا.

**إرتَأى الشَّيْئَ**: شتەکەی وامەزەندەکردو وای بینی، وای بۆ چوو.

**تـراءى فـلان**: فلانکـەس لەئاوێنـەدا سەیری خۆی کرد.

**تراءى القومُ**: خەڵکەکە هەندێکیان هەندێکیانی بینی.

**تراءى له**: روبەروی بووە تا چاوی پێ بکەوێ.

**تراءى له كذا**: وای بۆ دەرکەوت.

**تراءى الشَّيئَ**: شتەکەی دی ◦ لەحەدیث دا هاتووە دەفەرموێ: (تراءينا الهلال بذات عرق).

**تراءى فلان فلاناً**: فلان روبەڕوی فلان بوومەوە چاوی پێ کەوت.

**تَرَآى له**: روبەڕوی بوومەوە تا بیبینێ.

**تراءى في المِرآة ونحوها**: سەیری ئاوێنەو شتی وای کرد.

**استرأى بالمرآة**: سەیری ئاوێنەی کرد.

**استرأى الشَّيئَ**: شتەکەی بینی.

**استرأى فلاناً**: داوای دیتنی فلانکەسی کرد ◦ پرس‌و رای پێ کرد ◦ بەخۆ هەڵکێش‌و فشەبازی لەقەڵەم دا.

**الرَّأيُ**: بیرو باوەڕ ◦ عەقڵ‌و ئاوەز ◦ تەکبیرو پلان ◦ تێڕوانین‌و لێ وردبوونەوە ◦ بینینی چاو، دەگوترێ: (رأيته رأي العين) ◦ بەلای زانایانی ئوصولەوە دەرهێنانی حوکمی شەرعییە لەژێر ڕۆشنایی قاعیدەو یاسای چەسپاو.

**الرِّئـيُ**: پۆشاکی باش کەبلاو دەکرێتەوە کەسانی دی جوانییەکەی ببینن.

**رِئيُ الشَّيئِ**: بیندراوی شت؛ ئەوەی چاو دەیبینێ ◦ دیمەن‌و روخساری جوانی شت‌و شکۆمەندی سەرنج راکێش ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَاثًا وَرِئْيًا﴾.

**الرُّؤيا**: خەون ◦ (ك: رُؤَى).

**الرُّؤيَـةُ**: بینین ◦ بینینی مانگی یەکشەوە ◦ لەحەدیث دا هاتووە:(صوموا لرؤيته).

**الرِّئَة**: سی، ئەندامی هەناسەدان.

**الرِّئَوِيّ**: (القلب الرِّئوي): هەڵاوسانی لای ڕاستی دڵ بەهۆی هەندێ نەخۆشییەوە.

**الرِّئـيُّ**: پۆشاکی جوان‌و ناوازە کە بەدانسقە نیشانی خەڵك دەدرێ تاجوانییەکەی ببینن ◦ جندۆکە کە هەواڵی نهێنی بە ئادەمیزاد دەگەیەنێ ◦ دەشگوترێ: (فلان رَئِيُّ قومهُ) فلان دەمڕاست‌و عاقڵمەندی گەلەکەیەتی.

**الـرُّوَاءُ**: روخسار جوانی شکۆمەندی تەواوو سەرنج راکێش.

**الْمَرْأى**: دیمەن‌و روخساری بیندراو، دەگوترێ: (هو مني بمرأىً): ئەو لەمنەوە دیارەو دیمەنی دەبینم.

**الْمَرآةُ**: بەمانا (الْمَرْأى) دێ واتە: دیمەن‌و روخساری بیندراو.

**المِرآة**: ئاوێنە، یان هەر شتێك

تەماشاکەر خۆی تێدا ببینێ ٥ (ك: مَراءٍ ومرايا).

**رَبَأ** فلان ربئاً: فلان بەرز بووە، پلەی ڕێزی زیادی کرد ٥ لەهەموو خواردنەمەنییەك کۆی کردەوە ٥ لەسەرە خۆ ڕۆیشت.

**رَبَأَت** الأرضُ: زەوییەکە پاك بووە، بەروبومی زیادی کرد.

**رَبَأ** بفلان كذا: فلانکەسی بەرز کردەوەو بەدەستپاکی لەقەڵەم دا.

**رَبَأ** في الأمر: سەیری ئیشەکەی کردو لێی ورد بۆوە.

**رَبَأ** المالَ: ماڵەکەی چاودێری کردو چاکسازی تێدا کرد.

**رَبَأ** القومَ ولهم: بوو بەرەبیەو سەنگەر بۆ خەڵکەکە، دەشگوترێ: (ما رَبَأتُ رَبْأَة) گرنگیم پێ نەدا خۆم پێوەخەریك نەکرد.

**رابَأه**: لێی ترساو خۆی لێ پاراست ٥

**رابا فلان فلاناً**: هەریەك لەفلانو فلان چاودێری یەکتریان کرد.

**إرتَبَأ**: بەرز بۆوە.

**إرتَبَأ الجَبَل**: چووە سەر کێوەکە.

**الرَّبِيّ**: پێشەنگو چاوساغ کەلەسەر سنور پارێزگاری وڵات دەکا یان لەپێش لەشکرەوە دەڕواو لەبەرزاییەوە چاودێری دوژمن دەکا نەوەکوو پەلاماری هێزەکەیان بدەن ٥ (ك: ربايا).

**الربيئة**: بەمانا (الرَّبِيُّ) دێ ٥ (ك: ربايا).

**المَرْبا**: شوێنی ڕەبییە ٥ (ك: مَرَابِيُّ).

**الْمَرْبَاةُ**: بەمانا (الْمَرْبَا)دێ.

**الْمُرْتَبَا**: بەمانا (الْمَرْبَا)دێ.

**رَبَّ** الوَلَدَ رَبّاً: سەرپەرشتی منداڵەکەی کردو ئەرکی بەخێو کردنی گرتە ئەستۆ.

**رَبَّ** القَوْمَ: سەرۆکایەتی گەلەکەی کردو کاروباریانی هەڵسوڕاند ٥ لەحەدیثی ئیبنو زوبەیردا هاتووە (لأن يَرُبَّنِي بنوعمي أحبّ اليّ من أن يَرُبَّنِي غيرهم).

**رَبَّ** الشَّيْءَ: شتەکەی کردە مڵکی خۆی ٥ کۆی کردەوە.

**رَبَّ** النِعْمَةَ رَبّاً ورِبَاباً: پارێزگاری نازو نیعمەتەکەی کردو گەشەی پێ دا.

**رَبَّ** بالمكان: لەوشوێنە مایەوەو جێگیر بوو.

**رَبَّ** الدُهْنَ: ڕۆنەکەی پاڵفتە کردو چاکی بەرهەم هێنا.

**أَرَبَّت الريح**: بایەکە بەردەوام بوو.

**أَرَبَّت السَحابَةُ**: هەورەکە بارانەکەی بەردەوام بوو.

**رَبَّبَ الوَلَدَ**: سەرپەرشتی منداڵەکەی کردو ئەرکی بەخێوکردنی گرتە ئەستۆ.

**رَبَّبَ الثَّمَرَ**: میوەکەی کردە مرەبا.

**إرتَبَّ الوَلَدَ**: بەمانا (رَبَّهُ) دێ.

**إرتَبَّ على فلان**: نازو نیعمەتی بەسەر فلان دا ڕژاند.

**تَرَبَّبَ القَوْمُ**: خەڵکەکە کۆبونەوە.

**تَرَبَّبَ الوَلَدَ**: بەمانا (رَبَّهُ) دێ.

**تَرَبَّبَ الشَّيْئَ**: لافی ئەوەی لێ دا کەخاوەنی شتەکەیەو ئەو لێی بەرپرسیارە.

**الرَّابُ**: باوە پیارە، مێردی ژن کە لەمێردێکی تری کوڕێکی هەبێو ئەم مێردەی بۆی بەخێو بکا.

**الرَّابَّةُ**: باوەژن ٥ کە منداڵی مێردەکەی لەژنێکی تری بەخێو بکا.

**الرَّبَابُ**: هەوری سپی ٥ ئامێری موسیقایە یەك ژێی هەیە.

**الرِّبَابُ**: وادەو بەڵێن ٥ کۆمەڵێك سەرەتیر ٥ پەتێك کە گورزە تیری پێ ببەستی.

**الرَّبُّ**: ناوێکە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار ٥ خاوەن ٥ گەورەو ڕیش سپی ٥ بەخێوکەر ٥ سەرپەرشتیار ٥ نەخشەکێشو ڕێو شوێن دانەر ٥ چاکساز ٥ (ك: أرباب وربوب).

**الرُّبُّ**: دۆشاوی خورما یان میوەی تر.

**رُبَّ**: حەرفی جەڕەو ئیسمی نەکیرە مەجرور دەکا.

**الرَّبَبُ**: ئاوی زۆر ٥ ئاوی شیرینو گوارا.

**الرُّبَّى**: نیعمەتو چاکە ٥ پێویستی ٥ گرێی توندو تۆڵ.

**الرَّبَّانِيُّ**: خودا پەرست ٥ زانای کامڵو تەواو بەنەزەری و بەکردەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَـٰكِن كُونُوا رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ﴾.

**الرُّبَّةُ**: بۆ مێینە بەکاردێ.

**الرِّبَّةُ**: هەرچی درەختو ڕوەکێك لەگەرما دا شین بنوێنێ ٥ درەختی خەروب ٥ کۆمەڵی زۆر، یان دەهەزار کەس.

**ربّة البرسيم**: ڕواوەی گیا وێنجەو شتی وا کەلەدوا درونەوە سەر لەنوێ هەڵدەداتەوە.

**الرُّبَّةُ**: کۆمەڵی زۆری ئادەمیزاد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ﴾ زانای خودا پەرستو خاوەن صەبرو ئارام.

**الرُّبُوبُ**: کۆڵە بەسە ٥ گاڕانی ڕەشەوڵاخی کێوی.

**الرَّبِيبُ**: بەمانا (الرَّاب) دێ ٥ پەیمان لەگەل بەستراو ٥ کۆڵە بەسە ٥ پاشا ٥ (ك: أربّاء وأربّةُ).

**الرَّبِيبَةُ**: مێینەی (الرَّبِيب) ٥ کچی ژن کە لەمێردێکی تری بێ ٥ دایەنو شیردەری منداڵ ٥ (ك: ربائب).

**الْمِرْبَابُ**: زەوییەك گیاوو گژی زۆر لێ بڕوێ.

**اَلمَرَبُّ**: بەمانا (المرباب) دێ ٥ شوێن‌و جێگا ٥ شوێنی مانەوەو نیشتەجێ بوون.

**رَبَّت الصَّبِيَّ** ربتاً: بەمانا (رَبَّاهُ) دێ.

**رَبَّت الصَبِيَّ**: منداڵەکەی بەخێو کرد ٥ بەبەری دەستی بەهێواشی کەمکەم لەپشتی دا بۆئەوەی خەوی لێ بکەوێ.

**رَبَثَهُ عن حاجته وامره رَبْثاً**: مەنعی کرد لەو مەبەستەی لادا ٥ (هو رَبوثٌ وربیث).

**رَبَّثَهُ عن حاجته وأمره تربیثاً**: بەمانا (رَبَثَهُ)دێ.

**إرْتَبَثَ القَومُ**: خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد.

**إرْبَثَّ القومُ**: بەمانا (ارتبثوا) دێ.

**تَرَبَّثَ في سیره**: لەرۆیشتن دا مایەوە.

**إرْباثَّ**: بەند بوو، گیرا.

**الرَّبیثَةُ**: کارێك هەڵەو گیرت بکا ٥ فێڵت لێ بکرێ.

**رَبِجَ** رَباجَةً: کەودەن بوو گێل‌و نەفام بوو (هو ربیج وهي ربیجة).

**أرْبَجَ**: کوڕی کورتە باڵای بوون.

**تربَّجَ**: خۆی بەگێل‌و نەفام لەقەڵەم دا ٥ سەرسام بوو.

**تربَّجَت الوالدة**: دایکەکە دوای مردنی مێردەکەی شوی نەکردەوە خۆی تەرخان کرد بۆ بەخێوکردن‌و پێگەیاندنی منداڵەکەی.

**الرَّابِجُ**: تێر ئاوو گەدەتێر.

**الرَّباجِيُّ**: ئادەمیزادی کەتەو زەبەللاح ٥ گۆشتن‌و چوارپەل قەوی ٥ خۆهەڵکێش‌و شانازیی کەر.

**رَبِحَتْ تجارتهُ رَبْحاً ورَبَحاً ورَباحاً**: بازرگانیکردنەکەی قازانجی کرد.

**رَبِحَ** فلاناً علی بضاعته: قازانجی دا بەفلان لەسەر کاڵاکە.

**تَرَبَّحَ**: هەوڵی قازانجی داو کاسبی کرد ٥ سەرسام بوو.

**أربَحَتْ تجارته**: بەمانا (رَبِحَتْ) دێ.

**أربَحَ فلاناً علی بضاعته**: بەمانا (أربَحَهُ) دێ.

**رابَحَهُ علی بضاعته**: قازانجی پێدا.

**الرَّابِحُ**: قازانج کەر، ماڵێك قازانج بکا.

**الرُّبَحُ**: جەڵەبە ئەسپ‌و حوشتر کە بۆفرۆشتن‌و قازانج بهێندرێن ٥ بەزو پیو ٥ بێچوە ئاژەڵی بچوك.

**الرِّبْحُ**: قازانج ٥ ئەوەی قەرزدار بەزیادە دەیدا بە خاوەن قەرز بەگوێرەی چەند مەرجێك کەلەناو خۆیان دا دەیکەن.

**الرَّبیح**: دوکانێك قازانجی تێدابکرێ، دەگوترێ: (متجر ربیح).

**المُرابَحَة**: (بیع المرابَحَة): پێدانی

دەسمایــەو گێڕانـــی بــەقازانـج، بــۆ هەریــەکێ لــەخاوەن پارەکــەو پــارە پێدراوەکــە ئەندازەیــەکی دیــاریکراو لەقازانجەکە دیاری دەکرێ.

**رَبِخَ في الرَّمل رَبْخاً**: بەناڕەحـەتی بـەناو لمەلانەکەدا ڕۆیشتنی بۆکرا.

**أَرْبَـخَ الرَّمْـلُ**: لمەکـە پەسـتێوتراو یەکتری گرت ڕەق بوو.

**أَرْبَـخَ فـلان**: فلانکـەس کەوتـە نـاو ناڕەحەتی‌و تەنگ‌و چەڵەمەوە.

**أَرْبَخَ فلان في الرمل**: بەمانا (رَبِخَ)دێ.

**تَرَبَّخَ**: خۆی شل کرد، دەگوترێ: (تَـرَبَّخَ في مشيه) لـە ڕۆیشتن دا لـۆژە لـۆژی کرد، بەشل‌و شێواویی ڕۆیشت.

**الـرَّبِيخُ مـن الرجـال**: پیـاوی کەتـەو زەبەللاح‌و شل‌و شێواو.

**رَبَـدَ بالمكـان ربـداً وربـوداً**: لـەو شوێنە مایەوە.

**رَبَدَ فلاناً رَبْداً**: فلانکەسی بەند کرد.

**رَبَدَ التَّمْـرَ**: خورماکـەی لەمیربـەددا وشـك کردەوەو هەڵی گرت.

**رَبِـدَ رُبْـدَةً**: ڕەشـاییەکەی تێـکەڵاوی لێڵـی بوو ٥ (هو أَرْبَدُ وهي ربداءُ).

**إِرْبَـدَّ**: بـەمانا (رَبِـدَ) دێ، دەگـوترێ: (إِربَدَّ وَجْهَـهُ): لـەکاتی ڕق هەڵسانی دا ڕەنگــی ســور هەڵــگەڕاو ڕەش داگیرسا.

**تَرَبَّدَ**: بەمانا (إربدّ) دێ.

**تَرَبَّدَ الرجلُ**: پیاوەکە ڕوی گرژ کرد.

**تَرَبَّـدَت السـماءُ**: ئاسمـان هـەورو هـەڵا بوو.

**إِرْبادَّ**: بەمانا (إربدّ) دێ.

**الرُّبَدُ من السـيف**: جەوهـەری شمـشێر، ورشــەو ڕەنگــی ئــەو دیاردەیــەی کەپێی دەگوترێ ئاوی تیغ.

**الرَّبِيـدُ**: خورمایـەك لەسـەبەتەو شـتی وادا بەڕیز دادەنرێ پاشان ئاوی لـێ دەپرژێندرێ.

**الرَّبِيـدَةُ**: صـندوق‌و جانتـا کـە کتێـب‌و تۆمارگەیان تێـدا هەڵـدەگیرێ ٥ (ك: ربائد).

**المِرْبَدُ**: ئاغەڵ‌و حەوشەی حوشتر تێـدا ڕاگرتن ٥ لەبەصرە شوێنێکی بـەناو بـانگی لـەوجۆرە حەوشـە هـەبووە حوشـــتریان تێـــدا ڕاگرتـــووە بـــۆ فرۆشـــتن‌و شـــاعیرانیش تێیـــدا کۆبونەوەو شیعریان تێدا گوتووە ٥ هـــەروا نـــاوە بـــۆ ئـــەو حەصـیرو سەوییە زلـەی خورمـای تێدا وشـك کراوە ٥ (ك: مرابد).

**رَبِذَ رَبَـذاً**: قاچی لەڕۆیشتن سوك بـوو ٥ دەســـتی لـــەکار کـــردن دا ســـوك‌و ڕەنگین بوو.

**أَربَـذَ الثـوبَ أو الحبـلَ**: قوماشـەکەیان حەبلکەی بڕی.

**الرَّبَذَة**: ئەو پارچە پەڕۆیەی ئافرەتی بێنوێژ بەخۆیەوە دەگرێ ٥ ئەو پەڕۆیەی ئاڵتونچی ئاڵتونی پێ دەسڕێتەوە ٥ هەرپارچە پەڕۆیەك بەكاربێ بۆ پاككردنەوەی ئامێرو شتی تر ٥ هەرشتێك پیس‌و قێزەون بێ ٥ پیاوی بێ‌خێرو بێر ٥ تۆپەوانەی كەندو كۆلێنەو گۆزە.

**الرَّبَذِيُّ**: ژێ ٥ قامچی، شۆڕك.

**المِرْباذُ**: زۆر بلێ‌و چەقە چەناو.

**الرَّبْرَبُ**: جەڵەبە ئاسك ٥ گاڕانی گاكێوی ٥ كۆمەڵی ئادەمیزاد.

**رَبُزَ** الكبشُ رَبازة: بەرانەكە قەڵەو بوو گۆشتی گرت.

**رَبُزَ** فلان: فلان كەس عاقڵ‌و وردبین بوو (هو رَبيزٌ).

**رَبَّزَ القربة**: كوندەكەی پڕكرد لەئاو.

**إرْتَبَزَ**: لەهونەری خۆی دا تەواو كامڵ بوو.

**الرَّبِيزُ**: گەورەو لێ هاتوو لەفەننی خۆی دا.

**رَبَسَهُ** بيده رَبساً: بەدەستی خۆی لێی دا ٥ (هو مربوس وربيس).

**رَبَّسَ القِرْبَةَ** ونحوها: كوندەكەی پڕكرد.

**إرْتَبَسَ**: تێكەڵاو بوو ٥ گۆشتن‌و قەڵەو بوو.

**إرْتَبَسَ العنقودُ**: هێشوەكە پڕبوو دەنكەكانی پاڵیان لێك داو بۆڵە ترێیەكان لەناو خۆیان دا پاڵەپەستۆیان كردو چونە ناو یەكەوە.

**تَرَبَّسَ**: بەهێواشی ڕۆیشت.

**تَرَبَّسَ فلاناً**: فلانكەس زۆر بەوردی بەدووی فلانكەس دا گەڕا.

**إرْبَسَّ فلان**: بەناو زەوی دا ڕۆیی‌و گەڕا.

**إرْبَسَّ أمر القوم**: وەزع‌و حاڵی خەڵكەكە شێوا تاوایان لێ هات پەرتەوازە بوون.

**الرِّبْسُ**: پیاوی زیرەك‌و لێهاتوو ٥ ماڵی زۆر، شتی زۆر.

**الرَّبيسُ**: ماڵی زۆر، شتی زۆر ٥ بەرانی ورك زل قەڵەو ٥ گرێ داری زل ٥ پیاوی ئازاو نەبەرد.

**الرُّبَيْسُ**: (أم الرُّبَيس): مار ٥ بەكینایە دەهێندرێ بۆ كارەسات.

**رَبِشَتِ الأرضُ رَبَشاً**: زەوییەكە گژوگیای زۆرو ڕەنگاو ڕەنگ بوو ٥ زەوی بەگژوگیای ڕەنگاو ڕەنگ‌و زۆر ڕازایەوە، دەگوترێ: (رَبِشَت السنةُ وربش المكان ورَبِشَ الرجلُ): ڕەنگی جیاجیای بوون، پەڵەو خاڵی سورو هەندێكی تری ڕەشی تێدا پەیدا بوون ٥ (هو أربَش وهي ربشاء).

**أرْبَشَ الشجر**: درەختەكە پشكوت و گەڵای كرد ٥ میوەكەی دەركەوت وەكوو دەنكە نوك دەچوو.

**الرَّبَشُ**: سپیاییەك كەلە نینۆكی منداڵی ساوادا دەردەكەوێ.

**رَبَصَ** بفلان رَبصاً: چاوەڕوان بوو فلان چی بەسەر دێ لەخێر یان لەشەڕ، دەشكوترێ: (رَبَصَ فلاناً أمر).

**تَـرَبَصَ**: پەزمەندەی كرد، دەگوترێ: (تَـرَبَصَ بـه الشّيءِ) ئەو شتە چاوەڕوانی بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَا إِلاَّ إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ﴾.

**تَـرَبَّصَ بسلعته**: چاوەڕوان بوو ماڵ و كاڵاكەی نرخی بەرز بێتەوە.

**الرُّبْصَةُ**: رەنگی جۆراو جۆر، دەشكوترێ: (لي على هذا الأمر رُبْصَةٌ): من لەسەر ئەم كارە لێ وردبونەوەو چاوەڕوانیم هەیە.

**رَبَضَتِ الغَنَمُ وغيرها من الدواب ربضاً وربوضاً**: مەڕو بزنەكان یان ئاژەڵەكان مۆڵ بوون، مۆڵیان خوارد.

**رَبَضَ الأسَدُ على فريسته**: شێرەكە نێچیرەكەی خۆی خستە ژێر چنگی خۆیەوەو خپی كرد، دەشكوترێ: (رَبَضَ القرن على قرنه) پاڵەوانەكە هاوشانەكەی خۆی خستە سەر زەوی و ژێر خۆی ناو بۆڕی دا.

**رَبَضَ بالمكان**: لەشوێنەكە مایەوە.

**أرْبَضتِ الشمسُ**: خۆر گەرمییەكەی توند بوو هەتا وای لێ هات ئاژەڵەكان خۆیان كوتایە بن دارو پەناو پەسیوو خۆیان مۆڵ دا نەیانتوانی لەبەر گەرماكەدا خۆیان راگرن.

**أربَضَ الراعي الغَنَمَ وغيرها من الدواب**: شوانەكە مەڕو بزنەكانی وا لێ كردن بمۆڵن.

**أربَضَ الشرابُ القومَ**: شەرابەكە خەڵكەكەی تێراوو مەست كرد، هەموو كەلەلا بوون لەسەر زەوی رەق خەویان لێ كەوت و لاڵ و پاڵ لێی كەوتن، دەشكوترێ: (أربَضَهم الإناءُ) جامە مەییەكە مەست و كەلەلای كردن.

**أربَضَ أهْلَهُ**: بژێوی بۆماڵ و منداڵی خۆی دابین كرد.

**رَبَّضَ الراعي الغَنَمَ وغيرها من الدواب**: بەمانا (أربَضها) دێ.

**رَبَّضَ فلاناً بالمكان**: فلانكەسی لەشوێنەكە جێگیر كرد.

**تَرَبَّضَ الكبشُ عن الغنم**: بەمانا (رَبَضَ) دێ.

**تَرَبَّضَ بالمكان**: بەمانا (رَبَضَ) دێ.

**الرَّابِضُ**: شێر ٥ نەخۆش، دەگوترێ:

(أسد رابض) (ورجل رابض) ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە (كلب جوّال خير من أسد رابض) ٥ كوردیش دەڵێن: (ڕێوییەكی گەڕیدە لەشێرێكی نوستوو باشترە).

**الرّابِضَة**: نەرمانی لوت.

**الرِّبْضُ**: ژن، هاوسەر.

**الرَّبَضُ**: بەمانا (الرِّبْضُ) دێ ٥ تەویلەو ئاغەڵی ئاژەڵو وڵاخ ٥ حەوشەو شوێن تێدا مۆڵینی حوشتر ٥ هەر كەسێك هەر شوێنێك خێزانو تاكەكانی خێزان بۆی بگەڕێنەوە بۆ پشودانو ئیسراحەتو بچنە لای و تێیدا بمێننەوە ٥ وەكوو مێردو ژنو كچو خزم ٥ هەروا بەمانا ریخۆڵەو ناوسك دێ ٥ گوریسو قەیاسەو حەبلی باربەستن ٥ سوچو لاو كەناری شت ٥ دەوروبەری شار، بژێو كەلە شیر پێك هاتبێ.

**الرِّبْضُ**: كۆمەڵێك رەشە وڵاخو حەیوانی تر لەكاتی مۆڵین دا.

**الرُّبْضُ**: ناوەندی شت ٥ بناغەی بینا ٥ كۆمەڵێك درەختی تێك هاڵاوو تێكچرژاو.

**الرُّبُضُ**: ژن ٥ خێزان ٥ هەروا دەگوترێ: (رجلٌ رُبُضٌ عن الحاجات والأسفار): پیاوێكە خۆی بەسەفەرو شتی واوە نەگرتووە.

**الرِّبضَةُ**: قەبارەیەك كە خۆی بەسەر شتێك دا دابێو مات بووبێ ٥ كۆمەڵێك ئادەمیزاد.

**الرُّبْضَةُ**: پیاوی دانیشتوو بێ دەسەڵات ٥ پارچەیەك تێكوشاو.

**الرُّبَضَةُ**: پیاوی دانیشتووی بێ دەسەڵات.

**الرَّبوضُ**: دەگوترێ: (شجرة ربوض): درەختی گەورەو قەدزل ٥ (سلسلة ربوض): زنجیری ئەستورو پتەو (قرية ربوض): گوندێكی قەرەباڵغە.

**الرُّوَيْبِضُ**: مەڕو بزن بەشوانەوە لەحەوشەی مۆڵدان دا ٥ كۆبوونەوەی بەز لەگەدەدا.

**الرُّوَيْبِضَةُ**: پیاوی خوێڕیو ناكەس بەچە.

**رَبَطَ جَأشَهُ رباطة**: دڵی قایم بوو پەلەكوتەی پێ نەكەوت لەكاتی ترسان دا، خۆڕاگربوو.

**رَبَطَ الشَّيءَ**: شتەكەی شەتەك دا.

**رَبَطَ نَفْسَهُ عن كذا**: خۆی لەوشتە بواردو لاقەی نەكرد.

**رَبَطَ الله على قلبه بالصبر**: خودا صەبرو ئارامی بەسەر دڵو دەرونی دا رشتو هێزو توانای مەعنەوی پێ بەخشی.

**رابــط مُرابَطَــةً ورباطــاً**: ســەنگەری سەرســنوری پاراســتو لەشــوێنی ترسناك دا مایەوە، دەگوترێ: (رابَطَ الجيشُ) ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـواْ اصْـبِرُواْ وَصَـابِرُواْ وَرَابِطُـواْ﴾ لەســەر پابەنــدبوون بــە ئیــسلامو بــەردەوام بــوون لەســەر ئەنجامــدانی کــاری خێــرو چــاکە خــۆگرو پــشودرێژ بــنو تەمبــەڵ مەبن.

**إرْتَــبَطَ في الحبــلِ ونحــوه**: کەوتــە نــاو حەبلەکەوەو تیێ هاڵا.

**إرْتَــبَطَ الدَّابَّــةَ وغيرهــا**: وڵاخەکــەی بەستەوە، دەگوترێ: (فلان يرتبط من الــدواب كــذا رأســاً) فلاّنكــەس ئەوەنــــدە ســــەر وڵاخــــێ ئــــاژەڵ دەبەســــتێتەوە، واتــــە: خــــاوەنی ئەوەندە سەر وڵاخو ئاژەڵە.

**إرْتَبَطَ فرساً**: ئەسپەکەی بەخێو کرد بۆ سوار چاکیو ڕەمبازی.

**تَــرابط المــاءُ في المكــان**: ئاوەکــە لەشــوێنی خۆیــەتی هیــچی لــێ نەڕۆیشتووە.

**التَّرابُط**: لەزاراوەی فەلسەفەدا هەبوونی پەیوەنــدی نێــوان دووشــتە چــونکە لــەزەین دا هۆکارێــك پێــکیەوە بەستون.

**الرَّابِط**: دەگوترێ: (هـو رابـط الجأش): دڵ قــایمو چــاو نەترســە ٥ ئازایــە، لەهیچ شتێك ناترسێ.

**الرَّابِطَةُ**: پەیوەندیو وابەستەیی نێوان دوو شــت ٥ وڵاخــی بەســتراوە ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزاد لەپرۆژەیەك دا لــەبیرو بۆچــونو هــەڵسو کــەوت دا یــەك بگــرن، دەگــوترێ: (رابطــة الأدبــاء، رابطــة العلمــاء، رابطــة الفقراء،...) ٥ (ك: روابط).

**الرِّباطُ**: ئەوەی شتی پێ دەبەستێتەوە، دەگوترێ: (قَرَضَ رباطه): مـرد، یـان لەنەخۆشــییەکەی ڕزگــاری بــوو، دەشگوترێ: (جاء وقد قَرَضَ رباطَهُ): بەمانــدوویی گەڕایــەوە ٥ (ربــاط الخيل): شوێنی بەستنەوەی ئەسپ ٥ شــوێنی کەمەنــد کێــشی صــۆفیانو خوداپەرستیان ٥ دڵ ٥ (ك: رُبُطٌ).

**الــــرَّبْطُ**: لــــەزاراوەی فەلــــسەفەدا پەیــداکردنی جــۆرە پەیوەندییەکــە لــەنێوان دوشــتی هەســت پێــکراو دا لــەزەین دا بــەهۆی هــەبوونی جــۆرە پەیوەندییەکەوە.

**الرُّبْطَة**: گورزە ٥ باقەو باوەشە شت.

**الــرَّبِيط**: بەســتراو ٥ ڕەبــەنو دونیــا نەویــست ٥ خورمــای وشــکەوە بــوو کەدەکرێتە نـاو هەمبانـەو کیـسەوە، یــان دەخرێتــە نــاو خورمــادانو مــشتاخەوەو ئــاوی پێــدا دەکــرێ ٥

خورمای نەگەیشتوی شۆراوە ٥ تەڕبوو، دەشگوترێ: (هو ربيط الجأش): ئازاو نەبەردو چاو نەترسە.

**الرَّبِيطَةُ**: ولاخی بەستراوە ٥ (ك: رِبائِط).

**اَلْمَرَابِطَةُ**: کۆمەڵی ئادەمیزادو ئەسپ سوار کەلەسەر سنور سەنگەر لەدوژمن دەگرن‌و ناهێڵن دوژمن پێ بخاتە خاکی نیشتمانەوە.

**المِرْبَطُ**: ئەو زنجیرو حەبل‌و کەرەستەیەی ولاخی پێ دەبەسترێتەوە.

**المرْبَطَةُ**: بەمانا (المِرْبَط) دێ.

**رَبَعَ الربيعُ ربوعاً**: بەهار پەیدابوو، هاتە ناوەوە.

**رَبَعَ الإبلُ رَبْعاً**: لە پاوانەکە دا حوشترەکە بەرەڵلا کرا لەکوێ دەڵەوەڕێ بلەوەڕێ‌و بخواتەوە.

**رَبَعَ عليه الحميّ**: توشی نەخۆشی سێبەڕۆ بوو رۆژێك لەرزوتای توش دەبێ‌و رۆژێك یان دوو رۆژ بۆی نایە.

**رَبَعَ بالمكان**: لەوشوێنە مایەوەو جێگیر بوو.

**رَبَعَ فلان**: فلانکەس ڕاوەستاو چاوەڕوانی کردو گیری خوارد، دەگوترێ: (إرْبَعْ عليك أو على نفسك) بمێنەوەو چاوەڕوان بە ٥ بەردەکەی بەرز کردەوە بۆ بەتاقیکردنەوەی هێزو بازوی ٥ بەروبوومی باشی هەبوو.

**رَبَعَت الدَّابَّةُ**: ولاخەکە هەنگاوی درێژی هاویشتن.

**رَبَعَ عنه**: وازی لێ هێنا، دەگوترێ: (ربع على فلان): بەزەیی پێداهاتەوە، دەگوترێ: (رَبَعَ الرَّجلُ بالمكان وفي المال): پیاوەکە دەستی لەشوێنەکەیان لەماڵ‌و سامانەکە گیر بوو بەئارەزوی خۆی تەصەروفی تێداکرد.

**رَبَعَ فلاناً**: چواریەکی ماڵ‌و سامانی فلانی برد، وەری گرت.

**رَبَعَ الجَيْشَ**: چواریەکی دەستکەوتی سوپای برد.

**رَبَعَ الحِمْلَ**: بەچوار دەستەکی بارەکەیان بەرز کردەوە.

**رَبَعَ الحَبْلَ أو الوترَ**: پەتەکەی لەسێ هەودا بادا یان ژێیەکەی بادا.

**رَبَعَ الثلاثة**: بوو بەچووارەمی سێیەکان.

**رَبَعَ التسعة والثلاثين**: بوو بەتەواوکەری چل.

**رَبَعَ الثلاثة والأربعين**: چل‌و چوواری تەواو کرد.

**رُبِعَ**: توشی لەرزوتای سێبەڕۆ بوو.

**أرْبَعَ العَدَدُ**:ژمارەکە بوو بەچواریان چل.

**أرْبَعَ القومُ**: خەڵکەکە کەوتنە وەرزی بەهارەوە.

**أَرْبَعَ الحامِلُ**: لەبەهاردا ئافرەتەکە منداڵی بووو (هي مُرْبِعٌ ومِرْباع).

**أَرْبَعَ المولودُ**: منداڵەکە ددانی پێشەوەی دەرکەوتن، یان کەوتن.

**أَرْبَعَ فلان**: فلانکەس بەگەنجی منداڵی بوو.

**أَرْبَعَ الغَنَمُ**: مەڕو بزنەکان تەمەنیان چووە ساڵی چوارەمەوە.

**أَرْبَعَ ذوات الحافر**: ولاخە سمدارەکە چووە ساڵی پێنجەمەوە.

**أَرْبَعَ ذوات الخف**: ئاژەڵە پێ پانەکە چووە ساڵی حەوتەمەوە.

**أَرْبَعَ الغيث**: بارانەکە هێند زۆر بوو رێگاو بانی لەخەڵکەکە بڕیوەو لەناو ماڵەکانیان دا ماونەتەوە ٥ (فهو مُرْبَعٌ).

**أَرْبَعَ ماء الركية**: ئاوی بیرەکە زۆر بوو.

**أَرْبَعَ الإبلَ**: حوشترەکەی بەرەڵڵا کرد هەرکاتێ ویستی بچێ بۆ ناو خواردنەوە.

**أَرْبَعَ المريضَ**: دوو رۆژ بواری دا نەچووە لای نەخۆشەکەو رۆژی سێیەم سەردانی کرد.

**رابَعَ الحِمْلَ مرابَعةً ورباعاً**: کۆڵەکەی لەگەڵ یەکێکی تردا بەچوار دەستەکی هەڵگرت.

**رابَعَ فلاناً**: کۆڵەکەی لەفلانکەس بەدەستەبار هەڵگرت ٥ لەبەهاردا مامەڵەی لەگەڵ کرد.

**رَبَّعَ الشَّيْئَ**: شتەکەی کردە چوارگۆشە ٥ کردی بەچوار بەشەوە.

**رَبَّعَ فلان رجليه**: فلانکەس چوار مەشقی دانیشتو قاچەکانی نوشتاندنەوە.

**إِرْتَبَعَ البعيرُ**: حوشترەکە گیای تەڕی بەهاری خوارد ٥ قەڵەو بوو ٥ پەلەی کرد ٥ رۆیشت قاچی لەعەرد دەدا.

**إِرْتَبَعَ الحيوانُ**: گیاندارەکە هاتە سەر تایمی زیندەگانی خۆی و گەشەو نەشەی دەست پێ کردەوە بەهۆی چارەسەرێک.

**إِرْتَبَعَ بالمكان**: لەوشوێنە مایەوە لەوەرزی بەهاردا.

**إِرْتَبَعَ حَجَراً ونحوه**: بەردەکەی بەرز کردەوە.

**إِرْتَبَعَ فلان أمرَ القوم**: فلانکەس چاوەڕوانی کرد ببێتە سەرۆکی گەلەکەی ٥ لەحەدیث دا هاتووە (إن فلاناً قد ارتبع أمر القوم).

**تَرَبَّعَتِ الماشية**: ئاژەڵەکە گیا تەڕی بەهاری خوارد.

**تَرَبَّعَ الجالِسُ**: دانیشتووەکە قاچەکانی نوشتاندنەوەو خستنیە ژێر ڕانی.

**تَرَبَّعَ المكـان وبـه**: لـەوەرزى بـەهاردا لەوشوێنە جێگیر بوو.

**تَرَبَّعَ حجراً ونحـوه**: بەردەكەی بەچوار دەســتەكیو دەســتەبار لەگــەڵ یەكێكی تردا هەڵگرت.

**استَربَعَ البعيرُ ونحوه للسير**: حوشـترەكە بەهێز بوو بۆ رۆیشتن.

**اســـتَربَعَ فــلان بعملـــه**: فلاّنكــەس لەكارەكـەی خـۆی دا سـەربەخۆبوو توانای بەسەر ئیشەكەی دا شكا.

**استَربَعَ الرمـلُ ونحـوه**: لمبەكـە تـەباری بەست.

**استَربَعَ الغبارُ ونحـوُهُ**: تـەپو تـۆز بـەرز بووەوە.

**استَربَعَ شيئاً**: توانـای بەسـەر شتەكەدا شكاو بەسەری دا زاڵ بوو.

**الأربـعُ**: چـوار، وشـەیە كـە بۆژمـارەی چوار بەكاردێ.

**ذوات الأربع**: هەر گیانلەبەرێك لەسـەر چوار قاچ بڕوا.

**الريــاح الأربــع**: چـوار جـۆرە بایەكـە (كزەی بەرەبـەیان، بـای دەبور، بـای شەماڵ، بای باشور).

**الأربِعَاء**: چوارشەمە.

**الأُربُعَاء**: دەگوترێ: (قَعَدَ الأُربُعَاءَ) چوار مەشقی دانیشت.

**الأُربُعا**: بەمانا (الأُربُعاء) دێ.

**الأربَعــة**: چـوار (وشـەیەكە بـۆ ژمـارەی چـوار بـەكاردێ)، دەگـوترێ: (جـاء وعيناه تدمعان بأربعـة تـسيلان بأربعـة آماق).

**الأربعون**: چل؛ واتە چووار جار دە.

**التربيــع في الزراعــة**: چـوارەم پـاراوو ئاودانی كشتوكاڵ.

**الرابع**: پلەی دوا پلـە سێ ە دەگـوترێ: (ربيــع رابــع) بەهارێــكی بـەپیتو خێرو بێرە.

**رُباعَ**: چوار چوار، دەگوترێ:(جاء القومُ رُبَاعَ): خەڵكەكە چوار چوار هاتن.

**الرَّبــــاعُ**: وەزعو حـــاڵو بـــارو دۆخ، دەگوترێ: (هم على رَبـاعِهم) ئـەوان هەر لەسەر حاڵو وەزعـی خۆیـانن‌و هیچ ناخۆشییەكیان نەهاتۆتە رێ.

**الرِّبــاعُ**: خـوێنی كـوژراو كـە هۆزێــك لەجیاتی هۆزێكی تر بیدا.

**الرَّباعة**: بەمانا (الرَّباعُ)دێ ە لەحەدیث دا هـــاتووە دەربـــارەی ئەنـــصارو موهاجیرەكان دەفەرموێ: (انهم أمـة واحدة على رباعتهم).

**الرُّباعيـة**: ددانـی نێـوان كەڵبـەو خـرێ، كەچوارن، بەهەریـەكێ لەشـەویلەی خوارو شەویلەی سەرو.

**الرّبـــاعي**: هەرشتێــك لەچـوار پێــك هاتبێ ە لـەعیلمی هەندەسـەدا نـاوە بۆ وێنەیەكی یەكسانی چوارگۆشـەی چوار سوچ.

**الرّباعية في الشعر:** چوارين؛ بەفارسى پێى دەگوترێ دوو بەيت.

**الرَّبّاعُ:** كەسێك زۆر حوشترى شيردەر بكڕێ ٥ يان كەسێك خۆتاقى بكاتەوە بەبەرزكردنەوەى كێشى قورس.

**الرَّبْعُ:** بەهارە هەوار؛ ئەو شوێنەى بەهاران دەكرێتە شوێنى تێدا نيشتەجێ بوون ٥ خانوو نشينگە، دەورو بەرى خانوو ٥ هۆبەو گەرەك ٥ بالاّ مامناوەند ٥ جۆرە وەرزشێكە شتى قورسى تێدا بەرز دەكرێتەوە بۆ بەتاقيكردنەوەى هێز.

**الرَّبَعُ:** بالاّ مامناوەند.

**الرُّبْعُ:** چارەك؛ بەشێك لەچوار بەش ٥ بەزۆرى‌و بەعورف بەئامێرێكى پێوانە دەگوترێ چوار پيالە بگرێ.

**الرُّبَعُ:** بێچوە ئاژەڵ كە لەوەرزى بەهاردا لەدايك ببێ‌و دەستە گوڵ‌و نۆبەرە بێ.

**الرِّبْعُ:** لەرزو تايەكە رۆژێك توشى نەخۆشەكە بێ‌و دواى دوو ڕۆژ بەرى بداو ئەمجار رۆژى چوارەم بيگرێتەوە، پێى دەگوترێ مەلاريا ٥ هەروا جۆرێكە لەحوشتر ئاودان رۆژێك دەيبەنە سەر ئاوو دوو رۆژ نايبەن‌و رۆژى چوارەم دەيبەنەوە سەرئاوەكە.

**الرَّبْعَةُ:** ئادەميزادى بالاّ مامناوەندو چوارشانە ٥ قوتوى بۆن خۆش ٥ قورئان كە كرابێتە سى جوزء.

**الرَّبَعَةُ:** مەسافەى نێوان بەردى سێ كوچكەى ئاگردان ٥ بارانە بەهارە، گيا بەهارە ٥ پياوى گەنج كەژنەكەى منداڵى ببێ.

**الرِّبْعِيَّةُ:** (رِبْعية القوم): تێشوو بژێوى خەڵك لەسەرەتاى زستان دا.

**الرُّبُوعُ:** دەگوترێ: (بقرةٌ ربوع): مانگايەك بدۆشرێ‌و چووار قاپى شير تێدابێ ٥ (ك: رُبُعٌ وربائع).

**الرَّبِيعُ:** وەرزى بەهار ٥ وەرزى نێوان زستان‌و هاوين ٥ مانگى رەبيعى يەكەم‌و رەبيعى دووەم ٥ بارانى بەهار ٥ جۆگاى بچوك ٥ گياوگژى تەڕو تازە ٥ هەرگياو گژێك لەبەهاردا بڕوێ ٥ بەشێك لەچوار بەش ٥ چارەك.

**أبو ربيع:** نازناوى پەپوسلێمانكەيە.

**الرَّبِيعَةُ:** بەردێكە هێزى پاڵەوان‌و وەرزشكارانى پێ بەتاقى دەكرێتەوە ٥ زرێيەكە لەكاتى شەڕدا لەبەردەكرێ ٥ باخچە ٥ مەشكەو هەنبانەو كوندە ٥ قوتوى بۆنى خۆش كەمبوك‌و زاوا بەكارى دەهێنن ٥ (ك: ربائع).

**الرَّوبَعُ**: لاوازو پرو پوچ ٥ کولەبنەی خوێڕیو هەتیومچە.

**الرَّوبَعَة**: دمردێکە توشی بێچوە ئاژەڵی شیرە خۆرە دەبێ ٥ کورتە باڵا ٥ (ك: رَوابِع) ٥ دانیشتنی چوارمەشقی.

**المِرْباعُ**: چواریەکی دەستکەوتی شەڕ کەلەپێش ئیسلام دا سەرۆك‌و پاشاکان بۆخۆیانیان دادەنا ٥ باڵا مامناوەند ٥ ئەو ئاژەڵەی لەوەرزی بەهاردا زاوزێ دەکا ٥ ئەو شوێنەی لەبەهاردا یەکەمجار گیای لێ دەڕوێ ٥ (ك: مرابیع).

**المُرَبَّعُ**: هەرشتێك چوارگۆشە بێ ٥ لەزاراوەی هەندەسەدا هەرشتێك چوار تەنیشت‌و سوچی یەکسانی هەبێ، دەشگوترێ: (رجل مُرَبَّع الحاجبین): پیاوێکە توکی برۆی زۆرە دەڵێی چوار برۆی هەیە.

**المِرْبَعُ**: عەصایەکە دوو پیاو هەریەکەیان سەرێکی هەڵگرتووە بۆئەوەی لەسەرپشتی وڵاخەکە شتی پێ بیگوێزنەوە.

**المَرْبَعُ**: ئەوشوێنەی بەهاران دەکرێتە هەوارو نشینگە ٥ بەهارە هەوار ٥ بارانی بەهار ٥ (ك: مَرابع).

**المَرْبَعَةُ**: زەوییەك (یەربوع: جرجە قاچ کورتی) زۆربن یان چ زۆرو چ کەم یەربوعی هەبێ.

**المِرْبَعَةُ**: بەمانا (المِرْبَعُ) دێ ٥ (ك: مرابع).

**المَرْبُوعُ**: باڵا مامناوەند ٥ توشبوو بەنەخۆشی سێبەرۆ لەرزوتایەك ڕۆژێك دەیگرێ‌و دوو ڕۆژ بەری دەداو ڕۆژی چوارەم توشی دەبێتەوە ٥ (ك: مرابیع).

**الیَرْبوعُ**: جانەوەرێکە وەکوو جرج وایە بچوکە قاچی درێژو دەستی کورتن، کلکێکی درێژی هەیە کۆتاییەکەی بەتاڵە مویەك دێ.

**رَبَغَ رَبْغاً**: لەناو نازو نیعمەت دا مایەوە.

**رَبِغَ رَبَغاً**: ژیانی خۆش‌و بەرفراوان بوو ٥ سەری کردە ئەنجامدانی کاری خراپ‌و بێهودەو رابواردنی ناشەریفانەو خوی تاوانکردن‌و حەرام خواردن٥(هو رَبِغٌ وهي رَبِغَةٌ).

**رَبِغَ العیشُ**: ژیان‌و گوزەران خۆش‌و پڕنازو نیعمەت بوو ٥ (هو ربیغ):

**أربَغَت الناقة**: حوشترەکە قەڵەو بوو شیرو بەرهەمی زۆربوو.

**أربَغَ الشیطان في قلبه**: شەیتان بەسەر دڵ‌و دەرونی دا زاڵ بوو دڵی شێواندن ٥ لەحەدیث دا هاتووە: (إن الشیطان قد أربَغَ في قلوبهم وعَشَّشَ).

**رابِــغ**: شیوێــکه لــەنێوان مەککــەو مەدینەدا نزیك کەناری دەریای سور ٥ شوێنێــکه لەوشــوێنانەی میقــاتی ئیحرام بەستنە بۆ حاجیەکان.

**الرّابِــغَ**: دەگــوترێ: (عــیش رابِــغٌ): ژیانێکی خۆش‌و پڕ نازو نیعمەتە ٥ (ربیــع رابــغ): بــەهاری بــەپیت‌و بەرەکەتە.

**الرَّبَغُ**: ئاودێری ٥ گلّە وردە.

**الرَّبَغُ**: ژیانی خۆش‌و پڕنازو نیعمەت.

**رَبَقَهُ رَبْقاً**: بەحەبلی قوڵفەدار شەتەکی دا.

**رَبَقَ فلانــاً في الأمــر**: فلانکەســی خــستەناو کێشەکەوە.

**رَبَّقَهُ**: زێــدەرەوی کــرد لەشــەتەکدانی دا بەگوریسی قوڵفەدار.

**رَبَّقَ الکلامَ**: قسەکەی هەڵبەست، درۆی تێکەڵاوکرد.

**رَبَّقَ الخُبْزَ**: رۆنەکــەرەی کــردە پێخــۆری نانەکــە، دەگــوترێ: (خبــزة مربَّقَــةٌ): نانە چەورە ٥ کولێرە بەرۆن.

**ارتبــق في الحبالــة**: بەتۆڕەکــەوە بــوو، دەشــگوترێ: (ارتبـــق في حبالتــــه): کەوتە ناو فێڵی خۆیەوە.

**الرِّبْــقُ**: گوریــسی قوڵفــەدار ٥ زنجیــری وڵاخ بەستنەوە ٥ حــەبل، گوریس ٥ دەزوو ٥ (ك: أرباق و رباق).

**الرِبْقَةُ**: تاکە وشەی (الرِبْــقَ)، دەگــوترێ: (حَــلَّ رِبْقَتَـهُ) تــەنگو چــەڵەمەکەی کۆتایی پێ هات ٥ هــەروا دەگــوترێ: (لا یرضــی الحــرّ في رِبقَــة الــذُّل): هــەرگیز پیــاوی ئــازاد رازی نابــێ پێوەندی ژێردەستەیی لەپێ دا بێ.

**الرُّبَیْــقُ**: (أم الرُّبَیْــق): مــار ٥ تــەنگو چەڵەمە ٥ شەر.

**رَبَكَ الشَّيْءَ رَبْكاً**: شتەکەی تێکەڵاو کرد.

**رَبَكَ الرُّبیکةَ**: کەشکی دروست کرد(کەشکی تێکەڵ بەخورماو رۆنکرد).

**رَبَكَ الثریدَ**: تێکوشاوەکەی تێکەڵاو کــردو چاکی کرد وای لێ کرد بــۆ خــواردن گونجاوو خۆش بێ، دەگوترێ: (ربك طعاماً): خواردنی بۆ دروســت کــرد ٥ لەپەنــــدی پێــــشینان دا هــــاتووە (غِرْثــــان فَــارْبُکُوا لــه): برســییەتی‌و خواردنی بۆ ئامادەبکەن، بەکەسێك دەگوترێ خەمی خۆی نەبێ‌و خۆی تەرخان کردبێ بۆ یەکێکی تر.

**رَبَكَ الرجلَ**: پیاوەکەی خستە ناو قوڕەوە.

**رَبِكَ رَبَكاً**: کارەکەی لێ شێوا.

**ارتَبَــكَ الأمْــرُ**: ئیشەکەی لــێ تێــکەڵ‌و پێکەڵ بوو.

**ارتَبَــكَ في الوَحَــلِ**: لــەقوڕ چــەقی‌و بڕستی لێ بڕا.

**ارتَبَكَ في الأمر**: کەوتە نــاو کارەکــەوەو نەیتوانی خۆی لێ رزگار بکا.

الرَّبِكُ: کەسێك فیل‌و پیلانی لاوازی هەبێ.

الرُّبِكُ: (رجُل رُبَكٌ): پیاوێکی سەر لێ شێواوە نازانێ چ بکاو بۆ کوێ بچێ.

الرَّبيكةُ: کەشك بەخورماو بەڕۆن سور بکرێتەوە ٥ یان دۆ کەشك ٥ قوڕاو ٥ ڕۆن کەهێشتا لەماستو ئاوەکە جیانەکرابێتەوە.

رَبَلَ المكانُ رَبْلاً: شوێنەکە گیا (رەبل)ی لێ ڕوا؛ جۆرە ڕوەکێکە ٥ یان زۆری لەوجۆرە گیایە لێ هەبوو.

رَبَلَ القومُ: خەڵکەکە زۆر بوون، زاوو زێی باشیان کرد ٥ ماڵو سامانیان پەرەی سەندو گەشەی کرد.

رَبَلَت المرأةُ: ئافرەتەکە قەڵەو بوو، گۆشتن بوو.

إرتبل مالُه: ماڵو سامانی زۆر بوو.

تَرَبَّلَ الجِسمُ: جەستەی کەتەو زەبەلاح بوو.

تَرَبَّلَت المرأةُ: ئافرەتەکە قەڵەو بوو.

تَرَبَّلَ شجر الرِّبْل: درەختی رەبل گەڵای دەرکرد.

تَرَبَّلَ الظبيُ: ئاسکەکە گەڵای (رەبل)ی خوارد.

تَرَبَّلَ الرّجلُ: پیاوەکە ڕاوی کرد.

تَرَبَّلَت الأرضُ: زەوی دوای وشك بوونی لەوەرزی هاوین بەهاتنی پایزو بارانی پەڵە سەرلەنوێ سەوز بووەوە.

الرَّابِلَة: گۆشتی شان ٥ (ك: روابِل).

الرِّبْلُ: ڕوەکێکی گرژو زبرو زۆر سەوزە، گەڵاکانی پڕو تێکچڕژاون، سەری لقەکانی گوڵێکی زەردی شێوە ئوقحوانی ددان ددانی پێوەیە ٥ (ك: ربول).

الرِّبْلُ: بەمانا (الرِّبْل)دێ.

الرِّبْلَةُ: کوتە گۆشتی گەورە، گوڵمە گۆشت ٥ دیوی ناوەوەی ڕان.

الرِّبيلُ: جەستەی قەڵەوو گەورە ٥ پیاوی دزو جەتە کەبەتەنیا پەلامار بداو تاڵانو بڕۆ بکا، ئازاو بەجەرگ بێ.

الرّبيلةُ: ڕۆنو چەوری ٥ نازو نیعمەتو هەرزانی.

الرِّيبالُ: بەمانا (الرِّئبالُ) دێ کە بەمانا شێرە ٥ یان گورگە، دەگوترێ: (لِصٌّ ريبال) دزێکی ئازایەو هەمیشە لەکەلێن دایە بۆ شەڕ ٥ ڕوەکێك تێکبهاڵێو درێژ بێ ٥ کەسێك تاقانەی دایکی بێ ٥ (ك: رَبابیل وربابِلة).

الرِّيبالَةُ: شێری چەموش.

الرِّيبَلُ: حوشتری گۆشتن ٥ ئافرەتی نەرمو نیان.

**المِرْبالُ**: زەوییەك كە ڕوەكی (رەبل)ی زۆر بێ ٥ (ك: مرابيل).

**أَربَبَةُ**: پێشەكی عەربوونی دایە.

**تَرَبَّنَ**: بوو بە كەشتییەوان.

**الأُرْبُونُ**: لۆغەتێكە لە (العُربون).

**الرُّبــــان**: ســــەرۆكی دەریاوانـــەكان، لێپرسـراوی كەشتییەوانەكان ٥ (ك: ربابين).

**رِبانُ كل شيئٍ**: زۆرینەی ئەو شتە.

**ربان الشباب**: سەرەتای گەنجییەتی.

**الرَّبانِيُّ**: بەمانا (الرُّبان)دێ.

**الرُّبُّون**: لوغەتێكە لە(العُربون).

**ربَا الشَّيْءُ رَبْواً ورُبُوّاً**: شـتەكە زیـادی كـرد گەشـەی كـرد، فـشەڵ بـوو هاوسـا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَتَـرَى الْـأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَـاء اهْتَـزَّتْ وَرَبَتْ﴾.

**رَبَا الفَـرَسُ**: ئەسپەكە خڕبـۆوە لەترسان یان خۆی ئامادەكرد بۆ بازدان.

**رَبَا الجُرْحُ**: برینەكە هاوسا.

**رَبَا الـسويقُ ونحوه**: قاوتەكە ئاوی پێـداكراو فشەڵ بوو.

**رَبَا في البيت ولِي بـني فـلان**: لـەماڵا گـەورە بـــوو یـــان لـــەناو هـــۆزی فـــلان دا پـــەروەردە بـــوو ٥ توشـــی نەخۆشـــی (رەبۆ) بوو.

**رَبَـــا الرَّابِيَـــةَ**: چـــووە ســـەر تۆپـــەڵاكی تەپۆڵكەكە.

**رَبِـي في بـني فـلان**: لـەناو هـۆزی فـلان دا پێگەیشت.

**أَرْبَى على الخمـسين**: لەپـەنجا تێپـەڕی ٥ پـتر لـەوەی دا بـووی وەری گـرت ٥ سوڕی خـوارد، یـان مامەڵەی ڕیبـای كـرد ٥ لەســـەر گردەكـــە ڕاوەســـتا، مایەوە.

**أَرْبَى الأرضُ**: زەوی پاك بۆوە.

**أَرْبَى الشَّيْءُ**: شتەكەی گەشە پـێ كـردو زیادی كرد.

**راباه**: نەرمو نیانی لەگەڵا نواند.

**رَبَّاهُ**: گەشەی پێ كرد.

**رابـي فلانـاً**: فلانكەسـی بـەخێو كـردو پێـــی گەیانـــد ٥ هێـــزو لایەنـــە جەستەیی و عەقڵی و رەوشـتی خـۆی پەرە پێدا.

**رابى الأُتْرُجَّ**: نارنجەكەی كرد بە روب و رەقی كرد خەستی كردەوە.

**تَرَبَّى**: پێگەیی و رۆشنبیر بوو.

**الرَّابِيـــة**: گردۆڵـــكە، تەپۆڵكــە، هێـــزو توانای زیاد لەسنور.

**الرِّبا**: زێدەو دوچەنـدان ٥ ئەو ئەنـدازە پارەیــەی قــەرزدار بــەزیادە دەیداتــە خـــاوەن قـــەرز بـــەگوێرەی چـــەند مەرجێك.

**الرُّباءُ**: منەتو پیاوەتی و ئەمەك.

**الرِّباءُ**: بەمانا (الرِّبا)دێ.

**الرُباةُ**: بەمانا گردو بەرزایی دێ.

**الرَّبْوُ**: بەمانا (الرابیة) دێ ٥ نەخۆشییەکە توشی بۆریەکانی هەناسە دەبێ بەناخۆشی هەناسە دەدا.

**الرَّبْوَةُ**: بەمانا (الرابیة) دێ ٥ کۆمەڵی ئادەمیزاد کەلە (دە) هەزار کەس زۆرتربن.

**المُرَبّی**: مرەبا کەلەمیوە دروست دەکرێ ٥ (ك: مُرَبّیات).

**رَتَأَ رُتوءً**: مایەوە، نیشتەجێ بوو.

**رَتَأَ البعیر رتأناً**: حوشترەکە هەنگاوەکانی کورت کورت هاویشتن.

**رَتَأَ فلاناً رتأً**: فلانکەسی خنکاند.

**رَتَأَ العقدةَ**: گرێیەکەی توند کرد.

**أرتَأَ**: بە نابەدڵی پێکەنی ٥ وەپێکەنینی هێنا.

**رَتَبَ رُتوباً**: جێگیر بوو لەشوێنی سامناكو ناخۆش.

**رَتَبَ فلان**: فلانکەس هەڵسایە سەرپێ ٥ دەوڵەمەندیش بووە کەچی سواڵ دەکا.

**رَتَبَ الشَیْءَ**: شتەکەی چەسپاند ٥ چەقاندی.

**رَتَّبَهُ**: شتەکەی چەسپاندو دانی پیانا، لەشوێنی خۆی داینا.

**أرتَبَ**: بەمانا (رَتَبَ)دێ.

**تَرَتَّبَ**: لەسەر ئەوە پەیدا بوو، لێوەی کەوتەوە ٥ لەسەرئەوە بنیات نرا ٥ بنیات دەنرێ.

**الراتِبُ**: دەگوترێ: (رزق راتب) رزقو رۆزییەکی بەردەوامو هەمیشەییە.

**الرُتْبَةَ**: پلەو پایە، یان پلەی بەرز کە دەوڵەت دەیدا بە کەسێك کەشیاوی رێز لێنان بێ.

**الرَّتَبَةُ**: پلە پەیژە، پلەی قالدرمە ٥ لوتکە شاخو دوندە بەرد کەلێك نزیك بنو هەندێکیان لەهەندێکیان بەرز تربێ ٥ تەپۆلکەی زەوی ٥ بۆشایی نێوان پەنجەکان ٥ تەنگو چەڵەمە ٥ کارەسات.

**المَرْتَبَةُ**: بەمانا (الرُتْبَةُ)دێ ٥ شوێنی چاودێری ٥ هەموو شوێنێکی ترسناك ٥ ئەرکی قورس، ئەو شوێنەی ژمارەی رەهاو موتڵەقی تێدایە نرخی تایبەتی خۆی هەبێ، دەگوترێ: پلەی یەکان، دەیان، صەدان، ...هتد.

**المُرَتَّبُ**: موچە.

**رَتَّ رَتّاً ورتّةً**: زمانی تورتی تێدابوو زمانی خواربوو، جۆرە بێگانەییەکی پێوە دیاربوو ٥ (هو أرتّ وهي رتاء).

**الأرتّ**: زمان تور.

**الرَّتّ**: سەرۆك، ریش سپی.

الرَّتَّــةُ: زمــان لاری‌و خــوارو خێــچی لەقسەکردن دا.

الرَّتّاءُ: ئافرەتی زمان لار.

رَتَجَ الصَّبِيُّ رَتَجاناً: منداڵەکـه سـەرکەوت بە قاڵدرمەدا.

رَتَجَ البابَ: دەرگاکەی داخست، (فهو أرتـج وهي رتجاء).

رَتَـجَ البَحْـرُ: دەریـا شـەپۆلی داو ئاوەکـەی زۆربوو هەموو شتێـکی داپۆشی.

رَتَجَتْ الدجاجةُ: مریـشکەکە هێلکـەدانی پڕبوو لەهێلکە.

رَتَجَتْ الـسنةُ: هـەموو ساڵەکە گرانـی‌و قات‌و قڕی بوو.

رَتَجَ الثلجُ: بەفرەکە وڵاتی گرت‌و مایەوە.

رَتَـجَ الخِـصبُ: هـەرزانی هـەموو وڵاتـی گرتەوە.

رَتَجَ الأتانُ: دێڵە کەرەکە ئاوس بوو.

رَتَجَ الباب: دەرگاکەی داخست.

أُرْتُـجَ عليـه: قـسەی پـێ نـەکرا، زمـانی گیرا.

الرِّتَـــاجُ: دەرگـــای گـــەورە ◊ دەرگـــا بەهەرشێوەیەك بێ.

الرِّتاجةُ: هەرشیوو دۆڵێـك تەسك بـێ ◊ درکە شاخ‌و بەردە زلە.

الرِّتَجُ: رێـگەی دەرنەچوو (مـال رِتـجٌ) ماڵێـکە یاساغە کەسی پێ ناگا.

الرِّتَجُ: دەرگای گەورە ◊ (ك: أرتاج).

المِرْتاجُ: قفـڵ‌و کێلون، پاشـکۆڵ ◊ (ك: مَرَاتِجُ).

رَتَــخَ العَجـــينُ والطـــينُ رَتْخــاً ورتوخــاً: هەویرەکە یان قوڕەکە تەنك بوو.

رَتَخَ بالمكان: لەو شوێنـە مایەوە.

رَتَخَ به: پێوەی نووسا.

رَتَخَ عن الأمر: لەئیشەکە دواکەوت.

أرتخ الحجامُ: کەڵەشاخگرەکە برینەکەی زۆر گەورە نەکرد.

الرُّتْخُ: پارچە وردەی پێست بەتایبـەتی کوتە وردە پێست.

الرُّتَخَـةُ: قـوڕی تونـدو قـاچ گـر (وەکـوو قوڕی مالوومە).

رَتَعَـتِ الماشِـيةُ رتعـاً ورتوعـاً ورتاعـاً: ئاژەڵەکـــە بـــەئارەزۆی خـــۆی لـــە لەوەڕگای خۆش دا لەوەڕا.

رَتَعَ في لحمه: پاشملە باسی کرد بەخراپە ◊ (هو راتِعٌ).

أرْتَـعَ: کەوتـە نـاو لـەوەڕگای خـۆش‌و زۆرەوە.

أرْتَـعَ المطـرُ: بارانەکـە ئەوەنـدەی گیـا ڕوانـد ئـاژەڵ پێـی تێربخـوا، تێـرە خۆری هێنا.

أرْتَـعَ المكـانُ: شـوێنەکە تێـرە خـۆری ئاژەڵی لـێ پەیدا بوو.

أرْتَـعَ إبِلَـهُ: حوشـترەکانی کردنـە نـاو پاوان‌و لەوەڕگای خۆشەوە بۆئـەوەی بەئارەزوی خۆیان بلەوەڕێن.

الرَّتّاعُ: ئەو کەسـەی شـوێن ئاژەڵەکانی

دەکەوێو دەیانباتە لەوەڕگای خۆشو فرەناوەوە.

**الرُّتعَةُ**: هەرزانیو هەبوونی لەوەڕگای بەرفراوان.

**اَلْمَرْتَعُ**: پاوانو لەوەڕگا بۆ ئاژەڵ.

**رَتَـقَ الـشَّيْءَ رَتْقـاً**: شـتەکەی پینـەکرد، کونەکـەی گـرت، لـەحیمی کـرد ◇ چاکی کردەوە، دەگوترێ: (رَتَقَ فَتقَهُ) دڕاوییەکـەی دوریـیەوە، چـاکی کـردەوە ◇ (رتـق فـتقهُمْ): ناخۆشـی نێـوان بنەماڵـەو خێزانەکـەی چارەسەر کرد.

**رَتقَـتِ المرأة**: بـیلا مانـێی ئافرەتەکـە کـوێر بۆتـەوە گیراوە کـاری ئاسـایی خۆی ناکا ◇ (هي رتقاء) ◇ (ك: رُتُقٌ).

**ارتتق الشَّيْءُ**: بەمانا (رَتَقَ) دێ.

**الرِّتاق**: دوو پارچە قوماش کە بەپرژی دامێنەکەیان پێکەوە بدورێنەوە.

**الرَّتْـقُ**: پێـکەوە نوسـاوو یەکپارچـە ◇ قورئان دەفـەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا﴾.

**الرُّتْقَةُ**: بۆشایی نێوان پەنجەکان ◇ (ك: رُتَقٌ).

**رَتَـكَ الـبعيرُ رتكـاً ورتكانـاً**: حوشـترەکە بەهەنگاوی کورت کورت غاری دا.

**أرتـك الـضاحك**: پێـکەنی بەناچاری، بەپناو بەبن پێکەنی.

**رَتِلَ رَتَلاً**: رێـكو پێـكو ریز بەستوو بون، جوان کەوتنە پاڵ یەك، دەگوترێ: (رَتِل الثَّغرُ أو الاسنان): پوكو دەمو ددانی جوانو رێكو پێك بوون.

**رَتَّلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی جوان رێکخستو هۆنیەوە.

**رَتَّلَ الكلامَ**: قسەکانی جوان رێکخستن، بـەجوانی خوێنـدیـەوە ◇ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا﴾ ◇ هەروا دەگوترێ: (ثَغرٌ مُرَتَّلٌ): ددانو پوکێکی رێكو پێكو جوانن.

**تَرَتَّـلَ**: دەگـوترێ: (تَرَتَّـلَ في كلامـه): درێـژەی بەقـسەکانی داو بەهێـدیو هێمنی قسەکانی گوتن.

**الرَّتْلُ**: بـۆنی خۆشـی هەرشـتێـك بـێ ◇ سـپیایەتی ددانو ئـاوی زار ◇ کۆمەڵێـك ئەسپو وڵاخە بەرزە یان ئوتومبێل کە بەشوێن یەکتردا ریز دەبن ◇ (ك: أرتال).

**الرَّتِلُ**: بۆنی خۆش لەهەر شتێك بێ ◇ قسەی جوان.

**الرُّتَيْلى**: جۆرێکە لەجاڵجاڵۆکە.

**الرُّتَيْلاءُ**: بەمانا (الرُّتَيْلى) دێ.

**رَتَمَـت المعـزى رَتْمـاً**: بزنەکـە ڕووەکـی رەتمی خوارد بـەهۆی زۆر خـواردنی گیای (رەتم) گێژو وێژ بووە.

**رَتَمَ** فلان: فلآنكەس جێگیر بوو، مایەوە.

**رَتَمَ في بني فلان**: لەناو هۆزو هۆبەی فلان خێزان دا پێگەیی ٥ بەنەسپایی قسەی کردن.

**رَتَمَ الشَّئَ**: شتەکەی شکاند، وردو هاڕی کرد.

**أرتَلَ الفصيلُ**: بەرخەکە دوگی گۆشتی هەڵگرت.

**أرتَلَ فلان**: فلآنکەس گرێی لەقامکی خۆی دا بۆئەوەی شتەکەی بێتەوە یادو لەبیری نەچێ.

**إرتَتَمَ**: گرێی لەقامکی خۆی بەست.

**تَرَتَّمَ**: بەمانا (ارْتَتَمَ) دێ.

**الرُّتَامُ**: ئێسكو پروسك ٥ ئێسقانی مردوو.

**الرَّتَمُ**: جۆرە ڕوەکێکی کێوییە، وادەبێ لەباخچەی مالآنیش دا بۆجوانی دەڕوێندرێ ٥ بەڵگەو دەلیل ٥ قسەی بەنەسپاییو لەسەرە خۆ.

**الرَّتَمَةُ**: دەزوێکە لەپەنجە دەبەسترێ بۆیاد کردنەوە.

**الرَّتِيمَةُ**: بەمانا (الرَّتَمَةُ) دێ ٥ (ك: رتائم).

**رَتَنَ الشحمَ بالعجين**: بەزو پیوەکەی تێکەلآوی هەویر کرد.

**المِرْتَنَةُ**: ئانە جەورە بەپیو ٥ (ك: مراتن).

**رتا الرجلُ رَتْواً ورُتُواً**: پیاوەکە هەنگاوی نا.

**رتا برأسه**: بەسەر ئاماژەی کرد.

**رتا بالدلو**: بەهێواشی دۆڵچەکەی داهێشتە خوار.

**رتا الشَّئَ**: هاویشتی، شلی کردەوە ٥ گرێیەکە یان ڕێشمەکەی شل کردەوە.

**رتا القَلْبَ**: دڵی بەهێز کرد ٥ لەحەدیث دا هاتووە: (انه يرتو فؤاد الحزين ويسرو عن فؤاد السقيم).

**رتا الشَّئَ اليه**: شتەکەی بۆلای خۆی کێش کرد.

**رُتِيَ**: دەگوترێ: (رُتِيَ في ذرعه) بالی بڕایەوە، قرتا.

**الراتي**: زانای خواناسو شارەزا لەزانستەکان دا ٥ (ك: رُتَاةٌ).

**الرُّتْوَةُ**: هەنگاو ٥ لەحەدیثی فاطیمە دا هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: (أدني يا فاطمة، فدنوت رتوةً ثم قال ادني يا فاطمةُ فدنوت رتوةً) ٥ هەروا بەمانا زێدە ڕێزو شکۆمەندی دێ ٥ گرێی شلو خاوکراوە ٥ ساتە وەخت ٥ دلۆپە ٥ مەودا بەئەندازەی بڕکردنی چاو.

**رَثَأَ البعيرُ**: حوشترەکە برینی لەناو شان هات، جەدەوی بوو.

**رَثَأَ الغَضَبُ**: رقو کینەکەی نیشتەوە.

**رَثَأَ الشَّيْءَ بالشَّيْءِ**: شتەكەی تێكەڵاوی شتەكە كرد، دەگوترێ: (رَثَأَ اللبنَ): ماستە ترش‌و شیرینەكەی تێكەڵاو كردو بزركا.

**رَثَأَ فلاناً**: لەفلانكەسی دا.

**رَثِئَ** الكبشُ رثأً ورُثاءَةً: بەرانەكە ڕەنگی خورییەكەی پەڵە پەڵە بوو ٥ (هو أرثأ وهي رَثآء).

**أرثأ اللَّبَنَ**: شیرەكە بزركا.

**ارتثأ في رأيه**: راو بۆچونەكانی تێكەڵ‌و پێكەڵ بوو.

**ارتثأ اللَّبَنُ**: شیرەكە بزركا.

**ارتثأ الرثيئةَ**: دۆی ترش‌و شیرینی تێكەڵ بەیەكی خواردەوە.

**الرَّثْءُ**: گێلی‌و نەفامی‌و كەودەنی.

**الرَّثأة**: دەردێكە توشی ناوشانی حوشتر دەبێ.

**الرَّثيئةُ**: بەمانا (الرَّثْءُ) دێ هەروا دۆی ترش كەتێكەڵ بەدۆی شیرین بكرێ‌و ببزركێ.

**المَرْثُوءُ**: كەسێك بێ ورەو ترسنۆك بێ ٥ گێل‌و نەفام بێ.

**رثَّ الثوبُ وغيره**: پۆشاكەكە كراسەكە رزی‌و دادڕ دادڕ بوو.

**رثَّ الرجلُ**: پیاوەكە شێوە ناشیرین‌و چڵكن بوو.

**أرَثَّ الثوبُ وغيرُهُ**: بەمانا (رَثَّ)دێ، دەشگوترێ: (أرَثَّ الرجلُ): پیاوەكە گوریسەكەی یان پۆشاكەكەی رزی.

**أرَثَّتْ هيئةُ الرجُلِ**: بەمانا (رَثَّ)دێ.

**إرْتَثُّوا رِثَّةَ القوم**: كۆنەو رزیوی ئەوخەڵكەیان كۆكردەوەو كڕییان.

**أُرْتُثَّ فلان**: فلان لەشەڕا پێكراو گوێزرایەوە بۆ دواوە، پاشان بەو برینە مرد (فهو مرتثٌّ) ٥ لەحەدیثی كەعبی كوڕی مالیك دا هاتووە: (أنَّهُ أُرْتُثَّ يوم أحد فجاء به الزبير يقود بزمام راحلته).

**الأرَثُّ**: رزیوو بێ كەڵك.

**الأرَثّ**: رزیو ٥ (ك: رُثٌّ).

**الرَّثُّ**: كاڵای خراپ ٥ خانوو لانەی بێ كەڵك‌و خراپ ٥ (ك: رثاث).

**الرِّثَّةُ**: بەمانا (الرَّثُّ) دێ ٥ ئافرەتی گێل‌و ئەحمەق ٥ ئادەمیزادی خوێڕی‌و هیچ‌و پوچ ٥ (ك: رِثَثٌ ورِثاث).

**الرَّثيثُ**: بریندارێك بەناستەم گیانی تێدا مابێ ٥ (ك: رِثاثٌ).

**رَثَدَ المتاعَ رَثْداً**: كاڵاكانی خستنە پەنا یەكتر بەڕیز یان خستنیە سەریەك.

**رَثَدَتْ الدُّجَاجَةُ بيضَهَا**: مریشكەكە هێلكەكانی كۆكردنەوە (هو مرثود ورثيد).

**رَثِدَ الماءُ رَثَداً**: ئاوەكە لیڵ بوو (هو رَثِدٌ وهي رثدة).

**أرْكَدَ الماءُ:** بەمانا (رَثَدَ)دێ.

**أرْكَدَ فلان:** زەوی هەڵکۆڵی تا گەیشتە قوڵایی زەوی.

**أرْكَدَ القومُ:** خەڵکەکە کۆبونەوە.

**ارتَثَدَ المتاعَ:** بەمانا (رَثَدَهُ)دێ.

**الرِّثْــــدُ:** کۆمەڵــــە ئادەمیزادێــــکی نیشتەجێ بوو ٥ (ك: أرثاد).

**الرَّثَــدُ:** کـالای ڕیزکـراو سـەفتەکراو، ٥ خانوی خراپ ٥ ئادەمیزادی زەبون‌و هـیچ لەدەسـت نـەهاتوو، دەگـوترێ: (تركنا على الماء رثداً).

**الْمَرْكَدُ:** پیاوی کەریم‌و ڕەوشت بـەرزو ســـەخی سروشـــت ٥ شـــێر ٥ (ك: مَراثِد).

**رَثِعَ رَثَعاً:** بەتەماع بوو چاو چنۆك بـوو ٥ بەبەخشـشی کـەم ڕازی بـوو، یـان بەبەشی خـراپ ڕازی بـوو ٥ دۆسـتی خراپی گرت‌و بوو بە هاوەڵی پیاوی خوێڕی ٥ ڕەوشتی ناشیرینی هەبوو.

**اِرْتَمَنَ:** بێهێزو لەش داوەشاو بوو.

**اِرْتَمَنَ المَطَرُ:** باران زۆر باری، بارانەکەی بەپیت بوو.

**اِرْتَمَنَ الشَّعْرُ:** قژی شۆڕ بۆوە.

**المُرْكَمِنُ:** لافاوی زۆرو بەتەوژم ٥ رادەرو ڕامالەر.

**رَثَمَ انْفَهُ أو فَمَـهُ رَثْمـاً:** لـوتی شـکاند دەمـی شـکاند، خـوێنی لێهێنـا، دەگـوترێ: (رَثَـمَ أحـد أعـضاء جـسمِهِ): یـەکێ لەئەندامی جەستەی شکاند خوێنی لێهێنا.

**رَثَمَتْ المـرأة أنفَهـا بالطيـب:** ئافرەتەکە بۆنی خۆشی لەلوتی دا.

**رَثِمَ فـلانٌ رَثَمـاً:** فلانکەس قسەکەی ڕون نــەکردەوە بــەهۆی نەخۆشــییەك کەلەزمانی دا هەیە.

**رَثِمَ الفَرَسُ:** ئەسپەکە لا لمـۆزی سپییە ٥ داغ‌و نیـشانی حوشـتر ٥ (هــو أرثَــمُ وهي رثماءُ) ٥ (ك: رُثْمٌ).

**الرُّثْمُ:** سپیایەتی لالمـۆزی ئەسـپ، یـان لمۆزی سەروی ئەسپ.

**الرِّثْمَــةُ:** وردەبـاران‌و بـارانی زەعیــف، دەگـوترێ: (بَلَغَــهُ رَثْمَــةٌ مــن الخــبر) سەرەداوێـکی هەواڵەکەی زانـی، بۆی گەیی.

**الرَّثِيمُ:** (رثيم الحصى): وردە بەرد.

**المِرْثَمُ:** لوت ٥ (ك: مَراثِمُ).

**المَرْثِمُ:** بەمانا (المِرْثَم) دێ.

**رَثَنَــتِ الرِّكْنَــةُ الأرْضَ:** زەوی بارانێــکی کەم‌و لاوازی وێکەوت.

**رَثَنَتِ الرِّثْنةُ الأرْضَ:** بەمانا (رثنتها)دێ.

**ترَثَّنَــت المـرأةُ:** ئافرەتەکـە دەم‌و چـاوی خۆی بەزەعفەران ڕەنگ کرد.

**الرِّثْنَــةُ:** بـەمانا (الرِّثْمَــةُ) دێ کەبـەمانا وردە بارانە.

**رَثَاهُ رَثْواً ورِثاءً**: بۆی گریاو ئاکاره چاکەکانی ژماردن.

**الرَّثْو**: ماستی شیرین تێکەڵ بکرێ بەهی ترش‌و بی بزرکێنێ.

**رَثَى** المیتَ رثیاً ورِثاءً ورثایة: بۆ مردووە کە گریاو لاواندیەوە، دەگوترێ: (رَثَاهُ بقصیدة): بەچامەیەك لاواندییەوە، (ورثاه بکلمة): بەوتارێك لاواندییەوە.

**رَثَى** لە: دڵی پێ سوتاو بەزەیی پێدا هاتەوە.

**رَثَى** عنه الحدیث رثایةً: قسەی لێوە گێرانەوە.

**رَثِيَ** رثیاً ورَثَىً: توشی بێ هێزی‌و خەمو خەفەت بوو ٥ توشی نەخۆشی دەردە جومزگەو رۆماتیزم بوو ٥ هەر نەخۆشییەك چوست‌و چالاکی ئینسان یەکبخا ٥ دوای مردنی لاواندیەوە ٥ وایە شێرەی بۆ گوت.

**الرِّثَایَةُ**: گریانی بەدەنگو رۆرۆ.

**الرَّثْیَةُ**: لاوازی‌و چەواشەیی، دەگوترێ: (فی أموره رَثْیة): کارەکانی لاوازی‌و خەمساردییان پێوە دیارە ٥ گێلی‌و نەفامی، ئازاری جومزگەو ئێسقان‌و ئەژنۆو سەرئێشە، نەخۆشی رۆماتیزم ٥ هەر نەخۆشییەك برست لەئادەمیزاد ببڕێ.

**الرَّثِیَّةُ**: بەمانا (الرثیّة)دێ.

**المَرْثَاةُ**: ئەو شیعرو پەخشان‌و لاوك‌و حەیرانەی مردوی پێ دەلاوێنرێتەوە ٥ (ك: مراث).

**أرْجَأت الحامل**: سکپڕەکە نزیکە بزێ‌و سکەکەی دابنێ.

**أرْجَأ الصائدُ**: نێچیروانەکە هیچی دەست نەکەوت.

**أرْجَأ الأمرَ**: کارەکەی دواخست، ماوەیەکی تری بۆ دیاری کرد.

**المُرْجِئَةُ**: فیرقەیەکی ئیسلامین هیچ بڕیارێك دەربارەی موسوڵمانان دەرناکەن، بەڵکوو هەموو شتێك هەڵدەگرن بۆ رۆژی دوایی‌و بۆ قیامەت ٥ ئەوان پێیان وایە کەسێك ئیمانی هەبێ تاوان زەرەری نییە بۆی ٥ کەسێك کافربێ تاعەت کەڵکی نییە.

**رَجَبَ** رَجْباً ورجوباً: ترسا ٥ شەرمی کرد.

**رَجَبَ** فلاناً رجباً: فلانکەسی ترساند ٥ لێی ترساو پێی سەرسام بوو.

**رَجَبَ** فلاناً بقول سیّئ: بوختانی بەفلانکەس کرد، قسەی ناشیرینی بۆ هەڵبەست.

**رَجِبَ** رجباً: لێی ترسا، بەشکۆمەند هاتە پێش چاوی، پێی سەرسام بوو.

**أرْجَبَ فلاناً**: بەمانا (رَجَبَهُ)دێ.

رَجَبَ الرَّجُلُ: لەمانگی رەجەب دا پیاوەکە کوشتی سەربڕی لەلای بت و صەنەم ◊ قوربانی بۆبت کرد.

رَجَبَ الإنسانَ وغَيْرَهُ: ئادەمیزاد یان شتی تری بەگەورە زانی و بچوکی خۆی بۆ دەرخست.

رَجَّبَ النَخْلَةَ: کۆڵەکەی بۆ دارخورماکە چەقاند بۆئەوەی ببێتە پاڵپشتی و بەئاسانی بانەیشکێنێ، یان لقەکانی کۆکردنەوەو بەحەبل و لیفی خوص و شتی وا شەتەکی دا بۆئەوەی رەشەبا یاری بەلقەکان نەکا ◊ دەوری دارخورماکەی بەچقڵ و شتی وا پەرژین کرد بۆئەوەی کەس توخنی نەکەوێ.

رَجَّبَ الكرمَ: تولەی میوەکە رێک و پێک کردن و خستنیە شوێنی خۆیان.

الأرجاب: ریخۆڵە.

الرَّاجِبَةُ: جومگەی پەنجەکان.

الرَّواجِبُ: وەتەرەکانی شوێنی لێ دەرچوونی زەرەی گوێلرێژ.

رَجَبٌ: ناوی یەکێکە لەمانگەکان دوامانگی جیمادی الآخرة پێش مانگی شەعبان دێ ◊ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (عِش رجباً ترعجباً): چەند مانگە رەجەبێکی یەك لەدوایەك بژی شتی سەیر دەبینی.

الرُّجْبُ: سەری پەراسو بەلای سنگەوە ◊ (ك: أرجاب).

الرُّجْبَةُ: ئەو شتەی دەگرێتە کۆڵەکەو پاشکۆڵ بۆ دارخورما ◊ کۆخیتەی راوکەر.

الرَّجَبِيَّةُ: ئەو ئاژەڵەی لەمانگی رەجەب دا سەردەمی پێش ئیسلام بۆ بت و صەنەم سەردەبڕان ◊ دیدەنی کردنی شاری مەدینە لەمانگی رەجەب دا.

رَجَّهَ رجّاً ورجَّةً: رایوەشاندو هەڵی تەکاند بەهەمموو هێزی خۆی هەژاندی ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِذَا رُجَّتِ الْأَرْضُ رَجًّا﴾.

رَجَّ فلاناً عن الشّيئ: فلانکەسی لەوشتە مەنع کرد.

رَجَّ الشّيئُ: شتەکە کەوتە هەڵبەزو دابەز ◊ (هور أرجَ وهي رجّاءً) ◊ (ناقة رجّاء): حوشتری دووگ گەورە.

أرَجَّت الحامِلُ: ئافرەتە دوگیانەکە نزیکە منداڵی ببێ سکەکەی دابنێ.

إرْتَجَّ: کەوتە جم و جوڵ و هەژان.

إرْتَجَّ البحرُ: دەریا کەوتە شەپۆل دان.

إرْتَجَّ الكلام والظلام: قسەکان تێکەڵ و پێکەڵ بوون، شتەکان گوم بوون و پەردە پۆش کران.

الإرتجاج: لەزانیاری پزیشکی دا بریتییە

لەوەی مێشك كاری خۆی بەباشی
ئەنجام نەدا لەناكامی صەدمەو
وێكەوتنی شتێكی قورس پێی.

**الرَّجَّاجُ**: خەلْكانی زەعیفو ورە نزمو
خوێڕی، یان ئاژەڵی ناپەسەندو
خراپو بێ خێر ٥ بی شیرو كزو
لاواز.

**الرَّجَّاجَةُ**: لانەی شیرین.

**الرُّجاجة**: لەعیلمی كیمیادا ئامێرێكە
بۆ راوەشاندنو تێكەڵدان بەكاردێ.

**الرَّجَّةُ رَجَّة القوم**: قاوو قیژو قیرەو
هەراو تێكەلاو بوونی دەنگیان.

**رِجَّةُ الرعد**: دەنگو گرمەی هەور.

**رَجَحَ الشَّيْئُ رجحاً ورجحاناً ورجاحة**:
شتەكە سەنگین بوو، پەسەند بوو،
دەگوترێ: (رجحت إحدى الكفتين
الأخرى) لایەكی تەرازو بەسەر
لایەكەی تری دا پاساوی هەبوو.

**رَجَحَ في مجلسه**: لەكۆڕەكەدا سەنگین بوو
بەقورس لێیان ڕوانی.

**رَجَحَ عقله او رأيُهُ**: عەقڵو ئاوەزی
تەواو بوو رایەكەی تەواو بوو.

**رَجَحَ الشَّيْئَ بيده**: شتەكەی بەرز
كردەوە بۆ ئەوەی بزانی قورسایی
چەندە.

**رَجَحَ فلاناً**: لەعەقڵو رەوشت جوانی دا
بەسەر فلان دا بالاْ دەست بوو، (قول
راجح): قسەی پەسەند، (رأي
راجح): رای پەسەند.

**أرْجَحَهُ**: وای لێ كرد راجیح بێ.

**رَجَّحَ الميزانَ**: تایەكی تەرازوەكەی قورس
تر كرد تا سلاوی پێ دایەوە.

**رَجَّحَ فلاناً وله**: بەخششی زیاتری دا
بەفلانكەس.

**راجَحَهُ**: پێشبڕكێی لەگەڵ دا كرد
لەرووی پەسەندییەوە، دەگوترێ:
(راجحَهُ فرجَحَهُ).

**رَجَّحَهُ**: بەمانا (أرجَحَهُ) دێ ٥ پاساوی
دایەوە، پەسەندی كرد.

**إرْتَجَحَ الشَّيْئُ**: بەمانا (رَجَحَ)دێ ٥
هەروا بەمانا وردو هاڕبونو
خواربونو لادان دێ ٥ بەمانا هاتوو
چۆ دێ، دەگوترێ: (إرتجحت به
الأرجوحة): جۆلانەكە هێنایو
بردی.

**إرْتَجَحَ الروادفُ**: سمتەكان لەرینەوە.

**تَرَجَّحَ**: لەرزیو كەوتە جمو جۆڵ.

**تَرَجَّحَ الرَّأْيُ عنده**: لەلای ئەو ئەو رایە
پەسەند بوو پاساوی دا بەسەر
راكەی تردا.

**الأُرجُوحة**: جۆلانە بەدوو حەبل یان
بەدوو زنجیر بەبەرزییەوە دەبەسرێ
بەزۆری منداڵ سواری دەبنو
رادەژێو دێو دەچێ ٥ ناوێكیشە بۆ
سارا لەم ڕووەوە كە ڕێبوار تێیدا
دێو دەچێ ٥ (ك: أراجيح).

**الرَّاجِحُ**: لەزاراوەی فەلسەفی دا ئەوەیە

بوونی لەنەبوونی گونجاو تربێ‌و جێگای قبوڵ بێ، یان ڕاستییەکەی وێچوتربێ لەدرۆی.

**الرَّجَّاحُ:** ئافرەتی سمت‌و کەفەڵ گەورەو گۆشتن ٥ (جفنة رجَاح): سوێنەیەکی پڕ ٥ (امرأة رجَاح): ئافرەتێکی ئاقڵ‌و هۆشیار ٥ (کتیبة رجَاح): راکێشەرێکی قورس‌و بەهێز ٥ (ك: رُجُحٌ).

**الرَّجَّاحَةُ:** بارقوڵی‌و لەسەرەخۆیی.

**الرُّجاحَةُ:** جۆلانە، حەبلی جۆلانە ٥ هەروا بەمانا (الرَّجَاحَة)دێ ٥

**الرُّجحانيـة:** لەبواری فەلسەفەدا مەزهەب‌و ڕێبازێکە پەیڕەوکارەکانی پێیان وایە گەیشتن بەیەقین مەحاڵە.

**المِرْجَاحُ:** ئادەمیزادی هێدی‌و لەسەرەخۆ ٥ درەختێك بەری قورس بێ ٥ کەسێك لەرۆیشتن دا خۆبداو لەنجەو لار بکا، دەگوترێ: (جمل مِرْجاح وناقة مرجاح).

**المَرْجُوحَـةُ:** بەمانا (الأرجوحة) دێ ٥ (ك: مراجيح).

**إرْجَحَنَّ:** قورس بوو مەیەلان‌و لاژانەوەی کرد، لەرزی، دەگوترێ: (إرْجَحَنَّ الرِّدْفُ) سمتی لەرەلەریان کرد ٥ (إرْجَحَنَّت الرّحی): ئاشەکە کەوتە جم‌و جۆڵ، بلاو بۆوە، ولاتی تەنیەوە، دەگوترێ: (إرجَحَنَّ الجيشُ).

**رَجَدَ القَمْحَ رجداً ورجاداً:** کرشەو گەڵێشەکانی لەپەرێزەوە گواستەوە بۆ سەر خەرمان بۆ گێرە کردن.

**رَجْرَجَ الشَّيْئُ:** شتەکە جولایەوە، کەوتە هەژان.

**رَجْرَجَ فلان:** فلانکەس ماندوو بوو، برستی لی برا.

**رَجْرَجَ الشَّيْئَ:** شتەکەی راوەشاندو هەڵی تەکاند.

**رَجْرَجَ البئرَ:** گڵی بیرەکەی دەرهێنا.

**تَرَجْرَجَ الشَّيْئُ:** شتەکە کەوتە هەژین‌و جم‌و جۆڵ.

**الرَّجراجُ:** شتێك بهەژێ‌و هەڵتەك‌و داتەك بکا، دەگوترێ: (بحر رَجْراجٌ): دەریای شەپۆلاوی‌و چەموش ٥ (ناس رَجْراج): کەسانێك بێ عەقڵ‌و بیر تەسك‌و هیچ لەدەست نەهاتوو.

**الرَّجْرَاجَةُ:** (کتيبة رجراجة): کەتیبەکە لەبەر زۆری ئالیاتەکانی زۆر بەناخۆشی دەکەوێتە جوڵە ٥ (جارية رَجْراجَة): ئافرەتێکە سمتی شورابەیان کردوە هێندەیان گۆشت پێوەیە.

**الرِّجْرِجَةُ:** باقی ماندەی ئاوی لێڵ‌و

تێــکەڵ بــەقورە لیتــە کــە لــەبنکی حــەوزی ئــاودا بمێنێتــەوە ٥ لیــك ٥ کۆمەڵی زۆر لەشەڕدا ٥ (ك: رجارِجُ).

**رَجَـــزَ الرَّجـــزُ رجـــزاً**: هۆنراوەیــەکی خوێنــدەوە، هۆنیــەوە، دەگــوترێ: (رجز به): هۆنراوەی بـۆ هۆنیـەوە ٥ (هو راجز، ورجّاز، ورجّازة).

**رَجَزَتْ الريح بينهم**: بایەکـە لـەناویان دا بەردەوام بوو.

**رَجِـزَ الجَمَـلُ رَجَـزاً**: حوشـترەکە لـەکاتی هەڵــسان دا قاچــەکانی لـــەرزین بەهۆی نەخۆشی (ڕەجەزەوە) ٥ (هو أرجز وهي رَجْزاء).

**رَاجَـزَهُ**: لـەدانانی شیعر لەسـەر شێوەی ڕەجەز پێشبڕکێی لەگەڵ دا کرد.

**رَجَّزَهُ**: هۆنـراوەیەکی بۆ خوێندەوە.

**ارتَجَزَ الرَّاجِزُ**: هۆنـراوەیەکی گوت.

**ارتَجَزَ القومُ**: خەڵکەکە لەناو خۆیـان دا شـیعری شـێوە ڕەجـەزیان بۆیـەکتر خوێندەوە.

**ارتَجَزَ الرعدُ**: هەورەکە گۆڵەو گرمـەی یەك لەدوایەکی لـێ بیسترا.

**تراجَـزَ القَـومُ**: بـەمانا (ارتَجَـزُوا) دێ ٥ کێشەیان تێکەوت.

**تَرَجَّزَ الحادي**: حودیـە خـوێن حودیـەی بەشــێوەی ڕەجــەز خوێنــدەوە ٥ حودیە گۆرانییەکە ٥ (ترجّز الرعْدُ): هەور دەنگی لـێ بیسترا، گرماندی.

**ترجّـز الـسحابُ**: هەورەکـە بەهێواشـی ڕۆیــی چــونکە بــاری گــران بــوو بەباران.

**الأرجوزة**: هۆنـراوە لەبـەحری ڕەجـەز ٥ (ك: أراجيز).

**الرّاجِـزُ**: ئـەو کەسـەیە شـیعری شـێوە ڕەجـــەز دەخوێنێتـــەوە یـــان دەیهۆنێتەوە.

**الرِّجَـازَةُ**: شتێـکە وەکـوو کـەژاوە بـەڵام لـەو بـچوکترە ٥ هـەروا ئـەو گـۆزو گوڵێنکـە بەنمیـە کەکـەژاوەی پـێ دەڕازێنـدرێتەوە ٥ (ك: رجائز).

**الرِّجَاز**: بەمانا (الرّاجز)دێ.

**الرِّجْـزُ**: تـاوان ٥ سـزا ٥ بتپەرسـتی ٥ هاوەڵدانان بۆ خودا.

**رِجــزُ الــشيطان**: وەسوەســەو ختوکــەی شەیتان.

**الرَّجَـزُ**: دەردێـکە توشـی حوشـتر دەبـێ بـەو هۆیـەوە لـەکاتی ڕاسـتبونەوەدا سمتـــی دەلـــەرزن ٥ بەحرێـــکە لەبـــەحرەکانی شـــیعر بنـــەمای کێشەکەی شەش جار (مستفعلن)ە.

**رَجَـسَ صـوت الرعـد أو الجـيش رَجْـساً**: دەنگـەکان تێـکەڵ بـونو دەنگەکـە گەورە بوو.

**رَجَسَ البعيرُ**: حوشترەکە بەخێراییو توند بۆڕاندی.

**رَجَسَ السماءُ**: هەورەکانی ئاسمان بـەهێز گرماندیان.

**رَجَسَ فلان**: فلانكەس ئەندازەی ئاوی بیرەكەی بەمیرجاس مەزندە كرد ە (مانای میرجاس لەمەدوا دێ).

**رَجَسَ فلاناً عن الأمر**: فلانكەسی لەكارەكە مەنع كرد لەمپەری بۆدانا ە (هو راجس ورجّاس).

**رَجَسَ رَجَساً ورَجَاسَةً**: پیس بوو، شتی پیسی هێنا، چووە لای شتی پیس.

**رَجُسَ الشَّيْءُ رَجَاسَةً**: شتەكە قێزەون بوو.

**رَجُسَ فلان**: فلان كاری ناشیرینی كرد.

**أَرْجَسَ فلان**: فلان ئاوی بیرەكەی بەمیرجاس مەزندە كرد.

**ارتجست السماءُ**: بەمانا (رَجَسَتْ)دێ.

**ارتجس البِناءُ**: باڵەخانەكە كەوتە شەقە تۆڵەو هەژان ە لەحەدیثی سوطەیح دا هاتووە: (لما ولد صلى الله عليه وسلم إرتجس أيوان كسرى).

**ارتجس أمْرُهُ**: كارەكەی شێواو لێی تێك چوو.

**الرَّجْسُ**: دەنگی بەهێزو گەورە ە (ورَجْسُ البعير): بۆڕەی حوشتر.

**الرِّجْسُ**: قێزەون، شتی پیس، كاری خراپ، حەرامو یاساغ ە نەفرەت ە كوفر ە سزاو تۆڵە ە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يَعْقِلُونَ﴾.

**رجس الشيطان**: ختوكەو دەنەدانو وەسوەسەی شەیتان ە (ك: أرجاس).

**المِرْجَاسُ**: بەردێكە حەبلی بەسەرێكیەوە دەبەسترێو دادیلدرێتە ناو بیری ئاوەوە ڕادەوەشێندرێ بۆ ئەوەی لیتەی بنكی بیرەكە ببێتە قوڕاوو هەڵگۆزرێ، هەروەها ئەندازەی ئاوی ناو بیرەكەشی پێ مەزندە دەكرێ، قوڵی بیرەكەشی پێ دەزاندرێ ە (ك: مراجيس).

**الْمَرْجُوسَةُ**: دەگوترێ: (هم في مرجوسة من أمرهم) ئەوان سەریان لێ شێواوەو شتەكەیان لێ تێكەڵو پێكەڵ بووە هەردێنو دەچن.

**رَجَعَت الطيرُ رجوعاً ورجاعاً**: باڵندەكان لەشوێنە گەرمەكانەوە گەڕانەوە بۆ كوێستانەكان.

**رَجَعَ الشَّيْءُ**: شتەكە سودی بوو، دەگوترێ: (رجع فيه كلامي): قسەكەم كاری تێكردو سودی بوو بۆی.

**رَجَعَ الكلبُ في قيئِهِ**: سەگەكە ڕشوی خۆی خواردەوە.

**رَجَعَ فلاناً عن الشَّيْءِ واليه رَجْعاً ورُجُوعاً ورجعاناً**: فلانكەسی لادا لەوشتە، یان گێڕایەوە بۆلای ە قورئان دەفەرموێ: ﴿فَإِن رَّجَعَكَ اللّهُ إِلَى طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَاسْتَأْذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ﴾.

**أَرْجَعَ فلان:** فلانکەس دەستی خۆی بردنە پاش خۆی بۆئەوەی شتێك هەڵبگری.

**أَرْجَعَ الرجلُ أو الدابَّةُ:** پیاوەکە یان وڵاخەکە پیسایی کرد.

**أَرْجَعَتْ الناقةُ:** حوشترەکە لاواز بوو دوایی قەڵەو بوو.

**أَرْجَعَ فلاناً:** فلانکەسی گێڕایەوە، رەتی کردەوە.

**أَرْجَعَ الله بيعتَه:** خودا خێرو بێری خستە مامەڵەکەیەوە.

**رَاجَعَ فلاناً في أمره مراجَعةً ورجاعاً:** تەگبیرو رای بەفلان کردو راو بۆچونی لەگەڵ دا گۆڕییەوە.

**رَاجَعَ الكتابَ:** بەکتێبەکەدا چووەوە، بۆی گەڕایەوە سەیری کرد تێی روانی.

**رَاجَعَ الكتابَ أو الحسابَ:** جارێکی تر بەحیسابەکە دا چووەوە.

**رَاجَعَ زَوْجَتَهُ:** دوای تەڵاقدان ژنەکەی سەر لەنوێ هێنایەوە ژێر نیکاحی خۆی.

**رَاجَعَ فلاناً الكلامَ:** وەڵامی فلانی دایەوە، کێشەو دەمە دەمێی لەگەڵ دا کرد ە وای لێ کرد قسەکە دوبارە بکاتەوە.

**رَجَّعَ عند المصيبة:** لەکاتی بەڵاو موصیبەت دا وتی: (إنا لله وإنا إليه راجعون).

**رَجَّعَ صَوْتَهُ:** لەقورگی دا دەنگی خۆی لێ دایەوە، لەراندیەوە.

**رَجَّعَ فلانٌ:** لەخوێندنەوەدا دەنگی خۆی لەراندەوەو درێژەی پێدا.

**رَجَّعَ المؤذنُ في آذانه:** بانگێژەکە شایەتومانەکەی دوبارە کردەوە دوای ئەوەی بەلەسەر خۆیی گوتنی.

**رَجَّعَ الحَمَامُ:** کۆترەکە خوێندنەوەکەی بڕبڕ کرد.

**رَجَّعَ النقش والكتابةَ:** بەسەر نووسینەکەدا چووەو نوسینەکەی تۆخ کردەوەو چەند جارێك پێی دا چووە.

**اِرْتَجَعَ على الغريم والمتَّهم:** داوای لەقەرزدارو تاوانبارەکە کرد.

**اِرْتَجَعَ الشَّيْءَ اليه:** شتەکەی بۆ گێڕایەوە بردییەوە بۆلای.

**اِرْتَجَعَ به شيئاً:** شتەکەی بەوە گۆڕییەوە.

**اِرْتَجَعَ المراةَ:** ئافرەتەکەی ریجعە کردەوەو دوای تەڵاق بردییەوە ژێر نیکاحی خۆی.

**اِرْتَجَعَ الناقةَ:** حوشترەکەی کڕی بەنرخی حوشترەکەی تری وەکوو ئەو.

**اِرْتَجَعَ المرأةُ جلبابها:** ئافرەتەکە

چارەکەکەی هەڵدایەوە بۆ سەر دەمو چاوی خۆی، خۆی پێ داپۆشی.

**تراجع القومُ:** خەڵکەکە گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان.

**تراجع القوم الكلام بينهم:** خەڵکەکە قسەکەیان خستە بەر لێکۆڵینەوەو وتو وێژ.

**تَرَجَّعَ فلان:** بەمانا (رَجَّعَ)دێ.

**تَرَجَّعَ في المصيبة:** لەکاتی بەلاو ناخۆشیدا وتی: (إنا لله وإنا إليه راجعون).

**تَرَجَّعَ في صدري كذا:** ئەوە لەدڵما هاتو چۆی کرد.

**تَرَجَّعَ الناقة:** بەنرخی ئەو حوشترە حوشترێکی تری کڕی.

**استرجع عند المصيبة وفيها:** لەکاتی بەلادا وتی: (إنا لله وإنا إليه راجعون).

**استرجع الحمامُ في شدوه:** کۆترەکە خوێندنەکەی خۆی بڕی.

**استرجع الشَّيْءَ:** شتەکەی ڕەتکردەوە، وەری گرتەوە.

**الرَّاجِعُ:** ئافرەتێك دوای مردنی مێردەکەی، بچێتەوە سەر ماڵی باوك‌و کەس‌و کاری ◦ (ك: رواجعُ).

**الرَّاجعةُ:** زەلکاوو گۆماو ◦ جۆرێکە لە لەرزوتا بە نۆرە بەیناو بەین توشی نەخۆش دەبێ ◦ (ك: رواجع).

**الرياح الرَّواجع:** بایەك شوێنی لێهاتن‌و ڕۆیشتنی جوداواز بێ.

**الرِّجاعُ:** ڕیشمەو هەوسار ◦ ئەو بەشە هەوسارەی دەکەوێتە سەر لمبۆزی وڵاخەکە ◦ (ك: أرجِعَة ورُجُعٌ).

**الرَّجْعُ:** ڕیخ‌و زبڵ ◦ ئەو شلەمەنییەی پێش هاتنەدەری سەری منداڵ لەکاتی لەدایکبوون دا دێتە دەرێ‌و لەچڵم دەچێ ◦ ئاو ◦ بارانی دوا باران ◦ قازانج‌و سود ◦ زەلکاوو گۆماو ◦ وەڵامدانەوەی نامە ◦ دەنگدانەوەی دەنگ ◦ گیا بەهارە◦ لای خواروی شان◦(ك:رجاع و رُجْعان).

**الرُّجْعَى:** گەڕانەوە ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِلَى رَبِّكَ الرُّجْعَى﴾ ◦ وەڵامدانەوەی نامە، دەگوترێ: (جاءني رجعى رسالتي).

**الرَّجْعَةُ:** گەڕانەوەی پیاوی تەڵاقدەر بۆ هاوسەری لەگەڵ ژنە تەڵاقدراوەکەی دا ◦ مەزهەب‌و بیرو بۆچونی ئەوانەی پێیان وایە دوای مردن سەر لەنوێ دەگەڕێنەوە بۆ ژیانی دونیا ◦ لەزاراوەی (أحیا)دا بریتییە لەگەڕانەوە بۆ ژیان دوای مردنێکی ڕواڵەتی یان خەفە بوون.

**الرُّجْعَةُ:** وەڵامی نامە.

**الرَّجْعِيُّ:** (الطلاق الرَّجعي): ئەوەیە بۆ مێرد دروستە ژنە تەڵاقدراوەکەی

بگێڕێتەوە بۆ ژێر نیکاحی خۆی بەبێ گرێبەستی مارەیی سەر لەنوێ.

**الرَّجْعِيَّةُ**: کۆنەپەرستی، مانەوە لەسەر بیرو باوەڕو دابو نەریتی کۆنو هەڵنەکردن لەگەڵ پێشکەوتنی باری ژیانو گۆڕانکاری ڕۆژگار.

**الرَّجِيعُ**: زبڵو زاڵو پیسایی، هەر قسەو بیرو باوەڕێك کە پەسەند نەبی ○ (کلام رجیع): قسەی ڕەد کراوە بۆ خاوەنی ○ (حبل رجیع) گوریسێك سەرلەنوێ هەڵوەشابێتەوە.و جارێکی دی ڕێسرا بێتەوەو کرابێتەوە بە گوریس ○ (طعام رجیع) خۆراکی سەرلەنوێ گەرم کراوە ○ (بعیر رجیع): حوشتری ماندوو شەکەتی ڕێگا ○ گیاو گژی بەهاران ○ کاوێژی حوشتر ○ پۆشاکی ڕزیو ○ عەرەق ○ زەلکاوو گۆماو ○ (رجیع الفحم): خۆڵە پەتەی خەڵوز دوای گەشانەوەی ○ (رجیع الأرز): ئاردە برنج.

**الرَّجِيعَةُ**: حوشتری ماندوو شەکەتی سەفەر ○ (ك: رجائع).

**المَرْجِعُ**: بەمانا (الرُّجوع) دێ ○ شوێنی گەڕانەوە ○ بنەما ○ لای خواروی شان، شەپیلك ○ مامۆستاو ڕێبەر لە بواری ئەدەبو زانست دا ○ سەرچاوەی نووسراو، وەکوو دائیرەتولمەعاریفو قاموس.

**المُرْجِعَةُ**: (سفرة مرجِعَةٌ): سەفەرێك خێرو بێری تێدابێو سەرەنجامی باشی هەبێ.

**المَرْجُوعُ**: گەڕاوە، دەگوترێ: (ثوب مرجوع) و(خبر مرجوع) (نقش مرجوع) نووسراوەکە تۆخ کراوەتەوە ○ مۆرەکە تۆخ کراوەتەوە ○ وەلامی نامە ○ کالای گەڕاوەو نەفرۆشراو.

**المرجوعَةُ**: بەمانا (المرجوع) دێ.

**رَجَفَ رَجْفاً ورجوفاً ورجيفاً ورَجَفاناً**: لەرزی، هەژا کەوتە شەقەتۆڵە.

**رَجَفَ فلان**: فلانکەس ترساو لەهەیبەتا ئەژنۆی شکان.

**رَجَفَتْ يده**: بەهۆی نەخۆشی دەستی لەرزی یان لەبەر پیری.

**رَجَفَ القلب**: لەترسا دڵی کەوتە تەپە تەپ.

**رَجَفَ القومُ**: خەڵکەکە خۆیان ئامادەکرد بۆ شەڕ.

**رَجَفَتْ الأرض**: زەوی کەوتە لەرزینو هەژانو شەقەتۆڵە.

**رَجَفَ الرَّعدُ**: هەورەکە دەنگی دایەوەو گرمەکەی دووبارە بۆوە.

**رَجَفَتْ الأسنان**: ددانەکان کەوتن، هەڵوەرین.

رَجَفَ البحر: دەریا کەوتە شەپۆلدانو هەژان.

رَجَفَ الحميُّ فلاناً: لەرزو تاکە فلانی هێنایە لەرزینو شەپلە.

رَجَفَ الشَّيْءَ: شتەکەی خستە جمو جۆڵ ٥ (هو راجف ورجّاف ورجوف).

أرجف: بەمانا (رَجَفَ) دێ.

أرجف القومُ: خەڵکەکە کەوتنە بلاوکردنەوەی هەواڵی درۆو دەلەسەو پرو پاگەندەی بێ سەرو بەر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ﴾.

أرجفتْ الأرضُ: زەوی کەوتە هەژانو شەقە تۆلە.

أرجفتْ الريحُ الشَّيْءَ: بایەکە شتەکەی جولاندەوە.

إرتَجَف: دەستی کرد بە لەرزینو کەوتە شەقە تۆلە.

أسترجَفَ رأسَهُ: سەری لەرزاند، سەری بادا.

الإرجاف: هەواڵی درۆو سەرنج راکێشو فیتنە جۆ ٥ (ك: أراجيف).

الأراجيف في السوق: پروپاگەندەی بازاریانە بۆ گۆڕینی نرخی کالا.

الرّاجِفَةُ: فوکردن بەکەڕەنادا لەرۆژی قیامەت دا.

الرَّجّافُ: دەریا، رۆژی قیامەت.

الرَّجف: وێکهاتنەوەو لەرزینێکە لەماسولکەکانی جەستەدا پەیدا دەبێ، جگە لە ماسولکەی دەمو چاو.

الرَّجْفَةُ: شەقەتۆلەو لەرزینی توند ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ﴾.

رَجَلَهُ رَجْلاً: قاچی هەنگاوت.

رَجَلَ الشَّاةَ: مەڕەکەی بەقاچی بەستەوە ٥ بەقاچی هەڵیواسی.

رَجَلَتْ المرأة ولدها: ئافرەتەکە منداڵی بوو بەشێوەیەك قاچی پێش سەری هاتنە دەرەوە.

رَجِلَ رجلاً ورُجْلَةً: قاچی گەورە بوو ٥ لەسەر دووقاچی رۆیشت ٥ توانای رۆیشتنی پەیداکرد ٥ هاواری ئازاری قاچی کرد.

رَجِلَ الحيوان: ئاژەڵەکە لەقاچێکی دا پەڵەی سپی هەبوون ٥ (فهو أرجل وهي رَجْلاء).

رَجِلَ الشَّعْرُ: مووەکان مامناوەندی بوون نەزۆر گرژ نەزۆر خاو بوون.

أرْجَلت المرأةُ: ئافرەتەکە کوڕی بوو (فهي مُرْجِلٌ).

أرْجَلَ فلاناً: وایکرد فلان بەقاچ بڕوا ٥ مۆڵەتی دا بۆ ماوەیەك.

رَجَّلَهُ: بەهێزی کرد.

**أَرْجَلَ الشَّعْرَ**: قژەکانی داهێنان و ڕێک و پێکی کردن، رازاندنیەوە.

**إرتَجَلَ**: لەسەر قاچ ڕۆیشت ◦ تاک ڕەوی نواندو رای خۆی پێ پەسەند بوو گوێی بەرای کەسی تر نەدا.

**إرتَجَلَ الطَّبّاخُ**: کێشت لێنەرەکە لەدیزەدا کێشتی لێ نا.

**إرتَجَلَ النَهارُ**: ڕۆژ درەنگ بوو.

**إرتَجَلَ الشاةَ**: مەڕەکەی بەقاچ بەستەوە.

**إرتَجَلَ الشَّيْئَ**: شتەکەی خستە ژێر قاچیەوە.

**إرتَجَلَ الكلامَ**: بەبێ لێ ورد بوونەوەو بیر کردنەوە قسەی کردو وتاری دا.

**تَرَجَّلَ**: لەسەر قاچی ڕۆیشت.

**تَرَجَّلَ الراكِبُ**: سوارەکە دابەزی و بەقاچ ڕۆیشت.

**تَرَجَّلَتْ المرأةُ**: ئافرەتەکە لاسایی پیاوی کردەوەو هەڵس و کەوتی ئەوانی پەیڕەو کرد ◦ پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: (لعن الله المترجلات من النساء) خودا نەفرینی لەو ئافرەتانە کردووە کەلاسایی پیاو دەکەنەوە ◦ لەپۆشاک و ڕوخسارو هەڵس و کەوت دا.

**تَرَجَّلَتْ الشَّمسُ**: خۆر هەڵکشا ◦ (تَرَجَّلَتْ النهارُ): ڕۆژ درەنگ بوو.

**تَرَجَّلَتْ الشَّيْئَ**: شتەکەی خستە ژێر قاچییەوە.

**تَرَجَّلَتْ شَعْرَهُ**: قژەکانی ڕێک و پێک کردن ◦ قژی داهێنان.

**تَرَجَّلَ البِئْرَ**: چووە ناو بیرەکەوە.

**الأرْجَلُ**: قاچ گەورە (پێ پان)، دەگوترێ: (هو أرْجَلُ الرجُلَين) ئەو بەهێزترین و ئازاترین ئەودو پیاوەیە.

**الرّاجِلُ**: فیتنەو قسە هێن و قسە بەر ◦ هەر شتێک لەسەر دوو قاچ بڕوا.

**الرِّجْلُ**: قاچ لەسەرەتای ڕانەوە تا پاژنە پێ ◦ (ك: أرْجُل)، دەشگوترێ: (هو قائم على رجل) ئەو لەسەر پێیە، ئامادەیە بۆئیش ◦ (كان ذلك على رِجْل فلان): ئەو شتە لەسەر دەمی فلان دا بوو لەحەدیث دا هاتووە: (لا اعلم نبياً هلك على رِجْله من الجبابرة مثل ماهلك على رجل موسى عليه السلام) هەروا وشەی (رِجْل) بەمانا کۆمەڵێک شت دێ ◦ ڕەوە کوللە ◦ سوپا ◦ بەش و بار ◦ (رِجْل البحر): کەنداوی دەریا ◦ (رِجْل الغراب): گیایەکی درێژە بەسەر زەوی دا بڵاو دەبێتەوە، گەڵاکانی شەتاڵ شەتاڵە دەکولێندرێ و دەخورێ ◦ (رِجْل الجبار) و (رِجْل الجَوْزاء): ئەستێرەن ◦ (ك: أرجال).

**الرَّجُلُ:** پیاو؛ نێرینەی باڵغ لە ڕەگەزی ئادەمیزاد ٥ (ك: رجال ورَجْلَةُ)، کۆی کۆیەکەی (رجالات)، دەگوترێ: (هو من رجالات القوم): ئەو لەپیاوماقوڵانی گەلو نەتەوەیە.

**الرَّاجِلُ:** پیادە، پێچەوانەی سوار.

**الرَّجْلان:** بەمانا (الراجلُ) دێ ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (رَجْلى) ٥ (ك: رُجالى).

**الرَّجْلَةُ:** لافاو، هاتنە خوارەوەی ئاو لەبەرزایی‌و شاخ‌و کەنەکەوە بۆ دەشتایی ٥ ڕوەکی ئەحمەق (پەڵپینە) کە گیایەکی ساڵانەیە بەکاڵی‌و بەکوڵاوی دەخورێ تۆوێکی وردی هەیە ٥ (ك: رِجَلٌ).

**الرُّجْلَةُ:** ئافرەت؛ ئافرەتێك لاسایی پیاو بکاتەوە، دەگوترێ: (امرأةٌ رَجُلةٌ): ئافرەتێکە دەڵێی پیاوە لەبیرو بۆچوون دا ٥ لەحەدیث دا هاتووە: (کانت عائشة رضي الله عنها رَجُلَةَ الرأي).

**الرَّجْلِيُّون:** باز هاوێژەکان، ئەوانەی وەرزشی ڕاکردن دەکەن.

**الرُّجولَةَ والرُّجولية:** پیاوەتی ئەوەی بەتەواوی ڕەوشتی پیاوانەی تێدابێ.

**الرَّجيل:** پیادە پێچەوانەی سوار ٥ (ك: أرجِلَةٌ) ٥ هەروا بەکەسێك دەگوترێ بۆ پیادە ڕۆیشتن ئازابێ.

**اَلْمُرَجَّلُ:** پۆشاکێك وێنەی پیاوانی پێوەبێ.

**اَلْمِرْجَلُ:** دیزە، کیتەڵە ٥ قاپ‌و قاچاغێکە لەقوڕ دروست دەکرێ‌و سور دەکرێتەوە ٥ لەزانیاری میکانیکا بەو ئامێرە دەگوترێ بەکاردەهێنرێ بۆ بەرهەمهێنانی هەڵم لەئاو یان لەشتی تر.

**رَجَمَهُ رجْماً:** بەردەبارانی کرد ٥ بەبەرد کوشتی.

**رَجَمَ فلاناً:** جنێوی بەفلان دا ٥ نەفرینی لێ کرد ٥ دەری کرد ٥ وازی لێ هێنا ٥ قورئان دەفەرموێ: (لئن لم تنته لأرجمنّك).

**رَجَمَ بالظن:** گومانی خستە سەر.

**رَجَمَ القَبْرَ:** کێلە بەردی بۆ گۆڕەکە دانا.

**راَجَمَ في الكلام والعَدْوِ والحرب:** زێدە ڕۆیی کرد.

**راَجَمَ عن قومه:** داکۆکی لەگەل‌و نەتەوەکەی کرد.

**رَجَّمَ:** بەگومانەوە قسەی کرد، دەگوترێ: (رَجَّمَ بالغيب): قسەی لەشتی نهێنی‌و ئەو دیو پەردەوە کرد، قسەی لەشتێك کرد کە نایزانێ، نازاندرێ.

رأَجَمَ القَبْـرَ: كێلـه بـەردی خـستـه سـەر گۆڕەكە.

ارتجَمَ الشَّيْئُ: شتەكە هەندێكی كەوتە سەر هەندێكی.

ارتجَـمَ القـوم بالحِجـارة: خەڵـكەكە بـەردیان لەیـەك گـرت، شـەڕە بەردیان كرد.

ارتجَمَ بالكلام: جنێویان بەیەكتر دا.

استَرجَمَهُ: داوای لـێ كـرد بـەردەبارانی بكـا ٥ لەحـەدیـث دا هـاتووە دەڵـێ: (جاءت إمراة تسترجم النّبي).

الرِّجام: ئەو بەردە تایبەتییەیە لەسـەر بـیر دادەنـرێ بۆئـەوەی لـەكاتی پێویـستدا داهێڵدرێتـە ناوبیرەكـە بۆئەوەی قوڕی بنكی بیرەكەی پـێ بـشلەقێندرێو هەڵـگوازرێ ٥ ئـەو دولا دیوارە یان دوو كۆڵەكەیـەن كە چەرخو فەلـەكی دۆڵچەكەی لەسـەر دادەنرێ.

الـرَّجْمُ: كوشـتنی زیناكـەر بەبـەردە بـارانكردن ٥ ئـەو بەردانـەی پیـادەدرێ ٥ (رَجْـمٌ بالغيـب): قسە هاویشتن بەبێ بەڵگە.

الـرُّجُمْ: كێلـی قـەبر ٥ گـۆڕ ٥ بـیر ٥ تەندور ٥ (ك: رجام وأرجام).

الـرُّجُمْ: تـیر ئەستێرە ٥ ئـەو دیمەنەیـە كەدەڵێی ئەستێرەیەو بەردەبێتـەوە بۆسەر زەوی ٥ كێلی سەر گۆڕ.

الرُّجْمَةُ: كێلـه بـەردی سـەر گـۆڕ ٥ (ك: رِجام).

الرُّجْمَـةُ: بـەمانا (الرّجمـة) دێ ٥ ئـەو نـاوانو پەرژینۆكەیـە (بەبـەرد یـان ئاسـن) دەخرێتـه نێـوان دوو دێبەرەوە، یان دوو باخچەوە ٥ (ك: رُجَم وَرِجَامٌ).

اَلْمَرَاجِمُ: قسەی ناشیرینو جنێو ئاسا ٥ تاكەكەی (مِرْجَمة).

المِرْجـامُ: قۆچـەقانی، دارلاسیك ئـەو ئـامێرەی بـەردی پـێ دەهاویـژرێ، دەگـوترێ: (رمـاه بـالمراجم) ٥ (ك: مراجيم).

المِرْجَمُ: پیاوی بەهێز ٥ ئەسپی بـەهێز، دەگـوترێ: (رَجُلٌ مـرجم): پیاوێـكی بـەهێزو توانایـە ٥ (فـرس مِـرْجم): ئەسـپی سمكۆڵكـەر ئـەو ئەسـپەی بەهێز سمی بەزەوی دا دەدا ٥ (لِسان مِرْجَمٌ): زمان درێژو زۆر بلێ.

رَجَنَ بالمكانَ رُجُوناً: لەو شوێنە مایەوە.

رَجَـنَ الحیـوانُ: حەیوانەكـە مـاڵی بـوو، كەوی، بوو وەگری ئادەمی بوو.

رَجَنَ الدّابَـةَ رَجْنـاً: وڵاخەكـەی بەسـتەوە، لەزۆری كرد، ئاڵفی باشی نەدایە بۆ ئـەوەی كـزو لاواز بـێ ٥ لەماڵـەوە دایبەستو بەرەڵڵای نەكرد بۆخۆی بلەوەڕێ.

**رَجَنَ فلاناً**: شەرمی لەفلان کرد.

**أرجَنَ**: بەمانا (رَجَنَ)دێ.

**أرجَـنَ الدَابَّـةَ**: وڵاخەکـەی بەنـد کـرد، بەستیەوە، لەژوری کرد.

**إرتَجَنَ الشَّيْئُ**: شتەکە تێکەڵو پێـکەڵ بوو، خراپ بوو کەڵکی نەما.

**إرتَجَنَ الزُبدُ**: رۆنەکـە فرچاو خـەوش‌و خاڵی لـێ جیا نەبۆوە ٥ کەڵکی نەما.

**إرتَجَـنَ أمـر القـوم**: کـاری خەڵـکەکە شێواو تێـکەڵو پێـکەڵ بوو.

**إرتَجَـنَ بالمكـان**: لەشـوێنەکە مایـەوە، نیشتەجێ بوو.

**الرَّجِنُ**: ژەهری کوشندە.

**الرَّجِينةُ**: کۆمەڵو تاقم ٥ (ك: رجائن).

**المَرْجونـة**: جـۆرە زەمیلەیەکـە لەپوشـی خورما دروسـت دەکـرێ بنکـی پـان‌و لای دەمەکـەی تەسـکە، دەگـوترێ: (هـم في مرجونـة): خێڵەکـە راڕان‌و هــەردێن‌و دەچــن نــازانن ئایــا بمێننەوە یان باربکەن.

**رَجَاهُ رجواً ورُجُواً ورجاءةً ورجاوةً ومرجاةً**: هیواداری کرد، ئەمەلی پێ بەخشی ٥ لێـی ترسا ٥ بـەزۆری بـۆ (نـەکردن، نـەبون - نـەفی) بـەکار دەهێنـدرێ ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿مَـا لَـكُمْ لَـا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا﴾.

**رَجِيَ رجاً**: لەقسەو ئاخـاوتن کـەوت، بـێ دەنگ بوو.

**رُجِـيَ عليـه الكـلامُ**: زمـانی گـیرا قسەی بۆنەکرا.

**أرجت الناقَةُ**: حوشـترەکە نزیکە بـزێ‌و بێچوی ببێ.

**أرجى الأمرَ**: کارەکەی دواخست.

**أرجـى الـصَّيْدَ**: هـیچ نێـچیرێکی بـۆ نەگیرا.

**رَجَّاه**: بەمانا (رَجَاهُ)دێ.

**تَرَجَّاهُ**: هیواداری کرد.

**الأرجـوانُ**: دار ئەرخـەوان؛ درەختێـکە گوڵێکی سوری زۆر جوانی هەیـە ٥ بۆیـەی سـوری زۆر سـور ٥ سـور ٥ پۆشــاکی ڕەنــگ ســوری تــۆخ، دەگوترێ: (أحمر أرجواني).

**الأرْجِيَـــةُ**: شتێــك دوابخــرێ ٥ (ك: أراجي).

**التَرَجِّــي**: چـاوەڕوانیکردنی شتێــکی خۆش‌و مومکین.

**الرَّجا**: لای شت، تەنیشتی شت.

**الرَّجَــــوانُ**: شــــوێنی مەترســــیدارو فەوتێنــەر، دەگـوترێ: (رُمِــيَ بــە الرجـوان): خرایـە شوێنی خەتـەرو مەترسیدارەوە.

**الرَّجِيَّــةُ**: هەرشتێــك بــەهیوای بــی، دەگـوترێ: (مـالي في فـلان رجيّـة): هیچ هومێدێکم بەفلانکەس نییە.

**رَحَبَ المكانُ رَحَباً**: شوێنەکە بەرفراوان بوو.

رَحُــبَ المكــانُ رُحْبــاً ورَحَابَــةً: بــه‌مانا (رَحَــبَ)دێ، قورئــان ده‌فــه‌رموێ: ﴿حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ﴾.

أَرْحَبَ: به‌رفراوان بوو.

أَرْحَبَ الشَّيْءَ: به‌رفراوانی كرد.

رَحَّبَ المكانَ: شوێنه‌كه‌ی فراوان كرد.

رَحَّبَ فلانــاً وبــه ترحيبــاً: بــه‌خێرهاتنی فلانــی كــردو هیــوای بــۆ خواســت له‌وشــوێنه به‌خۆشــی بگوزه‌رێنــێ ٥ پێی گوت مه‌رحه‌باو خۆش هاتی.

تَراحَبَ: به‌رفراوان بوو.

الرُّحَــابُ: پــان‌و پــۆڕ، بــه‌رفراوان، ده‌گوترێ: (قِدْرٌ رُحابٌ).

الرَّحْبُ: پان‌و پۆڕ، ده‌گوترێ: (مكـانٌ رَحْبٌ) و(دار رَحْبٌ).

رَحْــبُ الــصدر: ســنگ فــراوان ٥ هێـدی‌و هێمن.

رَحْــبُ الــذِراع: بــه‌هێزو ده‌ســت‌و بــازو له‌كاتی ته‌نگانه‌دا.

رَحْبُ الذراع والباع: سه‌خی‌و ده‌ست‌و دڵ فراوان.

رَحْــبُ الرَّاحــة: ده‌ســت‌و پــل پــان‌و گــه‌وره، زۆر به‌خشنده.

رحْبُ الفهم: عاقڵ مه‌ندو تێگه‌یشتوو.

الرُّحْبى: پانترین په‌راسو لــه كه‌له‌كه‌ی حوشتر دا ٥ شوێنی لێدانی دڵ.

الرُّحْبَةُ: زه‌وی بــه‌رفراوان ٥ (ك: رُحْــبٌ ورِحَاب).

الرَّحِيبُ: ده‌گوترێ: (هو رحيب الصدر): سنگ فراوان‌و ســنگ پــان ٥ (رحيــب الجوف): گه‌ده پان‌و زل.

رحيب الباع والذِّراع: سه‌خی سروشت ٥ زۆر خۆر.

الْمَرْحَــبُ: پــان‌و پــۆڕ ٥ له‌بــه‌خێرهاتنی میوانــدا ده‌گــوترێ: (مَرْحَبــاً بــك): فــه‌رموو له‌شــوێنی پــان‌و فــه‌ره‌ح دا دابــه‌زه‌و دانیــــشه پــــشوو بــــده ٥ بمێنــــه‌وه لامــــان شــــوێنی خــــۆش‌و بــــه‌رفراوان بۆتۆیــــه ٥ دڵخۆشــــین بــه‌هاتنت ٥ بــۆ دوعــا لــێ كــردن ده‌گوترێ: (لا مرحباً بك): بــه‌خێر نه‌یــه‌ی، لــه‌م هاتنــه‌ت دا خۆشــی نــه‌بینی ٥ (أبــو مَرْحَــب): نازنــاوی سێبه‌ره.

رَحَّ الفَرَسُ رَحَحاً: ئه‌سپه‌كه سمی پان بوو (نیشانه‌ی ره‌سه‌نییه‌تی).

رَحَّ الوَعلُ: كه‌ڵه‌كێوییه‌كه سمی پان بوو.

رَحَّ الرَّجُــلُ: پیاوه‌كــه چالأیی بــه‌ری پێــی نه‌بوو، به‌ری قاچی راست بوو ٥ (هو أَرَحّ وهي رَحَّاءُ).

الأَرَحُّ: كه‌سێــك به‌ری پێی چالأیی تێـدا نه‌بێ هه‌مووی له‌زه‌وی بدا.

رَخْــرَحَ الرَّجُــلُ: پیاوه‌كــه نه‌گه‌یــشته

بڕیاری ئەوەی دەیەوێ بیکا.
رَخْرَحَ بالكلام: قسەکەی درکاندو ڕونی نەکردەوە.
رَخْرَحَ الخُبزَ: نانەکەی پانکردەوەو لێکی کێشایەوە.
تَرَخْرَحَتِ الفَرَسُ: ئەسپەکە قاچی پانکردن بۆئەوەی میز بکا.
الرَّخْرَاحُ: قاپی پانو پۆڕ ٥ (إناء رَخْراح): قاپی پانو فەراخ نزم وەکوو لەگەنو تەشتو سینی ٥ لەحەدیث دا هاتووە: (فأتي بقدح رحراح فوضع فيه أصابعه). ٥ (عيش رَخْراحٌ): ژیانی خۆشو پڕ خێرو بێر.
الرَّخْرَح: بەمانا (الرَّخْراحُ) دێ.
الرَّخْرَحَانُ: بەمانا (الرَّحراح) دێ.
رَحَضَ الثَّوْبَ رَحْضاً: قوماشەکەی شت ٥ لەحەدیث دا هاتووە: (سأل عن اواني المشركين فقال: إن لم تجدوا غيرها فارحضوها بالماء).
الرحيض: شتی شۆردراو (قوماشی شۆردراو).
رُحِضَ المحمومَ رحضاً: نەخۆشو تادارەکە عەرەقی زۆری کرد بەجۆرێک کەدەتکوت خۆی شتووە ٥ وەکوو مریشکی ئاوەڕوتکراوی لێ هات.
رُحِضَ فلان: فلانکەس عەرەقی زۆری کرد سەرتاپای جەستەی بوو بەئاو.
أُرْحَضَ الثَّوْبَ: قوماشەکەی شت ٥ لەحەدیثی میعراج دا هاتووە: (فَمَسَحَ عنه الرحضاء): عەرەقی جەستەی سڕی.
أُرْحَضَ المَحْمُومُ: تادارەکە عەرەقی زۆری کرد.
رَحَّضَهُ: بەمانا (رَحَضَهُ) دێ ٥ لەحەدیثی ئیبنو عەباس دا دەربارەی خەواریجەکان دەڵێ: (وعليهم قمص مُرَحَّضَةٌ).
إرْتَحَضَ فلان: فلانکەس حەیای چوو، ئاوی زڕا.
الرُّحاضَةُ: چڵکو پاشەڕۆی ئاکامی شتن.
الرُّحاضُ: گوندی کۆنو کەلاوە کۆن ٥ قوماشی داڕزاو بەهۆی زۆر شتنەوە.
الرُّحَضَاءُ: عەرەقی زۆر بەجۆرێک هەموو جەستە بشوا ٥ عەرەقی دوا لەرزو تا ەنەخۆشی تا بەعەرەقەوە.
المِرْحَاضُ: شوێنی خۆ پاکردنەوەو غوسڵ کردن ٥ دارێک پۆشاکی پێ دەکوترێ لەکاتی شتن دا ٥ (ك: مراحيض).
المِرْحَضَةُ: شتێکە دەستنوێژی تێدا دەگیرێ ٥ (ك: مراحض).

**الرُّحاقُ**: شەراب ە قورئان دەفەرمویّ: ﴿يُسقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ﴾ ە جۆرە عەترێکە ە میسکی بیّ غەش ە بنەچەو ڕەگەزی خاوێن ە (رحيق الأزهار): ئەو هەلالەو شیلەیەیە گوڵو ڕوەك دەری دەدا هەنگو حەشەراتی تر رایدە موسن.

**رَحَلَ** من المكان رَحْلاً ورحيلاً وترحالاً ورِحلة: رۆیی.

**رَحَلَ** البعيرَ رَحْلاً ورِحلة: حوشترەکە بارو بارگەنەی لێ نرا ە سواری حوشترەکە بوو، هەلاته سەر پشتی، دەگوتریّ: (رُحِلَ فلان بمكروه): فلان بەزۆر بردرا سەفەری پێ کرا ە بەسەری دا زالّ بوون.

**رَحَلَ** لە نفسَهُ: صەبری گرت لەسەر ئەزیەتدانیو گوێی پێ نەدا.

**أرْحَلَ** فلان: فلانکەس سەفەرو کاروانی زۆر بون.

**أرْحَلَ** الإبلُ: حوشترەکە دوای کزو لاوازیی قەلەو بۆوەو توانای ئەوەی پەیدا کردەوە باری لێ بنێریّ.

**أرْحَلَ** فلاناً: وای لە فلانکەس کرد سەفەر بکا، کاروان بکا ە ولاخی سوواریو توێشوی دا بەفلانکەس.

**رَاحَلَهُ**: یارمەتی دا لەسەر کاروانەکەیو سەفەرکردنی.

**رَحَّلَهُ**: وای لێ کرد سەفەر بکا، شوێنەکە جیّ بێلێ.

**رَحَّلَ** الإبلَ: حوشترەکەی ژێربارکرد، رایهێنا.

**رَحَّلَ** الثوبَ: کراسەکەی رازاندەوە بەوێنەی جۆراو جۆری کەلو پەلی کاروانی.

**رَحَّلَ** الحسابَ: حیسابەکەی گواستەوە بۆ شوێنێکی تر کە پەیوەندی بەسەرەتای حیسابەکەوە هەیە.

**ارتَحَلَ**: بەمانا (رَحَلَ) دیّ.

**ارتَحَلَ** البعيرَ: کەلو پەلی سەفەری لەحوشترەکە بارکرد ە سواری حوشترەکە بوو.

**ارتَحَلَ** الطفلُ أباه: منداڵەکە چووە سەر پشتی باوکی ە لەحەدیث دا هاتووە پێغەمبەر (د.خ) چووە سوژدەو حەسەنی کچەزای چووە سەرپشتی، ئەویش درێژەی بەسوژدەکەی دا، جادوای سەلامدانەوە لێیان پرسی بۆ ئەوەندە لەو سوژدەدا مایتەوە؟ فەرمووی: (إنّ ابني إرتحلني فكرهت أن أعجله).

**تَرَحَّلَ**: بەمانا (رَحَلَ)دیّ.

**تَرَحَّلَ** الدابَّةَ: سواری ولاخەکە بوو (وتَرَحَّلَهُ) بەناخۆشی سواری بوو.

**إستَرْحَلَهُ**: داوای لێ کرد باری بۆ بار

بكا ٥ داواى پێداويستى كاروانى لێ كرد.

**إسْتَرْحَلَ الناسَ نَفْسَهُ:** نەفسى خۆى ژێر دەستە كردوەو خەڵكى بەسەر خۆى دا زاڵ كردوە.

**الراحِلَة من الإبل:** حوشترێك بەكەڵكى كاروان‌و بارهەڵگرتن بێ ٥ لەحەديث دا هاتووە: (وتجدون الناس بعدي كإبلٍ مائة ليس فيها راحلة) ٥ (ك: رواحل)، دەگوترێ: (مشت رَوَاحِلُهُ): پيرو لاواز بووە كەڵكى نەماوە.

**الراحول:** بەمانا (الرّاحِلُ) دێ ٥ (ك: رواحيل).

**الرِّحالَةُ:** زين، يان زينى دروستكراو لەپێست‌و شتى وا كە بۆ غارغارێن‌و پێشبڕكێ بەكاردێ ٥ (ك: رَحَائل).

**الرُّحالُ:** زيندرو ٥ هەرشتێك پێداويستى سەفەربێ.

**الرُّحالُ:** عەرەبى كۆچەريى، كە هەميشە بەئاژەڵەكانيانەوە گەرميان‌و كوێستان دەكەن‌و بەدوو لەوەڕو ئاودا دەگەڕێن بۆ ئاژەڵەكانيان.

**الرَّحالَةُ:** كەسێك زۆر گەڕيدە بێ ٥ زۆر ولات گەرابێ.

**الرِّحْلَةُ:** كاروان كردن‌و لەماڵ دەرچون بۆ ولاتانى تر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿رِحْلَةَ الشِّتَاء وَالصَّيْفِ﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ گەشتنامە (كتێبێك باسى بەسەرهات‌و روداوو ئەو ديمەنانە بكا كە گەشتيارەكە بينيونى).

**الرُّحْلَةُ:** ئەوشتەى سەفەرى بۆدەكرێ‌و مەبەستە، دەگوترێ: (الكعبة رحلة المسلمين) ٥ (عالِم رُحْلَةُ): زانايەكە لەهەموو لايەكەوە خەڵك دێ بۆ خزمەتى ٥ (بعير ذو رُحْلَة): حوشترێكە تواناى زۆر رۆيشتنى هەيە.

**الرَّحولُ:** گەڕيدە؛ كەسێك زۆر بگەڕێ‌و سەفەر بكا ٥ پێداويستى سەفەر.

**الرَّحولةُ:** بەمانا (الرّاحلة)دێ.

**الرحيلُ:** سەفەرو كاروان كردن ٥ بەتوانا لەسەر سەفەرو رۆيشتن.

**المُرْتَحَلُ:** شوێنى بارلێنانى ولاخ كاروانسەرا ٥ خان ٥ شوێنى دابينكردنى پێداويستى سەفەر.

**المِرْحَلُ من الجمال:** حوشترى بەهێز.

**المَرْحلَةُ:** قۆناغە رێگە رۆژەرێ بەرۆيشتنى ئاسايى ٥ (ك: مراحيل).

**رَحِمَت المرأةُ:** ئافرەتەكە منداڵدانى (رەحمى) ئازارى بوو ٥ (فهي رحماء).

**رَحِمَ السِّقاءُ:** كوندەكە تاڵ‌و جەوتى نەكراوە رزى‌و كەڵكى نەما.

رَحِمَ فلاناً رحمةً ورحماً ومرحمةً: بەزەیی بەفلانکەس دا هاتەوە، دڵی بۆی نەرم بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَرَدْنَا أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴾.

رُحِمتِ المرأة: بەمانا (رحمت) دێ.

رَحَّمَ عليه: دوعاو نزای رەحمەتی بۆکرد.

تراحَمَ القومُ: خەڵکەکە لەناو خۆیان دا هەندێکیان بەزەییان بە هەندێکیان دا هاتەوە.

تَرَحَّمَ عليه: دوعای رەحمەتی بۆکرد.

اسْتَرْحَمَهُ: داوای سۆزو بەزەیی لێ کرد.

الراحِم: ئاژەڵێک (پزدانی) بێچودانی هاوسابێ.

الرَّحّام: مەڕو بزنێک بێچوی بووبێو پزدانی فڕێ نەدا.

الرَّحِمُ والرُّحمُ والرِّحمُ: بێچودانی ئاژەڵ شوێنی دروستبوونی بێچو لەسکی ئاژەڵ دا ٥ خزمایەتیو هۆکارەکانی ٥ (ك: أرحام) ٥ (ذوي الأرحام) ئەو خزمو کەسو کارەیە کە نەعەصەبەن نە خاوەن بەشی دیاریکراون لەمیراث دا، وەکوو کچی براو کچە مام.

الرُّحَمُ: نەخۆشییەکە توشی رەحەمی ئافرەت دەبێ ناهێڵێ ئاوی پیاوەکەو هێلکەی خۆی متربەبن‌و زاوڵە هەڵپێچێ.

الرَّحمنُ: زۆر بەرەحم‌و بەزەیی، ئەم ناوە تەنها بۆ خودا بەکاردەهێندرێ.

الرَّحْمَةُ: خێرو بێرو خۆشی.

الرَّحموت: بەمانا (الرّحمة)دێ، دەگوترێ: (رهبوت خير لك من رحموت): بترسێندرێو تاوان نەکەی باشترە لەوەی تاوان بکەی‌و عەفو بکرێی.

الرُّحمى: رەحمەت‌و بەزەیی.

الرُّحوم: زۆربە ڕوحم‌و بەزەیی ٥ ئافرەتێك منداڵدانی ئازاری هەبێ.

الرَّحيمُ: زۆر بەرەحم‌و بەزەیی ٥ (ك: رحماء).

المَرْحَمَة: بەمانا (الرُّحمة)دێ ٥ (ك: مراحم).

رَحَت الحيَّةُ رَحْواً: مارەکە خۆی کەوانە کردەوەو پاڕۆکەی بەست.

رَحَا الرَّحى: ئاشی نایەوە (وبها) خولاندیەوە.

رَحَّى الإنسانُ الرَّحى: ئادەمیزاد ئاشی دروستکردو نایەوە.

تَرَحَّتِ الحيةُ: بەمانا (رَحَتْ)دێ.

الرَّحا والرَّحى: ئاسیاو، ئاش ٥ ئامێری هاڕین ٥ (ك: أرحٍ أرحاءُ، رُحيّ، أرحيةٌ) ٥ سنگ ٥ ددانی خرێ ٥ (رحى الحرب): بەرداشی شەڕ،

دەگوترێ: (دارت رحی الحرب): شەڕ هەڵگیرسا ٥ بەرداشی شەڕ وەگەر کەوت ٥ کۆمەڵی خزمو کەس ٥ جەڵبە حوشتری زۆرو کۆبۆوە.

**رَحَی** القوم: ریش سپیو پیاو ماقوڵی هۆزو نەتەوە، کە خەڵکەکە لەقسەی دەرناچن ٥ (رحی السحاب): هەوری گەواڵ، گەواڵو کۆبوە ٥ (رحی الأرض): تەپۆڵکە.

**الرَّحَوِیَّةُ**: (في الميكانيكا): ئامێرێکە بۆ هەڵگرتنو بەرزکردنەوەی قەبارەی قورس یان راکێشانی.

**ألْمَرْحی**: مەدارو جەمسەری ئاش، یان گۆڕەپانی جەنگو پێکادان.

**رَخَّ العَجِینُ**: هەویرەکە ئاوی زۆر بوو.

**رَخَّ الشَّیْءَ رخّاً**: پێی بەشتەکەدا ناو شلی کردەوە یان شکاندیو شلی کردەوە.

**رَخَّ الشرابَ**: شەرابەکەی تێکەڵاو کرد.

**رَخَّ رَخَخاً**: ئاسانو نەرم بوو.

**أرَخَّ الشَّیْءَ**: زیدەڕەوی کرد لەشل کردنەوەی شتەکەدا.

**أرَخَّ العجینَ**: ئاوی هەویرەکەی زۆر کرد.

**إرْتَخَّ**: شل بووە، داچۆڕا، شۆڕ بووە.

**إرْتَخَّ رأیُهُ**: راوو بۆچوونەکەی چەواشە بوو.

**إرْتَخَّ السکرانُ**: زۆر سەرخۆش بوو، مەستو کەلەلا بوو.

**إرْتَخَّ العجینَ**: هەویرەکە ئاوی زۆر بوو.

**الرُّخاخُ**: نەرمو شل، دەگوترێ: (أرض رخاخ): زەوییەکی نەرمو شل ٥ (نبات رَخاخ): روەکێکی فشەڵۆکە ٥ (عیش رخاخ): ژیانی خۆشو پڕ نازو نیعمەتو بەختەوەریی.

**الرُّخُّ**: روەکێکی نەرمو نیانو سوکە ٥ باڵندەیەکی ئەفسانەییە پێشینان چەندان روداوی سەیریان بۆ هەڵبەستووە داشێکە (پارچەیەك) لەپارچەکانی شەترنج.

**الرُّخاءُ**: زەوی نەرمو فشەڵ کەلەژێر پێدا بخزێ ٥ (ك: رخاخي).

**الرُّخْراخُ**: لەقوڕ یان هەوێر ئەوەیە نەرمو شل بێ.

**الرَّخرَخُ**: بەمانا (الرُّخراخ)دێ.

**رَخُصَ** رُخاصةً ورخوصةً ورخصاناً: ناسكو نەرمو نیان بوو، دەگوترێ: (غُصنٌ رَخصٌ وبنان رَخصٌ).

**رَخُصَ السعرُ رخصاً**: نرخەکە هەرزان بوو، دابەزی.

**أرْخَصَ السِّعرَ**: نرخەکەی هەرزان کرد.

**أرْخَصَ الشَّیْءَ**: شتەکەی بەهەرزان دەست کەوت یان بە نرخی کەم کڕی ٥ (أرخص له في الأمر): کار ئاسانی بۆ کرد لەئیشەکەدا.

**رَخَّصَ له في الأمـر**: كارەكەی بۆ ئاسان كـرد ٥ دوای مـەنع كـردن رێـگەی پێدا.

**إرْتَخَـصَهُ**: بـە هـەرزانی لەقەڵـەم دا ٥ بەهەرزان كڕی.

**تَرَخَّصَ في الأمور**: روخصەتی وەرگرت ٥ بەمۆڵەتو رێـگە پێدان چووە نـاو كارەكەوە.

**استرخَصَهُ**: بەهەرزانی حسێب كرد.

**الرُخْصَةُ والرُخُصَة**: كار ئاسانی كـردنو رێـگە بۆخۆشـكردن، سـووككردنو كەمكردنـەوەی ئـەرك ٥ قومـە ئـاو، دەگوترێ: (أخذ رُخصَةً مـن المـاء) ٥ بەشو بار لەهاوبەشیو میرات دا ٥ مۆڵـەتو رێگەپێدانێـكە دەوڵـەت دەیدا بەچەند كەسێـك بۆ كردنی كارێـك یـان بـەكارهێنانی شتێـك ٥ وەكـــوو مۆڵـــەتی سەرتاشـــیو شۆفێریو وەستایی تر.

**الـرَّخيصُ**: كـەودەنو گێـلو گـەوج ٥ پۆشـاكی نـەرمو نیـان ٥ (مـــوت رخيص): مردنی تاڵو تفت.

**رَخِفَ العجينُ ونحوه رَخَفاً**: هەویرەكە شل بۆوەو داهێزا لەبەر زۆر ئاوی.

**رَخِفَ ورَخُفَ**: بەمانا (رَخَفَ)دێن.

**أرْخَـفَ العجـينَ**: ئـاوی هەویرەكـەی زۆر كرد تا شل بۆوەو داهێزا.

**الرَّخْفُ**: جۆرە رەنگو بۆیاخێكە.

**الرَّخْفَةُ**: قوڕاوی تەنك ٥ بەردی سوك ٥ (ك: رخاف).

**تَرَخَّلَ**: بەرخۆڵەی بەخێو كرد.

**الرَّخاخيلُ**: سركەی خورما.

**الرَّخْـلُ**: بەرخۆڵـەی مـێ (كـاوڕ) ٥ (ك: أرخُلُ ورُخال ورِخلان).

**الرِّخِلُ**: بەمانا (الرَّخْلُ)دێ.

**الرِّخْلَةُ**: بەمانا (الرّخلُ)دێ.

**رَخُمَ الصوت والكـلامُ**: دەنگەكـە، قسەكە نەرم بوو.

**رَخَمَتْ النعامَةُ والدّجاجة بيضها وعليـه رَخْماً ورَخَماً**: نوعامەكە یان مریشكە بەكڕەكـە هێلكـەكانی ژێرخـۆ دان لەسەریان كڕكەوت ٥ (هي راخِمٌ).

**رَخَمَتْ المـرأةُ وَلَـدَها رخمـاً**: ئافرەتەكـە یاری لەگەڵ منداڵەكە كرد.

**رَخِـمَ الـسقاءُ ونحـوه رَخَمـاً**: كوندەكـە پێستەكە بۆگەنی كرد.

**رَخِمَ الفرسُ ونحوه رُخمةً**: سەری سپی بـوو بـاقی جەسـتەی رەش، (فهـو أرخـم وهي رَخماءُ) ٥ (ك: رُخمٌ).

**رَخَّمَ فلانـاً رَخَمـاً**: بـەزەیی بەفلانكـەس دا هاتـەوە، دەگـوترێ: (ألقـى عليـه رَخْمَتَهُ): خۆشەویستی خـۆی خـستە سەر.

**رَخُمَ الصوتُ والكلامُ رخامةً**: دەنگی نەرمو

نیان بوو، قسەکە نەرم بوو.

أرخَمَت النَّعامَةُ والدَّجاجَةُ على بيضها: نوعامەکە یان مریشکەکە بەسەر هێلکەکانی دا کڕکەوت.

رَخَّمَ الدَّجاجَة: مریشکەکەی والێ کرد کڕبکەوێ.

رَخَّمَ البَيْتَ: خانوەکەی بەبەردی روخام کاشی کرد ٥ (ترخيم الأسم): بریتییە لەوەی پیتێك یان دوو پیت لەناوەکە قت بکەی لەکاتی بانگ لێ کردنی دا.

الرُّخام: جۆرە بەردێکە لەکاربۆناتی کالسیۆم کە بلور ئاسایێ بەسروشت.

الرُّخامي: کزە با، سروەی با ٥ ناوی جۆرە رووەکێکە تۆزاوی مەیلەو سپییە ئاژەڵ زۆری حەز لەخواردنیەتی.

الرَّخَمُ: باڵندەیەکە پەڕو پۆڵی زۆرە، رەنگی سپییەو خاڵخاڵی رەشی تێدان، دەندوکی درێژەو کەوانەیی کەمە، رەنگی خاکی مەیلەو سوورە ٥ نیوەی زیاتری بەچەرمێکی تەنك داپۆشراوە ٥ دوو باڵی درێژی هەن نیو مەتر دەبن، کلکی درێژەو چوار پەڕی پێوەن، قاچی باریك و نینۆکی مام ناوەندی و رەشن ٥ شیری خەست، (ژەك).

الرُّخامُ: ئەوکەسەی بەردی روخام مشت و ماڵ دەکاو تیف تیفەیان دەدا ٥ روخام فرۆش.

رخا العَيْشُ وغيره: ژیانی خۆش بوو.

رَخِيَ الشَّيْئُ رخاً ورخاءً: شتەکە نەرمەو شل بوو.

رَخِيَ العيشُ: ژیانی خۆش بوو.

رَخُوَ رخاءً ورخاوة: نەرمەو نیان بوو.

أرخى: کەوتە خۆشی و هەرزانییەوە.

رَخِيَ الفَرَسُ: ئەسپەکە بازی توندی هاویشت.

أرْخى الشَّيْئَ: شتەکەی شل کردەوە.

أرْخى السِّتْرَ: پەردەکەی دادایەوە.

أرْخى عمامَتَهُ: دڵنیا بوو.

أرْخى الزمام: جڵەوی شل کرد.

أرْخى له القيدَ: پێوەندەکەی بۆ فراوان کرد.

أرْخى له العِنانَ: وازی لێ هێناو هەموو شتێکی دایە دەست خۆی.

أرْخى الدّابةَ: گوریسی هەوساری ولاخەکەی درێژ کرد بۆئەوەی پتر ئەملاو ئەولا بکا.

رَخّى الشَّيْئَ بالشَّيْئ: ئەوشتەی تێکەڵاوی ئەو شتەکرد.

راخى (راخت الحاملُ): ئافرەتە سکپڕەکە کاتی منداڵ بوونی هات.

راخى الشَّيْئَ: شتەکەی نەرمەو شل کردەوە.

راخي العقدةَ: گرێکەی شل کردەوە.
راخي خِناقةً: پەتی ملی شل کردەوەو ڕێگای هەناسەدانی پێدا.
تراخـي: دواکەوت دوای خست، فنە فنەی پێ کرد.
تراخي عن الأمر: وازی لەکارەکە هێنا.
تراخـتْ السماءُ: ئاسمان بارانبارینی دواخست، لەکاتی خۆی دا نەی باراند.
تراخي ما بينهما: نێوانی ئەو دووشتەی زۆر فراوان کرد.
استرخي: شل‌و نەرم بوو، بڵاو بۆوە پان بۆوە.
استرخي الأمرُ: کارەکە ئاسان بوو بەلاو ناخۆشییەکە نەما.
استرخي الرَّجُلُ: پیاوەکە لەسەر پشت ڕاکشاو ماسولکەکانی شل کردنەوە.
الأُرخِيَةُ: ئەوەی لەشتەکە شل بکرێتەوە ٥ (ك: أراخي).
الرَّخاء: هەرزانی‌و گوزەران خۆشی.
الرُّخاءُ: کزە با، سروەی با ٥ بای هێدی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَسَخَّرْنَا لَهُ الرِّيحَ تَجْرِي بِأَمْرِهِ رُخَاءً حَيْثُ أَصَابَ﴾.
الرَّخاوة: (رخاوة العضل الخلقية): نەخۆشییەکە هەندێ منداڵ کەلەدایک دەبن شلۆکییان پێوە دیارە.
الرَّخْوُ: فشەڵ‌و نەرم لەهەرشتێک بێ.
الرِّخْو من الأصوات: دەنگێکە لەدەرچەکەی دا هەوا بە تەواوی بەربەست نابێ بەڵکوو ڕێگای دەرچوونی دەمێنێ ٥ پیتی (ڕەخو) ئەم پیتانەن (ث، ح، خ، ذ، ز، ظ، ص، ض، غ، ف، س، ش، ه).
الرَّخِيُّ: دەگوترێ: (عيش رخي): ژیانی خۆش‌و پڕ بەختەوەری.
رخِـي البال: بەناز پەروەردەو گوزەرانخۆش.
المِرْخـاءُ: دەگوترێ: (فرس مِرْخاء): ئەسپێکە گورج باز دەدا.
رَخْوَدَ: ژیانی خۆش بوو، گوزەرانی پڕ نازو نیعمەت بوو.
الرِّخْوَدُّ: شلۆك‌و نەرم، دەگوترێ: (هو رخودٌ): ئێسقان نەرم‌و قەڵەوە.
الرِّخْـوَدةُ: ئێسقان نەرمی، هۆکارەکەی کەمبوونی کالسیۆم‌و فسفۆرە لەلەش دا.
رَدَأَهُ به رَدْءاً: پاڵپشتی بۆ دانا.
رَدَأَ الحائِطَ: پاڵپشتی بۆ دیوارەکە داناو بەهێزی کرد.
رَدَأَ الماشِيَةَ: ئاژەڵەکانی باش بەخێو کردن.
رَدَأَه بحجر: بەردی پیادا.
رَدُؤَ رداءةً: بێهێزبوو خراپ بوو کەڵکی نەما.

أَرْدَأَ: كاری ناشیرینی ئەنجام دا ○ شتی خراپی پەیدا کرد.

أَرْدَأَ علی كذا: لەوە زیاد بوو.

أَرْدَأَ الشَّيْءَ: شتەکەی بێ کەڵک کرد، دایوەشاند خراپی کرد.

أَرْدَأَ فلاناً: یارمەتی فلانی داو بوو بەپاڵپشتی.

أَرْدَأَ الحائطَ: کۆڵەکەو پاڵپشتی بۆ دیوارەکە دانا.

أَرْدَأَ السِّتْرَ: پەردەکەی دادایەوە.

تَرَادَأَ القومُ: خەڵکەکە لەناو خۆیان دا بوون بەپاڵپشتی یەکترو یارمەتی یەکتریان دا.

الرِّدْءُ: یارمەتیدەرو پاڵپشت ○ هێزو کۆڵەکە ○ لاتای قورس ○ (ك: أَرْدَاءُ).

الرَّدِئ: ناخۆش‌و خراپ ○ بێ کەڵک‌و گەندەڵ ○ هەتیو مچەو خوێڕی ○ (ك: أَرْدِئاءَ).

تَرَدَّبَ به: نەرم‌و نیانی لەگەڵدا نواند، بەزەیی پێیاهاتەوە.

الإرْدَبُ: بڕوانە (الإِرْدَبَ) لەپیتی (ا)دا.

الرُّدَابُ: (الرّداب القولوني): هەبوونی چەند کونی گیراو لەقۆڵۆن دا.

الـرَّدَابُ: رێـگای دەرنەچـوو، کـۆڵانی کۆتایی گیراو، کۆڵانی گیراو.

رَدَجَ الـصَّبِيُ أو المهـرُ أو الـسَخلةُ: منداڵەکەیان جوانـو ئەسپەکە یان کارژیلەکە پێش ئەوەی خواردن بخوا چی لەسکی دا بوو دەری دا.

الرَّدَجُ: یەکەم پیسایی کە منداڵ یان جوانو یان کارژیلە دەری دەدا پێش ئەوەی شت بخوا ○ (ك: أرداج).

رَدَحَ رَدْحاً: جێگیر بوو مایەوە، دامەزرا، دەگوترێ: (رَدَحَ بالمكان).

رَدَحَ الرَّجُلُ: پیاوەکە کاری مەیسەر بوو ئیشەکەی جێ بەجێ بوو.

رَدَحَ الشَّيْءَ: شتەکەی بڵاو کردەوە.

رَدَحَ الرَّجُلَ: پیاوەکەی خست، بەزەوی دا دا.

رَدَحَ البيـت بـالطين: گڵی کـردە سـەر خانوەکە.

رَدُحَتِ المرأة رداحَةً: ئافرەتەکە سمتی گەورە بوو کەفەڵی قەڵەو بوو.

أردحَ البَيْتَ: بەمانا (رَدَحَهُ)دێ.

رَدَّحَ الشَّيْءَ: بەمانا (رَدَحَهُ)دێ.

الرَّادِحَـة: (مائـدة رادحـة): سـفرەو خوانێکی گەورەو پڕخێرو بێرە.

الرَّداحُ: دەگوترێ: (دوحة رداح وجفنة رداح): باخچەی گەورە، سوێنەی گـەورە ○ کۆڵێنـەی زل ○ (امـرأة رداح): ئافرەتی سمت‌و کەفەڵ پان‌و قەڵەو ○ (كبش رداح): بەرانی دوگ زل ○ (جمل رداح): حوشتری بارگران ○ (فتنـة رداح): فیتنـەو چورتمێـکی گەورە ○ (ك: رُدُحٌ).

**الرُّداحَةُ**: تەڵەیەکە بۆ درندە دەنرێتەوە.

**الرُّدْحَةُ**: گوشادیو خۆشی.

**الرُّدْحِيُّ**: بەقاڵی گوند.

**الرَّدوح**: ئافرەتی سمت زلو کەفەڵ پانو بۆڕ.

**المُرْتَدَحُ**: خۆش گوزەرانیو هەرزانی.

**رَدَخَ** رأسَهُ: سەری شکاند، سەری قەڵاشت.

**الرَّدَخُ**: قوڕی زۆر ٥ (رَدَخَة) پارچە قوڕ.

**رَدَّهُ رداً وتَرْداداً**: گەڕاندیەوە نەیهێشت بەمەراز بگا، دەگوترێ: (رَدَّه الیه): بۆی گێڕایەوە، بردییەوە بۆلای ٥ (رَدَّهُ علی عقبه): گێڕایەوە بۆ دواوە ٥ (رد کیده في نحره): فێڵو پیلانی هاوچەشنی لەگەڵ دا کرد ٥ (رَدَّ الباب): دەرگاکەی داخست ٥ (رَدَّ علیه کذا): شتەکەی بەسەردا دایەوە لێی وەرنەگرت ٥ (ردّ الیه الحکم): بڕیارەکەی دایە دەست ئەو ٥ (رَدَّ فلاناً): فلانکەسی بەهەڵە زانی ٥ (ردَّ الشَّيْءَ): شتەکەی لەحاڵەتێکەوە بردە سەر حاڵەتێکی تر ٥ وەکوو کابرای شاعیر دەڵێ:

فرد شعورهن السود بیضاً
ورد وجوههن البیض سوداً

**أرَدَّ**: تورە بوو ڕقی هەڵسا، خوێنی گەرم بوو.

**أرَدَّ البحرُ**: دەریا کەوتە ماخۆلانو شەپۆلەکانی زۆر بوون.

**أرَدَّ فلان**: فلانکەس ڕقی هەڵسا ٥ خوێنی گەرم بوو ٥ ماوەیەکی زۆر لەتەمەنی ڕۆیی بێ هاوسەر بوون.

**أرَدَّ الشاةَ**: مەڕەکە گوانی پڕبوون لەشیر.

**رَادَّ الکلامَ**: بەنووسینەکە دا چۆوە بۆی.

**رَادَّ البیعَ**: داوای هەڵوەشانەوەی مامەڵەکەی کرد.

**ردَّدَهُ**: دوبارەو سێ بارەی کردەوە.

**ارتدَّ**: هەڵگەڕایەوە، گەڕایەوە، دەگوترێ: (إرتَدَّ علی ألره، وارتدَّ الیه، وارتدّ عن دینه).

**ارتدَّ الشيءَ**: داوای گەڕانەوەی شتەکەی کرد.

**ترادَّ**: بەمانا (إرتدَّ)دێ.

**تَرَدَّدَ المتبایعان البیعَ**: کڕیارو فرۆشیارەکان مامەڵەکەیان هەڵوەشاندەوە.

**تَرَدَّدَ فیه**: تێیدا کەوتە گومانەوەو بۆی یەکالا نەبوەوە.

**تَرَدَّدَ في الکلام**: زمانی گیراو بەرێکو پێکی قسەی بۆنەکرا.

**تَرَدَّدَ الی مجالس العلم**: هاتو چۆی کۆڕی زانیاری دەکرد بەمەبەستی

فێربوون‌و بیرو ڕا گۆڕینەوە.

**استردّه**: داوای گەڕانەوەی شتەکەی کرد.

**استردّ فلاناً الشَّيْءَ**: داوای لەفلانکەس کرد شتەکەی بداتەوە.

**الأَرَدُّ**: کەسێك لە دەم‌و چاوی دا عەیب‌و خەوشێك هەبێ.

**الرّادَّةُ**: ئافرەتێك دەم‌و چاوی عەیبی تێدا بێ ٥ سودو قازانج، دەگوترێ: (هذا أمر لا رادّةَ فيه).

**الرّدُّ**: زمانگیران کەسێك لەقسە کردن دا زمانی بگیرێ ٥ شتی خراپ‌و نارەسەن ٥ بەروبوم ٥ قەڵب‌و ساختە، دەگوترێ: (درهم ردّ): دیرهەمی قەڵب ٥ بیرو باوەڕو یاساو ڕێسایەك پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری ئیسلام بێ ٥ لەحەدیث دا هاتووە دەفەرموێ: (من عمل عملاً ليس عليه أمرنا فهو ردّ) ٥ (ك: رُدُود).

**الرَّدَّةُ**: گەڕانەوەو مەیل کردن بۆلای شتێك ٥ عەیب‌و خەوش ٥ ناشیرینی شوێنێکی دەم‌و چاو لەگەڵ جوانی باقی جەستە ٥ چەناگەی بچوك‌و پوکاوە ٥ کۆزەرو بن ژێل.

**الرِّدَّةُ**: گەڕانەوە بۆ کوفر دوای موسوڵمان بوون ٥ پڕبوونی گوانی ئاژەڵ لەشیر پێش ئەوەی بزێ ٥ دەنگدانەوەی دەنگ ٥ پوکانەوەی چەناگە ٥ (حروب الردة): ئەو شەڕانە بوون کە موسوڵمانان بەڕابەرایەتی جێنشینی یەکەم حەزرەتی ئەبوبەکر ئەنجامیان دا دژی ئەوانەی لەزەکاتدان پاشگەز بوونەوە، هەندێکیشیان وازیان لەنوێژ هێنا.

**الرُّدّي**: ئافرەتی تەڵاقدراو.

**الرَّدِيدُ**: گەڕێنراوە ٥ قەڵب‌و ناشیرین، هەورێك بارانی باراندبێ‌و ئاوی پێ نەمابێ ٥ ئەندامی گۆشتن‌و تێکسمڕاو.

**الإسترداد**: (دعوى استرداد الحيازة): داوایەکە بۆ گێڕانەوەی مافی خاوەنداریتی کەلوپەلی زەوت کراوە.

**المتردِّدُ**: کورتە باڵاو کوڵە بنە.

**المِرَدُّ**: کەسێك زۆر بێت‌و بڕوا.

**المُرِدُّ**: کەسێك ماوەیەکی زۆر لەتەمەنی بڕواو بێ هاوسەر بێ.

**المَرْدُودُ**: سەر لێ شێواو.

**المَرْدُودَةُ**: مێینەی (المردود)یە ٥ ئافرەتی تەڵاقدراو.

**رَدَسَهُ رَدْساً**: بەبەرد لێی دا ٥ وردی کردو شکاندی ٥ بەیەکی کێشان لێکی دان.

رَدَسَهُ برأسه: بەسەر گێڕایەوە، شەرە قۆچی لەگەڵ کرد.
رَدَسَ بالشَّيْءِ: شتەکەی برد.
رَدَسَ الدّابَّةَ: وڵاخەکەی زێربار کرد.
تَرَدَّسَ: کەوتو هەڵدێرا، سەرەنگری بوو.
المِرْداسُ: شتێکی رەقو پتەوە شتی پێ دەکوترێو ورد دەکرێ، صندۆڵ، دەسکە صندۆڵ، یان کوینو چەکوج ٥ سەر ٥ بەردێک هەڵدەدرێتە ناو بیرەوەبۆئەوەی بزانێ ئاوی تێدایە یان نا ٥ (ك: مرادیس).
المِرْدَسُ: بەمانا (المرداسُ) دێ ٥ (ك: مرادس).
رَدَعَهُ رَدْعاً: گێڕایەوە، نەیهێشت بێت، بەری پێ گرت.
رَدَعَ ثوبَهُ بالزعفران: بە زەعفەران کراسەکەی رەنگ کرد.
رَدَعَ الشَّيْءَ: شتەکەی کوتا، وردی کردو پەستاوتی، دەگوترێ: (رَدَعَهُ بالحجر): بەبەرد کوتای.
رَدَعَ بە الأرْضَ: بەوشتە زەوییەکەی کوتایەوە.
رُدِعَ رَدْعاً ورَدْعَةً ورُداعاً: رەنگی گۆڕا بۆ زەردی (رەنگی زەرد هەڵگەڕا) ٥ کوژرا، بەعەرزدا درا.
رَدَعَ المریض: نەخۆشەکە باری تەندروستی تێک چوو ٥ جەستەی داهێزراو ئازاری لێپەیدا بوو، دەگوترێ: (رُدِعَ فلان): فلانکەس هەموو جەستەی ئازاری لێپەیدا بوو.
رَدَّعَهُ بالطیب: بۆنی خۆشی لەخۆدا.
إرْتَدَعَ: وازی لێ هێنا، نەیهێشت، داپەتا، بۆنی خۆشی لەخۆدا ٥ بەزەعفەران خۆی رەنگ کرد، دەشگوترێ: (أصاب السهمُ الهَدَفَ فارتدع): تیرەکە لەنیشانەکەی داو دولەت بوو شکا.
ترادَعُوا: هەندێک خەڵک هەندێکی تریان مەنع کردن.
تَرَدَّعَ بالطیب: بۆنی لەخۆدا ٥ بۆنی لەخۆی هەڵسو.
الأردعُ من الغنم: ئەو مەڕەیە سنگی رەش بێو باقی جەستەی سپی بێ.
الرَّادِعُ: کراسو پۆشاکێک ئاسەواری بۆنی خۆشی پێوەمابێ.
الرُّداعُ: ئازاری سەرانسەری جەستە ٥ لەش داوەشان.
الرُّداعُ: دەگوترێ: (أحمر رداع): سورێکی صاف.
الرَّدْعُ: هەرشتێک بەزەوی دا بکەوێ، وەکوو ئەوە باڵندە بەحەواوە بەهەنگێورێو بکەوێتە سەرزەوی یان

ئـادەمیزاد بكـوژرێو بكەوێتـە سـەر زەوی، ئـەو بەشـەی بـە زەوی دەكـەوێ پێـی دەگـوترێ (رَدْع)، دەگـوترێ: (رَكِبَ رَدْعَهُ): بەرەو دەم بەسەر زەوی دا كەوت، رەپەو ڕو كەوتە سەر زەوی ٥ لـەش داوەشـان ٥ زەعفـەران، یـان شـوێنەواری زەعفـەران، یـان خـوێن ٥ دەگـوترێ: (بـالثوب ردع مـن هـذا): كراسەكە پەڵە پەڵە خوێنی پێوەیە.

**الرَّدعاءُ**: مێینەی (الأرْدَع)ە.

**الرَّدیـعُ**: كـوژراو ٥ گێـلو ئەحمـەق ٥ لـەش داوەشـاو ٥ هەرشتێـك ئاسـەواری زەعفـەران یـان بـۆنی خۆشـی پێـوە مابـێ ٥ تیرێـك تیژاییەكەی پێوە نەمابێ.

**المِرْدَعُ**: كەسێـك بچێ بۆ شتێـك بۆی جـی بـەجێ نـەكرێ بەنائومێـدی بگەڕێتەوە ٥ كەشتییەوانی تەمبـەڵ ٥ كورتـە بـاڵا ٥ تیرێـك سـەرە تیرەكەی پێوە نەمابێ.

**وَدِعَ المكانُ رَدَغـاً**: شـوێنەكە قـوڕاوی بـوو یان قوڕی زۆر بوو.

**أرْدَغَ المكانُ**: شوێنەكە قوڕی زۆر بوو.

**أرْدَغَ فلان**: فلانكەس لەقوڕ چەقی.

**ارْتَدَغَ فلان**: بەمانا (أردغ)دێ.

**الرَّدْغَةُ**: قوڕێ زۆر ٥ (ك: رِداغ ورَدْغ).

**المَرْدغـة**: بـاخی ڕازاوەو جـوانو تـەڕ ٥ دەماغ ٥ نێوان گەردنو قوڕقوڕاگە ٥ گۆشتی نێوان شانو ئێسقانی سنگ، یان گۆشتی سنگ.

**رَدَفَـهُ رَدْفـاً**: لـەدواوەی سوار بوو، بـوو بەپاشـكۆ ٥ شـوێنی كـەوت ٥ (رَدَفَـهُ أمرٌ): كارێـكی گرنگ پەخەی گرت ٥ توشـی ئاسـتەنگ بـوو ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿قُـلْ عَسَـى أن يَـكونَ رَدِفَ لَـكم بَعْضُ الَّذِي تَسْتَعْجِلُونَ﴾.

**أرْدَفَ**: بەشـوێن یـەك دا هـاتن، ڕێچكەیان بەست.

**أرْدَفَ فلانـاً**: بـەدوا فـلان دا هـات ٥ شوێنی كەوت ٥ لەدواوەی سوار بوو.

**رادفَت الدّابّةُ**: پشتی وڵاخەكە جێگای ئـەوەی لـی بـۆوە لـەدوا سـوارەكە یەكێـكی تـریش سواری بێو ببێتـە پاشكۆ، یان وڵاخەكەی توانای ئەوەی هەبوو، وێرای سوارەكە پاشكۆكەش بتوانێ.

**إرْتَدَفَ فلان**: لەپاشـكۆی هاوەڵەكەیـەوە سوار بوو.

**إرْتَدَفَ فلاناً**: فلانكەسی لەدوا خۆیـەوە سواركرد.

**ترادفـا**: شـوێن یـەك كـەوتن ٥ یـەكیان لـەدوا ئـەوی تریـان سـوار بـوو، بـوو بەپاشكۆی ٥ یارمەتی یـەكتریان دا ٥ (ترادفـت الكلمتـان): لـەنێوان دوو وشەكان دا تەرادوف هەیە.

**تَرَدَّفَهُ**: بەمانا (رَدِفَهُ)دێ.

**استَرْدَفَهُ**: داوای لی کرد لەدوا خۆیەوە سواری بکا.

**الترادف**: ئەوەیە دوو وشە یەك مانایان هەبێ ٥ هەروا چەند وشەیەك یەك مانا ببەخشن.

**الرَّادِفَةُ**: فوکردنی دووەمجار بەکەرِنای صوردا لەرۆژی قیامەت ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿یَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ، تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ﴾ ٥ هەروا بەمانا سمتو کەفەڵ دێ ٥ (ك: روادف).

**الرِّدافُ**: شوێنی سواربوونی پاشکۆی سوار کەلە کلۆتی ولاخەکە تێدەپەرێ بۆلای پشتی.

**الرُّدَافي**: ئەو کەسەی لەدوا سوارەوە سوار دەبێ (پاشکۆ) تاکەکەی (ردیف) ٥ دالاشی بچوك ٥ واشە، باشو، باڵندەیەکی گۆشت خۆرە، زۆر گورجو گۆڵە ٥ دەگوترێ: (جاءوا رُدافى): بەشوێن یەك داهاتن، یان هەندێکیان لەپاشکۆی هەندێکیانەوە سواربوون.

**الرِّدافَةُ**: پلەو مەقامی جێگری پاشا ٥ بریکاری مەلیك.

**الرِّدْفُ**: سوار لەپاشکۆی سوار ٥ هەرشتێك سوار بیخاتە پاشکۆی خۆیەوە ٥ شوێنکەوتە ٥ دواوەی هەرشتێك ٥ سمتو کەفەڵ ٥ ئاکامو ئامانجی شت ٥ ئەستێرەیەکە بەشوێن ئەو چوار ئەستێرەوە دێ کە مەجەرە دەبرِن ٥ خەلیفەی پاشا کە لەسەردەمی نەفامی دا لەپاڵ پاشا دادەنیشتن و دوای پاشا شەرابی دەخواردەوە بەکوردی خۆمان پێی دەڵێین وەزیری دەستە راست، هەرکاتێ مەلیك بچوبایە بۆ شەرِ ئەو لەشوێنی فەرمانرِەوایی کردووە.

**الرِّدْفانِ**: شەوو رۆژ ٥ ئەو دوو کەشتیەوانەی لەدوای کەشتیەوە سواردەبن.

**الرَّدِيفُ**: سواری پاشکۆی سوار، ئەو کەسەی لەدوا سوارەوە سوار دەبێ، کەسێك لەخزمەتی سەربازی رزگاری دەبێ، وەکوو سەربازی یەدەك لەکاتی پێویست دا بانگ دەکرێتەوە بۆ هاوبەشی کردن لەجەنگ ٥ (ك: أرداف، ردفاء).

**رَدَمَ الشَّيْءُ رَدْماً**: شتەکە دەوامی کرد.

**رَدَمَ الشجرُ**: درەختەکە سەر لەنوێ سەوز بۆوە.

**رَدَمَ البابَ والثلمةَ**: دەرگاکە یان کەلێنەکەی گرت.

**رَدَمَ الحُفرةَ**: گڵی کردە چاڵەکەوە.

**رَدَمَ الثَّوبَ**: کراسەکەی پینە کرد، یان قەدی کرد.

**أرْدَمَ**: بەردەوام بوو، دەگوترێ: (أردمت

عليه الحمّى) نەخۆشی لەرزو تاكەی بەردەوام بوو.

رَدَّمَ الثَّوبَ: بەمانا (رَدَمَهُ) دێ، دەگوترێ: (رَدَّمَ كلامَهُ): قسەو ئاخاوتنەكانی راست كردنەوە ٥ بەقسەكانی دا چووەو هەڵەكانی لابردن، هەڵەبڕی كرد.

إرْتدم: بۆ موطاوعەی (رَدَمَ)دێ.

تَرَدَّمَ الثَّوبُ: كراسەكە كۆن بوو تاوای لێ هات پێویست بوو پینەی بكا.

تَرَدَّمَ الخصومَةُ: كێشەكە درێژەی كێشا.

تَرَدَّمَتْ المرأةُ على ولدها: ئافرەتەكە سۆزی بۆ منداڵەكەی بوو.

تَرَدَّمَ الثَّوبَ: كراسەكەی پینەكرد.

تَرَدَّمَ الكلامَ: بەقسەكانی دا چووەوە تا هەڵەبڕی كردو ڕاستی كردەوە.

تَرَدَّمَ فلاناً: شوێن هەڵس‌و كەوتی فلان كەوت تا بەتەواویی لێی رون بۆوە.

الأَرْدَمُ: كەشتییەوان یان كەشتییەوانی كاراما.

الـرُّدامُ: ئادەمیزادی خوێڕی‌و بێ كەڵك‌و ترگەن.

الـرَّدْمُ: ئەو خشت‌و خۆڵەی لەدیواری روخاو دەكەوێتە خوار ٥ بەربەستی گەورە، وەكوو سەددی یەئجوج‌و مەئجوج ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا﴾ ٥ (ك: رُدُومٌ).

الرِّدْمُ: پۆشاكی ڕزیوو كۆن.

الرَّدِيمُ: بەمانا (الرِّدمُ) دێ ٥ (ك: رُدُمْ).

الرَّدِيمَةُ: مێینەی (الرَّديم) ٥ دوو كراس تێك هاڵێن.

المُتَرَدَّمُ: ئەو شوێنەی لەپۆشاك پینە دەكرێ ٥ ئەو كەسەی پینە دۆزی دەكا.

رَدَنَ ردناً: حەریرو مەنتۆیەكەی ڕست، بای دا، یان بەتەشی ڕستی، دەگوترێ: (رَدَنَ الثوبَ): پۆشاكەكەی بەتەشی ڕست.

رَدَنَ السِّلاحُ: چەكەكان بەسەریەك دا كەوتن، دەنگیان لێ هات.

رَدَنَ المَتَاعَ: كاڵاكانی ریز بەند كردن.

رَدِنَ الجلدُ رَدَناً: پێستەكە گرژ بوو وێكهاتەوە.

أرْدَنَ: بەردەوام بوو.

أرْدَنَ العرقُ: ئارەقەكە بۆگەنی لێ هات ٥ بۆگەنی كرد.

أرْدَنَ القَميصَ: قۆڵ‌و فەقیانەی بۆ كراسەكە كرد.

رَدَّنَ القميصَ: بەمانا (أرْدَنَهُ) دێ.

إرْتَدَنَ: تەشی پەیدا كرد.

رودَنَ: ماندوو زەعیف بوو.

الأَرْدَنُ: جۆرێكە لەئاوریشمی سور (دێباجی سور).

**الرَّادن**: زەعفەران ○ (أحمر رادنيّ) سوری تێکەڵ بەزەرد.

**الرُّدنُ**: قۆڵ ○ (ك: أردان وأردنة).

**الـرَّدنُ**: رێـسراو، بـادراو ○ جۆرێـکی ئاوریشم یان حەریر ○ ئەو شتەی لەگـەڵ منـداڵ دێتـە دەر لـەکاتی لەدایك بوون دا.

**الرُدَيْنـي**: رمـبی رودەینـی ○ رودەینـە ئافرەتێـك بـوو کـاتی خـۆی رمبـی راسـت کردونـەوە چـەخماخ سـازی رمب بووە.

**المِرْدَنُ**: تەشی، خەرەك ○ (ك: مَرادن).

**المُرْدِنُ**: (عرق مُرْدِنٌ): ئارەقێکی بۆگەنە هەموو جەستەی گرتۆتـەوە ○ (ليـل مُرْدِن): شەوێکی تاریك.

**رَدَمَ** فلان ردماً: فلانکـەس بـوو بەگـەورەو سـەرکردەی گەلەکـەی بـەهۆی ئازایەتیو پیاوەتی خۆیەوە.

**رَدَمَ البَيْتَ**: خانوەکەی گەورە کرد.

**رَدَمَ فلاناً**: بەردی لەفلانکەس گرت، بەرد بارانی کرد ○

**الـرَّدِهُ مـن الرجـال**: پیـاوی ئـازاو قیرسیـچمەو لێـزان کەبـەهیچ شێوەیەك تێنەکەوێ.

**الرَّدْهَـةُ**: گـەورەترین خـانوو، یـان مەدخـەلو ڕێـڕەوی خانوێـك کـە دەرگـای زورەکـانی لەسـەر بـن ○ قوللەو تۆپەڵاکی رەبیەو مەخفەر ○ سـەنگەری گـەورەی بەبـەرد بنیـات نراو ○ بـەرداو حـەوزاوی نـاو شاخو کێـو، یـان بـەردی زل لـەناو ئـاودا ○ بەفراو کەدەبێتە نیمچە لافاوێك.

**رَدَى الفَرَسُ** ردياً ورديانـاً: ئەسپەکە پـێ کۆڵی کرد، لەکاتی رۆیشتنو غاردان دا بەسمی گڵی بەرزکردەوە.

**رَدَى الغـرابُ**: قاچێـکی هـەڵبڕیو لەسـەر قاچێك رۆیشت.

**رَدَى الغلام**: منداڵەکە قاچێـکی هـەڵبڕیو بۆیـاریکردن لەسـەر قاچێـکی رۆیشت.

**رَدَى فلان**: فلانکەس رۆیشت، دەگوترێ: (ما ادری أين ردى): نـازانم بـۆ کوێ چوو.

**رَدَى في البئر**: کەوتە ناو بیرەوە.

**رَدَى غَنَمُهُ**: مەڕو بزنەکانی زیادیان کرد.

**رَدَى علـى الـستين مـن عمـره**: تەمـەنی لەشەصت ساڵ تێپەڕی.

**رَدَى الإنـسـان وغـيره بـالحجر**: بـەردی لەئادەمیزادەکە گرت.

**رَدَى الحجـر بحجـر أو بمِعْـوَل**: بـەردی بەبـەرد کێشا یـان کـوێنی بەبەرد کێشا بۆئەوەی بیشکێنێ.

**رَدَى فلانـاً**: فلانکـەس ڕو بـەڕوی فـلان بۆوە.

**رَدِيَ** رَدَىً: فەوتا، تێدا چوو.

**رَدِيَ في الهُوَةِ**: کەوتە ناو چاڵەکەوە.

**أرْدَى على الستين**: تەمەنی لەشەصت تێپەڕی.

**رَدِيَ فلاناً**: فلانکەسی بەهیلاك برد، کوشتی ◦ خستی ◦

**رادى عنه**: داکۆکی لێ کرد، بەرگری لێ کرد.

**رَدّاه**: ڕیدای کردە بەری ◦ بەری دایەوە.

**ارتدى الرِّداءَ**: ڕیدای لەبەر کرد.

**ترادَوا بالحجارة**: شەڕە بەردیان کرد.

**تردّى بالرداء**: ڕیدای لەبەر کرد.

**تردّى في الهوة أو من عال**: کەوتە چاڵەوە، یان لەبەرزییەوە کەوتە خوار.

**الرِّداءُ**: ئەوشتەی لەسەر پۆشاکەوە لەبەر دەکرێ وەکوو جوببەو عەبا ◦ کراسێك لای زۆروی جەستە داپۆشێ‌و بگاتە زوور دەرپێ ◦ قوماشێکی تایبەتی ڕاست‌و چەپ بەشان دا دەدرێ پێی دەگوترێ وشاح، یان بەرو بەرموری ئافرەت ◦ (رِداءُ الشمس): جوانی‌و روناکی خۆر ◦ (رِداءُ الشباب): تەڕو تازەیی گەنج، دەشگوترێ: (هو خفيف الرِداءَ): کەم خێزانەو قەرزی زۆر لەسەر نییە یان قەرزدار نییە.

**الرَّدى**: هیلاك‌و تێدا چون ◦ زێدەو پاساو.

**الرَّداةُ**: بەردی زل.

**الرِّدْيَةُ**: شێوەی جل‌و پۆشاك پۆشین.

**المِرْدى**: بەرد ◦ بەردی زل‌و قورس ◦ بۆیە بەپیاوی ئازا دەگوترێ: (هو مِرْدى الحروب): یان (مِرْدى الخصومة): پشو درێژە.

**المِرْدَاةُ**: بەردێکی سەختە بەردی تری پێ دەشکێندرێ ◦ حوشتری تۆکمەو بەهێز ◦ قاچی حوشتر.

**المُرْدِيُّ**: سەوڵی کەڵکەوان‌و بەلەم، یان دارێکی درێژە خاوەن بەلەم بەلەمەکەی پێ لەزموی دوور دەخاتەوە بۆناو ئاو.

**رذّت السماءُ رَذاذاً**: ئاسمان سیخواری باراند، یان وردە بارانی زۆر وردی باراند، دەگوترێ: (باتت السماء ترُذُّنا).

**أرَذّت السماءُ**: بەمانا (رَذ تْ) دێ.

**الرَّذاذُ**: بارانی زۆر وردی لەسەر خۆی بەردەوام بەجۆرێك کە دەڵێی تۆزو غوبارە.

**المِرْذاذُ**: ئامێرێکە شلەمەنی بڵاو دەکاتەوەو دەیپرژێنێ وەکوو تەپو تۆز.

**الرَّوْذَقُ**: ئەو بەرخەیە بەسەر بڕاوی

دەخرێتە ناو ئاوی گەرمەوە بۆ ئەوەی هیچ تاڵە مویەکی پێوە نەمێنێ و سور بکرێتەوە ٥ گۆشتی کوڵاوو تێکەڵ کراو بە تەوابیل و داوو دەرمان ٥ پێستی ئاوەڕوتکراو.

رَذْلَهُ: بەڕەزیل و پیسکە ناوی برد.

رَذُلَ: ڕەزیل بوو.

أرْذَلَ فـلان: فلانکەس کرداری ڕەزیلانەی کرد.

أرْذَلَ الشَّيْئَ: شتەکە بەپوچ لەقەڵەم دا، دەگوترێ: (أرْذَلَ الغَنَم، وأرذَلَ الصيرفيّ النقود): مەڕەکەی بەلاوە پەسەند نەبوو، پارە گۆڕەکە پارەکەی بەقەڵب زانی.

استرْذَلَهُ: بەهیچ و پوچ و بێ کەڵک و خراپی لەقەڵەم دا.

أرذل العمر: دوا دوای تەمەنی پیری و کەنەفتی.

الرّذالُ: بەمانا (الأرذل) دێ.

الرُّذالَةُ: بەمانا (الرُّذالة)دێ.

الرَّذْلُ: بەمانا (الرّذال) دێ ٥ (ك: أرْذُل أرْذال) ٥ (ثوب رِذلٌ): پۆشاکێکی جلکنی خراپ.

الرَّذيلُ: بەمانا (الرُّذال)دێ ٥ (ك: رُذلاءُ، رِذال، رُذالی).

الرَّذيلة: ڕەوشتی ناشیرین ٥ پێچەوانەکەی (الفضيلة)یە.

رَذَمَ رذماً ورذماناً: پڕبوو تالێوان ڕێژ بوو، دەگوترێ: (رَذَمَ المكيالَ).

رَذِمَ رَذَماً: بەمانا (رَذَمَ)دێ، دەگوترێ: (قِدْرٌ رَذِمَةٌ).

أرْذَمَ: بەمانا (رَذَمَ)دێ ٥ زیاد بوو، تێپەڕی، دەگوترێ: (أرْذَمَ على الخمسين): تەمەنی لەپەنجا تێپەڕی.

الرُّذْمُ: کۆمەڵ کۆمەڵ، باقە باقە، دەگوترێ: (رأيت رذماً من الناس).

الرُّذُومُ: شلەمەنی لەهەر شتێک بێ، دەگوترێ: (قصعة رذوم): لەگەنەکە لێوان لێوەو لێی دەڕژێ ٥ (عظم رذوم): ئێسقانەکە مۆخی لێ دەکەوێتە خوار.

الرُّوْذَمَةُ: شێوە ڕۆیشتنی وڵاخ.

رَذِيَ رذاوةً: زەعیف بوو ٥ نەخۆشی برستی لێ بڕیوە.

رَذِيَ الناقَةُ: حوشترەکە بەهۆی زۆر ڕۆیشتنەوە لەپەل و پۆ کەوتووە.

أرْذى فـلان: فلانکەس حوشترو وڵاخەکانی لەپەل و پۆ کەوتن.

أرْذى فلاناً: وڵاخی ماندوو شەکەتی دا بەفلان.

أرْذى ناقَتَهُ: حوشترەکەی ماندو کردو لەکاروان دوای خست.

أرْذيَ الرَّجُلُ: نەخۆشی پیاوەکەی لەپەل و پۆ خست.

المُرذي: فڕێ دراوو خوێڕی کراو.

رَزَأَه رُزْءً ومَرْزِئَةً: توشی بەلای کرد.

رزاه رزيئةً: بەلای توش بوو.

رَزَأَ مَالَـهُ: شتێـکی لەماڵەکـە دەسـت کەوت کەم بوو.

رَزِئَهُ مالَهُ رُزءاً: بەمانا (رَزَأَهُ) دێ.

رُزِئَ وَلَدَهُ وبولَـدُهُ: بەمناڵەکەیـەوە تـوش بوو ٥ جەرگی سوتا.

رَزَّأَهُ: زۆری ماڵ خـەرج کـرد، مـاڵی زۆر خورا، دەگوترێ: (انه لكريم مـرزّأ): سەخییەو زۆری ماڵ دەخورێو سود بەخشە بۆ خەڵك، هەروا دەگوترێ: (نحـن قـوم مُـرزّءون) ئێمـە نەتەوەیـەکین زۆرجـار توشـی ئـەوە دەبـین باشـترین مـاڵو چـاکترین مرۆڤمان تێدا دەچێ.

إرتَزَأَ الشَّيْءَ: شتەکە کەمی کرد.

إرتَزَأَ فلاناً: ماڵی فلانی خوارد.

تـرازءوا الأمـوالَ: هەندێـکیان مـاڵی هەندێـکیان هەڵـگرتو بۆخۆیـان برد.

الرُّزْءُ: بەڵاو کارەسات.

الرَّزيئـة والرزيّـة: هـەردوکیان بـەمانا (الرّزء) دێن ٥

المَرْزِئَةُ: بـەمانا (الـرُّزْءُ) دێ، دەگـوترێ: (نحن وفد التهْنِئة لا وفد المَرْزِئة): ئێمە شـاندی پیرۆزبـایین نـەك شـاندی سەرەخۆشی.

رَزَبَ على الأرض رزباً: کەوتە سەر زەویو نەیتوانی هەڵسێ، یان لە شوێنێـك نیشتەجێ بوو بەجێی نەهێشت.

الإرْزَبُ: پیاوی کورتەباڵای چوارشانەی بەهێزو توانا ٥ پیاوی گەورە.

الإرزَبُ: چـەکوچو کـوینی گـەورە کـە بـەردی پـێ دەشـکێ ٥ گۆچـانو عەصایەکی ئاسن ٥ (ك: أرازِب).

المِـرْزابُ: پلوسـك ٥ بـۆری ئـاو کەلەبەرزییـەوە ئـاوی پێـدا بێتـە خوار ٥ کەشتیو بەلـەمی درێـژ یان گەورە.

المَرزُبَانُ: پاشای فارس، یان پیاوی ئازاو بەجـەرگو فەرمانـدەی گـەل پلـەی لەخوار پاشاوە دێ.

رَزَحَ البعيرُ رزاحاً ورزوحاً: حوشترەکە لاواز بوو پـاڵ کـەوت نـەیتوانی هەڵسێ ٥ (هو رازح) ٥ (ك: روازح، رزاح،...).

رَزَحَ فلان: فلانکەس زەعیف بوو هەرچی هەیبوو فەوتا.

رَزَحَ فلانـاً بـالرمح رزحـاً: بەسـەرە رمـب فلانکەسی راپێچ کرد.

أرزَحَ الكَـرْمَ: تولـە مێوەکـەی بـەرز کـردەوە دوای ئـەوەی کـەوتبووە خوار.

رَزَّحَـهُ: کـزو لاوازی کـرد، دەگـوترێ:

(رزَحته الأسفار): سەفەرو هاتوو چۆ ماندوو شەکەتی کردوە.

ترازَحَ: بەمانا (رَزَحَ) دێ، دەگوترێ: (ترازحت حالُهُ) حاڵی خراپ بوو.

المِرْزَاحُ من الإبل: بەمانا (الرّازِحُ) دێ.

الْمَرْزَحُ: زەوی دەشت‌و سارا.

المِرْزَحُ: قەلاَنگ کە تولە مێوی پێ لەزەوی بەرز دەکرێتەوە ٥ دەمنگ ٥ (ك: مرازح).

المِرْزَحَةُ: ئەو قەلاَنگەی تولەمێوی بەسەر یەکدا کەوتووی پێ بەرز دەکرێتەوە.

المِرْزِيحُ: دەمنگ ٥ (ك: مرازيح).

رَزَخَهُ بالرُّمْحِ ونحوه رزخاً: بەرمب‌و شتی وا لێی دا.

المِرْزَخَةُ: هەرشتێك بریندار کردنی پێ بکرێ وەکوو شیرو رمب‌و خەنجەرو چەقۆو کێرد ٥ (ك: مرازخ).

الرُّزداقُ: شوێنێك گوندو هۆبەی لێ هەبن.

الـرُّزْدَقُ: ریزی ئادەمیزاد یان ریزە درەخت ٥ (ك: رزادق).

رَزْرَزَهُ: رایوەشاند، هەژاندی.

رَزْرَزَ الحِمْلَ: بارەکەی راست کردەوە.

رَزَّتِ السماءُ رَزّاً: بارانبارین خرمەو گرمەی پەیدا کرد.

رَزَّ الشَّيءَ في الشَّيء: شتەکەی چەسپاند لەشتەکەدا، دەگوترێ: (رَزَّا المسمارَ في الحائط): بزمارەکەی بەدیوارەکەدا داکوتا ٥ (رَزَّت الجرادةُ ذنبها في الأرض لتبيض): کوللەکە کلکی لەزەوی چەقاند بۆئەوەی هێلکە بکا.

رَزَّ البابَ: ئەلقەی دەرگاکەی رێك‌و پێك کرد.

رَزَّ فلاناً: فلانکەسی بریندار کرد.

أرَزَّت الجرادةُ: بەمانا (رَزَّت)دێ.

رَزَّزَه: چەسپاندی ٥ تەختی کردو کوتایەوەو پێ پەستی کرد، دەگوترێ: (رَزَّزْت أمرك عند فلان): کارەکەتم لای فلاّن بۆ جێ بەجێ کردی.

رَزَّ القِرطاسَ: کاغەزەکەی سفت‌و لوس کرد.

رَزَّ الطعامَ: خواردەمەنی لەبرنج بۆ دروست کرد، دەگوترێ: (طعام مُرَزَّز): خواردەمەنییەکە بەبرنج رازاوەتەوە.

إرْتَزَّ الشَّيْءُ في الشَّيْءِ: شتەکە لەناو شتەکەی تردا چەسپاو قایم بوو، دەگوترێ: (إرتزّ السهم في الهدف).

إرْتَزَّ البخيلُ عند السؤال: کابرای چروك‌و بەخیل بەردەوام بوو لەسەر نەبەخشین‌و رژدی ٥

خەجاڵەتو ریسوا بوو روی رەش بوو.

**الإرْزِيزُ**: هەورە تریشقەو گرمەو گۆڵە گۆڵ ٥ دەنگێك لەدوورەوە بێ ٥ دەنگ درێژو هەناسە درێژ ٥ لەرزینو هەژاندن، دەنکە تەرزەی ورد ورد.

**الرَّزَّازُ**: رەصاص.

**الرُّزُّ**: برنج.

**الرِّزُّ**: دەنگ، دەنگی نرم، یان دەنگ لەدوورەوە بێ ٥ دەنگی هەور، حیلەی ئەسپ ٥ خورە خورێ گەدە.

**الرُّزَازَةُ**: برنج فرۆش، چەڵتوك كەر، مەرەزە كەر.

**الرُّزَازُ**: برنج فرۆش.

**الرُّزَّةُ**: ئاسنێكە قفلی پێوە دەگرێ ٥ ئەڵقە ریز.

**الرَّزِيزُ**: دەنگ.

**المَرَزَّةُ**: ئەو شوێنەی برنجی تێدا كۆدەكرێتەوە،، خەرمانی چەڵتوك.

**رَزِغَ رَزَغاً**: كەوتە ناو قوڕەوە.

**أرْزَغَ**: كەوتە ناو قوڕەوە.

**أرْزَغَ الماءُ**: ئاوەكە كەم بوو.

**أرْزَغَ المحتفِر**: بیر هەڵكەنەكە گەیشتە قوڕ.

**أرْزَغَ المطرُ الأرضَ**: بارانەكە زەوی تەڕكردو لافاوی لێ هەڵنەسا.

**أرْزَغَ فلاناً**: رەخنەی لەفلان گرت، تانەی لێ دا، دەگوترێ: (أرْزَغ في فلان): زۆری ئەزیەتی فلانكەس دا ٥ بەچاوی سوكو بێ نرخ تەماشای فلانی كرد.

**ارتَزَغَ**: بەمانا (رَزِغَ)دێ.

**استرزغه**: بەزەعیفو لاوازی دانا.

**رازَغَهُ**: چاوو راوی لێ كرد.

**الرَّازِغُ**: لەقوڕ چەقیو لە قوڕدا وەستاو.

**الرَّزَغَةُ**: بەمانا (الرَّدَغَة)دێ.

**رَزَفَ رَزَيفاً ورزفاً**: دەنگی لی هات.

**رَزَفَ الإنسان والحيوانُ**: ئادەمیزادەكە یان حەیوانەكە لەترسا رایكرد.

**رَزَفَ الأمرُ**: كارەكە نزیك بۆوە.

**رَزَفَ اليه**: بۆلای چوو، لێی چووە پێش.

**أرْزَفَ الجَمَلُ**: حوشترەكە بۆڕاندی.

**أرْزَفَتْ النَّاقَةُ**: حوشترەكە لەترسا بەپەلە رۆیی.

**أرْزَفَ الجَمَلَ**: حوشترەكەی بەپەلە لێخوڕی، دەنەدەنەی دا بۆ خێرا رۆیشتن، دەگوترێ: (أُرْزِف القومُ): خەڵكەكە راونرا، بەڕاكردن دوایان كەوتن.

**رزَّفَ الجملُ**: حوشترەكە بۆڕاندی.

**الرُّزَّافَةُ**: (رزّافات البلد): دەورو بەری شار.

**رزقَهُ رَزْقاً**: رزقی پێ گەیاند، رزقی دا، بژێوی پێدا، دەگوترێ: (رزق الطائرُ

فَرْخَهُ): باڵندەکە خۆراکی بۆ بێچوەکانی پەیداکردو بۆی هێنان ٥ (رَزَقَ الأميرُ جُنْدَهُ): پاشا موچەو بژێوی بۆ سەربازەکانی دابین کرد.

رَزَقَ فلاناً: سوپاسی فلانی کرد.

إرْتَزَقَ الجُنديُّ وغيرُهُ: سەربازەکە ڕزقی خۆی وەرگرت.

إرْتَزَقَ اللهَ: داوای ڕزقو رۆژی لەخودا کرد.

الـرَّازِقُ: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا.

الرازقيُّ: جۆرە ترێیەکە پێی دەگوترێ ترێ تایەفی، یان عەرەقی دروستکراو لەو جۆرە ترێیە ٥ کراسی کەتانی سپی، یان هەر قوماشێکی تەنک، یان خوری کەتانەکە ٥ لاوازو بێهێز.

الرّازقيّةُ: مێینەی (الرازقيّ)یە ٥ شەرابی دروستکراو لەترێ تایەفی ٥ پۆشاکی کەتانی سپی.

الـرَّزَّاقُ: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا.

الـرِّزْق: هەرشتێک سوودی لێ وەربگیرێ، خواردەمەنی بێ یان پۆشاکو شتی تر بێ ٥ باران لەم ڕووەوە هۆکاری پەیدابوونی ڕزقو ڕۆژییە ٥ موچەو بەخشش.

الرِّزْقَةُ: ئەو ڕزقو ڕۆژییەی بەجارێک دەدرێت بە سەرباز.

الرِّزْقَةُ: ئەو موڵکو ماڵەی داهاتەکەی دابەش دەکرێ بەسەر مزگەوتو مجەورو کارمەندەکانی دا.

الرَّوازِقُ: باڵندەی گۆشت خۆرو دڕندەی چوار پێ.

الْمُرْتَزِقَةُ: بەکرێگیراو جاش ٥ ئەو سەربازانەی بەکرێو لەپێناو پارەدا شەڕدەکەن ٥ بەزۆری لەکەسانی بێگانە پێک دێن.

الْمَرْزُوقُ: خاوەن بەختو شانس.

رَزَمَ رزوماً ورزاماً: لەسەر زەوی چەسپاو وەستا ٥ لەماندو شەکەتی دا کەوتە سەر زەویو جوڵەی لێ بڕا، یان لەشوێنی خۆی مایەوەو نەیتوانی جوڵەبکا.

رَزَمَ علی قِرْنِهِ: بەسەر بەرامبەرەکەی دا زاڵ بوو.

رَزَمَ الشتاءُ رزمةً: زستانەکە سارد بوو.

رَزَمَ الحيوانُ: ئاژەڵەکە مندار بۆوە.

رَزَمَ بالشَّيْ: لەجیاتی شتەکە بردی.

رَزَمَتِ الأمُّ بـه: دایکەکەی بەوە لەدی هێنا.

رَزَمَ شيئاً: شتەکەی کۆکردەوە، یان کردییە باقەو بەستە، یان کردییە گوێنیو کارتۆنەوە ٥ (رزين الـرأي): را دروستو را پەسەندە.

الرَّوْزَنَةُ: کونی سەرگیراو، کورە خانە.

**الرُّزنامة**: رۆژنامە، نامیلکەیەکی بچوك کە زانیاری رۆژانەو هەفتانەو مانگانە لەخۆبگرێ ە بەڕێوەبردنی دابەشکردنی موچە بەسەر موچە خۆران دا.

**رَسَبَ في الماء رسباً ورسوباً**: چووە بنکی ئاوەکە.

**رَسَبَ التلميذ**: قوتابییەکە لەتاقیکردنەوەدا دەرنەچوو.

**رَسَبَ عيناه**: چاوی بەقوڵا چوو.

**أرْسَبَ فلانٌ**: فلانکەس لەبرسا چاوی بەقوڵا چوو.

**أرْسَبَ فلاناً**: فلانکەسی والێ کرد رۆچێ ە ببێتە بنکڵو بنکرِ ە لەحەدیث دا هاتووە دەربارەی دۆزەخیەکان دەڵێ: (إذا طفت بهم النار أرسبهم الأغلال): کە ئاگر حەواپان دەدا زنجیرەکان داپان دەگرنەوە بۆ بنکڵی ئاگر.

**الرّاسِبُ**: بار قوڵو لەسەرە خۆ ە (جبل راسب): کێوێکی چەسپاوو دامەزراو.

**الرُّسوبُ**: ئەو خڵتەو پڵتەیەی دەکەوێتە ژێر ئاو لەڕێرەوی جۆگاو جۆم دا.

**الرَّسوبُ**: شمشێری بڕندە کە لەبڕین دا گوم ببێ ە پیاوی عاقڵو لەسەرە خۆ.

**المراسِبُ**: کۆڵەکەو پایە ە بینای قایمو پتەو.

**المِرْسِبُ من السيوف**: شمشێری بڕندە ە (ك: مراسب).

**رَسْت**: یەکەم مەقامی حەوت مەقامە رەسەنەکانە، لەبواری مۆسیقادا.

**الرُّسْتاقُ**: بەمانا (الرُّزداق) دێ، واتە: چەند گوندو کۆمەڵە خانوێك.

**رَسِحَ رَسَحاً**: گۆشتی سمتی کەم بوو، ڕانی لەڕو لاواز بوون ە (هو أرْسَحُ وهي رَسْحَاءُ).

**الرُّسْحَاءُ**: ئافرەتی سمت لەڕو لاواز ە (ك: رُسْحٌ).

**رَسَخَ رُسوخاً**: لەشوێنی خۆی جێگیرو چەسپاو مایەوە.

**رَسَخَ الغديرُ**: زەلکاوەکە ئاوەکەی رۆچوو.

**رَسَخَ المطرُ**: ئاوی بارانەکە بەزەوی دا رۆچوە خوار.

**رَسَخَ العِلمُ في قلبه**: زانیارییەکە لەدڵی دا جێگیر بوو بەحەقیقەتی زانستیو شكو گومانی نەما.

**أرْسَخَهُ**: چەسپاندی.

**رَسْرَسَ البعيرُ**: حوشترەکە توانی راست بێتەوە.

**رَسَّتِ الجرادةُ رسًّا ورسيساً**: کوللەکە کلکی لەزەوی چەقاند بۆئەوەی هێلکە بکاو گەرا دابنێ.

**رَسَّ الشَّيْءُ فِي الشَّيْءِ**: شتەکە چووە ناو شتەکەی ترەوەو جێگیر بوو، دەگوترێ: (رسَّ الغرام في قلبه): عەشق و دڵداری لەدڵی دا چەسپا، (رسَّ السقم في جسده) نەخۆشی لەجەستەی دا جێگیر بوو.

**رَسَّ الشَّيْءَ رسًّا**: شتەکەی لەبیر چۆوە چونکە ماوەی زۆری بەسەردا تێپەڕی.

**رَسَّ البِئْرَ**: بیرەکەی هەڵکەند.

**رَسَّ خَبَرَ القَوم**: توشی خەڵکەکە بوو بەسەر کاروباریان دا ئاگادار بوو.

**رَسَّ له الخَبَرَ**: هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە.

**رَسَّ المَيتَ**: مردووەکەی ناشت.

**رَسَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی خستە ناو گڵەوە.

**أَرَسَّ**: چووە ژوورو جێگیر بوو، دەگوترێ: (أَرَسَّ السقم في جسده): نەخۆشی لەجەستەی دا جێگیر بوو.

**أَرَسَّ الشَّيْءَ**: نیشانەی بۆشتەکە دانا.

**رَسَّسَ البعيرُ**: حوشترەکە توانی راست بێتەوە.

**ارْتَسَّ الخَبَرُ**: هەواڵەکە بڵاو بۆوە.

**تراسُّوا الخَبَرَ**: هەواڵەکەیان بۆ یەکتر گێڕایەوە.

**الأَرْسُوسَةُ**: هەرشتێك سەری پێ داپۆشرێ جا مێزەربێ، کڵاوبێ هەرشتێکی تر بێ.

**الرَّسُّ**: کان و مەعدەن ○ بیرێك کەهەڵنەچنرابێ ○ بیرێك بوو لەناو قەومی ثەمود ○ سەرەتای شت ○ پاشماوەی شت ○ لایەنێکی شت، دەگوترێ: (به رسّ الحِمى): سەرەتای تای پێوە دیارە ○ (رسّ الحب): پاشماوەی دڵداری ○ (رَسٌّ من الخبر): لایەنێکی هەواڵ ○ (ك: رِسَاسٌ).

**الرَّسَّةُ**: پۆشاکی سەر کڵاو، مێزەر، عەگاڵ.

**الرَّسِيسُ**: سەرەتای شت یان پاشماوەی شت، دەگوترێ: (به رسيس الحُمى): سەرەتای لەرزوتای لێ دیاری داوە ○ شتی چەسپاو لەشوێنی خۆی ○ عاقڵی زیرەك، دەگوترێ: (ريح رسيس المس): شنەبایەکی خۆشە نەرم نەرم لەجەستە دەدا گەشەی پێ دەکا.

**رَسَعَت العينُ رَسْعاً**: چاوەکانی کوێربوون، پێڵوی چاوەکانی بەیەك دا نووسان.

**رَسَّعَ العضو**: ئەندامەکەی جەستەی لەکارکەوت کەڵکی نەما.

**رَسَّعَ الصَّبِيَّ وَغَيْرَهُ**: مێروی شینی لەقاچی منداڵەکە کرد یان مێروی شینی بەئاژەڵەکەوە هەڵواسی بۆ چاوەزار.

رَسِعَ فلان وَرَسِعَ به الشَّيْءُ: فلانكەس پێوە نووسا ٥ شتەکەی پێوە نووسا ٥ (هو أرْسَعُ وهي رسعاءُ).

رَسَّعَتْ عينُهُ: بەمانا (رسعت) دێ، دەگوترێ: (رَسَّعَ فلان): فلانکەس لەماڵەوە دانیشت، ماڵی بەجێ نەهێشت.

الرَّسَاعَةُ: سیرمەو گولێنکن بەدامێنی قایشی شمشێرەوە دەکرێن، قایشی لەشان کردنی شمشێر کەپێی دەگوترێ حەمایەڵ.

الرَّسِيعُ: پێکەوە نووساو ٥ لەزگێندراو.

المُرَسَّعُ: ئەومیە بەهۆی شەو بەخەبەری چاوی لێڵو وێڵبن.

المُرَسِّعُ: کەسێك پێڵوی چاوی پێکەوە نووسابن.

المُرَسِّعة: بەمانا (المُرَسِّعُ) دێ ٥ پیاوێك لەماڵ نەچێتە دەر.

المُرَسَّعةُ: نوشتەیەکە، هەندێ مێروو تەنتەنەن دەکرێنە دەستی منداڵەوە وەکوو بازنە بۆ چاوەزار.

رَسَغَ المطرُ رَسْغاً: ئاوی باران گەیشتە پشت قولەپێ.

رَسَغَ البعيرَ ونحوه: پەتی بەقاچی حوشترەکەوە بەست، بەستییەوە.

راسَغَهُ مُراسَغةً ورساغاً: لەکاتی زۆرانبازی دا باریکایی قاچی گرت.

رَسَّغَ: ژیانی بۆ خۆش کرد، دەگوترێ: (رَسَّغ عليه في العيش).

رَسَغَ في الكلام: قسەکانی هەڵبەستن.

رَسَغَ المطرُ: بەمانا (رَسَغَ) دێ.

ارْتَسَغَ على عياله: بژێوی باش و چاکی بۆ خێزانەکەی دابین کرد.

الرِّساغ: حەبلێکە قاچی حوشتر یان هەر ئاژەڵێکی تری پێ دەبەسترێتەوە بەم جۆرە سەرێکی حەبلەکە لەقاچی توند دەکرێ و سەرەکەی تری بە سنگێکەوە دەبەسترێ.

الرُّسْغُ: بەمانا (الرِّساغ)دێ ٥ جومگەی دەست نێوانی قۆڵ و لەپەدەست، یان نێوان بەلەك و پوزو قولەپێ ٥ (ك: أرساغ وأرسُغُ).

الرَّسَغُ: شلایی قاچی حوشتر ٥ نەرمایی قاچی حوشتر.

الرَّسِيغ: بەرفراوان، زۆرو زەبەندە، دەگوترێ: (عيش رسيغ): ژیانی خۆش و هەرزانی ٥ (طعام رسيغ): خواردنی زۆرو زەبەندە.

المُرَسَّغُ: رای نابەجێ، دەگوترێ: (رأي مُرَسَّغٌ).

رَسَفَ في القيد رسفاً ورسفاناً ورسيفاً: هێواش هێواش بەپێوەندەوە رۆیی.

أرْسَفَ الإبلَ: بەپێوەندەوە حوشترەکەی راونا.

رَسِلَ البعيرُ رَسَلاً: حوشترەکە رۆیشتنی

٥ (رَهِقَ قـدوم فـلان): هاتنـەوەی فلان نزيك بووەوە.

**رَهِقَ الشَّيءَ** رهقاً: شتەكە نزيك بووە جا كابراكە شتەكەی دەست بكەوێ يان نا، پێی بگا يان نا.

**رَهِقَ الـشَّيءُ فلانـاً**: شتەكە لـەفلان نزيك بـووەو پـێی گەيـشت، دەگـوترێ: (رَهَقَـه الـدينُ): قەرزەكـەی وەختـی هات.

**أرْهَقَ الليلُ**: شەو نزيك بوەوە.

**أرهق فلانـاً**: كارێـكی خسته سەرشانی فـلان كـەبۆی هەڵناسـوڕێ، بـۆی ئەنجام نادرێ.

**أرْهَقَ الليلُ فلانـاً**: شەو لەكابرا نزيك بـوەوە، شــەوی بەســەر هــات، دەگوترێ: (أرهقنا الليلُ).

**أرهــقَ الـصلاةَ**: نوێژەكـەی دواخـست تاكەوتـە نزيكـی كـاتی نوێژێـكی ترەوە.

**أرهــق فلانــاً**: پەلـەی لـەفلان كـرد، دەگوترێ: (أرهـق فـلان ان أصـلي): فلانكەس پەلەی لێ كردم كە نوێـژ بكەم.

**ارهــق فلانــاً شــيئاً**: شتێـكی بەسـەر فلانكەس دا دا دايپۆشێ، دەگوترێ: (أرهقه حساماً): بەشمشێر دايپڵۆسـی ٥ (أرهقناهم الخيل): بەئەسپ دوايـان كەوتين ٥ (أرْهَقَه إثماً): تاوانی خستە سەرشانیو تاوانباری كرد.

**راهَـق الغـلامُ**: گەنجەكە خەريكە باڵـغ ببـێ، دەشـگوترێ: (راهــقَ الغــلام الحُلُـمَ) ٥ هـەروا دەگـوترێ: (صـلی الظهر مراهقاً): نوێژی نيوەڕۆی كـرد لەدواكات دا، خەريكبوو كاتی نوێژی عەصر دابێ.

**الرُّهــاق**: ئەنـدازە، دەگـوترێ: (القــوم رهاق مائـة): قەومەكـە بەئەنـدازەی سەدكەس دەبن.

**الرَّيهقان**: زەعفەران.

**المُراهقة**: لەكاتی باڵغ بوونەوە تا دەگاتە تەمەنی رەشيدبی.

**المُرَهَّقُ**: كەسێك بێ عەقڵو كاڵفام بێ ٥ سـەخی سروشــتو نانبدەيــەكی وەهــا هەميــشە ميـوانی هــەبێ ٥ پيــاوی خــوێڕیو خراپــەكار ٥ كەسێك تۆمەتی بێدينی لێ بكرێ.

**رَهَكَ** بالمكـان رَهْكـاً: لـەو شوێنە مايەوە، جێگير بوو.

**رَهَكَ الشَّيءَ**: شتەكەی باريك كـرد، وردی كرد، هاڕی.

**رَهَكَ** الدابَّةَ: ولاخەكەی بەلێخوڕين مانـدو كرد.

**رَهْوَكَ**: بـەهۆی ڕۆيشتنەوە جموژگـەكانی شل بونو نەيتوانی بڕوا.

**رَهْـوَكَ القــومُ**: خەڵـكەكە تێـكيانەوە هاويــشت كەوتنـــە خرۆشـــان.

**اِرْتَهَكَ**: جموژگەكانی شل بوونەوە بەهۆی زۆر رۆیشتنو ماندوو بونەوە.

**تَرَهْوَكَ**: رۆیشتن بەشێوەیەك كەشەپۆل بهاوێ.

**الرَّهكَةُ**: لاوازیی.

**الرُّهْكَةُ**: لەرو لاوازێكی بی خێرو بێر، دەگوترێ: (رجل رُهكة، وناقة رُهكة) ٥ (أرض رُهكة): زەوی نەرمو روخەك.

**الرُّهْوَكُ**: گەنجی نەرمو نیانو تەڕدەماخ ٥ ئاسكی قەڵەوو كارژیلەی قەڵەوو تۆپن.

**رَهِلَ لَحْمُهُ رَهَلاً**: گۆشتی شلو داچۆڕاو بوو، هاوسا، جەستەی فش بوو.

**رَهَّلَهُ**: وای لێ كرد گۆشتی جەستەی شلو داچۆڕاو بێ ٥ بهاوسێ.

**رَهَّلَهُ النوم**: زۆر نوستن پێڵوی چاوی هاوساندون.

**تَرَهَّلَ**: بەمانا (رَهِلَ)دێ.

**الرُّهَلُ**: ئەو ئاوە زەردەیە كەلەگەڵ منداڵ دا دێتە دەرەوە لەكاتی لەدایكبوونی دا.

**الرَّهْلُ**: تەنكە هەور كەوەكوو دیمەنی شەونم دەچێ.

**رهمت الأرضُ**: زەوییەكە بەردەوام بارانی ورد لێی دا، دەگوترێ: (مكان مرهوم وروضة مرهومة).

**أرهمت السَّحابةُ**: هەورەكە وردەبارانی بەردەوامی باراند.

**أرهم الربيعُ**: بەهار وردە بارانی بەردەوامی زۆر بوو.

**الرُّهْمانُ في سير الإبل**: لۆژە لۆژی رۆیشتنی حوشتر لەبەر كزو لاوازیی.

**الرِّهْمَةُ**: بارانی زەعیفو بەردەوام.

**الرَّهومُ**: مەڕی لەرو لاواز.

**رَهْمَسَ فلان**:فلانكەس هەڕەشەی لێكرد.

**رَهْمَسَ الأمْرَ**: كارەكەی شاردەوە.

**رَهْمَسَ الخَبَرَ**: بەشێكی لەهەواڵەكەی ئاشكرا كردو هەمووی رون نەكردەوە.

**رَهْمَسَ فلاناً**: فلانكەسی كەیف خۆش كرد.

**رهن الشَّيْءُ رَهْناً ورهوناً**: شتەكە چەسپاو بەردەوام بوو.

**رَهَنَ بالمكان**: لەوشوێنە جێگیر بوو.

**رَهَنَ الرجلُ والدابّةُ رهوناً**: پیاوەكە لاواز بوو، ماندو بوو.

**رَهَنَ الشَّيْءَ رهناً**: شتەكەی چەسپاندو دەوامی پێ دا.

**رَهَنَ فلان عند فلان الشَّيْءَ**: فلانكەس لەباتی قەرز شتەكەی لای فلان داناو

حەبسی کرد، دەشگوترێ: (رهْنُهُ لساني): زمانم لەئاستی ئەو بەند کردووە هیچی پێ ناڵێم.

أرْهَنَ في السلعة وبها: بۆ بەدەستهێنانی ئەو کاڵایە زۆری ماڵ دا تا دەستگیری بوو.

أرْهَنَ الشَّيْءَ: شتەکەی چەسپاندو بەردەوام بوو لەسەری.

أرهَنَ لهم الطعامَ والشرابَ: خواردن و خواردنەوەی بۆ دابین کردن.

أرْهَنَ الميتَ القَبْرَ: مردووەکەی خستە ناو گۆڕەوە.

أرهَنَ فلاناً وغيره: فلانکەسی لاواز کرد.

أرهن فلاناً الشَّيْءَ: شتەکەی لای فلانکەس رەهن کرد ٥ یان ئەو شتەی دا بەفلان بۆ ئەوەی لای یەکێکی تر رەهنی بکا.

راهَنَهُ على كذا مراهَنةً ورهاناً: گرەوی لەسەر ئەو شتەکرد.

إرْتَهَنَهُ منه: بەرەهن لێی وەرگرت.

تَراهَنَ القومُ: هەریەك لەو خەڵکە گرەویان کرد بۆئەوەی یەکێکیان بیباتەوەو بەهرەمەندبێ.

استرهَنَهُ: داوای رەهنی لێکرد.

الراهِنُ: ئامادەکار ٥ دەگوترێ: (هذا راهن لك): ئەوە بۆ تۆ ئامادەکراوە ٥ (طعام راهِنٌ): خواردەمەنیەکی بەردەوامە.

الراهِنَةُ: بۆ مێینەی (الراهن) بەکاردێ، دەگوترێ: (نعمة راهنة): نازو نیعمەتێکی هەمیشەییە.

الرِّهانُ: پێشبڕکێ ٥ (خيل الرهان): ئەسپی پێشڕەوی کردن ٥ لەپەندی پێشینانda هاتووە دەڵێ: (هما كفرسي رهان).

الرَّهْنُ: رەهن بریتییە لەبەندکردنی ماڵێك کە دادەنرێ لای بابای خاوەن حەق بۆئەوەی هەرکاتێك خاوەنی ماڵە رەهن کراوەکە نەیتوانی حەقی خاوەن حەقەکە بداتەوە لەوماڵە رەهن کراوە وەری بگرێتەوە، یان بڵێ ماڵێکە دادەنرێ لای تۆ لەبارتەقای ئەو ماڵەی لێت وەرگیراوە، دەشگوترێ: (الإنسان رهن عمله): ئادەمیزاد بارمتەی کردەوەکانیەتی، بەگوێرەی کردەوەکانی پاداش و سزای دێتەوەرێ، هەروا دەگوترێ: (أنا لك رهن بكذا): من بۆ تۆ بەرعودە دەبم بەو شتە.

الرِّهن: دەگوترێ: (رِهن مالٍ): بەڕێوەبەری ماڵ و سامانە سەرو کاری دەکا.

الرَّهين: دەگوترێ: (أنا رهين بكذا): من

بەرپرسیارم لەوەو بەرعودەی هەموشتێکی ئەوەم.

**الرَّهينة**: ئەو شتەی دەکرێتە رەهن ◊ بەرپرسیار.

**رها** رهْواً: هێدیو لەسەرەخۆ بوو ◊ لەسەرەخۆ رۆیشت ◊ دامرکاو هێدی بووە، دەگوترێ: (رَهَا البحرُ).

رها بين رجليه: نێوان دوو قاچی کرانەوە.

**أرْهى**: توشی شوێنێکی بەرفراوان بوو.

**أرهى الشَّيْئَ لك**: ئەوشتە بۆ تۆ گونجاوە، بۆ تۆ دەبێ.

**أرهى الشَّيْئَ لك**: ئەوشتەی بۆ تۆ گونجاند.

**أرهى لهم الشَّيْئَ**: شتەکەی بۆ ئێوە بەردەوام کرد.

**راهاه**: لێی نزیك بۆوە.

**إرتهى القومُ**: خەڵکەکە تێکەڵو پێکەڵ بوو.

**تراهيا**: خوداحافیزییان لەیەکتر کرد.

**أرهاء الشَّيْ**: ئەملاو ئەولای شت، قەراخو بیجاخی.

**الراهي**: (طعام راهٍ): خواردەمەنیەکی هەمیشەیی ◊ (عيش راهٍ): ژیانی خۆشیو بەناز پەروەردە.

**الرَّاهية**: مێینەی (الرهي)یە ◊ هەروا ناوە بۆ هەنگ لەم روەوە کە لەکاتی فرین دا پەلەقاژە ناکاو باڵ لێك نادا.

**الرَّهاءُ**: شوێنی فراوانو گوشاد ◊ دەگوترێ: (طريق رهاء): رێگایەکی پانو پۆڕو فراوانە، هەروا هەرشتێك وەکوو دوکەڵو تەمو مژبچێ.

**الرَّهْوُ**: شتی دامەزراوو بێ جوڵە ◊ هێدیو لەسەرە خۆ ◊ دەگوترێ: (مطر رهو): بارانی لەسەرە خۆ ◊ (بحر رهو): دەریای ڕاوەستاو ◊ (أفعلْ ذلك رهواً): ئەوکارە بکە بەکاڵە خۆ ◊ هەروا بەمانا پۆشاکی تەنك دێ ◊ شتی بڵاوو لێك جیابووەوە ◊ شوێنی پانو پۆڕ ◊ شوێنی نزماییو چاڵو زەلکاو ◊ پەلەوەری کورکی ◊ کۆمەڵی ئادەمیزاد (پێڕو تاقم).

**الرَّهْوَةُ**: شوێنی نزم لەزەوی کەئاوی تێدا کۆدەبێتەوە.

**المِرْهاةُ**: خۆشڕۆ ◊ دەگوترێ: (فرس مرهاة): ئەسپی تیژرۆیە.

**رهوك**: بڕوانە مادەی (رَهَكَ).

**رَهِيَا**: لاواز بوو نەیتوانی.

**رَهْيَات السماء**: ئاسمان ئامادەیە بۆ باران بارین، (رهيات السحابة): هەورەکە خەریکە باران ببارێنێ.

**رَهْيَا الشَّيْئَ**: شتەکەی تێکەڵو پێکەڵ کردو چاکی نەکرد.

**رَهْيَا رأيَهُ**: رايەكەی خۆی تێك دا ٥ ژێوان بۆوە.

**رَهْيَا في أمره**: سوور نەبو لە سەر كارەكەی.

**رَهْيَا الحِمْلَ**: لاتایەكی بارەكەی قورس تر كرد لەوی تریان ٥ چەندێك هەوڵ بدا بارەكە راست بكاتەوە هەر خوار دەبێ.

**تَرَهْيَا**: كەوتە جەو جۆڵو پەلەقاژە ٥ رارا بوو لەشتەكە، دەگوترێ: (تَرَهْيَاً في أمره): رارا بوو لەكارەكەی دا ویستی ئەنجامی بدا پاشان نەیكرد ٥ هەروا دەگوترێ: (عیناه تُرَهْیآن): پێڵوی چاوی بۆ راناوەستێ.

**ترهیا السحابُ**: هەورەكە خەریكە باران ببارێنێ.

**تَرَهْيَا في مَشْيِهِ**: لەرۆیشتن دا لارو لەنجەی كرد.

**رَوّا في الأمر تروئة وترويئاً**: لەكارەكە ورد بۆوەو تیی فكری خێرا بڕیاری لەسەر نەداو دەستبەجێ وەڵامی نەدایەوە.

**الـرّاء**: پیتێكە لەپیتەكانی هیجاء ٥ درەختێكە بەرێكی سپی یان سوری هەیە.

**الرَّوِيَّةُ**: تێفكرینو ورد بوونەوە لەشت.

**راب اللبنُ رَوْباً**: شیرەكە بزركا ٥ یان ماستەكە هەژێنراو رۆنەكەی جیاكرایەوەو دەرهێنرا.

**راب فلان**: فلانكەس سەرسام بوو ٥ گێژیی توش بوو بەهۆی تێری یان هەنۆزو خەوالوییی ٥ یان بەهۆی خواردنەوەی دۆی زۆرو ترش ٥ یان فلانكەس درۆی كرد ٥ عەقڵی تێك چوو ٥ رای ناپەسەند بوو ٥ هەروا دەگوترێ: (رابَ دَمُهُ): خوێنی حەلاڵ بوو ٥ كاتی لەناو بردنی هات ٥ كاتی سەربڕینی هات.

**أرَابَ اللَّبَنَ**: شیرەكەی مەیاند ٥ ترشاندی ٥ بزركاندی.

**رَوَّبَ اللَّبَنَ**: بەمانا (أرابَهُ)دێ.

**الأرْوَبُ**: پیاوی سەرگەردان ٥ یان كەسێك لەبرسان یان بەهۆی وەنەوزو نەنوستن سەنتەری تێك چوبێ.

**الرائب من الأمور**: كاری رێكو پێكو بێ موشكیلەو بێ شوبهەو گومان ٥ ئەم وشەیە ئەگەر لە (رَوَبَ) وەرگیرا بێ بەمانا گوماناویو شوبهەدارە ٥ لەحەدیثی ئەبوبەكردا هاتووە دەفەرموێ: (وعليك بالرائب من الأمور ودع الرائبَ منها) ٥ (الرائب)ی یەكەم لە (رَوَبَ)

وەرگـــیراوە (الرائـــب)ی دووەم لـــە (رَیَب)ەوە وەرگیراوە.

**الرَّابُ**: ئەنـدازە، دەگـوترێ: (هـذا راب کذا): ئەوە بەئەندازەی ئەومیە

**الـرَّوْبُ**: شـیری بزڕکـاو ترشـاو مـەییو، دەگــوترێ: (ماعنـــدي شـــوب ولا روب): نـە هـەنگوینم لایـە نـە دۆی ترشـاو ە لەحـــەدیــث دا هــاتووە: (لاشوب ولا روب في البیع والشراء): واتـــە نـــە غەشــکردن رەوایـــە نـــە تێـکەڵ کردنـی شـتی خـراپ بـەهی چاك.

**الرَّوبان مـن الرجـال**: پیـاوی غەشـکەر، گوماناوی.

**الرَّوْبـة**: هـەوێن ە خەمیرەیەکـە ترشـە دەکرێتــە نــاو ماســتو شــیرەوە بــۆ ئەوە بمەیێ.

**الرُّوبَـةُ**: بــەمانا (الرَّوْبــة)دێ ە شــیری بزڕکاو، ترشـاو ە چاککردنی ئـیشو کـار ە پێداویـستی ە بـژێوی ژیـان، دەگوترێ: (ما یقوم فلان بروبة أهله): فلانکــەس بــژێوی مــاڵو منــداڵی دابین ناکا ە هەروا ناوە بۆ زەوییەك زۆر بـــەپیتو فـــەرپێ ە پارچـــە گۆشت، دەگـوترێ: (قطع اللحم رُوبـة رُوبـةً) ە هـەروا نـاوە بـۆ سـەروکاری کردنی ئـیشو کـارو هەڵسوڕانیان ە بەشێــك لەشــەو ە عــەقڵو ئــاوەز، دەگـوترێ: (هـو یجـدلني وأنـا اذ ذاك غلام لیس لي رُوبة).

**المِرْوَبُ**: ئەو قاپەیە شیری تێدا دەکری بـــە پـــەنیر یـــان شـــیری تێـــدا دەمەیەندرێ ە (ك: مِرْواب).

**رَاثَ ذو الحـــافر رَوْثـــاً**: ئاژەڵـــە ســـم دوو قاقەکـــە ریخـــی کـــرد ە لەپەنـــدی پێشینان دا هـاتووە دەڵێ: (أَخُـثُكَ وتروثني): من گیاو گژت دەدەمێ تـۆ ریخـــم بـــۆ دەکـــەی، بەکەسێـــك دەگـوترێ، کـوفرانی نیعمـەت بکـاو چاکەی لەبەر چاو نەبێ.

**الرَّوْثُ**: کاوێژی ئـاژەڵی سـم دارە ە (ك: أرواث).

**الرَّوْثَـــةُ**: تـــاکی وشـــەی (الـــرَّوْث) ە کـــۆزەرەی گەنمـــە کـــە لـــەگەڵ گـــیرو بێـــــژنگ دادەمێنێتـــــەوە دوای لەبێژنگدانی گەنمەکە ە لایەکی لوت کەئاوی لـێ دێنـە خـوار ە دەنـدۆکی هەڵۆ.

**راجت السلعة رواجاً**: کاڵاکە برەوی بوو، داخوازی زۆر بون.

**راجـت الأمْـرُ روجـاً ورواجـاً**: بـەخێرایی کارەکە جێ بەجێ بوو.

**راجـت الـریحُ**: بایەکـە لـەزۆر لاوەهات، شوێنی هەڵبونەکەی زیاد لەجێیەك

بوو، نەزاندرا لەکوێوە هات.

**رَوَّجَ الغبارُ:** تەپو تۆزەکە درێژەی کێشا.

**رَوَّجَ السِّلْعَةَ:** برەوی بەکاڵاکە دا.

**رَوَّجَ کلامَهُ:** قسەکانی خۆی رازاندەوە ٥ قسەکانی خۆی چەواشە کردنو حەقیقەتیان نەزاندرا.

**الرَّوْجة:** پەلەکردن ٥ خێرایی.

**المُرَوَّجُ:** (أمرٌ مُرَوَّجٌ): کاری تێکەڵو پێکەڵ.

**راح** رواحاً: ئێوارە رۆیشت ٥ هەروەها وشەی (راح): بەکار دەهێنرێت بۆ رۆیشتن لەهەموو کاتێکی شەوو رۆژدا ٥ هەروا وشەی (الغُدُوّ): بۆ هەموو کاتێکی رۆیشتن بەکاردێ ٥ دەگوترێ: (راح القومَ وراح الیهم روحاً ورواحاً): چوو بۆلای قەومەکە.

**راح الإبلُ وغیرها:** حوشترەکە دوای مەغریب گەڕایەوە بۆ ئاغەڵەکەی.

**راح الیومُ:** رەشەباکەی توند بوو ٥ هەواکەی خۆش بوو.

**راح فلان للمعروف راحةً:** فلانکەس بۆ چاکەکردن جوستو چالاك بوو.

**راحت یدُهُ لکذا:** دەستی بۆ ئەوشتە سوك بوو.

**راح للأمر رواحاً وراحاً وراحة وأریحیةً:** بۆ ئەوکارە کەیف خۆشو تەڕ دەماخ بوو.

**راح فلان معروفاً راحةً:** فلانکەس بەچاکەکەی گەیشت.

**راح الشَّیئَ رَوْحاً:** شتەکە بەرفراوان بوو.

**رَوِحَ الرَّجُلُ:** پیاوەکە نێوان قاچەکانی پان بوو لای پەنجەکانی پانو لای پاژنە پێی تەسك ٥ (هو أروح وهي روحاءُ).

**أراحَ:** پشوی دا هەناسەی دا ٥ حەسایەوە ٥ مرد.

**أراحَ الشَّيْئُ:** شتەکە بۆگەنی کرد.

**أراح فلان:** فلانکەس کەوتە ئێوارە ٥ کەوتە ناو رەشەبا ٥ لەحوشترەکەی دابەزی بۆ ئەوەی حوشترەکەی بحەسێنێتەوە.

**أراحَ الإبلَ وغیرها:** حوشترەکەی گێڕایەوە بۆ ئاغەڵەکەی.

**أراحَ علیه حَقَّه:** مافەکەی بۆ گێڕایەوە.

**أراح فلاناً:** فلانکەسی خستە ئیستراحەتو خۆشییەوە.

**أراحَ منه معروفاً:** لەفلانەوە خێرو خۆشی پێ گەیی.

**أراحَ الشَّیْئَ:** بۆنی شتەکەی کرد.

**أرْوَحَ الشَّیْئُ:** شتەکە بۆگەنی کرد ٥

**رَاوَحَ بین الشیئین:** لەنێوان ئەو دووشتەدا یەکسانی نواند ٥ جارێك

دەستی بۆ ئەوشتە بردو جارێك بۆ شتەكەی تر ٥ دەگوترێ: (راوح بین جنبیه): هەردەمە لەسەر لاتەنیشتێكی راكشا ٥ (راوح بین رجلیه): هەرساتە لەسەر قاچێكی وەستا ٥ هەروا دەگوترێ: (أنا أغادیه وأراوحُهُ): جاری واهەیە بەیانی دەچم بۆلای، جاری واهەیە ئێوارە دەچم بۆلای، یان بەیانیو ئێوارە دەچم بۆلای.

رَوَّحَ علیه بالمِرْوَحَةَ: پانكەكەی خستە ئیش بۆئەوەی هەوای پاكی بۆ بێنێ ٥ هەواكە بگۆڕێ.

رَوَّحَ بالقوم: نوێژی تەراویحی بەخەڵكەكە كرد.

رَوَّحَ القومَ: ئێوارە رۆیشت بۆلای قەومەكە.

رَوَّح الدُهْنَ: بۆنی خۆشی تێكەڵ بەڕۆنەكە كرد بۆئەوەی بۆنی خۆش ببی.

رَوَّحَ فلاناً او الإبلَ: بەمانا (أَرَاحَ)دێ.

إرْتاحَ للأمر: دڵی بەكارەكە خۆش بوو.

ارتاح الله له برحمته: خودا لەبەلاو چورتم رزگاری كرد.

إرْتَوَحَ: نۆبەكردن، دەگوترێ: (هما یرتوحان عملاً): ئەو دووە بەنۆبە كاردەكەن.

تَرَاوَحَ: دەگوترێ: (فلان یداه تتراوحان بالمعروف): دەستەكانی بەردەوام دەبەخشن بەهەردوو دەستی خێرو پیاوەتی دەكا ٥ (تراوحا العملَ): بەهەردوو دەستی كاردەكا هەرساتەو دەستێكی لەكاردایە.

تراوحته الأحقاب: زۆر رۆژگاری بەسەردا تێپەڕی.

تَرَوَّحَ: ئێوارەو سەرەتای شەو دەستی كرد بە شەو رۆیی ٥ یان ئیشی تێدا كرد.

تَرَوَّحَ الشَّيْءُ: شتەكە بۆنی فلان شتی گرتووە چونكە لێی نزیك بوەوە.

تروَّحَ النَّبْتُ: روەكەكە درێژ بوو، بالای كرد.

تَرَوَّحَ الشجرُ: درەختەكە دوای رۆیشتنی وەرزی هاوین گەڵاكەی هەڵوەری.

تَرَوَّحَ بالمِروَحة: بەمانا (رَوَّح) هاتووە.

تَرَوَّحَ القومَ: ئێوارە هات بۆلای قەومەكە.

استراحَ: پشوی دا ٥ حەسایەوە.

استَرْوَحَ: بەمانا (استراحَ)دێ.

استروَحَ الیه: بەئەو ئارامی گرتو داسەكنا.

استروَحَ الغصنُ: لقەدرەختەكە هەژا هاتو چۆی كرد.

استروَحَ الرجُلُ: پیاوەكە لارو لەنجەی كرد.

**استروَحَ الشَّيْءَ:** بۆنی شتەکەی کرد ٥ بۆنی پێوە کرد.

**استروَحَ المطرُ الزرعَ:** بارانەکە زەرعاتەکەی بوژاندەوە.

**الإسْتِرواحُ:** لەبواری پزیشکی دا بەوە دەگوترێ هەوا داخڵ بکەیە بۆشاییەکی جەستەوە.

**الأرْيَحُ:** دەگوترێ (مَحْمِلٌ أرْيَحُ) کەژاوەیەکی فراوانە.

**الأرْيَحِيُّ:** سنگ فراوانو ڕەوشت جوانو ئامادەباش بۆ چاکەکارییو سەخی سروشت ٥ شمشێر.

**الأرْيَحِيَّةُ:** سەخی سروشتو حەزلە پیاوەتیو ئامادەباش بۆ ماڵبەخشین.

**التَّراوِيحُ:** کۆی وشەی (ترويحة)یە؛ لەبنەمادا ئەم وشەیە ناوە بۆ دانیشتن هەرچۆنێك بێ ٥ دوایی کراوە بەناو بۆ ئەو دانیشتنەی ئەنجام دەدرێ دوای چوار ڕکاتی نوێژی عیشا لەمانگی ڕەمەزان دا بۆ حەسانەوە، ئەمجار بەشێوەی مەجاز کراوە بەناو بۆ هەر چوار ڕکاتێك نوێژ کە دوو ڕکات دوو ڕکات ئەنجام دەدرێ لەمانگی ڕەمەزان دا.

**الرائِحَةُ:** بۆن چ خۆش بێ چ بۆگەن بێ ٥ حوشتر کە دوا خۆرئاوابوون بگەڕێتەوە بۆ ئاغەڵەکەی ٥ بەپێچەوانەی وشەی (السارِحة)یە ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (ما لە سارحة ولا رائحة): واتە هیچی نیە ٥ هەروا وشەی (الرائحة) ناوە بۆ بارانی ئێواران، پێچەوانەی وشەی (الغادية): کەبارانی بەیانیانی پێ دەگوترێ.

**الرّاحُ:** حەسانەوە ٥ شەراب ٥ ڕۆژگاری ڕەشەباو سەختو دژوار ٥

**الرّاحَةُ:** بەری دەست ٥ (ك: راحُ) ٥ کەسێك هەژاربێ بتەوێ هەژاریەکەی رابگەیەنی دەگوترێ: (تركته على أنقى من الراحة) ٥ هەروا ناوە بۆ حەسانەوە ٥ ژن ٥ گۆڕەپان.

**الرَّوَاحُ:** بەمانا (الرّاحَةُ) دێ ٥ ناوە بۆ کاتی نێوان نیوەڕۆو شەو ٥ بەرامبەرەکەی (الصَّبَاح).

**الرَّواحَة:** بەمانا (الرّاحَة) دێ.

**الرَّوْحُ:** بەمانا (الرّاحَة) دێ ٥ ڕەحمەت ٥ بای شەماڵ ٥ (ك: أرواح) ٥ دەگوترێ: (يوم رَوْحٌ): ڕۆژێکە هەوای خۆشە ٥ (عشية روحة): ئێوارەیەکە هەوا خۆشە ٥ هەروا بەمانا کەیف خۆشیو بەختەوەرییە.

**الرُّوحُ**: گیان ◦ نەفس ◦ قورئان ◦ نیگا.

**روح القدس**: بەلای مەسیحییەکانەوە ئوقنومی سێیەمە.

**الروح الأمین وروح القدس**: ناوی حەزرەتی جوبرائیلە سەلامی خودای لەسەر بێ ◦ لەزانیاری فەلسەفی دا ئەو شتەیە کەبەرامبەر ماددەیە ◦ لەزانیاری کیمیادا ئەو بەشەیە کەلەکاتی پاڵاوتنی ماددەدا بەرزدەبێتەوە وەکوو رۆحی گوڵو رۆحی نەعنا.

**الرُّوحاني**: ئەوشتەی گیانی هەبێ ◦ نیسبەتدانە بۆلای رۆح ◦ (الآباء الروحانیون): زانا ئاینییەکانی مەسیحییەکانن ◦ (الطب الروحاني): جۆرە چارەسەرێکی نەفسییە.

**الرَّوْحَة**: یەك جار رۆیشتنی ئێوارانە.

**الرّوحیة**: لەبواری فەلسەفی دا پێچەوانەی (المادیة)یە ◦ (الأشربة الروحیة): عەرەقو بیرەو ئەو جۆرە خواردنەوانە.

**الریح**: با ◦ بۆن ◦ رەحمەت ◦ هێزو توانا، دەگوترێ: (ذهبت ریحه): هێزو توانای نەما ◦ سەرکەوتنو باڵادەستی ◦ فەرمانڕەوایی، دەگوترێ: (الریح لآل فلان): سەرکەوتن یان فەرمانڕەوایی بۆ خێڵی فلانە، هەروا دەگوترێ: (رجل ساکن الریح): پیاوێکی عاقڵو سەنگینە ◦ (هَبَّت ریحه): بەویستی خۆی کارەکەی بۆ جێ بەجێ بوو.

**الرَّیْحانُ**: ریحانە ◦ هەر ڕووەکێك بۆنی خۆش بێ ◦ ڕەحمەتو ڕزقو ڕۆزی.

**الرِّیحَةُ**: با.

**الرَّیِّحُ**: ڕۆژگارو شوێنی بۆنخۆش ◦ شتی بۆن کەسکون .

**الرِّیحِيُّ**: (رِیحِيّ التلقیح): گواستنەوەی دەنکە تۆمی موتوربەیە بەهۆی هەواوە ◦ (رِیحِيّ الإنتشار): ناوە بۆ ئەو ڕووەکەی تۆمەکەی یان ڕەگەکانی جرثومەکانی بڵاودەبنەوە بەهۆی با.

**الْمَرَاحُ**: ئەو شوێنەی خەڵکەکە لێیەوە دەڕۆن یان بۆی دەچن ◦ پێچەوانەی وشەی (الْمَغْدی) دێ، دەگوترێ: (ما ترك فلان من أبیه مَغْدیً ولا مراحاً): فلانکەس هەموو شتێکی لەباوکی دەچێ.

**الْمُراحُ**: لەوشەی (أراح) وەرگیراوە بەمانا پەرچەو ئاغەڵی ئاژەڵە.

**الْمُرتاحُ**: ئەسپی پێنجەم لەئەسپەکانی گۆڕەپانی پێشبڕکێ دا.

**المِرْواحُ**: ئامێری تۆو چاندن.

**المِروَحُ**: بەمانا (المِرْواحُ) دێ ◦ پانکەو ئامێری فێنك کردنەوە.

**الْمَرْوَحَةُ**: ساراو بیابان ◦ ئەوشوێنەی بای لێ دێ.

المِرْوَحَة: ئامێرێکە لەکاتی گەرمادا بای فێنکی پێ دەسبەردەکرێ بەهۆی دەست یا کارەبا ٥ (ك: مَراوِحَ).
المِرْيَاحُ (طعام مِرياح): خواردنێکە غاز لەگەدەدا زۆردەکاو ورگ دەهاوسێنێ.
اُلْمُستَرَاحُ: پەناو کەنەف ٥ خانوی خەڵوەو ئارام ٥
رادت الدّوابُ رَوْداً ورَوَداناً ورِياداً: ئاژەڵەکان لە لەوەڕگاکەدا هاتوچۆیان بوو.
راد فلان: فلانکەس هات و ڕۆیی و لەشوێنێك دانەسەکنا.
راد وِسَادُهُ مِن مرض أو هم: لەبەر نەخۆشی و ئازار یان غەمو ناڕەحەتی سەری لەسەر سەرین نەوەستاو ئارامی نەگرت.
رادت المرأةُ: ئافرەتەکە زۆر هاتوچۆی ماڵە جیرانەکانی کرد.
راد الشَّيْءَ روداً ورِياداً: داوای شتەکەی کرد، دەگوترێ: (راد أهلَه منزلاً وكلأً): داوای کرد بۆ خێزانی مەنزڵ و بۆ ئاژەڵەکانی لەوەڕ.
أراد الشَّيْءَ: شتەکەی ویست ٥ خۆشی ویست، دەگوترێ: (أراد الجدارُ أن ينقضَّ): دیوارەکە خەریکە بڕوخێ.
أراد فلاناً على الأمر: فلانکەسی هەڵنا بۆ ئەوکارە.
أرود في مشيه: بەهێواشی ڕۆیی ٥ (أرود فلاناً): مۆڵەتی فلانی دا.
راوده مراودةً ورِواداً: فێڵی لێ کرد، چاوو ڕاوی لێ کرد.
راودت المرأةَ عن نفسها: ئافرەتەکە داوای کرد زینای لەگەڵ بکرێ.
راود عن الأمر وعليه: لەبارەی کارەکەوە زەمانە سازیی کردو خۆی لەگەل هاوەڵەکەی گونجاند.
راود على الأمر: داوای لێکرد کارەکە بکا.
ارتاد لأهله: داوای کرد بۆ خۆی و خێزانی شوێنی حەوانەوەو بۆ ئاژەڵەکانی لەوەڕ.
ارتاد الشَّيْءَ: داوای شتەکەی کرد.
استرادت الدوابُ: بەمانا (رادَتْ) دێ.
استرادت لِأمره: گەڕایەوە بۆ ئیشی خۆی و ملکەچ بوو.
استرادَ الشَّيْءَ: بەنا بەدڵی و ڕاڕایی داوای شتەکەی کرد.
الأرْوَد: دەگوترێ: (الدهر أرود ذو غير): ڕۆژگار بەهێواشی کارەکانی خۆی دەکا بەجۆرێك هەستی پێ نەکرێ.
الرائدُ: لەبنەڕەت دا بەوکەسەدەگوترێ کە چاوساغی خێڵە بۆ لەوەڕگای باش و شوێنی ئاوو دەڤەرێك باران

بیگرێتەوە ٥ چاوساغو شارەزا بۆ نیشاندانی رێگا بۆ کاروان ٥ ئێستا کراوە بەپلەیەکی تایبەتی فەرمانبەری پۆلیسی یان سوپا لەژوور پلەی نەقیبو لەخوار پلەی موقەدەمەوەیە ٥ (ك: رُوَادٌ ورادة).

**رائد العين**: چقلّی چاو، دەگوترێ: (فلان رائد الوساد): فلاّنکەس لەبەر ئازار یان غەمو نارەحەتی سەری خۆی لەسەر سەرین ناگری، هەروا دەگوترێ: (إمرأة رائدة): ئافرەتێکە زۆر مالاّنگەڕە زوو زوو هاموشۆی دراوسێیەکانی دەکا.

**الـرَّادُ**: بەمانا (رائـد)ێ ٥ دەگوترێ: (ریـح رادة): هەوایەکی نەرمو لەسەرە خۆیە ٥ (امرأة راد ورادة): ئافرەتێکی مالاّنگەڕە.

**الـرادار**: ئامێرێکی ئەلکترۆنییە بەهۆیەوە دەتوانـدرێ هەست بەبونی فڕۆکە بکەی لەئاسمانی ناوچەیەکی تایبەت، یان بوونی کەشتی لەدەریاداو دیاری کردنی شوێنەکەیان لەمەسافەیەکی تایبەتی دا لەبارو دۆخێك دا کەبەچاوی عادەتی ئەوکارە ئەنجام نادرێ.

**الراديوم**: عونصورێکی سپیو ورشەدارە، نیشاتێکی تیشکدەری هەیە دەشوبهێتە کالسیوم لەکارایی کیمیاوی دا.

**الرُّودُ**: بای نەرمو لەسەرەخۆ، هەوای شەماڵی هێدی ٥ مۆڵەت.

**الرُّوَيْدُ**: دەگوترێ: (رُوَيْداً): واتە لەسەرەخۆ بەهێمنی ٥ (رويدك خالداً): واتە مۆڵەتی خالید بدە.

**المِرْوَدُ**: کل چێوك، کلی پێ لەچاو رادەدرێ ٥ پارچە ئاسنێکە لەلغاودایە هەڵدەسوڕێ ٥ جومگە ٥ سنگ ٥ جەمسەری خولخلوکەی ئاسن ٥ یەکێکە لەکۆڵەکەکانی جەنجەڕی گێرە ٥ (ك: مراود ومراويد).

**رَوْذَنَ**: ماندو بوو لاواز بوو.

**رَازَهُ رَوْزاً**: بەتاقی کردەوە.

**راز الـدينار**: دینارە زێڕەکەی کێشا بۆئەوەی بزانێ کێشی چەندە.

**راز صنعته ومالَهُ**: سەرو کاری ماڵو سامانو بەرهەمی خۆی کرد.

**راز ماعنده**: داوای لێ کرد ئەوەی لایەتی بیداتێ.

**رَاوَزَهُ**: بەتاقی کردەوە لەبۆتەی دا.

**رَوَّز كلامَهُ ورأيَه في نفسه**: لەدڵی خۆی دا زنجیرەو چۆنیەتی راو قسەکانی خۆی تاوو توێ کردن بۆئەوەی بزانێ چۆن دەریان دەبڕێ.

**رَزَّ رأيَــه**: دوای لــی ورد بوونــەوەو تێفکرین دەستی بەشتەکە کرد.

**الـرّازُ**: بـاش وەسـتا، سـەرۆکی وەسـتا بیناســازەکان یــان ســەرۆکی هەرپیشەوەرو پیشەسازێك.

**الرِّيـازةُ**: پیشەی بیناسازیی ٥ وەستای دیوار.

**رَاسَ رَوْسـاً**: لارو لەنجـەی کـرد ٥ (راس الـسيلُ): لافاوەکـە پـلو پـوشو چیلکەو چەوێلی کۆکردەوەو لەگـەڵ خۆی رایدا.

**الرَّوْسُ**: عەیبو عار، دەگـوترێ: (فـلان رَوْسُ سُــوءٍ): فلانکــەس پیــاوی خراپە.

**رَاشَ رَوْشـاً**: زۆری خـوارد (راش المـرضُ فلاناً): نەخۆشی فلانی لاواز کردوە.

**رَوِشَ رَوَشاً**: عەقڵی سوك بوو بێ عەقڵە ٥ کاڵفامە.

**الرَّئوش**: گوێچکەی زۆری موو پێوەن ٥ پشتی لاوازە ٥ بێ هێزە.

**الرُّوْشَنُ**: بڕوانە وشەی (رَشَنَ).

**راضَهُ روضاً ورياضـاً ورياضـةً**: ژێربـاری کــرد، ملکەچــی کــرد، دەگــوترێ: (راضَ المُهْرَ): جوانوەکەی رام کـرد ٥ (راض نفسه بالتقوى): نـەفسی خـۆی راهێنا لەسەر خوداپەرستی ٥ (راض القوافي الـصعبة): سـەرەوای قـورسو گرانــــی هێنانــــە نــــاو چــامە شــیعرییەکەیەوە ٥ (راض الــدُّرَّ): مرواریيەکــەی کــون کــرد ٥ (هــو مروض وهي مروضة).

**أراض المكــانُ**: شــوێنەکە بــاغی زۆر بوون.

**أراض الــوادي والحــوضُ**: شـیوەکە یـان حەوزەکە ئەوەنـدەی تێـدا کۆبـوەوە زەوییەکەی داپۆشی.

**أراض فــلانَ**: فلانکــەس قــوم دوا قــوم شەرابەکەی نۆش کرد.

**أراضَ المكانَ**: شوێنەکەی کردە باغ.

**أراضَ القومَ**: خەڵکەکەی تێرئاو کرد.

**أرْوَضَ المكانُ**: بەمانا (أراض)دێ.

**راوَضَــهُ علــى الأمــر**: لەســەر ئیــشەکە چـەندو چـونو وتو وێـژی لەگـەڵ داکــــرد بۆئــــەوەی بیخاتــــە نــــاو کارەکەوە.

**رَوَّضَ المكانُ**: بەمانا (أراضَ)دێ.

**رَوَّضَ فلان**: فلانکەس هۆگری بـاخ بـوو تێیدا مایەوە.

**رَوَّضَ المكــانَ**: شــوێنەکەی کــردە بــاخ، دەگــوترێ: (روَّض المطــرُ الأرضَ): باران زەوی کردە باخو رازاندیەوە.

**رَوَّضَ المُهْرَ**: جوانوە ئەسپەکەی راهێنا.

**إرتاضَ**: رام بوو، ژێربار بوو، دەگوترێ: (ارتاضَ المُهْرُ): جوانوەکە رام بوو.

**إرتاضـت القــوافي**: سـەرەوا (قافیـة)کـان بەیەدەست بوون.

تراوضَا: چەندو چونیان کرد لەکڕینو فرۆشتن دا.

إستراضَ المكانُ والوادي والحَوْضُ: بەمانا (أراض)دێ ٥ هەروا بەمانا پانو پۆڕیو گوشادی دێ.

استراضَ النفس: دڵی ئارامی گرتو کرایەوە، خۆشنوود بوو.

استروضَ النبات: روەکەکە گەیشتە ئەوپەڕی گەورەیی و بەرزی خۆی.

استروضت الأرض: زەوییەکە گیاو گژی باشی بەرهەم هێنا.

الروضة: زەوی سەوز ٥ باخی جوانو رازاوە، دەگوترێ: (مجلسه روضة): مەجلیسو دانیشتن لەگەڵی دا خۆشو بەلەززەتە ٥ (ك: رَوْض ورياض).

روضة الحوض: ئەندازەی ئەوبەشەی ئاوەکە دایپۆشیوە.

الرياضة: بەلای صوفییەکانەوە بریتییە لەپاڵفتەکردنی ئەخلاقی دەرونو سەرگەرمبوون بەخودا پەرستیو وازهێنان لەوشتانەی کەنەفس داخوازییانە.

الرياضة البدنية: ئەنجامدانی جۆرە جمەو جوڵێکی تایبەتی کە جەستە بەهێز دەکاو رایدەهێنێ ٥ (العلوم الرياضية): بریتییە لە زانیاری حیسابو ئەندازیاریو جەبرو ئەو جۆرە زانیارییانە.

الرَّيِّضُ من الدواب: ئەو ئاژەڵو ولاغەیە کەرام نەکرێو مل نەدا بۆ خاوەنەکەی رای بێنێ، دەگوترێ: (أمرٌ رَيِّضٌ): کارێکە بەرێکو پێکی ئەنجام نەدراوە، کەمو کوڕی زۆری تێدایە.

الرَّيِّضَةُ: (قصيدة رَيِّضَةٌ): چامەیەکە رێکو پێک نەکراوە، لەنگیو کەمو کوڕی زۆری تێدایە ٥ (قصيدة رَيِّضَة القوافي): چامەیەکە سەرواکانی لەلایەن شاعیرانەوە رام نەکراون.

راعَ روعاً: ترسا.

راعَ الشَّيْءُ رواعاً: شتەکە گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی.

راعَ الأمرُ فلاناً: کارەکە فلانکەسی ترساند.

راعَ الشَّيْءُ فلاناً: شتەکە فلانکەسی خستە سەرسوڕمانەوە، دەگوترێ: (رَاعَنِي جمالُهُ): جوانییەکەی سەرنجی ڕاکێشام ٥ (راعني كلامُهُ): قسەکانی سەرنجیان راکێشام ٥ (هو رائع وهي رائعة) ٥ هەروا دەگوترێ: (هذه شربة راع بها فؤادي): ئەمە شەرابێک بوو کفتو کۆی دڵمی دامرکاند.

رَوِعَ رَوَعاً: زیرەکو لێهاتوو بوو، سەرنج راکێش بوو.

**أراعَهُ**: ترساندی.

**روّعه**: بەمانا (أراعه)دێ.

**روّعَ الطعـامَ بالـسَّمْن**: خواردنەکـەی چەورکرد، چەوری تێ کرد.

**إرتـاع**: ترسـا، دەگـوترێ: (ارتـاع منـه وارتاع له).

**ارتاعَ للخبر**: هەواڵەکەی پێ خۆش بوو.

**تَروّعَ**: ترسا ◦ (تروّعَ منه).

**الأروَعُ**: زیرەك‌و لێهاتوو وریا ◦ کەسێـك شـایی بـەخۆی بـێ لـەڕوی جـوانی روخـسارەوە یـان لـەڕوی ئازایـەتی‌و شەهامەتەوە ◦ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (رَوْعاء).

**الرائع**: سەرنـج راکێش، شایی بەخۆ.

**الرائعة**: بۆمێینەی (الرائع)دێ ◦ هـەروا نـاوە بۆشتێـك کەلـەبواری فـەنن‌و فیکـــرو ئـــەخلاق دا ســـنوری بەزانـدبێ‌و سـەرنـج راکـێش بـێ، دەگـوترێ: (هـذه القـصيدة أو هـذه القصة من روائع فلان).

**رائعة الشيب**: یەکەم مـوی سپی کەلـە سەرو ریش پەیدا دەبێ.

**رائعة النهـار**: زوربـەی رۆژ، دەگـوترێ: (هو کالشمس في رائعة النهار).

**الـرُّواعُ**: شـکۆمەنـدو زیـرەك‌و لێهـاتوو، دەگوترێ: (هو رواع الفؤاد).

**الرّوْعُ**: جەنگ.

**الـرُّوعُ**: دڵ ◦ نیهـن ◦ عـەقڵ‌و ئـاوەز، دەگـوترێ: (وقـع في رُوْعـي کـذا): واکەوتە دڵمەوە، عەقڵم وای بۆ چۆ ◦ (أفـرخ رُوعـهُ): تـرس لـەدڵی دا نەماو ئارام بۆوە.

**الرُّوعة**: شێوە جوانییەك ◦ ترس‌و بیم ◦ لەحەدیـث دا هـاتووە (أللـهم آمِـنْ روعـاتي): خودایـە وام لـێ بکـە لـە تۆنەبێ لەکەس نەترسم.

**المُـرَوَّع**: تێگەیشتو؛ ئەوکەسـەی بـاش لەشت حاڵی ببێ.

**راغ روغاً ورَوَغاناً ورواغاً**: لای دا، ئـەملاو ئـەولای کـرد قـۆرت‌و پێـچی کـردن، دەگوترێ: (راغ الثعلب): رێوییەکـە بـەقۆرت‌و پـێچ رۆیـشت، فێڵبـازی کرد.

**راغ الی کذا**: بەنهێنی چو بۆلای فلان شت ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًا بِالْيَمِينِ﴾.

**أراغَهُ**: فێڵی لـێ کـرد ◦ لەگـەڵیا کەوتـە گفـت‌و گـۆو داوای لـێ کـرد ئـەوەی بۆبکا، ئەوەی بداتی.

**رَاوَغَـــهُ**: فێڵـــی لـــێ کـــرد، ویـــستی بیخەڵـەتێنێ ◦ بـۆڕی داو شـکاندی، بەعەرزی دادا.

**روّغ الطعـامَ**: خواردنەکـەی چـەورکرد، رۆنـــی تێـــکرد، دەگـــوترێ: (رَوَّغ

اللقمــة في الدســم): پاروەکـەی لـەناو ڕۆناوەکـە دا ئەمـدیو ئـەودیو کـرد تـا بەباشی چەوربوو ڕۆنەکەی هەڵمژی.

إرتاغَهُ: ویستیو داوا ی کرد.

تراوَغـا: ئـەو دووە هەریەکـەیان فێڵـی لــەوی تریــان کــرد ٥ کەوتنــە زۆرانبازیو یەکتریان بۆڕدا.

تروغت الدابة: وڵاغەکە خۆی گەوزاند.

الأرْوَغ: دەگوترێ: (هو أروغ من ثُعالة): ئەو لە ڕێوی فێڵ زان ترە.

الرائــغ: دەگــوترێ: (طريــق رائــغ): ڕێبازێکی خوارە.

الرائغــة: ڕێبــازی قــۆرتو پێــچاوی ٥ لەحــەدیثــی (الاحنــف)دا هــاتووە دەڵێ: (فعدلت الى رائغة مـن روائـغ المدينة).

الرُّوَاغة: ئەوشوێنەی زۆر خەڵکی تێـدا بکــوژرێ، شــوێنی تێــدا بــەهیلاك چوون.

الــرُّوَّاغُ: کەسێــك زۆر فــێڵ زان بــێ ٥ ڕێوی.

الرِّياغ: هەرزانی، بەپیت.

راق رَوْقاً: ڕون بوو، ساف بوو، تەمو مژ ی لەسەر نەما.

راق عليــه: فــەضـلو پیــاوەتی بەســەردا زۆرکرد.

راق الـشَّيْءُ فلانــاً رَوْقــاً ورَوَقانــاً: شــتەکە سەرنجی فلانکەسی ڕاکێشا.

رَوِقَ رَوْقــاً: ددانــی پێــشینەی ســەرەوەی لــەددانی خــوارەوە زیــاتر هاتوونــە پێش، واتە کەڵبەی سەروی لەئاستی کەڵبەی خواروی نین.

راوَقَــهُ: دیوەخانەکــەی بەرامبــەر دیوەخــانی ئــەوە، دەگــوترێ: (هــو جاري مراوقي).

رَوَّقَ الليلُ: شەو پەردەی تـاریکی خـۆی درێژکردەوە.

روَّق الشرابَ: شـەرابەکەی ساف کـرد ٥ خــشتو خــۆڵو تــەپو تــۆزی لــێ پاڵاوت.

روَّق السلعة: کاڵاکەی فرۆشتو باشـتری کڕی.

روَّق لــه في الــسلعة: نرخــی کاڵاکــەی بەرزکردەوەو ناشیەوێ بیکڕێ.

روَّق البيــتَ: بــەربێڵای بــۆ خانوەکــە دروســت کــرد ٥ دیوەخــانی بــۆ خانوەکە دروست کرد.

تروَّق الشرابُ: شەرابەکە ساف بوو.

الأرْوَقُ: کەسێــکە کەڵبــەی ســەروی بەســەر کەڵبـەی خـواروی دا بـڕوانن لێیان پـێش کـەوتبن ٥ (عـام أروَق): ساڵێـکی سـەختو زەحمەتـە، ژیـانی تێدا ناخۆشە ٥ (هي روقاء).

الــراووق: شــت پــاڵێو ٥ چــاپاڵێو، شــیر

پـالێو، نـەوت پـاڵێو ٥ پیاڵـەو گـلاس ٥ (ك:رواويق).
الـــرُّواق: ژورێـــکە وەکـــوو خێمـــە لەدرێژەوەیە.
رواق البيت: بەربیلاّی خانوو ٥ ژورێك بـۆ خوێنـدن‌و دەرس گوتنـەوە لـە مزگـــەوت دا یـــان لەهـــەر عیبادەتخانەیـــەکی تـــردا بـــێ ٥ پەنایەك بۆ ڕاگوێزینەوەو وتـو وێـژ لەکۆبونـــەوەی نێـــو دەوڵـــەتی‌و فێستیفاڵی ئەدەبی‌و ئەوشتانەدا.
رواق الليـل: سـەرەتای شـەو، بەشێـك لەشەو.
رواق العـين: بـرۆی چـاو ٥ (ك: أروقـة وروق).
الرواقيّـــون: فوتابیـــەکانی زەینـــونی فەیلەسوفی یونانین، ئەم نازناوەیـان لـــەوەوە وەرگرتـــووە کـــە زەینـــون لەریواقێك دا دەرسی پێ دەگوتنەوە ٥ هەروا پێیان دەگـوترێ: (أصـحاب المظلة).
الـرَّوْقُ: لەهـەموو شتێـك دا پێشەکی‌و ســـەرەتاکەیەتی، دەگـــوترێ: (روق الجيش، روق البيت، روق الشباب).
روق القـــوم: گـــەورەو یەکـــە پیـــاوی قەومەکە.
رَوْقُ الليـــل: بەشێـــك لەشـــەو، دەگـــوترێ: (مضى روق من الليل).
رَوْقُ الـسحاب: لافـاوی بـاران، دەگـوترێ: (ألقت السحاب أرواقهـا): هەورەکـە بارانی بەردەوام بوو.
روق الدابـــة: شـــاخی ئـــاژەڵ ٥ لەپەنـــدی پێشینان دا هـاتووە دەڵـێ: (کـالثور يحمي أنفهُ برَوْقِه): وەکوو کەڵەگا وایە لـوتی بەشـاخی دەپـارێزێ ٥ هـەروا وشـەی (الـروق): بـەمانا بـەخۆنازو ئـــازاد دێ ٥ بـــەمانا تەمـــەن دێ، دەگوترێ: (أكل فلان روقـه): هـەروا بۆ ئـەم مانایانـە دێ: پـەردە ٥ شـتی صـافو ڕون ٥ کۆختـــەی ڕاوکـــەر ٥ ورەی پیـــاوو عـــەزم‌و جـــەزمی ٥ کۆمەڵێ ئادەمیزاد، دەگوترێ: (جـاء روقُ بني فلان): کۆمەڵی خێڵی فلان هـاتن ٥ خۆشەویـستی بـێ خـەوش ٥ بارتـــەقای شـــت ٥ لاشـــە (لاشـــەی مردوو) ٥ خێمە، دەگوترێ: (ضـرب روقـه بالمكـان): لەوشـوێنە خێمـەی خۆی هەڵداو نیشتەجێ بـوو ٥ (ك: أرواق) ٥ دەشـــکوترێ: (أسْـــبَلَت أرْواقهـا): فرمێـسکی رشـتن ٥ (رَمَـاهُ بأرواقـــه): فورسـایی خـۆی خـستە سـەری ٥ (رمى بأرواقه علـى الدابـة): سواری وڵاغەکە بـوو ٥ (ألقـى عليـه أوراقهُ): شـێت‌و شـەیدای بـوو زۆری خۆش ویست تاوای لـێ هات لەپێناو خۆشەویستی دا خۆی بـەخت بکا.
الرَّوْقَـةُ: جـوانی گەشـەداری ٥ روخـساری جـوان.

الرُّوقة: منداڵی جوان چ کوڕ بێ چ کچ، تاك بێ، دوبێ، کۆبێ ٥ ئادەمیزادی باش‌و وەجاخزادە ٥ دەربارەی رۆمەکان پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: (يخرج اليهم رُوقة المؤمنين) باشترین کەسانی موسوڵمان بەرەو رویان دەبنەوەو لێیان وەدەست دێن.

الرِّيْقُ: (ريق الشباب): سەرەتای گەنجی.

الرَّيِّقُ: لەهەمموو شتێك دا باشەکەیەتی.

رَيِّقُ الشباب: بەمانا (ريقه) دێ.

رَوَّلَ الفَرَسُ وغيره: ئەسپەکە لیکی چاند ٥ میزی پچڕ پچڕی کرد.

رَوَّلَ الطعامَ: خۆراکەکەی چەورکرد (ڕۆنی تێکرد).

رَوَّلَ رَأسه من الدهن: سەری چەورکرد.

تَرَوَّلَ: لیکی چاند (لیکی لەبەر رۆیی).

الرائل: ددانی زێڕ.

الراوولُ: بەمانا (الرائل)دێ، هەروا بەمانا (لیك)دێ ٥ (ك: رواويل).

الرّوالُ: لیك.

الْمِرْوَلُ: کەسێك زۆری لیك هەبێ.

رامَهُ روماً ومراماً: داوای کرد، قەصدی کرد.

رَوَّمَ: مایەوە، دانیشت.

رَوَّمَ فلاناً الشيْئَ: وای کرد فلانکەس داوای شتەکە بکا هەوڵی بۆ بدا، دەگوترێ: (رَوَّمَ فلانا، ورَوَّمَ بفلان): وای کرد فلان داوای بکا.

رَوَّمَ رأيه: قەصدی شتەکەی کرد دوایی داوای شتێکی تری کرد ٥ جار دواجار داوای شتی کرد.

تَرَوَّمَ بفلان: یاری پێ کرد.

رَامَةُ: شوێنێکە لەبادیەی عەرەب (لەسارای عەرەبوستان) وادەبێ دەیکەنە دوانی‌و بە (مثنی) ناوی دەهێنن ٥ وەکوو لەپەندی پێشینان دا هاتووە (تسالني برامتين سَلْجَماً): لەبادیەدا نیشتەجێ بووم داوای شێلمم لێ دەکا ٥ بەکەسێك دەگوترێ داوای شتێك بکا لەشوێنێك کە دەست نەکەوێ.

الرُّوْمُ: نەرمایی گوێچکە ٥ دەرخستنی بزوێنی کۆتایی وشە بەخێرایی بەجۆرێك ئەو بزوێنە ببیسترێ.

الرُّومُ: نەرمایی گوێچکە ٥ شەرابێك زۆر کەسکون بێ‌و زۆر سەرخۆشکەربێ کە لەقەسەبی شەکر پاڵفتە دەکرێ ٥ بەشێك لەئادەمیزاد کەپێیان دەگوترێ: (رۆم)و ئێستا بەشێکن لەگەلانی ئەورووپاو ئاسیا.

الرُّومَةُ: غەرەو سرێش.

الرّومـيُّ: حـەبلو سـەوڵەو زنجـیری کەشتی بەتاڵ.

المرامُ: داخوازی.

الرومـاتیزم: زاراوەیـەکی گـشتییە بـۆ چـەندحاڵەتی جیاجیـا بـەکار دەهێنـدرێ کـە دیاردەکـانی ئـازاری ماسـولکەو جومگـەو ئەنـسیجەی لیفییە.

**ران** الیومُ رَوْناً: رۆژەکە زۆر گەرم بوو زۆر ناخۆش بوو.

**ران** الأمرُ: کارەکە ناخۆش بوو تاڵو تفت بوو، گران بوو.

الأرْوَنـان: دەنـگ ٥ رۆژانـی سـەختو ناخۆش، دەگوترێ: (یوم أرونانٌ ویوم أرونان): رۆژێـکی گەرمو نـاخۆشو پڕغەمو پەژارە.

الرّوانـي: حەڵوایـەك لەهێلکـەو ئـاردو شەکر دروست دەکرێ.

الـرّوْنُ: نـاخۆشو زەحمـەت ٥ (ك: رؤون).

الرُّونـةُ: (رونـة الـشّيء): ئەسـتورایی شـتەکەو ناخۆشـییەکەی، لەگـەرمی لەسـاردی لەغـەمو پـەژارەو ئـەو جۆرە شتانە.

المَرُونُ: (هو مرون بـه): ئـەو تێشکاوە، زێرکەوتووە.

**رَوَى** علـى الـبعیر ریّـاً: لەسـەر حوشـترەکە داوای ئاوی کرد.

**رَوَى** القومَ وعلیهم ولهـم: داوای ئـاوی کـرد بـۆ خەڵـکەکە ٥ لەسـەر حوشـترەکە تونـد دایبەسـت، دەگـوترێ: (رَوَّى علی الرجل بـالرِّواء): لەسـەر پشتی حوشـترەکە پیاوەکـەی شـەتەك دا بۆئـەوەی لـەکاتی هێـرش هێنـانی خەودا نەکەوێتە خوار.

**روی** الحدیثَ أو الشعرَ روایةً: حـەدیثەکە یـان شـیعرەکەی وەرگـرتو هـەڵی گرت بۆ گێڕانەوەو نەقڵ کردن.

**رَوَى** علیه الکِذْبَ: درۆی بەدەمەوە کرد.

**رَوَى** الحَبْلَ ریّاً: حەبلەکەی خاو بادا.

**رَوَى** الزرعَ: کشتوکاڵەکەی ئاودا.

**رَوِيَ** مـن المـاء ونحـوه ریّـاً: ئاوەکـەی خواردەوەو تێرئاو بوو.

**رَوِيَ** الشّجَرُ ورَوِيَ النّبتُ: درەختەکە یان روەکەکە تێرئاو بوو تەڕدەماغ بوو.

أرْوَاه: وای لـێ کرد تێرئاو بێ.

**أروی** فلاناً الحدیثَ والشعرَ: حەدیثی بـۆ خوێنـدەوە، شـیعری بـۆ گـوت بۆئەوەی ئەویش لێیەوە نەقڵ بکاو بۆ خەڵکی تری بخوێنێتەوە.

**رَوَّى**: ئاوی لەگەڵ خۆی هەڵگرت.

**رَوَّى** فـلان في الأمـر: فلانکـەس لەکارەکەی ڕوانیو لـێی وردبۆوە.

**رَوَّى** فلاناً: فلانکەسـی والـێ کـرد تێـر ئاوبێ.

إرْتـوى: بـەمانا (رَوِيَ)دێ، دەگـوترێ:

(إرتوت مفاصلهُ) جومزگەكانى رێكو پێك بونو پتەوبوون.

**إرْتــوى الحَبْــلُ**: حەبلەكــە تاڵــەكانى زۆربونو بەگشتى بادرا.

**تَــرَوّى**: بــەمانا (رَوِيَ) دێ، دەگــوترێ: (إرتَــوتْ مفاصِــلَه): جومزگــەكانى رێكو پێك بونو پتەوبوون.

**تَرَوّى في الأمر**: سەيرى كارەكەى كردو لێى وردبۆوە.

**رَوَى الحــديث أو الــشِعْرَ**: حــەديــثو شيعرەكەى ريوايەت كرد.

**الأروية**: مانگا كێوى، بزنــەكێوى ٥ (ك: أراويّ).

**التروية**: (يوم التروية): رۆژى هەشتــەمى مانگى ذيلحيجەيە.

**ألرّوي**: راوى الحديث أو الشعر: حەديث گێڕەوەكــە شــيعر هەڵــگرەكە بۆئەوەى ريوايەتى بكەن بەكەسانى ديكەى بڵێن.

**الرّاوِيّــة**: مێينــەى (ألــرّاوي)يــە ٥ ئەوكەسەى داواى ئاودەكا ٥ كەسێــك زۆر حــەديــثو شيعر ريوايــەت بكا ئەوكاتــە (تــا) خرەكــەى بــۆ موبالەغەيــە، بــۆ تــەئنيــث نييــە ٥ كونــدەى ئــاو كەئاوى تێدابێ ٥ ئــەو ولاغەى بارە ئاوى لــێ دەنــرێ ٥ (ك: روايا)يە.

**الرُّواءُ من الماء**: ئاوى شــيرينو سازگارو گوارا ٥ ئاوى زۆرو تينوايەتى شكێن.

**الرِّوَى**: مــاء رِوَى: ئاوى شيرينو سازگار.

**الــرِّواءُ**: حەبلێــكە بــارو بارگەنــەى پــێ لەحوشتر دەبەسترێ.

**الرُّواءُ**: روخسارى جوان.

**الرِّواية**: چيرۆكى درێژ.

**الرُّوّاءُ**: ئاوگێڕ، ئاوكێش.

**الــــرَّوِيُّ**: ئاوخواردنـــەوەى تـــەواو، دەگــوترێ: (شــربت شــربا رويّــاً) ٥ هەورێـــك بارانەكـــەى دڵۆپـــە گەورەبێو بەرێژنەى توند ببارێ ٥ ئاوێك زۆر زوو تينوايــەتى بــشكێنێ ٥ ئــــاوگێڕ ٥ زەعيـــــفو لاواز ٥ لەزانستى عــوروزدا ئــەو پيتــەى كە چامەشــيعرەكەى لەســـەر بنيـــات دەنــــرێو چــامەكەى پــاڵ دەدرێ دەڵــێى چامەى بائى چامەى واوى .. ٥ هتد.

**الرَّوِيَّـــةُ**: وردبونـــەوەو تێفكرينـــە لەكاروبار ٥ لێماوەو پاشماوەى شت، دەگــوترێ: (علــى روِّيــة مــن ديــن): لەســەر ئــايينى بۆمــاوەى خۆيــانن ٥ پێداويستى.

**الرَّيّا**: بۆنى خۆش.

**الرَّيّــانُ**: دەگــوترێ: (فــرس ريّــانُ الظهــر): ئەسپێكى پشت پتەوو تۆكمەيە ٥ (وجه ريّان): دەمو چاوى گۆشتن ٥ (هــو ريــان العلــم): ئــەو پــڕە لەزانســتو زانيــارى.

**الرَيّةُ**: دهگوترێ: (عين رَيَّة): چاوێکه ئاوی زۆره.

**اَلْمَرْوَى**: بناوانی روبارو جۆگا کەئاوی لێ هەڵدەبەسترێ بۆ ئاودانی کشتوکاڵ.

**اَلْمِروى**: ئاوی شیرین‌و سازگار ٥ (ك: اَلْمَرَاوى)یه.

**رَابَهُ الأمرُ وفلان رَيْباً وريبةً**: کارهکه یان فلانکەس خستیه گومانەوه ٥ لەحەدیثدا هاتووه: (دع ما يريبك الى مالا يريبك)، دهگوترێ: (رابَهُ من فلان أمْرٌ): دەربارەی فلان دڵنیابوو لەگومانەکەی.

**راب الرجلُ فلاناً**: پیاوهکه لەفلان کەوته گومانەوه.

**راب الأمْرُ فلاناً**: کارهکه فلانی گرتەوه.

**أراب الأمْرُ والرجلُ**: کارهکه گوماناوی بوو، پیاوهکه گومانی کرد.

**أراب الأمرُ والرجلُ فلاناً**: کارهکه یان پیاوهکه وای کرد فلان گومان پەیدا بکا.

**أرابه من فلان أمْرٌ**: روداوێك، کارێك وای کرد گومان لەفلان بکا.

**أرابَ الرَّجُلَ**: شك‌و گومانی خسته ناو دڵی پیاوهکه.

**أراب فلاناً**: دڵه ڕاوکێی خسته ناو دڵی فلانەوەو توشی نائارامی‌و قەلەقی کرد ٥ لەحەدیثی فاطیمه دا هاتووه که پێغەمبەر دهربارەی فەرموویەتی: (يربني مايريبها): هەرشتێك فاطیمه ئیزعاج بکا منیش ناڕەحەت دهکا.

**إرتاب فيه وبه**: گومانی لێ پەیدا کرد ٥ تۆمەتباری کرد.

**تريَّبَ به**: بەمانا (إرتاب)دێ.

**استرابَ بِه**: شتێکی وای لێ بینی بیخاته گومانەوه.

**الرَّيْبُ**: شك‌و گومان‌و تۆمەت ٥ پێداویستی بەڵای ڕۆژگار ٥ روداوی زەمانه.

**الرِّيبَةُ**: گومان‌و تۆمەت ٥ (ك: رِيَبٌ).

**الرَّيّابُ من الأمور**: کاری ترسناك.

**المُسْترابةُ**: ئافرەتێك نەکەوێته عادەی مانگانەوه هەر چەنده لەتەمەنێك دا بێ دهبوایه بکەوتایه حەیزەوه.

**الرِّيبَاسُ**: روهکێکی تەمەن درێژه لەوڵاته ساردو سەرماکان‌و کێوه بەفراوییەکان دا دهڕوێ، قەدهکەی دهخورێ‌و شەرابیشی لێ دهگوشرێ، پێی دهگوترێ: (شەرابی رێباس).

**راث رَيْثاً**: تەمەڵی کرد.

**أراثهُ عنه**: وای لێ کرد تەمبەڵ بێ ٥ خاوو خلیچك بێ.

**رَيِّثَ فلان**: فلان ماندوو بوو، دهگوترێ:

(رَيَّثَ عما عليه): تەمبەڵ بوو لەئەنجامدانی ئەو ئەركانەی لەئەستۆی بوو.

رَيَّثَ فلاناً: وای لەفلانكەس كرد تەمبەڵ بێ ٥ ماندوشەكەتی كرد، بڕستی لێ بڕی.

رَيَّثَ الشَّيْءَ: شتەكەی نەرم كرد.

تَرَيَّثَ: بەمانا (راث)دێ.

إستراثَهُ: داوای لێ كرد تەمبەڵی بكا ٥ خاوە خاو بكا.

الرَّيْثُ: تەمبەڵی ماتڵ بون ٥ لەپەندا هاتووە دەڵێ: (رب عجلة تَهَبُ ريثاً): زۆرجار پەلەكردن دواكەوتن‌و ماتڵ بوون دەبەخشێ ٥ ئەندازەو چەندییەت، دەگوترێ: (ما جلس عندنا إلا رَيْثَ أن حدثنا بحديث ثم مَرَّ): هەرئەوەندە لامان دانیشت بەئەندازەی ئەوەی قسەیەكی بۆ گێڕاینەوەو پاشان ڕۆیشت.

الرَّيِّثُ: سست، تەمبەڵ.

اَلْمُرَيَّثُ: دەگوترێ: (هو مُرَيَّثُ العينين): ئەو ئادەمیزادە چاوی كزەو باش نابینێ.

الرَّيْجِيُّ: پاسایەكە بەگوێرەی ئەو پاسایە دەوڵەت هەندێ پرۆژەی ئابوری دا دەمەزرێنێ‌و ئاسانكارییان بۆ دەكا بۆ بەرهەم هێنان‌و سود وەرگرتن.

الأَرْيَحُ: بڕوانە ماددەی (رَوَحَ).

الرَّيْحان: بڕوانە ماددەی (رَوَحَ).

رَيَخَ رَيْخاً وريوخاً وريخاناً: ذەلیل‌و ملكەچ بوو ٥ نەرم‌و شل‌و شێواو بوو ٥ ناو گەڵی لێك دوور كەوتنەوە ناتوانێ قاچەكانی‌و ڕانەكانی لێك نزیك بكاتەوە.

رَيَّخَهُ: ذەلیلی كرد چەماندی، چەڕاندی.

الرَّادَةُ: (ريح رادة): بایەكە لەسەر خۆ هەڵدەبێ‌و شەماڵ ئاسا فێنكی دەخاتە ناو وڵاتەوە.

الرَّيْدُ: لوتكە شاخ.

الرِّيدُ: كارێكی داخوازو مەبەست دەتەوێ بێتە جێ‌و بەیدەست ببێ.

الرَّيْدَةُ: بای لەسەرەخۆو هێدی‌و شەماڵ ئاسا.

رَارَ رَيْراً: مۆخی قاچی زەعیف بوو.

أرار الهزالُ مُخَّ ساقيه: كزی‌و لاوازیی مۆخی ئێسقانی قاچی بارییك كردوە.

الرَّائِرَةُ: بەزو چەورایيەكە لەكەشكە ئەژنۆدا وەكوو مۆخ وایە جوڵانی جومگەی ئەژنۆ خۆش دەكا.

الرِّيرُ: دەگوترێ: (مخ رِيرٌ وَرَيْرٌ): مۆخێكی خراپ‌و بێ كەڵكە بەهۆی كزو لاوازیی تواوەتەوە.

**راش الطائرُ رَيْشاً:** پەلەوەرەكە پەڕی لێ ڕوان.

**راش فـلان:** فلانكەس بێ ئاتاج بوو پێویستی نەما.

**راش السَّهْمَ:** پەڕی لەتیرەكە بەستو قایمی كرد.

**راش فلاناً:** فلانكەسی بەهێز كرد، یارمەتی دا، حاڵو وەزعی باش كرد، دەگوترێ: (راشَهُ اللهُ): خودا گەشەی بەفلانكەس دا ◦ (راشه الله مالاً): خودا ماڵو سامانی پێ بەخشی ◦ (راشه السَّقَمُ فلاناً): نەخۆشی فلانكەسی لاواز كرد ◦ (لاتَرِش علي): قسەكەم پێ مەبڕە لێم گەڕێ با وتەكەم تەواو بكەم ◦ (فلان لا يريش ولا يبري): فلانكەس نەزیانی هەیە نەسود هیچی پێ ناكرێ.

**رَيَّشَ السَّهْمَ:** تیرەكەی پەڕدار كرد پەڕی لێ شەتەك دا ◦

**رَيَّشَ الثَّوْبَ:** كراسەكەی بەوێنەی پەڕی باڵندە ڕازاندەوە.

**رَيَّشَ السَّقَمُ فلاناً:** نەخۆشی فلانكەسی لاواز كرد.

**ارتاشَ فلان:** فلانكەس توشی خێرو خۆشی بوو، كاریگەریی ئەو نازو نیعمەتەی پێوە دیارە.

**ارتاش السَّهْمَ:** پەڕی لەتیرەكە بەست.

**تَرَيَّشَ:** بەمانا (ارتاش)دێ.

**الأرْيَشُ:** كەسێك تووكی گوێچكەو سەرو ڕیشی زۆر بێ، دەگوترێ: (رجل أريش): پیاوێكە خاوەنی ماڵو سامانو پۆشاكی باشە.

**الرّائِشُ:** تیری پەڕدار ◦ ئەوكەسەی دەبێتە ناوەند لەنێوان بەرتیلدەرو بەرتیل وەرگردا ◦ بۆئەوەی كارەكەیان جێبەجێ بكا.

**الرِّيَّاشُ:** پۆشاكی باشو بەنرخ ◦ كاڵای ناوماڵ ◦ ماڵو سامان ◦ هەرزانی ◦ موچە ◦ بارودۆخی باش.

**الرِّيْشُ:** كلارَيْش: لەوەڕێكی گەڵا زۆرە.

**الرِّيْشُ:** پەڕو پۆڵی باڵندە ◦ تاكەكەی (ريشة) ◦ پۆشاكی بەنرخ ◦ ناوماڵ ◦ سامان ◦ هەرزانی ◦ بارودۆخی لەبار ◦ (ك: أرياش ورياش).

**الرِّيْشُ:** تووكی زۆر بەگوێچكەو دەمو چاویەوە ◦ ئەو بەڵغو چڵكەی لەسەر مەعدەن دەردەكەوێ پێش مشتو ماڵ كردنی.

**الرِّيشَةُ:** قەڵەمێكە دروستكراوە لەدارو لەپەڕی مەعدەن ◦ پارچەیەكە لەئامێری عود لە بواری مۆسیقادا بەكاردەهێندرێ بۆ لێدانی وەتەرەكان (ژێیەكان) ◦ لەئامێری قانون دا پارچەیەكە لەشاخی حەیوان دەتاشرێو دەكرێندرێ تاتەواو باریك دەبێ ◦ دەخرێتە نێوان چاوە قامكو كوشتبانەوە ◦

لەبواری وێنەکێشانیش دا بریتییە لە پەڕی باڵندەیەك لەمەرەکەب هەڵدەکێشرێو وێنەی پێ دەکرێ یان شتی پێ دەنوسرێ.

**اَلْمُرَيَّشُ**: پیاوێك پشتی لاواز بێ ٥ یان پاشا پەڕە باڵندەیەکی پێ بەخشیوە بۆئەوەی لەسەری قایم بکاو ببێتە نیشانەی رێزلێنان بۆی.

**الرياضة**: بڕوانە وشەی (رَوَضَ).

**الرَّابِطَةُ**: لیفە یان چەرچەف کە هەمووی لەیەك تانو پۆ بێو یەکپارچە بێ ٥ هەر قوماشێك نەرمو تەنك بێ، دەگوترێ: (خرج مشتملا بريطة الظلماء) ٥ (ك: رَيْط ورِياط).

**راعَ الشَّئُ ريعاً وريوعاً**: شتەکە گەشەی کرد زیاد بوو.

**راع الإنسانُ او الحيوانُ رَيْعاً**: ئادەمیزاد یان حەیوانەکە گەڕایەوە، دەگوترێ: (وَعَظْتُهُ فأبى أن يَرِيعَ): ئامۆژگاریم کرد بەگوێی نەکردم نەهاتەوە سەر رێبازی راست ٥ (هربت الإبلُ فصاع عليها الراعي فراعت اليه): حوشترەکە تەرەبوو شوانەکە بەدەنگی بەرز بەسەریا قیڕاندی گەڕایەوە هاتەوە بۆ شوێنی خۆی.

**راع فلان**: فلانکەس ترسا.

**أراعَ فلان**: فلانکەس کشتوکاڵەکەی گەشەی کردو بەروبومی باشی هەبوو.

**أراعَ الشَّئَ**: شتەکەی گەشەپێ کردو زیادی کرد.

**رَيَّعَ**: بەمانا (أراع) دێ.

**تَرَيَّعَ الشَّئُ**: شتەکە زیادی کردو گەشەی کرد.

**تَرَيَّعَ فلان**: فلانکەس سەرسام بوو راوەستا ٥ مکیاجی کردو رۆنی لەقژی داو خۆی رازاندەوە.

**تَرَيَّعَ الماءُ**: ئاوەکە رەوان بوو.

**تَرَيَّعَ يَدُهُ بالجود**: دەستی بەخشندە بوو خێرو بێری زۆر بۆ هەژاران بوو.

**استراعَ فلان**: بەمانا (تَرَيَّعَ)دێ.

**الرَّيْعُ**: زێدەو پاشماوەی هەرشتێك بێ ٥ بەروبوم ٥ لەبواری ئابوری سیاسی دا بریتییە لەوبەشەی سەپانو وەرزێر دەیدەن بەخاوەن مڵك لەبەرامبەر سود وەرگرتن لەئامێرو زەویو زارو وزە سروشتییەکانی سەرمایە دارەکە ٥ هەروا وشەی (الرّيع): ئاوە بۆ سەرەتای هەموو شتێكو باشترینی دەگوترێ: (هذا في ريع الشباب): ئەوە لەسەرەتای گەنجیو لاویەتی دایە ٥ (ريع الضحا): روناکایی چێشتەنگاو ٥ رێباز ٥ (ك: ريوع، أرياع).

**ريعان كل شيئ**: سەرەتاو باشترینی هەموو شتێك، دەگوترێ: (ريعان الشباب)و (ريعان المطر).

رَيَّغ الطعامَ: خواردنەکەی چەورکرد ٥ (رَيَّغَ الشَّيْ): شتەکەی خۆلاوی کرد ٥ (تريَّغ الطعامُ): خواردنەکە چەور بوو.

الرَّيَاغ: گڵ ٥ یان گڵە وردە ٥ بەروبوم‌و بەرەکەت.

الرَّيغ: تەپ‌و تۆز ٥ گڵ.

**راف** فلان: فلانکەس هاتە لادێ.

رافـــت الماشـــية: ئاژەڵـــەکان کشت‌وکاڵەکەیان خوارد.

أَرْيَفَ فلان: بەمانا (راف)دێ.

أَرْيَفَـــت الأرض: زەوییەکـــە بـــەپیت‌و بەرەکەت بوو.

أرافـت الأرضُ: زەوییەکە بەپیت بوو، بەروبوومی چاکی هێنا.

رايف لِلطِيَّةِ: تۆمەتەکەی هێنایەدی.

تَرَيَّفَ فلان: بەمانا (راف)دێ.

الرِّيـفُ: زەوی کشت‌وکاڵ‌و بەروبووم‌و لادێ ٥ هەرشوێنێـــك شـــارو گـــەورەدێ‌و شاروچـــکە نـــەبێ ٥ خـــواردن‌و خواردنـــەوەی زۆرو زەبەندە ٥ (ك: أرياف وريوف).

الرَّيِّفَـــةُ مـــن الأرض: زەوی بـــەپیت‌و بەرەکەت.

**راق** الماءُ ونحوه رَيْقاً: ئاوەکە هەڵڕژا.

**راق** السرابُ: بەردە سیخرۆکە تراوێلکەکە درەوشایەوە.

**راق** فلان بنفسه رَيْقاً: فلانکەس گیانی دا.

أراقَ الماءَ: ئاوەکەی هەڵڕژاند.

رَيَّقَهُ الشرابَ: شەرابەکەی بەبێ پالاوتن پێ خواردەوە.

تَرَيَّقَ الشرابُ: شەرابەکە ڕژا.

تَرَيَّـــقَ المـــاءَ أو الطعـــامَ: ئاوەکـــەی خـــواردەوە، خواردنەکـــەی خـــوارد بەبێ پێخۆر.

الرائِق: پاڵفتەو پاڵێوراو ٥ (خبز رائـق): نانی بێ پێخۆر.

الرِّيـقُ: دەگـوترێ: (خبـز رِيـقٌ): نـانی پێخـــۆر ٥ ئـــاو خواردنـــەوەی لەخورێنی ٥ شتی بەتاڵ‌و پڕو پوچ ٥ سەرەتای گەنجی.

الرِّيقُ: لیك ٥ (ك: أرياق ورياق) ٥ هێزو توانا ٥ برسیەتی، دەگوترێ: (جاءوا على الرِّيق): بەبرسێتی هاتن.

الرِّيقة: بەمانا (الريق)دێ ٥ یان کەمێك لـــەلیك ٥ ســـەرەتای گـــەنجی ٥ لەهەموو شتێك نایابەکەی.

**رالَ** الـصَّبِيُّ ريـلاً: منداڵەکە لیکی چاند لیکی لەدەم هاتە دەر.

رَيَّلَ الصَّبِيُّ: بەمانا (رالَ)دێ.

الرِّيـــالُ: لیـــك ٥ جۆرێـــکە لـــەپارەی سکەلێدراوی هەندێ وڵات.

الرِّيالَةُ: لیك.

الْمَرْيلـــةُ: دەســـە سرێـــکە پارچـــە قوماشێـــکە لەگـــەردنی منـــداڵ دەئاڵێنـــدرێ بـــۆ ئـــەوەی لیکەکـــەی پۆشاکەکانی تەڕنەکا.

**رامَ** الجُرْحُ ريماً وريماناً: برینەکە دەمی وێـك هاتـەوەو بـەرەو چاکبوونەوە دەچێ.

**رام الحِمْلُ**: بارەکە لاسەنگ بوو، خواربوو.

**رام علیه رَيْماً**: لـێی زیاد بوو، دەگوترێ: (له ريم على هذا): فەضلو پیاوەتی بەسەر فلانەوە هەیە.

**رَيَّمَت السحابة**: هەورەکە بارانەکەی بەردەوام بوو.

**رَيَّمَ فلان**: فلانکەس تەواوی رۆژەکە بەردەوام بوو لەرۆیشتن ٥ (رَيَّمَ فلان بالمكان): فلانکەس لەوشوێنە جێنشین بوو.

**رَيَّمَ علیه**: لـێی زیادکرد.

**الرَّيْمُ**: گۆڕ ٥ ئێوارە تاکاتی داهاتنی تاریکی، دەشگوترێ: (بقي رَيْمٌ من النهار): سەعاتێکی درێژی رۆژماوە ٥ هەروا بەمانا (پلە)دێ.

**الرِّيْمُ**: ئاسك کەهەموو جەستەی سپی بێ.

**ريم** البركة أو الأرز: هەودا قەوزدی سەوز کە بەسەر ئاوی ڕاوەستاوەوە دەردەکەون.

**رانَ** الثوبُ رَيْناً: بۆشاکەکە چڵکن بوو.

**رانت النفسُ**: دەروونی پیس بوو.

**ران الشيءُ** فلاناً وعليه وبه ريناً وريوناً: شتەکە بە سەرفلانکەس دا زاڵ بوو دایپۆشی، دەگوترێ: (رانت علیه الخمرُ): شەراب کاری تێکردو مەستو کەلەلای کرد ٥ (ران علیه النعاسُ): هەنەوز بەسەری دا زاڵ بوو.

**ران على قلبه الذ نبُ**: تاوان بەسەر دڵو دەروونی دا زاڵ بوو، دڵی رەش بوو بەهۆی ئەنجامدانی تاوان دوا تاوان ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾.

**رِيـن بـه**: مرد ٥ کەوتە کێشەو چورتمێکەوە دەرهقەتی نایەو ناشتوانێ لـێی دەرچێ.

**أران**: ئاژەڵەکانی فەوتان، یان کزو لاواز بوون.

**الرَّانُ**: پەردەو داپۆشەری ئەستور ٥ ژەنگ کە شتی وەکوو شمشێرو خەنجەر دادەپۆشێ ٥ تاوانو ستەم کە دڵو دەروون دادەگرێ ٥ چڵكو بزوێن.

**الرَّين**: بەمانا (ألرَّانُ)دێ.

**الرَّينةُ**: شەراب.

**رَاهَ السرابُ رَيْهاً**: تراویلکەکە دردوشایەوە.

**رَيَّهَتِ الهاجِرةُ السرابَ**: گەرمای کاتی نیوەرۆژ تراویلکەکەی والێکرد لەپێش چاو جمو جۆڵ بکا.

**تَرَيَّهَ**: بەمانا (رَاهَ)دێ.

**الرِّيْهَقانُ**: بڕوانە مادەی (رَهَقَ).

**رَيَّا الرَّايَةَ**: ئالای دروست کرد ٥ چەقاندی.

**الرِّيَّا**: بڕوانە وشەی (رَوِي).

**الرَّايَةُ**: ئالا ٥ (ك: رايّ).



**الـزّاي**: پيتـى پانزەھەمـە لـەپيزى پيتـەكانى هيجاء ٥ شـوێنى دەرھـاتنى لـەنێوان سـەرى زوبـانو بنكـى دووكەڵبـەى لاى سـەرون ٥ لەحەرفەكانى صەفير دوژمێردرێ.

**زَأَبَ** زَأْباً: بەتاسـوخەوە شـلەمەنييەكەى خواردەوە.

**زَأَبَ بِحِمِلِهِ**: شتەكەى كێش كرد ڕاى كێشا.

**زَأَبَ الإبلَ**: حوشترەكانى لـێ خوڕين.

**زَأَبَ الـشّيْءَ**: شـتەكەى لـەباوەش گـرتو بەگورجى هێنايە پێشەوە.

**زَأْبَـرَ الثـوبُ**: كراسـەكە (قوماشـەكە) پڕزو پاڵى لـێ پەيدابوو.

**زَأْبَرَ فلانٌ الثوبَ**: فلان ريشوو پڕزى بۆ قوماشەكە كرد.

**الزِّئْبَـرُ**: ئـەو توكـە وردەو پـڕزو پاڵەيـە كەلەسـەر شـتى چنراو (قومـاشو شـتى وەھا) دەردەكـەوێ، دەگـوترێ: (أخَـذَ الـشّيْءَ بِزِئْبَـرِهِ): شـتەكەى بەكوڵـەكومووەوە بـە پـڕزو پاڵـەوە وەرگرت.

**زَأْبَقَ الشّيْءَ**: شتەكەى بە جيوە سواخ دا جيوەى تێهەڵسو.

**الزِّئْبَقُ**: عونصورێكى فلزى شلە لەپلەى گەرمى ئاسايى دا.

**زَأَرَ الأسَدُ زَأْراً زَئِيراً**: شێرەكە نەڕاندى.

**زَأَرَ الفحـلُ**: ئەسـپەكە حيلانـدى ٥ (هـو زائر، وهي زائرة).

**زَئِرَ**: بەمانا (زَأَرَ)دێ.

**أزْأَرَ**: بەمانا (زَأَرَ)دێ.

**الزِّئِرُ**: پياوى رق هەڵساو، زيز بوو؛ ئەوەى دەنگى لەبرادەرى خۆى دابڕيوە.

**الزَّأْرَةُ**: بيشەى شێر (لانەى شێر) ٥ باخ ٥ جەڵەبێـكى زۆرو چـڕو پـڕ لەحوشترو مەڕو بزن.

**الـزُّئِيُّ**: (ألـزئير الـصوري): جـۆرە نەخۆشييەكە تووشى قورگى ولاخـە بەرزە دەبێ.

**زَأْزَأَ**: بـازى هاويـشت ٥ (زأزأ الظّلِـيمُ): نوعامەكە راى كرد كلكو ملى خـۆى بەرز كردبونەوە.

**زأزأ فلانـاً**: فلانكەسـى ترسـاند ٥ (زَأْزَأَ الشّيْءَ): شتەكەى جولاند، دەگوترێ: (زَأْزَأَهُ الخوفُ): ترسو بـيم وەشـەقە تۆڵەى هێناوەو لەرزەى پێ خستووە.

**تَـزَأْزَأَ**: كەوتـە لێـوە لـەرەو جـەو جـۆڵ ٥ بەپـەل ڕاوەشـان ڕۆيـى وەكـوو شـێوە ڕۆيشتنى جل كوتو جل شۆر ٥ ترسا ٥ خۆى شاردەوە ٥ (تَزَأْزَأَ منه): لـێى ترساو خـۆى بـە بـچوك نيـشان دا لەئاسـتى دا.

**زَأَفَهُ زَأْفاً**: پەلەی لێ کرد ٥ (أزْأَفَ عليه): گیانی دەرچواند.

**أزأفَ فلاناً بطنُهُ**: فلانکەس ورگی بڕستی لێبڕیوە.

**الزُّؤافُ**: پەلەکردنو خێرایی ٥ (موت زؤاف): مردنی خێرا.

**زَأَمَ زَأْماً وزؤاماً**: خێرا گیانی دەرچوو، گـتو پـڕ مـرد ٥ بەتاسـوخەوە خواردنەکەی خوارد.

**زَأَمَ فلاناً زأماً**: ترساندی.

**زَأَمَ البردُ فلاناً**: سەرماو لەرز جەستەی فلانی پڕکردووەو توشی لێوە لەرەو هەڵ لەرزینی کردووە.

**زَأَمَ لِي فلان كلمةً**: فلانکەس قسەیەکی بۆ کردم نەمزانی راست دەکا یان درۆ.

**زُئِمَ زأماً**: ترسێنرا ٥ (زَئِمَ زَأَماً): بەمانا (زُئِمَ) دێ.

**زُئِمَ بفلان**: بەفلانکەس دا هەڵشاخیو بەسەریا نەڕاندی.

**أزْأَمَهُ على الأمر**: بەزۆر کارەکەی پێ کرد.

**أزْأَمَ اليه**: وای لێ کرد پەنابەرێ بۆ فلان.

**أزْأَمَ الجُرْحَ بِدَمِهِ**: بەخوێنەوە برینەکەی وێکهێنایەوەو بەستیو خوێنەکەی پێوە وشک بۆوە ٥ برینەکەی دەرمانکرد تا چاك بۆوە.

**الزُّؤام**: (موت زؤام): مردنی خێرا.

**الزُّؤْمُ**: حەسەبو نەسەب ٥ چاو.

**الزَّأمَةُ**: دەنگی بەهێز، دەگوترێ: (ما سمعتُ له زَأْمَةً): دەنگی بەرزم لێ نەبیست ٥ خواردنو خواردنەوەی بەتاسوخ ٥ پێداویستی، دەگوترێ: (أخذ من الطعام زأمَتَهُ): پێداویستی خۆی لەخواردنەکە برد.

**المِزْآمُ**: کەسێك زۆر بترسێو هەڵ لەرزێ.

**الزُّوانُ**: مرۆر؛ گیایەکە بەزۆری لە ناو گەنم دا دەڕوێ، دانەوێڵەکەی وەکوو گەنم وایە بەڵام رەنگی ڕەشە یان زەردە کەدروێنە دەکرێ لەگەڵ گەنمەکە تێکەڵ دەبێو تامو چێژی گەنمەکە تێك دەداو خراپی دەکا.

**زَأَيَ زأياً**: لوتبەرزیی نواند، خۆی بەزل زانی.

**أزْآهُ بطنُهُ**: ورگی پڕبوو نەیتوانی بجوڵێ.

**إزْبَأَرَّ الشَّعْرُ**: قژەکانی بژبوون، موی ژاکا.

**إزْبَأَرَّ النباتُ والوبرُ**: رووەکەکە یان توکەکە رواو دەرکەوت.

**إزْبَأَرَّ الرجلُ**: پیاوەکە خۆی ئامادەکرد بۆ شەڕ.

**زَبَّ القِرْبَةَ**: کوندەکەی پڕکرد.

زَبَّ الحِمْلَ: کۆڵەکەی هەڵگرت.
زَبَّ زَبَباً: زۆری توك‌و کوڵك پێوە بوو ٥ (هو أزبُّ وهي زَبّاءُ).
زَبَتِ الشمسُ: خۆر نزیك بەئاوابوون بوو.
أَزَبَّتِ الشمس: بەمانا (زبَّتْ)دێ.
أَزَبَّتِ العِنَبُ: ترێیەکەی کرد بەمێوژ.
زَبَّبَ العِنَبُ: ترێیەکە بوو بەمێوژ.
زَبَّبَتِ الشمسُ: خۆر نزیك بەئاوابوون بوو.
زَبَّبَ شِدْقا فلان: هەردوو لاشەویلەی فلان پڕبوون لەتف، دەگوترێ: (زَبَّبَ فم فلان): دەمی فلان پڕبوو لەتف.
زَبَّبَ: بۆ موطاوعەی (زَبَّبَه)دێ.
تَزَبَّبَ العِنَبُ: ترێیەکە بوو بەمێوژ ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (تَزَبَّبَ قبل أن يتحصرم): پێش ئەوەی ببێتە بەرسیلە بوو بەمێوژ، بەکەسێك دەگوترێ لافی شتێك لێبدا هێشتا خۆی بۆ ئامادە نەکردبێ.
تَزَبَّبَ فلان: فلانکەس قسەی زۆری کرد زیاد لەپێویست ئاخاوتنی کرد ٥ پڕبوو لەرق‌و کینە.
الأَزَبُّ (عام أَزَبُّ): ساڵێکی هات‌و پڕپیت‌و بەرەکەتە گژوگیای زۆرو زەبەندەیە.
الزَّبابَةُ: جۆرە مەگەزێکە لەباکوری ئەوروپا زۆرە.
الزَّبَبُ: قیژمو هەرا ٥ (الزَّبَبُ في الإنسان): توکنی‌و مو درێژی.
الزَّبيب: دەنکە مێوژ ٥ ترێی وشك کراو ٥ کەفی سەرئاو ٥ ژەهر لەناو دەمی ماردا ٥ شەرابێك لەمێوژ دروست بکرێ.
الزَّبيبَةُ: دەنکە مێوژ ٥ بالوکە کەلەدەست‌و پەنجە پەیدا دەبێ کەفێکە لەلغاوی ئەوکەسە دەردەکەوێ کە زۆر قسەبکا ٥ خاڵێکە لەدوخاڵی رەش کەلەسەرو چاوی مار یان سەگەوە دەردەکەوێ ٥ لەحەدیث دا هاتووە: (يجيء كنز أحدهم يوم القيامة شجاعاً أقرع له زبيبتان).
الزَّبيبيُّ: مێوژ فرۆش ٥ خۆشاوی مێوژ.
زَبَدَهُ زَبْداً: رۆنەکەرەی دەرخوارد دا.
زَبَدَهُ السقاءُ: مەشکەکەی هەژاند بۆئەوەی رۆنەکەرەی لێ پەیدا بکا.
زَبَدَ الطعامَ زَبْداً: خواردنەکەی تێکەڵی رۆنەکەرە کرد.
أَزْبَدَ: کەفی چاند، کەفی هەڵدا، دەگوترێ: (أزبَدَ البحرُ)، (أزبد فم البعير الهادر) ٥ (أرغى فلان وأزْبَدَ): فلانکەس رقی هەڵساو هەڕەشەی کرد ٥ کەفی چاند.

**زلَّ عُمرُهُ**: تەمەنی بەخێرایی تێپەڕی.

**زلَّ النَّقُودُ**: پارەکە کێشی کەم بوو.

**زلَّ زَلَلاً (زَلَّ يَزِلُّ)**: گۆشتی سمتو ڕانی کەم بوو، لاوازو لەڕبوو ٥ (هو أزلُّ وهي زَلاَّءُ).

**أزَلَّهُ**: هەڵیخلیسکاند ٥ پێشی خست.

**زَلَّلَ اليه نِعمةً**: نازو نیعمەتی پێدا، دەگوترێ: (فلان مُزَلَّلٌ): فلانکەس نانبدەو سەخی سروشتە ٥ زۆر دیاری بۆ خەڵک دەنێرێ ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (هي مُزَلِّلَةٌ).

**استَزَلَّهُ**: بەمانا (أَزَلَّهُ)دێ ٥ رایکێشا بۆ تاوان کردن.

**الأزَلُّ**: خێراو تیژڕۆ ٥ (السمع الأزَلّ): جۆرە گورگێکە لەنێوان کەمتیارو گورگ دا دێتە دی.

**الزُّلاَلُ**: ئاوی شیرینو گواراو ساردو صاف ٥ شتی رونو شەفاف لەهەر شتێک بێ ٥ لەبواری کیمیادا جۆرێکە لەپرۆتین لەئاودا دەتوێتەوە.

**الزُّلالِيُّ**: دەگوترێ: (بول زلالِيٌّ): میزێکی ڕونە.

**الزُّلُّ**: دەگوترێ: (مقام زُلٌّ): شوێنێکە خلیسکە.

**الزَّلاَّءُ**: بۆ مێینەی (الأزلّ) بەکاردێ، دەگوترێ: (قوس زلاَّءُ): قەوسێکە ڕێڕەوی تیرەکەی زۆر لوسەو بەخێرایی تیرەکەی لێ دەردەچێ.

**الزَّلَّةُ**: تاوان، هەڵە ٥ بوک ٥ زیافەتو داوەت ٥ دەست ڕەنگینیو کاری باش ٥ بەخشش.

**الزُّلَّةُ**: تەنگە نەفەسی.

**الزِّلَّةُ**: بەردی لوس.

**الزَّلِّيَّةُ**: جۆرە ڕاخەرێکە ٥ (ك: زَلاَلِيٌّ).

**الزُّلْـزُولُ**: دەگوترێ: (مكان زلـول): شوێنی خلیسک (ماء زُلُولُ): ئاوی زولاڵ.

**الزَّلِيل**: (ماء زليل): ئاوی زولال ٥ (مكان زليل): شوێنی خلیسک.

**الْمَزِلَّةُ**: شوێنی تاوانو هەڵخلیسکان.

**زَلَمَ زَلْماً**: هەڵەی کرد.

**زَلَمَ أنفَهُ**: لوتی بڕی.

**زَلَمَ عَطَاءَهُ**: بەخششەکەی کەم کردەوە.

**زَلَمَ السَّهمَ**: تیرەکانی ڕاستو ڕێکو پێک کردن، باشی دروست کردن.

**زَلَمَ الإناءَ**: قاپەکەی پڕکرد.

**زَلِمَ زَلَماً**: گوێی بزنەکەی بڕیو لێی نەکردەوە، پارچەکە پێوەی مایەوە.

**زَلَّمَهُ**: بەمانا (زَلَمَ)دێ.

**زَلَّمَ غِذاءَهُ**: خواردەمەنی خراپی پێدا لاشەی پێی لاواز بوو.

**زَلَّمَ الإبِلَ**: گوێچکەی حوشترەکەی بڕیو پارچە بڕاوەکەی پێوە هێشتەوە.

**زَلَّمَ الرَّحَى**: بەرداشەکەی خولاندەوەو لەملاو لەولای تاشی.

إِزْدَلَمَ رأسَهُ: سەری بڕی.

إِزْدَلَمَ أنفه: لوتی بڕی.

الأَزْلَمُ: کەڵەکێوی، نێریە قەرەی کێوی ٥ ڕۆژگـاری نـاخۆش‌و پڕکارەسـاتو بەڵاو چورتم.

الـزَلَمُ: تـیری بـێ پـەڕ ٥ (ك: أزلام) ٥ لــەرۆژگاری پــێش ئیــسلام دا عەرەبەکان لەرێگای تیرەوە شتیان بەش دەکرد، ئەوەبوو دەهاتن سەرە تیرەکانیــان دەخــستنە نــاو تورەکەیــەوە تێــکەڵاویان دەکـردن ئـەمجار دەسـتیان دەبـرد تیرێـکیان دەردێنـا ئەگـەر لەسـەری بنوسـرایە بکە ئـەو ئیشەکەی دەکرد، ئەزگەر لەسـەری بنووسـرایە مەکـە ئـەوە وازی لەئیشەکە دەهێنا.

الزَلْماءُ: مێینەی (الأَزْلَم) بزنە کێوی ٥ بازی مێ.

الزُلَمَةُ: شێوەو هەندام، دەگوترێ: (هـو العبـد زُلمـةً): دەق لەکۆیلە دەچـێ، شــێوە کۆیلەیــە ٥ پارچــەیەك لەگەردنی بزن دا شۆڕ دەبێتەوە.

المُزَلَّمُ: کورتە باڵای گورج‌و گۆڵ‌و ڕۆح سوك ٥ کلك کورت.

زَمَتَهُ زَمْتاً: خنکاندی.

زَمُتَ زمانـةً: عـاقڵ‌و سـەنگین بـوو ٥ کـەم قسە بوو.

تَزَمَّتَ: خۆی قورس ڕاگرت ٥ تونـد ڕەو بـوو لـەبارەی ئـایین‌و ڕاو بۆچـونی خۆیەوە.

الزِّمْـــتُ: قەلــە ڕەش؛ باڵندەیــەکی تێـکـسمراوو بـە پـەڕو پـۆڵی ڕەش جەستەی داپۆشراوە.

الزِّمیــتُ: کەسێــك زۆر پابەنــدی ڕاو بۆچونی خۆی بێ ٥ (هي زمیتة).

المُتَزَمِّتُ: بـەویقارو عـاقڵ ٥ تونـدڕەو دەربارەی ئایین.

زَمَجَ علیه زَمْجاً: بەبێ ئیزن‌و پرس کـردن چووە ژور، بێ ئەوەی بانگ بکرێ.

زَمَجَ بین الناس: ئاشوبی لەنێوان خەڵـك دا نایەوە خەڵکی هەڵنا بۆ یەکتر.

زَمَجَ القِربَة: کوندەکەی پڕکرد لەئاو.

زَمِجَ زَمِجاً: ڕقی هەڵسا ٥ (هـو زَمِـجٌ وهـي زَمِجَةٌ).

إِزْمَاجٌ: بەمانا (زَمِجَ)دێ ٥ شتێـکی تـەڕ هەڵبهاوسێ لەبەر گەرمی یان شێ.

الزُّمَّاجُ: کەسێك قاچی بچکۆلەبێ.

الــزُّمَّجُ: بــەمانا (الزُمَـــاجُ) دێ ٥ باڵندەیەکـە لـەپێری بـازو هـەڵۆو داڵاشەکانە، زۆر ڕەنگی هەن بەزۆری سـوورە، باڵندیـەکی گۆشـت خـۆرە، دەندوکی تیژو بەهێزی هەیە.

زُمَّـجُ المـاءِ: باڵنـدەی ئاوییـە لـەپێری باڵنــدەی ئەورەســییە دەندوکێــکی درێــژی کەوانــەیی هەیــە، ڕەنگــی سـەوزی مەیلـەو سوورە، قاچـەکانی

وەکـــــوو لەپەدەســــت وەهــــان، بارمەتیدەرنی بۆ مەلەکردن.

**زَمْجَرَ**: دەنگی خۆی لەراندەوە لەسنگی دا گەڕاندیەوە، گریەکی تێدا بوو.

**زَمَخَ** زَمْخاً وزُموخاً: خۆی بەزل زانی‌و تەکەببوری نواند، دەگوترێ: (زَمَخ بأنفه): لوتبەرزی نواند ٥ (تَزَمَخَ): تەکە ببوری نواند.

**الزّمِخُ**: بەرزو بڵندو سەرکەش، دەگوترێ: (جبل زامِخ) (أنف زامِخ) (وكيل زَامِخ).

**الزَّمَخُ**: دەگوترێ: (عقبة زَمَخٌ) و(رحلة زَمَخٌ): کارێکی ئەستەمە، سەفەرێکی ناخۆشە.

**الزُّمُوخُ**: بەمانا (زَمَخَ)دێ.

**زَمْخَرَ الصوتُ**: دەنگی بەهێز بوو، دەگوترێ: (زَمْخَرَ النِّمرُ وغيره): پڵینگەکە زیراندی لەکاتی ڕق هەڵسانی دا.

**زَمْخَرَ الشجرُ**: درەختەکە تێك چڕژاو لق‌و پۆپی لێك هالان.

**زَمْخَرَ العُشْبُ**: گیاو گژەکە لەخۆ کەوت‌و درێژ بوو چڕۆی کرد.

**تَزَمْخَرَ النِّمرُ وغيره**: بەمانا (زَمْخَرَ)دێ.

**اِزْمَخَرَّ الصوتُ**: دەنگەکە بەهێز بوو.

**الزّماخِرُ والزماخِرِيّ**: ناوکلۆر.

**الزَّمْخَرُ**: کلۆر ٥ شتی وەکوو قەفەزاز ئێسقان کەمۆخی نەبێ ٥ قەفەزازی میزمار بلوێر ٥ تیری دروستکراو لەقەفەزاز ٥ درەختی پڕلق‌و پۆپ‌و تێکچڕژاو ٥ پیاوی شکۆمەند، ڕێزدار.

**زَمَرَ** زَمْراً وزميراً: بەمیزمار بلوێری لێ دا ٥ بەجوزەلە شمشاڵی لێ دا.

**زَمَرَ بالحديث**: هەواڵەکەی بڵاوکردەوە.

**زَمَرَت النعامة زماراً**: نوعامەکە گارەگاری کرد.

**زَمَرَ الظَّبْيُ زمراناً**: ئاسکەکە تەرە بوو هەڵ سڵەمیەوە.

**زَمَرَ فلاناً بفلان زَمْراً**: فلانکەسی بەفلان لەخشتە برد.

**زَمَرَ الوعاءَ**: قاپەکەی پڕکرد.

**زَمِرَ الشَّئُ زَمْراً**: شتەکە کەم بوو، دەگوترێ: (زَمِرَ صوفُهُ أو شعره أو ريشُهُ).

**زمر فلان**: فلان پیاوەتی کەم بوو مەردایەتی زەعیف بوو ٥ (عطية زَمِرَة): بەخششی کەم.

**زَمّرَ بالمِزْمارِ**: فوی بەبلوێرەکەدا کردو بلوێری لێ دا.

**زَمَّرَ الوعاءَ**: قاپەکەی پڕکرد.

**زَمَّرَ الكلْبَ**: قلێتەی لەملی سەگەکە کرد.

**استَزْمَرَ**: وێك هاتەوەو پوچایەوە.

**ألزَّمِرُ**: زوڕنا ژەن ٥ بلوێر لێدەر.

**الزّمار**: گارەگاری نوعامە ٥ ڕوانی موو

لەسەری منداڵی تازە لەدایك بوو.

**الزُمْرَةُ**: فەوج‌و تاقم‌و كۆمەڵ ٥ پێرو دەستە.

**الزّمّار**: بەمانا (الزّامِرُ)دێ.

**الزّمّارةُ**: مێینەی (الزّمّار)ە ٥ ئامێری گۆرانی گوتن‌و بلوێرلێدان ٥ زنجیر ٥ قلێتەی ملی سەگ.

**الزّميرُ**: جۆرە ماسییەکە مەیلەو درێژە جەستەی لوسە توێکڵ‌و شتی پولەکە ئاسا دای نەپۆشیوە، لەلاتەنیشتەکانی دا صەفیحەی ئێسقانی هەن کلکێکی درێژی هەیە، لەروبارەکانی ئەوروپادا دەژی ٥ هەروا ئاوە بۆ باڵندەیەکی جەستە بچوکی تێکسمڕاو، بەپەرو پۆڵی نەرم جەستەی داپۆشراوە ڕەنگی خاکی‌و ڕەنگی مەیلەو سورە، حەزی لەشوێنی روتەن‌و سەرانسەری کێوو کەمژە، لەمیصرو هەندێ وڵاتی عەرەبی تر دەژیا.

**الزُمَيْرُ**: جۆرە ڕوەکێکە لەپێری نەرجیلی.

**الزُّمُورُ**: کوڕە لاوی جوان ٥ (ك: زُمُرٌ).

**الزِّمِّيُ**: کورتە باڵا ٥ (ك: زمار).

**المِزْمَارُ**: ئامێرێکە لەدار یان لەمەعدەن بۆڤێکی پانی بەلای سەریەوە هەیە ٥ بەکوردی (زوڕنا) ٥ (ك: مَزَامِير).

**المزمور**: بەمانا (المِزمار)دێ ٥ (ك: مزامير).

**مزامير داود**: ئەو ئامێرانەی حەزرەتی داوود سرودە ئایینیەکانی پێ دەخوێنند ٥ کتێبێکە دوعاو سرودەکانی حەزرەتی داودو حەزرەتی سولەیمان‌و ئاصەفی بەرخیای تێدا کۆکراوەتەوە کەناونراوە (الزبور).

**الزُّمُرُّدُ**: بەردێکی بەنرخە، ڕەنگی سەوزە زۆر سەوزەو شەفافە هەتا سەوزتر بنوێنێ بەنرخترەو نیشانەی باشییەتی.

**زَمْزَمَ**: لەدوورەوە دەنگی هات دەنگێك کەلێی حاڵی نەدەبووی ٥ مۆنەمۆنی کرد، دەگوترێ: (زَمْزَمَ الحصانُ): ئەسپەکە حیلکە حیلکی کرد ٥ (زَمْزَمَ المغنّي): گۆرانی بێژەکە دۆنە دونی بوو ٥ (زمزم المجوسي عند الأكل والشراب): بابای ئاگر پەرست لەکاتی خواردن‌و خواردنەوەدا دۆنەدۆنی کرد دەمی وێکنابوو گمەگمی بوو، لەلوتی دا گوتەکانی دەگوتن زمانی‌و لێوی نەجولاند.

**زَمْزَمَتِ النارُ**: ئاگرەکە لەکاتی هەڵگیرسانی دا لرفەلرف‌و قرچە قرچی هات.

**زَمْزَمَ شيئاً**: شتەکەی کۆکردەوە ئەوەی لێی بڵاو بوبووەوە هەڵیدانەوە سەر کۆمەڵ.

**الزُّمازِمُ من المياه**: ئاوی زۆر.

**الزَّمْـزَامُ مـن الميـاه**: ئاوێـك لـەنێوان شیرین‌و سوێریی دا بێ، دەگوترێ: (سحاب زمـزام): هەورێـکە دەنگـی زۆر ئاشکرا نییە.

**الزَّمْـزَمُ مـن الميـاه**: بـەمانا (الزُّمـازم)و (الزَمـزام)دێ ٥ بیرێـکە لەمەککـە لەپـەنا کەعبـە، ئاوەکـەی پـیرۆزو شـیفایە، ئاوەکـەی بەشـێوەی موتفەڕك دەبرێ بۆ هەموو جیهانی ئیسلامی.

**الزَّمْزَمَةُ**: کۆمەڵ‌و تاقم.

**الزَّمْزَمية**: کوندە ئاو دێمکە ئاو، مەتارە ئاو، دەبە ئاو.

**الزُّمْزُومُ من الناس**: پاڵەتەی ئادەمیزادو پیاوە باشەکانی، دەگوترێ: (فلان في زُمـزُوم قومـه): فلانکـەس لـەپیاوە باشـەکانی گەلەکەیـەتی ٥ (ك: زَمازیم).

**زَمَعَ زَمْعاً وزموعاً وزمعاناً**: لەرۆیشتن دا پەلـەی کـرد، دەگـوترێ: (زَمَعَـتِ الأرنـبُ): کەروێـشکەکە بـەخێرایی رۆیی.

**زَمِعَ زَمْعاً**: تاسا، ترسا ٥ لـەرزی، دەگـوترێ: (زمِعَـت أصَـابِعُهُ): پەنجـەکانی زیادەیان تێدا بوو ٥ (هو أزمـع وهـي زَمْعاء).

**زَمِعَ فلان**: فلانکەس چوست‌و چالاك‌و ئازا بوو.

**أزْمَعَ**: پەلـەی کـرد، (أزمعت الأرنـبُ): کەروێشکەکە بازی داو دوایی هێواش بووە.

**أزمعـت الكرمـةُ**: دار مێوەکـە پـۆخی کـردو شوێنی تولـەمێوی تـازەی لـێ دەرکەوت.

**أزمـع النبـات**: گژوگیاکـە بـەرزو نـزم دەرکـەوت‌و هەندێـکی لەهەندێـکی باشتر رسکاوە.

**أزمـع الأمـر وبـه وعليـه**: بڕیـاری دا کارەکــە ئــەنجام بــداو وازی لــێ نەهێنێ.

**زمَّــعَ الزنبــور ونحــوه**: زەردەواڵەکـە، زەنگەسـورەکەو شـتی‌وا گیزەگیـزو ویزەویزیان بوو.

**الزَّمَــاعُ**: پەلــەو خێــرا ٥ ســوربون لەسەرکارو وەرەبەرزی.

**الزَّمَـعُ**: کەسێـك کەترسـا یـان ڕقـی هەڵـسا میـز بـەخۆدا بکـا یـان فرمێسکی بڕژێ.

**الزُّمْعَةُ**: پەڵەو کۆپلە لەگژوگیا ٥ (ك: زُمَعٌ)، دەگوترێ: (أرض بها زُمَـعٌ مـن العُشب).

**الزَّمَعَةُ**: ئەو هینەزیادەی دەستی ولاغو ئـاژەڵ لەپـشت سمیـەوە یـان بڵـێ لەپشت زەندییەوە، هەروا دەگوترێ: (فلان زَمَعَةٌ): فلانکەس شوێنکەوتەو لاپرسەنگەو کەس حیسابی بۆناکا ٥ ئـەو گرییـەی بەلاسکی هێشووی ترێوەیـە یـان تـەرزەو تـولی ئـەملاو ئەولای مێو ٥ شوێنی نزمایی زەوی ٥ (ك: زَمَعٌ، زِمَاعٌ، أزماع).

**الزَّمْعِيُّ**: هەتیو مەچە، ناکەس بەچە ٥ تەنگە تیزەو خێرا هەڵچوو ٥ پیاوی ئازاو کاراماو لێهاتوو.

**الزُّمَّعُ**: کەسێـك زوو پێداویستی جـێ بەجێ نەکا ٥ زەردەواڵەیەك چزوی نەبێو منداڵ یاری پێ دەکەن.

**الزُّمـوع**: گـورجو گـۆڵو عـەجول ٥ کەروێشکی بەنیشات.

**الزَّمِيعُ**: خێراو عـەجول ٥ پیـاوی ئـازاو سـور لەسـەر هەڵوێـستی خـۆی ٥ کۆڵنـەدەرو تێـکۆشەر ٥ راپەسـەندو چاونەترس ، دەگـوترێ: (هـو زميـع الرأي) و(فلان قلبه زميـع مـاض غير هيّاب).

**زَمَكَهُ زَمْكاً**: پڕی کرد ٥ (زَمَـكَ فلانـاً): فلانکەسی جولانـدو تێوەی ژەنـی تـا ڕقی هەڵساند.

**زَمِكَ زَمَكاً**: شتەکان تێـك گیرانو چونە ناویەکەوە پەیوەستی یەکدی بوون.

**زَمَكَ فلان**: فلانکەس ڕقی هەڵسا.

**زَمَّكَهُ**: بەمانا (زَمَكَهُ)دێ.

**الزِّمِّكَـةُ**: کەسێـك زوو ڕقـی هەڵـسێ، دەگوترێ: (فـلانٌ زِمِّكـةٌ): فلانکـەس زوو ڕقـی هەڵدەستێو هەڵدەچـێ ٥ پیـاوی ئەحمـەق ٥ کوڵەبنـەو کورتـە بـالا، دەشـگوترێ: (هـي زمكـة): بۆ ئافرەت.

**الزِّمِكُّ**: بنکی کلکی باڵندە ٥ شوێنی لـێ ڕوانی پەڕی کلکی.

**الزِّمِكِّيُّ**: بەمانا (الزِّمِكُّ) دێ.

**زَمَـلَ زَمْـلاً وَزَمَلاَنـاً**: بـازی هاویـشت لەسەرپەك قاچ واتە بەهەنگڵە شەلە بازی دا.

**زَمَلَـتِ الدَّابَـةُ**: ولاخەکـە بـەهۆی تـەرپەماخیو نیشاتیەوە وا ڕۆیـشت دەتگوت دەشەلێ ٥ ئاوگێڕی سەربەر ٥ (زَمَلَ القوسُ): کەمەندەکە فینگەی لـی هات ٥ (زَمَلَ فلاناً زَمْلاً): هاوشانی فلانـی کـرد ٥ بەشـوێن فلانکـەس دا هات ٥ شوێنی کەوت ٥ (زَمَلَ الشَّيْءَ): شتەکەی بـەرزکردەوە هـەڵی گـرت ٥ (هو مزمول وزميل).

**زَامَلَـهُ**: هاوتـایی کـرد لەسـەر پـشتی حوشـترەکە یـان لەسـەر هەرشتێـکی تربێ، دەگـوترێ: (زَامَلَـهُ في العمـل).

**زَمَّلَهُ**: شاردیەوە، دایپۆشی ٥ (زَمَّلَهُ بثوبه وفیه): خۆی لەکراسەکەیەوە پێچا.

**تَزَمَّلَ**: خۆی پێچاوەو خۆی داپۆشی، دەشگوترێ: (إِزَّمَّلَ) ٥ (هو مزّمِّلٌ) ٥ قورئان دەفەرموێ:﴿يَاأَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ﴾.

**اِزْدَمَلَ**: بەمانا (تزمَّلَ)دێ ٥ (إِزْدَمَلَ شيئاً): شتەکەی بەیەکجار هەڵگرت ٥

**الأَزْمَلُ**: هەردەنگێک تێکەڵو پێکەڵ بێ، دەشگوترێ: (سمعت أَزْمَلَ القوس): گوێم لە گیفەو ویژەی کەوانەکە بوو ٥ (أَخَذَ الشَّيْءَ بأَزْمَلِهِ): هەموو شتەکەی وەرگرت ٥ (جاء بأَزْمَلِهِ): بەماڵو بەمنداڵەوە هاتو کەسی جێ نەهێشت بوو ٥ (تَرَكَ أَزْمَلاً): ماڵو خێزانی جێ هێشت.

**الأَزْمَلَةُ**: زۆرو زەبەندە، دەگوترێ: (لە عیال أَزْمَلَةٌ) ٥ هەروا بەمانا ماڵو خێزانو دەنگی کەوانو هەمووی دێ.

**الإِزْمِيلُ**: چەقۆی کلاش برین، چەقۆی پینەچی، دەگوترێ: (قطعت الجلد بالإزميلُ) ٥ هەروا ناوە بۆ کێردێکی کەوانەیی وەکوو مانگی یەک شەوە بەسەری ڕمبەوە دەکرێ بۆ ڕاوکردنی کەڵەگا کێوی ٥ چەکوچ ٥ ئامێرێکی ئاسنە لایەکی تیژە بەردو داری پێ کون دەکرێ یان وەکوو برمەند زیادەو گرێو گۆڵی داری پێ دەتاشرێ ٥ (ك: أزاميل).

**الزَّامِلُ**: وڵاخی تەڕدەماخو بەنیشات کەدەڕوا وادەزانی دەشەلێ ٥ حوشتر.

**الزاملة**: مێینەی (الزامل).

**الزَّمَالُ**: شەل.

**الزَّمَالَةُ**: پلەیەکی زانستییە.

**الزِّمْلُ**: بار، کۆڵ ٥ ترسنۆکی هیچو پوچ ٥ تەمبەڵ.

**الزُّمَّلُ**: لاوازو ترسنۆكو پەستو پایین.

**الزِّمْلَةُ**: ئەوەی تێك هاڵاوە لە دارخورمای بەرز.

**الزُّمْلَةُ**: هاورێو تاقمو کۆمەڵ.

**الزَّمَلَةُ**: خێزانو عەیال، دەگوترێ: (ترك زَمَلَةً).

**الزُّمَّيلُ**: بەمانا (الزُّمَّلُ)دێ.

**الزَّمِيلُ**: هاوڕێی سەفەر یان خوێندن یان ئیش ٥ هاوشان ٥ ئەوکەسەی پلەی زەمالەی وەرگرتووە.

**الزُّمَيْلُ**: بەمانا (الزُّمَّلُ)دێ.

**الْمُزَمَّلَةُ**: جەڕەیەکی گەورەی سەوزە هاوینان ئاوی تێدەکرێ بۆئەوەی ساردبێ.

**زَمَّ زَمّاً**: لەڕۆیشتن دا پێش کەوت ٥ قسەی کرد.

**زَمَّ بأنفه**: لوتبەرزی نواند تەکەببوری کرد.

زَمَّ البعيرُ بأنفه أو برأسِهِ: حوشترەكە سەری هەڵبڕی یان لوتی هەڵبڕی چونكە ئازاری هەبوو.
زمَّ القِربَةُ زُموماً: كوندەكە پڕ بوو.
زمَّ الزنبورُ أو العصفورُ زميماً: زەردەواڵەكە یان چۆلەكەكە دەنگی لێ هات.
زم الشّيء زمّاً: شتەكەی شەتەك دا.
زَمَّ البعيرَ: هەوسارو لغاوی بۆ حوشترەكە كرد.
زَمَّ القومَ: پێش خەڵكەكە كەوت وەكوو ئەوە رابەریان بێ.
زَمَّ الشّيءَ: شتەكەی پڕكرد تا لەسەریەوە رێژەی كرد.
زَامَّ فلاناً: دژایەتی فلانكەسی كرد.
زَمَّمَهُ: بەمانا (زَمَّهُ)دێ.
زَمَّمَ الجملَ: هەوساری حوشترەكەی توند كرد.
الإزْميم: مانگی یەك شەوە كە كەوانە دەبێتەوە وەكوو داسی لێ دێ.
الزِّمام: رێشمەو هەوسار ◦ (هو زِمامُ قومه): ئەمو سەرۆكو رابەری گەلەكەیەتی ◦ (القى لي يده زِمامُ أمره): ئیشو كارەكانی بەئەو سپارد.
الزَّمَمُ: دەگوترێ: (أمْرُهم زَمَمٌ): مەبەستێك بوو لە ئەندازەی خۆی تێنەپەڕی ◦ (داري من دراه زَمَمٌ): خانوەكەم نزیكی خانوەكەیەتی ◦ (داري زَمَمَ داره): خانوەكەم بەرامبەر خانوەكەیەتی.
زَمِنَ زَمَناً وزُمْنَةً: نەخۆشییەكی درێژخایەنی گرت ◦ یان بەهۆی پیرییەوە لاواز بوو.
أزْمَنَ بالمكان: لەوشوێنە چەند زەمانێك مایەوە.
أزمَنَ الشّيْءُ: رۆژگاری درێژ بەسەر شتەكە دا رۆیشت، دەگوترێ: (مرضٌ مُزمِنٌ وعلة مزمِنةٌ).
أزْمَنَ عنه عَطاؤُهُ: بەخششی درەنگ پێدا وەغراندی.
أزمن الله فلاناً وغيه: خودا فلانكەسی توشی نەخۆشی گۆجیو ئیفلیجی كردوە.
زامَنَهُ مزامَنَةً وزِماناً: مامەڵەی بەكات لەگەڵ دا كرد.
الزَّمانُ: كات كەم بێ یا زۆر ◦ تەمەنی دونیا هەمووی ◦ وەرز ◦ دەگوترێ: (السنة أربعة أزمنة): ساڵ چوار وەرزە ◦ (ك: أزْمَنَةٌ وأزْمُنٌ).
الزَّمَانة: نەخۆشییەكی درێژ خایەن.
الزَّمَنُ: بەمانا (الزّمان)دێ، دەگوترێ: (زَمَنٌ زامِنٌ): رۆژگارێكی زۆر ئەستەمو ناخۆشە.
الزَّمِنُ: دەگوترێ: (زَمِن الرَّغْبَةِ): كەم ئارەزۆو حەز لاوازە ◦ (ك: زَمْنى).

**الزِّمِّيْنَ**: بەمانا (الزِّمِنُ)دێ.

**الـزُّمَيْنُ**: دوای مـاوەی زۆر، دەگـوترێ: (لقيتُهُ ذات الزُّمَيْنِ).

**اَلْمُتَزَامِنُ**: هاوكاتو هاوزەمان.

**زَمِهَ الحَرُّ زَمَهاً**: گەرما تاوی ستاند.

**زَمِـهَ الرَّجُـلُ بـالحرِ**: پیاوەكـه گـەرمای لـێ بەهێز بوو.

**زَمِهـت الـشمسُ**: خـۆر تـینو گـەرمی بەهێز بوو.

**زَمْهَـرَت عينـاه**: دووچـاوی لـێ سـور هەڵگەڕان بەهۆی ڕق هەڵسان.

**ازْمَهَرَّ اليومُ**: ڕۆژەكه سەرماكەی توند بوو.

**ازْمَهَرَّ الوجه**: دەمو چاوەكه گرژو تـەڵخ بوون.

**ازْمَهَرَّ فلان**: فلانكەس زۆر رقی هەڵسا، دەشكوترێ: (ازْمَهَرَّ عليـه): رقـی لـێ هەڵسا.

**ازْمَهَــرَّت عينـــاه**: چــاوی لــێ ســور هەڵگەڕان.

**اِزْمَهَـــرَّ الكواكـــبُ**: ئەســـتێرەكان درەوشانەوە یان روناكییان زیاد بوو.

**اِزْمَهَرَّت أسـنانهُ عنـد الـضّحك**: لـەكاتی پێكەنین دا ددانی بریقەیان هات.

**الزَّمْهَرِيرُ**: سەرمای بەشیدەت، جەنگەی سەرما.

**الزُّمـاوَرْدُ**: خواردەمەنییەكـه لەهێلكەو گۆشت دروست دەكرێ، لوقمـه قـازی ○ لوقمەی خەلیفە.

**زَنَـأَ زُنـوءً**: تەنگـه بـەربوو ○ (زَنَـأَ بولُـهُ): میزی گیرا.

**زَنَأَ الشَّيْئُ**: شتەكه بەزەوییەوە نووسا.

**زَنَـــأَ الظِّـــلُّ**: ســێبەرەكه هەڵكـشایەوە، هەندێـــكی لەهەندێـــكی نزیـــك بوونەوە.

**زَنَأَ فيه**: پێیدا سەركەوت.

**زَنَـأَ بَولَـهُ**: بـۆ میـز گیرانەكـەی حوقنـەی بۆكرد.

**أزْنَأَ**: بەمانا (زَنَأَ)دێ.

**زَنَّأَ عليه**: تەنگی پێ هەڵچنی.

**الزَّنَـــاءُ**: تـــەنگی، تەنگەبـــەر ○ خـــڕو خـــەپانو كوڵەبنـــه ○ ئەوكەســـەی حوقنه بۆ میزی خۆی دەكا.

**الزِّنـــيءُ**: تـــەنگ ○ كونـــدەی بـــچكۆلە، جامی بچوكی ناو خواردنەوە.

**زَنِبَ زَنَباً**: بەكورته بالایی قەڵەو بوو، بـوو بـه خەبەتۆڵە ○ (هـو أزنـب وهـي زنباءُ) ○ (ك: زُلَبّ).

**الزُّنـابى**: بـەمانا (الزُّبـانى) دێ واتـە: دوشاخی دوپشك.

**الزُّنابَةُ**: بەمانا (الزُّنابى)دێ.

**الزُّنبـــار**: حەشـــەرەیەكه پێـــوەدانی بەئازارە لـەپێری (الزنبـور)یـه واتـە: ژەنگـــه ســـوورە ○ (ك: زنـــابیر).

**الزُّبُرُ**: لاوی تازه رسكاوی قالب سوك ٥ (ك: زنابر).

**الزِّنْبَرِيُّ مـن الرجـال**: پیاوی قـورس‌و قـونگ گـران ٥ كەشـتی گـەورەو زەبەللاح.

**الزِّنْبَرِيَـةُ**: جـۆرە كەشـتييەكی گـەورەو زەبەللاح.

**الزّنبـور**: بـەمانا (الزِّنبـار)دێ ٥ (ك: زنابير).

**الزُّنبوريـة**: مەسـەلەيەكی قەواعيـدی نەحوييـە كيسائی‌و سيبويە تێيـدا كەوتنە كێشەوە، ئاكامەكەی بەسـەر سيبويەيی دا شكايەوە.

**الْمَزْبَرَة**: زەوييەك ژەنگە سورەی زۆربن ٥ (ك: مَزَابِر).

**الزُّنْبُرُكُ**: زەنبەلەكی سەعات.

**الزّنْبَـقُ**: روەكێـكە لـەپێری زەنبەقيـە گولێـكی بۆنخۆشـی هەيـە ٥ رۆنـی ياسەمين.

**الزُّنْبَلك**: لوغەتێكە لە (الزُّنْبُرك).

**تَزَنْتَرَ**: لارو لەنجەی كرد.

**الزَّنْتَرَةُ**: تەنگانەو ناخۆشی.

**زَنِجَـتِ الإبـلُ زَنَجـاً**: حوشـترەكە زۆری تينوو بوو.

**زَنَجَ الرَّجُلُ**: پياوەكە لەتينوانا ريخۆڵەی وێـك هاتنەوەو وشك بوونەوە ٥ ناتوانێ زۆر بخواو بخواتەوە ٥ (هو زنيج).

**زَانَجَـهُ مزانجـةً وزناجـاً**: بەچـاكە يـان بەخراپە پاساوی دايەوە.

**تَزَنَّجَ عليه**: دەستدرێژی كردەسەر لـێ دا لـێ تورە بوو.

**الـزَّنْجُ**: چينێـك ئـادەميزادن لـەولاتی سودان پێستيان رەشە، قژيان تێـك باهەڵـدراوو گـشتە لێـو ئەسـتوورو كەپويان مەيلەو پانـە، لەمـديو ئـەو ديـوی هێڵـی اسـتواء نيـشتەجێن هەرێمەكـەيان لـەولاتی مەغريبـەوە دەسـت پێـدەكات تادەگاتـە ولاتـی حەبەشـە، هەندێكيـشيان لەسـەر روباری نيل نيشتەجێ بـوون، ئێستا وشـەی (الـزنج) بەهێنـدی هـۆزو بنەماڵەی ئـەفريقيش دەگوترێ جا لەهەر جێگايەك نيشتەجێ بووبن.

**الزَّنجبيـــلُ**: روەكێـــكە لـــەپێری (الزنجبارية)يە رەگی ئەستوری هەن‌و بەزەوی دا دەڕواتە خوار، تامی تيژە ٥ هەروا ناوە بۆ شەراب.

**زَنجبيـل الـشام**: روەكێـكە لـەپێری (المركبـة)يـە رەگـەكانی ئەسـتورن لـەبواری دەرمانـسازی دا بەكاردەهێنـدرێت.

**زنجبيـل الكـلاب**: گيايەكە سـەگ كوژە (سـەگ بيخـوا پێـی دەتۆپـێ)، لاسكەكەی سورە.

زَنْجَـــرَ: نینـــۆكی قامكـــە گـــەورەی بەنیونۆكی قامكی شایەدومان كێشا ٥ چەقەنەی لێدا.

الزَّنجارُ: ژەنگی مس.

الزَّنْجَرُ: ئەو سپیاتیەی بەسەر نینۆكی منداڵی ساواوە هەیە.

الزَّنْجِيرِ: بەمانا (الزَّنجَر)دێ ٥ نینۆك كەر ٥ چەقەنە لێدان ٥ زنجیر.

الزَّنْجُفْـــرُ: مەعدەنێـــكە پێـــكهاتووە لەتێـــكەڵاوبوونی جیـــوە بـــە گۆگردەوە، وردكراوەكەی زۆر سورە، نووسەرو وێنەگر بەكاری دەهێنن.

زَنِخَ الدُّهْنُ زَنَخاً: رۆنەكە بۆنی گۆڕا ٥ (هو زَنِخٌ).

زَنَّخَ: بەمانا (زَنِخَ)دێ.

زَنَدَ النـارَ زنـداً: ئاگرەكـەی هەڵـگیرساند، دەگـوترێ: (زَنَدَ نار الحـرب): شـەڕی هەڵـگیرساند، بەرپای كرد.

زند الإناءَ: قاپەكەی پڕكرد.

زَنِدَ زَنَداً: تینوی بوو ٥ (هو زَنِدٌ).

أزْنَدَ: زیادی كرد.

زَنَّـدَ: ئاگرەكـە بڵێـسەی سـەند ٥ درۆی كـــرد ٥ تـــەنگ بـــوو، تـــەنگی پـــێ هەڵچنی، دەگوترێ: (زَنَّدَ علی أهله): تەنگی بەماڵو منداڵەكەی هەڵچنیو لەقاقۆزەی پێچاون.

زَنَّـــدَ فلانـــاً: زیـــاد لەپێویـــست سـزای فلانكەسی دا.

تَزَنَّدَ: تەنگە بەر بوو.

تَزَنَّـدَ في الأمـر: لەكارەكەدا تـەنگی پـێ هەڵچنراو نارەحەت بوو، دەگـوترێ: (سألته مَسْألةً فَتَزَنَّدَ).

الزَّناد: ئامێرێكە چەرخەكە دەكوتـێو ئاگرەكـــە هەڵـــدەبێو باروتەكـــە دەتەقێنێـەوە.

الزَّنْـدُ: ئـەو پارچـەیەی لای سـەرو كـە دەكێـــشرێ بەپارچـــەی ژێـــرەوە ئاگرەكە هەڵدەبێ هـی سەرەوە پێـی دەگــوترێ: (الزَّنْـــدُ) هـــی ژێـــرەوە (الزَّنْـــدَة) واتـــە: بـــەردو ئەسـتێ، بەردەكـە پێـی دەگـوترێ: (الزَّنْـدَة) ئەستێكەش پێی دەگـوترێ: (ألزَّنْـدُ) ٥ (ك: زناد وأزناد) ٥ هـەروا نـاوە بـۆ كتێبێـكی ئاینی مەجوسی ٥ ددانـی مشارو شتی وا لەبەردو لەدار.

الزَّندان: باسكو قۆڵ.

الزَّنـدة: بـەردە ئەستێ ٥ قوتولكەیەكە مادەی ئاگراویو بـاروتی تێدایـە لای قونـداخی تۆپەكەوەیـە گـڕدەدرێو پاڵ بەگوللەكەوە دەنێ.

الزَّنْدِيـة: بازنەیەكـە لەدەسـتو قـۆڵ دەكرێ پێی دەگوترێ: بازی بەند.

ألمُزَنَّدُ: دەگـوترێ: (ثوب مُزَنَّدٌ): كراسی تەسك ٥ (رجل مُزَنَّدٌ): پیاوێكی رژدو چـروك، هەتیومـچەو بـاوك نادیـار ٥ پیاوی تورەو هەڵچوو.

**تَزَنْدَقَ**: بوو بەزندیق.

**اَلزَّنْدَقُ**: زۆر رژدو چروك.

**الزَّنْدَقَةُ**: بیرو باوەڕێکە پێی وایە کە بوونەوەر کۆنو ئەزەلییەو سەرەتای نییە، کاتێك نییە نەبووبێ ٥ وشەی (الزَّندقَـــة): بـــۆ زەردەشـــتییەکانو مانەوەییـــەکانو هـــەموو ئەوانـــەی بڕوایان بەهەبوونی دوو خودا هەیە بـەکار هـاتووە، دوایـی مانـای گـشتی تریـان بۆدانـاو هەرکەسێـك گومـانی لـەتاكو تـەنهایی خـودا هـەبێ یـان گومڕابـێ یـان هـیچ ئاینێـکی نـەبێ پێی گوتـراوە زندیق.

**الزِّنْـــدیق**: کەسێـــك بـــیرو بـــاوەڕی زەندەقـــەی هـــەبێ ٥ (ك: زنـــادیق، زنادقة).

**زَنَرَهُ زَنْراً**: زوناری لەپشتی ئەو بەست.

**زَنَرَ الإناءَ**: قاپەکەی پڕکرد.

**زَنَّـرَت عینـه**: چـاوی تەسـك بوونـەوە لەکاتی زۆر سەیرکردنو چاو تێبڕین دا، دەگوترێ: (عین مُزَنَّرة).

**زَنَّرَ الیه عینـه**: چـاوی تـێ بڕیو زۆری سەیرکرد.

**زَنَّرَ القَسُّ**: قەشەکە زونـاری لەپـشت کـابرا بەست.

**تَزَنَّرَ القَسُّ**: قەشـەکە زونـاری لەپـشتێن بەست.

**تَزَنَّرَ الشَّیئُ**: شتەکە وردو باریك بوو.

**الزُّنَّارُ**: زونار، پـشتێنێـکە مەسیحیەکان لەپشتی دەبەستن ٥ (ك: زنانیر).

**الزُّنزانَةُ**: ژوورێـکی بچوکە لەبەندیخانەدا هەنـدێ بەنـدکراوی بەتـەنها تێـدا بەند دەکرێ.

**زَنِفَ زَنَفاً**: رقی هەڵسا.

**تَزَنَّفَ**: بەمانا (زَنِفَ)دێ.

**الزُّنوف**: نێرەموك.

**زَنْفَلَ**: سەمای نەبەطی کرد ٥ واڕۆیـشت وەکوو ئەوە کۆڵێکی گرانی پێ بێ ٥ پەلەی کرد.

**زَنَقَ علی عیاله زَنْقاً**: چرۆکی لەگەڵ ماڵو منـداڵی خـۆی کـرد بـاشو تـیرو تەسـەل بـەخێوی نـەکردن جایـان لەبەر رژدی یان لەبەر هەژاریی.

**زَنَقَ الدّابة**: وڵاخەکەی هەوسار کرد.

**زَنَقَ الشَّیئَ**: شتەکەی خڕهەڵداو تەنگی پێ هەڵچنی.

**زَنَـــقَ الـــرأي**: راو بۆچـونەکەی پتـــەوو بەڵگەدار کرد ٥ (هو زنیق).

**أزْنَقَ علـی عیالـه**: بـاش مـاڵو خێزانـی بەخێو نەکرد.

**زَنَّقَ**: بەمانا (أزْنَقَهُ)دێ.

**الزِّنـــاقُ**: هـــەر حەبلێـــك لەپێـــست دروســـتکرابێ بـــەدەوری لمبـــۆزی وڵاخەکـــەدا هاتبێتـــەوەو ئـــەمجار بەرداربێتـــەوە بۆســـەری ٥ واتـــە هەوسـار، رێشمە ٥ جـۆرە خـشڵێکە

ومكوو مێخەكبەند ٥ (ك: زُلَقٌ أزْنقة).

**ألزَّنقُ**: شوێنی هەوسار ٥ لایەكی تیر، سەرمباریكەكەی.

**الزُّنقَةُ**: ڕێگای تەنگەبەری ناوگوند.

**الزِّنكُ**: زمنك، عونصورێكی فلزییە سپییە گەردیلە ژمارەكەی (٣٠)یە، كێشی گەردیلەكەی (٦٥,٣٨) لەپلەی (٤١٩م) دەتوێتەوە.

**زَنِمَ** زَنَماً: گوێی بڕاو بڕاوەكەی شۆڕبۆوە لێی نەبوەوە ٥ (هو زَنِمٌ وأزْنَمٌ).

**زَنَمَهُ**: بەمانا (زِنمَهُ) دێ، دەگوترێ: (بعير مزنّم): حوشتری گوێ بڕاوی وەها كەبڕاوەكەی لێ نەبوبێتەوە.

**الزَّنِيم**: زۆڵ، باوك نادیار خۆحسابكەر لەگەڵ نەتەوەیەكو لەوان نەبێ ٥ پیاوی خوێڕیو شەڕانیو چەقاوە سوو، بێوەفاو ناكەس بەچە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿عُتُلٍّ بَعْدَ ذَلِكَ زَنِيمٍ﴾.

**زَنَّ** عَصَبُهُ زَنّاً: ڕەگەكەی وشك بوو، جومزگەكانی شل بوونەوە.

**زَنَّ** فلاناً بخير أو شرّ: فلانكەسی پاڵ دا بۆ چاكە یان بەخراپكاری لەقەڵەم دا.

**زَنَّ** بَوْلَهُ: میزەكەی حوقنە كردو بەندی كرد.

**أزَنَّهُ**: بەمانا (زَنَّهُ).

**الزِّنُّ**: كەمو تەنگەبەر، دەگوترێ: (ماء زَنٌّ): ناوێكی كەم ٥ (بئرٌ زَنٌّ): بیرێكە نازاندرێ ئایا ئاوی تێدایە یان نا.

**الزَّنَّةُ**: تۆمەت ٥ (أبو زَنَّة): نازناوو كونییەی مەیمونە.

**الزَّنِّيُّ**: ئەو كەسەی میزی خۆی حەوق بكا.

**زَنْهَرَ** اليه بعينه: چاوی دەربەڕاندو بەوردی سەیری كرد.

**زَنَى** زِنىً: زینای كرد، بەبێ مارەبڕینو عەقدی شەرعی چووە لای ئافرەت ٥ (هو زانٍ وهي زانية).

**أزنَاهُ**: هەڵی نا بۆ زیناكردن ٥ زیناكردنی پاڵ دا.

**زَنَّاه**: بەمانا (أزناه)دێ.

**الزَّنَّاءُ**: كەسێك زۆر زینابكا.

**الزِّنْيَةُ**: دەگوترێ: (هو ابن زِنْيَةٍ): واتە: لە زیناوە پەیدا بووە.

**زِهْ**: وشەیەكی فارسییە كاتێك دەگوترێ شتێكی جوانی بەلاوە بكرێ.

**زَهِدَ** فيه وعنه زُهْداً وزهادةً: ڕوی لێ وەرگێڕا لەبەر بەكەم زانین یان لەبەر ناخۆشەویستی یان لەبەر كەمیو كەم بایەخی، دەگوترێ:(زهِدَ في الدنيا):وازی لەشتە حەڵاڵەكانی هێنا لەترسی لێ پرسینەوە، وازی لەشتە حەرامەكانیشی هێنا لەترسی سزادان.

أَزْهَدَ الرجُلُ: پیاوەکە ماڵو سامانی کەم بوو.
زَهَّدَهُ: بەکەمی زانی، کەمی کرد ٥ (زَهَّدَه فيه وعنه): وای لێ کرد زاهیدو نەویست بێ ٥ وای لێ کرد رژدو چروك بێ.
تَزَاهَدُوهُ: بەهیچو پوچیان لەقەڵەم داو بەکەمیان زانی، لەحەدیثدا هاتووە: (كتب الى عمر: ان الناس قد اندفعوا في الخمر، وتزاهدوا الحدّ).
تَزَهَّدَ: بوو بەدونیا نەویست، خودا پەرستی کرد.
إزْدَهَدَ: بەکەمی زانی، بەکەمی ژمارد.
الزَّاهِدُ: خودا پەرست ٥ (ك: زُهَّدٌ وزهّادٌ).
الزّهادة في الشّيْء: پێچەوانەی حەز لێ بونو داخوازی شتە ٥ وەرگرتنی کەمترین پێداویستی، رازی بون بەکەم لەشتی حەلاڵو ڕەواو وازهێنان لەشتی زێدە لەبەرخاتری ڕەزامەندی خودا.
الزُّهْدُ: بەمانا (الزّهادة)دێ.
الزُّهْدُ: ئەندازەی کەم، دەگوترێ: (خُذْ زَهْدَ ما يكفيك): کەمترین پێداویستی خۆت وەربگرە.
الزَّهَدُ: زەکات ٥ لەم ڕوەوە کەمترینی ئەو ماڵەیە زەکاتی لێ دەردەکرێ.
الزُّهاد: کەسێك زۆر زوهدی هەبێ.

الزَّهِيدُ: کەم، دەگوترێ: (ثمن زهيد): بەهای کەم ٥ (زهيد الأكل): خواردنی کەم.
زَهَوَ الوجهُ والسراج والقمر: دەمو چاو، چرا، مانگ، ڕوناکی داو درەوشایەوە.
زَهَرَ الشّيْءُ: شتەکە ڕەنگی صافو رون بوو.
زَهَرَ الزَّنْدُ: ئاگری چەرخەکە روناکی داو بلێسەی سەند، دەگوترێ: (زهرت بك ناري): بەهۆی تۆوە بەهێز بووم، (زهرت بك زنادي): بەهۆی تۆوە کارەکەم ئەنجام درا.
زَهَرَ النباتُ أو الشجرُ: روەکەکە یان درەختەکە گوڵی کرد.
زَهَرَت الشمسُ اللونَ: خۆر ڕەنگی گۆڕی.
زَهَرَ زَهْراً وزهارةً وزهُورةً: جوان بوو، سپی بوو، ڕەنگی صاف بوو ٥ (هو أزهر وهي زهراء).
أزهَرَ النباتُ أو الشجرُ: روەکەکە یان درەختەکە گوڵی دەرکەوت.
أزهَرَ النارَ وغيرها: ئاگرەکەی هەڵگیرساند، دەگوترێ: (ازهَرْتَ زندي): پلەو پایەت بەرزکردمەوە، ئیشەکەمت جێ بەجێ کرد.
ازْدَهَرَ: بەمانا (زَهَرَ)دێ ٥ کەیفخۆش بوو، روخساری گەشایەوە ٥ شتەکەی

هەزم کردو لیّ حالّی بوو، بەئیشەکە ڕازی نەبوو ڕەخنەی گرت ٥ شتەکەی خستە دلّیەوە.

**إزهَرَّ النبات أو الشجرُ:** بەمانا (أزهَرَ)دیّ، گولّەکانی زۆر بوون.

**ازهارّ النبات أو الشجرُ:** ڕوەکەکە یان درەختەکە وردە وردە گولّی کردو گولّەکانی دەرکەوتن.

**الأزْهَر:** هەموو ڕەنگێکی سپی صافو ڕون ٥ مانگ ٥ ڕۆژی هەینی ٥ هەموو گیانلەبەرێك یان ڕوەکێك ڕەنگی بریقو باقی هەبیّ ٥ (ك: زُهْرٌ).

**الزاهِرُ:** ڕوخسار جوان لەڕوەك بیّ یان لەگیانداربیّ یان بیّ گیان بیّ ٥ ڕەنگی پرشنگدارو روناك، دەگوتریّ: (أحمر زاهر): سورێکی زۆر سور.

**الزاهِرية:** لارو لەنجە، دەگوتریّ: (هو يمش الزاهِرية): بە لارو لەنجە دەڕوا.

**الزَّهَرُ:** خونچەو گولّی ڕوەك یان هی درەخت ٥ تاکەکەی (زهرة) ٥ (ك: أزهار) ٥ (زهرة النرد): پەلّەی سەر نەردی تاولّەو شتی وا.

**ماء الزهر:** ئەو ئاوەی لەگولّی نارنج دەگیردیّ.

**الزُّهْرُ:** سیّ شەوی سەرەتای مانگ.

**الزَّهراء:** مێینەی (الأزهر) ٥ (ك: زُهْرٌ) ٥ هەروا لەقەبو نازناوی فاطیمەی کچی پێغەمبەرە.

**الزَّهراوان:** سورەتی (البقرة وآل عمران)ن لەقورئانی پیرۆز.

**الزُّهرة:** تاکی (الزَّهَر)ە ٥ (زهرة الدنيا): جوانیو خۆشی ژیانی جیهان.

**الزُّهُرَةُ:** سپی پرشنگدار ٥ ڕەنگی ڕونو جوان.

**الزُّهَرَة:** یەکێکە لەئەستێرە گەڕۆکەکانی کۆمەلّەی خۆریی، کەنۆ ئەستێرەی گەڕۆکن و دووەم ئەستێرەیە لەڕوی دوریی لە خۆرەوە، دەکەوێتە نێوان ئەستێرەی عوطاریدو زەوییەوە، لەدوای خۆرو مانگ لەهەموو قەبارەکانی ئاسمان پرشنگدارترە ٥ هەروا وشەی (الزُّهرة): ناوی خودای جوانی ئیغریقییەکانە کە پێی دەلّێن (أفروديت)، لای ڕۆمانەکانیش (ڤینۆس)ە.

**الزِّهْرَةُ:** جیّ بەجێکردنی حەزو ئارەزو، دەگوتریّ: (قضيت منه زهرتي): کاری خۆم لیّ ئەنجام دا.

**الزُّهرِيُّ:** نەخۆشییەکی کوشندەو چارنەکراوو گوازراوەیە توشی کۆئەندامی زاوو زیّ دەبیّ.

**الزُّهْرِية:** گۆزەو سوراحی لەسوالّەت دروستکراو، بۆ جوانی گولّیان تیّ دەکریّ (گولّدان).

الزَّهــار: گــوڵفرۆش ◦ بــۆ ئــافرەتی گوڵفرۆش دەگوترێ: (زَهّارة).

المِزْهَـرُ: ئــەو دارەی پێــی لەکەمانەکــە دەدرێ، یەکێـــــکە لـــەئامێرەکانی شاییو زەماوەنـد، ئەوکەسـەی ئاگر هەڵدەگیرسێنێو میـوان بانگ دەکا بۆ داوەت.

زَهْزَق: بەدەنگی بەرزو بەهێز پێکەنی، بەشێوە زاراوەیەك قسەی کرد کەس لـێی حاڵی نەبوو.

زَهْزَق الصَّبِيَّ: مندڵەکەی هەڵپەڕاند.

الزُّهْـزَاهُ: لارو لەنجەکـەر، بـۆ مێینــە: (زَهزاهة).

زَهَفَ زهوفاً: زەلیل بوو، درۆی کرد.

زَهَفَ للموت: لەمردن نزیك بووەوە ◦ (هو زاهِف وزهّاف).

زَهِفَ زَهَفاً: خێرا ڕۆیی، گورجو گۆڵ بوو.

زَهِفَ للشّيء: بەخێرایی چوو بـۆ شتەکەو گورجو گۆڵو چوستو چالاك بوو.

أزهَـفَ: درۆی کـرد ◦ فیتنــەیی کـرد ◦ خێرا بەرەو شەڕ چوو.

أزهَـــفَ بـــه: هەواڵێـــکی لـــەکابرا دا خەڵکەکە نازانن ڕاستە یان نا.

أزهَفَ بي: خیانـەتی لـێکردم لەکاتێـك دا من بتمانەم پێی بوو.

أزهَفَ به: پێی موعجەب بوو.

أزهفــت اليــه فلانــة: فــلان ئــافرەت فلانکەسی توشی سەرسام بوون کرد، وای لـێ کرد پێی موعجەب بێ.

أزهَفَ عليـه: پەلـەی کـرد لەکوشتنیو زوو گیان دەرچوونی.

أزهَـــفَ الـــشَّيْءَ: شـــتەکەی بـــرد ◦ فەوتاندی.

أزهَـفَ فلانــاً: فلانکەســی زەلیـل کـرد، لەمەیدان دا خستی.

أزهفـــت الطعنـــة فلانـــاً: برینەکـــە فلانکەسی گەیاندە لێواری مەرگ.

أزهف له حديثاً: قسەی درۆی بـۆ هێنـا، قسەی خراپی پاڵ دا.

أزهف فلاناً بالشرِّ: فلانکەسی هەڵنا بـۆ شەڕکردن.

انْزَهَــفَ: بــازی دا ◦ دەســتی گەیانــدێو لـێی دا.

تَزَهَّــفَ عنــه: مــەنعی کــردو ڕوی لـــێ وەرگێڕا.

اِزْدَهَفَ: بەمانا (زَهَفَ)دێ.

إزدهف لـه بالـسيف: بەشمـشێر زەبـری لـێ دا برینداری کرد.

ازدهَفَ في كلامه: لەقسەکانی دا دەنگی هـــەڵبڕی ◦ درۆی کـــرد زیـــادەی بەقسەکانەوە نا.

ازدهف عنه: ڕوی لـێ وەرگێڕاو مـەنعی کرد گەڕاندیەوە.

ازدهـف الـشَّيْءَ وبـه: شـتەکەی بـرد.

**ازدهف فلاناً بالقول**: قسەی فلانکەسی پوچ کردەوە.

**ازدهف له بالخبر**: لەهەواڵەکەی زیاد کرد.

**ازدهف اليه حديثاً**: قسەی ناشیرینی پاڵ دا ٥ یان درۆی بۆ کرد.

**ازدهف فلاناً**: فلانکەسی بەسوك زانیو سوکایەتی پێکرد ٥ پەلەی کرد، دەشگوترێ: (ما ازدهف شيئاً): هیچی لی وەرنەگرت.

**زَهَقَ زَهَقاً وزهوقاً**: پێش کەوتو چووە پێش، دەگوترێ: (زَهَقَت الفرسُ): ئەسپەکە پێش ئەسپەکانی تر کەوت.

**زَهَقَ الباطلُ**: بەتاڵو ناحەق پوچ بۆوەو فەوتا ٥ (هو زاهق وزَهوق).

**زهق السَّهمُ**: تیرەکە مەبەستی نەپێکاو سەری کرد.

**زَهَقَتْ نفسه**: گیانی دەرچوو.

**الزُهُوق**: دەرچونی شت لەشتێك بەنارەحەتی.

**زهق مخ العظم**: مۆخی ئێسقانی پڕبوو.

**أزهق في السير**: لەرۆیشتن دا پەلەی کرد.

**أزهَقَ الشَّيْءَ**: وای کرد شتەکە لەشتێکی تر بێنێتەدەر یان وابکا شتەکە بفەوتێو نەمێنێ وەکوو دەلێی (أزهق الله الباطلَ): خودا بەتاڵو ناهەقی لەناوبرد.

**أزْهَقَ السَّهْمُ من الهَدَف**: تیرەکە لەهەدەفەکە تێپەڕی کرد.

**زاهَقَهُ**: بەمانا (أزهَقَهُ)دێ، دەگوترێ: (زاهَقَ الحق الباطلَ).

**إنْزَهَقَ**: پێشکەوتو بردیەوە.

**الزَّاهِقُ**: ناوێك بەتەوژم بڕوا ٥ تێشکاوو دۆڕاو ٥ پێشکەوتو لەکێ بڕکێ دا ٥ وشك ٥ دەگوترێ: (بئرٌ زاهِقٌ): بیرەکە بنکی قوڵە ٥ (ك: زواهق).

**الزُّهْقُ**: زەوی تەختانو نزم.

**الزُّهوق**: دەگوترێ: (بئرٌ زهوق): بیرێك کەبنکی قوڵ بێ.

**المَزْهَقَةُ**: شوێنی فەوتانو لەناو چوونی بەتاڵ، شوێنی گیان دەرچوونی یان هۆکاری فەوتانی بەتاڵو گیان دەرچون، دەگوترێ: (جَمَلٌ مُزهِقَةٌ لأرواح المطي): حوشترێکە ڕۆح کێشەری ولاخە سوارییەکانە ٥ هەر هەوڵ دەدەنو نایگەنێ.

**زَهَكَهُ**: ترنجاندیە نێوان دوو بەردەوە.

**زَهَكَ الريحُ الأرضَ** (أو التراب عن الأرض): ڕەشەبایەکە زەوی ماڵی، یان گڵو خۆڵی لەڕوی زەوی دا ڕادا.

**زَهَلَ زَهْلاً**: دڵی ئارامی گرت ٥ (زهل عنه): لێی دورکەوتەوە.

**زَهِلَ زَهَلاً**: سپی‌و لوس بوو.

**الزُّهلُولُ**: شتی لوس جا هەرچییەك بێ ٥ مار كە ملی توكی لـی هاتبێ (یالّی هەبێ) ٥ (ك: زهالیل).

**زَهَـمَ العظـمُ زَهْمـاً**: ئێسقانەكە مـۆخی تێكەوت.

**زَهَمَ فلاناً**: زۆری قسە لەسـەر فلان كـرد ٥ لـێی تورە بوو.

**زَهِمَتْ يَـدُهُ زَهَمـاً**: دەستـی چـەور بـوو رۆناوی بەدەستیەوە بوو، قەلّەو بوو گۆشت‌و بەزی سەرپەك نا.

**أزهَمَ العظْمُ**: بەمانا (زَهِمَ)دێ.

**أزْهَـمَ الـشَّيْءَ**: لەشتـەكە نزیـك بـوومـوە بەلام نەیگەیشتێ، دەگوترێ: (أزهَـمَ الأربعـين أو الخمـسين): نزیـك چـل سـالّی بـوومـوە بـەلام نـەبوو بەچـلی تەواو نزیك پەنجا بۆتـەومو پـەنجای تەواو نەكردوە.

**زاهَـمَـهُ**: لـێی نزیـك بـوومـوە (زاهـم في الـسير): لـە رۆیـشتن دا لـێی نزیـك بـوومـوە، یـان دەگـوترێ: (زاهــم في البيـع): لەمامەلّەكـە دا لـێی نزیـك بۆوە، دیقە دیقەی دا ٥ دژایەتی كرد ٥ لـێی جیابۆوە.

**الزُّهْمُ**: بای بۆگەن ٥ پیوی ئاژەلّی كێوی بۆ ئەوەی بۆگەنی لـێ بـێ بۆنێـكی خۆشـی ناسـراو بــە (الزُّبــاد)ە ٥ ئاژەلّێـــكی كێـــوی هەیــــە پێـــی دەگوترێ: (سِنوَر الزّباد) لەژێر كلكی لـەنێوان هـەردوو كـونی پیسایی دا كیـسێكی هەیـە مادەیـەكی تێدایـە میسك ئاسا بۆنی خۆشی هەیە.

**الـزَّهَمُ**: بۆگـەنی لاكـە تۆپیـو ٥ پێـوی ئـاژەلّی كێـوی ٥ بـاقی مانـدەی پیـو لەلاشەی ئاژەلّ دا.

**الزُّهْمَةُ**: بای بۆگەن.

**الزُّهُومَةُ**: بەمانا (الزُّهْمَةُ) دێ.

**زهـا زَهْـواً وزُهُـواً**: خـۆی بـەزلزانی‌و تەكەببورو شانازی كرد.

**زها الـسراجُ وغيره**: چراكە رونـاكی دا ٥ (زهـا اللــون): رەنگەكـە صـافو درەوشاوە بوو ٥ (زها البُسْرُ): هێشوە خورماكە ئالّ‌و بۆلّی تێكەوت دەنكی سورو زەردی تێكەوتن.

**زهـا الـزَّرعُ**: كـشتوكالّەكە گەشـەی كـردو راسا.

**زها الغلام**: كورەكە رەسیدە بـوو گەیـشتە تەمەنی گەنجی.

**زها النباتُ**: رووەكەكە درێژ بوو پێگەیی.

**زها الشَّيْءُ فلاناً زهـواً**: شتـەكە فلانكەسـی سوك كرد.

**زهـــا الكِبْــرُ فلانـــاً**: خـۆ بـەزلزانی وای لەفلانكەس كـرد بـەخۆی موعجەب بێ.

**زها** السرجَ وغيره: چراكەی هەڵگیرساند، شۆقی دایە چراكە.

**زهـا** الطَّـلُ الزَّهْـرَ: بارانەكـە ڕەونـەقی دا بەگوڵەكەو گەشاندیەوە.

**زهـا** الـسَّرَابُ الـشَّيْءَ زهـواً: تراویلكەكـە شتەكەی بەرزكردەوە.

**زها** الريحُ النبـاتَ وَالـشَّجَرَ: بایەكـە ڕوەك یان درەختەكەی دوای بارانو شەونم ڕاوەشاندو هەژاندی.

**زها** السفينة: كەشتییەكەی لێخوڕی.

**زهـــا** المُــرْوِحُ المِرْوَحـــةَ: موشـــەدەمكەر موشەدەمەكەی خستەكار.

**زها** الشَّيْءَ: شتەكەی ئەندازە گرت.

**زُهِـــيَ** الـشَّيْءُ لِعَيْنِـكَ: ڕوخـساری شـتەكە جوان بوو.

**زُهِيَ** على الناس: شـانازی بەسـەر خەڵـكدا كرد.

**أزْهَى**: بەمانا (زُهِيَ)دێ.

**أزهى البُسْرَ**: بەمانا (زَهَا)دێ.

**أزهى النباتُ**: بەمانا (زَهَا)دێ.

**زهـيٌّ البُـسْرُ**: هێـشوە خورماكـە ئـاڵو بۆڵی تێكەوت.

**زَهِيٌّ المِرْوَحَة**: پانكەكەی خستە ئیش.

**اِزْدَهَـــى**: كەمێـــك هەســـتی كـــرد بەخۆنازین، كەم شانازی كرد.

**الزُّهَـاءُ**: (زُهَاءُ الـشَّيْءِ): ئەنـدازەی شـت یـــان نزیـــك لـــە ئەنـــدازەی شـــت، دەگوترێ: (هو زُهـاءَ ألـف): ئەوانـە بەئەنـدازەی هەزاركەسـن یـان نزیـك بەو ژمارەیەن.

**الزَّهْوُ**: تەكەببور ◦ ڕوخساری جوان ◦ ڕومكی تەڕو تازە ◦ هێشوە خورمای ئاڵو بۆڵ تێكەوتوو.

**زابَ** الماءُ زوباً وزوباناً: ئاوەكە ڕەوان بوو.

**زاب** فلان: فلان خۆی دزییەوەو هەڵات.

**المیـــزابُ**: پلوســـك ◦ ڕێـــڕەوی ئـــاوی سەربانی ماڵ.

**زَوْبَرَ الثَّوْبُ** ونحوه: قوماشەكە پرزو پاڵو شتی وای لەسەر دیاریی دا.

**الزِّوْبَرُ**: ئەو پرزوپاڵەی لەسەر قوماشی تازە دەردەكەوێ.

**زاجَ** بیـــــنهم زَوْجـــــاً: دەنەدەنـــەی دانو هەڵینان.

**أزوجَ بينهمــــا**: بەرامبـــەری خـــستە نێوانیانو پێكی گرتن.

**زاوجَهُ** مزاوجة وزواجاً: تێكەڵاوی كردن.

**زاوج بینهمـا**: پێـكی گـرتنو بـەراوردی كردن.

**زَوَّجَ الأشـیاءَ تزويجـاً وزواجـاً**: شـتەكانی لێـك نزیك كردنەوەو جوتی كردن.

**زَوَّجَ فلاناً امـرأةً**: وای لەفلانكەس كـرد ئافرەتەكە ماربكا.

**اِزْدَوَجَـا**: لێـك نزیـك بوونـەوە، بونـە هاوسەری یەكتری.

**ازدوج القوم**: هەندێ پیاوی گەلەکە هەندێ ئافرەتی گەلی خۆیان مارەکرد.

**ازدَوَجَ الكلامُ**: قسەکان هەندێکیان لەهەندێکیان دەچوون لەبواری سەجعو کێش دا.

**ازدوج الشَّيْءُ**: شتەکە بوو بەدوو.

**تزاوجا**: یەکتریان مارەکرد ژنو پیاوەکە بوون بەهاوسەری یەکتر.

**تزاوجَ القومُ**: خەڵکەکە هاوسەرگیریان کرد.

**تَزَوَّجَ الكلامُ**: قسەکان لەبواری سەجعو کێش دا لێك چوون.

**تَزَوَّجَ امرأة وبها**: ئافرەتەکەی مارەکرد کردی بەهاوسەری خۆی.

**الزّاجُ**: کبریت.

**الزُّواجُ**: هاوسەرگیریی‌و جوتبوونی مێردو ژنە ٥ یان جوتبوونی نێرو مێ.

**الزَّوجُ**: هاوسەر (مێرد بێ یان ژن بێ) ٥ بۆ هەردوکیان بەکاردێ ٥ شتو پێچەوانەی شت وەکوو (تەڕو وشك، نێرو مێ، شەوو ڕۆژ، تاڵو شیرین، ٥..هتد) ئەمانە بەشێوەی موثەننا وشەی (زوج) یان بۆ بەکاردێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿قُلْنَا احْمِلْ فِيهَا مِن كُلّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ﴾ ٥ هەروا وشەی (زَوْج) بەمانا پێڕو تاقمو جۆردێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾.

**الزَّوْجَةُ**: ژنی پیاو (ئافرەتی مێردار).

**الزَوجِيّة**: بەمانا (الزّواج)دێ، دەگوترێ: (بينهما حق الزّوجية): لەنێوانیان دا مافی هاوسەرییەتی هەیە.

**المُزَاوَجَة**: قاعیدەیەکی عیلمی بەدیعە.

**المِزْواجُ**: پیاوێك زۆر ژن بهێنێ یان ئافرەتێك زۆری شو کردبێ ٥ (ك: مزاويج).

**المُزْدَوَجُ**: شتێك دولایەنی هەبێ، دوجۆری تێدابێ ٥ (مُزْدَوَجُ الثمر): لەزانستی ئەحیادا ڕوەکێکە دوو جۆر میوەی صیفات جیاجیا بگرێ یان لەدوو وەرزدا میوەی هەبێ ٥ (مزدوج اللون): ڕوەکێکە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ بگرێ.

**زاح** عن المكان زوحاً وزواحاً: لەوشوێنە لاچوو نەما ٥ دوورکەوتەوە.

**زاح الشَّيْءَ زَوْحاً**: شتەکەی دوور خستەوە.

**زاح الإبلَ وغيرها**: حوشترەکانی لێك بڵاو کردن.

**أزاحَهُ**: دووری خستەوە.

**زادَ** زوداً: تێشوی ئامادەکرد.

**أزادَهُ**: تێشوی پێ دا.

**زَوَّدَهُ**: تێشوی پێدا، دەشگوترێ: (زودته كتاباً الى فلان): بەنوسراوێك بۆلای فلانکەس پشتگیریم لێ کرد.

**تَـزَوَّدَ**: تێـشوی هەڵـگرت، دەشـگوترێ: (تـزوَدَ مـن الأمـير كتابـاً الى عاملـه): لەپاشاوە نووسراوێـكی وەرگـرت بـۆ كاربەدەستەكە تايارمەتی بداو ئیشی بڕوا.

**الزَّاد**: خواردنو بژێوێـكە بـۆ سـەفەرو كـاروان دەبـرێ ٥ ئـەو كـردەو گوفتارانەيـە ئـادەميزاد لـەژيانی دا دەيانكـا ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ الـزَّادِ التَّقْـوَى﴾ ٥ (ك: أزواد وأزودة).

**المِـزْوَدُ**: هەمبانـە، تورەكەيەكـە تێـشوی تێ دەكرێ ٥ (ك: مَزاوِدَ).

**زارَهُ زَوْراً وزيـارةً ومـزاراً**: ديـدەنی كـرد لەماڵەوە چوو بـۆلای بـۆ ڕابواردنو گفـتو گـۆ يـان بـۆ دابينكردنـی پێداويستی ٥ (هـو زائـر) ٥ (ك: زُوّار وَزُوَّر) ٥ (هي زائرة) ٥ (ك: زوائر).

**زَوِرَ زَوَراً**: سـنگی خواربـوو، لايـەكی لەلايـەكی بـەرزتر بـوو ٥ (هـو أزْوَرُ وهي زَوْرَاءُ).

**أزارَهُ الشَّيْئَ**: هەڵينا بۆ ديدەنی كردنـی شـتەكە، دەشـگوترێ: (أزَرْتُـهُ ثنـائي وقـصائدي): مـەدحو شـيعرەكانم ناڕاستەی ئەو كردن.

**زَوَّرَ الطـائِرُ**: باڵندەكـەی ئەومنـدەی خوارد جڵێدانەی پڕ بوو بەرز بـووە *هاوسا*.

**زَوَّرَ الشَّيْئَ**: شتەكەی چاك كردو ڕاستی كردەوە بەباشی كردی ٥ جوانی كرد، ڕازاندييەوە.

**زَوَّرَ الـشهادة ونحوهـا**: بڕيـاری دا شايەتييەكە يان فلان شت تـەزويرە، ناڕاستە.

**زَوَّرَ عليه**: قسەی ناڕاستی لەسەر كردن ٥ درۆی پاڵ دا.

**زَوَّرَ امـضائهُ أو توقيعـه**: لاسايی واژۆی ئەوی كرد.

**زَوَّرَ الزائـرَ**: پاساوی ديـدەنی كرنـەكەی بەباشـی دايـەوەو ڕێـزی لـی گـرتو پێشوازی باشی لێ كرد.

**زَوَّرَ الأسـيرَ ونحـوه**: حـەبلی تايبـەتی لەمەچـەكی ديلەكـە كـرد بۆئـەوەی شەتەكی بداو بڕستی لێ ببڕێ.

**تَـزاوَرَ النـاسُ**: خەڵـكەكە هەندێـكيان ديدەنی هەندێكيانی كرد.

**تَـزاوَرَ عنـه**: لـێی لا دا ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَتَـرَى الـشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَاوَرُ عَن كَهْفِهِمْ﴾.

**تَزَوَّرَ**: قسەی درۆی گوتن.

**تَزَوَّرَ الكلامَ**: قسەی هەڵبەست.

**إسْتَزاره**: داوای لـێ كـرد تـەزويری بـۆ بكا.

**إزْوَرَ عنه**: لای دا، ڕێبازی خواركرد.

**إزْوَرَّ عنـه**: لای داو ڕێبـازی خـوار كـرد.

إزْوارٌّ عنه: بەمانا (إزْوَرَّ)دێ.

الــزَارُ: ئاهەنگێــکی ســەمایە رێــك دەخــرێ بــۆ دەرکردنــی گیانــە پیسەکان کەبەبڕوای ئەوان مەسسی جەستەی هەندێ کەس دەکەن.

الــزَارَةُ: کۆمــەڵێ زۆری ئــادەمیزاد ٥ چلێدانەی باڵندە.

الزاوِرَةُ: حەبلێکە هەردوو دەستی دیلی بەسنگییەوە پــێ شــەتەك دەدرێ ٥ هەرشتێــك چاکــسازو رێــکخەری شتێکی تربێو پارێزەری بێ ٥ (ك: أزْوِرَة).

الــزُّوْرُ: چــاوگی (زارَهُ)یــە ٥ شــوێنی بەیەکگەیشتنی ئێسقانی سنگە، ئــەو ئێسقانەی لەسنگەوە بــەرز بۆتــەوە بــۆ شــان ٥ هــەروا وشــەی (ألــزّور): بەمانا هێزو توانایــە بــەمانا عــەقڵو ئــاوەزە، بــــەمانا عەزیمــــەتو ورەبەرزییە.

الزُّورُ: بەتاڵو پــوچ، شایەتی درۆ ٥ درۆ ٥ کۆڕی لەهوو گۆرانیو سەما.

الزُّورُ: سەیرکردن بەقولینچکی چاو.

الزّوراءُ: دوور، دەگــوترێ: (فلاة زوراء): ســـــــارایەکی دوور ٥ (أرض زوراءُ): زەوییــەکی دوور ٥ (وبئــرٌ زوراء): بیرێــکی قوڵــە بنکــی دیارنییــە ٥ هــەروا ناوێــکی شــاری بەغدایــە، یەکــــەم ڕۆژنامــــەش کەلەبەغــــدا دەرچووە ناوی (الزَّوْراء) بووە.

الزَّوْرَةُ: یەکجار دیدەنی، دوریی.

الــزِّوَرُ: بــەهێزو توانــا چ ئــادەمیزاد بــێ یــان گیانلەبــەری تــر ٥ ڕۆیــشتنی خێرا.

الزَّوّارُ: کەسێـك زۆر دیدەنی کەسێك یا شوێنێك بکا ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (الزَّوّارةُ).

الزَّيّارُ: بەمانا (ألزَّوّارُ) دێ.

الزِّيـرُ: کەسێــك زۆر بچێ بــۆ دیــدەنی ئــافرەتو حــەزی لــێ بــێ لەگــەڵیان دابنیشێو گفتو گۆیــان لەگــەڵ بکــا، دەگــوترێ: (فــلان زیــرُ نِـــساءٍ): فلانکــەس مێبــازە ٥ دابو نــەریت ٥ وەتــەری بــاریکی کــەمان ٥ کــەتان ٥ مەرکانــەی ئــاو (جــەرەی ئــاو) ٥ کوپــەی ئــاو ٥ (ك: أزوار، وأزیـــار، وزیرة).

المَزارُ: شوێنی زیبارەتکردن ٥ هەر گۆڕو ئارامگایــــەك خەڵــــکی لــــەڕوی پیرۆزییەوە زیارەتی بکەن.

تَزَوْرَقَ: بڕوانە مادەی (زَرَقَ).

الزُّوْرَقُ: بڕوانە مادەی (زَرَقَ).

زَوْزَكَ: بڕوانە ماددەی (زَزَكَ).

زَوْزَى زَوْزاةً: پــشتی راســت کــردەوەو پەلەی کرد لەبازدان.

**زَوْزى فلاناً**: فلآنكەسى بەهیچ و پوچی لەقەلّەم داو دەری كرد.

**زاعَ لحمُهُ زَوْعاً**: گۆشتەكەی لەدەمارەكانی جیابووەوە.

**زاعَ الشَّيْءَ**: شتەكەی پێش خست ٥ (زاع البعيرَ): حوشترەكەی راپەڕاندو دنەدنەی دا.

**زاعَ الثَّرِيدَ وشِبْهَهُ**: بەدەست تریتەكەی كێشكرد بۆ خۆی.

**زاع الشَّيْءَ**: شتەكەی دولاهێنایەوە ٥ مەنعی كردو گێڕایەوە.

**زاع لفلان زوعة من البطيخ**: قاشە كالّەكێكی بۆ فلآن بڕی.

**تَزَوَّعَ اللحمُ**: گۆشتەكە لەدەمارەكە بۆوە ٥ لەسەر ڕەگەكە لاچوو.

**الزَّاعَةُ**: یەكەم دەستەی پێشمەرگەو گیانبەختكەری بەرەی جەنگ.

**الزُّوْعَةُ**: قاشە كالّەك و شتی وا.

**الزُّوْعَةُ**: چوست و چالاك و خۆشڕۆ ٥ كۆمەلّێك ئادەمیزاد ٥ پارچە گۆشت ٥ دەسكێك گیا ٥ دەسكە گولّ و ڕێحانە.

**زَاغَ زَوْغاً وزَوَغاناً**: لەمەبەست لایدا.

**زَاغَ عن الطريق**: لەرێكە لای دا.

**زَاغَ في منطقه**: قسەی ناخۆشی كردن.

**زَاغَ الشَّيْءَ زَوْغاً**: شتەكەی خواركردەوە.

**زَاغَ الناقَةَ**: حوشترەكەی بەرێشمە ڕاكێشا.

**أزاغَهُ**: وای لێ كرد لابدا.

**الزَّاغُ**: جۆرە قەلەڕەشەیەكە پێی دەگوترێ: (الغراب الزرعِيّ) و(غراب الزيتون): چونكە زەیتون دەخوا، لە كۆتر بچوكترە ڕەشە، سەری خاكی و مەیلەو سپییە، گۆشتی لاك و شتی وا ناخوا، لەخۆرهەلآتی ئەوروپاو توركستان و ئێران دەژێی و هەندێكی ڕەودەكا بۆ ولآتی فەلەستین و میصر.

**زاف** الطائِرُ في الهواء زَوْفاً وزُءوفاً: بالندەكە بەهەوادا فڕی و هەلەقی لێ دان.

**زاف** الغلامُ: كوڕە گەنجەكە بازی داو خولایەوە.

**زاف** الماءُ: ئاوەكە بلّقی لەسەر دەركەوتن.

**زاف** الحمامة الذكرُ عند الحمامة الأنثى: كۆترە نێرەكە لای كۆترە مێیەكە بالّی خۆی فش كردن لەسەر زەوی خشاندنی.

**زاف** فلانٌ: فلآنكەس ڕۆیی بەلۆژە لۆژ هەموو جەستەی داهێزرابوو.

**تزاوف** الغلمان: منداڵەكان یاری (التزاوف)یان كرد بەم جۆرە یەكێكیان دێ دەست دەخاتە سەركەناری سەكۆكە، ئەمجار زۆر بەگوڕ بازێك بەرەو حەوا دەداو بەحەواوە خۆ هەلّەوگێڕ دەكاو دێتەوە شوێنی خۆی، بەمەش پڕاوەی ئەوە دەكەن خۆیان فێری

خۆ هەڵدانە سەرپشتی وڵاخ بکەن.

**الـــزُّوافُ**: دەگـوترێ: (مـــوت زؤاف): مردنێکی خێرا.

**الزُّوفى**: مادەیەکی لینجو لەزگە ئاسایە دەنووســێ بــەخوری مــەڕو مــوی بزنـــەوە، بەتایبـــەتی لـــەوڵاتی ئەرمینیەدا، بەزۆری بـۆ چارەســەری شـــێرپەنجە بەکاردەهێنـــدرێ ە ڕوەکێـکی تەمــەن درێـژە لـەبواری پزیـــشکی دا بەکاردەهێنـــدرێت، گەڵاکـەی بۆنێـکی خۆشـی هەیــەو تامی تیژەو دەخورێ.

**زَوَّقَــهُ**: بــەجیوە (زیئبــەق) زەرکــەفتی کردو جوانی کـرد، دەگـوترێ: (زَوَّقَ العـــروسَ): بوکەکــەی ڕازانــدەوە ە (زَوَّقَ کلامَهُ): قسەکانی ڕازاندنەوەو جوانی گوتن.

**زوّق المسجدَ**: مزگەوتەکـەی ڕازانـدەوە بەنەخشو نیگار.

**زَوِّقَ الکتابَ**: کتێبەکەی زەرکەفت کرد.

**التزویقُ**: جوانکردنو ڕازاندنەوە، کاری سەرەکی لـەم بـوارەدا ئەوەیـە جیـوە لەگــەڵ ئــاڵتون تێــکەڵاو بکــرێو ئەمجار شتەکەی پێ زەرکەفت بکرێ پاشان بخرێتە نـاو ئـاگرەوە جیوەکـە دەبێتــە هــەڵمو دوکــەڵو بەحــەوادا دەچـــێو ئاڵتونەکــە دەمێنێتـــەوە، بـــەڵام پاشـــان وشـــەی (تزویـــق) بەکارهێنراوە بۆ هــەموو شتێـك کـە نـــەخشو نیگـــاری تێـــدا بکـــرێو هەرکـەس خـەریکی نـەخشو نیگـار کـردن بـێ پێـی گـوتراوە (مُـزَوِّق)، هەرچەنـدە جیوەش بەکارنەهێنن.

**الزّاووق**: جیوە، زئبەق.

**الزُّواق**: جوانی ئافرەت، خشڵی ئافرەت.

**الزُّوَقَـــةُ**: ئەوانــەی هەڵاشــی خــانوو زەخرەفەو نەخشو نیگار دەکەن.

**المُزَوَّقُ**: دەگوترێ: (شعر مُـزَوَّق): قـژی پاكو خاوێنو بەشانە کراو.

**زَاكَ** زَوْكـاً وزَوَكانـاً: شـانی هەڵتەکانـدنو سمتــی بــادانو لەراندنیــەوە لــەکاتی ڕۆیـشتن دا قاچـی لێـك بڵاوکـردن ە لارو لەنجەی کردو خۆی ڕاوەشاند ە (هو زائك وزَوَّك).

**أزْوَكَ**: ڕۆیـشت وەکـوو ڕۆیـشتنی کورتـە باڵا.

**تزاوك**: شەرمی کرد.

**زَالَ** زوالاً وزولانـاً: گواسـتیەوە لەشـوێنی خۆیەوە چووە شوێنێـکی تر، بچوك بۆوە پوچایەوە، نەما.

**زالـت الـشمسُ**: خـۆر لـەنێوە ڕاسـتی ئاسمان لای دا.

**زال النهارُ**: ڕۆژ ڕابورد نزیکە شەو دابێ.

**زالَ الخیـــلُ برکبانهـــا**: ئەســـپەکان بەسوارەکانیانەوە بازیان دا.

**زال الـسَّرابُ بالـشخص**: تراویلکەکـە

شتەکەی بەرز کردەوەو هاتوچۆی پێ کرد، دەگوترێ: (أرَى النجومَ تـزول ولا تغيب): لەپێش چاوم ئەستێرەکان دەدرەوشێنەوەو جەو جوڵیانە کەچی ئاوانابن.

**زالَ زَوالَـهُ**: خودا لەناوی بەرێ، داوەشێ نەمێنێ (دوعا لێکردنە).

**أزالَهُ**: دووری خستەوە، دەگوترێ: (أزالَ الله زوالَــهُ): دوعا کردنە لـێی بەفەوتانو لەناوچون.

**زَاوَلَـهُ مُزاولَـةً وزِوالاً**: دەستی دایەوە کارەکە دەست بەکاربوو.

**زَوَّلَهُ**: بەمانا (أزالَهُ)دێ.

**إنْـزَالَ**: بەمانا (زَالَ)دێ. (إنـزالَ عنـه): لێی جیابۆوە.

**تَزَوَّلَ**: عاقڵ بوو ◦ ئازا بوو، چوستو چالاك بوو.

**اسْتَزَالَهُ**: چاوە ڕوانی فەوتانو لاچونی کرد.

**الزّائِلُ**: جەنگەی نیوەڕۆ ◦ (لیـل زائـل النجوم): شەوی درێژ.

**الزائلـة**: مێینەی (ألزّائـلَ) ◦ هەرچی گیانی لەبەر بێ ◦ هەرچی بجوڵێتەوە، دەگوترێ: (زالـت لـه زائلة): کەسێکی بینی، شەخصێکی هاتە بەرچاو ◦ (ك: زوائل).

**الزَّوائِـلُ**: نێچیر ◦ ئافرەت، دەگوترێ: (فلان يرمي الزوائل): فلانکەس چاك دەزانێ دڵی ئافرەت بۆلای خۆی کێش بکاو نێچیری خۆی بگرێ ◦ ئەستێرە، لەو ڕووەوە کەلەخۆر هەڵاتەوە بەرەو خۆر ئاوا دێ لە هەڵخولانو دەورانی خۆی دا.

**الـزُّوال**: جەنگەی نیوەڕۆ، ئەوکاتەی خۆر لەهێڵی ئیستیوا لادەدا.

**الـزُّوْلُ**: چوستو چالاك ◦ زیرەك ◦ شەخص ◦ ئازاو ئەبەردی وەها خەڵك قەلاچۆ بکا ◦ بازو هەڵۆ ◦ (ك: أزوال)، دەشگوترێ: (هـذا زَوْلٌ من الأزوال): ئەمە عەجایبێکە لە عەجایبە کان.

**الزُّوْلَـةُ**: مێینەی (ألـزُّولَ)، دەگوترێ: (شَتْوَة زَوْلَةٌ): زستانێکی عەجایبە لەساردو سەرمایی دا ◦ ئافرەتێك زۆر خۆنیشانی پیاو بدا.

**المِزْوَلَـةُ**: سەعاتی زەوالی کەکاتی پێ دیاری دەکرێ بەهۆی ئەو سێبەرەی کاتەکەی لەسەر دیاری دەکرێ ◦ (ك: مَزَاوِل).

**زَامَ زَوْماً**: مرد ◦ بەرقەوە تەماشای کرد ◦ دۆنە دۆنو مۆنە مۆنی بوو کەس نەیزانی دەڵێ چی.

**الزَّامُ**: چوارێەکی شت، دەگوترێ: (مضى زام من النهـار أو الليـل): چوارێەکی

رۆژ یان شەو رۆیشت ◦ (مضی زامان منه): نیوەی ڕۆیی.

الزّامة: پێرو تاقمو گروپ ◦ (ك: زامّ).

الزّويم: کۆبوەوە لەهەرشتێك بێ.

زِبنَ البُرُّ: گەنمەکە مرۆراویی بوو مرۆری تێکەڵ بوو.

الزّانُ: هەڵاوسانو قەڵەوی، درەختێکە گەورەو بەرزە چڵ مەتر بەرز دەبێتەوە، دارەکەی پتەوە زۆربەی کاڵای ناومالْ لەوداره دروست دەکرێ.

الزّانَةُ: شتێکە لەرمب کورترە ئامێری شەڕە، کاتی خۆی چەکی دەیلیمیەکان بووە.

الزُّوانُ: مرۆر، بڕوانە (الزُّءان).

الزّون: بتو صەنەم، هەرشتێك جگە لەخودا پەرستشی بۆ بکرێ، شوێنێك بتی تێدا کۆدەکرێنەوە تێیدا هەڵدە نرێن.

أزْوی: هاتو یەکێکی تریشی لەگەڵ دا بوو.

الزَّوْ: دوو هاوڕێو هاوشان، دەگوترێ: (جاءَ زوًّا): ئەو دووە بەیەکەوە هاتن ◦ هەروا دەگوترێ: (کان تَوًّا فصار زُوًّا): تەنها بوو بوو بەجوت ◦ ئەندازە روداوو کارەساتی مردن، دیاردەی گیانەلاو.

زَوَاهُ زیّاً: بردی، شتەکەی لەگەڵ خۆبرد، دەگوترێ: (زوی الدهرُ القومَ): رۆژگار ئەو نەتەوەیەی لەگەڵ خۆی ڕادا.

زَوَی المالَ: ماڵەکەی هەڵبژارد.

زَوَی السّرَّ: نهێنییەکەی شاردەوە.

زَوَی الشّيْءَ: شتەکەی کۆکردەوەو، وەری گرت.

زَوَی مابین عینیه: نێوچاوانی بەیەکدا داو گرژ بوو.

زَوَی الشّيْءَ عنه: شتەکەی لێ لاداو دووری خستەوە.

زَوِّی: کەوتە سوچی خانوەکەوە.

زَوِّی الشّيْءَ: شتەکەی پێچایەوە کۆی کردەوە وەری گرت.

زَوِّی الکلامَ في نفسه: لەدڵی خۆی دا قسەکەی گۆڕی.

زَوِّی الحرف: پیتەکەی بەدەنگی (زای) لەدەم هاتەدەر.

زَوِّی الزّايَ: نوسیەوە.

إنْزَوَی: کەوتە سوچی خانوەکە ◦ وێکهاتەوە، کۆبووەوە.

إنْزَوَی القومُ بعضهم الی بعض: خەڵکەکە لێك نزیك بوونەوە.

تَزَوَّی: بەمانا (إنْزَوَی)دێ.

الزّاویةُ من البِناءِ: سوچی خانوو، چونکە دوولادیوار یەك دەخاتەوە ◦ گۆنیا.

المِزْوَاةُ: ئامێرێکی وردە وەستای

بيناسازيى بەكارى دێنن بۆ ئەندازەگرتنى سوچو قولينچكى خانوو.

**تَزَيَّبَ لَحْمُهُ:** گۆشتى كەوتە سەريەك و قەڵەو بوو.

**الأزْيَبُ:** كورتە بالاّى گۆشتن و هەنگاو كورت ○ باى باشور ○ بايەك لەنێوان باى باشورو شەماڵ دايە، ڕەشەبا ○ ترس ○ دوژمنايەتى.

**زَاتَ** الطعامَ وغيره: زەيتى كردە ناو طەعامەكەوە.

**زَاتَ** الجِلْدَ وغيره: پێستەكەى بەزەيت هەنوو.

**زاتَ** فلاناً: زەيتى دەرخواردى فلاّنكەس دا.

**أزات فلانٌ:** فلان زەيتى لەلا زۆر بوو.

**زَيَّتَهُ:** بەمانا (زاته)دێ.

**زَيَّتَ فلاناً:** زەيتى بۆ فلاّن نارد.

**زَيَّتَ الآلةَ:** زەيت يان بەزو چەورى ترى كردە نێوان دوو قەبارەى لێك خشاو بۆئەوەى زەحتى لێك خشانەكە كەم بكاتەوە.

**استزات:** داواى زەيتى كرد.

**الزّيت:** ڕۆنى زەيتون ○ هەروا بەهەموو ڕۆنێك دەگوترێت زەيت، بەرەهايى و بەتايبەتى دەگوترێ: (زيت الخِرْوَع، والزيت الحار، والزّيتُ المعدني) ○ (ك: زيوت).

**الزّيّات:** زەيت فرۆش ○ زەيت گوش.

**الزّيتون:** درەختێكە بەردارە، بەرەكەى دواى سوێركردنى دەخورێ، زەيتيشى لێدەردەهێنرێ.

**الزّيجُ:** هەركتێبێك، جەدوەلى فەلەكى تێدابن و چۆنيەتى ڕۆيشتنى ئەستێرەكان ديارى بكاو بەهۆيەوە ساڵنامەو تەقويم ديارى بكرێن ○ تەنافى وەستاى بينا سازيى.

**زَاحَ** زَيْحاً وزيوحاً وزيحاناً: دوور كەوتەوە ڕۆيشت.

**أزاحَهُ:** لاى برد، دەگوترێ: (أَزَاحَ اللهُ عِلّتَهُ فزاحت): پەروەردگار نەخۆشييەكەى لابردو شيفاى دا.

**إنْزَاحَ:** لاچوو.

**زَادَ** زيداً وزيادةً: زيادبوو گەشەى كرد.

**زاد الشَّيْءَ:** شتەكەى والێ كرد زياد بێ.

**زادَ** فلاناً خيراً: خێرو بەرەكەتى دا بەفلاّن.

**زايَدَهُ:** بەر بەرەكانى كرد لەزياد كردن دا، زەم و زەمكاريى كرد.

**زَيَّدَ:** بەمانا (زادَ)دێ.

**تَزَايَدَ:** بەمانا (زادَ)دێ.

**زاد من قوله أو فعله:** زياد لەپێويست قسەى كرد يان زياد لەپێويست كارى كرد.

**تَزَايَدَ النّاسُ في السلعة وعليها:** خەڵكەكە لەنرخەكەيان زيادكردو زەميان بەسەر يەكترەوە كرد تا نرخەكەيان گەياندە ئەوپەڕى،

دەشگوترێ: (تَزَيَّدَ الجملُ في سيره): زیاد لــەتوانای حوشــترەکە هــەلینگی داو زەختی لێ کرد.

**إزْدادَ**: بەمانا (زَادَ)دێ، (إزداد شيئاً لـه): شتەکەی بۆ خۆی زیاد کرد.

**إزْدَادَ فلانــاً**: داوای زێـدەی لەفلانکەس کرد.

**الزَّائِدُ**: دەگوترێ: (أخذه بدرهم فزائـداً) بەدیرهەمێك کڕیو زیاتریش.

**الزَّائِدَةُ**: مێینەی (الزائد)ە ٥ هەروا نـاوە بـۆ ریخۆڵـە کوێرە ٥ (ك: زوائــد) ٥ (ذو الزوائــد): لەقــەبی شێرە، شتە زەوائیدەکانیــشی چـنگو نینــۆكو هەڵمەتو نەرمیەتی.

**زوائد الأسنان**: ئەو ددانەیە لەتەنیشت ددانی ترەوە دەڕوێ.

**الزيادة**: ئەوەی لەشتەکە زیـادە ٥ (زيادة الكبــد): زێدەکەیــەتی ٥ (حــروف الزيادة): پیتەکانی (سألتمونيها) یـان (أليوم تنساها)ن.

**الزَّيْدِيَّة**: تاقمێـکن لەشیعە پاڵ زەیـدی کوڕی عەلی دەدرێنو لەوڵاتی یەمەن رێبــازی ئــەوان پــەیڕەو دەکــرێ، بڕوایــان وایــە ئیمامــەت دەبــێ لەوەچــەو ئــەوەی عــەلی کــوڕی ئەبوطالبو فاطیمەی خێزانی بێ.

**الْمَـزَادُ**: مەزاتخانـە؛ شـوێنی فرۆشتنی کـاڵا لەهەراجخانــە بەشـێوەی زەمو زەمکاریی بۆئەوەی لەئاکام دا کاڵاکە لەسەریەکێــــك لەبەشــــدارانی مەزادەکەدا ڕاوەستێ ٥ (ثمن المزاد): ئــەو نرخەیــە کەلــە مەزادەکــەدا کاڵاکە لەسەری دەوەستێ.

**الْمَزَادَة**: هەمبانە، توێشودانی کاروانیو رێبوار.

**زار** الدَّابَّة زيراً: حەبلو هەوساری لەسەری ولاخەکە بەست.

**زَيَّــرَ الدابَّــةَ**: بەحــەبل ولاخەکــەی بەستەوە.

**الزِّيرُ**: بڕوانە مادەی (زَوَرَ).

**الزِّيَازِيَّة**: پەلەکردنو خێرایی.

**الزِّيزاءُ**: زەوی ساغو پتەو ٥ تەپۆڵـکە ٥ پەڕی باڵندە ٥ (ك: الزِّيازي).

**الزَّيْزَفون**: حوشتری خۆشڕەوی چوستو چالاك ٥ درەختێـکە خودی دارەکە سـپییە بەتــەڕی دەخـورێ، گوڵێـکی سپی هەیە بـەری نییـە، لەگوڵەکەی شـەراب دروسـت دەکـرێ ٥ لەپەنـدی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (کالزيزفون يزهــر ولايثمــر): وەکــوو درەختــی زەیزەفــۆن وایــە گــوڵ دەردەداو بەرناگرێ، بەکەسێك دەگوترێ وادە بداو پابەندی وادەکەی نەبێ.

**زَاطَ** زَيطاً وزياطـاً: هـاواری کـردو قیڕانـدی قیژاندی ٥ قیڕەو هەرای کرد.

**زاطَ** النـاسُ: خەڵـكەكە غەڵبـە غـەڵبيان كرد.

**الزِّيَاطُ**: جەرِەسی بچوك، فیتفیتۆكە.

**الزِّيطـة**: يـەكجار هـاواركردنو قـيرِه ٥ قيرِەو هەراو زاوەزاو.

**زَاغَ** عنه زَيْغاً وزيوغاً وزيغاناً: لای دا، مەيلی كـرد خواربـوو، دووركەوتـەوە، دەگوترێ: (زاغـت الـشمس): خـۆر بەلای ئاوابون دا رِۆيی.

**زاغ** عن الطريق: لەرِێگە لای دا.

**زاغَ** البـصرُ: چاو حەپەساو شتەكەی لـی تێـكەڵو پێـكەڵ بـوو ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿مَـا زَاغَ الْبَـصَرُ وَمَـا طَغَى﴾.

**أزَاغَـهُ**: وای لـی كـرد رِێـگەی لـی گـوم ببێو لەرِێبازی راست لابدا.

**زَيَّغَـهُ**: خـواری كـردەوە ٥ خوارييەكـەی راست كردەوە.

**الزَّيْغُ**: لادان لەحەقو راستی.

**زافـت** النقـود زَيْفـاً وزيوفـاً: دراوەكـە تەزويرو غەشی تێدابوو پارەكە پوچ بوو.

**زاف** في مشيته زيفانـاً: پەلـەی كـردو لای دا ئـەملاو ئـەولای كـرد ٥ خـۆی بـاداو لەنجەو لاری كرد.

**زاف** الحمامـة الـذكرُ عنـد الحمامـة الأنثـى: كـۆتره نێرەكـه لای كـۆتره مێيەكـه باڵی فش كردنو لەزەوی خشاندن.

**زافَ** البناءُ زيفاً: باڵەخانەكە بەرز بۆوە.

**زاف** الغـلامُ: كـورِه گەنجەكـه بـازی دا بـۆ سەر سوچی سەكۆكەو خۆی بادايەوە بۆ شوێنی پێشوی بۆئەوەی رام ببـێ بۆ سوارچاكی.

**زاف** النقـودَ وغَيْرَهـا: پارەكەی پوچ كـردو تـەزويری كـرد، وای لـێكرد نرخـی نەبێو پوچ بێ.

**زَيَّـفَ** النقـودَ: پارەكـەی تـەزوير كـرد، پارەی تەزويرو بێ بەهای خستە ناو بازارِەوە ٥ غەشو تەزويری پارەكەی دەرخـست ٥ دەيـشگوتری: (زَيَّفهـا عليه): شتەكەی بەسـەردا تێپەرِانـد، فۆپييەی لـێ كرد.

**زَيَّفَ** رَأيَهُ أو قوله: رِاو بۆچونەكەی پـوچ كردەوەو قسەكەی رِەتكردەوە پوچیو بەتاڵيەكـەی دەرخـست ٥ بـەهيچو پوچو بێ بايەخی لەقەڵەم دا.

**الزَّيْـفُ**: تـەزوير، پـوچ ٥ دەگـوترێ: (دِرهـم زيـف): درەمێـكی پوچـە سكەی ئەصڵی نييـە ٥ گويـسەبانەی خـانوو ٥ بـاركۆنو ديكـۆری باڵەخانـەی گـەورە ٥ (ك: زيـوف وأزياف).

**زَيَّقَ** القميصَ ونحوَهُ: يەخـەو ملەوانـەی بـۆ كراسەكە كرد، دەگوترێ: (عمِلَ للجيب زيقـاً): يەخـەی بـۆ گيرفانەكـە دروو.

**زَاكَ** فِي مشيته زَيْكاً وزيكاناً: لارو لەنجەی کردو خۆی بادا.

**زالَ** الشَّيْءَ زيلاً: شتەکەی دوور خستەوە، لای دا ٥ هەڵی هاواردن، دەگوترێ: (زِل ضَأنَكَ من معزك): مەڕەکانت لەبزنەکانت هەڵاوێره جیایان بکەوە.

**زالَ** يَزَالُ: ئەم دوو فیعلە دەبێ لەپێشیانەوە پیتی نەفی هەبێ ئەوکاتە فیعلی ناقیص دەبن، دەگوترێ: (مازال محمد مدرساً) و(لایزال محمد مدرساً).

**زَيِلَ** زيلاً: لینگی لێك بلاوکردنەوە، قاچی پان هاویشتن ٥ (هو أزيَلُ وهي زَيْلاءُ) ٥ (ك: زيل).

**زَايَلَهُ** مُزَايَلَةً وزيالاً: لێی جیابۆوە.

**زَيَّلَهُ**: بلاوی کردەوە.

**إنْزَالَ**: جیابۆوە.

**تَزايَلُوا**: لێك جیابوونەوە، (تزایل فلان من جلیسه): فلان خۆی لەهاوڕێو هاونیشینەکەی شاردەوە ٥ خۆی لێ داپۆشی بۆ ئەوەی نەی بینێ ٥ (امرأة متزايلة): ئافرەتێکە بەحەیاو شەرمە ڕوی خۆی دادەپۆشێ.

**تَزَيَّلُوا**: لێك جیابونەوە دەست بەرداری یەکتری بوون ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَوْ تَزَيَّلُوا لَعَذَّبْنَا الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾.

**المِزْيَلُ**: عاقڵمەندی زانا کە دەتوانێ سەرەداوی شتەکە لێك بکاتەوە ٥ (رجل مِخْلَط مِزْيَل): پیاوێکە شتەکان تێکەڵ دەکاو عاقڵانە لێکیان جیادەکاتەوەو بیری تیژە سەری لێ ناشێوێ.

**زام** له زَيْماً فاسكتَهُ: کارێکی پێ کرد یان بۆکرد بێدەنگی کرد.

**تَزَيَّمت الإبلُ والدوابُ**: حوشترەکان یان وڵاخەکان بلاو بوونەوە.

**تَزَيَّمَ اللحمُ**: گۆشتەکە توند بوو پاڵی لێك دا.

**الزِّيمَةُ**: جەڵەبە حوشتر کەلەدوو کەمتر نەبێو لەپێنج تێنەپەڕێ ٥ (ماشية زيم): ئاژەڵی بلاوە بوو (غارة زَيْمُ): هێرشی بەربلاو.

**زانَهُ** زَيْناً: جوانی کرد، ڕازاندیەوە.

**أزْيَنَ الشَّيْءَ**: شتەکەی جوانکرد.

**زَيَّنَهُ**: جوانی کرد.

**تَزَيَّنَ**: بەمانا (إزْدَانَ)دێ.

**إزَّيَّنَ**: بەمانا (إزدان)دێ.

**الزَّائِنُ**: خۆ جوانکردو، دەگوترێ: (إمرأة زائنٌ): ئافرەتێکە خۆی ڕازاندۆتەوە.

**الزِّيَانُ**: هەرشتێك خۆی پێ جوان بکرێ.

**الزَّيْنُ**: هەرشتێك شت جوان بکا ٥ (ك: أزيان)، دەگوترێ: (إمرأة زَيْنَةٌ).

**الزِّيْنَةُ:** بەمانا (الزّيان)دێ.

**يــوم الزِّينـــة:** رۆژی جــەژن ٥ جــەژنی نەورۆز.

**الزَّيْنون:** لەبواری کیمیادا عونـصورێـکی (خامل) لەهەوادا بەکەمی هەیـە بـۆ بۆری روناکی بەکاردەهێنـدرێ.

**زَيَّـاهُ تتزيِـةً:** ئامـادەی کـردو پۆشـاکی لەبەرکرد.

**تَزَيَّا بكـذا:** خـۆی حـازر کـردو پۆشاکی لەبەرکرد.

**الـــزِّيُّ:** شــێوەو روخـــسار ٥ پۆشـــاک، دەگـوترێ: (أقبـــل بـــزي العـــرب): بەپۆشـاکی عەرەبیـەوە هـات ٥ (ك: أزياء).



السِّينُ: پیتی دوانزەھەمی پیتەکانی هیجایە ٥ لەکەناری زمانو ددانی سەرەوەی پێشی دەم دێتە دەرەوە ٥ پیتی (سین) بە مەفتوحی دەچێتە سەر فیعلی موضاریعو تایبەتی دەکا بەزەمانی داهاتوو.

سَـأْ: دەنگێکە، گوێدرێژی پێ هۆش دەکرێ، یان پێی بانگ دەکرێ بۆئەوەی ئاو بخواتەوە یان بڕوا ٥ لەکوردی دا لەجیاتی ئەو وشەیە (هەچە) یان (هەتتە) بەکار دەهێندرێ.

سَأَبَهُ سَأْباً: خنکاندی ٥ دەستی لە قۆرتەمەنا (قورگی جەڕاند).

سَأَبَ السِّقاءَ: مەشکەکەی هەڵاخنی، پانی کرد.

سَئِبَ من الشراب سَأَباً: تێری خواردەوە لەشەرابەکە.

السَّأْبُ: کوندەی ئاو ٥ (ك: سُؤوبٌ).

السُّؤْبان: دەگوترێ: (هو سُؤْبان مال) بەجوانیو ڕێکو پێکی ماڵو سامانەکەی سەرو بەر کرد.

المِسْأَبُ: کوندەی ئاو ٥ (ك: مَسائب).

سَأَدَهُ سَأْداً: خنکاندی، قورتەمەی گرتو جەڕاندی.

سُـئِدَ: نەخۆشی (سوئادی) توش بوو، توشی شۆری بوو.

سَئِدَ الجرحُ سَأَداً: برینەکە هەڵتەقیەوە.

أَسْـأَدَ السَّيْرَ: ڕۆیینی مام ناوەندی ئەنجام دا ٥ بەشەو ڕۆیی.

السُّؤادُ: نەخۆشییەکە توشی کەسانێك دەبێ کەئاوی سوێر دەخۆنەوە.

السُّؤْدَةُ: باقی ماندەی گەنجی، ئاخرو ئۆخری گەنجی.

المِسْأَدُ: کوندە.

سَأَرَ من الطعام والشراب سَأْراً: هەندێکی لە طەعامو شەرابەکە هێشتەوە.

سَئِرَ سَأَراً: مایەوە (أسْأَرَ) بەمانا (سَأَرَ)دێ ٥ لە حەدیثدا هاتووە دەفەرموێ: (إذا شربتم فاسْئِروا): کەئاوتان خواردەوە کەمێکی لێ بهێڵنەوە.

أَسْأَرَ من حسابه: هەندێکی لەحیسابی خۆی هێشتەوەو سفری نەکرد.

تَسَأَّرَ الشرابَ: باقی ماندەی ئاوەکەی خواردەوە، بەرماوەکەی خواردەوە.

السَّائِدُ: باقی ماندە.

السُّؤْرُ: بەرماوە، باقی ماندە.

السُّؤْرَةُ: بەرماوە ٥ ئافرەتێك کە هەرەتی گەنجی بڕواو کەمێ تەڕو

تازەیی پێ مابێ، دەگوترێ: (إنّ فيها لَسُؤرَةُ).

اَلسُّؤرَةُ مـن المال: مـاڵی چاكو باش ٥ (ك: سُؤَرٌ).

سَأسَـا بالحمـار سَأسَـاةً: بەگوێدرێژەكـەی گـوت (سَأسَـا) بـۆ ئـەوەی ئاوەكـە بخواتـەوە ٥ يـان بـۆ ئـەوەی هەڵسڵەمێتەوە بڕوا یان ڕابوەستێ.

تَسَأسَأت الأمورُ: كارەكان گۆڕانكارییـان تێكەوت.

تَسَأسَأ فـلان بحقي: فلانكەس دانـی نـا بەمافی من دا پاش ئـەوەی ئینكاری دەكرد.

سَأنت يده سَأناً: دەورو بـەری ئینـۆكی دەسـتی هەڵـشتن، ئینـۆكی هەڵـشت هەڵشت بوون.

سَـئِفَتْ يَـدُهُ: بـەمانا (سَـأفَتْ) دێ، دەشگوترێ: (سَـئِفَتْ شَـفَتُهُ): لێـوی توێـكڵی هەڵدا.

سَئِفَ لیـف النخلـة: توێـكڵی دارخورماكـه شەقار شەقار بوو لێك بڵاو بووە.

سـؤُفَتْ ابلُـهُ سـأفةً: نەخۆشـیو قـڕان كەوتە نێو حوشترەكانەوە.

انْسَأفَ: بەمانا (سَأفَ)دێ.

السُّؤافُ: دەردێكه قڕان بەحوشتر دەكا.

الـسَّأفُ: مـوی كلـك ٥ مـووە ئەسـتورو درێژەكانی كلك.

سَأَلَهُ عـن كـذا سُؤالاً وتـسآلاً ومـسألة: پرسـیاری لـێ كـرد دەربـارەی فـلان شت ٥ سواڵی كردو دەستی لەكەسانی دیكه پان كردەوە.

سَأَلَ فلاناً الشَّيءَ: داوای شتی لـەفلان كـرد بیـداتێ، دەگـوترێ: (سَـألْتُ محمـداً دِرْهَمـاً): داوای درەمێـكم لـه موحەممەد كرد.

أسْأَلَهُ سؤله: ئیشەكەی جێ بەجێ كرد.

سَاءَلَهُ: بەمانا (سَألَهُ)دێ.

تساءَلوا: پرسیاریان لەیەك كرد.

السَّائِلُ: هەژارو سواڵكەر.

السَّآلُ: كەسێـك زۆر پرسیار بكا.

السُّؤالُ: سواڵكردن، داوای خێـر پێكـردن ٥ پرسیاری بەتاقیكردنـەوەی قوتـابی ٥ (ك: أسْئلة).

السُّولُ والسُّؤْلَةُ: ئەوشتەی دواكراوە یان داوای دەكەی.

السُّؤَلَةُ: كەسێـك زۆر پرسیار بكا.

السُّؤُولُ: بەمانا (السَّآلُ) دێ.

الْمَسْأَلَةُ: شتی داواكراو ٥ یان قەضییەو ڕوداوێـك بەڵـگەی لەسـەر بهێندرێتەوە.

الْمَـسْئولُ: بـەرپرس ٥ لێپرسـراوی دەوڵەت.

**اَلْمَسْئولِية**: بەرپرسیاریەتی لەگفتارو لەکردار.

**سَئِمَ الشَّيْءَ ومنه سَأْماً وسآمةً**: لەشتەکە وەڕز بوو.

**أَسْأَمَهُ**: وەڕزی کرد، جاڕزی کرد.

**السَّؤُوم**: کەسێك زۆر وەڕزبێ و وەڕزبوونی گەیشتبێتە ئەو پەڕی.

**سَأَى سَأْواً**: بازی دا، دوژمنایەتی کرد ٥ ئاشوبی خستە نێو جەماوەر.

**اَلسَّأْوُ**: زێدو نیشتمان ٥ وڕەو هیمەت، دەگوترێ: (فلان ذو سَأْوٍ): فلانکەس وڕە بەرزو خۆگرە ٥ مەبەستو ئامانج.

**سَبَأَ على يمين كاذبة سَبْأً وسِباءً ومَسْبَأً**: سوێندی خواردو هیچ گوێی بە گرنگی سوێند پێ خوراوەکە نەدا.

**سَبَأَ الخَمْرَ**: شەرابەکەی کڕی بۆئەوەی بیخواتەوە.

**إنسَبَأَ الجِلْدُ**: پێستەکە کەوڵ کرا.

**سَبَأ**: ناوی پیاوێکە گوایە خێڵەکانی یەمەن هەموویان دەچنەوە سەر ئەو ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە: (تفرقوا أيدي سبأ): بۆ نموونەی پەرتەوازەیی دەهێندرێتەوە، چونکە خەڵکی یان بڵێ هۆزەکانی (سَبَأ) کە وڵاتەکەیان ئاو داگیری کردو وێرانی کردو باغو باغاتیان لەناو چوو هەریەکەیان رویان کردە دەفەرو وڵاتێکو پەرتەوازە بوون.

**اَلسِّبَاءُ**: شەراب.

**اَلسُّبْأَةُ**: سەفەری دورو درێژ.

**اَلسَّبَئِيةُ**: پێڕەوکن لە شیعە توندڕەوەکان کە پاڵ عەبدوڵڵای کوڕی (سَبَأ) دەدرێن.

**اَلسَّبَّاءُ**: مەی فرۆش.

**اَلسَّبِيءُ**: (سبيء الحية): توێژی مار.

**اَلسَّبيئَةُ**: شەراب.

**اَلْمَسْبَأُ**: ڕێباز لەناو کێوو کەژدا.

**سَبَّهُ**: جنێوی پێ دا.

**سَبَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی بڕییەوە.

**سَبَّ الدَّابَّةَ**: ئاژەڵەکەی سەربڕی.

**سَابَّهُ مُسَابَّةً وسِبَاباً**: جنێوی پێ دا ٥ (جنێویان بەیەکتر دا).

**سَبَّبَهُ**: زۆری جنێو پێ دا.

**سَبَّبَ الأسْبابَ**: هۆکارەکانی هێنانەدی.

**سَبَّبَ للماء مَجْرَى**: ئاوەڕۆی بۆ ئاوەکە دروست کرد.

**سَبَّبَ الحكمَ ونحوه**: هۆکاری حوکمدانەکەی دیاری کردن.

**اِسْتَبُّوا**: خەڵکەکە جنێویان بەیەکتر دا.

**تَسَبَّوا**: شەڕە جنێویان کرد.

**تَسَابُّوا**: جنێویان بەیەکتر دانو دەنگیان لێك دابڕی.

تَسَبَّبَ اليه: بەواسیتەو هۆکاری جۆراو جۆرەوە پێی گەیی.

اسْتَسَبَّ له: وای لێ کرد جنێو ی پێ بدری، دەگوترێ: (استَسَبَّ لأبیه): جنێوی بەباوکی خەڵکی ترداو بەو هۆیەوە جنێو بەباوکی ئەویش درا ٥ ڕێگای خۆش کرد کەسانی دی جنێو بەباوکی بدەن.

الأُسْبُوبة: ئەو عەیبو لەککەیە جنێوی پێ دەدرێو دەکرێتە ئامرازی جنێو ٥ (ك: أسَابِیب).

السُّبُّ: جنێو فرۆش ٥ کەسێك زۆر جوێن بدا ٥ سەرپۆش ٥ مێزەر ٥ حەبل ٥ سنگو گوڵمێخ ٥ قوماشی تەنك ٥ (سِبُّ الشخص): جنێو پێدەر ٥ (ك: سُبُوب).

السَّبَبُ: حەبل ٥ هەرشتێك ببێتە هۆکار بۆ گەیشتن بە شتێك ٥ خزمایەتیو خۆشەویستی ٥ لەزاراوەی عەروزدا (سَبَبَ) بریتییە لە دو پیت یەکەمیان بزوێنی هەبێو ئەوی تر بێ بزوێن ٥ یەکەمیان سەبەبی سوكو دووەم سەبەبێ قورس ٥ لەزاراوەی شەرع دا هۆکارێکە کە بەهۆیەوە دەگەیە شتێكو بەڵام تێیدا کاریگەر نییە ٥ وەکوو کات هۆکارە بۆ واجب بوونی نوێژ، بەڵام تێیدا کاریگەرنییە ٥ (أسباب السماء): پەیژەو پلیکانە بۆ بەرزبوونەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَعَلِّي أَبْلُغُ الْأَسْبَابَ﴾ (أسباب السموات)، دەشگوترێ: (تَقَطَّعَتْ بهم الأسباب): هیچ بەهانەو فروفێڵیان نەماون ٥ (أسباب الحكم): بریتین لەو بەڵگەو شایەتانەی دادوەر دەیهێنێو دەیانکاتە بنەما بۆ حوکمە قانوونییەکەی.

السَّبَّابة: قامکی شایەتومان، قامکی نێوان قامکە گەورەو قامکە درێژ.

السُّبَّةُ: ماوەیەك لەزەمان، دەگوترێ: (مضت سَبَّةٌ من الدّهر): ماوەیەك لەڕۆژگار تێپەڕی ٥ (أصابتنا سَبَّةٌ من الحرّ أو البرد): ڕۆژگارێکی گەرم یان ساردمان بە سەردا تێپەڕی، ماوەیەك گەرما یان سەرما لێی داین ئێستا مەوجەی بۆ بەکاردەهێنن ٥ دەڵێن: مەوجەی گەرما یان مەوجەی سەرما.

السُّبَّةُ: عەیبو عار ٥ کەسێك خەڵك زۆر جوێنی پێ بدا.

السُّبَبَةُ: کەسێك زۆر جنێو بەخەڵك بدا.

السَّببيّة: پەیوەندی نێوان سەبەبو موسەبەب.

**السَّبِيبُ**: (سبيب الفرس): موى كلكو يالْو ناوچاوانى ئەسپ.

**السَّبِيبَةُ**: قوماشى تەنكو سوك ٥ پارچەمو (گلۆلە مو) ٥ درزو دڕاوى كەم لەقوماشى كەتان ٥ (ك: سبائب) ٥ دەگوترێ: (امرأة طويلة السبائب): ئافرەتێكى زوڵف درێژە ٥ (سبائب الدم): ڕێڕەوەكانى خوێن.

**المِسَبُّ**: جوێن فرۆش؛ كەسێك زۆر جوێن بدا.

**المِسَبَّةُ**: پەنجەى شايەتومان.

**سَبَتَ سَبْتاً**: نوست ٥ پشوى دا ٥ دامركا.

**سَبَتَ فلان سَبْتاً**: رۆژى شەممە فلانكەس چووە ژورەوە.

**سَبَتَ اليهود**: جولەكە مەراسيمى شەممەيان پێكهێناو پشويان داو وازيان لەكاروكاسبى هێنا.

**سَبَتَ الشَّيْءَ**: شتەكەى شل كردەوە.

**سَبَتَ شَعْرَهُ**: قژەكانى كردنەوە ٥ بڕيەوە، دەگوترێ: (سَبَتَ عِلاَوَتَهُ): لەملى دا ٥ (سَبَتَ رأسَهُ): سەرى تاشى.

**أسْبَتَتِ الحية**: مارەكە پاپۆكەى بەستو خۆى مات دا.

**أسبَتَ فلان**: فلانكەس رۆژى شەممە داخلْ بوو.

**أسبتَ اليهودُ**: جولەكە دابو نەريتى رۆژى شەممەيان پەيرەوكرد.

**سَبَّتَ الشَّيْءَ**: شتەكەى بڕييەوە.

**إنسَبَتَ الجِلدُ**: پێستەكە بەدەباغكردن نەرم بوو.

**إنسَبَتَ الرُّطَبُ**: خورماكە شيرين بوو هەمووى بوو بەروطاب.

**إنسبت الشَّيْءُ**: شتەكە درێژ بوو كشا لەگەڵ نەرم بوون دا.

**السُّبَاتُ**: راحەو پشودان ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاسًا وَالنَّوْمَ سُبَاتًا﴾ هەروا وشەى (سُبات) بەمانا خەوى سوكو سەرەخەوە، وەكوو نوستنى تاوناتاوەى پيرەمێردو نەخۆش ٥ عەمرى كوڕى مەسعود بەمعاويەى گوت: (ما تسأل عن شيخ نومه سبات وليله هبات) ٥ لەبوارى پزيشكى دا بريتييە لە حاڵەتێك كە نەخۆش تێيدا بێ ئاگا دەبێ‌و لەخۆ دەبێتەوەو بەهيچ دەرمانێك بەئاگا نايەتەوە پێچەوانەى ئيغمايە كەشتێكى كاتييەو دواى ماوەيەك لەسەرخۆ چووەكە بەئاگا دێتەوە ٥ (ابنا سبات): شەوو رۆژ.

**السَّبْتُ**: رۆژى شەممە ٥ رۆژگار يان ماوەييك، دەگوترێ: (أقمنا في بغداد سبتاً): ماوەيەك لەبەغدا ماينەوە ٥ ڕاحەو پشودان ٥ نوستن ٥ كەسێك

زۆر بنوێ ٥ گەنجی ئازاو چاو نەترس ٥ ئەسپی ڕەسەنی بەڕاپەرو تیژڕۆو بازهاوێژ ٥ (ك: سُبُوت وأسبات).

**السِّبْتُ**: هەرپێستێك دەباغ بكرێ ٥ جۆرە نەعلێك هەیە پێی دەگوترێ: (نەعلی سیبتی): لەوجۆرە پێستانەیە.

**السُّبْتَةُ**: ماوەیەك لەرۆژگار.

**اَلْمَسْبُوتُ**: نەخۆشی بێ هۆش و بێ هاوارکردن و پەلەقاژە ٥ مردو.

**سِبْتِمْبَر**: مانگی نۆی زایینی.

**تَسَبَّجَ**: پێست و کەوڵی لەبەرکرد کەوڵی ئاژەڵی پۆشی.

**السَّبَجُ**: مێروی ڕەش.

**السُّبْجَةُ**: جۆرە پۆشاکێکە ئافرەت لەماڵەوە لەبەری دەکا.

**اَلسَّبِيجَةُ**: بەمانا (السُّبْجَةُ)دێ.

**سَبَحَ** بالنهر وفيه: لە روبارەکە دا مەلەی کرد چووە ناو ئاوەکەو خۆی نقوم کرد.

**سَبَحَ الفَرَسُ**: ئەسپەکە لەرۆیشتن دا دەستی هاویشتن.

**سَبَحَ** النجومَ: ئەستێرەکان لەفەلەکی خۆیان لەهاتو چۆدا بوون ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾.

**سَبَحَ** فلان في الأرض: فلانکەس لەزەوی دا دوور کەوتەوە ٥ چاڵی هەڵکەند ٥ باری ژیانی ئاڵ و گۆڕی بەسەردا هات بۆژیان و دابینکردنی پێویستیاتی تێکۆشا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ لَكَ فِي اَلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا﴾.

**سَبَحَ** في الكلام: زۆری قسەکردن.

**أسْبَحَهُ في الماء**: مەلەی پێکرد، لەئاوی هەڵکێشا.

**سَبَّحَ**: وتی (سبحان الله)، تەسبیحاتی کرد.

**سَبَّحَ الله ولـه**: پەروەردگاری بەتاك و تەنهاو بێ عەیب و لەککە وەصف کرد تەقدیس و تەنزیهی کرد.

**السابحات**: گەمێکانی ناو دەریا ٥ فریشتە ٥ ئەستێرە.

**السِّبَاحَةُ**: مەلەکردن؛ جۆرە وەرزشێکە لەناو ئاودا دەکرێت.

**اَلسَّبَّاحُ**: مەلەکەر ئەوکەسەی زۆر لەناو ئاودا دەبێ.

**السَّبَّاحَةُ**: قامکی شایەتومان؛ پەنجەی نێوان قامکە گەورەو قامکە درێژ ٥ لەحەدیشدا هاتووە دەربارەی دەستنوێژ دەفەرموێ: (فأدخل إصبعيه السَّبَّاحَتَيْنِ في أُذُنَيْه).

**اَلسُّبُّوح**: ناوێکە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار؛ واتە لەهەموو عەیب و لەککەیەك دوورە هەرچی نەقص بێ تێیدا نییە.

**سُبْحَانَ:** دەگوترێت: (سبحان الله) وشەیەکە بۆ تەنزیهی زاتی پەروەردگار بەکاردێ ٥ لەکاتی سەرسوڕمان لە شتێك‌و عاجباتی لێ هاتن دەگوترێ.

**السُّبْحُ:** بەتاڵایی‌و فەراغ.

**السُّبْحَةُ:** دەنکە مێروی تەزبیح ٥ دوعاو پاڕانەوە ٥ نوێژی سوننەت ٥ (ك: سُبَحٌ).

**سُبُحات الله:** نورو جەلال‌و شکۆمەندیی پەوەردگار.

**السَّوَابِحُ:** بەهێزو توانا، پتەوو قایم، دەگوترێ: (کساء مُسَبَّحٌ).

**المُسْبِحَةُ:** پەنجەی شایەتومان.

**المِسْبَحَةُ:** میروی تەزبیح.

**سَبْحَلَ فلان:** فلانکەس وتی (سبحان الله).

**سَبَخَ سَبْخاً:** داسەکناو دامرکایەوە، دەگوترێ: (سَبَخَ الحَرُّ): گەرما ڕەویەوە.

**سَبَّخَ القُطْنَ:** لۆکەکەی پێچایەوە، لولی دا.

**سَبِخت الأرضُ سَبْخاً:** زەوییەکە شۆڕ بوو، سوێرە خاکە ٥ (أسْبَخَتِ الأرض) بەمانا (سَبِخَتْ)دێ.

**أسْبَخَ في حفره:** لە هەڵکەندنی چاڵەکەدا گەیشتە سوێرە خاك.

**سَبَّخَ:** نوست.

**سَبَّخَ الشَّيْءُ:** شتەکە سوك بوو دامرکاو داسەکنا، دەگوترێ: (سَبَّخَ العرق): دەمارەکە لە فرە فرکەوتو لێدان‌و ئازاری نەما ٥ (سَبَّخَ الحَرُّ): گەرما دامرکایەوە ٥ (سَبَّخَ عنه الشدة): ناخۆشی‌و چورتمی لەسەر سوك بوون ٥ (سَبَّخَ القطنَ): لۆکەکەی شی کردەوە، پانی کردەوە ٥ (تَسَبَّخَ): سوك بوو، دامرکایەوە.

**السِّبَاخُ:** زەوییەکە نەکێڵدرابێ‌و ئاوەدان نەکرابێتەوە لەبەرئەوەی سوێرە خاکە ٥ هەروا ناوە بۆ زبڵی کیمیاوی.

**السَّبَخُ:** شوێنێك سوێرە خاك بێ قاچی لێ ڕۆبچن.

**السَّبْخَةُ:** زەوییەك لەبەرئەوەی شۆرە خاکە هیچی لێ نەڕوێ ٥ یان شوێنێك ئاوەکەی قەوزەی لەسەر بێ.

**السَّبِخَةُ:** ئەرزی نەکێڵدراو ئاوەدان نەکراوە لەبەر شۆرە خاکی.

**السَّبِيخَةُ:** پارچە لۆکە کە دەرمانی دەخرێتە سەرو ئامادە دەکرێ بخرێتە سەر برین ٥ یان لۆکەی شی کراوە ٥ یان ئەو لۆکەیەی لول دەکرێ بۆ ڕستن ٥ ئەو پرزوپاڵەی لەباڵی باڵندە دەکەوێتە خوار ٥ (ك: سَبيخ وسبائخ).

سَبَدَ شَعْرَهُ سَبْداً: مووەکانی جەستەی‌و ریشی تاشین.
أَسْبَدَ: بەمانا (سَبَدَ)دێ.
سَبَّدَ الشَّعرُ: مووەکان دوای تاشین هاتنەوەو سەریان دەرهێنایەوەو ڕەشاییان دیارە.
سَبَّدَ الفَرْخُ: جوجکەکە (بێچووەکە) پەڕو پۆڵی لێ ڕوان.
سَبَّدَ شَعْرَهُ: مووەکانی تاشین‌و لەبێخ دەری هێنان.
سَبَّدَ رَأسَهُ: سەری نەشت‌و چەوری نەکرد، قژەکانی بەژاکاوی‌و چڵکنی هێشتنەوە.
السَّبَدُ: دیمەنی ڕوەك‌و گژوگیا لەکاتی سەر دەرهێنانی لەزەوی پێش ئەوەی پەل‌و پۆ بکاو بڵاو بێتەوە ◦ پاشماوەی گیای دوراوە ◦ کەمێك لەقژ، دەگوترێ: (ماله سَبَدٌ ولا لَبَدٌ): ئەکەم نە زۆر هیچی نییە.
السُّبَدُ: باڵندەیەکی پەڕ خاڵخاڵاوی‌و دەم پان‌و گەورەیە، پەڕو پۆڵی نەرمە کە ئاوی ڕێ دەکەوێ خێرا لێی دەچۆڕێتەوە، عەرەب ئەسپی عەرەق کردو بەو باڵندە دەشوبهێنن ◦ (ك: سِبْدان) ◦ هەروا ئاوە بۆ قوماشێك حەوزی پێ دەهاخندرێ‌و لەناو حەوزەکەدا ڕادەخرێ بۆ ئەوەی کە حوشترەکان هاتنە سەر ئاوەکە قوڕاوو لێڵ نەبێ.
سَبَرَهُ سَبْراً: مەزندەی کرد ◦ ئەندازەی گرت، دەگوترێ: (سَبَرَ الجُرْحَ): قوڵایی برینەکەی پێوا، مەزندەی کرد بەئامێری تایبەت.
سَبَرَ فلاناً: فلانکەسی هەڵپشکنی بۆئەوەی بزانێ چی لاهەیە.
أَسْبَرَهُ: بەمانا (سَبَرَهُ)دێ ◦ (إسْتَبَرَهُ) بەمانا (سَبَرَهُ)دێ.
السَّابِريُّ من الثياب: قوماشی تەنکی زۆر باش ◦ ئەگەر بۆ زرێ بەکارهات مەبەست زرێی چاك چندراوە.
السِّبَارُ: ئەو ئامێرەی قوڵایی برینی پێ دەپێورێ ◦ یان قوڵایی ئاوی پێ مەزندە دەکرێ ◦ (ك: سُبُرٌ).
السُّبُورُ: هەژار.
السَّبُّورةُ: تەختە ڕەشەی قوتابخانە ◦ سەبورە.
السِّبْرُ: ئەصڵ‌و ڕەسەن، بناغە ◦ ڕەنگ ◦ شێوەو ڕوخسار ◦ (ك: أسبار).
السَّبْرُ والتقسيم: لەزاراوەی زانایانی ئوصولی فیقهدا بریتییە لە کۆکردنەوەی وەصفەکان لەئەصڵ‌و قیاس بۆسەر کراوەکەدا ئەمجار وەلانانی هەندێکیان بۆئەوەی باقی ماندەکە بکەینە عیلەت‌و بایسی قیاسەکە.

**اَلسَّبْرُ**: بەمانا ئەصڵو ڕەنگو شێوەو ڕوخسار دێ.
**اَلسُّبَرُ**: باڵندەیەکی دڕندەیە لەباشو گەورەترە باڵەکانی درێژن.
**اَلسُّبْرَةُ**: سبەینانی سارد.
**اَلْمِسْبَارُ**: ئامێری برین مەزندەکردن ٥ (ك: مسابر).
**اَلْمَسْبُرَةُ**: (مَسْبُرَة الجرح): کۆتایی برینەکە.
**اَلْمَسْبُورُ**: ڕوخسار جوان.
**سَبْرَتَ**: بڕوای کردو ئیدی نەیپرسی.
**اَلسُّبْرَاتُ**: هەژارو مسکین ٥ (وهي سبراتة) ٥ (ك: سباريت).
**اَلسُّبْرُوتُ**: شتی کەمو بێ نرخ ٥ هەژارو مسکین، کوڕی گەنج کەموی لێ نەهاتبن ٥ زەوی چۆڵو سوتەمەڕو ٥ (ك: سباريت) ٥ (أرض سباريتُ): زەوی سوتەمەڕو.
**اَلسِّبْرِيتُ**: بەمانا (اَلسُّبْرات)دێ ٥ (هي سبريتة) ٥ (ك: سباريت).
**سَبْرَجَ على الأمر**: کارەکەی ئاڵۆز کرد.
**سَبْرَدَ شعرَهُ**: مووەکانی تاشین.
**سَبْسَبَ الرجلُ**: پیاوەکە بەهێواشی ڕۆیشت.
**سَبْسَبَ الماءَ والبولَ**: ئاوەکە یان میزەکەی ڕژاند، ڕەوانی کرد.
**تَسَبْسَبَ الماءُ**: ئاوەکە جاری بوو.
**اَلسَّبْسَبُ**: سارای کاکی بەکاکی ٥ (ك: سباسب).
**سَبِطَ سَبْطاً**: خاو بوو، نەرم بوو.
**سَبُطَ الشعرُ**: قژی خاوو نەرم بوو، دەشگوترێ: (هو سبط الجسم): قەدو باڵای ڕێكو پێكو ئەندامی جوانن.
**أَسْبَطَ**: لەترسان بێدەنگ بوو ٥ سەری شۆڕ کردوو چاوی لەزەوی ژەنین ٥ لەشی داهێزاو گورجو گۆڵ نەبوو.
**أَسْبَطَ بالأرض**: بەزەوییەوە نووساو ڕاست نەبووەوە، بەهۆی نەخۆشی یان زەبر وێکەوتنەوە کەوتە سەر جێو هەڵنەستا.
**أَسْبَطَ في النوم**: چاوی لێکنان ٥ (أَسْبَطَ عنه): لێی بێ ئاگا بوو.
**سَبَّطَتْ بولدها**: پێش کامڵ بوون منداڵەکەی لەبارچوو.
**اَلسَّابَاطُ**: هەڵاشێکە لەسەر دوو دیوارو بەژێر یا ڕێگای کراوە هەیە ٥ (ك: سوابيط وساباطات).
**سَبَاطِ**: لەرزو تا.
**اَلسُّبَاطَةُ**: ئەو گەندە موو پرژو پاڵەیە کە لەکاتی سەر شانەکردن دا دەکەونە خوار ٥ سەرانگوێلك ٥ هێشوی خورما کە دەنکە خورماکانی پێوەبن.
**اَلسَّبِطُ**: پیاوێکە کە باڵابەرز بێ، درێژ بێ ٥ قژی خاو ٥ بارانی بەردەوام.

**سِبْطُ** اليدين: سەخی سروشتە ◦ (سِبط الأصابع): قامکی درێژن.

**سِبْطُ** الجسم: جەستە رێكو پێكە، دەشگوترێ: (امرأة سِبطة الخَلْقِ): ئافرەتێکی نەرمو نیانو ناسکە.

**اَلسَّبَطُ**: درەختێکە لقو پۆپی زۆرنو یەك قەدی هەیە.

**السِّبْط**: کوڕەزاو کچە زا ◦ لەناو جولەکەش دا وەکوو پێکهاتەی خێڵو هۆزی ناو عەرەب وەهایە ◦ (ك: أسباط).

**السُّبْطَانة**: تاپڕو ساچمەزەن ◦ تفەنگێك کەڕاوی باڵندەی پێ بکرێ.

**اسْبَطَرَّ**: ڕاکشا ◦ درێژبوو، دەگوترێ: (اسْبَطَرَّت الذبيحة): کوشتییەکە دوای سەربڕینی ڕاکشاو درێژ بوو.

**اسْبَطَرَّ البلادُ**: وڵات ئارام بوو.

**السِّبَطْرُ**: پیاوی زیرەكو کۆڵنەدەر لەکارو پیشەی خۆی ◦ درێژ، دەگوترێ: (شَعْرٌ سِبَطْرٌ): قژێکی درێژی خاو ◦ هەروا بەمانا تیژ ڕۆو گورجو گۆڵ دێ، دەگوترێ: (جمل سِبَطْرٌ): و (أسد سِبَطْرٌ): واتە لەکاتی بازدان دا جەستەی درێژ دەبێ.

**السِّبَطْرَةُ**: ئافرەتی جەستە گەورەو کەتە.

**السَّبَطْى**: ڕۆیشتنێکە لارو لەنجەی تێدایە.

**السَّبَنْطَرُ**: درێژ.

**سَبَعَ القَومَ سَبْعاً**: بوو بەحەوتەم کەسی خەڵکەکە بەئەو ژمارەی خەڵکە کەبوو بە حەوت، دەگوترێ: (هو سابع ستة): ئەو ژمارە حەوتە حەوتی دوا شەش ◦ هەروا مانای ئەوەدەگەیەنێ کە حەوتیەکی ماڵەکەی لێ وەرگرتوون.

**سَبَعَ الحبلَ**: حەبلەکەی بەحەوت لۆ بادا.

**سَبَعَ الذئبُ الغَنَمَ**: گورگەکە حەوتی لەجەڵەبە مەڕو بزنەکان خنکاند.

**سَبَعَ فلاناً**: فلانکەسی ترساند، ڕەخنەی لێگرتو جنێوی پێدا.

**سُبِعَ المولود**: منداڵەکە سەری تاشراو حەوتمی بۆکرا.

**سُبِعَتِ البقرةُ الوَحْشِية**: درندە بێچوی مانگا کێوییەکەی خوارد.

**أسْبَعَ القومُ**: خەڵکەکە بوونە حەوت کەس ◦ درندە کەوتە ناو ئاژەڵەکانیان و لەی خواردن.

**أسْبَعَتِ الحامِلُ**: ئافرەتە سکپڕەکە بەحەوت مانگی منداڵی بوو.

**أسْبَعَ الطريقُ**: ڕێگاکە درندەی زۆر بوو.

**أسْبَعَ إبْنَهُ**: منداڵەکەی دا بەدایەن شیری بداتێو بەخێوی بکا.

**سَبَّعَ العَمَلَ**: حەوت جار کارەکەی ئەنجام دا ٥ یان دوچەندانەی کردەوە، دەگوترێ: (سَبَّعَ الإناءَ): حەوت جار قاپەکەی شت ٥ (سَبَّعَ اللهُ لكَ الأجْرَ): خودا حەوت هێندەی پاداش دایەوە یان پاداشی بۆ دوچەندانە کرد ٥ هەروا دەگوترێ: (سَبَّعَ عند إمرأته): حەوت شەو لای ژنەکەی مایەوە.

**سَبَّعَ الحامل**: ئافرەتەکە بەحەوت مانگی منداڵەکەی بوو.

**سَبَّعَ القومُ**: خەڵکەکە ژمارەیان بوو بەحەوت سەد کەس، لە حەدیثدا هاتووە دەفەرموێ: (سَبَّعَتْ سليم يوم الفتح): هۆزی سولەیم ڕۆژی فەتح حەوت سەد کەسیان ئامادە بوون بۆ ڕزگار کردنی مەککە.

**إسْتَبَعُوا**: بوون بە حەوت.

**الأسبوع من الأيام**: هەفتە ٥ کە بۆ تەوافکردنی کەعبە، گوترا مەبەست حەوتجار سوڕانەوەیە بە دەوری کەعبەدا ٥ (ك: أسابيع).

**السَّابِعُ**: ژمارەی نێوان شەش و هەشت، دەگوترێ: (هو سابعُ سبعة): یەکێکە لەژمارەکانی حەوت.

**السُّبَاعي**: حەوت سوچ، حەوت لا ٥ (رجل سُبَاعي البدن): پیاوێکە جەستە تەواو (ثوب سُبَاعِيٌّ): قوماشێکە حەوت مەترە، حەوت بستە.

**السَّبُعُ**: دڕندە، هەردەعبایەك چنگ و نینۆکی هەبن و پەلاماری ئادەمیزادو ئاژەڵ بداو نێچیری بکا وەکوو شێرو گورگ و پڵینگ ٥ (ك: سِباع وأسبع وسُبوع).

**السُّبُعُ**: بەشێکە لەحەوت بەش ٥ (ك: أسباع).

**السَّبْعَةُ**: ژمارەیەکە بۆ نێرینە بەکاردێ.

**السُّبَعَةُ**: بێچوە شێر.

**السُّبُوعُ**: هەفتە.

**السَّبِيعُ**: بەمانا (السُّبُعُ)دێ.

**المُسَبَّعُ**: لەزاراوەی ئەندازیاری دا فەبارمیەکی حەوت سوچە.

**المَسْبَعُ**: شوێنێك دڕندەی لێ هەبێ ٥ (ك: مَسَابِع).

**المُسْبَعُ**: بەناز پەروەردەو ژیان نەرم و نۆڵ ٥ منداڵە ساوایەك دایکی بمرێ و ئافرەتێکی تر شیری پێ بداو بەخێوی بکا ٥ منداڵی زۆڵ ٥ منداڵی باوك نەناسراو ٥ منداڵێك بەحەوت مانگی لەدایك ببێ.

**المَسْبَعَةُ**: زەوییەك دڕندەی زۆربن ٥ (ك: مَسَابِع).

**سَبَغَ الشَّيْءُ**: شتەکە تەواو بوو ٥ درێژ بوو، بەرفراوان بوو، زۆر بوو، دەگوترێ: (سَبَغَتْ الدِّرعُ) و(سَبَغَ الشَّعْرُ) و(سَبَغَ الذنب) و(سَبَغَتْ النعمة)، وە دەگوترێ: (هو سابغ وهي سابغة) ٥ (ك: سوابغ).

**أسْبَغَ الفارسُ**: سوارەکە زرێی پان‌و پۆڕی لەبەرکرد، دەگوترێ: (أسْبَغَ ثوبَهُ): کراسەکەی پان‌و پۆڕ کرد ٥ (أسْبَغَ وضوءَهُ): بەرێك‌و پێکی دەستنوێژی گرت‌و ئەندامەکانی جوان شت ٥ (أسْبَغَ له في النفقة): بە تێرو پڕی نەفەقەی کێشا ٥ (أسْبَغَ الله عليك في النعمة): پەروەردگار نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشتی.

**التَّسْبِغَةُ**: (تسبغة الخوذة): ئەو قەیتان‌و قۆپچەو ترمەقەو شتانەیە کە ئەڵقەکانی زرییەکەی پێ قاییم دەکرێ لەمل دا ٥ (ك: تَسَابِغُ).

**سَبَقَه الى الشَّيْءِ سَبْقاً**: پێشی کەوت، دەگوترێ: (سَبَقَ الفَرَسُ في الحلبة): ئەسپەکە لەمەیدانی غار غارێن دا پێش ئەسپەکانی تر گەیشتە مەبەست.

**سَبَقَ على قومه**: لەپیاوەتی‌و شکۆمەندیی دا پێش هۆزو نەتەوەکەی کەوت ٥ (سُبِقَ على الأمر): لەکارەکەدا تێشکا.

**أسْبَقَ القَوْمُ الى الأمر**: خەڵکەکە بەپەلەو لێبڕانەوە بۆکارەکە چون.

**أسْبَقَ الرأيَ**: لەسەر ڕایەکەی سور بوو بەبێ لێ وردبونەوەو بێ سێ‌و دوو.

**سَابَقَ الى الشَّيْءِ مُسَابَقَةً وسباقاً**: پەلەی کرد بۆلای شتەکە.

**سَابَقَ بين الخيل**: ئەسپەکانی خستنە غارکردن‌و سوارەکانیان بەسەریانەوە بوون، سەیری کرد بزانێ کامیان پێش دەکەوێ.

**سَابَقَ فلاناً**: پێشبڕکێی لەگەڵ فلانکەس دا کرد.

**سَبَّقَ**: پێشکەوتنی بەدەست هێنا.

**سَبَّقَ بين الخيل**: بەمانا (سابق)دێ.

**سابقت الشاةُ ونحوها**: مەڕەکە پێش وەخت بێچوەکەی بوو.

**سابق الطيرَ الجارحَ**: حەبلێکی سیرمەی لەقاچی باڵندەکە کردو بەستیەوە.

**إستَبَقُوا الى كذا**: خەڵکەکە پێشبڕکێیان کرد بۆلای ئەو شتە.

**إستبقوا الطريق**: لەڕێکاکە لای دا.

**تسابقوا**: بەمانا (استبقوا) دێ ٥ کێبڕکێیان کرد.

**السَّابِقُ**: کەسێك دەست پێشخەر بێ بۆ کاری چاکە.

**السَّابِقَةُ**: پێشبڕکێ لە ڕۆیشتن‌و شتی

تر دا ٥ دەست پێشخەری لەشت دا، دەگوترێ: (له في هذا الأمر سابقة): لەم نیشەدا پێش کەسانی دی کەوتووەو تێیدا کارامایە ٥ لەیاسادا بریتییە لەتاوانێك کەسێك دەیکاو لەسەری تۆمار دەکرێ ٥ هەڵسو کەوتێکی رێکو پێکەو تازە قەڵایەو دەکرێتە نمونەو سەرە مەشق ٥ (ك: سوابق).

**السَّابقات**: ئەسپ.

**السِّباقُ**: قەیدو حەبلی لەسیرمەو شتی قایم قاچی باڵندەی بەهێزو درندەی پێ دەبەسترێ.

**سِباقَ الخیل**: ئەنجامدانی پێشبڕکێ لەمەیدانی غار غارێن دا.

**السَّبَّاقُ**: کەسێك زۆر جار پێشکەوتن بەدەست بێنێ.

**السَّبَقُ**: ئەوشتەی گرەوی پێشبڕکێکەی لەسەردەکرێ یان شوێنی پێشبڕکێکە ٥ (ك: أسباق).

**سَبَكَ المَعْدِنَ سَبْكاً**: مەعدەنەکەی تواندەوەو پاڵفتەی کردو خشتو خاڵی لێ دوور خستەوەو لەقاڵبی دا، دەشگوترێ: (سَبَكَت التجارب فلاناً): ئەزمونو تاقیکردنەوە فلانکەسی لەبۆتە داوەو قاڵی کردوە، دەگوترێ: (هو سبوك وسبيك).

**سَبَّكَ المَعْدِنَ**: بەمانا (سَبَكَهُ)دێ.

**إنْسَبَكَ**: لەقاڵب درا.

**السِّبَاكَةُ**: پیشەی ئاڵتونو مس توانەوەو شتی واو لەقاڵب دان.

**السَّبَّاكُ**: ئەو کەسەی مەعدەنەکان دەتوێنێتەوەو لەبۆتەیان دەداو دەیانکاتەوە بەقاڵب ٥ هەروا ناوە بۆ ئەوکەسەی بۆری بەلوعە لەناو خانوو باڵەخانە لێك دەداو دەیانبەستێ.

**السَّبِيكَة**: قاڵبە ئاڵتون قاڵبە زیو قاڵبە رەصاصو شتی وا ٥ هەرپارچە مەعدەنێکی مەیلەو درێژو لەقاڵب دراو ٥ (ك: سبائك).

**المَسْبَكُ**: ئەو شوێنەی مەعدەنەکانی تێدا لەقاڵب دەدرێ ٥ (ك: مَسَابِك).

**المِسْبَكَةُ**: ئەو قاڵبو ئامێرانەی ئاڵتون و زیوو مەعدەنە تواوەکانی تێدا لەقاڵب دەدرێ.

**إسْبَكَرَّ الشَّيْءُ**: شتەکە درێژ بوو، دەگوترێ: (إسْبَكَرَّ النبتُ واسْبَكَرَّ الشَّعْرُ): ڕوەکەکە بەرز بۆوە، قژەکە درێژ بوو.

**اسْبَكَرَّ الشباب**: گەنجییەکەی کامڵ بوو چاك پێگەیی.

**إسْبَكَرَّ النَّهرُ**: چۆمەکە ڕەوان بوو، ئاوەکەی ڕۆیی.

أَسْبَلَت الطريق: ڕێگاكە قەرەباڵغ بوو خەڵكی زۆر پێدا ڕۆیی.

أَسْبَلَ الزَّرْعُ: كشتوكاڵەكە گوڵی دا (أَسْبَلَ السماءُ): ئاسمان بارانی باراند (أَسْبَلَتْ العين): چاو فرمێسكی ڕشت، (أَسْبَلَ عليه): زۆری قسە لەسەر كرد ○ (أَسْبَلَ الشَّيْءَ): شتەكەی بەرەڵلا كردو شلی كردەوە، دایدایەوە، دەگوترێ: (أَسْبَلَ الثوبَ وأَسْبَلَ الستر وأَسْبَلَ الفرسُ ذنبه).

سَبَّلَ الشَّيْءَ: شتەكەی كردە موڵكی هەموانی، وەقفی گشتی لەڕێگەی خودادا.

الأَسْبَلُ: سمێڵ درێژ یان ڕیش درێژ ○ (ك: سُبْلٌ).

السَّابِلُ: (طريق سابلٌ): ڕێبازێكە خەڵكی پێدا تێپەڕ دەبێ.

السَّابِلَةُ: ڕێگایەك خەڵكی پێدا دەڕوا، دەگوترێ: (سبيل سابلة): ڕێبازێكە خەڵكی پێدا دەڕوا.

السَّبَلُ: بارانی بەخوڕەم ○ گوڵی ڕوەك ○ دەردێكە توشی چاو دەبێ پەردەیەكی تەنكی وەكوو تەنراوی جاڵجاڵۆكە خەتخەتی سور لەناو چاو پەیدا دەبن ○ پۆشاكی درێژ ○ كراسی ئاودامان.

السَّبْلاَءُ: ئافرەتێكە لەزوور لێوی سەرەوەی مووی لێ ڕوابن ○ چاوێك برژانگی درێژ بن ○ (ك: سُبْلٌ).

السُّبْلَةُ: (سَبَلَة الزرع): گوڵی ڕوەك، گوڵە گەنمو جۆ ○ (سَبَلَةُ الرجل): ئەو كەوانەیەی لەناوەڕاستی لێوی سەرەوە ○ قەراخی سمێڵ ○ لای خواروی ڕیش ○ (سَبَلَة الإناء): سەری قاپ، دەگوترێ: (مَلَأَهُ الى سَبَلَتِهِ): تا سەر قاپەكەی پڕی كرد ○ (جَرَّ فلان سَبَلَتَهُ): فلانكەس پۆشاكە زێدەو شۆڕبووەكەی ڕاكێشا ○ (جاء وقد نشر سَبَلَتَهُ): هات هەڕەشەی كرد ○ (هو أَصْهَبُ السَّبَلة): ئەو دوژمنە.

السَّبِيلُ: ڕێگا ○ هۆكارو سەبەب ○ قورئان دەفەرموێ: ﴿يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا﴾ ○ هەروا بەمانا فێڵو تەڵەكە دێ.

سبيل الله: جیهادو تێكۆشان لەڕێگەی خودادا ○ حەجكردن ○ هەوڵدان بۆ فێربوونی عیلمو زانیاری ○ هەرشتێك خودا فەرمانی بەئەنجامدانی كردبێ لەكاری خێرو چاكە ○ بەزۆری بەمانای جیهاد بەكاردێ ○ هەروا بەمانا حەرەجو عەیبە دێ، دەگوترێ: (ليس علي في كذا سبيل) ○ بەمانا بەڵگەو دەلیل دێ، دەگوترێ: (ليس لك علي سبيل).

إبن السبيل: کەسێکە ڕێبواربێ‌و پێداویستی گەڕانەوەی بۆ شوێنی خۆی دەست نەکەوێ.

السَّبَنْجُونَةُ: فەروەو باڵتۆی دروستکراو لەکەوڵی ڕێوی ٥ ڕیوایەتکراوە حەسەنی کوڕی عەلی فەروەیەکی لەوجۆرەی هەبوو لەکاتی نوێژکردن دا لەبەری نەدەکرد.

السِّبِنْسَةُ: فارغۆنی دواوەی شەمەندەفەر.

سُبِهَ سَبَهاً: عەقڵی نەما، شێت‌و گێل بوو لەبەر پیری، دەگوترێ: (هو مَسْبوه).

سُبِّهَ: بەمانا (سُبِهَ)دێ ٥ زمانی کراوەیە.

السَّبَاهي: (رجل سباهٍ): پیاوێکە لەبەر پیری عەقڵی نەماوە.

السُّبَهُ: خۆ بەزلزان.

السُّبَاهية: خۆ بەزلزان.

السَّبَهْلَلُ: پیاوی بێ‌عەقڵ‌و هیچ نەبوو، هیچ لەبارا نەبوو ٥ پیاوی تەڕ دەماخ‌و لەخۆ ڕازی‌و لوتبەرز ٥ هەوڵدەر بۆ شتی بێهودە، دەگوترێ: (یَمشی سَبَهْلَلاً): دێ‌و دەچێ بەبێ ئەوەی سودێکی دەست بکەوێ ٥ کارێك کەهیچ سودێکی لێ چاوەڕوان نەکرێ ٥ هەروا دەگوترێ: (ذهب أمره سَبَهْلَلاً): هەوڵدانەکەی بێ سوود بوو.

السَّبَهْلى: خۆ بەزلزان‌و لارو لەنجەکار.

سَبَى عَدُوَّهُ سَبْياً وسِبَاءً: دوژمنی دیل کرد، دەشگوترێ: (سَبَتْه الغانیة): قەدبارێك‌و چاوجوان دیلی کرد.

سبى الخَمْرَ: لەوڵاتێکەوە شەرابی برد بۆ وڵاتێکی تر.

سَبى الماءَ: زەوی هەڵکۆڵی تا گەیشتە ئاو.

سَباهُ اللهُ وأبعدهُ: خودا نەفرینی لی کرد ٥ خودا نەفرینی لێ بکا.

استباهُ: بەمانا (سَباه)دێ.

تسابى القومُ: خەڵکەکە هەندێکیان هەندێکیانیان دیل کرد.

تَسَبَّى لە: خۆی لاخۆشەویست کردو مامەحەمەی بۆ کرد.

السَّابِياءُ: یزدان ٥ ئاژەڵ‌و بەرو بوومی‌و زۆر بونیان زۆر بونی ماڵ‌و پیاوی تێکۆشەرو جەنگاوەر ٥ (ك: سوابِيّ).

السِّبَاءُ: ئەو دارو چیلکەو چەوێڵەیە ئاو لەوڵاتێکەوە دەیبا بۆ وڵاتێکی تر.

السَّبْيُ: دیل کراو ڕفێنراو ٥ بەزۆری بۆ ئافرەت بەکار دەهێنرێ لەو ڕووەوە دڵ ڕفێنن یان خۆیان بێ دەسەڵاتن‌و دەرفێنرێن ٥ (ك: سُبِيّ).

السَّبِيُّ: دیل کراو، ڕفێنراو چ پیاو بێ چ ئافرەت بێ.

السِّبَاءُ: توێژی مارپێستی مارە(ك: سبایا).

**السَّبِيَّةُ**: دوڕو گەوهەر کەمەلەوان لەدەریا دەری دێنێ ◦ (ك: سبايا).

**السَّاتُ**: شەشەم، دەگوترێ: (جاء فلان سادِاً): فلانکەس بەپلەی شەشەم هات.

**السِّتُّ**: شەش ژمارەی نێوان پێنج و حەوت ◦ بۆ مێینە بەکاردێ دەشکرێتە وشەی ڕێزدانان بۆ ئافرەت دەگوترێ (ست فاطمة، ست رقية، ...هتد) ◦ (ك: سِتَّاتٌ).

**السِتة**: ژمارەی شەش بۆ نێرینە بەکاردێ.

**السِّتُّون**: ژمارەی شەصت ◦ شەش جار دە ◦ بۆ نێرو مێ بەکاردێ، دەگوترێ: (ستون رجلاً وستون امرأةً).

**سَتَرَهُ سَتْراً**: شاردیەوە.

**ساتره العداوة**: دوژمنایەتیەکەی بۆ ئەو دەرنەخست.

**إسْتَتَرَ**: داپۆشی.

**إنْسَتَرَ**: بەمانا (إستتر)دێ.

**تَسَتَّرَ**: خۆی شاردەوە، دەگوترێ: (تستّر عليه): لێی شاردەوە.

**الإسْتَارُ** (من العدد): ژمارە چوار دەگەیەنێ ◦ هەروا کێشی چوار مثقال و نیو دەگەیەنێ.

**إسْتَارُ القوم**: چوارەمی قەومەکەیە ◦ هەروا بەمانا عەقڵ و شەرم و حەیا دێ ◦ (ك: أساتير).

**ألسِّتَارُ**: داپۆشەر، پەردە ◦ پەردەی پەنجەرەو دەرگا.

**ألسِّتَارَةُ**: بەمانا (ألسِتار)دێ ◦ (ك: ستائر).

**ألسِّتْرُ**: بەمانا (ألسِتار)دێ ◦ بەمانا عەقڵ و شەرم و حەیا دێ ◦ (ك: أستار وسُتُور وسُتُرٌ).

**ألسُّتْرَةُ**: بەمانا (ألسِتَارُ)دێ.

**ألسِّتِّيُّ**: کەسێکە حەزی لەشتی نهێنی بێ و سەرپۆش بێ ◦ داوێنپاك ◦ درەختێك لق و پۆپی زۆربن.

**ألمُسَتَّرَةُ** (جارية مُستَّرَةٌ): کچۆلەیەکی کەژاوە نشین و پارێزراوە وەکوو دوڕی ناو صەدەف وایە.

**ألمَسْتُور**: داوێنپاك و خاوێن ◦ کەسێك حاڵ و وەزعی لای خەڵك دیارنەبێ.

**السُّتُوق**: پارەی ستۆك و تەزویر ◦ پارەی قەڵب.

**ألمُسْتَقَةُ**: ئامێرێکە پێی لەسازو سەمتور دەدرێ.

**سَتَلَ القومُ سَتْلاً**: خەڵکەکە بەرێز یەك لەدوا یەك هاتنە دەرەوە.

**سَتَلَ اللؤلوءَ**: دەنکە لولوئەکان یەك یەك لەبنەکەیان کەوتنە خوارەوە.

**سَتِلَهُ سَتْلاً**: شوێنی کەوت.

**سَاتَلَ**: شوێنی کەوت.

**تساتَلَ**: بەمانا (سَاتَلَ)دێ، دەگوترێ: (تساتل الدمع واللؤلؤ).

**سَتَالَةُ الشَّيْئِ**: جۆرە پڕو پوچەکانی شت.

**اَلسُّتَلُ**: باڵندەیەکە لەپێری (الصقریات) گەورەترین باڵندەیە لەڕوی قەبارەوە، چونکە درێژی باڵەکانی لەکاتی کردنەوەیان نزیکەی سێ مەتر دەبن ٥ لەشوێنی چیاو شاخو کەژدا دەژی ٥ (ك: سُتْلان).

**اَلْمَسْتَلُ**: ڕێگەی تەنگەبەر ٥ (ك: مساتِلَ).

**سَتَهَهُ سَتَهًا**: دوای کەوتو لێی نابێتەوە، هەمیشە بەدواوەیەتی.

**سَتِهَ سَتَهاً**: سمتی زل بوون ٥ (فهو أسته وهي ستهاء) ٥ (ك: سُتَةٌ).

**الإسْتُ**: سمت ٥ جاریوایش دەبێ مەبەست خودی کونی پاشەوەیە ٥ (ك: أستاه) ٥ بەخەڵکانی خوێڕیو هەتیومچە دەڵێن: (سُتاه).

**أست الدهر**: ئەوەڵی ڕۆژگار.

**ابن استها**: کوڕی کۆیلەو دایک ئەمەتە ٥ منداڵی زینا.

**سَجَّ بَطْنُهُ سَجًّا**: گوڕونکەی توش بوو ٥ سکی چوو.

**سَجَّ الطائرُ**: باڵندەکە ناوسکی خۆی دانا.

**سَجَّ بسَلْجِهِ**: جیقنەی ڕونی کرد.

**سَجَّ سَطْحَهُ**: بەقوڕی شل سەربانەکەی سواخ دا.

**سَجَّ الحائطَ**: دیوارەکەی سواخ دا.

**السَّجَاجُ**: ماستاوی زۆر ڕون.

**السَّجُّ**: دەگوترێ: (أخذه في بطنه سَجٌ): سکی چوو.

**المِسَجَّةُ**: مالنج، ماڵە؛ ئامێرێکە قوڕو گەچو شتی وای پێ بڵاو دەکرێتەوە ٥ (ك: مَساج).

**سَجَحَ لە بشيئ من الكلام سَجْحاً**: بەتەعریضو توانج مانایەکی ئاڕاستە کرد.

**سَجَاحِ**: ناوی ژنێکی تەمیمییە لافی پێغەمبەرێتی لێ دە دا، هاوسەرو هاوەڵی موسەیلیمە بوو.

**السُّجَاحُ**: بەرامبەر ٥ دەگوترێ: (داري سُجَاحَ دارە).

**السُّجُحُ من الطريق**: ناوەڕاستی ڕێگا ٥ ڕیزو تەناف ٥ دەگوترێ: (بنوا بيوتهم على سُجُح واحد): خانووەکانیان لەڕیزی یەك دروست کردون.

**السُّجْحَةُ**: سروشتو ڕەوشت.

**السَّجِيحُ**: نەرمو شل، ئاسان ٥ دەگوترێ: (خُلُقٌ سَجيح): ڕەوشتی نەرمو نیان.

**السَّجِيحة**: بەمانا (السُّجْحَةُ)دێ ٥ دەگوترێ: (ركب سِجيحة رأسه).

**سَجَدَ سُجوداً**: چووه سوژده ٥ ملكەچ بوو ناوچاوانی خستە سەرزەوی.

**سَجَدَتْ السفينةُ للريح**: كەشتييەكە بەگوێرەی بايەكە مەيەلانی كرد.

**سَجِدَتْ رجلُهُ سَجَداً**: قاچی هاوسا ٥ (فِي سَجْداءُ وهو أسْجَدُ) ٥ (ك: سُجدٌ).

**أسْجَدَ**: سەری دانەواند چووه ركوع ٥ (أسْجَدَ الرَّجُلُ) پياوەكە بە تێلەی چاو زۆری بۆ روانیو درێژەی بە تەماشاكردنەكە دا.

**السَّاجِدُ**: دەگوترێ: (فلان ساجد المنخر) فلانكەس ملكەچو زەليلو فەرمانبەرداره.

**السَّاجِدَةُ**: مێينەی (السَّاجِدَ) دەگوترێ: (عين ساجدة) چاوەكە پرتە پرتيەتی، چاوەكە فرە فرپەتی ٥ دەشگوترێ: (نخلة ساجده) دار خورمايەكی قەد خوارو خێچە ٥ (ك: سَوَاجِدُ).

**السَّجَّادُ**: كەسێك زۆر سوژده بەرێ.

**السَّجَّادَة**: بەرماڵ، فەرشێكی بچوكە نوێژی لەسەر دەكرێ ٥ شوێنكەی سوژده بردن بەناو چاوانەوه.

**الْمَسْجَدُ**: ناوچەوان ٥ (الْمَسَاجِدُ من بدن الانسان) ئەو ئەندامانەی لەكاتی سوژده بردندا بكەونە سەر زەوی كە بريتين لە ناوچەوانو لوت دوو بەری دەستو هەر دوو كەشكە ئەژنۆو هەردوو چاوە قامكی قاچ.

**الْمَسْجِدُ**: مزگەوت ٥ شوێنی نوێژی موسوڵمانان.

**الْمَسْجِد الحرام**: مزگەوتی كەعبە.

**الْمَسْجِد الأقصى**: مزگەوتی قودس ٥ (ك: مَسَاجِدَ).

**الْمِسْجَدَة**: بەرماڵ.

**سَجَرَ سَجْراً وسجوراً**: پڕبوو (سَجَرَ الاناءَ) قاپەكەی پڕكرد ٥ (سَجَرَ الشِعرَ) شيعرەكەی بەتاك قافيەيی نەگوت.

**سَجَرَ** الماءَ في حلقه: ئاوی رژاندە قورگيەوه.

**سَجَرَ** التنورَ: تەندورەكەی پڕكرد لە سوتەمەنیو گەرمی كرد.

**سَجَرَ** الرَّجُلُ الكلْبَ: پياوەكە قلێتەی كردە ملی سەگەكە.

**سَجِرَتْ عَيْنُهُ سَجَراً وسُجْرَةً**: سپێنەی چاوی كەمێك سوری تێدايە ٥ (فهي سَجْراءُ) بە خاوەنی چاوەكەش دەگوترێ: (أسْجَرُ).

**سَاجَرَهُ**: هاوڕێيەتی كردو ئەمەكو وەفای لەگەڵدا نواند.

**سَجَّرَ** الاناءَ ونحوه: قاپەكەی پڕكرد.

**سَجَّرَ** الماءَ: ئاوەكەی هەڵقوڵاند فيچقەی كرد.

**سَجَّرَ** الشِعْرَ: شيعرەكەی تاك قافيەو قافيە جودا خوێندەوه يان

به هەردوو شێوەکە شیعری دانا.

**سَجَّرَ الكَلْبَ**: قلّێتەی لە ملی سەگەکە کرد.

**إنسَجَرَ**: پڕی کرد (إنسَجَرَ الشِعرَ) شیعرەکەی بە قافیەی جیا جیا دانا، خوێندییەوە.

**إنسَجَرَ في السَيْرِ**: لە ڕۆیشتندا بەردەوام بوو.

**الأسْجَرُ**: لێڵ ٥ دەگوترێ: (غدير أسْجَرُ) گۆلاوێکی لێڵە، ئاوەکەی قوڕاوێکی مەیلەو سورە ٥ (ك: سُجْرٌ).

**السَّاجِرُ**: لافاو.

**الساجور**: قلّێتە دەکرێتە ملی سەگ.

**السَّجْرُ**: چاوگەو بەکاردەهێنرێ بۆ گرمەی هەور ٥ دەگوترێ: (بِئْرٌ سَجْرٌ) بیرێکە پڕە لە ئاو.

**السُّجُورُ**: دارو چیلکەو چەوێڵ کە ئاگری پێ دەکرێتەوە.

**السَّجِيرُ**: دۆستی گیانی بەگیانی ٥ (ك: سُجَرَاء).

**المِسْجَرُ**: کۆڵەوەژ ئەو دارەی ئاگری تەندوری پێ خۆش دەکرێ ٥ (ك: مَسَاجِر).

**المِسْجَرَةُ**: بەمانا (ألمِسْجَرُ) دێ ٥ (ك: مَسَاجِر).

**المَسْجُورُ**: هەڵایساو هەڵگیرساو ٥ پڕ.

**سَجِسَ سَجَساً**: لێڵ بوو ڕەنگی گۆڕا.

**سَجِسَ الماءُ**: ئاوەکە لێڵ و قوڕاو بوو (هو سَجِسٌ وسَجِيس) (بِئْرٌ سَجِسَةٌ وسَجِيسَة).

**سَجَّسَ الإبطُ والماءُ**: بن هەنگڵی بۆنی کرد، ئاوەکە بۆگەن بوو.

**سَجَّسَ الماءَ**: ئاوەکەی لێڵ کرد.

**السَّاجِسِيُّ**: (كبش سَاجِسِي) مەڕێکی سپی زۆر سپی و خوریەکەشی زۆرە.

**السَّجَسُ**: لێڵ و گۆڕاو.

**السَّجِيسُ**: هەرگیزاو هەرگیز ٥ دەگوترێ: (لا أفعله سجيس الليالي أو سجيس الليالي والأيام أو سجيس الدهر) مەبەست ئەوەیە قەت ئەوە ناکەم.

**السَّجْسَجُ**: (يوم سَجْسَجٌ) ڕۆژێکی کەش و هەوا مام ناوەندییە نەساردەو نەگەرمە ٥ (ظل سَجْسَجٌ) (وأرض سَجْسَجٌ) زەوییەکە نە نەرمەڵانە نە ڕەق و پتەوە ٥ یان زەوییەکی پان و پۆڕە ٥ (ك: سَجَاسِج).

**سَجَعَت الحمامة والناقةُ سَجْعاً**: کۆترەکە بەیەك شێوە خوێندی ٥ حوشترەکە بەیەك شێوە باڕاندی.

**سَجَّعَ فلان**: فلانکەس بە شێوەیەك قسەی کردن ڕستەکانی وشەکانی سەرەوایان هەبوو وەکوو شیعر ٥

دەشگوترێ: (سَجَعَ الكلامَ وسَجَعَ به) قسەکانی سەرەوادار کردن ٥ (وەهو وهي سَجَّاعة) ٥ (وەهو سَجّاع).

**سَجَعَ** له: قەصدی ئەوی کرد.

**سَجَعَ** فلان في سيره: فلاّن مامناوەندیو راستاڵ بوو لە مەبەست لای نەدا.

**سَجَّعَ** الكلامَ وسَجَّعَ فيه: قسەکانی بەشێوە سەجع کردن شێوازی سەجعی لە قسەکانیدا پەیڕەو کرد.

**الأُسْجُوعَةُ**: قسەی سەجع دار، رستەی سەرەوادار.

**السَّاجِعُ**: دەگوترێ: (ناقة ساجِعةٌ وساجِع) حوشترێکی وەهایە لەیەك شێوە دەبارێنێ ٥ (ك: سواجع وسُجَّع) ٥ دەمو چاوی رێكو پێك ؛ روخسار جوانو قۆز.

**السَّجْعُ**: قسەکردن بەشێوەیەك رستەکان سەرەوایان هەبێ بەڵام بێ کێش بن (ك: أسجاع وسُجُوع).

**السَّجْعَةُ**: پارچەیەك لە کەلامی سەرەوادار.

**الْمَسْجَعُ**: مەبەستو رێڕەو (ك: مساجع).

**سَجَفَ** البَيْتَ سَجْفاً: حەصیرو شتی وای خستە سەر سەقفی خانوەکە.

**أسْجَفَ** الليل: شەو تاریك بوو.

**أسْجَفَ** البَيْتَ: حەصیرو تامانو قەفەزاژی خستە سەر سەقفی بانەکە.

**أسْجَفَ** السِّتْرَ: پەردەکەی دادایەوە.

**السِّجَاف**: پەردە ٥ ئەو نەخشو نەتەمینو پەراوێزەیە بە دامێنی کراسەوە دەلکێندرێ ٥ (ك: سُجُفٌ).

**السِّجَافَةُ**: پەردە.

**السِّجْفُ**: دوو پەردە لێك نزیك بنو بەتاڵایی یەکیان لە نێواندا بێ ٥ (ك: أسجاف وسجوف).

**السِّجْفَةُ**: ساتێك لە شەو ٥ (ك: سُجَفٌ).

**السُّجُقُ**: ریخۆڵە بە پارچە گۆشتو بەز داپۆشرێ.

**سَجَلَ** به سجلاً: لە بەرزییەوە فڕێی دایە خوار.

**سَجَلَ** الشَّيْءَ: شتەکەی یەك لەدوای یەك نارد.

**سَجلَ** الماءَ: ئاوەکەی لە بەرزییەوە بەسەردا هەڵڕژان.

**سجلَ** السورة أو القصيدة: سورەتە قورعانەکە یان چامە شیعرەکەی بێ پسانەوە خوێندەوە.

**أسْجَلَ** فلان: فلاّنکەس خێرو بێری زۆر بوو.

**أسْجَلَ** الحوض ونحوه: حەوزەکەی پڕکرد.

**أَسْجَلَ فلاناً**: دۆڵچەیەك یان دوو دۆڵچەی دا بە فلانكەس ٥ یان زۆر عەتاو بەخششی پێدا.

**أَسْجَلَ له**: نامەیەكی بۆ نووسی.

**أَسْجَلَ الشَّيْءَ**: شتەكەی نارد، دەگوترێ: (أَسْجَلَ البَهْمَةَ مع أمها): بەرخۆلەكەی لەتەك دایكیدا نارد بۆ كێو.

**أَسْجَلَ الكلامَ**: قسەكانی بەرەوانیو بێ ڕاوەستان ئاراستە كردن ٥ ڕێگەی پێدا قسەكانی خۆی بڵێو ڕای خۆی دەربڕێ.

**أَسْجَلَ الأمْرَ**: كارەكەی بۆ بەرەوا زانی ٥ (هذا أمر مُسْجَلٌ): كارێكە بۆ هەموو كەس ڕەوایە.

**أَسْجَلَ الناسَ**: وازی لە خەڵكەكە هێنا.

**ساجَلَهُ**: بەرامبەری وەستاو شانازی بەسەردا كرد.

**سَجَّلَ**: سیجلەكەی نووسی.

**سَجَّلَ القاضي**: قازی بڕیاری داو حوكمی كردو بڕیارەكەی لەدەفتەردا تۆمار كرد.

**سَجَّلَ العَقْدَ**: گرێبەستەكەی لەسیجلی تایبەتی فەرمی دا تۆمار كرد بۆ ئەوەی نەفەوتێ.

**سَجَّلَ الخِطابَ ونحوه في البريد**: وتارەكەی لەسیجلی تایبەتی دا تۆماركرد بۆ ئەوەی نەفەوتێ.

**سَجَّلَ عليه بكذا**: شۆرەتی پێداو ناوی بڵاو كردەوە بەوە.

**إِنْسَجَلَ**: دەگوترێ: (إِنْسَجَلَ الماءُ والدمعُ): ئاوەكە ڕژا یان فرمێسكی ڕژان.

**تساجلوا**: خۆیان هەڵنایەوەو هەركەسەیان شانازییان بەسەر بەرامبەرەكەی دا كرد.

**السَّاجولُ**: كیفی شوشەو قۆریو سوراحی شوشەو ئەو جۆرە شتانە ٥ (ك: سواجيل).

**السِّجِّيلُ**: سواڵەت، گڵی ڕەق بوو سوركراوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ﴾ ٥ دیوانو دەفتەری تۆماركردنی سزای كافرەكان ٥ شیوێكە لەناو دۆزەخ دا.

**السَّجْلُ**: دۆڵچەی گەورەی پڕئاو یان خاڵی ٥ گوانی گەورە ٥ بەشێك لەشت ٥ (ك: سجول وسجال)، دەگوترێ: (الحرب بينهم سجال): واتە شەڕ لەنێوانیان دا بەنۆرەیە، هەرجارەو سەركەوتن بۆ یەكێكیانە.

**السِّجِلُّ**: كتێبێك شتی مەبەستی تێ دا تۆمار بكرێ ٥ (ك: سجلات) ٥

هەروا بەمانا نووسەرە ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ﴾.

السِّجِيلَّةُ: لەدۆڵچە مەبەست دۆڵچەی گەورەیە.

المُسَجَّلُ: دەگوترێ: (عقد مُسَجَّلٌ و خطاب مُسَجَّلٌ): گرێبەستی تۆمارکراو لەدەفتەری فەرمی دا ◦ وتاری تۆمارکراو.

المُسْجَلُ: دەگوترێ: (فعلنا ذلك و الدهرمُسْجَلُ): ئەو نیشەمان ئەنجام داو کەس لەکەسمان نەدەترسا.

سَجَمَ الدمعُ والمطرُ سجوماً وسِجاماً وتَسْجَاماً: فرمێسك هەڵڕژان یان باران باری.

سَجَمَ العينُ الدَّمْعَ سَجْماً وسجوماً: چاوەکە فرمێسکی باراندن.

سَجَمَ عن الأمر: لەکارەکەدا تەمبەڵی کرد، خۆی لێ گرتەوە.

أسجمت السَّحَابَةُ: هەورەکە بارانەکەی بەردەوام بوو.

أسْجَمَت العينُ الدمعَ: چاوەکە فرمێسکی باراندن، دەشگوترێ: (أسْجَمَت السحابةُ الماءَ): هەورەکە بارانی باراند.

إنسَجَمَ: هەڵڕژا بەتەوژم باری.

السَّجْمُ: ئاو، فرمێسك.

السَّجوم: هەورێك زۆر باران ببارێنێ یان چاوی فرمێسکاوی ◦ ئەگەر بۆ حوشترو شتی وا بگوترێ بەمانا ئەومیە شیری زۆربێ.

المِسْجَامُ: بەمانا (السجوم)دێ ◦ (ك: مساجيم).

سَجَنَهُ سَجْناً: بەندی کرد (هو مسجون وسجين) ◦ (ك: سُجَنَاءُ وسَجْنَى)بە (هي مسجونة وسجينة) ◦ (ك: سجنى وسجائن).

سَجَنَ لسانَهُ: زمانی خۆی گرت.

سَجَنَ الهَمَّ: خەمو خەفەتەکەی خۆی ئاشکرا نەکرد شاردیەوە.

سَجَّنَهُ: بەمانا (سَجَنَهُ)دێ.

سَجَّنَ النَخلَ: چاڵی بۆ بنکی دارخورماکە هەڵکەند قوڵکەی بۆکرد بۆئەوەی ئاوی بێتە ناوەوە.

السَّاجُونُ: ئاسنی نەرم.

السَّجَّان: ئەوکەسەی سەرۆکاری بەندکراوان دەکا.

السِّجِّينُ: بەند، بەندیخانە ◦ شیوێکە لە دۆزەخ ◦ پەڕاوێکە کردارو گوفتاری تاوانبارانی ئادەمیزادو جندو کەی تێدا تۆمار کراوە ◦ نامەی کردەوەی تاوانباران ◦ شتی زۆر رەق و پتەو، دەگوترێ: (ضرب سِجِّين): لێدانێك ئەوەندە کاریگەربێ لێدراوەکە لەگەڵو گۆ بخا

٥ بەردەوامو هەمیشەیی ٥ (نخلٌ سِجين): دارخورمایەك كە بۆ بنكەكەی قوڵكە كرابێ ٥ هەروا وشەی (سِجِّين): بەمانا ئاشكرا دێ، دەگوترێ: (فعل ذلك سِجّيناً): ئەوشتەی بەئاشكرا ئەنجام دا.

**السِّجْنُ:** بەندیخانە ٥ (ك: سجون) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ﴾: قیرائەتێك هەیە بە (السَّجْنُ) دەخوێندرێتەوە.

**السَّجَنْجَلُ:** ئاوێنە ٥ ئاڵتون ٥ قاڵبە زیو ٥ زەعفەران.

**سجا الشَّيْءَ سَجْواً وسُجُوّاً:** شتەكە دامركا هێواش بوو، دەگوترێ: (سجا الليل وسجا البحرُ وسجت الريحُ).

**سجت الحلوبة للحالب:** شیردەرەكە بۆ شیر دۆشەكە ڕاوەستاو نقەی نەكرد.

**أسجى البحرُ وغيره:** بەمانا (سَجَا)دێ.

**أسجى البئر:** بیرەكە ئاوی زۆر بوو.

**أسجت الحلوبة:** شیردەرەكە شیری زۆر بوو.

**أسجى الشَّيْءَ:** شتەكەی داپۆشی.

**ساجاه:** دەستی لێ دا، دەگوترێ: (أتانا بطعام فما ساجيناه).

**سَجَّى الميتَ:** مردووەكەی داپۆشی.

**تَسَجَّى:** داپۆشرا.

**السَّاجي:** پرتە پرتكەر، نوقاو، قوچاو، دەگوترێ: (طرف ساجٍ) و (ليلة ساجية) شەوێكی ئارام نە ساردو نەگەرم نەهەوری هەیەو نەزۆر تاریكە.

**السَّجْوَاءُ:** (إمرأة سجواء): ئافرەتێكە چاو بەل، چاو نەرم ٥ (ناقة سجواء): حوشترێكە كە دەیدۆشن ئارام دەگرێ ٥ (ريح سجواء): بای نەرمو نیان ٥ (بئر سجواء): بیرێكە ئاوی زۆرە.

**السَّجِيَّةُ:** سروشتو ڕەوشت ٥ (ك: سجايا).

**سَحَبَ الشَّيْءَ سَحْباً:** شتەكەی بەسەر زەوی دا ڕاكێشا، دەگوترێ: (سحبت الريحُ الترابَ): ڕەشەباكە تەپو تۆزی هەڵسانو ڕایماڵی ٥ (سَحَبَ ذيلَهُ): داوێنی لەدوو خۆی خشاندن ٥ (سحبت الريحُ أذيالها): ڕەشەبا داوێنی ئەو ئافرەتەی هەڵدایەوە ٥ (إسْحَبْ ذيلَك على ما كان مني): داوێنت لەدیدی خۆت نەدیو بكە واتە عەفوم بكە ٥ (جاء فلان يسحبُ ذيله): فلانكەس هات بەلەنجەو لار، دەشگوترێ: (سَحَبَ وديعته): ئەمانەتیەكەی وەرگرتەوە ٥ (أسْحَبَهُ الشَّيْءَ): وای لێ كرد شتەكە وەربگرێتەوە.

إنسَحَبَ: بەسەر زەوی دا کێش کرا، ڕاکێشرا.

انسَحَبَ فلان من المجلس: لەبەر هۆیەك فلان لەمەجلیسەکە چووە دەرەوە، دەشگوترێ: (إنسَحَبَ الجيشُ من الميدان): سوپا لە بەرەی شەڕکشایەوە.

تَسحَّبَ في حق فلان: مافی فلانکەسی داگیر کردو خستیە پاڵ سامانی خۆی.

تَسحَّبَ فلان: فلانکەس نازو نوزی کرد، دەگوترێ: (هو يَتَسَحَّبُ علينا).

السَّحَابُ: هەور بارانی پێوەبێ یان نا ٥ (ك: سُحُبٌ).

السَّحابَةُ: پەڵە هەورێك ٥ (ك: سحائب).

السُّحَابَة: ئەو جۆرە ئاوەی لەبنکی گۆماوو زەلکاودا دەمێنێتەوە.

سَحْبَان: پیاوێکی هۆزی وائیلە بە زمانڕەوان‌و فسەزان بەناو بانگە.

السَّحْبَانُ: رادەر، راماڵەر.

السُّحْبَةُ: بەمانا (السَّحَابَة) دێ ٥ پەردەو داپۆشەر.

المَسْحَبُ: شوێنی سەحب کردن‌و ڕاکێشان ٥ (ك: مساحِبَ).

سَحَتَ الشيءَ سَحْتاً: شتەکەی لەبێخ دەرهێنا.

سَحَتَ رأسَهُ: سەری هەڵکەند.

سَحَتَ البَرَكَةَ: بەرەکەتەکەی برد.

سَحَتَ الشحْمَ واللَحْمَ: بەزو گۆشتەکەی قەلاشتەوە.

سَحَتَ في تجارته: سوت‌و ریبای لەبازرگانیکردنەکەی دا ئەنجام دا.

أسْحَتَ: کەوتە ناو سوت‌و ریباوە، دەگوترێ: (أسحت في تجارته): بەمانا (سَحَتَ)دێ.

أسْحَتَ الشيْءَ: شتەکەی لەبێخ دەرهێنا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَا تَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُمْ بِعَذَابٍ﴾ ٥ هەروا دەگوترێ: (أسحت رأسَه): سەری هەڵکێشا ٥ (أسحت مالَه): ماڵەکەی فەوتاند.

الأسْحَتُ: (عام أسحتُ): ساڵێکی بێ لەوەڕو کەم بژێوە ٥ (وهي سَحْتَاءُ): دەگوترێ: (سنة سحتاء): (أرض سحتاءُ) ٥ (ك: سُحْتٌ).

السُّحْتُ: شتی پیس‌و پۆخەڵ‌و ناحەلاڵ، کەئەنجامدانی یان قبوڵکردنی شەرمەزاریی بێ، وەکوو بەرتیل وەرگرتن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ﴾ ٥ هەروا بەمانا شتی کەم‌و کەمبایەخیش دێ ٥ وشەی (السُّحْتُ): ئەگەر مەبەست

ئادەمیزاد بوو بەمانا ئادەمیزادی نەوسن‌و زۆر خۆرو ورگ زلە کە هەرگیز تێرخواردنی نەبێ.

**اَلسُّحْتُ**: قوماشی کۆن‌و ڕزیو ٥ هێزی برسییەتی‌و تینوایەتی ٥ سزاو ئەشکەنجە ٥ (مال ودم سحت): ماڵێک یان خوێنێک کە بەفیڕۆ دانیان تاوان نەبێ.

**اَلسُّحْتُوتُ**: قاوتی کەم‌و چەور ٥ دەشتی نەرمان‌و گڵ نەرم ٥ قوماشی ڕزیو.

**اَلسِّحْتِیتُ**: قاوتێ چەورایی کەم بێ ٥ (ك: سحاتیت).

**اَلسِّحِیتُ**: ورگ زلی تێر نەخۆرو نەوسن.

**اَلسِّحِیتَةُ**: رادەر، رامالەر.

**المسحوت**: بەمانا (اَلسِّحیت)دێ.

**سَحَجَهُ سَحْجاً**: رنی، برینداری کرد، قەلاشتییەوە، دەگوترێ: (سَحَجَ العودَ بالمِبْرَدِ): دارەکەی گرن گرن کردو سپی کرد توێکڵی لێ کردەوە ٥ (سجحت الریحُ الأرضَ): ڕەشەباکە زەوییەکەی رادا شوێنکەی لێ کرد.

**سَحَّجَ شَعْرَهُ**: قژەکانی بەشانەدا هێنا.

**سَحَجَ فِي سیره**: بەهێواشی رۆیشت، هەروا دەگوترێ: (مَرَّ یَسْحَجُ).

**سَحَّجَهُ**: سپی کرد ٥ توێکڵی لێ کردەوە ٥ گەستی‌و شوێنکەی لێ کرد.

**إنْسَحَجَ**: سپی کرا توێکڵی لێ کرایەوە.

**تَسَحَّجَ**: سپی بوو.

**اَلسَّحُوجُ**: ئافرەتێك زۆر سوێند بخوا.

**المِسْحَاجُ**: بەمانا (اَلسَّحُوجُ) دێ ٥ شتێك زۆر شتی تر بگەزێ ٥ (ك: مساحیج).

**المِسْحَجُ**: گەزندە ٥ شتێك گەزینی زۆربێ ٥ قەڵەم دادەر ئامێرێکە داری پێ دادەدرێ ٥ (ك: مساحِجَ).

**سَحَّ الانسانُ والحیوانُ سَحاً وَسُحُوحاً**: قەڵەو بوو زۆر قەڵەو بوو ٥ (هو ساحٍ وهی ساحَّةٌ).

**سَحَّ الماءُ ونحوه**: ئاوەکە لەبەرزاییەوە هەڵڕژایە خوار بۆ نزمایی.

**سَحَّ الماءَ ونحوه سَحّاً**: ئاوەکەی لێکدان لێکدان هەڵڕژاندە خوارو پێی داکرد، دەشگوترێ: (استنشدته قصیدة فسَحَّهَا عليّ سَحّاً): داوای چامە شیعرێکم لێ کرد بێ مینجە مینج بەسەریدا خوێندمەوە.

**سَحَّ فلاناً**: لەفلانکەسی دا.

**سَحَّ**: جەڵدەی لێ دا، دەگوترێ: (سَحَّهُ مائة سوط): سەد شوڕکە داری حەددی لێ دا.

**سَحَّحَ الماءَ ونحوه**: بەمانا (سَحَّ)دێ.

إِنْسَحَّ: هەڵڕژا، ئاوەکەی بەسەردا هەڵڕژایە خوار.

تَسَحَّحَ: بەمانا (سَحَّحَ)دێ.

السَّحَّاءُ: شتێك بەردەوام بەرێژنە ببارێ، دەگوترێ: (يَمِينه سَحَّاءٌ): دەستی بەخشندەیەو زۆر دەبەخشێ ٥ (غارة سَحَّاءُ): هەڵمەتێکە گشتیو پەرتەوازەیە.

السَّحَّاحَةُ: لەزانیاری کیمیادا لولەیەکە لەشوشە دەرەجە دەرەجەیە بۆ تەحلیلی کیمیائی بەکاردەهێندرێ.

سَحَرَ فلان: فلانکەس پارشێوی کرد ٥ کەوتە کاتی پارشێوەوە.

سَحَرَ عن الشَّئِ سَحْراً: لەشتەکە دوور کەوتەوە.

سَحَرَ فلاناً بالشئ: بەشتەکە سیحری لەفلان کرد.

سَحَرَ بالطعام: بەخۆراك تێری کرد، بژێوی پێ دا.

سَحَرَ بالشراب: خێرا خێرا ئاوو شەرابی دایە بیخواتەوە.

سَحَرَ الشَّئَ عن وجهه: شتەکەی لەڕێ لادا، دەگوترێ: (سَحَرَهُ عن الشَّئِ): فلانی لەشتەکە لادا.

سَحَرَهُ بكذا: ئالودەی کردو هۆشی برد، دەگوترێ: (سَحَرَتْهُ بعينها) و(سَحَرَه بكلامه).

سَحَرَ فلاناً: گەردنی هەنگاوت، زەبری کوشندەی لەگەروی دا.

سَحَرَ الشَّئَ: شتەکەی تێك داو بێ کەڵکی کرد.

سَحَرَ المطرُ الأرضَ: بارانەکە لەبەر زۆری زەویو زارەکەی تێك دا ٥ کشتوکاڵەکەی خراپ کرد.

سَحِرَ سَحْراً: بەیانی زوو دەرچوو، سەر لەبەیانی زوو دەستی پێ کرد، جۆڵەمەی پچڕا.

أسْحَرَ القومُ: خەڵکەکە کەوتنە وەختی پارشێوەوە یان لەکاتی پارشێوکردن سەفەریان کرد.

سَحَّرَ فلاناً: جادوی لەفلانکەس کردو سیحری نیشان دا هەتا وای لێ کرد عەقڵو هۆشی تێك داو شێتی کرد ٥ زەمی پارشێوی خستە بەردەم فلانکەس.

إسْتَحَرَّ القومُ: خەڵکەکە پارشێویان کرد.

إسْتَحَرَّ الطائرُ: باڵندەکە دەمەو بەیان خوێندی.

تَسَحَّرَ: زەمی پارشێوی خوارد، دەگوترێ: (تَسَحَّرَ السحورَ): نانی پارشێوی خوارد ٥ پارشێوی کرد.

السُّحَارَةُ: هەرشتێك پەیوەندی بەگەرووەوە هەبێ وەکوو دڵو ڕیخۆڵە.

**اَلسِّحْرُ**: سيحرو جادوبازىو چاو بەستى ◦ هەروا روداوو دياردەيەك هۆكارەكەى نەزانىدرێو بەپێچەوانەى واقيع بێتە بەرمەوداى خەياڵ.

**اَلسُّحْرُ**: بەمانا (السَّحَّارة)دێ، دەگوترێ: (انفتخ سُحْرُهُ): ڕەگى لاملى لێ فش بوونو تورە بوو، لەئەندازەى خۆى دەرچوو، دەگوترێ: (إنفتخَ سُحْرُهُ): دڵى پڕ بوو لەترسو ڕەنگى زەرد بوو ◦ (انقطع منه سُحْرِي): لێى نائومێد بووم ◦ (ك: أسحار وسحور).

**اَلسَّحَرُ والسُّحْرُ**: كۆتايى شەو (پێش كازيوە) ◦ لايەكى شت، ئەملاو ئەولاى ◦ سپياييەكە سەرتاريكى دەكەوێ كەپێى دەگوترێ: فەجر، بەيان ◦ فەجرى كاذيبو فەجرى صادق.

**اَلسُّحْرَةُ**: كۆتايى شەو، شەبەقى بەيان، سپياييەتييەكە دەكەوێتە سەرتاريكايى.

**اَلسَّحَرِيَّةُ، والسَّحَرِي**: كۆتايى شەو، بەرەبەيان.

**اَلسَّوْحَرُ**: خواردەمەنى پارشێوو شلەمەنى كەپارشێو دەخورێتەوە.

**اَلسَّوْحَرُ**: درەختى صەفصاف.

**اَلْمُسَاحِرُ**: دەگوترێ: (انتَفَخَتْ مساحِرُهُ): لەئەندازەى خۆى دەرچوو بەئەندازەى خۆى پێى ڕانەكێشا.

**اَلْمَسْحُورَةُ مِن الأرض**: ئەو زەوييەى هيچى لێ نەڕوێ ◦ زەوى سوتەمەڕۆو ڕوتەن ◦ هەروا بەناژەڵى كەم شيريش دەگوترێ.

**تَسَحْسَحَ الماءُ ونحوه**: ئاوەكە ڕۆيى ڕەوان بوو.

**اَلسَّحْسَاحُ**: بارانى بەڕێژنەو بەخوڕەم.

**اَلسَّحْسَاحَةُ**: (عين سَحْسَاحَةٌ): چاوێكى فرمێسك ڕێژە ◦ هەميشە فرمێسك دەبارێنێ ◦ بارانى بەخوڕەم ڕێژنە ئاسا.

**اَلسَّحْسَحَةُ**: حەوشەى خانوو، بەردەرگاى ماڵ.

**سَحَطَهُ سَحْطاً**: خێرا سەرى بڕى ملى قت كرد.

**سَحَطَ الطعامُ فلاناً**: خواردنەكە لەبينى فلانكەس گيرا.

**سَحَطَ الشرابَ**: شەرابەكەى تێكەڵ بەئاو كرد.

**إنْسَحَطَ الشَّيْئُ مِن يده**: شتەكەى لەدەست كەوتە خوارو ڕزگارى بوو.

**انْسَحَطَ فلان عن النخلة**: فلان لەدارخورماكە هاتە خوار.

**اَلْمَسْحَطُ**: گەرو ◦ (ك: مساحط).

**سَحَفَ** الشَّئَ سَحْفاً: شتەکەی سپی کرد توێکڵی لێ کردەوە، دەگوترێ: (سَحَفَ الشَحْمَ عن ظهر الشاة): بەزی پشتی مەڕەکەی قەڵاشتەوە.

**سَحَفَ** الشَّعْرَ عن الجلد: مووەکانی لەپێستەکە کردەوەو سپی کرد هیچی پێوە نەهێشت.

**سَحَفَ** الله فلاناً: خودا فلانکەسی توشی سیل کرد.

**اسحفت** الریحُ السَّحَابَ: بایەکە هەورەکەی ڕادا.

**أَسْحَفَ** فلانٌ: فلانکەس بەزی فرۆشت.

**السُّحَافُ**: سیل.

**السَّحْفَةُ**: ئەو بەزو پیوەی بەموراغەی پشتەوە هەیەو نووساوە بەپشتەوە لەناو شانەوە تا دەگاتە نیهایەتی پشت (کلیّجە) ٥ (ك: سَحْفٌ وسَحَاف).

**السَّحَفَةُ**: (رَجُلٌ سَحَفَة): پیاوێکی سەرتاشراو.

**السَّحُوف**: قەڵەوێك کەبەزی سەرپشتی بقەڵشێندرێتەوە ٥ دەنگی ئاش، خرە خری ئاش ٥ خوشەی شیردۆشین لەکاتی دۆشین دا.

**السَّحِيفُ**: کرەکری ئاش.

**السَّحِيفَةُ**: بەمانا (السَّحْفَةُ): دێ ٥ بارانی بەخوڕەو ڕێژنە کەدەبێتە هۆی لافاو هەڵسانو هەموو شتێك لەمرێرەوی خۆی دا ڕادەدا ٥ (ك: سحائف).

**المَسْحَفُ**: (مَسْحَفُ الحية): شوێنکەی مار لەسەر زەوی کەدەڕوا خێشکە دروست دەکا ٥ (ك: مساحِفَ).

**المَسْحَقَةُ**: زەوییەك بەتەنکی گیاو گزی لێ بڕوێ ٥ (ك: مَسَاحِف).

**المِسْحَقَةُ**: ئامێرێکە (کێردێکە) گۆشتی پێ قاش دەکرێ ٥ (ك: مَسَاحِفَ).

**سَحَقَهُ** سَحْقاً: وردو خاشی کرد، دەگوترێ: (سَحَقَ الدَّوَاءَ): دەرمانەکەی کوتاو وردی کرد.

**سَحَقَ** الشَّئَ: شتەکەی تەفرو تونا کرد لەناوی برد، دەگوترێ: (سَحَقَ فلاناً، وسَحَقَ الحَشَرَةَ وسَحَقَ الثوبَ).

**سَحَقَ** رأسَهُ: سەری تاشی.

**سَحَقَت** العينُ الدَّمْعَ: چاو فرمێسکی هەڵوەراندن.

**سَحَقَ** اللهُ فلاناً: خودا فلانی دوور خستەوە.

**سَحِقَ** سُحْقاً: زۆر دووری خستەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَسُحْقًا لِّأَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ ٥ (هو سحيق وهي سحيقة).

**سَحُقَ** الشَّئُ سَحَاقَةً وسُحُوقَةً: شتەکە ڕزیو بێ کەڵك بوو.

**سَحُقَ** الشَّيْءُ سُحقاً: زۆر دووركەوتەوە ٥ (فهو سحيق) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَتَخطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾.

**سَحُقَت النَّخْلَةُ**: دارخورماكە درێژ بوو، بەرز بۆوە.

**أسْحَقَ**: ڕزی، دەگوترێ: (أسْحَقَ الثوبُ): قوماشەكە ڕزی، زۆر دووركەوتەوە ٥ (أسْحَقَ الضرعُ): گوانەكە وشكی كرد شیری تێدا نەما.

**أسْحَقَ اللهُ فلاناً**: خودا فلانی دوور خستەوە.

**أنْسَحَقَ الدَّوَاءُ**: دەرمانەكە وردكرا، كوترا.

**أنْسَحَقَ الثوب**: قوماشەكە ڕزی.

**انْسَحَقَ فلان**: فلانكەس دوور كەوتەوە.

**انْسَحَقَ الدَمْعُ**: فرمێسكەكە هەڵوەری.

**انْسَحَقَ الشَّيْءُ**: شتەكە پان و پۆڕ بوو.

**السُّحْقُ**: قوماشی ڕزیو ٥ شوێنكەی برینی جەستەی حوشتر كەسپی دەبێ ٥ تەنكە هەور ٥ (ك: سُحُوق).

**السُّحْقُ**: شتی زۆر دوور، دەگوترێ: (سُحقاً لـه وسُحقاً سُحقاً): وەكوو دووعا لێكردن دەگوترێ ٥ بۆ زێدە ڕۆیی لەو مانایەدا دەگوترێ: (سُحق سَاحِق).

**السَّحُوقُ**: درێژ، دەگوترێ: (عود سَحُوق ونخلة سَحُوق) ٥ (إمْرأةٌ سَحُوق): ئافرەتێكی درێژە ٥ (ك: سُحُق).

**السَّحِيقَة**: بارانی بەرێژنە كە دەبێتە هۆی لافاو هەڵسان ٥ (ك: سَحَائِق).

**الْمَسْحُوق**: كوتراوو ورد كراو ٥ (ك: مساحيق).

**سَحَلَت العينُ سَحْلاً وسحولاً**: چاو فرمێسكی ڕژاند، دەگوترێ: (سحلت السماءُ): ئاسمان بارانی باراند.

**سَحَلَ** الحمارُ سَحيلاً وسُحَالاً: گوێدرێژەكە زەڕی.

**سَحَلَ** الحَبْلَ سَحْلاً: یەكجار حەبلەكەی بادا.

**سَحَلَ** الدراهِمَ: درەمەكانی بەپوچ و تەزویر لەقەڵەم دا.

**سَحَلَ** فلاناً كذا درهماً: پەلەی كرد لەپارە پێدانی فلانكەس ٥ بەخێرایی ئەوەندە دیرهەمی بۆ بژارد.

**سَحَلَ** السورة والقصيدة: سورەتەكە یان چامە شیعرییەكەی بێ ڕاوەستان و پسانەوە خوێندەوە.

**سَحَلَ** الشَّيْءَ: شتەكەی پان كردەوە، پلیشاندییەوە، وردو خاشی كرد.

**سَحَلَ** الذهَبَ والفِضَةَ: ئاڵتون و زیوەكەی

دوای لەبۆتەدانو قاڵ کردن سارد کردنەوە ٥ هەروا وشەی (سَحَلَ): بەمانا توێکڵ لێ کردنەوە داتاشینو ڕاستەو پاستە کردنە، دەشکوترێ: (سحلت الريحُ الأرضَ): ڕەشەبایەکە زەوییەکەی ماڵیو تەپو تۆزەکەی لەسەر ڕادا.

**سَحَلَ** فلاناً بلسانه: جنێوی بەفلانکەس داو سەرزەنشتی کرد.

**أسْحَلَ الحَبْلَ**: یەکجار حەبلەکەی بادا.

**سَاحَلُوا**: هاتنە قەراخی دەریا ٥ یان پێیدا ڕۆیشتن.

**ساحلَ فلاناً مساحَلةً وسِحالاً**: سەرزەنشتی فلانکەسی کرد، جنێوی پێدا.

**إنسَحَلَ**: توێکڵی لی بۆوە، سپی بوو، خێرا ڕۆیی، دەگوترێ: (انسحلت الناقة): حوشترەکە خێرا ڕۆیی.

**إنسَحَلَ الخطيب**: وتار بێژەکە بەخێرایی وتاری دا.

**الإسْحِلُ**: درەختێکە لقەکانی بۆ سیواک پێ کردن بەکاردێ دەشوبهێتە دار حەیزەران (دارگەز) بەزۆری لەدەشتو سارادا دەڕوێ، سروشتی درەختی ئیراکی هەیەو لەوناوچانە دەڕوێ کەئەوی لێ دەڕوێ.

**الساحِلُ**: قەراخ دەریا ٥ ئەو شوێنانەی ئاوی دەریا جار بەجار بەهۆی شەپۆلو بەرز بوونەوە دەیگاتێو جاری واش هەیە نایگاتێ.

**السِّحالُ**: لغاو.

**السُّحَالَةُ**: وردەی ئاڵتونو زیوو ئەوشتانە ٥ سۆی ئاردی گەنمو جۆ ٥ (سُحالة القوم): خوێڕیو هەتیو مچەی قەومو هۆز.

**السَّحْلُ**: قوماشێکە ڕیسەکەی بەدولا بانەدرێ ٥ حەبلی یەك هەودا ٥ قوماشی سپی تەنك ٥ (ك: أسحالٌ وسُحولٌ وسُحُلٌ).

**السَّحيلُ**: قوماشێکە، ڕیسەکە نەبڕێتەوە دولانەکرێتەوە یەك هەودابێ.

**المُسَحَّلَةُ**: سەرە تەشی.

**المِسْحَلُ**: لغاو ٥ ئەڵقەیەکی دوانی تێکخراون بەملاو بەولای لغاوەوەیە ٥ لایەکی ڕیش ٥ ئامێری نەحتکردن.

**مِسْحَلُ اللِسان**: دەگوترێ: (ركب الخطيب مِسْحَلَهُ): وتاربێژەکە بەردەوام بوو لەوتاردانەکەی دا ٥ کارتیخ ٥ بێژینگ ٥ (ك: مساحل).

**المَسْحُولُ**: شتی بچوکی بێ نرخ ٥ شوێنی دەشتو بەرفراوان.

**سَحِمَ** سَحْماً وسُحاماً وسحمةً: ڕەش بوو، ڕەش داگیرسا ٥ (فهو أسْحَمُ وهي سَحماءُ) ٥ (ك: سُحْمٌ).

**إسْحَمَتِ السماءُ**: ئاسمان بارانی باراند.

**سَحَّمَ الشَّيْئَ**: شتەکەی ڕەش کرد.

**الإسْحِمَانُ**: هەرشتێك ڕەش بێ.

**السُّحُمُ**: چەکوچی ئاسنگەر.

**السَّحَمَةُ**: پارچەیەکی گەورەو خڕی ئاسن ٥ (ك: سَحَمٌ).

**سَحَنَ الشَّيْئَ سَحْناً**: شتەکەی بچوك کردەوە، باریکی کرد.

**سَحَنَ الخَشَبَةَ**: وردە وردە دارەکەی والێ کرد نەرم بێو دابێ.

**سَاحَنَهُ**: بەشێوەی جوان بەرەو پیری چوو.

**سَاحَنَهُ الشَّيْئَ**: لەشتەکەدا تێکەڵاوی بوو.

**السَّحْنَاءُ**: شێوەو ڕوخسار ٥ ڕەنگ ٥ حاڵو وەزع ٥ پێستی نەرم ٥ نازو نیعمەت.

**السَّحْنُ** (يوم سَحْنٌ): ڕۆژی کۆبونەوەی جەماوەری زۆرە.

**السِّحْنُ**:پەناو ژێر باڵ ٥ دەگوترێ:(هو في سِحْنِهِ) ئەو لەژێر دەسەڵاتی ئەودایەو لەژێر باڵی ئەودا جێگای بۆتەوە.

**السَّحْنَةُ**: بەمانا (السَّحْنَاءُ) دێ.

**المِسْحَنُ**: شتێکە داری پێ تیف تیفە دەدرێ تاوای لێ دێ لوس دەبێ ٥ وەکو برمەند وایە ٥ (ك: مساحن).

**سَحَا الشَّيْئَ سَحْواً**: شتەکەی ڕاداو ڕیمالی ٥ توێکڵی لێ کردەوە ٥ دەگوترێ: (سحا التراب عن وجه الأرض) گڵەکەی ڕامالی ٥ (سَحَا الشَحْمَ) بەزەکەی لێ کردەوە ٥ (سحا القرطاسَ) کاغەزەکەی پاك کردەوە نووسینەکەی سەری کوژاندەوە لای برد ٥ (سَحَا من القرطاس) هەندێکی لە کاغەزەکە کڕاند (سَحَا الشَّعْرَ) مووەکانی تاشین.

**سَحَا الكتابَ**: کتێبەکەی بە توێکڵی درەختو شتی وا بەست.

**سَحَا الطينُ سَحْياً**: قوڕەکەی ڕادا، کڕاندی.

**أسْحَى الكتابَ**: کتێبەکەی بە توێکڵە دارو شتی وا بەست.

**سَحَّاه**: بەمانا (سَحَا) دێ.

**إسْتَحَى الشَّيْئَ**: توێکڵی لە شتەکە کردەوە، سپی کرد.

**اسْتَحَى الشَّعْرَ**: مووەکانی تاشین.

**إنْسَحَى**: توێکڵەکەی لێ کرایەوە پاك کرا، سپی کرا.

**الأُسْحُوَانُ**: درێژو جوان ٥ زۆر خۆر.

**الأسْحِيَةُ**: هەر توێکڵێك بەسەر گۆشتەوە بێ کە گۆشتەکە بەسەر

ئێـسقان یـان دەمــارەوە بـێ ٥ (ك: أساحي).

السَّاحِية: بـارانی بـە خـورەمو ڕێژنـە ٥ کــە خـــشتو خــۆڵی ڕوی زەوی دەشــواتەوە ٥ دەشــگوترێ: (ســیل ســـاحیة) لافاوێــکی شــت ڕادەرەو هەموو شتێـك لـول دەدا ٥ (ت)یەکە بۆ موبالەغەیە.

أَلــسَّحَا: لــە هــەموو شتێــکدا بــە توێکڵەکەی دەگوترێ.

الــسَّحَاءُ: توێــکڵی هــەموو شتێــك ٥ تاکەکــەی (سِـــحَاءَة وسِــــحَايَة) دەگوترێ: (ما في السماء سـحاءة مـن الــسحاب) چڵــکە هەورێــك تـۆزە هەورێك بە ئاسمانەوە نیە.

السِّحَايَةُ: پێـشەی تیـف تیفـەدانی دارو لوســـکردنی توێـــکڵ دامــاڵینی ٥ پەردەی دەماغ.

السَّحَاءُ: دروستکەری بێڵو خاکەنازو شتی وا کە شتی پێ ڕابدرێ.

أَلمِسْحَاةُ: هەر ئامێرێك شتی پێ داماڵی، شتی پێ ڕابدەی ٥ (ك: مساح).

السِّخَابُ: ملوانکەو گەردن بەند کە لە قـەرەنفولو میخـەك دروسـتکرابێ لوئلوئـو جـەواهێراتو زێـڕو زیـوی تێدانـەبێ ٥ وەکـوو میخـەك بەنـد ٥ دەگوترێ: (وجدته مـارث الـسّخاب) بینـیم وەکـوو منـداڵ وابـوو هیـچی نەدەزانی نەفامو کەودەن.

السُّخْبُرُ: درەختێکە کە بەرز دەبێتەوە لقەکانی دادێـنو شۆڕدەبنەوە، مـارو مـۆر بنکـەکانیان دەکەنـە نـشینگەی خۆیـان ٥ دەگـوترێ: (رکــب فــلان السُّخْبَرَ) فلان غەدرو زوڵمی کردوە.

الــسُّخْتُ: بـەهێزو بـەتوانا ٥ دەگـوترێ: (حـرُّ سَـخْتٌ) گـەرمای بـەتین (بـرد سخت) سەرمای بەتین هەروا بەمانا شتی ڕەقو پتەو تەنك دێ.

الــسِّخْتِيت: بـەمانا (الـسُّخْتُ) دێ ٥ شتی باریكو وردو سپی تەواو یەك ڕەنگ.

السِّخْتِيَانُ: پێستی بزن بە دەباغکراوی.

أَلمَسْخوت: شتی لوسو پوس.

سَخَّت الجَرادَةُ سَخاً: کوللەکە کلکی لـە زەوی چەقاند.

سَخَّ في الـسير والحَفْرِ: زۆر ڕۆیـشت، زۆری قوڵ کرد.

الــسَّخاخُ: زەوی نەرمــەڵان کـە چـەوی تێدا نەبێ.

سَـخِدَ ورقُ الـشجر: گـەڵای درەختەکـە شــەوتماوی بــوو پەڵــکە گــەڵاکانی کەوتنە سەر یەك.

**السَّخْدُ**: گەرم.

**السُّخْدُ**: ئاوێکی زەردو خەستە لەگەڵ منداڵبوون دێتەدەر پارچەیەکە وەکوو جەرگو سی ٥ تەنکە هەور ٥ زەردی دەمو چاو، پارچەیەکە بە دیواری ناو ڕەحمەوە دەنووسێ ٥ ئەو ریخۆڵەیەی لە ناوکەوە زاروکەکە بژیوی لێ وەردەگرێ بەو پارچەوە پەیوەستە.

**السَّخْوَدُ**: (شباب سَخْوَدُ) گەنجێکی نەرمو شلە.

**اَلْمُسَخَّدُ**: لەش داهێزراو دڵ شکاوو خەمبار.

**سَخرتِ السَّفينةُ سَخراً**: کەشتییەکە رەهابوو بە ویستی کەشتییەوانەکە بایەکە هەڵی کردبوو.

**سَخَّرَ فلاناً سُخرِيّاً**: تەکلیفی لە فلان کرد بۆ شتێك کە نەیویست ئەنجامی بدا پێی ناخۆش بوو بیکاو بە زۆر پێی کرد.

**سَخِرَ منه وبه: سَخراً وسُخراً وسُخرِيَّةً**: گاڵتەی پێکرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ﴾.

**سَخَّرَهُ**: داوای شتێکی لێ کرد لە وزەیدا نەبوو بیکاو بە زۆر پێی کرد ٥ بێگاری پێکرد ؛ کاری پێ کردو کرێی نەدایە ٥ دەگوترێ: (سَخَّرَ اللهُ الإبلَ) پەروەردگار حوشتری ژێربار کردووە بۆ ئێوە سوودی لێ وەردەگرن.

**سَخَّرَهُ عليه**: باڵا دەستی کرد بەسەریدا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ﴾.

**تَسَخَّرَهُ**: ئەرکێکی خستە سەرو کرێی نەدایە بێگاری پێ کرد.

**إِسْتَسْخَرَ منه**: بەمانا (سَخِرَ) دێ.

**السُّخْرَةُ**: بێگار (سۆغرە) بەبێ کرێ پێدان کار بە خەڵك بکەی ٥ دەگوترێ: (هم سُخْرَة) ئەوانە بێگار پێ کراون.

**اَلْمَسْخَرَةُ**: هەرشتێك ببێتە هۆی گاڵتە پێکردن ٥ (ك: مَسَاخِرَ).

**السُّخْرِيَةُ والسُّخْرِيَّةُ**: بەمانا گاڵتە پێکردنە.

**سَخِطَهُ وسَخِطَ عليهِ سَخطاً وسُخطاً**: رقی لێبوو ناخۆشی ویست لێی رازی نەبوو.

**اَسْخَطَهُ**: رقی هەڵساند.

**تَسَخَّطَهُ**: لێی رازی نەبوو.

**تَسَخَّطَ العطاءَ**: بەخششەکەی بەکەم زانی، بە ویستی ئەو نەبوو ٥ کەمی پێداو پێی ناخۆش بوو.

**سَخُفَ الشَّيْءُ سُخفاً وسُخْفَةً وسَخَافَةً**: تەنك و لاواز بوو ٥ دەگوترێ:

(سَخُفَ الثوبُ) قوماشەکە تەنك‌و زەعیف بوو ٥ هەروا دەگوترێ: (سَخُفَ العقلُ) کاڵفام‌و بێ عەقڵ بوو ٥ (هو سخیف وهي سخیفة) دەشگوترێ: (رأى سخیف) رایەکی لاوازە (ثوب سخیف) قوماشێکی تەنکە.

سَخُفَهُ: بێ عەقڵی کرد بەبێ عەقڵی لە قەڵەمدا.

سَخَفَ الجوع فلاناً: برسیەتی فلانی لاوازو بێ تین کرد.

ألسُخْفَةُ: (سُخْفَةُ الجوع) ئەو بێ هێزیو لاوازییەی بەهۆی برسییەتیەوە پەیدا دەبێ.

سَخَلَ الشَّئَ سَخلاً: بە فێڵ شتەکەی گرت.

أسْخَلَ الأمْرَ: کارەکەی دواخست.

سَخَلَتِ النَخْلَةُ: دارخورماکە خورماکانی لاواز بوون، یان پێش گەیشتن وەراندنی.

سَخَّلَ النَّخْلَةَ: خورماکانی هەڵرشتن، بە نەکامڵی وەراندنی.

السُخالَةُ: شتی پڕو پوچ‌و بێ کەڵك.

السُّخَلُ: خورما ئەگەر ناوکەکەی رەق نەبوو بێ.

ألسَّخْلُ: هەرشتێك کامڵ نەبوو بێ ٥ لاوازو بێ نرخ.

السَّخْلَةُ: بەرخۆڵەو کارژیلە دوای ئەوەی لە دایك دەبن ٥ (ك: سَخلٌ وسِخالٌ وسُخْلان).

سَخَمَ اللَّحْمَ: گۆشتەکە بۆگەنی کرد.

سَخَّمَ فلاناً بصدره: رقی فلانکەسی هەڵساند.

سَخَّمَ اللهُ وَجْهَهُ: خودا روی رەش کرد.

تَسَخَّمَ علیه: رق‌و کینەی پەیدا کرد.

الأسْخَمُ: رەش (هي سخماءُ) ئەو ئافرەتە رەشە.

السُّخام: رەشایی بنکی دیزەو مەنجەڵ ٥ خەڵوز ٥ دەگوترێ: (لیل سَخامٌ) شەوێکی تاریکە.

السُّخامِيّ: رەش ٥ دەگوترێ: (لیل سُخاميّ).

السُّخْمُ: رەش، رەشایی ٥ تاریکی.

السُّخْمَةُ: رەشایی ٥ رق‌و کینەو تورە بوون.

السَّخیمَةُ: رق‌و کینە ٥ دەگوترێ: (سَلَلْتُ سَخیمتَهُ باللطف والرضی) رق‌و کینەی ئەوم بەهێدی‌و ئارامی‌و رازیکردن لەناو برد.

ألمُسَخَّمُ: خاوەن رق‌و کینە ٥ تورەو تەوسن.

سَخَنَ سُخناً وسُخُونةً: گەرم بوو.

سَخِنَ: بەمانا (سَخَنَ) دێ.

سَخِنت العینُ: چاو فێنك نەبووە (هو سَخِین وهي سَخِینةٌ).

**سَخُنَ** سخونةً وَسَخانة: بەمانا (سَخَنَ) دێ.
**أسْخَنَهُ**: گەرمی کرد.
**أسْخَنَ اللهُ عينه وبعينه**: خودا توشی بەلایەکی کرد گریانی بێ ٥ لەم روەوە کە فرمێسکی ناخۆشی گەرمن ٥ بە پێچەوانەوە دەگوترێ: (أقر الله عينه) خودا فێنکایی بخاتە چاویەوە ؛ توشی خۆشی ببێ.
**سَخَّنَهُ**: وای لێکرد گەرم ببێ.
**التَّسَاخِين**: مەنجەڵو ئامێری ئاو تێدا گەرم کردن ٥ هەروا ناوە بۆ شتێك وەکوو تەیلەسان وایە.
**السَّخَّانُ**: بۆیلەر (ئاو گەرمکەر) ٥ هەر ئامێرێك ئاوی ئاو بۆری‌و شتی وا گەرم بکا.
**السِّخِينُ**: گەرمکەر ٥ لێدانی گەرم‌و بەهێزو ئازار هێنەر ٥ دەستەدوی هەوجاڕ، شوێنی دەست پێگرتنی ئامێری کێڵان‌و وەرد کردنەوە ٥ بێڵ‌و خاکەناز ٥ کێردی قەساب (ك: سَخاخين).
**السُّخْنُ**: گەرم (گەرمایی).
**السُّخْنَةُ**: گەرمی ٥ تاوو نەخۆشی ٥ زێدە گەرمایی ئازار ٥ دەگوترێ: (عليك بالأمر عند سُخْنَتِهِ) لە سەرەتاوە بە جیدی کار دەست پێ بکە ٥ دەگوترێ: ئاسن تا گەرمە دەتوانی بە ویستی خۆت بەکاری بێنی کە سارد بووە هیچت بۆ لەگەڵ ناکرێ ٥ (سُخْنَةُ العين) پێچەوانەی (قرة العين).
**السُّخْنَةُ**: بەمانا (السُّخْنَةُ) دێ.
**السُّخُون من المرق**: شۆربای گەرم.
**السُّخُونَةُ**: (سُخونة النفاس): بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی جەستەی ئافرەتە دوای ئەوەی منداڵی دەبێ.
**السَّخِينُ** (ضرب سَخِينٌ): لێدانی بە ئازارو ئەشکەنجە.
**السَّخِينةُ**: خواردەمەنییەکە لە ئارد دروست دەکرێ نەزۆر شل نەزۆر توند بە کوردی پێی دەگوترێ: پەڵوو ٥ خۆراکی گەرم.
**المِسْخَنَةُ**: دیزەیەکە خواردنی تێدا گەرم دەکرێ ٥ (ك: مَسَاخِنَ).
**سَخَا** سَخَاءً: بەخشی، سەخاوەتی نواند دەگوترێ: (سخابه، فهو ساخٍ، هي ساخية).
**سخا** فلان: فلانکەس لە جوڵە کەوت.
**سَخُوَ** سَخَاوَةً: بوو بە ئادەمیزادێکی بەخشندە (هو سَخِيٌّ) (ك: أسخِياء) ٥ (وهي سَخِيّة) (ك: سَخَايا).
**سَخِيَ** سَخاً: بەخشندەو دەست‌و دڵ فراوان بوو.
**سَخِيَ نَفْسُهُ عن الشَّئ**: نەفسی لە شتەکە بێزراو وازی لێ هێنا.

**أسخى النارَ**: رێگای دەرچوونی بۆ ئاگرەکە کردەوە نەیهێشت چیدی لەژێر مەنجەڵەکەدا پەنگ بخواتەوە ٥ دەشگوترێ: (أسخى القِدرَ) دوکەڵکێشی بۆ مەنجەڵەکە دامەزراند بۆئەوەی بڵێسەی ئاگرەکە بەملاو ئەولای مەنجەڵەکەدا دەربچێ.

**سَخَى نَفْسَهُ** وبنفسه عن كذا: نەفسی خۆی هەڵنا بۆ وازهێنان لەوشتە.

**سَخَى النارَ**: بەمانا (أسخى النار) دێ.

**تَسَخَّى على أصحابه**: بە زۆرە ملێو تەکەللوف وای نیشانی هاوەڵانی دا کە سەخی سروشتە.

**السَّخاوِية**: زەوی نەرمەڵان یان پانو پۆڕ ٥ (ك: سخاوي).

**السَّخواء من الأرض**: بەمانا (السَّخاوية) دێ ٥ (ك: سَخاوى).

**سَدَخَتْ فلانة سَدْخاً**: فلان ئافرەت لای مێردەکەی بەختەوەر بوو لە شانسو بەختی خۆی رازی بوو ٥ منداڵی زۆری لێ بوون.

**سَدَحَ بالمكان**: لەوشوێنە مایەوە.

**سَدَحَ الشَّيءَ**: شتەکەی لەسەر زەوی بڵاو کردەوە.

**سَدَحَ فلاناً**: فلانکەسی بە زەویدا داو بەرەورو (رەپەورو) رایکێشا ٥ یان لەسەر پشتی رایکێشا.

**سَدَحَ الناقةَ**: حوشترەکەی پیخ دا ٥ یان لەسەر زەوی رایکێشاو سەری بڕی.

**السَّادحُ**: پیاوێکی بەزرووێتە نەزۆك نیە.

**السَّادِحة**: هەوری پڕو رەشو تاریك ٥ (ك: سوادح).

**سَدَّ الشَّيءُ** سداداً وسدوداً: شتەکە راستو رێكو پێك بوو.

**سَدَّ السَّهْمُ**: وسَدَّ فلان: لە قسەو کردەوەیدا پێکای.

**سَدَّ قوله وفعله**: گوفتارو کردەوەی لە جێی خۆیدا بوو.

**سَدَّ الشَّيءَ**: کونو کەلێنی شتەکەی پڕکردنەوە.

**سَدَّ القناةَ**: پردۆکەی بەسەر جۆگاکەدا رابەست.

**سَدَّ عليه باب الكلام**: قسەی لێ قەدەغە کرد.

**سَدَّ الشَّيءَ سَدّاً**: کونو کەلەبەری پڕکردنەوە ٥ شتەکەی پێکا.

**سَدَّدَ السهمَ الى الصيد**: تیرەکەی ئاراستەی نێچیرەکە کرد.

**سدّد الله فلاناً**: خودا فلانکەسی خستە سەر رێگای راستو هیدایەتی دا.

**سَدَّدَ صاحِبَهُ**: ئامۆژگاری هاوەڵەکەی کردو رێگای باشی نیشاندا.

سَدَّ مالَهُ: بە باشى ماڵو سامانەکەى خستە گەڕ.

سَـــدَّد عليـــه القـــولَ: قـــسەکەى هەڵوەشاندەوە.

إستَدَّ: ڕێكوپێك بەردەوام بوو لەسەر کارى خۆى.

إنْسَدَّ: گیراو بەربەستى بۆ پەیدا بوو.

تَسَدَّدَ: ڕێكوپێك بەردەوام بوو لەسەر کارەکانى.

الإنسداد التـاجي: گیرانـى شـا ڕەگـى تاجییە بەجەڵتەى خوێنى.

السّادُّ: دەگوترێ: (هو سادّ القَامَـةِ) ئـەو پیاوە باڵاى ڕێكو شوشە.

الـسـادة: چاوێـــك کراوەبـــێو بـــاش نەبینێ.

السَّدادُ: بەردەوام بـوون لەسـەرى کـارى باشو هەنگاو نـان بـەرەو مەبەسـتى پـیرۆز ٥ گوفتـارو کـردارى حـەقو ڕاست.

السِّدادُ: ئەوەى کونو کەلەبەرێـکى پـێ بگیرێ ٥ دەگوترێ

سِداد القارورة: تۆپەوانەى گوزەو دیزەو کوڵینە.

سِـداد مـن عَـوَز وسـداد العـیش: دابـین کردنى پێداویستى ژیان ٥ هەروا نـاوە بـۆ جەڵتـەى خـوێنى یـان کۆمەڵێـك بەکتریا یان قەبارەیـەکى غـەریب کـە ڕێگاى هاتوچۆى خوێن بگرێ.

سِـــداد الثـــغر: ئـــەو پێـــشمەرگەو سەربازانەى لەسەر سنوورى وڵات لە سەنگەردان ٥ (ك: أسِدَّة).

الـــسُّدَادُ: نەخۆشـــییەکە کونـــە لـــوت دەگرێو ناهێڵێ هەوا لەوێوە بـچێتە نـاو سـییەکانەوە ٥ هـەروا نـاوە بـۆ هەرشتێـك لـەناو جەسـتەدا ڕێ لـە هاتوچۆى شتێـکى تر بگرێ.

ألسَّدُّ: بەردەو لەمپەڕ لەنێوان دوشتا ٥ دروسـتکردنى بەربەسـتو لەمپـەڕى پتـەو لـە ڕێـڕەوى ڕوبـاردا بۆئـەوەى بەگوێرەى پێویست ئاو گل بداتەوەو کۆ بکاتەوە (ك: سدود أسداد).

السُّدُّ: بەمانا (السَّدُّ) دێ ٥ بەو هەورەى ئاسۆ داگیردەکا دەگـوترێ (سُـدٌّ مـن سحاب) ٥ (وسُـدٌّ مـن جـراد وجـراد سُدٌّ) کوللە بێتـان کە هـەموو ئاسـۆ داگیربکـا ٥ وشـکە چـەم کـە گۆمـاوو بـەردى گـەورەى تێـدا بـنو ئاویـان تێـدا بمێنێتـەوە بۆماوەیـەك ٥ (ك: سُدود وأسداد).

ألسَّدُّ: قسەى ڕاستو دروست.

السَّدَدُ: بەمانا (ألسُّداد) دێ.

ألسَّدّاد: (رجل سَدّاد): پیاوێکى لەسەرە خـۆو بـەردەوام لەسـەر کـارى باشـى خۆیەتى.

**السُّدَّة**: دەرگای ماڵ ◦ بەربێڵای خانوو، ساحەی بەردەرگا ◦ سیسەم ◦ هەروا بەمانا (ألسُّداد) دێ.

**اَلْمَسَدُّ**: شوێن‌و جێگا، دەگوترێ: (سَدَّ مَسَدَّهُ) شوێنی ئەوی گرت، لە شوێنی ئەو دانیشت ◦ هەروا دەگوترێ: (هم یسدّون مسادّ آبائهم) ئەوانە شوێنی باوک‌و باپیری خۆیان دەگرنەوە.

**سَدَرَ** فلانٌ في البلاد سدراً وسدوراً: فلان رۆیشت بەناو وڵاتدا گەڕا هیچ شتێك نەیگێڕایەوە.

**سَدَرَ** الثوبَ: قوماشەکەی دڕی.

**سَدِرَ** سَدَراً وسَدَارَةً: چاوی لەبەر گەرما لێڵ‌و پێڵ بوون ◦ دەگوترێ: (سَدِرَ بصرُهُ) ◦ هیچ لە کردارو گوفتاری خۆی ورد نەبوەوەو گوێی بەوە نەدا چ دەکاو چ ناکا ◦ دەگوترێ: (هو سادر وسَدِرٌ، وهي سَدِرَةٌ) ◦ هەروا دەگوترێ: (هو سادر في الغَيِّ) ئەو لە گومڕاییدا رۆچووە ◦ (تکلم سادراً) قسەی کردو لە قسەکانیدا دڵنیا نەبوو.

**أَسْدَرَهُ**: گومڕای کرد، وای لێکرد گرنگی نەدا بەشت.

**انْسَدَرَ**: پەلەی کرد لە بازدان‌و راکردندا.

**تَسَدَّرَ** بالثوب: بە قوماش خۆی رازاندەوە، خۆی دەرخست.

**الأَسْدَرَان**: دوو رەگەن لە ژوور کوڵمەوە بەرز بوونەوە بەرەو ژوور کەوتوونە پێش کرکڕاگەی گوێچکە تا گەیشتونە تۆقە سەر ◦ دەگوترێ: (جاء یضرب أسدَرَیه) بە کەسێك دەگوترێ هیچ ئیشێکی نەبێ بێ کارو مەبەست بسوڕێتەوە ◦ یان بە دەستی بەتاڵ گەڕایەوە هیچی دەست نەکەوت.

**اَلسِّدارُ**: شێوە پەردەیەکە لەناو خێمە هەڵدەدرێ.

**السَّدَرُ**: سەر گێژی‌و ئاو لێ گەڕانە توشی ئەوانە دەبێ کە سواری کەشتی دەبن لەناو دەریا سەرگێژ دەبن.

**السِّدْرُ**: درەختی نەبگ ◦ تاکەکەی (سِدْرَة) (ك: سِدَرٌ).

**سِدْرة المنتهی**: درەختێکە لە بەهەشتدا.

**السَّدیر**: باڵە خانەی سێ لا (سێ سوچ‌و تاوەر) یان گومبەزێکە پێك هاتووە لە سێ گومبەزی وەها کە چوبنە ناو یەکەوە ◦ سەرچاوەی ئاو، کارێز.

**سدیر العشب وسدیر النخل**: کۆمەڵگاو کانی گیاوگژ ◦ باخە دارخورما ◦ رەشایی دیمەنی ئەو جۆرە شتانە.

**السِّيدارة**: سداره ؛ جۆره کڵاوێکه بەزۆری موچه خۆرو خانه نشین له برِی وڵاتدا لەسەر دەکەن.

**سَدَسَ القومَ سَدْساً**: شەش یەکی ماڵو سامانی خەڵکەکەی وەرگرت ٥ بوو بە شەشەم کەسی قەومەکەی.

**أسْدَسَ القومُ**: خەڵکەکە بوون بە شەش.

**السُّداسُ**: شەش شەش دەگوترێ: (جاءوا سُدَاسَ) شەش شەش هاتن.

**السُّدَاسِيُّ** (ازار سُداسِي): ئیزارێکە، دەرپێیەکە درێژیەکەی شەش بستە.

**السُّدْسِيَّةُ**: لە زاراوەی ئەندازیاریدا بریتییە لە ئامێرێکی بینین پلە پلەی شێوە کەوانەیی درێژیەکەی شەش یەکی موحیتی کەوانەکەیە ٥ ئەبعادی سوچی پێ دەپێورێ.

**السُّدْسُ**: شەش یەك ٥ (ك: أسداس) ٥ دەگوترێ: (هو یضرب الأخماس في الأسداس) ئەو کابرایە هەر پێنج شەشیەتیو خەریکی فێڵو تەڵەکەیە.

**السُّدُوسُ**: طەیلەسان یان طەیلەسانی سەوز.

**السَّدِيس**: بەمانا (السُّدُس) دێ ٥ (ك: أسْدَاس) مەرێك کەوتبێتە ساڵی شەشەمی تەمەنیەوە ٥ حوشترێك چوبێتە ساڵی هەشتەمەوە ٥ (ك: سُدُسٌ).

**المُسْدَسُ**: لە ئەندازیاریدا (شەش لۆچ) شەش سوچ ٥ هەروا ناوە بۆ دەمانچەی گوللە هاوێژ ٥ بە زۆری بەو دەمانچانە دەگوترێ شەش گوللە بخوا، هەروا ناوە بۆ دەمانچەیەکی خانەدارو خاوەن شانە.

**مَسْدَسَ**: دەگوترێ: (جاءُوا مَسْدَسَ) شەش شەش هاتن.

**سَدَعَ الشَّيْءَ بغیره سَدْعاً**: شتەکە بەرەنگاری شتێکی تر بووە لێکدران.

**سَدَعَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بڵاو کردەوە.

**سَدَعَ الحیوان**: ئاژەڵەکەی سەربرِی.

**سَدَعَ فلاناً**: رێگەی نیشانی فلانکەس دا.

**المِسْدَعُ**: رێ نیشاندەرو چاو ساغ کە مل دەنێ بە رێگای خۆیو ئەرکی خۆی ئەنجام دەدا ٥ یان خێرا رۆو بەپەلە ٥ (ك: مَسَادِعَ).

**سَدِفَ البَصَرُ سَدَفاً**: چاوەکە لە برسانا تاریکایی بەسەردا هات ٥ (هو أسْدَفُ وهي سَدْفاء) (ك: سُدْفٌ).

**أسْدَفَ**: تاریك بوو ٥ دەگوترێ: (أسدف اللیلُ).

**أسْدَفَ فلان**: فلانکەس نووست ٥ لە

برسان یان لەبەر پیری چاوی تاریك بوو ٥ یان چووە ناو تاریکستانەوە ٥ لە روناکایی دوور کەوتەوە چووە ژێر پەردەی تاریکییەوە.

**أسْدَفَ السِّتْرَ**: پەردەکەی هەڵدایەوە.

**أسْدَفَ البابَ**: دەرگاکەی کردەوە.

**أسْدَفَتِ المرأةُ القِناعَ**: ئافرەتەکە روپۆشەکەی خۆی بەردایەوە.

**سَدَّفَ اللَّحْمَ**: گۆشتەکەی بڕی کوتکوتی کرد.

**الأسْدَفُ**: رەش ٥ تاریك ٥ (لیل أسْدَفُ) شەوی تاریك.

**السِّدافَةُ**: پەردە ٥ داپۆشەر.

**السَّدَفُ**: تاریکایی ٥ شەوو تاریکایی شەو (ك: أسْداف).

**السُّدْفَةُ**: تاریکی ٥ بەشێك لە شەو ٥ تێکەڵاو بوونی تاریکیو روناکی پێکەوە وەکوو کاتی نێوان دەرکەوتنی بەیان تا دەگاتە کاتی سپی بوونی ئاسۆ ٥ (ك: سُدَفٌ).

**السُّدْفَةُ**: دەرگا ٥ یان بەردەرگا ٥ (ك: سُدَفٌ).

**السَّدَفَةُ**: شەوو تاریکایی شەو ٥ بەیانی نێوان دەرکەوتنی روناکی بەیانی (فەجر) تا کاتی سپی بوونی ئاسۆ.

**السَّدِيفُ**: گۆشتی پشتە خرەی حوشتر (سەنام) ٥ (ك: سَدائِف وسِداف).

**سَدِكَ** بالشيء سَدَكاً وسَدْكاً: وەگری شتەکە بوو پێیەوە لکا ٥ (فهو سَدِك وهي سَدِكَة).

**سَدَكَ** جلالَ التمر: سەبەتە خورماکانی خستنە سەر یەك.

**السَّدِكُ**: ئادەمیزادی دەست گەرمو دەست سوك لە ئیش کردندا ٥ دەگوترێ: (هو سَدِك بالرمح) ئەو دەست رەنگینو کارامایە لە رمب وەشاندا.

**سَدَلَ** الثوبَ والستر والشَعْرَ سدلاً: کراسەکەی دادایەوە یان پەردەکەی دادایەوە یان قژی بەردانەوە.

**سَدَلَ** في البلاد: بەناو وڵاتدا رۆیی.

**سَدِلَ** سَدَلاً: مەیەلان بوو ٥ مەیلی کرد (هو أسْدَلُ وهي سَدْلاءُ) (ك: سُدْلٌ).

**أسْدَلَهُ**: دایدایەوە، بەری دایەوە ٥ شلی کردەوە.

**سَدَّلَهُ**: بەمانا (أسْدَلَهُ) دێ.

**إنْسَدَلَ**: شلی کردەوە، دایدایەوە.

**السِّدْلُ**: ملیوانکەی گەوهەر دورو جەواهیر کە درێژ بێتە خوار تا سەر سنگ ٥ وەکوو بەرمور ٥ (ك: سُدُولٌ).

**السِّدْلُ**: پەردە ٥ (ك: أسْدال وسدول).

**السَّدِيلُ**: ئەو پارچە قوماشەی بەسەر کەژاوەدا دەدرێ ٥ یان ئەو

پەردەیەی لەناو ماڵدا بۆ بووك دەگیرێتەوە ٥ یان تارای بووك ٥ (ك: أسْدال وسُدُلٌ وسدائل).

**سَدَمَ** البابَ سَدْماً: دەرگاكەی بەدو خۆیدا پێوە دایەوە.

**سَدِمَ** الماءُ سَدَماً: ئاوەكە بەهۆی زۆر مانەوەی بۆگەنی كرد ٥ گڵو خۆڵی تێكەوت تا ئاوەكە گوم بوو داپۆشرا.

**سَدِمَ** فلان: فلانكەس غەمو نارەحەتی توش هات، تورە بوو.

**سَدِمَ** بالشّيْ: سور بوو لەسەر شتەكەو وازی لێ نەهێنا ٥ بەزۆری لەگەڵ مادەی وەرگیراو لە وشەی (ندم)دا بەكاردەهێندرێ ٥ دەگوترێ: (سادم نادم، سدمان ندمان).

**سَدَّمَ** الماءَ طولُ العهد: زۆر مانەوە ئاوەكەی بۆگەن كرد.

**انْسَدَمَ** دُبُرُ البعير: برینی پشتی حوشترە كە چاك بۆوە.

**السَّدِمُ** من الفحول: ئەسپی سەركەش و چەموش ٥ ئەگەر بۆ ئاو بەكارهات بەمانا ئاوی هەڵقوڵاوە ٥ دەگوترێ: (الماءُ السَّدِمُ) ٥ (عاشق سَدِمٌ) عاشقێكی شەیدا.

**السَّدِمُ** من الفحول ومن المياه: بەمانا (السَّدِمُ) دێ.

**السُّدُمُ**: بئر سُدُمٌ: بیری ئاو كە پركرابێتەوە.

**السَّدِيمُ**: ماندو ٥ گومڕاو سەر لێ شێواو ٥ ئاوی هەڵقوڵاو ٥ تەمو غاری كەمو تەنك ٥ پەڵە پەڵەی جۆرە هەورو تەمو غارێك كە بەهۆی چڕبوونەوە یان بەریەككەوتنی زۆرێك لە جورمە ئاسمانییەكان كە هەندێكیان مەجەرەكانن پەیدا دەبێ ٥ (ك: سُدُمٌ).

**سَدَنَ** سَدْناً وسِدانة وسِداناً: خزمەتی كابەی كرد، بووە مجەوری ماڵی خودا.

**السَّادِنُ**: مجەوری كەعبە ٥ خزمەتچی ماڵی خودا ٥ دەگوترێ: (هو سادِنُ فلان وآذِنُهُ) ئەو پیاوە خزمەتكاری فلانكەسە، دەرگەوانو رەنجبەریەتی ٥ (ك: سَدَنَةٌ).

**السِّدِينُ**: بەزو پیو ٥ خوێن ٥ خوری (ك: أسْدَان).

**سَدَا** فلانٌ سَدْواً: دەستی بۆ شتەكە درێژ كرد ٥ دەگوترێ: (سدا الى الشّيْ بيده، وسدا يديه).

**سدا** فلان سَدْوَ كذا: فلان لایەنی فلان شتی گرتو ئەوی مەبەست بوو، بۆ ئەو چوو ٥ هەروا دەگوترێ: (خطب فمازال على سَدْوٍ واحد) فلانكەس وتاری داو بەردەوام بوو لەسەر یەك شێوەو سەجع.

**سدي الثوبَ سدياً**: رايەڵی قوماشەكەی درێژ كردەوە.

**سَدِيَ سَدىً**: نمی هێنایەوە ؛ شەو نماوی بوو ٥ دەگوترێ: (سَدِيت الأرضُ وسَدِيَ المكانُ وسدِيت الليلةُ) زەوییەكە شێدار بوو ؛ شەو نماوی بوو (فهو سَدٍ وهي سَدِية).

**أسْدى الثوبَ**: رايەڵی قوماشەكەی درێژ كردەوە.

**أسْدى إليه معروفاً**: بەخششی پێدا، چاكەی لەگەڵ كرد.

**أسْدى الأمرَ**: كارەكەی پێكا، باشی لێ زانی چاكی ئەنجامدا.

**أسْدى الشَّيْءَ**: شتەكەی ئیهمال كرد.

**أسْدى بينهما**: صولحی نێوانی كردن ٥ رێكی خستنەوە.

**أسدى بينهم حديثا**: قسەی لە نێوان خەڵكەكەدا هەڵبەست.

**سَدّى الثوبَ**: رايەڵی قوماشەكەی درێژ كردەوە.

**سَدّى اليه**: چاكەی لەگەڵ كرد.

**سَدّىَ بينهما**: صولحی نێوانی كردن.

**سَدّى النحلُ الشَّهْدَ**: هەنگەكە هەنگوینی كرد.

**استدى فلان**: بەمانا (سدا) دێ ٥ دەشگوترێ:

**استدى الى الشَّيْءِ**: دەستی بۆ شتەكە درێژ كرد.

**استدى الفرسُ**: ئەسپەكە عەرەقی كرد.

**تَسَدّى الثوبَ**: بەمانا (أسداه) دێ.

**تسدّى الشَّيْءَ**: سەر شتەكە كەوتو سواری بوو ٥ دەگوترێ: (تسدّى الأمرَ) بەسەر كارەكەدا زاڵ بوو، كارەكەی كۆنترۆڵ كرد.

**السُّدى**: ئیهمال كردنو گوێ پێ نەدانی، ئیهمال كراو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾.

**السُّدَى من الثوب**: رايەڵی قوماش، پێچەوانەی تێوەدان ٥ هەروا بەمانا عەطاو بەخششە ٥ ئیهمال كراو.

**السُّذابُ**: رەگەزی رووەكە پزیشكییەكان لە پێڕی (السُّذابية)یە.

**السَّاذَجُ**: شتی خاڵصو پاڵفتە كە شتی تری تێكەڵ نەبێو نەقشو نیگاریشی تێدا نەبێ ٥ دەگوترێ: (حجة سازجة) بەڵگەیەكی سادەیە.

**سَرَأت الجرادةُ والسَّمَكةُ سَرْءاً**: كوللە یان ماسییەكە هێلكەی كرد، گەرای نایەوە.

**سرأت المرأةُ**: ئافرەتەكە منداڵی زۆر بوون.

**أسْرَأتْ**: كاتی ئەوەی هات هێلكە بكا.

**سَرِّآتْ**: بەمانا (سَرَأَتْ) دێ.

**ألسِّرْءُ**: هێلکەی ماسیو گەرای کوللەو دەعبای لەوجۆرە.

**سَرَبَ سُرُباً**: چووە دەر ە (سرب في الأرض) لەسەر چنگ بەسەر زەویدا ڕۆییشت ە دەگوترێ: (هو سارب) لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ﴾ ە هەروا دەگوترێ: (سَرَبَ في حاجته) بە ئیشی خۆی ڕۆییشت.

**سَرَبَ الماءُ**: ئاوەکە ڕەوان بوو ە (سَرَبَت العينُ) چاو فرمێسکی ڕشت ە (سَرَبَ القِرْبَةَ) کوندەکەی پینە کرد، بە سیرمە کوندەکەی دروەوە.

**سَرِبَ الماءُ سَرَباً**: ئاوەکە ڕەوان بوو ە (هو سَرِبٌ).

**أسْرَبَ الماءَ**: ئاوەکەی ڕۆیاند، ڕژاندی.

**سَرَّبَ السَّرَبَ**: ڕێبازی نهێنی دروست کرد ە گۆڕیچەی لەژێر زەوییەوە هەڵکەند.

**سَرَّبَ الشَّيْءَ**: شتەکەی پارچە پارچە نارد ە دەگوترێ: (سَرَّبَ اليه الشَّيْءَ وسَرَّب عليه الخيلَ والإبلَ).

**سَرَّبَ الماءَ**: ئاوەکەی ڕەوان کرد، ڕۆیاندی.

**انْسَرَبَ الماءُ**: ئاوەکە ڕەوان بوو (إنْسَرَبَ في جحره) چووە ناو کونەکەی خۆیەوە .

**تَسَرَّبَ**: بەمانا (إنْسَرَبَ) دێ.

**تَسَرَّبَ من الشّراب**: پڕبوو لە شەراب.

**تَسَرَّبَ القومُ في الطريق**: خەڵکەکە بە شوێن یەکدا بە ڕێگاکەدا ڕۆیشتن.

**السَّرابُ**: تراویلکە سیخرۆ؛ شتێکە لە دەوروبەری نیوەڕۆدا کە گەرمابێ وەکوو ئاو لە دەشتاییدا لە دوور دەبیندرێ بەڵام هیچ نیە.

**السَّرَبُ**: ڕێگای نادیارو دزە ڕێ ە قورئان دەفەرموێ: ﴿فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا﴾ ە هەروا ئاوە بۆ گۆڕیچە لەژێر زەویدا کە ملەمای نەبێ بێ مەنفەز بێ ە کونە مشكو کونە مار ە گۆڕیچەی کارێزاو، کونجی کارێز، بۆری ئاو ە ئاوی چۆڕاو لە کوندە ە (ك: أسراب).

**السِّرْبُ**: کۆمەڵە باڵندەو ئاژەڵ ە دەگوترێ: (سِرْب من النساء) ڕەوە ئافرەت وەکوو چۆن دەگوترێ ڕەوە ئاسك ە هەروا دەگوترێ: (سرب من النَّخلِ) پورە هەنگ ە دڵو دەروون دەگوترێ: (أمِن السِّرْب) دڵ ئارام ە (أمن في سربه) لە دڵدا ئارامو هێدیو هێمنە ە هەروا بەمانا سینگ دێ ە دەگوترێ: (هو واسِع السرب) ئەو سینگ فراوانە ە هەروا بەمانا

ڕێبازو ئامانج دێ ٥ دەگوترێ: (خَلِّ سِرْبَهُ) ڕێگای ئەو واز لێ بێنە، هەوڵ بۆ بەدیهێنانی ئامانجی ئەو مەدە ٥ (ك: أسْرَابٌ).

**السِّرْبُ**: ئاژەڵ بە گشتی ٥ ڕێبازو ئامانج ٥ سینگ ٥ (ك: سروب).

**السُّرْبَةُ**: کۆمەڵە باڵندەو ڕەوە حەیوان ٥ کۆمەڵێک لە سەرباز خانە دوور دەکەونەوە هەڵمەت دەبەنە سەر دوژمن و دەگەڕێنەوە ٥ تووکی جەستەی ئادەمیزاد لە سینگیەوە تا دەگاتە ناوکی ٥ ڕێگا ٥ دەگوترێ: (هو قريب السُّرْبة) ڕێگای نزیکە ٥ بەخێرایی دەچێ کاری خۆی دەکاو دەگەڕێتەوە ٥ (هو بعيد السربة) ئەو ڕێگاکەی دوورە.

**السُّرْبَةُ**: سەفەری نزیك.

**المَسْرَبُ**: شوێن خێشکەی مار ؛ شوێنی خشانی مار بەسەر لمبە وردەو گڵە وردەدا ٥ دەگوترێ: (هذه مسارب الحياة) ئەوە شوێنی خشانی مارەکانە لەسەر ئەو لمبە یان ئەو گڵە وردە.

**المَسْرُبَةُ**: مووی نێوان سینگ و ناوك ٥ بەرپێلاو پێش هەیوانی ژوور ٥ (ك: مَسَارب).

**المَسْرَبَةُ**: مووی نێوان سینگ و ناوك ٥ پاوان و لەوەڕگا ٥ (ك: مَسَارب).

**سَرْبَلَهُ السِرْبالَ**: کراس یان زرێی لەبەر فلان کرد ٥ لە حەدیثێکدا کە لە عوسمانەوە ڕیوایەت کراوە دەفەرموێ: (لا أخْلَعُ سِرْبالاً سربلنيه الله).

**تَسَرْبَلَ بالسِّرْبال**: کراسی لەبەرکرد.

**السِّرْبالُ**: کراس یان زرێ یان هەرشتێکی تری وەها کە لەبەر بکرێ ٥ (ك: سرابيل) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿سَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ وَسَرَابِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ﴾.

**سَرَجَ فلان سَرجاً**: درۆی کرد ٥ دەشگوترێ: (سَرَجَ فلان الكذِبَ) فلان درۆی هەڵبەست.

**سَرَجَت المرأة شعرها**: ئافرەتەکە قژی خۆی هۆنیەوە.

**سَرِجَ سَرَجاً**: دەموچاوی جوان بوو ٥ درۆی کرد.

**أسْرَجَ السِّراجَ**: چراکەی هەڵکرد ٥ (أسْرَج الشَّيْءَ) شتەکەی جوان کرد ڕازاندیەوە.

**أسْرَجَ الفَرَسَ**: ئەسپەکەی زین کرد ٥ دەشگوترێ: (سَرَّج الأحاديث) قسەکانی بە درۆ ڕازاندنەوەو ڕوکەشی کردن.

**سَرَّجَ اللهُ فلاناً**: خودا توفیقی فلانی دا لە کارەکانیدا سەرکەوت.

**سَرَّجت المرأةُ شعرها:** ئافرەتەکە قژی خۆی هۆنینەوە.

**إستَسْرَجَ السِّراجَ:** چراکەی هەڵکرد.

**السارِجُ:** (جـ‌ین سـارج) ناوچـەوانی گەش‌و جوان وەکوو چرا.

**السِّراجُ:** چـرای هەڵـگیرساو ٥ (ك: سُرُج).

**السِّراجَة:** پیشەی زین دورین (زینلرو).

**السَّرْجُ:** زینی وڵاخ ٥ (ك: سروج).

**السَّرَّاجُ:** زین فرۆش ٥ زینلرو ٥ درۆزن.

**سُـریْجٌ:** ئاسـنگەرو شیرگەرێـکی بەناوبانگ بووە، شمشێری سورەیجی بۆ لای ئەو نیسبەت دەدرێن.

**الْمِسْرَجَةُ:** ئەو شوێنە یان ئـەو شتەیە کە چرا رۆنەکەی تێدا دادەنرێ (ك: مَسَارِج).

**سَرْجَنَ الأرضَ:** زبڵی بـە زەوییەکە کرد بۆئەوەی باش رووەکی تێدا بڕوێ.

**السِّرْجِين:** زبڵ.

**سَرَحَ سَرْحاً وسُرُوحاً:** بەیانی زوو دەرچوو رۆیی.

**سَرَحَ السَّيْلُ:** لافاوەکە بە هێواشی رۆیی.

**سَرَحَت الماشية:** ئاژەڵەکە بۆخۆی لـەوەڕا پێویستی بە ئاڵف پێدان نەکرد.

**سَرَحَ الشَّيْءَ:** شتەکەی نارد.

**سَرَحَ مـا في صـدره:** چی لـە سنگیدا بوو دەری خست دەری بڕی.

**سَرَحَ الماشِيةَ:** ئاژەڵەکانی بەرەڵلای لەوەڕگا کردن بۆئەوەی بۆخۆیان بلەوەڕێن.

**سَرَحَ الله فلاناً:** خودا توفیقی فلانکەسی دا ٥ دەشگوترێ: (هو يسرع في أعـراض الناس) ئەو پاشملە بـە خراپـە باسی خەڵك دەکا.

**سَرِحَ سَرَحاً:** لە ئەرکەکانی خۆی رزگاری بوو.

**سَرَّحَ الشَّيْءَ:** شتەکەی نارد ٥ دەگوترێ: (سَرَّحَ الرسولَ) نێردراوی خۆی نارد بۆ ئەنجامدانی کارەکە.

**سَـرَّحَ الـشَّعْرَ:** قـژەکانی بەشـانە کـرد هەندێ گەنـدە مـووی هەڵـکەندراوی بە ددانی شانەکە جیا کردەوە.

**سَـرَّحَ فلانـاً الى موضِـع کـذا:** فلانـی ئاڕاستەی فلان شوێن کرد.

**سَرَّحَ المرأةَ:** ئافرەتەکەی تەڵاق دا.

**سَرَّحَ العامِلَ:** کرێکارەکەی لـە ئیشەکە دەرکرد.

**سَـرَّحَ الماشـيةَ:** ئاژەڵـەکانی بـردە جێـگایەك بـەدەمی خۆیـان بلـەوەڕێن‌و پێویـستیان بـە ئـاڵف پێدان نەبێ.

سَرَّحَ الشَّيْءَ: شتەکەی ئاسان کرد.
سَرَّحَ عنه الشَّيْءَ: شتەکەی لە چنگ ئەو رزگار کرد.
سَرَّحَ الله العبدَ للخير: خودا بەندەکەی تۆفیق دا بۆ خێرو خۆشی.
انْسَرَحَ فلان: فلانکەس پۆشاکی لەبەر خۆی داکەند ٥ پەلەی کرد.
تَسَرَّحَ من المكان: لەو شوێنە رۆیی‌و چووەدەر.
التسريحة: شێوەیەکە لە داهێنان‌و چاککردنی قژ.
السَّارِحُ: شوان ٥ ئاژەڵ.
السَّارِحة: ئاژەڵ ٥ دەگوترێ: (ماله سارحة ولا رائحة) واتە: هیچی نیە.
السَّراحُ: ئاسان ٥ دەگوترێ: (أفعل ذلك في سَرَاح ورواح) بە ئاسانی‌و بێ گیرو گرفت ئەو کارە دەکەم ٥ هەروا دەگوترێ: (أطلق سراحَهُ) بەرەڵلای کرد ٥ وازی لێ هێنا.
السَّرْحُ: ئاژەڵ ٥ بە تایبەتی بەو ئاژەڵە دەگوترێ بەیانی ببرێ بۆ لەوەڕ خواردن‌و ئێوارە بهێندرێتەوە ٥ هەروا ناوە بۆ درەختی گەورەو بەرز ٥ بەردەرگاو بەر بێلای خانوو.
السُّرُحُ: ئاسان ٥ دەگوترێ: (مِشية سُرُحٌ) رۆیشتنێکی ئاسان ٥ (وولدتهُ سُرُحاً) بە ئاسانی منداڵی بوو (عطاء سَرُحٌ) بەخشندەی وەرگیراوو گەیشتوو ٥ (فرسٌ سُرُحٌ) ئەسپێکی تیژڕۆو گورج‌و گۆڵ.
السِّرْحانُ: گورگ ٥ (ذَنَب السِّرحان) فەجری درۆزن (سَرْحان الحوض) ناوەڕاستی حەوز ٥ (ك: سراحين، وسَرَاح).
السَّرُوح: ئەسپ‌و حوشتری خۆشڕۆو تیژڕۆ.
السَّرِيحُ: شتی ئاسان ٥ پەلە کردن دەگوترێ: (لايكون ذلك الا في سريح) ئەوە بەپەلە نەبێ ناکرێ ٥ رۆیشتنێك کاڵەی بۆ ببەسترێ ٥ خۆی بۆ ئامادەبکرێ ٥ ئەسپێك زینی بە پشتەوە نەبێ، بێ زین بێ.
السَّرِيحة: پارچە پەڕۆی شڕو دڕاو ٥ خوێنی رژاوی بەسەر شتدا رۆیشتوی وشکەوە بوو ٥ (ك: سريح، وسرائح) ٥ رێگای راست‌و دیار لە شیوو دۆڵ‌و تەنگە بەراییدا، کە بە چوار دەوریدا درەخت هەبن (ك: سرائح).
المَسْرَحُ: پاوان، لەوەڕگا ٥ شوێنی شانوو رانواندنی تەمسیل ٥ (ك: مسارِح).
المِسْرَحُ: شانە ٥ (ك: مسارح).

المِسْرَحَة: بەمانا (المِسرَحُ) دێ ٥ (ك: مسارِح).

المَسْرَحِية: چیرۆکێك ئامادە کرابێ بۆ سەر شانۆ.

المُنْسَرِحُ: یەکێکە لە بەحرەکانی عەروز، زۆر بە کەمی شیعری پێ گوتراوە.

سَرَدَ الشَّيْءَ سَرْداً: شتەکەی کون کرد ٥ (سَرَدَ الجِلْدَ) پێستەکە یان (چەرمە)کەی کون کرد.

سَرَدَ الدِّرعَ: زرێیەکەی چنی، هەردوو لای ئەڵقەکەی بەیەکەوە نووساندن و دایکوتان بەیەکەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿أَنِ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ﴾.

سَرَدَ الشَّيْءَ: درێژەی بە شتەکە داو بەردەوام بوو لەسەری ٥ دەگوترێ: (سرد الصومَ) بەردەوام بوو لەسەر رۆژو گرتن ٥ دەشگوترێ: (سرد الحديثَ) درێژەی بە قسەکردنەکەی داو بە رێك و پێکی ئاخاوتنی کرد.

سَرِدَ سَرَداً: بەردەوام بوو لەسەر رۆژو گرتن.

أَسْرَدَ الشَّيْءَ: شتەکەی کون کرد ٥ (أسرَد الدرعَ) زرێیەکەی چنی.

تَسَرَّدَ الشَّيْءُ: شتەکە رێچکەی بەست زنجیرەی بەست، بە شوێن یەکدا ریزبوو ٥ دەگوترێ: (تَسَرَّد الدرُّ) (تسرَّد الماشي) (تسرَّد الدمعُ) ٥ (تَسَرَّدَ الحديثَ) قسەکانی جوان ئاراستە کردن و بە رێك و پێکی دوا.

السّارد: میرو ساز، میرو کونکەر.

السِّرَادُ: ئامێری شت کونکردن، ئەو شتەی میروی پێ کون دەکرێ.

السَّرْدُ: ناوە بۆ ئەو کەسە زرێیەکان، ئەڵقەکان کۆ دەکاتەوە ٥ (شَيءُ سَرْدٌ) شتی بە ریزو بە زنجیرە و زور ٥ دەگوترێ: (نجوم سَرْدٌ).

السَّرَدُ: بەمانا (السَّرْدُ) دێ.

السِّرادُ: ئەڵقە دروستکەر بۆ زرێ.

المِسْرَدُ: بەمانا (السِّرَادُ) دێ ٥ زوبان ٥ دەگوترێ: (ماشٍ مِسْرَدُ): کەسێکە بەردەوام هەنگاو دەهاوێ و دێ و دەچێ ٥ (ك: مسارِدُ).

السِّرْدابُ: ژێر زەمین، هۆدەو قاوشێکە لەژێر بینادا دروست دەکرێ بۆکاتی پێویستی لەسەرماو گەرمادا پەنای بۆ دەبرێ ٥ (ك: سراديب).

السِّرْدار: سەرۆکی سەربازو پۆلیس.

سَرْدَقَ البيتَ: خانوەکەی توندو تۆڵ کرد.

السُّرادِق: هەر دیوارو پەرژینێك دەورەی شتێکی تر بدا ٥ خێمەی

هەڵدراو بەبۆنەی بوك گواستنەوە
یان تەعزییەو سەرە خۆشییەوە.
السَّرْدِينُ: جۆرە ماسییەکی بچوکە خوێ دەکرێو هەڵدەگیرێ، ناوی دەدرێن بۆ دوورگەی (سەردینییە).
سَرَّهُ سُرُوراً: کەیف خۆشی کرد.
سَرَّ فلاناً سَرّاً: چاكو چۆنی لێکردو هیوای خۆشی بۆ خواست.
سَرَّ الصبيَ: ناوکی منداڵەکەی بڕی.
سَرَّ فلاناً: زەبری لەناوکی فلان دا.
سَرَّ الشَّيْءَ: شتەکەی شاردەوە.
سَرَّ سَرَراً وسَرّاً: ناوکی ژانی کرد ٥ (هو أسَرُّ هي سَرّاءُ).
أسَرَّهُ: شاردیەوە ٥ (أسَرَّ اليه حديثا) قسەیەکی نهێنی بە گوێ دادا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا﴾.
سَارَّهُ مُسَارَّةً وسِراراً: سرتەی لەگەڵدا کردو بەسەر نهێنی خۆیدا ئاگاداری کرد.
سَرَّرَه الماءُ: ناوەکە گەیشتە ناوکی.
اسْتَسَرَّ: خۆی شاردەوە، خۆی پەنادا ٥ دەگوترێ: (إستسر القمرُ) مانگ خۆی پەنا داو گوم بوو (ليلة السِرار) ئەو شەوە یان ئەو دوو شەوەیە کە مانگ نابیندرێو گوم دەبێ.
اسْتَسَرَّ الأمْرُ: ئیشەکە دیارنەما، شتەکە گوم بوو.
اسْتَسَرَّ فلاناً: نهێنی خۆی بۆ فلان باس کرد.
اسْتَسَرَّ الجاريةَ: کەنیزەکەکەی کردە ملکی خۆی.
تَسَارُّوا: بە یەکەوە سرتە سرتیان بوو ٥ دەشگوترێ:
تَسَارَّ الى كذا: حەزی لە فلان شت بوو بەخۆشی زانی.
تَسَرَّرَ الثَّوْبَ: قوماشەکەی دڕ دڕ کرد، دڕاندی.
تَسَرَّرَ فلان: فلانکەس کەنیزەکی کردە ملکی خۆی.
تَسَرَّرَ بِنت فلان: کچی فلانکەسی کردە هاوسەری خۆی چونکە بۆ خۆی دەوڵەمەندو ئافرەتەکە هەژار بوو.
الأسارير: خەتو شیوو دۆڵی بەری دەستو دەمو چاوو ناوچەوانە ٥ تاکەکەی (أسرار) ٥ هەروا ناوە بۆ جوانی دەمو چاو ٥ جوانی دوو روومەتو دوو کوڵم.
الأسَرُّ (أسَرُّ الرجل): ئەو کەسەی خۆ لە کاروباری پیاو هەڵدەقورتێنێو لە ئیشەکانی دەکۆڵێتەوە.
السِّرَارُ: کۆتایی (سَرار الشهر) دوا شەوی مانگ.

سَرار الحسب: بنیچه پاكو خاوێنو وەجاخ زادە.

سَرار الأرض: ناوەڕاستی شیوو شوێنی باشی.

ألسِّرارُ: (سِرار الأرض) ناوەڕاستی پارچە زەوییەکە ٥ خەتو شیوو دۆڵی بەری دەستو دەمو چاو ناوچاوان.

السَّرارَةُ: (سَرارة الأرض) باشترین شوێنی زەویو بە نرخترینی.

سَراة الحسب: مامناوەندیو وەجاخ زادەیی ٥ دەگوترێ: (سِرٌّ بَیِّنُ السَّرارة) پاڵفتە کراوی شت ٥ کاکڵە.

ألسِّرُّ: نهێنی: ئەو شتەی دەیشارییەوەو ناتەوێ کەس بیزانێ ٥ بنەماو بنیچە ٥ پاڵفتەی شت ٥ بە نرخترینی شت.

سِرُّ الوادي: بە نرخترینی شیوو دۆڵ.

سِرُّ الأرض: بە نرخترین شوێنی زەوی ٥ شتی دڵخۆشکەرەو فەرەح ئامێز ٥ ئەو کارانەی ئادەمیزاد ئەنجامیان دەدا دڵی پێیان خۆشە.

سِرُّ الشيء: پاڵفتەی شت.

سِرُّ النسب: کاکڵەو پوختەی بنیچەو نژاد ٥ دەگوترێ: (هو في سِرّ قومه) ئەو لە وەجاخ زادەی نەتەوەکەیەتی ٥ (هو سِرُّ هذا الأمر) ئەو زاناو لێزانی ئەو ئیشەیە.

ألسُّرُّ: خەتو شیوو دۆڵێکن لە بەری دەستو دەمو چاوو ناوچاوان ٥ ئەو ریخۆڵەیەی پەیوەستە بە ناوکەوەو کاتی لە دایکبوون دەبڕدرێ ٥ دەگوترێ: (عرفت ذلك قبل أن يُقْطع سُرُّك) پێش ئەوەی ناوکت بپڕدرێ من ئەوەم زانیوە ٥ (ك: أسرار).

السَّرَرُ: ئەو ریخۆڵەیە لە ناوکی منداڵی تازە لەدایکبوو دەبڕدرێ ٥ شەوی پەنا گرتنی مانگ ئەو شەوەی مانگ نابیندرێ ٥ (ك: أسْرار).

السَّرّاء: نازو نیعمەت ٥ هەرزانیو خۆش گوزەرانی ٥ بۆری ناو بۆش ٥ زەوی بە پیتو بەرەکەت.

السُّرَّة: ناوك ٥ (وسُرّة الروضة) باشترین شوێنی باخ کە باش شتی لێ بڕوێ ٥ (سُرّة الحوض) ناوەڕاستی حەوزو شوێنی ئاو تێدا راوەستانی ٥ (سُرَّة البذرة) خاڵێکە لە شوێنی گەیشتنی تۆم بە دیواری هێلکەدانەوە ٥ (ك: سُرَرٌ).

السِّرَّةُ: دەسکە ریحانە ٥ چەپکە ریحانە.

السِّريرُ: ئەو کەسەی هاوەڵەکانی کەیف خۆش دەکاو چاکە کارە لەگەڵیان.

السُّرِيَّةُ: كەنیزەكی كڕدراو ٥ (ك: سَرارِيّ).
السُّرورُ: كەیف خۆشی لەكاتی پەیدا بوونی سود یان نەمانی زیان.
السَّرِير: سیسەم، كورسیو قەنەفەی لەسەر دانیشتن ٥ دارە مەیت، تاتە شۆر.
سرير الرأس: شوێنی نێوان ملو سەر ٥ (ك: سُرُرٌ وأسِرَّة).
السَّرِيرَة: نهێنیو شاراوە ٥ (ك: سَرائر).
اَلْمَسَرَّةُ: كەیف خۆشی ٥ قەراخو پەنا ریحانە.
السُّرْسُوب: فرۆ، ژەك ٥ ئەو شیرەی دوای لە دایكبون دەچێتە گوانی ئاژەڵ، یان مەمكی ئافرەت.
السُّرْسُورُ: زیرەكو زاناو لێكۆڵەرەوە لە كاروباردا.
اَلسُّرْسَامُ: ئەستور بوونو هاوسانێكە لە پەردەی دەماغدا پەیدا دەبێو لەرزوتای بەردەوام لە ئەخۆشەكەدا پەیدا دەكا، هەروا دیاردەی تریشی لێ پەیدا دەبێ بۆ نموونە خەو زڕاندنو سەر سوڕمانو سەر لێ شێوان.
سَرَطَهُ سَرْطاً: قوتی دا.
سَرِطَهُ سَرَطاً: بەمانا قوتیدا.
استَرَطَهُ: بەمانا (سَرَطَهُ) دێ.
انْسَرَط الطعام في حلقه: خواردنەكە بە ئاسانی لە قوڕگی چووە خوار.
تَسَرَّطَهُ: بەمانا (سَرَطَهُ) دێ.
السِّراط: ڕێبازی ئاشكرا.
السُّرَاطُ: بڕندە ٥ دەگوترێ: (سیف سُراط) شمشێری بڕندە.
السُّرَطُ: قوتدەر، پارو گەورە، خێرا خۆر، تیژڕۆ.
السَّرَطان: قرژاڵ؛ گیاندارێكی دەریاییە لە پێڕی (القشریات)ە دە قاچی هەیە ٥ بورجێكی ئاسمانە ٥ لە بواری پزیشكیش دا هاوسانێكی پیسە لە خانە ئاشكراكانی جەستەدا دروست دەبێو بە ئەنسیجەكانی دەوروبەری خانەكان دا بڵاو دەبێتەوە.
السُّرَيط: حەڵوا ٥ خورماو ڕۆن.
المِسْرَطُ: گەرو (ك: مَسَارِط).
سَرِعَ سَرَعاً: پەلەی كرد ٥ (فهو سَرِعٌ وسرعان وهي سرعى).
سَرُعَ سُرَاعة وسُرْعَةً وسَرْعاً: بەمانا (سَرِعَ) دێ.
أسْرَعَ: پەلەی كرد ٥ دەگوترێ: (أسْرَعَ في السير) پەلەی كرد لە ڕۆیشتندا.
سارَعَ: دەست پێشخەری كرد.
تَسَارَعَ: بەمانا (سَارَعَ) دێ.

**تَسَرَّعَ**: بەمانا (تسارع) دێ.

**الأُسْرُوعُ**: تاکی (الأساريع) ئەو شتەیە لە تولەی دارمێو دێتەدەر ٥ کرمێکی سپی سەر سوورە دەشوبهێتە قامك و پەنجەی ئافرەت ٥ (ك: أساريع) ٥ (أساريع الذهب) چاڵ و چوێڵی ئالتون.

**السُّرَاع**: خێرارۆ، تیژڕەو.

**السِّرْعُ**: هەر تولە مێوو لقە درەختێك تەڕبێ ٥ (ك: سُرُوعٌ).

**سُرعان ما فعلت كذا**: ئای چەند بە خێرایی ئەو کارەت ئەنجامدا!

**السَّرَعانُ**: (سَرَعان الناس) پێشەتای خەڵکەکە ٥ (سَرْعان الخيل) پێشەنگی رەوە ئەسپ و قافڵە.

**السَّرِيعُ**: پەلە درەختی تەڕ بەتایبەتی درەختی بەشام کە درەختێکی بۆن خۆشەو سیواکی پێ دەکرێ ٥ بەحرێکی عوروزیشە زۆر بە کەمی شیعری پێ گوتراوە.

**السَّرَعْرَعُ**: لقەدار لەکاتی تەڕیدا ٥ شوڕکە داری درێژو باریك ٥ شتی درێژو باریك ٥ گەنجی تەڕو تازەو شۆخ و شەنگ.

**سَرِفَت السُّرْفَةُ الشَّجَرَة**: کرمی ئاوریشم درەختەکەی خوارد.

**سَرِفَت الأُمُّ وَلَدَها**: دایکەکە زۆری شیردا بە منداڵەکەو کۆئەندامی هەرسی تێکدا.

**سَرِفَ الطعامُ**: زۆری خوارد تا توشی گەدە ترشان و ئینتەلا بوو.

**سَرِفَ الشَّيءَ**: شتەکەی پاش گوێ خست، غافڵی کرد ٥ هەڵەی تێدا کردو مەبەستی نەپێکا ٥ شتەکەی نەزانی.

**سَرِفَ القَوْمُ**: لە خەڵکەکە تێپەڕی.

**أسرف**: لە ئەندازە دەرچوو ٥ هێڵی سوری بەزاند ٥ دەگوترێ: (أسرف في مالە) دەستبلاوی لە ماڵ و سامانی خۆی ئەنجام دا ٥ (أسرف في الكلام) زۆری چەنەدا ٥ (أسْرَفَ في القتل) لە کوشتنەکە زێدەڕۆیی کرد.

**أسْرَفَ**: هەڵەی کرد ٥ بێ ئاگا بوو ٥ نەزان بوو.

**السَّرَفُ**: خوگرتن بە شتێکەوە ٥ لە گرێژە نەچون ٥ لە سەنتەر لادان.

**سَرَفُ الماء**: ئەو ئاوەی بە خۆڕایی بڕواو کەڵکی لێ وەرنەگیرێ.

**السَّرِف**: کەم ٥ دەگوترێ: (هو سَرِف العقل) ئەو کەم عەقڵە ٥ (سَرِف الفؤاد) بێ ئاگاو غافڵە ٥ (مکان سَرِفٌ) شوێنێکە کرمی ئاوریشمی زۆرە ٥ هەروا دەگوترێ: (أرضی سَرِفة).

**السُرْفَةُ**: كرمی ئاوریشم.

**السُروفُ**: بەهێزو گەورە.

**ألسُرِيفُ**: تولە مێو.

**سَرَقَ** منه مالاً: ماڵەکەی لێ دزی ٥ (هو سارق) (ك: سَرَقَة).

**سَرَقَ** السَّمْعَ وسرق النظر: بە دزییەوە گوێی هەڵخست بۆئەوەی قسەکە بدزێ ٥ بەنهێنی بۆی روانی.

**سرقتني عيني**: نووستم ٥ خەوم لێ کەوت.

**سَرِقَ سَرَقاً**: گوم بوو ٥ لاواز بوو.

**سَارَقه النَّظَرَ، وسارق النظرَ اليه**: هەوڵیدا هەلی بۆ هەڵبکەوێ سەیری بکا، بە دزییەوە بۆی بروانێ.

**سارق السمعَ**: هەوڵیدا بە نهێنی گوێی لە وتەکانی بێ.

**سَرَّق الشَّيْئَ**: بەمانا (سَرَقَهُ) دێ.

**سَرَّقَ فلاناً**: فلانکەسی بە دز لە قەڵەمدا.

**اسْتَرَقَ الشَّيْئَ**: بەمانا (سَرَقَهُ) دێ.

**إنْسَرَقَ**: لاوازو بێ هێز بوو ٥ دەگوترێ: (إنسرق صوته) دەنگی زەعیفو لاواز بوو (إنسرقت مفاصله) جومگەی لاواز بوو.

**إنسرقَ عن القوم**: لە خەڵکەکە دوا کەوتو خۆی گوم کردو رۆیی.

**تَسَرَّقَ**: وردە وردە شتەکەی دزی ٥ هەروا دەگوترێ: (تَسَرَّقَ النظر والسَّمْعَ).

**السَّارِقَةُ**: زنجیر ٥ بزمار لە قەیدو شتی وا ٥ (ك: سوارق).

**السُّرَاقَةُ**: ئەوەی بدزرێ ٥ دەگوترێ: (هذه سَرَاقَةُ فلان) ئەمە ماڵە دزراوەکەی فلانە.

**السَّرَقُ**: پۆشاکی ئاوریشم ٥ باشترین جۆری ئاوریشم.

**السَّرِقَة**: دزی ٥ هەڵگرتنی ماڵێکی دیاریکراوە لە شوێنی شیاوی خۆی بە شێوەی دزی.

**اَلْمُسْتَرَق**: لاوازو کاڵفام، جەستە بێ هێز.

**مسترق العنق**: ئادەمیزادی مل کورت ٥ قسە دزو قسە قۆزەرەوە.

**سَرْقَنَ الأرْضَ**: زەوییەکەی زبڵ رێژ کرد، زبڵاوی کرد.

**السِّرْقِين**: زبڵ.

**سَرِكَ سَرَكاً**: دوای بەهێزو بە توانایی لاواز بوو.

**تَسَارَكَ في المشي**: لەبەر ماندوویی‌و لاوازی نەیتوانی بڕوا.

**السَّرْكي**: چەکی موچە ٥ دەفتەری پێدان‌و وەرگرتنی نامە ٥ دەفتەری رۆژانەی کرێکار.

**السَّرْكودية**: نەخۆشییەکی درێژ

خايەنەو هۆكارى پەيدا بوونى نازانرێ، بە زۆرى توشى غودەى لەمفاوىو چاوو سييەكانو ئێسقانى دەستو قاچ دەبێ.

**السَّرْكومة:** (ألسّركومة اللمفية) هاوسانێكى پيسە لە گۆشتدا پەيدا دەبێ.

**سَرَّمَهُ:** بڕييەوە ٥ پچڕاندى.

**تَسَرَّمَ:** بڕدرايەوە ٥ پچڕا.

**السُّرْمُ:** قەراخى ريخۆڵە.

**السَّرْمَدُ:** بەردەوامو نەبڕاوە.

**السَرْمَدِيّ:** پاڵدراو بۆ لاى (السَرْمَد).

**سَرَا** فلان سَرْواً وسَرَاوةً: فلان بەرێز بوو شەريفو وەجاخ زادە بوو ٥ سەخى سروشت بوو.

**سرا** الشَّئ عنه سرواً: شتەكەى داكەندو فڕێى دا.

**سرا** عنه ثوبَهُ ودِرْعَه: كراسو زرێيەكەى لەبەرخۆ داكەند.

**سرا** الهَمَّ عن فؤاده: غەمو پەژارەى خۆى دەرخست.

**سرا** السيفَ: شمشێرەكەى روت كرد، لە كالان رايكێشا.

**سَرُوَ** سَراوةً وسَرْواً: شەريف بوو (ك: سروات).

**أسْرىَ** الشَّئَ عنه: شتەكەى لەبەر داكەند.

**سَرَّى** الشَّئَ عنه: شتەكەى لەبەر داكەند ٥ دەگوترێ: (سُرِّي عن فلان) فلانكەس غەمو ناڕەحەتى لە دڵدا نەما.

**إنْسَرىَ:** دەركەوت، پەردەو تەمو مژى لەسەر لاچوو.

**إنسرى الهَمُّ عنه:** غەمو پەژارەى لە دڵدا نەما.

**تَسَرَّى:** بە زۆرە ملێو تەكەللوف سەخاوەتى بەسەر خۆيدا هێنا.

**السَّرَاةُ:** (سراة كل شئ) لاى ژوروى شتو ناوەڕاستى ٥ يان زۆرينەى ٥ (سَرَاة النهار) چێشتەنگاوو نيوەڕۆ.

**سَراة الطريق:** ناوەڕاستى رێگا، يان زۆرينەى رێگا.

**سَراة الفرس:** سەر پشتى ئەسپ ٥ (ك: سَرَوَات).

**السَّرْو:** درەختى سنەو بەر ٥ تەپۆڵكەى ناو شيوو دۆڵ ٥ كونێكى ناكەوانەييە لەسەر سندوقى ئامێرى قانونى مۆسيقا.

**سَرْوَلَهُ:** دەرپێى لەپێى ئەو كرد.

**تَسَرْوَلَ:** دەرپێى لەپێ كرد.

**السَّراويل:** دەرپێ ؛ پۆشاكێكە نێوان ناوكو ئەژنۆ دادەپۆشێ ٥ (ك: سراويلات).

**الْمُسَرْوَلُ:** كۆترێك پەڕى بە

فاچەکانەوە بێ ٥ ئەسپێک پەڵەی سپی جەستەی لە دەستو فاچی تێپەڕ بووبێ.

**سَرَى** اللَّيلُ، سَرْياً وسِرايةً وسُريً: شەو رۆیی‌و کۆتایی هات ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ﴾.

**سَرَى** الهَمُّ: غەمو پەژارەی رۆیی.

**سَرَىَ** الليلَ: بە رۆیشتن شەوی بەڕێ کرد.

**سَرَى** بفلان: شەو رەوی بە فلان کرد.

**سَرَى** عِرْق الشجرة في الأرض: رەگی درەختەکە بە ناوی زەویدا رۆچوو.

**سَرَىَ** فيه السُمُّ والخمرُ: ژەهرەکە یان شەراب بەناو جەستەی دا بلاوبۆوە.

**سَرَى** فيه عِرق السّوءِ: رەگی خراپەکاریی تێدا بلاوبۆتەوە.

**سرى** عليه الهمُّ: غەمو پەژارە شەو یەخەی گرت.

سَرَى الجرحُ الى النفس: ئازاری برینەکە بەردەوام بوو تا کوشتی.

**أسرى** الليلَ وبه: شەو ڕەوی کرد بە شەو رۆیی.

**أسرى** فلاناً وبفلان: شەو رەوی بە فلان کرد.

**سارى** صاحِبَهُ: شەو رەوی لەگەڵ هاوەڵەکەی کرد.

**إسْتَرَى** الليلَ وبه: بەمانا (سرى) دێ.

**إسْتَرى** الشَّيْءَ: شتەکەی هەڵبژارد.

**تَسَرَّى**: بە نهێنی جووە دەر (تَسَرَّى الشيءَ) بەمانا (إسراه) دێ.

**السّارِية**: هەورێك بەشەو پەیدا ببێ ٥ بارانی شەو، کۆڵەکە ٥ ئەو دارەی ئالای کەشتی پێدا دەگرێ.

**السُّرى**: رۆیشتنی زوربەی شەو.

**السَّرِيُّ**: جۆگا ٥ روباری پچوك ٥ (ك: أسْرِيَة وسُرْيان).

**السَّرِيَّةُ**: کۆمەڵێك سەرباز ٥ پۆلە پێشمەرگەیەك ٥ دەستەیەك جاش ٥ لە پێنج کەسەوە تا سێ سەد کەس ٥ رەوە ئەسپ نزیکەی چوار سەد دانە ٥ (ك: سرايا).

**السُّرْيالية**: بیرو بۆچوونێکی سەردەمیانەیە لە بواری فەنو ئەدەبدا پشت بە خەیاڵ دەبەستێو لە زوور واقیعەوە هەوا پەرواڕەو حاڵو چۆنیەتی (اللاشعور) دەردەخا.

**سِرْيوم**: عونصورێکی فیلزییەو لە عونصورە ناوازەکانە.

**سِرْيوم**: عونصورێکی فیلزییەو تایبەتمەندییەکانی دەشوبهێتە صودیوم وەلێ لەو نیشاتی پترە.

**الأُسْطُبَة**: پرزو پاڵی کەتان کە بەددانی سێلكو شەنە جیا دەبێتەوە.

**اَلْمِسْطَبَة**: سندانی ئاسنگەر ٥ سەکۆی دانیشتن ٥ (ك: مساطب).

**سَطَحَهُ سَطْحاً**: بڵاوی کردەوە، ڕێکی خست، ڕایخست ٥ دەگوترێ: (سطح الله الأرضُ) یان دەگوترێ: (سطح الخبز بالخور) نانکەرەکە بە تیرۆك نانەکەی پان کردەوە.

**سَطَحَ فلاناً**: فلانکەسی بە زەویدا داو خستی.

**سَطَّحَ البیت**: سەربانی خانوەکەی ڕێك خست، ڕاستەو پاستەی کرد.

**سَطَّحَهُ**: بەمانا (سَطَحَهُ) دێ.

**إنْسَطَحَ**: بڵاو بۆوە، ڕاخرا ٥ ڕاکشا، لەسەر پشتە مل خۆی درێژ کردو جوڵەی لەخۆی بڕی.

**تَسَطَّحَ**: ڕاکشا، تەخت بوو.

**اَلسَّطْحُ**: سەطحی هەموو شتێك لای سەرویەتی ٥ لە زانیاری ئەندازیاریدا بە قەبارەیەك دەگوترێ درێژی‌و پانی هەبێ.

**السُّطَّاحُ**: هەر ڕوەکێك بەسەر زەویدا بڵاو ببێتەوە.

**السَّطِیحُ**: ئەو کەسەی لەبەر نەخۆشی نەتوانێ هەڵسێ یان دانیشێ ٥ هەمبانەو کوندە.

**السَّطِیحَةُ**: کوندەو هەمبانە ٥ کەلە دوو پێست بێ.

**اَلْمِسْطَحُ**: خەرمانی خورما، خورماکانی تێدا بڵاو دەکرێنەوە بۆنەوەی وشك ببن (ك: مساطح) ٥ هەروا ناوە بۆ حەصیر کە لە پەڕی دارخورما دروست کرابێ ٥ کۆڵەکەی ڕەشماڵ‌و خێمە ٥ مەنجەڵی گەنم تێدا کوڵاندن ٥ داری ڕانگێودراو بە سەر کۆڵەکەی کەپرەمێودا ٥ تیرۆکی نان کردن.

**اَلْمُسَطَّحُ**: (أنف مُسَطَّحٌ) لوتی پانەوە بوو.

**سَطَرَ الکتاب سطراً**: کتێبەکەی نووسیەوە.

**سَطَرَ فلاناً**: فلانکەسی بە زەویدا دا.

**سَطَرَ الشَّیْءَ بالسیف**: بە شمشێر شتەکەی بڕیەوە.

**أسْطَرَ الشَّیْءَ**: شتەکەی بە هەڵە خوێندەوە ٥ دەگوترێ:

**أسْطَرَ إسْمِي**: ناوی منی نەخوێندەوە، ئەو دێڕەی ناوی منی تێدا نووسرابوو پەڕاندی.

**سَطَّرَ الکتابَ**: بەمانا (سَطَرَهُ) دێ.

**سَطَّرَ الورقةَ**: بە ڕاستە هێڵ‌و خانەی لەسەر کاغەزەکە دروست کرد.

**سَطَّرَ العبارةَ**: عیبارەتەکەی داڕشت ٥ دەشگوترێ:

**سَطَّرَ الأکاذیب**: درۆی هەڵبەستن.

**سَطَّرَ علینا**: چیرۆکی بۆ گێڕاینەوە.

اسْتَطَرَّ الكتابَ: كتێبەکەی نووسیەوە.

الأساطير: ئەفسانەو چیرۆکە کۆن ○ قسەی پڕوپوچ و بێ بنەما.

السّاطِرُ: قەساب.

السّاطورُ: کێردی قەساب ○ شمشێری قەساب ○ تەورزمەی قەساب کە کێردێکی زلە ئێسقانی گۆشتییەکەی پێ وردەکا ○ (ك: سواطير).

السَّطْرُ: ریزو چین لە هەرشتێك بێ ○ دەگوترێ: (سطر من الكتابة) (سطر مِن الشّجر) (ك: أسطر وسطور وأسطار).

السُّطْرَةُ: هیواو ئاوات.

السَّطّارُ: قەساب.

المِسْطارُ: شەرابێك بخۆرەوەکەی کەلەلا بکا ○ تەپو تۆزی بەرزەوە بوو بۆ هەوا ○ لە بواری رەسم و تەصویردا بریتییە لە قەڵەمێکی مەعدەنی لە شێوەی پاندانەا.

المِسْطَرة: راستە ○ ئەوەی کتێبی بێ دێر دێر دەکرێ ○ لە بواری ئەندازیاری و ریازەدا ئامێرێکی قەراخ تیزی راستە بەکاردەهێنرێ بۆ رەسم کردنی هێڵی راست.

المُسَطِّرُ: بالا دەست.

المُسْطَرين: کەمچەی بیناسازی.

سَطَعَ الشَّيْءُ سَطْعاً وسطوعاً: شتەکە بڵاو بووە ○ دەگوترێ:

سَطَعَت الرائحةُ: بۆنەکە بڵاوبووە ○ هەروا دەگوترێ: (سطع البرق في السماء وسطع الغبار وسطع النور).

سَطَعَ الأمْرُ: کارەکە دەرکەوت ئاشکرا بوو.

سَطَعَ الرَّجُلُ: پیاوەکە سەری خۆی بەرز کردەوەو ملی درێژ کرد.

سَطَعَ فلانٌ بيديه: فلانکەس چەپڵەی بە هەردوو دەستی لێ دا.

سطعت فلاناً رائحة المسك: بۆنی میسك لوتی فلانکەسی پڕکرد.

سَطِعَ سَطَعاً: ملی درێژ بوو ○ (فهو أسطع وهي سَطْعاءُ).

السُّطاعُ: درێژترین کۆڵەکەی زۆر رەشماڵە، ئەو کۆڵەکەی دەخرێتە ژێر ناوەراستی خێمەوە بۆئەوەی باراناو دەرکا ○ (ك: أسْطِعة وسُطُعٌ).

السَّطْعُ: هەرشتێك بڵاو بێتەوەو بەرز بێتەوە.

السَّطيعُ: بەیانی ○ درێژ.

المِسْطَعُ: زوبان رەوان و گفت و لفت شیرین ○ دەگوترێ: (خطيب مِسْطَعٌ).

السّاطِلُ: تەپو تۆزی بەرزەوە بوو.

السَّطْلُ: سەتڵ ○ (ك: أسْطالٌ وسطولٌ).

سَطَمَ البابَ سَطْماً: دەرگاکەی پێوە دایەوە.

الإسْطامُ: کۆڵەوەژ، ئاگر خۆشکەر

(ئاسنێكی درێژی سەرپان).

**الأسْطُمُ**: شەپۆلی دەریا ٥ بنەما.

**الأُسْطُمَةُ**: (أسْطُمَة القوم) پیاوی رێزداری قەوم.

**ألسَّطَامَ**: بەمانا (الإسطام) دێ ٥ تیزایی شمشێر ٥ تۆپەوانەی دیزەو گۆزەو ئەو جۆرە شتانە.

**ألسَّطْمُ**: تیزایی شمشێر.

**سَطَنَهُ**: چەسپاندیو قایمی كرد.

**سَطَا** الفَرَسُ سَطْواً وسَطْوَةً: ئەسپەكە ملی نەداو سەر رەق بوو.

**سَطَا** الْماءُ: ئاوەكە زۆر بوو ٥ (سَطا علیە وبە) پەلاماری داو هێرشی بۆبرد.

**سَطَا** علی الحامل: منداڵی سكی ئافرەتەكەی بە مردوویی دەرهێنا.

**سَطَا** الطعامَ وفیە: خۆراكەكەی خوارد دەستی بۆ بردو خواردی دەگوترێ: (ما سطوت في طعام أحد).

**أسطی علیە**: بەمانا (سَطَا) دێ.

**ساطاه**: شتەكەی لێ توندكرد.

**السَّواطي**: دەستەكان.

سَعَبَ لە كذا: شتەكەی بۆ رێكوپێك كرد.

**انْسَعَبَ**: رەوان بوو ٥ لێك كشایەوە.

**تَسَعَّبَ**: كشا ٥ لێك كشایەوە.

**السُّعْبُ**: هەرشتێك شلەمەنی بێو رەوان بێ.

**السَّعابیبُ**: ئەوەی درێژ دەبێتەوەو وەك داوە دەزوو شۆڕاوگە دەبەستێ وەك دۆشاوو هەنگوینو بنێشتو لیكو ئەو جۆرە شتانە ٥ دەگوترێ: (سال فَمُهُ سعابیبَ) دەمی لیكی درێژ بووە وەكوو هێڵە دەزوو ٥ تاكەكەی (سُعبوب و سُعْبوبة).

**سَعَدَ** سَعْداً وسعوداً: بەختەوەر بوو، كەوتە كامەرانیو خۆش بەختییەوە ٥ پێچەوانەی نەگبەتیو شومە ٥ دەگوترێ: (سَعَدَ یومُكَ) رۆژگارت بەختەوەر بێ.

**سَعَدَ** الله فلاناً: خودا فلانكەسی بەختەوەرو خۆشنود كرد.

**سَعِد** سَعادة: بەمانا (سَعَدَ) دێ ٥ (ك: سُعداء).

**سَعِدَ** الماءُ: ئاوەكە رۆیی سلۆبی هەیە پێویست بە ئامێری ئاو بەرز كردنەوە ناكا.

**أسْعَدَهُ الله**: خودا توفیقی فلانی دا (هو مُسْعَد ومسعود).

**أسْعَدَ الله فلاناً**: خودا یارمەتی فلانكەسی دا ٥ دەگوترێ:

**أسْعَدَت النائحَةُ الثَّكْلی**: ژنە شەپۆڕ گێڕەكە ژنە وایە شیرەكەرەكە هاوكاری ژنە كۆست كەوتووەكەی كردو لەگەڵیدا شینو شەپۆڕی گێڕا.

ساعَدَهُ على الأمر مُساعدةً وسِعاداً: يارمەتی دا لەسەر کارەکە.

اسْتَسْعَدَ برؤيته: دیتنەکەی بەخێرو فەڕ زانی‌و گەشبینی لێ بەدی کرد.

السّاعِدُ: قۆڵ‌و بازوو نێوان ئانیشك‌و بەرە دەست ◊ دەگوترێ: (شَدَّ الله على ساعدك) خودا یارمەتیت بدا.

ساعدُ القوم: سەرۆکی گەل‌و هۆز ◊ هەروا وشەی (ساعِد) ناوە بۆ ڕێڕەوی مۆخی ناو ئێسقان ◊ ڕێڕەوی ئاو بۆ ناو روبارو دەریا ◊ ڕێڕەوی شیر بۆ ناو گوان‌و مەمك ◊ (ك: سواعد).

سواعد الطير: باڵەکانی باڵندەیە ◊ دەشگوترێ: (أمرٌ ذو سواعد) کارێکی فرە لایەن‌و فرە خاوەن‌و فرە شێوازە.

السّاعِدَةُ: (ساعِدَة الساق) پارچە ئێسقانی قاچ.

السّعادة: بەختەوەری ◊ یارمەتی پەروەردگار بۆ بەندەی خۆی بەوە بەختەوەری بکا ◊ (پێچەوانەی بەدبەختی).

السَّعْدانُ: چقڵی درەختی خورما ◊ روەك‌و درەختی چقڵاوی ◊ لەپەندا هاتووە (مرعى ولا سعدان).

السَّعْدانة: کۆتر ◊ گرێیەکە لەلای خواروی لایەکانی تەرازو ◊ کەوانەی دەوری گۆی مەمك.

سعدیْك: دوعای خێرو خۆشی، واتە: خودایە بەختەوەری دوا بەختەوەریت بۆ دەستەبەر بکا.

السُّعُودُ (سعود النجوم): کۆمەڵە ئەستێرەیەکە هەریەکەیان پێی دەگوترێ: (سَعْد) ◊ ئەستێرەی (سَعْد السعود) یەکێکە لەو کۆمەڵە.

السّعید: روباری پچوك ◊ (ك: سُعُدٌ).

السّعیدة: (سعیدة القمیص): پەخەی کراس‌و شوێنی قۆپچەکانی.

سَعَرَ الفرسُ سعراناً: ئەسپەکە بە توندی بازی هاویشت.

سَعَرَ النارَ: ئاگرەکەی هەڵگیرساند ◊ دەگوترێ: (سعر الحربَ) شەڕەکەی گەرم کرد.

سَعَرَ القومَ بالنبل: خەڵکەکەی داخکردو سوتاندنی‌و چەوساندنیەوە ◊ شەڕو نەگبەتی بەسەرا بڵاو کردنەوە.

سَعَرَ الليلَ بالمطي: بە سواری وڵاخ شەوەکەی بەڕێ کرد.

سَعَرَ اليوم في حاجته: بۆ ئیشی خۆی سوڕایەوە.

سُعِرَ: برسی بوو ◊ تینوی بوو، برسێیەتی تینوایەتی تینی بۆ هێنا ◊ شێت بوو ◊ (هو مسعور).

**سَعِرَ سَعَراً وسُعْرَةً:** رەنگی مەیلەو رەش بوو (هو أسْعَرُ وهي سَعْراءُ) (ك: سُعُرٌ).

**أسْعَرَ النارَ والحربَ:** ئاگرەکەی هەڵگیرساند، شەڕەکەی هەڵگیرساند.

**إسْتعرت النارُ:** ئاگرەکە هەڵگیرسا ٥ دەگوترێ: (إسْتعر الشرُّ واستعر المرض) شەڕو ئاژاوە، نەخۆشی بڵاوبۆوە.

**استعرت الحربُ:** شەڕەکە گەرم بوو.

**استعر اللصوصُ:** دزو جەردەکان کەوتنە جمەوجوڵو وروژان.

**تَسَعَّرَت النارُ:** بەمانا (إستعرتْ) دێ.

**الأسْعَرُ:** داڵ گۆشت ٥ کەسێك نەوەنە کزو لاواز بێ دەماری لەشی دیاربن ٥ (وهي سَعْراء) (ك: سُعُرٌ).

**التسعير الجبري:** نرخ دانان بۆ شتومەك لەلایەن دەسەڵاتەوە (نرخ دانانی حکومەت).

**السَّاعورُ:** تەندور ٥ ئاگر ٥ (ك: سواعير).

**السَّاعورَةُ:** ئاگر ٥ (ك: سواعير).

**السُّعَارُ:** گەرمایی ئاگر ٥ ئازاری برسێیەتی ٥ تینوایەتی ٥ شێتی.

**السِّعْرُ:** نرخی کاڵا ٥ دەگوترێ: (لە سِعْرٌ) نرخی زیادی کرد، بەنرخە ٥ دەشگوترێ: (لیس لە سِعْرٌ) زۆر هەرزانە.

**سِعر السوق:** نرخی بازاڕ ٥ ئەو نرخەی لە بازاڕدا باوە.

**سِعر الصرف:** نرخی پارە بە گوێرەی دراوی دەوڵەتەکان ٥ (ك: أسْعار).

**السَّعْرُ:** شێت ٥ (ك: سَعْرى).

**السُّعْرُ:** گەرما ٥ ئارەزوی خواردنو برسێیەتی ٥ شێتی ٥ پەتاو تاعون ٥ پەکەی ئەندازەی گەرمی.

**السُّعُرُ:** شێت ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ﴾.

**السُّعْرَةُ:** کۆکەی بە شیدەت ٥ سەرەتای کارو گرنگی پێدانی.

**السَّعِيرُ:** ئاگر ٥ بڵێسەی ئاگر ٥ دەگوترێ: (خبا سعير النار) بڵێسەی ئاگرەکە دامرکا.

**المِسْعَارُ:** کۆڵەوەژی ئاگر تێکوەردان ئاسن بێ یان دار بێ.

**المِسْعَرُ:** بەمانا (المِسْعَارُ) دێ ٥ دەگوترێ: (هو مِسْعَر حرب) ئەو هەڵگیرسێنەری شەڕە ٥ (عنق مِسْعَرٌ) ملی درێژ.

**المَسْعُورُ:** چلێسو تێر نەخۆر ٥ گەدەی پڕ بووە هەر دەخوا ٥ شێتو وێت ٥ (ك: مساعير).

**سَعْسَعَ:** گەورە بوو بەرەو پیری رۆیی و

پۆڵكا ○ دەگوترێ: (سَغسَغَ الجسمُ) جەستەی بەهۆی پیری توشی نەخۆشی شەپلە بووە ○

سَغسَغَ الشَّعْرَ: رۆنی لە قژی دا.

تَسَغسَغَ: گەورە بوو چووە تەمەنی پیرییەوەو پۆڵكا.

تَسَغسَغَ الجسمُ: جەستەی گەورە بوو بەهۆی پیری پۆڵكا.

تَسَغسَغَ الشَّيْءُ: شتەكە نزیكی كۆتایی بونەوە بوو ○ دەگوترێ: (تَسَغسَغَ عمرە وتسعسع الشهرُ) ○ هەروا دەگوترێ:

تَسَغسَغَ حالە: حاڵو وەزعی شێوا بەرەو خراپی رۆیی.

سَعَطَهُ الدَّوَاءَ سَعْطاً وسعوطاً: دەرمانی كردە لوتیەوە.

أسْعَطَهُ الدواءَ: دەرمانی كردە لوتیەوە ○ دەشگوترێ:

أسْعَطَهُ علماً: زۆری هەوڵدا فێری زانیاری بكا.

اسْتَعَطَ الدواءَ: دەرمانی كردە لوتیەوە.

السُّعَاطُ: كەسكونی بۆنو بڵاوبونەوەی.

السَّعُوطُ: دەرمان كە دەكرێتە ناو لوت ○ هەروا بۆ وردەی جۆرە توتنێك كە دەكرێتە لوتەوەو هەڵدەمژرێ.

المِسْعُطُ: قوتوی بۆن، قوتوی دەرمان (ك: مساعط).

سَعَفَ بحاجة فلان سَعْفاً: ئیشی فلانی جێبەجێ كرد.

سَعِفَ الصَّبِيُّ: منداڵەكە توشی نەخۆشی پێست بوو.

سَعِفَتْ يَدُهُ سَعَفاً: دەوری نینۆكی قەڵشتن.

الإسعاف: فریاكەوتن ○ (جمعية الإسعاف) كۆمەڵەی فریاكەوتن كە ئەركی بەهاناوە چونی توشبوانی كارەساتو روداوە دڵتەزێنەكان چارەسەر بكەن.

السُّعَافُ: قەڵشانو درز بردنی قەراخی نینۆكەكان.

السَّعَفُ: لقە دارخورما ○ گەڵای دارخورمای وشكەوە بوو ○ جیازو بارو بارگەنەی بوك ○ (ك: سعوف).

السَّعَفُ: كاڵا.

السَّعَفَةُ: نەخۆشییەكی فیطرییە توشی پێست دەبێ.

السُّعُوفُ: سروشتەكان ○ شتومەكی ناو ماڵ ○ پیاڵەو پەرداخی گەورەو فراوان.

المُسَاعِفُ: نزیك ○ خزم.

سَعَلَ سُعالاً وسُعْلَةً: كۆكی (كۆكەی هات).

سَعِلَ سَعَلاً: چوستو چالاك بوو.

أسْعَلَهُ: چوستو چالاكی كرد.

**إستَسعَلَت فلانة**: فلانکەس وەکوو دێوی لێ هات.

**السَّاعِلُ**: شوێنی کۆکە لە گەروو دەمدا.

**السُّعَالُ**: کۆکـەو بەڵغـەم فڕێـدان ٥ (ألسُّعال الديكي) کۆکە ڕەشە ٥ جۆرە کۆکەیەکە بـە زۆریـی توشی منداڵ دەبێ.

**السِّعْلى**: دێـو (غـوڵ)، خێـو ٥ (ك: السَّعَالي).

**السِّعْلاةُ**: بەمانا (السِّعْلَى) دێ.

**أسْعَنَ فلان**: فلانکەس سێبەروکەیەکی بۆخۆی دروست کرد.

**تَسَعَّنَ**: پڕبوو لە چەوری.

**ألسُّعْنُ**: کوندەیەکە لە نێوە ڕاستەوە دەبـڕدرێو سـرکەی تـێ دەکرێت ٥ یـان دەکـرێ بـە ئـامێری ئـاو تێـدا خواردنەوە وادەبێ ئافرەت کوڵـكو مـۆو ڕیـسی تێـدا هەڵـدەگرێ ٥ (ك: سِعَنَةٌ واسْعان) هەروا ناوە بۆ سێبەرو سەقفێـکی سانەوی لەسـەر سـەربان دروست دەکرێ.

**السُّعْنُ**: بەزو پیوو دوگ.

**السُّعْنَةُ**: سێبەر (ك: سُعَنٌ).

**السُّعْنَةُ**: دەگوترێ: (ماله سُعْنَة ولا مُعْنَةٌ) واتە: هیچی نیە نەکەم نە زۆر.

**ألسِّعْوُ من الليل والسِّعْوَةُ منه**: بەشێـك لە شەو.

**ألسَّعْوَةُ**: مۆم.

**سـعى فـلان سَـعْياً**: فلانکـەس هەوڵیـدا کۆششی کـرد ٥ جا لەهـەر بوارێـکدا بێ.

**سـعى اليـه**: چـو بـۆلای، کردیـە ئامـانجی خۆی.

**سعى لعياله**: کاسبی بۆ ماڵو منداڵی خۆی کرد.

**سَعى في مشيه**: لە ڕۆیشتنیدا پەلەی کردو بازی هاویشت.

**سَعى الى الصلاة**: چوو بۆ نوێژ.

**سَـعى بـين الـصفا والمـروة**: لـەنێوان گردۆڵـکەی صـەفاو مـەڕوەدا هـاتوو چۆی کرد.

**سَـعى علـى الـصدقة**: هەوڵیـدا زەکـات لـە زەکات دەران کۆبکاتەوە.

**سـعى علـى القـوم**: بـوو بـە سـەرۆكو کاربەدەستی گەلو هۆز.

**سَـعى بـه سِـعَايةً**: فیتنـەو دوو زمـانی بـۆ کرد.

**سعى فلاناً سـعياً**: لـە فلانکـەس تێـکۆشەر تر بوو.

**أسعاه**: وای کرد کۆشش بکا ٥ هەڵینا بۆ سەعی کردن.

**ساعاهُ**: کۆششی لەگەڵدا کرد، پێشبڕکێی لەگەڵـدا کـرد لـە کۆشـشو سـەعی کردن دا.

تَسَاعوا الى كذا: بۆ بەدەست هێنانی ئەوە پێشبڕکێیان کرد.
إستسعاه: کردی بە کاربەدەستی زەکات کۆکردنەوە ٥ دەسەڵاتی دایە زەکات لە دەوڵەمەندەکان وەربگرێ.
استسعى العَبْدَ: کارێکی وای بە کۆیلە سپارد بتوانێ خۆی ئازاد بکا ٥ ئەگەر لەوە پێش هەندێکی ئازاد کرابێ و هەندێکی مابێ.
السّاعي: کاربەدەستی زەکات وەرگرتن ٥ دابەشکەری بەریدی فەرمانگەو نامەی پۆستە ٥ (ك: سعاة).
اَلْمَسْعَاةُ: ڕێزو شکۆمەندی ٥ (ك: مساع).
المساعي الحميدة: هەوڵدانی هەندێ لایەن و قسە ڕۆیشتوو بۆ ڕێکخستنەوەی نێوان بەشەڕ هاتووەکان و حەللی نیزاع و کێشەیان.
سَغَبَ سَغَباً وسُغُوباً: بەهۆی ماندویەتیەوە برسی بوو.
سَغِبَ سَغَباً وسَغابةً: بەمانا (سَغَبَ) دێ ٥ (فهو سَغِبٌ وهي سَغِبةٌ) (وهو سَغْبَان وهي سَغْبى).
أسْغَبَ: کەوتە ناو حاڵەتی برسێیەتی و گرانییەوە.
السَّغَابُ: برسێیەتی.
اَلْمَسْغَبَةُ: برسیایەتی و قات و قڕی.
قورئان دەفەرموێ: ﴿أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ﴾.
سُغِدَ: هاوسا.
سَغْسَغَ الشَّيئَ: شتەکەی لەقاند بۆئەوەی دەری بێنێ.
سَغْسَغَ الشيئ في التراب: سنگەکەی بەناو زەویدا داکوتا.
سَغْسَغَ الطعام: زۆری چەوری کردە ناو خواردەمەنیەکەوە.
سَغْسَغَ رأسَهُ بالدهن: سەری بە ڕۆن چەورکرد.
سَغْسَغَ الدُّهنَ في رأسِهِ: ڕۆنی کردە ناو قژی سەری.
تَسَغْسَغَتْ ثنيتُهُ: ددانی پێشینەی (کەڵبەی) لەقین.
تَسَغْسَغَ في الأرض: چوە ناو زەوییەوە.
تَسَغْسَغَ من الأمر: لەکارەکە ڕزگاری بوو.
سَغِلَ الرجلُ وغيرهُ: پیاوەکە جەستە بچوک و قاچ باریک بوو یان جەستەی ناقۆڵا بوو ٥ زەعیف و لاواز بوو ٥ ڕەوشتی ناشیرین بوو.
السَّغَلُ التناسلي: نەخۆشییەکی تەناسولییە تووشی کۆئەندامی زاووزێ دێ.
تَسَغَّمَهُ سَغْماً: خەم و خەفەتی گەیاندە دڵی و زۆری نارەحەت کرد.
أسْغَمَهُ: بەمانا (سَخَمَهُ) دێ.

**أَسْغَمَ الصَّبِيَّ**: خۆراكی ڕێـك و پێـك و باشی دا بە منداڵەكە.

**سَـغْمَةُ**: جـوان خـۆراكی پێـداو شـتی گونجاوی دەرخواردددا.

**سَغَمَ الفصيلَ**: بێچوومكەی قەڵەو كرد.

**سَـغَمَ الـشَّيْءَ**: زێـدە ڕەوی كـرد لـە ئاودانی، لـە چـەوركردنی دەگـوترێ: (سَغَمَ الزرعَ والطين ماءً وبه). (وسَـغَمَ الطعامَ دهنـا وبـه) ٥ (وسَـغَمَ المصباحَ زيتاً وبه).

**المُـسَغَّمُ**: منـداڵی بـەناز پـەروەردەو قەڵەوو خوباب.

**السُّغْنُ**: خۆراكی خـراپ و بـێ كەڵـك ٥ (ك: أسْغان) دەگـوترێ: (هم يتَعَيَّشُونَ بالأسغان).

**سَفِتَ الـشرابَ سـفتاً**: زۆری لـە شـەرابەكە خواردەوەو لێی تێراو نەبوو.

**استَفَتَ الشَّيْءَ**: شتەكەی برد.

**الـسَّفِتُ**: خۆراكێـك بەرەكـەتی تێـدا نەبێ.

**سَـفْتَجَ بالنقـد**: بـە شـێوەی حەواڵـە مامەڵەی بە پارەكەوە كرد.

**السُّفْتَجَةُ**: ئەوەیـە بازرگانەكـە مـاڵ بـدا بە یەكێك ئەوكەسە ماڵی لـە وڵاتـی پارە پێدەرەكە هەبێ لەوێ بیـداتێ و لێـرە وەری بگرێتـەوە ٥ واتـە: بـە شـێوەی حەواڵـە ٥ قازانجەكـەی لەوەدایە ئەركی هەڵگرتنی ماڵەكەو ترسی ڕێگای لەسەر شان لادەبا ٥ لە زانیـاری ئابوریـدا بریتییـە لـە حەواڵەیەك كە خاوەن قەرز كەسی سێیەم دەنێرێتە سەر قەرزدارەكەو داوای لێدەكا قەرزەكەی بداتە كەسە سێیەمەكە ٥ هەروا جۆری تریـشی هەیە.

**سَـفَحَ الـدَّمُ ونحـوه سـفوحاً وسَـفَحاناً**: خوێنەكە ڕژا.

**سَفَحَ الدَّم سَفحاً وسفوحاً**: خـوێنی ڕشـت ٥ پیاوی كوشت.

**سَفَحَ الماءَ والدَّمْعَ**: ئاوەكە، یـان فرمێـسكی ڕژاند ٥ (هو سافِحٌ وسفّاح وسُفُوح).

**سافحها مسافَحةً وَسفاحاً**: بەبێ نیكاحی شەرعی لەگەڵ ئافرەتەكەدا مایـەوە، خـەڵوەی كـرد ٥ دەشگـوترێ: (بينهم سفاح) لـەنێوان ئـەو كۆمـەڵ و تایەفـەدا خـوێن ڕشـتن هەیـە ٥ لـە یەكتریان كوشتووە.

**سَـفَحَ**: كارێـكی كـرد سوودی بـۆ خـۆی نەبوو.

**تسافحا**: لە نێوانیاندا خوێن ڕێژی هەیە.

**التَّسفحُ**: (سفح الجبل): دامێنی كێو ٥ بناری كێو (ك: سُفُوح) هەروا وشەی (سُفوح) ناوە بۆ دەركە شاخی ڕزیوو شاخە شینكە.

**السَّفَّاحُ**: ئەو كەسەی زۆر خوێن ڕێژو پیاو کوژبێ نازناوی یەکەم خەلیفەی عەباسیشە (أبو العباس السَّفَّاح).

**أَلسَّفِيحُ**: بەرگو پۆشاکی ئەستور ٥ قەدەحی قومار پارچە دارێکە راستەو پاستە دەکرێو بەرزیو نزمیو نەخشو نیگاری تێدا دروست دەکرێ هەر یەکەیان لەوی تر جیاوازە وەك داشدامە، بۆ قومار کردن بەکار دەهێنرێ.

**السَّفِيحان**: خورجی، تێرە ٥ دوو جەواڵی بەیەکەوە دوورواون دەمیان بۆ سەرەوە کراوەتەوە، دەخرێنە سەر پشتی وڵاخو شتی تێدەکرێ.

**أَلْمَسَافِحُ**: (مَسَافِح الوادی): ئاوەڕۆی شیو ٥ ڕێڕەوی ئاوی دۆڵ.

**أَلْمُسَافَحَة**: (ولد المُسَافحة) منداڵی زۆڵو حەرامزادە.

**أَلْمَسْفُوحُ**: پانو پۆڕ دەگوترێ: (جمل مسفوح الضُّلوع) حوشترێکی پەراسوو پانە ٥ دەشگوترێ: (هو مسفوح العنق) ئەو مل ئەستورو مل درێژە.

**سَفَدَ**: ئاژەڵە نێرەکە سواری ئاژەڵە مێینەکە بوو.

**سَفِدَ الذکر الأُنثى**: بەمانا (سَفَدَ) دێ.

**أَسْفَدَ الذکرَ**: وایکرد نێرەکە سواری مێیەکە بێ.

**سافَدَها**: سواری بوو.

**سَفَّدَ اللحمَ**: گۆشتەکەی بە شیشەوە کرد بۆ ئەوەی بیبرژێنێ.

**تَسَافَدَ الحیوان**: ئاژەڵەکان هەندێکیان سواری هەندێکیان بوون (نێرێو بەران تێکرا).

**تَسَفَّدَ البعیرَ أو الفَرَسَ**: لە دواوە سواری حوشترەکە یان ماینەکە بوو.

**اسْتَسْفَدَ البعیرَ أو الفرسَ**: بەمانا (تسفَّدَ) دێ.

**سَفَرَ سفوراً**: دەرکەوت ئاشکرا بوو ٥ دەگوترێ: (سفر الصبحُ) گزنگی بەیان دەرکەوتو روناکی دا ٥ ئاسۆ روون بۆوە.

**سَفَرَتِ الشَّمْسُ**: خۆر هەڵات ٥ (سفر وجهه حسناً) دەمو چاوو روخساری جوان بوو درەوشایەوە.

**سَفَرَت المرأةُ**: ئافرەتەکە خۆی سفور کرد، دەمو چاوو روخساری خۆی دەرخست بێگانە بیبینن.

**سَفَرَ الرجل سَفَراً**: پیاوەکە رۆیشت بۆ سەفەرو گەڕان.

**سَفَرَ الشَّیْءَ سَفْراً**: شتەکەی ئاشکرا کرد ٥ دەگوترێ: (سَفَرَ العَمَامَةَ عَنْ وجهه)

مێزەری لەسەر سەری خۆی لابرد.

سفرت الریحُ الغیمَ عن وجه السماء: ڕەشەباکە هەوری ڕوی ئاسمانی ڕامالّین .

سَفَرَ البَیْت: مالّەکەی مالّی، گەسکی لێدا ٥ دەشکوترێ: (سفر التراب) و (سَفَرَ الوَرَقَ).

سَفَرَ الکتاب: کتێبەکەی نووسیەوە ٥ (سَفَرَ البعیر) لغاوی کردە لووتی حوشترەکە.

سَفَرَ بین القوم: صولّحو ئاشتەوایی خستە ناو خەلّکەکەوە ٥ دەگوترێ: (هو سافرو سفیر).

أسْفَرَ: ئاشکرا بوو دەرکەوت ٥ دەگوترێ: (أسفر الصُبْحُ) و (أسفر وجهه).

أسْفَرَ فلانٌ: فلانکەس کەوتە ناو سەفەری بەیانییەوە.

أسْفَرَ بالصلاة: لە کاتی گزنگی بەیانیدا نوێژی کرد.

أسْفَرَت الشجرةُ: درەختەکە گەلاکەی وەری.

أسْفَرَت الحربُ: شەڕەکە قورس بوو، توند بوو.

أسْفَرَ البعیرُ: حوشترەکە بۆ سەفەرو گەشت ئازاو بەهێز بوو.

سافر مسافرة وسفاراً: چووە دەر بۆ گەڕانو گەشت ٥ وەغری کرد، مرد.

سَفَّرَهُ: وای لێکرد سەفەر بکا بچێ ٥ بۆ گەڕان.

سَفَّرَ النار: ئاگرەکەی هەلّگیرساند.

سَفَّرَ البعیرَ: لوتەوانە (لغاو)ی کردە لووتی حوشترەکە.

إنْسَفَرَ الشیءُ: شتەکە ئاشکراو دیار بوو ٥ دەشکوترێ: (إنْسَفَرَ مقدم رأسه) پێشە سەری تووکی پێوە نەما ٥ سەری روتایەوە ئەصلەع بوو.

تَسَفَّرَ: لەکاتی بەیانیدا هات.

تَسَفَّرَ الجِلدُ: پێستەکەی کاری تێکرا، ئازاری پێ گەیی.

تَسَفَّرَ النساءَ: داوای کرد ئافرەتەکان خۆیان سفور بکەن.

تَسَفَّرَ شیئاً عن حاجته: هەندێ پێویستیاتی خۆی دەرخستن پێڕاگەیی دەریان بێنێ.

اسْتَسْفَرَهُ: کردی بە شالیار لەنێو فلان گەل و نەتەوەدا.

اسْتَسْفَرَ النساءَ: ئافرەتەکانی سفور کردن.

المُسافِر: ڕێبوار (ك: سَفْرٌ وسافرة وسُفّار وأسفار) هەروا بەمانا: نووسەر دێ ٥ ئەو فریشتانەی نامەی عەمەلی ئادەمیزادەکان دەنووسن ٥ (ك: سفرة) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿بأیدی

سفرة كرام بَرَرَة﴾ ٥ دەگوترێ: (إمرأة سافر) ئافرەتێکە روخساری خۆی نیشانی بێگانە دەدا ٥ (ك: سوافر) ٥ دەگوترێ: (فرسٌ سافِرٌ) ئەسپێکی داڵگۆشت‌و لاوازە، کەم گۆشتە.

**السَّافِرَةُ**: مێینەی (السَّافر).

**السَّافِي**: یاقوتی شین کە یەکێکە لە جۆرە نایابەکانی گەوهەر ئەو شوێنانەی ئەم مادەیان هەیە (سیام، سیلان، بۆرما، هیند، کشمیر، ئوستراليا، مونتانا).

**السِّفَارُ**: ئاسنێکە یان چەرمێکە دەکرێتە لووتی حوشتر وەکوو لغاو بۆ ئەسپ، حوشترەکە سەر نەرم دەکا.

**السِّفَارة**: ئەرکی سەفیر، شوێنی سەفیر.

**السُّفَارَةُ**: گەسك لێدەر ٥ جادەو رێگا ماڵ‌و کەناس.

**السَّفَرُ**: بڕینی رێگا، رۆیشتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ٥ هەروا وشەی (السَّفَرُ) ناوە بۆ ئەو سپیایەی دوا خۆرئاوا بوون لە کەناری ئاسمانەوە دیارە.

**السَّفْرُ**: رێبوار ٥ شوێنکە لەسەر پێست بمێنێتەوە.

**السِّفْرُ**: کتێب ٥ یان کتێبی گەورە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ بەشێك لە تەورات.

**السُّفْرَةُ**: خواردەمەنییەکە بۆ رێبوار ئامادە دەکرێ ٥ تێشو ٥ تیشودان (هەمبانە) ٥ سفرەو خوان ٥ (ك: سُفَرٌ).

**السَّفِيرُ**: نێردراو ٥ ناوبژی کەرو رێکخەرەوەی نێوان دوو هۆزو گەل ٥ لە بواری یاسای نێو دەوڵەتیدا سەفیر بریتییە لە نێردراوێك لەلایەن دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر کە نوێنەرایەتی دەوڵەتەکەی یان سەرۆکی وڵاتەکەی دەکا لە وڵاتی بۆ نێردراودا ٥ دەڵاڵ‌و نێوانکاری فرۆشیارو کڕیار ٥ زاناو شارەزا لە بواری ئاوازەکاندا ٥ پیاوی لێهاتوو قسە خۆش ٥ (ك: سُفَراء) ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو پوش‌و پەڵاش‌و گەڵاو گوڵەی دەکەوێتە سەر زەوی‌و بنکی درەختەکان.

**السَّفِيرَةُ**: مێینەی (السَّفير)ە ملوانکەیەکی قوڵفە بەندە لە زێڕو زیو ٥ (ك: سفائر).

**الْمُسَافِرُ**: (مُسَافِر الوجه) ئەوەی لە روخسار دیارەو دەردەکەوێ.

**الْمِسْفَارُ**: بە کەسێك دەگوترێ ئازابێ بۆ سەفەر کردن، یان زۆر سەفەر بکا ٥ (ك: مسافر).

**اَلْمِسْفَرُ**: بەمانا (اَلْمِسْفارُ) دێ.

**اَلْمِسْفَرَةُ**: مێینەی (اَلْمِسْفَرُ) ٥ هەروا ناوە بۆ کەسك.

**اَلْمُسْفَرَةُ**: تۆپەڵی بەنی ڕێسراو (گلۆڵە ڕیس).

**اَلسَّفَرْجَلُ**: بەهێ ٥ درەختی بەهێ، درەختێکی گوڵی بەردارە، بەرەکەی خڕە وەکوو سێوو پڕتەقاڵ، شوێنی سەرەکی وڵاتی ئێرانەو لە هەموو وڵاتێکی تردا دەڕوێ ئەگەر ئاوو هەوای مام ناوەندی بێ ٥ بەرەکەی بەکاڵی دەخورێو دەکوڵێنرێو شەکری تێکەڵ دەکرێ مرەبای لێ دروست دەکرێ.

**سَفْسَطَ**: قسەی تێکەڵو پێکەڵو بێ بنەمای کردن، بەخەیاڵی خۆی حیکمەتو فەلسەفە بڵاو دەکاتەوە.

**اَلسَّفْسَطَةُ**: قیاسو پێکگرتنو قسە دامەزراندن لەسەر بنەمای وەهمو خەیاڵ مەبەست بۆڕدانی بەرامبەرو بێدەنگ کردنیەتی.

**اَلسَّفْسَطِيُّ**: ئەو کەسەی سەفسەطە چییەو بیرو بۆچونی هەڵە بڵاو دەکاتەوە.

**اَلسُّوفِسطائية**: پێڕێکن ئینکاری شتی حسیو ڕونو ئاشکرا دەکەنو بڕوایان بە هیچ نیە.

**سَفْسَفَ العملَ**: کارەکەی بە باشی ئەنجام نەدا ٥ دەغەڵی تێدا کرد.

**سَفْسَفَ الدقيق**: ئاردەکەی بێژا ٥ دەگوترێ: (سمعت سَفْسَفة المُنخُلِ) گوێم لە خشە خشی هێڵەکی ئارد بێژانەکە بوو.

**سَفْسَفَ الريحُ الترابَ**: ڕەشەباکە گڵو خۆڵەکەی بە حەوادا برد.

**اَلسَّفْسَافُ**: وردە ئارد کە لە هێڵەکەوە دادەبێژرێو کۆمەڵ دەبێ ٥ یان گڵە وردە کە کۆمەڵ دەکرێ ٥ شتی پڕو پوچو بێ کەڵك کارو گوفتاری بێ سوود ٥ (ك: سَفَاسِفَ).

**اَلسَّفْسَافَةُ**: ڕەشەبایەك گڵو خۆڵ رابدا بەسەر زەویدا.

**اَلْمُسَفْسِفُ**: چروكو دەست قوچاو، ڕەوشت ناشیرین.

**سَفْسَفَ الطائرُ**: باڵندەکە جیقنەی کرد.

**سِفْسَفَةَ السيف**: جەوهەرو شەپۆلی ورشە داری شمشێر.

**سَفُطَ سَفَاطَةً**: دڵی پاك بوو لەگەڵ سەخاوەتیدا.

**سَفَّطَ الحَوْضَ**: حەوزەکەی چاك کردو سواغی دا، لەبغی کرد.

**اسْتَفَطَ ما في الأناء**: هەرچی لە قاپەکەدا بوو خواردیەوە.

**تَسَفَّطَ ما في الأناء:** بەمانا (اسْتَفَطَ) دێ.

**السُّفَاطَةُ:** فش‌و فۆڵ‌و کلۆر.

**السُّفَاطَةُ:** شتی ناو ماڵ.

**اَلسَّفَطُ:** صندوقێکە ئافرەت عەترو مکیاج‌و شتی تایبەتی خۆی تێدا هەڵدەگرێ ٥ بە چنەو قەرتاڵەو زەمبیلە کە میوەی تێدا هەڵدەگیرێ ٥ میوەی تێدەکرێ ٥ توێکڵی سەر پێستی ماسی ٥ (ك: أسفاط).

**السَّفَّاط:** ئەو کەسەی صندوق‌و یەغدانی تایبەت بە کل‌و کولتورو عەترو میکیاجی ئافرەت دروست دەکا یان دەیفرۆشێ.

**اَلسَّفِيطُ:** ئەو خورما نەگەییوانەی کە هەڵدەومرن.

**سَفَعَ بعضو من أعضائه:** ئەندامێکی جەستەی گرت‌و رایکێشا بۆلای خۆی ٥ دەگوترێ: (سَفَعَ بناصیته) قژی پێشە سەری گرت‌و رایکێشا ٥ هەروا دەگوترێ: (سفع بناصية الفرس لیرکبە) یالی ئەسپەکەی گرت‌و سواری بوو.

**سَفَعَت السمومَ والشّمسُ والنارُ وَجْهَهُ:** رەشەباو هەتاوو ئاگر دەم‌و چاوو روخساری فلانی داخ کردوە هەڵیپروزاندوە، رەنگی پێستی گۆڕیوەو رەشی کردوە.

**سَفَعَ الشَّيْءَ:** شتەکەی نیشانە کرد ٥ داخی کرد.

**سَفِعَ سَفَعاً وسُفْعَةً:** رەنگی رەشی مەیلەو سور بوو (فهو أسْفَعُ وهي سفعاءُ) (ك: سُفْعٌ).

**سَافَعَهُ مسافَعَةً وسِفاعاً:** شەڕی لەگەڵ کرد، دەری کرد.

**سَفَّعَتِ النار وَجْهَهُ:** ئاگر دەم‌و چاوی هەڵپروزاندو پێستی رەش کردوە.

**اسْتَفَعَ ثيابَهُ:** پۆشاکەکەی لەبەر کرد ٥ بە زۆری بۆ پۆشاکی رەنگاو رەنگ بەکار دەهێندرێ.

**أسْتُفِعَ لونُه:** لە ترسا یان بەهۆی شتی ترەوە رەنگی گۆڕا.

**تَسَفَّعَ بالنار:** بە ئاگر خۆی گەرم کردەوە، خۆی بەر ئاگردا.

**اَلسُّفْعُ:** پۆشاك لە هەر جۆرێك بێ ٥ (ك: سُفُوعٌ).

**السُّفْعَاءُ:** سێ کوچکەی مەنجەڵ‌و دیزە ٥ کوتری ملیوانکە لەمل ٥ (ك: سُفُعٌ).

**السَّوَافِعُ:** گرو گەرمی بای سەموم.

**سَفَّ الطائِرُ سَفيفاً:** باڵندەکە لە نزیك زەوییەوە فڕی.

**سَفَّ الخوصَ والحَصيرَ سفّاً:** لقە دارخورماو حەصیرەکەی بە پەنجە تەنی.

**سَفَّ الدَّواءَ سَفّاً**: بە وشکی دەرمانەکەی خوارد نەیکردە هەویرو نەیشێلا ٥ دەگوترێ: (سَفِفْتُ الدواءَ).

**أسَفَّ الطائر**: بەمانا (سَفَّ) دێ.

**أسَفَّ السَّحَابُ**: هەورەکە لە زەوی نزیک بۆوە.

**أسَفَّ فلان**: فلانکەس هەوڵی کاری سوکانەی داو کاری خوێڕییانەی گرتە ئەستۆی خۆی.

**أسَفَّ الأمْرُ**: کارەکەی نزیک خستەوە، لێی نزیک بۆوە.

**أسَفَّ النظرَ اليه**: چاوی تێ بڕی‌و زۆری سەیرکرد.

**أسَفَّ البعيرَ**: ئالفی دا بە حوشترەکە ٥ ئالفی وشکی دایە.

**أسَفَّ فلاناً السَّفُوفَ**: دەرمانی وشکی دەرخواردی فلان دا، وایکرد فلان دەرمانەکە بە وشکی بخوا ٥ دەگوترێ: (أسَفَّ الجُرْحَ دواءً) دەرمانی وشکی خستە سەر برینەکە.

**أسَفَّ الفرسَ اللجامَ**: لغاوی کردە دەمی ئەسپەکە.

**أسَفَّ الخوص والحصيرَ**: پڕژە دارخورماو حەصیرەکەی تەنین.

**أسَفَّ الوشمَ**: خاڵەکەی بە نەوشاتر داپۆشی (سواخیدا) ٥ دەشگوترێ: (ما أسَفَّ منه بتافه) هیچی لێی دەس نەکەوت.

**أسِفَّ وَجْهُهُ**: روخساری گۆڕا.

**اسْتَفَّ السَّوِيقَ والدَّواءَ**: قاوتەکەو دەرمانەکەی بە وشکی خوارد.

**السُّفَّةُ**: ئەو پڕژو پاڵەی درەختی خورماکە دەتەندرێ‌و زەنبیلەو شتی وای لێ دروست دەکرێ ٥ گورزە پڕژو پاڵی دارخورما ٥ (ك: سُفَفٌ).

**السَّفُوف**: هەر دەرمانێك وشك بێ‌و نەکرابێ بە هەویرو ئاوی تێکەڵ نەکرابێ.

**السَّفِيفَةُ**: بەرچنەو زەنبیلەو شتی وا کە لە پڕژی دارخورما تەندرابێ.

**سَفَقَ**: بەمانا (صَفَقَ) دێ بە هەموو صیغەکانیەوە.

**سَفَكَه سَفْكاً**: ڕشتی، ڕۆی کرد ٥ دەگوترێ: (سَفَكَ الدَّمَ) خوێنەکەی ڕشت ٥ (سَفَكَ الماء وسفك الدمعَ) (هو سافِك وسفّاك).

**إنْسَفَكَ**: ڕژا، هەڵڕژا.

**السُّفْكَةُ**: ئەو زەڵاتەو تەوابیلانەی پێش خواردن لەسەر سفرەو خوان دادەنرێ ٥ (ك: سُفَكٌ).

**السَّفُوك**: درۆزن ٥ ناوێکە لە ناوەکانی نەفس‌و دەرون.

**سَفَلَ سفولاً وسفالاً وسُفالةً**: نزم بووە،

پێـــــچەوانەی بەرزبونەوەیـــــە دەگـــوترێ: (سَـــــفَلَ فِي الــــشيء) لەسەرەوە راهاتە خوار بۆ دامێن.

**سَــــفَلَ فِي علمــه وخلقــه:** لـە زانيـارىو رەوشتدا نزم بووە، شانسو بـەختى كەم بوو ٥ (هـو سَـافِلٌ) ٥ (ك: سُـفَّلٌ وسُفّالٌ وسَفَلَةٌ).

**سَفُلَ** سفالةً: خوێڕىو هيچو پوچ بوو.

**سَـفَّلَهُ:** نزمـى كـردەوەو بـەرەو خـوار ناردى دايبەزاندە خوار.

**اسْتَفَلَ:** بەمانا (سَفَلَ) دێ.

**تَـــسَفَّلَ:** ڕێـــزى دابـــەزى شـــكۆمەندى لەدەست دا.

**الأسْـفَلُ:** (أسْـفَلُ الـشّئ) خـوارووى شـت پێـچەوانەى ژوورووى ٥ (ك: أســـافِلُ وهي سُفلى).

**السَّافِلَةُ:** مێينـەى (الـسَّافِلَ) ٥ (وسـافلة الـــــشيء) لاى خـــواروى شـــت ٥ دەگـــوترێ: (ســـافلة الــرمح) نيــوەى رمــب بــەلاى دەسكەكەيدا ٥ (سـافلة النهـر) لاى خـواروى جـۆمو روبـار ٥ پێچەوانەى لاى سەروى.

**الـسُّفَالَة:** (سُـفَالَةُ الـشيء) لاى خـواروى شـت (سُفالة الريح): بەرامبـەرى ئـەو شوێنەى باى لێ هەڵدەبێ.

**الـسِّفِلَةُ مـن النـاس:** خـوێڕىو هـەتيو مجەى خەڵك.

**الـسِّفْلَةُ مـن النـاس:** خـوێڕىو هـەتيو مجەى خەڵك.

**المَسْفَلَةُ** (مـسفلة الـشيء): لاى خـوارووى شـت قـولايى شـت ٥ دەگـوترێ: (هــو يــسكن محــلاة المدينــة وانــا اســكن مَسْفَلَتها) ٥ (ك: مَسافِلُ).

**سَفَنَتِ الريحُ سُفُوناً:** بايەكە لەسەر زەوى بە نـزمـى هەڵبوو ٥ (فهي سافنة) (ك: سوافِن) ٥ (وهي سفون) (ك: سَفائن).

**سَــفَنَ الــشَّئَ سَــفْناً:** توێـكڵى لـە شـتەكە كردەوە سپى كرد.

**سَفَّنَ الشَّيْئَ:** بەمانا (سَفَنَ) دێ.

**الـسَّافِنُ:** رەگێـكە لـەناو پـشتدايە بـە درێژايى پشت پەيوەستە بە ڕيشەى دڵەوە پێشى دەگوترێ: (الأكحل).

**السِّفَانَةُ:** پيشەى كەشتى دروست كردن.

**الـسَّفَانُ:** كەشـتى دروسـتكەر وەسـتاى كەشتى دروستكردن.

**السَّفَانة:** لوئلوئو مروارى.

**الــــسَّفَنُ:** تەشـــوى، پـــاچ قـــوڵينگ. هەرشتێـــك شـــتى پــێ بتاشــرێ ٥ پێستى رەقو زبر.

**السَّفينة:** كەشتى ٥ (ك: سُـفُن، وسـفائن وسـفين) بـە حوشـترێش دەگـوترێ: (سفائن البر).

**اَلسَّوافِن**: با، رەشە با، تاكەكەی (سافنة).
**اَلْمِسْفَنُ**: بەمانا (السَّفَنُ) دێ ٥ (ك: مسافن).
**سَفِهَ نفسه ورأيهُ سفاهاً وسفاهَةً**: نەفسی خۆی هەڵنا بۆ سەفاهەتو رابواردنو بێ عەقڵی ٥ یان نیسبەتی دا بۆ سەفاهەت ٥ فەوتاندی بە هیلاكی برد.
**سَفِهَ صاحِبَهُ سَفْهاً**: لە سەفاهەتو بێ عەقڵیدا بەسەر هاوەڵەكەیدا باڵا دەست بوو لەوی تێپەڕاند.
**سَفِهَ سَفَهاً**: بێ وەزن بوو نەزان بوو ٥ دەگوترێ: (سَفِهَ علینا) بێجایی بەرامبەر كردین جنێوەی پێداین.
**سَفِهَ الحقَ**: حەقو راستی ژێر پێداو پابەند نەبوو پێیەوە.
**سَفِهَ نفسَه ورأيَهُ**: بەمانا (سَفَهَ) دێ.
**سَفِهَ فلاناً**: فلانكەسی بە نەزانو گێل لە قەڵەمدا.
**سَفِهَ الشرابَ**: زۆری لە شەرابەكە خواردەوە تێراو نەبوو.
**سَفِهَ نصيبَهُ**: بەشی خۆی لەبیر چۆوە.
**سَفُهَ فلان سفاها وسَفاهة**: بەمانا (سَفِهَ) دێ.
**سَافَهَهُ**: جنێوی پێدا.
**سَافَهَ الشرابَ**: زۆری لە شەرابەكە خواردەوە، زێدەڕەوی تێدا كردو لە گۆترە خواردیەوە.
**سافَهَ الطريقَ**: ملی رێگای گرتو بە خێرایی پێیدا رۆیشت.
**سَفَّهَهُ**: بە كاڵفامو نەزانی لە قەڵەمدا وای لێكرد گێلو نەفام بێ ٥ دەگوترێ: (سَفَّهَ الجهلُ حلْمَهُ) نەزانیو گێلی عەقڵی كەم كردو نەفام بوو.
**سَفَّهَ فلاناً**: نیسبەتی فلانكەسی بۆلای گێلی دا.
**تَسافَهَ عليهم**: بێ عەقڵی بەرامبەری نواندن.
**تَسَفَّهَت الرياحُ**: رەشەباكە تێكیەوە هاویشتو بوو بە گێژە لۆكە.
**تَسَفَّهَ فلان**: فلانكەس بە زۆرە ملێو تەكەللوف گێلیو سەفاهەتی بەسەر خۆیدا هێنا.
**تَسَفَّهَ عليه**: قسەی ناشیرینی بەرامبەر كردنو رێزی شكاند.
**تَسَفَّهَ الريحُ الشَّيْئَ**: رەشەباكە شتەكەی حەواداو هێنایيو بردی.
**تَسَفَّهَ فلاناً عن الشَّيْئَ**: فلانكەسی لە شتەكە لاداو فێڵی لێكرد.
**السَّافِهُ**: ئەحمەقو گێل ٥ زۆر تینو ٥ كەسێك زۆری تینوبێ.
**السَّفِيهُ**: كەسێك بە نەفامیو گێلی ماڵو سامانی خۆی خەرج بكا ٥

نەزانو کاڵفام ◦ (ك: سفهاء) ◦ دەگوترێ: (ثوب سفيه) قوماشێکە چنینەکەی خراپە (زمام سفِيه) لغاوێکە نارێکو پێك ◦ (ناقةٌ سفيهة) حوشترێکی سوك رۆیە، بەهێواشی دەڕوا .

اَلْمَسْفَهَةُ: خواردنێك کە زۆر ئاو کێش بێ.

سَفَا سُفُوّاً: پەلەی کرد ◦ دەگوترێ: (سفا في مشيه): لە رۆیشتندا پەلەی کرد (سفا في طيرانه): لە فڕیندا پەلەی کرد.

سفا فلان: فلانکەس بەندایەتی خودای کرد تەوازوعی نواند ◦ شیعری ناسكو جوانی هەبوو ◦ عەقڵو هۆشی لاواز بوو.

سفا الريحُ الترابَ ونحوه سَفْياً: رەشەبایەکە گڵو خۆڵەکەی هەڵگرت ◦ بڵاوی کردەوە ◦ (فالريحُ سافية) (ك: سوافٍ) گڵو خۆڵەکە پێی دەگوترێ: (مَسْفِيٌّ، ساف، سَفِيٌّ).

سَفِيَ الشَّيْءَ سَفىً: شتەکە سوك بوو تەنك بوو دەگوترێ: (سَفِيَ شعر ناصيته) قژی پێشە سەری تەنك بوو ◦ سەری روتایەوە.

سَفِيت البَغْلَةُ: هێسترەکە جەستە سوكو خێرارۆ بوو.

سَفِي الحيوانُ أوالانسانُ: ئاژەڵەکە یان ئادەمیزادەکە کزو لاواز بوو (هو أسفى وهي سفواء).

أسفى فلان: فلانکەس گڵەکەی گواستەوە ◦ لاواز بوو.

أسفى بصاحبه: خراپەکاری لەگەڵ هاوەڵەکەی کرد ◦ فیتنەیی بۆکرد.

أسْفى الزَرْعُ: کشتو کاڵەکە دەوروبەری گوڵە دانەوێڵەکانی زبربوو پێگەیی.

أسْفى فلاناً: فلانکەسی هەڵنا بۆ شتی پڕوپوچو خوێڕیەتی.

أسفى الريحُ الترابَ: رەشەباکە گڵو خۆڵی حەوادا رایدا بڵاوی کردەوە .

السَّافِياء: تەپو تۆز ◦ رەشەبایەك گڵو خۆڵی زۆر هەڵبگرێ.

السَّفَا: گڵو خۆڵ ◦ درەختی چقڵاوی ◦ خودی چقڵو دڕکەکان.

السِّفَاء: دەرمان.

السُّفِيَّةُ: زیدەیەکی باریکە کۆتایی سەری پەلکە گەڵای هەندێ درەختو روەکی پێ دی ◦ وەکو پەلکە گەڵای سینامەکیو کۆکا.

سَقِبَ سَقَباً وسقوباً: نزیك بووە (هو ساقِبٌ وسقيب).

أسْقَبَ: نزیك بووە (أسقَبَ الشيَ) شتەکەی نزیك کردەوە.

سَاقَبَة: لێی نزیك بۆوه.

تسَاقبا: لێك نزیك بوونەوه.

السِّقَابُ: پارچە لۆکەیەکە لە سەردەمی پێش ئیسلامدا ئافرەتی عەرەب بە خوێنی خۆی سوری دەکردو لەسەر سەری خۆی قایمی دەکرد لکێکی لە ژێــر سەرپێــچەکەیەوە دەهێنایــە دەرەوە تــا خەڵــك بــزانن مێــردی نەماوە، یان براو کەسێکی نزیکی لە دەست داوە (ك: سُقُبٌ).

الــسَّقْبُ: بێــچوە حوشــتر ئەوکاتــەی لەدایك دەبێ ٥ درێژ لەهەر شتێــك بێ ٥ کۆڵەکەی خێمەو رەشماڵ (ك: أسْقُب وسُقوب وسِقاب وسِقبان).

أَلــسَّقَبُ: نزیــك ٥ دەگــوترێ: (مــنزل سَقَبٌ) مەنزڵی نزیك ٥ لە حەدیثــدا هاتووە (أَلجارُ أحق بِسَقَبِهِ).

الــسَّقِيبَةُ: کۆڵەکــەی خێمــەو رەشمــاڵ ٥ (ك: سقائب).

سَقَدَ فرسَهَ سَقْداً: ئەسپەکەی لاواز کرد.

السُّقُدُ: ئەسپی لاواز ٥ (ك: أسْقاد).

الــسُّقْدَةُ: باڵندەیەکــە گۆشــت خــۆرە جەســتەی پــچوکە، باریکەڵەیــە، دەنــــدوکی رەقو رەشــــە جــرو جانــەوەری پــێ کۆدەکاتــەوە، پــشتی خاکییە، کەنارو قەراخی پەرو باڵی بوننیە، بەر ورگی سپییە، سینگو کلکیو قاچی سورن ٥ لە وڵاتانی ئەوروپاو سیبریا دەژی ٥ (ك: سُقُدٌ).

سَقَرَ سَقْراً: دوور کەوتەوە.

سقرت النار أو الشمسُ فلاناً: ئاگر یان خۆر پێستی فلانی رەش هەڵگێرا ٥ ئازاریدا سوتاندی، داخی کرد.

أسْقرت النخلةُ: خورماکە دۆشاوی لەبەر رۆیی ٥ شیرینی لێ چۆڕایەوە ٥ دۆشاوی لێ تکا.

السَّاقور: گەرمایی ٥ گەرمی ٥ ئاسنی داخکــردنو نیــشانەکردنی ئــاژەڵو شتی وا ٥ (ك: سواقیر).

السَّقْرُ: گەرمی خۆر یان گەرمی ئاگر، ئــازاری گەرمییەکــە ٥ یــان دۆشــاو ٥ (ك: سقور).

سَقْسَقَ الطائر: باڵندەکە بە دەنگی نــزم خوێندی ٥ جیقنەی کرد.

أَلْمُسَقْسِقُ: شیعر خوێندنەوە بە نۆرە، واتـــە: دوو کــــەس بـــە نـــۆرە هەریەکـــەیان دێـــڕە شیعرێـــك بخوێنێتەوە.

سَقَطَ سُقُوطاً وسَقْطاً: کەوت ٥ کەوتە خوار ٥ دەگوترێ: (سقط من كذا في كذا أو على كذا أو إلى كذا) لە پەندی پێشینانـدا هـاتووە دەڵێ: (سَــقَط

العشاءُ به علي سِرحان) بـه كەسێـك دەگـوترێ هـەوڵی بەدەسـت هێنـانی شتێك بداو سەری خۆی دانێو تێدا بچێ.

**سَقَطَ** الجنين من بطن أمـه: زارۆكەكـە پێش نـۆ مـانگی لـە سـکی دایکـی کەوتـە خوار ◦ بە نەکاملی لە دایك بوو.

**سَقَطَ** الكوكبُ: ئەستێرەكە ئاوا بوو .

**سَقَطَ** الحَرُّ أو البردُ: گەرما یان سەرما هات.

**سَقَطَ** عني: لاچوو دەرهات.

**سَقَطَ** في كلامه وبه: هەڵەی کـرد لـە قـسە کردندا تێکەوت.

**سَقَطَ** من عـيني و مـن منزلتـه: پـێش چـاوم کەوت ◦ رێزی لام نەما.

**سُقِطَ** في يده: پەشیمان بووە، سەر سام بوو ◦ قورئان دەفـەرموێ: ﴿ولما سُـقِطَ في أيديهم﴾.

**أسْقَطَ** في قوله أو فعله: هەڵەی کـرد لـە قسەدا یان لە کـردەوەدا ◦ دەگـوترێ: (تَكَلَّـمَ فمـا أسـقط في كلمـة) قـسەی کردو هیچ هەڵەیەکی لـە قـسەکەیدا نەکرد ◦

**أسْقَطَ** له: بە قسەی پرو پوچ ئاخاوتنی لەگەڵ کرد.

**أسْقَطَتِ** الحامل الجنين: ئافرەتە سکپڕەکە منداڵەکەی لەبارچوو.

**أسْقَط** الـشَّيْءَ: شـتەکەی خـست، بـەری دایە خوارەوە.

**أسْقَطَ** فلاناً: لە شان و شکۆی فلانی کەم کـردەوە، شـکاندی هـەوڵی لەگـەڵ فلانـدا هەڵەی پێبکـا یـان درۆ بکـا، ئەوەی لایەتی بیدرکێنێ.

**أسْـقَطَ** الخَبَـرَ: وردە وردە هەواڵەکـەی وەرگرت.

**أسْـقَطَ** كـذا مـن كـذا: ئـەوەی لـەوە دەرکردو لێی کەم کردەوە.

**أُسْقِطَ** في يده: بەمانا (سُقِطَ) دێ.

**سَاقَط** الشَّيْءَ مُسَاقطة وسِقاطاً: شتەکەی خـستە خـوار، دایگـرت ◦ بـەردەوام بـوو لەسـەر خـستنە خـوارەوەی شتەکان یەك لەدوا یەك.

**ساقطَ** فلانٌ فلاناً الحديثَ: فلان قسەی بۆ فلان کردو ئـەویش گوێی بـۆ گـرت، ئـەمجار ئـەویان کەوتـە قـسە کـردن ئەمیان گوێی بۆ گرت.

**سـاقَطَ** الفـرسُ العَـدْوَ: ئەسـپەکە بەهێواشی بازیدا.

**ساقط** الحِصانُ الخيـلَ وغيرهـا: ئەسپەکە پێش ماینەکە کەوت.

**تسَاقَطَ**: بەمانا (سَقَطَ) دێ ◦ یەك لەدوا یەك کەوتنە خوار.

**تَسَاقَطَ** عليه: خۆی فرێدایە سەری.

**تَسَقَّطَ** فلانـاً: داوای خـستنە خـوارەوەی فلانـی کـرد ◦ فلانکەسـی هـەڵنا بۆئـەوەی خـۆی بخـا، رێـزی خـۆی بشکێنێ ◦ بکەوێتە هەڵەوە، درۆ بکـا.

إسْتَسْقَطَهُ: بەمانا (تَسَقَّطَهُ) دێ.

الإسْقاطُ: لە بواری پزیشکیدا منداڵ لەبار چوونی ئافرەتە بە چوار مانگی تا حەوت مانگی.

السَّاقِطُ: خوێڕیو هەتیو مچە ○ دواکەوتوو لە بەدەست هێنانی بەختەوەریو بڕوا نامەو دەستکەوتەکانی ژیان ○ (ك: سُقاط) بۆ مێینە دەگوترێ: (ساقطة) (ك: سواقط) دەگوترێ: (لکل ساقِطة لاقطة) بۆ هەموو قسەیەکی خراپو بێ کەڵک کەسانێک هەن بیان قۆزنەوەو بڵاویان بکەنەوە ○ یان بۆ هەموو شتێکی خراپ داخوازێک هەیە.

السِّقاطُ: ئەو خورما نەگەیوانەی هەڵدەوەرن ○ هەڵەو هەڵخلیسکان ○ باڵی باڵندە، یان ئەو بەشەی باڵی کە لە زەوی دەخشێ لەکاتی رۆیشتن بەسەر زەویدا.

السِّقاط مِن الشَّيْءِ: لایەکی شتەکە ○ قەراخی شت.

سِقاطا اللیل: دوو لایەنی تاریکی شەو.

السُّقاطُ: هەرچی لە شت بکەوێتە خوار، پڕزو پاڵو وردەو بنزیلو خشتو خۆڵ.

السُّقاطَةُ: بەمانا (السُّقاط) دێ.

السُّقْطُ: هەرچی بەربێتەوە بە نەکاملی ○ زارۆکو منداڵی لەبارچوو پێش تەمەنی نۆ مانگی ○ پزیشکە ئاگر کە لە بەردەستیو شتی وا دەبێتەوە ○ کۆتایی لمبەلان ○ (ك: أسقاط).

السَّقْطُ: ئەو پڕزانەی لە شەونم دەکەونە خوار ○ بەفر ○ ئادەمیزادی خوێڕیو هیچو پوچ.

السِّقْطُ مِن کل شيءٍ: قەراخی شت ○ ئەملاو ئەولای شت ○ باڵی باڵندە، یان ئەوەی لە زەوی دەخشێ لە کاتی رۆیشتنیدا ○ (ك: أسقاط) (سقطا اللیل) ئەمپەڕەو پەڕی تاریکییەکەی.

السَّقَطُ: هەڵوەریوو بەربۆوە لەهەر شتێك بێ ○ شتی خراپو بێ کەڵک ○ بۆیە بە ورگو ریخۆڵەی کوشتی دەگوترێ: (سَقَط) ○ هەروا ئاوە بۆ قسەو کردەوەی هەڵە ○ (ك: أسقاط).

أسقاط الناس: خوێڕیو هەتیو مچەی ئادەمیزاد.

السَّقْطَةُ: جارێك کەوتنو بەربوونەوە ○ بەلای هەژێنەر ○ هەڵەنگوتن ○ (ك: سِقاط).

السَّقْطِيُّ: فرۆشیاری کاڵای خراپو بێ کەڵك.

**السَّقَّاط**: بەمانا (السَّقطيّ) دێ.
**الـسُّقاطَةُ**: شتێـکه لـەلای سـەروی دەرگاوەیه دەرگاکەی پێ قفڵ دەدرێ (سورگی).
**الـسُّقُوط**: (سُـقُوط الـذِراع) لـه بـواری منداڵبونـدا لـەجێ چـوونی شـانو شـەپیلکه، یـان هاتنـه دەرەوەی دودەستیەتی لـه پـێش سـەردا ٥ لـه بـواری قانونـدا کۆتـا پێهێنـانی کێشەیه پـێش بڕیـاری دادگـا، دوای تێپـەڕ بـوونی ساڵێـك بەسـەر نواندنیداو وەگەڕ نەخستنی.
**الـسَّقِیطُ**: بـەمانا (الـسَّاقِط) دێ ٥ ئـەو پڕژانەی له شەونم دەکەونه خـوار ٥ تـەرزه ٥ سـەهۆڵ ٥ (ك: سُـقُطْ) ٥ هەروا ناوه بۆ گێلو ئەحمەق ٥ (ك: سقائِط).
**السَّقِیطَةُ**: مێینەی (اَلسَّقِیط) ٥ ئافرەتی بێ رەوشتو چەتیوەو بێ رێز.
**اَلْمِـسْقاطَ**: ئـافرەتی وەهـا منـداڵی بـۆ رانەوەسـتێ، هـەر منـداڵی لـه سـکی بکەوێ به نـەکامڵی لـه بـاری بـچێ ٥ (ك: مَسَاقِیط).
**اَلْمَسْقَطُ**: شوێنی بەربوونەوەو کەوتنـه خوارەوە.
**مَـسْقَطُ الـرأس**: شـوێنی لـەدایکبوون ٥ دەگـوترێ: (فـلان یحـن الی مَـسْقطِهِ) فلانکەس بیری شوێنی لـەدایکبوونی خۆی دەکاتەوە بۆی دەکورکێنێ.
**مَسْقَطُ الـنجم أو الغیـث**: ئـەو شوێنەی ئەستێرەکه یان بارانەکه لێـی دەدا ٥ دەگـوترێ: (هـم ینتجعـونَ مـساقط الغیث) ئەو خێڵە لەو شوێنه مانەوه کـه بـارانی لێ بـاریو لـەوەڕو ئـاوی لێیه.
**مَسْقَط الرمل**: کۆتایی لمبەلان ٥ (مَسْقط الـضوء) ٥ پەنجـەرەو کولانـەی کـه روناکی لێوه دێته ناو ماڵەوە.
**اَلْمَسْقَطُ**: بـاڵی باڵنـده، یـان ئـەو سـەره پەڕو باڵەی لەکاتی ڕۆیشتنی باڵنـده بەسەر زەویدا له عەرز بخشێ ٥ (ك: مساقط).
**اَلْمَسْقَطَةُ**: هۆی بەر بوونـەوە، داخـوازی بەر بوونەوە (ك: مساقِط).
**السُّقْطِرِيُّ**: هـەر شتێـك نیـسبەت بـدرێ بـۆ (سقطري) کـه دورگەیەکـه لـەناو دەریـای هینـددا ٥ دەگـوترێ: (صُـبِرٌ سُقُطْرِي) تاڵی سوقوطری.
**سَـقَعَ سَـقْعاً**: ڕۆیـشت ٥ (سـقع الـدیك) کەڵەشێرەکه خوێندی.
**سَقَعَ الشَّيْءَ الـصُّلْبَ**: بـه شتێـکی ڕەق لـه شته ڕەقەکەیدا.
**الأَسْقَعُ**: دوژمـنو حەسـوود کـه بێـگانه بـن ٥ قەلـه ڕەشـه ٥ باڵندەیـەکی

جەستە پچوکە وەکوو چۆلەکە وایە هەندێ بەشی پەڕو باڵی سەوزە ٥ سەری سپییە ٥ زۆر حەزی لە نزیک ئاوە ٥ (ك: أساقع).

**سَقَفَ البَيْتَ سَقفاً**: سەقفو هەلاشی بۆ خانووەکە کرد.

**سَقِفَ سَقَفاً**: درێژ بوو بە مەیلەو خواری ٥ ئێسقانی ئەستوور بوون.

**سَقِفَ الرجلُ**: پیاوەکە لاخوار بوو ٥ (سَقِفَ الظليمُ) بێچوە نوعامەکە ملی خوار بوو ٥ (هو أسقَفُ وهي سقفاء) (ك: سُقُفٌ).

**أسقَفَ النصارى فلاناً**: مەسیحیەکان فلانکەسیان کردە ئوسقوفی خۆیان واتە: کردیان بە کەشیش بەسەر خۆیانەوە.

**سَقَّفَهُ**: بەمانا (أسْقَفَهُ) دێ.

**تَسَقَّفَ**: بوو بە ئوسقوف (کەشیش).

**الأُسْقُفُ**: سەرۆکێکە لە سەرۆکەکانی مەسیحی پلەی لە ژوور پلەی کەشیشەوەیەو لەخوار مەطرانەوەیە ٥ (ك: أساقفة، أساقف).

**الأُسقُفِية**: پلەی ئوسقوف ٥ ئەو مەسیحیانەی لە ژێر کۆنترۆڵی ئوسقوفێکدان ٥ ئەو هەرێمو ناوچەیەی لە ژێر فەرمانی ئەودان.

**السَّقْفُ**: هەلاشی خانوو (سەقفی خانوو) ٥ ئاسمان ٥ (ك: سقوف وأسقف وسُقُفٌ).

**السَّقَّاف**: کەسێک پیشەی سەقف دروست کردن بێ.

**السَّقِيفُ**: بەمانا (السَّقْفُ) دێ ٥ (ك: سُقُفٌ).

**السَّقِيفَةُ**: کەپرو سابات ٥ شتێک سێبەر بکا.

**سقيفة بني ساعدة**: ساباتێک بوو موسوڵمانان لە ژێریدا بەیعەتیان بە ئەبوبەکری صدیق کرد بۆ جێ نشینی ٥ هەروا ئاوە بۆ هەر تەلە بەردێکی پان کە بکرێ بە سەقفو سەرقاپ بۆ جۆگاو بیرازو شتی لەو جۆرە ٥ لەوحی کەشتی ٥ هەر پارچە زیوو ئاڵتونێک کە وردو چەکوچ لێ دراو بێو درێژ بوبێ ٥ شەپکەی دار؛ کە دەخرێتە سەر ئەندامی شکاوو پێی هەڵدەبەسترێتەوە ٥ (ك: سقائف وسُقُفٌ).

**المُسَقَّفُ**: درێژ.

**سَقِلَتْ اليدُ أو الرِّجْلُ سَقَلاً**: دەستەکە یان قاچەکە خوار بوو ٥ (فهو أسْقَلُ وهي سقلاء) (ك: سُقْلٌ).

**الإسْقالُ**: پیوازە مشکە؛ روەکێکی بە

تەمەنە پێی دەگوترێ: (عُنصُل).

**الإِسْقِيلُ**: بەمانا (الإِسقالُ) دێ.

**السَّقَالَةُ**: بەمانا (الاسقالة) دێ.

**السُّقْلُ**: کەلەکە.

**السَّقِيلُ**: کەلەکە تێك قوپیو (قەد باریك).

**سَقِمَ** سَقَماً وسَقاماً: نەخۆشییەکەی درێژەی کێشا.

**سَقُمَ** سَقْماً وسقاماً وسقامةً: بەمانا (سَقِمَ) دێ.

**أَسْقَمَ فلانٌ**: نەخۆشی یەك لە دوای یەك پەخەیان گرت.

**أَسْقَمَ اللهُ فلاناً**: خودا فلانکەسی نەخۆش خست ٥ دەشگوترێ: (أسقَمَهُ العِشقُ وأضناه) عیشقو سۆز نەخۆشی خست ٥ کزو لاوازی کرد.

**سَقَّمَهُ**: بەمانا (أَسقَمَهُ) دێ.

**السَّقِيمُ**: دەگوترێ: (هو سقيم الصدر على أخيه) رقی لە براکەیەتی حیقدو کینەی هەیە بەرامبەر براکەی ٥ (فهو سقيم وكلام سقيم) تێگەیشتنی لاواز، قسەو ئاخاوتنی لاواز ٥ (ك: سُقُمٌ، وهي سقيمة) (ك: سقائم).

**المِسْقَامُ**: کەسێك زۆر جار نەخۆش ببێ.

**المَسْقَمَةُ**: (أرض مسقمة) ئەرزێکە زۆر نەخۆشی تێدا پەیدا دەبن.

**السُّقْلُونیا**: گیایەکە دەرمانی رەوانیو سکچونی لێ دەردەهێندرێ هەروا دەرمانی کرمیشی لێ دروست دەکرێ.

**سَقِيَ بَطْنُهُ سقياً**: لە بۆشایی ورگیدا جۆرە شلەمەنییەکی نەخۆشی تێدا پەیدا بوو کە چاکبونەوەی زەحمەت بێ.

**سقي العِرقُ**: رەگەکە خوێنی بەربوو نەوەستایەوە.

**سقى الحيوانَ والنباتَ**: حەیوانەکە یان کشتو کاڵەکەی ئاودا.

**سقاه غيثاً**: بارانی بەسەردا باراند.

**سقى الثوبَ**: قوماشەکەی رەنگ کرد، لە خمی دا ٥ دەشگوترێ: (سقاه صِبْغاً) ٥ (ك: سُقاة وسُقاء وسُقِيٌّ).

**سُقِيَ بطنُه**: سکی چوو، رەوان بوو.

**سُقِيَ قلبُهُ عداوةً**: دڵو دەروونی بە دوژمنایەتی ئاودراوە ٥ (أسقاه) بەمانا (سقاه) دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَسْقَيْنَاكُم مَّاء فُرَاتًا﴾ ٥ ئاوی بۆ دابین کرد ٥ دەگوترێ: (أسقاه جدولاً من نهره) جۆگە ئاوێکی لە چەمەکە بۆ جیاکردەوە.

**أَسْقَى فلاناً**: شوێنی ئاوی نیشانی فلانکەس دا ٥ پێی گوت: خودا تێراوت بکا.

**ساقى فلاناً ماءً أو شراباً:** بەمانا (سقاه) دێ.

**ساقى فلاناً شجرَهُ أو أرضَه:** باخەكەی یان زەوییەكەی دا بە فلان بۆئەوەی بەخێوی بكاو ئاوی بداو ئاوەدانی بكاتەوەو بەشێكی لە بەرو بوومەكە بدرێتێ.

**سَقّاهُ:** زۆری ئاودا زیاد لە پێویست ئاودێری كرد.

**سَقّى الثَّوْبَ كذا من الصبغ:** چەند جارێك قوماشەكەی لە رەنگەكە هەڵكێشاو لە خمی دایەوە.

**سَقّى فلاناً:** بە فلانكەسی گوت خودا تێراوت بكا.

**استقى فلاناً ومنه:** داوای ئاوی لە فلانكەس كرد.

**استقى من النهر أو البئر:** لە ئاوی روبارەكە یان لە ئاوی بیرەكەی هەڵێنجا.

**استقى المعارفَ أو الأخبارَ من كذا:** زانیاریو هەواڵی لە فلان شتەوە دەست كەوت.

**تساقى القومُ:** خەڵكەكە هەر یەكەیان ئاوی دا بەوی تریان ○ دەشگوترێ: (تساقوا كؤوس المنية) خەڵكەكە لەناو خۆیاندا بوو بە شەڕیانو یەكتریان كوشتو بڕ كرد .

**تَسَقّى:** تێراو بوو ئاومكەی تێ بووروا ○ (تَسَقّى السائلَ) شلە مەنیەكەی خواردەوە ○ دەگوترێ: (تَسَقّى الجلدُ الدَّمَ) پێستەكە خوێنەكەی هەڵمژی.

**إسْتَسْقى بطنُهُ:** بەمانا (سَقى) دێ.

**إسْتَسْقى فلاناً:** داوای ئاوی لە فلان كرد.

**الاستسقاءُ:** داوای باران بارین پاڕانەوە لە خودا بۆ باران بارین ○ (صلاة الاستسقاء) نوێژە بارانە ○ هەروا ناوە بۆ كۆبوونەوەی شلە مەنیەكی تایبەتی لە بۆشایی بریتونیدا كە نەخۆشییەكە چاكبوونەوەی كەمە ○ (الإستسقاء الدماغي) نەخۆشییەكی زكماكە زۆر جار وادەبێ شلەی مۆخ لە كیسەی دەماغدا زیاد دەبێو دەیكشێنێ .

**السّاقي:** ئاو گێڕ، مەی گێڕ ○ (ك: سُقاة).

**السّاقية:** جۆگە ئاو ○ دۆڵچەی ناعور.

**السِّقاءُ:** كوندە، مەشكە ○ هەرشتێك شتی خواردنەوەی تێ بكرێ ○ (ك: أسقية).

**السِّقايَةُ:** شوێنی ئاو دابەش كردنو ئاودان ○ ئەو پەرداخو سەتڵو گۆزەی ئاومكەی تێدایە ○ قورئان دەفەرموێ: ﴿جَعَلَ السِّقَايَةَ فِي رَحْلِ أَخِيهِ﴾ ○ پیشەی ئاو دابەش كردن.

**سِقاية الحاج**: دابەش كردنی شەربەت، ئاوو، خۆشاوی مێوژ، كە تايبەت بوو بە قورەيشيەكانەوەو شانازييان بەوە دەكرد كە ئەو كارەيان لە ئەستۆيە.

**السَّقَّاءُ**: ئاو كێش بۆ ماڵو بۆ فەرمانگەو شوێنی وا ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (سَقّاءة وسَقّاية).

**ألسَّقْيُ**: ئاودێری، ئاودان ٥ لە دوعا كردندا دەگوترێ: (سقيا له ورعياً) .

**ألسِّقْيُ**: ئەوەی ئاو دەدرێ لە زەویو زرعات ٥ دەگوترێ: (زرع سِقْيٌ) زرعاتێكە بەبێ باران ئاو دەدرێ ٥ بەشە ئاوو نۆرە ئاو ٥ دەگوترێ: (كم سِقيُ أرضك) بەشە ئاوی زەوييەكەت چەندە؟ ئەو ئاوەی لەگەڵ منداڵ بووندا دێتە دەر (ك: أسقِيَة).

**ألسُّقْيَا**: ناوی ئاو داشتنە ٥ ئاو دێری كردن، دەگوترێ: (سُقيا رحمة لا سُقيا عذاب) واتە بارانێكمان بۆ ببارێنە سودی هەبێو بێ زيان بێ.

**السَّقِيُّ**: ئاو دراو ٥ ئەو شتەی پێويستی بە ئاو داشتن هەبێ ٥ دەگوترێ: (زَرْع سَقِيٌّ) ٥ (ونخل سَقِيٌّ) ئەو دار خورمايەی بە ئاعور ئاو دەدرێ ٥ رەگی بەرەدا ٥ بۆيە پێی دەگوترێ: (سَقِيٌّ) چونكە لەناو ئاوو نزيك ئاو دەروێ ٥ هەروا ئاوە بۆ هەوری بارانـاوی فەترە گەورە كە بە خورەم لە زەوی دەدا.

**ألمَسْقَاةُ**: شوێنی ئاودێری ٥ جۆگايەك زرعاتو ئاژەڵی لێ ئاو بدرێ ٥ (ك: مَسَاقي).

**ألمِسْقَاة**: بەمانا (ألمَسْقاة) دێ ٥ ئامێری ئاو داشتن ٥ ئاعور (ك: المساقي).

**ألمَسْقَوِيُّ**: ئەو زەرعاتەی بە جۆگاو ئاعور ئاو بدرێ نەك بە باران ٥ ميصرييەكان پێی دەڵێن: (مِسقاوي).

**سكَبَ** الماءُ سكوباً وسكباً: ئاوەكە هەڵڕژا، رەوان بوو (هو ساكب وسَكْبٌ).

**سَكَبَ** الماءَ سكباً وتسكاباً: ئاوەكەی رژاند، هەڵيڕشت ٥ (هو مسكوب).

**إنسكب**: هەڵڕژا.

**الإسْكابَة**: داروچكەيەكە كونی كونەو مەشكەی پێ دەگيرێ ٥ هەروا كونی تەنكیو عامماراويشی پێ دەگيرێ ٥ رەحەتەی نەوتو رۆنو بەنزين تێكردنو شتی لەو جۆرە.

**الأُسْكُوبُ**: بارانی بەردەوامو ئيقليم گير كە بروكەی نەداتێ ٥ لە بروسكەشدا بەو بەشەی دەگوترێ

که بەرەو زەوی دێ ○ ریزە درەختی خورما ○ (ك: أساكيب).

**ألسَّكْبُ**: بارانی قەترە گەورەو بەردەوام ○ لافاوی خێراو بە تەوژم ○ ئەسپی خۆشڕۆ ○ دەگوترێ: (فرسٌ سَكْبٌ) ئەسپێکی تیژ ڕۆیە، ئەسپی جەستە سوكو بە نیشانە ○ کاری پێویستو حەتمی ○ دەگوترێ: (أمر سَكْبٌ) کارێکی پێویست ○ پیاوی درێژ ○ مس ○ رەصاص.

**ألسَّكَبُ**: رەصاص ○ درەختێکی بۆن خۆشە پڕزو گەڵای وەکوو روەکی صەعتەر وایە.

**ألسُّكْبَةُ**: پەڕۆیەکە دەکرێتە کڵاو وەکوو شەبەکە وایە ○ پێستێکی تەنکە بە سەری منداڵەوەیە لەکاتی لە دایکبووندا لەگەڵ منداڵەکە دێتە دەر ○ (ك: سِكاب).

**ألسُّكَبَةُ**: کرێژو چڵکی سەر (ك: سَكَبٌ وسكاب).

**ألمِسْكَبَةُ**: ئاو رێژو ئامێری ئاو پرژێن ○ دەگوترێ: (أرْسَلَ الماءَ في المِسْكَبة) ○ (ك: مَسَاكب).

**سَكْبَجَ**: خواردنی سەکبەجەی ئامادە کرد ○ ئەم خواردنە بریتییە لە گۆشتو سرکەو هەندێ زەڵاتەو تەوابیل ○ کە تێکەڵاو دەکرێنو دەبێتە خواردنێکی خۆشو بەتام.

**ألسِّكْبَاج**: خواردنێکە لە گۆشتو سرکەو هەندێ تەوابیل دروست دەکرێ ○ پارچەیەك لەو خواردنە پێی دەگوترێ: (سِكبَاجة).

**سكت** سكوتاً وسكاتاً: بێ دەنگ بوو ○ وازی لە قسە کردن هێنا.

**سَكَتَ المتحرِكُ**: جمو جوڵە کەرە کە دامرکاو خپ بوو ○ دەگوترێ: (سَكَتَ) واتە مرد ○ (سَكَتَ الغَضَبُ عنه) رقی نیشتەوە.

**سَكَتَ الريحُ**: رەشەباکە کەوت دیاردەی نەما.

**سَكَتَ الحَرُّ**: گەرمییەکە زیادی کرد لەبەر کزی با.

**سكت الفرسُ**: ئەسپەکە دواین ئەسپ بوو کە لە حەلەبەکە دەرچوو.

**أسْكَتَهُ**: بێ دەنگی کرد، خوستی لێ بڕی ○ دەگوترێ: (لا أسكت الله لك حِسّاً) خودا هیچ هەستێکت لەکار نەخا زیانت خۆش بێ.

**سَكَّتَهُ**: بەمانا (أسكته) دێ.

**الأسْكاتُ**: پاشماوە لەهەر شتێك بێ ○ پێڕو کۆمەڵی جیا جیای ئادەمیزاد ○ ئادەمیزادی خوێڕیو هیچو پوچ ○ رۆژانی کۆتایی وەرزی هاوین.

**الإسْكاتَةُ**: بێ دەنگییەکی کاتیو

دەستکردنەوە بە خوێندنەوەو ئاخاوتن.

**أَلسَّاكوت**: بێ دەنگی زۆر ٥ کەسێك ماوەی زۆر بێ دەنگ بێ.

**أَلسَّاكوتة**: بەمانا (أَلسَّاكوت) دێ ٥ مردنی ناکاوو بە سەکتەی دڵ.

**السُّكَاتُ**: بەردەوامی لەسەر بێ دەنگی ٥ نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی زمان وەستان‌و قسە نەکردن ٥ هەر شتێك ببێتە هۆی وسکوت بوون ٥ مردنی سەکتە ٥ ماری گازنەدەی وەها کە هەستی پێ نەکرێ تا پێوە دەدا ٥ دەشگوترێ: (هو علی سُكات الأمر) ئەو لەسەر تەواو کردنی کارەکەیەتی ٥ خەریکە ئیشەکەی تەواو بکا.

**أَلسَّكْتُ**: هەناسە دان‌و ئارام بوونەوە لەکاتی خوێندنەوەو گۆرانی گوتندا.

**أَلسَّكْتةُ**: وەستانێك (جارێك لە وەستان) ٥ مردنی لەنکاو.

**السُّكْتَةُ**: هەر شتێك منداڵ یان شتی تر بێ دەنگ بکا ٥ پاشماوە لە بنکی پەرداخ (ك: سُكَتٌ).

**أَلسِّكْتَةُ**: شێوەی بێ دەنگی‌و جۆرەکەی ٥ هەر شتێك منداڵ یان شتی تر بێ دەنگ بکا.

**السُّكوتُ من الأبل**: حوشترێکە کاتێ بارو کەژاوەی دەخرێتە سەر پشتی بۆرە بۆڕ ناکا ٥ (ومن الحَيَّاتِ) لە رەگەزی ماریشدا بەو مارانە دەگوترێ: کە خۆ مات دەکاو پێوە دەدا، کەم هەستی پێ دەکرێ ٥ (ك: سُكُتٌ).

**السِّكِّيتُ**: کەسێك زۆر بێ دەنگ بێ.

**السُّكَيْتُ**: بەمانا (أَلسِّكِّيتُ) دێ ٥ دوا ئەسپی ناو حەلەبە ٥ دەگوترێ: (فلان سِكِّيتُ الحلبة) بەکەسێك دەگوترێ لە کارو باری خۆیدا سەر نەکەوێ.

**أَلْمُسَكِّتُ**: دوایین قوداحی قومارە.

**سَكَرَ** سكوراً وسكراناً: مەست بوو ٥ خەپ بوو ٥ بێدەنگ بوو ٥ راوەستا ٥ دەگوترێ: (سكرت الريح) و (سكر الحرّ).

**سكرتْ عينُهُ**: چاوی لە روانین وەستا ٥ چاوی مەست بوو.

**سكر** الإناءَ سكراً: قاپەکەی پڕ کرد.

**سكرَ** النَّهرَ: ئاوی روبارەکەی بەند کرد، بەربەستی لەبەردا کرد.

**سَكِرَ** الحوضُ ونحوه سَكَراً: حەوزەکە پڕبوو ٥ دەگوترێ:

**سكر** من الغضب: رقی هەڵساو زۆر تورە بوو.

**سكر** فلان من الشراب سكراً وسُكراً:

فلانکەس بەهۆی خواردنەوەی شەرابەوە سەرخۆش بوو عەقڵو هۆشی لەدەست دا ٥ (فهو سَكِرٌ وسكران وهي سَكِرة وسَكرى وسكرانة).

سُكِرَ البحرُ ونحوه: دەریا ئارام بوو ٥ (سُكِرَ بصره) چاوی لە بینین مەنع کرا.

أسْكَرَهُ الشَّرابُ: شەراب سەرخۆشی کرد ٥ دەشگوترێ: (أسكرهُ فلان) فلانکەس شتێکی پێدا سەرخۆشی کرد.

سَكَّرَهُ: موبالەغەی کرد لە سەرخۆش کردنیدا ٥ دەگوترێ: (سُكِّرَ بَصرُهُ) چاوی نوقا، قوچا ٥ یان لە دیتن مەنع کرا ٥ یان لێڵو پێڵ بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا﴾.

سَكَّرَ الماءَ: بە شەکر ئاوەکەی شیرین کرد.

تساكَرَ: خۆی بە سەرخۆش نیشانداو لە واقیعدا سەرخۆش نییە.

السَّكارين: بەشێکە لە بەرهەمی قەترانی خەڵوز، رەنگی سپییە، بلورییە، شیرینە دەدرێ بە کەسێك نەخۆشی شەکرەی هەبێ لە جیاتی شیرینی.

السُّكْرُ: بێ هۆش بوونو ئاگا لەخۆ نەمان بەهۆی شەراب خواردنەوە ٥ جاری وا دەبێ بەهۆی رق هەڵسان یان عەشق یان هێزو گەنجییەوە حاڵەتی بێ هۆش بوونی بەسەردا دێ ٥ دەگوترێ: (أخذه سُكرُ الشباب أو المال أو السلطان أو النوم).

السِّكْرُ: بەربەستی ئاو، هەر شتێك بکرێتە بەنداو ٥ هەر شتێك درزو کونو کەلەبەر پڕ بکاتەوە ٥ (ك: سُكُورٌ).

السَّكَرُ: هەرشتێك سەرخۆشکەر بێت ج شەراب بێ یان بیرەو شتی تر ٥ گوشراوی خورما کە بە ئاگر نەکوڵابێ ٥ سرکە.

السَّكْرَةُ: یەك جار سەرخۆش بوون ٥ دەگوترێ: (ذهب بين الصحوة والسكرة) واتە: لە نێوان دوو حاڵەتی وا ئاگای لەخۆی بێ یان بێ ئاگا بێ ٥ رق هەڵسانێك ٥ بالا دەستی لەززەتو خۆشی بەسەر گەنجدا ٥ مردنی ناخۆشو بە ئازار ٥ غەمو نارەحەتی زۆر ٥ لەسەر خۆچوونی گیانەلاو.

السُّكَّرَةُ: دانەوێڵەی مرۆر دانەوێڵەیەکی تام تاڵە بە زۆری لەناو گەنمدا دەروێ.

السَّكَّارُ: فرۆشیاری شەرابو بیرەو شتی سەرخۆش کەر.

السُّكَّرُ: شەکر، مادەیەکی شیرینە بە

زۆری لە قەصەبو چەوەندەر دەردەهێندرێ، قەصەبەکەی هەر بەناوی (قصب السكر) ناو دەبرێ ٥ جۆرێك لە ترێ سپییە زۆر شیرینە ٥ جۆرێکیشە لە خورما زۆر شیرینە ٥ تاکەکەی (سُكَّرَة).

**سُكَّرُ الشعیر**: جۆرێکە لە شەکر کە لە هیدراتی کاربۆن دەردەهێندرێ، وەلێ بە ئەندازەی شەکری قەصەبو چەوەندەر شیرین نیە.

**سُكَّرُ العِنب**: جۆرێکە لە شیرینی لە ترێدا هەیە ٥ هەروا لە زۆر میوەی تریشدا هەیە ٥ لە هەنگوینیشدا هەیە ٥ شەکر جۆرێکی بلورییەو لە ئاودا دەتوێتەوەو بێ رەنگەو تامی شیرینە.

**شەکر یان شیرینی میوە هات**: جۆرێکە لە شەکرو سپییەو بلورییەو تامی شیرینە بە زۆری لە میوەی تازەدا هەیە ٥ هەروا لە هەلاڵی گوڵو رووەك‌و هەنگوینی هەنگدا.

**السُّكَّرِيّ**: (ألبولُ السكری) نەخۆشییەکە شەکرەی ترێ لە میزدا پەیدا دەکا، هۆکارەکانی زۆرن، گرنگەکەیان کەمبوونی هەرمۆنی (الأنسولین) کە سوتانی ئەو شیرینییە لە خەلای جەستەدا رێك دەخا.

**السُّكَّرِيَّة**: قوتوی شیرینی.

**السِّكِّيرُ**: کەسێك زۆر سەرخۆش بێ ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (السِّكِّيرَةُ).

**السُّكُّورُ**: زۆر سەرخۆش ٥ (ك: سُكُرٌ).

**السُّكرانُ**: رووەکێکی بە تەمەنە لە پێڕی بازینجانە لە سارای میصرو هینددا دەڕوێ، لق‌و پۆپی زۆری هەن‌و یەك بنکی هەیە ٥ گەڵاکانی (عصریة)و گوڵەکانی بنەفسجیە لە بواری پزیشکیدا سودی لێ وەردەگیرێ.

**المُسَكِّرُ**: هەر شتێك بە شەکر شیرین کرابێ ٥ سەرخۆش ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (مُسَكَّرَة).

**السُّكُرُّجة**: دەوری پچوکی چێشت تێدا خواردن ٥ بەزۆری میوەو خۆراکی ئیشتیها کەرەومیان تێدا دادەنرێ.

**سَكَعَ سَكْعاً**: ملی لە رۆیشتن ناو بۆ خۆشی نازانێ بۆ کوێ دەچێ ٥ گومڕا بوو، سەرسام بوو.

**سَكَعَ فلاناً**: لە سەری فلانکەسی دا ٥ زەبری ئاراستەی سەری کرد.

**سَكِعَ**: بەمانا (سَكَعَ) دێ.

**سَكَّعَ فلاناً**: وای لە فلانکەس کرد گومڕا ببێ‌و سەری لێ بشێوێ نەزانێ چی دەکاو چی ناکا.

**تَسَكَّعَ**: بەمانا (سَكَعَ) دێ ٥ ملی لە بەتاڵ‌و گومڕایی ناو کەوتە ناو

تاریکی تاوان‌و سەری خۆی بۆ رزگار ناکرێ.

**السَّاكِعُ**: غـەریب ◦ بـۆ ئـافرەت دەگوترێ: (ساكعة).

**السُّكِعُ**: بەمانا (السَّاكِعُ) دێ.

**السُّكَعُ**: گومڕاو سەر لێ شێواو.

**المُسْكَعَةُ**: شوێنی زلکاوو گـومڕایی ◦ شـوێنی سەرسـام بـوون‌و رێ لێ تێکچوون.

**سَكِفَ** البابَ أو البيتَ سَكْفاً: بۆ دەرگاکە یان بۆ خانوەکە بەر بێڵای دروست کرد ◦ دەگـوترێ: (ما سكفت البابَ) بـەر بـێڵاو چـەترم بـۆ دەرگـای خانوەکە نەکرد.

**أَسْـكَفَ** فـلان: فلانکـەس بـوو بـە بۆیاخکەری قۆندەرە.

**تَسَكَّفَ** البـابَ أو البَيْـتَ: بـەربێڵای بـۆ خانووەکە دروست کرد.

**الإِسْـكافُ**: پینەچـی (قۆنـدەرە چـی، پێڵاو دروست کەر) ◦ (ك: أساكفة).

**الأُسْـكُفُ** مـن العـين: شـوێنی روانـی برژانگ ◦ پێڵوی چاو هی لای خوارو ◦ موی چاو.

**السَّاكِفُ**: سـەر دەرگـای خـانوو ئـەوەی گرێژمنـەی لای سـەروی دەرگاکـەی تێدا دەسورێ.

**السَّكَّافَةُ**: پیشەی پینە چییەتی‌و پێڵاو دروست کردن.

**سَكَّ** الشَّيءَ سَكّاً: شتەکەی بەست ؛ (سـك البـاب أو الخَـشَبَ) بزمـاری لـە دەرگاکـە دان دەرگاکـەی بـە بزمـار داکوتا.

**سَكَّ** الكلامُ السَّمْعَ: قسەکە گوێچکەی کـەڕ کـرد لەبەرئـەوەی بـەهێز بـوو ◦ دەگوترێ: (ماسكّ سمعي مثلُ ذلـك) دەنگـی وا گـەورەم نەچـۆتە گوێچکەوە ◦ (سَكّ البابَ) دەرگاکەی داخست.

**سَكَّ** ما في بطنه من غائط ونحوه: ئـەوەی لـە ورگیدا بوو بە شلی هاتە دەر.

**سَكَّ** أذنيه: گوێچکەی دەرهێنان.

**سَكَّ** البئرَ: بیرەکەی بە تەنگە بـەری لێـدا، پان‌و پۆڕ نەبوو.

**سَكَّ** النقـود: لەسـەر سکە پارەکەی چاپ کرد ◦ سکەی لە دراوەکەدا.

**سَـكَّ** سَـكَكاً: گوێـچکەی بـچوک بـوو بـە سەریەوە نووسا بوو زۆر لە سـەری جیا نەبوونەوە ◦ توشی کەڕی بوو.

**سَـكَّ** الأذن: کرکراگـەی گوێـچکەی پـچوک بوو (هو أَسَكّ وهي سَكَّاء).

**اسْـتَكَّ**: گـیرا، کلۆرایی نـەما ◦ (انـسكّ مسامِعُهُ) گوێچکەی گیرا ◦ کەڕ بـوو ◦ دەشـگوترێ: (مـا إسْتَكَّ في مـسامعي مثله) شتی وام بە گوێچکەدا نەچووە ◦ تەنگەبەر بوو.

**إستكَ الشجَرُ أو النباتُ:** درەختەکە چرو پڕ بوو بۆشایی ناو لق و پۆپی نەما.

**إنْسَكَّ:** بەرەو پێش رۆیی راستەو راست ٥ دەگوترێ: (إنسكّ الطيرُ).

**تَسَكّك:** پاڕایەوە، لالایەوە.

**السُكّاك:** هەواو بۆشایی نێوان ئاسمان و زەوی ٥ دەگوترێ: (لا أفعل ذلك لو صعدتَ في السَكّاك) بچیە سەر ئاسمان من ئەوە ناکەم ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو شوێنەی پەرە تیری لێ قایم دەکرێ.

**السُكّاكةُ:** بەمانا (السُكّاك) دێ ٥ ئادەمیزادی گوێچکە پچوك ٥ کەسێك هەر بە رای خۆی بجوڵێتەوەو ئامۆژگاری کەسی بە گوێدا نەچێ ٥ (ك: سكائك).

**السُكُّ:** تەبیات ناشیرینی بەد سروشت و بەد رەوشت ٥ بزمار ٥ بیری تەنگە بەرو تەسك ٥ زرێی ئەڵقە تەسك ٥ بیناو دیواری راست ٥ کانگەی راست ٥ (ك: سكوك وسكاك) ٥ دەگوترێ: (ضربوا بيوتهم سِكاكاً) خانوەکانیان بە ریز دروست کردون ٥ (دَارُ السُكّ): باڵە خانەی دراوو چاپ کردن ٥ شوێنی سکە لێدانی پارە ٥ کارگەی پارە لێدان.

**السُكُّ:** رێگای تەنگە بەری گیراو ٥ کونی دوپشك یان جاڵجاڵۆکە ٥ زرێی ئەڵقە پچوك ٥ بیری تەنگە بەر هەڵچندراو ٥ بەد سروشت ٥ دەگوترێ: (هو يفعل ذلك بِسُكِّ طبعه) بەهۆی بەد رەوشتی ئەو ئەوکارە دەکا ٥ جۆرێکە لە بۆنی خۆش تێکەڵ بە میسك و رامك دەکرێ (ك: سكوك وسكاك).

**السَكّاءُ:** مێینەی (الأسَكّ) زرێی ئەڵقە پچوك ٥ (ك: سُكّ).

**السَكّاكُ:** کەسێکە پیشەی سکە لێدان بێ ٥ (ك: سَكّاكة).

**السَكّاكة:** مێینەی (السُكّاك) ٥ رێبوارو رەوتەنی.

**السِكّةُ:** ریزە دارو ریزە دار خورما ٥ رێگای راست و بێ کەند و لەند ٥ سکەی شەمەندەفەر ٥ کۆڵان و گەڕەك ٥ دراوی ئاسن ٥ گاسنی هەوجاڕ ٥ دەشگوترێ: (أخذ الأمرَ بسِكّتِه) لەکاتی خۆیدا کارەکەی ئەنجامدا ٥ یان دەگوترێ: (فلان صَعْبُ السِكّةِ) فلانکەس راڕایەو لەسەر کاری خۆی بەردەوام نابێ ٥ (ك: سِكك) (أصحاب السِكَك) کار بەدەستانی پۆستە.

**السُكّيُّ:** بزمار ٥ دینار.

السِّكيُّ: پاڵدراو بۆلای سکه ٥ پۆسته.
السُّكْلُ: ماسییەکی رەشی گەورەیەو درێژە ٥ (ك: أسْكال وسِكْلَة).
الإسْكَلَة: پەیژەی گوازراوە ٥ بەندەری کەشتی ٥ ئەسکەلە.
سَكَمَ سَكْماً: لەبەر پیری و بێ هێزی هەنگاوی کورتی هەڵێنان.
السَّيْكَمُ: کەسێکە لەبەر پیری و لاوازی هەنگاوی کورت بهاوێژێ.
سكن المتحرك سكوناً: جەو جوڵەکەرەکە خپ بوو خوستی لێ برا.
سَكَنَ المتكلمُ: قسه کەرەکە بێ دەنگ بوو.
سكنَ المطر: باران برا.
سَكَنَ الريحُ: رەشەباکە کەوت ٥ ئارام بۆوە.
سكن النفس: دڵ و دەروونی ئارامی گرت.
سَكَن اليه: ئارامی پێ گرت، وەگری بوو ٥ ئیسراحەتی لا کرد.
سكن الحرفُ: پیتەکە بزوێنی نەبوو.
سَكَنَ المكانَ وبه: لەو شوێن و جێگایەدا نیشتەجێ بوو ٥ ئەو شوێنەی کردە نیشتمانی خۆی.
سَكُنَ فلانٌ سكونةً وسكانةً: فلانکەس هەژار بوو.
أسْكَنَ فلانٌ: بەمانا (سَكُنَ) دێ.
أسْكَنَ المتحركَ: خوستی لەجەو جوڵەکەرەکە بڕی.
أسْكَنَ فلاناً المكانَ وفيه: فلانکەسی لەو جێگایە نیشتەجێ کرد.
اسْكنَ المكانَ فلاناً: ئەو شوێنەی دا بە فلانکەس بۆئەوەی تێیدا نیشتەجێ ببێ.
أسْكنَ الله فلاناً: خودا فلانکەسی هەژار کرد.
اسكنَ الفقر فلاناً: هەژاری برستی لە فلانکەس بڕی و بێ هێزی کرد.
ساكَنَهُ: لە گەڵیدا لە خانووەکەدا نیشتەجێ بوو.
سَكَّنَ المتحركَ ونحوه: بزوێنەکەی لە جەو جوڵ خست ٥ پیتە بزوێنەکەی لە حەرەکە خست ساکنی کرد.
سَكَّنَ فلاناً المنزلَ: فلانکەسی لە مەنزڵەکەدا نیشتەجێ کرد.
سَكَّنَ القناةَ: شمشێرەکەی بە ئاگر تەعدیل کردو راستی کردەوە.
سَكَّنَ الكلمةَ: لەسەر کۆتایی وشەکە وەستاو بزوێنی نەدایە.
استكن فلان: فلانکەس زەلیل و داماو بوو.
استكان: بەمانا (إستكن) دێ.
تساكنوا: بە کۆمەڵ بەیەکەوە لە خانوەکەدا نیشتەجێ بوون.
تسكَّنَ: هەژار بوو، خۆی وەکوو هەژاران لێکرد ٥ ئارامی گرت و هێواش بۆوە.

**تَمَسْكَنَ**: بەمانا (تَسَكَّنَ) دێ.

**السّاكِنُ**: پێچەوانەی جەمو جوڵە ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (ألساكنة) ٥ (ك: سواكن) ٥ دانیشتووی خانوو مەنزڵ.

**السّكاكيني**: پاڵدراو بۆلای (ألسّكاكين) ٥ دروست کەری کێردو چەقۆ.

**السُّكّانُ**: ئەو شتەی لەنگەری کەشتی رادەگرێو ناهێڵێ کەشتییەکە جەمو جوڵ بکاو لە رێرەوی خۆی لابدا.

**السِكّينُ**: کێرد، چەقۆ ٥ (ك: سكاكين).

**السِكّينة**: بەمانا (السِكّينُ) دێ.

**السَّكْنُ**: خاوو خێزانو دانیشتوی ناو خانوو مەنزڵ.

**السُّكْنُ**: مەنزڵو شوێنی تێدا حەوانەوە ٥ بژیو ٥ نیشتەجێ بوون لە خانوو مەنزڵدا بەبێ کرێ ٥ (ك: أسكان).

**السَّكَنُ**: خانوو مەنزڵ ٥ هەر شتێك دڵ پێی ئارام ببێو رەحەتی بە گیان ببەخشێ ٥ هاوسەر ٥ ئاگر ٥ سۆزو بەزەیی ٥ خێرو بێرو بەرەکەت ٥ بژیو ٥ (ك: أسكان).

**السُّكنى**: بەمانا (الإسكان) دێ. هەروا بەمانا ئەوەیە ئادەمیزادێك یان خێزانێك لە خانوێکدا نیشتەجێ بکەی بەبێ کرێ ٥ خانوو مەنزڵ.

**السُّكْنَةُ**: دڵ ئارامیو ئارام بوونەوە ٥ (ك: سُكَنٌ).

**السِّكِنَةُ**: خانوو مەنزڵ ٥ شوێنی راگیر بوونی سەر لە ملدا ٥ دەشگوترێ: (تركتهم على سِكناتهم) ئەوانم جێ هێشت لەسەر حاڵو باری خۆیانو هیچ نەگۆڕا بوون.

**السُّكَيْنَةُ**: کچۆڵەی روح سوكو زەریفو چوستو چالاك.

**السَّكِينَةُ**: ئارام گرتنو پشودانو وەستان ٥ بار قوڵیو خۆ گرێ.

**الْمَسْكَنُ**: شوێنی نیشتەجێ بوون ٥ (ك: مساكن).

**الْمَسْكنة**: هەژاریو زەعیفی.

**المِسْكِينُ**: کەسێك ئەوەندەی نەبێ ژیانی دابین بکا ٥ هەژار ٥ گەردن کەچو لاوازو ژێر دەستەو بێ دەسەڵات ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (مِسْكِينة) (ك: مساكين).

**السَّكَنْجَبِينُ**: شەرابێکە تێکەڵە لە شیرینیو ترشی (واتە: مزرە) ٥ لە وشەیەکی فارسی وەرگیراوە کە (سرکا أنگبین)ە.

**سَلَا الدُّهْنَ أو الزُّبَدَ سَلْناً وسِلاءً**: رۆنەکەی بە گەرم کردن تواندەوە.

**سلا السَّمْسِمَ وغيره**: کونجییەکەی گوشیو رۆنەکەی دەرهێنا.

سَلاَ فلاناً: لە فلانکەسی دا ٥ دەگوترێ: (سلاه مائة سوط) سەد شوڕکی لێدا ٥ (سَلا الدراهمَ) زۆر زوو درهەمەکانی سکە لێدان ٥ (سلا فلاناً كذا درهماً) ئەوەندە درەمەی بۆ فلان سکە لێدا.

سَلاَ النخلَةَ: چەقڵی دار خورماکەی دەرهێنان.

اسْتَلَأَ الزُبْدَ أو الدهنَ: بەمانا (سَلَأَه) دێ.

السِّلأُ: رۆنو شتی وا بەمەرجێ خاڵصو بێ خەوش بێ ٥ (ك: أسْلِئَة).

السُّلاَّءُ: چەقڵی دار خورما ٥ تاكەكەی (سُلاَءة) ٥ تیر ئەگەر لەسەر شێوەی چەقڵی دار خورمابێ ٥ باڵندەیەكی رەنگ بۆری قاچ درێژە.

الْمَسْلُوءُ: رۆنە كەرە ٥ رۆن.

سلبَ الشيْءَ سَلْباً: بەزۆر شتەكەی لێ ستاند.

سَلَبتْ فلانَةُ فؤادَهُ أو عقلَه: فلان ئافرەت دڵی بردووەو عەقڵی لێ ستاندووە.

سَلَبَ فلاناً: كەرەسەی جەنگی فلانكەسی بۆ خۆی بردو دەستی بەسەردا گرت ٥ چەكو پۆشاكی لێ ستاندو روتی كردەوە.

سلبَ الشجَرَ أو النبات: توێكڵی درەختەكە یان روەكەكەی داماڵی سپی كردەوە، گەڵا میوەكەی رنی وەراندی.

سَلَبَ القَضِيَةَ: ئامرازی سەلبی خستە ناو رستەی (قضية)ی مەنطیقەكەوە.

سَلَبَتِ المرأة سَلْباً: ئافرەتەكە پۆشاكی پۆشی.

أسْلَبَ الشَّجَرُ ونحوه: درەختەكە بەرەكەی وەری و گەڵاكەی كەوتە خوارو، روت بوو.

أسْلَبَ الثُمامُ: پڵو پرشەكەی دەرهێنا.

أسْلَبت الحامِلُ: ژنە سك پڕەكە منداڵەكەی لەبارچوو ٥ یان منداڵەكەی بوو لێیان ستاند، یان بەهۆی مردنی منداڵەكەوە جەرگی سوتا ٥ (فهي مُسْلِبٌ وهي سلوب)، (ك: سلب، وسلائب).

سَلَّبَتْ: بەمانا (سَلِبَتْ) دێ.

سَلَّبَت الحامِلُ: بەمانا (أسْلَبت) دێ ٥ (فهي مُسَلِّبٌ).

اسْتَلَبَهُ: بەمانا (سَلَبَهُ) دێ.

تَسَلَّبَتْ فلانة: بەمانا (سَلِبتْ) دێ.

الأُسْلوبُ: رێباز، شێوەو شێواز ٥ دەگوترێ: (سلكت أسلوب فلان في كذا) پەیڕەوی شوێنی فلانكەسم كردووە لە فلان شتدا ٥ رێبازو شێوازی نووسین ٥ ریزی دار خورما.

السَّالِبُ: ئەو ئافرەتەیە: منداڵی لێ رفێنرابێ ٥ لەباری چووبێ.

**السَلاَّبُ**: پۆشاکێکی رەشە ئافرەت بە بۆنەی تەعزییەو روداوی ناخۆشەوە دەیپۆشێ • (ك: سُلُبٌ).

**اَلسَّلْبُ**: رۆیشتنی خێرا.

**اَلسِّلْبُ**: دەستە دوی ئامێری جوت (دەستە دوی هەوجاڕ ) • (ك: سلوب وأسلاب).

**اَلسَّلَبُ**: هەرشتێك لە کەسێك بسێندرێ وەکوو پۆشاكو چەكو ولاغی سواریی • دەگوترێ: (أخذ سلب القتيل) ئەسبابی کوژراوەکەی برد بۆ خۆی • توێکڵی درەختو روەك • یان قەصەبی هەڵکێشراو • یان توێکڵی درەختی وەها کە سەلەو زەمبیلەو بەچنەو شتی وای لێ دروست بکرێ • پرژو توێکڵی درەختێکە لە وڵاتی یەمەن حەبلی لێ دروست دەکرێ • توێکڵی درەختی دۆمو خورما • ئەگەر بۆ ئاژەڵی سەربڕاو بەکار هات مەبەست پێستی ورگو ریخۆڵەکانیەتی.

**اَلسُّلْبَةُ**: روتبون لە پۆشاك (سفوری).

**اَلسُّلَبَةُ**: جۆرێکە لە حەبلو گوش • کە لە پرژو پاڵی درەختو روەك دروست دەکرێ • (ك: سَلب وسلاب).

**السَّلَبوتُ**: کەسێك زۆر شت بڕفێنێ • یان کاری سەرەکی شت رفاندن بێ.

**اَلسَّلْبِية**: بەلای فەیلەسوفەکانەوە حاڵەتێکی دەرونییە سەر دەکێشێ بۆ تەمبەڵیو رارایی لە جمو جوڵو هەڵسو کەوتدا • وا دەبێ سەر دەکێشێ بۆ لە گڵو گۆکەوتنو جەستە لەکار کەوتن • یان بە کەسێك دەگوترێ ئەندامەکانی جەستەی هاریکاری یەکتر نەکەن.

**السَّلاَّبُ**: دروستکەری بەچنەو زەمبیلەو سەلەو شتی لەوجۆرە • یان فرۆشیاری ئەو جۆرە شتانە.

**السَّلاَّبَةُ**: پیاوێك زۆر شت بڕفێنێ • هەروا دەگوترێ: (إمرأة سلاّبَةٌ).

**السَّليبُ**: رفێندراو • دەگوترێ: (رجل سليب العقل) پیاوێکە عەقڵی لێ ستێندراوە • (ك: سُلُبٌ وسَلْبى).

**سَلَتَهُ سَلْتاً**: روتی کرد، رایکێشا • ئەوەی لەسەری بوو لایدا • ئەوەی لەناویدا بوو بردی • ریخۆڵە • بەدەستی دەری هێنا • چی تێدا بوو هێنایە دەر.

**سَلَتَتْ المرأةُ الخِضابَ عن يدها ونحوها**: ئافرەتەکە خەنەو وسمەکەی لە دەستو قاچی کردەوە.

**سَلَتَ الشعر أو الراس**: سەری تاشی • (سلت الشَيءَ) شتەکەی بڕیەوە •

(سَلَت الأنفَ) لوتی بڕی ٥ (سَلَتَ فلاناً) له فلانکەسی دا.

إنْسَلَتَ: بەمانا (إنسَلّ) دێ.

الأسْلَتُ: گوێ بڕاو ٥ (ك: سُلتٌ).

السُّلاتَةُ: هەر شتێك بپڕدرێو برندرێتەوە ٥ کراندنی ئەو چڵكو پڵكو کێشتە کۆنەی بە قەراخی قصعەو مەنجەڵو لەگەنەوە دەمێنێتەوە بۆ ئەوە پاك بکرێتەوە.

السُّلْتُ: جۆرە جۆیەکە سۆی پێوە نیە، توێکڵی نەبێ، وەکوو گەنم وایە، لە غەوری ئوردنو لە حیجاز هەیە.

السَّلْتاء: مێینەی (الأسْلت)ە ٥ ئافرەتێك خەنەو وسمە لەسەر نەگرێو میکیاج نەکا ٥ (ك: سُلْتٌ).

السُّلْتَةُ: لە دەست دەرچونو لە کیس چون ٥ دەگوترێ: (ذهب مني سَلْتَةً) لە نکاو لە دەستم دەرچوو.

سَلَجَت الإبلُ سُلوجاً: حوشترەکە روەکی سولجی خواردو تورِاندی، سکی چوو.

سَلِجَ الفصيلُ الناقَةَ: بێچوەکە شیری حوشترەکەی مژی.

سَلَجَ اللقمةَ: پارومکەی قوتدا.

إسْتَلَجَ الشرابَ: خێرا شەرابەکەی هەڵقوراندو زوو خواردیەوە.

تَسَلَّجَ الطعامَ ونحوه: خواردنەکەی قوتدا.

تَسَلَّجَ الشرابَ: شەرابەکەی بە قورگییەوە ناو هەڵیقوراند.

السُّلْجُ: جۆرە روەکێکی نەرمە لە پێڕی درەختی نەرمە یان درەختێکە حوشتر حەزی لێیەتیو گەڵاکەی دەخوا.

السُّلْجانُ: بەمانا (السُّلجُ) دێ. یان جۆرێکە لەو.

السَّليجُ من الطعام: خواردنی خۆش کە بە ئاسانی قوت بچێ.

السَّليجةُ: داری ساج کە دەرگاو شتی وای لێ دروست دەکرێ ٥ (ك: سلائج).

السُّلاَجِمُ: پیاوی درێژ ٥ یان تیری درێژ ٥ (ك: سَلاَجِمَ).

السُّلْجَمُ: ریشی پڕ ٥ سەرو دەمو چاوی درێژ ٥ بیری وا ئاوی زۆر بێو کۆنە بیر بێ ٥ روەکی گەرچەك: جۆرە روەکێکە لە پێڕی (الصَّلبيات) دەروێندرێ بۆئەوەی رۆنەکەی لێ بگیرێ بۆ چراو روناکی، ئێستا بەکاردێ بۆ چەورکردنی ئینجانەی دۆلابو شتی وا بۆئەوەی هاتوچۆیان خۆش بێ.

السُّلاَجِمُ: ئەسپی درێژ، پیاوی درێژ، تیری درێژ.

سَلَحَ سَلْحاً وسُلاحاً: ریخی کرد، توراندی.

**اسْلَحَهُ الدّواءُ**: دەرمانەکە وای لێکرد پیسایی بکا، بتورێنێ.

**سَلَّحَهُ**: بەمانا (أسْلَحَهُ) دێ. دەگوترێ: (سَلَّحَ العُشْبُ الماشِيَةَ) گیاکە وای کرد ئاژەڵەکە بتورێنێ.

**سَلَّحَ فلاناً**: چەکی دا بە فلان.

**سَلَّحَ إناءَ السَّمن**: گوزەی رۆنەکەی بە جۆرە (روب)ێك چەور کرد، هەنوی ٥ تیف تیفەی دا.

**تَسَلَّحَ**: خۆی چەکدار کرد، چەکی هەڵگرت.

**تَسَلَّحت الإبلُ وغيرها بأسلِحَتِها**: حوشترەکە قەڵەو بوو لە پێش چاوی خاوەنەکەی جوان بوو.

**الإسْليحُ**: جۆرە روەکێکە کە حوشتر بیخوا شیری زۆر دەبێ.

**السَّالِحُ**: چەکدار، خاوەن چەك.

**السِّلاحُ**: ناوە بۆ چەکی شەڕ بەگشتی چ لە وشکانی چ لە دەریادا چ لە حەوادا ٥ دەشگوترێ: (أخذت الابلُ سِلاحَهُ) حوشترەکە قەڵەو بوو لە پێش چاوی خاوەنەکەی جوان بوو ٥ هەروا ناوە بۆ (السِّماك الرامح) کە ئەستێرەیەکی ورشە دارەو کەوتۆتە باکورەوە بەرامبەر (السماك الأعزل) کە کەوتۆتە باشورەوە.

**السُّلاحُ**: هەرچی لە گەدە بێتە دەرەوە لە پیسایی.

**السُّلْحُ**: بەمانا (السُّلاحُ) دێ.

**السُّلْحُ**: روبێکە گوزەو دیزەی رۆنی پێ چەور دەکرێ.

**السُّلَحُ**: ئاوی باران کە لە چاڵو چوێڵدا دەمێنێتەوە.

**السُّلَحُ**: بێچووە کەو ؛ کەو بارِ (ك: سِلْحان).

**السَّلاّحُ**: کەسێك پیسایی زۆر بکا (گو گەورە).

**اَلْمَسْلَحُ**: شوێنی چەك دانان (مەرجەب) ٥ هەر شوێنێك ترسناك بێو پۆلیسو سەرباز بەچەکەوە لێی رابوەستن بۆ پارێزگاری کردنی ٥ کۆمەڵێك چەکدار کە لە سەنگەرو مەخفەردا کۆببنەوە بۆ چاو دێریو پارێزگاری.

**اَلْمَسْلَحَةُ**: بەمانا (اَلْمَسْلَحُ) دێ ٥ (ك: مسالح).

**اَلسُّلَحْفاةُ**: سولەحفات: (کیسەڵ) حەیوانێکی (وشکیو تەرپیە) لە پێری زەواحیفەکانە سندوقێکی ئێسق دەورەی جەستەی داوە بە پولەکەی پچوك داپۆشراوە ٥ (ك: سلاحف).

**سَلَخت الحَيَّةُ**: مارەکە توێژی فرێدا ٥ (سَلَخَ الشهرُ) کۆتایی مانگ هات ٥ مانگ تەواو بوو.

**سَلَخَ النباتُ**: رووەکەکە دوای وشکی سەوز بوو.

**سَلَخَ الجِلْدَ وغوه**: پێستەکەی گرو دایمالّی.

**سَـلَخَ الْحَرُّ أو الجربُ الجلدَ**: گەرما یان گرونّی پێستەکەی سوتاند.

**سَلَخَ ثيابَهُ**: پۆشاکەکەی داکەند، داپرنی ٥ (سَلَخَ الله النهار من الليل أو الليلَ من النهار) خودا شەوی لە رۆژ داپرنی یان رۆژی لە شەو داپرنی، لێکی جیاکردنەوە.

**سلخ فلاناً**: بە قسەی ناشیرین فلانکەسی ئەزیەت دا.

**سَـلَخَ فلانٌ شهرَهُ ونحوه**: فلانکەس مانگەکەی بەرێ کرد، کەوتە کۆتایی مانگ.

**سَلَخَ الريحُ مامرت به**: رەشەباکە هەرچی هاتە پێشی رایدا.

**سَلَخَ الكلامَ**: لە قسەکان هەندێکی لابردو قسەی تری بردنە شوێنی قسە لابراوەکان کە هەمان مانـاو مەبەستیان دەگەیاند.

**سَـلَخَ موضعُ المـاءِ**: شوێنی ئاوەکەی هەڵکەند.

**سَلُخَ الطعامُ والشرابُ سَلاَخَةً**: خواردنەکە بێ تامو خوێ بوو هیچ تامی نەبوو.

**سَلَّخَهُ**: بەمانا (سَلَخَهُ) دێ.

**إنْـسَلَخَ**: دەرکەوت، گوروا، پێستی لێ دارندرا، کەوڵ کرا.

**تسَلَّخَ**: بەمانا (إنْسَلَخَ) دێ.

**الأسْلَخُ**: ئەصلەع ؛ سەر روتاوە ٥ سورە فلەو زۆر سور ٥ شڵە.

**الـسَّالِخُ**: رەشمـاری زۆر رەش ٥ دەگوترێ: (أسْوَدٌ سالِخٌ) رەشی زۆر رەش‌و قەترانی ٥ بۆ مێینە ناگوترێ: (سَالِخة) بەڵکو دەگوترێ: (أسـودة) ٥ ئەو جۆرە مارە زۆر گازنـدەو کوشـندەن، بۆیە پێی دەگوترێ: (سـالخ) چونکە هەموو سالّی توێـژی خۆی فـڕێ دەدا. (ك: سـوالِخ وسُلَّخ) ٥ گرویەکە توشی پێستی حوشتر دەبێ.

**الـسِّلاَخَةُ**: پیـشەی پێست گـوروین، کەسێك ئیشی ئەوەبێ.

**السَّلْخُ**: پێستی گرواو ٥ کۆتایی مانگ.

**الـسِّلْخُ**: پێستی گـورواو (ك: سـلوخ وأسلاخ).

**الـسُّلَخُ**: ئەو ریسەی بەسەر تەشیەوە هەڵکراوە.

**السَّلْخَةُ**: یەکجار گروین ٥ پارچەیەك لە شتێکی تر داماڵدرێ ٥ لە زاراوەی چاپەمەنیدا پارچەیەك لە پلێت‌و صەفحە پێش ئەوەی شتی لەسەر چاپ بکرێ.

**السِّلْخَةُ**: شێوەی گروین.

**السَّلاَّخ**: کەسێـك پیسایی زۆر بکا (گو گەورە) ٥ کەسێـك پیشەی گروینـی پێست بێ.

**الـسَّلِیخُ**: گـورواو ٥ خواردنێـك تـامی نەبێ.

**السَّلِیخَةُ**: بێچوی تازە لەدایك بوو ٥ لە بواری بۆنو عـەتردا شتێـکە دەڵێـی توێـکڵەو داماڵـدراوە ٥ لـە درەختـی بانــدا بــە رۆنــی بەروبومەکـــەی دەگوترێ پێش کوڵانـنو کردنی بـە مرەبا.

**الْمِـــسْلاَخُ**: درەختـــی خورمـــا کـــە بەرسیلەکەی بلاو دەبێتەوەو هێشتا سـەوزە ٥ پێـست ٥ دەگـوترێ: (هـو ملك أو حمار في مسلاخ انـسان) ئـەو فریشتەیە یان گوێ درێژە لە پێستی ئادەمیزاددایــە وەکــوو دەگــوترێ: (گورگـە لـە پێـستی مەڕدایـە) (ك: مَسَالِیخُ).

**الْمَـــسْلَخُ**: شـوێنی گروینــی ئـاژەڵ ٥ شوێنی داماڵینی پێست.

**الْمَسْلَخَةُ**: بەمانا (الْمَسْلَخُ) دێ.

**سَلِسَ الشیئُ سَلَساً**: ئاسان بوو، نەرم بـوو، ملکـەچ بـوو ٥ دەگـوترێ: (شــراب سَلِسٌ) شەرابێکی گوارایە خـۆش بـە قورگـدا دەڕواتــە خــوار ٥ (سَـلِسَ البولُ) میزەکە ڕانەوەستا هاتە خوار

٥ (سَلِسَ له بحقه) مافی خۆی دایە بە ئاسانی هیچ گـرێو گـۆڵو تەگـەرەی تێ نەخـست ٥ (سَلِـسَت النخلـةُ) دار خورماکــە بنکــی لــقو پەڕژەکــانی نەمان لێ بونەوە.

**سَلِسَت الخَشَبَةُ**: دارەکە گەندەڵ بوو رزی ٥ (هو سلِس وسالس وسلیس).

**سَـلُسَ سَلاَسَــةً**: نـەرم بـوو، ئاسـان بـوو، ملکەچ بوو (هو سلیس).

**سُلِسَ سَلْساً**: عـەقڵی نەما، بێ عـەقڵ بـوو (هو مَسْلوس).

**أسْلَسَت النخلةُ**: دار خورماکە بنکی لقو پەڕژەکانی لێ بوونەوە ٥ بەرسیلەکەی بلاو بۆوە.

**اسْلَسَت الناقةُ**: حوشترەکە بـە نـەکاملی بێـچوی بـوو ٥ پـێش وەخـت بێـچوی بوو (فهي مُسْلِسٌ ومِسْلاسٌ).

**اسْلَسَ الـشَّیْئَ**: شـتەکەی نـەرمو ئاسان کرد.

**سَلَّسَ الحُلِيُّ**: خشڵەکەی ڕێـك خـستو رازاندیەوە بە گەوهەرو شتی بەنرخ نەك بە متو میرو.

**السُّلاَسُ**: نەمانی عەقڵ ٥ شێت بوون.

**الـسُّلاَسَة** (سلاســة اللفــظ): ئاسـانیو خــۆش ئــاوازی لەســەر گوێــچکەو گونجـانیو ئاسـانی لەسـەر زوبـانو مانای ئاشکرا.

**السِّلْسُ**: ئەو بەنەی تەسبیحەکەی پێ دەهۆندرێتەوە ◦ مەروی سپی لە ریزی ملوانکەدا ◦ گوارەی زێڕو خشلْ ◦ چوار شێوەو چارەکەو دەسماڵ ◦ (ك: سلوس).

**ألسَّلَس**: ئەوەیە کابرا میزی پێ راناگیرێ.

**ألسَّلِسَةُ**: جۆرە روەکێکە لە دەشتاییدا دەڕوێ.

**السَّلْسَبِيلُ**: شەرابێکە بە ئاسانی لە قورگ دەچێتە خوارو گوارایە ◦ ناوی کانیاوێکی ناو بەهەشتە ◦ یان ناوە بۆ هەموو سەرچاوەو کارێزاوێك بە خێرایی جەرەیان بکا ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّى سَلْسَبِيلًا﴾.

**سَلْسَلَ الأشياءَ**: شتەکانی پێکەوە هۆنینەوە وەکوو زنجیرە ◦ دەگوترێ: (سَلْسَلَ الأعداد) ژمارەکانی ریز کردن.

**سَلْسَلَ الماءَ ونحوه**: ئاوەکەی رۆکردە خوارو هەڵی رشتو جۆگەلەی پێ بەست.

**سَلْسَلَ الحيوانَ وغيره**: ئاژەڵەکەی بەستەوە، بە زنجیر بەستیەوە ◦ (سَلْسَلَ الثوب): وێنەی لە قوماشەکەدا دروست کرد وەکوو زنجیر.

**تَسَلْسَلَ**: کەوتنە شوێن یەكو زنجیریان بەست.

**تَسَلْسَلَ الماءُ**: ئاوەکە جۆگەلەی بەستو سەر بەرەو خوار رەوان بوو ◦ روبەری ئاوەکە وەکوو زنجیر خۆی نیشاندا کاتێ هەوا لێیدا.

**تسلسلَ الشَّيْءُ**: شتەکە تێکیەوە هاویشتو شێوا.

**تَسَلْسَلَ الثوبُ**: کراسەکە ئەوەندە لەبەرکرا هەتا رایەڵەکەی تەنك بوو.

**السلاسل**: لبە رەق هەڵدێو دەکەوێتە سەریەك ◦ هەورە بروسکەکە بە شوێن یەکدا لێبداو پێچاو پێچ بروسکەکە وەکوو زنجیر دێتە بەرچاو ◦ ئەگەر لە باسی کتێبدا گوترا مەبەست دێرەکانیەتی.

**السُّلاَسِلُ**: ئاوی شیرینو سافو گواراو خۆشرۆ بە گەرودا ◦ کە خورایەوە لە گەرودا زنجیر ببەستێو بە خۆشی قوتچێ.

**السَّلْسَالُ**: بەمانا (السُّلاسِلُ) دێ ◦ دەگوترێ: (ماء سَلْسالٌ) ئاوێکە بە ئاسانی بە گەرودا دەڕواتە خوار چونکە شیرینو گوارایە ◦ (ماء سَلْسَلٌ) ئاوەکە رەشەبا لێیداو روبەرەکەی وەکوو زنجیر دەنوێنێ.

**السُّلْسُلُ**: منداڵی رۆح سوك.

**السِّلْسِلَةُ**: ئەلقە ئەلقەی تێکخراو ○ بە شتی زنجیرە ئاسا دەگوترێ ○ وەکوو دەڵێن: (سِلْسِلة مقالات أو مؤلفات) ○ هەروا بە بروسکەیەك دەگوترێ بە پانتـایی هەورەکـەدا رابـشکێ ○ (سِلْسِلة الجبال) زنجیرەی کێو ○ ریزە کـەژ کـە یـەك بـەدوای یەکـدا بەیەکەوە بەسترابن ○ (ك: سَلاسِلٌ).

**الْمُسَلْسَلُ**: دەگوترێ: (ثوب مُسَلْسَلٌ)، قوماشێـکە وێنـەی وەکـوو زنجـیری تێـدا کـراون ○ قوماشـی خـراپ چندراو رزیو ○ حـەدیثی پێغەمبـەر (د.خ) کـە حـەدیث گێرەوەکانی تـا سەر پێغەمبـەر حـەدیثـەکـەیان لـە یەکتر بیستبێ ○ ریوایەتەکە بڕ بڕ نەبێ.

**سَـلِطَ الطَعَـامُ سَلَـطاً**: خواردەمەنییەکـە، رۆنی کونجی تێکرابێ.

**سَـلِطَ فـلانٌ سـلاطة وسُـلُوطة**: فلانکەس زمانی درێژ بوو.

**سَلُطَ** فلانٌ سلاطة وسُلوطة: بەمانا (سَلِطَ) دێ ○ (فهـو سـلِط وهـي سَـليطة) ○ دەشگوترێ (سَلُطَ لسانُهُ).

**سَلَّـطَهُ**: دەسـەڵاتی رەهـای دایـە، بـاڵا دەسـتی کـرد ○ وای لێـکرد بتوانـێ کۆنترۆڵی بکا.

**تَسَلَّـطَ عليه**: باڵا دەست بوو، بەسەریدا زاڵ بوو.

**الـسَّلاَّطِ**: هەنگوتکە هـەویری گـەورە، نانی گەورە.

**السَّلِطُ**: بـەهێزو تـەوژم ○ زمـان درێـژو زمـان تیـژ ○ پیـاوی چـەقە چـەناوی زمان درێژ.

**الـسَّلِطُ**: تـیر: کـە هـیچ زیبکـەو گرێنایەکی پێوە نەبێ.

**السُّلْطَةُ**: دەسەڵاتو باڵا دەستیو دەست لێ گیربوون.

**السِّلْطَةُ**: تیری بارێـکی درێـژ ○ قاپێـکە حەشیشەو کاو شتی وای تێدەکرێ.

**السَّلَطَةُ**: زەڵاتە ○ سەوزەی ورد کـراو ○ ماسـتی ترشـاو یـان ئـاردو سـرکەو ئاوی لیمۆو خوێ.

**السَّلِيطُ**: هەر رۆنێك لە دەنکی کونجی گوشرابێ ○ (ك: سلطان).

**المِسْلاَطُ**: ددانی کلیل ○ (ك: مساليط).

**المـسلوط**: دەگـوترێ: (رجـل مـسلوط اللحيــة) پیاوێــکە مــووی ریــشی ئەملاو ئەولای رومەتی تەنکە.

**إسْلَنطعَ الوادي**: شیوەکە فراوان بوو.

**إسْلنطع الشيئ**: شـتەکە درێـژ بـوو یـان بوو.

**إسـلنطع الرجـلُ**: پیاوەکـە کرایـەوە پـشویدا ○ لەسـەر پـشت یـان بـەرەو دەم راکشا.

**سَلْطَنَهُ:** كردی بە سوڵتان‌و پاشا.

**تسلطن:** بوو بە سوڵتان‌و خاوەن دەسەڵات.

**السُّلطانُ:** مەلیك، پاشا، فەرمان ڕەوای وڵات ٥ (ك: سلاطين) بۆ مێینە دەگوترێ: (سُلطانة) ٥ هێزو تواناو دەسەڵاتی ژێر بارکردن ٥ بەڵگەو دەلیل.

**السلطانية:** قاپێکە، لەگەنێکە لە سواڵەت دروست دەکرێ خواردنی تێدا دەخورێ ٥ بە کوردی پێی دەڵێن: (کاشی).

**السَّلْطنة:** ناوچەو پانتایی ژێر دەسەڵاتی سوڵتان.

**سَلَعَ رأسَهُ سَلْعاً:** سەری شکاند.

**سَلَعَ الطريق:** ڕێگاکەی ڕاکیشا کەندو لەندی تەخت کردن، چاڵ‌و چوێڵی پڕکردنەوە کردی بە جادە ڕێ.

**سَلِعَ جلده سَلَعاً:** پێستی شەقار شەقار بوو ٥ بەڵەك بوو.

**سَلِعَ الرجلُ:** پیاوەکە پشتی دەرپەڕی‌و شان‌و شەپیلکی خوارو خێچ بوون ٥ (هو أسْلَعُ وهي سَلْعاء) (ك: سُلْعٌ).

**أسْلَعَ فلان:** فلانکەس بوو بە خاوەن کاڵاو شتومەك.

**سَلَّعَ الجلد:** پێستەکەی قەڵاشت هەڵیدڕی.

**إنسَلَعَ جِلدُهُ:** پێستی شەقار شەقار بوو.

**تَسَلَّعَ:** بەمانا (إنسلَعَ) دێ.

**الأسْلَعُ:** پێست قەڵشاو ٥ پێست بەڵەك ٥ پێست دەرپەڕیو ٥ پشت کۆم‌و شان‌و شەپیلك خوارو خێچ ٥ (ك: سُلْعٌ).

**السَّلْعُ:** شەقبونی پێست ٥ قەڵشت بردنی کێوو شتی وا (ك: سلوع واسلاع).

**السِّلْعُ:** شەقبونی کێو ٥ وێنەو شێوە ٥ (ك: سلوع واسلاع).

**السَّلَعُ:** درەختێکە لە وڵاتی یەمەن دەڕوێ، لە پێڕی (العينبية)یە.

**السَّلْعَة:** بڕینی سەر، سەر شکان ٥ (ك: سلاع).

**السِّلْعَةُ:** کاڵاو شتومەکی بازرگانی ٥ شتومەك بە گشتی ٥ هاوسانێکی پیس‌و نەکلەوەتە بە گۆشتەوە نانووسێ لە ژێر پێستەوەیەو دەجوڵێ پەردەیەکی هەیە ٥ جاری وا دەبێ زۆر گەورە دەبێ ٥ یان زێدەیەکە لە جەستەدا پەیدا دەبێ بە تایبەتی لە ملدا زۆر پەیدا دەبێ بە ئەندازەی نوکێك یان زیاتر.

**السُّوْلَعُ:** تاڵی زۆر تاڵ.

**المِسْلَعُ:** چاو ساغ‌و شارەزاو ڕێ نیشاندەر ٥ (ك: مسالِعَ).

سَلَغَ ذو الحافر سَلَغاً: ئاژەڵە سمدارەکە شیلەی کەوتن‌و لە شوێنی ئەوە ددانی تری رووان.
سَلَغَ ولد الشاة أو البقرة: کاوڕەکە یان گوێلکەکە ددانی تەواو هاتن ٥ یان ددانی پاش شەش ساڵەی کەوت ٥ (ك: سُلَّغ وسَوالِغ).
سَلِغَ سَلَغاً: بەڵەك بوو ٥ زۆر سور بوو.
سَلِغَ اللحمُ: گۆشتەکە نەکوڵی.
سَلِغَ فلان: فلانکەس بەد رەوشت بوو (فهو أسْلَغُ وهي سَلْغاءُ) ٥ (ك: سُلْغ).
سَلَفَ سلوفاً وسلفاً: پێش کەوت ٥ رابورد ٥ (هو سالف) ٥ (ك: سوالف) (وهي سالفة) ٥ (ك: سوالف) ٥ تێپەڕی، بەسەر چوو.
سَلَفَ السائرَ سَلْفاً: پێش رێبوارەکە کەوت.
سَلَفَ القومُ الأرض: خەڵکەکە زەوییەکەیان تەخت کرد بۆ کشت‌و کاڵ تێدا کردن.
اسلفت المرأةُ: ئافرەتەکە تەمەنی لە چل‌و پێنج ساڵی تێپەڕی.
أسْلَفَ فلاناً مالاً: بە قەرز ماڵی دا بە فلانکەس.
أسلف الأرضَ: زەوییەکەی رێکخست بۆ کشت‌و کاڵ تێدا کردن.
أسلف اليه في الشيئ: شتەکەی بەشێوەی فرۆشتنی سەلەم پێدا.
سَالَفَ: پێش کەوت.
سالف سائراً في الأرض: بە زەوییەکەدا رۆیشت.
سالف فلاناً في أمر: لە کارەکەدا فلانکەسی وەك خۆی لێکرد.
سَلَّفَ فلانٌ: فلانکەس سولفەی خوارد.
سَلَّفَ الضَيْفَ: خواردنی خستە بەردەم میوانەکە، بەڵام کەم بوو.
سَلَّفَ الشَّيْئَ: شتەکەی پێش خست.
سَلَّفَ فلاناً مالاً: ماڵی بە قەرز دا بە فلانکەس.
اسْتَلَفَ: قەرزی کرد.
تسالف الرجلان: ئەو دوو پیاوە دوو خوشکیان مارە کردن بوون بە ئاوەڵ زاوا .
تَسَلَّفَ: بۆ (مطاوعة)ی (سَلَّفَهُ) دێ ٥ سلفەی خوارد.
تَسَلَّفَ منه: پارەی لێ قەرز کرد.
الأسلوفَةُ: خەزورو زاوا بەندی ٥ (ك: أساليف).
السَّالِفَةُ: لامل، ئەستۆ ٥ گەردنی ئەسپ ٥ (ك: سوالف).
السُّلافُ: باشترین شەراب‌و پوختەکەی ٥ کاکڵەی هەموو شتێك.
السُّلافَةُ: بەمانا (ألسُّلاف) دێ.
السَّلْفُ: پێستی دەباغ نەکراو یان دەباغ کردنەکەی تەواو نەبێ ٥

کونـــدەی گـــەورە ٥ (ك: أســــلُفُ وسلوفٌ).

**الــسِّلْفُ للرجـل**: ئـاوەڵ زاوا ؛ مێـردی خوشکی ژنەکەی.

**سِلْفان**: دو کەس ئاوەڵ زاوای یەکتربن ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو تۆزە پێستەی لە هێنی کوڕو وانێـکی کـچ دەبـڕدرێ لـەکاتی خەتەنـە کردنیانـدا ٥ (ك: أسلاف).

**الـسَّلَفُ**: کـۆی (الـسَّالِف)ە بـە هـەموو ئەوانـــە دەگـوترێ کـە پـێش تـۆ کەوتون لە تەمەندا لە باوكو باپیرو خـزمو کـەسو کـار ٥ یـان لـە بـواری زانیاریو فەضلو شکۆمەندیدا پێش تۆ کەوتون ٥ هەر کردەوەیەکی باش پـێش خـۆت ناردبێتـتو ئـەنجامت دابێ ٥ ئەو پێشەکیە پارەی دەیـدەی پێش وەرگرتنی کالا ٥ قەرزێـك کە سـودی بـۆ قەرزدەرەکـە نـەبێ ٥ فرۆشـتن بـە شـێوەی سـەلەم ٥ (ك: أسلاف وسُلاَّف).

**السِّلِفُ**: بەمانا (ألسَّلَفُ) دێ ٥ ئەو تۆزە چەرمەی لە هێنی کوڕو وانێکی کچ دەبـڕدرێ لـەکاتی خەتەنـە کردنـدا (ك: أسْلاف).

**الـسُّلَفُ**: بێچوە کەو، کـەوبارِ ٥ بێـچوە قەتێ ٥ (ك: سُلْفان).

**السُّلْفَةُ**: کەمێك خۆراك کە پێش نان خـواردنی تـەواو ئـادەمیزادی برسـی دەیخـوا ٥ (بـەرکوڵی خـواردن) ٥ ئەوەی ئافرەت پەزمەنـدەی دەکا لـە پارچە شتومەکی عادەتی بۆئـەوەی بیکاتە دیاریی بۆ ئەوانـەی دیـدەنی دەکەن پاش گواستنەوە ٥ بـەو پێـڕو کۆمەڵانـە دەگـوترێ کـە لـە پێـشدا دەگەنە جێو پێش دەکەون ٥ پارچە زەوییەکە رێـك دەخـرێ بـۆ کشتو کـاڵ تێـداکردن، پێـستێکی تەنکـە دەکـرێ بـەناو کـەفی پـێڵاو ٥ ئـەو تـۆزە پێـستەیە کە لـە هێنـی کـوڕو وانێــکی کــچ دەبــڕدرێ لــەکاتی خەتەنە کردندا ٥ مـاڵی قـەرزکراو ٥ (ك: سُلَفٌ).

**الـسِّلْفَةُ للمـرأة**: ژنـی بـرای مێـردی ئافرەت (براژن).

**الـسِّلفتان**: دوو ئـافرەت کـە ژنـی دوو برابن ٥ (ك: سَلائف).

**السُّلِفَةُ مـن الأرض**: زەوییـەك درەختـی کەمی لێ ڕوابێ.

**السَّلَفِي**: کەسێـك لە ئەحکامی شەرعدا بگەڕێتـەوە بـۆ قورئـانو حـەدیثی پێغەمبــەر (د.خ) ٥ گــوێ بــە ڕاو بۆچونی زانایانی ئیسلام نەدا.

**السُّلاَّف مـن العـسکر**: پێشەتای سوپا.

**السَّلِيفُ**: بەمانا (ألسَّالِف) دێ ٥ پێرو کۆمەڵ کە لە پێشدا دەگەنە جێ ٥ (ك: سُلُفٌ).

**الْمِسْلَفَةُ**: ئامێرێکە زەوی پێ تەخت دەکرێ بۆ کشتو کاڵو شتی وا.

**سَلَقَ سَلْقاً**: بازی دا ٥ هاواری کردو دەنگی بەرز کردەوە.

**سَلَقَ** اللحمَ والخُضَرَ بالماء الحار: گۆشتەکە یان تەماتەو بامیەکەی لە ئاوی گەرمدا کوڵاند رۆنو تامی تێکرد.

**سَلَقَ** فلاناً بكلامه أو بلسانه: بە زوبان دڵی فلانکەسی ئازاردا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا ذَهَبَ الْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ﴾.

**سَلَقَهُ**: لێی دا ٥ زەبری لێداو برینداری کردو بەسەر لادا خستی ٥ بەسەر پشتە ملیدا خستی.

**سَلَقَ** الطبيب فلاناً: پزیشك فلانکەسی لەسەر پشت راکێشا.

**سَلَقَ** الذبيحةَ بالماء الحار: کوشتییەکەی بە ئاوی کوڵاتو ئاوەروت کرد ٥ کوڵکەکە یان خورییەکەی لێ داماڵی.

**سَلَقَ** اللّحمَ عن العظم: گۆشتەکەی لە ئێسقانەکە داماڵی ٥ دەگوترێ: (ركب الدَّابَةَ فَسَلَقَتْ باطن فخذيه) سواری وڵاخەکە بوو ناو رانی داماڵدران.

**سَلَقَ** بالسوط وغيره: پێستی گرو.

**سَلَقَ** ظهرَ الدّابةِ: پشتی وڵاخەکە برینداربوو پێستی داماڵدرا.

**سَلَقَ** البردُ أو الحَرُّ النباتَ: سەرما رومکەکەی برد ٥ گەرما رومکەی سوتاند.

**سلق** الجلدَ: پێستەکەی چەور کرد.

**سَلَقَ** الحائِط وغيرَهُ: چووە سەر دیوارەکە.

**سَلَقَ** العودَ ونحوه في المروة: دارەکەی خستە ناو قوڵفەی گۆزەکەوە.

**سُلِقَ** فلان على هذه السَّليقة: فلانکەس لەسەر ئەو رەوشتە دروست بووە.

**أسْلَقَ الرجلُ**: پیاوەکە کوڵلەی نێچیر کرد.

**أسلق العودَ في المروة**: دارەکەی کردە ناو قوڵفی گۆزەکەوە.

**إنسَلَقَ**: بۆ موطاوەعەی (سَلَقَهُ) دێ.

**انسلق اللسانُ**: زوبانەکە هەڵشت هەڵشت بوو.

**انسلق الجفونُ**: پێڵوی چاوەکە سور هەڵگڕاو شەقار شەقار بوو.

**تَسَلَّقَ على فِراشِهِ**: لەسەر جێگا خەوی لێ زڕاو لەبەر خەمو پەژارە خەوی لێ نەکەوت.

**الأسَالِقُ**: مەلاشوو لە زمانە پچکۆلە بەملاوە یان خودی زمانە پچکۆلە.

أَلسَّالِقة: ئافرەتێك لەكاتی تەنگانەو بەلاو ناخۆشیدا دەنگ بەرز بكاتەوەو بقیژێنێ ◦ یان لە دەمو چاوی خۆی بداو قژی خۆی بڕنێتەوە ◦ (ك: سوالق).

السُّلاَق: زیبكە كە لە بنكی زمان بێ ◦ قەڵشانو شەقار بوونی پوكو بنكی ددانە.

أَلسِّلْقُ: گورگ ◦ یان روەكی (سلق) كە دەكوڵێندرێو یاپراخو دۆڵمەی پێ دروست دەكرێ، یان بە شێوەی تر كە دەكوڵێندرێو دەخورێ ◦ لافاوی ئاو ◦ (ك: سُلْقان).

السَّلَقُ: رێگای پانو پۆڕ ◦ دەشتایی پانو پۆڕ كە روتەن بێو هیچی لێ نەروابێ (ك: أسلاق وسُلْقان).

أَلسِّلْقَةُ: ئافرەتی زمان درێژو بێ حەیا ◦ كوللە كە گەرا دەنێتەوەو هێلكە دەكا. (ك: سِلَقٌ).

السَّلاَّق: دەگوترێ: (خَطیب سَلاّق) وتار بێژێكی بەلیغو زمان رەوانەو قسە شیرینە.

السَّلوقي: هەر شتێك پاڵ (سَلوق) بدرێ كە گوندێكە بە سەگی چاك بەناوبانگە ◦ وەكوو چۆن لەلای ئێمە سەگی گوندی هەوشار مەشهورن ◦ هەروا گوندی (سلوق) بە زرێی باشیش بەناوبانگە.

السُّلوقیة: شوێنی دانیشتنی كەشتیەوان لەناو كەشتیدا.

السَّلیقُ: روەكی سەرما بردو یان گەرما بردو ◦ گەندە گیاو روەكی تەنكی وشكەوە بوو ◦ ئەوەی هەڵدەوەری لە درەختی پچكۆلە ◦ ئەملاو ئەولای رێگا ◦ شانە هەنگوین ◦ (ك: سُلُقٌ وسُلْقٌ).

السَّلیقةُ: سروشت ◦ دەگوترێ: (فلان یتكلم بالسلیقة) فلانكەس بە سروشت بەبێ فێركردن بەو زمانە قسە دەكا ◦ لا تەڕادو گۆشتی ئەملاو ئەولای كەلەكە ◦ جێ شوێنی قاچو سمی وڵاخ لەناو رێگادا ◦ رێگای ئاشكراو شەقامە رێ ◦ شتێكە هەنگ لەناو هەنگەلانەكەیدا دەیچنێ بە درێژایی كۆلەسەكە ◦ دانەوێڵەی زورات بهاڕدرێو لەگەڵ شیردا بكرێ بە پەلوو بكوڵێندرێ ◦ (ك: سلائق وسُلُقٌ).

السَّلیقي: نیسبەت دراو بۆلای سەلیقە ◦ عەرەبێك بەبێ خوێندنی نەحوو ئیعراب قسەی رەوانو بێ هەڵە بكا، بە سروشت بە زمانی زكماك ئاخاوتن بكا.

أَلمِسْلاَق: بەمانا (السَّلاق) دێ ◦ (ك: مسالیق).

**اَلمَسْلوقةُ**: فروجاو گۆشتاو، ئاوو گۆشت بكوڵێندرێ.

**السَّلْقون**: ئۆكسیدی رەصاصی سور بۆ بۆیە كردنو شتی وا بەكار دەهێندرێ.

**السَّیلقون**: بەمانا (السلقون) دێ.

**سَلَكَ** المكانَ وبه وفیه سلكاً وسلوكاً: چووە ناو شوێنەكەوە.

**سَلَكَ** الشَّيءَ في الشَّيءِ: شتەكەی خستە ناو شتەكەوە.

**سَلَكَ** فلاناً المكانَ: فلانی خستە ناو شوێنەكەوە ٥ دەشگوترێ: (سَلَكَ بە المكانَ) یان (أسلكه المكانَ) ٥ خستیە ناو شوێنەكەوە، وای كرد بچێتە ناو شوێنەكەوە.

**سَلَكَهُ**: خستیە ناو شوێنەكەوە.

**تَسَلَّكَ**: بۆ (موطاوعە)ی (سَلَكه) دێ.

**السِّلْكُ**: بەنی تەزبیحو میرو هۆنینەوە یان بەكرەی درومان ٥ یان وایەری راكێشانی كارەبا ٥ (ك: سلوك وأسلاك).

**السِّلك الدیبلوماسي**: كۆمەڵێك كارمەندی دەوڵەت كە لە وڵاتێكی تردا نوێنەرایەتی دەوڵەتی خۆیان دەكەن.

**السُّلَك**: بێچووە قەتێو بێچووە كەو (كەوباڕ) (ك: سِلْكان).

**السِّلْكي**: كاری راستەوخۆ ٥ شتی راستو بێ پێچو پەنا ٥ برینی راستو قوڵ.

**السِّلكةُ**: داوە دەزوو بەكرە ٥ وایەری كارەبا (ك: سِلَكٌ).

**السَّلاّكُ**: فرۆشیاری دەزوو بەكرە یان هی وایەری كارەبا ٥ دروست كەری ئەو شتانە.

**السُّلُوكُ**: ژیانی ئادەمیزادو هەڵسو كەوتو بیرو باوەڕی ٥ دەگوترێ: (فلان حسن السلوك أو سيئ السلوك) ٥ لە بواری دەروونناسیدا بریتییە لە ئامادە باشی تەواوی بونەوەرێكی زیندو بۆ هەر هەڵوێستو رووداوێك كە دێتە پێشی.

**اَلْمَسْلَك**: رێگا ٥ (مسالك الماء) رێڕەوەكانی ئاو ٥ (ك: مَسالك).

**سَلَّ** الشَّيءَ من الشَّيءِ سَلاًّ: بە هێدیو لەسەرەخۆ شتەكەی لە شتەكە دەرهێنا ٥ وەكوو دەگوترێ: (سَلَّ الشَّعرةَ من العَجين) مووەكەی لە هەویرەكە دەركێشا.

**سَلَّ** السیفَ من غِمده: شمشێرەكەی لە كالانی دەرهێنا.

**سَلَّ** الشَّيءَ: شتەكەی دزی ٥ (سُلَّ) توشی نەخۆشی سیل بوو.

**سَلَّهُ اللهُ فلاناً**: خودا فلانكەسی توشی دەردی سیل كرد.

**اسْتَلّ الشيءَ**: بەمانا (سَلَّهُ) دێ ٥ دەگوترێ: (إستَلَّ به) بە دزی بردی.

**سَلَّ** الجدولُ النّهرَ: جۆگاكە لە روبارەكە هەڵگیراو بوو بە لقێكی چۆمەكە.

**إنسَلَّ**: بۆ موطاوەعەی (سَلَّهُ) دێ ٥ بە دزییەوە چووە دەر.

**تَسَلَّلَ**: بەمانا (إنْسَلَّ) دێ ٥ دەگوترێ: (تَسَلَّلَ في الظلام).

**الأسَلُّ**: دز.

**الإسلالُ**: دزییەتی، دزی كردن لە حەدیثدا هاتووە (لا إغلالَ ولا إسلالَ) ٥ هەروا بە مانا بەرتیل دانو هێرش بردنی ئاشكراش هاتووە.

**السَّالُ**: تەنگەلانی ناو شیوو دۆڵ ٥ رێڕەوی ئاو كە تەنگە بەربێ ٥ (ك: سَوّال وسُلاّن).

**السُّلالُ**: نەخۆشییەكە توشی جەرگو سی دەبێو خاوەنەكەی زەعیفو لاواز دەبێو سەرەنجام دەیكوژێ.

**السُّلالَةُ**: هەر شتێك لە شتێكی تر دەربهێنرێ ٥ دڵۆپە مەنی (دڵۆپە ئاوی گەرا) قورئان دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِن سُلَالَةٍ مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ﴾ ٥ كۆمەڵێك بونەوەری زیندو لە رەوشتو ئاكاردا لێك بچن.

**السَّلُّ**: سەلە، زەمبیلە، بەچنە.

**السِّلُّ**: بەمانا (السُّلاَلُ) دێ.

**ألسَّلَّةُ**: یەكجار دەركێشان، راكێشانێك ٥ دەگوترێ: (أتیناهم عند السِّلَّةِ) لەكاتی راكێشانی شمشێرەكانیان هاتینە لایان ٥ دزی ٥ دەگوترێ: (ألْخُلَّةُ تدعو الى السِّلَّة) نەبوونیو ئاتاجی سەر دەكێشن بۆ دزی كردن ٥ درزو قەڵشتی ناو زەوی كە ئاو دەدزن ٥ بازدانی ئەسپ.

**السِّلَّةُ**: روەكێكی چقڵاوییە لە سارادا دەروێ.

**السَّلاَّلُ**: سەلەو زەمبیلە دروستكەر ٥ فرۆشیاری ئەو جۆرە شتانە.

**ألسَّلِیلُ**: راكێشراو روتكراو، دەرهێنراو ٥ منداڵ كاتێ لە ڕەحمی دایكییەوە دێتەدەر ٥ شەرابی خالصو بێ خەوش كە هیچ خڵتەو ئێڵی تێدا نەبێ ٥ رێڕەوی ئاو لەناو شیوو دۆڵدا ٥ (ك: سلاّن).

**السَّلِیلَةُ**: مێینەی (السَّلیل) بەمانا كچو كەنیزەكە ٥ خوریو موی بەشەكراوو شیكراوە ٥ ریشاڵە گۆشت ٥ گۆشتی ریشاڵ ریشاڵ.

**المِسَلَّةُ**: دەرزی ئەستۆران، سوژن ٥ میلی سەركەوتن كە بەردێكی گەورە یان دیوارێكی منارە ئاسایە نووسینی كۆنینەی لەسەرە ٥ وەكوو

میلی فیرعەونەکانو میلی حامورابی، میلی کێلە شینو زۆر شوێنی تر (ك: مَسَال).

اَلْمُسَلِّلُ: شارەزا لە فێڵو تەڵەکەدا، دەست سوك لە دزیو شتی وادا ٥ دز.

سَلَمَ الجِلْدَ سَلْماً: پێستەکەی بە گەڵای داری (سەلم) دەباغ کرد.

سَلِمَ من الأفات ونحوها سلاماً وسلامَةً: لە بەڵاو نەخۆشی رزگاری بوو، قوتار بوو.

سَلِمَ له كذا: تایبەت بوو بۆ ئەو، کەوتە بەشی ئەوەوە.

أسْلَمَ: گەردن کەچ بوو، ملکەچ بوو، بە راستاڵیو دڵسۆزی بەندایەتی بۆ خودا کرد ٥ موسوڵمان بوو، چووە ژێر خێمەی ئایینی ئیسلامەوە ٥ چووە ناو حاڵەتی ئاشتەواییو ئارامییەوە.

اسْلَمَ عن الشَّيْءِ: وازی لە شتەکە هێنا لێی دەرچوو.

اسْلَمَ في البيع: لە مامەڵەدا سەودای شێوە سەلەمی کرد ؛ بە شێوەی سەلەم کڕینو فرۆشتنی کرد.

اسْلَمَ اليه الشيءَ: شتەکەی تەسلیم کرد.

أسلم أمْرَهُ له: کاری خۆی بە ئەو سپارد.

أسْلَمَ الخَيْطُ ونحوه: بەنی تەسبیحەکە پچڕاو دەنکە تەسبیحەکە پەرتو بڵاو بوونەوە.

اسلم فلاناً: فلانکەسی دا بەدەست دوژمنەوە ٥ ئیهماڵی کرد، ریسوای کرد.

سالَمَهُ مُسَالَمَةً وسلاماً: صوڵحی لەگەڵدا کرد.

سَلَّمَ: ملکەچ بوو ٥ رازی بوو بە بڕیارەکە.

سَلَّمَ المصلّي: نوێژ کەرەکە سەلامی دایەوە لە نوێژەکە دەرچوو ٥ گوتی: (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته).

سَلَّمَ في البيع: بە شێوەی سەلەم کڕینو فرۆشتنی کرد.

سَلَّمَ في الدعوى: دانی بەراستی داواکەدا نا.

سَلَّمَ الجيشُ لعدُوِّهِ: سوپا دانی نا بە تێشکان لە بەرامبەر دوژمنی.

سَلَّمَ أمره لله واليه: گەردن کەچی خودا بوو.

سَلَّمَ نَفْسَهُ لغيره: خۆی تەسلیم بە غەیر کرد.

سَلَّمَ الشَّيْءَ له: شتەکەی بۆ خۆی تایبەت کرد.

سَلَّمَ الله فلاناً مِن كذا: خودا فلانکەسی لەو شتە رەها کرد.

سَلَّمَ الشَّيْءَ له واليه: شتەكەی پێدا، پێی گەیاند.
استَلَمَ الزرعُ: كشتو كاڵەكە گوڵی كرد.
استلم الحاج الحجر الأسود: حاجیەكە بەردە رەشەی ماچ كرد، دەستی لێدا بە دەست ئاماژەی بۆ كرد.
تسالَمَا: رێك كەوتن صوڵحیان كرد.
تَسالَمَ الخيلُ ونحوها: ئەسپەكە بە هێواشی لە گەڵیدا رۆیشت.
تَسَلَّمَ الشَّيْءَ: شتەكەی وەرگرت.
تَسَلَّمَ منه: خۆی لێ بێ بەری كرد خۆی نەكرد بە خاوەنی.
تَسَلَّمَ الكافر: كافرەكە موسوڵمان بوو ٥ خۆی بە موسوڵمان دانا ٥ خۆی شوبهان بە موسوڵمان.
اسْتَسْلَمَ: ملكەچ بوو.
اسْتَسْلَمَ سَنَنَ الطريق: ملی رێگای گرتە بەرو پێیدا رۆیی هەڵەی نەكرد.
الاسلام: پەیرەوی كردنی ئەو پەیامو پرۆگرامەی حەزرەتی موحەممەد (د.خ) هێناویەتیو پابەند بوون پێیەوە ٥ ئایینی خودا پەسەند كە حەزرەتی موحەممەد هێناویەتیو قورئان بەرنامەیەتی.
الأُسَيْلِم: رەگێكە لە نێوان پەنجەی برا توتەو پەنا براتوتە.

السَّلاَم: ناوێكە لە ناوە جوانەكانی خودا ٥ سەلامەتو بێ عەیبو خەوش ٥ شێوەی سەلام كردنە لەلای موسوڵمانان ٥ صوڵحو ئاشتەوایی ٥ نەشیدی نیشتمانی ٥ جۆرێكیشە لە درەخت ٥ (دار السلام) بەهەشت ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَهُمْ دَارُ السَّلاَمِ﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ شاری بەغدا.
السُّلاَمَى: بای باشور پێچەوانەی بای شەماڵ.
السُّلاَمَى: ئێسقانی پەنجە لە دەستو قاچدا.
السُّلاَمِيات: ئەو رەگو دەمارانەن كە لە دەستو قاچدا دەردەكەون.
السَّلامان: درەختێكی دەشتاییە.
السُّلَّمُ: پەیژەو هەڵكێشو داكێش؛ (مەصعەد) ٥ لە بواری مۆسیقادا كۆمەڵە ئاوازێكن سنوریان دیاری كراوە پلە لە ژور پلە.
السِّلْمُ: ئیسلام ؛ ئاشتەواییو صوڵح ٥ پێچەوانەی شەڕ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا﴾ ٥ ئاشتی خواز.
السَّلَمُ: گەردن كەچیو ژێر باری ٥ خۆ بەدەستەوە دان ٥ دیل بوون لە

غـەيرى شـەڕدا ٥ فرۆشـتن‌و كڕينـى
كاڵا بە شێوەی سەلەم ٥ درەختێـكە
گەڵاكـەی دەبـاغی پـێ دەكـرێ ٥
تاكەكـەی (سَـلَمَةٌ) ٥ (أبـو سَـلَمان)
دەعبايەكە وەكوو قالۆنچە دەچێ.
اَلسَّلِمَةُ: بەرد ٥ ئافرەتی دەست‌و پەنجە
نەرم‌و نيان ٥ (ك: سِلام وسَلِمٌ).
اَلـــسَّلِيمُ: ئـــادەميزادی گەســـتراو ٥
برينـــداری گەيیـــشتو بـــە حاڵـــەتی
گيانەڵاو ٥ (ك: سَلْمَي وسُلَماء).
اَلْمُـــسْلِمُ: موســـوڵمان: هـــەر كەسێـــك
پـــەيامی حـــەزرەتی موحەمەـــەد
بەراست قبوڵ بكاو پەيڕەوی بكا.
إسْلَهَبَّ الفَرَسُ ونحوه: ئەسپەكە بەردەوام
بوو لە ڕۆيشتنی خۆيدا.
الـسَّلْهابُ: ئـافرەتی ئـازاو پێـشكەوتن
خواز ٥ (ك: سلاهيب).
السَّلْهابَةُ: بەمانا (السَّلْهابُ) دێ.
الـــسَّلْهَبُ: درێـــژ ج ئـادەميزاد بـێ ج
ئەسپ بێ ٥ (ك: سَلاهِبَ وسَلاهِبة).
إسْلَهَمَّ: سيس بـوو، وشـك بـوو بـەهۆی
نەخۆشـييەوە ٥ يـان كزبـوو شـێوا
بەبێ نەخۆشی ٥ ڕەنگی گۆڕا، بۆنی
گۆڕا.
اسْـلَهَمَّ المـريضُ: نەخۆشـەكە شـوێنكەی
نەخۆشـييەكەی بـــە جەســـتەيەوە
ديارە.
اَلسَّلْهَمُ: قەد باريك ٥ وشتری كزو لاواز

بوو بەهۆی نەخۆشی.
سَلاَّ وعنه سَلْواً وسُلُوّاً وسلواناً: بڕوی نا
تەسەلای هات.
سَلِيَهُ سُلِياً: بوغزاندی ناخۆشی ويست ٥
دەگوترێ: (ما سليت أن أقـوْلَ كـذا)
لە بـيرم نەچـوو ئـەوە بڵێم بەڵـكوو
بە ئەنقەست نەمگوت.
أسْلَى القَوْمُ: خەڵكەكە لە درنـدە دڵنيا
بوون‌و ترسی ئەوەيان نەما.
أسْلَى فلاناً عن كـذا: وای لـە فلانكـەس
كرد تەسەلای بێ‌و بـڕوی ئـەو شتە
بنێ.
أسْلَى فلاناً من هَمِّهِ: غەم‌و خەفەتی لە
دڵی فلان دەرهاويشت.
سـلاَّ عنـه ومنـه: تەسـەلای ئـەوی لـەو
شتە هێنا.
إنْسَلَى عنه الهَمُّ وغيره: خـەم‌و خەفـەتی
لێ ڕۆيی ٥ خەمی بەبادا.
تَـسَلَّى فـلانٌ: فلانكـەس بـڕوی نـا،
تەسەلای هات.
تَسلَّى عنه الهَمُّ وغيره: خەم‌و خەفەت لە
دڵ‌و دەرونی دا نەما.
اَلـسَّلْوَى: هـەر شتێـك تەسـەللای تـۆ
بێنێ ٥ ناوە بۆ باڵندەی سومانی كە
باڵندەيـــەكی پـــچوكە لـــە پێـــری
(الدُّجاجيات) جەسـتەی تێكسمڕاوو
خـڕو خۆڵـە ٥ زسـتانان ڕەودەكـا بۆ

وڵاتی یەمەن‌و سودان، لە ئەوروپاو ولاتانی دەوروبەری دەریای ناوەڕاست دەژی تاکەکەی (سَلْواة).

**السُّلْوان**: ئاوێکە پێیان وابووە عاشق بیخواتەوە سۆزی عیشقەکەی لە دڵدا دادەمرکێ‌و تەسەلای دێ ٥ دەرمانێکە خەمبار بیخواتەوە خەمەکەی دەڕەوێ‌و تەسەلای دێ ٥ دەگوترێ: (سَقَيْتَنِي سُلْواناً) کەیف خۆشت کردم ٥ خەمت لە دڵمدا لابرد.

**السُّلْوانة**: میرویەکە پێیان وابووە ئەگەر بارانی لێ ببارێ‌و عاشق باراناوەکەی بخواتەوە تەسەلای دێ‌و عەشقەکەی دادەمرکێ.

**السُّلْوَةُ**: هەر شتێک تەسەلا بداتەوەو بیرۆشی بشکێنێ ٥ دەگوترێ: (سقيتني سُلْوَةً) بیرۆشیت پێ هێنام، تەسەلات دامەوە ٥ هەروا ناوە بۆ ژیان خۆشی.

**المَسْلَى**: بەمانا (السُّلُوُّ) دێ ٥ (ك: مَسالٍ).

**المَسْلاةُ**: بەمانا (المَسْلَى) دێ.

**السَّلُّورُ**: جۆرە ماسییەکە لە دەریاو روباردا هەیە، وادەبێ سێ مەتر درێژ دەبێ.

**سلى النَّاقَةَ ونحوها**: پزدانی حوشترەکەی دەرهێنا.

**سَلِيت الحامِلُ سَلىً**: سک پڕەکە پزدانی پچڕا ٥ پزدان: پەردەیەکی تەنکە بێچو لەناو سکی دایکیدا لەو پەردەدایە ئەگەر ئەو پەردە لەناو سکی دایکەکەدا بپچڕێ دایکەکەو بێچوەکە هەردوکیان دەمرن.

**إسْتَلَتِ الحامِلُ**: سک پڕەکە پزدانی فڕێدا.

**إسْتلت الشاةُ**: مەڕەکە قەڵەو بوو.

**السَّلَى**: پزدان ٥ بە پیاوی خوێڕی دەگوترێ (هو آكل السَّلَى) پزدان خۆر.

**سَمَأَلَ الخَلُّ**: شەرابەکە زرینگاوەتەوەو بڵقە وردەی کەوتوونە سەر.

**إسْمَأَلَّ الظِلُّ**: سێبەرەکە پوکایەوە.

**إسْمَأَلَّ الحيوانُ**: حەیوانەکە لاواز بوو قەدی باریک بوو.

**إسْمَأَلَّ الثوبُ**: قوماشەکە رزی.

**السَّمْأَلُ**: سێبەر.

**السَّمَوْأَلُ**: سێبەر ٥ بڵقە وردەی سەر کوپە شەراب.

**سَمَتَ سَمْتاً**: رەوێتی جوان بوو ٥ بە گومانەوە بەسەر رێگادا رۆیی.

**سمت للقوم**: رێ‌و شوێنی بۆ خەڵکەکە دانا، بەرنامەی بۆ دارشتن تا پەیڕەوی بکەن.

**سَمَتَ الشَّيْءَ**: قەصدی شتەکەی کرد ٥ دەگوترێ: (سَمَتَ سمت فلان) چووە دەوروبەری فلان‌و رێ‌و شوێنی ئەوی گرتە بەر.

**سامَتَهُ**: روو بەرِوی بووە، بەرامبەری وەستا.

**سَمَّتَ فلان**: فلانکەس رێگای راستی گرتە بەر.

**سَمَّتَ الله**: لە کاتی تەنگانەدا هاواری لە خودا کرد.

**سَمّت على الشيئ**: ناوی خودای لەسەر شتەکە هێنا.

**السَّمْتُ**: رێگای ئاشکرا، مەزهەب‌و رێباز ٥ ئارامی‌و شکۆمەندی ٥ شێوەو ئاکار ٥ خاڵێکە لە ئاسمان لە ئاستی سەری بینەر.

**اَلْمُتَسامِتَةُ النقط المتسامتة**: چەند خاڵێك لەسەر یەك دێڕ ریز بکرێن (زاراوەیەکی هەندەسییە).

**اَلْمُسَمَّتُ من النعل**: بەری نەعل ناوەڕاستەکەی.

**سَمُجَ سَمَاجَةً وسُمُوجَة**: ناشیرین بوو (هو سَمِیج وسَمْج وسَمِجٌ).

**سَمَّجَهُ**: ناشیرینی کرد.

**إسْتَسْمَجَهُ**: هەوڵیدا ناشیرینی بکا، داوای کرد ناشیرین بێ.

**اَلسَّمْجُ**: شیری تام گۆڕاوی بۆگەن.

**اَلسَّمِیجُ**: بەمانا (السَّمْجُ) دێ ٥ (ك: سُمَجاء) (وهي سمیجة) (ك: سِماج).

**سَمْجَرَ اللَّبَنَ**: شیرەکەی تێکەڵ بە ئاوکرد ٥ ئاوی کردە شیرەکە.

**سَمَحَ سمحاً سماحة**: لێبوردەو نەرم تەبیعەت بوو.

**سَمَحَ العودُ**: شورکەکە بێ گرێ بوو.

**سَمَحَ فلان**: فلانکەس لە هەرزانی‌و گرانی دا بەخشندە بوو هەموو کاتێ لە ماڵی خۆی دەبەخشی ٥ دەگوترێ: (سَمَحَ له بحاجة) کارەکەی بۆ ئاسان کرد.

**سَمُحَ سماحة وسموحة**: لە پێری ئادەمیزادانی لێبوردەو بەخشندە بوو (هو سَمْحٌ وسَمِیحٌ).

**أسْمَحَ**: بەمانا (سَمَحَ) دێ ٥ دەگوترێ: (أسْمَحَت نفسه) نەفسی زەلیل بوو ملکەچ بوو هاتە ژێربار.

**سامَحَهُ بکذا وفیه**: رازی بوو داواکەی بێنێتە دی ٥ لێی خۆش بوو ٥ لە دوعاو پاڕانەوەدا دەگوترێ: (سامحك الله).

**سَمَّحَ**: بەمانا (سَمَحَ) دێ ٥ شەو بە هێواشی لەسەرخۆ رۆیشت.

**سَمَّحَ الشَّيْءَ**: شتەکەی ئاسان کرد نەرمی کرد.

**سَمَّحَ الرَّمْحَ وغیره**: رمبەکەی نەرم کرد، مشت‌و ماڵی کرد.

**سَمَّحَ فلاناً**: ئاسانكاری لەگەڵ فلانكەس كرد.

**تَسَامَحَ في كذا**: ئاسانكاری لەگەڵدا كرد لەو شتەدا.

**تَسَمَّحَ فيه**: بەمانا (تسامَحَ) دێ ٥ یان بە زۆرە ملێ لێبوردەیی‌و سەماحەتی بەسەر خۆیدا هێنا.

**اَلسَّمَاحُ**: ئاسانكاری‌و لێبوردەیی ٥ (بيع السماح) فرۆشتنی شت بە كەمتر لە نرخی خۆی ٥ (رقصة السماح) جۆرێكە لە سوڕدانی بە كۆمەڵ كە سوڕ دەرەكان بەشێوەی بازنەیی سوڕدانەكەیان ئەنجام دەدەن.

**اَلسَّمَاحَةُ**: بەخشندەیی‌و شكۆداری، ئاسانكاری.

**اَلسَّمْحُ**: دەگوترێ: (فلان سمح جواد سخي) فلانكەس لێبوردەو سەخی‌و بەخشندەیە ٥ هەروا دەگوترێ: (عود سَمْحٌ) شوڕكێكە بێ گرێ‌و گۆڵ.

**اَلسَّمْحَة**: مێینەی (السَّمحَ) ٥ دەگوترێ: (شريعة سَمْحَة) شەریعەت‌و یاسایەكی ئاسانكارو گونجاوە ٥ (ك: سِمَاح).

**المِسْمَاحُ**: كەسێك زۆر لێبوردەو چاو پۆشیكەر بێ ٥ (ك: مساميح).

**اَلْمَسْمَحُ**: هەرشتێك ئاسانكاری‌و نەرم‌و نیانی تێدا بێ.

**اَلْمِسْمَحُ**: كەسێك زۆر ئاسانكاری‌و نەرمی تێدا بێ.

**اَلسِّمْحَاحُ**: پێستێكە یان توێكڵێكە تەنكەو بە سەری ئێسقانی سەرەوەیە ٥ ئەو پەردە تەنكەیە كە منداڵ لە سكی دایكیدا تێیدایە ٥ شتێكی تەنكەڵەیەو وەكوو توێكڵ ٥ پارچە هەورێكی تەنكە ٥ برینێك قوڵایی بگاتە پێستە تەنكی سەر ئێسقان ٥ شوێنی بڕاوی خەتەنە كردن ٥ (ك: سماحيق).

**اَلسُّمْحُوقُ**: درێژی بارێك ٥ درەختی خورمای بەرز ٥ (ك: سماحيق).

**سَمَدَ سُمُوداً**: بەرز بووە ٥ سەری بەرز كردەوە سنگی دەرپەڕاند.

**سَمَدَ عنه**: لێی غافڵ بوو.

**سَمَّدَهُ**: غافڵی كرد.

**سَمَّدَ الأرْضَ**: زبڵی كیمیاوی كردە ناو زەوییەكەوەو چاكی كرد بۆ كشت‌و كاڵ.

**إسْمَدَّ**: هاوسا بە هاوسانێكی زۆر ٥ دەشگوترێ: (إسْمَدَّ من الغضب والغيظ) بەهۆی رق هەڵسان‌و سور بوونەوە خۆی فش كردەوە، سور بۆوە.

**السَّمادُ**: زبڵ‌و هەر شتێك زەوییەكە بەهێز بكاو پیت‌و بەرەكەتی زیاد بكاو كشت‌و كاڵەكەی زیاد بكا ٥ (ك: أسمدة).

**اَلسَّمْدُ**: بەردەوامو هەمیشەیی.

**اَلسَّمِيذُ**: لوغەتێکە لە وشەی (اَلسَّمِيذ) بەمانا ئاردی بێژراوی بێ سۆ دێ.

**اِسْمَدَّ بصره**: چاوی رەشکەو پێشکەی کرد.

**اسْمدرَ الطريقُ**: رێگاکە درێژو راست بوو.

**اسْمَدرَ الكلامُ**: قسەکە راست دەرچوو.

**السمادير**: ئەو رەشکەو پێشکانەن کە دێنە پێش چاوو وا دەزانی مێش‌و مێشولەن ٥ تاکەکەی (سُمدور).

**اَلسُّمَيْدَعُ**: پیاوی بەرێزو پیاوانەو سەخی سروشت ٥ سەرۆك ٥ ئازا ٥ چوست‌و چالاك بۆ دابینکردنی پێویستیاتی خۆی ٥ (ك: سَمادع وسَمادعة).

**السَّمِيذُ**: لۆغەتێکە لە (السَّمِيدُ).

**سَمَرَ سَمْراً وسُموراً**: شەو چەرەی کرد، شەو لەگەڵ هاو نشینەکانیدا بە وتو وێژ کاتی بەرێ کرد ٥ لە پەندیدا هاتووە (لا أفعله ما سَمر السميرُ أو ابن سمير أو ابنا سمير) واتە قەت ئەو کارە ناکەم.

**سَمَرَت الماشِيةُ**: ئاژەڵەکە لەوەڕا ٥ (سَمَرَت الماشيةُ النباتَ) ئاژەڵەکە روەکەکەی خوارد.

**سَمَرَ الإبلَ**: حوشترەکەی بەرەڵا کرد خۆی لێ بێ خاوەن کرد.

**سَمَرَ اللّبنَ**: ماستەکەی کرد بە ماستاو.

**سَمَرَ الخَشَبَ**: دارەکەی بە بسمار لێك قایم کرد، بە یەکی داکوتان.

**سَمِرَ سُمْرةً**: گەنم رەنگ بوو، رەنگی ئەسمەر بوو ٥ (هو أسمرُ وهي سَمراءُ) (ك: سُمْرٌ).

**سَمُرَ سُمْرةً**: بەمانا (سَمِرَ) دێ.

**سَامَرَهُ**: بەشەو قسەی لەگەڵ کرد بە قسە کردن بۆ یەکتر شەویان بەسەر برد.

**سَمَّرَ الإبلَ واللبنَ والخشَبَ**: بەمانا (سَمَرَ) دێ.

**تسامَرا**: بە یەکەوە شەو قسەیان بۆ یەکتر کرد.

**إسْمَارَّ**: وردە وردە رەنگی گەنم رەنگ بوو.

**إسْمَرَّ**: بەمانا (سَمِرَ) دێ.

**الأسْمَرُ**: گەنم رەنگ ٥ دەشگوترێ: (عام أسْمَرُ) سالی بێ بارانی‌و گرانی ٥ رمب‌و شمشێر ٥ شیری ئاسك ٥ (ك: سُمْرٌ).

**الأسْمران**: ئاوو گەنم ٥ (نان‌و ئاو).

**السَّامِرُ**: ئەوانەی قسە بۆ یەکتر دەکەن‌و شەو بەرێ دەکەن ٥ یانەی شەو چەرەو شەو بەسەر بردن.

**السَّامِريّ**: ئەوانەی پاڵ (السامِرة)

دەدرێن کە گەڵو هۆزێکن لەگەڵ جولەکەدا لە هەندێ بیرو باوەڕدا یەك دەگرنەوەو لە هەندێ بیرو بۆچووندا لێك جیا دەبنەوە ٥ یەکێکە لە پیاوانی نەتەوەی ئیسرائیل لە سەردەمی حەزرەتی موسادا پەیکەری گۆلکەڵەیەکی دروست کردو داوای لە نەتەوەکەی کرد کە گوێرەکەکە بپەرستن‌و واز لە بەندایەتیکردن بۆ خودا بهێنن.

**اَلسَّمارُ**: ماستاو ٥ رووەکێکە لە پێڕی (الأسلية)یە لە زلکاوو شوێنی تەڕو شێداردا دەڕوێ، حەصیرو سەلەو زەمبیلەی لێ دروست دەکرێ.

**اَلسَّمَارَةُ**: شەو بە ڕێکردن بە قسەو چیرۆك گێڕانەوە.

**اَلسَّمَرُ**: قسەو باسی شەو (شەو چەرە) چیرۆك‌و رووداو گێڕانەوە، پانەی قسەکردنی شەوانە ٥ تریفەی مانگە شەو ٥ رۆژگارو زەمانە ٥ دەگوترێ: (لا أُكَلِمَهُ السَّمَرَ والقَمَرَ) واتە: هەرگیزاو هەرگیز قسەی لەگەڵ ناکەم.

**اَلسَّمُرُ**: جۆرە درەختێکە لە درەختی (الطَلْح) ٥ تاکەکەی (سَمُرَة).

**اَلسُّمْرَةُ**: ئەسمەر رەنگێکە لەنێوان سپی‌و رەشدا.

**اَلسَّمَرَةُ**: چیرۆك گێڕانەوە بە شەو.

**اَلسَّمُّورُ**: ئاژەڵێکی گوانداروو شیردەرە لە پێڕی (السَّمورية)یە گۆشت خۆرە، لە پێستەکەی فەروەی بەنرخ دروست دەکرێ ٥ لە باکوری ئاسیا دەژی.

**اَلسِّمِّيرُ**: کەسێك شارەزا بێ لە چیرۆك گێڕانەوەی شەوانەدا ٥ دەگوترێ: (فلان سَمِيرُ ملوك) فلانکەس چیرۆك خوانی پاشایە.

**اَلسُّمَيرُ**: حیکایەت خوانی فەرمانڕەوا (ك: سُمَراء) ٥ زەمانەو رۆژگار ٥ دەگوترێ: (لا أفعله سمير الليالي) قەت ئەوە ناکەم.

**اَلسُّمَيرِيَّةُ**: جۆرە کەشتییەکە.

**اَلمِسْمارُ**: بزمار ٥ شتێکە لە ئاسن دروست دەکرێ سەرێکی تیژەو سەرێکی پانە دارو شتی وای پێ لێك قایم دەکرێ ٥ دەگوترێ: (فلان مِسمار الابل) فلانکەس زۆر باش حوشتر بەخێو دەکاو خاوەندارییان ئەنجام دەداو لێزانە لە پەروەردە کردنیاندا.

**اَلمَسْمُورُ**: داڵ گۆشت، کرژو لاواز، ئێسقان رەق‌و دەمار گشتە.

**سَمْرَجَ**: بە سێ جار پارەی خەراجی ساڵانەی وەرگرت ٥ (ك: سَمارِجَ).

اَلسَمَرَجَةُ: بەمانا (السَّمَرَجُ) دێ.

اَلسَّمَرْمَرُ: باڵندەیەکە دەشوبهێتە باڵندەی شێلاقە ٥ ڕەنگی ڕەشە کوللە لەبەر دەنکەکەی هەڵدێن.

اَلسَّمَرْمَرَةُ: غولی چۆڵەوانی ٥ خێوی بیابان.

سَمْسَرَ فلانٌ: فلانکەس بوو بە دەلاڵو ناوەند لە نێوان کڕیارو فرۆشیاردا هەردوکی گەیاندنە یەکترو مامەڵەکەی پێکردن بۆئەوەی بەشێکی لە پارە بدەنێ.

اَلسِّمْسَارُ: دەلاڵو ناوەند لە نێوان کڕیارو فرۆشیاردا بۆ ئاسانکردنی ئەنجامدانی مامەڵەکە ٥ (سِمْسَار الأرض) زاناو شارەزا لە بواری زەوی ناسیدا ٥ (ك: سَمَاسرة).

اَلسَّمْسَرَةُ: پیشەی دەلاڵی ٥ پارەی دەلاڵی کردن.

اَلسَّمْسَقُ: ڕوەکێکی بۆن خۆشە، عەتری لێ بەرهەم دەهێندرێ ٥ لە پێری (الشّفوية)یە، پێشی دەگوترێ: مردقوش (مرنجوش).

سَمْسَمَ: بە هێواشیو لەسەرە خۆ ڕۆیشت.

سَمْسَمَ الثعلبُ: ڕێویەکە بازی دا.

سَمْسَمَ الله وجه فلان: پەروەردگار شتی وەکوو کونجیو شتی وای لەسەر دەمو چاوی فلان پەیداکردن.

اَلسُّمَاسِمُ: چوستو چالاك لەهەر شتێك بێ ٥ ڕێوی ٥ (ك: سَمَاسِم).

اَلسَّمْسَام: چوستو چالاك لەهەر شتێك بێ.

اَلسَّمْسَمُ: ڕێوی ٥ ژەهر.

اَلسُّمْسُمُ: مێروە سوورە ٥ باڵندەیەکە دەشوبهێتە هەڵۆ ٥ تاکەکەی (سُمْسُمَةٌ)ە، دەگوترێ: (لا کلفتني بيض السماسم) داوای شتێکم لێ مەکە کە ڕێگا چارەی نییە.

اَلسِّمْسِمُ: مێروە سوورە ٥ ڕوەکێکی سالانەیەو ڕۆنی لێ دەردەهێندرێ پێی دەگوترێ: ڕۆنی کونجی ٥ (ك: سماسم) تاکەکەی (سِمْسِمَةٌ).

اَلسُّمْسُمَانُ: چوستو چالاك لەهەر شتێکدا بێ.

سَمَطَ اَللَّبَنُ سَمْطاً وسموطاً: ماستەکە یان شیرەکە شیرینایەکەی ڕۆییوەو تامی نەگۆڕاوە.

سَمَطَ على اليمين: سوێندی خوارد.

سَمَطَ فلاناً يميناً على حقه: لەسەر مافی خۆی فلانکەسی سوێندا.

سَمَطَ الذبيحةَ سمطاً: کوشتییەکەی لەناو ئاوی گەرمدا نوغرۆ کرد ٥ یان خستیە ناو مادەی کیمیاوی پەرمەنگەناتەوە بۆئەوەی موو پەڕو

پوڵی پێوە نەمێنێ پێش ئەوەی بکوڵێندرێو بکرێ بە شیوو پێخۆر، یان پێش دەباغ کردنی.
**سَمَطَ السكينَ**: کێردەکەی تیز کرد.
**سَمَطَ الشيءَ**: شتەکەی بە تەنافدا هەڵواسی.
**سَمَّطَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بە بەن ساموتەکەی زینی ئەسپەکەوە هەڵواسی.
**سَمَّطَ القصيدةَ**: چامە شیعرییەکەی بە شێوازی (مُسَمَّط) هۆنیەوە (بروانە مانای ئەو وشەیە).
**سَمَّطَ الشَّيْءَ**: پابەند بوو بە شتەکەوە.
**تَسَمَّطَ به**: پەیوەست بوو پێیەوە.
**تَسَمَّطَ اللحمَ وغيره**: گۆشتی هەڵگرتبوو ؛ لە کۆڵێدا بوو ٥ دەگوترێ: (رأيته مُتَسَمِّطاً لحماً) ئەو پیاوەم بینی گۆشتی لە کۆڵدا بوو، گۆشتی هەڵ گرتبوو.
**السامِطُ**: ناوی کوڵاتوو کە کوڵکو پەرو پۆڵی کوشتی دادەماڵێ.
**السِّماطُ**: ریزو صەف ٥ دەگوترێ: (مشي بين سِمَاطين من الجنود) بەناو دوو ریزی سەربازدا تێپەری ٥ یان دەگوترێ: (هم على سماط واحد) ئەوان لەسەر یەك ریزو یەك یاساو رێسان ٥ سفرە کە رادەخرێ بۆ خواردەمەنی لەسەر دانان ٥ ئەملاو ئەولای رێگا دەگوترێ: (مشي على سماطي الطريق أو النهر) یان دەگوترێ: (وقف عند سِماط الوادي) لە ناوەڕاستی دۆڵەکەدا وەستاوە ٥ (ك: سُمُطٌ وأسمِطة).
**السَّمْطُ**: پیاوی هەژارو بار سووك.
**السِّمْطُ**: بەنی تەسبیحو ملوانکە بەمەرجێ میروەکانی پێ هۆنرابنەوە ٥ بەرمور ٥ ملوانکەی درێژ کە لە مل بێتە خوار ٥ بەن ساموتەکە ؛ کە بریتییە لە تیلمە چەرمێك بەدوا زینەوە شۆڕ دەبێتەوە راوکەر کوشتی پێدا هەڵدەواسێ ٥ یان شتی تری پێدا هەڵدەواسێ ٥ پیاوی زیرەكو چوستو چالاك ٥ کاراماو دڵسۆز بۆ کاری خۆی ٥ نێچیرەوان لەم رووەوە کە خۆی لە کۆختەکەدا مات دەکاو دەمێنێتەوە وەکوو مانەوەی ملوانکە لە ملدا ٥ (ك: سموط).
**السُّمْطُ**: پۆشاکێکە لە خوری دروست کراو ٥ (ك: أسماط).
**السِّمْط من القصائد**: چامە شیعری (مُسَمَّط)ە.
**السَّمِيطُ**: کوشتی ئاوە روتکراو ٥ بەنی

تەسبیحو ملوانکە کە مرووەکانی پێ هۆنرابنەوە ٥ خشتی ریز کراوو یەك لەسەر یەك دانراو.
**السُّمَيْطُ**: خشتی ریز کراوو یەك لەسەر یەك دانراو.
**المَسْمَطُ**: ئەو شوێنەی کوشتی تێدا پاك دەکرێو ئاوە روت دەکرێ ٥ سەرو پێو ورگو ریخۆڵەی کوشتییەکەی تێدا پاك دەکرێ.
**المُسَمَّطُ من القصائد**: چامە شیعرێکە چەند دێرێکی سەرەوای چون یەکی هەیە ئەمجار دێرێکی تر دێ سەرەوای جودای هەیە بەم جۆرە تا چامەکە کۆتایی دێ.
**المُسَمَّطُ من الأشياء**: ئەو شتەی رەت ناکرێتەوە دەگوترێ: (حُكْمُكَ مُسَمَّطاً) بریاری تۆ پەسەندەو رەت کردنەوەی نییە کەس دژی ناوەستێ.
**سَمِعَ لفلان أو اليه أو الى حديثه سَمْعاً**: گوێی بۆ فلانکەس، گرت گوێی لە قسەی فلانکەس گرت .
**سَمِعَ له**: بە قسەی کرد، فەرمان بەرداری بوو.
**سمع الله لمن حَمِدَهُ**: پەروەردگار حەمدو سوپاسی سوپاسکاری قبوڵ کرد.
**سَمِعَ الصوتَ**: گوێی لە دەنگەکە بوو گوێچکەی بیستی.
**سَمِعَ الدعاءَ**: بە پیر بانگەوازییەوە هاتو قبوڵی بانگەکەی کرد.
**سَمِعَ الكلامَ**: لە قسەکە حاڵی بوو.
**أسْمَعَ الدَّلْوَ أو الزنبيل**: قوڵفەی بۆ دۆڵچەکە یان بۆ زەمبیلەکە کرد ٥ بۆئەوەی بە ئاسانی هەڵبگیرێ ٥ (أسمعَ الزنبيل) دوو دەسکی بۆ زەمبیلەکە دروست کرد بۆئەوەی گڵی ناو بیری پێ هەڵکێشێ بۆ سەرەوە.
**أسْمَعَ فلاناً**: جنێوی بە فلانکەس دا.
**أسْمَعَ فلاناً الكلامَ**: وای کرد فلانکەس قسەکەی گوێ لێبێ ٥ یان قسەکەی پێ راگەیاند.
**سَمَّعَهُ الكلامَ**: وای لێکرد گوێی لە قسەکە بێ.
**سَمَّعَهُ بفلان**: ناوی فلانکەسی زڕاند پڕو پاگەندەی دژ کرد. عەیبو عاری فلانی بڵاو کردەوە ٥ دەگوترێ: (سَمَّعَ به في الناس أو في المجالس) ٥ لەناو خەڵکدا لەناو یانەو کۆڕو کۆمەڵدا ناوی زڕاند.
**إسْتَمَعَهُ وله واليه**: گوێی گرت بۆ قسەکەی.
**تَسَامَعَ الناسُ بالكلام**: خەڵکەکە قسەکەیان لە یەکتر بیستو بۆ یەکتریان گێڕایەوە.

تَسَامَع النَاسُ بفلان: عەیبو عاری لەناو خەڵکدا بڵاو بووە.
تَسَمَّعَهُ وله والیه: گوێی بۆ گرت.
تسمّعه الطبیبُ: پزیشك پشکنینی بۆ نەخۆشەکە کرد.
اَلسَّامِعَةُ: مێینەی (السَّامِعَ) ٥ ناویشە بۆ گوێچکە. دەگوترێ: (أذن سامعة) گوێچکەیەکی زۆر بیسەرە ٥ دەگوترێ: (همـا سـامعتان) ٥ (ك: سوامِع).
اَلسَّمَاعُ: یاد کردنی خوداو زیکری بیستراوو پەسەند ٥ گۆرانی ٥ بەلای زانایانی زمانەوە بریتییە لە پێچەوانەی (قیاس) واتە بیستراو لە عەرەب بەڵام قیاسی بۆ سەر ناکرێ.
سَمَاع: بەمانا (إسْمَعْ) دێ.
السَّمَاعِيُّ: شتێك نیسبەت بدرێ بۆ لای سەماع ٥ پێچەوانەی (القیاسی)یە ٥ واتە: ئەوەی یاسایەکی نیە تا قیاسی بکەی بەڵکوو هەر پشت بە بیستن دەبەسترێ تێیدا.
اَلسَّمْعُ: هێزێکە لە گوێچکەدا دەنگی پێ دەبیسترێ ٥ خودی گوێچکە ٥ بیستراو ٥ زیکرو یادی خودا (ك: أسماع) دەگوترێ: (سمعاً وطاعة) واتە: ببیسە بە بیستن ملکەچو فەرمان بەردار بە ٥ (سَمْعٌ وطاعة) ئیشی من گوێ رادێریو فەرمان بەردارییە.
سَمْعَكَ إليَّ: لە من ببیسە.
سَمْعَ أذني: بە گوێی خۆم گوێم لێ بوو.
اَلسِّمْعُ: زیکری بیستراو ٥ گیانلەبەرێکە لە پێری (الكلبیة)یە لە سەگ گەورەترە قاچی درێژو سەری پانە گوێچکەی سوکە بۆ گوێ سوکی بەناوبانگە ٥ دەگوترێ: (أسْمَعُ من سِمْعٍ) (وأسْمَعُ من السِّمْعِ الأزلِّ).
اَلسُّمْعَةُ: هەر شتێك ببیسترێ لە چاکەو لە خراپە ٥ دەگوترێ: (فَعَلَ ذلك رِیاءً وسُمْعَةً) ئەوەی کرد بۆئەوەی خەڵك ببینن و ببیسن ٥ هەروا دەگوترێ: (أذن سَمْعَة) گوێچکەی زۆر سوكو سرکە.
اَلسُّمْعَةُ: دەنگو باسو شۆرەت ٥ دەگوترێ: (فَعَل ذلك ریاء وسُمْعَةً) ئەوەی کرد بۆئەوەی خەڵك ببینێو ببیسێ.
اَلسَّمْعِیاتُ: لە بواری عەقیدەدا بەو شتانە دەگوترێ کە بە نیگاو سروش دەزانرێ وەکوو بەهەشتو دۆزەخو حاڵو وەزعی قیامەت.
السَّمَّاعَةُ: مێینەی (السَّمَّاع)ە دەگوترێ: (أذن سَمَّاعة) ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو ئامێرەی پزیشك ئەندازەی

فشاری خوێن و چۆنیەتی لێدانی دڵی پێ دیاری دەکا ٥ پارچەیەکە لەناو تەلەفۆندا قسەی پێ دەنێردرێ و پێی دەبیسترێ.

اَلسَّمِيعُ: ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خودا ٥ بیسەر ٥ گوێگر.

اَلْمَسْمَعُ: دەگوترێ: (هو مني بمرئي ومَسْمَع) ئەو لێم نزیکەو دەیبینم و گوێی لە وتەکانمە.

اَلْمِسْمَعُ: گوێچکە ٥ قولفەی ناوەڕاستی دۆڵچە.

اَلْمِسْمَعَةُ: گوێچکە ٥ (ك: مسامع).

اَلْمُسْمِعَةُ: مێینەی (اَلْمُسمع) ٥ ئافرەتی گۆرانی بێژ.

اَلسَّمَعْمَعُ: چوست و چالاک و قالب سوک ٥ بەڵای ناخۆش و پیس ٥ پیاوی پچکۆلەو سەر سەرما زەڵە ٥ سەری پچوک و سوکەڵە ٥ قاچی درێژو باریک ٥ ئافرەتی تێکۆشەرو کۆڵنەدەر.

اَلسَّمَعْمَعَةُ: مێینەی (اَلسَّمعمع) ٥ ئافرەتی ناشیرین و گورگ ئاسا ٥ ئافرەتی دێوە زمەو بەد رەوشت ٥ هەر دەڵێی غول و گورگە.

سَمَقَ النبات أو الشَجَرُ وغيره سَمْقاً: روەکەکە، درەختەکە درێژ بوو، بەرز بۆوە.

السُّمَاقُ: پاڵفتەو پوخت.

السَّمِقُ: پیاوی درێژ.

السُّمَّاقُ: درەختی ترش ؛ ترشە سماق ٥ گەڵاکەی بۆ دەباغ کردن بەکاردێ ٥ لە شوێنی بەرزو کێوو کەژ دەڕوێ.

السَّمِيقُ (اَلسميقان): کەڵەوە (دوو داری خوار کراوەن لە نێری سەر ملی گای جووت قایم دەکرێن بەملاو بەولای ملی گا جوتەکەدا دێنە خوارو لە ژێر گەردنی گا جوتەکەدا بە بەنکەڵەوە سەری دوو دارەکە پێکەوە دەبەسترێن و دەبنە تۆقی ملی بەمەش نێرەکە لە ملی گا جوتەکە شەتەک دەدرێ) ٥ (ك: أسمقة).

سَمَكَ سموكاً: بەرز بۆوە.

سَمَكَ الشَيْءَ سَمْكاً: شتەکەی بەرز کردەوە.

إستمك البَيْتُ: خانووەکە قەبارەی درێژ بوو، بەرز بوو.

إنْسَمَك البيتُ: بەمانا (إستمك) دێ.

اَلسِّمَاكُ: هەر شتێک بەرز بکرێتەوە دیوار بێ یان هەڵاش ٥ یان شتی پێ بەرز بکرێتەوە.

السِّماكان: دوو ئەستێرەی ورشە دارن ٥ یەکیان لە باکورە پێی دەگوترێ:

(السِّماك الرامح) ئەوی تریان لە باشورە پێی دەگوترێ: (السِّماك الأعزل).

السَّمْكُ: سەقف، هەلاش ٥ قەدو بالا هی هەرشتێك بێ ٥ لە بواری وەرزشدا بریتییە لە بوعدی سێیەم جگە لە پانیو درێژی کە دەبێتە قوڵی یان بەرزی قەبارەکە ٥ (ك: سموك).

السُّمْكُ: (سُمْك الشيء) ئەستوری شتەکە.

السَّمَك: ماسی ؛ گیانلەبەرێکی ئاوییەو زۆر جۆری هەیە هەر جۆرە ناوێکی تایبەتی هەیە ٥ (ك: سِماك، سموك، أسماك).

السَّمَكَةُ: تاکی (السَّمَك) ٥ لە پەندێدا هاتووە دەڵێ: (شوي في الحريق سَمَكَتُهُ) لە ئاگر کەوتنەوەدا ماسی خۆی برژاند ٥ واتە: لە جیاتی ئەوەی هەوڵ بدا ئاگرەکە بکوژێنێتەوە ئەو خەریکی ماسی برژاندنی خۆی بوو ٥ بە کەسێك دەگوترێ هەلپەرست بێو بەرژەوەندی گشتی مەبەست نەبێ.

السَّمِيكُ: شتی ئەستوری قەبارە دار لەروی قوڵیو بەرزییەوە.

السُّمَيْكاءُ: مۆرانە، خەمخۆرکە ٥ جۆرە ماسییەکە وردیلە درێژییەکەی دە سانتیمەتر دەبێ، رەنگی زیوی مەیلەو سەوزە ٥ لە دەریای سورداو لەسەر کەناری خۆرهەلاتی ئەفریقاو لە دەریا لوشی ئارامو بەحرەین دەژی ٥ وشك دەکرێتەوەو دەخورێ.

المِسْماكُ: کۆڵەکەیەکە لەژێر خێمەو رەشماڵدا سەقفی خێمەکەی پێ بەرز دەکرێتەوە ٥ (ك: مساميك).

المَسْمُوكُ: درێژ، ئەسپی تێکسمڕاو.

السَّمَكِيّ: کەسێك شتو مەکی ناو ماڵ دروست بکا وەکوو گۆزەو دیزەو قومقومە ٥ پلێتی ئاسن کە بە مادەی قصدیر روکەش کرابێ.

سَمَلَ الثوبُ ونحوه سُمولاً وسُمولَةً: قوماشەکە رزی.

سَمَلَ بينهم سَمْلاً: صولحی نێوانی کردن.

سَمَلَ في المعيشة: هەوڵی چاککردنی ژیانی خۆی دا.

سَمَلَ العينَ: چاوەکەی هەڵ کۆڵی.

سَمَلَ الحوضَ ونحوه: حەوزەکەی لە قوڕو لیتەو قەوزو شتی وا پاك کردەوە.

سَمُلَ الثوبُ: قوماشەکە رزی.

أسْمَلَ بينهم: صولحی نێوانی کردن ٥ هەروا بەمانا (سَمُلَ) دێ.

سَمَّلَ الحوضُ: حەوزەکە ئاوی کەمی لێ هاتەدەر.

سَمَّلَ الحوضَ ونحوه: حەوزەکەی پاك کردەوە قوڕو لیتەو قەوزەی لێ دەرهێنا.
سَمَّلَ فلاناً بالقول: فلانکەسی بە قسە بۆ دڵنەرم کرد، هێدی کردەوە.
اسْتَمَلَ العينَ: چاوەکەی هەڵکۆڵی.
تَسَمَّلَ فلان: ئاوی بنکی پەرداخەکەی خواردەوە بەرماوی بنکی قاپەکەی خواردەوە.
سَمَّلَ النَّبيذَ: پیَ گیری کرد لە خواردنەوەی بیرەو شەرابدا ٥ زۆری لێ خواردەوە.
السَّمَالُ: کرمی ناو ئاوی ڕاوەستاوی بۆگەن کردوو.
السَّمَلُ: (ئوب سَمَلٌ) قوماشێکی ڕزیوو کۆنە ٥ باقی ماندەی ئاو لە بنکی حەوزدا ٥ (ك: أسمالٌ) ٥ دەشگوترێ: (لوب أسمالٌ) قوماشی کۆنو ڕزیو.
السَّمِلُ: (ثوبٌ سَمِلٌ) قوماشی ڕزیو.
السُّمْلانُ من الشراب: باقی ماندەی شەراب.
السُّمْلَةُ: ئاوی کەم لە بنکی پەرداخو سوراحیدا ٥ برسیایەتی کە ئادەمیزاد وا لێبکا فرمێسکی لە چاو بێنە خوار.
السَّمَلَةُ: (ثوب سَمَلَةٌ) بەمانا (سَمَلٌ) دێ ٥ ئاوی کەم لە بنکی پەرداخو سوراحیو دیزەدا بمێنێتەوە ٥ باقی ماندەی ئاو لە بنکی حەوزدا ٥ یان قوڕو لیتەی بنکی حەوز ٥ (ك: سَمَلٌ وأسمالٌ).
سَمْلَجَ الشيءَ في حلقه: شتەکەی بە ئاسانی قوتدا.
السَّمالِجُ: شیری شیرین ٥ (ماستی شیرین).
السُّلاجُ: جێژنێکی مەسیحییەکانە.
السَّمَلَّجُ: ماستو شیری چەورو تام خۆش.
السَّمَالِجُ من اللبن والطعام: ئەوەیە بێ تام بێ ٥ تامی خۆش نەبێ ٥ ماستێك خرابێتە ناو مەشکەوەو خرابێتە ناو چاڵەوە بۆئەوەی ترش بێ، ببێ بە تۆراخ.
السَّمْلَقُ: چۆڵو سارایەك درەختو ڕووەکی لێ نەڕوابێ ٥ ئافرەتی نەزۆك ٥ پەرێزنی بەساڵا چوو پۆڵکاو ٥ (ك: سمالق).
السَّمَلَّقُ من الكذب: درۆی تەواوو بێ پێچو پەنا.
سَمْلَكَ اللُّقْمَةَ ونحوها: پاروەکەی باداو لول کردو هەڵی پێچا.
سَمَّت الرّيحُ سُموماً: بایەکە سوتاندی سوتێنەر بوو.
سَمَّت اليوم: ڕۆژەکە بای سەمومی هەبوو.
سَمَّ الشيءُ: شتەکە تایبەت بوو.

**سَمَّت النِعْمَةُ**: نازو نیعمەتەکە تایبەت بوو.

**سَمَّت الهامَّةُ فلاناً**: جڕو جانەوەرەکە فلانکەسی گەستو ژەهری خستە ناو جەستەیەوە، ژەهراوی کرد.

**سَمَّ السُّمومُ النباتَ**: بای سەموم روەکی سوتاند هەڵی پروزاند یان گەرما بردوی کرد.

**سَمَّ الإبْرَةَ**: کونی لە دەرزییەکە کرد، کونی بۆ دروست کرد.

**سَمَّ الثَّقْبَ**: چووە ناو کونەکەوە.

**سَمَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی چاك کرد، ڕێکی خست.

**سَمَّ الأَمْرَ**: شتەکەی ئەندازە گرتو قوڵییەکەی پێوا.

**سَمَّ بینهم**: چاك سازی نێوانی کردن.

**سَمَّ القارورةَ**: دەمی سوراحییەکەی بەست، دەمی دیزەکەی بەست.

**سَمَّ فلاناً**: فلانکەسی تایبەت کرد.

**سَمَّ النِعمةَ**: نیعمەتەکەی تایبەت کرد.

**سَمَّ فلانٌ سَمَّ فلانٍ**: فلانکەس مەبەستی ئەوی کردە مەبەستی خۆی.

**سُمَّ الیومُ**: ڕۆژەکە بای سەمومی هەبوو، یان بای سەمومی تێدا هەڵ بوو.

**أُسَمَّ الیومُ**: بەمانا (سُمَّ) دێ.

**سَمَّمَهُ**: تایبەتی کرد ۞ ژەهراوی کرد.

**سَمَّمَ السِلاحَ**: ژەهری کردە ناو سیلاحەکەوە.

**سَمَّمَ الوضینَ**: قوڵفەی بۆ قەپاسەکە کرد.

**سَمَّمَ الشيءَ**: شتەکەی بە مرواری ڕازاندەوە.

**تَسَمَّمَ**: بۆ موطاوەعەی (سَمَّمَهُ) دێ ۞ دەگوترێ:

**تَسَمَّمَ الطعام، تَسَمَّمَ الحیوان، تَسَمَّمَ الجرحُ**: واتە: ژەهراوی بوو، ژەهری پێدا بڵاو بۆوە.

**الأَسَمُّ**: لوت کە لەلای سەرویەوە کونەکەی تەنگەبەر بێ.

**السَّامُّ**: هەر جڕو جانەوەرێك ژەهری هەبێ وەکوو مارو دوپشكو سەر مازەڵە ۞ (ك: سَوام).

**سام** أبرص: جۆرە سەر مازەڵەیەکە.

**السّامَّةُ**: مێینەی (السام) ۞ دەعبای ژەهراوی ۞ مردن ۞ ئادەمیزادی تایبەتیو زیرەكو لێکۆڵەرەوە لە نهێنی کاروبار ۞ (ك: سَوام).

**السَّمَّامُ**: جۆرە باڵندەیەکە وەکوو باڵندەی (السُّماني) وایە ۞ شتی سوکەڵەو ناسكو عەنتێکە، شتی خێراو دەستەو پەخە.

**السَّمَّامَةُ**: لە هەموو شتێکدا کەسایەتیو جەوهەرو مادەکەیەتی ۞ روخساری شتو دیمەنی دیاری ۞

دەگوترێ: (فلان بهي السُّمامة) فلانکەس روخسار جوانو خاوەن دیمەنی شکۆمەندە ٥ ئالا ٥ خالێکی کەوانەییە لە ملی ئەسپدا بەهای زیاتر بۆ ئەسپەکە بەیدەست دەکا.

السَّمُّ: هەر مادەیەکی ژەهراوی بێ ٥ شتێکە وەکوو دەنکە مرواری لە دەریا دەردەهێندرێو دەهۆندرێتەوە بۆ جوانی خۆڕازاندنەوەی ئافرەتو شتی تر ٥ یەکێکە لەو دوو رەگەی لە مەلاشوو لووتی ئەسپدایە (ك: سُمومٌ) ٥ دەگوترێ:

أصاب سَمَّ حاجته: مەبەستی خۆی پێکا.

السُّمُّ: هەر مادەیەك ژەهر بێ (سَمّ الفأرة) دەرمانە مشك ٥ مشك کوژە ٥ هەر کونێك تەنگ بێ وەکوو کونی دەرزیو کونە لوتو کونە گوێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ﴾ ٥ (ك: سُموم وسِمام) ٥ (سُموم الأنسان) دەمو کونە لوتو کونە گوێ.

السُّمَّةُ: هەر شتێك وەکوو دەنکە مرواری بێو لە دەریا دەربهێندرێو بهۆندرێتەوە بۆ جوانیو رازاندنەوە ٥ حەصیر؛ کە رادەخرێ لە ژێر دار خورما بۆئەوەی لەکاتی رنینی خورماکانیدا دەنکە هەڵوەریووەکانی بکەونە سەر ٥ خزمایەتی تایبەتی ٥ کرۆکی دار خورما کە بە کەڵکی خواردن بێ (ك: سُمَمٌ وسِمَامٌ).

السَّمُومُ: بای گەرمی سەموم بە زۆری لە وڵاتی میصر لە مانگی مایو بە رۆژ هەڵدەبێ ٥ گەرمای بەتین کە کاردەکاتە وردە کونی پێستی جەستە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ، فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ﴾ ٥ (ك: سَمائم).

المِسَمُّ: ئەوەی دەسەڵاتی بەسەردا بشکێ دەیخوا.

المَسَامُّ: وردە کونی پێستی جەستە.

المَسَمَّةُ: تایبەتی ٥ (أهل المَسَمَّة) خزمو کەسو کاری تایبەتی.

سَمَنَ لفلان سَمْناً: پێخۆری رۆنی بۆ دانا، رۆنی بۆ کردە پێخۆر.

سَمَنَ الطعامَ: بە رۆن خواردەمەنی دروست کرد.

سَمَنَ فلاناً: رۆنی دەرخواردی فلان دا.

سَمِنَ سِمَناً وسَمانةً: قەڵەو بوو، گۆشتو بەزی زۆر بوو ٥ (فهو سامن وسمين وهي سمينة).

سَمُنَ سِمَناً وسَمَانَةً: بەمانا (سَمِنَ) دێ.

أسْمَنَ: بە سروشت قەڵەو بوو.

أَسْمَنَ فلانٌ: قەڵەوی زۆر بوو، زیاد لە پێویست گۆشتن بوو ٥ ئاژەڵەکانی قەڵەو بوون ٥ بوو بە خاوەنی شتی قەڵەو.

أَسْمَنَ الحيوانَ: حەیوانەکەی قەڵەو کرد.

أَسْمَنَ الطعامَ: خۆراکەکەی چەور کرد.

أَسْمَنَ فلاناً: فلانکەسی قەڵەو کرد.

سَمَّنَهُ: قەڵەوی کرد ٥ لە پەنددا هاتووە (سَمِّنْ کلبك یأکلك) سەگەکەت قەڵەو بکەی دەتخوا ٥ بە کەسێك دەگوترێ تۆ چاکەی لەگەڵ بکەی ئەو خراپەت بەرامبەر بکا.

سَمَّنَ الطعامَ ونحوه: خۆراکەکەی چەور کرد.

سَمَّنَ فلاناً: چەوری دا بە فلانکەس ٥ چەوری دەرخوارد دا.

سَمَّنَ لفلان: زۆری بەخشیش دا بە فلانکەس.

تَسَمَّنَ: بەمانا (سَمِنَ) دێ.

تَسَمَّنَ فلانٌ: زۆر شکۆمەندی پاڵ خۆی دان و لافی زۆر شتی لێدا کەتێیدا نین ؛ (فشەکەرو خۆ هەڵکێشە) ٥ زۆر هۆکاری قەڵەو بوونی بۆ خۆی دەستەبەر کرد لە خواردن و خواردنەوە.

اسْتَسْمَنَ فلان: فلانکەس داوای چەوری کرد.

اسْتَسْمَنَ الشَّيْءَ: شتەکەی بە قەڵەوو چەور حسێب کرد ٥ لە پەنددا هاتووە (اسْتَسْمَنْتَ ذاورم) ئەو جەستە هاوساوەت بە قەڵەو حسێب کرد ٥ بە کەسێك دەگوترێ: بە رواڵەت و روکەش هەڵ خەڵەتێ.

الأَسْمَنُ: دەگوترێ: (فلان أسمن حَظاً) فلانکەس بەشی باشتری هەیە، شانس و بەختی چاکتری هەیە.

السَّامِنُ: کەسێك رۆنی بێ، چەوری لا هەبێ.

السُّمانى: جۆرە باڵندەیەکە پێی دەگوترێ (شێلاقە).

السَّمَّان: رۆن فرۆش ٥ بۆیەیەکە زەخرەفەی پێ دەکرێ.

السَّمْنُ: رۆنی قاڵبوو.

السُّمْنَةُ: دەرمانێکە بۆ قەڵەوی بەکاردێ ٥ گژو گیایەکە گەڵاو لاسکی هەیە، لاسکەکانی باریکن، گوڵێکی سپی هەیە، دەنکە تۆمی هەیە، ئافرەت دەیخوا بۆئەوەی قەڵەو بێ.

السُّمَنِيَّةُ: پێڕێکن لە هیندوستان دەهری مەزهەبن و بڕوایان بە کۆچکردن (تناسخ) هەیە، بڕوایان بە هەواڵی رابردو نیەو دەڵێن رێگای

زانیاری تەنیا هەستەو بەس ٥ جگە لە هەست هیچ شتێکی تر نیە زانیاری لێ دەستەبەر ببێ.

اَلسَّمِینُ: پێچەوانەی خراپە ٥ دەگوترێ: (کلام سمین) قسەیەکی رێکو پێکو پڕ مانایە ٥ (أرض سمینة) خاکێکی بە پیتو بەرەکەتە ٥ خاکێکی بێ بەردەڵانو پاکە، شێدارو گونجاوە بۆ کشتو کاڵ.

اَلْمَسْمَنَةُ: هەر شتێک چاوەڕوانی چەوری لێ بکرێ دەگوترێ: (طعامٌ مَسْمنة للجسم) خۆراکیکە گومانی چەوری لێ دەکرێو وێدەچێ بە خواردنی قەڵەو ببێ.

اَلسَّمَنْدُ: ئەسپ.

اَلسَّمَنْدَلُ: گیانلەبەرێکی قەبارە بچوکە لەناو ئاوو وشکانیدا دەژی ٥ باڵندەیەکە لە وڵاتی هیندوستان هەیە، دەڵێن: ئاگر نایسوتێنێ.

سَمَهَ سَمْهاً وسُموهاً: سەرسام بوو، حەیران بوو ٥ دەگوترێ: (بقي القومُ سُمَّهاً) خەڵکەکە بە واق وڕماوی مانەوە.

سَمَهَ الفرسُ في شوطِهِ سُموهاً: ئەسپەکە غاریداو هەستی بە ماندو بوون نەکرد.

سَمَّهَ اللهُ عقلَهُ: خودا عەقڵی فلانی برد.

سَمَّهَ الرجلُ إبلَهُ: پیاوەکە حوشترەکانی ئیهمال کردن.

اَلسُّمَّهُ: بەتاڵو پوچ ٥ درۆ ٥ هەوڵدانی بێ مەبەست ٥ دەگوترێ: (ذهب فلان في السُّمَّهِ) فلانکەس ملی لە شتی بێ هودە ناو بێ مەبەست داو دەچێ ٥ با، هەوا.

اَلسُّمَّهى: ئەو دیمەنەیە کە ئادەمیزاد لەکاتی روانینیدا بۆ قورسی خۆر دەمەو نیوەڕۆ دێتە بەرچاوی ٥ خۆ بادانو لارو لەنجە کردن لە روی فیزەوە.

اَلسُّمَّهَةُ: پڕۆو پاڵی دار خورما دەتەندرێو لێک دەدرێ وەکوو شێوەی سفرەی نان لەسەر خواردن.

اَلسُّمَّیْهى: بەمانا (اَلسُّمَّهى) دێ ٥ دەگوترێ: (مشي السُّمَّیْهى) رۆیشتنی بە فیزو لوت بەرزییەوە.

سَمْهَجَ في السیرِ وغیرِهِ: پەلەی کرد لە رۆیشتندا.

سَمْهَجَ الشَّيْءَ: شتەکەی رەوانە کرد.

سَمْهَجَ کلامَهُ: درۆی لە قسەکانیدا کرد.

سَمْهَجَ الحَبْلَ: حەبلەکەی توند بادا.

سَمْهَجَ الیمینَ: سوێندەکەی جەخت کردەوە.

اَلسُّمَاهِجُ من اللبنِ: شیرو ماستێک شیرین نەبێو تامی نەگۆڕابێ.

اَلسِّمْهاج: درۆ.

**اَلسَّمْهَجُ**: شیری شیرین‌و چەور ٥ ناسان ٥ دەگوتریّ: (ماء سَمْهَجٌ) ئاویّکی گواراو خۆشرەوە ٥ (أرض سَمْهَجٌ) زەوییەکی تەخت‌و نەرمەلانە ٥ (درْعٌ سَمْهَجٌ) زرێیەکە خۆش لەبەر دەکریّ بە جەستە خۆشە.

**السَّمْهَجَةُ**: سوێندی جەخت لەسەر کراوە.

**سَمْهَرَ الزَّرْعُ**: کشت‌و کاڵەکە بە پیت نەبوو، زیادی نەکرد.

**إسْمَهَرَّ الشَّيْئُ والأمرُ**: شتەکە رەق‌و پتەو بوو ٥ کارەکە سەخت بوو، توند بوو ٥ مام ناوەندی بوو.

**اسْمَهَرَّ في القتال**: لە شەڕدا جەربەزەو ورە بەرز بوو.

**اسْمَهَرَّ الظلامُ**: تاریکی کەوتە سەر تاریکی.

**السَّمْهَرِيُّ**: رمبێك ئاسنەکەی زۆر پتەو بێ ٥ دەڵێن: ئەم جۆرە رمبە دەدرێنە پاڵ پیاوێك ناوی (سَمْهَرَ) بووە ئەو دروستی کردون ٥ خێزانەکەشی ناوی (رُدَينَة) بوو رمبی رودەینی نیسبەتیان بۆ ئەو دەدریّ ٥ هەروا وشەی (السَّمهريّ) ناوە بۆ زێی گشت‌و پتەو.

**سَمَا سمواً وسماءً**: بەرز بووە، سەرکەوت، درێژ بوو ٥ دەگوتریّ: (سَمَتْ هِمَّتُهُ إلى معالي الأمور) هەمیشە ئەو چاوی لە کاری مەردانەو شکۆدارییە ٥ هەوڵی عیزەت‌و شەرەف مەندی دەدا ٥ (سما في الحسب والنسب) لە بنەماڵەو وەجاخ زادەییدا زۆر بەرزو شکۆدارە.

**سَمَا بصره الى الشيء**: چاوی لە شتەکە بڕی‌و تەماحی لێکرد.

**سَمَا الهلالُ**: مانگی نویّ بەرز بووە ٥ بەرزی دەرکەوت.

**سما الشوقُ لفلان**: عیشق‌و سۆز بۆ فلانکەس هاتەوە.

**سما القومُ ونحوهم على المأة ونحوها**: قەومەکە ژمارەیان لە سەد تێپەڕی.

**سماله شخص**: لە دورەوە کابرایەك خۆی بۆ دیاری کردو چاوی لیّ بوو.

**سمابه**: بەرزی کردەوە.

**سمالهم**: راپەڕی بۆئەوەی شەڕیان لەدژ بکا.

**سما الفحلُ سماوةً**: ئەسپەکە خۆی هاویشتە سەر شوێنی ئاو خواردنەوەکەو ئاوی بنکی دوێلاوەکەی خواردەوە.

**سما فلاناً محمداً**: ناوی فلانکەسی نا (موحەممەد) ٥ وشەی موحەممەدی کردە ناوی کەسایەتی بۆ فلان.

**سما الصائدُ الوحش**: راوکەرەکە تارمایی دەعباکەی بەدی کردو هەوڵیدا فرسەتی لیّ بێنیّ.

**أسْمَى الشَّيْئَ**: شتەکەی بەرز کردەوە.

أسَمى فلاناً من بلد الى بلد: فلانكەسی دەست نیشان کرد لەم شارە ناردی بۆ شارێکی تر.
أسَمى الشَّيْئَ كذا بكذا: شتەکەی کرد بە ناو بۆ ئەوە.
ساماه: کێ برکێی لەگەڵدا کرد.
سَمَّاهُ كذا: ناوی نا فلان.
إسْتَمى فلان: فلانکەس چووە دەرەوە بۆ راوکردن ٥ گۆرەوی هەڵکێشان‌و لەکاتی گەرمادا خەریکی راوە ئاسك بوو.
إسْتَمَى الصائدُ الوَحْشَ: راوکەرەکە دەعباکەی دیاری کردو هەوڵی نێچیر کردنی دا.
استمى فلاناً: داوای ناوی فلانکەسی کرد.
استمى فلاناً: داوای گۆرەوی راوکردنی لە فلانکەس کرد بۆ کاتێکی دیاری کراو بیداتێ‌و بچێ راوی پێ بکا ٥ وای لێکرد بچێ ئاسك راو بکا بە گۆرەوی تایبەتی راوکردن ٥ بە ئەنقەست چوو بۆ دیدەنی ٥ خێرو چاکەی لێ چاوەڕوان کرد.
الإسم: ناوی شت: ئەو وشەیەی دەبێتە نیشانەی شت‌و پێناسەی ٥ بەلای نەحوییەکانەوە بریتییە لە وشەیەك دەلالەت دەکا لە مانایەك لە خودی خۆیداو مانای زەمەن تێیدا بەرچاو نەگیراوە.
الاسم الأعظم: ناوێکە کۆکەرەوەی مانای هەموو صیفاتی خودایە.
اسم الجلالة: ناوی پەروەردگار ٥ (ك: أسامي).
السَّامي: بەرزو شکۆدار ٥ دەگوترێ: (مقام سام) ٥ پلەو پایەی بەرزو شکۆدار.
السُّما: ناوو شۆرەت.
السماء: ئاسمان: ئەوەی دەق بەرامبەر زەوییە ٥ لە هەموو شتێکدا لای ژووروی ٥ هەرشتێك لەسەر تۆوە بێ‌و سێبەرت لێبکا ٥ (ك: سماوات) ٥ هەورو باران ٥ لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ گژوگیا چونکە بەهۆی بارانی ئاسمانەوە دێتە بەرهەم.
السَّمَاوَةُ: هەڵاشی خانوو ٥ لە هەموو شتێکدا شەخصی شتەکەیە یان روخسارەکەیەتی ٥ (سماوة الهلال) دیمەنی مانگ کە کەمێك لە ئاسۆ دەربکەوێ ٥ (ك: سماء وسماو).
السُّمُوُّ: بەرزی‌و شکۆمەندی ٥ (صاحب السمو) نازناوی پاشاو میرو فەرمانڕەوایە.

السَّمِيُّ: بەخۆ نازو خۆ هەڵکێش ٥ وێنەو بەرامبەر.

ألمِسْمَاةُ: گۆرەوی کە لە خوری‌و شتی وا دروست دەکرێ ٥ راوکەر لەبەری دەکا بۆئەوەی گەرما کاری تێ نەکا ٥ (ك: مَسام).

ألمُسَمّى: ناونراو، دیاری کراو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إلَى أجَلٍ مُسَمًّى فَاكتُبُوهُ﴾ ٥ دەشگوترێ: (فلان من مسمي قومه) فلانکەس لە پیاوە باشەکانی گەلەکەیەتی.

السَّنابُ: شەڕی قورس.

السِّنابُ: کەسێك پشت‌و سکی درێژ بێ.

السِّنابَةُ: بەمانا (السِّنابُ) دێ.

السَّنبُ: زەمانەو رۆژگار.

السَّنبُ من الخيل: ئەسپی زۆر خۆشڕۆو رەسەن ٥ (ك: سُنُوبٌ).

السِّنبَةُ: بەشێك لە رۆژگار دەگوترێ: (مضى من الدهر سِنبَةٌ).

السُّنُوبُ: درۆزن‌و غەیبەت کەر ٥ رق هەڵساو، رق ئەستور.

السُّنبُوقُ: بەلەمی پچوك ٥ (ك: سنابيق).

السُّنبُكُ: قەراخی سمی وڵاخ ٥ لە هەموو شتێکدا سەرەتاکەی ٥ دەگوترێ: (أصابنا سُنبُك السماء) سەرەتای بارانمان لێ باری ٥ یان دەگوترێ: (كان ذلك على سنبك فلان) ئەو شتە لە سەرەتای فەرمان رەوایی فلاندا بوو ٥ هەروا ناوە بۆ قەراخی ئەو شوێنەی شمشێر کە زەرکەفت کراوە ٥ لای ژووروی کلاو خودەی ئاسن ٥ زەوی پتەو بێ خێرو بێر ٥ خەراج‌و باج ٥ (ك: سنابك).

السُّنبُوكُ: بەمانا (السُّنبوقُ) دێ (ك: سنابيك).

سَنبَلَ الزرعُ: کشت‌و کاڵەکە گوڵی کرد.

سَنبَلَ ثوبَهُ: کراسەکەی بەردایەوەو لکێکی بە دووی خۆیدا راکێشا.

السُّنبُلُ: گوڵی رووەك ٥ ئەو بەشەی تۆوەکەی تێدایە ٥ رووەکی ناردین کە رووەکێکە لە رەگەکانی هەندێ جۆر عەتر دەردەهێندرێ ٥ عەتری ئەم رووەکە زۆر بەناوبانگە ٥ (ك: سنابل).

السُّنبُلَةُ: بەمانا (السُّنبُلُ) دێ ٥ هەروا ناوە بۆ بورجێك لە دوانزە بورجەکانی ئاسمان.

السُّنبُولُ: بەمانا (السُّنبُلُ) دێ ٥ تاکەکەی (سنبولة).

أسْنَتَ القومُ: خەڵکەکە توشی ساڵێکی بێ بارانی‌و قات‌و قڕی بوو.

سَنَّتَ القِدرَ ونحوها: کەمونی کردە ناو مەنجەڵەکەوە.

تَسَنَّتَ كريمةَ آلِ فلان: لە ساڵێکی گرانیو بێ بارانیدا کچە خانمی فلان بنەماڵەی مارە کرد ٥ یان پیاوێکی خوێڕی دەوڵەمەند کچێکی خانمو خاتونی هەژاری مارە کرد لە ساڵی بێ بارانیو قاتو قڕیدا.

السُّنُوتُ: کەمون ؛ روەکێکی کشتو کاڵی ساڵانەیە دەنکو تۆوەکەی لە تەوابیلاتەو زۆر جۆری هەیە بڕوانە مادەی (کمون).

سَنَّجَهُ سَنْجاً: بە رەنگی جیا لە رەنگی خۆی بۆیەی کرد.

سَنَّجَ الثَّوْبَ: قوماشەکەی خێت خێت کرد.

السِّنَاجُ: شوێنەواری دوکەڵی چراو فتیلەیە بە دیوارو شتی وەهاوە ٥ لە پەندا هاتووە (لابدّ للسّراج من السّناج) چراو فتیلە بێ دوکەڵ نابێ، چرات داگیرساند دیوارت ڕەش دەبێ ٥ لە بواری کیمیادا بریتییە لە وردە کاربۆن کە لەئاکامی هەبوونی کەمو کوڕی لە سوتانی سوتەمەنییەکە پەیدا دەبێ ٥ (ك: سُنُجٌ وأسْنِجة).

السِّنْجَةُ: پارسەنگ وەکوو کیلۆو حوققەو ڕیطلو شتی وا ٥ (ك: سِنَجٌ).

السُّنْجَةُ من الألوان: ڕەنگی بەڵەکو خاڵخاڵ ٥ (ك: سُنَجٌ).

السُّنْجَابُ: سموره: گیانلەبەرێکە لە جرج گەورەترە کلکی درێژە توکی پڕە چوستو چالاکە، ڕەنگی زەردی خاکییە.

السُّنجقُ: هەرێمێك قەڵەم ڕەوی پارێزگار یان قائمقام بێ، بۆیە جار جار ئەم وشەیە پاڵ شاری کۆیە دەدرێو دەگوترێ کۆی سنجەق.

سَنَحَ سنوحاً: هاتە دڵیەوە، بە دڵیدا هات، وای بۆ دەرکەوت ٥ دەگوترێ: (سَنَحَ لي رأي في كذا) لە فلان شتدا بۆچوونێکم بۆ پەیدا بوو.

سَنَحَ الطائرُ أو الظَّبْيُ وغيرهما: باڵندەکە یان ئاسکەکە لەلای چەپتەوە بکەوێتە لای ڕاستت ٥ عەرەب بە بینینی دیاردەی ئاوا گەشبین بوون ٥ (هو سانح وهي سانحة).

سَنَحَ الشَّيْءُ: شتەکە ئاسانو بەدەست بوو.

سَنَحَ الخاطِرُ بكذا: دڵی سەخی بوو، لێبوردەیی نواند.

سَنَحَ فلان بكذا: فلانکەس بە شێوە تیلنیشانو تەعریض ئاماژەی بۆ شتەکە کردو ڕاستەوخۆ دانی پێدا نەنا.

**سَنَحَ** به أو عليه: خستيه حالّەتى لەڕودامانـەوە، يان شەڕو نەگبەتى توش كرد.

**سَـنَحَ الـشَّئَ سَـنحاً**: بـه دەسـت پێـشوازى لێكرد.

**سَنَحَ** فلاناً عن كـذا: فلانكەسـى لـەو كـارە لادا ٥ گێڕايەوە.

**سانحَ سِناحاً ومُسانحةً**: بەمانا (سَنَحَ) دێ.

**تَـسَنَّحَ مـن الـريح**: خـۆى لـە بايەكـە شاردەوە ٥ خۆى لە بايەكە پەنادا.

**تَـسَنَّحَ فلانـاً عـن كـذا**: فلانكەسـى هەڵپشكنى لە بارەى ئەو شتەوە.

**إستَسنَحَهُ**: بەمانا (تَسَنَّحَهُ) دێ.

**السُّنيحُ**: خێـرو بەرەكـەت ٥ ناوەڕاسـتى ڕێگە.

**السَّنيحُ**: گەوهەرو مروارى ٥ خشڵ (ك: سُنُحٌ).

**سَنَخَ سُنوخاً**: جێـگير بوو، بەرز بووە.

**سَـنِخَ الـدهن أو الطعـام**: ڕۆنەكـە يـان خۆراكەكە بۆگەنى كرد.

**سَـنِخَ أسـنانُهُ**: ددانـى خـوران‌و هـەڵوەرين هەتا بنكى ددانەكان دەركەوت ٥ (هو سَنِخٌ وهي سَنِخَةٌ).

**سَنِخَ** من الطعـام: خواردەمەنييەكـەى زۆر كرد.

**السَّناخَةُ**: باى بۆگەن.

**السِّنْخُ**: بنـەماو ئەصڵى شت جا هـەر شتێــــك بـــێ ٥ شـــوێنى ڕوان‌و دامــەزرانى ددان لــەناو شــەويلەو پوكـدا ٥ ئـەو ئاسـنە پـچكۆلەى بـە سەرى تيرەكـەدا دەكرێ ٥ گـرو گفـى تاو نەخۆشى.

**السِّنخُ**: دەگوترێ: (بلد سَنِخٌ) ولاتێـكى لەرزو تا دارە ٥ شوێنێكە لەرزو تـاى زۆرە. (وهي سَنِخَةٌ).

**سَنَدَ** اليه سـنوداً: پـاڵى پێوەدا، پشتى پـێ بەست، خۆى بەسەردا دا.

**سَنَدَ** ذنب الناقة: كلكـى حوشـترەكە لـەملاو لەولاى خۆيدا ڕاست‌و چەپى كرد.

**سَنَدَ** في الجبل: بە كێوەكەدا سەركەوت.

**سَنَدَ** للخمسين ونحوها: لە پەنجا تێپەڕى.

**سَنَدَ** الشَّئَ سنداً: كۆڵەكەى بۆ شتەكە دانا، كۆڵەكەى ژێر شتەكەدا.

**أسْنَدَ اليه**: بەمانا (سَنَدَ) دێ.

**أسـنَدَ في العـدو**: لـە ڕاكـردن‌و بازدانـدا تينى تێ كردو گوڕى دايە خۆى.

**أسْنَدَ الشَّئَ**: بەمانا (سَنَدَهُ) دێ.

**أسْنَدَ الحديث الى قائلـه**: قـسەكەى بـەرز كردەوە بۆ سەر بێژەرەكەى.

**أسْنَدَ اليه أمْرَهُ**: كارو بارى خۆى خستە ئەسـتۆى ئـەوو كـردى بـە بريكـارى خۆى.

**سَنَّدَ**: سەنەدى لەبەركرد.

**سَنَّدَ الشَّئَ**: بەمانا (سَنَدَهُ) دێ.

استند اليه: بەمانا (سَنَدَ) دێ.

تساندَ اليه: بەمانا (استند اليه) دێ.

تَسَانَدَ القوم أو الجيش: خەڵكەكە یان سوپاكە وەجبە وەجبە هاتنە دەرو هەر وەجبەو ئاڵای خۆی بەرز كردەوە ٥ دەشگوترێ: (خرجوا متساندين).

الاسنادُ: بەلای زانایانی زمانی عەرەبییەوە بریتییە لە لێكدانی دوو وشە بە شێوەیەك كە مانای تەواو بگەیەنێ.

السِّنادُ: لە رووی قافیەو سەرواوە جوداوازی نێوان حەرەكەو پیتی مەدی پێش رەوییە، ئەم جوداوازییە بە عەیبێكی گەورەی شیعر دادەنرێ.

السَّنْدُ: جۆرێكە لە قوماش یان جۆرە بوردەیەكی یەمەنییە.

السِّنْدُ: وڵاتێكە كەوتۆتە بەشی باكوری خۆرئاوای هیندوستان ٥ حەوزی روباری (السِّند) كەوتۆتە ناوەڕاستی، ئێستا زوربەی ئەو وڵاتە كەوتۆتە پاكستانی خۆرئاواوە ٥ هەروا وشەی (السِّند) ناوە بۆ پێرێك ئادەمیزاد كە لەو وڵاتەدا نیشتەجێن ٥ (ك: سُنودُ وأسناد).

السَّنَدُ: جۆرێكە لە قوماش یان جۆرێكە لە بوردەی یەمەنی ٥ كێوی بەرامبەرو بەرز ٥ هەر شتێك پشتی پێ ببەسترێ یان بكرێتە بەڵگە، بۆیە بە چەكی قەرز دەگوترێ: (سَنَدٌ) ٥ لە بواری ئابوریدا بریتییە لە وەرەقەیەكی رەسمی قەرزێكی دیاری كراوی تێدا تۆمار كراوە.

السَّند الإذني: نوسراوێكە پابەند بۆنێكی تێدا تۆمار كراوە كە ئەندازەیەك پارە بدا بە كەسێكی دیاریكراو یان بە هەڵگری ئەو نوسراوە لە كاتێكی دیاریكراودا.

لە عیلمی حەدیثدا بریتییە لە زنجیرەی پیاوی حەدیث گێڕەوە.

السَّندان: دەزگای ئاسنگەر ئەو ئاسنە پتەوەی دانراوەو ئاسنگەر بە چەكوچەكەی ئاسنی تر دەكوتێ لەسەری ٥ دەگوترێ: (هو بين المطرقة والسندان) فلان شت لە نێوان چەكوچو سنداندایە.

السِّنْدانُ: پیاوی بەهێزو گەورە، گورگی گەورەو بەهێز.

السِّنديانُ: درەختێكە لە درەختی (الأحراج) دار بەڕو.

السَّنيدُ: زۆڵو باوك نادیار ٥ (هي سنيدة).

الْمُسْنَدُ من الحديث: ئەو حەدیثەیە

زنجیرەکەی بگاتەوە سەر پێغەمبەر (د.خ) ٥ ئادەمیزادی حەرام زادە ٥ جۆرە نووسینێکی حیمیەرییەکانە کە لە کۆندا لە یەمەن بەکاریان هێناوەو لەگەڵ شێوە نووسینی ئێمە جوداوازە ٥ هەروا بە شیعرێك دەگوترێ: (سِنَاد)ی تێدا بێ.

**اَلْمُسْنَدُ**: هەر شتێك پاڵی پێوە بدرێ ٥ (ك: مساند).

**سَنْدَرَ فِي الأمر**: پەلەی لە کارەکەدا کردو ملی لێنا.

**السَّنْدَرُ**: چاو نەترس‌و ئازاو بە جەرگ کە سڵ لە هیچ نەکاتەوە.

**السَّنْدَرَةُ**: پێوەرێکی گەورەیە وەکوو تەغارو عەربە ٥ درەختێکە سەرە تیرو شتی وای لێ دروست دەکرێ ٥ شوێنێکە لەسەر سەربانی خانوو کاڵای ناو ماڵی تێدا هەڵدەگیرێ بە تایبەتی ئەو ئامێرو شتانەی کە رۆژانە پێویست نین‌و ناو بەناو پێویستمان پێ دەبێ.

**السَّنْدَرِيُّ**: کەسێك بۆ کاروباری خۆی بە پەلە بێ‌و گرنگی تەواو بە کاری خۆی بدا ٥ ئازاو بە جەرگ ٥ تووند ڕەوو بەهێز ٥ درێژ ٥ چاو گەورە ٥ باش‌و ڕەسەن.

**السَّنْدَرُوسُ**: کەتیرەو صمغێکە لە درەخت دەردەهێندرێ‌و دەرمانی برین‌و شتی وای پێ دەکرێ.

**السُّنْدُسُ**: جۆرێکە لە ئاوریشمی تەنك.

**سَنْدَل**: گۆرەوی هەڵکێشان بۆ ڕاوکردنی حەیوانی کێووی‌و دڕندە.

**السُّندالُ**: بەمانا (السَّدان) دێ.

**السَّنْدَلُ**: گۆرەوی (ك: سنادل).

**سَنَوَّ سَنَراً**: تەمەنگە تیژە بوو، ڕەوشتی ناشیرین بوو (هو سَنِرٌ).

**السِّنَّوْرُ**: پشیلە؛ خۆشترین خواردن لای ئەم گیانلەبەرە مشکە ٥ پشیلەی کێوی‌و پشیلەی ماڵی هەیە ٥ گردە مل ٥ بنکی کلك ٥ (ك: سنانیر).

**السَّنَوَّرُ**: کۆمەڵێ چەك‌و تەقەمەنی ٥ پۆشاکێکە لە چەرم دروست دەکرێ وەکوو زرێ لە شەڕدا لەبەر دەکرێ.

**سَنْسَنَتِ الريحُ**: با هەڵیکرد زۆر ساردە.

**السِّنْسِنُ**: تینوایەتی ٥ قەراخی فەقەرەی پشت ٥ لایەکی پەراسو ئەو لایەی بە سنگەوە نووساوە ٥ (ك: سناسِن) ٥ دەگوترێ: (جاءت الريحُ سناسِنَ) بایەکە لەسەر یەك شێوە هەڵبوو.

**السِّنْسِنَةُ**: قەراخی فەقەرەی پشت ٥ لایەکی پەراسوو ئەولایەی بە

سنگەوە نووساوە ٥ (ك: سَناسِن).

**سَنَطَ** سناطةً: کۆسە بوو ٥ ریشی مووی لێ نەهاتووە ٥ یان لا روومەتی مووی پێوە نیە ٥ (فهو سِناط وسنوط).

**سَنِطَ** سَنَطاً: بەمانا (سَنَطَ) دێ.

**السَّنْطُ**: درەختێکە لە پێری (القرنیە)یە گەڵاکەی دەباغی پێ دەکرێ ٥ لە شوێنی گەرمەڵاندا دەروێ.

**السِّنْطُ**: جموزگەی دەست، مەچەکی دەست ٥ (ك: سُنُوط).

**السُّنْطور**: سەمتور؛ ئامێرێکی مۆسیقایە دەشوبهێتە قانون ژێیەکانی لە مس دروست کراوە.

**السِّنْطِيرُ**: بەمانا (السُّنْطور) دێ.

**سَنُعَ** سناعةً وسُنوعاً: هەڵکشا، بەرز بۆوە ٥ جوان‌و شیرین بوو ٥ جومزگەکانی نەرم‌و ئەندام شلك بوو ٥ (هو سنيع وهي سنيعة).

**أَسْنَعَ**: بەمانا (سَنُعَ) دێ.

**أَسْنَعَ فلانٌ**: فلانکەس کوڕو کچی باڵا بەرزو روخسار جوانی بوون ٥ فلانکەس جومزگەی نازاریان هەبوو.

**أَسْنَعَ مَهْرَ المرأة**: مارەیی ئافرەتەکەی زۆر کرد.

**الأَسْنَعُ**: درێژو باڵا بەرز (امرأة سنعاء) ئافرەتی باڵا بەرز دەگوترێ: (هو أسنع منه أفضل وأطول) (ك: سُنْعٌ).

**السِّنْعُ**: مەچەك‌و جومزگە ٥ (ك: أسناع وسِنَعَةٌ).

**السَّنيع**: زۆر ٥ دەگوترێ: (مهر سنيع) مارەییەکی زۆرە.

**السَّنيعة**: مێینەی (السَّنيع) ٥ ئافرەتی نەرم‌و شل‌و دەست‌و مەچەك شلك‌و ئێسقان نەرم ٥ رێگای ناو کێو ٥ (ك: سنائع).

**السُّنْبُعَةُ**: (ابن عرس) چەقەڵ ٥ دەعبایەکە وەکوو مشك مێلی مریشك‌و جوجکە ٥ ئەو گۆشتە پچکۆلەیە لە ناوەڕاستی دیوی ناوەوەی لێوی سەرەوەیە ٥ (ك: سَناعب).

**سَنَفَ البعيرُ**: حوشترەکە پێش کەوت.

**سَنَفَ البَعيرَ**: بەرسك‌و پاڵووشتی وای بۆ حوشترەکە دروست کردو شەتەکیدا بۆئەوەی بارو کورتانی پێوە بوەستێ.

**أَسْنَفَ البعيرَ**: بەمانا (سَنَفَ) دێ.

**أَسنَفَت البِكرةُ**: حوشترەکە چەند مانگ بەسەر ئاوس بوونیدا تێپەڕی‌و گوانەکانی هاوسان.

**أَسْنَفَ البرقُ والسحابُ**: بروسکەو هەورەکە لە نزیکەوە بینران.

**أسنفت الريحُ:** بایەکە بە تەوژم هەڵبوو تەپو تۆزی بەرپا کرد.

**أسنفت الناقةُ:** حوشترەکە کزو لاواز بوو.

**أسنفت الأرض:** زەوییەکە بێ گیاو گژبوو پێداویستی ژیانی تێدا نەبوو.

**أسنف الأمرَ:** کارەکەی قایم کردو گرنگی پێدا.

**السِّنافُ:** حەبلێکە یان سیرمەیەکە بە دەوری جەستەی حوشتردا دەهێندرێ کورتانو باری سەر پشتی پێ قایم دەکرێ.

**السِّنْف:** بەچنەو زەمبیلەی میوە بە هەموو قەبارەیەکەوە؛ خڕبێ لە درێژەوە بێ، هەر شتێك میوەی تێ بکرێ پێی دەگوترێ: (السِّنف). هەروا ناوە بۆ لقو پۆپو پرژی بێ گەلا ٥ گەنمو جۆی کورتە بالا ٥ کۆمەڵەو پێڕ (ك: سُنُوفٌ وسِنَفَة).

**السَّنِيفُ:** قەراخی بەرەو مافور (ك: سُنُفٌ).

**المِسْنَافُ:** پێشکەوتوو لە رۆیشتندا ٥ قەد باریكو کزو لاواز ٥ (ك: مسانف).

**سَنِقَ من الطعام أو الشراب:** لە خواردنەکە تێری خواردو ئینتەلای کرد.

**سَنِقَ فلانٌ:** فلانکەس ناز پەروەردەو ژیان نەرمو نۆڵ بوو (هو سَنِقٌ وهي سِنِقَةٌ).

**اسنقه الطعامُ أو الشرابُ:** خواردنو خواردنەوە تەبیاتی تێکداو تووشی ئینتەلا بوو.

**أسْنَقَهُ النعيمُ فلاناً:** نازو نیعمەتی زۆر فلانکەسی توشی تەرەفو گومڕایی کردو لە ڕێگەی راست لایدا.

**السُّنَيْقُ:** خانووی گەچکاری کراو ٥ ئەستێرەیەکی سپییە (ك: سنانيق).

**السِّنكِسارُ:** کتێبێکە ژینامەی پیاو چاکانی مەسیحیو رەبەنو دێر نشینی تێدا تۆمار کراوە لە کەنیشتەکاندا بەسەر کۆڕو کۆمەڵانی خۆیاندا دەخوێندرێتەوە.

**سَنِمَ البعيرُ سَنَماً:** حوشترەکە دۆگی گەورە بوو.

**سَنِمَ الشَّيْءُ:** شتەکە لە زەوی بەرز بۆوە ٥ (هو سَنِمٌ وهي سَنِمَةٌ).

**أسْنَمَ:** بەمانا (سَنِمَ) دێ.

**أسْنَمتِ النَّارُ:** ئاگرەکە بڵێسەی گەورە بوو.

**أسْنَمَ الطعامُ البعيرَ:** خۆراکەکە دۆگی حوشترەکەی گەورە کرد.

**سَنَّمَ الكلأُ البعيرَ:** لەوەڕو ئالفەکە دوگی حوشترەکەی گەورە کرد.

سَنَّمَ فلان الشَّيْئَ: فلانكەس شتەكەی لە روی زەوی بـەرز كـردەوە ◦ وەكـوو دوگی حوشـتر لای سـەروی تەسـكو لای خواروی پان ◦ دەگـوترێ: (سَـنَّمَ القـبر) گڵی گۆڕەكەی بـەرز كـردەوە سەرانــسەرەكەی تەســك كــردەوەو تەختی نەكرد.

سَـنَّمَ الوِعــاءَ: تەنەكـەو بەرمیلەكـەی پڕكـردوو هەڵیدایـەوە تـا وای لێهـات وەكوو دوگی حوشتر بەرز بۆوە.

استَنَمَ البعيرَ: سـواری دوگـی حوشـترەكە بوو.

استَنَمَ الشَّيْئَ: سواری شتەكە بوو، چووە تۆپەڵاكی.

تَسَنَّمَهُ: بەمانا (إستَنَمَهُ) دێ.

تَـسَنَّمَ عليـه مـن فـوق الغـرف: لـە ژوور ژوورەكانەوە هاتە خوار.

تَسَنَّمَ الـسَّحابُ الأرضَ: هەورەكـە زەوی ئاودا.

تَسَنَّمَ فلاناً: لەنكاو فلانكەسی گرت.

تَسَنَّمَ الـشَّيْبُ فلانـاً: دیاردەی پیری لـە فلانكەسدا زۆر بوو.

التَّـسنيمُ: جۆگەیەكـە لـە بەهەشـتدا ◦ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَمِزَاجُـهُ مِـن تَسنِيم، عَيْنًا يَشرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُونَ﴾.

الـسَّنَامُ: هەبارەیـەك بـەزوو پیـوە بـە شێوەی خـوارەوە بـوو لەسـەر پشتی حوشـتر كـۆ بۆتـەوە ◦ هـەروا لـە هەموو شتێكدا لای سەرویەتی ◦ لە زەویدا بە ناوەڕاستی دەگوترێ ◦ لە گـەلو نەتـەوەدا بـە پیـاوی وەجـاخ زادەو شـەریف دەگـوترێ ◦ دەڵـێن: (سَـنام الرَّجُـل) بـەرزیو شـەوكەتی پیاو ◦ (ك: أسْنِمَةٌ).

السِّنِمَا: سینەما ◦ وێنەو جەو جوڵكەر لەسەر شاشە بە بەرچاوی بینەراندا ◦ ئـەو خـانووەی وێنــەكانی تێـدا رادەنوێنرێن.

السِّنِمَا توغراف: ئامێرێكە وێنـە جەو جوڵكەرەكان لەسەر شاشە پێچەوانە دەكاتەوە.

السَّنَمَةُ مـن النبـاتِ: ئـەوەی دەكەوێتـە لای سـەروی روەكەكـە وەكـوو گوڵـە گـەنەو گوڵـە جۆو شتی وا ◦ چرۆو گـوڵی روەك ◦ تۆپـەڵاكی درەخـت، سـەرە تـەرزەو كۆتـایی لقو پـۆپ ◦ هـەر درەختێـك بـەردار نـەبێو ئەملاو ئەولای وشك بێ.

الـسَّنِيمُ: دەگـوترێ: (رجـل سـنيم) پیاوێكی رێزدارو شكۆمەندە.

الْمُسَنَّمُ: دەگوترێ: (مجدٌ مُسَنَّم) رێزو شـكۆمەندییەكی گەورەیـە ◦ شتێـك لەسەر شێوەی دوگی حوشتر بێ.

الـسِّنِمارُ: مــانگ ◦ پیاوێــك شــەو نەخەوێ ◦ دزو جەردە.

سِنِمّار: ناوی وەستایەکی رۆمییە باڵە خانەیەکی بۆ نوعمانی لەخمی دروست کرد، ئەو وەستایە باڵە خانەکەی جوان دروست کرد کە تەواوی دەکا لە جیاتی ئەوەی نوعمان پاداشی بداتەوە، فەرمانی دا لەسەر باڵە خانەکەوە بیخەنە خوارو لەناوی بەرن بۆئەوەی باڵە خانەی لەو جۆرە بۆ کەسی تر دروست نەکا ○ بۆیە دەرحەقی گوتراوە (جوزی جزاء السِّنِمار) ئێستا ئەم پەندە بە کەسێك دەگوترێ: کە چاکە بکاو بە خراپە پاداشی بدرێتەوە.

سَنَّ السكين ونحوه سَنَّاً: کێردەکەی تیژ کرد.

سَنَّ الحَجَرَ ونحوه: بەردەکەی سووە، لوس‌و پوسی کرد ○ دەگوترێ: (هذا مما يَسُنُّكَ على الطعام) ئەمە هەڵت دەنێ بۆ خواردنی خواردەمەنییەکە.

سَنَّ الأميرُ رعيته: فەرمانڕەوا بە ڕێك‌و پێکی کارو باری گەلەکەی بەڕێوە برد.

سَنَّ الأسنانَ: ددانی هاژنینەوە، سیواکی کردن، دەرمانی کرد.

سَنَّ فلاناً: گازی لە فلانکەس گرت، بە فلانکەس رۆگەزی ○ ددانی فلانی شکاندن ○ بە ددان بریندارى کرد.

سَنَّ الرمحَ: ددانی بۆ رمبەکە دروست کردن‌و لێی بەستن.

سَنَّ الشَّيْءَ: وێنەی شتەکەی کرد ○ لوس‌و پوسی کرد.

سَنَّ الطينَ: گڵەکەی سور کردەوەو کردی بە سواڵەت.

سَنَّ العُقدةَ: گرێیەکەی کردەوە.

سَنَّ الطريقَ: رێگاکەی تەخت‌و خۆش کرد.

سَنَّ الأمر: کارەکەی ئاشکرا کرد.

سَنَّ الله سُنَّةً: پەروەردگار رێگای راستی رون کردۆتەوە.

سَنَّ المشَرِّعُ القانون: یاسا دانەرەکە یاسای دانا ○ هەروا هەر کارێکی داهێنراوو تازە هەڵا بکەی‌و دوایی کەسانی دیکە پەیڕەوی بکەن ئەوە بە وشەی (سُنَّة) تەعبیری لێ دەدرێ.

سَنَّ الماء أو الترابَ على وجه الأرض: بە هێواشی ئاو یان گڵی رۆکردە سەر زەوی ○ دەگوترێ: (سَنَّت العينُ الدمعَ) چاوەکە بە هێواشی فرمێسکی باراندن.

سُنَّ الوجهُ: دەم‌و چاوی بە شێوەی درێژو مەخروطی دەرکەوت ○ دەڵێی گۆشتی لێ داتاشراوە.

سُنَّ الماءُ: ئاوەکە گۆڕا بۆگەن بوو.

سُـنّت الأرض: زەوییەکـە گیـاو گـژی هەمووی خوراو هیچی پێوە نەما.
أسَنَّ: ددانی روان ◦ تەمەنی گەورە بوو، تەمەنی درێژ بوو.
أسَنَّ الله سِنَّهُ: خودا ددانی رواندن.
أسَنَّ الرُمْحَ: ددانی بۆ رمبەکە دروست کردن.
سَنَّنَ السكين ونحوه: کێردەکەی تیژ کرد.
سَنَّنَ كلامَـهُ: قسەکانی پاڵفتـه کـردن‌و جوانی رازاندنەوە.
سَـنَّنَ الـرُمْحَ: ددانـی لەسـەری رمبەکـە بەست.
سَنَّنَ الرُمْحَ إليه: رمبەکەی ئاراستە کرد ◦ رمبی تێگرت.
سَنَّنَ الشَّيْءَ: ددانی بـۆ شـتەکە دروست کردن وەکوو مشار.
سَـنَّنَ الرَّجـلَ: تەمـەنی بـۆ پیاوەکـە مەزندە کرد.
إسْتَنَّ: سیواکی کرد.
إستَنَّت العينُ: چاوەکە فرمێسکی هـەڵ رشتن.
إسـتَنَّ دم الطعنـة: خـوێنی برینەکـە فیچقەی کرد.
إسْتَنَّ الفـرسُ: ئەسـپەکە لەسـەر رەوتـی خۆی رۆیشت بەرەو پێش.
اسْتَنَّ السرابُ: تراویلکەکە لە پێش چاو کەوتە شەپۆلدان‌و ژاکان وەکوو ئەوە جاری ببێ‌و بڕوا.
اسْتَنَّ بسُنَّتِهِ: بە رێبازی ئەو کاری کرد، پەیڕەوی بیرو بۆچوونی ئـەوی کـرد دەگـوترێ: (سَنّ فلان طريقاً من الخير لقومه، فاستَنُّوا به وسلكوه).
تَسَنَّنَ في عَدْوِه: بەرەو پێش رۆیی.
تَسَنَّنَ: پەیڕەوی حـەدیثی پێغەمبـەری کرد.
اسْتَـسَنَّ: تەمـەنی زۆر بـوو، بـە سـاڵا چوو.
اسْتَسَنَّ الطريقةَ: رێبازەکەی گرتە بـەرو پێیدا رۆیی.
الـسِّنانُ: نـوکی رمـب ◦ هـەر شتێـك کێردو شتی وای لەسـەر ببەسـترێ ◦ (ك: أسِنَّه).
السِّنُّ: ددان.
السِّنُّ من الشيء: هەر بەشێك لە شت‌و سـەرەکەی تیـژ بـێ وەکـوو ددانـی شانە‌و مشارو داس‌و کلیل‌و قەڵەم ◦ تەمـەن ◦ دەگـوترێ: (صـدُقني سِـنُ بكره) تەمەنی گەنجی ئەو بڕوای بە من هێنا ◦ دەنکی سەرە سیرو پیاز ◦ هاوتەمـەن ◦ دەگـوترێ: (فـلان سِـنّ فلان) فلان هاوتەمـەنی فلانکەسـە ◦ (ك: أسنان).
الـسُّنَنُ: رێبـازو شـێوە‌و شـێواز ◦

دەگوترێ: (بنوابيوتهم على سنن واحد) خانوەكانيان لەسەر يەك شێوەو شێواز بنيات ناون.

السَّنَنُ من الطريق: شێوەی ڕێگاو ئاڕاستەی ڕێگا ◦ دەگوترێ: (تَنحَّ عن سَنَنِ الخيل) ◦ لە ڕێڕەوی ئەسپەكە لابدا.

ألسُّنَّةُ: يەكجار تيژ كردن ◦ ورچ ◦ فەهد ◦ (ك: سِنان).

السُّنَّةُ: ڕێباز ◦ ژينامەی پاكو خاوێن يان پيسو پۆخەڵ ◦ ياساو دابو نەريتی پەروەردگار، حوكمو بڕياری خودا دەربارەی مەخلوقاتی ◦ سوننەتو ڕێبازی پێغەمبەر (فەرمودەو كردارو ڕازی بوونی لەسەر شت) ◦ هەر شتێك پاڵ پێغەمبەر بدرێ لە گوفتارو كردارو بێدەنگ بوون لە شت ◦ لە فيقهی ئيسلاميشدا بە كردەوەی چاك دەگوترێ لە بواری طاعەتدا بەو ئەركانە دەگوترێ (سُنَّة): كە نە فەرضن نە واجبن ◦ سروشتو ڕەوشت ◦ ڕوخسار ◦ وێنە ◦ دەگوترێ: (هو أشبه شيءٍ به سُنَّةً) لەڕوی وێنەو ڕوخسارەوە لە هەموو شتێك زياتر لەو دەچێ.

أهل السنة: ئەو جەماعەتو لايەنەن كە پێيان وايە ئەبوبەكرو عومەر دوو خەليفەو جێنشينی يەك لەدوای يەكی پێغەمبەر بوونو جێنشينييەكەيان شەرعی بووە ◦ شيعە دژی ئەم ڕايەن.

ألسِّنَّةُ: پاچی دوو سەر (پاچە ئينگليزی) ◦ يان ئەو ئاسنەی زەوی پێ دەكێڵدرێتەوە وەكوو گاسنو پێمەڕە.

السُّنِّيَّةُ: نيسبەت بۆلای (سُنَّة) ◦ سونە مەزهەب ◦ دەگوترێ: (هو سني وهي سُنية).

السُّنُونُ: ئەو دەرمانو مەڵحەمەی ددانی پێ پاك دەكرێتەوە.

ألسَّنِينُ: ئەوەی هەڵدەوەرێ لە بڕينی مشارو لێك خشاندنی بەرد لە شتی تر ◦ زەوييەك گياو گژی خورابێو بوبێتە سوتە مەرو ◦ هاوشانو دەستە براو دەستە خوشك.

السَّنينة: مێينەی (السَّنِين) ◦ لمی بەرزەوە بوو، كۆمەڵ بوو لەسەر زەوی ◦ (ك: سنائن) ◦ دەگوترێ: (جاءت الريحُ سَنائِنَ) بايەكە لەسەر يەك شێوە هەڵيكرد.

ألْمَسَانُ من الإبل: حوشتری گەورە تاكەكەی (مُسِنّ).

المِسَنُّ: هەسان، كارتيخ ؛ هەر شتێك

چەقۆی پێ تیژ بکرێ یان لەسەری تیژ بکرێ ٥ (ك: مَسَانٌ).

سَنِهَ الطعام أو الشرابُ سَنَهاً: خواردنەکە گۆڕا، بۆگەنی کرد.

سَنِهَتِ النَّخْلَةُ: دار خورماکە سالێ زۆری بەسەردا تێپەڕین ٥ (فهو سَنِهٌ وهي سَنِهةٌ وهي سَنهاءُ) (ك: سُنَّةٌ).

سانَهَتِ النَّخْلَةُ وغيرها مُسَانَهةً وسناهاً: بەمانا (سَنِهت) دێ ٥ یان سالێك بەری گرتو سالێك بێ بەر بوو.

سَانَهَ فلاناً: بە سالێ مامەڵەی لەگەڵ کرد، دەگوترێ: (استأجَرَهُ مُسَانَهَةً) بە سالێ بە کرێی گرت.

تَسَنَّهَ: بەمانا (سَنِهَ) دێ.

تَسَنَّهَ عند فلان: سالێك یا زیاتر لای فلانکەس مایەوە.

السَّنَا هِيَّةُ في الاقتصاد: مەبلەغێك پارەیە بە شێوەی وەجبە وەجبەی یەك لەدوا یەك دەفع دەکرێ بە چەند مەرجێکی دیاری کراو بە زۆری ماوەی وەجبەکان ساڵانە دەبێ یان شێوەیەك کە لە سەری رێك دەکەون.

السَّنَةُ: سالێ ؛ ئەندازەی بڕینی خۆر بۆ دوانزە بورجی ئاسمان، بەمە دەگوترێ: سالی خۆری (السنة الشمسية) یان تەواو کردنی دوانزە دەورەی مانگ بەمەش دەگوترێ: سالی مانگی (السنة القمرية) ٥ هەروا بەمانا گرانیو سالی بێ بارانی دێ ٥ زەوی سوتە مەرۆ ٥ (ك: سِنون سنوات).

سِنوا الخصب: لە بواری پزیشکیدا بە سالانی نێوان بالغ بوونو مەئیوس بوون دەگوترێ.

السَّنهاءُ: دەگوترێ: (نخلة سنهاء) دار خورمایەکە سالێ بەر دەگرێو سالێك ناگرێ ٥ (أرض سنهاء) زەوییەکی بێ بەرو بومەو سالی بێ بارانیو قاتو قڕی بەسەرا هاتووە.

سنا البرقُ وغيرُهُ سناءً: هەورە بروسکە لێیداو دونیای روناك کردەوە ٥ روناکایی داو ورشەی بەرز بۆوە.

سَنَتِ النار: ئاگرەکە بڵێسەی بەرز بووە.

سنا الى معالى الأمور: خۆی بۆ کاری بەرزو شکۆ مەندانە ئامادە کرد.

سنا فلان سَنْواً وسُنُوَّةً: ئاودێری کرد، ئاویدا دەگوترێ:

سنا على الدّابَةِ: لەسەر ولاخەکە ئاوی دابەش کرد.

سنا القومُ لأنفسهم: ئاویان بۆ خۆیان دەرهێنا، ئاویان دا بەیەکتر.

سنت السّانيةُ الأرضَ: بە ناعورو ئاو هەڵکێش زەوییەکەی ئاودا.

**سنا الدَّلوَ ونحوها**: دۆڵچەکەی لە بیرەکە دەرهێنا.

**سنا البَابَ**: دەرگاکەی کردەوە.

**سنا الشَّيْءَ**: شتەکەی ئاسان کرد.

**سَنِيَ سَنياً وسُنِيّاً**: بەمانا (سَنَا) دێ.

**سَنِيَ سناً وسَناءً**: بەرز بۆوە ٥ بوو بە خاوەن ڕێزو شکۆمەندی ٥ (فهو سَنِي وهي سَنِيَةٌ).

**سَنِيَ الدّابـةُ**: لەسەر پشتی ولاخەکە ئاو درا بە خەڵك.

**أسْنَى البرقُ ونحوه**: روناکی بروسکەکە روناکایی بلاو کردەوە، پرتەوی بروسکەکە چووە ناو ماڵیەوە.

**أسنى القومُ**: خەڵکەکە ساڵێك یان زیاتر لە شوێنێك مانەوە ٥ ساڵیان بەسەردا تێپەڕی.

**أسنى الشَّيْءَ**: شتەکەی وا لێکرد ڕێزو نرخی هەبێ، روناکایی بدا.

**أسنَى النارَ ونحوها**: بڵێسەی ئاگرەکەی بەرز کردەوە روناکایی دا.

**أسنى لـه الجائزةَ**: پاداشەکەی بۆ بەرز کردەوە.

**أسنى جواره**: هاوسێیەتی بە ڕێكو پێکی بەڕێوە کرد.

**سانى البابَ وغيره مساناةً وسِناءً**: دەرگاکەی کردەوە.

**سانى فلاناً**: بە نەرمی لەگەڵ فلاندا جولایەوە هەڵس‌و کەوتی جوانی لەگەڵدا کرد ٥ (سانَهَهُ) بەمانا (ساناه) دێ.

**إستنى**: داوای ئاوی کرد، ئاوی دابەش کرد.

**إستنى النار ونحوها**: سەیری بڵێسەو شۆقی ئاگرەکەی کرد.

**تَسَنّى الشَّيْءُ**: شتەکە گۆڕاو بۆگەنی کرد.

**تَسَنَّت العُقدَةُ**: گرێیەکە کرایەوە ٥ شل بۆوە.

**تَسَنّى عند فلان**: لەلای فلانکەس ساڵێك یان زیاتر مایەوە.

**تَسَنّى الشَّيْءَ**: چووە سەری‌و بەرز بووە.

**تَسَنّى فلاناً**: فلانکەسی رازی کردو نەرم‌و نیان بوو لەگەڵیدا.

**السَّانية**: ئامێری ئاو هەڵێنجان وەکوو ناعور وایە دۆڵچەکانی لە پێستی گا دروست دەکرێ، لەناو بیرەکەوە بە ولاخ رادەکێشرێ کە هاتە دەرو ئاوەکە رۆکرا ئەمجار ولاخەکان پاشەو پاش دەکشێنەوە دۆڵچەکان دەکەونەوە ناو بیرەکەوە ٥ هەروا ناوە بۆ حوشتر کە ئاو لەسەر پشتی دابەش دەکرێ، وشتر دەرواو ئاوی لێ

دابەش دەكرێو راوەستان نيە بۆيە لە پەنددا هاتووە دەڵێ (سير السُّواني سفر لا ينقطع) رۆيشتنى حوشترى ئاو لەسەر پشت سەفەرێكە برانەوەى نيە (ك: سوانِ).

**السَّنا**: تريفەى مانگە شەو ٥ روناكايى زۆر ورشە دار ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالْأَبْصَارِ﴾ ٥ هەروا ئاوە بۆ روناكى هەورە بروسكە ٥ هەروا ئاوە بۆ روەكى سينامەكى ٥ ئەو روناكييەى وێنەگر بە كامێراكەى بەكارى دەهێنێ بۆ وێنە گرتن.

**السَّناءُ**: بەرزىو شكۆمەندى.

**السَّنْواء**: قاتو قرى، دەگوترێ: (سنة سَنواء) ساڵى ناخۆشو گرانى (أرض سنواء) زەوى بێ روەكو بێ بەروبووم.

**الْمُسَنَّاةُ**: بەر بەستێكە بنيات دەنرێ بۆ گلدانەوەى ئاوى لافاو وشكە شيوو، قفڵى تێدا بەكاردەهێندرێ بۆئەوەى بە گوێرەى پێويست ئاوى لێ خەرج بكرێ.

**الْمَسْنَوِيَّةُ** من الآبار: بيرى زۆر قوڵ ؛ كە بەهۆى حوشترو وڵاغو ئاعورەوە نەبێ ئاوى لێ دەرنەهێندرێ.

**السِّنْيُورِيَّةُ**: نەخۆشييەكە بەهۆى كرمى شريتييەوە پەيدا دەبێ ٥ ئەگەر توشى دەماغى مەڕو بزن بوو لۆژە لۆژو لەرزەى لێ پەيدا دەبێ ٥ يان ئەگەر توشى نوخاعى شەوكى بوو نەخۆشى قەفزەى تێدا پەيدا دەبێ ٥ وا دەبێ ئەو نەخۆشييە توشى ئادەميزاديش دەبێ.

**سَهَبَهُ سَهْباً**: وەرى گرت، گرتى.

**أَسْهَبَ**: چووە چۆڵەوانى رۆيى بۆ ساراو دەشتو دەر.

**أَسْهَبَ المكانُ**: شوێنەكە ورو هەڵۆڵ بوو نە ئاوى تێدەوەستێ نە ئاو دەگرێتەوە.

**أسْـهَبَ فـلانٌ**: فلانكەس بيرەكەى هەڵكەندو گەيشتە لمو چەو ئاوى دەست نەكەوت ٥ بە تەماعو چاو چنۆك بوو، زۆر چووە شتەكەوەو پەلو پۆى تێدا هاويشتو هەوڵى بەرفراوان كردنيدا ٥ زۆرى بەخشى ٥ قسەكەى زۆر درێژ كردەوە ٥ دەگوترێ: (في كلامه إسهاب) و (أسْهَبَ كلامَهُ).

**أسْـهَبَ الفـرسُ**: ئەسپەكە بازى بەرفراوانى هاويشتنو پێش كەوت.

**أسْهَبَ الرضيعُ**: شيرە خۆرەكە زۆرى شير خوارد تێر خواردنى نەبوو.

**أسْـهَبَ الماشِيةَ**: ئاژەڵەكانى بەرەڵاى

لەوەرگاکە کردنو وازی لێ هێنان بۆ خۆیان بلەوەڕێن.
أَسْهبَ فلان: فلانکەس لەتاو ئازاری دوپشك پێوەدانو گەستنی مار دەبزرکێنێ ٥ رەنگی روخساری لە برسا یان لە ترسا یان بەهۆی نەخۆشی گۆڕا.
إِسْتَهَبَ فلان: فلانکەس زۆری بەخشی.
ألتسهيبُ: نەمانی عەقڵو ئاوەز.
ألسَّهْبُ: دەشتو چۆڵەوانی ٥ زەوی دورو دەشتایی ٥ دەگوترێ: (قطعوا سَهْباً من الأرض) ٥ دەشتاییەکی زۆری بڕی تا گەیشتە لای ٥ ئەسپی بە راپەڕو چوست ٥ ئەسپێك زۆر عەرەق نەکا، زوو عەرەق نەکا ٥ ئەسپی هەنگاو درێژ باز هاوێژو بەهێزو توندو تۆڵ ٥ بەشێك لە شەو ٥ دەگوترێ: (مضى سَهْبٌ من الليل) بەشێك لە شەو رابورد (ك: سُهُوب).
السُّهْبُ من الارض: بەمانا (ألسَّهْبُ) دێ ٥ (ك: سُهُوب).
سُهوبُ الفَلاَة: قەراخو بیجاخی چۆڵەوانی کە رێگای لێوە دەرنەچێ.
ألسُّهْبَةُ: بیری قوڵ ٥ (ك: سِهاب).
ألمُسْهَبُ: دەگوترێ: (رجل مُسْهَبٌ) پیاوێکی درێژە ٥ (طويل مُسْهَبٌ) درێژێکی زیاد لە ئەندازە درێژە.
ألمُسْهَبَةُ: مێینەی (ألمُسْهَبَ) ٥ بیری زۆر قوڵ.
سَهَجت الريحُ سُهُوجاً: رەشەباکە توند بوو، بەهێز بوو ٥ بە بەردەوامی هەڵبوو.
سَهَجَ الشَّيْئُ سَهْجاً: شتەکەی وردو هاڕ کرد.
سهجت الريحُ الأرضَ: رەشەباکە گڵی سەر روی زەوی راماڵیو زەوییەکەی پاك کردەوە.
سَهَجَ السائِرُ ليلتَهُ: رێبوارو شەو رەوەکە بە بەردەوامی رۆیی.
الأساهيجُ: چەند جۆرە رۆیشتنێکە.
السّاهِجُ: بای بەهێز ٥ (ك: سُهَّجٌ وسواهج).
السُّهُوجُ: بەمانا (السّاهج) دێ ٥ (ك: سياهج).
السَّيْهَجُ من الرياح: بەمانا (السّاهِج) دێ ٥ (ك: سياهج).
ألمَسْهَجُ: رێڕەوی با (ك: مساهج).
ألمِسْهَجُ: باوەشێن ؛ هەر شتێك با پەیدا بکا ٥ ئەو کەسەی لە هەموو دیزەیەك ئەسکوێیەو خۆ لە هەموو شتێك هەڵدەقورتێنێ.

سَهْجَرَ: بازى ترسنۆكانەى هاويشت.

سَهِدَ سَهَداً وسُهْداً وسُهاداً: شەو بە خەبەر بوو ٥ دەشگوترێ: (في عينه سُهْدٌ وسُهادٌ).

اسْهَدَت الحامل: ئافرەتە سك پڕەكە بە يەك ژان منداڵەكەى بوو.

أسْهَدَ فلاناً: خەوى لە فلانكەس زڕاند، نەيهێشت شەو بخەوێ.

سَهَّدَهُ: شەو بە خەبەرى كرد، خەوى لێ زڕاند ٥ دەگوترێ: (رجلٌ مُسَهَّدٌ) پياوێكى ورياو بە ئاگايە.

الأسْهَدُ: دەگوترێ: (هو أسْهَدُ منه رأياً) ئەو زۆر لە فلان بە ورە ترو بەرچاو رونترو بە ئاگاترە.

السَّهْدُ: جوانو رێكو پێك ٥ دەگوترێ: (هذا شيء سَهْدٌ مهدٌ) ئەمە شتێكى جوانو رێكە.

السُّهُدُ: شەو بە خەبەريى ٥ بێدارو بێ خەو ٥ دەگوترێ: (رجل سُهُدٌ وامرأة سُهُدٌ).

السُّهْدَةُ: يەك جار خەو زڕانو بێدارى ٥ دەگوترێ: (فلان ذو سُهْدة في أمره) فلانكەس بۆ بەرژەوەندى خۆى وريايە ٥ (ما رأيت من فلان سُهْدَةً) لێهاتويىو زيرەكيەكم لە فلانكەسدا نەبينى، حەزى لە خێرو پياوەتى نيە ٥ كاروبارێك پشتى پێ ببەسترێو جێگاى هيواو نومێد بێ.

السُّهْوَدُ مِن الغِلْمانِ: كورى تازە پێگەيشتوو ٥ درێژى بەهێز.

سَهِرَ سَهَراً: شەو تا بەيانى بە ئاگا بوو، خەوى لێ زڕاو بێدار مايەوە.

سَهِرَ البَرقُ: لە شەودا هەورە بروسكە روناكى دا (فهو ساهر وسُهران وَسَهّار وسَهِرة).

أسْهَرَهُ: شەو بێدارى كرد، خەوى لێ زڕاند.

الأسْهران: دوو رەگن لە چاوو لە گوێچكەدا.

السَّاهر: دەگوترێ: (ليلٌ ساهر) شەوێك كە نوستنى تێدا نەكرێ، خەڵكەكە تێيدا خەوى بزرێ.

السَّاهِرَة: مێينەى (الساهر) دەگوترێ: (ليلة ساهرة) (أرض ساهِرَة) زەوييەكە روەكى زوو پێ دەگا دەڵێى روەكەكانى قەت لە گەشە ناكەونو هەر خەريكى نەشو نمان ٥ (قطعوا ساهِرَةً) زەوييەكى دەشتايىو پانو پۆرپان برى، زەوييەكى وەها رێبوارانى شەو تێيدا ناخەونو شەو بێدارن ٥ هەروا وشەى (الساهرة) ناوە بۆ سارايەكى سپى بێ روەك بۆيە بەو دەشتو سارايەى كە رۆژى قيامەت ئادەميزادى لەسەر حەشر

دەكرێن دەگوترێ: (الساهرة) قورئان دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا هُم بِالسَّاهِرَةِ﴾ ٥ هەروەها بە چۆڵەوانیەك دەگوترێ ئادەمیزاد پێی نەخستبێتە سەر ٥ كارێز ٥ خولانەوەی مانگ.

اَلسَّاهُورُ: خولانەوەی مانگ ؛ خولگەی مانگ ٥ نۆ رۆژی كۆتایی مانگ ٥ روبەری زەوی ٥ سەرچاوەی ئاوو شوێنی سەرەكی هەڵقوڵانەكەی.

اَلسُّهارُ: شەو بێداری بەهۆی نەخۆشی یان خەمو خەفەتەوە.

اَلسُّهَرَةُ: كەسێك زۆر بەشەو بە خەبەر بێ هەمیشە خەوی لێ زڕابێ ٥ دەگوترێ: (هو سُهَرَة وهي سُهَرَة).

اَلسَّهَّارُ: بەمانا (السُّهَرَةُ) دێ ٥ دەگوترێ: (رجل سَهَّار العين) پیاوێكە شەو بە خەبەرەو خەو لە چاوی ناكەوێ.

اَلسَّهَارِيُّ: چرایەكە خەفەو كەم نوورە ٥ گلۆپی سفر، خەڵك دوای نووستن هەڵی دەكەن.

اَلْمِسْهارُ: كەسێك بۆ شەو بەخەبەری ئازابێ بتوانێ شەو تا بەیانی نەنوێ.

سَهَفَ الذِّبُ سَهْفاً وسُهافاً وسهيفاً: ورچەكە بۆڵاندی.

سَهَفَ القتيل أو الذبيح: كوژراوەكە یان سەر براوەكە لە خوێناوی خۆیدا لنگە فرتەی كرد گەوزی.

سَهِفَ سَهَفاً وسُهافاً: زۆری تینوو بوو (فهو سَهِف وهي سَهِفَةٌ).

إِسْتَهَفَهَ: سوكایەتی پێكرد، بەبێ نرخ سەیری كرد.

السَاهِفُ: فەوتاو تێدا چوو ٥ كەسێك خوێنی بەربووبێ‌و بێ هۆش‌و گۆش كەوتبێ ٥ یان بە تینوایەتی گیانی دەرچوو بێ ٥ یان روخساری گۆڕا بێ.

اَلسُّهافُ: دەردێكە توشی هەر كەسێك ببێ تێراو نابێ هەمیشە تینوویەتی.

اَلسَّهْفُ: توێكڵ‌و پێستی ماسی.

اَلْمِسْهافُ: زۆر تینو ٥ دەگوترێ: (ناقة مِسْهاف) حوشترێكی گەرو وشك‌و زۆر تینووە ٥ (ك: مساهيف).

اَلْمَسْهَفَةُ: هەر خواردنێك ئاو خواز بێ ٥ رێڕەوی رێگا ٥ (ك: مساهِف).

اَلْمَسْهوفُ: دەگوترێ: (رجل مَسْهوفٌ) پیاوێكە هەمیشە تینوویەتی‌و قەت تێر ناخواتەوە ٥ (وهي مسهوفة) ٥ (ك: مَساهيف).

سَهَكَت الريحُ سُهُوكاً: بایەكە هەڵبوو بوو بە گێژەڵوكە.

سَهَكَت الدَابَةُ: وڵاخەكە بە خێرایی رۆیشت.

سهك الشَيْءَ سَهْكاً: شتەكەی كەرتو

پـــەرت کـــرد بـــەڵام نەیگەیانـــدە ئەنـدازەی هاڕین وەکوو ئارد وردی نەکرد.

سَهَكَ الريحُ الأرضَ: ڕەشەباکە گڵو خۆڵی سەر زەوی ڕاماڵی.

سَهَكَ الريحُ التراب: ڕەشەباکە گڵو خۆڵی بە حەوادا برد.

سَهِكَ سَهَكاً: بۆگەنی ناخۆش بوو.

سَـــهِكَ فـلان: فلانکـەس عـەرەقی کـرد بۆنێـکی ناخۆشـی لێ هـات ٥ (فهـو سَـهِك) دەشـکوترێ: (لحـم سَـهِكٌ وسمك سَهِكٌ) (وهـي سَـهِكة) هـەروا دەگوترێ: (يـدي مـن الـسمك ومـن صدأ الحديد سَهِكة) دەستم بـەهۆی ماسی یان ژەنگی ئاسنەوە بۆگەنی لێ دێ.

الأساهيك: (أساهيك الدّابّـةَ) جۆرەکانی ڕۆیـشتنی وڵاخو خـۆ بادانیـەتی بـە ڕاستو چەپدا.

السّاهِكُ: چاو ئێشە ٥ خورانی چاو ٥ دەگوترێ: (بعينـه سـاهك) چڵقڵ لـە چاویدایە، چاوی ئازاری هەیە.

السّاهِكةُ من الرياح: ڕەشـەبای بـەهێزو خێـرا ڕۆ کـە خـشتو خـۆڵی سـەر زەوی ڕبماڵێ ٥ (ك: سواهك).

السُّهَاكَةُ: شتێـك كاتی پێ بەسەر ببرێ خـۆی پـێ بخافڵێنـدرێ دەگـوترێ: (سُـــهاكة مـــن خـــبر) چـیرۆكو ئەفسانەیەك ٥ حیکایەتە درۆزنە.

السَّهْكَةُ: بۆنی ناخۆش.

السُّهْكَةُ: بەمانا (السَّهْكَةُ) دێ.

السُّهُوكُ: بای بۆگەن ٥ هەڵۆ.

سَهُلَ سُهُولَةً: نەرمو ئاسان بوو، زبری کەم بوو (فهو سهل وهي سهلة).

أسْهَلَ: دابەزییـە دەشـتایی ٥ یان هاتـە نـاو دەشـتاییەوە ٥ لەگـەڵ خەڵـکدا لەسەرەخۆو نەرمو نیان بوو.

أسْهَلَ الشَّيْءَ: شتەکەی ئاسان کرد.

أسْهَلَ الأمْرَ: کارەکەی بـە ئاسانی هاتـە دەست، لای ئاسان بوو.

أسْهَلَ الـدّواءُ الـبَطْنَ: دەرمانەکە سکی چواند، ڕەوانی کرد.

أُسْهِلَ البَطْنُ: سکی چوو، خۆراکی نـاو گەدەی نەرم بـوو، گوو فیرەی تـوش بوو.

سَاهَلَهُ: نەرمو نیانی لەگەڵدا نواند.

سَهَّلَهُ: بەمانا (أسْهَلَهُ) دێ.

تَـساهَلَ الـشَّيْءُ: شـتەکە ئاسـان بـوو، زەحمەت نەبوو.

تساهَلَ فلانٌ: فلانکەس لێبوردە بوو.

تـــساهَلَ النـــاسُ بعـــضهم مـــع بعـــض: خەڵـکەکە لـەناو خۆیانـدا لێبوردەو هاریکـار بـوونو ئاسـان کارییـان بـۆ یەکتر کرد.

**تَسَهَّلَ**: بەمانا (سَهُلَ) دێ.

**اسْتَسْهَلَ فلانٌ**: فلانکەس دەرمانی ڕەوانی خوارد، شتێکی خوارد سکی ڕەوان بکا، سکی پێ بچێ.

**اسْتَسْهَلَ الشَّيْئَ**: شتەکەی بە سەهل‌و ئاسان لە قەڵەم دا ٥ یان شتەکەی بە ئاسان دەس کەوت، بە ئاسانی بۆی گونجا.

**الإسْهَالُ**: سکچون، ڕەوان بوون ٥ هاتنە دەرەوەی ناو گەدە بە شێوەی نا سروشتی.

**التَّسْهِيلُ**: لەلای زانایانی تەجویدو زانیاری صەرف بریتییە لە سووککردنی پیتی (همزة)و کردنی بە ئەلف.

**ألسَّهْلُ**: هەر شتێك مەیلی بەلای نەرمیدا بێ‌و زبری پێوە نەبێ ٥ زەوی دەشتایی نەرمەڵان (ك: سُهولٌ) دەشگوترێ: (هو سَهْلُ الوجه) دەموچاو کزو بێ گۆشتە ٥ (سَهلُ الخدين) کوڵم کراوەو نەرم گۆشتە ٥ (سَهْلُ الخلق) ڕەوشت خاکی‌و ئاسان خوازە ٥ (أهلاً وسهلاً) تووشی دۆست‌و ئەهل‌و ناسیاو بووی‌و هاتیتە شوێنێکی سەهل‌و دڵکەرەوە.

**السَّهْلُ**: کڵێکە وەکوو لب وایە ئاو کێش دەکا، ئاو دەدزێ ٥ (ك: سُهولٌ وأسهالٌ).

**ألسُّهْلِيُّ**: دەشتەکی، دەشتایی ٥ هەر شتێك نیسبەت بدرێ بۆ لای دەشت ٥ دەگوترێ: (نبات سُهْلي) ڕوەکێکە لە دەشتایی دەڕوێ ٥ (بعير سَهْلي) حوشترێکە دەشتەکی‌و لە دەشت دەلەوەڕێ.

**السُّهُولُ**: دەرمانی ڕەوانکەر، دەرمانی وەها گەدە نەرم بکاو سك بچوێنێ.

**السُّهولةُ في الكلام**: ئەوەیە کەلامەکە خالی بێ لە زۆر لەخۆ کردن‌و گرێ‌و گۆڵ‌و زێدە ڕۆیی لە وشە کاریدا.

**سُهَيْلٌ**: ئەستێرەی سیوەیل، ئەستێرەی گەلاوێژ ٥ دەڵێن: بەدەرکەوتنی لە شەودا میوە پێ دەگاو گەرما نامێنێ ٥ یەکێکە لە ئەستێرەکانی یەمانی ٥ لە پەندی پێشیناندا هاتووە دەڵێ: (اذا طلع سهيل رفع كيل ووضع كيل) واتە: کە گەلاوێژ هەڵات هەوا دەگۆڕێ.

**ألْمُسْهِلُ**: دەرمانی وا سك بچوێنێ.

**سَهَمَ سُهُوماً وسُهاماً**: ڕەنگی گۆڕا لەبەر شتێکی تازە پەیدا بوو لەبەر خەم‌و کزی‌و لاوازیی ٥ کزو لەڕ بوو.

**سَهَمَ فلاناً سَهْماً**: لە کێ برکێ بەسەریدا

زاڵ بوو ◊ دەگوترێ: (ساهَمَهُ فَسَهَمَهُ) کێ بڕکێی لەگەڵدا کردو پێشی کەوت.

**سُهِمَ**: بەمانا (سَهَمَ) دێ ◊ یان گڕەی گەرمای هاوین‌و بای گەرم لێی داو روخساری گۆڕی ◊ لە شەڕدا بە زۆر تاوانی پێ ئەنجام درا.

**سَهُمَ سُهُوماً**: بەمانا (سَهَمَ) دێ.

**أسْهَمَ بينهم**: تیرو پشکی خستە نێوانیانەوە.

**أسْهَمَ لە**: بەشی دایە، ئەندازەیەکی بەخشش بۆ دیاری کرد، بۆی زیاد کرد.

**أسْهَمَ في الشيئ**: لە شتەکەدا کردی بە هاوبەش.

**أسْهَمَ الشَّيْئَ**: شتەکەی بەش بەش کرد.

**ساهَمَهُ مساهمةً وسِهَاماً**: هاوبەشی کرد لە کێ بڕکێداو بە سەریدا زاڵ بوو ◊ لە دیاری وەرگرتندا پێشی کەوت لەوی تێپەڕاند ◊ لە تیرو پشکدا تێشکا ◊ لەگەڵ ئەودا بوو بە هاوبەش لە بەش وەرگرتندا ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ الْمُدْحَضِينَ﴾.

**سَهَّمَ الثَّوْبَ**: لە قوماشەکەدا وێنەی تیرو کەوانی دروست کردن ؛ (فهو مُسَهَّمٌ).

**تساهم الرجلان**: ئەو دوو پیاوە زۆران بازی، شمشێر بازی، گوریس کێشەکێیان کرد.

**تَسَاهَمَ الشَّيْئَ**: شتەکەیان بەش کرد.

**السُّهَامُ**: کزی‌و لەڕی‌و گۆڕان ◊ گەرمی بای رەشەبا.

**السُّهَامُ**: لەڕی‌و روخسار گۆڕان، رەنگ هەڵقرچان.

**السَّهْمُ**: ئەو قوداحەی قوماری پێ دەکرێ ◊ بەش‌و بارو بەخت‌و شانس ◊ ئەوەی قومارکەر دەیباتەوە ◊ لە بواری ئابوریدا چەکە پارەیەکە نمونەی بەشێک لە سەرمایەی کۆمپانیایەکە زیادو کەمی بەسەردا دێ ◊ بەڵگە نامەیەکی چاپکراوە بە شێوازێکی تایبەتی ◊ لە زانیاری پێوانەو روپێوی دا بەشێکە لە بیست‌و چوار بەشی قیراط ◊ چیلکە دارێکە دەتاشرێ‌و رێک دەخرێ‌و دەخرێتە ناو کەوانەوەو دەهاوێژرێ ◊ دارێکە لە نێوان دوو دیواردا رادەنگێودرێ ◊ تیری کەوان ◊ ئەستێرەیەکە ◊ (ك: أسهم وسِهامٌ).

**السُّهْمَةُ**: بەش‌و بار ◊ خزمایەتی (ك: سُهَمٌ).

**السَّهِيمُ**: هاوبەش لەگەڵ کەسانی دیکە ◊ هەر لەم روومەیە کە (بديع الزمان الهمداني) دەڵێ: (أفترضى أن تكون

سـهيم حمـزة في الـشهادة) ئايـا رازى دمبێ به شێكت لـه پاداشـى شـههيد بوونى حهمزه بهر بكهوێ.

**سَهَا** عنه وفيه سَـهْواً وسُـهُواً: لێـى بـێ ئاگـا بوو ○ دهشـگوترێ: (سَهَا فيه) ههڵـهى تێدا كرد ○ به نهزانى وازى لێ هێنا.

**سَهَا** عنـه: بـه مهبهسـتهوه وازى لێ هێنـا ○ دهگوترێ: (سها في الـصلاة) شتێـكى له نوێژدا لهبير چوو.

(سها عن الصلاة) شتێـكى لـه نوێـژ تـهرك كرد، ئهنجامى نهدا.

**سَهِيَ** سَهْواً: بهمانا (سَهَا) دێ.

**سَهُوَ** سَـهَاوةً: نـهرمو نيـانو ئـارامگر بـوو، پان بۆوهو تهخت بوو.

**أسْـهَى** فـلان: فلانكـهس بـهر بـێلاى دروست كرد بۆ خانوهكهى.

**أسْهَى** فلاناً: واى كـرد فلانكـهس سـههو بكا.

ساهاه: بێ ئاگاى كرد ○ گاڵتهى پێ كرد ○ بهرێـكو پێـكى هـهڵسو كـهوتى لهگـهڵ كـرد ○ وازى لـه توێژینـهوهو ورد بونـــهوه هێنـــاو ئاســـانكارى لهگهڵدا كرد.

**سَهَاهُ**: واى لێكرد سههو بكا ○ بێ ئاگاى كرد، غافڵ گيرى كرد.

**السُّها**: ئهستێرهيهكى خهفۆكه روناكى كهمـه لهبـهر دوريـى لـهپێرى (بنـات النعش)وه.

**السَّهْوُ**: بێ ئاگايىو غافڵى.

**السَّهْوَة**: خانوێـكه لهقـهراخ ئـاو بنيـات دهنـرێ بۆئـهوهى مهلـهوانو راوچـى پشوى تێدا بدهن ○ سياجى خـانوو ○ گهنجينهى نـاو مـاڵ ○ چوار دار يـان سـێ دار لاوو نيـو دهخرێنـه سـهر يـهكو كالآيـان دهخرێتـه سـهر (ك: سِهاءٌ).

**سَاءَ** سَوْءاً وسَـوءاً: شتێـكى شـهرم ئـاوهرى بهسـهردا هـاتو توشـى عهيبـدارى بوو.

**ساء** به ظناً: گومانى خراپى لێكرد ○ لێـى به گومان بـوو (فهو سَيِّئ وهي سيِّئة) (وهو أسوأ وهي سَوْآءُ).

**سـاءَ** فلانـاً سُـوءاً وسَـوْءاً: شتێـكى واى لهگهڵدا كرد پێى ناخۆش بوو.

**ساء**: وشهيهكه وهكوو (بئس) بـهكاردێ بـۆ زهم كردن ○ دهگـوترێ: (ساء مايفعل) ئهوهى دهيكا كارێكى خراپه.

**أساءَ** فلانٌ: فلانكهس كارى خراپى كرد.

**أساءَ** الشَّيْءَ: كارهكهى باش ئهنجام نهدا ○ شتێـكى ناشـيرينى پاڵدا ؛ شتێـكى زيان ئاميزى پاڵدا.

**أسَاءَ** فلاناً وله واليه وعليه وبه: بـهمانا (ساءه) دێ.

سَوَّأَه: شتی ناشیرینی پاڵدا.

سَوَّأَ علیه قوله أو فعله: رەخنەی لەسەر ئەوە لێ گرت.

سَوِّ ولا تُسَوِّيْ: چاك سازی بكەو گەندەڵ كاری مەكە.

إسْتاءَ: بۆ موطاوعەی (ساءَهُ) دێ ٥ نارەحەت بوو دڵی ناخۆش بوو ٥ دۆش داماو ویژدانی روشا.

السَّوْءُ: وشەیەكە لە شتی ناشیرینیدا بەكار دێ ٥ دەگوترێ: (رجل سَوْءٍ وعمل سَوْءٍ ورجل السَّوْءِ والرجل السَّوْء) هەروا بەمانا ئاگر دێ ٥ (ك: أسْواءٌ).

السُّوءُ: هەر شتێك خەمو پەژارە بخاتە ناو دڵەوە ٥ هەر شتێك ناشیرین بێو بە خراپ لە قەڵەم بدرێ ٥ ناوێكە كۆكەرەوەی بەڵاو كارەساتو چورتم دەگەیەنێ ٥ دەبێتە دركەو كینایە بۆ نەخۆشی بەڵەكی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاء مِنْ غَيْرِ سُوءٍ﴾.

السُّوأى: مێینەی (الأسْوَأ) ٥ تاوان ٥ ئاگر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ كَانَ عَاقِبَةَ الَّذِينَ أَسَاؤُوا السُّوأَى﴾.

السُّوْآءُ: رەوشتی ناشیرین ٥ روخساری ناشیرین.

السَّوْآءُ: رەوشتی ناشیرین ٥ كاری فاحیشەو خراپ، شەرمكا (عەورەت).

السَّيِّئُ: هەر شتێك ناشیرینو عەیب بێ.

السَّيِّءُ: بەمانا (السَّيِّئُ) دێ.

السَّيِّئَةُ: گوناهی پچوك ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ﴾ ٥ عەیبو كەمو كوری گرانیو چورتمو ناخۆشی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ﴾ ٥ هەڵە.

الْمَسَاءَةُ: پێچەوانەی (الْمَسَرَّة) واتە: كەیف ناخۆشی.

الْمَسَاوِي: عەیبو كەمو كورپەكان، هەر ئاوا بە (كۆ) بەكار دەهێنرێ، دەڵێن تاكی نیە.

السُّوبَةُ: سەفەری دوور.

السُّوبِيَّةُ: شەرابێكە لە برنج دروست دەكرێ كەمێك دەگورێنرێو سەرخۆش كەرە ٥ بە زۆری لە میصردا باوەو دەخورێتەوە.

سَاجَ سَوْجاً وسواجاً وسَوَجاناً: هاتو رۆیی ٥ بە هێواشی رۆیی.

ساجَ الحائكُ النَّسيجَ بالمِسْوَجَة: جوڵا مەكوكەی هێناو بردو رێسراوی تێوەرداو بە شەپیتە كەی قوماشەكەی رێك خست.

**سَوَّج على البستان وغيره**: شوراى بۆ باخەكە كرد.

**السّاجُ**: درەختى ساج جۆرە درەختێكە زۆر گەورە دەبىّو لق‌و پۆپى بلاو دەبنەوە ٥ گەلایەكى گەورەى هەيە.

**السَّاجَةُ**: تاكى (السَّاجَ) ٥ جۆرە بەتانىو لێفەيەكە ئادەميزاد خۆى پىّ دادەپۆشىّ.

**السُّوجُ**: جۆرە چارە سەرييەك بە قورى كولاّو جۆلاّ رايەلّى قوماشەكەى پىّ سفت دەكا.

**السِّيَاجُ**: پەرژين بە شتى چقلّدارو دركاوى يان بە ديوار ٥ (ك: أسْوِجة وسُوج).

**المِسْوَجَةُ**: ئاميرێكە جۆلاّ قوماشەكەى پىّ سفت‌و لوس دەكا ٥ ئاو پرژێن ٥ (ك: مَسَاوِج).

**السَّاحَةُ**: گۆرەپان ٥ دەشتايى‌و پانتايى نێوان خانوى هۆبەو گەرەك ٥ دەگوترىّ: (هو برئ الساحة) ئەو بىّ تاوانە.

**ساخت قوائمُهُ**: قاچى لە زەوى چەقين (ساخت الأرضُ بهم) زەوى قوتى دان.

**أسَاخَهُ**: واى لێكرد لە قور بچەقىّ.

**تَسَوَّخ في الطين**: كەوتە ناو قورەوە.

**السُّواخ**: قورى زۆر كە قاچى تێدا بچەقىّ ٥ دەگوترىّ: (مُطِرْنا حتى صارت الأرض سُواحاً) ئەوەندە باران بارى زەوى زل بوو قاچى پێدا رۆدەچن.

**سادَ سِيادةً وسودداً وَسُؤْدَداً**: بەرێزو شكۆمەند بوو ناوى پياوەتى‌و سەخاوەتى بلاو بۆوە ٥ رەش بوو، رەش هەلّگەرا ٥ ناوى سازگارى خواردەوە.

**سادَ قَوْمَهُ أو غيرهم**: بوو بە گەورەى قەومەكەى.

**سادَ غيرُهُ**: پێش كەوت‌و بەسەر ناحەزانيدا بالاّ دەست بوو.

**سادَ فلاناً**: لە گەورەيى‌و بالاّ دەستيدا بەسەر فلاّندا زالّ بوو.

**سَوِدَ سَوَداً**: رەنگى وەكوو خەلّوز رەش بوو (فهو أسود، وهي سَوْدَاءُ) (ك: سود).

**أسَادَ**: مندالّى رەش پێستى بوو ٥ كورێكى بوو بە گەورەو فەرمانرەواو كاربەدەست.

**أسْوَدَ**: بەمانا (أسَادَ) هاتووە.

**سَاوَدَهُ مساودة وسِواداً**: كىّ بركێى لەگەلّدا كرد لە پياوەتى‌و شكۆمەنديدا، لە وەجاخ زادەيى‌و رەسەنيدا ٥ لە تاريكايى شەودا توشى بوو ٥ رقە بەرايەتى كرد.

**ساودت الماشِيةُ النباتَ**: ئاژەلّەكە

دەمی بۆ رومەکە برد بۆئەوەی بیخوا وەلێ هیچی دەست نەکەوت چونکە گزوگیاکە کەمو کورت بوو لە زەوی جیانەبوبوەوە.

سَوَّدَ: ئازا بوو.

سَوَّدَ الشَّيْءَ: شتەکەی رەش کرد.

سَوَّدَ الكتابَ: کتێبەکەی رەش نووس کرد، یەکەم جار نووسییەوە.

سَوَّدَ فلاناً: فلانکەسی کردە گەورەو سەرومر ٥ دەگوترێ:

سَوَّدَه عليهم: کردییە گەورەو فەرمانرەوا بە سەریانەوە.

إسْتادَ القومُ: قەومەکە گەورەی خۆیان کوشت ٥ وتاریان بۆ خوێندەوە نارەزاییان بەرامبەر دەربرێ.

استاد القومُ بني فلان: خەڵکەکە گەورەو ریش سپی فلان بنەماڵەیان کوشت، یان دیلیان کرد ٥ یان وتاریان ئاراستە کرد.

استاد القوم وفيهم: ئافرەتێکی خانەدانی نەتەوەکەی خواست مارەی کرد، گواستیەوە.

تَسَوَّدَ: ژنی هێنا.

إسْوَادَّ: وردە وردە بوو بە رەش پێست.

إسْوَدَّ: بەمانا (إسْوادَّ) دێ ٥ دەگوترێ: (إسْوَدَّ وجهه) دەمو چاوی رەش هەڵگەراو خەمبار بوو.

الأَسْوَدُ: رەش پێچەوانەی سپی ٥ لەلای عەرەب شتی زۆر سەوز بە رەش ناوزەد دەکرێ ٥ دەشگوترێ: (هو أسود الكبد) واتە دوژمنو ناحەز ٥ (هم سود الكباد) ئەوانە دوژمنن (الْغَنَمُ سود البطون) مەرەکان کزن ٥ هەروا وشەی (الأسود) ناوە بۆ چۆلەکە ٥ ماری گەورە کە رەشی تێدا بێ ٥ ماری قوڵە هوێبابو پیسو ژەهراوی ٥ دەشگوترێ:

أسود سالِخٌ: مارێکی رەشو توێژ فرێدەر ٥ چونکە هەموو ساڵێك توێژێك فرێ دەدا ٥ (ك: أساود).

الأسودان: بەردەڵانو شەو ٥ مارو دووپشك ٥ خورماو ئاو ٥ ئاوو ماست.

الأَسْوَدَةُ: ماری گەورە کە پەڵەی رەشی تێدابن.

السَّوَادُ: رەش، رەشایی ٥ پێچەوانەی رەنگی سپییە ٥ کەسایەتیو خود ٥ دەگوترێ: (لا يُفارِق سَوادي سوادَهُ) من هەرگیز خۆم لە ئەو جیاناکەمەوە ٥ هەروا دەگوترێ: (لا يُزايِلُ سوادي بياضَكَ) کەسایەتی من لە کەسایەتی تۆ جیا نابێتەوە ٥ لە حەدیثدا هاتووە: (اذا رأى أحدُكم سواداً بليل فلا يكن أجْبَنَ السَّوادين فانه يخافك كما تخافه).

سواد القلب: ناخی دڵ.
سواد العين: گلێنەی چاو.
سواد البطن: جەرگ ٥ هەروا ناوە بۆ کۆمەڵێك دارخورماو درەختی ترو روەکی زۆر سەوز ٥ چونکە سەوزایی نزیکە لە رەنگی رەش ٥ پۆشاکی رەسمی ٥ دەگوترێ: (جاء الوزير وعليه سوادهُ) وەزیر هاتو بەرگی رەسمی خۆی لەبەردا بوو ٥ هەروا وشەی (ألسَّواد) ناوە بۆ گوندی سەر بەشار ٥ دەگوترێ: (خرجوا الى سواد المدينة) چونەدەر بۆ دێهاتی دەوروبەری شار.
سواد العراق: رەشە خاکی عێراق.
سواد العسكر: خێمەو چەكو پێداویستی سەربازی.
سواد الأمير: دارو دەستەی پاشاو پاساوڵەکانی ٥ زۆرینەی خەڵك ٥ ماڵو سامانی زۆر ٥ ئاژەڵو کشتو کاڵی زۆر ٥ دەگوترێ: (لفلان سواد من الماشية والمزارع).
السُّوَادُ: کەیف خۆشکردن ٥ نەخۆشییەکە توشی جەرگ دەبێ لە ئاکامی زۆر خواردنی خورما ٥ وا دەبێ ئەم نەخۆشییە دەیکوژێ ٥ دەردێکە توشی مەڕ دەبێ گۆشتی رەش دەبێو دەیکوژێ ٥ رەنگ زەردییەکە ٥ سەوزییەکە توشی نینۆك دەبێ ٥ نەخۆشییەکە توشی گەنمو جۆ دەبێ، دەنکەکەی رەش دەبێ.
السّوادُ: بەمانا کەیف خۆشی دێ.
السُّودُ: پلێتێکی مەعدەنی رێكو پێکە ٥ شوێنێك بەردی زۆر بێ بەتایبەتی بەردی رەشو زبر.
السَّوْداءُ: مێینەی (الأسود) ٥ یەکێك لەو چوار مادەیەی جەستەی لێ پێك دێ: کە بە بڕوای پێشینان جەستە لەو چوار شتە پەیدا دەبێ ؛ ئەوانەش (الصفراء، الدَّم، البلغم، السَّوْداءُ) ٥ رەشماری گەورە ٥ رەشکە؛ کە بە (حبة البركة) ناسراوە ٥ دەشگوترێ: (كلمته مارَدَّ على سوداء ولا بيضاء) قسەم لەگەڵ دا کرد نە بە چاك نە بە خراپ وەڵامی نەدامەوە.
ألسُّودان: کۆی (الأسود) چینێکی ئادەمیزادن رەش پێست، هەندێکیان قژ هەڵپڕوزاو هەندێکیان لچ ئەستورو هەندێکیان لوت پانەوە بوون.
السُّوْدَدُ والسُّودَدُ: گەورەیی شکۆمەندی، رێزو پیاوەتیو مەردایەتی.

**السُّوَيداءُ**: پچووككراوەى (السَّوْداء) ٥ هەروا ناوە بۆ ناخى دڵ.

**السَّيِّدُ**: خاوەن ٥ پاشاو گەورە ٥ خاوەنى كۆيلە ٥ ريش سپىو سەركردەى كۆمەڵێك ئادەميزاد ٥ هەركەسێك بە گوێ كردنى فەرزو پێويست بێ ٥ نازناوێكى رێزو خۆشەويستييە بۆ وەچەو نەوەى فاطيمەى كچى پێغەمبەر بەكار دەهێندرێ ٥ هەروا وشەى (السّيد) لە هەندێ وڵات بۆ هەموو كەسو بۆ رێزدارى هەموو شتێك بەكاردێ ٥ دەگوترێ: (القرآن سيد الكلام) ٥ قورئان رێزدارترين كەلامە.

**الْمَسْوَدَةُ**: دەگوترێ: (ماء مَسْوَدَة) ئاوێكە دڵ فێنك كەرموميە (ك: مساود).

**الْمُسَوَّدُ**: جۆرە خواردنێكە لەناو عەرەبدا باوە.

**الْمُسَوَّدَةُ**: رەش نووسى لاپەڕەيەك يا زياتر يەكەمجار دەنووسرێو دوايى پاكنووس دەكرێ.

**السَّوْذَقُ**: باز يان هەڵۆ ٥ (ك: سوادِق).

**سَوْذَلَ فلانٌ**: فلانكەس سميڵى درێژ بوون.

**السَّوْذَلُ**: سميڵ.

**السَّوْذانِقُ**: بەمانا (السَّوْذَقُ) دێ.

**السُّوْذَقُ**: بەمانا (السَّوْذَق) دێ ٥ ئەڵقەى زنجير ٥ دڵ ٥ (ك: سَواذِق).

**السُّوْذَقُ**: بەمانا (السَّوْذَق) دێ.

**السَّوْذِقِيُّ**: هەڵۆى باز ئاسا ٥ (اسم منسوب) واتە: چوستو چالاكو فێڵ زانو وريا.

**سار** سوراً وسورةً: رقى هەڵسا، تورە بوو پەلاماريدا.

**سار** الشجاع في الحرب: جەنگاوەرە ئازاكە لە شەڕدا هەڵمەتى برد.

**سار** الشَّرابُ في راسَه: عەرەقەكە لە كەللەى داو سەرخۆشى كرد، گێژى كرد.

**سار** الحائِطَ: چووە سەر ديوارەكە ٥ (سُرْ سُرْ) فەرمانێكە لە (سارِيسور) وەرگێراوە ئاراستەى ئادەميزاد دەكرێ بە مەبەستى هەڵنانى بۆ كارى بەرزو پياوەتى.

**ساوره** مُسَاوَرَةً وسواراً: پەلامارى دا ٥ لە شەڕو زۆرانبازيدا سەرى گرت ٥ دەشگوترێ: (ساورته الهموم والهواجِسَ والأفكار ونحوها) خەمو پەژارە، دڵە خوتەو بيرو بۆچوونى جيا جيا لە ناخيدا سەريان هەڵداو زۆرانبازييان لەگەڵدا كردو هێنايانو برديان چەمبەرەيان لەگەڵدا بەست.

**سَوَّرَهُ**: شوراى بۆ كرد، پەرژينى بۆ كرد

سَوَّر المرأةَ: بازنەی کردە دەستی ئافرەتەکەوە.

سَوَّر الحائط: چووە سەر دیوارەکە.

سَوَّر فلاناً: فلانکەسی کردە گەورەو کار بەدەست ٥ کردی بە تفەنگچی‌و راست هاوێژ.

تَسَاوَرَ للشَّيْءِ: خودی شتەکەی بۆ بەرز کردەوە.

تساور الرجلان أو غيرهما: ئەو دوو پیاوە پەلاماری یەکیان داو دەستەو یەخەی یەکتر بوون.

تَسَوَّرَت المرأةُ: ئافرەتەکە بازنەی لە دەست کردن.

تَسَوَّر الحائط: چووە سەر دیوارەکە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَهَلْ أَتَاكَ نَبَأُ الْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا الْمِحْرَابَ﴾.

تَسَوَّرَ عليه: هێرشی بۆ برد.

الإِسْوار: لۆغەتێکە لە (السِّوار) بەمانا ئەو بازنەو خشڵەیە ئافرەت لە دەستی دەکا ٥ (ك: أَسْوِرَة) ٥ سەرکردەیەکی فارس بووە ٥ تفەنگچی‌و نیشان هەنگێو ٥ دامەزراوو خۆگر لەسەر پشتی ئەسپ.

الأَساوِرَة: نەتەوەیەکی ناعەرەبن لە دێر زەمانەوە لە بەصرەدا نیشتەجێ بوون.

السِّوارُ: بازنەو خڕ خاڵ.

السُّوارُ: بەمانا (السِّوارُ) دێ ٥ (ك: أَسْوِرَة).

سُوارُ الخمر ونحوها: کەفو هەڵچوونی شەراب‌و کاریگەری توندو کەسکونی ٥ دەگوترێ: (أخذه سُوار الفرح ونحوه) نەش‌و نمای دڵ خۆشی‌و تەڕ دەماخی لە کەللەی دا.

السُّورُ: هەر شتێك دەورەی شتێکی تر بداو ببێتە سیاج بۆی ٥ (ك: أسوار وسيران) ٥ وشتری رەسەن ٥ خواردنی ئامادەکراو بۆ میوانی بەرێز ٥ لە حەدیثدا هاتووە: دەڵێ: پێغەمبەر (د.خ) بە هاوەڵانی خۆی فەرموو: (قوموا فقد صنع جابرٌ سوراً) ٥ هەستن بابڕۆین جابیر خواردنی بۆ ئامادەکردوین.

السَّوْرَة: راپەڕین‌و پەلامار دان، دیاردەو نیشانەی پیاوەتی‌و مەردایەتی ٥ بەرز بوونەوەی رێزو شەرەف ٥ کوشندەی سەرما ٥ کەسکونی‌و کاریگەری شەراب ٥ رق هەڵسانی زۆرو لە سنور دەرچوو ٥ هەڵمەت‌و تۆڵە ستاندنەوەی پاشا لە تاوانباران‌و کەمتەرخەمان ٥ دەشگوترێ: (فلان ذو سَوْرة في الحرب) فلانکەس لە شەڕدا لێزان‌و بیروبۆچوونی پەسەندی هەیە.

السُّورَةُ من البناء: ئەو باڵەخانەیە

بەرزو جوان بێ ٥ چینێکە لە چینەکانی دیوار ٥ قاتێکە لە قاتەکانی باڵەخانە ٥ تاکی سورەتە لە سورەتەکانی قورئانی پیرۆز ٥ پلەو پایەی بەرزو شکۆمەند ٥ فەضڵو گەورەیی ٥ شەرەفو نەجیب زادەیی ٥ نیشانە ٥ (ك: سُوَرٌ وسُورٌ).

**السُّوَّار**: ئەو کەسەی زۆر تورە دەبێو رقی هەڵدەستێ ٥ زۆر هەڵمەت دەباو تۆڵە ستێنە ٥ کەسێك شەراب لە کەللەی بداو تەڕدەماخی بکا یان لە پەلو پۆی بخا ٥ هێرش بەرو تانەو تەشەر هاوێژ ٥ سەگی درِندەو ئازا بۆ ئادەمیزادی بێگانە ٥ قسەی کاریگەرو سەلمێندراوو بۆڕدەر.

**المِسْوَرُ**: سەرینو پشتی لە پێستو چەرم دروستکراو ٥ سەرین ٥ (ك: مَساوِر).

**المِسْوَرَةُ**: بەمانا (المِسْوَرُ) دێ ٥ (ك: مَسَاوِر).

**المُسَوَّرُ**: مەچەك ٥ شوێنی بازنەو دەستەوانە ٥ پیاوێك بە زۆر کرابێتە پاشاو فەرمانڕەوا.

**ساسَ الحَبُّ والخَشَبُ سَوْساً**: دانەوێڵە کە سن لێی دا ٥ دارەکە مۆرانە کرمۆڵی کرد.

**ساسَ الشاةُ**: مەڕەکە ئەسپێ لە خوریەکەی دا ٥ ئەسپێی ناو خوریەکەی زۆر بوو.

**ساسَ الناسَ سِيَاسَةً**: بوو بە گەورەی خەڵکەکەو فەرمانڕەوایی کرد.

**ساسَ الدّوابَ**: وڵاخەکەی رام کردو ژێرباری کرد.

**ساسَ الأمورَ**: کارەکانی رێکخستنو چاکسازی تێدا کردن ٥ (فهو سائس) (ك: ساسة وسُواسٌ).

**سَوِسَ الحَبُّ وغيرهُ**: بەمانا (سَاسَ) دێ ٥ دەگوترێ:

**سَوِسَ الحيوانُ**: مەڕو بزنەکە ئەسپێ لێی دانو گەنە لێی دان ٥ (فهو أسوس وهي سوساء) (ك: سُوسٌ).

**أساسَ الحَبُّ وغيره**: بەمانا (سَاسَ) دێ ٥ دەگوترێ:

**أَسَاسَ القومُ فلاناً**: خەڵکەکە فلانکەسیان کردە گەورەو فەرمانڕەوای خۆیان ٥ دەشگوترێ: (أساسوا فلاناً أمورهم) کاروباری خۆیانیان دا بە ئەو ٥ هەروەها دەگوترێ: (سَوَّسُوه أمورهم).

**سَوَّس فلان لفلان أمراً**: فلانکەس کارەکەی بۆ فلانکەس ئاسان کردو رێی بۆ خۆش کرد.

**إسْتاسَ الحَبُّ وغيرُهُ**: بەمانا (ساس) دێ.

**تَسَوَّسَ:** بۆ موطاوعەی (سَوَّسَهُ) دێ.

**السَّائِسُ:** ئەو کەسەی وڵاخ رام‌و ژێربار بکا، کارامایە لەژێر بارکردنی وڵاخدا ٥ (ك: سَاسَة وسُوَّاس).

**السَّاسُ:** خمخۆرکە، سن کە لە دانەوێڵەو خوری‌و شتی وا دەداو دایدەوەشێنێ ٥ هەرشتێك دابخورێ‌و کرمۆڵ ببێ.

**السُّوسُ:** بەڵغی سەر ددان، ددان کرمۆڵ کەر.

**السَّاسَة:** کۆی وشەی (السَّائس)ە ٥ دانەوێڵەو خۆراکی سن لێ دراوو ئەسپێ لێ دراوو کرم لێ دراو.

**السَّوَّاسُ:** درەختێکە لە جۆری درەختی (عیضا) دەشوبهێتە درەختی مەرخ چقڵی نیە گەڵای نیە، بەرز دەبێتەوە باشترین چیلکەی شقارتەی لێ دروست دەکرێ.

**السُّواسُ:** دەردێکە توشی ملی ئەسپ دەبێ قورگی وشك دەکاتەوە تا دەتۆپێ.

**السَّوَسُ:** دەردێکە توشی قاچی وڵاخ دەبێ ٥ دەردێکە توشی سمتی وڵاخ دەبێ‌و قاچی لاواز دەکا.

**السُّوسُ:** بەمانا (السَّاسُ) دێ ٥ (سُوسُ کل شيء) خمخۆرکەی شتەکەیە، کە لەناو شتەکەدا پەیدا دەبێ‌و وردە وردە شتەکە دەخوا وەکوو (سن)ی ناو دانەوێڵە، کرمی ناو خۆراك ٥ کرمۆڵ بوونی ددان ٥ هەروا ناوە بۆ روەکێکی عوشبی، تەمەن درێژە دەشتەکییە رەگەکانی درێژو قوڵن، رەگەکانی ورد دەکرێن‌و دەکوترێن دەرمانی لێ دروست دەکرێ ٥ هەروا شەرابێکی لێ دروست دەکرێ پێی دەگوترێ عیرقی سوس ٥ هەروا دەکرێتە کینایە بۆ سروشت‌و رەوشتی شت ٥ دەگوترێ: (الکرم من سوسه) سەخی‌و نانبدەیی لە سروشت‌و رەوشتی ئەوە ٥ ئەصڵ‌و بنەما.

**السیاسة:** رامیاری ٥ (سِیاسة سوق الحرة) دەربڕین‌و تەعبیرێکە هەڵس‌و کەوتی بانقە سەرەکییەکان دیاری دەکا دەربارەی کڕین‌و فرۆشتنی پارە جیا جیاکان ٥ بە مەبەستی زۆرتر گۆڕینەوەی کاڵاو دراو.

**السَّوْسَنُ:** جۆرە روەکێکە لە پێری روەکەکانی (الأیرِس) قەدو باڵای شەصت سانتیمەترێك بەرز دەبێتەوە ٥ گوڵێك یان چەند گوڵێك هەریەکەیان لە غونچەیەکەوە پەیدا دەبێ‌و

دەپشکوێ، هەیە سپی، هەیە شینە هەیـــە زەردە هەیـــە ســـوورە ٥ رووەکێکی تەمەن درێژە لە وڵاتانی ئەورووپاو وڵاتانی سەر دەریای سپی ناوەڕاست دەڕوێ، هەندێ جۆری بە رەگی بۆن خۆش بەناوبانگە، چونکە رووەکێکی عەتر ئامێزە.

**ساطت نفسُهُ سَوْطاناً**: دڵی تێکەڵ هات.

**سَاطَ الشَّيْءَ سَوْطاً**: شتەکەی تێکەڵاو کرد بە ئەسکوێو شتی وا تێکی هەڵدا بۆئەوەی باش تێکەڵ بەیەکتربن ٥ دەگـوترێ: (ســاط القــدر ونحوهــا) خـواردنی نـاو مەنجەڵەکـەی تێـك هەڵدا هەروا دەگوترێ:

**سِيطَ حُبُّك بدمي**: خۆشەویستیت تێکەڵ بە خوێنم بووە.

**ساط الأمر ونحوه**: کارەکەی ئەمـدیواو دیو کردو لێی ورد بۆوە ٥ (سـاط الحـربَ ونحوهـا) لە شـەڕەکەوە گلاو چووە ناویەوە.

**ساط الدَّابَّةَ**: بە قەمچی وڵاغەکەی ئاژوت لێی خوڕی.

**سَاوَطَ فلاناً**: بـە قەمـچی لـە فلانکەس راسا ٥ یـان بـە قەمـچی بـەرەنگاری فلانکەس بۆوەو لە شەڕە قەمچی دا بەســەریدا زاڵ بــوو ٥ دەگــوترێ: (ساوَطَني فَسُطْتُهُ).

**سَــوَّطَ الكُــرَّاثُ**: گیـا کـوراث گڵـوکی ناوەڕاستی دەرکرد.

**سَوَّطَ الشَّيْءَ**: شتەکەی تێك هەڵدا.

**سَوَّطَ أمره أو رأيه**: لـە کاروبارەکانیـدا یـان لـە راو بۆچـوونەکانیدا تێـکەڵو پێکەڵی کرد.

**سَوَّطَ الحربَ**: کەوتە شەڕ دەستی بەشەڕ کرد.

**استوط الأمـرُ**: کارەکـە شـێواو چەواشـە بوو، دەشگـوترێ: (إسْتَوَطَ عليه أمره) ئیشەکەی لێ چەواشە بوو دەستی تێ خراو لەسەری قورس بوو.

**الـسَّوْط**: قەمـچی لـە چـەرمو شـتی وا دروســت کرابــێ ٥ لاســکی رووەکــی کـوڕاث کـە هێـشتا گوڵەکـەی لـە غونـچەدایە ٥ بـەش و بـار ٥ ئـازارو نارەحــەتی ٥ قورئــان دەفــەرموێ: ﴿فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ﴾: خــودا عــەزابی بــە ئێـشی بەســەرا رشتن ٥ پاڵاوگەی ئاو ٥ زێدەی گۆلاو کە وەکوو قەمچی درێژ دەبێتـەوە ٥ رێـگای بارێـکی نێـوان دوو بـارگۆن (ك: أسواط وسياط).

**سَــوْط** باطــل: ئـەو دیمەنەیـە کـە لـە کونێـکەوە تیـشکی هـەتاو دەچێتە نـاو ژوورێـکەوەو خێتێـك دروسـت

دەکا ، دەشگوترێ: (همـا يتعاطيـان سـوطاً واحـداً) ئـەو دووانـە يـەك کاردەکەن.

**السَّوّاطُ:** خـاوەن قەمـچی، پاسـاوڵ، پۆلیـسی قەمـچی بەدەسـت کـە لەخەڵك دەدا.

**السُّوَيطاءُ:** شۆرباوێـکە ئـاوو بەرەکێـشتەکەی زۆر بـێ ، پیـازو نۆکی زۆر تێدا بێ.

**السُّوَيطَةُ:** تێـکەڵاو تێـك هەڵـدراو تێکەڵـکراو ، دەگـوترێ: (أمـرالهم سويطة بينهم) ماڵەکەیان تێکەڵاوە.

**المِسْوَاطُ:** دارێکە یان شتێکی تر وەکوو ئەسـکوێ ئـەوەی لـەناو مەنجەڵەکەدایە پێی تێك هەڵدەدرێ ، ئەسپێکە بە قەمچی نەبێ بازنادا، ناکەوێتە غار ، (ك: مساويط).

**المِسْوَطُ:** بـەمانا (المِسْواط) دێ ، (ك: مَساوِط).

**المِسْيَاطُ:** ئـاو کـە لـە بنکـی حـەوزدا بمێنێتەوە (ك: مسابيط).

**ساعَ الشَّيْئُ سَوْعاً:** شـتەکە فـەوتا، لـەکیس چـوو، دەگـوترێ: (ضـائع سائعٌ): فەوتاوو لەناو چووە.

**ساعَت الإبلُ أو الماشيةُ:** حوشـترەکە یـان مـەڕو بزنـەکان چـوونە لـەوەڕگاوە، یان بەبێ شوان لەپاوان دەلەوەڕێن.

**أَسَاعَ:** لەساتێـکەوە بـۆ ساتێـك گواسـتیەوە ، یـان سەعاتێـك دواکەوت.

**أَسَاعَ الشَّيْئَ:** شتەکەی پاشگوێ خـست، فەوتاندی.

**أَسَاعَ الماشِيَةَ:** ئاژەڵەکانی بەرەڵڵا کـردن تا بۆخۆیان بلەوەڕێن.

**سَاوعَهُ مُسَاوَعَةً وسِواعاً:** بۆسەعاتێـك بـەکرێی گـرت ، یـان بەسـەعات بەکرێی گرت.

**السَّاعُ:** ناڕەحەتیو ناخۆشی.

**السَّاعَةُ:** بەشێـك لەبەشـەکانی کـات چ کەم بێ یان زۆر ، بەشێك لەبیستو چوار بەشی شـەوو ڕۆژ ، ئامێرێـکە کـاتی پـێ دیـاریی دەکـرێ ، واتـە سـەعات ، سـەعاتی خـۆریی بـەهۆی وزەی خـۆر ئـیش دەکـاو کاتـەکانی شـەوو ڕۆژی پـێ دیـاریی دەکـرێ ، ڕۆژی قیامـەت ، یـان ئەوکاتـە قیامـەتی تێـدا ڕادەبـێ ، (ك: سـاع وسَواعٌ).

**ساعة الغَفْلَة:** سەعاتی نێوان مەغریبو عیشایە.

**ساعة سَوْعاءُ:** ساتەوەختێکی ناخۆشو نالەبارە.

**سـاعة الـصفر:** لـەزاراوەی هێـزی چەکدارو سوپادا ئەوکاتە نهێنییەیە کە دەست دەکـرێ بـەکاری سـەربازی تێیدا.

**السُّواعُ من الليل**: سەعات.

**سُواعٌ**: بتێکی ناوداره لەناو قەومی نوح دا پەرستشی بۆ کراوه دوایی بوومته پەرستراوی هۆزی هوزەیل یان خێڵی هەمـدان ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿لَـا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾.

**السَّوْعُ مِنَ الليل**: بەمانا (السُّواعُ)دێ.

**المِـسْياعُ**: فەوتێنـەر، فەلاچـۆكەر، دەگـوترێ: (هـو مِـسْياع مِـضياع) ٥ هەروا ناوه بۆ حوشترێـك كه بـەبێ شـوان دەچـێته لـەوەڕگا ٥ (ك: مسايع).

**سَاغَ الشَّيْءَ سَوْغاً وسَواغاً**: شتەكه خۆش‌و گوارا بوو بەجەستەی كەوت ٥ (ساغ الشرابُ والطعامُ في الحلق): بەئاسانی ئاوو شلەمەنییەكه یان خواردنەكـه له گەروی ڕۆیشته خوار.

**سـاغ الـشرابَ أو الطعـامَ**: بەئاسانی ئـاوو خواردنەكەی قوت دا.

**أسَاغَ فلان بفلان**: فلانكەس بەفلانكەس كارەكەی بۆ تەواو كـراو جـێ بـەجێ بوو.

**أسَاغَ الشَّيْءَ**: شتەكەی والـێ كـرد قـوت بـچێ‌و بەئاسـانی لەگـەروی بڕواتـه خوار، دەگـوترێ: (أسغ لـي غُـصَّتي): مۆڵەتم بدەو پەلەم لـێ مەكه.

**أسْوَغَ أخاه**: لەگەڵ براكەی لەدایك بـوو، دوو لانـەبوو، یـان لـەدوای براكـەی لەدایك بوو.

**سَوَّغَ الشَّيْءَ**: شتەكەی گونجاند، وای لـێ كرد بەئاسانی قوت بچێ.

**سَـوَّغَ الأمْـرَ ونحـوه**: ئیشەكەی بـەڕەوا زانـی‌و وای لـێ كـرد كەسـانی دیكـه سودی لـێ ببینن.

**سَوَّغ فلاناً مـا أصـاب**: ڕێـگای دا فلان سود له بەشی خۆی وەربگرێ، بەشی خۆی بەرێ‌و كەس ڕێـی لـێ نـەگرێ ٥ شـتەكەی بەپاڵفتـەكراوی جـێ هێشت ٥ (سَوَّغَ له كذا): فلان شتـی پـێ دا.

**إسْتَـسَاغَهُ**: بـەمانا (سَـاغَهُ) دێ ٥ بەگونجاوی دانا ٥ وای كرد خواردن‌و خواردنەوەكه بەخۆشی قوت بـچێ ٥ قسەكەی خۆی بردە سەرو وای كـرد كەسانی بەرامبەر بیرو بۆچونەكانی پەسـەند بكـەن، دەگـوترێ: (لا أستـسيغ الطعـامَ أو الكـلامَ): ئـەو خواردنـه یـان ئـەو قسه پەسـەند ناكەم.

**الأسْـوَغُ**: گـواراو خـۆش قـوت چـوو، دەگـوترێ: (شـراب أسْـوَغُ): شەرابێكی گوارایه.

**التَّسْوِيغُ**: (تسويغات الـسلاطين): ڕێـگه پێدانی پاشایه بەوه كەسێك بتوانێ

له لایەنێکی دیاریکراو مافی خۆی وەربگرێ.

**السِّوَاغُ**: هەرشتێـك ببێتـه هۆکـاری قوتـدانی خـۆراك، دەگـوترێ: (الماءُ سِـواغُ الغُـصَصِ): ئـاو هۆکـاری قوتدانی پاروە خۆراکە.

**ألسَّوْغُ**: (هـذا سَـوْغ هـذا): ئـەوە بەئەنـدازەی ئـەوە ە یـان لەسـەر شێوەی ئـەوە ە دەشگوترێ: (فـلان سَـوْغ أخيـه): فـلان دوا بـەدوای براکەی لەدایك بـووە منـداڵی تریـان نەکەوتۆتـه نێوانـەوە ە هـەروا دەگوترێ: (هو أخـوه سَوْغُهُ): فلان دوا بـەدوای براکـەی لـەدایك بـووە منداڵی تریان نەکەوتۆتە نێوانەوە ە هەروا دەگوترێ: (هي أختـه سَوْغُهُ): ئەوە خوشکیەتی‌و دوا بـەدوای ئـەو لەدایك بووە.

**السَّوْغَةُ**: بەمانا (السَّوْغُ)دێ.

**اَلْمُسَوَّغاتُ**: (مُسَوَّغات التعيين): ئـەو بەڵـگەنامەو بڕوانامـەو پـشتگیری کردنانـەن کەپێویـستە ئەوکەسـەی دەیـەوێ لەفەرمانگەیـەك دابمـەزرێ پێشکەشیان بکا بۆ تەعین بوون.

**سافت الماشيةُ سوفاً وسَوافاً**: ئاژەڵەکان بەنەخۆشی (سوواف) لەناو چوون.

**سـافَ عليـه**: خـۆی گـرت، بەصـەبر بـوو لەسەری.

**سافَ الشَّيْءَ**: بۆنی شتەکەی کرد.

**سَـافَ الـسَّائِفَةَ**: لەلبەلانەکـه نزیـك کەوتەوە.

**أسافَ**: نەخۆشی (سـوواف) کەوتـه نـاو ئاژەڵەکانیەوە.

**أسَـافَ الوالـدان**: بـاوك‌و دایکەکـه منداڵیان مـرد، بەمنداڵه مردووەکە دەگـوترێ (مُـساف)، بەباوکەکـه دەگوترێ (مُسیف).

**أسافَ فلاناً وغيره**: فلانکەسی لەناوبردو فەوتاندی.

**أساف فلان رجاً**: بۆنی فلانکەسی کرد.

**سَاوَفَ فلاناً**: فلانکەسی ڕۆیانـد ە بـۆنی کـرد بۆئـەوەی بزانـێ کامیـان بـۆنی کەسکون ترە ە فلانکەسی خافلاند.

**سَـوَّفَ فلانـاً**: فلانکەسـی دواخـست ە خافلاندی.

**سَوَّفَ الأمـر**: گوتی لـەوە دوا ئـەو کارە دەکـەم ە کارەکـەی دواخـست، دەشگوترێ: (سَوَّفَ به).

**سَـوَّفَ فلانـاً أمـره**: کارەکـەی دایـه فلانکـەس‌و وتـی بەویـستی خـۆت چۆنی دەکەی‌و چی دەکەی بیکە.

**استافَهُ**: بۆنی کرد.

**إسـتافَ المَـسَافَةَ**: ماوەکـەی بـڕی لەمەسافەکەی تێپەڕی.

**السائفة**: لمبەلان ە زەوییەك لەنێوان لمبەلان‌و زەوی ڕەق‌و پتەودا بێ ە (ك: سوائف).

**السَّافُ**: چینی دیوار لەخشت بێ یان لەبەردو شتی تر ە ئەو خشت‌و خۆڵ‌و پرزو پاڵەی ڕەشەبا دەیهێنێ‌و دەیبا.

**السُّوافُ**: دەردێکە توشی حوشتر دەبێ دەیفەوتێنێ.

**السَّوْف**: صەبرو چاوەڕوانی کردن، دەگوترێ: (فلان يقتات السَّوف): فلانکەس بەهەوا دەژی.

**سوف**: حەرفێکە بۆ ڕۆژگاری داهاتوو بەکاردەهێنرێ ە فیعلی موضاریع تایبەت دەکا بەداهاتووەوە.

**السِّيفَةُ**: دوور بوون، دوورکەوتنەوە، دەگوترێ: (كم سيفة هذه الأرض؟) یان دەگوترێ: (وبيننا سيفة عشرين يوماً): نێوانمان دووریی بیست ڕۆژە ڕێگایە.

**المساف**: دووری ە لوت.

**المسافة**: دووریی ە بەزۆری بۆ ڕووبەرو ئەندازە بەکار دەهێنرێ، دەگوترێ: (مَسَافَة يوم أو مَسَافَةُ شهر): واتە دوریی ئەو ولاتە ڕۆژە ڕێیەکە یان مانگە ڕێیەکە.

**ساق المريضُ سوقاً وسِياقاً**: نەخۆشەکە کەوتە گیانەلاوەوە، دەگوترێ: (رأيت فلاناً يسوق): فلانکەسم بینی خەریکی گیان دەرچون بوو ە هەروا دەگوترێ: (ساق المريضُ بنفسه وَنَفَسه فهو سائق).

**ساق فلاناً**: قاچی فلانکەسی هەنگاوت، لەقاچی دا ە لەدواوە تێیەوە ژەنی‌و دەنە دەنەی دا بۆئەوەی بڕوا ە دەشگوترێ: (ساق الله اليه خيراً): خودا خێری بۆنارد، خێری بەسەردا ڕشت.

**ساقت الريحُ الترابَ والسَّحابَ**: ڕەشەبایەکە تەپو تۆزو گڵ‌و خۆڵی حەوا دا، هەورەکانی ڕاماڵی.

**ساق الحديث**: قسەکەی درێژە پێداو بەزنجیرە گێڕایەوە.

**ساق اليه الحديث**: ڕوی ئاخاوتنەکەی کردە ئەو.

**ساق المهر الى المرأة**: مارەییەکەی نارد بۆ ئافرەتەکە.

**سَوِقَ سَوَقاً**: قاچی ئەستورو گەورە بوو ە (هو أسْوَقُ وهي سَوْقاء).

**أساقَهُ**: بەمانا (سَاقَهُ)دێ.

**ساق فلاناً الماشِيةَ**: وای کرد فلان کەس ئاژەڵەکە لێ خوڕێ ە ئاژەڵەکانی کردە موڵکی فلان.

**سَاوَقَهُ**: لەڕۆیشتن دا پێشبڕکێی لەگەڵ

دا کردو پێشی کەوت ٥ کێ برکێی لەگەڵ دا کرد تابزاندرێ کامیان تیژ ڕەوترە.

**ساق مَعَهُ**: شتەکەی لەگەڵدا لێخوڕی ٥ شوێنی کەوت.

**سَوَّقَ النبتُ أو الشجَرُ**: ڕووەکەکە یان درەختەکە قەدی پەیدا کرد.

**سَوَّقَ الحيوانَ وغَيْرَهُ**: بەمانا (ساقَهُ) دێ.

**سَوَّقَ فلاناً أمرهِ**: کاروباری خۆی دایە دەست فلانکەس.

**ساقَ البِضاعةَ**: هەوڵی دا بازاڕ بۆ کاڵاکانی بکاتەوە.

**استاقَهُ**: بەمانا (ساقه)دێ.

**إنْساقَ**: بۆ موطاوەعەی (ساقه)دێ ٥ شوێن غەیری خۆی کەوت ٥ ملکەچ بوو، ژێربار بوو.

**انساق الجَبَلُ**: کێومکە درێژ بووە.

**تسارقت الماشيةُ**: ئاژەڵەکان دوایەکتر کەوتن، بەشوێن یەکتردا هاتن ٥ لەڕۆیشتن دا پاڵەپەستۆیان کرد.

**تَساوق الشيئان**: ئەو دوو شتە پێکەوە ڕۆیشتن، شان بەشانی یەکتر ڕێیان کرد.

**تَساوق القومُ**: خەڵکەکە لەبازاڕدا زەمو زەمکارییان کرد.

**تَسَوَّقَ**: لەبازاڕدا کڕین و فرۆشتنی کرد.

**تَسَوَّقَ القومُ**: خەڵکەکە بازاڕیان دروست کرد.

**السائق**: لێخوڕی ترومبێل یان ترێن و شتی لەو جۆرە.

**السّاق**: نێوان ئەژنۆو قاچ ٥ قەدی درەخت و ڕووەك ٥ (ك: سوق وسيقان وأسوق) ٥ هەروا بەمانا نەفس و گیان دێ ٥ ئیمامی عەلی دەربارەی خەواریجەکان دەڵێ: (لابد لي من قتالهم ولو تلفت ساقي): ناچارم شەڕیان لەگەڵ دا بکەم تەنانەت ئەگەر گیانشم تێدا بچێ ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە (كشف عن ساقه): قاچی لێ هەڵماڵی، ئەم پەندە بەکەسێك دەگوترێ کەزۆر بەجیدی دەست بەکارێك بکا شانی بەردا ٥ هەروا دەگوترێ: (قَرَعَ للأمر سَاقَهُ): قاچی هەڵکرد بۆ کردنی کارەکە.

**قامت الحرب على ساق**: شەڕەکە گەرم بوو تاوی ساند.

**قام فلان على ساق**: فلانکەس زۆر لێبڕاوانە شانی بەرکارەکە داو خۆی پێوە خەریك کرد ٥ هەروا دەگوترێ: (بنى القوم بيوتهم على ساق واحدة): خەڵکەکە خانووەکانیان لەسەر یەك ڕیزو شێوە دروست کرد ٥ (ولدت المرأة ثلاثة

ذكور على ساق واحدة): ئافرەتەكە يەك بەدواى يەكدا سێ كوڕى بوون‌و مێینەیان نەكەوتە نێوانەوە.

ساق حُرّ: نێرینەی باڵندەی قەمارێیە.

السَّاقَةُ: پاشینەی سوپا.

السُّوقُ: بازاڕ؛ ئەو شوێنەی كڕین‌و فرۆشتنی تێدا دەكرێ.

سوق القتال: شوێنی لێكدان‌و شەڕكردنی دوو لایەنی بەگژ یەكدا چووە ٥ گۆڕەپانی جەنگ ٥ (ك: أسواق).

السوق الحُرَّةُ: بازاڕی ئازاد.

السُّوقُ السَّوْداء: بازاڕی ڕەش ٥ بازاڕێكە مامەڵە چییەكان تێیدا پابەندی نرخی دیاریكراو نابن.

السُّوقَةُ: ڕەشەخەڵك‌و بۆرە پیاو ٥ خەڵكی هەرەمەكی ٥ بۆتاك‌و بۆكۆ بەكاردەهێندرێ، دەگوترێ: (هو سُوقة وهم سوقة) ٥ (ك: سُوَقٌ).

السُّوقي: بازاڕیی، دەگوترێ: (هذا الشيء سوقي): ئەم كاڵایە بازاڕییە واتە باش دروست نەكراوە.

السَّوَّاقُ: سایەق ٥ قاچ درێژ ٥ حەڵوا فرۆش ٥ حەڵواچی.

السُّواقُ: قاچ درێژ ٥ ڕومكێك یەك ساقی هەبێ ٥ پەڕژی دار خورما ئەوكاتەی دەردەكەوێ‌و بەئەندازەی بستێك درێژ دەبێ.

السَّويق: قاوت؛ حەڵوا، خواردنێكە بەئاردی گەنم یان ئاردی جۆ دروست دەكرێ.

السُّوَيقَةُ: لاسكی ڕوەك‌و قەدی درەخت ٥ یان بازاڕی بچوك.

السِّياق: مارەیی ٥ (سِياق الكلام): شێوەی قسەو باس‌و ئوسلوب‌و شێوازی كەلام ٥ گیانەڵاو كاتی گیان كێشان، دەگوترێ: (هو في السِّياق): ئەو لەگیان كێشاندایە.

السَّيِّق من السحاب: ئەو هەورەی با ڕایدەماڵێ جا ئاوی پێوە بێ یان بێ باران بێ.

السَّيِّقَةُ: ئاژەڵی لێخوڕاو ٥ ئاژەڵی فڕێندراو لەلایەن دوژمنەوە ٥ هەروا دەگوترێ: (المرأ سيّقة القدر): ئادەمیزاد ڕاپێچكراوی دەستی قەدەرە بۆ كوێی دەوێ وادەیباو ناتوانێ لێی لادا ٥ كۆختەو دێوجامەو شتی وا كەڕاوچی لەدوایەوە خۆی حەشار بدا ٥ (ك: سیائق).

المِسْوَقُ: حوشترێك ڕاوكەر خۆی لەپەنادا نەدیو بكا بۆ ئەوەی نێچیرەكەی نەیبینێ ٥ (ك: مَسَاوِق).

المِسْوَقَةُ: گۆچانی شوان كە ئاژەڵەكانی پێ دەئاژوێ ٥ (ك: مَسَاوِق).

**ساك سَوكاً وسواكاً**: بەهێواشی ڕۆیشت.

**ساك الشيءَ**: شتەکەی شێلا دەستی پێدا هێنا.

**ساك فَمَهُ وأسنانَهُ بالسواك**: دەمو ددانی بەسیواك پاك کردنەوە، سیواکی بەدەمو دانی دا هێناو برد.

**سَوَّكَه**: سیواکی کرد.

**اسْتاكَ**: دەمو ددانی بەسیواك پاك کردنەوە.

**تَسَاوَكَ**: بە ڕۆیشتنێکی نەرم ڕۆیشت.

**تساوكت الماشيَةُ**: ئاژەڵەکە ئەوەندە لاواز بووە کە دەڕوا لۆژە لۆژیەتی.

**تَسَوَّكَ**: بەمانا (استاك)دێ ٥ هەروا بەمانا (تساوك)دێ.

**السِّواك**: چیلکە دارێکە لەدرەختی ئەراك یان درەختی لەو جۆرە سەرێکی پرژ پرژ دەکرێو سیواکی پێ دەکرێ.

**المِسْوَاكُ**: بەمانا (السواك)دێ ٥ (ك: مساويك).

**سال فلان سُوالاً**: بڕوانە (سأل).

**سَوِلَ سَوَلاً وَسَوَلَةً**: نەرم بوو، دەگوترێ: (سَوِلَ البطنُ): گەدەی داچۆڕا ٥ (هو أسول وهي سولاء) ٥ (ك: سول).

**سَوَّلَ لە الشرَّ**: شەڕو هەرای لەلا خۆشەویست کردو هەڵی نا بۆ شەڕو هەرا، دەگوترێ: (سَوَّلَت لە نفسە كذا): نەفسو هەوا هەڵی نا بۆ ئەو کارە ٥ هەروا دەگوترێ: (سَوَّلَ لە الشيطان كذا): شەیتان چووە کەللەیەوەو ئەوکارەی پێ کرد ٥ (وهذا من تسويلات الشيطان): ئەو لەخشتە بردنەکانی شەیتانە.

**تَسَوَّلَ**: بەمانا (سَوِلَ)دێ ٥ پرسیاری کرد داوای کرد.

**السُّوَال**: بڕوانە مادەی (سأل).

**السُّولُ**: بڕوانە مادەی (سأل).

**السُّولار**: شلەمەنییەکە کڵبەستێنە زوو گڕ دەگرێ لە پیترۆڵ دەردەهێندرێ، کەشافەی لەسوتەمەنی دیزڵ کەمترە.

**السَّوْلَعُ**: بڕوانە مادەی (سَلَعَ).

**سام سَوْماً وسواماً**: بەرەو پێش ڕۆیشت بەویستی خۆی ٥ بەمەبەستی وەدەست هێنانی شتێك ڕۆیشت.

**سامت الماشيةُ**: ئاژەڵەکان بۆ خۆیان لەوەڕانو پێویستیان بەئالف نەبوو ٥ بەردەوام بوون لەسەر لەوەڕان.

**سام الطير على الشيء**: باڵندە بەدەوری شتەکەدا سوڕایەوە.

**سامت الإبلُ والريحُ وغيرها**: حوشترەکە یان بایەکە بەردەوام بوون بەخێرایی یان بەهێواشی گوزەری کرد.

**سـام الـشيئ:** بەشـتەکەوە لکـاو لێـی نەبووەوە.

**سـام الإبـلَ في المرعـى:** حوشـترەکەی بـەرەڵڵای پاوانەکـە کـردو وازی لـێ هێنا.

**سـامَ الإنـسانَ ذُلاً أو خـسْفاً:** زەلیلـیو نارەحـەتی بەسـەر ئادەمیزادەکـە دا ڕشت.

**سـامَ فلانـاً الأمـرَ:** کارەکـەی خـستە ئەستۆیو داوای لـێ کـرد ئـەنجامی بدا.

**سـامَ البـائعُ الـسِّلعةَ سَـوْماً وسُـواماً:** فرۆشـیارەکە کـاڵای ڕانوانـد بـۆ فرۆشتنو نرخەکەشی دیاریی کرد ٥ لەحەدیث دا هاتووە (لایسوم أحدکم علی سوم أخیه) بایەکێ لـەئێوە زەمو زەمکـاری بەسـەر براکـەی دا نـەکا ٥ دەگـوترێ (سِمـتُ فلانـاً سِـلْعَتِي): بەفلانکەسم گوت کاڵاکەم بەومنـدە لـێ دەکـرێ؟ ٥ هـەروا دەگـوترێ: (سُمْتُك بعيرك سيمة حَسَنة): نرخـی حوشترەکەتم باش بەرزکردەوە.

**سامَ الماشيةَ على الحوض:** وڵاخەکەی بـردە سەر حەوزەکە.

**أسـام الماشـيةَ:** وڵاخەکـەی لەلـەوەڕگا لەوەڕاند.

**أسام اليه ببصره:** چاوی پیسی تێ بڕیو بەچاو هەنگاوتی.

**سـاوَمَهُ مـساومة وسِـواماً:** مامەڵـەی لەگەڵ دا کرد بۆ کڕینو فرۆشتن.

**سـاوم البـائعُ بالـسِّلعة:** فرۆشـیارەکە نرخی کاڵاکەی بەرز کردەوە.

**سَـوَّمَ الماشِـيةَ:** ئاژەڵەکـەی لەلـەوەڕگا لەوەڕاند.

**سَوَّمَ الخيـلَ:** وڵاخـەکانی بەسوارەکانەوە ڕەوانەکردن ٥ ناردنی.

**سَوَّمَ فلاناً:** وازی لەفلانکەس هێنـا چـی دەکا بیکا.

**سَوَّمَ فلاناً في مالـه:** فلانکەسی لـەماڵو سامانی خـۆی دا دەسـەڵاتدار کـردو هەموو صەڵاحییەتێـکی دایە.

**سَوَّمَ على القوم:** پـەلاماری نەتەوەکـەی داو هێرشی لەناکاوی کردە سەریانو بارودۆخی شێواندن.

**سَوَّمَ الشيئَ:** شتەکەی نیشانەدار کرد.

**استامت الماشِيةُ:** بەمانا (سامت)دێ.

**اسـتام البـائع بالـسلعة وعليهـا:** فرۆشـــیارەکە نرخـــی کاڵاکـــەی بەرزکردەوە.

**استام المشتري من البائع بسلعته:** کڕیـار نرخـی کاڵاکەی بەفرۆشیار ڕانوانـد داوای لـێ کرد پێی بڵێ چەندە؟

**اسـتام فلانـاً الـسِّلعة وعليهـا:** داوای لەفلانکـەس کـرد نیـشانەی کاڵاکـەی بۆ ڕون بکاتەوە.

**تساوما السّلعة وفيها:** فرۆشیارو کڕیار دانو سانیان کرد دەربارەی کڕینو فرۆشتنی کاڵاکە ٥ فرۆشیار نرخێکی درکاندو کڕیاریش نرخێکی تری ڕاڕاند.

**تَسَوَّم فلان:** فلانکەس نیشانەیەکی بۆ خۆی دانا تا پێی بناسرێ.

**السَّائمة:** هەر ئاژەڵێك بەدەمی خۆی بلەوەڕێو پێویستی بەئالفو ئالیك نەبێ ٥ (ك: سوائم).

**السَّام:** مردن ٥ زێڕ ٥ توێژو ڕێڕەوی ئاڵتونو زیو لەبەردو لەکانەکان دا ٥ قالبە زێڕو زیو ٥ دار خەیزەران.

**السّامي:** هەرشتێك پاڵ بدرێ بۆلای (سام) کە یەکێکە لەکوڕەکانی حەزرەتی نوح (د.خ)، دەگوترێ: (جِنسٌ سامي): ڕەگەزی سامی نەژاد ٥ (لغة سامية): زمانێکی سامی.

**السُّوَمَةُ:** نیشانەو عەلامەت ٥ نرخو بەها، دەگوترێ: (إنه لغالي السمة): ئەوە گران بەهایە.

**السِّيمَةُ:** بەمانا (السُّومة) دێ.

**السِّما:** نیشانەو عەلامەت ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم﴾.

**السِّماءُ:** بەمانا (السِّما)دێ.

**السِّيمياءُ:** بەمانا (السِّيما)دێ.

**سَوِيَ الرجلُ سِوىً:** پیاوەکە کاروباری باش بوو، پیاوەکە ئیشی لەبار بوو.

**أسْوى:** ڕاوەستاوو بەردەوامو کار دروست بوو.

**أسْوى فلان:** فلانکەس ئیشی باشو ڕێكو پێك بەردەوام بوو ٥ لەنەخۆشی ڕزگاری بوو ٥ لەبیری چوو ٥ خراپەی کرد ٥ لەحیساب دا هەڵەی کردو ڕاستی کردەوە ٥ ڕیسوا بوو ٥ دایهێنا ٥ پەیدای کرد ٥ بەڵەك بوو، توشی نەخۆشی پێست بوو.

**أسْوى الشيئ:** شتەکەی ڕێك خستو تەختی کرد ٥ پاشگوێی خست.

**أسوى الشيئ بالشيئ:** شتەکەی وەکوو فلان شت لێ کردو ڕێك خستیە سەر شێوەی ئەو وەکوو ئەوی لێ کرد.

**ساواه:** هاوشانی ئەوی لێ کرد، خستیە ئاستی ئەو، دەگوترێ: (ساوى فلان قِرنَهُ وبه في العلم وغيره): فلانکەس لەبواری زانستو شتی تردا چووە ئاستی هاوشانەکەیو پێی گەیشتەوە.

**ساوى هذا بذاك:** ئەوەی بەرز کردەوە تا گەیاندییە ئاستی ئەو.

**ساوى بينهما:** ئەو دوانەی واڵێکرد لەیەك ئاست دابنو وەکوو یەك وابن.

سَوّى الشيءَ: شتەکەی ڕاست کردەوە ڕێکی خست ٥ ڕێكو پێکی کرد.
سَوّى بينهما: بەمانا (ساوى بينهما) دێ.
سَوّى الطعام: خواردنەکەی پێ گەیاند، دەگوترێ: (سُوِيَتْ عليه الأرضُ وبه) لەوخاکەدا بەهیلاك چوو فەوتا.
استوى: ڕاست بوو، مایەوە لەسەر ئەو حاڵە.
استوى الشيئان: ئەو دوو شتە هاوشانو چون یەك بوون.
استوى فلان: فلانکەس گەنجیەتی کامڵ بوو.
استوى الطعامُ: خواردنەکە پێگەیی.
استوت الأرضُ: زەوییەکـــە بـــوو بەسوتەمەڕۆ ڤاتو ڤڕی تێدا پەیدا بوو.
استوى به الأرضُ: لەوخاکەدا فەوتا.
استوى على كذا: چووە سەری، کۆنترۆڵی کرد ٥ جێ گیر بوو مایەوە ٥ بوو بەخاوەنیو دەستی بەسەردا ڕۆیی.
استوى على سرير الملك: دەسەڵاتی گرتە دەست.
استوى اليه: چو بۆلایو کردیە ئامانجی خۆی.
تَسَوّى: بۆ موطاوعەی (سَوّاه)دێ.
تَسَوّى به الأرض: لەوخاکە دا تێدا چوو فەوتا.
الإستواءُ (خط الإستواء): هێڵی کاکێشان ٥ بڕوانە مادەی (خطط).
السُوى: عـەدل ٥ مەبەستو ئامانج ٥ (وسُوى الشيء): ناوەڕاستی شت ٥ لەجیاتی شت ٥ غەیری شت.
السُّواءُ: بەمانا (السُّوى) دێ ٥ هاوشانو هاوڕێیـەتی ٥ تـەختو دەشـتایی، دەگوترێ: (مكان سـواء): شوێنێکی تەخت ٥ (وثـوب سـواء): کراسێکی ڕێكو پێكو درێـژو پانی گونجاوو لەبار ٥ (رجل سواء البطن): پیاوێکە ورگی لەگەڵ سنگی دا ڕێکەو ورگی دەرنەپەڕیوە ٥ (رجل سـواء القـدم): پیاوێـکە بـەرپێی تەختــەو پاژنــە پێو سنگە پێی لەگەڵ بەری پێی دا ڕاستو ڕێکە.
سَواء الجبل: تۆپەلاکی کێو، دوندی کێو ٥ (سـواء النهـار): نیـوەڕۆ، زوربـەی شـەو ٥ (ليلـة الـسُّواء): شـەوی چواردەی مانگی قەمەری ٥ کـەمانگ تێیـدا خـشتو کـامڵ دەبـێ ٥ (ك: أسواء) ٥ دەشگوترێ: (مـررت برجـل سـواء والعـدم): بـەلای پیاوێـك دا ڕۆیشتم بـونو نـەبوونی چون یـەك بوو.
السُّواء مـن الأرض: زەوییەکە گلەکەی

وەكوو لەب وابێ ٥ یان زەوی دەشتی نەرمەڵان.

**السَّوِيُّ**: دەشتایی‌و ڕێك ٥ مام ناوەندیی ٥ ئاسایی‌و عادەتی ٥ مام ناوەند.

**السَّوِيَّةَ**: ڕاست‌و مام ناوەند ٥ عەدل‌و ویژدان ٥ پارچە بەرگێکە دوگی حوشتر لەخۆ دەگرێ وەکوو ملەوانکەو شتی بازنەیی دەوران دەوری سەنامەکە دەدا ٥ جلە حوشتر ٥ (ك: سوايا).

**السِّيُّ**: هاوشان‌و بەرامبەر بۆ نێرو مێ یەك شێوە بەکاردێ ٥ دەگوترێ: (هو سِيُّكَ وهي سِيُّكَ وهما سِيّان) ٥ هەروا بۆ شوێنی دەشتایی‌و ساراو چۆڵەوانیش بەکاردێ.

**سِيَّما**: بەتایبەتی، دەگوترێ: (أتقن فلان العلوم العربية سِيَّما النحو): فلانکەس زانستە عەرەبییەکان فێربووە بەتایبەتی نەحو.

**المستوى**: (السطح المستوي): ئەو ڕووبەرەیە لەهەرشوێنێك دو خاڵ دابنێی هێڵی ناوەڕاستیان یان هێڵی پێوەلکاویان ڕاست بێ‌و خواریی تێدانەبێ.

**سَيَّأتِ الناقةُ**: حوشترەکە شیری داچۆڕاند شیری لەگوان دا چۆڕا.

**سَيَّأ فلان الناقة ونحوها**: فلانکەس شیری حوشترەکەی دۆشی ئەو شیرەی خەریکبوو لەگوانی دابچۆڕێ.

**إنسَيَأ اللبنُ مِن الضرع**: شیرەکە بێ دۆشین لەگوانی ئاژەڵەکە چۆڕایە خوار.

**تَسَيَّأت الناقةُ ونحوها**: بەمانا (سَيَّأت)دێ.

**تَسَيَّأت الأمور**: کارەکان تێکەڵ‌و پێکەڵ بوون.

**تَسَيَّأ فلان بِسَيْئٍ قليل**: فلانکەس شتێکی کەمی شیر پێدام.

**تَسَيَّأ فلان بحقي**: فلانکەس دوای ئینکاری کردن دانی بەمافی من دانا.

**السَّيْئُ**: شیری ئاژەڵ کەبەبێ دۆشین لەگوانی دابچۆڕێ.

**السَّيّاءُ**: کفن فرۆش.

**سابَ سَيْباً وسَيَبَاناً**: ڕۆیی بۆ کوێی ویست ملی ناو نەگەڕایەوە.

**ساب فلان في كلامه**: فلانکەس درێژەی بەقسەکردن داو دەمدرێژیی کرد.

**سَيَّبَهُ**: وازی لێ هێناو بەرەڵای کرد بۆ کوێ دەچێ بچێ.

**انْسابَ**: بەمانا (ساب)دێ ٥ (انساب نحو كذا): بۆلای ئەو گەڕایەوە.

**الإسَابَةُ**: لەبواری کیمیادا بریتییە لەو عەمەلییەتەی کە مادەی ڕەق دەکاتە شلەمەنی یان غاز.

**السَّائِبَةُ**: ئیهمال کراو بەرەڵاکراو ٥ لەسەردەمی پێش ئیسلامدا حوشتریان نەزری بتەکانیان دەکرد ئیتر ئەو حوشترە باری لێ نەدەنراو لەکوێ بیویستایە دەلەوەڕاو کەس لەهیچ شتێك نەیدەگێڕایەوە ٥ یان حوشترێك وەچەی پێبگاو زاوزێی لێ کەوتبێتەوە ئیتر ئەو جۆرە حوشترە بەرەڵا دەکراو باری لێ نەدەنراو کەس سواری نەدەبوو ٥ هەروا ناوە بۆ کۆیلەیەك ئازاد بکرێو وەلای بۆ ئازادکەرەکە نەبێ ٥ (ك: سَوائب وسُيَّب).

**السَّيَّابُ**: خورمای بەرسیلەو سەوز.

**السَّيَابَةُ**: تاکی (أَلسَّيَابُ) ٥ شەراب.

**السَّيْبُ**: هەرشتێك وازی لێ بهێنرێو بەرەڵا بکرێ ٥ عەطاو ٥ بەخشش ٥ چاکە ٥ زیادەو سوننەت ٥ موی توکی کلکی ئەسپ ٥ یاڵی ئەسپ ٥ ماڵو سامانی ژێر گڵ دراوی کۆن ٥ کانو کانزا ٥ سەوڵی کەشتییەوان ئەو دارەی بەلەمو کەشتی پێ لێ دەخورێ ٥ (ك: سُيوب).

**السِّيبُ**: دەراوی ئاو ٥ سێو، بۆیە دەڵێن: (سیبریە): بەمانا بۆنی سێوە ٥ (ك: سیوب).

**السُّيَّابُ**: بەمانا (السَّيَّابُ)دێ.

**السُّيُوبَةُ**: لەبواری کیمیادا سیفەتی جیسمی سائبە.

**سَيَّجَ كذا وعليه**: بەمانا (سَوَّجَ)دێ، دەگوترێ: (سَيَّجَ حائطه بالشوك أو الأسلاك الشائكة): دیوارەکەی تەل بەندکرد یان چقڵ ڕێژی کرد بۆئەوەی کەس نەتوانێ بیگاتێ یان خۆی لێوە هەڵبداتە خوار.

**السَّاجُ**: بڕوانە مادەی (سَوَجَ).

**السِّيَاجُ**: بڕوانە مادەی (سَوَجَ).

**السِّيجارُ**: جگەرەیەك گەڵاتوتنەکە ورد نەکرابێو لول درابێ.

**السِّيجارَةُ**: جگەرەیەك توتنەکەی ورد کرابێو لەپارچە کاغەزێکی تەنك پێچرابێ، ئامادەکرابێ بۆ کێشان.

**ساح الماءُ سَيْحاً وسيحاناً**: ئاوەکە جاری بوو، ڕەوان بوو.

**ساح فلان في الأرض سيحاً وسيحاناً**: فلانکەس بەناو زەوی دا گەڕاو گەشتو گوزاری کرد ٥ بەناو زەوی بەمەبەستی خوداپەرستیو بیرکردنەوەو دەرویشی بەناو وڵات دا گەڕا ٥ (ساحَ فلان): لەمزگەوت دا مایەوەو لێی دەرنەچوو ٥ هەمیشە بەڕۆژوو بوو.

**سَاحَ الظِلُّ**: سێبەرەکە لەخۆرئاواوە بەرەو خۆرهەڵات گەڕایەوە.

أَسَاحَ الفَرَسُ وغوه بننبه: ئەسپەکە کلکی خۆی شۆڕ کردەوە.
أَسَاحَ نهراً وغوه: جۆمەکەی ڕۆیاند ئاوی روبارەکەی ڕەوان کرد.
سَيَّحَ اكثر كلامه: زوربەی قسەکانی رازاندنەوە ٥ هێلکێشیو بۆ کردو پلانی بۆ دانا.
انْسَاحَ: بەرفراوان بوو، دەگوترێ: (انْسَاحَ البطن): گەدەی کشا، گەورە بوو لەبەر گەورەیی داچۆڕایە خوار.
انْسَاحَ الماءُ: ئاوەکە هەڵقولا ٥ (انْسَاحَ الثوبُ): قوماشەکە دادڕا، شەقار شەقار بوو.
انْسَاحَ الصُّبْحُ: ئاسۆ رون ڕوناك بوو روناکایی بەرەبەیان تاریکی دڕی.
السَّائِحُ: گەڕیدەو دەروێش ڕەوشت ٥ گەڕیدە بەناو زەوی دا بۆ بەدەستهێنانی زانیاریو لێکۆڵینەوە یان بۆ گەشتو گوزار ٥ ڕۆژوەوانی وەگری مزگەوت بوو و ئیعتیکافکەر.
السَّيْحُ: ئاوی ڕەوان بوو بەسەر روی زەوی دا، ئاوی جۆگا ٥ قوماشی خەت خەت ٥ (ك: أسياح).
السَّيَّاحُ: گەڕیدە؛ کەسێك ئیشی هەر گەڕان بێو هەمیشە لەگەشتو گوزاردا بێ.
المِسْيَاحُ: ئەوکەسەی بەمەبەستی فیتنە جۆیی‌و شەڕنانەوە بەناو وڵاتان دا بگەڕێ ٥ (ك: مسابيح).
ألمسيح: بڕوانە مادەی (مَسَحَ).
المُسَيَّحُ: کوڵلەی ڕەنگاو ڕەنگو خەتخەت ٥ گەرەکێوی.
ساخت قوائمُهُ سَيْخاً وسَيَخاناً: قاچی بەزەوی دا ڕۆچون.
ساخت الأرض بهم: زەوی قوتی دان.
أَسَاخَ الشيءَ: شتەکەی والیکرد بەزەوی دا ڕۆبچێ.
السِّيخُ: تایەفەو پێڕێکی ئاینین لەهیندوستان ٥ شیشی گۆشت برژاندن.
السِّيدُ: گورگ ٥ (ك: سِيدان وهي سِيدة).
السِّيدانة: بەمانا (السِّيدَةُ) دێ ٥ ئافرەتی ئازا ٥ (ك: سِيدان).
السِّيداقُ: درەختێکی قەد ئەستورە، توێکڵەکەی تیژو بیبەر ئاسایە، خۆڵی دارەسوتاوەکەی ڕێسراوی کەتانی پێ سپی دەکرێتەوە ٥ تاکەکەی (سَيْداقة).
سارَ سيراً: ڕۆیی.
سارَ الكلامُ أو المثل: قسەکە یان پەندەکە بەناو خەڵك دا بڵاو بۆوە ٥ لەپەندێك هاتووە (أسائِرَ اليومَ وقد زال الظهر): بەکەسێك دەگوترێ: کەلەدابینکردنی پێویستییەکەی ناهومێد بوو بێ.
سارَ الشيءَ وبه: شتەکەی ڕۆیاند.

**سارَ الدابَّةَ**: سواری ولاخەکە بوو.
**سارَ السنةَ أو السيرةَ**: شوێن سوننەت کەوت یان پەیرەوی ژینامەی پێغەمبەری کردو بەوشێوە هەڵس‌و کەوتی کرد.
**أسارَهُ**: وای لێ کرد بڕوا ◦ (أسارَ الدابَّةَ): ولاغەکەی بەرەڵلا کردە ناو لەوەڕگاو پاوان.
**سايَرَهُ**: لەگەڵیا ڕۆیی‌و هاوڕێیەتی کرد ◦ (فلان لاتُسايَرُ خَيْلاه): فلانکەس لەگەڵ ئەسپەکانی دا ڕۆیشتن ناکرێ واتە درۆزنەو بەکەڵکی هاوڕێیەتی نایە.
**سَيَّرَهُ**: بەمانا (أسارَهُ)دێ.
**سَيَّرَ فلاناً من بلد أو موطن**: فلانکەسی لەوشارو ولاتەدا کردە دەر.
**سَيَّرَ المَثَلَ أو الكلامَ**: پەندەکە یان وتەو ئاخاوتنەکەی بەناو خەڵک دا بلاو کردەوە.
**سَيَّرَ فلان سيرةً**: فلانکەس سەر گوزشتەی ڕابواردوانی گێڕایەوە.
**سَيَّرَ الثوبَ وغيره**: قوماشەکەی تیتۆڵ تیتۆڵ کرد.
**سَيَّرَت المرأةُ خِضابَها**: ئافرەتەکە خەتخەت خەنەی لەخۆی دا.
**إستار بسيرته أو بسُنَّتِهِ**: ڕێگاو پرۆگرامی ئەوی ڕەچاو کرد.
**تسايَرَ**: بەمانا (سار)دێ ◦ دەگوترێ: (تساير عن وجهه الغضب): ڕق‌و ڕەنگ ترشی لەدەم‌و چاوی ڕۆیی نەما، ڕوی ئاسایی بۆوە.
**تساير الرجلان**: ئەو دوو پیاوە پێکەوە ڕۆیشتن.
**تَسَيَّرَ جلده**: پێستی شەقار شەقار بوو ◦ (تَسَيَّرَ بسيرته): بەمانا (إستار)دێ.
**السَّائِرُ من الشيئ**: باقی ماندەی شت ◦ پەندی بلاوە بوو باو لەناو خەڵك دا ◦ (ك: سوائر).
**السَّيْرُ من الجلد**: سیرمە چەرم تیلمە چەرم ◦ (ك: سيور وأسيار).
**السِّيَراءُ**: جۆرە بوردەیەکە خەتی زەردی تێدان ◦ قوماشێکی خەتخەت‌و تیتۆڵ تیتۆڵە خەتی ئاوریشمی تێدان ◦ زێڕی خاڵص ◦ پێستی نووساو بەدەنکی بەروبومەوە.
**السِّيرَةُ**: ژینامە ◦ ڕێبازو پرۆگرام ◦ (ك: سِيَر).
**السُّيَرَةُ**: کەسێك زۆر بڕوا.
**السَّيَّار**: ڕۆیندەو خۆشڕۆ زۆر ڕۆ ◦ یەکێك لەئەستێرە گەڕۆکەکان.
**السَّيَّارة**: کاروان وقافلە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَجَاءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُوا وَارِدَهُمْ﴾ ◦ ئوتومبێل، ترومبێل کە بەبەنزین‌و گاز ئیش دەکاو خێرا دەڕوا لەسەر چوار پێچکەو زیاترو کەمتر.

أَلْمُسَيَّرُ: قوماشێکە تاڵتاڵی ئاوریشمی تێدایە وەکو تیلمەو هێڵ.

سَيِسَ الحَبُّ سَيَساً: دانەوێڵەکە مۆرانە لێی دا.

السِّيَسَاءُ: ڕیزە فەقەرەی پشت یان پێکەوە بەستەی فەقەرەکان ٥ دەشکوترێ: (حمله على سيساء الحقّ): هەڵی گرت بۆ سەر سنووری حەق‌و راستی ٥ (ك: سَيَاسِيّ).

السِّيسَاءَة: زەوی نەرمەڵان‌و گڵەوردە.

المِسْيَاط: بڕوانە مادەی (سَوَطَ).

سَيْطَرَ عليه: بەسەری دا زاڵ بوو.

ساعَ سَيْعاً وسُيُوعاً: فەوتا ٥ تێدا چوو.

ساعَ الماءُ أو الشَّرابُ: ئاوەکە یان تراویلکەکە لەسەر ڕووبەری زەوی بریسکەو شەپۆلی دان.

أَسَاعَهُ: وای لێ کرد بفەوتێ ٥ یان بدرەوشێتەوە.

سَيَّعَ الحائطَ: دیوارەکەی بەقوڕە سپی کاپێداکراوو شێلراو سواخ دا ٥ گڵ گەچی کرد ٥ سپیکاریی کرد.

سَيَّعَ الزِّقَ والسَّفِينةَ: کۆلینەکە یان کەشتییەکەی قیر کرد، قیری تێ هەڵسوو.

سَيَّعَ الجِلْدَ ونحوه: پێستەکە یان شتێکی تری لەو جۆرەی بەبەزو پیو چەور کرد ٥ هەنوی.

إِنْسَاعَ الماءُ أو الشَّرابُ: بەمانا (سَاعَ)دێ.

انساعَ الجَمَدُ: سەهۆڵەکە توایەوەو ڕەوان بوو.

تَسَيَّعَ: بەمانا (ساعَ)دێ.

تَسَيَّعَ البقلُ: گژوگیاکە کەرویشکەی کرد، ڕاژا، مۆنجی دایەوە.

الأَسْيَعُ: ئاوی شەپۆلاوی‌و تراویلکەی درەوشاوە.

السِّيَاعُ: درەختی لبان یان درەختی بان ٥ قوڕی بەکا شێلدراو بۆ سواخکردنی خانوو ٥ قیرو زفت ٥ پیو کە مەشکەو شتی وای پێ چەور دەکرێ.

السَّيَاع: قوڕی بەکا شێلدراو کەدیواری پێ سواخ دەکرێ ٥ قیرو زفت ٥ پیوو شتی لەو جۆرە ٥ ماڵەی لەدار دروستکراو بۆ سواخکردن.

السَّيْعُ: ئاوی ڕەوان بوو بەسەر زەوی دا.

السَّيَعَاءُ: بەشێك لەشەو.

السِّيْعَاءُ: بەمانا (السَّيَعَاءُ)دێ.

المِسْيَاعُ: بڕوانە (سَوَعَ).

أَلمِسْيَعَةُ: دارێکە لوس یان شتێکی تری لووس ماڵە ناسا یان وەکوو کەمچە قوڕەکەی پێ لووس‌و ڕێك دەکرێ ٥ (ك: مسايع).

ساغَ سَيْغاً: پاك‌و خاوێن بوو ٥ بەلەزەت بوو.

ساغَ الطعام والشراب في الحَلْق: بەخۆشی

خواردنەکە یان ئاوو شلەمەنیەکە لەقورِگ رۆ چووە خوار.

**ساغ الشیئُ**: شتەکە رِەوا بوو لەبار بوو گونجا ٥ (هو سائغ وسَیِّغ).

**ساغ الشرابَ والطعامَ**: شلەمەنیو خواردەمەنییەکەی قوت دا بەئاسانی لەقورگی ئەو دیوی کردنو تامو لەزەتی پێگەیی ٥ (أساغَهُ): وای لێ کرد رِەوابێ بگونجێ هیچ ئەرێو لەمپەرێکی لەبەردەم دا نەبێ.

**السَّیِّغُ**: دەگوترێ: (هذا سَیِّغُ هذا): ئەوە بەئەندازەی ئەوەیە لەسەر شێوەی ئەوە.

**سافَت یَدُهُ سَیْفاً**: دەستی قەڵشتن ٥ دەورو بەری نینۆکەکانی چڵکن بوون.

**سافَ فلاناً وغیره**: بەشمشێر لەفلانکەسی دا.

**سَیِفَتِ النخلَةُ**: درەختی خورماکە توێکڵی بنکی لقەکانی مابوون.

**أساف فلانٌ**: فلانکەس شمشێری لەشان کرد ٥ شمشێری کرِی.

**أساف الوالدان**: دایکو باوکەکە منداڵەکەیان مرد.

**أساف فلان**: فلانکەس هەژار کەوت.

**سَایَفَهُ**: شمشێر بازی لەگەڵ دا کرد ٥ بەشمشێر گاڵتەی لەگەڵ کرد.

**سَیَّفَهُ**: لەشتەکەدا وێنەی شمشێری دروست کرد.

**إسْتَافُوا**: شمشێر بازییان کرد ٥ بەشمشێر لێکیان دا ٥ تاویان دایە شمشێر.

**تَسَایَفُوا**: بەمانا (إستافوا)دێ.

**تَسَیَّفَهُ**: بەمانا (سافَهُ)دێ.

**السَّائف**: خاوەن شمشێر.

**السَّائِفَةُ**: زەوییەك بکەوێتە نێوان رەقانیو لمبەڵان ٥ (ك: سوائف).

**السَّیْف**: شمشێر؛ جۆرە چەکێکی ناسراوو دیارە ٥ بەمانا زمان لوسیو قسەزانی دێ ٥ دەگوترێ: (بین فکي فلان سیف صارم): لەنێوان دوو شەویلەی فلانکەس دا شمشێری برِندە هەیە مەبەست زمانلووسیو قسە زانییە ٥ ماسییەکە لەسەر شێوەی شمشێر ٥ (ك: سیوف وأسیاف) ٥ (سیف الغراب): جۆرە گوڵێکە لەپێری (ألسّوسنیات) کەڵاکانی باریکەڵەن وەکوو شمشێر وان.

**السَّیْفُ من السمك**: ئەو ماسییەیە کەلەسەر شێوەی شمشێرە ٥ کەناری دەریا ٥ کەناری شیوو روبار ٥ (سِیفُ القارة): ئەو بەشە دەشتاییەی کیشوەرێکە کە دەکەوێتە قەراخی

دەریا ٥ (ك: أسياف) ٥ ئەو توێكڵەی لكاوە بەبنكی لقە دار خورماوە.

اَلسَّيْفَانُ: پیاوی درێژی قەد بارێك وەكوو شمشێر ٥ (وهي سيفانة).

السِّيفَةُ: بڕوانە مادەی (سَوَفَ).

السَّيَّاف: خاوەن شمشێر ٥ شیرگەر، شمشێر دروستكەر ٥ كەسێك پاشاو فەرمانڕەوا ئەركی لەملدانی تاوانبارانی دەخاتە ئەستۆ ٥ (ك: سيَّافة).

السَّيَّافة: لەبواری سەربازی دا ئەو شەڕكەرو جەنگاوەرانەن كە بەشمشێر شەڕدەكەن.

اَلْمَسَائِفُ: ساڵانی قاتو قڕیو گرانی.

اَلْمُسَايَفَةُ: لێكدان بەشمشێر ٥ ڕاهێنان لەسەر بەكارهێنانی شمشێر.

اَلْمُسِيفُ: شمشێر لەشان.

اَلْمُسَيَّفُ من الثياب ونحوها: ئەو قوماشەی وێنەی شمشێری لەسەر دروست كرابێ ٥ ئەگەر بۆ دراو بەكارهات ئەو پارەو دراوێكە قەراخەكانی نەخشو زبری پێوەنەبێ لووسو پوس بێ.

اَلسِّيفُون: ئەو صندوقو خەزانە ئاوەیە كە پیسایی ناو ئاودەست رادەماڵێ.

سالَ سَيْلاً وسيلاناً ومسيلاً: ڕەوان بوو، جاری بوو ٥ سەر ڕێژی كرد ٥ دەگوترێ: (سالَت الأرضُ بما فيها): زەوی سەر ڕێژی كرد بەوەی تێیدا بوو.

سالت عليه الخيلُ وغيرها: لەهەموو لایەكەوە ئەسپ سوار پەیدا بوونو سەریان هەڵدا.

سال بهم السيلُ: لافاو رایدان ٥ (وجاش بنا البَحرُ): دەریا خستنیە ناو گێژاوی خۆیەوە واتە ئەوان كەوتنە كێشەو ناخۆشییەوە ئێمە كەوتینە گێژاوو چورتمی ناخۆشترەوە.

سالت الغُرَّةُ: سپیایی و پەڵەسپی ناوچەوانی ئەسپەكە پانو درێژ بۆوە تەنانەت تاسەر لوتی هات.

أَسَالَهُ: شلەمەنییەكەی ڕۆیاند، تواندیەوە ٥ دەگوترێ: (أَسَالَ المَعْدَنَ): كانزاكەی تواندەوە.

أَسَالَ حدَّ النصل: سەری تیرەكەی درێژو بارێك كرد.

أَسَالَ الغازَ: غازەكەی والێ كرد نەزۆر شل بێ نە توند بێ.

سَيَّلَهُ: بەمانا (أَسَالَهُ)دێ.

تسايَلَ: بەمانا (سَالَ)دێ.

تسايَلَ الكتائِبُ وغيرها: دەستەو تاقمو گروپەكان لەهەموو ڕویەكەوە راجمین.

السَّائِلُ: لەبواری كیمیا گەری دا

حاڵەتێکە لەحاڵەتەکانی مادە نەزۆر شلو غاز ئاسایە، نەرەقو توندە ٥ (ك: سوائل) ٥ دەگوترێ: (الزيت نوع من السوائل): زەیت جۆرێکە لەشلەمەنی.

**السائِلَة**: مێینەی (السَّائِل) ٥ دەگوترێ: (رأيتُ سائِلَةً من الناس): کۆمەڵە خەڵکێکم بینی لەهەموو لایەکەوە هەڵرژان ٥ (ك: سوائل).

**السَّيَّالُ**: درەختێکە چقڵاوی قەبارە مام ناوەندییە لەپێری (القرنية)یە توێکڵێکی سوری هەیە بۆ دەباغکردن بەکار دێ لقەکانی لوسو بێ گرێن، لە میصری سەرەوەو وڵاتی حەبەشەو وڵاتی عەرەب دەروێ ٥ درەختی (سەمر) ئەگەر بەرز بێ ٥ (شجر الخلاف): بەزاراوەی یەمەنی.

**السَّيْلُ**: لافاو ئاوی زۆری ڕەوان ٥ ئاوی باران ئەگەر کۆببێتەوەو بەگورجی بەسەر زەوی دا بڕوا ٥ (ك: سيول).

**السَّيَلان**: هەوکردنی ڕێڕەوی میز، کەناوە عیلمییەکەی (الجنوكُكيُّ)یە ٥ یەکێکە لە نەخۆشییەکانی کۆئەندامی زاوو زێ.

**السَّيْلان**: دەسکی شمشێرو کێرد ئەوەی دەستی تێوەردێ.

**المسيلُ**: ڕێڕەوی ئاوو فرمێسکو شتی وا ٥ (ك: مسايل ومُسُل ومسلان).

**السيماقور**: ئالایەکە لەسەر ڕێڕەوی شەمەندەفەرو شتی وا هەڵدەدرێ، بەلای سەرەوەی پارچەیەکی پێوەیە وەکوو باسکی ئادەمیزاد هەڵبەزو دابەز دەکا، ئەگەر سەری شۆڕ بۆوە ئامازەیە بۆ ئەوە کەرێگا چۆڵەو لەمپەر نییە.

**السِّيمِيَاءُ**: سیحرو جادو بازیی ٥ پەیداکردنی شتی خەیاڵیو پوچو بێ بناغەیە کە لەواقیع دا بوونی نییە.

**السِّيَةُ من القوس**: ئەملاو ئەولای کەوان کە کەوانەیی دەبنەوە.



**شـين**: پیتـی سیانزەهەمە لـە زنجیرەی پیتـەکانی هیجـا، لەناوەڕاسـتی زمـانو مەلاشـو دەردێ، یەکێکیـشە لـەپیتی (الشجرية).

**الـشُؤبُوبُ**: تـاوە بـاران، ڕێژنـە بـاران ٥ توندو بەهێزی لەهـەموو شتێـکدا ٥ (شَــؤْبُوبُ الـــشمس): ئەوپـەڕی گـەرمایی خـۆر. (شَـؤبوب الفَـرَس): بازهاویشتنی بـەگوڕی ئەسـپ ٥ (ك: شآبیب).

**شَـئِزَ المکـانُ شَـأزاً**: شـوێنە کـە بـەرزبوو، ڕەقەڵانو توند بوو.

**شَئِزَ فلانٌ**: فلانکەس ڕاڕاو گرنگ خواز بوو ٥ (هو شَئِزٌ).

**أشأزَهُ**: گرنگی پێـداو خستیە قەلـەقو دڵەڕاوکێوە.

**إشتَأزَ**: بێزرا، ڕۆیی، پێی ناخۆش بوو.

**شاشَــاَت النخلَــة وشأشَــأة وشِئـشاءً**: دارخورماکە قبـوڵی متوربـە کردنـی نەکرد.

**شَأشَـا فـلان بـالحُمُر والغـنم**: فلانکـەس گوێدرێـژو مـەڕو بزنــەکانی ڕادانو لـێی خوڕین بەوتەی (شَأشَأ).

**تَشَأشَأ القومُ**: خەڵکەکە بلاو بونەوە.

**تَشَأشَأ أمرُهُمْ**: کارەکەیان ئاسان بوو.

**شُئِفَت رِجْلُهُ**: قاچی کوانە ڕەقەی لێهات ٥ (هو مَشْؤوفٌ).

**شَئِفَتْ رِجلُهُ**: بەمانا (شُئِفَتْ)دێ.

**شَئِفَت الأصابِعُ**: دەوروبەری نینۆکەکانی چڵکنو شەقار شەقار بوو.

**شَئِفَ جِسْمُهُ**: جەستەی کوانە ڕەقەی لێهات ٥ (فَهُوَ شَئِفٌ).

**شَئِفَ فلاناً ولـه ومنـه شَـأفاً وشـأفَةً**: ڕقـی لەفلان بوو ڕەشبینی لەلا پەیدا بوو.

**إستَشأفَت القرحة**: برینەکەی پیس بوو، قوڵ بوو.

**شَــأفُ الجُــرْح**: پـیس بـوونی بـرینو داوەشانی بەجۆرێـك چاکبوونەوەی چاوەڕوان ناکرێ.

**الـشَأمَةُ**: کوانـە ڕەقەیەکـە شوێنەکەی زبــرەو بـــەداخکردن چارەســـەری دەکـــرێ ٥ ڕقو کینـــەو ڕەشـــبینی، دەگوترێ: (إستَأصَلَ اللهُ شَأفَتَهُ): خودا لەڕەگو ڕیشەوە دەری هێنا.

**شَـأمَهُمْ شَـأماً**: نەگبـەتی بـۆ هێنـان ٥ دەگوترێ: (شأم علیهم).

**شُئِمَ علیهم**: بوو بەنەگبەتی بۆیان ٥ (هـو مشؤوم علیهم) ٥ (ك: مشائم).

**أشأمَ**: چوو بۆ شام.

**شائَمَ بِهِ**: بەلای چەپی دا بردی.

**تَشائَمَ**: ڕەشبینی نواند.

**تَشائَمَ بِهِ**: بەلای چەپی دا بردی.

**تَشأمَ**: نیسبەتی دا بۆلای نەگبەتی ◦ بردی بۆلای چەپی.

**تَشأمَ بِهِ**: بەمانا (تشاءَمَ) دێ.

**الأشأمُ**: نەگبەت ◦ نەگبەتی هێن ◦ (ك: أشائم)، دەگوترێ: (أشأم كل إنسان بين لَحيَيْهِ): نەگبەتی هەموو ئادەمیزادێك بەهۆی زوبانیەوەیەتی.

**الشأمُ**: هەرێمی باکوری خۆرئاوای نیوە دورگەی عەرەب.

**الشُؤمُ**: شەڕو نەگبەتی.

**الشُؤمى**: مێینەی (الأشأم) ◦ پێچەوانەی مانای (اليُمنى)یە، دەگوترێ: (اليَدُ الشُؤمى).

**الشأمَةُ**: لای چەپ، دەگوترێ: (نظر يَمْنَةً وشامَةً).

**المَشأمَةُ**: نەگبەتی ◦ لای چەپ ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿هُمْ أصحَابُ المَشْأمَةِ﴾.

**المُتَشائِمُ**: ڕەشبین ◦ کەسێك گومانی خراپ بەژیان بەرێ.

**شَأنَ شأناً**: ئیشی بۆ پەیدا بوو ◦ (شَأنَ شَأنَ فلان): شوێن ڕێبازی فلان کەوت، بەڕێچکەی ئەودا ڕۆیشت.

**إشتَأنَ شَأنَهُ**: شوێن ڕێبازی ئەو کەوت.

**الشأنُ**: حاڵو وەزعو چۆنیەتی ◦ پلەو پایە، دەگوترێ: (رجل من ذوي الشأن): پیاوێکی خاوەن ڕێزو پلەو پایەیە ◦ بەڵاو چەرتەو تەنگانەو هەڵەو گیربوون ◦ بەڵاو کارەسات ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأنٌ يُغْنِيهِ﴾ ◦ هەروا بەمانا پێداویستییەك هاتووە ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا اسْتَأذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأنِهِمْ﴾ ◦ (ك: شئون).

**شؤون العين**: ڕێڕەوی فرمێسکی چاو.

**شؤون الطلبة**: کاروباری قوتابیان.

**شؤون العاملين**: کاروباری کرێکار.

**شأرت القوم شأواً**: پێش خەڵکەکە کەوتم.

**شاوَ الشيئُ فلاناً**: شتەکە فلانی توشی سەر سوڕمان کردو شۆکی لەلا پەیدا کرد ◦ خەمباری کرد.

**شاءاه**: پێشبڕکێی لەگەڵ دا کرد.

**تشاءى مابينهم**: نێوانیان دور بوو.

**تَشاءى القومُ**: خەڵکەکە پەرتەواز بوون.

**الشأوُ**: هەل و کەرەتو جار ◦ ماوەو مەبەست، دەگوترێ: (إنه لبعيد الشأو) ئەو ئامانجو هیوای دورو درێژی هەیە.

شباط: مانگی پێنجەمی ساڵی سوریانی‌و مانگی دووی زاینییە.
شَبَّ الغلامُ شباباً: کەوتە قۆناغی گەنجییەوە.
شَبَّتِ النار شبوباً: ئاگرەکە هەڵگیرسا ٥ کڵپەی کرد.
شَبَّ الفَرَسُ شِباباً وشَبوباً: ئەسپەکە نیشاتی پەیداکردو تەڕدەماخ بوو هەڵسایە سەر پاشوی دەستی بەرزدەکردەوە، سمکۆڵی دەکرد.
شَبَّ النار شبّاً: ئاگرەکەی هەڵگیرساند.
شبَّ الخِمارُ والشَّعْرُ لونَ المرأة: چارەکەو چارشێو روخساری ئافرەتەکەو رەنگی قژی جوان کرد.
شُبَّ له کذا: رێگای پێ درا، بۆی گونجا.
أشَبَّ الغلامُ: بەمانا (شَبَّ)دێ.
أشَبَّ فلانٌ: فلانکەس منداڵەکانی گەورەبون‌و گەیشتنە تەمەنی گەنجی.
أشَبَّ الحیوانُ: ئاژەڵەکە بەتەواوی کامڵ بوو گەیشتە ئەو پەڕی هەراشبونی.
أشَبَّ الله الصَّبِيَّ: پەروەردگار منداڵەکەی گەیاندە تەمەنی گەنجی.
أشَبَّ الفَرَسَ: ئەسپەکەی تاودا.
شَبَّبَ الشاعِرُ: شاعیرەکە یادی رۆژانی دڵداری‌و رابواردنی خۆی کردەوە.
شَبَّبَ بفلانة: شیعری دڵداری بەسەر فلانە ئافرەت دا هەڵگوت‌و وەصفی جوانی ئەوی کرد.
إسْتَشَبَّ علی ساقیە: خۆی ئامادەکرد بۆ هەڵسان‌و تینی دایە قاچەکانی ٥ گەنجەکانی هەڵبژارد بۆ برە کارێکی تایبەتی.
الشّابُّ: گەنج، کەسێك بگاتە تەمەنی بالغ بوون‌و تەڕو تازەیی گەنجی پێوە دیار بێ ٥ نەبوو بێتە پیاو ٥ (ك: شبان).
الشَّبَابُ: گەنجیەتی‌و تازە پێگەیشتویی.
شباب الشَّيْئِ: سەرەتای شت، دەگوترێ: (لقیته في شباب النهار): لەسەرەتای رۆژدا توشی فلان بووم ٥ مێباز، دەگوترێ: (محمد علي مدهوش أرق الناس شباباً): حەمە عەلی مەدهۆشی لەهەموو کەس مێباز تر بوو ٥ هەرشتێك بلێسەی پێ هەڵبکرێ.
الشَّبَبُ: ئاژەڵی گەنج، جوانو جوانەگا ٥ کاوڕ، کورو.
الشَّبُّ: گەنج ٥ کبریتی ئەلەمنیۆم‌و پۆتاسیۆم.
الشَّبَّةُ: کچی تازەپێگەیشتوو ٥ (ك: شبائب).
شَبَّةُ النار: بلێسەدانی ئاگرو هەڵگیرسانی.

الشُّبوب: ئەوەی ئاگری پێ هەڵگیرسێندرێ ٥ ئەوەی شت جوان‌و ڕازاوە بکا، دەگوترێ: (هذا شبوب لكذا) ٥ ئاژەڵی گەنج ٥ جوانو، جوانەگا، کاوڕ، گیسک‌و کورو.

الشَّبيبة: گەنجیەتی ٥ گەنج‌و لاو.

المشبوب (رجل مَشْبوب): پیاوێکی دڵ وریاو ڕەوشت بەرزو ئازایە ٥ ڕوخسار جوان‌و ڕەنگ درەوشاوەو تەڕ دەماخە ٥ (ك: مشابيب).

مشبوب الأظافر: نینۆك تیژە.

الشِّبِتُ: ڕوەکێکە لەپێری خێوەتییەو بەمەبەستی بۆنخۆشکردنی چێشت‌و خۆراك سود لەگەڵاکەی‌و لە تۆوەکەی وەردەگیرێ، بەکوردی پێی دەوترێ شویت.

شَبِثَ الشَّيْءَ وبالشَّيْءِ: بەشتەکەوە نووساو وەگری بوو پێوەی پابەند بوو.

شابَثَ الشَّيْءَ: دەستەو یەخەی شتەکە بوو تێك هاڵان.

تَشَبَّثَ بالشَّيْءِ: بەمانای (شَبِثَ) دێ.

تَشَبَّثَ برأيه: پابەندی ڕای خۆی بوو.

الشَّبَثُ: جۆرە مەگەزێکە بەئەندازەی جاڵجاڵۆکە گەورەیە، ڕەشە خەڵك پێی دەڵێن (أبو شَبث) ٥ (ك: أشباث وشِبثان).

الشَّبِثُ: (رَجُلٌ شَبِثٌ): پیاوێکە پابەندی ڕاوبۆچونی خۆیەتی.

الشُّبَثَةُ: ئەوکەسەی هەمیشە لەگەڵ هاوشانی خۆی دایەو لێی جیانابێتەوە.

شَبَحَ الشَّيْءُ: تارمایی شتەکە دەرکەوت.

شَبَحَ الجِلْدَ ونحوه: لەنێوان سینگ‌و گوڵمیخ دا ڕایکێشا بۆ ئەوەی لێی بدا، دەگوترێ: (شَبَحَ الشَّخصَ): کەسەکەی ڕاکێشا بۆ ئەوەی جەڵدەی لێ بدا ٥ یان وەکوو لەسێدارە دراو درێژی کردەوە.

شَبَحَ العودَ: دارەکەی ڕێکخست‌و پانی کرد ٥ دەستی هەڵبڕی‌و درێژی کردن بۆ پاڕانەوەو دوعاکردن.

شَبُحَ الرجلُ شباحةً: پیاوەکە باسکی ئەستور بون‌و نێوشانی پان بوون ٥ (فهو مشبوح الذراعين).

شُبِّحَ فلان: فلانکەس ئەوەندە پیر بوو چاوی کز بون بەجۆرێك یەك تارمایی بەدوو تارمایی ببینێ ٥ بۆ موبالەغەی (شَبَحَ)دێ زۆری ئیلحاح کرد لەداوا کردن دا.

شَبَّحَ الشَّيْءَ: شتەکەی لێك کێشایەوەو هەوڵی دا زیاتر پانی بکا ٥ توێکڵەکەی لێ کردەوە.

الشَّبَحُ: تارمایی کەلە دورەوە دەبیندرێ‌و نازانی چییە.

شَبَحَ الشَّيْءُ: سێبەرو خەیاڵی شت، دەگوترێ: (شبح الحرب) و(شبح الموت) ◦ (ك: أشباح وشبوح)، دەگوترێ: (هم أشباح بلا أرواح).

شَبَّرَ الثوبَ: قوماشەکەی بەبست پێوا.

شَبَرَ شَبْراً: تەڕ دەماخ بوو.

شَبَّرَ الثوبَ وغيره: قوماشەکە یان شتی تری بەبست پێوا.

تشابر الفريقان: دوو تاقمەکە لەشەڕدا لێك نزیك بونەوە.

الشِّبْرُ: بست؛ نێوانی سەری پەنجە گەورەو سەری پەنجە بچوکە.

المَشابِرُ: شوێنی بەکارهێنانی ئاو ◦ ئاوی نزمی ژێر زەوی کەئاوی تری دێتە سەر ◦ تاکەکەی (مَشْبَرُ وَمَشْبَرة).

الشُّبُورُ: کەرەنا، زورنا ◦ شتی دەنگ گەورە کەر.

الشُّبُورةُ: تەمو مژی بەیانی.

شَبْرَقَهُ شَبْرَقَةً وشِبْراقاً: بڕیو پارچە پارچەی کرد، دەگوترێ: (شَبْرَقَ الثَوبَ، وَشَبْرَقَ اللحمَ وشَبْرَقَ البازي الصيدَ).

شُبارِق: (ثوبٌ شُبارِق): قوماشێکی دادڕ دادڕی ونجڕ ونجڕکراوە.

لحم شُبارِق: گۆشتێکی جۆراو جۆر کولاوەو کراوە بەچەند جۆر چێشت.

الشَّبارِيقُ: (ثوب شَباريق): قوماشی دڕاو ونجڕ ونجڕکراو.

الشِّبْرِقَةُ: پارچە قوماش ◦ گزوگیای تەنكو پچکە پچکە.

الشُّبُوطُ: جۆرە ماسییەکە لەڕوباری دیجلەدا بەزۆری هەیە، ناوقەد ئەستورو کلك باریكو جەستە نەرمە ◦ (ك: شبابيط).

شَبِعَ شِبَعاً: گەدەی پڕ بوو لەخواردەمەنی، تێر بوو، دەگوترێ: (شَبِعَ طعاماً وَشَبِعَ من الطعام).

شَبِعَ الجِسْمُ: جەستەی پڕ بووە، قەڵەو بوو تێکسمڕا.

شَبِعَ من الأمر: لەکارەکە وەڕزبوو لێی بێزرا ◦ (فهو شبعان) ◦ (ك: شِباع وشَباعى) ◦ (وهي شَبْعى وشبعانة) ◦ (ك: شباع)، دەگوترێ: (هي شبعى الوِشاح): تێکسمڕاوو ورگ زلە.

أشْبَعَهُ: تێری کرد ◦ خواردنی دایە تا تێری خوارد.

أشْبَعَ الثوبَ: قوماشەکەی ڕەنگ کرد.

أشْبَعَ السائِلَ: شلەمەنییەکە چی تێدابوو توانرایەوە ◦ ئەوەی کرا بتوێتەوە توانرایەوە.

أشْبَعَ الشَّيْءَ: شتەکەی بەتێرو تەسەلی تەواو کرد، دەگوترێ: (أشْبَعَ

البحثَ): باسەكەی بەتێرو تەسەلی خستەڕو.

**تَشَبَّعَ**: خۆی بەتێرو تەسەل نیشان دا، دەگوترێ: (تَشَبَّعَ الماءُ بالمِلح): ئاوەكە تێر خوێ بوو.

**الشُّبَاعَةُ**: وردە نانو ئێسقانی كراوەو بەرماوەی خۆراك لەسەر سفرەو خوان دوای تێرلێخواردن.

**الشِّبَعُ من الطعام وغيره**: ئەو خۆراكەی دەبێتە هۆی تێربون.

**الشُّبْعَةُ من الطعام**: ژەمە نان ٥ (ك: شُبَعٌ).

**الشَّبِيعُ**: تێركراو.

**شَبِقَ الذكرُ من الحيوان شَبَقاً**: نێرەكە زەوقی لەمێیەكە بەهێز بوو.

**شَبَكَ الشَّيْئَ شَبْكاً**: شتەكە هەندێكی چووە ناو هەندێكی ترەوە.

**شَبَّكَ الشَّيْئَ**: شتەكە هەندێكی چەقییە هەندێكی، چونە ناو یەكترەوە، دەگوترێ: (شَبَّكَ أصابعهُ): پەنجەكانی تێك نان.

**شَبَّكَ**: زێدەڕۆیی مانای (شَبَكَ) دەگەیەنێ ٥ شتەكان زۆر چونە ناو یەكەوەو چەمبەرەیان بەست.

**تَشَابَكَ الشَّيْئَ**: بەمانا (شَبَكَ)دێ، دەگوترێ: (تَشَابَكَتِ الأمور): كارەكان چونە ناو یەكەوەو ئاڵۆزان.

**اشْتَبَكَ**: بەمانا (تشابك)دێ، دەگوترێ: (تَشَابَكَتْ الأمور): كارەكان تێكەڵاو بوون.

**اشْتَبَكَ الجيشان**: دوو سوپاكە تێكچڕژان پێك وەربوون.

**تَشَبَّكَ**: بەمانا (اِشْتَبَكَ)دێ.

**الشَّابِكَ**: (طريق شابِكٌ): ڕێگایەكی چەواشەو ئاڵۆزە ٥ (أمر شَابِكٌ): كارێكی تێكەڵو پێكەڵە.

**الشَّبَّاكُ**: ئەو كەسەی بەتۆڕو داو نێچیر دەگرێ.

**الشُّبَّاكُ**: پەنجەرە لەئاسنو دارو شتی وا ٥ تاینجەو ڕەشكە ٥ سێرمەو شتی وا كەوەكوو تاینجە بچەندرێو شتی تێدا باربكرێ ٥ (ك: شبابيك).

**الشَّبَكُ**: ددانی شانە ٥ كۆی (شَبَكَةً).

**الشُّبُكُ**: سەبیل؛ شتێكە توتنی تێدەكرێو ئاگری پێوە دەنرێ بۆ كێشان.

**الشَّبَكَة**: تۆڕی ڕاوچی ٥ بەزۆری لەبەنو بەنی نایلۆن دەچندرێ وەكوو تاینجەو ڕەشكە ٥ هەرشتێك بەیەكەوە پەیوەست بن، دەگوترێ: (شَبَكَة الكهرباء وشبكة المواصلات) ٥ (ك: شَبَكَ وشِباك).

**الشُّبْكَةُ**: دیاری زاوا بۆ بوك ٥ دیاری بۆ دەزگیران بۆ ئەوەی بزانرێ كە ئەو

کوڕو کچە دەبنە هاوسەری یەکتری.

الشُّبَکِیَّةُ: هەر چنراوێـك کونکون بێ وەکوو تاینچەو ڕەشکەو تۆڕی ماسی گرتن‌و ڕاوکردنی نێچیر.

الْمُشَبَّكُ: جۆرە حەلْواو شیرینییەکە لەسەر شێوەی بۆری تێـك خراوو لێك بەستراو دروست دەکرێ.

المِشْبَكُ: ئامێری چنینی شەبەکەو تۆڕو تاینچەو شتی وا ٥ جۆرە خشلێکە لە زێڕ یان لە ئەلْماس لەسەر سینگ‌و مەمك هەلْدەواسرێ یان لەسەر قایم دەکرێ ٥ (ك: مَشَابِك).

شَبَلَ الغلامُ شبولاً: منداڵەکە گەورە بوو، لەنازو نیعمەت دا پەروەردە بوو ٥ (فهو شابل).

أشبَلت اللَّبْوَةُ: دێڵە شێرەکە بێچوی بوو.

أشبَلَت المرأةُ علی أولادها: ئافرەتەکە بەسەر منداڵەکانیەوە دانیشت‌و دوای مردنی مێردەکەی شوی نەکردەوە خۆی کرد بە شێرەژن ٥ (فهي مُشبِلٌ).

الشِّبْلُ: بێچوە شێر ٥ (ك: أشبال).

شَبِمَ شَبَماً: سارد بوو ٥ هەستی بەساردی‌و برسیەتی کرد ٥ (فهو شَبِمٌ)، دەگوترێ: (ماء شَبِمٌ): ئاوێکی ساردە ٥ (غداة شَبِمٌ): بەیانیەکی ساردە ٥ (قلب شَبِمٌ): دلێکی ساردو کەم هەستە.

الشِّبَامُ: مەمك مژە؛ دارێکە یان نایلۆنێکە دەخرێتە دەمی منداڵەوە بۆ ئەوەی بخافڵێ‌و بیری شیرخواردنی نەمێنێ ٥ هەروا ناوە بۆ دەمبێن‌و ئەو دارەی دەخرێتە دەمی بێچوە ئاژەڵەوە تانەتوانێ شیری دایکی بخوا.

الشِّبَامَان: دو پەت‌و حەبلن لەملاو لەو لای دەسماڵ‌و کۆڵوانەو ڕۆب‌و شتی وا پێکەوە گرێ دەدرێن.

شَبَنَ الغلام شَبْناً: منداڵەکە گەورە بوو پێگەیی‌و خۆی داڕشت.

شَبَنَ الشَّیْئُ: شتەکە نزیك بۆوە ٥ (فهو شابن).

الشُّبِینُ: لەلای مەسیحییەکان بەو کەسە دەگوترێ کە هاوڕێیەتی بوك یان زاوا دەکا لەڕۆژانی گواستنەوەی بوك دا، بەکوردی خۆمان (بەربوك‌و برازاوا)یان پێ دەڵێن ٥ هەروا ناوە بۆ ئەوکەسەی بەفەرمانی قەشەی مەسیحی منداڵەکە دەخاتە ناوی مەعمودییەوە کە داب‌و نەریتێکی مەسیحیانە دەبێ قەشە ئایەتی تەنصیر بەسەر ئاوەکەدا بخوێنێ‌و منداڵەکەی پێ بشۆرێ ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (شبینة) ٥ (ك: شَبائِن وأشابِنة).

أَشْبَهَ الشَّيْءُ الشَّيْءَ: شتەکە لەشتەکە چوو.
شابَهَهُ: لەو چوو.
شَبَّهَ عليه الأمر: شتەکەی لێ تێکچوو نەیزانی کامەیەو لێی چەواشە بوو.
شَبَّهَ الشَّيْءَ بالشَّيْء: شتەکەی بەشتێکی تر شوبهاند ٥ لەشوێنی ئەو شتە شتێکی تری هاوشێوەی دانا چونکە لێك دەچوون.
شُبِّهَ عليه ولـه: لێی تێکچوو نەیزانی کامە کامەیە.
اِشتَبهَ في المسألة: گومانی لەڕاستی مەسەلەکەدا بۆ پەیدابوو.
تشابه الشَّيئان: ئەو دوشتە لێك چون بەجۆرێك چەند سەرنجیان بدەیتێ نازانی کامەیان کامەیەو لێك ناکرێنەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْبَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا﴾.
تشَبَّهَ بغيره: چاوی لەو کرد لاسایی کەسێکی تری کردەوە.
التشبيه: شوبهاندنو لێك چواندنی دوشت یا زیاتر بەیەکتر چونکە لەچەند دیاردەو ڕەوشتێك دا جۆرە هاوبەشییەکیان هەیە وەکوو شوبهاندنی پیاوی ئازا بەشێر یان شوبهاندنی ئافرەتی جوان بە گوڵ یان بەمانگو ئەستێرە ...هتد.
تشبيه المسجونين: وەرگرتنی پەنجە مۆری گیراوەکانو نووسینی شێوەو ڕوخساریان لەسەر کارتێکی تایبەتی بۆ دیاریکردنی کەسایەتییان.
الشَّبْهُ: هاوشێوە ٥ (ك: أشباه).
الشَّبَهُ: مسی زەرد ٥ (ك: أشباه).
الشُّبْهَةُ: لێتێك چونو لێشێوان ٥ لەشەرع دا بەشتێك دەگوترێ نەزانرێ ئاخۆ حەڵاڵە یان حەرامە، حەقە یان بەتاڵە.
الشَّبيهُ: هاو وێنەو هاوشێوە.
الْمُشابه: ئەمو مزاویو مانا بەزەحمەت زانراو، شتی وا کەم کەس لێی تێ بگەن ٥ دەقەکەی قورئان کە دەفەرموێ: ﴿مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ﴾ وشەی (متشابه) لەوشوێنەدا زۆر مانا هەڵدەگرێ.
الْمُشَابِهُ: بەمانا (الأشباه)ی دێتو کۆی (شَبَه) بەمانای هاو وێنە دێ.
الْمُشَبِّهة: پێڕێکی ئایینین خودا دەشوبهێنن بەشتی دروستکراو.
شَبا الشَّيْءُ شَبْواً: شتەکە بەرزبۆوە ٥ (شَبا الفرسُ): ئەسپەکە بۆوە بەجوانو.
شَبا وَجْهُهُ: دەموچاوی گەشاندەوەو دوای گرژیو مۆنی ڕوخساری ڕون بۆوە.

شَبا النارَ: ئاگری کردەوە.

أشْبی الـشَجَرُ: درەختەکـە درێـژ بـوو تێکهالا، تێکچڕژا.

أشبی علـی فـلان: بـەزەیی بـەفلان دا هاتەوەو یارمەتی دا.

أشـبی فـلان: فلانکـەس منداڵێـکی زیرەكو ئاقڵی بوو.

أشبی فلانـاً: رێـزی فلانکەسـی گـرتو قەدرزانی بەرامبەر نواند.

أشـــبی الأولادَ آبـــاهم: منداڵـــەکان چوونەوە سەر باوکیان لەو دەچن.

الشَّبا: قەوز ٥ تەرزە.

شَباه الشَّيْ: تیژایی قـەراخی شتەکە ٥ (شباة السیف): تیژایی دەمی شمشێر ٥ (شَبَاة العقرب): چزوی دوپشك.

شَـبْوَةُ: نـاوە بـۆ دوپـشك (اسـم غـیر منصرف).

جارية شَبْوَةٌ: کەنیزەکێکی گورجو گۆڵە.

شـتت الأشـیاءُ شـتاتاً: شـتەکان لێـك بلاوبون.

شتت الدیار بفلان: ولات فلانـی لـەخۆی دورخستەوە لەولات دورکەوتەوە.

شَتَّ بقلبه الوَجْدُ: عەشقو دڵداری سۆزی فلانـــی هەڵـــساندو بـــیرو بۆچـــونی شێواند.

شَتَّ الأشیاءُ: شتەکانی بـلاوە پـێ کـرد، دەگـوترێ: (أشَـــتَّ بـــي قـــومي): نەتەوەکـــەم ســـەریان لێتێـــك دام نازانم چۆن هەڵسو کەوت دەکەم.

شَتَّتَ الأشیاءَ: شتەکانی بلاوکردنەوە.

تَـشَتَّتُوا: بـلاو بونـەوەو هەریەکـەیان بەلایەکدا رۆیی.

الشَّتاتُ: جیاجیا ٥ (أمْرٌ شَـتَاتٌ): کـاری جیـا جیـا، دەگـوترێ: (جـاء القـومُ شتاتَ شَتَاتَ): خەڵکەکە بەجیا جیا هاتن.

الـشَتُّ: (أمـرٌ شَـتٌّ): کارێـکی پـەرتو بـلاوە ٥ (ك: أشـــتات)، دەگـــوترێ: (اذهبوا أشتاتاً): بەجیا جیا رۆیشتن.

شَتَّانَ: دەگوترێ: (شَتَّانَ ما بینهما): نێوان ئـەو شـتە زۆر جیاوازییـان گـەورەو بەرفراوانە.

الـــشُتُوتُ مـــن النـــاس: کۆمەڵـــگایەك دانیـــشتوانەکەی هەریەکـــەیان ســـەر بەتیرەو هۆزێك بنو لەتیرەو خێڵـی جیا جیا پێکهاتبن.

الشَّتیتُ: لێـك بلاوە بوو ٥ (ثغر شتیت): ددانی نێوان کەلو یـەك یـەك، واتـە ددان شاشو رێك.

أشیاءٌ شَتَّی: چەند شتێك لەجۆری جیا جیـــا ٥ قورئـــان دەفـــەرموێ: ﴿إِنَّ سَعْیَـــكُمْ لَـــشَتَّی﴾ هـەوڵو کۆشـشی ئێوە جۆراو جۆرو جیاجیان.

شَتَرَهُ شَتْراً: بڕیەوە، دڕاندی، دەگوترێ:

(شَتَر ثوبَهُ): قوماشەكەی دڕی ٥ (شتر فلاناً): فلاّنكەسی برینداركرد.

شَتَرَ الداءُ عَيْنَهُ: نەخۆشییەكە پێلّوی چاوی هەڵگێڕایەوە.

شَتِرَ شَتْراً: دوو لەت بوو، دەگوترێ: (شَتِرَ فلان): فلاّنكەس لێوی خواروی قەڵشی ٥ (هو أشتر وهي شتراء).

شَتَّرَ بفلان: ڕەخنەی لەفلاّنكەس گرتو جوێنی پێدا.

الشَّتِيُّ: عەیبدارو ڕەوشت ناشیرین.

الشُّتْرَةُ: بۆشایی نێوان پەنجەكان.

شَتَلَ الزرْعَ شَتْلاً: تۆومكەی لەشوێنێك چاند بۆئەوەی بڕوێنو دوایی شەتڵەكان هەڵكێشێو لەشوێنێكی تر بیان نێژێ.

الشَّتْلَةُ: ڕوەكی تازە ڕسكاوو سەوز بوو لەوشوێنەی لێی ڕواوە بگوێزرێتەوە بۆ شوێنێكی تر.

المَشْتَلُ: شەتڵگا ٥ شوێنی شەتڵ ٥ زەوییەك تۆوی لێ بچێندرێ دوای تێپەڕبوونی مانگێك یا زیاترو كەمتر شەتڵەكە هەڵبكێشرێو لەشوێنێكی تر بچەقێندرێتەوە.

شَتَمَهُ شتماً: جوێنی پێدا.

شَتُمَ شَتَامَةً: ڕوخسار ناشیرینو نەكڵەوەت بوو ٥ (فهو شتيم).

شاتَمَهُ: جوێنی پێدا.

الشَّتَّامُ والشُّتَّامَةُ: دەموچاو ناشیرینو بەدڕەوشت.

الشَّتِيمةُ: جوێن.

شَتَنَ الثوبَ شَتْناً: قوماشەكەی چنی ٥ (فهو شاتِن وشتون).

شَتَّانَ: بڕوانە (شَتَتَ).

شَتَا بالمكان شَتْواً: بە زستان لەوشوێنە مایەوە.

شَتَا الشِّتَاءُ: زستان سارد بوو.

شتا اليومُ: سەرماكەی توند كرد.

شتا السماءُ: ئاسمان بارانی باراند.

أشتى فلانٌ: فلاّنكەس كەوتە زستانەوە.

أشتى القومُ: خەڵكەكە تووشی برسیەتیو قاتو قڕی بوون.

شاتاه مشاتاةً وشتاءً: مامەڵەی لەگەڵ دا كرد لەماوەی زستان دا.

شاهره مشاهرة: لەماوەی مانگێك دا مامەڵەی لەگەڵ دا كرد.

شَتَّى بالمكان: بەمانا (شتا)دێ.

شتَّى الشيْءُ فلاناً: شتەكە بەشی زستانی فلاّنكەسی كرد.

الشِّتاءُ: زستان ٥ زومستان وەرزێكە لەوەرزەكانی ساڵ، لەسەرەتای بیستو دووی مانگی دوانزە دەست پێدەكاتو لەبیستو یەكی مانگی ئازاردا كۆتایی پێ دێ ٥ گرانیو قاتو قڕی.

**اَلشَّتْوَةُ**: زستان.

**الشَّتْوِيُّ**: بارانی زستان.

**الشَّتِيُّ**: بەمانا (الشَّتوِيّ)دێ.

**اَلْمَشْتَى**: شوێنێك زستانی تێدا بەسەر بەری ٥ وەرزی زستان.

**اَلْمَشْتَاةُ**: بەمانا (اَلْمَشْتَى)دێ ٥ زستان.

**شَثِنَتْ كَفُّهُ شَثَناً**: دەستی زبر بون ڕەقو ئەستور بون.

**الشَّثْنُ**: ئەستورو زبرو ڕەق، دەگوترێ: (رجـل شَـثْنُ الأصـابع): پیاوێـکە دەستو پەنجە زبرە.

**شَجَبَ فـلانٌ شـجوباً**: فلانکەس بـەهیلاك چوو، فەوتا ٥ غەمبار بوو.

**شَـجَبَ الغـرابُ شـجيباً**: قەلەڕەشـەکە قراندیو ناوانی خەڵکەکەی تێکدا.

**شَجَبَ فلانـاً شـجباً**: فلانکەسی بـەهیلاك برد.

**شَجَبَ الـصَّيْدَ**: تیرێـکی بەنێچیرەکەوەناو خپی کرد، جوڵەی لێ بڕی.

**شَجَبَ فلاناً**: فلانکەسی خەفەتبار کرد.

**شَـجِبَ الـشَّيْئُ فلانـاً**: شـتەکە فلانکەسی هەڵەو گێر کرد.

**شَـجَبَ الـشَّيْئَ**: شـتەکەی کـێش کـرد، دەگوترێ: (شَجَبَ اللِجامَ): ڕیشمەکەی توند کرد ٥ گرتیەوە.

**شَـجَبَ القـارورة بالـشِجاب**: بـە تۆپەوانـە دەمی گۆزەکەی گرت.

**شَـجَبَ الـرأيَ وللموقـفَ**: نـاڕەزایی خـۆی بەرامبەر ڕاو هەڵوێستەکە دەربڕی.

**شَـجِبَ شَـجْباً**: فـەوتا، تێـدا چـوو ٥ خەفەتبار بوو.

**أشْجَبَهُ**: غەمباری کرد.

**تشاجبت الامور**: کارەکان لێك ئاڵۆزان و چەواشە بوون.

**اَلـشَّاجِبُ**: زۆر بڵـێو چـەقە چـەناو ٥ قەلەڕەشـی نەگبـەت کـە دەقڕێنـێو شوم بڵاو دەکاتەوە.

**الـشِّجابُ**: عەلاگـەی جـل هەڵواسـین ٥ سەدادە.

**اَلشَّجَبُ**: پێداویستیو غەمو خەفـەت ٥ (ك: شجوب).

**الـشَّجَبُ**: ناڕەحـەتیو ئـازارو لـەش داهێـزان کەبـەهۆی نەخۆشـییەوە توشـی ئـادەمیزاد دەبـێ، دەگـوترێ: (امرأة شـجوب): ئافرەتێـکە توشـی خەمو ناخۆشی بووە بـەهۆی ئـەوەی دڵی بەکوڕێکەوە یە ٥ (ك: شُجُبٌ).

**اَلْمِـشْجَبُ**: عەلاگـەو سـینگو شـتی وا کەجلی پێدا بکرێ ٥ (ك: مَشاجب).

**شَجَّهُ شجّاً**: سەری شکاند، برینی لەدەمو چاوی کرد، دەگـوترێ: (شَـجَّ رأسَـهُ، شَجَّهُ في رأسه أو وجهه).

**شَـجَّت الـسفينة البحـرَ**: کەشـتییەکە ئاوەکەی دڕدا، شەقی کرد.

شَجَّ الشرابَ بالماء: شەرابەکەی تێکەڵی ئاو کرد ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان يَشُجُّ بيد وياسو بأخرى): فڵان بەدەستێکی بریندار دەکا بەوەکەی تری دەرمانی دەکا، ئەمە پەندەو بەکەسێک دەگوترێ خراپەو چاکە بکا.

شَجَّ شَجَجاً: شوێنەواری برین بەروخسارییەوە ماوە ٥ (فهو أشجُّ وهي شَجَّاءُ). (ك: شَجُّ).

شاجَّهُ شِجاجاً: یەکتریان بریندار کرد.

الشَّجَجُ: شوێنەواری برین لەناو چاوان دا ٥ یان لەشوێنی تردا.

الشَّجَّةُ: برین لەسەر یان لەدەمو چاو یان لەناو چاوان ٥ (ك: شِجَاجٌ).

الشَّجِيجُ: بریندار کراو، سەرشکاو، روخسار بریندار کراو.

شَجَرَ الأمرُ بينهم شُجُوراً: کارەکە لەنێوانیان دا ئاڵۆز بوو، کێشەیان تێکەوت، بوو بە مقۆ مقۆیان.

شَجَرَ الشَّجَرَ والنبات: لقە شۆڕ بۆوەی درەختو روەکەکەی بەرز کردەوە.

شَجَرَ الشَّيْءَ: شتەکەی بەستەوە ٥ شتەکەی خستە سەر عەلاگەکەو پێیدا هەڵواسی.

شَجَرَ فلاناً عن الأمر: فڵانکەسی لەکارەکە لادا، نەیهێشت بیکا.

أشجرت الأرضُ: زەوییەکە درەختی زۆر بوو.

شاجَرَهُ: کێشەی لەگەڵدا کرد.

شَجُرَ النباتُ: روەکەکە بوو بەدرەخت.

شَجَّرَ الأرْضَ: درەختی لەزەوییەکەدا رواند.

شَجَّرَ النسب: بنەچەو پەلو پۆی خێزانو هۆزەکەی رونکردەوەو لەشێوەی درەخت دا وێنەی کرد.

اشْتَجَرَ الشَّيْءُ: شتەکە هەندێکی چووە ناو هەندێکیەوەو تێکچرژانە دەگوترێ: (إشْتَجَرَت الأصابعُ): پەنجەکان چونە ناویەکەوە.

اشتَجَرَت الرِماحُ: شمشێرەکان تێک رژان.

اشتجر القومُ: خەڵکەکە کێشەیان تێکەوت.

اشتَجَرَ فلان: فڵانکەس دەستی خستە بن چەناگەیو قورسایی خستە سەر ئەنیشکی.

تشاجر الشَّيْءُ: شتەکە هەندێکی چووە ناو هەندێکیەوە، دەگوترێ: (تشاجرت الرِماحُ): رمبەکان تێکرژان.

تشاجر القومُ: خەڵکەکە کەوتنە کێشەو نیزاعەوە.

الشِّجَارُ: کەژاوەی بچوک؛ دارێکە لەپاش دەرگاوە وەکوو کێلونو

پاشکۆڵ دەرگاکەی پێ قایم دەکرێ ٥ دارێـــکە دەخرێتـــە دەمـــی بێـــچووە ئاژەڵـــەوە بـــۆ ئـــەوەی شـــیری پـــێ نەخورێ.

الـشَّجْرُ: کـاری سـەر بەگێـچەڵو کێـشە ئـامێز ٥ بۆشـایی نـاو دەم نێـوان مەلاشوو پانـایی زمـان ٥ چـەناگە ٥ (ك: شُجُور وأشجار).

الـشَّجَرُ: درەخـت؛ ڕووەکێـکە یـەك قـەدی ڕەقـی هـەبێ، جـاری واش دەبـێ بـە ڕووەکێـــك دەگـــوترێ کـــە ڕاســـت نەبێتـەوەو بەڵـکوو بەسـەر زەوی دا پـان بێتـەوە وەکـوو ڕووەکـی کاڵـەك‌و ترۆزی‌و کولەکە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَنبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ﴾ ئەوەتا ڕووەکـی کولەکـە بـە درەخـت نـاوی بـردووە، وەلـێ زانایـانی ڕووەك ناسـی وشەی (شـجر) بـەدرەختی بەتەمـەنی یـەك قـەدو قـەد ڕەق‌و ڕوت دەڵـێن ٥ تاکەکەی (شجرة) ٥ دەشـگوترێ: (هـو مـن شـجرة طيبـة): ئـەو لەبنەماڵـەو خێزانێـکی ڕەسەن‌و وەجاخزادەیە.

شَجَرَةُ النسب: ڕونکردنەوەو وێنەکردنی بنەماڵەو لق‌و پۆپی خێـزان‌و هۆزو تایەفـە لەسـەر شـێوەی لـق‌و پـرژی درەخت کەلـەباپیرە گـەورەوە دەست پێـــدەکاو وەچـــەو نـــەوە دیـــاری دەکرێن.

الشَّجْراءُ: درەختی تێکچرژاوی پڕو چڕ ٥ زەوی درەختاوی چڕو پڕ.

الـــشَّجْرِيُّ: پیتـــی شـــەجەری کـــە (ش.ض.ج.ي)ە.

الشَّجِيرُ: دەگوترێ: (واد شـجير) شیوی پـڕدارو درەخـت ٥ (أرض شَـجِيرٌ): زەوی پڕ درەخت.

الشَّواجِرُ: بەربەست‌و لەمپەڕ، دەگوترێ: (قـــد شـــجرتني عنـــه الـــشواجر): بەربەسـت‌و لەمپـەڕ منیـان لەوشـتە گێڕایـەوە ٥ (رمـاح شـواجِر): ڕمـی تێك ڕژاوو تێکەوە بوو.

الْمُـشَجَّرُ: هەرشتێـك وێنـەی درەختـی تێدا بێ چ کاغەز بێ یان قوماش بێ یان هەرشتێکی تر بێ.

الْمَـشْجَرُ: شـوێنی روانـدنی درەخـت، شوێنێـــك درەختـــی لـــێ ڕوابـــێ ٥ هەرپانتاییـەك درەخـت داپۆشـیبێ کەم یا زۆر ٥ (ك: مَشَاجِر).

الْمَشْجَرَةُ: بەمانا (الْمَشْجَرُ) دێ.

الْمِشْجَرُ: عەلاگەی جل پێدا هەڵواسین.

شَـــجُعَ شَـجَاعَةً: ئـازاو ورە بـەرزو چـاو نـەترس بـوو ٥ (فهـو شـجيع) ٥ (ك: شُجَعاءُ وَشِجَاع) ٥ (وهي شَجِيعَةٌ) ٥ (ك: شَجَائِعُ).

شَـــاجَعَهُ: پێـشبڕکێ لەگـەڵ دا کـرد لەئازایەتی دا.

**تَشَجَّعَ**: وره بەرز بوو ٥ وای خۆنیشان دا ئازایەو خۆی ئازا کرد.

**الأَشْجَعُ**: تاکی (الأَشاجِعُ)ە ٥ ناوه بۆ دەمارەکانی پشتی دەست.

**الشُجَاعُ**: ئازاو چاونەترس ٥ (ك: شُجعَان وشِجعَةٌ) ٥ ماری گەورە ٥ (ك: شُجعان).

**الشَجِيعُ**: (رجل شجيع) پیاوێکی ئازاو بەجەرگ ٥ (وهي شجيعة) ٥ (ك: شَجائع وشجاع).

**شَجَنَت الحَمَامَةُ شُجوناً**: کۆترەکە خوێندی ٥ ئالاندی.

**شَجَنَ الأمرَ فلاناً شَجْناً**: کارەکە فلانکەسی هەڵەو گیرکرد، خەفەتباری کرد.

**شَجِنَ شَجْناً**: غەمبار بوو ٥ (فهو شجن).

**أَشْجَنَ الكرمُ**: دار مێوەکە تولەکانی تێك هالان.

**أشجَنَ الأمر فلاناً**: کارەکە فلانکەسی غەمبار کرد.

**تَشَجَّنَ**: خەفەتبار بوو، یادی رابردوی کردەوەو کوڵی گریانی هەڵسا.

**تَشَجَّنَ الشجرُ**: درەختەکە تێك چرژا چرو پڕ بوو.

**الشَّاجِنُ**: شیوو دۆڵی پڕ دارو درەخت ٥ رێگای ناو شیو ٥ (ك: شواجِن).

**الشَّجَنُ**: لق و پۆپی تێك چرژاو لێك هالاو ٥ لایەن و کون و کەلەبەر لەهەر شتێك بێ، دەگوترێ: (الحديث ذو شجون): قسەو باسی جۆرو شێوازو نهێنی و ئاشکرای هەیە ٥ هەروا بەمانا غەم و خەفەت دێ ٥ پێداویستی کات گرو هەڵەو گیر کەر ٥ (ك: أشجان وشجون).

**الشُّجْنَةُ**: لق و پۆپی تێکهالاوو تێکچرژاو ٥ درەختی چرو پڕ ٥ کون و کەلەبەری هەموو شتێك.

**شَجَاهُ الأمرُ شَجْواً**: خەمباری کرد.

**شجا الحديثُ ولحوه فلاناً**: شیعرەکە یا چیرۆکەکە فلانی خستە هەڵپەڕین و سەما.

**شَجَاه تذكّرُ الإلف**: یادی هاوڕێ و دۆستەو خۆشەویست خستیە سەر شەوق و یادەوەری و کوڵی گریانی هەڵساند.

**شَجِيَ شجاً**: پاروی لەقورگ گیرا ٥ کوڵی گریان لەقورگی گیرا ٥ دەگوترێ: (شجي بالهمّ): خەم و خەفەت دایگرت و هیچ رێگا چارەیەکی نەدۆزیەوە دەرمەتانی نەبوو ٥ (شَجِيَ بقِرْنِهِ): هاوشانەکەی بەسەری دا زاڵ بوو ٥ هەروا وشەی (شَجِيَ): بەمانا گرنگی دان بەشت و غەمبار بوونە ٥ بیری رابردوی کردەوەو دڵی گەرم بوو، گریا ٥ (فهو شَجٍ وهي شَجِية).

**أشجاه**: بەمانا (شجاه)دێ ٥ بەسەری دا

زاڵ بوو، ژێر باری کرد.

**أشجاه بكذا:** بەوشتە قورگی گیرا.

**الشَّجا:** شتێک لەقورگ بگیرێ وەکوو ئێسکو شتی وا.

**الشَّجْوُ:** غەمو خەفەت ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (بكى فلان شَجْوَهُ): فلانکەس گریا غەمو خەفەتی خۆی بەبادا.

**الشَّجِيُّ:** کەسێک غەمو نارەحەتی کوڵی گریانی هەڵسێنێ ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (ويلٌ للشجيّ من الخلي): هاوار بۆ عاشق لەدەست دۆستەکەی.

**شَحَبَ جِسْمُهُ شُحُوباً:** جەستەی گۆڕاو کزو لاواز بوو.

**شَحَبَ اللون:** ڕەنگی گۆڕا ٥ (فهو شاحِب).

**شَحَثَ:** پرسیاری کردو زۆر کرۆزایەوە ئیلحاحی کرد.

**الشَّحَّاثُ:** سواڵکەری درێژە دادڕو ئیلحاح کەر.

**شَحَجَ البغلُ والحمار شَحِيجاً:** هێسترەکە یان کەرەکە لوشکی کرد، حنکە حنکی کرد، دەگوترێ: (شَحَجَ الغرابُ): قەلە ڕەشەکە قڕاندی ٥ (فهو شاحِجٌ وشحاج).

**تَشَحَّجَ صوته:** دەنگی گڕ بوو، گڕیی تێدا دەرکەوت.

**الشاحِجُ:** هێسترو گوێدرێژ.

**شَحَّ الماءُ ونحوه:** ئاوەکە یان شتی تر کەم بوو بەناخۆشی دەست دەکەوت.

**شَحَّ الزِّنادُ:** شقارتە یان بەردو ئەستێیەکە ئاگری نەکردەوە.

**شَحَّ فلان بالشيئ:** فلانکەس دەست قوچاوو بەخیل بوو.

**شَحَّ عليه:** سوور بوو لەسەری ٥ (فهو شحيح وشَحَاحٌ).

**شاحَّ فلاناً:** کێشەی لەگەڵ فلانکەس نایەوەو بەڵگەو بیانووی لێ دۆزیەوە، زانایان دەفەرموون: (لامُشَاحَّة في الإصطلاح): کێشەو نیزاع لە زاراوە دا نییە.

**تَشَاحّوا في الأمر وعليه:** پێشبڕکێیان بۆ ئیشەکە کرد.

**تَشَاحَّ الخَصْمان:** دوو کێبڕکێکەرەکان هەریەکەیان لەلای خۆیەوە سور بوو لەسەر سەرکەوتنی خۆیو ژێر خستنی بەرامبەرەکەی.

**الشُّحُّ:** ڕژدیو چروکی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأُحْضِرَتِ الأَنفُسُ الشُّحَّ﴾.

**الشَّحَّةُ:** (نفس شَحَّةٌ): دەروونێکی زۆر ڕژدو چروک.

**الشَّحِيحُ:** بەخیلو چروک ٥ (ك: شِحاح وأشِحَّة) ٥ قورئان دەفەرموێ:

﴿سَلَقُوكُم بِأَلسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى الْخَيْرِ﴾ ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (شحيحة) ٥ (ك: شَحائِح) ٥ (إبل شَحائح): حوشتری کەم شیر.

**شَحَذَ السَّيفَ ونحوه شَحْذاً**: نوکی شمشێرەکەی تیژ کرد، دەگوترێ: (السيف شحيذ ومشحوذ)، هەروا دەگوترێ: (شَحَذَ ذِهْنَهُ): زەینی خۆی مشتو ماڵ کرد ٥ (شَحَذَ الناسَ): بەپاڕانەوەی زۆرو بەئیلحاحەوە داوای لەخەڵك کرد ٥ دەق بەمانای (شَحَثَ) دێ.

**أَشْحَذَ السَّيفَ ونحوه**: بەمانا (شَحَذَ)دێ.

**الشَّحَّاذُ**: سواڵکەری نوزە درێژو ویرە ویرکەر.

**المِشْحَذُ**: هەسانو کارتیخو شتی وا کە تیغی پێ تیژ بکرێ ٥ (ك: مَشاحِذ).

**المَشْحَذَةُ**: دەگوترێ: (هذا الكلام مَشْحَذَةٌ للفهم) ئەم قسەیە ڕێخۆشکەرەو داخوازە بۆ تێگەیشتن.

**الشَّحْرُ**: ئاوە وەی شیوو دۆڵ ٥ ڕێڕەوی ئاو.

**الشُّحْرُورُ**: باڵندەیەکە دەخوێنێو دەنگخۆشە لە پێری (الشحروريات)٥ نێرەکەی ڕەشە، مێینەکەی لای سەری سەوزەیەو گەنم ڕەنگە سنگی مەیلەو سورە ٥ دەگیرێو دەخرێتە قەفەسەوە بۆ خوێندن.

**شَحَطَ المكانُ شُحُوطاً**: شوێنەکە دوور بوو.

**شَحَطَ في المساومة**: زێدە ڕۆیی کرد لەمامەڵەو چەلەحانێ داو لەسنووری تێپەڕاند.

**شَحَطَت الناقةُ**: حوشترەکە نەخۆشییەکی لەسنگ دا دروست بوو کوشندەو قەڵاچۆکەرە.

**شَحَطَت الآلةُ**: ئامێرەکە سوتەمەنییەکەی کەمی کرد خەریکە لەکاربکەوێ.

**شَحَطَ القتيل في الدَّمِ**: کوژراوەکە لەخوێنی خۆیدا گەوزی.

**شَحَطَ فلاناً شَحْطاً**: لەراکردن دا پێش فلانکەس کەوت.

**شَحَطَ الكَرْمَةَ وغيرها**: تولە مێوە تەڕەکانی خستنە سەر کەپرو داری ڕاهێڵراو.

**شَحَطَ الإناءَ**: قاپەکەی پڕ کرد.

**شَحَطَ الشرابَ**: شەرابەکەی تێکەڵ بەئاو کرد بۆ ئەوەی هەندێ کەسکونی نەمێنێو رون بێتەوەو خواردنەوەی ئاسان بێ.

**شَحَطَ اللَّبَنَ**: زۆری ئاو لەشیرەکە کرد.

**أَشْحَطَهُ**: دوری خستەوە.

**شَحَّطَهُ في دمه وبدمه**: وای لێ کرد لەخوێناوی خۆیدا بگەوزێ.

**الشَّحْطُ**: ئەمو دارە ڕاهێڵراوەیە کە

تولەمێوی دەخرێنە سەر بۆ ئەوەی شۆڕنەبنەوە.

**الشَّحْطَةُ**: شوێنەواری چرنوكو ڕنینی پێست.

**الشَّوْحَطُ**: جۆرە درەختێكە لەكێوەكانی (السَّرَاةُ) هەیە، تیری كەوانی لێ دروست دەكرێ، گەڵاكەی تەنكو درێژەو بەرەكەی وەكوو عەنبەی درێژ وایەو دەخورێ.

**شَحَمَ الطعامَ والخُبْزَ شَحْماً**: پیوی كردە ناو خواردنەكەوە.

**شَحَمَ القومُ**: بەزو پیوی دەرخواردی قەومەكە دا.

**شَحِمَ شَحَماً**: قەڵەو بوو، خۆی دارشت.

**شَحِمَ العِنَبُ**: ترێیەكە ناوی كەمو توێكڵی ئەستور بوو.

**شَحِمَت الرُّمّانَةُ**: هەنارەكە پەردەی نێوان دەنكەكانی ئەستور بوو.

**شَحِمَ الى الشحم**: حەزی لەپیو بوو.

**أشْحَمَ**: بەزو پیوی زۆر بوو.

**أشْحَمَ القومَ**: بەمانا (شَحَمَهُمْ) دێ.

**شَحَّمَ**: موبالەغەی (شَحَمَ)یە.

**شَحَّمَ الآلَةَ**: ئامێرەكەی بەبەزو پیو چەور كرد، نەرمی كرد.

**الشَّحْمُ**: بەزو پیو لەجەستەی ئادەمیزادو ئاژەڵ دا، مادەیەكی سپی چەورە لەگەڵ گۆشت دایەو بەجیاش لەجەستەدا كۆدەبێتەوە وەكوو دووگی مەڕو حوشتر، لەشتی تریش دا بەهۆی تەكنۆلۆژیاوە دەردەهێندرێ.

**الشَّحْمَةُ**: پارچە بەز ٥ (شَحْمَة العین): گلێنەی چاو ئەو شوێنەی ڕەشاییو سپیایی چاو بەیەك دەگەنو كۆدەبنەوە ٥ (شَحْمَة الأذن): نەرمایی گوێچكە؛ ئەوشوێنەی كون دەكرێو گوارەی پێدا هەڵدەواسرێ ٥ (شَحْمَة الرمانة): ئەو پەردەی نێوان دەنكە هەنارەكانە.

**الشَّحِيمُ**: گیاندارێك بەزو پیوی زۆربێ، دەگوترێ: (رجل شحیم لحیم): پیاوێكی قەڵەوو گۆشتنە.

**شَحَنَ السفینة ونحوها شحناً**: كەشتییەكە یا بارهەڵگرەكەی باركرد، پڕی كرد لەكاڵا، دەگوترێ: (شَحَنَ البلدَ بالخیل): وڵاتەكەی پڕكرد لەئەسپ.

**شَحَنَ فلاناً**: فلانكەسی دوورخستەوە، دەری كرد.

**شَحِنَ علیه شَحْناً**: ڕقی لێ هەڵسا.

**أشْحَنَ**: دەگوترێ: (أشْحَنَ لە بسهم): خۆی بۆ ئامادە كرد تیری پێوە بنێ.

**شاحَنَهُ**: ڕقی لێ هەڵسا ٥ دژایەتی كرد.

**تشاحَنوا**: یەكتریان دزاو ناكۆكی كەوتە نێوانیانەوەو بوون بە دوژمنی یەكتر.

**الشّاحِنُ**: پڕ، دەگوترێ: (مركب شاحِنٌ):

بارهەڵگرێکی پڕ لەکاڵایە.

**الـشَّحْنَاءُ**: حیقـدو دوژمنایـەتیو ڕقو کینە.

**الـشِّحْنَةُ**: ئـەو کاڵایـەی کەشـتی لـێ پڕدەکـرێ ٥ ئـەو خـۆراکو پێداویـستییەی ژیانـە کـە کۆدەکرێتـەوە بـۆ ئـەوەی بەشـی یاساوڵو پـۆلیسو کاربەدەست کـە پاشا دیاریـیان دەکا لێـی بـدرێ، بـۆ ئەوەی ئەمنو ئاسایشی وڵاتێك یان شارێـك بپـارێزن ٥ ڕەوە ئەسـپ ٥ (ك: شِـحَن) ٥ (الـشحنة الكهربيـة): ئەو بڕە کارەبایەیە کە قەبارەیەك هەڵی دەگرێ.

**شحا فلان شَحْواً**: فلانکەس هەنگاوی پانی هاویشتنو پەلەی کرد، دەگوترێ: (شحا في الفتنة): لەفیتنـەیىو دووو زمـانی دا ڕۆچوو.

**شَحَى فَمَهُ شَحْياً**: دەمی داچەقاند.

**تَـشَحَّى فِي الـشَّيْءِ**: فراوانخـوازی لەشتەکەدا کرد.

**تَـشَحَّى فِي الـسَّوْمِ**: زێـدە ڕۆیـی کـرد لەبانگـەوازی کـردن بـۆ فرۆشـتنو هەراجکردن یان گرانکردنی کاڵا.

**تَشَحَّى علـى فـلان**: زمـانی لەفلانکـەس بەرەڵا بوو چی خـودا پێـی ناخۆشـە پێی کرد.

**الشَّحْوَةُ**: بازو هەنگاو، دەگـوترێ: (فرس رغيب الـشحوة): ئەسپێـکی هـەنگاو درێـژە بـازی درێـژ دەهاوێ ٥ (فـلان بعيد الشحوة في مقاصده): فلانکەس دوربـینو پلانـی سـتراتیجی درێژخایـەنی هەیـە بـۆ ژیـانو مەبەستی دورو درێژی هـەن ٥ (إناء الشحوة): قاپێکە ناوەکەی فراوانە.

**شَخَبَ اللَّبَنُ شَـخْباً**: شـیرەکە لـەگوان هاتـە دەرو خوشەی هات، دەگـوترێ: (شَـخَبَ مـن الجُـرْحِ): خوێنەکـە لـە برینەکـە فیـچقەی کـرد، دەشـگوترێ: (شَـخَبَتْ أوداج القتيـل دمـاً): ڕەگـی لاملـی کوژراوەکـە فیـچقەی خوێنیـان کـرد، بەفیچقە خوێنیان لـی هاتە دەر.

**إنشَخَبَ اللبنُ**: خوێنەکە بەفیچقە هاتـە دەر، دەگـوترێ: (إنشَخَبَ العِرقُ دماً): ڕەگەکە خـوێنی بەفیـچقە لـێ هاتـە دەر.

**الأشخوب**: خوشـە خوشـی شیر لـەکاتی دۆشین دا.

**الـشُّخْبُ والـشَّخْب**: خوشـەی شـیر، فیچقەکردنی شیر لـەکاتی دۆشین دا ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (شخبٌ في الإناء وشخبٌ في الأرض): خوشێـك بۆنـاو قاپەکـەو خوشێـك بۆسـەر زەوی، واتـە جارێـك دەیهەنگێوێو جارێك نا.

**الـشُّخْبَةُ**: بـەمانا (الـشُّخب)دێ ٥ (ك: شِخاب).

**شَخُتَ شُخوتَةً**: جەستەی لاوازو باریك بوو بەشێوەیەكی سروشتی ٥ (فهو شَخْتٌ وشِخيت) ٥ (ك: شِخات).

**الشَّخْت**: هەر گیانلەبەرێك بەسروشت كـزو كۆڵـەواربێ، دەگـوترێ: (فـلان شـــخت): فلانكـەس لاوازو قــەد باریكە ٥ (هـو شـخت العطـاء): ئـەو دەست قوچاوو كەمبەخششە ٥ (ك: شِخات).

**شَخَّ في نومه**: لەخەودا پرخە پرخـی هات ٥ (شَخَّ ببوله): گیزە گیزی میز كردنـی هات.

**شَخَرَ شَخراً وشخيراً**: دەنگەكـە لەقورگی دا هـاتو چـو بـێ ئـەوەی ببێتـە قـسە، دەگـوترێ: (شَـخَرَ الفَـرسُ): ئەسـپەكە حیلاندی.

**شَخَرَ الحمار**: گوێدرێژەكە زەڕی.

**شَـــخَسَ الأمـــرُ شَخْـــساً**: كارەكـە شـێوا، چەواشەیی تێكەوت ٥ راستیو دروستی خۆی لەدەست دا ٥ (هو شخيص).

**تشاخَسَتْ أسنانه**: ددانـی ڕێـكو پێـكو ڕیز بەستوو نەبون.

**شَخْـشَخَ القَـشُّ**: كـۆزەرو كاوكۆتەكـە دەنگی خەشخەشەیان لـێ هات.

**شَخَصَ الشَّيْءُ شُخوصاً**: شتەكە بەرز بـۆوە ٥ لەدوورەوە دەركەوت.

**شَخَصَ السهمُ**: تیرەكە مەبەستی نەپێـكاو نەیهەنگاوت.

**شَـــخَصَ مـــن بلـــده وعنـــه**: لـەوڵاتی خـۆی ڕۆیشتە دەرەوە.

**شَخَصَ الى بلده**: گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی.

**شَخَصَ أمامه**: لەبەردەمی دا خودی خۆی ئامادە بوو.

**شَخَصَ فلان بصره وبِبَصَرِه**: فلانكەس چاوی بەملۆق وەستاو نەیتروكاندن.

**شَخُصَ فلان شخاصةً**: قەبارەی فلان گەورە بـوو جەسـتەی زەبـەلاح بـوو، (فهــو شخيص وهي شخيصة).

**أشْخَصَ فلان**: فلانكەس كاتی ڕۆیشتنی هات.

**أشْـخَصَ الرامـي**: تـیری تیرهاوێژەكـە هەڵـەی كـردو نەیپێـكا، دەگـوترێ: (أشخص مـهمه وبسهمه).

**أشْـخَصَ فلانــاً مــن بلــده**: فلانكەسـی لەوڵاتی خۆی دەركرد.

**أشخص فلاناً اليه**: فلانكەسی نارد.

**شَـخَّصَ الـشَّيْءَ**: شتەكەی دیاری كـردو لەشتی تر جیای كردەوە.

**شَخَّصَ الداءَ**: دەردەكەی دۆزییەوە.

**شَخَّصَ المشكلة**: كارەكە ئاشكرا بوو، ڕون بۆوە.

**الــشَّاخِص**: شـتی بەرچـاوو بینــراو ٥

بەنیشانەو عـەلاماتی ڕێـگاو بـانو شتی لەو جۆرە دەگوترێ.

**الشَّخصُ**: هەرقەبارەیەك بـەپێوە بێو ببینـدرێ بـەزۆری بـۆ ئـادەمیزاد بەکاردەهێنـــدرێ ٥ لـــەزاراوەی فەلسەفەدا وشەی (شخص) بریتییە لـــە زاتو بونەوەرێـــك کەهۆشـــی هـەبێو کیـانی سـەربەخۆی بزانـێ ویستو ئیرادەی سەربەخۆیی هەبێ.

**الشَّخصِيّ**: کاری تایبەتی کەسێك، شتی پەیوەندیـــــدار بەکەسێـــــکی تایبەتییەوە.

**الشَّخصِيّة**: چەند ڕەوشتو دیاردەیەکن کەســەکە لەکەســانی تــر جیــا دەکەنــەوە، دەگــوترێ: (فــلان ذو شخــصیة قویــة): فلاّنکـەس چـەند ڕەوشــتو ئاکارێــکی جیاکـەرەوەی تێـدانو ویــستو ئــیرادەو کیــانو بونێـــکی ســـەربەخۆی هەیـــە ٥ (الأحـــوال الشخـــصیة): بـــاری کەسـیەتی؛ هەوییـەکی تایبەتییـە ٥ هەروا چەند مەسەلەو قانونو یاساو ڕێسایەکن لەبواری خێزان دا وەکـوو مـیرات گـرتنو مـارەکردنو لێـك جیابوونــەوەو پێـــکەوەژیانی ژنو مێردو منداڵو ئەو جۆرە شتانە.

**شَخِمَ الطعامُ شَخماً**: خۆراکەکە خراپ بوو، گۆڕاو بۆگەنی کـرد، دەگـوترێ: (شَـخِمَ فَمُ فلان): دەمی فلاّنکەس بۆگەنی کـرد ٥ (فهو شَخِمٌ).

**أَشْخَمَ**: بەمانا (شَخِمَ)دێ.

**الأشْخَمُ**: دەگوترێ: (فلان أشخم الرأس): فلاّنکەس سەری بۆز بوو، سپیایەتی مووەکـانی بەسـەر ڕەشـەکانی دا زاڵ بوون ٥ (شـعر أشـخم): مـووی سپی بـوو ٥ مـووی مـاشو بـرنج ٥ (عـام أشخم): ساڵێـکی بێ بـارانی، وشکە ساڵیو بێ دانەوێڵەو لـەوەڕ ٥ (روض أشـــــخم): باخێـــکە بـــێ ڕوەكو درەخت.

**شَدَخت الغُرّةُ شَـدْخاً**: شتەکەی برینـدار کـــرد، دەگـــوترێ: (شَـــدَخَ الـــرأسَ والحنظَـلَ): سـەری شـکاند ٥ کاڵەکـە تاڵەکەی بریندار کرد.

**شَدَخَ دمَ فلان**: خوێنی فلاّنکەسی بـەفیڕۆ دا، تۆڵەی نەساندەوە.

**شُدَّخُهُ**: بۆ زێندە ڕۆیی لەمانای (شَدَخَ)دا بەکاردێ.

**إنشَدَخَ**: بریندار بوو قرینجا.

**تَشَدَّخَ**: شکا.

**الـشُدْخَة**: برینێــك، قرینجاوییــەك ٥ ڕوەکێـکی نەرمو تەڕو گەشە.

**المِشْدَخ والمِشْدَخةُ**: ئـامێری قرینجانـدنو بریندار کردن.

**شَدَّ الشَّيْءُ شِدَّةً**: شتەکە بەهێز بوو، پتەو بوو ٥ قورس بوو.

**شَدَّ فلانٌ شَدّاً**: فلانکەس بازی دا.

**شَدَّ النهارُ**: ڕۆژەکە زوربەی بەسەر چوو، بەرز بۆوە.

**شَدَّ عليه في الحرب**: لەشەڕدا بەتوندی هێرشی بۆ برد.

**شَدَّ على قلبه شَدّاً**: دڵی مۆر کرد ٥ لە قورئان دا هاتووە: ﴿وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَلاَ يُؤْمِنُواْ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الأَلِيمَ﴾.

**شَدَّ فلاناً**: فلانکەسی پێوەند کرد، دەشگوترێ: (شد على عضده) یان (شدّ على يده) دەستی گوشیو پشتگیری لێ کرد، یارمەتی دا.

**شَدَّ رِحالَهُ**: خۆی بۆ سەفەر کردن ساز دا.

**شَدَّ مِئْزَرَهُ**: کۆششی کرد لەکارەکەدا، بە لێبڕاوانە پڕی دایە.

**شَدَّ الحَبْلَ ونحوه**: حەبلو پەتەکەی ڕاکێشاو توندی کرد.

**أَشَدَّ الفتى**: کوڕەکە گەیشتە تەمەنی گەنجیو هەڕەتی لاوەتیو لەعەقڵو تەمەن دا پێگەییو خۆی دارشت.

**شادَّهُ مُشادَّةً وشِداداً**: بەسەری دا زاڵ بوو.

**شادَّ في الأمر**: زێدە ڕەوی لەکارەکەدا کردو ئاسانکاریی ڕەچاو نەکرد ٥ لەفەرمودەی پێغەمبەردا هاتووە (لَنْ يُشَادَّ الدينَ الا غلبه): هەرکەسێ زێدەڕەوی لەئایین دا کردبێ یا زێدەڕەوی لەئایین دا بکا تێدەشکێو سەرەنجام بۆی ئەنجام نادرێ.

**شَدَّدَ**: بەمانا (شادَّ) دێ ٥ (شَدَّدَ الشَّيْءَ): شتەکەی پتەو کرد، هێزو توانای دایە.

**شَدَّدَ الحَرْفَ**: پیتەکەی بەشێوەی دوبارە کراوەو تێکخراویی دەربڕی.

**إِشْتَدَّ**: بەهێز بوو، زیاد بوو، دەگوترێ: (إشتدَّ مرضُهُ): نەخۆشییەکەی توند بوو.

**إِشْتَدَّ عليه الأمرُ**: کارەکەی لێ قورس کرد.

**إِشْتَدَّ في عَدْوِهِ**: پەلەی کرد لەبازدان دا.

**إِشْتَدَّ النهارُ**: ڕۆژەکە زۆری ڕۆییو خۆرەکەی بەرز بۆوە.

**إِشْتَدَّ السِّعرُ**: نرخەکەی بەرز بۆوە ٥ کاڵاکان گران بوون.

**إِشْتَدَّ اللبنُ ونحوه**: شیرەکە مەییو رەق بوو خەریکە دەبێتە پەنیر.

**تَشادّاً**: بەسەریەك دا زاڵبون.

**تَشَدَّدَ في الأمر**: زێدە ڕەوی لەئیشەکەدا کردو ئاسانکاریی نەکرد ٥ ڕژد بوو.

**الأَشُدُّ**: تەواو بوون ٥ (بَلَغَ أَشُدَّهُ): گەیشتە هەڕەتی هێزو توانا ٥

قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ﴾.

**الشِّدادُ**: ئەوەی شتی پێ قایم دەکرێ.

**الشَّدُّ**: راکێشان و کێشکردن، دەگوترێ: (لايقوى على شدٍّ ولا إرخاء): دەسەوسانەو هیچی پێ ناکرێ ٥ (أتانا شَدَّ النهار): لەجەنگەی نێوەرۆدا هاتە لامان ٥ (أتانا شَدَّ الضُّحَى): لەجەنگەی کێشتەنگاودا هاتە لامان.

**الشَّدَّةُ**: هێرش و پەلاماری شەڕ ٥ چوکڵەیەکە دەخرێتە سەر پیت بۆ ئەوەی پیتەکە بەدووبارەیی و تێکخراویی دەرببڕدرێ.

**الشِّدَّةُ**: تەنگژەو کاری گورچکبڕو بەڵاو کارەسات کەپیاو بەزەحمەت خۆی بۆ ڕادەگرێ.

**شِدَّة العيش**: تەنگو چەڵەمەی ژیان.

**الشَّدِيدُ**: بەهێزو توانا ٥ کاری قورس و ئەستەم.

**شديد القُوى**: دەسەڵاتداری بەتوانا ٥ خاوەن توانای ڕەها ٥ عەترێک بۆنەکەی کەسکون بێ ٥ پیاوی چاوتیژو ئازا بۆشەو بەخەبەریی.

**الْمِشَدُّ**: کەمبەرە؛ خشڵێکە ئافرەت لەقەدی خۆی دەبەستێ بۆ ئەوەی قەدی باریک بێ.

**شَدَفَهُ شَدْفاً**: پارچە پارچەی کرد، وردو هاڕی کرد.

**شَدِفَ شَدَفاً**: تەڕ دەماخ بوو ٥ لەڕوی خۆ بەزلزانیو بەخۆ نازینەوە روی وەرگێڕا ٥ (فهو أشدف وهي شَدْفاء).

**تَشادَفَ**: لارو لەنجەی کرد، خۆی بادا.

**الأَشْدَفُ**: کەسێک بەدەستی چەپ کارەکانی ئەنجام بدا.

**الشَّادوف**: دوشی ئاوپڕژاندن؛ ئامێرێکە ئاودێری زەوی پێ دەکرێ.

**الشُّدْفَةُ**: پارچە لەهەرشتێك بێ ٥ (ك: شُدَف).

**شَدِقَ شَدَقاً**: شەویلەی پان بوون ٥ (فهو أشدق وهي شدقاء) ٥ (ك: شُدْق).

**تَشَدَّقَ**: بەمەبەستی شت جوین شەویلەی خۆی جوڵاندن ٥ شەویلەی خۆی بادا بۆئەوەی قسەی رەوان بکا.

**الأَشْدَقُ**: (خطيب أشْدَقُ): وتاربێژێکی دەنگ گەورەی قسەزانە ٥ (وهي شَدْقاء): بۆ ئافرەت بەکاردێ، دەگوترێ: (شفة شدقاء): دەمی گەورەو شەویلە پانە.

**الشِّدْقُ**: لا ڕومەت لەخوار کوڵمەوە، لاشەویلە ٥ (ك: أشداق وشدوق).

**الشِّدْقم**: ئادەمیزادی شەویلە پان.

**شَدَنَ الظَّبْيُ شُدوناً**: بێچوە ئاسکەکە بۆ خۆی لەوەڕاو پێگەیی پێویستی

بەشیری دایکی نەبوو ، (فهو شادِن).

**أشْدَنت الظبيةُ وغيرها**: بەمانا (شَدَنَ ولدُها) دێ ، (فهي مُشْدِنٌ) ، (ك: مشادِن).

**الشَّادِنُ**: بێچوە ئاسک ، (ك: شوادن).

**شَدَهَ فلاناً شَدْهاً**: فلانکەسی سەرسام کرد، دەگوترێ: (شُدِهَ): بەکارەکە سەرسام کرا توشی سەراسیمە بوو.

**أشْدَهَهُ**: سەرسامی کرد.

**إنْشَدَهَ**: سەرسام بوو.

**الشُّدَاهُ**: سەرسامیو واق ورمانو سەراسیمە بوون.

**المَشَادِهُ**: ئەو شتانەی ئادەمیزاد هەڵوگیر دەکەن ، تاکەکەی (مَشْدَهة).

**شدا شَدْوا**: گۆرانی گوت ، بولبولەکە خوێندی.

**شدا بالشّعر**: شیعرەکەی بەشێوەی گۆرانی خوێندەوە.

**شدا شَدْوَ فلان**: خۆی لەفلانکەس چواند، خۆی بەو شوبهاند.

**الشَّادي**: گۆرانی بێژ ، قوتابیو هەوڵدەر بۆ وەدەستهێنانی ئەدەبو زانیاری ، (ك: شداةٌ).

**الشَّدَا**: بەشێک لەهێزو توانا، دەگوترێ: (لم يَبْقَ من قوته إلاّ شَدًا): کەمێکی هێزو توانا ماوە ، ئەندازەی شت، سنوورو قەبارەی شت.

**الشَّدْوُ**: بەشی کەم لەزۆر ، دەگوترێ: (أخذ شدواً من المال): بەشێکی کەمی لەماڵە زۆرەکە وەرگرت.

**شَذَبَ اللِحاءَ شَذباً**: توێکڵەکەی قەلاشتو لێی داماڵی.

**شَذَبَ العودَ**: لقو پۆپی لە دارەکە کردەوە تا وای لێ هات قەدەکەی روت بوو، دەگوترێ: (شَذَبَ عن فلان): داکۆکی لەفلان کردو شەڕو نەگبەتی لێ دوور خستەوە.

**شَذَّبَ اللحاءَ والشجرَ والعودَ**: بەمانا (شَذَبَهُ) دێ، واتە توێکڵەکەی سپی کرد، دارەکەی روت کرد، لقەکەی هەڵپاچی.

**شَذَّبَ الشيءَ**: شتەکەی بڵاوە پێ کردو ونجرِ ونجڕی کرد.

**شَذَّبَ المالَ**: ماڵو سامانەکەی پەرتو بڵاو کردەوە.

**شَذَّبَ فلاناً عن الشيء**: فلانکەسی لەشتەکە دوور خستەوە.

**تَشَذَّبَ القومُ**: خەڵکەکە بڵاوەیان کرد.

**الشَّاذِبُ**: دوورکەوتەی وڵاتو زێدو نیشتمان ، دەرکراوی ناهومێد لەرزگار بوون.

**الشَّذَبُ**: ئەوەی دەبڕدرێو فڕێ دەدرێ لەشت ، پاشماوەی شت ، پاشەڕۆک،

دەگوترێ: (في الأرض شَذَبٌ مِن الكلأ) ٥ (ك: أشذاب).

**الشَّذِبُ**: (رجل شَذِبُ العُروق): پیاوێکە دەمارەکانی جەستەی دیارن.

**المِشْذَبُ**: داس؛ ئامێری گیا درون ٥ (ك: مشاذب).

**شَذَّ شُذُذاً**: تاك بووە لەکۆمەڵو تەرەبوو، هەڵس‌و کەوتی پێچەوانەی کۆمەڵ بوو، دەگوترێ: (شَذَّ عن الجماعة): لەرێڕەوی کۆمەڵ دەرچوو تاق بۆوە.

**شَذَّ الكلامُ**: قسەکە لە قیاس‌و یاسای ئاخاوتن دەرچوو.

**أشَذَّ فلان**: فلانکەس قسەو رایەکی شازو وێنەچوی هێنایە پێشەوە.

**أشَذَّ الشيءَ**: شتەکەی دوور خستەوە ٥ (أشَذَّ القول): قسەیەکی کەس نەگوتوی هێنایە پێشەوە.

**الشَّاذُّ**: تاق بووە، دەرچوو لەکۆمەڵ ٥ پێچەوانەی قاعیدە ٥ دەرچوو لەیاساو رێسای کۆمەڵگە ٥ (ك: شواذّ).

**شَذَّرَ العقدَ ونحوه**: مروو شتی خستە نێوان ریزی خشڵەکەوە یان دەنکە زێڕو زیوی خستە نێوان مرووە هۆنراوەکانەوە، دەگوترێ: (شذر الأديب كلامه بالشعر): نووسەرەکە شیعری خستە نێو پەخشانە فەنییەکەیەوە.

**تشذَّرَ القومُ**: خەڵکەکە بڵاو بوونەوە ٥ راو بیرو بۆچونیان جیاواز بوو هەریەکە لەهەوایەك لێ دەدا.

**تَشَذَّرَ فلان**: فلانکەس خۆی ئامادەکرد بۆ جەنگ.

**تشَذَّرَ الرجلُ**: پیاوەکە هەڕەشەی کرد.

**الشَّذْرُ**: پارچە زێڕ کە لەکانەکانی دەردەهێنرێ ٥ مرووێەکە دەخرێتە نێوان مرووی جیاواز ٥ لوئلوئی بچوك ٥ تاکەکەی (شذرةٌ) ٥ (ك: شذورٌ).

**شَذَرَ مَذَرَ**: دەگوترێ: (تفرقوا شذر مذر): بڵاوبونەوەو بوونە پارچە پارچەو گروپ گروپ‌و کێشەو نیزاعیان تێکەوت.

**شذا المِسْكُ شذواً**: میسکەکە بۆنەکەی کەسکونەو بڵاو بۆوە.

**شذا فلانٌ**: فلان بەمیسك خۆی بۆنخۆش کرد.

**أشْذاهُ عنه**: لێی دوور خستەوە.

**الشَّذْرُ**: میسك یان بۆنی میسك یان رەنگی میسك.

**الشَّذا**: کەسکونی بۆنی خۆش یان ناخۆش ٥ پارچە پارچەی داری عود کە بۆ بۆنخۆشی بەکار دێ.

**الشَّذاةُ**: باقی ماندەی هێزو توانا.

**اشرأبَّ اليه وله إشْرِئباباً**: ملی بۆ درێژ کرد ○ چووه بەرزایی بۆئەوەی بڕوانێ.

**شرِبَ الماءَ ونحوه شُرْباً**: ئاوەکەی قوت دا ○ (فهو شارب) ○ (ك: شاربون وشَرَبَة).

**شرِبَ السُّنْبُلُ الدقيقَ**: گوڵە گەنمو جۆیەکە پێگەیشتووە دەنکەکانی ڕەق بوون‌و کاتی دروێنەی هاتووە.

**أشْرَبَ الرَّجُلُ**: پیاوەکە حوشترەکانی یان کشت‌و کاڵەکەی وەختی ئاودانیان هات یان تێراو بوون.

**أشرب فلاناً**: ئاوی دا بەفلانکەس، دەگوترێ: (أشربني ما لم أشرب): کردەوەیەکی پاڵداوم کەنەم کردووە.

**أشربَ اللَّوْنَ**: ڕەنگەکەی تێرو تۆخ کرد.

**أشْرَبَ اللونَ غيره**: شتی تری تێکەڵاوی ڕەنگەکە کرد، دەگوترێ: (أشرَبَ البياضَ حمرةً): ڕەنگی سوری تێکەڵی ڕەنگە سپییەکە کرد ○ (وأشرَبَ قلبُهُ حب الإيمان): خۆشەویستی ئیمان‌و خودا پەرستی تێکەڵ بەناخی دڵی بووە ○ لە قورئان دا هاتووە: ﴿وَأُشْرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ الْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ﴾.

**شارَبَهُ مشارَبَةً وشراباً**: لەگەڵی دا خواردیەوە.

**شَرَّبَ قصب الزَّرع**: ئاو لەلاسکی گژو گیاکە زیا.

**شَرَّبَ فلاناً**: وایکرد فلانکەس بخواتەوە.

**تَشَرَّبَ الماءَ ونحوَهُ**: ئاوەکەی وردە وردە هەڵمژی، دەگوترێ: (تَشَرَّبَ الثَّوبُ العرقَ أو الصِّبْغَ): قوماشەکە عەرقەکەی هەڵمژی یان ڕەنگەکەی هەڵمژی.

**استشرَبَ اللَّوْنُ**: ڕەنگەکە تۆخ بوو.

**إشْرَأبَّ اليه**: بڕوانە (اشرأبّ).

**الشارِبُ**: بخۆرەوە ○ (ك: شُرّابٌ) ○ سمێڵ؛ ئەو موانەی لەسەر لێوی سەرو دەڕوێن ○ (الشاربان): جوت سمێڵ ○ (ك: شوارب).

**الشارِبَةُ**: مێینەی (الشارِب) ○ (ك: شوارب)، کۆمەڵێک خەڵک لەسەر کەناری ڕوبارێک نیشتە جێ ببن‌و ئاوی تایبەتیان لەچەمەکەوە هێنابێ.

**الشَّرابُ**: هەرشتێک بخورێتەوە ○ (ك: أشربة).

**الشَّرْبُ**: کۆمەڵە خەڵکێک بخۆنەومو دانیشتبن‌و بۆ خواردنەوە کۆمەڵەیان کردبێ.

**الشِّرْبُ**: ئاوی خواردنەوە ○ بەشە ئاوی تایبەتی ○ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾ ○ دوێلاو؛ شوێنی ئاو خواردنەوە ○ (ك: أشراب).

الشَّرْبَةُ: یەکجار ئاوخواردنەوە، قومە ئاوێك.

الشُّرْبَةُ: سورایی سەر دەمو چاو ٥ ئەندازەی ئەو ئاوەی ئادەمیزادێك پێی تێراو دەبێ ٥ پەلۆی رون کە هەڵ لوشرێ ٥ (ك: شُرَبٌ).

الشُّرَبَةُ: زۆر خواردنەوە ٥ تینوایەتی، دەگوترێ: (لم تَزَلْ بِهِ شَرَبَةٌ هذا الیوم): بەردەوام ئەمڕۆ تینوی بوو ٥ (یوم ذو شَرَبَة): رۆژەکەی گەرم بوو ئاوی زۆر تێدا خورایەوە ٥ (طعام ذو شَرَبَة): خواردنێکی ئاوکێشە بخۆرەکەی پێویستی بە ئاو خواردنەوەی زۆر هەیە ٥ حەوزی بچکۆلە کەبەدەوری بنکی درەختو روەك دا دروست دەکرێ بۆ ئەوەی ئاوی تێ بکرێو ماوەیەك گلی بنکی درەختەکە بەتەڕی بمێنێتەوە.

الشُّرَبَةُ: ئەوەی زۆر ئاو دەخواتەوە.

الشِّرِّیبُ: ئەو کەسەی زۆری حەز لەخواردنەوەیە.

الشروبُ: زۆر خۆرەوە ٥ ئاوێك گوارا نەبێ ٥ کەمێك تاڵو تفت بێ.

الشَّرِیبُ: بەمانا (الشَّروب) دێ ٥ ئەوەی ئاوی لەگەڵ دەخواتەوە یان لەگەڵی دا دەچێتە سەر دوێڵاوو کانی ئاو خواردنەوە.

المَشْرَبُ: ئەو شوێنەی لێی دەخورێتەوە، شوێنی ئاوخواردنەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ﴾ ٥ یان ئاوە بۆ خودی ئەو شتەی دەخورێتەوە.

مَشْرَبُ الرجل: هەواو هەوەسو مەیلی پیاو، دەگوترێ: (هم قوم إختلفت مشاربهم): ئەوانە قەومێکن بیرو بۆچونو حەزو ئارەزووی جیاجیایان هەیە.

المَشْرَبَةُ: شوێنی خواردنەوە ٥ زەوی نەرمەڵانو هەمیشە سەوزو ڕومکاوی ٥ (طعام مشربة): خۆراکێکە ئاوکێشە زۆری ئاو لەسەر دەخورێتەوە ٥ (ك: مشارب).

المِشْرَبَةُ: جامی ئاو خواردنەوە، پیاڵەی ئاو خواردنەوە ٥ (ك: مشارب).

شَرِثَتْ یَدُهُ أو رِجْلُهُ شَرَثاً: پێستی قاچی یان دەستی ئەستور بوو بەهۆی سەرماوە قەڵشینو شەقار شەقار بوون.

شَرِثَ النعلُ: نەعلەکە درا.

إنْشَرَثَتْ یَدُهُ: دەستی قەڵشین.

الشَّرِثُ: تیژایی دەمی شمشێر ٥ تیژایی چەقۆو شتی وا.

شَرَجَ الشیءَ شَرجاً: پارچەو کەرتەکانی شتەکەی خستنە پاڵ یەك.

**شَرَجَ اللَّبِنَ ونحوه**: خشتەکانی ریز کردن.
**شَرَجَ العيبَةَ**: هەندێ قولفەو ئەڵقەی عەیبەکەی لێک بەستن ٥ (العَيبَة): تاینچەو رەشکەو تیرەو قەرتاڵەو شتی وا کە بەروبومی دوورواوەو چنراوی تێدا دەگوێزرێتەوە بۆ سەرخەرمان.
**شَرَجَ الشراب بالماء**: شەرابەکەی تێکەڵاوی ئاو کرد.
**شَرِجَ الجِسْمَ شَرجاً**: جەستەکە قەڵەوو گۆشتن بوو.
**أشرَجَ العيبَةَ**: بەمانا (شَرَجَ)دێ، دەشگوترێ: (أشرَجَ صَدرَهُ على كذا): سنگی خۆی بەوەوە جوت کرد.
**شَرَّجَ**: بۆ موبالەغەو زیادەڕۆیی لەمانای (شَرَجَ)دا دێ.
**شَرَجَ الثوبَ**: بەتەقەڵی درشت قوماشەکەی درو.
**إنْشَرَجَ**: شتەکە بوو بەدووو بەش.
**تَشَرَّجَ اللَّحْمُ بالشحم**: گۆشتو بەز تێکەڵاو بوون.
**الشَّرْجُ**: ڕێڕەوی ئاو لەتەپۆڵکەو شتی وا دا کەدێتە خوار بۆ پێدەشتو بنارەکان ٥ کۆمەڵ و تاقم، دەگوترێ: (أصبحوا في هذا الأمر شرجين): لەم کارەدا بوون بە دوو تاقمو پێر ٥ (ك: شِراج).
**الشَّرَجُ**: ئەڵقەو قولفەی عەربەو رەشکەو خێمەو شتی وا ٥ دەوران دەوری کونی پاشەوە ٥ (شَرَجُ الوادي): دەراوی شیو ٥ (ك: أشراج).
**الشَّرِيجُ**: سەری چیلکە دار دوای شکاندنەوەی.
**الشريجان**: دوو ڕەنگی جیا لەهەر شتێک.
**الشَّريجة**: زەمبیلەیەکی گەورە لەپرژی دارخورما دەچندرێ کاڵەک و میوەی تێدا دەگوازرێتەوە ٥ کولانەو قەفەسێکە لەپرژی دارخورما دروست دەکرێ بۆ کۆتر ٥ (ك: شرائج).
**شَرْجَعَ الخَشَبَةَ المربعة**: ئەملاو ئەولای دارە چوار گۆشەیەکەی تاشی.
**الشَّرْجَعُ**: درێژ ٥ دارە مەیت ٥ (المُشَرْجَعُ): درێژ کراو.
**شَرَحَ اللحمَ**: گۆشتەکەی کوتکوت کرد بە شێوەیەک کوتەکانی درێژو تەنک بن.
**شرحَ الشيءَ**: شتەکەی ڕونکردەوە شی کردنەوەو لێکۆڵینەوەی تێدا ئەنجام دا، دەگوترێ: (شرح صدره بالأمر): دڵی خۆش کرد بەکارەکە ٥ ئیشەکەی لا خۆشەویست کرد.
**شَرَّحَ اللحمَ**: بەمانا (شَرَحه)دێ.
**شَرَّحَ الجُثَّةَ**: لاشەکەی پشکنی، هەندێکی لەهەندێکی جیاکردەوە بۆ

پشكنينى زانيارى.

**اِنْشَرَحَ**: بۆ موطاوعەى (شَرَحَهُ) هاتووە، دەگوترێ: (إنْشَرَحَ صدرُهُ لكذا): دڵى پێى خۆش بوو، هاتە سەر ئەو رايەو بەراستى زانى.

**التَّشْرِيحُ**: (علم التَشريح): زانيارييەكە دەربارەى پێكهاتەى جەستەى عوضوى بەشێوەى هەڵدڕينو پشكنين بۆ مەبەستێكى تايبەتى.

**الشريحة**: پارچە گۆشتى تەنك يان پارچەى تەنكى شتى تر ٥ (ك: شرائح).

**المَشْرَحَةُ**: ئەو مێزو تەختەيەيە جەستەى لەسەر دەپشكنرێ هەروا ئاوە بۆ زورێكى گەورە ئامادە دەكرێ بۆ هەڵدڕينو پشكنينى جەستەى مردوەكان تێيدا.

**شَرَخَ الصَّبِيُّ شروخاً**: منداڵەكە گەيشتە سەرەتاى گەنجى.

**شَرَخَ ناب البعير شَرْخاً**: ددانى حوشترەكە دەركەوتن گۆشتەكەيان درىو سەريان دەرهێنا ٥ (ك: شَرْخ وشُرُّخ).

**الشَّرْخُ**: ئەصڵو بنەما ٥ رەگو دەمار ٥ (شَرْخ الشباب): سەرەتاى گەنجىو تەڕو تازەيىو گەشەدارىى گەنجى ٥ درزو كەلێنێكە لەنێسقانو ديوارو شتى وا دا پەيدا ببێو نەگاتە ئاستى لێك جيابوونەوەو پچڕان.

**شَرَدَ البعيرُ وغيره**: حوشترەكە تەرەبوو، ياخى بوو.

**شَرَدَ عن الطريق**: لەرێگە لاى دا ٥ (فهو شارد وشرود).

**شُرِدَ فلانٌ**: فلانكەس شاربەدەر كرا، بەشێوەى ترۆكراوى شوێنى خۆى جێ هێشت.

**أشْرَدَهُ**: شاربەدەرى كرد بەزۆر وەدەرى ناو واى لێ كرد بێلانەو ماڵو حاڵ بێ.

**شَرَّدَهُ**: ترۆى كردو وەدەرى ناو بێ شوێنو جێگا مايەوە..

**شَرَّدَ القومَ**: خەڵكەكەى پەرتو بڵاو كردو تەفرو توناى كردن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَشَرِّدْ بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ﴾.

**تَشَرَّدوا**: بڵاو بونەوە، دەگوترێ: (تَشَرَّدَوا في الأرض): بەناو زەوى دا بڵاو بونەوە.

**الشّارِدُ**: دەگوترێ: (رجل شارد العين): پياوێكە چاوى برپوەتە شتێك كەهى ئەو نييە، بۆ ئەو نابێ، بۆ ئافرەت دەگوترێ: (إمرأة شاردة) ٥ (قصيدة شاردة): چامە شيعرێكە دەستاو دەستى پێ كرا بەناو خەڵك دا بڵاو بۆوە ٥ (ك: شوارد).

**شوارد اللغة**: وشەو رستەى ناوازەو كەم بيستراوى زمان.

**الشُّرود**: (شرود الذهن): لەزانستى

دەرونزانی دا بەوە دەگوترێ کابرا ئاگاداری شت نەبێو بێ ئاگابێ لەبارو دۆخی دەوروبەرو روداوی تازە پەیدا بوو.

الشّرِیدُ: دەرکراوی بێ شوێنو جێگاو لانە.

المُتَشَرِّدُ: تەمبەڵو بێکارو ئیشو هیچ لەبارا نەبوو.

الشِّرْذِمَةُ: بەشو تاقمو گرۆهـ، دەگوترێ: (شِرذمة من الناس): کۆمەڵێکی کەم لەئادەمیزاد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰؤُلَاءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ﴾ ٥ (ك: شراذم) ٥ دەگوترێ: (ثوب شراذم وثیاب شراذم): کراسێکی دادڕاوو کۆنە ٥ پۆشاکی شڕو وڕکراو.

شَرَّ فلان شراً: فلانکەس حەزی لەشەڕو ئاژاوە بوو ٥ باری بەشەڕو هەراوە گرتووە.

شَرَّ فلاناً شَرّاً: ڕەخنەی لەفلانکەس گرتو عەیبو عاری پاڵ دا.

شَرَّ الثوبَ أو اللحم ونحوهما: قوماشەکە یان گۆشتەکەی بڵاو کردەوە بۆ ئەوەی وشك بێتەوە.

أشَرَّ الشيئَ: بەمانا (شَرَّهُ) دێ، دەگوترێ: (أشَرَّ الثوبَ واللحم ونحوهما): قوماشەکە یان گۆشتەکەی بڵاو کردەوە.

أشَرَّ فلاناً: کێشەی لەگەڵ فلانکەس بەرپاکرد.

الإشارةُ: ئەو شتەی گۆشتی لەسەر بڵاو دەکرێتەوە بۆ ئەوەی وشك بێتەوە یان پەنیرو شتی لەو جۆرەی لەسەر هەڵدەخرێ ٥ هەروا ناوە بۆ پارچە گۆشتی وشکەوە کراو ٥ (ك: أشارير).

الشَّرارُ: پریشك کەلەقەبارەی ئاگر تێبەربوو پەیدادەبن ٥ روناکایی پەیدا بوو لەخاڵی بوونی کارەباوە.

الشَّرَرُ: پریشك دەق بەمانا (الشَّرَار) دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ﴾.

الشَّرُّ: خراپەو نەگبەتی زیانو زێنەخرۆ ٥ (ك: شرور)، دەگوترێ: (رجل شرٌّ): پیاوێکی خراپەکارە ٥ (ك: أشرار وشِرار) ٥ دەگوترێ: (هو شر الناس وهي شر الناس).

الشِّرَّةُ: توندو تیژی، دەگوترێ: (أعوذ بالله من شِرة الغضب): پەنادەگرم لەسەرڕێژکردنی ڕقو قین ٥ چوستو چالاك، دەگوترێ: (للشباب شِرَّةٌ): گەنجیەتی چوستو چالاکی هەیە.

الشِّرِّيرُ: پیاو خراپو شەڕ خواز.

شَرَزَ الشيئَ شرزاً: شتەکەی پارچە پارچە کرد ٥ بڕییەوە.

أَشرَزَهُ الله: خودا خستیه ناو چورتەو ناخۆشییەوە بەهیچ شێوەیەك رزگار بوونی نییە.

شـارَزَهُ: دژایـەتی کـردو بەرهەڵستکاری کرد.

شَرَّزَهُ: ئەشکنجەی دا ٥ جوێنی پێ دا ٥ (شرّزَ الشيء): شتەکەی شەتەك داو ئەملاو ئەولای بەست.

الشَرْزُ: شەڕو نەگبەتی ٥ توندو گرژی ٥ هێـزو توانـا، دەگـوترێ: (عَذَّبَـهُ الله عذاباً شرزاً): خودا سزای بەئێشی دا.

المشارِزُ: ڕەوشت ناشیرین ٥ شەڕکەری جەربەزەو بێ بەزەیی.

شَرَسَ الجِلدَ: پێستەکەی شێلا، دەستی پێدا هێنا.

شَــرَسَ صــاحِبَهُ: بەقـسە هاوەڵەکـەی تەنگەتاو کرد.

شَرَسَ الدابَةَ: وڵاخەکەی رام کرد.

شَرِسَ شَرَسـاً وشراسَـةً: ڕەوشتی ناشیرین بوو توندو تیژیی نواند دژایەتییەکەی تونـدو بـەهێز بـوو، دەگـوترێ: (شَـرِسَ خلقـه وشرِسـت نفـسُه) ٥ (فهـو شـرِسٌ وأشرس وهي شرسة وشَرْساء).

شَرُسَ شَراسَةً: بەمانا (شَرِسَ)دێ.

شارَسَهُ: دژایەتی کرد.

تَـشَارَسَ القـومُ: خەڵـکەکە دژایـەتییان کرد پێچەوانەی ئەو جوڵانەوە.

الإشـراس: سـرێش؛ مادەیەکـە وەکـوو کەتیرە بۆ شت بەیەکەوە نوساندن بەکاردێ.

الشُرّاسُ: بەمانا (الإشراسُ) دێ.

الــشَرِيسُ: بەدرەوشــت ٥ تونــد ڕەو لەدژایەتیکردن دا.

الشُرْسُوفُ: سەری پەراسو بەلای گەدەوە ٥ (ك: شَراسيف).

شَرْشَرَ الماءُ ونحوه: ئاوەکە دڵۆپ دڵۆپ هاتە خوار ٥ تکەی کرد.

شَرْشَرَ السكينَ ونحوه: کێردەکەی تیژ کرد ٥ دەمی کێردەکەی وەکوو مشار دابڕ دابڕ کرد.

شَرْشَرَ الشيءَ: شتەکەی گەستو دوایـی فرێـی دا ٥ شـتەکەی جـوێو دوایـی تفی دایەوە.

الـشُراشِرُ: قـەراخی بـاڵ؛ سـەرە بـاڵ ٥ جەسـتەو قــەبارەو قورسـایی، دەگـوترێ: (ألقـى عليـه شراشِـرَهُ): خەمو خەفەتی خۆی بەسەردا دان، یـان لـە خۆشەویـستیو بەخەمـەوە بوونی خۆی بەسەر دا دا ٥ تاکەکەی (شُرْشُرَة).

الــشُرْشُرُ: (شِـواء شُرْشُـرٌ): شـەوایەیەکە چەوری گۆشتەکەی تك تك دێتە خوار.

الشَرْشَرَةُ: داسی بچوك، داسی دروێنـەی بچوك.

**الشِّرْشِرَة**: پارچەی شت ٥ (ك: شَرَاشِر).

**الـشِّرْشورُ**: باڵندەیـەکی بـچوکە وەکـوو چۆلەکە وەهایە.

**شَــرَطَ الجلـدَ ونحـوه شَــرْطاً**: پێـستەکەی هەڵدڕی کونێکی بچوکی تێکرد.

**شَـرَطَ لـه أمـراً**: بـۆی بـەرعودەی کارێـك بوو.

**شَرَطَ عليه أمراً**: کارێکی خستە ئەستۆی.

**شَرِطَ فلاناً**: فلانکەس کەوتە نـاو کارێـکی ئەستەمو گەورەوە.

**أشْـرَطَهُ**: نیـشانەی بۆدانـا، دەگـوترێ: (أشْرَطَ نفسه بكذا): نەفسی خۆی بۆ ئەوشتە ئامادە کرد.

**أشْرَطَ الرسولَ الى فـلان**: بەپەلـە پیـاوی نارد بۆلای فلانکەس.

**أشْرَطَ فلاناً لعمل كذا**: فلانکەسی ڕاسپارد بۆئەوەی بەسەر فلان کاردا ڕابگا.

**شارَطَه على كذا**: مەرجی لەسەر دانا.

**اشْتَرَطَ عليه كذا**: بەمانا (شَرَطَ)دێ.

**اشْـتَرَطَ القـومُ كـذا**: خەڵـکەکە فـلان شتیان کردە نیشانە بۆ خۆیان.

**تـشارطا علـى كـذا**: ئـەو دوووکەسـە هەریەکـەیان مـەرجی خـۆی لەسـەر ئەوی تریان دانا.

**تَـشَرَّطَ في عملـه**: لەکارەکـەی دا دەسـت ڕەنگینیو وردەکاری نواند.

**الـشَّرْط**: مـەرج؛ دوو کـەس یـا زیـاتر لەمامەڵـــەو شـــتی وادا مـــەرج بۆیەکتری دادەنێن بۆئـەوەی پێیـەوە پابەنـــد بـــن ٥ لـــەفیقهو قـــانون دا شەرت ئەوەیە شتەکە بێ ئەو تـەواو نەبێ لەپێکهاتەی شتەکەش نـەبێ ٥ بـەلای ئەحوییەکانـەوە پەیـدابوونی شتێـــکە بـــەهۆی شتێـــکی تـــرەوە، پەیوەست بووونی شتێکە بەشتێکی تـرەوە بـەهۆی ئامرازێـکەوە ٥ (ك: شـــروط) ٥ ئـــامرازی شـــەرت وەکـــوو (إنْ، مَنْ، مهما، ...هتد).

**الشَّرَطُ**: نیشانە ٥ (ك: أشراط) ٥ قورئان دەفـەرموێ: ﴿فَقَـدْ جَـاءَ أَشْـرَاطُهَا﴾ بێـگومان نیشانەکانی قیامەت پەیـدا بوون.

**الـــشَّرَطان**: دوو ئەســـتێرەن پێیـــان دەگـوترێ (قرنـا الحمـل) لەسـەرەتای بەهاردا دەردەکەون.

**الـشُّرْطة**: پـۆلیس ٥ تاکەکـەی (شُـرْطي وشُـرَطي)یـە ٥ (صـاحِبُ الـشرطة): سەرۆکی پۆلیس.

**الشَّريط**: حەبلی بادراو ٥ پلیتەی چرا ٥ تیلمـە چـەرمو تیلمـە نـایلۆن کـە درێـــژو تەســـك بـــێ ٥ جانتـــاو تورەکەیەکی بچوکە ئـافرەت عـەترو پێداویـستی مکیـاجی خـۆی تێـدا هەڵدەگرێ.

الشريطة: بەمانا (الشَرْط)دێ.

المِشْرَطَ: چەقۆو گوێزانی پزیشك بۆ بەكارهێنانی لە نەشتەرگەریدا.

المِشْرَطَة: بەمانا (المِشْرَط)دێ ٥ (ك: مشارط).

شَرَعَ الوارِدُ شَرْعاً: دەمی خستە ناو ناوەكەوەو خواردیەوە.

شَرَعَ لِلنَزِلُ: خانوەكە لەرێگاكەوە نزیك بوو.

شَرَعَ فلان يفعل كذا: فلانكەس دەستی بەفلان كار كرد.

شَرَعَ الشيئَ: شتەكەی بەرز كردەوە، دەری خست.

شَرَعَ الدينَ: ئایینەكەی دانا روكن‌و مەرجەكانی رونكردنەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿شَرَعَ لَكم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا﴾.

شَرَعَ الأمْرَ: كارەكەی بەباش داناو پەسەندی كرد.

شرع الطريق: رێگاكەی خۆش كردو تەختی كرد.

شَرَع للنزل: خانوەكەی لەسەر رێگای دەرچوو كراوە بنیات نا .

شَرَعَ البابَ: دەرگاكەی خستە سەر رێگای دەرچوو كراوە.

أشْرَعَ الشَّيئَ: شتەكەی دەرخست، بەرزی كردەوە.

أشْرَعَ نحوه الرمْحَ: رمبەكەی بۆ راداشت، روی رمبی تێكرد.

أشْرَعَ الطريقَ: رێگاكەی درێژكردەوەو تەخت‌و خۆشی كرد.

أشْرَعَ النافذة الى الطريق: پەنجەرەی سەر رێگای كردەوە.

أشْرَعَ الدابةَ: ولاخەكەی بردە سەرئاو.

شَرَّعَ: بۆ موبالەغەو زێدەرۆیی مانای (شَرَعَ)دێ.

شَرَّعَ البيت: خانوەكەی بەرزكردەوە.

شَرَّعَ السفينةَ: شیراعی بۆ كەشتییەكە دروست كرد.

اشترعَ الشريعة: قانون‌و یاساو شەریعەتی دانا.

الشُراعَة: سەر لاشیپانە، تاكێكە دەكەوێتە سەر دەرگا، بۆ هەواودان‌و روناكی.

الشَرْعُ: رێگاو بان ٥ رێبازو یاسایەك خودا داینابن بۆ ئادەمیزاد هەروا دەگوترێ: (الناسُ في هذا شرع واحد): ئادەمیزاد لەم بوارەدا یەكسانن.

الشَرْعُ: یەكسانی، دەگوترێ: (نحن في هذا شَرَعٌ).

الشِرْعُ: هاوشان، دەگوترێ: (هما شِرعان) ٥ هەروا ناوە بۆ وەتەری عود.

الشَّرَعَةُ: کەپرو سابات ٥ (ك: أشراع).

الشِّرْعَةُ: ڕێبازو پەیڕەوو پڕۆگرام ٥ مەزهەبو ڕێبازی ڕاست ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾.

الشّريعة: ئەو بەرنامەیەی خودا بۆ بەندەکانی داینـاوە لەبوار ی بیرو باوەڕو یاساو ڕێساوە ٥ ڕێبازو پڕۆگرام ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا﴾: دەراوی ئاو کەبەبێ جامولکەو پەرداخ دەتوانرێ دەمی پێوەنێیو ئاوی لێ بخۆیەوە ٥ بەربێلاو هەیوان.

المَشْرَعَةُ: پلوسکی ئاو ٥ دەراوی ئاو ٥ (ك: مَشارِع).

المشروعُ: ئەوەی شەرع بەڕەوای بزانێ ٥ کارێك بخرێتە بەرنامەوە بۆ ئەنجامدان ٥ (ك: مشروعات).

شَرَفَت الدابَّةُ شروفاً: وڵاخەکە بەسەر شتەکەی دا ڕوانی.

شَرَفَ الحائطَ: گوێسەبانەی بۆ دیوارەکە کرد.

شَرُفَ الرجلُ: پیاوەکە شەریفو مەردبوو پلەو پایەی بەرز بۆوە، دەگوترێ: (هو شريف) ٥ (ك: شُرَفاء وأشراف) (وهن شرائف).

أشْرَفَ الشيءُ: شتەکە بەرز بۆوە، گران بوو.

أشْرَفَ عليه: لەبەرزاییەوە تێی ڕوانی ٥ چاودێری کردو بەسەری دا ڕاگەیی ٥ لێی نزیك بۆوە، دەگوترێ: (أشْرَفَ على الموت): هەروەها بەمانای بەزەیی پێداهاتنەوە دێ.

أشْرَفَ الشيءَ لـه: شتەکەی بۆ جێگیر کرد، ئەوشتەی بۆ گونجاند.

أشْـرَفَ المِرْقـاةَ: چووە سەر پەیژەو بەرزەكو مەصعەد.

شارَفَهُ: لەبنەچەو باوكو باپیرەوە خۆی هەڵنایەوەو شانازی بەسەردا کرد.

شـارَفَ الـشيءَ: لەبەرزاییـەوە پێیـدا ڕوانیو سەیری کرد.

شارَفَهُ: لێی نزیك بۆوە.

شَرَّفَ البنـاءَ: گوێسەبانەو دیکۆری بۆ خانوەکە دروست کرد.

شَـرَّفَ فلانـاً: ڕێـزی لـەفلان گـرتو بەگەورەی دانا ٥ وەسپی دا.

تَشَرَّفَ الرَّجُلُ: پیاوەکە شەرەفیاب بوو پلەو پایەی بەرز بۆوە.

تَـشَرَّفَ للـشَيْءِ: چاوەڕوانی شـتەکەی کرد، بەهیوای بوو.

تَـشَرَّفَ للفتنـةِ: توشی فیتنـەو ئاشوب بوو.

تَـشَرَّفَ الـشيءَ: دەسـتی خـستە سـەر

بروٚکانی بوٚ ئەوەی تیشکی خوٚر ئازاری چاوی نەداو بەئاسانی شتەکە لەبەرزیو دووری ببینیّ.

**تَشَرَّفَ المرقاةَ وعليها:** چووە سەر پەیژەو بەرزەکەکە.

**اِسْتَشرف:** راست بۆوەو خوّی بەرز کردەوە.

**اِسْتَشْرَفَ الشيئَ:** چاوی هەلبّری بوّئەوەی لەبەرزییەوە بیبینیّ.

**أشراف الوجه:** دوگوێچکەو لوت.

**الشّارِف من الدّواب:** ولاّخی پیر ٥ (ك: شَوارِف وشُرّف).

**الشّارِف من الأشياء:** شتی کوّنو عەنتیکە.

**الشّارُوفُ:** گەسکە ٥ (ك: شواريف).

**الشُّرافَةُ:** دیکوّرو زەوانیدی وەها کە شتەکەی پیّ برازیّنریّتەوە.

**الشَّرَفَ:** شوێنی بەرز کەلێیەوە بروانیتە ئەملاو ئەولا، دەگوتریّ: (هو علی شرف من كذا) ٥ بەسەری دا دەروانیّو لێیەوە نزیکە ٥ بەرزیو شکوّمەندیو پەسنی.

**الشُّرْفَةُ:** ژووری شت ٥ لای سەروی شت ٥ ئەگەر بوّ بیناو بالّەخانە بەکاربیّ بەو دیکوّرو زەخرەفەیە دەگوتریّ کەلەسەروی بیناکەوە دروست دەکریّ بەمەبەستی رازاندنەوە ٥ یان هەوره بانە.

**المشارِفُ:** (مشارف الأرض): بەرزاییەکانی زەوی ٥ تاکەکەی (مَشْرَف) ٥ (مشارِف العراق): ئەو گوندە عەرەبانەی سەر سنوری رەشەخاکی عێراقن.

**المَشْرَفِيّ:** شمشێرێکە لەولاّتی مشارف دروست دەکریّ یان لەوێوە دەهێندریّ.

**شَرَقَت الشمسُ شَرْقاً:** خوّر دەرکەوت، خوّر هەلاّت.

**شَرِقَ المكانُ:** شوێنەکە خوّر لێی دا، خوّری تێکەوت.

**شَرِقَ الشيئُ:** شتەکە تێکەلّ بوو.

**شَرِقَ لونه:** رەنگی سور بوو.

**شَرِقَ البلحُ:** خورما بەرسیلەکە سور هەلّگەرا.

**شَرِقَ وجهه:** خەجالّەت بوو، رەنگی سور هەلّگەرا.

**شَرِقَ الدمُ بجسده:** خوێنەکە دەرکەوتو رەوان بوو.

**شَرِقَ فلان بالماء:** فلاّنکەس بەئاو قورگی گیرا، دەگوتریّ: (شَرِقَ بريقه وَشَرِقَ الموضعُ بأهله): دەمی پڕبوو لە تف ٥ شوێنەکە پڕبوو لەخەلّكو تەنگەبەر بوو.

**شَرِقَت الآلةُ:** ئامێرەکە (مەکینەکە) بەسوتەمەنییەکەی خنکا.

**شَـــرِقَت الأرضُ:** زەوییەکـــە بـــەهۆی ئاودێرنەکردنی بوو بەسوتەمەڕۆ.

**أشْـــرَقَت الـــشمسُ:** خـــۆر لەئاســـۆوە دەرکەوت و گزنگی خۆی بـەزەوی دا بـڵاو کـردەوە، دەشـگوترێ (أشـرقت الأرضُ): زەوی بەتیـــشکی خـــۆر رونـاك بـۆوە ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَأَشْرَقَتِ الْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا﴾.

**أشْـرَقَ وجْهَـهُ:** روخـساری درەوشـایەوە جوانی لـێ دەتکا.

**أشْرَقَ الـبلحُ:** بەرسیلە خورماکە سور هەڵگەڕا.

**أشْرَقَ القـومُ:** خەڵـکەکە کەوتنـە کـاتی خـــۆر هەڵاتنـــەوە ٥ قورئـــان دەفەرموێ: ﴿فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ﴾.

**أشْرَقَ فلاناً:** قورگی فلانکەسی گیراند.

**أشْرَقَ الثـوب بالـصبغ:** زێـدەڕەوی کـرد لەبۆیەکردنی قوماشەکەدا.

**شَرَّقَ:** لای خۆرهەڵاتی گرت.

**شَـرَّقَت وجهُـهُ:** دەمو چـاوی گەشـایەوە جوانی لـێ تکا.

**أشْرَقَتْ الأرضُ:** زەوییەکە بێ بـەروبووم بـــوو، ئـــاوی لـــێ بـــڕاو بـــوو بەسوتەمەڕۆ.

**أشرق اللحمُ:** گۆشتەکەی توێ توێ کـرد لەبـەر خـۆر هـەڵی خست تـا وشـك بێتەوە.

**إنشرق اللحمَ:** گۆشتەکەی توێ توێ کرد لەبـەر خۆرهـەڵی خـست تـا وشـك بێتەوە.

**انـشَرَقَّت القـوس:** قەوسـەکە دوو لـەت بوو.

**تَـــــشَرَّقَ:** خــــۆی بەرهــــەمتاو دا، لەچێـشتەنگاودا لەبـەر بەرۆچـك دانیشت بۆ ئەوەی گەرمی بێتەوە.

**الإشـراق:** پەیـدابوونی نـورو روناکیـە لەجیهانی هەست پـێ نـەکراوەوە بۆ نـــاو زەیـــن، کـــە دەبێتـــە هـــۆی پەیدابوونی زانست و زانیاری.

**التشریق:** (أیـام التـشریق): سـێ رۆژەی دوای جـەژنی قوربـان رۆژی (١٢-١٣-١٤)ی مـانگی ذیلحجـە ٥ هـەروا بـە نوێژی جەژنی قوربانیش دەگـوترێ ٥ لەحەدیثدا هاتووە (لا ذبح الا بعد التشریق).

**الـشارِقُ:** خـۆر ٥ لای خۆرهـەڵات ٥ (ك: شـَرَق)، دەشـگوترێ: (أحمـر شـارق): سورێـکی زۆر سورە.

**الـشَّراقي:** لـەزاراوەی خەڵـکی میـصردا ئـەو زەوییەیـە ئـاوی روبـاری نیـل نەیگرێتـەوە ٥ کـە ئـاو دراو بـەرو بـوومی باشـی بـوو پێـی دەگـوترێ: (ريّ الشراقي).

**الــشَّرْقُ:** خــۆر ٥ لای خــۆر هــەڵات ٥

(شـجرة شـرقية): ئـەو درەختەيـە لەخۆرهەڵاتـەوە خـۆر لێـی بـدا تـا نیوەڕۆ.

الشَّرَقُ: خۆر ٥ (لحم شَرَقٌ): گۆشتی بێ چەوری.

الشَّرِيقُ: خۆر هەڵات ٥ (ك: شُرُقٌ).

المـشارقة: دانیـشتوانی خۆرهـەڵات ٥ تاكەكەی (مشرقي)یە.

المَـشْرِقُ: لای خۆرهـەڵات ٥ وڵاتـە ئیـسلامییەكانی خۆرهـەڵاتی نیـوە دورگەی عەرەبی ٥ (ك: مشارق).

المَـشْرِقان: خۆرهـەڵاتو خۆرئـاوا (بەشـێوەی تـەغلیب) ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿يَا لَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ﴾.

المِشْرقان: تیـشكێكە لـەدرزی دەرگـاو پەنجەرەوە دەچێتە ژور ٥ یان نـاوە بۆ خودی درزەكە ٥ (ك: مشاريق).

شَرِكت النعلُ شركاً: شیراكی نەعلەكە بچڕا.

شَرَكَ فلاناً في الأمر شِركاً وشَرِكةً وشِركةً: فلانكەس بوو بەهاوبەش لەكارەكەداو بۆ هەریـەكێ لەهاوبەشـەكان بەشێـكی دیاریكراو هەیە.

أشْرَكَهُ في أمره: خستیە ناو كارەكەیەوە ٥ كـردی بەهاوبـەش، دەگـوترێ: (أشرك بالله): هـاوەڵی بـۆ خـودا دانـا، شـتی تـری كـرد بەهاوبەشـی خـودا لەخودایەتیو دەسـەڵات دا ٥ قورئـان دەفەرموێ: ﴿يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ﴾.

أشْـرَكَ النعـلَ: شـیراكی بـۆ نەعلەكـە دروست كرد.

شـاركە: هاوبەشـی كـرد، بـوو بـە هاوبەشی، دەشگوترێ: (فلان يشارك في علـم كـذا): فلانكـەس لـەفلان زانـست دا هاوبەشـی هەیـە شتێـكی لـێ دەزانێ.

شَرَّكَ بينهم: كردنی بەهاوبەش.

شَـرَّكَ النَّعْـلَ: شـراكی بـۆ نەعلەكـە دروست كرد.

اشترك الأمـرُ: كارەكە تێـكەڵو پێـكەڵ بوو.

اشترك فـلان في كـذا: فلانكـەس لەفلان پرۆژەدا هاوبەشی كرد شتێكی پارە خـستە نـاو پرۆژەكـەوە بـۆ ئـەوەی سـودی لـێ وەرگـرێ، دەگـوترێ: (اشـترك في الـصحيفة أو في الـسكة الحديدية).

اشـترك الـرجلان: ئـەو دوو پیاوە بوون بەهاوبەشی یەكتر.

تشاركا: هاوبەشی یەكتریان كرد.

الإشتراكية: ڕێبازێكی سیاسیو ئابورییە پەیڕەوو پرۆگرامی ئەوەیە دەوڵەت ئـامێرو كەرەسـەی وەبـەرهێنان

كۆنترۆڵ بكاو سەروكاريان بكاو بەشێوەی عەدالەت بەرو بوومەكەيان بەسەر دانيشتوانەكان دا دابەش بكا يەكسانی بخاتە ناو كۆمەڵگاوە ٥ (لەڕاستی ئەوە هەر قسەيەو چەواشەكردنی جەماوەرەو لەواقيع دا شتێكی ترە) (كلمة حق يراد بها الباطل).

**الشِّرَاك**: شيراكی نەعل كەدەكەوێتە پشتەپێ ٥ (ك: شُرُك وأشرُك).

**الشِّرْكُ**: بەش‌و بار ٥ (ك: أشراك) ٥ بڕوای فرەخوايی.

**الشَّرَك**: داوی نێچيرەوان ٥ (ك: أشراك وشُرُك).

**الشِّرِكَةُ**: گرێبەستێكە لەنێوان دووكەس يان زياتر بۆ ئەنجامدانی پرۆژەی هاوبەش.

**المُشْتَرَك**: (رجل مشترك): پياوێكی خەمۆكە، قسە لەگەڵ خۆی دەكا ٥ (لفظ مشترك): وشەيەكە زياد لەمانايەكی هەيە ٥ (مال مشترك): ماڵێكی هاوبەشە زياد لە خاوەنێكی هەيە.

**شَرَمَ الشيءَ شَرْماً**: لەلاوە شتەكەی دادڕی، دەگوترێ: (شرم أنفه وشرم أذنه): لەلای سەروی لێی بڕی كەمێكی لێ كردەوە ٥ (فهو مشروم وشريم).

**شَرَمَ له من ماله**: لەماڵ‌و سامانی خۆی شتێكی كەمی دايە.

**شَرِمَ شَرَماً**: درزی برد، قەڵشا، دەگوترێ: (الشرَّمَ الجلدُ): پێستەكە قەڵشت ٥ (تشرَّمَ نواحي الكتاب): قەراخی كتێبەكە شەقار شەقار بوو.

**الشَّرْم**: هەر درزو دەلاقەيەك لەديوار يان لەكێو دابێ‌و داخراوبێ ئەم ديواو ديونەبێ.

**الشَّرْم في البحر**: بەمانا خليجی دەريا (قوناو)دێ.

**شرنَقَةُ**: بڕيەوە.

**الشَّرانِقُ**: كاژ؛ توێژی مار كەساڵانە فڕێی دەدا.

**الشَّرْنَقَةُ**: قۆزاخە؛ پەردەيەكی چنراو لەهەوداى باريك بڕێ جرو جانەوەر بەدەوری خۆی دا دەيچنێ بۆ پارێزگاری كردنی بۆ نموونە كرمی ئاوريشم.

**شَرِهَ الى الطعام وغيره**: حەزی لەخواردن كرد زۆر بۆی چلێس بوو (فهو شره وشَرْهانُ وهي شرهة وشرهي).

**شَرَاهُ شِرىً**: فرۆشتی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ﴾ ٥ ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاء مَرْضَاتِ اللَّهِ﴾ ٥ بەنرخ‌و بەهای خۆی شتەكەی هەڵگرت.

**شَرَى الله فلاناً**: خودا فلانكەسى توشى نەخۆشى خرۆيلكە كرد.

**شَرِيَ في الأمر**: توند ڕەوى لەكارەكەدا كردو زۆرى لێ كۆڵيەوە ٥ بەتوندى تێ نووساو خێرا هەنگاوى نا، دەگوترێ: (شَرِيَ الرجلُ في غضبه وشَرِيَ الفرسُ في سيره).

**شَرِيَ البرقُ**: بروسكەكە روناكىو تيشكەكەى درێژەى كێشا.

**شَرِيَت العينُ بالدمع**: چاو بەريز فرمێسكى رشتن.

**شَرِيَ الجلدُ**: پێستى خرۆيلكەى دەردا ٥ (فهو شَرٍ).

**أَشْرَتِ الشَّجَرَةُ**: درەختەكە پەلكە گەڵاكانى لەزەوى خشان بەناوى دا بڵاو بوونەوە.

**أَشرى القومُ**: خەڵكەكە خۆيان شوبهاند بەكۆمەڵى شورات.

**أشرى بين القوم**: شەڕو ئاشوبى خستە ناو خەڵكەكەوە.

**أشرى الشيءَ**: شتەكەى خوار كردەوە.

**أشرى فلاناً بكذا**: بەفلان شت فلانكەسى هەڵنا بۆ كردنى شتێك.

**شاراه مشاراةً وشِراءً**: پێى فرۆشت مامەڵەى لەگەڵ كرد ٥ زۆر توند ڕەوى كرد لەكێشەو نيزاعەكەى دا.

**اشتراه**: بەبەهاو نرخى خۆى شتەكەى وەرگرت ٥ لێى كڕى ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ﴾.

**تَشَرَّى القومُ**: خەڵكەكە بڵاوەيان لێ كرد ٥ چوونە نێو پێرو تاقمى شوراتەكانەوە.

**اسْتَشْرَى**: خرۆيلكە يان مێكوتەى جەستەى زۆر بوون.

**اِسْتَشرى الشرُّ أو الداءُ**: شەڕو ئاژاوەكە يان دەردەكە پەرەى ستاند لەوزە دەرچوو.

**الشاري**: كڕيار ٥ فرۆشيار ٥ كەسێك لەبەرخاترى خودا خۆى جانفيدا بكا، خۆبكاتە قوربانى ٥ (ك: شراة).

**الشَّرى**: بلقى سورن وەكوو فلسو پەنجاىو شتى وا لەسەر جەستە پەيدا دەبن خرويان تێدايەو ئازاريشيان هەيە ٥ كێوو كەژ ٥ شوێنێك شێرى زۆربێ، دەگوترێ: (هم أُسْدُ الشرى): ئەوان ئازاو بەجەرگو مەردن ٥ ناوچە ٥ (ك: أشراءُ).

**شَرْوَى الشيءِ**: وەكوو ئەوشتە ٥ هاوتاو هاوشێوەى شت، دەگوترێ: (هو لايملك شروى نقير) ٥ ئەوپياوە داراى توێكڵە خورمايەك نيە، هەژارو لاكەوتەيە.

**الشَّرْيُ**: کاڵەکە مارانە ٥ ئەمامە خورما کە بەهۆی دەنکەکەیەوە بڕوێ ٥ تاکەکەی (شَرْيَةٌ).

**الشِّرْيان**: ئەو ڕەگەیە خوێن لەدڵەوە دابەش دەکا بۆ جەستە ٥ (ك: شرايين).

**الشَّرية من النساء**: ئافرەتێکە هەرکچی ببن.

**المُشتري**: گەورەترین هەسارەی گەڕۆکە ٥ لەچەرۆك‌و ئەفسانەکان دا بەگەورەی خوداکانیان داناوە.

**شَزَبَ الحيوانُ شزوباً**: حەیوانەکە کزو لاواز بوو.

**شَزَبَ المكانُ**: شوێنەکە ڕەقەن‌و کڕێن بوو ٥ (فهو شازب) ٥ (ك: شُزَّبٌ) ٥ (وهي شازبة) ٥ (ك: شوازِب).

**شزَّبَ الحيوانَ**: حەیوانەکەی کزو لاواز کرد ٥ ژێر باری کرد.

**الشَّزيبُ**: پەلەدار پێش ئەوەی راستەو پاستە کرابێ ٥ (ك: شُزُوب).

**شَزَرَ الحَبْل شَزراً**: حەبلەکەی بادا.

**شَزَرَ فلاناً واليه**: بەتیلەی چاو سەیری کرد، بەزۆری لەکاتی رق هەڵسان‌و تورەبون دا روودەدا.

**شَزَّرَ بالسِّنان**: زەبری لێ دا لەراست‌و چەپ، بەسەرە رەب هەلا هەلای کرد.

**تَشازَرُوا**: بەتیلەی چاو سەیری یەکتریان کرد، خێسەیان لەیەکتر کرد.

**إسْتَشزَرَ الحبلُ**: حەبلەکە گشت بوو زۆری باخوارد ٥ امرؤ القيس دەڵێ: (غذائرها مستشزرات الى العلا).

**استَشزَرَ الحَبلَ**: حەبلەکەی زۆر بادا ٥ گشتی کرد.

**الشَّزْرُ**: سەرکردنی دڕدۆمی‌و نەویستی، تەماشاکردن‌و خێسە لێ کردن، بەچاوی تەماشاکردن.

**شَزِنَ شَزَناً**: نیشاتی پەیداکرد، بەردەوام بوو لەسەر ئیش‌و کار ٥ ماندو بوو لەئیش کردن.

**تَشَزَّنَت الأرض**: دەمارە رەق‌و بەردەزڕوێی زەوییەکە درێژ بووە.

**تشَزَّنَ الشيءُ**: شتەکە پتەو بوو.

**تشزَّن الأمر عليه**: کارەکەی لێ قورس بوو، بۆی ئەنجام نادرێ.

**تَشَزَّن للأمر**: خۆی بۆکارەکە ئامادە کرد.

**تَشَزَّنَ قِرنَه**: هاوشانەکەی خۆی بۆڕدا، بەسەری دا زاڵ بوو.

**تَشَزَّنَ الشاةَ**: مەڕەکەی خستە سەر زەوی بۆئەوەی سەری ببڕێ.

**الشَّزَنُ**: پارچە زەوی ڕەق، دەماری پتەو توند ڕەوشت، تورەو تڕۆ، سەر ڕەق.

**الشَّزَن من الشيء**: تەنیشت‌و ئەملاو ئەولای شت، دەورو بەری شت ٥

دوریی ٥ (ك: شُزُنْ وشُزُون).

**الشُزُنُ**: ناوچه ٥ لای شت ٥ نزیك شت.

**شَسَعَ الشیئُ شُسُوعاً**: شتەکە دوور کەوتەوە، دوور بوو، دەگوترێ: (شَسَعَ فلان عن بلده ووطنه): فلانکەس لەخاكو وڵاتی دوور کەوتەوە.

**شَسَعَ بفلان**: فلانکەسی دوورخستەوە ٥ (فهو شاسع) ٥ (ك: شُسَعْ) ٥ (وهي شاسعة) ٥ (ك: شَوَاسع).

**شَسَعَ النعلَ**: تیلمە چەرمی بۆ نەعلەکە دانا بۆ ئەوەی قامکی قاچی تێ بکا لەرۆیشتن دا نەعلەکە بەقاچییەوە هەڵبسێ.

**شَسِعت النعلُ**: نەعلەکە تیلمە چەرمەکەی پچڕا، ئەو تیلمە چەرمەی قامکی قاچی تێ دەکا پچڕا.

**أشسَعَ النعلَ**: تیلمە چەرمی بۆنەعلەکە دروست کرد.

**أشسَعَ الشیئَ**: شتەکەی دوور خستەوە.

**شَسَّعَ النعلَ**: تیلمە چەرمی بۆ نەعلەکە دروست کرد واتە دەق بەمانا (شَسَعَ النعلَ)ی.

**الشِسْعُ**: تیلمە چەرمێکە بەدیوی سەرەوەی نەعلەوە چەسپ دەکرێو شوێنی پەنجەی قاچی لێ دروست دەکرێ بۆئەوەی پەنجە گەورەی قاچی تێ بکرێو لەرۆیشتن دا نەعلەکە بەقاچەوە هەڵبسێ ٥ (ك: أشساع وشسوع).

**الشِسْعُ**: قەراخی شوێن، ئەمبەرمو بەری شوێن، دەگوترێ: (نزلوا بِشِسْعِ الوادي): لەلایەکی شیوەکە دابەزین ٥ (نزلوا بِشِسْعِ الصحراء): لەم سەرمو سەری سارایەکە هەڵیان داو نیشتە جێ بوون.

**الشِسْعُ من الأرض**: شوێنی تەنگەبەری زەوی.

**شِسْعُ المال**: باقی ماندەی ماڵ، بەرماوە، دەگوترێ: (لە شِسْعُ مال): پیاوێکی ماڵ خۆشەویستەو باش سەرو کاریی دەکا.

**الشَسَفُ**: نانی وشك، کولێرەی رەق هەڵاتوو.

**الشَیفُ**: خورمای نەگەیشتوی شەقار بوو ٥ گۆشتێك تەڕایی پێوە نەمێنێو خەریك بێ وشك بێتەوە.

**الشُشْمُ**: شتێکە دەهاڕدرێو زۆر ورد دەکرێ بۆ دەرمانی چاو بەکار دەهێندرێ یان بۆ بەهێزکردنی بینایی چاو وەکوو کل لەچاو رادەدرێ.

**شَصَبَ العیشُ**: ژیانو گوزەران ناخۆش بوو، کەمو کوڕی تێکەوت ٥ (فهو شاصِبٌ).

**شَصِبَ المكانُ شَصَباً**: شوێنەکە بێ بەروبووم بوو.

**شَصِبَ الأمرُ**: کارەکە قورس بوو ئاستەنگی هاتە پێش ○ (فهو شَصِبٌ).

**الشَّصْبُ**: کەمو کوڕیو گرانیو ژیانی کوللە مەرگی ○ (ك: أشصاب).

**الشَّصِيبةُ**: بەمانا (الشَّصْبُ)دێ ○ (ك: شَصائب).

**شَصَرَ الثَّورُ**: کەڵەگا کێوییەکە بەشاخەکانی شەرە قۆچی کرد.

**شَصَرَ فلاناً بالرمح**: بەرمب لەفلانکەسی دا.

**شَصَرَت الشوكةُ فلاناً**: چقڵەکە لەفلانکەس ڕاچوو.

**شَصَرَ الثوبَ**: قوماشەکەی بەتەقەڵی گەورە گەورە درووە ○ تەقەڵەکانی لێک دوور بون.

**الشّاصِرُ من الظباء**: ئاسکێک پێ بگاو هێزو توانای بازدانو ڕاکردن پەیدا بکا، یان بگاتە ئەو ئاستەی شەڕە قۆچ بکا.

**الشّاصِرة**: مێینەی (الشاصر) ○ داوێکە دڕندەی پێ کەمەند دەکرێ ○ (ك: شواصِر).

**الشِّصَار**: تەختەدارێکە دەکرێتە لوتی حوشترەوە بۆئەوەی جڵەو خۆش بێ.

**الشَّصَرُ من الظباء**: بەمانا (الشاصر) دێ.

**شَصَّ فلان شصّاً**: فلانکەس بەتوندی دەستی بەسەر شتەکەدا گرت ○ ددانی خۆی لێ جیڕکردونو بەری نادا.

**شَصَّت الناقةُ ونحوها**: حوشترەکە شیری وشکی کرد یان شیری کەم بوو.

**شَصَّت السنةُ**: ساڵەکە بێ بارانیو گرانیو قاتو قڕی بوو.

**شَصَّت المعيشةُ**: ژیانو گوزەران ناخۆش بوو ○ (فهي شَصُوص).

**شَصَّ فلاناً عن الشيئ**: فلانکەسی لە شتەکە دورخستەوە لێی مەنع کرد.

**أشَصَّهُ عن الشيئ**: بەمانا (شَصَّهُ)دێ.

**الشِّصُّ**: ئاسنێکی سەر قولاپە ماسی پێ دەگیرێ.

**الشَّصُوصُ من النوق**: حوشتری کەم شیرە ○ (الشصوص من السنين): ساڵی بێ بارانیو قاتو قڕییە ○ (ك: شَصائص وشِصاص).

**شصا السَّحابُ شَصُواً**: هەورەکە بەرز بۆوە.

**شصت القرية**: کوندەکە پڕبوو لەناو هەنگڵەکانی بەرز بوونەوە.

**شصا بَصَرُهُ**: چاوی بەملۆق وەستا.

**شصت عينُه**: چاوی تیل ڕوان بوو، خێل بوو، ڕوی لەشوێنێکەو چاوی لەشوێنێکی تر.

**شصا الميتُ شُصُوّاً وشُصِيّاً**: مردوەکە هاوسا ٥ دەستو قاچی بەرز بوونەوە ٥ (هو شاصٍ وهي شاصية) ٥ (ك: شواص).

**أشصى بَصَرَهُ**: چاوی بەرز کردەوە.

**الشّصْوُ**: جورتەو ناخۆشی ٥ سیواك.

**شَطَأَ الزَّرعُ شطئاً وشطوءاً**: کشتوکاڵەکە چروزەی کرد درەختەکە چرۆی کرد.

**شطئتِ الأمُ بالولد**: دایکەکە منداڵی بوو.

**شَطَأَ الزَّرْعُ**: بەمانا (شَطَأَ)دێ، دەشگوترێ: (أشطَأت الشجرةُ بغصونها): درەختەکە چرۆی کرد ٥ (أشطأ الوادي): دۆڵەکە لافاوی لێ هەڵسا.

**شاطَأتُهُ**: من لەمبەر روبارو ئەو بەوبەر روبارەوە ڕۆیشتین.

**شاطِئ النهر والوادي**: قەراخ چۆم کەناری شیو ٥ (ك: شواطئ وشطآن).

**الشّطْءُ**: ئەمامی درەخت ٥ چرۆی درەخت ٥ گەڵای درەخت لەسەرەتای دەرکەوتنی دا ٥ (ك: شطوء وأشطاء).

**شَطْءُ النهر والوادي**: کەناری روبارو شیوو دۆڵ.

**شَطَبَ عنه شَطْباً**: لێی لا دا.

**شطب الأديمَ**: چەرمەکەی هەڵدڕی.

**شَطَبَ الكاتِب الكلمةَ**: نووسەرەکە وشەکەی کوژاندەوە.

**شطَبَ القاضي الدعوى**: قازی داواکەی چەرت کردو لەلیستی داواکان دەری هێنا لەبەر هۆکارێکی یاسایی.

**شَطَّبَ**: زێدەڕۆیی لەمانای (شَطَبَ)دەگەیەنێ، دەشگوترێ: (شَطَّبَ العملَ): کارەکەی کۆتایی پێ هێنا.

**شَطَّبَ اللحمَ**: گۆشتەکەی توێ توێ کرد، قەڵاشتییەوە.

**شَطَّبَ السيفُ جسمه**: شمشێرەکە شوێنکەی لەجەستەدا جێ هێشت.

**إنْشَطَبَ الماءُ**: ئاوەکە ڕەوان بوو.

**الشّاطِب**: (طريق شاطب): ڕێگای خوارو پێچاو پێچ ٥ (مكان شاطب): شوێنی دوور ٥ (رمية شاطبة): هاویشتنێك ئامانج نەپێکێ، لەدەورو بەری نیشانەکە بدا.

**الشُّطْبُ**: (شُطْبُ السيف): ئەو خەتو هێڵانەن کەوەکوو جەوهەر لەشمشێرەکەدا دەبینرێن ٥ تاکەکەی (شُطْبَةٌ).

**الشُّطْبُ**: درێژی ڕەوشت جوان ٥ لەزاراوەی ژمێریاریو دەفتەر داران دا بریتییە لە دیاریکردنو تۆمارکردنی مەسروفات لەدەفتەری تایبەتی داو داگرتنی لە بودجەی پەسەندکراو دا.

**الشُّطْبَةُ من الشَّيْء**: پارچەیەکە لەشت بەدرێژایی ببڕدرێ وەکوو تڵیشە دار،

تیتۆڵە قوماش ○ هێڵێکە بەسەر نوسراوە هەڵەکەدا دەهێندرێ، وادەبێ دو هێڵی ڕاست و چەپ بەکاردەهێندرێن.

**الشَّطِيبَةُ**: ئەو پارچە تیلمە چەرمەیە بەدرێژی دەبڕدرێ ○ یان هەرشتێکی لەوجۆرە ○ (ك: شطائب).

**شَطَحَ في السير أو في القول**: زۆر دوور کەوتەوە، زۆری گوت.

**الشَّطْحَةُ**: قسەو کردەوەی ناقۆڵا، دەگوترێ: (لفلان الصوفي أحوال وشطحات).

**شَطَرَ الرجلُ على قومه شطوراً وشطارة**: پیاوەکە بەشەڕو ناخۆشی قەومەکەی خۆی ناڕەحەت کرد.

**شَطَرَ عن القوم**: لەخەڵکەکە جیابووە بەرق هەڵستاوی.

**شَطَرَ الشيءَ شطراً**: شتەکەی لەت کرد، دابەشی کرد، کردی بەدوو بەش.

**شَطَّرَ الحلوبة**: گوانێکی ئاژەڵە شیردەرەکەی دۆشی و گوانەکەی تری نەدۆشی.

**شَاطَرَهُ الشيءَ**: شتەکەی کرد بەنیوە.

**شَطَّرَ الشِّعْرَ**: بۆ هەر نیوە دێڕە شیعرێك نیو دێر شیعری خۆی خستە سەر چامە شیعرەکە.

**الشَّاطِرُ**: بەدخوو دڵ پیس و خراپەکار ○ بەلای صوفییەکانەوە کەسێك دەست پێشخەربێ و بۆلای خودا پەلەبکا ○ زیرەك و لێهاتوو دەست ڕەنگین ○ (ك: شُطّار).

**الشَّطْرُ**: نیوەی شت، بەبەشێکیشی دەگوترێ ○ (ك: أشطُر، وشطور) ○ دەگوترێ: (حلب الدهر أشطُرَهُ): ڕۆژگاری سەرەو ناو کرد تاڵی و شیرینی چەشت، خۆشی و ناخۆشی تێدا دین ○ ناحیەو لای شت ○ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾.

**شَطْرُ البيت من الشعر**: نیوە دێڕی شیعرەکە.

**الشُّطُورُ**: دەگوترێ: (ثوب شطور): قوماشەکە لایەکی پانیەکەی لەلاکەی تری زیاترە.

**الشَّطِيرُ**: دوور، دەگوترێ: (منزل شطير وبلد شطير): مەنزڵگایەکی دوور ولاتێکی دوور ○ غەریب و عەنتیکە.

**شطيرا الشيء**: نیوەی شت ○ (ك: شَطْرٌ).

**الشَّطِيرة**: نانێکە دوو توێ دەکرێ و پێخۆری تێدەکرێ وەکوو شلکێنە، کەلانە، کوببەشامی ○ (ك: شَطَائر).

**المشطور من الخبز**: بەمانا (الشطيرة)دێ ○ پاسایەکی شیعرییە نیوەی شیعرەکە لەجۆری (السریع) یان (الرجز)بێ

لەهەمموو شیعرەکەدا ڕەچاوی یەك سەرەوا دەکرێ.

**الـشَطْرَنج**: یارییەکە لەسەر پارچە تەختەیەك (کە شەصت‌و چوار چوارگۆشەی تێدایە) ئەنجام دەدرێ، لاسایی دوو دەوڵەتی بەشەڕهاتوو لەگەڵ یەکتردا دەکرێتەوە، سی‌و دوو پارچەی تێدا بەکاردەهێندرێ کە نموونەی دوو مەلیك‌و دوو وەزیرو ئەسپ سوارو قەڵاو فیل‌و سەربازەکانن، لەبنەڕەت دا یارییەکە هیندییە.

**شَطَّ شُطُوطاً وشَطَطاً**: دوور کەوتەوە، دەگوترێ: (شطت الدار): ماڵەکەی دوور بوو ◦ (شَطَّ في الأمر): زۆر لەکارەکە ورد بووەوە گەلێکی ئەمدیو ئەو دیوکرد زیاد لە پێویست لێی کۆڵیەوە، دەگوترێ: (شَطَّ في المساومة): لەمامەڵەو دان‌و سان دا زۆری هێناو برد ◦ (شَطَّ عليه في حكمه): لەبڕیارەکەی دا ستەمی لێ کرد.

**أشَطَّ**: دوور کەوتەوە، دەگوترێ: (أشطَّ في الصحراء): لەساراداا زۆر دوور کەوتەوە ◦ (أشَطَّ في الطلب): زۆری لەداواکە کۆڵیەوە یان زۆری داوا کرد ◦ (أشَطَّ في حكمه): ستەمی لەبڕیارەکە دا کرد.

**شاطَّهُ**: لەستەم‌و زیان پێ گەیاندن دا بەسەری دا باڵا دەست بوو.

**شَطَّطَ**: زێدە ڕۆیی کرد لەدوور کەوتنەوەدا.

**إشْتَطَّ**: دوور کەوتەوە ◦ (إشْتَطَّ في حكمه): لەبڕیارەکەی دا ستەمی کرد.

**الشِّطَاطُ**: دووریی ◦ درێژی‌و هەندام ڕێك‌و پێکی.

**الشَّطُّ**: کەناری ڕووبار ◦ (ك: شُطُوط وشُطَّان).

**شَطَفَ عن الشيء**: وازی لەشتەکە هێنا لێی دوورکەوتەوە.

**شَطَفَ الثَوْبَ**: قوماشەکەی شت.

**الشُطُوف**: دەگوترێ (نية شطوف): نیازێکی دوورە.

**الشُطْفَةُ**: پارچە ◦ (ك: شُطَفٌ).

**المَشْطُوفُ**: لەبواری ماتماتیك دا بریتییە لەوەی قەبارەیەك دووکەرت بکرێ بەئەندازەیەك بنکەکەی بەرامبەر یەکێك لەقاعیدەکانی نەبێ واتە فەیزەن بێ.

**شَطَنَت الدارُ شُطوناً**: خانووەکە دوورکەوتەوە، دەگوترێ: (شَطَن عنه): لێی دوورکەوتەوە ◦ (شَطَنَ صاحِبَهُ شطناً): بەپێچەوانەی مەبەستی هاوەڵەکەیەوە جوڵایەوە.

**شَطَنَ الدَّابَةَ**: ولاخەکەی بەپەتێ درێژ بەستەوە، یان ولاخەکەی بەحەبلی درێژ شەتەك دا.

**شَيْطَنَ**: وەکوو شەیتانی لێ هات، یان کرداری شەیتانی کرد.

**تَشَيْطَنَ**: بەمانا (شَيْطَنَ)دێ.

**أَشْطَنَهُ**: دووری خستەوە.

**الشَّطَنُ**: حەبلی درێژ کە لەبیر ئاوی پێ هەڵدەهێنجندرێ، یان ولاخی پێ شەتەك دەدرێ ٥ (ك: أشطان).

**الشَّطون** (بئر شطون): بیری قوڵ ٥ (سِفر شطون): سەفەرێکی دوورو نیازو مەبەست دوورە ٥ (رمح شطون): رمبی درێژو خوار ٥ (حرب شطون): شەڕی ترسناكو خوێناویو ناخۆش.

**الشيطان**: گیانی شەڕو نەگبەتو گومڕاکەر ٥ هەرکەسێك بێ فەرمانی خودا بکاو فەساد بلاوبکاتەوە ٥ ماری ژەهراوی پیسو زێنەخڕۆ ٥ بۆ ناشیرین کردنی شت دەگوترێ: (كأنه وجه شيطان): روخساری دەڵێی روخساری شەیتانە، یان دەگوترێ: (رأسه رأس شيطان): سەری دەڵێی سەرە شەیتانە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُؤُوسُ الشَّيَاطِينِ﴾ ٥ هەروا دەگوترێ: (ركبه شيطانهُ): شەیتان سواری شانی بوو ٥ شەیتان چووە کەللەیەوە ٥ (نزع عنه شيطانه): شەیتانەکەی لەکەللەی دابەزی یان لەکەللەی شەیتان هاتە خوار رێبازی ئاشتیو بارقوڵیو هێمنی رەچاو کرد.

**شيطان الفلا**: تینوایەتی.

**شيطان الشاعر**: جندۆکەی شاعیر ٥ لەسەردەمی نەزانی دا بڕوایان وابوو هەموو شاعیرێك جندۆکەی هەیەو فێری شیعری دەکا ٥ (الراجز) دەڵێ: (فأن شيطاني أمير الجن).

**شَظُفَ الشَّجَرُ**: درەختەکە بەهۆی کەم ئاودانیەوە وشك بوو.

**شَظُفَ العيشُ**: ژیانی ناخۆشو پڕکەمو کوڕی بوو.

**شَظُفَ الخلق**: ڕەوشتی ناشیرین بوو ٥ (فهو شظيف).

**الشَّظْفُ**: نانە سوتاو ٥ پارچە دارێکی بچوك وەکوو سنگ.

**الشَّظَفُ**: چورتمو ناخۆشی ٥ (ك: شظاف) ٥ پەلّ هەڵدانی گۆشت لەبنکی نینۆكو ئەملاو ئەولای.

**شَظِيَ العودَ وغيرهُ شَظىً**: عودەکە قلیشاو دوو کەرت بوو.

**شَظِيَ القومُ**: خەڵکەکە بلاوەیان لێ کرد.

**شَظِيَ الفرسُ**: ئێسقانی خوار ئەژنۆی

ئەسپەکە نەخۆش کەوت ◦ (فهو شظِ وهي شظية).

**أشظاهُ:** پرپشکی ئەو شتەی ڕێ کەوت ◦ پارچەی ئەوی لێ درا.

**شظّي الشيءَ:** شتەکەی پارچە پارچە کرد.

**شَظِّيَ القومَ:** خەڵکەکەی پەرتەوازە کرد.

**تَشَظّى العودُ:** عودەکە کەرت کەرت بوو، دەگوترێ: (تشظّى الصَّدَفُ عن اللؤلؤ): توێکڵی مرواریەکە قەڵشی‌و دەنکە مرواریەکە دەرکەوت.

**تَشَظّي القومَ:** خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد.

**الشَّظَى:** ئێسقانێکە بەئەژنۆی ئەسپەوە لکاوە ◦ دەست‌و پێوەندی هۆزو خێڵ لەبنەچەو نەژادا لەوان نین‌و بەغەوارە حسێب دەکرێن.

**الشَّظِية:** ئێسقانی بچوك کەبەدەوری ئێسقانی ئاوزەنگی قاچەوەیە ◦ پارچەو پریشك کەلەقەبارەی ڕەقەوە بپەڕن ◦ بەزۆری بۆپارچەی تەقەمەنی‌و گوللەتۆپ‌و شتی وا بەکاردەهێنرێ ◦ (ك: شظايا).

**شَعَبَ الشيءَ شَعْباً:** شتەکە لێك بۆوەو پارچە پارچە بوو ◦ تەقییەوە.

**شَعَبَ اليه:** ئارزوی کردو حەزی لێ بوو.

**شَعَبَ عنه:** دوور کەوتەوە.

**شَعَبَ الشيءَ:** شتەکەی پارچە پارچەکرد ◦ وادەبێ بۆمانای پێچەوانەی لێك بوونەوەو تەقینەوە بەکاردەهێندرێ، دەگوترێ: (شَعَبَ الصَّدْعَ): شتە تەقیوو درزبردوەکەی پێکەوە نووساندەوە.

**شَعِبَ الرجلُ:** پیاوەکە ناوشانی پان بوو.

**شَعِبَ الظبْيُ:** ئاسکەکە نێوان شاخەکانی پان بوون ◦ (فهو أشعب وهي شعباء) ◦ (ك: شُعْبٌ).

**أشْعَبَ الشيءَ:** قەڵشاوی شتەکەی چاك کردەوە.

**شَعَّبَ الزرعُ:** کشت‌و کاڵەکە پەڵەپەڵە بوو دێراو دێراو بوو.

**شَعَّبَ الأمْرَ:** کارەکەی بەشبەش کرد.

**شَعَّبَ الإناءَ ونحوه:** درزی زەرف‌و مەنجەڵ‌و قاپەکەی چاك کردەوە.

**إنْشَعَبَ:** بڵاوو پەرتەوازە بوو، دەگوترێ: (إنشعَبَتْ أغصان الشجرة): پەل‌و لقی درەختەکە بڵاو بوونەوە.

**إنشَعَبَ النهرُ:** ڕوبارەکە بەشبەش بوو ◦ (إنشعَبَ الطريق): ڕێگاکە دابەش بوو، ڕێ ڕێ بوو، بوو بە دوو ڕێیان‌و سێ ڕێیان.

**إنْشَعَبَ عنه:** دورکەوتەوە لێی، دەگوترێ: (إنْشَعَبَ القولُ بصاحبه):

قسەکە سەرنجی کابرای خاوەنی لەمانایەکەوە بۆ مانایەکی تر برد.

تَشَعَّبَ: پارچە پارچە بوو، بوو بە چەند بەش.

تَشَعَّبَ الزَرْعُ ونحوه: کشتو کاڵەکە پەڵەپەڵە بوو.

أشْعَبُ: پیاوێکی ئازادکراوی حەزرەتی عوسمان بوو لەمەدینە، زۆر چاو چنۆكو بەتەماع بوو بۆ تە نمونەی تەماعکاریو لەپەندا دەگوترێ: (أطْمَعُ من أشعب): فلان لە ئەشعەب بەتەماع ترە، یان دەگوترێ: (طمع أشْعَبِيٌّ).

الشَعْبُ: نەتەوە، کۆمەڵی زۆر کەلەنەژادا بچنەوە سەرباوکێكو لەهۆزو خێڵ بەرفراوانترە، یان کۆمەڵێك ئادەمیزادی زۆرنو پەیرەوی یەك یاساو رێسای تایبەتی دەکەن ٥ یان کۆمەڵێك ئادەمیزادی زۆر بەیەك زمان ئاخاوتن بکەن ٥ (ك: شعوب).

الشِّعْبُ: شیوو دۆڵ، نزمایی نێوان دوو کێو ٥ (ك: شِعاب) ٥ رێگا ٥ رێرەوی ئاو لەژێر زەوی.

شَعْبَانُ: مانگی هەشتی ساڵی قەمەریی.

الشُعْبَةُ: کۆمەڵەشت ٥ قورئان دەفەرموێ: {انطَلِقُوا إِلَى ظِلٍّ ذِي ثَلَاثِ شُعَبٍ} ٥ پارچە کە قاپو قۆریو شتی شکاوی لەوجۆرەی پێ چاك دەکرێ ٥ لقی درەخت ٥ (ك: شُعَبٌ، شِعابٌ).

الشُعَبُ: پەنجەکانی دەستو قاچ ، یان پەلو نوکی ئامێری وەکوو سێلكو شەنەو شەو فڵچەو شتی وا، دەگوترێ: (شُعَبُ السَّفود): شتێکە وەکوو مقاش دووسێ نووکی بەسەرەوەیە، لەکاتی گۆشت سورکردنەوەدا گۆشتەکەی پێ تێك هەڵدەدرێو ونجر ونجر دەکرێ ٥ (شُعَبَ الدهر): بارو دۆخەکانی رۆژگارو گۆڕانکارییەکانی ٥ (شُعَب الصدر): بۆرییەکانی هەناسە لەناو سییەکان دا ٥ (النزلة الشُعَبِيَّةُ): هەوکردنی پەردەی رێڕەوەکانی هەناسە.

شَعُوبُ: ناوێکە لەناوەکانی مردن، دەگوترێ: (شَعَبَتْهُ الشَعوب): مردن تەفرو تونای کرد.

الشُعُوبِيَة: نەزعەو بیرو باوەڕێکی دەمارگیری نەتەوە پەرستییە لەسەردەمی عەباسییەکان دا پەرەی سەند دژی رێزلێنانو پاساو دانەوەی رەگەزی عەرەبە بەسەر نەتەوەکانی تردا ٥ هەروا ناوە بۆ هەڵگرانی ئەو بیرو باوەڕە ٥ تاکەکەی (شعوبي)یە.

الشُعَيْبَةُ: لەبواری پزیشکی دا

ڕێڕەوێکی هەوایيە لەناو سيیەکان دا ٥ هەروا ناوی شوێنێکە لەباشوری عێراق نزیك بەصرە، لەسەرەتای هاتنی ئینگلیزەکان بۆ داگیرکردنی عێراق ١٩١٥م شەڕێکی بەناو بانگی تێدا کراوە شێخ مەحموودی حەفید بەلەشکرێکی پێکهاتوو لەجەنگاوەرانی کورد هاوبەشی ئەو شەڕەی کردوە.

المِشْعَبُ: ئامێرێکی کونکردنە بەکاردەهێندرێ بۆ چاککردنەوەی قاپو قاچاخ ٥ (ك: مشاغب).

شَعْبَذَ شَعْبَذَةً: کاراما بوو لەفرتو فێڵو چاو بەستەکی دا توانایەکی تایبەتی هەبوو بۆ شاردنەوەی ڕاستییەکانو دەرخستنی شتە بەتاڵو پوچەکان لەقاوغی ڕاستییەکان دا بەپشت بەستن بەچاو بەستەکی ٥ (فهو مُشَعْبِذٌ).

شَعِثَ الشَّعْرُ شَعَثاً: قژی ژاکاو ئاڵۆزاو گرێ گرێ بوو، دەگوترێ: (شَعِثَ فلان و شَعِثَ رأسُهُ وبدنه): فلانکەس چڵکنو پلکن بوو ٥ (فهو أشْعَثُ وهي شعثاء) ٥ (ك: شُعُثٌ).

شَعِثَ الأمْرُ: کارەکە بڵاو بۆوە، پارچە پارچە بوو.

شَعَّثَ مِن الشيئ: شتێکی کەمی لەشتەکە هەڵگرت.

شَعَّثَ مِن فلان: بەچاوی سوكو بێ نرخ سەیری فلانی کرد.

شَعَّثَ الشَّاعِرُ: شاعیرەکە لەشیعرەکانی دا شێوەی (تەشعیث)ی عەروزی بەکارهێنا واتە لەجیاتی تەفعیلە (فاعلاتن) لەبەحری (المجتث)دا، تەفعیلەی (مفعولن)ی بەکارهێنا.

تَشَعَّثَ: لێك بڵاو بوو، دەگوترێ: (تَشَعَّثَ رأس الوتد): سەری سنگەکە پرژ پرژ بوو، قەڵشیو پارچە پارچە بوو.

تَشَعَّثَ رأس المسواك: سەری دارسیواکەکە پرژ پرژ بوو.

تَشَعَّثَ الشَّعْرُ: قژەکە ئاڵۆزکان، چڵکن بوو.

تَشَعَّثَ القومُ: خەڵکەکە بڵاو بوونەوەو پارچە پارچە بوون.

الأشْعَثُ: سنگ ٥ سیواك.

الشَّعَثُ: کاروباری بڵاوو هەمەچەشنو جۆراو جۆر، دەگوترێ: (لَمَّ اللهُ شَعَثَهُ): خودا ئیشو کارەکانی بۆ کۆکردنەوەو بەکالا بوونەوە.

التَّشْعِيثُ: لەبواری عوروزدا نەوەیە تەفعیلەی (فاعلاتن) لەسەرەوای بەحری خەفیفی موجتەث دا ببێتە (مفعولن).

**شَعْوَذَ شَعْوَذَةً**: بەمانا (شَعْبَذَ)دێ ٥ (فهو مُشَعْوِذ).

**المُشَعْوِذ**: ئەوكەسەی چاو بەستەکی لێ کرابێ.

**شَعَرَ فلان**: فلانکەس شیعری گوت.

**شَعَرَ له**: شیعری بۆ گوت.

**شَعَرَ بە شعوراً**: هەستی پێکردو پێی زانی.

**شَعَرَ فلاناً**: لەشیعردا زاڵ بوو بەسەری دا، بۆری دا.

**شَعَرَ الشیئ شَعْراً**: کوڵك‌و موی کردە ناوکەفی شتەکە، دەگوترێ: (شَعَرَ الخُفُّ): موی کردە ناواخن‌و ناوکەفی خوفەکە.

**شَعِرَ شَعَراً**: موی زۆرو درێژ بوون ٥ (فهو أشعر وهي شعراء) ٥ (ك: شُعْرٌ).

**شَعَرَ فلان شِعْراً**: فلانکەس مەلەکەی شیعری لەلایەیدا بوو، شیعری جوان‌و نایابی گوتن.

**أَشْعَرَ الغلام والجارية**: کورو کچەکە لەکاتی پێگەیشتن‌و بالق بوون دا موویان لەسەر جەستە پەیدا بوو.

**أَشْعَرَ القومُ**: خەڵکەکە دروشمێکیان بۆ خۆیان دانا.

**أَشْعَرَ الشیئُ الشیئَ**: شتەکە بەشتەکەوە نووسا، یان تێکەڵاوی بوو.

**أَشْعَرَ الأمر**: شتەکەی بڵاو کردەوە.

**أَشْعَرَ فلاناً**: پۆشاك‌و شیعاری تایبەتی لەبەر فلانکەس کرد.

**أَشْعَرَ فلاناً الأَمْرَ وبالأمر**: کارەکەی بەفلان زاناند ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَا إِذَا جَاءَتْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾.

**شَاعَرَهُ**: شەڕە شیعریان کرد، لەشیعر گوتن دا پێشبڕکێیان کرد، بەشیعر بەرهەڵستی شیعری ئەوی تری دایەوە.

**شَعَّرَ الشیئ**: بەکوڵك‌و مو ناواخنی کرد.

**تَشَاعَرَ**: لافی شاعیرێتی لێ دا، خۆی بەشاعیر دانا.

**اسْتَشْعَرَ القوم**: لەشەڕا خەڵکەکە بەدروشمی خۆیان بانگی یەکتریان کرد ٥ بەنهێنی تایبەتی خۆیان یەکتریان ئاگادارکرد.

**اسْتَشْعَرَ الثوبَ**: قوماشەکەی وەکوو دروشم لەبەر کرد.

**اسْتَشْعَرَ الخوف**: هەستی بەترس کرد، دەگوترێ: (اسْتَشْعَرَ خشية الله).

**الأَشْعَرُ**: گۆشتی ژێر نینۆك ٥ (ك: شُعْرٌ وشاعر) ٥ (هو أَشْعَرُ الرقبة): ئازاو بەجەرگە (کینایە لەشێر، دەشوبهێندرێ بەشێر باملی توکیشی پێوەنەبێ).

## أوزان الشعر العربي

البيت شطران (مصراعان) : الصدر والعجُز

والشطر اجزاء يقطع اليها الشعر حسب بحور الشعر الآتية نظمها صفي الدين الحلّي :

| البحر | الشطر | التفعيلات |
|---|---|---|
| البحر الطويل : | طويلٌ لهُ دونَ البحورِ فضائلُ | فَعُولُنْ مَفَاعِيلُنْ فَعُولُنْ مَفَاعِلُ |
| البحر المديد : | لِمَديد الشعْرِ عنــدي صفاتُ | فَاعِلاتُنْ فَاعِلُنْ فَــاعِلَاتُ |
| البحر البسيط : | انّ البسيطَ لديهِ يُبْسَطُ الأمــلُ | مُسْتَفْعِلُنْ فَاعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ فَعِلُ |
| البحر الوافر : | بحورُ الشعْرِ وَافرهــا جميلُ | مُفَاعَلَتُنْ مُفَاعَلَتُنْ فَعُولُ |
| البحر الكامل : | كَمَلُ الجَمَالِ مِنَ البُحور الكامِلُ | مُتَفَاعِلُنْ مُتَفَاعِلُنْ مُتَفَــاعِلُ |
| بحر الهزج : | على الأهزاج تَسْهِيلُ | مَفَاعِيلُنْ مَفَاعِيــلُ |
| بحر الرجز : | في أبحرِ الأرجــازِ بَحْرٌ يَسهلُ | مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُ |
| بحر الرمل : | رَملُ الأبحر تَرْوِيهِ الثِقاتُ | فَاعِلاتُنْ فَاعِلاتُنْ فَاعِلَاتُ |
| بحر السريع : | بحرٌ سريعٌ مــا لهُ ساحِلُ | مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ فَاعِــلُ |
| البحر المنسرح : | مُنْسَرِحٌ فيهِ يُضرَبُ المَثَلُ | مُسْتَفْعِلُنْ مَفْعُولاتُ مُفْتَعِلُ |
| البحر الخفيف : | يا خفيفًا خَفَّتْ بــهِ الحركاتُ | فَاعِلاتُنْ مُسْتَفْعِ لُنْ فَاعِلَاتُ |
| بحر المضارع : | تُعَدُّ المُضارِعاتُ | مَفَاعِيلُ فَاعِ لَاتُ |
| بحر المقتضب : | اقتضِبْ كما سألوا | فَاعِلَاتُ مُفْتَعِــلُ |
| بحر المجتثّ ، | ان جُثَّتِ الحركاتُ | مُسْتَفْعِلُنْ فَاعِلَاتُ |
| البحر المتقارب : | عن المُتقاربِ قالَ الخليلُ | فَعُولُنْ فَعُولُنْ فَعُولُنْ فَعُولُ |
| البحر المتدارك : | حركاتُ المُحْدَثِ تَنْتَقِلُ | فَعِلُنْ فَعِلُنْ فَعِلُنْ فَعِلُ |

خريطة الفروق الساعية



الأشعرية: تاقمێكن لەعولەمای كەلام شوێن رێبازی ئەبولحەسەنی ئەشعەری كەوتوون لەزۆر شت دا بیرو باوەڕیان پێچەوانەی موعتەزیلەكانە.

الشَّاعِرُ: شاعیر، هەستیار ٥ شیعروێژ ٥ (ك: شعراء) ٥ (شعر شاعر): شیعری چاكو پەسەند.

الشِّعَار: درەختی تێكهاڵاو، درەختی چڕو پڕ ٥ شوێنی پڕ دارو درەخت.

الشِّعَارُ: ژێركراس؛ ئەو پارچە كراسو دەرپێیەی دەكەونە سەر گۆشت ٥ ئارمو دروشمی تایبەتی كۆمەڵێك، پارتێك، دەوڵەتێك ٥ وشەو رستەو نهێنییەكە كۆمەڵێك لەسەفەردا یان لەشەڕدا بۆ یەكتر ناسینەوەی خۆیان بەكاری دەهێنن ٥ (ك: أشعِرة).

الشَّعْرُ: گەندە مو؛ موی زیادە كەلەسەر جەستەی ئادەمیزادو گیانلەبەری تردا دەردەكەون ٥ گەندە گیا ٥ (ك: شعور وأشعار).

الشِّعْرُ: كەلامێكی كێشراوو هاوكێشەو خاوەن سەرەواو سۆزو خەیاڵی لەخۆگرتووەو بەمەبەستەوە بگوترێ ٥ لەزارەوەی مەنتیقیەكان دا قسەو ئاخاوتنێكە پێكهاتووە لەمشتی خەیاڵیو مەبەست لێی حەز لێ كردنە یان قێز لێ كردنە وەكوو دەڵێ: (الخمر یاقوتة سیالة): مەی دوڕو یاقوتێكی شلە ٥ (العسَلُ قيء النحل): هەنگوین رشوی هەنگە.

الشِّعْرُ المنثور: پەخشانە شیعر؛ كەلامێكی بەلیغو سەجع ئامێزە بەشێوەی شیعر خەیاڵو سۆزی تێدایەو بێ كێشی عوروزییە.

الشِّعْرَى: ئەستێرەیەكی روناكی زۆر گەورەیە لەكاتی گەرمەی هاوین دا دەردەكەوێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّهُ هُوَ رَبُّ الشِّعْرَى﴾.

الشَّعْراءُ: فەروە ٥ زەوی یان باخی درەختاوی كەدرەختی زۆر بێ ٥ (داهیة شَعراءُ): بەڵای قورسو سامناك.

الشَّعْراني: توكنی، توك درێژ.

الشَّعْرَةُ: تاڵە موو ٥ لەبواری چاو ئێشەدا بریتییە لەهەڵگەڕانەوەی برژانگ بۆلای گلێنە.

الشُّعْرور: شاعیرۆكە؛ كەسێك هەستی شیعری بەهێز نەبێ.

الشَّعْرِیة: شەعرییە؛ جۆرە خواردنێكە لەهەویری گەنم دروست دەكرێ وشك دەكرێتەوە دەكوڵێنرێ.

الشُّعُورُ: هەست، دەرك پێكردن بەبێ

بەڵــگە ٥ لــەکاتی زەمو رەخنــەدا دەگــوترێ: (فــلان لایــشعر) ٥ لــەزاراوەی زانایــانی دەروونناســی دا بــەو زانینــە دەگــوترێ کەلەنەفــسی بەرامبەردا هەستــی پــێ دەکرێ یــان لــە بــارو دۆخو دەورو بــەردا پێــی دەزانــدرێ، یــان ئــەو دەرك کــردنو شتــە ویژدانیانەیــە کەعــەقڵ کۆیــان دەکاتـــەوە بۆیـــە دەگـــوترێ: (انّ للـشعور ثلاثـة مظـاهر هـي الا دراك والوجدان والنزوع).

الــشّعِيرُ: جــۆ؛ زەوادو بــژێوە لــەخوار گەنمەوەیــە بــۆ بــەهێزی ٥ لەپەنــددا هاتووە دەڵـێ: (فلان کالـشعير يؤکـل ويـذم): فلانکــەس وەکــوو جــۆ وایــە دەشخورێو زەمیشی دەکرێ.

الـــشّعِيرة: ئەوشــتەی شــەرعو ئــایین بەپەســـەندی بـــزانن‌و فـــەرمانی بەئەنجامـــدانیان کردبـــێ ٥ (ك: شعائر) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَــن يُعَظِّــمْ شَــعَائِرَ اللَّــهِ فَإِنَّهَــا مِــن تَقْــوَى الْقُلُوبِ﴾ ٥ قوربانیو هەدی بۆ ماڵی خودا ٥ نیشانەو دروشم.

المـشاعر: (مـشاعر الحـج): ئەنجامـدانی کاروباری حەج.

المَشْعَرُ: درەختی تێك چرژاوو پرگەڵاو لـــق‌و پـــۆپ ٥ هەســـت ٥ شـــوێنی ئەنجامدانی حەج.

المشعر الحرام: موزدەلیفە ٥ (ك: مشاعر).

شَعْشَعَ الـضوءُ: روناکییەکـە کەمێـك بڵاو بۆوە.

شَعْشَعَ الـشراب ونحـوه: ئـاوی تێـکەڵاوی شەرابەکە کرد.

شَعْشَعَ الزَّبَدَ: رۆن‌و چەوری زۆری کردە ناو تێکوشاویەکە.

تَشَعْشَعَ الضوء: روناکییەکە بڵاو بۆوە.

تَشَعْـشَعَ الـشهرُ: زوربــەی زۆری مـانگ تێپەڕی.

الشَّعْشاعُ: بـڵاوە بـوو، دەگوترێ: (ظـل شعـــشا ع): سێبەرێـــکە لەهەنـــدێ کون‌و کەلەبەریەوە روناکی‌و تیشکی خـۆر دێتـە نـاوەوە ٥ قـسە خـۆش‌و نیکتە بازو دەمو لەفظ شیرین.

الشَّعْشَعُ: بەمانا (الشعشع)دێ.

شَعَّ الشيءُ شَعاً: شتەکە بڵاو بۆوە.

شَعَّ فلان: فلانکەس پەلەی کرد.

شَعَّ الماءُ شعّاً: ئاوەکەی هەڵڕشت.

أشَعَّتِ الشمسُ: خۆر تیشکی خۆی بـڵاو کردەوە.

أشــعَّتِ النــار: ئاگرەکــە روناکــایی‌و گەرمایی خۆی نارد.

أشَعَّ السنبلُ: گوڵە دانەوێڵەکە پڕبوو، دەنکەکانی کامڵ بوون.

أشَعَّ الماءَ: ئاوەکەی پچڕ پچڕ نارد چۆڕ چۆڕ ئاوی بۆنارد.

**الإشـعاعُ**: بـلاو بوونـەوەی روونـاکیو تیشکە لەفەزادا بە شێوەی شەپۆل شەپۆل.

**الأشـعة الـصّينية**: تیـشکێکی موغنوکارمبییـە لەلێـك کـەوتنی ئەلکترۆناتی تیژرۆ پەیدا دەبن.

**الأشـعة الكونيـة**: تیشکێکە لەبۆشایی دەرەوە دەگاتـە زەوی زۆر کارایـە بـۆ چـونە نـاوەوەی شـتو کـونکردنی شت.

**الـشّعَاعُ**: شـتی بـلاوە بـوی پـرژاو، دەگـوترێ: (دم شَـعَاعٌ): خـوێنی پـرژاو، (قلـب شـعاع): دڵـی ڕاڕاو پەرتـەوازە ٥ (ذهبـوا شَـعَاعاً): بـە پەرتـەوازەیی رۆیـشتن، دەگـوترێ: (تطايرت العـصا شَـعَاعاً): گۆچانەکە شکاو بـوو بەچـەند پارچـەیەکەوە ٥ (شَعَاع الـسنبل): پـرژی گوڵەگـەنم ٥ تەپو تـۆزو کاوکۆتی گوڵەگـەنم کـە وشك بۆوە.

**الشُّعَاعُ**: هێڵی روناکی کە لەدرزو کونو کەلەبـەرەوە دێنـە ژورەوە، وەکـوو تیتـۆڵو داوە دەزو دێنـە بەرچـاو ٥ (ك: أشِعة وشعوع).

**الـشُّعُ**: بـەمانا (الـشُّعَاع)دێ ٥ خـانوی جالّجالّۆکە ٥ (ك: شِعاع).

**المُـشِعَّةُ**: (النظـائر المُـشِعَّة): ئـەو شـێوەو نمونانـــەن کەتایبەتمەنـــدی تیشکدانەوەیان هەبێ.

**شَعَفَ الشيئَ شَعْفاً**: زۆر شتەکە کەوت.

**شَعَفَ الحُبُ فلانـاً**: دڵداری دڵی فلانکەسی داخ کردوە.

**شَعِف به وبحبه شَعَفاً**: خۆشی ویست، وەگری بوو، پێیەوە هەڵەو گیر بـوو ٥ (شَعِفَ بـالأمر): ترسا لەکارەکەو توشی شۆك بوو.

**الشُّعَاف**: شێتی.

**الـشَّعَفَةُ**: لای سـەروی هەرشتێـك بـێ، دەگوترێ: (شَعَفَةُ الجبل): دوندی کێو تۆپەڵاکی کەژ ٥ (شَعَفَةُ الرأس): تۆقە سەر ٥ پەڵە قژی سەر، کۆپلـە مـووی سەر ٥ خۆشەویستی لەسنور زیاد ٥ (ك: شَعَفٌ وشِعاف وشُعُوفٌ).

**الشُّعْفَةُ**: نمەباران؛ ئاوە بارانی کـەم کـە بەناسـتەم روی زەوی تـەڕبکا ٥ (ك: شِعاف).

**المَشْعُوف**: دڵ سوتاوی عیشقو ئـەوین ٥ دڵ بریـنـداری خۆشەویـستی ٥ دڵ ترساو ٥ شێت.

**شَعَلَت النارُ شَعْلاً**: ئاگرەکە هەڵـگیرساو کڵپەی کرد.

**شَعَّلَ النَـارَ**: ئاگرەکـەی داگیرسـاند، کڵپـەی کرد.

**شَعِلَ شَـعَلاً**: سـپیایەتی تێـکەڵی قژەکانی

بوو، قژەکانی ماش‌و برنج بوون ٥ (فهو أشعل وهي شعلاء).

**أشعَلَ النار**: ئاگرەکەی داگیرساند، دەشگوترێ: (اشعَلَ النار): رقی فلانکەسی هەڵساند.

**أشعَلَ الفتنة**: فیتنەو ئاشوبەکەی بەرفراوان کرد.

**أشعَلَت الطعنةُ الدَّمَ**: زەبرو برینەکە خوێنی پرژاند.

**شَعَّلَ النارَ**: بۆ زێدە ڕەوی لەمانای (شَعَلَ)دا بەکاردێ.

**اِشتَعَلَت النار**: ئاگرەکە هەڵگیرساو بڵێسەی کرد.

**اشتَعَلَ فلان غضباً**: فلانکەس رقی هەڵساو گڕی گرت.

**اشْتَعَلَ الرَّأسُ**: پیری بەناو قژی سەریدا بڵاو بۆوە ٥ قژی سەری ماش‌و برنج بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاشْتَعَلَ الرَّأسُ شَيْبًا﴾.

**الأشْعَلُ من الخيل**: ئەسپێك کە تووکی سپی تێکەڵاوی تووکی بێ ٥ ئادەمیزاد کە ڕەنگی سور لەچاوی دا بێ، یا سپێنی چاوی سور بێ.

**الشُّعْلَةُ**: بڵێسە ئاگر، ئاگری گڕدار، بڵێسەی ئاگردان‌و تەنور ٥ بڵێسەی چاوی تەباخ‌و سەماوەرو شتی لەو جۆرە کەبەنەوت یان بەغاز ئیش دەکەن کە غازەکەیان دەکرێتەوە ئاگر بە شوێنی هاتنە دەرەوەی غازەکە دەنرێ‌و گڕدەگرێ ٥ یان پەڕۆیەك لەسەری دارێکەوە دەپێچرێ‌و لەنەوت‌و زەیت هەڵدەکێشرێ‌و ئاگری پێوە دەنرێ بۆ روناکی.

**الشَّعِيلُ**: هەڵگیرساو، بۆ مێینە (الشعيلة) بەکاردێ ٥ (ك: شُعَلٌ وشعائل).

**المِشْعالُ**: ئامێری شت داگیرساندن وەکوو چەرخ‌و شقارتەو شتی لەو جۆرە ٥ (ك: مشاعل).

**المِشْعَلُ**: بەمانا (المشاعل) دێ ٥ (ك: مشاعل).

**المَشْعَلُ**: بەمانا (المشعال)دێ ٥ (ك: مشاعل).

**المَشْعَلُ**: چراو فانۆس‌و شتی لەو جۆرە ٥ (ك: مشاعِل).

**المُشْعِلُ**: شتی پرژاوو بڵاوە بوو بەچوار دەوری خۆی دا، دەگوترێ: (جراد مُشْعِلٌ وكتيبة مَشْعِلَةٌ).

**شَعِنَ شَعْرُهُ شَعْناً**: قژی ژاکاو بژو تێکهاڵاو بوو.

**أشْعَنَ فلان**: فلانکەس کاکۆڵی دوژمنەکەی گرت‌و بۆلای خۆی رایکێشا ٥ قژی ناوچەوانی گرت‌و کێشی کرد.

اِشْعَنَّ شَعْرُهُ ونحوه: قـژى زۆر ژاكـاو بژبون.

الشَّعَانِين: جەژنێـكى مەسـيحيانەيە دەكەوێتە رۆژى يەكشەممەى پێش جەژنى فيصح، ئاهەنگو جەژنێـكە بەبۆنەى يادەوەرى چونى حەزرەتى عيسايە بۆ بەيتولمەقدیس.

الشُّعْنونُ: (رجل شُعْنون): پياوێـكى قـژ بژو ژاكاوە ◦ گێل‌و ئەحمەق ◦ (ك: شعانين).

شَعَا شَعْواً: بلاّو بۆوە، پەرتەوازە بوو.

شَعَا الشَّعْرُ ونحوه: قژەكە بژبوو زۆر ژاكا.

شَعِيَ شَعاً: بەمانا (شَعَا)دێ ◦ (فهـو أشـعى وهي شعواء).

أشعى القومُ الغارَةَ: خەڵكەكە هێرشيان بردو دەستيان بەشەڕ كرد ◦ شەڕيان هەڵگيرساند.

الشَّاعِي: بەشى ئاشكراو ديار ◦ دوور.

الشُّعَى: كۆپلە قژى بلاّوە بوو.

الشَّعْواءُ: بەربلاّو، پەرتەوازە ◦ شاش‌و پاش، دەگوترێ: (شجرة شعواء): درەختى لق‌و پۆپ بلاّو ◦ (غارە شعواء): هەڵمەتى بەر بلاّوو سەرانسەرى.

شَعْوَذ: بڕوانە مادەى (شَعَذ).

شَغَبَ القومَ (عليهم وفيهم وبهم): شەڕى لەناو قەومەكەدا هەڵگيرساند ◦ فيتنەو ئاشوبى لەناويان دا بەرپاكرد، دەگوترێ: (شَغَبَ فلان): فلاّنكەس فيتنەيى نايەوە.

شَغَبَ عن الطريق: لەرێـگە لاى دا.

شاغَبَهُ: زۆرى فيتنە جۆيى لەگەڵ دا كرد.

تَشاغَبَ فلان: فلاّنكەس شەغەبو فيتنەيى دروست كرد ◦ خۆى بەدەستەوەنەدا، دەگوترێ: (طلبت منه كذا فتشاغب وامتنع).

تشاغب الرجلان: هەريەك لەو دوو پياوە ئاشوبى بۆ ئەوى تر نايەوە.

الشَّغْبُ: ئاگرى فيتنە خۆشكردن‌و دنەدنەى خەڵك بۆ شەڕو بەگژ يەكدا چون ◦ ئاشوب نانەوەو فيتنە بەرپاكردن ◦ هێرش كردنە سەر يەكترو كێشە بەرپاكردن.

الشَّغِبُ: شەڕانگێزو فيتنە جۆ ◦ ئاژاوە گێڕ ◦ شەڕانى.

المَشْغَبُ: بەمانا (الشَّغِبُ) دێ.

شَغَرَ المكان ونحوه شُغُوراً: شوێنەكە خاڵى بوو، چۆڵ بوو، دەگوترێ: (شَغَرَ المنصب أو الكرسي أو الوظيفة).

شَغَرَ البلدُ: وڵات لەپارێزگارو كاربەدەست خاڵى بوو، كەس نيەكاروبارى بەڕێوە بەرێ ئەمن‌و ئاسايشى بپارێزێ بەرفراوان بوو.

**شَغَرَ السّعْرُ**: نرخ دابەزی.

**شَغَرَ الكلبُ**: سەگەکە قاچێکی هەڵبڕی بۆ ئەوەی میز بکا.

**شَغَرَ فلاناً عن البلد ونحوه شَغْراً وشغاراً**: فلانکەسی لەوڵات دەرکردو تەرۆی کرد شاربەدەری کرد.

**أشْغَرَ المَنْهَلُ**: سەرچاوەی ئاوەکە لەڕێگا دوور بوو.

**شاغَرَهُ مُشاغرة**: ژن بەژنی لەگەڵدا کرد خزمێکی خۆی لەفلان مارەکرد بەمەرجێك ئەویش خزمێکی خۆی لی مارەبکا، واتە بەشێوەی (نکاح الشغار) ژنیان مارەکرد بەبێ مارەیی کەلە ڕاستی دا ئەمە لەئاینی ئیسلام دا حەرامە.

**اشْتَغَرَ**: بەمانا (أشغر)دێ ٥ زۆرو تێکەڵو پێکەڵ بوو.

**اشتغر التّرابُ**: جرو جانەوەرو ئاژەڵ زۆر بونو پەرەیان سەند.

**اشْتَغَرَ الأمر بفلان**: کاروباری فلان یان کێشەو نیزاعەکەی لەوزە دەرچوو بەرفراوان بوو.

**اشْتَغَرَ عليه الأمر**: کارەکەی تێکەڵو پێکەڵ بوو.

**اشْتَغَرَ الحسابُ عليه**: حیسابو مامەڵەکەی بەرفراوانو تێکەڵو پێکەڵ بوو سەرو دەری لێ ناکا.

**اشْتَغَرَ على فلان**: دەست درێژی کردە سەر فلانو قسەی ناشیرینی پێ گوت، شانازیی بەسەردا کرد.

**شاغَرَ**: هەریەك لەو دووکەسە خۆشکی خۆی یان خزمی خۆی لەوێ ترمارە کرد بەبێ مارەیی (ژن بەژنیان کرد).

**تَشَغَّرَ فلان في القبيح ونحوه**: فلانکەس لەشتی ناشیرینو کاری نابەجێ دا ڕۆچوو، سنور شکێنی کرد.

**الشّاغِرُ**: خاڵیو بۆش، دەگوترێ: (مكان شاغر أو منصب شاغر أو كرسي شاغر): شوێنی چۆڵ، پلەو پایەی چۆڵ، کورسی چۆڵ.

**الشّاغِران**: شوێنی بڕینی ناوك ٥ کۆتایی ڕەگی ناوك.

**الشُّغَارُ**: بەتاڵو بۆش ٥ بڕێك ئاوی زۆری تێدابێ ٥ ڕەگێکە لەلاتەنیشتی حوشتر.

**الشِّغَارُ** (نكاح الشغار): ئەوەیە پیاوێك ئافرەتێکی خزمی خۆی لەپیاوێك مارە بکا بەبێ مارەیی بەمەرجێك پیاوەکەی تریش ئافرەتێکی خزمی خۆی لەئەو مارە بکا بەهەمان شێوە.

**الشُّغَرُ**: دەگوترێ: (تفرقوا شَغَرَ بَغَرَ): بەهەمو لایەك دا بڵاو بوونەوەو

كون‌و قوژبنی ولاتیان پڕکردنه‌وه.

**الشُّغَارَةُ**: پەردە ئەستێ بەناسن لێ دەدرێ‌و پریشکی ئاگری لێ بەرز دەبنەوەو ئاگری پێ دەکرێتەوە.

**شَغْشَغَ اللجامَ في فم الدابة**: لغاوی لەدەمی ولاخەکەدا جوڵاندو توندی کرد بۆ ئەوەی ولاخەکە سەرنەرم بێ، جڵەو کێش بێ.

**شَغْشَغَ السنانَ في المطعون**: سەرە رمبەکەی لەبرینەکەدا لقاند بۆ ئەوەی برینەکە کاریگەر تر بێ.

**شَغَفَهُ شَغْفاً**: دڵی داگیر کرد، دڵی برد، وای لێ کرد عاشقی بێ.

**شَغِفَ به وبحبه**: حەزی لێ کرد بەسۆزو خۆشەویستی ئەو هەڵەو گیر بوو، کەوتە داوی دڵداری ئەوەوە ٥ (فهو شَغِفٌ وهي شَغِفَة).

**شُغِفَ به وبحبه شَغْفاً**: بەمانا (شَغِفَ)دێ ٥ (فهو مشغوف).

**تَشَغَّفَهُ**: بەمانا (شَغَفَهُ)دێ.

**تَشَغَّفَ الخبر فلاناً**: هەواڵەکە فلانکەسی خستە دڵەڕاوکێوەو پێیەوە هەڵەو گیر بوو.

**الشُّغاف**: پەردەی دڵ، یان ناخی دڵ.

**شَغَلَ الدارَ**: لەخانوەکە دا جێگیر بوو، مایەوە.

**شَغَلَ فلاناً عن الشيء**: فلانکەسی لەشتەکە لادا، مەشغولی کرد.

**شُغِلَ عنه بكذا**: بەهۆی فلان شتەوە لێی بێ ئاگا بوو.

**شَغَّلَهُ**: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (شَغَلَهُ)دا بەکاردێ، وای لێ کرد مەشغوڵ بێو ئاگای لەشتی تر نەبێ.

**اشْتَغَلَ الدواءُ في جسمه**: دەرمانەکە بەجەستەی دا بڵاو بوو کاریگەر بوو تێیدا.

**إنْشَغَلَ**: بۆ موطاوعەی (شَغَلَهُ)دێ.

**تَشَاغَلَ بِهِ**: پێوەی مەشغوڵ بوو.

**الأُشْغُولَةُ**: هەرشتێک ئادەمیزاد مەشغول بکاو لەشتی تر بێ ئاگای بکا ٥ (ك: أشاغيل).

**الشُّغَّالُ**: ئەو کەسەی ئیشی زۆر بێ ٥ ئەوکەسەی هەمە کارە بێو هەرچی داوای لێ بکرێ جگە لەکاری پیشەسازیی ئەنجامی دەدا.

**الشُّغْلُ**: پێچەوانەی بەتاڵییە ٥ شتی پەیدا بوو کە ئادەمیزاد مەشغوڵ بکا، دەگوترێ: (هو في شُغل شاغل): بۆ زێدە رۆیی لەمەشغوڵ بون دا بەمانا خودی کارەکەش دێ، دەگوترێ: (شُغل شاق): کارێکی قورس‌و گرانە، (شُغل جيد): کارێکی باشەی ٥ (ك: أشغال).

**المشغول**: دەگوترێ: (فلان فارغ

مـشغول): فلانكـەس بەكارێـكی بـێ سـودەوە خەریكـە ٥ (دار مـشغولة): خانوێـــكە خێزانـــی تێدایـــە، ئـادەمیزادی تێـدا نیـشتەجێیە ٥ (منـــصب مـــشغول): مەنـصەبەكە پڕكراوەتـەوە، كەسێـك هەیـە لـەو پلەو پایەدا كاردەكا.

شَغِيَتْ سِنُّهُ شَغىً: ددانێكی لەددانەكانی تـری درێـژ تـرە، گـەورەترە ٥ یـان لەڕیزی ددانەكانی تر دەرچووە.

شَغِيَ مِنسَرُ الطائر: دەنـدوكی باڵندەكە كەوانـەیی بـوو، خـوار بۆتـەوە ٥ (فهـو أشغَى وهي شَغواء).

شَغِيَت الأسـنانُ: ددانـەكانی لـەكورتیو درێـــژی دا جوداوازییـــان هـــەبوو ٥ (فهي شاغية).

أشغَى الرجلُ: پیاوەكە ڕاڕاو حولحولییە هەردەمەو ڕایەكی هەیە.

أشـغى القـوم بكـذا: خەڵـكەكە بـیرو بۆچونیان جـوداواز بـوو هەریەكـەو ڕایەكی خۆی هەبوو.

أشغى ببولـه: چۆڕ چۆڕو دڵۆپ دڵۆپ میزی كرد.

شَـــفَرَهُ شُـــفراً: قـــەراخی هـــەنگاوت، لەكەناری دا.

شَفَرَ الشيءَ: قەراخی شتەكەی هەنگاوت.

شَفَّرَتِ الشمسُ: خۆر لەئاوا بوون نزیـك بۆوە.

شَفَّرَ المـالُ: مـاڵو سامانەكە كـەم بۆوە، لەناوچوو فەوتا.

شَفَّرَ على الأمر: لەكارەكـە نزیـك بـۆوە لـێی چووە پێشەوە.

الـشُفْرَة: قـەراخی هەرشتێـك ٥ (شُـفرُ الجُفنِ): قەراخی پێڵوی چاو ئـەوەی كـە برژانگـی لـێ دەڕوێـن ٥ (ك: أشغار).

الـشَّفْرَةُ: دەمـە شمـشێرو دەمـە چـەقۆ، دەمە كێرد ئـەوەی پان كراوەتـەوەو تیـژكراوە لـەمادەی ئاسـن ٥ موسـو تـەراشو گـوێزان هەرشتێـك مـوی پـێ بتاشـرێ ٥ ڕەمـزو نهێنییەكـە هەندێ كۆمەڵو تاقم لەناوخۆیان دا بەكاری دەهێنن بۆ لێك حاڵی بونو لێك تێگەیشتن بە شێوەی نهێنـی ٥ (ك: شِفارٌ وشَفَرٌ).

الـــشَّفَّارُ: وەســـتای شـــفرە، شـــفرە دروستكەر.

الشَّفِيرُ: لێوارو قەراخ ٥ (شَـفِيرُ جهـنم): لێواری دۆزەخ.

المِشْفَرُ: لیـچی حوشـتر ٥ لیـچی خـواروی ئەستورو پتەوە.

شَفَشَفَ فـلان: پیاوەكـە غـیرە گرتـیو تـوڕە بـوو لەسـەر هـەڵسو كـەوتی بێگانە بەرامبەر مەحرەمەكانی.

**شَفْشَفَ الحَرُّ الشيءَ**: گەرماکە شتەکەی وشك کردەوە.

**شَفْشَفَ الصّقيعُ النبات**: سەرماو سۆڵەکە گیاوو گژەکەی هەڵپڕوکاند.

**شَفْشَفَ الهمُّ فلاناً**: خەمو خەفەت فلانکەسی کزو کۆڵەوار کرد.

**شَفْشَفَ الماءَ ونحوه**: کەم کەم ئاوی رشاند.

**شَفْشَفَ الدواءَ على الجرح**: دەرمانەکەی بەبرینەکەدا پرژاند پێیدا بلاو کردەوە.

**الشَّفْشاف من الثياب**: قوماشی تەنك چنراوو شاشو پاش چنراو ٥ بای شەماڵو فێنك کەرەوە ٥ نەرمەبای فێنك ٥ سروە بای فێنك.

**المُشَفْشَفُ**: کەسێك بەهۆی رق هەڵسانو تورە بوونەوە بلەرزێ، غیرە بیگرێو تورە ببێ.

**المُشَفْشِفُ**: فشەکەرو بەد ڕەوشت.

**شَفَعَ الشيءَ شَفْعاً**: شتەکەی کرد بە جوت، دوهێندەی خۆی لێ کرد.

**شَفَعَ البَصَرُ الأشباحَ**: بیناییەکە شتەکەی بەدو دوو بینی، وەکوو چۆن خێل شتی تاك بە جوت دەبینێ.

**شَفَعَتِ الحامِلُ**: ژنە دوگیانەکە منداڵەکانی کردن بە جوت، بەدوو، واتە دووەم منداڵی بوو.

**شَفَعَ لفلان**: تکاو پاڕانەوەی بۆ فلانکەس کرد بۆنەوەی لەتاوانی خۆش ببن یان لێی کەم بکەنەوە.

**شَفَعَ الى فلان**: هانای بۆ فلانکەس بردو تکاکاری نارد بۆلای.

**شَفَعَ في الأمر**: شەفاعەتو تکای لەکارەکەدا کرد.

**شَفُعَ**: مانای (شَفَعَ) بەزێدە وە دەگەیەنێ.

**شَفَّعَ فلاناً في كذا**: تکای فلانکەسی لەوشتەدا وەرگرت ٥ تکاکەی وەرگیرا، دەگوترێ: (هو مُشَفَّعٌ): تکاو شەفاعەت وەردەگرێو قبوڵیەتی ٥ (هو مُشَفَّعٌ): تکاو شەفاعەتی وەرگیراوە.

**تَشَفَّعَ له**: بەمانا (شَفَعَ)دێ.

**تَشَفَّعَ لفلان الى فلان**: تکای لەفلان کرد بۆ فلان.

**تَشَفَّعَ**: چووە سەر ڕێبازی ئیمامی شافیعی، بوو بەشافیعی مەزهەب.

**استَشْفَعَ**: داوای کۆمەکیو یارمەتی کرد، دەشگوترێ: (استَشْفَعَ فلاناً وبه واستَشْفَعَ الى فلان).

**الشّافِعُ**: خاوەن تکاو شەفاعەت ٥ (ناقة شافع): حوشترێك بێچوی لەگەڵ بێ ٥ (شاة شافع): مەڕ بەرخۆلەی لەگەڵ بێ.

**الشَّفائع**: شتی دوولایەنو دوو سەرە.

**شفائع النبت**: روەكێك بەدوو جۆر بڕوێ.
**الشَّفَاعَة**: تكاكردنو پاڕانەوە بۆ لێخۆشبون لە تاوانبار.
**الشَّفْعُ**: ئەوەی شت دەكا بەجوتو دوو دوو ٥ پێچەوانەی تاكە ٥ (ك: أشفاع وشفاع).
**الشَّفْعُ**: بەمانا (الشَّفْعُ)دێ.
**الشُّفْعَةُ**: دوڕكات نوێژی چەشتەنگاو.
**الشُّفْعَةُ**: مافی جیران بۆ هەڵگرتنەوەی زەویو خانوی هاوسێی خۆیو نەهێشتنی كڕیاری تر كە ئەو مڵكە بكڕێ بەومەرجو یاسایەی شەریعەتی ئیسلام دیاریی كردون، هەروا وشەی (الشُّفْعَة) ناوە بۆ خودی موڵكە هەڵگیراوەكە بەو شێوەیە ٥ هەروا بەمانا (الشُّفْعَةُ)دێ ٥ چاوەزار، دەگوترێ: (أصابته شُفْعَةٌ): چاوی پیس كاری لێ كردوە.
**الشُّفوعُ**: كەسێكە بتوانێ دوهێندەی هاوەڵەكەی كار بكا.
**الشَّفيعُ**: خاوەن تكاو شەفاعەت ٥ ئەوكەسەی زەویو خانو بەشێوەی شوفعە هەڵبگرێتەوە ٥ ژمارەی جوت وەكوو (٢،٤،٦،٨،....هتد) ٥ (ك: شُفَعَاءُ).
**شَفَّ الثَّوبَ ونحوه**: قوماشەكە ئەوەندە تەنكو شاشە ئەو دیوی دەبیندرێ.
**شَفَّ الشيءُ**: شتەكە هێندە تەنكە یان ئەوەندە رونو شەفافە ئەودیوی نەشاردەوە، دەگوترێ: (شَفَّ الإناءُ): مەنجەڵەكە سوراحییەكە شتی ئەودیوی تێدا دەبیندرێ ٥ (شَفَّ السائل): شلەمەنییەكە ئەوەندە رونە ئەودیوی خۆی نەشاردۆتەوە.
**شَفَّ**: بەهۆی نەخۆشیو غەمو خەفەتەوە كزو لاواز بوو ٥ لەبەر سوكیو بێ كێشی وەقرە ناگرێ.
**شَفَّت الريحُ**: كزە با هەڵیكرد هەوای ساردو كزەبا هەڵبوو.
**شَفَّ الشيءَ شَفّاً**: شتەكەی لاوازكرد، خەوی لێ زڕاند، دەگوترێ: (شَفَّهُ الحب أو الهَمُّ): دڵداریی یان خەمو پەژارە خەوی لێ زڕاند.
**شَفَّ الهواءُ الماءَ وغيره**: هەواكە كەمێكی لەناوەكە برد.
**شَفَّ الشاربُ الماءَ أو الشرابَ**: بخۆرەوەكە جۆڕی لەناوو شەرابەكە بڕی هەمووی هەڵقوڕاندو هیچی نەهێشتەوە.
**شَفَّ الرسمَ**: وێنەكەی بەشتی رونو شەفاف دروست كرد.
**أشَفَّ عليه**: بەسەری دا باڵا دەست بوو.
**أشَفَّ الشيءَ**: شتەكەی رونو شەفاف دروست كرد.

أشَفَّ بعض أولاده على بعض: زێده ڕێزو خۆشەویستی دا بەهەندێ لەمناڵەکانیو بەهەندێکیانی نەدا.

شَفَّ عليه: بەسەری دا باڵا دەست بوو ٥ تەنكو باریكی كرد.

اشتَفَّ ما في الإناء: ئەوی لەپەرداخو قاپەكە دا بوو هەموی خواردەوە.

اشْتَفَّ الأمورَ: لێكۆڵینەوەی لەكارەكان دا كرد.

إستَشفَّ الشيءَ: شتەكەی بینی بەهۆی چاویلكەو دوربینو شتی وەهاوە.

استَشَفَّ الثَّوبَ: قوماشەكەی هەڵپشكنی بۆ ئەوەی بزانێ ئاخۆ عەیبی تێدانییە.

إستَشَفَّ الكتابَ والأمرَ: لەكتێبەكە ورد بۆوە یان لەكارەكەی ڕوانی بۆئەوەی بزانێ چی تێدایە.

إستَشَفَّ الشرابَ: شەرابەكەی هەموو هەڵقوڕاند چۆڕی لێ بڕی.

الشُّفَافَةُ: بەرماوەی شەراب.

الشِّفُّ: پەردەی تەنك كەئەودیوی تێڕا دیاربێ، دەگوترێ: (ثوبٌ شِفٌّ): قوماشێكە ئەو دیوی تێڕا دیارە ٥ (ك: شُفُوفٌ).

الشِّفُّ: زێدە بەش ٥ خۆزگەو پیرۆزبایی، دەگوترێ: (شِفٌّ لك یافلان): خۆزگەم بەخۆت فلانكەس، ئەو شتەت پیرۆزبێ ٥ (ك: شُفُوف).

الشَّفَفُ: تەنكیو لاوازیی ٥ سوكیو بێ كێشی ٥ كەم گوزەرانیو دەست كورتی ٥ شتی كەمو بێ بەهاو ئاسان.

الشَّفَّافُ: ئەوەی ئەو دیوی خۆی نەشارێتەوە لەبەر ڕونیو تەنكی.

الشَّفِيفُ: بەمانا (الشَّفَّاف)دێ ٥ گەستنی سەرما، ئازاری سەرما ٥ (ك:شِفاف).

شَفِقَ منه وعليه شَفَقاً: ترسا لێی ٥ لێی وریا بوو ٥ بەزەیی پێداهاتو سۆزی بۆ نواند ٥ (فهو شفيق وهي شفيقة).

أشفَقَ منه: لێی ترسا، حەزەری لێ كرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَهُم مِّنَ السَّاعَةِ مُشفِقُونَ﴾.

أشفَقَ عليه: بەزەیی پێداهاتەوە خەمی بوو توشی شتێك بێ.

الشَّفَقُ: سۆزو بەزەیی ٥ سورایییەكە دوای خۆر ئاوابون لەكەناری ئاسمان دیارەو دەمێنێتەوە تاكاتی نوێژی خەوتنان ٥ لای شت ٥ شتی خراپ لە هەرشتێك بێ.

الشَّفَقَةُ: ڕەحمو سۆزو بەزەیی ٥ ترسو خۆف لەپەیدا بوونی بەڵاو كارەسات.

الشَّفِيقُ: خاوەن سۆزو بەزەیی ٥ (ك: شُفَقَاء).

شَفَنَهُ واليه شَفْناً: بەتیلەی چاوو ڕق

لێبوونەوە سەیری کرد، یان بە سەرسوڕمان لێی سەیری کرد، یان بەگاڵتە پێکردن و کەم نرخییەوە تەماشای کرد ◦ (فهو شافن وشفون).

شَفَهَهُ شَفْهاً: لێوی هەنگاوت ◦ زۆر بە گیرە گیرەوە داوای لێ کردو شتی لێ وەرگرت تاهیچی پێوە نەهێشت.

شَفَهَ المالَ ونحوه: ماڵەکەی لەکیس دا تەفرو تونای کرد.

شُفِهَ الشیئُ: شتەکە داواکاریی زۆربون ◦ (فهو مَشفوه)، دەگوترێ: (شُفِهَ الطعامُ) و(شُفِهَ المالُ) و(شُفِهَ الرجل).

شافَهَهُ مشافَهَةً وشفاهاً: راستەو خۆو رو بەڕو قسەی لەگەڵ کرد.

شافَهَ البلدَ أو الأمرَ: لەوڵات و شارەکە نزیک بۆوە یان لەکارەکەی نزیک بۆوە.

الشَّافِهُ: تینو ئاوی دەست نەکەوێ.

الشُّفَاهِيُ: لێو ئەستور یان هەردو لیچی ئەستورو خەپلە بن.

الشَّفَةُ: (شَفَةُ الشیء): کەناری شت، قەراخی شت، قەراخی لای سەروی شتەکە، دەگوترێ: (شفة الدلو وشفة الجبل).

شفة الإنسان: لێوی ئادەمیزاد؛ ئەو پارچە گۆشتەی ددان دادەپۆشێ مەبەست هەردو لێوە لێوی خوارو لێوی سەرو ◦ (بنت الشَّفَة): وشەو قسە، دەگوترێ: (لم ینبس بنت شَفَةٍ): قسەیەکی نەکرد ورتەی لەدەم نەهاتەدەر.

شَفَت الشمسُ شَفْواً: خۆر نزیک بەئاوا بون بوو.

شَفا الله العلیلَ: خودا شیفای نەخۆشەکەی دا، لەنەخۆشییەکەی چاك بۆوە.

أشفى فلان: فلانکەس کەوتە کۆتایی شەوەوە.

أشفى علی الشیئ: لەشتەکە نزیک بۆوە، دەگوترێ: (أشفت الشمس علی الغروب): خۆر لەئاوابون نزیک بۆوە.

أشفى الرجل علی الموت: فلانکەس لەمردن نزیک بۆوە.

أشفى المریضَ: داوای شیفای بۆ نەخۆشەکە کرد ◦ یان دەرمانی کاریگەریی بۆ دەست نیشان کرد.

أشفى المریض الدَّوَاءَ: دەرمانی چاککەرەوەی دا بەنەخۆشەکە.

شافاه: راستەو خۆو روبەڕو قسەی لەگەڵ کرد.

اِشتَفى بکذا: بەفلان دەرمان چاری سەری نەخۆشیەکەی کرد.

اِشتَفى من عدوِهِ: گەیشتە حاڵەتێك تۆڵەی لەدوژمنەکەی ستێندراو بیرۆشی هات.

تَشَفَّى: بەمانا (إستشفى)دێ.

اسْتَشْفَى المريضُ من علته: نەخۆشەكە هەوڵی چاكبونەوەی دا.

اسْتَشْفَى بِه: بەو دەرمانە تیماری دەردەكەی كرد.

الأشْفَى: ئەو كەسەی زار قزبێو لێوی بۆ لێك نەنرێن، بۆ مێینە دەگوترێ: (شَفواء).

الشَّفَا من كل شيئ: لەهەموو شتێك دا بەكەنارەكەی دەگوترێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَكُنتُمْ عَلَىَ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا﴾ ٥ هەروا بەمانا كەمو بێ ئەمود دێ، دەگوترێ: (ما بقي منه إلا شفاً): شتێكی كەم نەبێ لەو شتە نەماوەتەوە.

الشِّفَاءُ: چاكبوونەوە لەنەخۆشی ٥ دەرمانی دەردو نەخۆشی ٥ قورئان دەربارەی هەنگوین دەفەرموێ: ﴿يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاء لِلنَّاسِ﴾ ٥ هەروا بەمانا دەرمانی دەروون دێ، (قورئان دەفەرموێ: (وشفاء لما في الصدور).

المستشفى: شوێنی دەرمانكردنو چارەسەركردنی نەخۆش ٥ خەستەخانە كەپزیشكو پەرستیارو دەرمانو شوێنی حەوانەوەی تێدایە.

الشَّفْوِي: هەرشتێك بەدەم ئەنجام بدرێ ٥ تاقیكردنەوەی شەفەوی، بڕیاری شەفەوی.

الشفوية: روەكی شەفەویە ئەوەی گوڵەكەی بەرزبێتەوەو ببێتە دووفاقو یەكیان لەوی تریان بەرز تربێ ٥ (الحروف الشفوية): ئەو پیتانەی بەلێو دەردەبڕدرێن وەكوو (ف، م، ب، و).

شَقَا نابُه شُقوءاً: كەڵبەی دەركەوت.

شَقَأَ شَعْرَهُ بالمشط شقئاً: قژی بەشانە بڵاو كردن.

شَقَأَ فلاناً بالعصا: گۆچانی ئاراستەی تۆقە سەری فلان كرد.

الشَّقَأُ: پشت ناو چاوان لەپێشە سەر ٥ (ك: مَشاقئ).

المِشقأ: شانە ٥ (ك: مَشاقئ).

شَقَحَ الشيئَ شَقْحاً: شتەكەی دوور خستەوە ٥ شكاندی.

شَقَحَ الجوزَ ونحوها: كاكڵەی گوێزەكە یان بادامەكەی دەرهێنا.

شَقِحَ شَقَحاً وشُقْحَةً: سوورو چاوشین بوو.

شَقُحَ شقاحة: ناشیرین بوو.

أشْقَحَ البسرُ: خورما بەرسیلەكە سوورایی تێكەوت ٥ ئاڵو بۆڵی لێ پەیدا بوو، دەگوترێ: (أشْقَحَ النخلُ): خورماكە ئاڵو بۆڵی تێكەوت.

شَاقَحَهُ: جوێنی پێ دا.

تــشاقَحَا: ئــەو دووكەســە جوێنيــان بەيەكتردا.

الأَشْقَحُ: سوری چاوشین ◦ سورهڵ ◦ بۆ مێینە (شقحاء).

الـشَّقْحَةُ: هێـشوە خورمـای ئـاڵو بـۆڵ تێكەوتوو ◦ (ك: شِقاح).

الشُّقْدَةُ: گیاو گژو ئاڵفێكە ئاژەڵ بیخوا شـیری زۆر دەبـێ پێـشی دەگـوترێ: (القِشدة) ◦ (ك: شِقَدٌ).

الشُّقْدُفُ: شتێـكە لەكـەژاوە گـەورەترە، كـاتی خـۆی عەرەبـەكان بـەكاریان دەهێنا بۆ سەفەری حەجو عـەمرە ◦ (ك: شقادِف).

شَقَدَ شَقْداً: دەركراو، دووركەوتەوە.

شَقِدَ شَقَداً: بەمانا (شَقَدَ)دێ.

شَـقِدَ فـلان: فلانكـەس خـەوی لـێ زڕاو نـەیتوانی بخـەوێ، یـان بەسـەر خـەودا زاڵ بـوو وەنـەوزی نـەهاتێ، یـان چـاو پیـسەو بەچـاو خەڵـك دەهـەنگێوێ ◦ (فهو شَقِدٌ).

أَشْقَدَهُ: دەری كردو ڕۆیی.

شاقَدَهُ: دژایەتی كرد.

الـــشَّقِدُ: گـــورگ ◦ هـــەڵۆ ◦ حیربـــاء ◦ چاوپیس كە بەچاوەزار كار لەشت دەكا زیان دەگەیەنێ.

الشَّقَذُ: عەیبو لەككە، دەگـوترێ: (مابه شَـــقَذٌ ولانَقَـــذٌ): هـــیچ عـــەیبو خەلەلێكی تێدانییە.

الشَّقَذان: بەمانا (الشقذ)دێ.

الـشَّقْذانة: ئـافرەتی ڕۆح سوكو خـوێن شـیرین، یـان ئـافرەتی دەمدرێـژی جنێو فرۆش.

الشَّقِيذُ: ئەوكەسەی خەوناچێتە چاوی.

شَقِرَ شَقَراً وشُقْرَةً: سورو سپی بـوو، ڕەنگـە سپییەكەی سـوریی تێـكەڕاوە ◦ (فهـو شَقِرٌ وهـي شـقرة) ◦ (وهـو أشـقر وهـي شقراء) ◦ (ك: شقرٌ).

إشقَرَّ: سوریو سپییەكەی زۆر بوو.

الأشْقَرُ من الدمـاء: خوێنپارە.

الـــشُّقارى: گـــوڵی شـــەقائق النعمـــان؛ ڕوەكێـــكە گوڵەكـــەی ســـورو پەڵـــە پەڵەیـە بـەخاڵی ڕەش، زۆر جـۆری هەیـــە هەندێـــكی دەروێنـــدرێ هەندێـــكی خۆڕســـكە لـــەكۆتایی زستانو بەهاردا دەڕوێ.

الـشُّقْرُ: كـاری گـرنگ ◦ نهێنـی ◦ (ك: شـقور)، دەگـوترێ: (بَثَّـهُ شُـقُورَهُ): خەمو خەفەتی بۆ هەڵڕشتن.

الشُّقَرُ: كەڵەشێر.

الـشِّقِرى: جـۆرە خورمایـەكی باشـە، لەیەمەن پێی دەڵێن: (المُشَقَّرُ).

الـشُّقْران: نەخۆشییەكە توشی كشتو كاڵ دەبێ.

الـــشُّقْرَةُ: ســـورایيەكی رونو صـــافەو

تۆزێك مەیلەو سپییە بەزۆری بۆ پێستی ئادەمیزاد بەكاردەهێندرێ.

**الشُقّارُ**: بەمانا (الشُّقّاری): دێ ٥ جۆرە ماسییەكی سوری كلك درێژە.

**الشُقّارَی**: بەمانا (الشُقارَی)دێ.

**الـشُقُورُ**: غـەمو دڵتەنگییـەك خـەو بزرێنێ.

**الشُقَیْرُ**: جۆرە حەربایەكە، سیسرەیە ٥ جۆرە كوللەیەكە.

**المَشْقَرُ من الرمل**: چەوو لمی تـەمبارە بەستوی رەق‌و پتـەو وەكـوو شاخە زرِوی كەبەناو زەوی دا درێژ بۆتەوە ٥ (ك: مَشَاقِرُ).

**المُـشَقَرُ**: سـوراحی ٥ پیاڵـەی گـەورە ٥ كونـدەی ئـاو ٥ قەلایـەكی كـۆن‌و مێژوییە لەولاتی بەحرەین.

**الشُقْرَاقُ والشِّقِرّاقُ**: باڵندەیەكی بچوكی وەكـوو پەپوسـولەیمانكەیە رەنگـی خاڵخاڵە بەسەوزو سورو سپی، پێشی دەگـوترێ: (الأخیـل) عـەرەب كردوویانـە بـە نیـشانەی رەشـبینی‌و نەگبەتی.

**شَقْشَقَ الجملُ**: حوشـترەكە دەنگـی خـۆی لـەقورگی دا خـواردەوە ٥ چۆلەكەكە جریواندی.

**الشِقْـشِقَةُ**: شتێـكە وەكـوو سـی وایـە حوشـتر لـەكاتی چەموشـی‌و دەنـگ خواردنەوەی لـەدەمی دەری دەهێنـێ ٥ (ك: شـقائق)، هـەروا دەگـوترێ: (هـدرت شِقْـشِقَةُ فـلان): رقـی فلان هەڵـسا، یـان بەباشـی راو بۆچـونی خـۆی دەربـری، هـەروەها دەگـوترێ: (شِقْشِقَةُ هدرت ثم قرّت): ئاشوب‌و فیتنەییـەك بـوو بـەرپابوو پاشـان دامركایەوە، هەروا دەگوترێ: (فـلان شِقْـشِقَةُ قومـە): فلانكـەس گـەورەو قسە رۆیشتوی گەلەكەیەتی.

**شَـقَّصَ الذبیحـة وغیرهـا**: گۆشـتی كوشـتییەكەی كـەرت‌و پـەرت كـرد، بەیەكـسانی بەسـەر هاوبەشـەكان دا دابەشی كرد.

**الـشُقْصُ**: پارچـەی شت ٥ بـەش‌و بـار ٥ (ك: أشقاص وشِقاص).

**الـشَقِیصُ**: بـەمانا (الـشُّقْصُ)دێ ٥ شـتی كەم ٥ هاوبەش.

**المِشْقَصُ من النصال**: سەرە رمبی درێژو پـان، دەگـوترێ: (سـهم ذو نـصل عریض) ٥ (ك: مشاقص).

**المُشَقِّصُ**: قەصاب ٥ گۆشت فرۆش.

**الـشُقَفُ**: سوالەت یـان لەتـە سوالەت ٥ تاكەكەی (شَقَفَةٌ).

**الـشُقّاف**: سـوالەت دروسـتكەر، یـان سوالەت فرۆش.

**شَقَّ الأمرُ شَقّاً**: كارەكە گران‌و زەحمەت بـوو.

**شَقَّ على فلان**: ئەركى گرانى خستە سەر شانى فلانكەس.
**شَقَّ النبتُ**: روەكەكە رواو دەركەوت، سەرى لەزەوى دەرهێنا.
**شَقَّ النابُ**: كەڵبەكە (ددانەكە) دەركەوت.
**شَقَّ البرقُ**: هەورە بروسكەكە بەدرێژى بینرا لەناو هەوردا بەلام بلاو نەبۆوە.
**شَقَّ الشيءَ**: شتەكەى شەق و پەق كرد.
**شَقَّ نَهْراً**: جۆگاى راكێشا، جۆگاكەى هەڵكەند.
**شَقَّ الأرضَ**: زەوییەكەى كێلا، دەشكوترێ: (شَقَّ عصا الطاعة): سەرپێچى كردو یاخى بوو ٥ (وَشَقَّ عصا الجماعة): یەكیەتى كۆمەڵى تێك داو ئاژاوەى خستە ناویانەوە، تەبایى لێ كردن بەدژایەتى.
**شَقَّ الفرسُ ونحوه شَقّاً**: ئەسپەكە لەرۆیشتن دا ئەملاو ئەولاى رێگاى گرت و بەراستە رێگادا نەرۆیى ٥ (فهو أشَقُّ وهي شَقَّاءُ).
**شاقَّهُ**: دژایەتى كردو بەپێچەوانەى ئەو جولایەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَمَن يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾.
**شَقَّقَهُ**: بۆ زێدەرەوى لەماناى (شَقَّهُ)دى.
**شَقَّقَ الكلامَ**: قسەكەى درێژە پێداو رونى كردەوە لەقسە قسەى دەرهێناو قسەكەى وردكردەوە، دەگوترێ: (اشتق الفرسُ ونحوه في عدوه وفلان في الكلام أو الخصومة ونحوها): ئەسپەكە لەرۆیشتنى مەبەست لاى دا، یان فلانكەس لەمەبەستى سەرەكى باسەكە چووە دەرو شتى لاوەكى هێنانە ناو باسەكەوە یان كێشە سەرەكییەكەى واز لێ هێناو شتى ترى هێنانە پێشەوە.
**اِشتَقَّ الطريقَ في الفلاة**: بەرێگاى چۆڵ و سارادا رۆیى.
**اِشتَقَّ طريقه في الأمر**: بەتواناو لێ هاتوییەوە چووە كارەكەوە.
**اِشتَقَّ الكلمةَ من غيرها**: وشەكەى لەوشەیەكى تر دەرهێنا، وەكوو بڵێى وشەى (یضرب، ضارب، مضروب)ى لەوشەى (ضَرَبَ)دەرهێنا.
**اِنشَقَّ**: شەقى برد، درزى گەورەى تێكەوت.
**اِنشَقَّ الفجرُ**: كازیوەى بەیانى دەركەوت.
**اِنشَقَّ البرق**: بروسكەكە دەركەوت.
**اِنشَقَّ الرأي**: رایەكە كێشەى تێكەوت بۆ بەچەند رایەكى جیاجیا، دەگوترێ: (اِنشقَّت عصا الجماعة): كۆمەڵەكە پەرتەوازە بوون ٥ پێرو تاقمەكە

بلاَوەیان لیَ کرد.

**تَـشَاقًّا**: لیَـك جیابوونـەوەو دژایـەتی کەوتە ناویانەوە.

**تشَقّقَ**: شەق بوو، درزی گەورەی تیَ بوو کەلەبـەری دەرکـەوت ٥ قورئـان دەفـەرمویَ: ﴿يَوْمَ تَشَقَّقُ الْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا﴾.

**تشقّق الفرسُ**: ئەسپەکە کزو لاواز بوو.

**اسْتَـشَقَّ الحامـل بِحَمْلِـهِ**: کۆلْبارەکـە کۆلْەکـەی خـستە سـەر لایـەکی بۆئـەوەی لەدەرگاکـە یـان لەشـویَنی تەنگەبەر ئەودیو بکەویَ.

**الإسْتِـشقاق**: لـەزانیاری عـەرەبی دا بریتییە لەدەرهیَنانو دروستکردنی وشەیەك لەوشەیەکی تـر بـەگویَرەی یاسای زانیاری سەرف.

**الشَّاقّ**: قورس، گرانو ناخۆش ٥ (ك: شواق).

**الشّقائق**: یان (شقائق النعمان): بەچەند جـۆرە گولیَـك دەگـوتریَ وەکـوو گولالە سورەو گولـە نیسانو شلیَرو گەلاوك.

**الشُّقَاق**: قەلْشانی پیَستی دەستو قاچو دەمو لیَـو بـەهۆی نەخۆشـی یـان ساردو سەرماوە.

**الـشّقُّ**: نارەحـەتیو مەینـەتی ٥ درزو کەلەبـەرو قەلْـشتو کـون ٥ (ك: شُقُوق).

**الـشّقُّ الخَیـشومي**: کـونی لـوت بـەلای سەردا.

**الـشّقُّ القیـصري فِي الـولادة**: هەلْـدڕینی سـکە بـۆ دەرهیَنـانی زارۆك لەمندالْدانی دایکی.

**الشِّقُّ**: (شِقّ الشيء): لای شت ٥ بەشیَکی شـت ٥ کەرتیَـکی نیـوەی ٥ چـورتمو نارەحـەتی ئـەرکی قـورسو گـران ٥ قورئـان دەفـەرمویَ: ﴿وَتَحْمِـلُ أَثْقَالَـكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُـواْ بَالِغِيـهِ إِلاَّ بِشِقِّ الأَنفُسِ﴾.

**الـشّقّاق**: دەگـوتریَ: (رجـل شـقّاقٌ): پیاویَـکی خۆبـەزلزانو لـەخۆبایی‌و هیچ لەبارانەبووە.

**الـشُّقّة**: نیـوەی شـت کـە بکریَ بـەدوو کەرتـەوە ٥ پارچـەی لیَـکراوە یـان هەلْـدڕاو شـەقبوو ٥ هەرپارچـە قوماشیَـك بەدریَـژی دڕابـیَ، یـان عەصاو داری تـر کـە درزی بردبیَ ٥ دوریـی ٥ سـەفەری دریَـژ ٥ یـان مەسـافەیەك کـە بەناخۆشـی رۆیـشتنی پیَـدابکریَ ٥ قورئـان دەفەرمویَ: ﴿وَلَـكِن بَعُـدَتْ عَلَـيْهِمُ الشُّقَّةُ﴾ ٥ (ك: شُقَاق).

**الـشّقِیقُ**: بـرای بـاوكو دایکـی ٥ هـاو ویَنـەو هاوشـان، هاوسـەر ٥

لەفەرمودەی پێغەمبەردا هاتووە: (النساء شقائق الرجال) ٥ (ك: أشِقاء).

**الشَّقِيقة**: خوشکی باوكو دایکی ٥ بارانی زۆر ٥ ئازارێکە نیوەی سەردەگرێ یان نیوەی دەمو چاو دەهێشێ ٥ (ك: شقائق).

**المَشَقَّةُ**: نارەحەتیو مەینەتی ٥ (ك: مشاق).

**شَقَلَهُ شَقْلاً**: كێشای.

**الشاقول**: شاوێ ٥ دارێکە بەلای سەروویەوە شتێکی پێوەیە وەکوو بزمار ٥ کشتیارەکان زەوی پێ مەزندە دەکەن یان سنووری زەوییەکانیانی پێ دیاری دەکەن.

**شَقَاهُ شَقْواً**: خستیە نێو نەگبەتییەوە، توشی نەهامەتی کرد.

**شَقِيَ شَقاً وشَقاوة**: بەدبەختو نەگبەت بوو، وەزع حاڵی ناخۆش بوو ژیانی تاڵ بوو.

**شَقِيَ في كذا**: ماندوو بوو، ئەرکی گرانی کەوتە سەرشان ٥ توشی ناخۆشیو کارەسات بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ شَقُوا فَفِي النَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ﴾.

**أشقاه**: خستیە ناو نەگبەتیو چورتمەوە، توشی كێشەو کارەساتی کرد.

**شاقى الشيءَ مشاقاةً وشِقَاءً**: لەشتەکە نارەحەتی چەشتو ناخۆشی بینی.

**شاقاه في الحرب**: لەشەڕدا بەسەریدا زاڵ بوو.

**الشَّقاء**: تەنگو چەڵەمەو ناخۆشی ٥ تەنگانەو دەردەسەری ٥ گومڕایی بەدبەختی.

**الشَّقاوة**: بەمانا (الشَّقَاءُ) دێ.

**الشِّقْوَةُ**: بەمانا (الشَّقَاءُ)دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا﴾.

**الشَّقِيُّ**: نەگبەتو بەدبەخت ٥ لە قورئان دا هاتووە: ﴿فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ﴾ ٥ گومڕاو ڕێگا لێ گوم بوو ٥ لاسارو هیدایەت وەرنەگر ٥ (ك: أشقياء) بۆ مێینە (شَقِيَّة) بەكاردێ.

**شكي فُقْرَةٌ شَكاً**: نینۆکی قەڵشتن ٥ دەگوترێ: (شكي فلان): فلانکەس نینۆکی قەڵشان ٥ قامکی شەقار شەقاربوو.

**اشكَلت الشَّجَرَةُ**: درەختەکە چرۆی کرد، لقو پۆپەکانی یەکەمجار دەرکەوت.

**الشُّكاءُ**: قەڵشینی دەورو بەری نینۆك ٥ قەڵشانی پێست.

**الشُّكبَانُ**: تاینچە، رەشکە، شریفی کون کون، شتێکە کونکونە کشتیارەکان کاو کۆتی تێدەکەنو دەیگوێزنەوە.

**شَكَدَهُ شكداً**: بەخشینی باشی دایەو چاوەڕوانی سوپاسیشی لێ نەکرد ٥ لەکاتی بەرێکەوتنی بۆسەفەر هەندێ خۆراکی پێدا.

**الشُّكُدُ**: بەخشینی بێ پاساوو سوپاس ٥ خەرمانانەو مشتاخانە ئەو شتەی کەلەکاتی چنینو درونەوەدا بەشێك دەدرێ بەهەژارو بێ نەوایان بەناوی خەرمانلۆغەو مشتخانە ٥ ئەو خواردنو تێشوەی بۆ رێبوار نامادە دەکرێ لەکاتی سەفەرکردنی دا.

**شَكَرَتِ الدَّابَّةُ شكراً وشكوراً وشكراناً**: وڵاخەکە ئالفو ئالیکی کەم بەشی کرد ٥ وڵاخەکە چووە ناو پاوانەوەو لەوەڕاو قەڵەو بوو.

**شَكَرَ فلاناً وله شكراً وشكراناً**: باسی ئازو نیعمەتی فلانی کردو سوپاسگوزاری بوو، باسی پیاوەتییەکانی فلانی کردو پێیدا هەڵکوت، دەگوترێ: (شَكَرَ اللهُ): سوپاسی خودای کرد ٥ (شَكَرَ للهِ): سوپاسگوزاری خودا بوو نیعمەتەکانی خودای هێنانە بەرچاوی خۆی سوپاسگوزار بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُواْ لِلّهِ﴾.

**شَكَرَ عَمَلَهُ**: لەسەر کارەکەی پاداشی دایەوە.

**شَكِرَتِ الشَّجَرَةُ شَكراً**: درەختەکە پڕۆو پاڵی دەرکرد.

**شَكِرَ الضَّرْعُ**: گوانەکە پڕبوو لەشیر، دەشگوترێ: (شَكِرَت الناقة): حوشترەکە شیری زۆر بوو.

**شَكِرَت السَّحَابَةُ**: هەورەکە پڕبوو لەباران.

**شَكِرَ فلان**: فلانکەس دوای ڕژدیو چرۆکی دڵفراوان سەخی سروشت بوو، یان عەتاو بەخششی زۆر بوو ٥ (فهو شَكِرٌ وشكران وهي شَكِرَة وشَكْرَى) ٥ (ك: شَكارى).

**أشكَرَ الضَّرْعُ والشجرُ**: بەمانا (شَكِرَ)دێ.

**إشْتَكَرَ الجنينُ**: منداڵەکە گەندەموی لێ ڕوان.

**إشْتَكَرَ السَّماءُ**: ئاسمان بارانی زۆری باراند، بارانی بەخوڕەمی باراند.

**إشْتَكَرَ الرياحُ**: بایەکە بارانی هێنا، بای پێش باران بوو.

**إشْتَكَرَ الحرُّ أو البردُ**: گەرما یان سەرما پەرەی سەند.

**إشْتَكَرَ الرجُلُ في عدوه**: پیاوەکە هەنگاوی خێرای هەڵێنان.

**تَشَكَّرَ له**: سوپاسی کرد، سوپاسگوزاری بوو.

**الشَّكَائِرُ**: پێشە سەر، ناوچەوان.

**الشِّكَارَةُ**: کیسێکە لەکاغەز یان لەشتی

تر دروست دەكرێ ٥ چیمەنتۆی تێ دەكرێ.

**الشُّكُرُ**: سوپاسگوزاریو پێ زانینی نیعمەت ٥ سوپاسكردن لەسەر نیعمەت.

**الشَّكُورُ**: بۆ زیدە مانای وشەی (الشاكر) دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ﴾ ٥ وشەی (الشكور) یەكێكە لەناوە جوانەكانی خودا بەمانا پاداش دەرەوەو نیعمەت بەخش دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ﴾ ٥ هەروا بەكەسێك دەگوترێ دیاردەی نیعمەتی پێوە دیاربێ، دەگوترێ: (إمرأة شكور): ئافرەتێكە ئازو نیعمەتی پێوە دیارە، ئاز پەروەردەیی لێ دەبینرێ ٥ (ك: شُكُرٌ).

**الشَّكِيُّ**: گەندەمو، گەندە پەرو پۆڵ ٥ پرزو پاڵی دەوروبەری لقە دارخورما ٥ لقە داری تەرو تازە ٥ چرۆزەی درەخت كەسەر دەردێنێ ٥ ئەو دەومەنو پرزو پاڵەی لەدەورو بەری بنكی درەخت دەروێ.

**المِشكارُ**: ئاژەڵی بەشیرو شیر زۆر ٥ (ك: مشاكِر).

**المِشكَرَةُ مِنَ العُشب وغيره**: ئەو گیاو گژەی كە ئاژەڵ دەیخواو پێی قەڵەو دەبێو شیری پێ زۆر دەبێ ٥ (ك: مشاكر).

**شَكَرَهُ شكراً**: بەسەرە نەڤیزەو گۆچان تێوەی ژەنی ٥ بەزمان لێی دواو باسی كرد، قسەی ناشیرینی ئاراستە كرد.

**شَكِسَ شَكَساً وشكاسة**: رەوشتی ناشیرین بوو، مامەڵەی قورسو گران بوو.

**شَاكَسَهُ**: رقی هەڵسان، تورەی كرد، تەنگی پێ هەڵچنی.

**تَشَاكَسَا**: دژایەتی كەوتە نێوانیانەوەو بەرامبەر بەیەك گرژبوون ٥ هەریەكەو دەیەوێ مزی خۆی لێ بكرێ.

**الشّاكوسُ**: چەكوچ چەكوچی بچوك ٥ (ك: شواكس).

**شَكشَكَ السِّلاحَ**: شمشێرو كێردەكەی تیژ كرد خەنجەرەكەی مشتو ماڵ كرد.

**شَكَعَ الدابّةَ بزمامها شَكْعاً**: بەهەوسارەكەی سەری ولاخەكەی بەرز كردەوە.

**شَكِعَ فلان شَكَعاً**: فلانكەس ئالاندیو هاواری ئازاری كرد.

**أشْكَعَهُ**: ئارەحەتو خەفەتباری كرد.

**شَكَّ الشيءُ شَكّاً**: هەندێكی لەشتەكەی

بەهەندێکی تریەوە نوساندو چەسپاندی.

شَكَّتِ القرابةُ: خزمایەتییەکەی راگرتو نەی پچڕاند.

شَكَّ الدّابةَ: دەستی ولاخەکەی هەڵبەست بۆئەوەی هەنگڵەشەلە بکا.

شَكَّ علیه الأمْرُ: کارەکەی لێ چەواشە بوو، لێی تێکچوو نەیزانی کامە کامەیە.

شَكَّ في الأمر: لەکارەکە کەوتە گومانەوە.

شَكَّ في السلاح: بەتەواوی چەکی لەخۆبەست.

شَكَّ الخرز ونحوه: مرووەکانی هۆنینەوە.

شَكَّ الجِلدَ بالمِخرَزِ: بەدرێوشەو دەرزی پێستەکەی دورییەوە.

شَكَّ القومُ بیوتهم ونحوها: خەڵکەکە خانوەکانیان بەریزو لەپەنا یەکترەوە دروست کردو بەیەك شێوەو دیکۆر رازاندیانەوە.

شَكَّ الشیءَ: شتەکەی کون کرد، دەگوترێ: (شَكَّ الدابةَ بالمِهماز): بەنەقیزە لەولاخەکەیەوە ژەنی یان بەقەمچی لێ دا بۆ ئەوەی خێرا بڕوا.

شَكَّ فلاناً ونحوه بالرمح: بەسەرە رمب لەفلانکەسی دا.

شَكَّكَهُ: خستیە گومانەوە.

إشتَكَّ الشیءُ: هەندێکی شتەکەی بەیەکەوە نوساندو چەسپاندی.

تَشَكَّكَ: بۆ موطاوەعەی (شَكَّكَهُ)دێ.

تَشَكَّكَ في کذا أو في الأمر: کەوتە گومانەوە لێ‌ی.

التشكيك: ئەوەیە دەلالەت بکا لەسەر لەفظێکی عامو هاوبەش لەنێوان فەردەکانی دا بەلام بەیەکسانی نا وەکوو وشەی (أبیض) کە دەلالەت دەکا لەسەر زۆر شت کەسپی بن بەلام بەیەکسانی نا.

الشّاكّةُ: هەوکردنی لۆزەتێنە.

الشِّكاك: دەگوترێ: (ضربوا بیوتهم شِكاكاً): خەڵکەکە خانوەکانی خۆیان لەریزی یەکترو بەیەك شێوەو شێواز بنیات نان.

الشَّكُّ: گومان ◊ حاڵەتێکی دروونییە زەین لەگەڵیا دێو دەچێ نازانێ وایە یان وانیەو ناتوانێ بڕیارەکە یەکالا بکاتەوە ◊ پارچەیەکی بچوکە لەنێسقان دا ◊ (ك: شكوك).

الشَّكّاك: کەسێك زۆر گوماناوی بێ ◊ شکی لەهەموو شتێك بێ.

الشّكّاكون: پێڕێکن لەفەیلەسوفەکان، راڕان لەوەدا ئاخۆ حەقائقی شتەکان هەن یان نین، لەفەلسەفەی ئیسلامی دا بە (ألا أدریة) بەناوبانگن‌و بەشێکن لەسەوفەسطائییەکان.

**الشُكُوك**: (أمر شكوك): كارێکی لێڵ‌و تەم‌و مزاوی‌و گوماناوییە.

**الشكيكةُ**: کۆمەڵە شتێکن بەیەکەوە دەلکێندرێن ٥ (ك: شكائِك وشُكك).

**المِشكُّ**: ئامێری شت پێکەوەلکاندن ٥ سیرمەیەکە یا تەلێکە زرێی پێ دەچنرێ ٥ (ك: مشاك).

**شَكَلَ الأمرُ شكولاً**: کارەکە چەواشە بوو، سەروبەری نەما.

**شَكَلَ المريضُ**: نەخۆشەکە خەریکە چاك بێتەوە.

**شَكَلَ الثمرُ**: میوەکە خەریکە پێ بگا ئاڵ‌و بۆڵی تێکەوت.

**شَكَلَ الدابّةَ**: وڵاخەکەی بەزنجیر بەستەوە، دەشگوترێ: (شَكَّلها بـه): بەزنجیر قاچەکانی پێوەند کردن.

**شَكَلَ الكِتابَ**: سەرو بۆرو ژێری بۆ کتێبەکە دانان.

**شَكِلَ اللّونُ شكَلاً**: ڕەنگەکە ڕەنگی تری تێکەڵاو بوو.

**شَكِلَتِ العينُ**: سپینی چاوەکە سوورایی تێکەڵ بوو.

**وشَكِلَتِ الخيلُ**: ڕەشایی ئەسپەکە سوورایی تێکەڵ بوو ٥ (فهو شَكِلٌ وأشكلُ وهي شكِلَةٌ وشكلاءَ).

**أشكَلَ الأمرُ**: کارەکە چەواشە بوو ٥ (أشكل اللونُ): بەمانا (شكِلَ)دێ.

**أشكَلَ فلان**: فلانکەس لەگەڵ هاوەڵ‌و هاو وێنەکانی خۆی دا کۆ بۆوە، کۆبونەوەی پێ کردن.

**أشكَلَ النّخلُ**: بەرسیلە خورماکە ڕەنگی گۆڕاوە خەریکە پێ بگا.

**أشكَلَ الكتابَ**: سەرو ژێرو بۆری بۆ کتێبەکە کرد.

**أشكَلَتِ المرأةُ شَعْرَها**: ئافرەتەکە لەهەموو لایەکەوە قژەکانی هەڵدانەوە بۆ تۆقە سەری.

**شاكَلَهُ**: وەکوو ئەو چوو، هاو وێنەی بوو.

**شَكَّلَ الدابّةَ**: وڵاخەکەی بەزنجیر بەستەوە، بەپێوەند قاچەکانی بەستن.

**شَكَّلَ الشيئَ**: وێنەی شتەکەی کرد، پەیکەری بۆشتەکە کرد.

**شكَّلَ الزَّهْرَ**: دەسکە گوڵی جۆراو جۆری بەستن ٥ لەچەند جۆرە گوڵ چەپکە گوڵی بەست.

**شَكَّلَتِ المرأةُ شعرها**: ئافرەتەکە لەهەموو لایەکەوە قژەکانی هەڵدانەوە بۆ تەپڵەسەری.

**تَشاكَلاَ**: ئەو دووە لێك چون هاو وێنەی یەکتر بوون.

**تَشَكَّلَ**: بۆ موطاوعەی (شَكَّلَهُ) دێ.

**تَشَكَّلَ الشيئُ**: شتەکە وێنەی وەرگرت

بوو بەواقیعو خۆی نواند.

**اسْتَشْكَلَ الأمرُ**: کارەکە چەواشە بوو ٥ رەخنەی لێ گیراو بوو بەهۆی دڵە ڕاوکێ ٥ ئیشکالو لەمپەری خستە ناو کارەکەوە.

**اسْتَشْكَلَ في تنفيذ الحكم**: چەند بەڵگەو ئیشکالو پاساوێکی خستە ڕوو داخوازی ئەوەن بڕیاری دادگا رابگیرێو لێکۆڵینەوەی تر لەدۆسیەکە دا بکرێو گرێ کوێرەکان بکرێنەوە.

**الإشكالُ**: بریتیە لەکارێك، لەبەڵگەو نیشانەیەك چەواشەکاریی دەخەنە ڕوو ناهێڵن رووداوەکە رون بکرێتەوەو بڕیارەکە جێ بەجێ بکرێ.

**الأشْكَلُ**: دوو ڕەنگ، دوڕەنگی تێکەڵاو ٥ وەکوو ئەوە ناو خوێنی تێکەڵ ببێ ڕەنگی ناوەکە بگۆڕێ.

**الأشْكَلُ من الناس**: کەسێك لەچاویدا ڕەگێك هەبێ بچێتەوە سەر شێوەی چاوی باوکی، یان چاوی چەند ڕەنگێکی تێدا ببینرێ، دەگوترێ: (هو أشكلُ بأبيه): ئەو زۆر لەباوکی دەچێ.

**الشَّاكِلَةُ**: سروشتو تەبیات ٥ شێوەو شێواز ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَى شَاكِلَتِهِ﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو بەشەی دەکەوێتە نێوان زوڵفو گوێچکەوە ٥ کەلەکە ٥ ناوەڕاستو کرۆکی شت، دەگوترێ: (أصاب شاكلةَ الصَّوابِ) ٥ (ك: شواكِلُ).

**الشِّكالُ**: زنجیرو پێوەند ٥ هەروا ناوە بۆ ئەسپێك قاچی ڕاستیو دەستی چەپی لەخوار ئەژنۆیەوە پەڵەیەکی تێدابێ قاچو دەستەکەی تری پەڵەکەیان ڕەنگێکی تربێ.

**الشُّكْلُ**: کاری چەواشەو پڕ گرێو گۆڵ ٥ وێنەو شێوەی شت، دیاردەو ڕواڵەتی شت، دەگوترێ: (مسائل شكلية) چەند مەسەلەیەکن تێیان دا گرنگی بەوێنەو شکڵ دەدرێ نەك بەکرۆكو ناوەرۆك ٥ شێوەو سیما ٥ گونجاو لەبار، دەگوترێ: (هذا من شكلي): ئەمە بۆ من گونجاوە، لەمن دێ ٥ لەبواری ئەندازیاریی دا شێوە قەبارەیەکە یان ڕوبەرێکە بەیەك سنوور دیاریی کراوە وەکوو تۆپ یان بەچەند سنورێکی جیا جیا وەکوو سێ گۆشەو چوارگۆشە ٥ لەبواری زانستی مەنطیقیەکان دا جۆرە دەلیلێکە گۆڕانکاری تێدا ڕودەدا بەگوێرەی نیسبەتدانی حەددی ناوەڕاست بۆلای حەددی (أصغر)و

(أكبر) ٥ (ك: أشكال وشكول) ٥ (الدَّفْعُ الشَّكْلي): لەقانوونی (المرافعات)دا بریتییە لەوەی داوا لەسەر تۆمارکارکراو رەخنەی خۆی ئاراستەی شێوازی بەرێوە چوونی کێشەکە بکا نەك خودی مەوضوعەکە، وەکوو ئەوە بڵێ لای ئێمە داواکە بەتاڵەو بێ بناغەیە.

**الشَّكْلُ**: وێنەو شێوەی شت.

**الشَّكْلَةُ**: یەك تەشکیلە، دانانی حەرەکەیەك لەسەر وشە.

**الشُّكْلَةُ**: تێکەڵبوونی رەنگەکانە ٥ لەچاودا بریتییە لەتێکەڵبوونی رەنگی سورو سپی ٥ شێوەو لێك چوون، دەگوترێ: (فیه شُكْلَةٌ من أبیه): چووەتەوە سەر باوکی، لەباوکی دەکا.

**المُشَاكَلَةُ**: هاو وێنە، هاوشێوە ٥ لەزانستی بەدیع دا بریتییە لەوەی شتەکە بەوشەی تر بدرکێنی بەهۆی هاونشینییەوە وەکوو قورئان دەفەرموێ: ﴿نَسُواْ اللّهَ فَنَسِيَهُمْ﴾ یان ﴿وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ اللّهُ﴾.

**المُشْكِلُ**: چەواشە، لێڵو تەمو مژاوی ٥ بەلای زانایانی ئوصوڵی فیقهەوە، ئەوەیە لەماناکەی تێ ناگەی مەگەر لەلایەکی ترەوە بەڵگەی بۆ بێنی ٥ (خنثى المُشْكِل): بریتییە لەوەی مرۆڤێك هەردو لایەنی نێرایەتی‌و مێینەیی وەکوو یەك وابن، هیچ لایەنێکی بەتەواوی رون نەبوبێتەوە.

**شَكَمَ الفَرَسَ ونحوه شَكْماً**: لغاوی کردە دەمی ئەسپەکەوە، دەشگوترێ: (شَكَمَ المعتدي): بەهێزو تواناوە دەست درێژو هێرش کاری پاشەو پاش شکانەوە.

**شَكَمَ المُتَسَلِّطَ**: داگیرکەرو دەسەڵاتدارەکەی دەمکوت کرد، بۆڕی دا.

**شَكَمَ فلاناً**: پاداشی فلانکەسی دایەوە.

**شَكِمَ شَكَماً**: برسی بوو (فهو شَكِمٌ).

**أشْكَمَهُ**: بەمانا (شَكِمَهُ)دێ.

**الشُّكْمُ**: بەخشش بەشێوەی پاداش‌و موکافەئە.

**الشَّكِيمَةُ**: ئاسنێکە پانەو پان دەکرێتە دەمی ولاخەوە ٥ هێزو توانای دڵو ورە بەرزی ٥ سەرکەوتن بەسەر زوڵم‌و ستەم دا ٥ دەگوترێ: (فلان شدید الشكیمه): فلانکەس ورەبەرزو دڵ دامەزراوە ٥ (ك: شكائم وشكیم وشُكُمٌ).

**شَاكَهَهُ مُشاكهة وشِكاهاً**: لەوچوو شێوەی چووە سەر شێوەی ئەو.

**تشاكها**: شێوەیان لەیەك چوو.

**شَكَا شَكْواً وشَكْوىً وشَكَاةً**: ئازاری نەخۆشی هەبوو.

**شَكَا الشَّكْوَةَ**: دەمی مەشكۆڵەكەی كردەوەو ئەوەی تێیدا بوو دەری خست.

**شَكَا هَمَّهُ**: خەمو ناڕەحەتی خۆی هەڵڕشت، باسی كردن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ﴾.

**شَكَا فلاناً**: هەواڵی خراپەكاریەكانی فلانكەسی دا، هەواڵی ئەوەی دا كەفلانكەس خراپەی دەرباره كردوه.

**أشكى من فلان**: مافی خۆی لەفلانكەس وەرگرت.

**أشكى فلاناً**: فلانكەسی هەڵنا بۆئەوەی شكات بكا، باسی مەینەتی‌و ناڕەحەتی خۆی بكا ٥ رازی كردو هۆكاری شكاتكردنەكەی لابرد، دەگوترێ: (أشكاه على مايشكوه): یارمەتی دا.

**أشكى شكْوة**: مەشكولەی دۆی دروست كرد.

**شاكاه**: بەمانا (شكاه)دێ.

**شَكِيَّ فلان أو الراعي**: فلانكەس یان شوان مەشكۆڵەی دۆی بۆ هەژاندنی ماست دروست كرد.

**شكيَّ فلاناً**: هۆكاری شكات‌و ئازارەكانی فلانكەسی لابرد.

**إشتكى**: بەمانا (شكا)دێ ٥ نەخۆش كەوت ٥ مەشكۆڵەی دووی دروست كرد.

**اشتكى اليه**: پەنای بۆ برد بۆئەوەی هۆكاری شەكواكەی لابەرێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ﴾.

**تشاكى القومُ**: خەڵكەكە هەندێكیان شكاتیان لای هەندێكیان كرد.

**تَشَكَّى**: بەمانا (اشتكى)دێ.

**الشّاكي**: شكایەتكەر ٥ (شاكى السلاح): چەك لەخۆ بەستوو ئامادە بۆشەڕ.

**الشَّكاةُ**: شكات‌و ئازار ٥ نەخۆشی ٥ عەیب‌و لەككە.

**الشَّكوى**: ئاخ‌و ئۆفكردن لەبەر ئازارو ناڕەحەتی‌و شتی وا ٥ ئەوەی دەبێتە هۆی ئازارو ناڕەحەتی ٥ (ك: شكاوى).

**الشَّكْوَة**: زەرفێكی بچوك بەكاردەهێنرێ بۆ ئاوتێكردن یان بۆ ماست‌و دۆتێكردن لەپێست دروست دەكرێ، وادەبێ بۆ سارد كردنی دۆو ئاوەكە بەكاردێ بەكوردی خۆمان ئەوەی ئاوی تێ دەكرێ پێی دەگوترێ كوندە یان جەوەندە ئەوەی بۆ ماست‌و دۆ بەكاردێ مەشكوولەیە ٥ (ك: شِكاءَ وشَكِيَّ وشُكِيٌّ).

**الشَّكِيَّة**: ئەوەی ئاخ‌و ئۆفی لـێ دەکرێ ٥ پاشماوەی شت ٥ بەرماوە ٥ (ك: شكايا).

**المِشْكاة**: تاقەیەکە لەدیوار چرای تێدا دادەنرێ ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ﴾ ٥ هەروا ناوە بۆئەو شتەی چراکەی لەسەر هەڵدەگیرێ ٥ یان خودی چراو دیوارکۆو لۆکزەکەی تێدا دادەنرێ.

**الشَّلْجَمُ**: شێلم.

**شَلَحَهُ**: روتی کردەوە.

**شَلَعَ العينُ**: چاو نەقوچا ٥ نەیتوانی پێڵوی چاوی بەتەواوی بقوچێنێ.

**شَلْشَلَ الماء ونحوه**: لێکدان لێکدان ئاوی پێداکرد، دەشگوترێ: (شَلْشَلَ السيفُ الدمَ): شمشێرەکە زۆری خوێن رژاند.

**تَشَلْشَلَ الماءُ ونحوه**: ئاوەکە بەپرژاوی هاتە خوارەوە.

**تَشَلْشَلَ السيفُ بالدم**: شمشێرەکە خوێنی رژاند.

**تَشَلْشَلَ فلان في عمله**: فلانکەس لەکارەکەی دا چوست‌و چالاك بوو.

**الشُّلاشِلُ**: روەکی ناسك.

**الشَّلْشَلُ**: چوست‌و چالاك لەکاری خۆی دا ٥ دڵپاك‌و بێ غەش، دەگوترێ: (ماء شلشل ودم شلشل): دڵۆپ دڵۆپ ئاوەکە یان خوێنەکە دەتکێ.

**شَلَقَهُ شَلْقاً**: بەقەمچی لێی دا.

**شَلَقَ الأذنَ أو الأنف**: لەدرێژەوە گوێچکەی یان لوتی هەڵدرِی ٥ گوێی هەڵدرِی، لوتی هەڵدرِی.

**شَلَّ الدابّة شلاً**: وڵاخەکەی لێ خورِی، دەری کرد، دەگوترێ: (شَلّت العينُ الدمعَ): چاوەکە فرمێسکی رشت.

**شَلَّ الصباحُ الظلامَ**: گزنگی بەیانی بەسەر تاریکی دا زاڵ بوو تاریکی رادا.

**شَلَّ الثوبَ**: قوماشەکەی بەتەقەڵی گەورەو دەزوی باریك درووی.

**شَلَّ العضو شَلَلاً**: ئەندامێکی جەستە توشی شەلەل بوو، یان وشك بوو لەکارکەوت یان سست بوو ٥ بۆ دوعا کردن بۆ کەسێك دەگوترێ: (لا شَلّت يمينك) بۆ دوعاکردن لێی دەگوترێ: (شَلّت يمينه) ٥ (فهو أشلّ وهي شلاء).

**شَلَّ الثوبُ**: قوماشەکە رەشایی تێوە چووە بەئاو پاك نابێتەوە.

**أشلّ فلان**: فلانکەس شەلەل توش بوو.

**أشلّ الله فلاناً أو يده**: خودا فلانکەسی توشی شەلەل کرد یان دەستی توشی شەلەل کرد.

**إنْشَلَّ المطرُ**: باران باری بەخورِەم.

**الشَّلاّلَة**: دورمانی تەقەڵ گەورەو دەزو باریك.

**الـشَلَلُ**: وەستانی جمو جوڵ لەئەندامێکی جەستەدا یان لەهەموو جەستەدا.

**الشَلاّلُ**: هەڵڕژانی ئاوی روبار لەرێرەوی خۆی دا لەبەرزاییەوە سەرەو خوار هەڵبرژێ وەکوو شەلالی گەلی عەلی بەگ، شەلالی بێخاڵ.

**شَلاّل العين**: نەخۆشییەکە توشی چاو دەبێ هێزی بینین کەم دەکا.

**الشَلُول**: چوستو چالاك لەکاری خۆی دا ○ ئەگەر بۆ حوشترو مەڕ بەکارهات مەبەست ئەوەیە تەمەنیان چوبێتە ساڵی دووەم.

**الـشَلِيلُ**: دەراوی ئاو لەدۆڵو شیودا ○ پارچە پۆشاکێکە لەژێر زرێوە لەبەر دەکرێ ○ نوخاعی شەوکی (دەزوی پشت) ○ (ك: أشِلّة).

**المِشَلُّ**: ئەوشتەی مێشو شتی وای پێ دەردەکرێ ○ ئەوەی زۆر شت دەهاوێژێ ○ ملپێچ ○ (ك: مِشَالّ).

**المُشَلَّلُ**: ئەوکەرە کێویەی زۆر گرنگی بەدێڵەکەرەکەی دەداو لێی دوورناکەوێتەوە.

**الشَّالَمُ**: گیامرۆر کەبەزۆری لەناو گەنم دا دەروێو دەنکێکی رەش یان زەردی هەیەو هەرگەنمێك ئەو دانەوێڵەی تێکەڵ بێ نرخی کەم دەکاتەوە.

**الشُولَمُ**: بەمانا (الشالِم)دێ.

**الشَيْلَمُ**) بەمانا (الشَّالَم)دێ.

**أشْلَى الحيوان**: بانگی ئاژەڵەکەی کرد بۆ خواردن یان بۆ دۆشین.

**أشْلَى الكَلْبَ على الصيد**: سەگەکەی تاودا بۆ گرتنی نێچیر.

**إشْتَلاَه**: بانگی کرد بۆ ئەوەی لەتەنگاوو ناخوشی رزگاری بکا.

**إسْتَشْلَى**: رقی هەڵساو تورە بوو.

**إسْتَشْلَى الكلبَ**: سەگەکەی هەڵنا بۆ گرتنی نێچیر.

**إشْتَلَى فلاناً**: بانگی فلانکەسی کرد بۆئەوەی لەهیلاکەتو ناخۆشی رزگاری بکا.

**الشَّلاَ**: شلا الشيئ: قەبارەی شتەکە ○ باقی ماندەی شت ○ پێست ○ ئەندامێکی جەستە ○ (ك: أشلاء).

**الشِلْوُ**: ئەندامی جەستە ○ پارچەیەك لەگۆشت ○ باقی ماندە لەهەر شتێك بێ ○ (ك: أشلاَء).

**أشْلاَءُ الإنسان وغيره**: ئێسقو پروسکی جەستەی ئادەمیزاد یان هی گیانلەبەری تر دوای رزینو لێك بلاو بوون.

**الـشَلِيَّةُ**: باقی ماندەی ماڵو شتی وا، دەگوترێ: (لم يبقَ من ماله الا شَلِيَّةٌ) ○

هەروا ناوە بۆ کوتە گۆشتو شتی وا ٥ (ك: شلایا).

**المُشلَّی**: داڵگۆشت، کزو لاواز.

**إشمأزَّ**: بڕوانە مادەی (شَمَزَ).

**شَمِتَ به، أو بعدوّه**: کەیف خۆش بوو بەوە کە دوژمنەکەی تووشی بەڵاو کارەسات بووە ٥ کورد کەلەخودا دەپاڕێتەوە یەکێ لەداخوازییەکانی ئەومیە دەڵێ: (خودایە دوژمنم پێ خۆش نەکەی) ٥ (فهو شامِت) ٥ (ك: شُمّات) ٥ (هي شامتةَ) ٥ (ك: شوامِت).

**أشْمَتَهُ الله بعدو**: خودا وایکرد بەدوژمنەکەی خۆش بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلاَ تُشْمِتْ بِيَ الأَعْدَاءَ﴾.

**شَمَّتَهُ بعدوه**: بەمانا (أشمته)دێ.

**شَمَّتَ العاطِسَ وعليه**: دوعای خێری بۆ پژمیوەکە کرد ٥ کە کابرا پژمی پێی گوت (یرحمك الله).

**تَشَمَّتَ**: بەنائومێدی گەڕایەوە، هیچ دەسکەوتی جەنگی دەست نەکەوت.

**الشَّامِتةُ**: قاچی ئاژەڵ ٥ کەسێك دوعای شەڕ لەیەکێك بکا دەڵێ: (لاترك الله له شامتة): خودا تاکە ئاژەڵێکی بۆ نەهێڵێتەوە ٥ (ك: شوامت)، دەشگوترێ: (بات فلان بليلة الشوامت، وبات طوع الشوامت): حاڵو وەزعی ئەوەندە پەرێشان بوو دوژمن پێی خۆش بوو، دوژمن بەزەیی پێدا هاتەوە.

**الشِّمات**: کەسانێکن ناحەزانیان پێیان خۆش ببن لەبەر نائومێدی یان وەزعو حاڵی خراپیان ٥ (ئەم وشەیە تاکی نییە).

**الشُّمَاتی**: بەمانا (الشِّمات)دێ.

**الشَّمَاتةُ**: کەیفخۆش بوون بەوەی دوژمن توشی بەڵابووە ٥ پێخۆش بوون بەدوژمن.

**شَمَجَتِ الدَّابةُ شَمَجاً**: وڵاخەکە بەپەلە ڕۆیی، پەلەی کرد ٥ (فهي شَمِجی)، دەشگوترێ: (شَمَجَ في الأمر): پەلەی لەکارەکەدا کرد.

**شَمَجَ الشيئَ**: شتەکەی تێکەڵ بەشتی تر کرد.

**شَمَجَ الثوبَ**: قوماشەکەی بەتەقەڵی گەورەو بەدەرزوی بارێك دووری.

**شَمَجَ الشَّعيَ أو الرُّزَّ**: خەپلەی گەورەی لەئاردە جۆیەکە یان لە برنجەکە دروست کرد.

**الشَّمَاجُ**: خەپلەو نانی گەورە کەلەبرنجو ئاردی جۆو شتی وا دروست بکرێ ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو هێشوە ترێیەی بۆڵە ساخەکانی دەخورێنو لاسكو ترێ رزیوەکەی

فڕێ دەدرێ، ئەوەی فڕێ دەدرێ پێی دەگوترێ (الشماج)، دەگوترێ: (ماذقت شَماجاً) هیچ شتێکم نەخواردوە.

**شَمَخَ الجَبَلُ ونحوه شُمُوخاً**: کێوەکە بەرز بوو.

**شَمَخَ أنفَهُ**: لوتی بەرز نواند، خۆی بەزل زانی، فیزی نواند.

**الشامِخُ**: بەرزو شکۆمەند ◦ (نسب شامِخ): رشتەو بنەچەی دێرین‌و پەسەند، وەجاخزادە ◦ (ك: شوامخ وشُمَّخ): بۆ کۆی مێینە (شامخات) دەگوترێ ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ﴾.

**الشَّمِخُ**: دوور، دەگوترێ: (سَفَرٌ شَمَخٌ ومفزة شَمَخٌ).

**الشُّمُوخ**: بەمانا (الشَّمَخ)دێ.

**الشِّمَخْتَرُ**: خوێڕی‌و دڵ پیس‌و بەدڕەوشت ◦ نەگبەت.

**شَمْخَرَ**: خۆی بەزل زانی، لوتبەرزی نواند.

**إشْمَخَرَّ**: زۆر بەرز بوو، بەرزییەکە زۆر بوو.

**الشَّمْخَرِيرَةُ**: خۆ بەزلزانی‌و لوتبەرزیی.

**الشِّمْخِرُ**: پیاوی کەتەو زل ◦ یان زاناو پیاو ماقوڵ ◦ لوتبەرز ◦ هەوڵدەر بۆ بەدەستهێنانی دوا رۆژێکی بەختەوەر ◦ دوور بین‌و خاوەن هیواو ئاواتی بەرز.

**شَمَذَ الحيوانُ شَمْذاً وشُمُوذاً**: ئاژەڵەکە کلکی بەرز کردەوە، دەشگوترێ: (شَمَذَ بذنبه).

**شَمَذَ الرَّجلُ ثوبَهُ**: پیاوەکە خۆی هەڵکرد دەرپێیەکەی تا ئەژنۆی هەڵکرد.

**الشَّامِذُ**: دووپشك، بۆیە ئەو ناوەی هەیە چونکە چزوی کلکی بەرز دەکاتەوە ◦ (ك: شُمَّذ وشوامذ).

**الشَّمَذَةُ**: درەختێکە ئامادە دەکرێ بۆئەوەی درەختی تری پێ هەڵگەرێ، تێوەی ئالێ ◦ (ك: شَمَذ وشِمَاذ).

**شَمَرَ شَمْراً**: بەوریایی‌و هەست‌و خوستەوە رۆیشت ◦ بەخۆ بادان‌و فیزەوە رۆیشت.

**شَمَرَ الشيءَ**: شتەکەی وێکناو لۆلۆی کرد.

**أشْمَرَ الدابَّةَ**: وڵاخەکەی بەگورجی لێ خوڕی.

**شَمَّرَ**: بەمانا (شَمَرَ)دێ.

**شَمَّرَ في الأمر**: چوست‌و چالاك کارەکەی ئەنجام دا.

**شَمَّرَ للأمر**: خۆی بۆ کارەکە ئامادەکرد، دەشگوترێ: (شَمَّرَ عن ساعد الجد): قۆڵی هەڵماڵی بۆ ئەنجامدانی کارەکە بەباشی، یان دەگوترێ: (شَمَّرَ عن ساقه): چاکی ئیشکردنی مەردانەی لێ هەڵکرد.

**شَمَّرَت الحربُ**: شەڕەکە گەرم بوو، توند بوو، پەرەی سەند.

شَمَّرَ الشيءَ: شتەکەی وێکنا، لۆلۆی کرد.

شَمَّرَ ثوبَهُ: چاکی کراسەکەی هەڵدایەوە، یان قۆڵی لێ هەڵماڵین.

شَمَّرَ الدابّة: وڵاخەکەی بەخێرایی تاودا.

اِنْشَمَرَ: بۆ موطاوعەی (شَمَرَهُ)دێ.

تَشَمَّرَ: بۆ موطاوعەی (شَمَّرَهُ)دێ.

تَشَمَّرَ الشيءُ: شتەکە وێك هاتەوە ٥ هەڵقرچا، دەگوترێ: (تَشَمَّرَت اللِثَةُ): پوکی هەڵقرچا، داخورا.

الشّامِرُ: (ناقة أو شاة شامِر): حوشترێك یان مەرێك کە گوانەکانی چرچ بوبنەوەو هەڵکشابنەوە بۆلای ورگی.

الشَّمّارُ: رووەکێکە لەپێری خەیمییەکانە، جۆرێکی هەیە شیرینە دەروێندرێ، لاسك و گەڵاکەی بەکاڵی دەخورێ ٥ جۆرێکی تری بەکوڵاوی دەخورێ.

الشَّمَرُ: بەمانا (الشمار)دێ.

الشِمْرُ: کەسێکە گرنگی بەکاری خۆی بداو هەوڵی ئەنجامدانی بدا ٥ سەخی تەبیعەت و دەست و دڵ فراوان.

الشِمِرُ: ئیشی گەورە کە پێویست بێ پیاو قۆڵی بۆ هەڵکاو چاکی بۆ بەلادا بکا.

الشِمِّرِيُّ: ئەوکەسەی زۆر بەتەنگ ئیش و کاری خۆیەوە بێ.

الشِمِّيُّ: بۆ زێدە ڕەوی لەچاك بەلادا کردن و قۆڵ لێ هەڵماڵین و گرنگی دان بەکار.

شَمْرَجَ الثوبَ وغیره شَمْرَجَةً وشِمْراجاً: قوماشەکەی بەتەقەڵی گەورە گەورە دروو.

شَمْرَجَ النَسّاجُ الثوبَ: جۆڵاکە یان تەنکەرمگە شاش و پاش قوماشەکەی چنی.

شَمْرَجَ الكلامَ: قسەکانی تێکەڵ کردن.

الشُمْرُجُ: قوماشی تەنك چنراو ٥ (ك: شَمارِج، وشَمارِيج).

الشُمْرُوجُ: بەمانا (الشُمْرُجُ)دێ.

شَمْرَخَ العِذْقَ: گەڵاو پرزی لە لقەدرەختەکە کردەوە هەڵی پەرداوت یان بەتەور داس و شتی وا لق و پۆپی درەختەکەی هەڵپەرداوت.

شَمْرَخَ النخلةَ: دەنکە خورما نەگەیوەکانی لەهێشوە خورماکە چنی.

الشِمْراخُ: هێشوی خورما کە بەرسیلە بێ یان خورماکەی پێوەبێ نەچنرابێ ٥ هەروا هێشوی ترێ کە بۆڵە ترێکانی پێوەبن و نەچنرابن ٥

لقەدارێـــكی باریـــكو زەعیـــف كەلەســەر لقــی ئەســتور ســەری هەڵدابێ ٥ بـەكوردی خۆمـان پێـی دەگوترێ چروزە یان تەرزە.

**الشُّمْرُوخُ**: بەمانا (الشِّمراخُ)دێ.

**الـشُّمَرْدَلُ**: منـداڵی چوسـتو چـالاك، دەشـكوترێ: (جَمَــلٌ شَــمَرْدلٌ): حوشترێكی بەتوانایە بۆ رۆیشتن.

**شَمَزَ شَمْزاً**: وێـك هاتەوەو كۆبـۆوە ٥ قیـزو بێزی كرد لەوشتەی ناخۆشی دەویست.

**تَـشَمَّزَ**: وێـك هاتـەوە، تێـچو، كۆبـۆوە، گرژ بوو، دەگوترێ (تَـشَمَّزَ وجْهُـهُ): روخساری گرژبوو وێك هاتەوە.

**إشْمَأزَّ بالأمر**: بەكارەكە تەنكە تاو بـوو، نارەحەت بوو ٥ قیزی لـێ كـردەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ﴾.

**الشُّمَأزِيزُ**: بەمانا (الإِشْمِئزازُ)دێ.

**شَـمَسَ اليـومُ شُموساً**: ئـەمرۆ خورەكـەی دەركـەوت یـان خورەتاوەكـەی بـەهێز بوو.

**شَمَسَ فلان**: فلانكەس یاخی بوو.

**شَـمَسَ لفـلان**: ویـستی زیـان بەفلانكـەس بگەیەنێ ئەزیەتی بدا ٥ (فهو شامِس) ٥ (ك: شُمَّسٌ وهن شوامس).

**أشْمَسَ اليوم ولهوه**: بەمانا (شَمَسَ)دی.

**شامَسَهُ مشامَسَة وشِماساً**: رقە بەرایەتی كرد، دژی وەستا.

**شَمَّسَ**: خۆری پەرست.

**شَمَّسَ الشيئَ**: شتەكەی رانوانـد بـۆ خـۆر، بەر خۆری دا بۆئەوەی وشك ببێتەوە.

**تشامَـسَا**: دژایـەتی یـەكتریان كـرد دژی یەكتر وەستان.

**تَشَمَّسَ**: بۆ موطاوەعـەی (شَمَّـسَهُ)دێ ٥ بەر خۆر كەوت هەتاو لێی دا، گەرما بردو بوو، كەم بوو.

**الـشامِس**: دەگـوترێ: (یـوم شـامس) رۆژێـــكی خۆرەتـــاوە، خـــۆر بەدەرەوەیەو ئاسمان سافە.

**الشِّمَاسُ**: مەنع كردن، بەرگری كردن.

**الشَّمْسُ**: خـۆر؛ ئەسـتێرەیەكی گـەورەو سـەرەكییە لەكۆمەڵـەی خـۆری دا بـــەدەوری دا زەوی دەســـورێتەوە، هــەروا بــاقی هەســارەكانی تــری كۆمەڵــەی رۆژی بــەدەوری خــۆردا دەسورێنەوە.

**الشمـسية**: هەرشتێـك نیـسبەت بـدرێ بۆلای خۆر وەكوو (الحروف الشمسية المجموعــة الشمــسية) ٥ چــەتر، بــۆ خۆپاراسـتن لەگـەرما یـان لـەباران ٥ (الـلاّم الشمـسية) (أل ـ)ی تـەعریف بــچێتە ســەر پیتــەكانی وەكـــوو (ت،ث،د،ذ،ر،ز،س،ش،ص،ض،ل،ن) كـە چووە سـەر پیتـەكانی تـر پێـی دەگوترێ (اللام القمرية).

الشَمّاس: زۆر چەموشوو تۆڕەو تەوسن ٥ ناوە بۆ کەسێك خزمەتی کەنیسە بکاو (پلەو پایەکە لەخوار پلەی کەشیشەوەیە) ٥ (ك: شِمَسَة).

الشَمُوسُ: چەمووش و سرك و تورەو تەوسن بەجۆرێك کەس نەتوانێ لەگەڵی هەڵبکا، دەگوترێ: (رجل شموس وامرأة شموس) ٥ هەروا ناوە بۆ جۆرە شەرابێك ٥ (ك: شُمُسٌ).

شَمَصَ الدَّابَّة وغيرها شَمْصاً وشُمُوصاً: بەتوندی ولاخەکەی تاوداو لێی خوڕی تاوای لێ کرد ماندوو شەکەتی کرد، دەگوترێ: (شَمَصَ الرجلَ): پیاوەکەی داخورپاندو تورەی کرد.

الشُمُوصُ: بەمانا (الشموسُ)دێ ٥ (ك: شُمَصٌ).

المَشْمُوصُ: کەسێکە ئەوەندەیان تێوەژەنی بێ و لێیان دابێ ماندوو شەکەت بووبێ و چاوی لێ بەملۆق وەستابن.

شَمَطَ الشَّجَرُ ونحوه شَمْطاً: درەختەکە گەڵای کرد، گەڵاکەی بڵاو بۆوە.

شَمَطَ الشيءَ: شتەکەی تێکەڵ بەشتی تر کرد.

شَمَطَ مالَهُ: ماڵە حەلاڵەکەی تێکەڵ بەماڵە حەرامەکە کرد.

شَمَطَ الكلامَ: قسەی تێکەڵ و پێکەڵی کردن، لەزۆر بوارەوە دواو چووە ناو زۆر باس و خواسەوە.

شَمَطَ الإناءَ ونحوه: قاپەکەی پڕکرد، (فهو مشموط وشميط).

شَمِطَ الشيءُ شَمَطاً: شتەکە تێکەڵ بەشتی تر بوو.

شَمِطَ شَعْرُهُ: قژەکانی ڕەش و سپی تێکەڵاو بوون، قژی ماش و برنج بوون.

شَمِطَ الشَّجَرُ: درەختەکە گەڵاکەی وەراند ٥ (فهو أشْمَطُ وهي شمطاء).

أشْمَطَ الشيءَ: بەمانا (شَمِطَ)دێ ٥ دەگوترێ: (أشْمِطْ عَمَلَكَ بصدقة): کردەوەت تێکەڵ بەبەخشین و صەدەقە بکە.

إشْمَاطٌ: بەمانا (شَمِطَ)دێ.

إشْمَاطٌ: بەمانا (إشْمَاطٌ)دێ.

الأشْمَطُ: کەسێکە قژی ڕەشی تێکەڵ بەقژی سپی بوو بێ، واتە: سەری ماش و برنج بووبێ بۆ ئافرەت دەگوترێ (شَمطاء) ٥ (ك: شُمْطٌ).

الشَّمْطُ: ئەو بۆن و بەرامەو دەرمان و بەهاراتەیە تێکەڵ بەخواردن دەکرێ بۆنەوەی زیاتر تامی خۆش بکا.

الشَّمَطُ: تێکەڵاو بوونی مووی سپی بەمووی ڕەش ٥ (ك: أشْمَاط وشِماط).

الشَّمَطَاتُ: چەند مویەکی سپی لەناو مووی ڕەش دا.

الشُّطَّانُ: هێشوه خورما کەناڵو بۆڵی تێبکەوێ، لایەکی بگاو لاکەی تری هەر بەرسیله بێ ٥ تاکەکەی (شمطانة).

الشَّمِيطُ: تێکەلاّو.

الشَّمَاطِيط: پەرتو بلاّو، دەگوترێ: (تفرق القوم شَمَاطِيط): خەلّکەکە پەرتو بلاّو بوونەوه ٥ (ثوبٌ شماطيط): قوماشی رزیوو دڕاو.

شَمَعَ شَمْعاً وشُمُوعاً: گاڵتەو گەپی کرد، کەیف خۆش بوو.

أَشْمَعَ السِّرَاجُ ونحوه: چراکە داگیرسا، روناکی بەرز بۆوه.

شَمَّعَهُ: یاریی پێ کرد، هەڵی پەڕاند.

شَمَّعَ لَه: ئامێری وای بۆ ڕەخساند یاری پێ بکاو کەیف خۆش بێ.

شَمَّعَ بِه: قەشمەری پێ کردو پێی پێکەنی.

شَمَّعَ الثَّوْبَ: قوماشەکەی مێودا بۆئەوەی سفتولوس بێ.

شَمَّعَ الحِرزَ: مێوی لەسەر دەرگای قاسەکە یان صندوقەکە داناو مۆری کرد.

الشِمَاعُ والشِمَاعَةُ: گاڵتەو گەپ.

الشَّمْعُ: مێو؛ مادەیەکی نەرمەو تێکەڵ لەچەوری‌و شتی ترە ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو مادەیەی هەنگ شانەهەنگوینی پێ ڕادەبەستێ‌و هەنگوینی تێ دەکا کەپێی دەگوترێ کەڕشان ٥ هەروا ناوە بۆ مۆم کە بۆ روناکی وەکوو چرا بەکار دەهێندرێ ٥ (ك: شُمُوع).

الشَّمْعَةُ: تاکی (الشَّمَع)یەکە یەکەی پێوانەی هێزی چرای کارەبایی پێ دەکرێ، دەگوترێ: (هو ذو عشر شمعات أو مائة شمعة).

الشَّمَّاع: مۆم دروستکەر یان مۆم فرۆش.

الشَّمَّاعَةُ: شوێنی هەڵگرتن‌و پێداکردنی پۆشاك ٥ عەلاگەی پۆشاك پێدا هەڵواسین.

الشُّمُوعُ: سوحبەتچی‌و قسە خۆش ٥ (ك: شُمُعٌ).

المَشْمَعَة: گاڵتەو سوحبەتو کەیف خۆشی ٥ کارگەی مۆم دروستکردن ٥ (ك: مَشَامِعُ).

المُشَمَّعُ: هەر قوماش‌و شاڵێك مێو درێ بەمێو سفتو لوس بکرێ.

الشَّمْعِدان: مۆم دان؛ پەیکەرێکی بەرزە مۆمی لەسەر چەسپ دەکرێ لەکاتی داگیرسان دا بۆئەوەی مۆمەکە نەکەوێ‌و روناکییەکەشی باش بلاّو بێتەوه.

إشْمَعَلَّ الرَّجُلُ: پیاوەکە بوو بەپیاوی ناو

پیاوان‌و پلەو پایەی بەرز بۆوە، کەیفخۆش بوو.

**إشْمَعَلَّتِ الدابةُ**: ولاخەکە چوست‌و چالاك بوو خۆش باربوو جلەو سووك بوو.

**إشْمَعَلَّت الغارةُ**: هێرشەکە بەربلاوو گشتگیر بوو.

**اشْمَعَلَّ اللبنُ**: ماستەکە زۆر ترش بوو (المُشْمَعِلُّ)بەرز بۆوەو خاوەن شەرەف‌و ڕێز بوو.

**شَمِقَ فلان شَمَقاً وشَماقةً**: فلانکەس ئەوەندە کەیفخۆش‌و تەڕ دەماخ بوو دەتگوت شێتە سەنتەری نەمابوو.

**الأشْمَقُ**: کەفی دەم کەلەگەڵ خوێن دا تێکەڵ بێ.

**الشَّمَقُ من الثياب**: قوماشی دڕاوو کونکون.

**الشَّمَقْمَقُ**: بالاّ بەرزو درێژ.

**شَمَلَت الريحُ شَمْلاً وشُمُولاً**: بایەکە گۆڕابوو بەبای شەماڵ.

**شَمَلَ بفلان**: فلانکەسی بەرەو باکور برد.

**شَمَلَ الأمرُ القومَ**: کارەکە هەموو خەڵکەکەی گرتەوە.

**شَمَلَ فلاناً**: فلانکەسی بەجاجم داپۆشی، بەپارچە قوماشی لەخوری دروستکراو داپۆشی، دەگوترێ: (شَمَلَ التمرَ وشَمَلَ الضرعَ).

**شَمِلَ الأمرُ القومَ**: کارەکە هەموو خەڵکەکەی گرتەوە.

**شَمِلَ الدابةُ اللقاحَ**: ولاخەکە کەڵی گرت ە تەلقیحەکەی وەرگرت.

**أشْمَلت الريحُ**: لەباکورەوە بایەکە هەڵیکرد.

**أشْملت الريحُ القومَ**: خەڵکەکە بای شەماڵ لێی دان بۆیان هەڵبوو فێنکی کردنەوە.

**أشْمَلَ فلان**: فلانکەس بووبەخاوەن جاجم‌و شەملە.

**أشْمَلَ فلاناً**: پارچە شەملەی لەبەر فلانکەس کرد.

**أشْمَلَ التمرَ والضرعَ ونحوه**: بەهۆی شەملە پێدادانەوە خورماکە یان گوانەکەی پاراست.

**إشْتَمَلَ بثوبِه**: قوماشە خورییەکەی لەخۆوە پێچا هەموو جەستەی خۆی پێ داپۆشی.

**إشْتَمَلَ بسيفه**: شمشێرەکەی لەخۆ بەست.

**إشْتَمَلَ على كذا**: داگرندە بو بۆ ئەو شتە هەمووی داپۆشی.

**إشْتَمَلَ على فلان**: خۆی پارێزگاری فلانکەسی کرد.

**تَشَمَّلَ بالشَّمْلَةِ**: شەملەی لەخۆوە پێچا.

**الشِّمَالُ**: چەپ، باکور، پێچەوانەی

باشوور ○ بای شەماڵ ئەو هەوایەی لەباکورەوە دێ ○ هەروا بەمانا شومو نەگبەتی دێ ○ (طیر الشِمال): باڵندەی شوم ○ بومی شوم ○ ئەخلاقو ڕەوشت ○ (ك: شمَئل) ○ هەروا ناوە بۆ تورەکەیەك دەکرێتە گوانی ئاژەڵەوە بۆئەوەی زۆر شۆڕنەبێتەوەو لەزەوی نەخشێ، یان تورەکەیەك دەکرێتە هێشوە خورماو هێشو ترێوە بۆئەوەی زۆر بڵاو نەبێتەوە.

**الشَمْلُ**: (شَمْلُ القوم): کۆمەڵی خەڵك، دەگوترێ: (جمع الله شملهم): خودا ئادەمیزادە دابڕاوو پەراگەندەو تەرەکانی ئەو گەڵو نەتەوە کۆبکاتەوە، یەکیەتییان بخاتە ناوەو یەکریزو یەك هەڵوێست بن.

**الشِمْلُ**: لەمدار خورما.

**الشِمِلُ**: کەسێك بە جاجم (شەملە) خۆی داپۆشیبێ.

**الشَمْلَةُ**: پارچە پۆشاکێکە راستو چەپ لەشان دەکرێ بۆ خۆڕازاندنەوە، یان قوماشێکە لەخوریو موو مەرەز دروست دەکرێ وەکوو جاجم بەخۆدا دەدرێ یان خۆی تێوە دەپێچرێ وەکوو عەباو فەروەی عەرەبی ○ (ك: شِمالٌ) ○ لەئیمامی عەلییەوە حەدیسێك ریوایەتکراوە دەفەرموێ: (إن أبا هذا کان یَنسِجُ الشِمَالَ بیمینه).

**الشُمْلَةُ**: چوستو چالاك.

**الشُمُولُ**: بای شەماڵ ○ شەراب.

**الِمشمالُ**: ئەو پارچە پۆشاکەی پێی دەگوترێ شەملە (جاجم) کە مرۆڤ خۆی پێ دادەپۆشێ ○ (ك: شمامیل).

**المِشْمَلُ**: بەمانا (الشَمْلَةُ)دێ ○ هەروا ناوە بۆ شمشێری کورت کەخاوەنەکەی بتوانێ لەناو پۆشاکی خۆی بیشارێتەوە، کەسانی دی هەست نەکەن کەشمشێری هەڵگرتووە ○ (ك: مَشامِل).

**المِشْمَلَةُ**: شەملەیەکە (جاجمێکە) دولکی هەیە بۆ نووستن بەخۆ دا دەدرێ.

**المَشْمُولُ**: کەسێك بای شەماڵ لێی بدا، دەگوترێ: (غدیر مشمولٌ): گۆمە ئاوو چاڵاییەکە بای شەماڵ دەیگرێتەوە، یان کەسێکە بای شەماڵ دەمو چاوی گەشو جوان کردون فێنکی کردۆتەوە.

**نار مشمولة**: ئاگرێکە بای شەماڵ هەڵی گیرساندوە.

**شَمْلَلَ**: پەلەی کرد.

**شَمْلَلَ الشَجَرُ**: درەختەکە میوەکەی خۆی هەڵوەراند.

**الشِمْلالُ**: چوستو چالاك.

**الشُّمْلُولُ**: دەمارە بەردە زرویَو رەقەلان کەبەناو زەوی دا درێژ بوبێتەوە ◦ لقە داری پرژاوی پەل هاویشتوو بلاو ◦ (ك: شماليل) ◦ (قوم شماليل): گەلی پەرتەوازە، نەتەوەی لێك دابراو ◦ (ثوب شماليل): قوماشی دڕاوو هەڵدڕاو.

**الشِّمْلِيلُ**: چوستو چالاك.

**شَمَّهُ**: بۆنی کرد، دەشگوترێ: (شَمَّ الخَبَرَ): چتێکی لەهەواڵەکە زانی ◦ (شَمَّ الأمرَ): لە هەواڵەکەی کۆڵیەوە، سەرەوناوی کرد.

**شَمَّ الأنفُ**: بۆری لوتی کەمێك بەرز بوو.

**شَمَّ الرجلُ**: پیاوەکە لوتبەرزو بەفیز بوو ◦ (فهو أشمُّ وهي شَمَّاءُ).

**شَمَّ الشيءَ شَمّاً وشَمِيماً**: بۆنی شتەکەی کرد.

**أشَمَّ الرجلُ**: پیاوەکە بەلوتبەرزییەوە رۆیی‌و هیچ سەری خۆی دانەنەواند بزانێ چی لەبەر دەمایە.

**أشَمَّ عنه**: لێی لادا، دوورکەوتەوە.

**أشَمَّ فلاناً الطيبَ**: بۆنەکەی بۆ فلانکەس رانواند تا بۆنی پێوەبکا.

**أشَمَّ الخاتِنُ**: خەتەنەکەرەکە کەمێکی لەپێستی دەورو بەری گۆپکەی هینەکە هێشتەوە.

**شَمَّمَهُ الطيبَ أو الدّواءَ**: وای لێ کرد بۆن بەعەترەکەوە یان دەرمانەکەوە بکا.

**إشْتَمَّهُ**: بەمانا (شَمَّهُ)دێ.

**تَشَمَّمَهُ**: لەسەرە خۆ بۆنی پێوە کرد.

**تَشَمَّمَ الأمرَ**: لەکارەکەی کۆڵیەوەو هەوڵی دا بزانێ چۆنە.

**الإشْمام**: لەلای زوربەی نەحوییەکان‌و قورئانخوێنەکان بریتییە لەوەی دەنگێکی زمانەوانی بەتارمایی دەنگێکی تر رەنگ بکرێ وەکوو زاراوەی زۆر لەهۆزی قەیس‌و بەنی ئەسەد کەوشەی وەکوو (قيل، بيع) بەلاری دەخوێننەوە ◦ هەروا بەلای زانایانی تەجویدەوە بریتییە لەوەی بەدوایێو بەسکون ئاماژە بکرێ بۆ بزوێنە بۆرێك کە لەکۆتایی وشە لەسەر راوەستاوەکە کرتاوە بەبێ ئەوەی دەنگی بۆرەکە ببیسترێ.

**الشَّمُّ**: بۆنکردن.

**الشَّمَمُ**: بەرزایی، بەرز ◦ بەرز بوونەوەی بۆری لوت.

**الشَّمَّامُ**: کەسێك هەستی بۆنکردنی زۆر بێ، بەبۆن بێ ◦ شەمامە جۆرە کاڵەکێکە هێلکەییەو بچوکە توێکڵەکەی خەتخەتەو بۆنەکەی زۆر بەهێزە.

**الشِّمّامات**: هەرشتێك بۆنی هەبێ‌و بۆنی پێوەبکرێ.

**الشَّمِيمُ**: ئەوەی بۆنی پێوەبکرێ ◦ بەرزو بەرز بۆوە.

**شَنَأَهُ شَنْئاً وَشَنَئاناً**: رقی لێ بوو، بۆغزاندی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُوا﴾ ٥ (فهو شانئ) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ﴾.

**تشانؤوا**: یەکتریان بۆغزاند.

**الشَّنَاءَةُ**: رق لێ بۆنی زۆر.

**الشَّنوءَةُ**: قیز لێ بون و بێزلێ کردنەوە ٥ خۆپاراستن لەعەیب و عارو قیز لێ کردنەوە لێیان.

**المَشْنَأ**: روخسار ناشیرین، نەکڵەوەت.

**المِشْنَأ**: بوغزاوی و دڵ پیس و رقاویی ٥ گۆشەگیر لەخەڵك.

**المَشْنُوءُ**: رەزاگران و ناخۆشەویست، هەرچەند لەواقیع دا جوان بێ.

**شَنِبَ شَنَباً وشُنْبَةً**: دەم و ددان و پوکی جوان بوو، ددانی سپی و رێك و وردبوو.

**شَنِبَ الیومُ**: رۆژەکەی ساردو سەرما بوو ٥ (هو أشنب وهي شَنْباء).

**الشَّنَبُ**: پوکی جوان ددانی سپی و بریقەدار.

**الشُّنْباءُ من الرمان**: ئەو هەنارەی دەنکەکانی تۆویان نەبێ ٥ (ك: شَنَبٌ).

**شَنْتَرَ ثوبَهُ ونحوَهُ**: قوماشەکەی دڕی و ونجڕ ونجڕی کرد.

**شَنَجَ شَنَجاً**: وێك هاتەوە تێ چوو ٥ (فهو شَنِجٌ).

**شَنَّجَ الشيءَ**: وێکی هێنایەوە، تێکی چواند، گرژی کردەوە، دەگوترێ: (شَنَّجَ وَجْهَهُ): دەم و چاوی خۆی وێك هێنایەوە گرژی کرد.

**شَنَّجَ الخیاطُ القَبَاءَ**: خەیاتەکە بالتۆکەی تەسك کردەوە هەڵی قرچاند.

**تَشَنَّجَ**: گرژ بوو، دەگوترێ: (تَشَنَّجَ عضلاته): ماسولکەکانی گرژ بوون.

**الأشْنَجُ**: گرژو مۆن و تورە ٥ (ك: شَنِجٌ).

**التَّشَنُّجُ**: گرژبوونی ماسولکەو وێك هاتنەوەیان.

**المُشَنَّجُ**: گرژکراو هەڵقرچێندراو.

**السراویل المُشَنَّجَةُ**: دەرپێی پانی دەرەلینگ تەسك.

**شَنَّرَهُ وعلیه**: بیستی ٥ ئابڕوی برد وای لێ کرد گوێی لێ بێ.

**الشَّنَارُ**: کاری بەناو بانگ بەخراپی و ناشیرین.

**شَنْشَنَ القرطاسُ أو الثوبُ الجدیدُ**: کاغەزەکە یان قوماشەکە خڕی و خشەی هات.

**الشِّنْشِنَةُ**: داب و نەرێتی باو، رەوشتی لێك چوو باو ٥ (ك: شناشِنُ).

**شَنَطَ اللحمَ**: گۆشتەکەی برژاند، وەلێ زۆری نەبرژاند.

**شَنَّعَ الخِرقَةَ ونحوها شَنْقاً**: پەڕۆکەی دڕاندو شی کردەوە.

**شَنَعَ فلاناً**: ڕەخنەی لەفلانکەس گرت‌و ئابڕوی تکاند.

**شَنِعَ بە شَنَعاً**: پێی ناڕازی بوو بە ناشیرینی لەقەڵەم دا.

**شَنُعَ شَناعةً**: ناشیرینییەکەی لەسنور تێپەڕبوو زۆر نەگلەوەت بوو ٥ (فهو شَنيعٌ شَنِعٌ وأشنع).

**شَنَّعَ**: بۆ زیدە ڕەوی لەماناى (شَنَعَ)دا هاتووە.

**شَنَّعَ الشيءَ**: شتەکەی بەناشیرین لەقەڵەم دا، ناشیرینی کرد.

**شَنَّعَ على فلان**: فلانکەسی ڕیسوا کردو سومعەی ناشیرین کردو کەسایەتی لەکەدار کرد.

**تَشَنَّعَ**: ناشیرینی‌و بەد ڕەوشتی بەسەردا زاڵ بوو.

**تَشَنَّعَ القومُ**: خەڵکەکە ئیشەکەیان ناشیرین بوو بەهۆی دوبەرەکی ڕارایی‌و پەرتەوازەییان.

**تَشَنَّعَ الثوبُ**: قوماشەکە (کراسەکە) شڕو وڕ بوو، ونجڕ ونجڕ بوو.

**تَشَنَّعَ الغارةَ**: هێرشەکەی بەر بڵاو کرد.

**اِسْتَشْنَعَ الأمرَ**: کارەکەی بەناشیرین دانا، بەخراپی لەقەڵەم دا.

**استَشنَعَ فلاناً**: فلانکەسی خستە بەدخویی‌و کاری ناشیرینەوە، دەگوترێ: (إستَشنَعَهُ جهلُهُ): نەزانییەکەی ناشیرینی کرد یان (إستَشنَعَ بە جهلە).

**الشَّنعاءُ**: دەگوترێ: (فعلة شنعاء): کارێکی زۆر ناشیرینە ٥ (ك: شُنعٌ).

**الشُنْعَةُ**: ناشیرن ٥ بەدو خراپ.

**الشَّنيعُ**: ناشیرین‌و خراپ‌و قێزەون ٥ (ك: شنائعٌ).

**شَنَفَ اليه شَنْفاً وشُنُوفاً**: بەچاوی سوك‌و قێز لێ کردنەوە سەیری کرد.

**شَنَفَ عَنْهُ**: بەلوتبەرزییەوە ڕوی لێ وەرگێڕا.

**شَنِفَ له شَنَفاً**: هەستی پێ کرد پێی زانی.

**شَنِفت الشفة العليا**: لێوی سەرەوەی هەڵگەڕاوەتەوە ٥ (زارقژ)ە، دەشگوترێ: (شَنِفَ الرجلُ): پیاوەکە لیچی سەرەوەی هەڵگەڕاوەیە ٥ (فهو أشْنَفُ وهي شنفاء).

**شَنِفَ فلاناً ولە**: فلانکەسی ناخۆش ویست‌و ڕقی لێی بۆوە.

**شَنَّفَ المرأةَ**: گوارەی بۆ ئافرەتەکە کرد، دەشگوترێ: (شَنَّفَ الآذان بكلامه): بەقسە خۆشەکانی گوێچکەی زاخاو دا.

**شَنَّفَ كلامَهُ**: قسەکانی ڕازاندنەوە.

**تَشَنَّفَتْ المرأةُ**: ئافرەتەکە بەگوارە خۆی ڕازاندەوە ٥ گوارەی لەگوێچکە کرد.

**الشَّنْفُ**: گوارە ٥ وادەبێ ئەم وشەیە بۆ

خشڵێك دەگوترێ كە بەپشت گوێچكەوە هەڵاوەسرێ وەكوو لاگیرە ٥ وشەی (القرط)یش بەخشڵێك دەگوترێ بەخوار گوێچكەوە هەڵبواسرێ ٥ (ك: شُنوف وأشناف).

**شَنَقَهُ شَنقاً:** هەڵیواسی.

**شَنَقَ الرجلَ:** پیاوەكەی لەقەنارە دا، بەشێوەی هەڵواسین كوشتی، بەم جۆرە پەتی لەملی كردو هەڵیواسی، لەسێدارەی دا.

**شَنَقَ البعیرَ ولَهُ:** بەلغاوو هەوسار سەری حوشترەكەی شەتەك دا بۆ ئەوەی ژێر باری بكاو جڵەوی خۆش بێ.

**شَنِقَ الأمرَ شَنَقاً:** خۆشی ویستو هۆگری بوو.

**أشْنَقَ الشیءَ:** شتەكەی هەڵواسی، لەقەنارەی دا.

**أشْنَقَ الیدَ الی العنق:** دەست قوچاوو چروك بوو.

**أشْنَقَ البَعیرَ ولَهُ:** سەری حوشترەكەی بەلغاوی هەوسارو ریشمە شەتەك دا تا ژێر باری بكاو جڵەوی خۆش بێ.

**أشْنَقَ القِربةَ:** كوندە ئاوەكەی بەحەبلی درێژ شەتەك دا.

**أشْنَقَ ماشیتە الی ماشیة غیره:** ئاژەڵەكانی خۆی تێكەڵ بە ئاژەڵی كەسانی تر كرد بۆئەوەی زەكاتەكەیان كەم بكاتەوە، وەكوو ئەوە دوكەس هەریەكەیان چل سەر مەڕی هەبێ ئەگەر بەجیابن دەبێ هەریەكەیان مەڕێك بدا بەزەكات واتە بەهەردوكیان دوو مەڕبدەن، ئەگەر تێكەڵاویان بكەن‌و ئاژەڵەكان دەبن بەهەشتا سەرو بەهەر دوكیان یەك مەڕ زەكات دەدەن.

**شانَقَهُ مشانقةً وشِناقاً:** ماڵەكەی تێكەڵ بەماڵی ئەوی تر كرد بۆ فێڵ كردن لەزەكات دان دا ٥ بۆیە پێغەمبەر (د.خ) نەی لەم كارە كردووەو فەرموویەتی (لاشِناق) ماڵی زەكات تێكەڵ بەیەكتر مەكەن بەمەبەستی كەمكردنەوەی زەكات دان.

**شَنَّقَ العجینَ أو اللحمَ:** هەویرەكەی هەنكوت هەنكوت كرد گۆشتەكەی كوتكوت كرد.

**تَشانَقَ الرجلان:** ئەو دوو پیاوە ماڵەكەیان تێكەڵ بەماڵی یەكتر كرد بۆ فێڵ كردن لەزەكات دان.

**الشِّناق:** درێژ ٥ پەتی درێژ.

**الشِّناق:** حەبل یان پەتو سیرمە كە شتی پێ دەبەسترێ‌و هەڵدەواسرێ پێی وەكوو قایشی تفەنگ‌و شمشێرو شتی وا ٥ ژێی كەوان ٥ (ك: شُنُقٌ وأشنقة).

**الشُّنَقُ**: لابار، لاتا ٥ بەهای خوێن برین کەمتر لەبەهای خوێن ٥ (ك: أشناق).

**الشُّنَاقُ**: بۆ مێینە بەکاردێ، ئافرەتێك ماڵەکەی تێکەڵ بە ماڵی یەکی تر بکا بەمەبەستی کەمکردنەوەی زەکات ٥ باڵندەیەك بەدەندوك خواردن بدا بەبێچووەکانی ٥ (ك: شُنُق).

**المِشْنَاقُ**: ئەوکەسەی حەزی لەهەموو شتێکە، هەوڵدانی هەمە جۆری هەیە.

**المِشْنَقَةُ**: قەنارەو سێدارە ئەو ئامێرەی تاوانبار کراوی پێ لەقەنارە دەدرێ، دەخنکێندرێ ٥ (ك: مَشانِق).

**شَنَّ شَنّاً**: وشك بوو، رزی ٥ دەگوترێ: (شَنَّت القِربةُ): کوندە ئاوەکە رزی، وشك بوو ٥ (شَنَّ الجملُ من العطش): حوشترەکە لەتینوان وشك بۆوە.

**شَنَّ الماءُ شَنيناً وتِشناناً**: ئاوەکە دڵۆپ دڵۆپ چۆڕایەوە.

**شَنَّ السائِلَ شَنّاً**: شلەمەنییەکەی رژاند، پرژاندی، دەگوترێ: (شَنَّ الماءَ على الشَّرَابِ): ئاوی رژاندە ناو شەرابەکەوە.

**شَنَّتِ العينُ الدمعَ**: چاو فرمێسکی رژاند.

**شَنَّ الغارَةَ على عدوه**: لەهەموو لایەکەوە هێرشی کردە سەر دوژمن.

**أشَنَّ**: بەمانا (شَنَّ)دێ.

**شَنَّنَ السِّقاءَ أو الماءَ**: بەمانا (شَنَّ)دێ.

**إنْشَنَّ الذِئبُ في الغنم**: گورگ کەوتە ناو مەڕو بزنەوەو کەلاکی لێ خستن.

**تَشَنَّنَ الماءُ**: ئاوەکە خێرا خێراو دڵۆپ دڵۆپ چۆڕایە خوار.

**تَشَنَّ الجِلْدُ**: پێستەکە وشكو چرچ بوو، گرژ بوو هەڵقرچا.

**تَشَنَّنَتْ بشرةُ الرجل**: پێستی پیاوەکە بەهۆی پیرییەوە چرچو لۆچی زۆری تێکەوت.

**اِسْتَشَنَّت القِربةُ**: بەمانا (شَنَّت)دێ، دەشگوترێ: (اِستَشَنَّ الرجلُ أو الجَمَلُ): پیاوەکە یان مەڕەکە کزو لاواز بوو.

**الشَّانَّةُ**: دەراوی ئاو کە بڕوا بەرەو شیوو دۆڵ ٥ (ك: شَوَان).

**الشُّنَانُ**: هەورێك کە بارانی لێ ببارێ بەتاوو خوڕەم ٥ ئاوی سارد، دەگوترێ: (ماءٌ شنان): ئاوی بڵاوو هەڵڕژاو بەپرژو قەڵبەزەو کەفو کوڵەوە.

**الشُّنَانَةُ**: ئاوی هەڵڕژاو جۆڕ جۆڕ لەکوندە، ئاوی تکە تك کەر لەکوندە یان لەدرەختەوە ٥ هەر شیرو ماستێك ئاوی تێبکرێ.

**الـشَّنُّ**: كونـده ئـاوى بـچوكو كۆن كـه بەرواڵەت كونـده تـا كۆن بـێ باشـتر ئاوى تێدا سارد دەبێ ٥ (ك: شِنَانٌ).

**شَنٌّ وطبقة**: ناوى پياوو ئافرەتێكه كه بۆ زيرەكى بەناو بـانگ بـوون ٥ لەپەنـدى پێشينان دا هـاتووه دەڵێ: (وافـق شـنٌّ طَبَقَة): شەنو تەبەقه رێك كەوتن.

**الـشَّنَّةُ**: بـەمانا (الـشَّنُّ)دێ ٥ پيرێـژن ، دەگوترێ: (قوس شَنَّةٌ): كەوانى كۆن ٥ (جَبْهَةُ شَنَّة): ناوچەوانى گرژو مۆن ٥ ناوچەوانى چرچو لۆچاوىو گرژ ٥ (ك: شِنَان).

**الـشُّنُونُ**: گيانلەبـەرى مـام ناوەنــدىى نەكز نەقەڵەو.

**الـشَّنِينُ**: ماسـتى سـاغ ئـاوى سـاردى تێبكرێ ببێته ماستاوى ساغو سارد.

**المِـشَنَّةُ**: نانـدان، تەشـتەنان، سـەبەتەى نان، بەزۆرى لەپرژو پەلى دارخورما دروست دەكرێ، لـه شـۆركو خەڵفـه نـەمامى دارچـوالەو درەختـى كفـرو بـى دروسـت دەكـرێ، وايـش دەبـێ لەلاسـكى گـەنمو شـتى وا دروسـت دەكرێ.

**شَـهَبَهُ الحَـرُّ أو البَـردُ شَـهْباً**: گـەرما يـان سـەرما رەنگـى پێـستو روخـسارى گۆڕى.

**شَهَبَت السَّنَةُ القوم**: سالى قـاتو قـرىو نەهاتى توشى خەڵكەكه هات ماڵو سامانى بەهيلاك بردن.

**شَهِبَ شَهَباً وَشَهْبَةً**: سپيەتى تێكەڵ بەموى رەش بوو بۆ زى كرد، رەنگـى سروشـتى گۆڕى، قـژى مـاشو بـرنج بـوو ٥ (فهـو أشهب وهي شهباء).

**أشْـهَبَتِ الـسَّنةُ القـومَ**: سـالى نـەهاتو قـاتو قـرى توشـى ئـەو نەتەوەيـە بوو، ماڵو سامانى بەهيلاك بردن.

**إشْتَهَبَ**: بەمانا (شَهِبَ)دێ.

**إشْتَهَبَ الـرأسُ**: قـژى سـەرى سـپى بـوو پيرى لـێى ديارى دا.

**إشْهَابَّ**: بەمانا (إشْتَهَبَ)دێ، واتـه وردە وردە سەرى سپى بوو.

**إشْهَابَّ الزَّرْعُ**: كشتو كاڵەكه زەرد بـوو پەڵه پەڵەى سەوزى تێدا ماوە.

**إشْـهَابَّت الـشفاه والمَـشَافِرُ**: لـچو لێـوى قەبارەى سپييان لەسەر ديارى دا.

**إشْهَبَّ**: بەمانا (إشْهَابَّ)دێ.

**الأشْـهَبُ**: دەگـوترێ: (عــام أشــهب): ساڵێكى گرانىو قاتو قرييه ٥ (يوم أشــهب): رۆژێـكى سـاردو سـەرماو رەشەبايە.

**الشِّهَابُ**: ماست يـان شـير ئەومنـده يـان ئاو تێكەڵ كرابێ سپاييەتيەكەيان كەم بووبێتەوە.

**الشِّهَابُ**: دەستە چيله ئاگرى بلێسەدار

کەتاریکی شەو کون بکا ٥ لە قورئان دا هاتووە: ﴿أَوْ آتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ ئەستێرەی پرشنگدار، فەبارەیەکی ئاسمانییە لەفەزادا دێ ودەچێ، کەهاتە خوار بۆ ناوکەش‌و هەوای زەوی گڕ دەگرێ‌و دەبێتە خۆڵەمێش ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ﴾ ٥ هەروا کەسێك لەشەڕدا شارەزا بێ یان لەکارو بارو زانیاریی دا لێهاتوو بێ پێی دەگوترێ (هو شهاب حرب أو شهاب علم) ٥ (ك: شُهُبٌ وشهبان وأشهب).

**الشُّهُبُ**: ئەستێرەی پرشنگدارو درەوشاوە.

**الشِّهابَةُ**: بەمانا (الشِّهاب)دێ.

**الشَّهْبُ**: کێوی سەر داپۆشراو بەبەفر ٥ (ك: شُهُوبٌ).

**الشَّهْبَاءُ**: دەگوترێ: (کتيبة شهباء): کەتیبە سەربازێکی پڕچەك‌و تەقەمەنییە ٥ (غُرَّةٌ شَهْبَاءُ): پەڵە مویەکی سپی بەئەسپ‌و شتی واوە کە هەندێ لەمووەکان رەنگی تربن ٥ (سنة شهباءَ): ساڵی گرانی‌و قات‌و قڕی ٥ (أرض شهباء): زەوییەك بەبەفر داپۆشیبێ ٥ هەروا وشەی (شهباء): نازناوی شاری

(حەڵەب)یشە چونکە بەردی سپی لێیە.

**الشُّهْبَةُ**: سپی تێکەڵ بەرەش، (پەڵە موی سپی بچوك لەگەڵ موی رەش دا).

**شَهِدَ على كذا شهادةً**: هەواڵی راستەقینەی دایە.

**شَهِدَ لفلان على فلان بكذا**: فلانکەس ئەو شایەتیەی لای بوو دەربارەی فلان شت لەسەر کابرا دای، ئەنجامی دا.

**شَهِدَ بالله**: سوێندی بەخودا خوارد ٥ دانی بەوەدا نا کەدەیزانی.

**شَهِدَ المجلسَ**: ئامادەی مەجلیس‌و ئەنجومەنەکە بوو جووە ناویەوە ٥ هەر لەم مانایەدایە کە قورئان دەفەرموێ: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾.

**شَهِدَ الحادث**: روداوەکەی بینی.

**شَهِدَ الشيءَ**: شتەکە بینی، دەشگوترێ: (شهد على شهادة غيره وشهد بما سمع): شایەتی لەسەر شایەتی دا، شایەتی دا بەوەی بیستوویەتی.

**أشهَدَهُ على كذا**: وای لێ کرد شایەتی لەسەر ئەوە بدا.

**أشهد الشيءَ**: شتەکەی ئامادە کرد.

**شاهَدَهُ**: چاوی پێ کەوت بینی.

**تشَهَّدَ**: شایەتومانی هێنا، وتی (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول

الله) ٥ داوای شایەتومانی لێ کرد.

**إسْتَشْهَدَ:** نزیك بوو شەهید ببێ لەپێناو ئایینی خودادا.

**إسْتَشْهَدَ الرجلُ فلاناً:** پیاوەکە داوای کرد فلان شایەتی بۆبدا ٥ بەلگەی لەسەر هێنایەوە.

**إسْتَشْهَدَ فلان:** فلانکەس لەرێگەی خودادا شەهید بوو.

**ألإشهادُ:** لەبواری (جنایەتو تاوان دا) ئەوەیە بەخاوەن خانوو بگوترێ دیواری خانوەکەت خوارەو راستی بکەرەوە، ترسی روخانی هەیە چاکی بکە.

**التَّشهّدُ:** لەنوێژدا بریتییە لەتەحیات خوێندن.

**الشّاهِدُ:** شایەت ٥ بەلگەو نیشانە ٥ مادەیەکە لەگەلّ هاتنە دەرەوەی مندالّ لەسکی دایکی دێتە دەرەوە وەکوو چلّم وایە ٥ (ك: شهود وأشهاد وشُهّدٌ) ٥ بۆ غەیرە عاقلّ (شواهِد) دەگوترێ ٥ (صلاة الشاهد): نوێژی شێوانو نوێژی بەیانی.

**الشّهادةُ:** ئەوەیە کابرا شایەتی بدا لەسەر ئەوەی ئاگای لێیەو دیویەتی، یان دان بنێ بەوەی کە دەیزانێ ٥ هەموو ئەوشتانەی بەهەست دەزانرێن.

**الشهادة البيّنة:** لەبواری (داد دا) قسەو گوفتاری شایەتەکانە لەبەردەم دادوەردا ٥ (عَالَم الشّهادة): جیهانی بونەوەرە، شتە ئاشکراو هەست پێکراوەکان ٥ دەق بەرامبەری (عالَم الغيب): دێ جیهانی ئەودیو ماددەو جیهانی نەبینراو ٥ قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ هەردوو جیهانەکە کردووەو دەفەرموێ: ﴿وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾.

**الشُّهْدُ:** هەنگوین بەمەرجێ لەگەلّ کەرە شانەکەی دا بێو لێك جیا نەکرابنەوە ٥ شانە هەنگوینێك پێی دەگوترێ: (شُهْدَة) ٥ (ك: شِهَادٌ).

**الشّهيدُ:** کەسێك لەرێگای ئایینی خودادا خۆی بەخت بکا ٥ کەسێکە شایەتی بدا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلاَ شَهِيدٌ﴾ ٥ (ك: شهداء وأشهاد).

**المُشَاهَدَةُ:** هەست کردن بەیەکێ لەپێنج هەستەکان.

**المُشاهدات:** ئەو شتانەی بەهەستەکان دەزانرێن.

**المَشْهَدُ:** ئامادە بوون ٥ ئەوەی بەچاو دەبیندرێ ٥ کۆمەلّگای ئادەمیزاد ٥ (ك: مَشاهِدَ) ٥ (ومشاهِدُ مكة) ٥ ئەو شوێنانەی مەککەو دەورو بەری کە

خەڵك لەکاتەکانی حەج‌و عەمرەدا وە موناسەباتی تردا تێیدا کۆبونەوە ◦ هەروا ناوە بۆ ئارامگا.

المشهود (یوم مشهود): ڕۆژی بەناو بانگ کەڕوداوی گەورە یان تێدا روبدا.

الشَّهْدانجُ: تۆوی درەختی (قِنَب) کە درەختێکە توێکڵەکەی بادەدرێ‌و دەکرێ بەگوش ◦ (قِنَب)ی هیندیش هەیە حەشیشەی لێ دەردەهێندرێ.

الشَّهْدانَقُ: بەمانا (الشهدانج)دێ.

شَهَرَهُ شَهْراً وشُهْرَةً: بڵاوی کردەوە، رایگەیاند.

شَهَرَ السَّیف: شمشێری لەکالان دەرکێشاو بەرزی کردەوە.

شَهَرَ العقدَ: گرێبەستەکەی مۆرکردو لەفەرمانگەی زەوی‌و زار تۆماری کردو کردی بە تاپۆ.

أشْهَرَ الشیئَ: شتەکە مانگێکی بەسەردا تێپەری.

أشهر فی المکان أو بە: مانگێك لەو شوێنە مایەوە.

أشهرت الحاملُ: ئافرەتە سکپڕەکە چووە مانگی منداڵبوونیەوە، چووە نۆ مانگ‌و نۆ ڕۆژی خۆیەوە.

أشْهَرَ الشیئَ: شتەکەی بڵاو کردەوە.

شاهَرَهُ مشاهرةً وشهاراً: بەمانگانە مامەڵەی لەگەڵ کرد.

شَهَّرَهُ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (شَهَرَهُ)دێ.

شَهَّرَهُ بە: ناوی زڕاند ◦ هەڵس‌و کەوتی خراپی پاڵ دا.

اشْتَهَرَ الأمرُ: کارەکە بڵاو بۆوە، ناوبانگی دەرکرد.

إشْتَهَرَ الشیئَ: شتەکەی بڵاو کردەوە، رایگەیاند.

تَشَاهَرَ بکذا: ویستی بەهەوڵدان‌و لافو گەزاف ناوبانگ بۆ خۆی دەرکا.

الشَّهْرُ: مانگ، بەشێك لەدوانزە بەشی ساڵ ◦ چ ساڵێ مانگی یا ساڵی خۆری بێ ◦ ئەگەر مانگەکە بەهۆی تەواو کردنی خولی مانگەوە بوو ئەوە مانگی قەمەریی پێ دەگوترێ، یان بەهۆی دیاریکردنی بەشێك لەدوانزە بەشی ساڵ ئەوە مانگی خۆریی پێ دەگوترێ ◦ (ك: شُهُور وأشْهُر).

أشْهُر الحرم: ئەو مانگانەن لەکاتی پێش هاتنی ئیسلام دا عەرەبەکان شەڕیان تێدا حەرام کردبوو، ئەو مانگانە چوارن سێیان بەشوێن یەکەوە دێن (ذو القعدةِ، ذو الحجة، المحرم) یەکێکیشیان مانگی ڕەجەبە ◦ هەروا وشەی (الشَّهْر): ناوە بۆ یاساو نیزامێکی فەرمی بەمەبەستی

بەدیکۆمێنت کردنی گرێبەستەکانو بڵاو کردنەوەیانو ڕاگەیاندنیان ٥ (مصلحة الشهر): فەرمانگەیەکی دەوڵەتییە گرێبەستەکان تۆماردەکاو دەیانکاتە دیکۆمێنت.

**الشُهْرَةُ**: دەرکەوتنی شتو بڵاو کردنەوەیان.

**الشَهرِيَّةُ**: مانگانە، هەرشتێك نسبەت بدرێ بۆلای مانگ ٥ موچە کە بەمانگ سنوردار بکرێ.

**الشَّهِيرُ**: بەناوبانگو مەشهور ٥ گۆیکەی هێنی نێر.

**المشهورات**: زاراوەو بیرو باوەڕێکن هەموو ئادەمیزاد یان زوربەیان کۆکن لەسەر باشیو بەباش زانینیان وەکوو دەگوترێ: (العدل جميل والكذب قبيح).

**الشُهْرَمان**: جۆرە مراوییەکە قاچ کورتو جەستە بەڵەکەو لەلەقلەق بچوکترە.

**شَهَقَ البناءُ والجَبَلُ وغوهما مشوقاً**: باڵەخانە یان کێوەکە زۆر بەرز بوون ٥ (فهو شاهِق) ٥ (ك: شَواهِق).

**شَهِقَ شهيقاً**: هەناسەی لە قوڕگی دا هاتو چو بیسترا لەناخی دا گریاو کورکە کورکی کرد ٥ هەوای هەڵمژیو سییەکانی پڕکردن لە هەوا (ئۆکسجین).

**الشَّاهِقُ**: دەگوترێ: (فلان ذو شاهق): فلانکەس رق ئەستورو دەمار گرژە ٥ (فحل ذو شاهق): ئەسپەکە حیلکاندنی بەهێزە.

**الشهيق**: دەنگی ئەسازو گەورە، زەڕەی گوێدرێژ ٥ گرمەو ناڵەی ئاگر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿سَمِعُوا لَهَا شَهِيقًا وَهِيَ تَفُورُ﴾ ٥ هەروا ئاوە بۆ هەڵکێشانی هەناسە بۆ ناو سییەکان.

**شَهِلَ اللونان شَهَلاً**: دوو رەنگەکە تێکەڵ بەیەکتر بوون ٥ فلانکەس لەچاوی دا سورایی هەیە، دەگوترێ: (شَهِلت عينه): گلێنەی چاوی سورایی تێدایە ٥ (فهو أشهل وهي شهلاء) ٥ (ك: شُهْلٌ).

**شَاهَلَهُ مُشاهَلَةً**: جوێنی پێ دا، ڕەخنەی لێ گرت.

**تَشَهَّلَ ما. وجهه**: لەبەر زەعیفیو بێ هێزی ئاوی روخساری نەما، تەڕو تازەیی دەمو چاوی ڕۆیی، دەشگوترێ: (تَشَهَّلَ الرجلُ): پیاوەکە روخساری چرچ بوو، گەشەداریی لەدەست دا.

**الشُهلُ**: ئەوەیە گلێنەی چاو سورایی تێدابێ.

**الشُهْلَةُ**: بەمانا (الشَهَل)دێ.

**الـشُّهْلَةُ:** پیرێـژن ، ئـافرەتی قـەیرەی عاقڵو رەزان.

**شَهَمَهُ شَهْماً وشُهُوماً:** چوستو چالاكی كرد ، دەری كرد، لێی تورە بوو.

**شَـهُمَ شَـهَامةً:** خـاوەنی مەردایـەتیو پیاوەتی بوو.

**الـشَّهَامة:** نـەفس بـەرزیو سـور بـون لەسەر ئەنجامدانی كاری گـەورە كـە ببنـە جێـگای رێزلێنـانی خەڵـكو باسكردنیان.

**الــشَّهْمُ:** زیــرەك ، پیـاوی گــەورەو رادروسـت ، عـاقڵو لێـزان لـەكارو باردا ، پشوو درێـژ بـۆ ئەنجامـدانی ئـەركی سەر شـانی ، (فـرس شـهْمٌ): ئەسپی بەهێزو تیژ رەو ، (ك: شِهام وشُهوم).

**الشَّيْهَمُ:** گیانلەبەرێـكی ددان تیژە، شت دەقرتێنـێ، چقڵێـكی درێـژی هەیـە لەپێری (قَنافِذ)بەكورتی جۆرێـكە لـە ژیـشك پێـشی دەگـوترێ: دوڵـدوڵ ، (ك: شیاهم).

**الشاهِنشاه:** پاشای پاشایان، یـان پاشـای گەورە.

**الــشَّاهین:** دالاش؛ جۆرێــكە لەباڵنــدە گۆشت خۆرەكان وەكوو هـەڵۆ وایـە ، عــەمودو راســتەی تــەرازوو ، (ك: شواهین وشیاهین).

**شَهَاهُ شَهْوَةً:** خۆشی ویـست، حـەزی لـێ كرد.

**شَهُوَ الطعامُ وغیره شهارةً:** خۆراكەكە تام خۆشو بەلەزەت بوو.

**أشْهَاهُ:** وای لەخواردەمەنییەكە كرد تام خۆش بێ ، ئـەوەی حـەزی لـێ بـوو دەرخواردی دا.

**شَهَّاهُ:** هەڵێنا بـۆ ئـەوەی ئـارەزوی بكاو بەلەزەتی بزانـێ، تـامی خـۆش كـرد، دەگوترێ: (هذا شيٌ يُشَهِّي الطعـامَ): ئەمە شتێـكە خۆراك خۆش دەكا.

**اشتهى الـشيئَ:** زۆری ئـارەزوی شـتەكە كرد ، قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَلَـكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ﴾.

**تَشَهَّى الشيئَ:** حەزی لەشتەكە كرد.

**تَشَهَّى علیه:** جار دواجـار داوای ئـەوەی كردەوە.

**الشَّاهِية:** شەهوەتو ئارەزو.

**الشَّهْوان:** كەسێـك زۆری حـەز لەوشـتە بێ ، بۆ مێینە دەگوترێ: (شهوى) ، (ك: شهاوى).

**الــشَّهْوَاني:** كەسێــك زۆری حـــەز لـەرابواردنو خـواردنی خـۆش بـێ نەفسی خۆی پێ زەوت نەكرێ.

**الشَّهْوَةُ:** حەزو ئارەزوی زۆرو سەركەش ، هێزێكی دەرونییـە، ئـارەزوی ئـەو شتانە دەكا كە حەز لێـكراون ، ئـەو

شته مادديانەی حەزيان لێ دەكرێ ە (ك: شهوات وأشهية وشهيّ) ە قورئان دەفەرموێ: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاء وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ﴾.

**الشَّهِيُّ**: حەزلێكراو ئەوەی نەفس ئارەزوی بكا، شتی بەتام و لەزەت.

**الشَّهِيَّة**: مێینەی (الشَّهِيّ)یە ە هەروا بەمانا حەزكردن لەخواردن و شتی وایە.

**المُشَهِّيَات**: ئەو شتانەی دەبنە هۆی كردنەوەی شەهیەو تام و لەزەت دان بەخواردن وەكوو ترشیات و زەلاتەو سەوزەوات.

**شاب فلان في بيع أو شراء شَوْباً**: فلانكەس لەمامەڵەدا فێڵی كرد ە (شَابَ في قوله): درۆی كرد، دەشگوترێ: (هو يشوب ويروب): ئەو لەقسەو كردەوەی دا شت تێكەڵ و پێكەڵ دەكا، وادەبێ دەی پێكێ و وادەبێ هەڵەدەكا.

**شابَ عن صديقة**: بەرگری لە دۆست و برادەرەكەی كرد جارێك بەجدی و جارێك بە تەمبەڵی.

**شابَ الشيءَ بالشيء**: شتەكەی تێكەڵ بەشتەكەی تر كرد.

**شابَ الشيءُ غيره**: شتەكە تێكەڵاوی شتی تر بوو ە (شائب): تێكەڵكەر ە (مَشوب): تێكەڵاو كراو.

**شَوَّبَ عَنْهُ**: بۆ زێدە ڕەوی لەمانای (شاب عنه)دی.

**الشَّائِبَة**: شتی غەریب و جوداواز لەشتەكەی تر كە تێكەڵی ببێ، دەگوترێ: (ما فيه شائبة): ئەوە هیچ شك و گومانی تێدا نییە ە چڵك و پیسایی و شتی قێزلێكراو ە (ك: شوائب)، دەگوترێ: (فلان بريئ من الشَّوائب): فلانكەس هیچ عەیب و لەكەی تێدانییە.

**الشَّوْبُ**: ئەوەی تێكەڵ غەیری خۆی ببێ ە وەكوو هەنگوین تێكەڵ ئاوببێ، دۆشاو تێكەڵی ماست و شیر ببێ ە قورئان دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ﴾، دەشگوترێ: (سقاه الذَّوبَ بالشوب).

**الشَّوْبَةُ**: فرت و فێڵ، دەگوترێ: (في فلان شوبة): فلانكەس فێڵ و فەجەرێكی تێدایە.

**الشِّيَابُ**: ناوە بۆ شتی تێكەڵكراو.

**الشَّوْحَطُ**: بڕوانە (شَحَطَ).

**شَوَّذت الشمس**: خۆر بەرەو ئاوابون رۆیی.

**شَوَّذ السحابُ الشمسَ**: هەوری تەنك دەوری خۆری داوە.

**شارَ الرجل شوراً**: پیاوەكە دیمەنی جوان بوو.

شارَ الشيءَ: ستەکەی رانواند بۆ ئەوەی شتە جوانەکانی، لایەنی جوانی دەربخا.

شارَ الدابةَ: ولاخەکەی لەبەرچاوی کڕیارەکە راپسکاندو هێنای‌و بردی بۆئەوەی چوست‌و چالاکییەکەی دەربکەوێ ٥ لەحەدیس دا هاتووە هاوەڵێکی پێغەمبەر (د.خ) کە ناوی طەلحە بوو لەبەردەمی پێغەمبەر دا خۆی رانواندو هات‌و چو بۆ ئەوەی دەری بخا کە بەتواناو چوست‌و چالاکە.

شارَ العسلَ: هەنگوینەکەی لەکۆڵەس‌و شانەکە دەرهێنا.

أشارَ اليه وبيده أو نحوها: بەدەستی یان بەئەندامی تری ئاماژەی کرد بۆ مانایەك لەماناکان وەکوو هاتنە دەرەوەو چوونە ژورەوە لەگەڵدا رۆیشتن‌و ئەوشتانە.

أشار اليه بكذا: ئامۆژگاری کرد فلانکار ئەنجام بداو سودەکانی بۆ ڕون کردنەوە.

أشار فلاناً على العسل: یارمەتی فلانکەسی دا هەنگوین ببڕێ.

شاوره مشاورةً وشواراً: داوای رای ئەوی کرد بۆ نیشەکە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾.

شَوَّرَ اليه بيده ونحوها: بەمانا (أشار)دێ.

شَوَّرَ بالنار: بەئاگر بەرزی کردەوە.

شَوَّرَ فلاناً وبه: فلانکەسی شەرمەزار کرد، یان کاری حەیابەرەی پێ کرد.

شَوَّرَ الثوبَ ونحوه: قوماشەکەی بەزەعفەران رەنگ کرد.

إستشار العسلَ: هەنگوینەکەی لەکۆڵەسەکە دەرهێنا.

استشار الفحلُ الناقةَ: حوشترە نێرەکە بۆنی بەحوشترە مێیەکەوە کرد بۆئەوەی بزانێ ئاخۆ کەڵی گرتووە یان نا.

اشتور القومُ: خەڵکەکە هەندێکیان راو بۆچونی یەکتریان وەرگرت.

تشاوروا: بەمانا (إشتوروا)دێ.

استشار فلانٌ: فلانکەس تاج‌و نەجمەی بەستن، پۆشاکی تایبەتی فەرمی پۆشی، پۆشاکی جوانی لەبەرکرد.

استشار أمره: کارەکەی دەرکەوت‌و رون بۆوە.

استشار فلاناً في كذا أو في الأمر: پرس‌و ڕای لێ وەرگرت دەربارەی فلانکار.

الإستشارة: ئاماژە ٥ شت دیاریکردن بەدەست راداشتن بۆی ٥ یان ئاماژەکردن بەسەر، بەچاو، بەلێو بەشێوەیەك مەبەستەکە دەربڕێ.

الشَّارُ: روخساری جوان، دەگوترێ: (رجل صارٌ شارٌ): پیاوێکە روخسار جوان‌و خاوەن ناوو شۆرەتی جوان.

الـشارة: جـوانی، زۆر جـوانو سـەرنج راكـێش ٥ شـێوە ٥ پۆشـاكی جـوان ٥ ڕۆنو چەوری.

الـشِّوار: بـەمانا (الـشارة)دێ ٥ خـشڵو شتی خۆڕازاندنەوە.

الشُّوار: شتو مەكی ناو ماڵ، یان شتی نایابی ناو ماڵ ٥ جیازی بوك، شتو مەكی ناوماڵ كە بوك لەگەڵ خۆی دەیبا بۆ ماڵی مێردی.

الشَّوْرُ: هەنگوینی بڕدراوو جیاكراوە.

الـشُّوری: راوێـژ ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾.

الـــشُّورَةُ: نـــاوو ناوبـــانگ ٥ دیمـــەنو روخسار ٥ شانە هـەنگ یان شوێنی هەنگوین.

الشَّيَارُ: بەمانا (الشارة)دێ.

الـشَّيْرُ: شـتی زۆر جـوانو رازاوە ٥ (ك: شُـــوَراءُ) ٥ بـــۆ ئـافرەت دەگـوترێ: (شِيار).

الْمَشَارُ: شانەی هـەنگ كـە هـەنگوینی تێـــدابێو بتوانـــدرێ لـــێ دەربهێندرێ ٥ (ك: مَشاور).

المِـشوارُ: چـیلكەیەكە هـەنگوینی پـێ كۆدەكرێتەوە ٥ ژێی ئامێری هەلاج ٥ شوێنێـك كەكالای تێدا رابنـوێنرێ ٥ (نمایشگا)، ئەو مەسافەو گۆڕەپانـەی ئاژەڵی تێدا رادەنوێنرێ بۆ فرۆشتن

٥ هـەروا نـاوە بـۆ ئـەو قۆناغـەی ئادەمیزاد دەیبڕێ لەڕێگا.

المِشْوَرُ: بەمانا (المِشوار)دێ.

المَشُورَةُ: ئەو ئامۆژگاریو رادەربڕینەیە كـە راوێـــژ پێـــكراو ئاراســـتەی راوێژكەری دەكا.

المَشْوَرَةُ: بەمانا (المَشُورة)دێ.

المُشِيرَةُ: پەنجەی شایەتومان.

شـــاسَ فـــلان شوســـاً: فـلان لەبـەر خۆبـــەزلزانی یـــان رق لـــێ بـــوون بەقولینـــچكی چـــاوی بـــۆی ڕوانـــی، چاوێـكی یـان هـەر دوو چـاوی بـچوك كردنـەوەو پێڵوی چاوەكانی هێنانـەوە یەكو بەو شێوە سەیری كرد.

شاسَ خُلُقُهُ: رەوشتی ناشیرین بوو.

شَوِسَ شَوَساً: ئازاو چاو نەترس بوو، درێژ بـوو ٥ خـۆی بـەزلزانیو فیـزی كـرد ٥ (فهو أشوس وهي شوساء) ٥ (ك: شـوس وأشاوِس).

شـاوس المـاءُ: ئاوەكە لەبـەر كـەمی یـان لەبـەر دووریـی بینینـی زەحمـەت بوو.

تشاوسَ الیه: بەمانا (شـاسَ)دێ ٥ خـۆی وانیشان دا رێگای هەڵەكردووە.

شَوْشَـــهُ: شـــتەكانی تێـــكەڵ كـــردنو شـــێواندنی، خراپـــی ریزكـــردن، دەگـوترێ: (شَـوّشَ بیـنهم): بـشێوی

خستە ناویانەوە ◦ یەکیەتیو تەبایی لێ تێك دان ئاژاوەو ئاشوبی لەناودا بەرپاکردن.

**التشویش**: تێکەڵو پێکەڵ کردن ◦ دەڵێن: ئەم وشەیە وشەیەکی رەسەنی عەرەبی نیەو تازە داتاشراوە، وشە رەسەنەکە (التهویش)ەو لەمادەی (هَوش)ەیە.

**تَشَوَّشَ علیه الأمر**: ئیشەکەی لێ تێکەڵو پێکەڵ بوو.

**الشَّاشُ**: قوماشێکە لە لۆکە دروست دەکرێ تەنكو شاشە بۆ برین پێچانو شتی وا بەکاردەهێندرێ ◦ هەروا دەشکرێ بەمێزەرو لەسەر دەبەسترێ.

**المُشَوَّش**: شتی نارێكو پێك ◦ لەزاراوەی بەلاغیان دا (لف ونشر مُشَوَّش) بریتییە لە هێنانی وشەی کورت ئەمجار شی کردنەوەو درێژە پێدانیان بەشێوەی نا تەرتیبو پێچەوانەی تەرتیبی وشە کورتەکان.

**شَاصَ شوصاً وشوصاناً**: جوڵایەوەو پەلەکوتەی کرد، دەگوترێ: (شاص الجنین في بطن أمه): زارۆکە کە لەسکی دایکی دا جوڵایەوە.

**شاصَ به العرق والمرض**: نەخۆشیو شتی وا تلاو تلی پێ کرد حەجمینی لێ بری.

**شاصَ فلان بفلان**: فلانکەس دوزمانی بەفلان کرد.

**شاصَ الشیءَ شَوْصاً**: جوڵاندیو لەشوێنی خۆی لایبرد.

**شاصَ أسنانهُ بالسواك**: ددانی بەفرشەو سیواك پاك کردنەوە.

**شَوِصَتِ العینُ شَوْصاً**: چاوی گەورە بوو پێڵوەکانی دایان پۆشین، یان پێڵوی چاوەکانی پتەپتیان بوو.

**تَشَوَّصَ**: جوڵایەوەو پەلە قاژەی بوو.

**الأشْوَصُ**: کەسێکە هەمیشە پێڵوی چاوەکانی پتە پتیانە، یان پێڵوی چاوی یەکناکەونەوەو چاوەکانی داناپۆشن ◦ (ك: شوص).

**الشَّوْصُ**: شێلانو دەست رێ خستن ◦ ئازاری ددان هێشان سك هێشان.

**الشَّوْصاءُ**: مێینەی (الأشوص) ◦ چاوێك بەشێوەی ئاسایی خۆی نەڕوانێ، بەڵکوو شێوە خێل بێ، یان لەقولینچکەوە بڕوانێ یان لەلای پێڵوی سەرەوە بڕوانێ.

**الشَّوْصَةُ**: سك هێشان بەهۆی باکردنەوە، یان برکو کوڵینج کردن.

**الشُّوْصَةُ**: بەمانا (الشَّوْصَةُ)دێ.

**الشَّیَاصُ**: رەوشتی ناشیرینو خراپ.

**شاطَ الفرسُ وغيرهُ شَوْطاً**: ئەسپەكە بازى دا بۆ شوێنى مەبەست.

**شَوَّطَ المُسافرُ**: ڕێبوارەكە سەفەرەكەى درێژەى كێشا.

**شَوَّطَ الفرسَ**: دەورەیەكى غار بەئەسپەكە كرد.

**تَشَوَّطَ الفرسَ**: ئەسپەكەى هەلینگ دا تاماندوى كرد.

**الشَّوْطُ**: ڕاكردن بەرەو مەبەست ٥ غاردان بەئەسپ بۆ گەیشتن بەمەبەست ٥ هەروەها ناوە بۆ بەشێكى هەموو كارو چتێ ٥ (ك: أشواط) ٥ مەسافەو شوێنێك لەنێوان دوو عەمود یان دوو نیشانە كە درێژى مەسافەكە بەئەندازەى گەیشتنى دەنگ بێ ٥ (ك: شِیَاط).

**شاظ به المرضُ شوظاً**: نەخۆشییەكە حەجمینى لێ بڕى.

**شاظَ الغضبُ**: رقو كینەكە پەرەى سەند.

**الشُّواظُ**: بلێسە ئاگرى بێ دوكەڵ ٥ گرمى گەرما ٥ لە قورئان دا هاتووە: ﴿يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ﴾.

**شاعَ شوعاً**: قژ ژاكاوو جەستە هەڵوەشاوو چڵكن بوو.

**شَوِعَ الشَّعرُ شَوَعاً**: توكو قژى بڵاوو ژاكاو بوون وەكوو چەقڵ ڕاست بوونەوە، دەشكوترێ: (شَوِعَ رأسُهُ).

**الشُّوعُ**: درەختى بان یان بەرەكەى ٥ جارى وا دەبێ بەرى درەختەكە ناوى درەختەكەى لێ دەنێن ٥ (ك: شیاع).

**شافَ شَوْفاً**: بەسەرى دا ڕاگەیىو سەیرى كرد.

**شافَ الشيءَ**: شتەكەى مشتو ماڵ كردو ڕازاندیەوە.

**أشافَ علیه**: بەسەرى دا ڕاگەیىو بۆى ڕوانى.

**شَوَّفَهُ**: بەمانا (شافَهُ)دێ.

**شَوَّفَ الجاریةَ**: جاریەكەى ڕازاندەوە (چەتیوەكەى قۆزكرد).

**شَیَّفَ الدواءَ**: دەرمانەكەى كردە دەرمانى چاو ئێشە.

**اشتاف الیه**: بۆى ڕوانىو سەیرى كرد.

**اشتاف الفرسُ وغیره**: ئەسپەكە ملى بەرز كردەوەو بۆ پێش خۆى ڕوانى.

**اشتاف الشيءَ**: چاوى خۆى خستە سەرىو سەرنجى دایە.

**تَشَوَّفَ الشيءُ**: لەبەرزاییەوە دەركەوت ٥ خۆى ڕازاندەوە.

**تَشَوَّفَ له والیه**: بۆى ڕوانىو لێى گەڕاو چاوەڕوانى كرد.

**تَشَوَّفَ أمراً**: هەوڵى ئەنجامدانى كارەكەى دا حەزى لێ بوو ئەنجامى بدا.

**الــشُوْفُ**: مالَمــالّ؛ ئامێرێــکه زەوی کێڵدراوی پێ تەخت دەکرێ، تەختە دارێــکی پانــە، پیاوێــك دەچــێتە ســـەری‌و دورەشـــە وڵاخ یـــان دو هێسترو بارگیر رایدەکێشن.

**الشُوفان**: روەکێــکی ئاڵفییــە، دەکرێتــە ئالف بۆ ئاژەڵ.

**الشيّافُ**: درەمانی چاوو شوێنی تر.

**المُشوَّفَةُ من النساء**: ئەو ئافرەتەی خۆی بۆ بێگانە رابنوێنێ‌و مەبەستی بێ خەڵك بیبینن.

**شاقَ اليه شوقاً**: حەزی لــێ بــوو، ئـارەزوی لای ئەوی کرد.

**شــاقَ الــشيءُ فلانــاً**: شـتەکە فلانکەسـی وروژاند.

**شــاقَ الــشيءَ الى آخــر**: شـتەکەی بـۆلای شتێـکی تر کێش کرد، دەگوترێ: (شاق المَــشْجَبَ ونحــوه الى الحــائط): عەلاگـە پۆشاکەکەی بە دیوارەکەوە چەسپاند ٥ (شـــاق الطنـــب الى الوتـــد): لکـــی رەشماڵەکەی بەسینگەکەوە شـەتەك داو بەستییەوە.

**أشَاقَ الشيءُ فلانـاً**: شـتەکە فلانکەسـی توشی زەحمەت کرد.

**أشاق فلان الـشيءَ**: فلانکـەس شتەکەی بەلاوە زەحمەت بوو.

**شوّقَ اليه**: لای خۆشەویستکرد وایکـرد شتەکە حەزی لێ بکرێ.

**اشتاق اليه**: یان (إشتاقه)حەزی لـێ کرد.

**تَــشوَّقَ الى الــشيءِ**: زۆری ئـارەزۆ کـرد حـەزی لـێ بـوو ٥ خـۆی وانیـشان دا حەزی لەشتەکەیە.

**الــشائِقُ**: بـــەمانا (المـــشتاق) دێ ٥ ئارەزۆمەنـــــد، ئەوشـــــتەی وا لـــەئادەمیزاد بکـــا بـــەجوانی‌و رەنگینیەکەی شەیدای ببێ.

**الــشَوْقُ**: حـەزو ئـارەزو، مـەیل کردنــی نەفـــسە یـــان وەگـــری بونیـــەتی بەشتەکەوە ٥ (ك: أشواق).

**الشيِّقُ**: بەمانا (المشتاق)دێ.

**شـاكتهُ الـشوكَةُ شـوكاً**: چقڵ لــێی دا، چقڵی تێڕا چوو.

**شـــاكَ فـــلان فلانـــاً**: فلانکـەس چـقڵی لەفلانکـەس رۆکـرد، بەچـقڵ لێـی دا ٥ ئەزیەتی دا، دەگوتـرێ: (لا تشوكك مني شـوكة): لەمنـەوە هـیچ زیانێـکت پـێ ناگا.

**شـاكَ الـشجرُ وغـيره شَـوكاً**: درەختەکـە چقڵی دەرکرد یان چقڵی زۆر بون.

**شـــاكَ الرجـــلُ**: پیاوەکـە شـکۆمەندی‌و پیاوەتی دەرکەوت.

**شاكَ ثدي الفتاة**: مەمکی کچەکە سەریان هەڵدا، کچەکە بناغەی مەمکی دانا.

**شاكَ فلان الـشوكَ**: فلانکەس کەوتـە نـاو چقڵ‌و چاڵەوە.

**شِيكَ الجَسَدُ:** جەستەكە چقڵی تێدا ڕۆچوو، یان نوخاعی شەوكی توشی نەخۆشی بوو.

**أشَاكَ الشجرُ:** درەختەكە چقڵی دەركرد.

**أشاك فلاناً:** چقڵی لەفلان دا.

**شَوَّكَ الزرعُ:** كشتو كاڵەكە سەری دەرهێنا.

**شَوَّكَ الفرخُ:** بێچوە باڵندەكە پەڕو پۆڵی لێ ڕوا ○ پەڕەكانی سەریان دەرهێنا.

**شَوَّكَ الرأسُ:** سەری توكی لێ هات، یان دوای تاشین مووەكانی سەری هاتنەوە.

**شَوَّكَ شارِب الغلام أو عذاره:** سمێڵی گەنجەكە زبر بوو، یان لاجانگی زبر بوون.

**شَوَّكَ فلاناً بالشوك ونحوه:** چقڵی لەفلانكەس ڕۆكرد، بەچقڵ لەفلانكەسی دا.

**شَوَّكَ الحائطَ:** چقڵی بەدەوری دیوارەكەدا رایەڵ كرد یان بەسەر دیوارەكەدا چقڵی رایەڵ كرد.

**الشَّائِكُ:** چقڵاوی ○ كارێك كێشەو ناخۆشی لەسەر بێ، دەگوترێ: (أمر شائك أو موضوع شائك): قورسو گرانو زیان بەخشە، دەشگوترێ: (رجل شائك السّلاح): پیاوێكە پڕچەكو سیلاحە، یان تەلی دڕكاوی بەدەوری ماڵو جێگەوەیەتی.

**الشَّوْكُ:** چقڵ كەلەدرەختو رووەك دێتە دەر رەقو سەرتیژە ○ (ك: أشواك) ○ دەگوترێ: (جاء بالشوك والشجر): ژمارەی زۆری هێنا.

**الشَّوْكاءُ:** (حُلّة شوكاء وبردة شوكاء): كەواو عەباو پاڵتۆیەكی زبرە هەموو بەتازەیی دێتە بەرچاو.

**شَوْكَةُ العقرب:** چزوی دووپشك ○ هەروا وشەی (الشَّوْكَة)بەمانا چەكو هێزو تواناو زەبرو زەنگ دێ ○ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ الشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ﴾ ○ هەروا ناوە بۆ ئەو ئامێرەی جۆلاو تەونكار رایەڵو پۆی چنراوو تەنراوەكەی پێ سفتو لوس دەكا ○ هەروا ناوە بۆ چەتاڵی میوەو گۆشت خواردن شتێكە وەكوو كەوچك سەرەكەی وەكوو شانە پەل پەلە ○ سوراییەكە لەسەردەمو چاوو جەستە پەیدا دەبێ.

**الشَّوْكي:** هەرشتێك نیسبەت بدرێ بۆلای چقڵ ○ (الحبل الشوكي او النخاع الشوكي): بەشێك لەكۆئەندامی دەماری كەلەناو بۆری فەقەراتو بربڕەی پشت دایە ○ (التين الشوكي): روەكێكی چقڵاوییە لەپێڕی (الشوكية)یە.

**شالَ الشيءُ شولاً وشوَلاناً**: شتەکە بەرز بۆوە.

**شال الميزانُ**: تایەکی تەرازووەکە سەری کرد، بەرز بۆوە، دەشگوترێ: (شال میزان فلان): لەخۆ هەڵنانەوەو شایی بەخۆبون دا فلان بالادەست بوو ٥ (شالت نعامة فلان): فلانکەس خێرا تورە بوو پاشان رقەکەی نیشتەوە ٥ (شالت نعامة القوم): یەکیەتی‌و تەبایی قەومەکە نەماو فەوتا.

**شال الرجلُ يديه**: پیاوەکە دەستی هەڵبڕی.

**شالت الناقة بذنبها**: حوشترەکە کلکی هەڵبڕی.

**شاولَ الشيءَ**: شتەکەی بەرز کردەوە.

**شاول فلان قرنه**: فلانکەس هاوشانەکەی خۆی تورەکرد، وای کرد دەماری بەرز ببنەوە رقی هەڵسێ.

**شَوَّلَ الشائلُ**: شلەمەنییەکە کەم بوو، دەگوترێ: (شَوَّلَ لبن الناقة): شیری حوشترەکە کەم بوو.

**شَوَّلَت الدوابُّ**: ئاژەڵەکان لەبرسان سکیان بەپشتیانەوە نووسا.

**شَوَّلَ في المزادة**: لەکوندەکەدا شتێکی کەمی ناو هێشتەوە.

**إنْشالَ**: بەرز بۆوە، بۆ موطاوەعەی (شاله)دێ.

**تشاوَلَ القوم عند القتال**: خەڵکەکە بەرامبەر بەیەك چەکیان هەڵگرت ٥ هەرتاقمەو بەرامبەر بەیەك وەستان.

**الشائِلُ**: هەرشتێك بەرز بکرێتەوە ٥ حوشتری بەکەڵ کە کلکی بەرز دەکاتەوە بۆ حوشتری نێر ٥ (ك: شُوَّل وشوَّال).

**الشائِلة**: مێینەی (الشائِل)، دەگوترێ: (فرس شائلة) ٥ هەروا بەحوشترێك دەگوترێ: دوای بێچو بون گوانی هەڵکشێنەوەو شیری کەم بێ ٥ (ك: شوائل).

**الشالُ**: جۆرە پۆشاکێکە وەکوو دەسماڵی ئافرەت لەسەر شانەوە سنگ‌و بەرۆکی پێ دادەپۆشرێ، یان دەکرێ بەمێزەرو گودرەو لەچکە ٥ (ك: شیلان) ٥ هەروا ناوە بۆ جۆرە ماسییەکی روباری نیل.

**الشَّوْلُ**: باقی ماندەی شیر لەبنکی گوانی ئاژەڵ دا ٥ باقی ماندەی ئاو لەبنکی جام‌و پەرداخ دا ٥ ئاوی کەم ٥ (ك: أشوال).

**الشَّوِلُ**: گورج‌و گۆڵ‌و چوست چالاك لەئیش‌و کاری خۆی دا.

**الشَّوْلَةُ**: ئەو ئەندازە کلك‌و جزوەی کە دوپشك بەرزی دەکاتەوە ٥ فاریزەو کۆما کە لەنێوان رستەو وشەکان

دەنوسرێ بۆ روون کردنەوەی مەبەست ◦ هەروا مەنزڵو قۆناغێکە لەمەنزڵەکانی مانگ ◦ دوو ئەستێرەی بەرامبەر بەیەکن لە بورجی عەقرەب دا پێیان دەگوترێ: (حُمَةُ العقرب) چونکە بورجەکە هەمووی لەشێوەی دوپشك دایە.

**الشَّوَّالُ**: کەسێك بەرماوەی زۆر بێ ◦ هەروا ناوە بۆ یەکێك لەمانگەکانی عەرەبی کەبەدوا مانگی رەمەزان دا دێو پێی دەگوترێ شەشەلان ◦ (ك: شواويل وشواوِل).

**الشَّوَّالَةُ**: ئافرەتی فیتنەو دوو زمان ◦ باڵندەیەکە کەلەفڕین دا راست دەبێ کلکی دەجوڵێنێ ◦ هەروا وشەی (شَوّالة) عەلەمی جینسە بۆ دوپشك.

**المِشْوَالُ**: ئامێری بەرزکردنەوە ◦ (ك: مشاويل).

**المِشوَلُ**: ئامێری بەرزکردنەوە ◦ داسی بچوك ◦ (ك: مشاول).

**المِشْوَلَةُ**: بەمانا (المِشْوَلُ)دێ ◦ (ك: مشاول).

**الشَّوْلَمُ**: بڕوانە مادەی (شَلَمَ).

**الشَّوْمُ**: دارێکی رەقە بەکاردەهێندرێ بۆ دەسك لێ دروست کردنی ئامێرو شتی وا.

**شَوَّنَ الغَلَّةَ**: دانەوێڵەکەی تاقەت کرد، خەزنی کرد.

**الشُّوَنَةُ**: کۆڵێنەو کەندو عەمباری دانەوێڵە ◦ (ك: شُوَن) ◦ هەروا ناوە بۆ جۆرە کەشتیەکی شەڕ لەکۆن دا بەکارهێنراوە.

**الشُّوَّان**: ئەوکەسەی لێ پرسراوی کەندو عەمباری دانەوێڵەیە.

**الشونيز**: رەشکە؛ دانەوێڵەیەکە بۆ زۆر نەخۆشی دەرمانەو پێی دەگوترێ (حبة البركة).

**شاهَ الشيئُ**: شتەکە ناشیرین بوو.

**شاهَ نفسُهُ الى كذا**: نەفسی ئارەزوی ئەوەی کرد.

**شاهت عينه**: بەتیژی ووردیی بۆی ڕوانی.

**شاهَ الإنسانَ**: ئادەمیزادەکەی بەچاو هەنگاوت.

**شَوِهَ الشيئُ شَوَهاً**: شتەکە شێوا، ژاکا ◦ بەنرخ بوو بەرز بووە ◦ چاوی پیس کاری لێ کرد، یان توشی چاو ئێشەی توند بوو ◦ (فهو أشوه وهي شوهاء).

**شَوَّهَهُ**: ناشیرینی کرد.

**تشوه له واليه**: چاوی تێ بڕی، زۆری سەیر کرد ◦ خۆی لێ نەناس کرد.

**تَشَوَّهَ فلان شاةً**: فلانکەس مەڕێکی نێچیر کرد.

**الأشْوَهُ**: ناشیرینو نەکلەوت ◦ خۆ

بـــەزلزانو لارو لەنجەکـــەر ٥ چـــاو پـیسو هـەنگێو بەچـاو، بـۆ مێینـە دەگوترێ: (شـوهاء) هـەروا نـاوە بـۆ تاقانە لەمـەڕو بـزنو ئاسكو ڕەشـە وڵاخو کـــەرە کێـــوی ٥ (ك: شــــاء وشِیاه).

الـــشَّاهُ: پاشـاو مــەلیك ٥ هــەروا ئــەو شــاومەلیکەی لــەیاری شــەترنج دا بەکاری دەهێنن.

شـــابَلّوط: شــابەڕو جــۆرە درەختێـــکە لەپێری داربەڕوو میصرییەکان پێـی دەڵێن (أبو فَرْوَة).

شاهنـشاه: پاشـای پاشـایان، یـان شـای گەورە.

الـــشَّوْهَاءُ: ناشـــیرینو نەکڵـــەوەت ٥ ڕەزاگران.

الشُوهَةُ: ناشیرین.

المَشَاهَةُ: زەوییەك مەڕو بزنی زۆر بێ.

شَوَی اللحمَ وغیره شیّاً: گۆشتەکەی برژانـد بەئاگر.

شَوى الماءَ: ناوەکەی گەرم کرد.

شَـــوَى الـــشيئَ: لەشـــوێنی کاریگـــەری شتەکەی دا.

أشـــوى القمــــحَ: گوڵەگەنمەکـــەی هەڵپرووزاند، وای لێ کرد بەکەڵکی برژاندن بێ.

أشوی الـسَّعَفُ: لقە دار خورماکە زەرد بوو بەرەو وشك بوون دەچێ.

أشـوَی فـلان: فلانکـەس شـتی سـوتاوو خراپی بۆ خۆی پەزمەندە کرد.

أشوی من الشیئ: لەشتەکە هەندێـکی هێشتەوە.

أشوَی فلاناً: بـرژاوی دەرخـواردی فلان دا.

أشـــوَی الـــصَّیدَ وغـــیره: نێـــچیرەکەی نەهەنگاوت بۆی ڕاونەکرا.

شوَّی فلانـاً: شـتی بـرژاوی دەرخـواردی فلانکەس دا.

اشتَوَی: بۆ موطاوەعەی (شَوّاهُ)دێ.

اشـتوی اللحـمَ: گۆشـتەکەی بـەبرژاوی هەڵگرت.

إشتَوَی: بۆ موطاوەعەی (شواه)دێ.

الـــشَّوَی: قــەراخو تەنیــشتی جەســتە، دەگــوترێ: (فــرس عبــل الــشَّوی): ئەسپێــکی دەســتو پــەل قەوییــە ٥ سەرگەورەیە ٥ پێستی بەدەرەوەیە ٥ تاکەکـــەی (شَـــــواةٌ) ٥ قورئـــان دەفـەرموێ: ﴿کَلَّا إِنَّهَـا لَظَـی، نَزَّاعَـةً لِّلـــشَّوَى﴾ ٥ بـاقی مانـدەی شــتو بـەرماوە ٥ کـاری ئاسـانو بـێ نمـودو کەمبایـەخ ٥ گوتویانـە (کـل شـیئ شوی ماسلم دینك وعرضك): هەموو شتێـك ئاسانو کەم نمودە بەمەرجێ ئایینو ناموست پارێزراو بێ.

**الشِّواءُ**: برژاو.

**الشِّواةُ**: تاكى وشەى (الشَّوَى)يە.

**الشُّوايَةُ**: بەشێكى كەم لەمزۆر، پارچەیەك لەشت ◦ پارچە گۆشتێك لەلاكە مەڕێك ◦ كوتە گۆشتێك لەحەیوانێكى سەر بڕوا.

**الشِّوَايَة**: پیشەى برژاندن، وەستاى كەبابو شتى وا.

**الشَّوَّاءُ**: گۆشت برژێنو شت برژێن.

**الشَّوِيُّ**: برژاو.

**الشَّوَّايَةُ**: ئامێرى برژاندن، تاوەو شتى لەو جۆرە كە گۆشتو شتى واى تێدا ببرژێنرێ.

**الشُّوِيَّةُ**: پارچەى برژاو كوتە گۆشتى برژاو ◦ باقى ماندەى شت، بەرماوەى شت.

**الشُّوَيَّةُ**: بەشى كەم لەمزۆر.

**المَشوى**: شوێنى برژاندن ◦ (ك: مشاو).

**شاءَهُ شيئاً**: ویستى، ئیرادەى كرد.

**شاءَه الى كذا**: ناچارى كرد بۆ ئەو شتە.

**شيَّأهُ على الأمر**: بەمانا (شاءَهُ)دێ.

**تَشَيَّأ فلان**: فلانكەس رقەكەى نیشتەوە.

**الشَّيْئُ**: شت، هەبوو، هەرشتێك كەمەندكێشى خەیاڵ ببێو بتوانى هەواڵى لێ بدەى.

**المَشِيئة**: ویستو ئیرادە.

**المُشَيَّأ**: ناچار كراو بۆ كار، بێگار پێكراو.

**المُشَوَّهُ**: جەستە نارێكو پێك بەزكماكى ◦ جەستە شێواو بە خۆرسك.

**شابَ فلان شيباً وشَيْبَةً**: فلانكەس سەرو ریشى سپى بوو، دەگوترێ: (شَابَ الشَّعْرُ وشَابَ الرأسُ) ◦ (فهو شائب وأشيب) ◦ بەمزۆرى بۆ پیاو دەگوترێ: (أشْيَبُ) بۆ ژن (شَمْطاء)دەگوترێ، هەروا دەگوترێ: (شابت رؤوس الآكام وغيرها): سەرى كێوەكان بەبەفر داپۆشین.

(كوێستانان خاڵخاڵ بەفرى ناچێتۆ
قیبلەم تۆراوە ئاشتى نابێتۆ).

**أشَابَ الرَّجلُ**: پیاوەكە كوڕەكەى پیر بوو.

**أشابَ الكِبَرُ أو الحزنُ او الخوفُ فلاناً**: پیرى، غەمو خەفەت، ترسو بیم فلانكەسى پۆلكاندو موى سپى بوو.

**شَيَّبَهُ**: بەمانا (أشابَهُ)دێ ◦ هەر لەم مانایەدایە كە (عبدالملك)ى كوڕى مەروان وتویەتى (شَيَّبَنِي اعتلاء المنابر): چوونە سەر مینبەرو وتار خوێندنەوە پیرى كردم.

**الأشْيَبُ**: پیرو كەنەفت، دەگوترێ: (جبل أشيب): كێوى سەر بەبەفر ◦ (یوم أشيب): رۆژێكى هەورو هەڵاواوىو

ساردو سەرما ٥ بۆ مێینە دەگوترێ:
(شیباء) ٥ (ك: شِيَبٌ).
**الليلة الشَّيْبَاءُ**: شەوی کۆتایی مانگ.
**الشَّيْبُ**: موی سپی، سپیایەتی موو.
**المَشِيبُ**: تەمەنی پیری.
**الشِّيتُ**: جۆرێکە لەقوماشی تەنك و شاش و گوڵگوڵاوی دروستکراو لە لۆکە، بەکوردی خۆمان پێی دەڵێن (چیت).
**شاحَ في الأمر شيحاً**: دڵسۆزیی لەکارەکەی دا نواند.
**شاحَ على حاجته**: بۆ ئیشی خۆی لێبڕاو، سووربوو لەسەر ئەنجامدانی.
**أشاحَ المكانُ**: زەوییەکە روەکی (شَیح)ی رواند.
**أشاحَ وجْهَهُ أو بوجهه**: روی خۆی لێ وەرگێڕاو نارازیبوونی خۆی دەرخستو بەهیچ و پوچی لەقەڵەم دا.
**الشائِحُ**: پیاوی ئازاو چاونەترس، وریاو ئاگادار.
**الشِّيحُ**: روەکێکی هەمەجۆری دەشتەکییەو بۆنێکی خۆشی کەسکونی هەیە، ئاژەڵ حەزی لێیەتی و دەیخوا ٥ (ك: شيحان).
**شاخ الإنسانُ شيخاً وشيوخة وشيخوخة**: ئادەمیزادە کە پیربوو کەوتە ساڵەوە.
**شاخ النَّباتُ**: روەکەکە ئاوەوەی وشك و گەندەڵ بوو.
**شَيَّخ**: بەمانا (شاخ)دێ.
**شيّخ فلاناً**: بەوشەی شێخ بانگی فلانکەسی کرد.
**شَيَّخ عليه**: رەخنەی لێ گرت، ناوی زڕاندو ئابڕوی برد.
**تَشَيَّخ**: خۆی بەپیرو پەککەوتە نیشان دا.
**الشُّيَّاخ**: ئەوکەسەی زوو پیریی لێ دیاریی دەدا، پێگەیشتن و کامڵ بوونی ئاسایی نەبێ.
**الشِّيَاخة**: پلەو پایەی شێخ و ریش سپی عەشیرەت، سنووری قەڵەمڕەوی و دەست رۆیشتنی سەرۆك هۆز.
**الشَّيْخُ**: پیرەمێرد، بەزۆریی لەتەمەنی پەنجا ساڵییەوە پیریی دەست پێدەکا ٥ پلەو پایەیەکە دەدرێ بەکەسێك لەناو هۆزو دەفەردا رۆڵێکی کاریگەریی هەبێ و خاوەنی رەوشت و ئاکاری پەسند بێ و خزمەتی گەل و هۆزی بکا، خەڵکەکەش پابەندی فەرمان و ئامۆژگارییەکانی بن.
**شيخ البلد**: کوێخای گوند، ریش سپی شارو دەفەر.
**شادَ البناءَ شيداً**: باڵەخانەکەی گەچکاریی کرد، بۆیەی کرد، لەبغی کرد، بەرزی کردەوە، هەڵی چنی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَقَصْرٍ مَشِيدٍ﴾.

أشادَ البناءَ: باڵەخانەکەی بەرزکردەوە.

أشادَ بالشيئ: بەدەنگی بەرز وەسپی شتەکەی داو پێی دا هەڵگوتو لێ رازیبوونی خۆی دەربڕی ٥ ئاماژەی بۆکرد.

أشادَ عليه: ناوی زڕاند، بەخراپ باسی کرد.

شَيَّدَهُ: بەمانا (شَادَهُ)دێ، بیناکەی قایمو قوڵ دروست کرد.

الشِّيدُ: هەرشتێك دیواری خانووی پێ لەبیغو گەچکاریی‌و بۆیەبکرێ.

الشَّيْرَجُ: زەیتی کونجی.

شَيَّزَ البُردَ أو الثوب ونحوه: قوماشەکەی بەهێڵی سور خاڵخاڵ کرد.

الشِّيزُ: دارێکی رەشی پتەوە، شانەو کاسەو قاپو قاچاغی لێ دروست دەکرێ، وادەبێ خودی شانەو کاسەو شتەکانی تری کەلەو دارە دروست دەکرێن پێیان دەگوترێ (شیز).

أشاشت النخلة: دارخورماکە بەرەکەی هەڵ نەپێچاو دەنکی ناوەوەی خورماکانیان رەق نەبوو بوونە خورما وشکەڵو بەکەڵکی خواردن نەهاتن.

الشِّيشُ: دار خورمایەکە دەنکەکانی هەڵ نەپێچێ، یان بەرەکەی گزو لاوازبێ کەوشك ببێتەوە ببنە خورما وشکەڵ ٥ جۆرێکە لەیاری ریازە شمشێری کولو نەبڕی تێدابەکار دەهێنرێ بۆ پەراوەپێکردنو فێربوونی شەڕە شمشێر ٥ ناوە بۆ خودی ئەو شمشێرەی کولو نەبڕەو یارییەکەی پێ دەکرێ ٥ هەروەها ناوە بۆ شوشەی پەنجەرە، خودی پەنجەرەکە بەشێوەیەکی فەننی لەجیاتی پەردە کونکونی چوار گۆشەیان پاقلاوەیی تێدابێ کەسێبەر لەژورەکە بکاو نەهێڵێ هەتاو لەناوەوە بداو هەواش بەرێتە ژوور.

الشِّيشَاءُ: خورمایەك کاڵو کرچو بیزۆك بێ.

الشِّيشَةُ: نێرگەلە کە بە کاربێ بۆ کێشانی توتن ٥ یان ناوە بۆ خودی شوشەی نێرگەلەکە.

أشاصت النخلةُ: دارخورماکە خورمای بیزۆکی بەرهەم هێنا، بەهۆی تەلقیح نەکردنەوە یان بەهۆی خراپ بەخێو کردن.

شايَصَ مُشايَصَةً وشياصاً: شەڕەنگێزو بەد ڕەوشت بوو.

شَايَصَ فلاناً: قیزی لەفلان کرد تڕۆی کرد.

شَيَّصَت النخلةُ: دارخورما بەری بیزۆكو وشکەڵی بەرهەم هێنا.

شَيَّصَ فلان الناسَ: فلانكەس ئەزيەتی خەڵكی دا.

الشِّيصُ: خورمای بێزۆك‌و وشكەڵ بەهۆی باش تەلقیح نەكردن‌و خراپ بەخێوكردنەوە.

الشِّيصَاءُ: دەق بەمانا (الشِّيشاء)دێ.

شاطَ شَيْطاً وشياطةً: خەریك بوو بسوتێ، هەندێكی یان هەمووی نزیك بوو گڕبگرێ، دەگوترێ: (شاط الطعام): خۆراكەكە هەندێكی سوتا.

شاطَتِ القِدرُ وغوها: مەنجەڵەكە هەندێ لەوخواردنەی تێدا لێ نرا بوو بەبنكیەوە نووسا، گەمرەی كرد.

شاطَ فلان: فلانكەس فەوتا، تێدا چوو، خوێنی بەفیڕۆ رۆیی، دەگوترێ: (شاط دم القتيل): خوێنی كوژراوەكە بەفیڕۆ چوو.

أشاطَ الشيئَ: شتەكەی والێ كرد بسوتێ، خواردنەكەی والێ كرد بسوتێ.

أشاطَ فلاناً: فلانكەسی بەهیلاك برد.

أشاطَ دَمَ الذبيحة: خوێنی كوشتیيەكەی رژاند.

أشاطَ الحاكمُ دَمَ القتيل: دادوەر خوێنی كوژراوەكەی بەفیڕۆ دا.

أشاطَ اللحمَ على القوم: گۆشتەكەی پارچە پارچە كردو بەسەر خەڵكەكەدا دابەشی كرد.

شَيَّطَ الشيئَ: شتەكەی والێ كرد هەندێكی یان هەمووی بسوتێ.

شَيَّطَ الجلدَ: پێستەكەی هەڵپرووزاند چی توك‌و گەندەموی پێوە بوو هەمووی هەڵكرووزاند.

شَيَّطَ اللحمَ: گۆشتەكەی بەئاگر راداشت‌و چاك نەیبرژاند.

اشتاط عليه: زۆر رقی هەڵسا.

تشيَّطَ: سوتا، هەڵپرووزا.

تشيَّطَ دم الرجل: خوێنی پیاوەكە لەرقا دەكوڵا، دەشگوترێ: (تَشَيَّطَ به دَمُهُ): خوێنی گەرم بوو، رقی هەڵسا.

استَشاطَ: بەمانا (إشتاط)دێ.

استَشاطَ الحمامُ: كۆترەكە بەچوست‌و چالاكی هەڵفڕی.

استَشاطَ في الحرب: لەشەڕدا گورج‌و گۆڵ بوو جانفیدایی نواند.

استَشاطَ في الضَّحك: زۆر پێكەنی‌و خەریك بوو هەناسەی لێ ببڕێ.

الشِّياط: بۆسۆ، بۆنی سوتاوی پەڕۆو لۆكەو شتی وا.

تَشَيْطَنَ: بڕوانە مادەی (شطن).

الشيطان: بڕوانە مادەی (شَطن).

تَشَيْظَمَ عليه بالكلام: خێرا قسەی لەگەڵ كردو توند بوو.

الشَّيْظَمُ: شێر ○ درێژ ○ روگوشاد ○ (ك:

شياظم وشياظمة).

**شاعَ الشيئُ شيوعاً وشيعاناً ومشاعاً:** شتەكە بڵاو بووەوە دەركەوت.

**شاع بالشيئ:** شتەكەی بڵاو كردەوە.

**شاع الدارُ:** خانوەكە هاوبەش بوو جیا نەكرابۆوە ە دەگوترێ: (اشترى داره على الشيوع): خانوی تێكەڵو ئیفراز نەكراوی كڕی.

**شاعَ الإناءَ:** قاپەكەی پڕكرد ە لەدوعا كردن دا دەگوترێ: (شاعَكَ الخَيْرُ) خێرو خۆشی داتپۆشێ.

**أشاعَ الشيئَ وبه:** شتەكەی بڵاو كردەوە دەری خست.

**أشاع الدار ونحوها:** خانوەكەی والێ كرد تێكەڵ بێو بەشەكانی لێك جیانەكرێتەوە ئیفراز نەكرابێ.

**أشاع بالقوم:** بانگی خەڵكەكەی كردو هاواری لێ كردن، لێیان تورە بوو.

**أشاع الله القوم بالسلام:** پەروەردگار ئەمنو ئاسایشی بەسەر ئەو قەومەدا رژاند گشتگیری كرد بۆیان.

**شايَعَهُ مشايعة وشياعاً:** شوێنی كەوت، پشتگیری كردو هاوڕاو هاوبیری بوو.

**شَيَّعَ:** بەمانا (شاعَ)دێ.

**شَيَّعَ فلان:** فلانكەس بوو بە شوێنكەوتەی خەڵكی تر ە بوو بە شیعە مەزهەب.

**شَيَّعَ الزامِرُ:** زوڕنا ژەنەكە فوی بەزوڕناكەدا كردو لێی دا.

**شَيَّعَتْ فلاناً نفسه:** فلانكەس نەفسی تەمی خواردو بوو.

**شَيَّعَ النارَ في الحطب:** ئاگری خستە ناو دارەكانەوەو بڵاوی كردەوەو خۆشی كرد.

**شَيَّعَ الغضبَ فلاناً:** رق هەڵسانو توڕەیی فلانكەسی كەمبایەخو بێ نمود كرد.

**شَيَّعَ فلاناً:** لەگەڵ فلانكەس چووە دەرو بەڕێی كرد، خودا حافیزی لێ كرد ە ویستی بیگەیەنێتەوە شوێنی خۆی، دەشگوترێ: (شَيَّعَ الجنازة): تەرمی مردوەكەی بەڕێ كرد، لەگەڵی رۆیشت بۆ سەر گۆڕستانو بەخاكی سپارد.

**اشتاعا في كذا:** لەوشتەدا هاوبەش بوون.

**تَشَايَعَ الأمرُ:** كارەكە بڵاو بۆوە.

**تشايَعَ القومُ:** هەندێ لەخەڵكەكە پشتگیری هەندێكیانیان كرد، یان بوونە چەند گروپو تاقمێك.

**تَشَيَّعَ في الشيئ:** لەحەزو ئارەزوەكانی خۆی دا سەری تێداچوو.

**تشَيَّعَ الغضبُ فلاناً:** رق هەڵسانو

تورەیی فلانکەسی سوكو سەلیم کرد، لەپێش چاوی خەڵك ڕێزی دابەزی.

الإشاعة: بڵاو بوونەوەی هەواڵی بێ بنەما.

الشائع: بڵاوە بوو.

الشائعة: هەواڵی بڵاوە بوونی بێ بنەما ٥ (ك: شوائع).

الشَّاعُ: بەمانا (الشائع)دێ.

الشِّيَاعُ: بانگدان، بانگ لێ کردن ٥ ئامێری دەنگ گەورە کردن.

الشَّيْعُ: هاوشێوەو هاوشانو نزیك لەشێوەی ئەو، دەگوترێ: (آتيك غداً أو شيعه) یان دەگوترێ: (ثمنه شيع عشرين درهماً): نرخەکەی نزیکی بیست دیرهەمە.

الشَّيْعُ: کەسێك ژنانی بێو زۆر تێکەڵی پێڕی ئافرەتان بێ، دەگوترێ: (هو شيع نساء).

الشَّيْعَةُ: جۆرە درەختێکە لەبالای ئادەمیزاد کورت ترەو پەلەکانی گرێو گوڵیان زۆرەو گوڵەکەی لەگوڵی یاسەمین بچوکترە، ڕەنگی گوڵەکەی سورێکی تۆخەو بۆنی زۆر خۆشە پۆشاکی پێ پاك دەکرێتەوە ٥ هەنگوینی ئەم جۆرە گوڵە زۆر بەتامەو هەنگ هەڵاڵەی لێ وەردەگرێ.

الشِّيعَةُ: فیرقەو کۆمەڵ، پێرو تاقم ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا﴾ شوێنکەوتەو یارمەتیدەر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِن شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ﴾ ٥ هەروا دەگوترێ: (هم من شيعة فلان) ٥ شیعە جەماوەرێکی زۆری موسوڵمانانن و ڕێزو خۆشەویستییان بۆ عەلی کوڕی ئەبو طالبو وەچەو نەوەکانی هەیەو پێیان وایە هەر کەسێك لەنەژادی عەلی بێ ئەو شیاوە بۆ خەلیفایەتی موسوڵمانان ٥ (ك: شيع وأشيع).

الشِّيعي: تاکی (الشيعة)یە ٥ بەیەکێك دەگوترێ لەپێڕی ئیمامی عەلی بێ.

الشَّيِّعُ: هاوبەش لەشتی موشاع دا ٥ (ك: شُيَعَاء).

الشيوعية: مەزهەبو بیرو بۆچونێکە داوادەکەن خاوەنداریێتی مڵكو سامان هەموانی بێ مڵکدارییەتی تایبەتی نەمێنێو هەموو کەس بەئەندازەی توانای خۆی ئیش بکاو بەگوێرەی پێویستی شت وەربگرێ.

الشيوعي: کەسێك نیسبەت بدرێ بۆ شوسیالیسی.

**المَشَاعُ**: هەمە جۆرو هەمواني‌و بەرەلاّ بۆ هەموو کەس.

**المَـشَاعُ**: بـلاّوە بـوو، ملّـکی هاوبـەش‌و جیانەکراوە.

**المِشْياعُ**: بـۆ زيـادە رِەوی لـەماناى بـلاّو کردنـــەوەو دەرخـــستنی شـــت دا هاتووە.

**المِشيَعَةُ**: تورەکە، سندوقێکی بچوك يان جانتايـەکی بـچوکە ئـافرەت هەنـدێ پێداويستی خۆی تێدا هەڵدەگرێ ٥ (ك: مشايع).

**المُـــشَيّعُ**: کەسێـــك زۆر لايـــەنگرو شـــوێنکەوتووی هـــەبێ ٥ ئـــازاو بەجەرگ‌و دلێرو دلّ قايم.

**الـشِيقُ**: کەلەبـەری نێـوان دوو بـەرد ٥ رێگای تەنگەبەر.

**الشيك**: چەکێکی فـەرمی پارەوەگرتنـە کـابرای خـاوەن پـارە کەلـەبانك داينـاوە فـەرمان دەکـا بەبانکەکـە برِێـك لەپارەکەی بـدەن بەفلاّن.

**شَالَهُ وبه شيلاً ومشالاً**: بەرزی کردەوە.

**الشَيّالُ**: ئەسپێـکە بـاوکی رەسـەن بـێ‌و دايکی نارِەسەن.

**الـشَيالة**: پيـشەی شـت بەرزکردنـەوەو لابـردن ٥ کرێـی بـەرز کردنـەوەو لابردن.

**الشَيّالُ**: حەمالّ ٥ کۆلّ هەڵگر.

**الـشَيّالَة**: ئـامێری شـت بەرزکردنـەوە ٥ کرێن.

**المِـشْيَالُ**: کەسێـك جەسـتەی نارێـك‌و پێـك بـێ ٥ ناقۆلاّبێ.

**الشَلْمُ**: بروانە (شَلَمَ).

**شام فـلان شيماً**: فلاّنکەس خـالّ لەسـەر پێستی دەرکەوت.

**شـامَ الـسحاب والـبرق**: تەماشـای هـەورو بروسکەکەی کـرد ئـاخۆ لـە کوێ بـاران دەبارێنێ.

**شـام مخايـل الـشيئ**: بـەوردی روانـی بـۆ شوێنی گوماناوی شتەکە.

**شـــامَ الـــشيئَ**: شـــتەکەی ئامـــادەکردو مەزندەی کرد.

**شَـــيمَ شَـــيْماً**: خـــالّ لەســـەر جەســـتەی دەرکەوت ٥ خـالّ بەجەستەيەوە بـوو ٥ زۆری خـالّ پێـوە بـوو، موحەممـەدی مامليێ دەڵێ:

دەبارێ هەی دەبارێ دەبارێو کرێوەی دەکـــا
لەسەر سينگی کەژاڵێ خاڵەو بانگی خاڵ دەکا

(فهو أشيم وهي شيماء).

**شَـيَّمَ يديـه في رأس فـلان أو ثوبـه**: بەهەردوو دەستی سەری فلاّنی گرت يان يەخەی گرت شەرِی لەگەڵ کرد.

**تَشَيَّمَ الشيئَ غيره**: شتەکە بەناو غەيری خۆی دا بلاّو بۆوە، دەگوترێ: (تَشَيَّمَ الحريق القصب): ئاگر بـەناو پـەرێزو

پوشو پەڵاشەکەدا بڵاو بۆوە ٥ (تَشَيَّمَ الــشَّيْبُ الرجــلَ): پــیری بــەناو جەستەی فلان دا بڵاو بۆوە.

تَشَيَّمَ فلان أباه: فلانکەس سەری لەبابی خۆی دا لەئەخلاق‌و رەوشت دا.

الشَّامَةُ: خاڵ؛ نیشانەیەکە لەجەستەدا رەنگــی جودایــە لــەرەنگی پێــستی، هــەتا خاڵەکــە رەش تربــێ جــوانترە، دەگوترێ: (کــانهم شــامة في النــاس): ئەوانە ئاشکراو دیارن لەناوکەسانی تــردا ٥ (شــامة القمــر): ئەوتــەڵخی‌و رەشــییەیە لــەڕوی دا دەبینــدرێ ٥ (ك: شام).

الشِّيَمُ: زەوییەك لەبەر رەقی‌و تونــدی هەڵکەندنی زەحمەت بێ.

المَشِيمَةُ: ئــەو پــەردە دەرەکییەیــە کــە زارۆك لەمنداڵدانی دایکی دا تێیدایە لەگــەڵ لــەدایکبوونی دێتــە دەرەوە ٥ (ك: مشايم).

شَانَهُ شَيْناً: ناشیرینی کرد، رەخنەی لــێ گرت.

الشَّيْنُ: عەیبو ناشــیرینی، پێــچەوانەی جوانییە.

المشاين: عەیبو ناشیرینی جۆراو جۆر.

الشَّايِي: چا؛ رووەکێکە بەزۆری لەوڵاتی ســـیلان‌و وڵاتـــانی تـــری ئاســـیا دەروێندرێ گەڵاکەی وشك دەکــرێ‌و دەکوڵێنـــدرێ‌و شـــەکری تێـــکەڵ دەکرێ‌و دەخورێتەوە.

